# ژیانی ئازیزمان

## صلى اللّه عليه وسلم

بەرگی دووهەم

نووسینی

حبیب محمد سعید

# پــێـشــکـەش

**ئەم بەرهەمە پێشکەش بێت بە :**

* گیانی پاکی پێغەمبەری خوا ﷺ و ، هەموو برا پێغەمبەرەکانی تری سەلامیان لێ بێ و ، هەموو هاوەڵان و ، شوێن‌کەوتووان و ، زانایان و ، ئەولیایان و ، خزمەتگوزارانی دینی خوا .
* بەو مامۆستایانەی کە دەستیان گرتین و ، بە کتێب ، یا بە ئامۆژگاریی ئەلف و بێی ئیسلامیان فێر کردین و ، نەیانهێشت سەرگەردانی بیابانی ئیلحاد و بێ‌دینیی ببین .
* بە دایك و باوك و ، کەس‌وکاری خەم‌خۆری دەوروبەر و ، ئەو برایانەی کە برایانە دەستیان گرتین و هەردەم دڵیان خۆش ئەکردین تا لە سەرچەمەی زوڵاڵی قورئان دوور نەکەوینەوە .
* بە هەموو چاك‌ویستێك کە خوا هیدایەتی دابێت بۆ سەر ڕێبازی ئیسلام و ، بڕیاری دابێ تەمەنی بۆ خزمەتی ئیمان ، بۆ سەرفرازیی مەردومەکان لە دۆزەخ ، بەخت بکات .

# پێشەکیی

الـحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على سيد الـمرسلين وعلى آله وصحبه جمعين ، إلى يوم الدين .

وا بە پشتیوانیی خـوای گـەورە بـەرگی دووهـەمی ژیـاننامەکـەی ئازیزمـان ﷺ ەخەینە بەر دەستی خوێنەری بەڕێز ، بەو هیوایەی هەموو لایەکمان لە رەحم و سۆزی خوای گەورە بەهرەمەند ببین . داواکارین خوای بالادەست ئیمە و هەموو موسـڵمانێك سەربەرزی دنیا و قیامەت بکات و ، دینی ئیسلامی پیرۆزیش پەخشـانی سـەرزەویی بکـات ، بـەو هیوایـەی مرۆڤـەکان لـە ئـاگری دۆزەخ سـەرفراز بـن و ، موسـڵمانە دڵسۆزەکانیش بە پلەی بەرزی خۆیان بگەیەنێت .

سلێمانیی

٢٧ / رەبیعی یەکەم / ١٤٢٧ ك

٢٥ / نیسـان /٢٠٠٦ ز

## بەشی بیست و شەشەم

# ڕووداوەکانی نێوان ئوحود و ئەحزاب

هەر چەندە شکستی ڕۆژی ئوحود کاریگەریی زۆری هەبوو لەسەر سومعە و ورەی موسڵمانەکان ، لەگەڵ ئەوەش‌دا بە تەواویی دەسەڵاتی ناوچەکە لە دەستی ئەوان‌دا بوو و ، هیچ هێزێك نەی‌توانیی شان لە شانیان بدات ، بە تایبەت دوای ئەنجام‌دانی ئەو هەڵمەتە سەربازی‌یە گورج و گۆڵانە کە ترسی خستبووە دڵی هەموو بت پەرستێکەوە .

موسڵمانەکان هەموو وزەیەکیان خستە کار تا سومعەی سوپاکەیان بپارێزن و ، بت پەرستە دڕندەکانی دوورگە هەڵ نەکوتنە سەریان . بۆ ئەمە چەند هەڵمەتێکیان ئەنجام دا و ، شێرانە توانی‌یان گورزی کاریگەر لەو دوژمنانە بوەشێنن کە نیازیان دەرهەق بە مەدینە خراپ بوو .

دیارە یەکەم هەڵمەتێك کە ئەنجامیان دا هەڵمەتی ( حمراء الأسد ) بوو ، کە ئەوەبوو دوای کۆتایی هاتنی جەنگی ئوحود بە چەند سەعاتێك موسڵمانەکان کەوتنە دوای قورەیش و ڕاویان نا ، وەك لە پێشەوە بە درێژە باس کرا . ئەم هەڵمەتە سومعەی سوپای ئیسلامیی یەکجار بەرز کردەوە .

موسڵمانەکان بە سەرکردایەتیی پێغەمبەری خوا ﷺ خەریکی دامەزراندنی دەوڵەتی نەونەمامی ئیسلام بوون .. بیریان لە هیچ دەستدرێژی‌یەك نەئەکردەوە ، کەچیی هۆزە عەرەبەکانی دەوروبەری مەدینە کەوتبوونە تەماعی ئەوەی کە دەستێك لە مەدینە بوەشێنن ، تا دەست بە تاڵان و بڕۆ بکەن و ژن و منداڵیش بە دیل بگرن .

موسڵمانەکان لە دەست‌خستنی دەنگ‌وباسی ناوچە جۆرا و جۆرەکانی دوورگەدا یەکجار چالاك بوون .. بۆیە هەر هۆزێك نیازی خراپی دەرهەق بە مەدینە ببوایە ، خێرا پێ‌یان ئەزانیی و ، بەر لەوەی ئەو ناحەزە بێتە سەر مەدینە و دەستدرێژیی بکاتە سەریان ، هێزی موسڵمانان تەپی ئەکوتایە سەر شوێن و مەنزڵی ئەو هۆزە و لە گۆی ئەخست ..

ئـەوەبوو دوای جـەنگی ئوحـود چـەند هەڵمـەتێکیان دا و ، ئـەو عەرەبـە بـت پەرستانەیان دەرس دادان .

**یەکەم : ئەمێ کردنی نەوەی ئەسەد**

یەکەم هەڵمەتێك کە سوپای موسڵمانان کردیە سەر دوژمنان بریتیی بوو لە دەوری یەیەك کـە پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بۆ لێدانی هۆزی ئەسەد لە ناوچەی نەجد .

فەرماندایـەتیی مەدینـە هـەواڵی ئـەوەی وەرگـرت کـە هـۆزی ئەسـەد ، بـە سەرکردایەتیی جەنگاوەری ناوداریان طـولەیحەی کوڕی خوەیلید[1] و سـەلەمەی بـرای ، نیازی ئەوەیان کردووە سوپا کۆ بکەنەوە و هێرش بکەنە سەر مەدینە .

خێرا پێغەمبەری خوا ﷺ لە موهاجیر و ئەنصار هێزێکی رێك خسـت کـە صـەد و پـەنجا سـوار بـوون و ، ئەبوسـەلەمەی کـوڕی عەبدولئەسـەدی مـەخزوومیی[2] کـردە فەرماندەیان و ، ئاڵاکەی دایە دەستی .

ناردنی ئەم سریەیە یان لە ذولحەججەی ساڵی سێهەمدا بووە ، یان لە یەکـەم رۆژی موحەڕڕەمی ساڵی چوارەمدا بووە . شایانی باسە کە ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح و ، سەعدی کوڕی ئەبووەققاص و ، هی تریش لـە گـەورە پیـاوانی موهـاجیر و ئەنصـار لەگەڵ ئەم سریەیەدا سەرباز بوون .

---

[1] طولەیحەی کوڕی خوەیلیدی ئەسەدیی ، لە هۆزی ئەسەدی کوڕی خوزەیمە بووە . داوای پێغەمبەرایەتیی کردووە ، بۆیە پێی وتراوە طولەیحەی درۆزن . ئازا و زمان پاراو بووە و ، لە ئازایەتیی‌دا بە هەزار پیاو لە قەڵەم دراوە . لە جەنگی ئەحزابدا سەرکردەی نەوەی ئەسەد بوو . لەگەڵ نوێنەری نەوەی ئەسەددا ، لە ساڵی نۆی کۆچیی‌دا دێتە مەدینە و پێکەوە موسڵمان ئەبن . کە گەڕانەوە طولەیحە هەڵ ئەگەڕێتەوە و ، هەر لە ژیانی ئازیزدا دەست ئەداتە داوای پێغەمبەرایەتیی . پێغەمبەری خوا ﷺ ضیراری کوڕی ئەزوەری بۆ ئەنێرێ تا بی‌کوژێ . کە ضیرار شمشێری لێ ئەدا ئەچەمێتەوە و نای‌برێ .. ئەمە لە ناو خەڵك دا بڵاو ئەبێتەوە . کە پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد شوێن کەوتوانی طولەیحە پەرەیان سەند . وای ئەگەیاند کە جیبریل دێتە لای .. هەندێ سەجەعی دەست هەڵ بەستی بۆ خەڵك خوێندەوە کە تیایا فەرمانی بە وازهێنان لە سوجدەی نوێژ ئەدا .. تەماعی کردە مەدینە و هێرشی کردە سەری بەڵام دانیشتوان هێرش‌بەرانیان گێڕایە دواوە . خەلیفە ئەبوبەکر خالیدی بۆ نارد و ، طولەیحە تێك شکا و ، دواجار هەڵات بۆ شام . پاشان کە ئەسەد و غەطەفان موسڵمان بوون ، ئەویش هاتەوە مەدینە خزمەتی خەلیفە عومەر و ، بەیعەتی پێ دا و ، شمشێرەکەی هەڵ گرت و بەرەو عێراق کەوتە رێ ، مەردانە چوو بۆ جیهاد و بەشداریی جەنگی قادسیەی کرد و ، لە جەنگی نەهاوەندی ئێراندا ، لەگەڵ سوارچاکی یەمەن ( عەمری کوڕی مەعدی‌کەریبەی زوبەیدیی ) بە شەهیدیی سەریان نایەوە .

[2] ئەبوسەلەمە : ناوی عەبدوڵلای کوڕی عەبدولئەسەدی کوڕی هیلالی مەخزوومی‌یە . یەکێکە لەوانەی کە زوو بە زوو لە مەککەدا موسڵمان بووە . بەشداریی جەنگی بەدر و ئوحودی کردووە . لە ئوحوددا زامدار بووە و پاشان چاك بۆتەوە، کەچیی کە بۆ ئەم سریەیە دەر ئەچێ خوێنی زامەکەی بەر ئەبێت و ، دوای گەڕانەوەی لەو سریەیە کۆچی دوایی ئەکات .

ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ نەخشەی هەنگاوەکانی ئەم هەڵمەتەی بۆ ئەبوسەلەمەی فەرماندە کێشا تا لە سەری بڕوا . گرنگترین خاڵی ئەم نەخشەیە پاراستنی نهێنیی و ، گورج وگۆڵیی بوو ، تا لە ناخلۆفدا بەسەر هۆزەکانی نەوەی ئەسەددا بدەن ، بە بێ ئەوەی بتوانن خۆیان جەم بکەن .

بە پێی نەخشەکە سریە ئیمانداره‌کە ، بەرەو شوێن و مەنزڵی نەوەی ئەسەد لە ناوچەی نەجد ، کەوتە رێ ، بە تایبەت بەرەو چیایەکیان بە ناوی قەطەن .

ئەبوسەلەمە بە پەلە کەوتە رێ و ، بۆ ئەوەی چوونەکەی ئاشکرا نەبێ ، بە شەودا بەڕێوە ئەچوون و ، بە رۆژدا خۆیان ئەشاردەوە . موسڵمانەکانی بە رێیەكدا ئەبرد کە تا ئێستە کەسی پێدا نەچوو بوو هەتا گەیشتە مەنزڵی نەوەی ئەسەد .

هەڵمەتێکی سەرکەوتوو بوو .. لە ناخلۆفدا دایان بەسەر نەوەی ئەسەددا ، کە هێشتا سوپایان کۆ نەکردبوویەوە و توانای هێرشیان نەبوو ..

نەوەی ئەسەد کە لە بەرەبەیانێکی زوودا دییان وا دەورەی ماڵەکانیان دراوە و ئەوانیش دەستیان بە هیچ ناگات ، ئەوەندەیان بۆ هات ، ماڵ و منداڵ و ، ماوا و مەنزڵیان بەجێ هێشت و ، بەبێ هیچ بەرگرییەك هەڵاتن و ، سوپای موسڵمانان ناوچەکەی گرتە دەست و ، ئەبوسەلەمەی سەرکردە لە پیاوەکانی دوو مەفرەزەی پێك هێنا و ، ناردنی بۆ راونانی خەڵکەکە و ، لە ئەنجامدا دەستیان بەسەر ژمارەیەکی زۆر مەڕ و وشتری نەوەی ئەسەددا گرت و ، مەفرەزەیەکیشیان سێ بەندەی شوانی وشتری ئەوانیان بە دیل گرتن . ئیتر پیاوانی تری هۆزەکە لە شیوەکان و لەسەر لووتکەی چیاکان خۆیان حەشار دا ..

بەم شێوەیە ئەم دەوریەیە کاری سەرشانی خۆی بە جوانیی ئەنجام دا و ، نەوەی ئەسەدیان بە شێوەیەك تەمێ کرد کە هەرگیز بە بیریاندا نەئەهات و ، ئەبوسەلەمەش بە سەرکەوتوویی گەڕایەوە مەدینە .

ئەم هەڵمەتە لە دە رۆژ زیاتری پێ چوو و ، کارێکی چاکیشی کردە سەر دڵ و دەروونی ئەو خەڵکە ، چونکە هۆزی ئەسەد لە ناو هۆزەکاندا زۆر بە هێز بوو و ، موسڵمانەکان توانی بێتیان دەستی لێ بووەشێنن ، کەواتە ئەوانی تر بەرگەی هیچ ناگرن ..[٣]

---

[٣] غزوة الأحزاب لباشميل : ١٩ ـ ٣٠ ، الرحيق المختوم : ٢٩٦ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٢٣٣ ، السيرة النبوية للصلابي : ٥٢٨ ـ ٥٢٩ .

**دووهەم : كوشتنی فەرماندەی هوذەیل ، خالیدی كوڕی سوفیان**

فەرماندەی باڵای موسڵمانان هەواڵێكی پێ گەیشت كە فەرماندەی هۆزی هوذەیل، خالیدی كوڕی سوفیان خەریكە سوپا لە ئەعرابی ناوچەی عورەنە كۆ ئەكاتەوە ، بە نیازی ئەوەی كە هێرش بكاتە سەر مەدینە بۆ تالآن و بڕۆی موسڵمانان ..

پێغەمبەری خوا ﷺ كە ئەم هەواڵەی بیست ، یەكێ لە هاوەڵانی ، كە پاڵەوانی بە جەرگ و شارەزای ناوچەكە عەبدوڵڵای كوڕی ئونەیس بوو ، بانگ كرد و ، ناردی بۆ ئەو ناوچانە تا هەواڵەكە ساغ بكاتەوە . جا ئەگەر هەواڵەكە ڕاست بوو ، فەرماندەی هوذەیل بكوژێ ، چونكە بە كوشتنی ئەو پیاوە كارەكە كۆتایی پێ دێ و ، پێویست ناكات سوپا بۆ ئەو ناوچە دوورانە ڕەوانە بكرێ .

فەرمانی بەسەردا دا كە بە هەر شێوەیەك بووە ئەو پیاوە لە ناو بەرێت . عەبدوڵڵا خالیدی كوڕی سوفیانی نەئەناسیی ، بۆیە داوای لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد تا بۆی وەصف بكا .

فەرمووی : (( إذا رأيته هبته ، وفرقت منه ، وذكرت الشيطان )) . فەرمووی : كە چاوت پێ كەوت لێی ئەترسیی و ، سامت لێ ئەنیشێ و ، شەیتانت بیر ئەكەوێتەوە .

عەبدوڵڵا ئەیوت : من لە هیچ پیاوێك نەئەترسام .

جا عەبدوڵڵا ، بۆ ئەوەی كارەكەی لەو شوێنە دوورەدا سەر بگرێ ، ماوەی خواست كە ئەگەر لای ئەو پیاوە هەندێ شتی ناڕاست بڵێ ، ئەویش ماوەی دا ..

عەبدوڵڵا بە پەلە بەرەو ناوچەی هوذەیل كەوتە ڕێ . كە گەیشتە ئەو شوێنە دیتی وا هەواڵەكە ڕاستە و كابرا خەریكی كۆكردنەوەی سوپایە .. عەبدوڵڵا لەو ناوەدا وەها خۆی ناساند كە لە هۆزی خوزاعەیە .

بەرە بەرە خۆی لە فەرماندەی هوذەیل نزیك خستەوە . كە خالید پرسیی ئەم پیاوە كێیە ؟ وتی : پیاوێكی نەوەی خوزاعەم . بیستوومە بۆ جەنگی موحەممەد خەڵك كۆ ئەكەیتەوە ، منیش هاتووم بكەومە گەڵتان . ئەویش پێی خۆش بوو ..

كە چاوی پێ كەوت ، بەو شێوە بوو كە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی باس كردبوو .

كە كابرا لە عەبدوڵڵا هێمن بوویەوە ، كەوتنە گەڕان و گێڕانەوەی دەنگ و باسی خۆیان ، هەتا ئەوەبوو عەبدوڵڵا كەناری بە كابرا گرت و پاسەوانەكانی لێی دووركەوتنەوە و ، عەبدوڵڵا هەلی بۆ ڕەخسا و بە شمشێر دای گرتەوە و ، یەكسەر

کوشتی . خێرا سەری کابرای لە لاشەی جیا کردەوە و ، بۆ ئەوەی دار و دەستەکەی نەیگرن و نەیدۆزنەوە ، خۆی گەیاندە ئەشکەوتێك و تیایا خۆی حەشار دا .. پیاوەکانی خالید ماوەیەك گەڕان بە دوایا و هیچیان نەدۆزیەوە .. ئیتر عەبدوڵلاّ بەرەو مەدینە ، کەوتە ڕێ .. بە شەودا ئەڕۆیشت و بە ڕۆژ خۆی ئەشاردەوە .

کە گەیشتەوە مەدینە ئەبینێ وا پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوتدایە ، کە چاوی بە عەبدوڵلاّ ئەکەوێ ، ئەفەرموێ : (( أفلح الوجه )) .

ئەویش ئەڵێ : ڕووی خۆت گەشاوە بێ ، ئەی پێغەمبەری خوا !

سەری خالیدی هەذلیی ئەخاتە بەردەستی و هەواڵەکەشی بۆ ئەگێڕێتەوە . شایانی باسە ئەم هەڵمەتەش لە مانگی موحەڕڕەمی ساڵی چوارەمدا بووە و ، عەبدوڵلاّ هەژدە شەوی پێ چووە .

ئەم کارەی عەبدوڵلاّ ئەوەندەی هەڵمەتی سوپایەك بەکەڵك بوو ، چونکە ورەی خەڵکە کۆکراوەکەشی ڕووخاند و ، سەلماندی کە موسڵمانان خاوەنی غیرەتێکن کە هەموو کارێکیان پێ ئەنجام ئەدرێ ..

شایانی باسە کاتێك کە عەبدوڵلاّ سەری دوژمنی خوای خستە بەردەم پێغەمبەری خوا ﷺ ، ئەویش داردەستەکەی خۆی دایێ و فەرمووی : (( هذه آية بيني و بينك يوم القيامة )) . فەرمووی : ئەمە نیشانەی نێوان من و تۆیە لە ڕۆژی قیامەتدا . عەبدوڵلاّ لە کاتی سەرەمەرگیدا وەسیەتی کرد ئەو داردەستە بخەنە ناو کەفنەکەیەوە .

لەم ڕووداوەدا بۆمان دەر ئەکەوێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ نەیئەهێشت دوژمن نەخشە بکێشێ ، ئەم بە زووترین کات و بە کەمترین زیان ئەو مەترسییەی لە موسڵمانان دوور ئەخستەوە .

هەروەها هەڵبژاردنی عەبدوڵلاّی کوڕی ئونەیس بۆ ئەو کارە گەورەیە ئەوپەڕی سەلیقەجوانیی پێغەمبەری خوامان ﷺ بۆ دەر ئەخات ، چونکە ئەو کارە بە هەموو کەسێك ئەنجام نەئەدرا ، بە تایبەتیی مەنزڵی ئەو هۆزانە لە مەنزڵی هۆزەکەی ئەوەوە ( جوهەینە ) نزیك بوو .[٤]

---

[٤] غزوة الأحزاب لباشميل : ٣٠ ـ ٣٣ ، الرحيق المختوم : ٢٩٦ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٢٣٤ ، السيرة النبوية للصلابي : ٥٢٩ ـ ٥٣٢ .

### سێهەم : ڕووداوی ڕەجیع [5]

لە مانگی صەفەری ساڵی چوارەمدا کۆمەڵێك لە هۆزی عەضەل و قارە هاتنە مەدینە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و ، خۆیان بە موسڵمان خستە پێش چاو و وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ! خەڵك لەلای ئێمە موسڵمان بووە ، جا چەند کەسێك لە هاوەڵانت بنێرە لەگەڵمان تا لە دین شارەزامان بکەن و ، قورئانمان پێ بڵێن و ، شەریعەتی ئیسلامان فێر بکەن .

بۆ ئەم داوایە پێغەمبەری خوا ﷺ نۆ هاوەڵی هەڵ بژارد و ، وەك لەلای بوخاریی هاتووە و صەحیحتریشە ، مورثیدی کوڕی ئەبومورثیدی غەنەویی کردە سەرۆکیان ، کە یەکێ لەو هاوەڵانەش عاصیمی کوڕی ثابیتی کوڕی ئەبوئەفلەح بوو ، کە لە تیرهاویشتندا پاڵەوانێکی بەناوبانگ بوو و ، لە ڕۆژی ئوحودیشدا یەکێ لە ئەرکانی جەنگی سوپای ئیسلام بوو و ، بە تیری ئەویش دوان لە هەڵ گرانی ئاڵای قوڕەیش لەو جەنگەدا کوژرا بوون .

لە ریوایەتێکی تردا عاصیم سەرۆکی هاوەڵەکان بووە .

ئەو دەستە قورئان خوێنە لەگەڵ ئەو کۆمەڵە ناپاکەدا بەرەو مەککە کەوتنە رێ ، هەتا گەیشتنە سەر ئاوی ڕەجیع کە ناوچەی هوذەیلە ، لە نێوان عوسفان و مەککەدا .. موسڵمانەکان لەسەر ئاوەکەدا لایان دا و هیچ خەمیان نەبوو ، کەچیی مونافیقەکان ناپاکییان لەگەڵیان کرد و ، یەك لە دوای یەك خۆیان دزییەوە و ، بەرەو رووی هۆزی هوذەیل چوون و، هاواریان لێ کردن تا بێنە سەر موسڵمانەکان . ئەوەبوو دووصەد پیاوێکیان هاتن و هێرشیان کردە سەر موسڵمانەکان .. موسڵمانەکان کە سەیریان کرد چوار دەوریان بە پیاوی شمشێر بەدەست گیراوە . خێرا هەر دە موسڵمانەکە دەستیان دایە شمشێرەکانیان ، تا بەرگریی لە خۆیان بکەن .

جەنگ گەرم بوو .. کە کافران دەست و شمشێری موسڵمانە کەمەکانیان دیی زانییان چاریان ناکەن ، بۆیە کەوتنە فڕو فێڵ و داوای وەستانی جەنگیان کرد و وتیان : ئێمە بەخوا نامانەوێ بتانکوژین ، عەهد و پەیمانی خوا بێت کە نەتان کوژین .

موسڵمانەکان کە ئەمەیان بیست دوو رایان هەبوو .. بەشی زۆریان دەریان بڕیی کە بە هیچ شێوەیەك بڕوا بە بەڵێن و پەیمانی کافر ناکەن .. حەوتیان ئەمە رایان بوو ،

---

[5] ڕەجیع ناوی شوێنێکە لە وڵاتی هوذەیل ، لە نێوان مەککە و عوسفان دا کە هەشت میل لە عوسفانەوە دوورە .

بۆیە هەڵمەتیان دا و دەستیان بە کوشتاری کافران کرد .. بەڵام کافران یەکجار زۆر بوون .. هێرشیان کردە سەر ئەو بەڕێزە پاك و خاوێنانە و هەموویان شەهید کردن .

بەڵام سیانەکەی تر کە دییان وا بەرگریی ئەوان کەڵکێکی نیە و هەر ئەیان کوژن ، بڕوایان بە بەڵێنەکەیان کرد و ، خۆیان بە دەستەوە دا ..

هەر کە ئەمان ـ کە زەیدی کوڕی دەثینە و ، [٦] خوبەیبی کوڕی عەدیی و ، [٧] عەبدوڵڵای کوڕی طاریق بوون ـ [٨] خۆیان بە دەستەوە دا ، ئەو ناپاکانە قۆڵ بەستیان کردن و ، بە پەلە بەرەو مەککە دایاننە بەر ، تا لەوێ بیانفرۆشن بە کافرانی مەککە ، کە دەیانزانیی قورەیش یەکجار شادمان ئەبن هاوەڵانیان دەست بکەون .

کە عەبدوڵڵای کوڕی طاریق ناپاکیی ئەو بتپەرستانەی دیی خێرا پەشیمانی خۆ بە دەستەوەدانەکەی بوو . کە گەیشتنە ظەهران ، لەسەر ڕێی مەککە ، عەبدوڵڵا دەستی خۆی داماڵیی و ، شمشێرێکی فڕاند و دەستی دایە جەنگ . بت پەرستەکان نەیانوێرا بچنە مەیدانی شەڕە شمشێری عەبدوڵڵاوە ، ناچار هەر لە دوورەوە بەردیان تێ ئەگرت ، هەتا شەهیدیان کرد و ، گیانی سپارد خوا لێی ڕازیی بێ ..

پاشان هوذەیل خوبەیب و زەیدیان بردن بۆ مەککە .. جا لەبەر ئەوەی مەککە و مەدینە ناکۆك بوون ، سەردارانی قورەیش ئەم کارەی هوذەیلیان زۆر بە دڵ بوو و ، کەوتنە سەر وخوار لەگەڵ هوذەیلدا تا لەسەر نرخەکەیان ڕێك بکەون و ، بە کوشتنیان تۆڵەی کوژراوانیان وەربگرنەوە .

سەرەنجام قورەیش دیل بە دیل لەگەڵ هوذەیلدا ڕێك کەوتن و ، دوو دیلی هوذەیلیان ئازاد کرد ، کە لە جەنگێکی لەوەو پێشدا دەست قورەیش کەوتبوون و ، هوذەیلیش خوبەیب و زەیدیان دایە دەست قورەیش .

جا ئیبن سەعد باسی ئەوەی کردووە کە صەفوانی کوڕی ئومەییەی جومەحیی زەیدی کڕیوە ، تا لە بریی ئومەییەی کوڕی خەلەفی باوکیدا ، کە موسڵمانەکان لە بەدردا کوشتبوویان ، بیکوژێتەوە و ، حوجەیری کوڕی ئەبوئیهابیش خوبەیبی کڕیی و

---

[٦] زەیدی کوڕی دەثینەی کوڕی موعاویەی بەیاضیی ئەنصاریی ، یەکێکە لەوانەی کە لە مەدینەدا زوو بە زوو موسڵمان بووە و ، بەشداریی بەدر و ئوحودی کردووە .

[٧] خوبەیبی کوڕی عەدیی کوڕی مالیکی ئەوسیی ئەنصارییە .. ئەمیش زوو بە زوو موسڵمان بووە و ، بەشداریی بەدر و ئوحودی کردووە .

[٨] عەبدوڵڵای کوڕی طاریقی کوڕی عەمری کوڕی مالیکی بەلەویی ، کە مووسای کوڕی عوقبە لە ئەهلی بەدری لە قەڵەم داوە .

دایە دەست عوقبەی کوڕی حاریثی خوشکەزای تا لە بریی باوکیدا ، کە موسڵمانەکان کوشتبوویان ، بی‌کوژێتەوە .
ئەم رووداوە لە مانگەکانی حەرامدا رووی دا ، بۆیە دانیشتوانی مەککە جێ بەجێ کردنی لە سێدارەدانی ئەم دوو هاوەڵەیان دوا خست ، تا ئەو مانگانە بەسەر بچن و پاشان بە شێوەیەکی دڕندانە شەهیدیان کردن .
لەو ماوەیەدا خوبەیب لە ماڵێکی نەوەی حاریثدا بەند کرابوو .. کە ماوەی شەهیدکردنەکەی نزیك بوویەوە لە کەنیزەکێکی ماڵەکە گوێزانێکی وەرگرت تا خۆی پاك بکاتەوە ، ئیتر کەنیزەکەکە بە شتی ترەوە پەشۆکا و منداڵێکی ساوای ماڵی ئاغاکەی لە یاد چوو و ، منداڵەکەش رۆیشت بۆ لای خوبەیب و ، ئەویش منداڵەکەی لەسەر رانی خۆی دانا . کە کەنیزەکەکە ئەوەی دیی داچڵەکا و ، بە ترس و لەرزێکەوە لە دڵی خۆیدا وتی : بە خوا کابرا بە کوشتنی منداڵەکە تۆڵەی خۆی سەند . خوبەیب هەستی بە ترس و پەشۆکانی ئافرەتەکە و ئەوەش کە بە دڵی دا هات کرد ، بۆیە پێی وت :
ئەترسیت بی‌کوژم ؟! إن شاء الله شتی وەها ناکەم !!
کەنیزەکەکە دوای ئەوەی کە موسڵمان بوو بوو باسی ئەکرد : هەرگیز دیلی چاکی وەك خوبەیبم نەدیوە .. چاوم لێ بووە کە لە هێشووە ترێی خواردووە و ، ئەو رۆژەش لە مەککەدا هیچ میوەیەك نەبووە و ، کۆت و زنجیریش لە دەست و پێیدا بووە و ، ئەوەش رزقێك بوو کە خوا پێی بەخشیی بوو !!
قورەیش هەروەك لە مانگە حەرامەکاندا خوێنیان نەئەرێژا ، هەروەها لە ناوچەی حەرەمی مەککییشدا خوێنیان نەئەرێژا .. بۆیە هەردوو هاوەڵەکەیان لە حەرەم بردنە دەرەوە و ، لە ناوچەی تەنعیم شەهیدیان کردن .
کاتێك کە هەردوو دیلەکە بەرەو ئەو شوێنە ئەبران ، زۆرێك لە دانیشتوانی مەککە لە ژن و پیاو و منداڵ و بەندە ، هەتا ئەبوسوفیانی سەرداری مەککە ، دوایان کەوتبوون . بۆیە لەم هەڵوێستەدا پێویست بوو هەردوو هاوەڵە مەزنەکە ، ئەوپەڕی ئازایەتیی و چاونەترسیی بنوێنن ، تا ئاستی سەربازی موسڵمان بە بەرز و بڵند بێتە بەرچاوی خەڵکێك کە دوژمنی دینەکەیانن . خوا پاداشتیان بداتەوە ، هەردووکیان نموونەی پاڵەوانی بەجەرگ بوون ..

ئەوەبوو صەفوان زەیدی دایە دەست بەندەیەکی کە ناوی ( نسطاس ) بوو و فەرمانی بەسەردا دا کە بیکوژێ .

کاتێك کە زەیدی کوڕی دەثینە هێنرایە پێشەوە تا بیکوژن ، بۆ تاقیی کردنەوەی ئەبوسوفیان لێی پرسیی : ئەی زەید ، بۆ خوا لێت ئەپرسم ، ئایا پێت خۆش ئەبوو ئێستا موحەممەد لە جێی تۆدا بوایە ، بدرایە لە ملی و ، تۆش لە ناو ماڵ و منداڵی خۆتدا بوویتایە ؟

زەید خوا لێی ڕازیی بێ وەڵامی دایەوە : نا ، بەخوا ، پێم خۆش نیە ئێستە موحەممەد لەو شوێنەی خۆیدا دڕکێکی پیا بچێ و ئازاری بدات و ، منیش لە ناو کەسوکاری خۆمدا دانیشتبم .

ئەبوسوفیان وتی : نەمدیوە هیچ کەس کەسێکی خۆش بوێ وەك هاوەڵانی موحەممەد موحەممەدیان خۆش ئەوێ .

بەر لەوەی نسطاس بێتە پێشەوە بۆ شەهیدکردنی زەید ، بتپەرستەکان دەستیان کرد بە ئازاردانی .. بەستیانەوە و دەستیان کرد بە تیرهاویشتن بۆی ، بەڵام لە شوێنی وەهایان نەئەدا کە بیکوژێ ، بەو هیوایەی بەڵکو پەشیمان ببێتەوە و لە دین وەربگەڕێ ، کەچیی تا ئەهات ئیمانی دامەزراوتر ئەبوو و زیاتر خۆی تەسلیمی خوای گەورە ئەکرد .

بەڵام خوبەیبی شەهید ، قوڕەیش ئاهەنگێکی یەکجار گەورەیان بۆ شەهید کردنی ساز دا .. خەڵکێکی زۆر هاتبووە تەماشای پارچە پارچەکردنی لاشەی مرۆڤی ئیماندار .. پێش ئەوەی بیکوژن بە سێدارەوە هەڵیان واسیی .. دەستیان کرد بە هەڕەشەکردن لێی بەڵکو واز لە دینەکەی بهێنێ .. بەڵێنیان پێ دا کە ئەگەر لە دینی موحەممەد پاشگەز بێتەوە ، ئازادی بکەن و لە کوشتن ڕزگاری ببێ، جا کە وازی نەئەهێنا بە ڕم لێیان ئەدا ..

ئەویش خوا لێی ڕازیی بێ وەك ئیمانداڕێکی ڕاستگۆ کە شەهیدبوونی بە لاوە شیرین بێ ئەیوت : کوشتنی من لە پێناوی خوادا کارێکی یەکجار کەمە ..

شایانی باسە کە خوبەیب پێش هەڵواسینی داوای لە کافرانی قوڕەیش کرد کە مۆڵەتی بدەن دوو ڕەکعەت نوێژ بۆ خوا بەجێ بهێنێ . ئەوانیش ڕێگەیان دا .. ئەویش خوا لێی ڕازیی بێ دوو ڕەکعەتی بە جوانیی و بە خشوعەوە بۆ خوا بەجێ هێنا ، وەك بڵێ : خوای پەروەردگارم ! وا هاتم بۆ خزمەتت .. خوایە ! هەر تۆم لێ

رازیی بێ ئیتر هیچی ترم ناوێ .. خوایە ! بەوپەڕی زەلیلی‌یـەوە لـە دەرگانـەی تـۆدا وەستاوم نائومێدم نەکەی .. لە رەحمەتی خۆت بێبەشم نەکەی .. خوایە !

کە لێ بوویەوە ، رووی لە موشریکەکان کرد و وتی : بەخوا لەبەر ئەوە نەبوایە کـە ئەترسم وا بزانن لە ترسی مردن درێژە بە نوێژەکەم ئەدەم نوێژی زۆرم بە جێ ئەهێنا ..

ئیبن ئیسحاق وتوویە : خوبەیبی کوڕی عەدیی یەکەم کەسێکە کـە بـەجێ‌هێنانی ئەو دوو رەکعەتەی لە کاتی کوشتن‌دا کردە سوننەت .

کاتێك کە خوبەیب بەسەر سێدارەکەوە هەڵواسرا بوو لە خـوای گـەورە پاڕایـەوە و وتی : خوایە ! هیچ کەس لێرە نیە هـەتا سـەلامم بـە پێغەمبەرەکـەت رابگەیـەنێ ، خۆت سەلامی منی پێ رابگەیەنە و ، پێیشی رابگەیەنە کە چیمان پێ ئەکرێ ..

خوای گەورە بە سۆز و شەفەقەتی فراوانی دوعای شەهیدی سـتەم لێکـراوی گـیرا کرد و ، پێغەمبەری دەربارەی خوبەیب ئاگادار کرد کە چیی پێ ئەکرێ ..

ئوسامە خوا لێی رازیی بێ گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ـ لەو رۆژەدا کـە خوبەیب لە سێدارە درا بوو ـ لە ناو هاوەڵەکانی‌دا دانیشتبوو و ، ئەو حاڵەتەی کە لە کاتی وەحیی‌دا بەسەری‌دا ئەهات ، بەسەری هات و ، گوێمان لێ بوو ئەی‌فەرموو : (( وعليه السلام ورحمة الله وبركاته )) . پاشان فەرمووی : (( هذا جبريل يقرئني السلام ، خبيب قتلته قريش )) . دوای وەڵام‌دانـەوەی سـەلامەکە فـەرمووی : ئـەوە جیبریلـە هاتووە و سەلامم لێ ئەکات . قوڕەیش خوبەیبیان کوشتووە .

پاشان خوبەیب لە خوا پاڕایەوە تا قوڕەیش لـە نـاو بـەرێت و ئـەی وت : (( أللـهم أحصهم عدداً ، واقتلهم بدداً ، ولا تغادر منهم أحداً )) ..

لەو رۆژەدا ئەبوسوفیان موعاویەی کوڕیشـی ، کـە هێشـتا منـداڵ بـوو ، لەگـەڵ خۆی‌دا هێنا بوو بۆ ناوچەی ( تەنعیم ) ، کە خوبەیب دوعای لە قوڕەیش کرد ، خێـرا ئەبوسوفیان موعاویەی کوڕی لەسەر زەوی‌یەکە راکشاند ، چونکە بڕوایان وەها بوو کە هەر کەسێ دوعای لێ بکرێ ، ئەگەر پاڵ بکەوێ ئەو دوعایە کاری تێ ناکا .

پاشان قوڕەیش چل گەنجیان بانگ کردن ، لەوانـەی باوکیـان لـە رۆژی بـەدردا بـە دەستی موسڵمانەکان کوژرا بوون و ، هەریەکەیان رمێکیان دایە دەستی و پێیان وتن: ئەمە باوکی ئێوەی کوشتووە . ئەوانیش هەر یەکە لە ئاستی خۆیـەوە بـە رم لێیـان ئەدا ، هەتا لاشەیان شیتاڵ شیتاڵ کرد ، خوای گەورە لێی رازیی بێ .

لە ریوایەتێکی تردا ئەڵێن کە عوقبەی کوڕی حاریث خوبەیبی کوشتووە ، لە کاتێکدا کە منداڵێکی بچووک بووە ، بەوەی کە پیاوێکی قوڕەیشیی حەربەی ئەخستە دەستی عوقبەوە و ، کابرا بە دەستی خۆی دەستی عوقبەی ئەگرت و ئەیدا لە لاشەی خوبەیب تا کوشتی . دوایی کە عوقبە موسڵمان بوو بوو ، ئەی وت : بەخوا من خوبەیبم نەکوشتووە ، چونکە من لەوە بچوکتر بووم .. واتە : بە هێزی دەستی من نەکوژراوە ، با حەربەکەش لە دەستی مندا بووبێ .

ئەم شەهیدکردنەی خوبەیب بەرهەمی دا .. خۆی بە سەری بەرزەوە بەرەو بەهەشت کەوتە رێ .. کافران بە چاوی خۆیان غیرەتی ئیماندارییان دیی .. هەریەکە لە دڵی خۆیدا پرسیاری ئەکرد : ئایا دینی موحەممەد ئەوەندە گرنگە تا خەڵکیی ئاوەها خۆیان بە قوربانی بکەن ؟!

لەو رۆژەوە کە ئیسلام هاتووە هەزاران ئیماندار بەوپەڕی فەخر و شانازییەوە خۆیان بە قوربانی دینە پاکەکەی پێغەمبەری خوا کردووە .. ئەوانە لە چینی زۆر بەرێزی مرۆڤەکان بوون .. چونکە نرخی طەلایان ئەزانیی و ، بە فەخرەوە باوەشیان بۆ ئەگرتەوە !!

بەرهەمێکی تری شەهیدکردنی خوبەیب هۆشیاربوونەوەی سەعیدی کوڕی عامیری جومەحیی [٩] بوو .. کە دوایی بووە کارمەندێکی زاهیدی خواناسی بەناوبانگ بۆ ئیسلام .

سەعید یەکێ بوو لەوانەی کە کەوتبوونە دوای خوبەیبی دیل کراو و رەوانەی تەنعیمیان ئەکرد .. واتە هێشتا موسڵمان نەبوو بوو .. ئامادە بوو چۆن قوڕەیش بەبێ رەحمانە لاوچاکی ئیماندارییان شەهید کرد ، بۆیە هەرچیی لەوە و دوا ، دوای موسڵمان بوونی ، خوبەیبی ئەهاتەوە یاد بێهۆش ئەکەوت .

ئیبن هیشام ئەڵێت : عومەری کوڕی خەططاب سەعیدی کوڕی عامیری کردبووە کاربەدەستی هەندێ ناوچەی شام . جارێکیان لەلای عومەر باسیان کرد کە جار جار

---

[٩] سەعیدی کوڕی عامیری کوڕی حەذیمی کوڕی سەلامانی قوڕەیشیی جومەحیی یەکێ لە هاوەڵە مەزن و پایەدارەکان بووە . درەنگ موسڵمان بووە .. موسڵمان بوونی پێش غەزای خەیبەر بووە و ، لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ بەشداریی خەیبەر و لەوە و دوای کردووە . یەکێ بووە لە زاهید و پیاوچاکە ناودارەکانی هاوەڵان ، بۆیە خەلیفە عومەر زۆری خۆش ئەویست و کردییە والیی ناوچەیەکی شام . لە ساڵی بیستەمی کۆچییدا کۆچی دوایی کردووە .

لە ئەنجوومەنی ئەمیریی‌دا ئەبووریتەوە . عومەریش لە هاتنێکی‌دا بۆ لای سەعید لێی پرسیی و پێی‌وت : ئەوە چی‌یە تووشت ئەبێت ؟

وتی : بەخوا ئەی ئەمیری ئیمان‌داران ! هیچ نەخۆشی‌یەکم نیە ، بەلاّم منیش یەکێ بووم لەوانەی کە ئامادەی کوشتنی خوبەیبی کوڕی عەدیی بوون و ، گوێم لە دوعاکردنەکەی بوو . دە بەخوا هەرچیی جارێ لە ئەنجومەن‌دا بم و بیرم بکەوێتەوە ئەبووریمەوە .

بەم هەلّوێستە سەعید ئەوەندەی تر بەلای خەلیفەوە خۆشەویست بوو .

خوبەیب خوا لێی رازیی بێ شیعرێکی گەرم و گوڕیی ئیمانیی لەو کاتە ناسکەدا دا بە گوێی ئامادەبووان‌دا تا بزانن سەربازی ئیمان لە مردن یەکجار بێ‌باکە و هیچ هێزێکیش کۆلّی پێ نادا و ، لەسەر خوا هەموو شتێ قبوولّ ئەکات کە ئەی وت :

لقد أجمعَ الأحزابُ حولي وألّبوا قبائلهم واستجمعوا كلَّ مجمع
وقد قرّبوا أبناءهم ونساءهم وقربت من جذع طويل ممنّع
إلى الله أشكو غربتي بعد كربتي وما جمع الأحزاب لي عند مضجعي
فذا العرش صَبِّرْني على ما يراد بي فقد بضعوا لحمي وقد ياسَ مطمعي
وقد خيروني الكفرَ والموتُ دونَهُ فقد ذرَّفَتْ عيناايَ من غير مدمع
ولستُ أبالي حين أقتلُ مسلماً على أي شقٍّ كان في الله مضجعي
وذلك في ذات الإله ، وإن يشأْ يبارك على أوصالِ شِلْوٍ مُمَزَّع

پاشان دایان لە سێ‌دارە و پاسەوانیان بۆ لاشەکەی دانا تا هیچ کەس دای‌نەگرێ و نەنێژرێت .

ئیمام ئەحمەد ( لە موسنەددا : ٤ / ١٣٩ ) و طبەرانیی لە عەمری کوڕی ئومەییەی ضەمریی‌یەوە خوا لێی رازیی بێ تەخریجیان کردووە کە پێغەمبەر ﷺ بە تاقی تەنیا ناردوویە بۆ هەوالّزانینی قورەیش . ئەویش ئەلّێت : هاتمە لای سێدارەکەی خوبەیب خوا لێی رازیی بێ و ئەش‌ترسام خەلّك بە چاوەوە بێت ، سەرکەوتم پیایا و خوبەیبم لێ کردەوە و ، کەوتە زەویی . کەمێ کەنارم گرت بێ‌تەوەی دوور بکەومەوە ، پاشان کە ئاوڕم دایەوە خوبەیبم نەدیی ، هەروەك زەویی قووتی دابێ . ئیتر هەتا ئێستاش شوێنەواری خوبەیب نەبینرا ..

لە پێشەوە باسی شەهیدبوونی عاصیمی کوڕی ثابیتمان کرد ، کە ئەویش یەکێ بوو لەو حەوت هاوەلّەی کە بڕوایان بە بەلّێن و پەیمانی کافران نەبوو و خۆیان بە

دەستەوە نەدا .. جا هوذەیل ویستیان سەری لە لاشەی جیا بکەنەوە و ، بیبەن بیفرۆشن بە سولافەی کچی سەعد ، کە هەردوو کوڕەکەی ئەوی لە ئوحوددا کوشتبوون . ئەو ئافرەتە نەذری کردبوو کە ئەگەر سەری عاصیمی دەست بکەوێت لە کاسەی سەریدا عەرەق بخواتەوە ! بەڵام خوای گەورە ویستی وەها بوو لاشەکەی بپارێزێت ، ئەوەبوو کۆمەڵە زەردەواڵەیەکی بۆ سەر لاشەکەی نارد کە وەك پەڵە هەور وەها بوون و پارێزگارییان لێ ئەکرد . هەروەها قورەیشیش هەوڵیان دا دەست لە لاشەی بووەشێنن ، بەڵام لەبەر ئەو زەردەواڵانە نەیانتوانیی ، بۆیە وتیان : وازی لێ بهێنن تا شەو بەسەردا دێت و زەردەواڵە نامێنن . کە ئێوارە هاتنەوە بۆ شوێنەکەی نەیاندۆزییەوە ، بەڵکو خوای گەورە لە شیوەکەدا مەحووی کردبۆوە .

عاصیم بەڵێنی بە خوا دابوو کە لەبەر پیسیی کافر هەرگیز نەهێڵێ لاشەی کافر بەر لاشەی بکەوێ .

عومەریش کە بیستی زەردەواڵە ماوەیان نەداوە کەس دەست بۆ لاشەکەی بەرێ ، فەرمووی : خوای گەورە بەندەی ئیمانداری خۆی ئەپارێزێ ، چونکە عاصیم نەذری کردبوو کە هەرگیز لە ژیانیدا لاشەی کافر بەر لاشەی نەکەوێ ، وا خوای گەورە لە دوای مردنیشی لەوە پاراستی .

بە شەهیدبوونی ئەم دەستە خواناسە جوولەکە و مونافیقانی مەدینە کەوتنە دەربڕینی خۆشیی و دەست بەسەر دڵدا هێنان و ، پێیان ئەوتن : ماڵ کاولیی بۆ ئەو خەڵەتاوانە کە تیا چوون ، نە ئەوەبوو لە ناو کەسوکاریاندا بۆ خۆیان دابنیشن و ، نە ئەوەش بوو کاری گەورەکەیان رابپەڕێنن .

لە وەڵامی ئەم ناپاکانەدا خوای گەورە قورئانی ناردە خوارەوە :

﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُعْجِبُكَ قَوْلُهُۥ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَيُشْهِدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا فِى قَلْبِهِۦ وَهُوَ أَلَدُّ ٱلْخِصَامِ ﴿٢٠٤﴾ وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ فِى ٱلْأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا وَيُهْلِكَ ٱلْحَرْثَ وَٱلنَّسْلَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْفَسَادَ ﴾ ( البقرة : ٢٠٤ - ٢٠٥ ) .[10]

---

[10] غزوة الأحزاب : ٤٢ ـ ٥٢ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٢٣٥ ـ ٢٣٨ ، الرحيق المختوم : ٢٩٦ ـ ٢٩٨، السيرة النبوية للندوي : ٢٤٢ ـ ٢٤٣ ، شرح حياة الصحابة : ١ / ٧٩٧ ـ ٨٠٦ ، ٤ / ٤٢٢ ـ ٤٢٥ ، ٤٩٤ـ٤٩٥ ، السيرة النبوية للصلابي : ٥٣٢ ـ ٥٣٦ .

**چوارەم : ڕووداوی ( بئر معونة )**

هەر لە هەمان مانگدا ، لە مانگی صەفەری ساڵی چوارەمدا ، ڕووداوێکی تری دڵتەزێن هاتە بەردەم موسڵمانەکان ، کە هێشتا بەسەر ڕووداوی ئوحوددا چل و پێنج شەویش تێ نەپەڕیی بوون . ئەم ڕووداوە ئەوەندەی ئوحود زیانی بە موسڵمانان گەیاند .. ئەوەبوو لە هاوەڵە قورئان خوێنە شارەزاکان حەفتا پیاوی چاکیان لە وڵاتی نەجددا بە ناڕەوا شەهید کران .. باسەکەش بەم شێوە بووە :

یەکێ لە پیاوە ناودارەکانی نەوەی عامیر ، کە سوارچاکێکی بەناوبانگ ئەبێت بە ناوی ئەبوبەراء عامیری کوڕی مالیکی کوڕی جەعفەر کە نازناوەکەشی ( ملاعب الأسنة ) بووە ،[11] دێتە مەدینە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و ، ئەویش باسی ئیسلامی بۆ ئەکات ، بەڵام عامیر موسڵمان نابێت و ، دووریش ناکەوێتەوە هەتا داوا لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەکا کە کۆمەڵێك لە هاوەڵانی بنێرێ بۆ ناوچەی نەجد تا خەڵکەکە بۆ سەر ئیسلام بانگ بکەن .

پێغەمبەری خوا ﷺ کارەکەی بە دڵ بوو ، بەڵام ئەوەی دەربڕیی کە ترسی ئەوەی هەیە دانیشتوانی نەجد دەست لە هاوەڵانی بوەشێنن ، کە فەرمووی : (( إني أخاف عليهم أهل نجد )) .

( ملاعب الأسنة ) دەری بڕیی کە ئەو هاوەڵانە لە پەنای ئەودا ئەبن و با لە ناوچەی نەجددا خەڵك بانگ بکەن بۆ سەر دینەکەی . بۆ ئەمە پێغەمبەری خوا ﷺ کۆمەڵێك هاوەڵی گەنجی هەڵ بژارد ، کە زۆربەیان لە ئەنصار بوون و ، موندیری کوڕی عەمری ئەنصاریی ـ کە یەکێ بوو لە دوانزە نەقیبەکەی پەیمانی عەقەبەی دووهەم ـ کردە سەرۆکیان .

شایانی باسە کە ئەم حەفتا هاوەڵە لە گەنجە خوێن گەرمە قورئان خوێنەکان بوون ، کە لەبەر زۆر شارەزاییان لە دین ناویان نابوون (( القراء )) ، سەرەڕای ئازایەتیی و چاونەترسییان لە جەنگدا . ئەمانە بە ڕۆژدا ئەچوون داریان ئەهێنا و بە پارەی دارەکان خۆراکیان بۆ ئەهلی صوففە ئەکڕیی ، کە هەژارەکانی مزگەوت بوون و ، خەریکی دیراسەی قورئان ئەبوون و ، بە شەویش خەریکی شەونوێژ و پاڕانەوە بوون .

---

[11] ئەبوبەراء ، عامیری کوڕی مالیکی عامیریی یەکێ بووە لە سوارچاکە بەناوبانگەکانی عەرەب . لەوە ئەچێ کە موسڵمان بووبێ و ، هەندێکیش لە مێژوونووسان پلەی هاوەڵێتییان بۆ تۆمار کردووە . کاتێك کە ئەبیستێ وا عامیری کوڕی طوفەیلی برازای ناپاکیی کردووە و دەستی لە موسڵمانەکان وەشاندووە و ، پەیمانەکەی ئەوی شکاندووە ، لەبەر ئەوەی موسڵمانەکان لە پەنای ئەودا بوون ، لە مەراقی ئەم ڕووداوەدا ئەمرێ .

لە باسەکانی پێشەوەدا باسی دامەزراویی و ئازایەتیی حاریثی کوڕی صیمەمان کرد ، کە چەندە ئازا و بەجەرگ بوو لە پاراستنی پێغەمبەری خوادا ﷺ لە رۆژی ئوحوددا و لەو کاتەدا کە موسڵمانەکان شپرزە بووبوون . جا ئەندامانی ئەم کۆمەڵە قورئان خوێنە یەکێکیان ئەو حاریثە بوو و ئەوانی تریش هەر هاوشانی ئەو بوون ، وەك حەرامی کوڕی میلحان و ، عامیری کوڕی فوهەیرەی بەندەی ئازادکراوی ئەبوبەکری صددیق و ، [١٢] عوروەی کوڕی ئەسمائی کوڕی صەلت و ، نافیعی کوڕی بودەیلی کوڕی وەرقاء .

ئەم کۆمەڵە رۆشنبیرە لەگەڵ عامیری کوڕی مالیکی سەرداری نەوەی عامیردا ، بەبێ خۆ ئامادەکردن بۆ جەنگ ، مەدینەیان بەجێ هێشت و روویان لە ناوچەی نەجد نا ، بە نیازی ئەوەی کە دانیشتوان بانگ بکەن بۆ سەر ئیسلام و ، سەردارێکی خاوەن پلەوپایەش مۆڵەتی داون ..

رۆیشتن هەتا گەیشتنە ( بئر معونة ) کە ئەکەوێتە نێوان نەوەی عامیر و ناوچە بەردەڵانەکەی نەوەی سولەیم . لەوێ لایان دا و یەکێ لە موسڵمانەکانیان هەڵ بژارد ، کە حەرامی کوڕی میلحانی برای ئوم سولەیم بوو ، تا نامەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەرێت بۆ عامیری کوڕی طوفەیل ، کە برازای عامیری کوڕی مالیك ( ملاعب الأسنة ) بوو ..

کوڕی طوفەیل پیاوێکی دڕوندەی داخ لە دڵ بوو بەرامبەر بە ئیسلام و موسڵمانان، جا کە نامەکەی بۆ برد ، تەماشای نەکرد و ، فەرمانی دا بە یەکێ لە پیاوەکانی لە دواوە رمێکی ئاراستەی ناوشانی حەرام کرد و رمەکە لەسەر سنگی دەرچوو و ، خێرا وتی : ألله أکبر ! بە پەروەردگاری کەعبە سەرکەوتم و بردمەوە !!

ئەوەی کە حەرامی کوڕی میلحانی کوشت ناوی جەبباری کوڕی سولما بوو ، کە ئەو وتەیەی لە دەمی حەرام بیست ، سەری سوڕ ئەما ، ئەم پیاوە چیی ئەڵێ ؟

[١٢] بوخاریی لە عوروەوە تەخریجی کردووە ( ٢ / ٥٨٧ ) کە وتوویە : کاتێك کە هاوەڵانی ( بئر معونة ) شەهید کران و عەمری کوڕی ئومەییەی ضەمریی بە دیل گیرا ، عامیری کوڕی طوفەیل ، دەستی راکێشا بۆ لای کوژراوێك و وتی : ئەمە کێیە ؟ عەمری کوڕی ئومەییە پێی وت : ئەوە عامیری کوڕی فوهەیرەیە . خوانەناسەکە وتی : دوای کوژرانی چاوم لێی بوو بەرز کرایەوە بۆ ئاسمان ، بە رادەیەك کە لە نێوان ئەو و زەوییدا ئاسمانم ئەبینی ، پاشان دانرایەوە سەر زەویی .

هەروەها لە ( مغازی ) مووسای کوڕی عوقبەدا لە عوروەوە هاتووە کە وتوویە : جەستەی عامیری کوڕی فوهەیرە نەدۆزرایەوە و ، وای بۆ ئەچن کە مەلائیکە ناشتبێتیان .

رمەکە لەسەر سنگیەوە دەرچووە و ، ئەشڵێ : بە پەروەردگاری کەعبە ، سەرکەوتم و بردمەوە . چیی بردۆتەوە ؟ ئەی من کابرام نەکوشتووە ؟ دوایی کە پرسیار ئەکا لە واتای ئەو وتەیەی ، پێی ئەڵێن : ئەوە مەبەستی ئەوە بووە کە بە پلەی شەهیدی گەیشتووە . جەبباریش ئەڵێت : دە بەخوا سەرکەوتووە . ئەمە ئەبێتە هۆی موسڵمان بوونی جەببار .

پاشان عامیری کوڕی طوفەیل هاواری کردە هۆزەکانی نەوەی عامیر تا بە هەموویانەوە هەڵمەت بەرنە سەر هاوەڵەکانی تر و ، تاقیان ببڕنەوە . بەڵام ئەو هۆزانە هەر چەندە ئیمانیان نەهێنا بوو و ، لەسەر شیرك بوون ، بە گوێی ئەو ستەم کارەیان نەکرد و ، پیٚ‌یان راگەیاند کە ئەوپەڕی شوورەیی‌یە هەڵمەت ببرێتە سەر کۆمەڵێکی بیٚ‌وەی ، لە کاتێك‌دا کە لە پەنای سەردارێکی خۆشیان‌دا هاتوونەتە ناوچەکە و ، هیچ خراپەیەکیشیان لیٚ نەوەشاوەتەوە .

کە عامیری کوڕی طوفەیل دەستی لە نەوەی عامیر شۆرد ، هاواری کردە هۆزەکانی نەوەی سولەیم : رەعل و ، ذەکوان و ، عوصەییە تا بێنە سەریان . ئەوان نامەردانە دەستیان دایە شمشێر و هەزار سوارێك جەم بوون و لە ناکاودا هەڵمەتیان بردە سەر نوێنەرە موسڵمانەکان کە لەلای کەل و پەلەکەیان بەبیٚ خەم دانیشتبوون و ، چاوەڕوانی نێراوەکەیان ئەکرد کە بگەڕێتەوە لایان . ئیتر بە بیریانا نەئەهات کە ئەو هۆزانە بە چەکەوە هەڵمەت بدەنە سەر کەسانێکی بیٚ‌وەی ، بە مەرجیٚ بە پەنا هاتبن .

لە ناکاودا ئەسپ‌سوارانی عامیری کوڕی طوفەیل ، بە کۆمەکیی و پشت گیریی هۆزەکانی نەوەی سولەیم ، چوار دەوری موسڵمانە زانست دۆستەکانیان گرت ..

موسڵمانەکان کە ئەمەیان دیی ، پیٚ‌یان وتن : بەخوا مەبەستمان نەبووە بێینە لای ئێوە ، ئێمە بۆ کاری پێغەمبەر ﷺ تێپەڕ ئەکەین . کە ئەم قسانەیان لیٚ نەبیستن و، موسڵمانەکان ناچار بوون بۆ بەرگریی لە خۆیان دەست بدەنە شمشێرەکانیان و، کوشتارێکی مەردانەیان کرد .. بەڵام زۆریی پیاو و تفاقی دوژمن لەوەدا نەبوو کە بەو موسڵمانە کەمانە چار بکریٚ . بۆیە یەك لە دوای یەك شەهید بوون و ، ئەو کۆمەڵە پاکە تەنها یەکێکیان دەرچوو کە ئەویش کەعبی کوڕی زەید [١٣] بوو و ، لە ناو

---

[١٣] کەعبی کوڕی زەیدی کوڕی قەیسی کوڕی مالیکی نەججاریی ئەنصاریی ، بەشداریی جەنگی بەدری کردووە . لە جەنگی خەندەق دا شەهید بووە ، بە هۆی تیرێکەوە کە ضیراری کوڕی خەططابی فیهریی تێی گرت .

کوژراوەکان‌دا وەهایان زانیی بوو کوژراوە ، بەڵام گیانێکی تیا مابوو . ئەو دەرباز بوو ، کەچیی لە خەندەق‌دا شەهید بوو ..

بەڵام دووان لەو حەفتایە ، کە عەمری کوڕی ئومەییەی ضەمریی [١٤] و ، مونذیری کوڕی عوقبەی کوڕی عامیر بوون ، لەو کاتەدا لەوێ نەبوون و بەلای ئاژەڵی موسڵمانەکانەوە بوون و دوور کەوتبوونەوە و ، ئاگایان لێ نەبوو موسڵمانەکان چی‌یان بەسەر هاتووە ، تا کە سەرنجی ئاسمانیان گرت ئەبینن باڵندە بەسەر شوێنی بارخستنەکەیانەوە ئەسووڕێنەوە . وتیان : بەخوا بوونی ئەو باڵندانە شتێکی تیایە .

کە گەڕانەوە ئەبینن وا موسڵمانەکان لە ناو گۆمی خوێن‌دان و ، ئەو ئەسپ سوارانەش کە موسڵمانەکانیان کوشتوون ، لەوێ وەستاون ، مونذیر بە عەمر ئەڵێت : چیی بە چاك ئەزانیت ؟ ئەڵێت : وای‌ئەبینم خۆمان بگەیەنینەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و هەواڵەکەی پێ بگەیەنین . مونذیر وتی: بەڵام من پێم خۆش نیە لە شوێنێك‌دا کە مونذیری کوڕی عەمری ـ واتە سەرۆکی کۆمەڵە موسڵمانەکە ـ تێدا کوژرا بێ خۆم بپارێزم و ، پێیشم خۆش نیە هەواڵم بگەیەنرێت ..

دەستی دایە کوشتار هەتا بە سەری بەرزەوە بە شەهیدیی سەری نایەوە ..

عەمریش جەنگی کرد هەتا بە دیل گیرا . کاتێك کە هەواڵی دانێ ئەو لە تیرەی موضەرە ، عامیری کوڕی طوفەیل قژی پێشەوەی سەری بریی و ئازادی کرد ..

عەمر بەرەو مەدینە کەوتە ڕێ . لە ڕێگا دوو پیاوی نەوەی عامیری پێ گەیشتن ، کە ئەمانی پێغەمبەریان ﷺ پێ بوو . عەمر وازی لێ هێنان هەتا خەوتن ، هەردووکیانی کوشتن ، بێ ئەوەی لە ئەمانەکەی پێغەمبەر ﷺ ئاگادار بێ و ، وایشی ئەزانیی کە تۆڵەی لە نەوەی عامیر سەندووە . کە گەیشتەوە خزمەتی پێغەمبەر و هەواڵەکەی پێ دا فەرمووی : (( لقد قتلت قتيلين لأدِيَنَّهما )) . فەرمووی : دوو پیاوت کوشتوون و مەگەر من خوێنەکەیان بدەم . پاشان فەرمووی : (( هذا عمل أبي

---

[١٤] عەمری کوڕی ئومەییەی کوڕی خوەیلیدی کوڕی ئەیاسی ضەمریی یەکێکە لە هاوەڵە ناودارەکان و ، زوو بە زوویش موسڵمان بووە ، فەرموودەشی ریوایەت کردووە . ئەم بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بۆ لای نەجاشیی لە حەبەشە تا نوم حەبیبەی کچی ئەبوسوفیانی بۆ مارە بڕێ . یەکێ بووە لە ئازا و بەجەرگەکانی عەرەب . کاتێك کە قورەیش خوبەیبیان شەهید کرد پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی تا لاشەی خوبەیب بەسەر دارەکەوە داگرێ کە کافرانی مەککە بەسەریەوە لە سێ‌دارەیان دا .. عەمر تا سەردەمی خەلیفە موعاویە ژیاوە و ، لە مەدینە ـ بە پێی وتەی ئەبونوعەیم ـ پێش ساڵی شەصتی کۆچیی کۆچی دوایی کردووە .

البراء ، قد كنت لهذا كارهاً متخوفاً )) . فەرمووی : ئەمە کاری عامیری کوڕی مالیك بوو ، من کارەکەم بە دڵ نەبوو و ئەش‌ترسام .

کە ئەمە بە عامیری کوڕی مالیك گەیشتەوە ، زۆری بەلاوە گران بوو وا ئەو برازا نامەردەی ، عامیری کوڕی طوفەیل ، پەیمانەکەی ئەوی شکاندووە و ، ئەو موسڵمانە پاکانەی شەهید کردووە ، بێ ئەوەی تاوانێکیان ئەنجام دابێ .. ئەوەندەی بەلاوە گران بوو ، لە خەفەت و مەراقی ئەو کارە ناشیرینەدا و ، لە داخ و خەفەتی‌دا عامیر گیانی لە دەست دا .

پاشان رەبیعەی کوڕی عامیری کوڕی مالیك چووە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی : ئایا ئەگەر من شمشێرێك یان رمێك لە عامیری کوڕی طوفەیل بدەم ئەو ستەمە لەسەر باوکم ئەشۆرێتەوە ؟ فەرمووی : بەڵێ .

بۆ ئەمە رەبیعەی کوڕی ( ملاعب الأسنة ) هەوڵی دا تۆڵە لە عامیری کوڕی طوفەیل بستێنێ ، ئەوەبوو لە شوێنی کۆڕ و کۆبوونەوەیان‌دا هەڵمەتی دایە سەری و رمێکی تێ گرت و زامداری کرد ، بەڵام چونکە بەر رانی کەوتبوو نەی کوشت . خێرا دەستەی عامیری کوڕی طوفەیل کەوتنە بەینیان و رەبیعەیان گرت و نەیان‌هێشت رمی تێ بگرێ و ، بە عامیری کوڕی طوفەیلیان وت : تۆڵەی خۆتی لێ بسێنە . کەچیی ئەو تۆڵەی لێ نەسەند و وتی : ئەگەر مردم خوێنەکەم بۆ ( ملاعب الأسنة ) ی مامەم ، واتە باوکی رەبیعە .

دەنگ و باسی ئەم شەهیدانە گەیشتەوە مەدینە و ، خەم و خەفەتێکی زۆری بردە دڵی موسڵمانەکانەوە ، زیاتر لە خەفەتی ئوحود . پێغەمبەری خوا ﷺ یەکجار پێی خەفەت‌بار بوو . چونکە ئەو بەرێزانە بۆ جەنگ نەچوو بوون و ، ماوەشیان لە سەرداری ناوچەکە خواستبوو .. ئیبن سەعد لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ریوایەتی کردووە کە وتوویە : نەم دیوە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هیچ کەسێکی تر ئەوەندەی هاوەڵانی ( بئر معونة ) خەفەت‌بار ببێ .

لە پێشەوە وتمان کە عەمری کوڕی ئومەییەی ضەمریی هەواڵەکەی گەیاندە مەدینە . لە ( السيرة الحلبية ) دا هاتووە کە : کاتێك ئەسپ سوارانی عامیری کوڕی طوفەیل چواردەوری قورئان خوێنەکانیان گرت ، وتیان : خوایە ! جگە لە خۆت کەسێکی تر شك نابەین تا سەلامان بە پێغەمبەرەکەت بگەیەنێ . جا خۆت سەلامانی پێ بگەیەنە . ئەوەبوو لەو بارەوە وەحی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هات ، ئەویش

سەركەوتە سەر مینبەر و سوپاس و ستایشی خوای كرد و پاشان فەرمووی : (( إن إخوانكم قد لقوا المشركين وقتلوهم )) . فەرمووی : براكانتان بە دەستی بتپەرستان كوژراون .

گەیشتنی هەواڵی شەهیدانی ( رەجیع ) و ( بیئر مەعوونە ) لە یەك شەودا بووە . پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندە پێی نارەحەت بووە ، بۆ ماوەی مانگێك لە پێنج فەرزەی نوێژدا و ، بە تایبەتیی لە نوێژی فەجردا دوعای لە هۆزی رەعل و ذەكوان و عوصەییە كرد . شایانی باسە كە خوای گەورە تۆڵەی لە عامیری كوڕی طوفەیلی تاوانبار سەند . دوای ئەوەی كە رەبیعەی ئامۆزای هەوڵی دا بیكوژێ و بەو لێدانە نەمرد ، عامیر بەرەو مەدینە كەوتە رێ بۆ سەردانی پێغەمبەری خوا ﷺ ، ئەمەش بە نیازی دەست لێ وەشاندنی . بەڵام خوای گەورە ماوەی نەدا .. ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای لێ كرد تا خوا لە كۆڵی بكاتەوە ، كە فەرمووی : (( أللهم اكفني عامراً )) . كە گەیشتە مەدینە لەماڵی ئافرەتێكی ئەوەی سەلوول تووشی جۆرە تاعوونێك بوو كە تووشی وشتر ئەبێت . جا ئەیوت : تاعوونێك وەك تاعوونی وشتر لە ماڵی ئافرەتێكی سەلوولییدا تووش بووم .. لە داخانا سواری ئەسپەكەی بوو و ، لە دەشتدا هەر بەسەر ئەسپەكەیەوە گیانی دەرچوو و ، بێكەس و بێدەر لە چۆڵەوانییدا بووە خۆراكی باڵندە و دڕندەی كێویی .. پاك و بێگەردیی بۆ خوا .. هیوادارم هەركەسێ نیازی دژایەتیی پێغەمبەری خوای ﷺ بە دڵدا بێت ، خوای گەورە لەوە خراپتری پێ بكات .. سوپاس بۆ خوا . زۆرێك لەوانەمان بە چاوی خۆمان دیوە و چاوەڕوانی ئەوانی تریشین . چونكە ئەو ( رحمة للعالمين ) ە، هەر كەس دژی خۆی و دینەكەی بووەستێ خوا رسوای ئەكات و، ئەیكاتە پەندی زەمانە.[١٥]

**پێنجەم : غەزای نەوەی نەضیر**

وەك لە پێشەوە باسمان كرد ، جوولەكە زۆر داخ لەدڵ بوون بۆ موسڵمانەكان ، بەڵام ترسنۆك و حیزەڵە بوون و ، پیاوی جەنگ نەبوون ، بەڵكو تەنها ئاژاوە و پیلان و فڕوفێڵیان ئەزانیی . بۆیە هەوڵیان ئەدا داو بۆ موسڵمانەكان بنێننەوە ، بێ ئەوەی

---

[١٥] غزوة الأحزاب لباشميل : ٣٣ ـ ٤١ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٢٣٩ ـ ٢٤١ ، السيرة النبوية للندوي : ٢٤٣ ، الرحيق المختوم : ٢٩٨ ـ ٣٠٠ ، شرح حياة الصحابة : ١ / ٨٠٦ ـ ٨١٠ ، ٤ / ٤٢٠ ـ ٤٢١ ، السيرة النبوية للصلابي : ٥٣٧ ـ ٥٤٢ .

خۆیان پێوەی بتلێنن . جا دوای دەرکردنی جوولەکەی قەینوقاع و ، کوشتنی کەعبی کوڕی ئەشرەفی گەورە پیاویان ترس چوو بووە دڵیانەوە .

ئەوەبوو موسڵمانەکان لە ئوحوددا کۆمەڵێکیان لێ شەهید کرا ، بەمە جوولەکە سامیان شکا و ، دەمیان بەرەڵا بوو ، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ پێی خۆش بوو ئارامیان لەگەڵدا بگرێ ، کەچیی کە لە رووداوی رەجیع و بیرمەعوونەدا موسڵمانی تر شەهید کران کەوتنە پیلانگێڕان بۆ لەناوبردنی پێغەمبەری خوا ﷺ.

باسی ئەوەشمان کرد کە نەوەی قەینوقاعی جوولەکە پێش هەموان ناپاکی‌یان لەگەڵ موسڵمانەکان کرد و ، پەیمانیان شکاند ، جا کە جەنگ بەرپا بوو ، نەوەی نەضیر و نەوەی قورەیظە پشتی نەوەی قەینوقاعیان نەگرت و ، پەیمانیان لەگەڵ موسڵمانەکان نەشکاند .

بەڵام نەوەی نەضیر هەردەم لە پیلاندا بوون دژی موسڵمانەکان ، تا ئاواتیان بێتە دی کە ئەویش لەناوبردنی ئیسلام و موسڵمانەکانە . بۆ ئەمە بڕیاریان دا بە هەر شێوەیەك بووە دەست لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووەشێنن و لە ناوی بەرن ، بەو نیازەی دینەکەشی تیا بچێ .. هەروا چاوەڕوانی رۆژێك بوون کە هەلیان دەست بکەوێ .

ئەوەبوو یەکێ لە هاوەڵان کە عەمری کوڕی ئومەییەی ضەمریی بوو ، ئەو هاوەڵەی کە لە ( بئر معونة ) رزگاری بوو و گەڕایەوە ، وەك لە پێشەوە باسمان کرد تووشی دوو پیاوی نەوەی عامیر بوو ، ئەو هۆزەی کە هاوەڵانی ( بئر معونة ) یان شەهید کردن عەمر نەیزانی ئەو دوو پیاوە لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ عەهد و پەیمانیان وەرگرتووە ، بۆیە بە هەڵی زانی و ، کە خەویان لێ کەوت هەردووکیانی کوشت ، بەو نیازەی کە ئەمانە دوژمنن و تۆڵەیان لێ بستێنێ . کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم هەواڵەی زانیی ، لە کارەکەی عەمر ناڕازیی بوو و ، بڕیاری دا خوێنی هەر دوو پیاوە عامیری‌یەکە بداتە کەس و کاریان ، هەرچەندە ئەو هۆزەی ئەوان بە نامەرد ترین شێوە ئەو حەفتا هاوەڵە گەنجە قورئان خوێنە رۆشنبیرە ئاشتیی خوازانەیان شەهید کردن ، تا بۆ هەموو لایەك دەربکەوێ کە ئیسلام هیچ کات ماوە نادات موسڵمانان دەست بۆ هیچ کەس درێژ بکەن و ، تا توانایشیان هەبێ بەرامبەر بە ستەم و دەستدرێژیی دان بە خۆیاندا ئەگرن و ، هەر کەسیش لە سنوور دەرچوو دەرسێکی وەهای دا ئەدان لە مێژوودا تۆمار بکرێت ..

ئەگەر خوێنەری بەڕێز لە یادی بێ لە کاتی کۆچ کردن‌دا پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ جوولەکەدا پەیمانی بەرگریی هاوبەشیان لە مەدینە مۆر کرد و ، هێشتا ئەو پەیمانە هەر مابوو، بەو پێ‌یە ئەبوایە نەوەی نەضیر یارمەتیی موسڵمانەکان بدەن ، بە تایبەت لە خوێنی ئەو دوو کوژراوەدا ، سەرەڕای ئەوەش عەهد و پەیمانی دۆستایەتیی لە نێوان نەوەی عامیر و نەوەی نەضیر هەبوو . بۆ ئەمە پێغەمبەری خوا ﷺ ، لەگەڵ کۆمەڵێك لە هاوەڵان‌دا ، کە ئەبوبەکر و عومەر و عەلی‌یان تێدا بوو ، بەرەو خانووبەرەی نەوەی نەضیر کەوتنە ڕێ ، تا پێ‌یان ڕابگەیەنێ کە بە پێی پەیمانی نێوانیان مافی خۆیانە بەشداریی خوێن‌دانی ئەو دوو کوژراوە بکەن . جوولەکەش بۆ ئەمە ڕەزامەندی‌یان دەربڕیی و ، داوایان لێ کردن لە پەنای دیوارێك‌دا دابنیشن هەتا یارمەتی‌یەکەیان بۆ ئامادە بکەن .

خێرا سەردارانی نەوەی نەضیر لە یەکێ لە قەڵاکانیان‌دا کەوتنە تەگبیری لەناوبردنی پێغەمبەری خوا ﷺ و کۆ ڕونەوەیەکی نهێنی‌یان بۆ ئەمە ئەنجام دا .

بە یەکتری‌یان ڕاگەیاند کە جارێکی تر ئەم پیاوە بەم شێوەیە و بەم ئاسانی‌یە نایەتە بەر دەستیان ، جا وا چاکە یەکێکیان سەرکەوێتە سەربانەکە و بەردێکی زلە - لە ڕیوایەتێك‌دا بەردی دەستهاڕ هاتووە - بخات بەسەریا و بی‌کوژێ و ، هەموویان لە دەستی ڕزگار بن .

بە درێژایی مێژوو هیچ قەومێك ئەوەندەی جوولەکە خوێنی پێغەمبەرانی خوایان نەڕێژاوە ، وەك لە قورئان‌دا هاتووە . جا ئەمجارەش ویستیان پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناو بەرن . لەناو کۆبوونەوەکەدا سەردارێکیان بە ناوی سەللامی کوڕی میشکەم ناڕەزایی لەو هەنگاوە ناپاکە پڕمەترسی‌یە دەربڕیی و پێی وتن : شتی وەها نەکەن بەخوا ئەوەی نیازتان کردووە لێی ئاگادار ئەکرێ ، سەرەڕای ئەوەی کە ئەوە هەڵوەشاندنەوەی ئەو پەیمانەیە کەوا لە نێوان ئێمە و ئەودا ..

ناڕەزایی دەربڕینی سەللام دەورێکی نەبوو ، چونکە هەموو بە لایانەوە مسۆگەر بوو کە لە ناوی ئەبەن و ، کارەکەش یەکجار ئاسانە .

کە پرسی‌یان کێ ئەو پیاوەیە کە سەرکەوێتە سەر ئەو سەربانە و بەردێکی بخات بەسەردا و لە دەستی دەربازمان بکات ؟ بەدبەختێکیان ، کە ناوی عەمری کوڕی جەححاش بوو خۆی تەرخان کرد بۆ ئەو کارە .. بۆ کوژاندنەوەی نووری خوا لەسەر زەویی‌دا ..

وەنەبێ هەر ئەم بەدبەختە دژایەتیی پێغەمبەری خوای ﷺ کردبێ ، بەڵکو زۆرێک هەوڵیان داوە و ، زۆرێکی تریش هەوڵ ئەدەن زیان بە ئیمان بگەیەنن و ، هەوڵ ئەدەن رووناکیی خوا بکوژێننەوە ، بەڵام هەر هەموویان یەك چارەنووس چاوەڕێیان ئەکات ، ئەویش ئەوەیە کە ببنە پەندی زەمانە .. سەرشۆڕیی دنیا و قیامەت .. خەجاڵەتیی و سەرشۆڕیی ..

تا بەدبەختەکە سەرکەوتە سەربان و بەردی هێنا تا بیدات بە تەوقە سەری پێغەمبەری خوادا ﷺ ، ئەم وەحی بۆ هات و لەو پیلانە پیسەی جوولەکان ئاگادار کرا .. بەڵێ ، لە ئاسمانەوە هەواڵی درایە کە نیازیانە بیکوژن و لە ناوی بەرن .. بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ خۆی تێك نەدا ، بەڵکو لەسەر خۆ هەستا وەك یەکێك بیەوێ دەست بە ئاو بگەیەنێ .. هەتا هاوەڵەکانیشی ئاگادار نەکردن ، بەڵکو بە تەنیا هەستا و شوێنەکەی بەجێ هێشت و ، یەك وشە قسەی لەگەڵ جوولەکەکاندا نەکرد .. دوای کەمێك هاوەڵەکانیشی هەستان و خانووبەرەی نەوەی نەضیریان بەجێ هێشت ، بێئەوەی هۆی ئەم بەجێ هێشتنە بزانن .

پێغەمبەری خوا ﷺ وەهای دەرنەخست کە بە پیلانەکەی زانیوە ، نەوەکو جوولەکە بکەونە خۆ و بە هەموویانەوە دەورەی خۆی و هاوەڵە کەمەکانی بگرن و بیانفەوتێنن . لەبەر ئەوە لەسەر خۆ خۆی لە کۆڕەکە دزییەوە و ، بێ ئەوەی جوولەکە ئاگادار بن خۆی گەیاندەوە مەدینە و ، هاوەڵەکانیشی کە هەواڵی گەڕانەوەی ئەویان زانیی گەڕانەوە بۆ مەدینە و ، ئەویش هەواڵی پیلانی جوولەکەی دانێ کە چۆن نیازی ناپاکییان هەبووە .

ئەم هەڵوێستەی جوولەکە هەڵوێستێکی دوژمنانە بوو ، کە هەموو پەیمان و رێك کەوتنێکی پێ هەڵ ئەوەشایەوە ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم رووداوەی وەها لە قەڵەم دا کە پەیمانیان لە نێواندا نەماوە و ، بڕیاری دا ئەو جوولەکە پیسانە لە ناوچەی یەثریب دەربکرێن ، تا لە شەڕ وخراپە و فڕوفێڵیان رزگاریان ببێ .

دکتۆر ( علي الصلابي ) ش هۆیەکی تری باس کردووە کە بریتییە لە پشتگیریی کردن لە ناحەزانی موسڵمانان .

ئەوەبوو ئەبوسوفیان بە دووصەد جەنگاوەرەوە ، هەڵمەتی دایە سەر مەدینە ، ئەمەش لە غەزای ( سەویق ) دا و ، سەللامی کوڕی ئەبولحوقەیقی سەرۆکی

جوولەکەی نەوەی نەضیریش میوان داریی لە ئەبوسوفیان کرد و ، هەواڵی موسڵمانانی پێ گەیاند و ، بۆ جەنگی موسڵمانان هەڵی نا ..

ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی نارد بۆ لایان و پێی فەرموو : (( إذهب إلى يهود بني النضير وقل لهم : إن رسول الله أرسلني إليكم أن أخرجوا من بلادي ، لقد نقضتم العهد الذي جعلت لكم بما هممتم به من الغدر ، لقد أجّلتكم عشراً ، فمن رؤي بعد ذلك ضربت عنقه )) . فەرمووی : بڕۆ بۆ لای جوولەکەی نەوەی نەضیر و پێیان بڵێ : پێغەمبەری خوا ناردوومی بۆ لاتان کە ئەفەرموێ : لە وڵاتم دەرچن ، چونکە بەو نیازە خراپەی کە ویستتان غەدر بکەن ئەو پەیمانەتان هەڵوەشاندەوە کە پێتانم دابوو . دە ڕۆژ مۆڵەتم بۆتان داناوە ، جا لەوەو دوا هەر کەستان لەم وڵاتەدا ببینرێ لەگەردنی ئەدەم .

موحەممەدی کوڕی مەسلەمە بە پەلە بڕیارەکەی پێغەمبەری ﷺ بە جوولەکە گەیاند و ، ئەوانیش کە ئەمەیان بیست زانییان پیلانەکەیان ئاشکرا بووە .. شایانی باسە کە لە لاپەڕەکانی مێژوودا هیچ بەرگرییەکی جوولەکە تۆمار نەکراوە دەربارەی ئەوەی کە ئەو کارەیان ئەنجام نەدابێ .

ئەم بڕیارەی پێغەمبەری خوا ﷺ کارێکی گەورەی کردە سەر جوولەکە و ، بە جارێ ورەیان ڕووخا و ، سەرنجیان دا کە جگە لە کۆچ کردن هیچ چارەیەکی تریان نیە . بۆیە خێرا ناردیان ئەو وشترانەی کە بەر درابوون کۆیان بکەنەوە و ، هەندێ وشتری تریشیان لە نەوەی ئەشجەع بە کرێ گرت ، بەو هیوایەی کە بار بکەن و مەدینە بەجێ بهێڵن ، چونکە ئەیانزانیی ئەگەر ملەجەڕە بکەن لە لایەن سوپای ئیسلامەوە گورزی کاریگەریان تێ ئەسرەوێنرێ و بەرگەی هەڵمەتی شێر و پڵنگەکانی ئیسلام ناگرن ..

کە ئەم دەنگ و باسە گەیشتە لای سەرۆکی موونافیقان عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول ، زۆری پێ ناخۆش بوو ، چونکە هەستی بە تیاچوونی خۆیشی ئەکرد .. دوێنێ نەوەی قەینوقاع و ، ئەمڕۆ نەوەی نەضیر و ، سبەینێش نەوەی قورەیظە مەدینە چۆڵ بکەن ئیتر کێ پشت و پشتیوانی موونافیقان بێ ؟ کەواتە هەر لە ئێستەوە ئەوانیش تیاچوون !! کە بیری لەم بارودۆخە کردەوە کەوتە پەلەقاژەی ئەوە کە بەڵکو دەوری چۆڵ نەبێ .. موونافیقیش چونکە هەموو گیانی هەر ترس و نامەردیی و درۆکردنە ، ناردی بۆ لای جوولەکەی نەضیر کە دان بە خۆیاندا بگرن و ،

ماڵ و حاڵی خۆیان بەجێ نەهێڵن و ، ئەو هەڕەشەیەی موسڵمانان بدەنە دواوە و ، نەترسن .. ئەگەر موسڵمانەکان هێرشی سەربازی‌یان بکەنە سەر ، وا ئەمان پشتیان ئەگرن و ، ئەگەر جەنگیش داگیرسا ئەوا یارمەتی‌یان ئەدەن و لەگەڵیان ئەجەنگن و ، گەر دەریش چوون و ناوچەکەیان بەجێ هێشت ، ئەمانیش لەگەڵیان دەرئەچن .

سەرۆکی مونافیقان بە نهێنیی جوابی بۆ ناردن کە تا دواهەناسە وا لەگەڵیان کە پێی وتن : لە ناوچەی خۆتان دەرنەچن و لە قەڵاکانتان‌دا بمێننەوە ، چونکە من لە خزمەکانم و لە عەرەبی تریش دوو هەزارم لەگەڵ دایە و ، دێنە ناو قەڵاکانتانەوە و مەگەر دواپیاویان بکوژرێ و ، قورەیظە و غەطەفانی هاوپەیمانیشتان کۆمەکییتان بۆ ئەنێرن .

دوای ئەم هەموو ورە بەرزکردنەوە و بەڵێن پێدانە ، جوولەکە غیرەتیان خستە بەر خۆیان تا دامەزراو بن و بەرگریی بکەن ، بەتایبەت دوای ئەوەی کە جوولەکەی نەوەی قورەیظە پاڵیان پێیانەوە دا و بە ئاشکرا ئامادەبوونیان بۆ جەنگی موسڵمانان دەربڕیی .[١٦]

ئەوەبوو پیاویان نارده خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و ئاگاداریان کرد کە ماوا و مەنزڵی خۆیان چۆڵ ناکەن و چیی پێ خۆشە با وا بکات . پاشان دەستیان کرد بە مەحکەم‌کردنی قەڵاکانیان و ، لە شەقام و کۆڵانەکان‌دا سەنگەریان لێ دا بۆ خۆ پاراستن و ، دەستیان کرد بە کێش‌کردنی بەرد بۆ سەربانی قەڵاکانیان ، تا ئەگەر موسڵمانەکان هێرشیان کردە سەریان ، بیان‌خەن بەسەریان‌دا .. هەروەها خۆراکی یەك ساڵیان خزاندە قەڵاکانیانەوە . بەڵام خەمی ئاویان نەبوو چونکە لەناو قەڵاکانیان‌دا بیری زۆریان لێ دابوون .

بەڵێ ، حویەیی کوڕی ئەخطەبی سەرۆکی نەوەی نەضیر ، کە بەڵێنی سەرۆکی نیفاقی پێ گەیشت ، جوابی نارد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ، کە ئێمە دەرناچین و چیت پێ خۆشە بی‌کە .

---

[١٦] ئیمام بوخاریی لە صەحیحەکەی‌دا تەئکیدی لەسەر ئەوە کردۆتەوە کە قورەیظەش شان بە شانی نەضیر لەگەڵ موسڵمانەکان دا جەنگاون ، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ دوای سەرکەوتن و رێککەوتن نەوەی نەضیری بار پێ‌کردوون ، بەڵام چاوپۆشیی لە نەوەی قورەیظە کردووە ، تا ئەوەبوو ئەوانیش لە جەنگی خەندەق دا ناپاکی‌یان کرد و ، بوونە دەستەی جەنگاوەر دژی موسڵمانەکان ، ئیتر پێغەمبەری خوا ﷺ بە فەرمانی ئاسمان پیاوەکانی کوشتن و ژن و ماڵ و منداڵەکانیشیانی بەسەر موسڵمانەکان دا دابەش کرد ..

وەنەبێ موسڵمانەکان پێیان خۆش بووبێ لەو کاتە ناسکەیاندا جەنگ یەخەیان پێ بگرێتەوە ، چونکە لەو کاتەدا عەرەبەکان دژیان وەستا بوون و ، لە هەموو لایەکەوە دەستیان لە موسڵمانەکان ئەوەشاند و ، نەوەی نەضیریش بەشی خۆیان ئازا و لێهاتوو بوون و ، خۆ بە دەستەوەدانیان کارێکی ئاسان نەبوو . بۆیە چوون بە گژیان دا کارێکی بێ مەترسیی نەبوو . بەڵام دوای ئەو پیلانەیان موسڵمانەکان ناچار بوون لە گەڵیاندا بجەنگن .

کە وەڵامەکەی سەرۆکی نەوەی نەضیر گەیشت ، پێغەمبەری خوا ﷺ ( ألله أكبر ) ی فەرموو و هاوەڵانیش بۆیان سەندەوە و ، یەکسەر فەرمانی دا ئابلووقەی نەوەی نەضیر بدرێ و هەڵمەت ببرێتە سەر قەڵاکانیان . شایانی باسە کە قەڵاکانیان یەکجار سەخت و مەحکەم بوون ، بۆیە جوولەکە بێباك لەسەر قەڵاکانەوە بەرگرییان ئەکرد .

کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە مانگی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی چوارەمی کۆچییدا ، بەرامبەر بە مانگی ئابی ٦٢٥ زایینیی ، هەڵمەتی بردە سەر نەوەی نەضیر ، ( إبن أم مكتوم ) ی هاوەڵی موهاجیری نابینای کردە ئەمیری مەدینە و ، ئەوەبوو شەش شەو، یان پانزە شەو ئابلووقەی قەڵاکانیان دا .

کە پێغەمبەری خوا ﷺ سەرنجی دا وا جوولەکەی نەضیر باکیان نیە ، ڕێیەکی تری گرتە بەر بۆ ڕووخاندنی ورەی دوژمن . ئەوەبوو فەرمانی دا دەست بە بڕینی دارخورمای باخەکانی جوولەکە بکەن ، ئەمەش تا ورەیان بڕووخێ ، چونکە جوولەکە بە درێژایی مێژوو هەر پوولەکیی و ماددەپەرست بوون .

لە ڕاستییدا ئەو باخە دارخورمایانە لە دەستی جوولەکە دەرچوو بوون ، چونکە ئەو ناوچانە لەلایەن سوپای ئیسلامەوە دەستیان بەسەردا گیرا بوو و ، بووبوونە موڵکی موسڵمانەکان . جا موسڵمانەکان نەیانئەویست بە ڕاستیی هەموو باخەکان ببڕن ، یان هەموو جۆرە دارخورماکان ببڕن ، بەڵکو تەنها ئەو دارخورمایانەیان ئەبڕیی کە جۆری چاك نەبوون و پێیان ئەوترا ( لینە ) و خورمای ئەم دارانە زیاتر دەرخواردی وشتر ئەدرا .

ئەم هەوڵە تا ڕادەیەکی چاك سەری گرت . هەر ئەوەبوو کە جوولەکە چاویان لە لقی دارخورما بوو ئەکەوتە زەویی و ، قەدەکەیان دووکەڵی لێ بەرز ئەبوویەوە ، چاویان پەڕییە تەوقە سەریان و ، ترس و لەرزیان لێ نیشت و ، هاواریان لێ بەرز

بوویەوە ، هەروەك لە دڵی خۆیاندا هەر بە تامای باخ و باخاتی خۆیان بن .. لە ترسی ئەو کارەدا هاتنە سەر ئەوە کە خۆیان بە دەستەوە بدەن .
ئەوەبوو جوولەکە ناڕەزایییان لە بڕین و سووتاندنی دارخورماکان دەربڕیی و هاواریان کرد : ئەی موحەممەد ! تۆ جاران قەدەغەی فەسادت ئەکرد و ، هەرکەس ئەنجامی بدایە بە شوورەییت لە قەڵەم ئەدا ، ئێستا بۆچ دارخورماکان ئەبڕیی و ئەسووتێنی ؟!
ئەم ناڕەزایییە لە جوولەکە نەئەبیسترا ، چونکە ئەوە جەنگە و هەر کەسە هەموو ڕێیەك ئەگرێتە بەر هەتا بەرامبەرەکەی ناچاری خۆ بەدەستەوەدان بکات . هەندێ لە موسڵمانانیش بڕین و سووتاندنی دارخورماکانیان بەلاوە قورس بوو ، هەر چەندە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دەرکردبوو ، تا ئەوەبوو قورئانی پیرۆز هاتە خوارەوە و پشتگیریی لە فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەکرد کە ئەیفەرموو :
﴿ مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَآئِمَةً عَلَىٰٓ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ وَلِيُخْزِىَ ٱلْفَـٰسِقِينَ ﴾ (الحشر : ٥) .
لێرەدا پێویستە سەرنج لە هەڵوێستی هەندێ لە هاوەڵان بدەین ، کە هەرگیز نەیان ویستووە بە کوێرانە گوێڕایەڵیی فەرمان بن ، ئەگەرچیی ئەو فەرمانەش لە پێغەمبەری خواوە بێ ﷺ چونکە ئەوان بە مەرجێ سەروماڵیان ئەکردە قوربانی ئیسلام ، ئەو ئیسلامە ئەو داد و عەدالەتەی تیا بێ کە خوا پێی ڕازییە ، نەك بۆ بەرژەوەندیی خۆیان چاو بنووقێنن و ، بۆ پینەکردنی ناتەواویی لایەنەکەی خۆیان دەمەلاسکێ بکەن .. بەڵێ ، ناڕەزایییان لە دڵا بوو هەتا قورئان هات و ڕەواندی یەوە .
تەنها بە بڕینی چەند دارخورمایەکی جۆری خراپ ورەی نەوەی نەضیر رووخا .. هەستیان کرد چاری سوپای ئیسلامیان پێ ناکرێ و ، پێغەمبەری خواش ﷺ کۆڵ نادا هەتا مەدینە بەجێ نەهێڵن . خۆ ئەگەر بمێننەوە تاقیان لێ ئەبڕێتەوە ، چونکە ئەوپەڕی ناپاکییان لێ دەرکەوت و ، جارێکی تر بڕوا بە بەڵێن و پەیمانیان ناکات .
جوولەکە ماوەیەك دانیان بە خۆیاندا گرت بەو هیوایەی کە یارمەتییان بگاتێ . بە تەما بوون عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی موونافیق و ، غەطەفانی هاوپەیمانیان بێن بە

دەمیانەوە . بەڵام بێسوود بوو .. كوڕی ئوبەی لە ماڵی خۆیدا پاڵی لێ دایەوە و، جوولەكەی ترسنۆك و بێئارامیش چاوەڕوانی دەست و بازووی موونافیق بوون ..

لەولاوە غەطەفانیش دەنگ و باسی هێز و بازووی سوپای ئیسلامیان بەرگوێ كەوتبوو ، كە چۆن قورەیشیان تەمێ كردبوو ، ئەوانیش نەیانوێرا بێنە پێشەوە . بەمە ترس و لەرزێكی بێوێنە چووە دڵی جوولەكەوە .

موسڵمانەكان لەسەر ئابلۆوقە بەردەوام بوون و . جوولەكەش لەسەر جەنگێكی دۆڕاوی بێئەنجام بەردەوام بوون . ئەوەبوو بەسەر قەڵاكانەوە تیر و بەردیان ئەگرتە موسڵمانەكان . پێغەمبەری خوایش ﷺ چادرەكەی خۆی لە بنكەی فەرماندەییدا، لە دەوری قەڵاكان هەڵدا بوو ، بۆیە تیرهاوێژانی جوولەكە بە زۆریی تیریان ئەگرتە چادرەكەی ئەو ، بەڵام زۆربەی ئەو تیرانە نەئەگەیشتن . جوولەكە بانگیان كردە جەنگاوەرێكی ئازایان كە تیری زۆر ئەڕۆیشت تا تیر بگرێتە چادری فەرماندایەتیی . ئەوەبوو موسڵمانەكان لە تاوتیری ئەو جوولەكەیە چادرەكەیان گواستەوە بۆ شوێنێك كە تیری نەگاتێ .

ئەم جوولەكەیە ناوی ( غەزوەل ) بوو و بە خۆی و دە جەنگاوەری ترەوە ، بە نیازی دەست وەشاندن لە موسڵمانەكان ، لە قەڵا هاتنە دەرەوە . ئیمام عەلییش لەگەڵ سەهلی كوڕی حونەیف و ئەبودوجانە خوا لێیان رازیی بێ بۆسەیەكیان بۆ نابوونەوە . ئیمام هێرشی كردە سەر غەزوەل و كوشتی و ، ئەبودوجانە و هاوەڵانیشی هێرشیان كردە سەر ئەوانی تر و هەر دەیان كوشتن . ئیمامیش سەری ئەو جوولەكە تیرهاوێژەی هێنا بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ..

لەو كاتانەدا كە جوولەكە دەوریان درابوو دوو پیاوی جوولەكە ، كە ناویان یامینی كوڕی عومەیر و [17] . ئەبوسەعدی كوڕی وەهب [18] بوو و ، یامین ئامۆزای عەمری كوڕی جەححاش بوو كە ویستی سەر بكەوێتە سەر بانەكە و بەردەكە بكێشێ بە پێغەمبەردا . ئەم دوو پیاوە یەكێكیان بەوی تریانی وت : بەخوا تۆ چاك ئەزانیی كە ئەو پێغەمبەری خوایە . ئەوەبوو لەسەر ئەوە رێك كەوتن كە خۆیان بگەیەننە لای موسڵمانەكان و موسڵمان بن . هەر لەو رۆژانەدا كە گەمارووی قەڵاكان درابوو ، شەو

---

[17] یامینی كوڕی عومەیری كوڕی كەعبی نەضریی بۆتە یەكێ لە گەورە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ . مێژووی كۆچ كردنی دیار نیە .

[18] ئەبوسەعدی كوڕی وەهبی نەضریی فەرموودەیەكی ریوایەت كردووە .

بە نهێنیی لە قەلاکانەوە دابەزین و پەیوەندی‌یان بە پێغەمبەری خواوە ﷺ کرد و موسڵمانبوونی خۆیانیان دەربڕیی ..

هەر لەو چەند رۆژەدا کە گەمارووی قەلاکانی نەوەی نەضیر درا بوو یامین دڵسۆزیی راستەقینەی لەگەڵ ئیسلامدا نواند ، بەوەی کە بەر لەوەی جوولەکەی نەضیر خۆیان بە دەستەوە بدەن ، یامین هەوڵی دا عەمری کوڕی جەححاشی ئامۆزای بکوژێت و تۆڵەی ئەو ناپاکی‌یەی لێ بستێنێ ، چونکە نەك هەر ئەو ، بەڵکو جوولەکە هەر هەموویان چاك ئەیانزانیی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلا ﷺ پێغەمبەری خوایە و ، بە بۆنەی خوار و خێچیی دەروونیانەوە دانیان پیا نەئەنا . هەرواش بوو یامین بەڵێنی بە پیاوێکی نەوەی قەیس دا کە ئەگەر عەمری کوڕی جەححاش بکوژێ پێنج ویسق خورمای بداتێ ، کابرای قەیسییش هەلی بە دەست هێنا و ، بەر لەوەی نەوەی نەضیر خۆیان بە دەستەوە بدەن عەمری کوشت .

جوولەکە خۆیان زۆر پێ نەگیرا ، بەڵکو دوای ماوەیەکی کەم نوێنەریان ناردە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ وتوویژ کردن و ، پێغەمبەری خوایش ئەوەی قبووڵ کرد و ، وتوویژەکە بە رێك‌کەوتن لەسەر چۆڵکردن کۆتایی هات بەم مەرجانەی خوارەوە :

١ ـ جوولەکەی نەوەی نەضیر ناوچەی یەثریب بەجێ بهێڵن و بۆ هەر کوێ ئەچن بە ویستی خۆیانە .

٢ ـ جوولەکە چیی چەکیان هەیە ، بە هەموو جۆرەکانیانەوە ، تەسلیمی موسڵمانەکانی بکەن و ، کاتێك کە مەدینە بەجێ ئەهێڵن چەکیان بە دەستەوە نەمابێ .

٣ ـ جوولەکە چیی ماڵ و سامانیان هەیە و توانایان هەیە لەگەڵ خۆیاندا بی‌بەن ، جگە لە چەك ، ئەتوانن بی‌بەن .

٤ ـ هەرچی‌یان لێ بەجێ ئەمێنێ هەر هەمووی ئەبێتە دەست‌کەوتی موسڵمانان .

٥ ـ فەرماندایەتیی موسڵمانان لە مەدینەدا لێ پرسراوە لە سەلامەتیی گیانی جوولەکەی نەوەی نەضیر تا لە ناوچەی دەسەلاتی موسڵمانان دەرئەچن .

جوولەکە خۆیان پێچایەوە و چیی کەل و پەلێك بۆیان تەبرا باریان کرد و مەدینەیان چۆڵ کرد . شایانی باسە ئەو جوولەکانە زۆر دەوڵەمەند بوون . ئەوەبوو شەش‌صەد وشتریان بار کرد ، کە زۆرێك لە ئاڵتوون و زیویان هەبوو . هەتا ئەڵێن کە

سەللامی کوڕی ئەبولحوقەیق خۆی بە تەنیا پڕ بە چەرمی گاجووتێک زێڕ و زیوی لەگەڵ خۆیدا بردووە . ئەم جوولەکەیە لە کاتی دەرچوونیدا ، دەستی ئەدا لە چەرمە پڕ لە زێڕ و زیوەکە و بە داخ و خەفەت و هەڕەشەوە بە موسڵمانانی ئەوت : ئەمەمان ئامادە کردووە تا زەویی پێ بەرز و نزم بکەینەوە و ، گەر ئێمە دارخورمامان بەجێ هێشتبێ ، لە خەیبەریش دارخورما هەیە .

بە درێژایی مێژوو جوولەکە شەیدای دەسەڵات بوون و ، هەوڵیان دا بە پارە دەستی بخەن ، بۆیە چیی ڕێگای ناشەرعیی هەبوو گرتیانە بەر بۆ پەیداکردنی پارە ، کەچیی هەر بە ئاوات نەگەیشتن و ، هەر نەحەسانەوە !!

کاتێك ماڵەکانیان بەجێ ئەهێشت بە تایبەتیی دیوار و کۆڵەکەکانیان ئەخستن تا خانووەکان بڕووخێن و موسڵمانان کەڵکیان لێ وەرگرن .

کاتێك کە نەوەی نەضیر لە مەدینە دەرچوون خۆیان بە دامەزراو لە قەڵەم ئەدا .. ژنەکانیان سواری کاژاوە کردبوو و کاژاوەکانیان ڕازاندبۆوە و ، بە جل و بەرگی ئاوریشم و قەدیفەی صەوز و سوور و خشڵی زیو و زێڕ ئافرەتەکانیان ڕازاندبۆوە و ، دەف و شمشاڵیان لێ ئەدا.. هەروەك هەڕەشە لە موسڵمانەکان بکەن . هەروایش بوو ، دوای کەمێك عەرەبە بت پەرستەکانی دوورگەیان لە دژی موسڵمانەکان هەڵ نا و جەنگی ئەحزاب رووی دا ، بەڵام خوای میهرەبان موسڵمانەکانی پاراست !

پێش هاتنی ئیسلام هەر ژنێك منداڵی بۆ نەمایە ، ئەوە خرا بووە سەر زاری خەڵکیی کە هەر کەس بیەوێ منداڵەکەی نەمرێ با بیکاتە جوولەکە ، ئەمە فێڵی جوولەکە بوو بۆ زیادکردنی دینی جوولەکە . بەم پێیە هەندێ لە منداڵانی ئەنصار بووبوونە جوولەکە و ، کە نەوەی نەضیر مەدینەیان چۆڵ کرد ، ئەو عەرەبانەش کەوتنە گەلیان و لەگەڵ جوولەکەکاندا باریان کرد . ئەوەبوو کەس‌وکاریان ویستیان قەدەغەیان بکەن و ، نەهێڵن بار بکەن ، کەچیی پێغەمبەری خوا ﷺ ماوەی دا بەو جوولەکانە کە با سەربەست بن و لە کۆچ کردن قەدەغە نەکرێن ، چونکە لە دین دارییدا زۆرکاریی نیە .

هەندێ لەو جوولەکانە باریان بۆ ( أذرعات ) ی شام کرد و ، بەشی زۆریشیان بۆ خەیبەر ، کە حویەیی کوڕی ئەخطەب و سەللامی کوڕی ئەبولحوقەیق و کینانەی کوڕی رەبیعیان لەگەڵدا بوون و ، بە گەیشتنیان خەیبەریان کردە بنکەی دژایەتیی موسڵمانان و ، لە ئەنجامدا خەیبەریشیان قوڕبەسەر کرد .

نەوەی نەضیر تا توانی‌یـان بـار و کـەل و پـەلیان لەگـەڵ خۆیـان بـرد و ، دەسـت کەوتێکی زۆریشیان بۆ موسڵمانان بەجێ هێشت ، وەك پەنجا قەڵغان و ، پەنجا حەربـە و ، سێ‌صەد و چل شمشێر و ، دانەوێڵەیەکی زۆر و ، باخ و باخاتێکی یەکجار زۆر لـە دارخورما و دار و درەختی تر .

شایانی باسە دەستکەوتەکانی نەوەی نەضیر لەلایـەن پێغەمبـەری خـواوە ﷺ بـە وێنەی دەستکەوتی جەنگ دابەش نەکران بەسەر موسڵمانەکان‌دا ، بـەڵکو دابەشـی کردن بەسەر موهاجیرەکان‌دا . لەبەر ئەوەی کە ئـەم دەسـتکەوتانـە بـەبێ جـەنگ و کوشتار ، بەڵکو بە رێك‌کەوتن دەستیان کەوتبوون . ئەمەش دوای راوێـژکردن لەگـەڵ ئەنصاردا و وەرگرتنی رەزامەندی‌یان .

ئەوەبوو ئەنصاری کۆکردنـەوە و ، دەسـتی بـە وتـاردان کـرد و فـەرمووی : (( إن إخوانكم المهاجرين ليس لهم أموال ، فإن شئتم قسمت هذه الأموال التي أفاء الله عليّ وخصني بها مع أموالكم بيـنكم جميعـاً ، وإن شـئتم أمسـكتم وقسـمت فـيهم هـذه خاصـة )) . فەرمووی : برا کۆچ‌کەرەکانتان ماڵ و سامانیان نیە . جا ئەگەر بتانـەوێ ئەم دەستکەوتەی کە خوای گەورە بە تایبەتیی بۆ منی جیا کردۆتەوە لەگـەڵ مـاڵ و سامانەکەی خۆتان‌دا بەسەر هـەمووتان‌دا بەشـی ئەکـەم و ، گـەر بشـتانەوێ مـاڵ و سامانی خۆتان بۆ خۆتان و ئەمە بە تایبەتیی بەسەر ئەوان‌دا دابەش ئەکەم .

ئەنصار خوا لێ‌یان رازیی بێ وتیان : بـەڵکو ئـەم دەسـتکەوتـە بەسـەر ئـەوان‌دا دابەش بکە و ، لە ماڵ و سامانی ئێمەش چەندت پێ خۆشە دابەشی بکە .

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم رەزامەندی‌یەی ئەنصاری زۆر پێ خۆش بوو و ، بەو سنگە فراوان و دڵە پاکانە گەشایەوە کە ئەنصار بەرامبـەر بـە براکانیـان نوانـدیان ، هـەتا ئەوەبوو فەرمووی : (( أللهم ارحم الأنصار ، وأبناء الأنصار )) .

قورئانی پیرۆز هەڵوێستی بەرزی ئەنصاری نرخاند و فەرمووی :

﴿ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ﴾ (الحشر : ٩) .

بەم شـێوەیە پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەستکەوتـەکانی نـەوەی نـەضیری بەسـەر موهاجیرەکان‌دا دابەش کرد و بەشی ئەنصاری لێ نەدان جگە لە دوو پیاوی هـەژاریان کە سـەهلی کـوڕی حونـەیف و، ئەبودوجانـە سـەماکی کـوڕی خەرەشـە بـوون ، کـە هەردووکیان دوو پاڵەوانی دامەزراوی ئوحود بوون لە کاتی شپرزەبوونی موسـڵمانەکان دا . هەروەها بە شێوەی دیاریی شمشێرەکەی سەرداری نەوەی نەضیر سـەلامی کـوڕی

ئەبولحوقەیقی دا بە سەرداری ئەوس سەعدی کوڕی موعاذ ، کە شمشێرێکی ناودار بوو لە ناو عەرەبدا !!

بە تێكشكانی نەوەی نەضیر پشتی مونافیقەكانیش شكا ، بۆیە تووشی خەم و خەفەتێکی یەکجار زۆر بوون ، چونکە جوولەکە بۆ ئەوان پاڵپشت بوون و ، نەمانیان نیشانەی نەمانی ئەوانیش بوو ..

بە بۆنەی دوورخستنەوەی نەوەی نەضیر لە مەدینە خوای گەورە سورەتی ( الحشر ) ی بە تەواویی نارده خوارەوە کە سەرەتا پاك و بێگەردیی و تەقدیسی ئاسمانەکان و زەویی و هەرچیی وا تیایانا بۆ ئەو خوایە دەرئەبڕێ کە نەوەی نەضیری لە کۆچ‌کردنی یەکەم‌دا لە مەدینە دەرپەڕاند .. ئەو جوولەکانە ئەوەندە بەهێز بوون و خاوەنی قەڵای سەخت بوون ، بە بیری موسڵمانەکان‌دا نەئەهات ئەو ماڵ و حاڵەیان چۆڵ بکەن . بەڵام بە شێوەیەك کە بە بیریاندا نەیەت ، خوای گەورە ترس و لەرزی خستە دڵیانەوە و ، ورەیان نەما و « دەستیان دایە رووخاندنی خانووەکانیان بە دەستی خۆیان و ئیمان داران » تا ئەمە پەند و ئامۆژگاریی‌بێ بۆ هەموو ژیر و سەلیقەدارێك کە نەکا دژی خوا و پێغەمبەرەکەی بوەستێ . خۆ ئەگەر ئەو جوولەکانە مەدینەیان چۆڵ نەکردایە ئەوا بە کوشتن و دیل‌کردن خوای گەورە سزای ئەدان و لە قیامەتیش‌دا ئاگری دۆزەخ بەشیان بوو . چونکە ئەوانە نامەردانە دژی خوا و پێغەمبەرەکەی وەستان و ، هەرکەسیش دژایەتیی خوا بکات ، خوای گەورە سزای سەختی ئەوانە ئەدات . پاشان قورئان پشتیوانیی لە پێغەمبەر ئەکات لە بڕینی دارخورماکانیان ، تا ئەو فاسقانە سەرشۆڕ بن . ( الحشر : ١ـ ٥ ) .

پاشان ( فيء ) روون ئەکاتەوە کە ئەوەیە بەبێ جەنگ و کوشتار و ماندووبوون دەست کەوتبێ و ئەوەش بەشی موجاهیدانی پێوە نیە و ، بۆ پێغەمبەری خوایە ﷺ تا بە ویستی خۆی بی‌دات بە هەر کەسێ کە ئاتاج بێ ، تا هەژاران کەڵکی لێ وەربگرن . دوای ئەوە قورئان فەرمان ئەدا بە موسڵمانان تا بە جوانیی گوێڕایەڵی فەرمانەکانی پێغەمبەر بن و شەرمی خوا بکەن ، چونکە خوای گەورە خاوەنی سزای سەختە . ( الحشر : ٦ ـ ٧ ) .

پاشان خوای گەورە موسڵمانەکان ئاگادار ئەکات کە ئەو دەست کەوتانە با بۆ موه[illegible] فەقیر و هەژارەکان بن « چونکە ئەوان ماڵ و سامانیان بەجێ هێشتووە .
( الحش[illegible] ) .

پاشان بە ڕێزەوە باسی سەخاوەت و سنگ‌فراوانیی و ئیمان‌داریی ئەنصار ئەکات کە چۆن باوەشیان بۆ میوانە ئازیزەکان کردەوە و ، لەگەڵ ئەوەدا کە هی وایان هەبوو دەست کورت و هەژار بوو هیچ دریغی‌یەکیان نەئەکرد . ( الحشر : ٩ ) .

پاشان باسی ( تابیعین ) ئەکات کە دوای ئەو بەرە پاك و خاوێنەی سەردەمی ئازیز دێن ؛ چۆن لە خوای گەورە ئەپاڕێنەوە بۆ ئیمان‌دارانی پێشی خۆیان و ، داوا ئەکەن خوای گەورە دڵەکانیان پاك بکاتەوە . ئەمەش ئامۆژگاری‌یە بۆ هەموو موسڵمانێك کە ڕەخنە لە هیچ هاوەڵێك نەگرێ ؛ ئەگینا لە خزمەتی قورئان‌دا بێ‌ئەدەبیی کردووە. ( الحشر : ١٠ ) .

پاشان باسی بەڵێنی پووچ و درۆینەی مونافیقان ئەکات کە چۆن دەستی نەوەی نەضیریان بریی و نەشیان‌وێرا بچن بە هانایانەوە . ( الحشر : ١١ ـ ١٣ ) .

دوای ئەوە باسی ترسنۆکیی جوولەکە ئەکات کە مەگەر لە قەڵای سەخت‌دا بتوانن لەگەڵتانا بجەنگێن ، کە جەنگیش ڕووی دا هێز و ورەیان ئەڕووخێ و بەرگە ناگرن . بە ڕواڵەتیش وا دەرئەکەوێ کە جوولەکە و مونافیقان یەك بن کەچیی وا نین ؛ چونکە کۆمەڵێکی نەفام و نەزانن . ( الحشر : ١٤ ) ......[19]

**شەشەم : غەزای نەجد**

دوای ئەوەی کە موسڵمانەکان لە غەزای نەوەی نەضیردا ، بەبێ قوربانیی‌دان ؛ سەرکەوتنێکی چاکیان بەدەست هێنا ، لە مەدینەدا دەسەڵاتیان پەیدا کرد و ، سەرشۆڕییش بەسەر مونافیقان‌دا هات ، پێغەمبەری خوا ﷺ یەك لایی بوویەوە ؛ تا ئاوڕێك بەلای ئەو ئەعرابانەدا بداتەوە کە بە ناڕەوا دوای ئوحود دەستیان لە موسڵمانەکان وەشاند و ، هاتنە سەر ئەوەش کە جورئەت بکەن و هەڵمەت بەرنە سەر مەدینە .

ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ لە جومادیی یەکەمی ساڵی چوارەمی کۆچیی‌دا ، بە خۆی و چوارصەد موسڵمانەوە؛ هەڵمەتیان بردە سەر ناوچەی غەطەفان لە وڵاتی نەجد کە ئەکەوتە نێوان سەعد و شەقرە ، ئەمەش بۆ تەمێ‌کردنی ئەو ئەعرابانە لەناو جەرگەی ناوچەی خۆیان‌دا ؛ کە ئەوەبوو هەواڵ گەیشتبووە مەدینە کە نەوەی

---

[19] غزوة الأحزاب لباشميل : ٥٢ ـ ٧٣ ؛ السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٣٩٩ ـ ٤٠٥ ؛ الرحيق المختوم : ٣٠٠ ـ ٣٠٣ ، السيرة النبوية للصلابي : ٥٤٨ ـ ٥٦٢ .

موحاريب و نەوەی ثعلبە لە هۆزی غەطەفان ، موسڵمانەكانیان بەلاوە بێدەسەڵاتە و تەماعی ئەوەیان هەیە كە دەست لە مەدینە بوەشێنن و ، بۆ ئەمە خەریكی كۆكردنەوەی سوپان .

خێرا پێغەمبەری خوا ﷺ سوپای لە هاوەڵان جەم كرد و ، بە پەلە هەڵمەتی بردە سەریان ، چونكە ئەو هۆزانە زۆر جەنگاوەر بوون و ، بە ماوەیەكی كەم و بە ئاسانیی جەنگاوەری زۆریان كۆ ئەكردەوە و ، لە هەمان كاتیشدا زۆر داخ لە دڵی حكوومەتی مەدینە بوون و ، پیاوانی ئەم هۆزەش بڕبڕەی پشتی ئەحزاب بوون كاتێ كە هێرش كرایە سەر مەدینە .

شایانی باسە كە لە نێوان بەدر و ئوحوددا هەڵمەتێكی تر برایە سەر ئەم هۆزە بە ناوی ( ذي أمر ) .

كە موسڵمانەكان ویستیان لە مەدینە دەرچن پێغەمبەری خوا ﷺ عوثمانی كوڕی عەففانی لە ماوەی دەرچوونیدا كردە ئەمیری مەدینە .

بەڵێ لە مانگی جومادیی یەكەمی ساڵی چوارەمدا بەرەو ناوچەكە كەوتنە رێ . موسڵمانەكان دوو قۆناغیان بڕیی و گەیشتنە ( نەخلا ) ، ئەبینن وا غەطەفان سوپایان ئامادەیە ، بەڵام سوپایەكی زۆر .

هەر دوو سوپا لە یەك نزیك كەوتنەوە ، بەڵام هیچ لایەك دەستی بە هێرش نەكرد ، بەڵكو ماوەیەك بەبێ جەنگ بەرامبەر بە یەك وەستان ، تا ئەوەبوو سەرەنجام غەطەفان كشانەوە و ، پشتیان لە جەنگ كرد و ، بە چیاكاندا بڵاوەیان كرد . بەڵام موسڵمانەكان دوایان نەكەوتن ، بەڵكو بە پرژ و بڵاوبوونەوەیان وازیان لێ هێنان و ، موسڵمانەكان هیچ ماڵ و سامانێكی دوژمنیان دەست نەكەوت ، بەڵام چەند ئافرەتێك، وەك باوی ئەو سەردەمە ، كەوتنە دەست موسڵمانەكان .

لەم غەزایەدا ، لەبەر ئەوەی كە ماوەیەك هەردوو سوپا بەرامبەر بە یەك وەستان ، موسڵمانەكان ناچار بوون كە ( نوێژی ترس ) بەجێ بهێنن . جا غەطەفانییەكان ئەیانزانیی لە چەند كاتێكدا موسڵمانەكان نوێژ بە كۆمەڵ ئەنجام ئەدەن ، بۆ ئەمە كەوتنە چاودێریی ، بەو نیازەوە كە لە ناخلۆفدا هێرش بكەنە سەریان و دەستیان لێ بوەشێنن .

ئەوەبوو خوای گەورە وەحی بۆ پێغەمبەرەكەی ﷺ نارد تا نەخشەی نوێژی كاتی جەنگ پیشانی سوپای ئیسلام بدات .

ئەوەبوو ئایەتی ( ١٠٢ ) ی سوورەتی ( النساء ) هاتە خوارەوە و بە وردیی نوێژی ترسی پیشانی موسڵمانەکان دا :

﴿ وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُوٓا۟ أَسْلِحَتَهُمْ فَإِذَا سَجَدُوا۟ فَلْيَكُونُوا۟ مِن وَرَآئِكُمْ وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَىٰ لَمْ يُصَلُّوا۟ فَلْيُصَلُّوا۟ مَعَكَ وَلْيَأْخُذُوا۟ حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ ۗ وَدَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَٰحِدَةً ۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَن تَضَعُوٓا۟ أَسْلِحَتَكُمْ ۖ وَخُذُوا۟ حِذْرَكُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴾ ( النساء : ١٠٢ ) .

بە درێژایی مێژوو موسڵمانەکان بەم پێیە نوێژی کاتی جەنگیان ئەنجام ئەدا .

جا لەبەر ئەوەی کە سوپای دوژمن لەلای قیبلەوە نەبوو ، ئەوا پێغەمبەری خوا ﷺ سوپای هاوەڵانی لە کاتی نوێژدا کردە دوو بەشەوە : بەشێکیان دەست بە نوێژ نەکات بەڵکو بەرامبەر بە دوژمن بوەستێ و ، بەشێکیشیان خۆی ببێتە ئیمامیان و یەك رەکعەت نوێژیان پێ بەجێ بهێنێ . کاتێك کە هەڵ ئەسێتەوە بۆ رەکعەتی دووەهەم ئەو دەستەیە لێی جوێ ئەبنەوە و بۆ خۆیان رەکعەتی دووەهەم بەجێ ئەهێنن و ، پاشان لە ( مصلی ) ئەکشێنەوە و ، لە رووی دوژمندا ئەوەستن و ، بەشی یەکەم دێن و فریای رەکعەتێك ئەکەون و پێغەمبەری خوا ﷺ چاوەڕوان ئەبێ هەتا ئەوانیش رەکعەتی دووەهەم بەجێ ئەهێنن و فریای ( تشهد ) ی کۆتایی ئەکەون لەگەڵیا و پاشان پێکەوە سەلام ئەدەنەوە .

دوای ئەوەی سوپای ئەعراب بلاوەیان لێ کرد ، پێغەمبەری خوا ﷺ بە خۆی و سوپاکەیەوە بە سەرکەوتوویی بەرەو مەدینە گەڕانەوە ، کە ئەوەبوو ئەم غەزایە پانزە رۆژی پێ چوو و ، پێغەمبەری خوا ﷺ یەکێ لە هاوەڵانی بە ناوی جوعالی کوڕی سوراقە لە پێشەوە بەرەو مەدینە رەوانە کرد هەتا مژدەی سەرکەوتن بگەیەنێ بە مەدینە .[٢٠]

### حەوتەم : غەزای بەدری بچووك

لە مانگی شەعبانی ساڵی چوارەمدا ، بەرامبەر بە کانوونی دووەهەمی ساڵی ٦٢٦ ز ، موسڵمانەکان خۆیان کۆکردەوە تا بەرەو بەدر بکەونە رێ و لەوێ بە سوپای

[٢٠] غزوة الأحزاب لباشميل : ٧٣ ـ ٨٢ ، الرحيق المختوم : ٣٠٣ ـ ٣٠٤ .

مەككە بگەن ، ئەمەش تا لەبەردەم هەموو دنیادا بسەلمێ كە سوپای ئیسلام هەرگیز لە سوپای قورەیش سڵ ناكاتەوە و ، هەردەم ئامادەیە دەستی لێ بوەشێنێ و تەمێی بكات ..

ئەمە لەلایەكەوە ، لەلایەكی ترەوە سالّی پار لە كۆتایی جەنگی ئوحوددا ، سەر لە ئێوارە و بەر لە كشانەوەی سوپای قورەیش لە مەیدانی ئوحود ، ئەبوسوفیان بەڵێنی لە موسڵمانەكان وەرگرت كە ساڵێكی تر لەم رۆژەدا و لە بەدردا بە یەك بگەن و ، دەست بدەنە جەنگ ، تا یەكێكیان یەكێكیان بە زەویی‌دا بدات .

هەر دوولا خۆیان بۆ ئەو رۆژە ئامادە كرد ، هەر چەندە لە ماوەی ئەم ساڵەدا موسڵمانەكان تووشی چەندین كارەسات بوون وەك رووداوی دڵتەزێنی رەجیع و بیئر مەعوونە و ، چەند جەنگێكیش هاتنە بەردەمیان وەك : تەمێ‌كردنی نەوەی ئەسەد و، كوشتنی فەرماندەی هوذەیل و ، غەزای نەوەی نەضیر ، بەڵام قورەیش هیچی لەمانەیان نەهاتە رێ . خۆیان ئامادە كرد تا لە بەدردا غەزای بەدری دووهەم ئەنجام بدەن ، كەوا ئەخەملێنرا لە جەنگی یەكەم گەورەتر و سەخت‌تر بێت ، چونكە هەر دوولا هێز و سوپای زیاتریان ئامادە كردبوو .

ئەوەبوو ئەبوسوفیان سێ هەزار جەنگاوەری ئامادە كردبوو و ، لە ( الرحيق ) دا دوو هەزار هاتووە ، كە پەنجا ئەسپیان پێ بووە و ، قۆناغێك لە مەككەوە رێ ئەبڕن ، هەتا ئەگەنە ( الظهران ) و ، لە ( مـجنّة ) بار ئەخەن .

بەڵام سوپای موسڵمانان هەزار و پێنج صەد جەنگاوەر ئەبوو ، كە تەنها دە ئەسپیان پێ بوو .. پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی فەرماندە بوو و ، بەرەو بەدر كەوتە رێ و ، بەبێ وەستان سوپاكەی گەیاندە بەدر و ، لەوێ مۆڵگای دروست كرد . بەمە ئەو پێش قورەیش بەڵێنی خۆی بردە سەر .

لە رۆژی ئوحوددا ئەبوسوفیان یەكجار دڵ خۆش بوو ، بۆیە ئەو داوای كرد ، با ساڵێكی تر لە بەدردا بە یەك بگەن .. كە رۆژان تێ پەڕین و ، بریسكەی سەركەوتنی ساختە نەما و هۆشی بە خۆی‌دا هاتەوە كە سوپای مەككە ئەو سوپایە نیە بەرگەی گورزی كاریگەری سوپای مەدینە بگرێ ، گیری خوارد . لە لایەكەوە بەڵێنی داوە ، بگرە ئەو خۆی راوەشاندووە و داوای كردووە ، لە لایەكیشەوە ئەزانێ هەر لە یەكەم سەعات‌دا سوپاكەی تەفروتوونا ئەبێت و ئابڕووی هەتا هەتایی ئەچێت ، بۆیە پێی

خۆش بوو کارێك بكرێ ئەم دوو سوپایە بە یەك نەگەن و ، لەولاشەوە تەفرەدانی نەخرێتە ئەستۆی قورەیش .
ئەبوسوفیان کە ئەمەی ئەزانیی هەر زوو خەمی ئەو تەفرەدانەی خوارد .. بەر لەوەی سوپای مەدینە بکەوێتە رێ ، هەولّی دا تەفرەدانەکە بخاتە ئەستۆی موسڵمانەکان .
ئەبوسوفیان وای بە چاك زانیی بە پاگاندە ترس بخاتە دڵی سەربازانی مەدینەوە تا ئەوان نەیەن و بەڵێن بەسەر نەبردن بکەوێتە سەرشانی ئەوان .
بۆ ئەمە پیاوێکی ژیری قسەزانی وەك نوعەیمی کوڕی مەسعوودی ئەشجەعیی غەطەفانیی بە کرێ گرت تا بێت بۆ مەدینە و ، موسڵمانەکان سارد بکاتەوە و ورەیان بڕووخێنێ ، بەوەی کە سوپای مەککە یەکجار زۆرە و بە هیچ کەس چارناکرێ .
ئەبوسوفیان بە نوعەیمی وت : بۆم دەرکەوتووە کە دەرنەچم بۆ جەنگ و ، پێیشم ناخۆشە موحەممەد دەرچێت و من دەرنەچم ، چونکە ئەو کاتە موسڵمانەکان ئازاتر ئەبن . من پێم خۆشە دواکەوتن لەوانەوە دەربکەوێ ، نەك لە منەوە . جا تۆ بچۆ بۆ مەدینە و تێیان بگەیەنە کە ئێمە خەڵکێکی زۆرمان کۆ کردۆتەوە و ، ئەوان توانایان نیە لەگەڵمانا بجەنگن . ئەو کاتە تۆش ئەوەندە و ئەوەندە وشترت بەلای منەوە ئەبێت و بەسەر دەستی سوهەیلی کوڕی عەمردا تەسلیمت ئەکەم .
دوای ئەوەی سوهەیل بووە کەفیلی ئەبوسوفیان کە ئەو وشترانەی بداتێ ، نوعەیم بەرەو مەدینە کەوتە رێ و ، دەربارەی زۆریی سوپای ئەبوسوفیان دەستی بە پاگاندە کرد ، ئەمەش بۆ ترساندنی موسڵمانەکان . لەولاوە مونافیقان و جوولەکە پاگاندەکانی نوعەیمیان بڵاو ئەکردنەوە ، تا ئەوەبوو ترسێکی زۆر چووە دڵی موسڵمانەکانەوە ، بە رادەیەك کە خەڵکێك نیەتی دەرچوونیان نەبوو . بەمە جوولەکە و مونافیقان زۆر دڵخۆش بوون و ، ئەشیان وت : موحەممەد لە دەستی ئەو سوپایە رزگاری نابێت .
کاتێك کە ئەبوبەکر و عومەری جووتە وەزیری پێغەمبەری خوا ﷺ ، خوا لێیان رازیی بێ ئەم تۆقاندن و تەفرەدانەیان بیست ، بۆ ورە بەرزکردنەوە ، هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و هەولّیان لەگەڵدا ئەدا تا سوپا بەرەو بەدر بخاتە رێ ، تا بت پەرستان بە لاوازیان نەزانن و ، هەولّی لە ناوبردنیان بدەن . بۆیە فەرموویان : ئەی پێغەمبەری خوا ! خوای گەورە پێغەمبەرەکەی سەر ئەخات و ، دینەکەشی پایەدار

ئەکات . جا ئێمە بەڵێنێکمان بەو خەڵکە داوە و ، پێمان خۆش نیە لەو بەڵێنە دوا بکەوین ، تا ئەوان بە ترسنۆکیی بزانن . لە کاتی دیاریی‌کراودا تەشریف بەرە .. بەخوا ئەوە خێری تیایە ..

بەم غیرەتەی ئەبوبەکر و عومەر پێغەمبەری خوا ﷺ یەکجار شادمان بوو ، بۆیە موسڵمانەکانی ئاگادار کردن کە ئەگەر بە تاقی تەنیاش بووە ئەو خۆی بەرەو بەدر ئەڕوات ، کە فەرمووی: (( والذي نفسي بيده لأخرجنَّ وإن لم يخرج معي أحد )) . پاشان فەرمانی دا موسڵمانەکان خۆیان ئامادەی غەزا بکەن .

ئەوەبوو خوای گەورە ترس و لەرزی لە دڵی موسڵمانەکان دوور خستەوە و ، پیلانەکەی نوعەیمی کوڕی مەسعوودیش سەری نەگرت و ، موسڵمانەکان کەوتنە پێش بڕکێی خۆپێچانەوە و نزیکەی هەزار و پێنج‌صەد کەس کۆ بوونەوە و ، ئاڵاش درایە دەست عەلیی کوڕی ئەبوطالیب و ، ئەمیریی مەدینەش بە فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ سپێررا بە عەبدوڵلای کوڕی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول و ، لە ریوایەتی تردا بە عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە سپێرراوە .

موسڵمانەکان گەیشتنە بەدر و هەشت شەو لەوێ چاوەڕوانیی سوپای مەککەیان کرد ، بەڵام سوپای مەککە بە خۆی و فەرماندەکانیەوە ئەو پیاوە نەبوون بوێرن بێنە بەردەم سوپای ئیسلام ، بۆیە ناچار بوون قبووڵی هەموو سەرشۆڕی‌یەك بکەن بەو مەرجەی لە دەست و بازووی موسڵمانان رزگاریان بێت .

بە هەر حاڵ قوڕەیش گەیشتبوونە عوسفان ، لەوێ وەستان و ، فەرماندەکان لەوێ کۆبوونەوەیەکیان ئەنجام دا و ، سەرەنجام هاتنە سەر ئەو بڕیارە کە سوپای مەککە چیی تر بەرەو پێش نەڕوا و بگەڕێتەوە بەرەو مەککە .. بیانووشیان بۆ ئەم بڕیارە ئەوەبوو کە بارووذۆخیان بۆ جەنگ نەگونجاوە و ، ساڵەکەیان ساڵێکی وشکە و بۆ ئەوان دەست نادات جەنگی تیا بکەن . ئەوەبوو ئەبوسوفیان فەرماندەی گشتیی سوپای مەککە دەستی بە وتاردان کرد و ، تیایا فەرمانی بۆ سوپای مەککە دەرکرد کە بگەڕێتەوە کە وتی :

ئەی کۆمەڵی قوڕەیش ! ساڵێکی بە پیت بە کەڵکی ئێوە دێت کە گیا زۆر بێ و ئاژەڵەکانتان بلەوەڕێنن و شیر بۆ خواردنەوەتان زۆر بێ . بەڵام ئەم ساڵەتان ساڵێکی وشکە ، بۆیە من ئەگەڕێمەوە و ئێوەش بگەڕێنەوە .

یەك كەس ناڕەزایی لەم كشانەوەیە دەرنەبڕیی ، هەر هەموو گوێڕایەڵی وتارەكەی ئەبوسوفیان بوون و ، لە خوایان ئەویست ئەو شتی وەها بڵێ ، ئەگەرچیی شوورەیی یەخەیان پێ ئەگرێ ، بەڵام لەوە چاكترە بكەونە بەر پلاری سوپای ئیسلام و بە راست و بە چەپ‌دا لە دەشتی بەدردا كوژراویان لێ بخات و ، پاشماوەكانیش قۆڵ بەست بكات .

هەر لەوێوە گەڕانەوە و ، موسڵمانەكانیش ئەوەندەی كە پێویست بوو لە بەدر مانەوە و لەوێ ئەو هەشت رۆژە چاوەڕوان بوون و ، چیی كەل و پەلی بازرگانی‌یان پێ بوو لەوێ فرۆشتیان و لە هەموو درهەمێك‌دا دوو درهەمیان قازانج ئەكرد و ، پاشان بە سەری بەرزەوە ، بە شاهێدیی هەموو هۆزەكانی دوورگە بەرەو مەدینە گەڕانەوە و، ئەم غەزایەشیان ـ وەك هەڵمەتی ( حمراء الأسد ) ـ كردە شاهێدێكی تر لەسەر قورەیش كە ئەوان هەرگیز پیاوی ئەوە نین بچنە مەیدانی پاڵەوانەكانی ئیسلامەوە ، ئەگەرچیی زۆر بن و لە تفاقیش‌دا لە موسڵمانان زیاتر بن .

بەمە بۆ هەموو دوورگەیان سەلماند كە موسڵمانەكان لە رۆژی ئوحوددا نەدۆڕاون ، بەڵكو بە هۆی هەڵەیەكەوە چەند كەسێكیان لێ شەهید بوون و بەس . ئەوەتا ئەمڕۆش گەورەترین و رێك‌وپێك‌ترین سوپای دوورگە ، كە سوپای قورەیشە ناوێرێ بێتە مەیدانی سوپای ئیسلام . دەی كەواتە هیچ هێزێكی تری دوورگەش توانای نیە بێتە مەیدانی موسڵمانەكان ..

بەڵگەیەكیش بۆ دەسەڵاتی سوپای موسڵمانان لە ناوچەكەدا ، ئەوەیە كە مەخشیی كوڕی عەمری ضیمریی كە یەكێ بوو لە سەرۆك هۆزەكانی ناوچەی بەدر، هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ، ئەمەش لەو كاتەدا بوو كە موسڵمانەكان چاوەڕوانی هاتنی سوپای مەككە بوون و ، وەك بیانوو بگرێ وتی : ئەی موحەممەد! ئایا هاتووی لەسەر ئەم ئاوە لەگەڵ قورەیش‌دا بجەنگیی ؟ مەبەستی لە ئاوی بەدر بوو كە گوایا وا لە خاكی نەوەی ضیمرەدا .. شایانی باسە كە پێش غەزای بەدری گەورە ئەم هۆزانەی نەوەی ضیمرە پەیمانی دەست درێژیی نەكردنیان لەگەڵ موسڵمانەكان‌دا بەستبوو ..

كە سەرۆكی ئەو هۆزە ئەو قسەیەی كرد ، پێغەمبەری خوا ﷺ بەوپەڕی متمانە و هێز و تواناوە وەڵامی كابرای دایەوە و فەرمووی : (( نعم يا أخا ضمرة ، وإن شئت رددنا عليك ما كان بيننا وبينك ، ثم جالدناك حتى يحكم الله بيننا وبينك )) .

تێی گەیاند ئەگەر ئەیەوێ با ڕێك کەوتنەکەی نێوانیان بداتەوە دوا و ، پاشان دەست بدەنە یەخەی یەکتریی تا خوا یەکێکیان سەر بخات .
خێرا کابرا دەستی دایە وتەی نەرم و وتی : نە بەخوا ئەی موحەممەد شتی وەهامان ناوێت .[21]

**هەشتەم : ڕووداوی تری ساڵی چوارەم**

سەرەڕای ئەو هەموو ڕووداوانە کە لە ساڵی چوارەمدا هاتنە ڕێی موسڵمانان ، وەك لە پێشەوە باسمان کردن ، هەندێ ڕووداوی تریش ڕوویان دا و وا چاکە بیان خەینە بەردەم خوێنەری بەڕێز :

**( ١ ) کۆچی دوایی ئەبوسەلەمە :**

لەم ساڵەدا ئەبوسەلەمە ؛ عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولئەسەدی کوڕی هیلالی قورەیشیی مەخزوومیی ، کە دایکی ناوی بەڕڕەی کچی عەبدولموطەللیب بووە ؛ کۆچی دوایی کرد . واتە پوورزای پێغەمبەری خوا بووە و ، هەردووکیشیان برای شیریی بوون ؛ چونکە لە شیری ثوەیبەی کەنیزەکی ئەبولەهەب شیریان خواردبوو .. ئەبوسەلەمە یەکێ بوو لەوانەی کە زوو بە زوو لە مەککەدا موسڵمان بوو بوو .. لەگەڵ ئومسەلەمەی هاوسەریدا کۆچیان بۆ حەبەشە کرد و ، لەوێ لە وڵاتی حەبەشە چەند منداڵێکیان بوو . پاشان گەڕانەوە بۆ مەککە . یەکەم کەسێك بوو کە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بۆ مەدینە کۆچ بکات ، کەچیی کەسوکاری هاوسەرەکەی ئوم سەلەمەیان لە کۆچ کردن قەدەغە کرد ، پاشان دوای ساڵێك هێشتیان بگاتە لای مێردەکەی .

ئەبوسەلەمە بەشداریی غەزای بەدر و ئوحودی کرد و ، لە ئوحوددا زامدار بوو و، مانگێك خەریکی دەرمانکردنی زامەکەی بوو هەتا چاك بوویەوە . پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ لە موحەڕڕەمی ساڵی چوارەمدا کردیە فەرماندەی ئەو سریەیەی کە ناردیە سەر هۆزی ئەسەد تا تەمێیان بکات . لەو هەڵمەتەدا بە سەرکەوتوویی گەڕانەوە ؛ کە گەیشتنەوە مەدینە زامەکەی کولایەوە و سێ ڕۆژ لە مانگی جومادیی یەکەم مابوون کۆچی دوایی کرد . خوای گەورە لێی ڕازیی بێ .

[21] غزوة الأحزاب : ٨٢ ـ ٩٠ ؛ الرحيق المختوم : ٣٠٤ ـ ٣٠٥ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٢٤٣ ـ ٢٤٤ ؛ السيرة النبوية للصلابي : ٥٦٦ ـ ٥٦٨ .

رۆژێکیان ئوم سەلەمە بە ئەبوسەلەمەی مێردی وت : پێم گەیشتووە کە هەر ئافرەتێك مێردەکەی بمرێ و ئەهلی بەهەشت بێت و ، ژنەکەی شووی نەکردەوە ، خوا لە بەهەشتدا یەکیان پێ ئەگرێتەوە . دە وەرە با پەیمانت بدەمێ کە دوای من تۆ ژن مەهێنە و ، منیش دوای تۆ شوو نەکەم .

ئەبوسەلەمە وتی : ئایا گوێڕایەڵییم بۆ ئەکەی ؟ وتی : بەڵێ . وتی : ئەگەر من مردم تۆ شوو بکە . خوایە ! دوای من پیاوێك بە ئوم سەلەمە ببەخشە کە لە من چاکتر بێ ، کە نە خەفەتی بداتێ و ، نە ئازاری بدات .

کاتێك کە ئەبوسەلەمە مرد ، ئوم سەلەمە وتی : جا کێ لە ئەبوسەلەمە چاکترە؟ ئەوەندەی پێ نەچوو پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هێنا و ، لە دەرگادا وەستا و، خوازبێنیی ئوم سەلەمەی بەلای سەلەمەی کوڕیەوە کرد .حاشیە

( ٢ ) کۆچی دوایی عەبدوڵڵای کوڕی عوثمان :

لە مانگی جومادیی یەکەمی ساڵی چوارەمدا عەبدوڵڵای کوڕی عوثمانی کوڕی عەففان خوا لێی رازیی بێ کۆچی دوایی کرد ، کە لە خاتوو روقیەی کچی پێغەمبەری خوا بووبوو و ، تەمەنیشی شەش ساڵان بوو . ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر کرد و ، عوثمانی باوکیشی دابەزییە ناو قەبرەکەیەوە .

( ٣ ) لە دایك بوونی ئیمام حوسەین :

دوای چەند شەوێك لە مانگی شەعبانی ساڵی چوارەم ، حوسەینی کوڕی عەلیی لە خاتوو فاطیمە لە دایك بوو خوا لە هەموویان رازیی بێ ، کە سەرداری گەنجەکانی بەهەشتە .

پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ئەو و حەسەنی برای فەرموویە : (( هما ريحانتاي من الدنيا )) . هەروەها ئەوەش ریوایەت کراوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەردووکیانی بۆن ئەکردن و ماچیشی ئەکردن .

( ٤ ) شووکردنی زەینەبی کچی خوزەیمە :

لە مانگی رەمەزانی پیرۆزی ئەم ساڵەدا ، کە سیی و یەك مانگ بوو کۆچ بۆ مەدینە کرا بوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ زەینەبی کچی خوزەیمەی کوڕی حاریثی کوڕی عەبدوڵڵای مارە کرد ، کە لە سەردەمی نەفامییدا پێی ئەوترا : دایکی هەژاران ، بە بۆنەی ئەوەوە کە خێر و صەدەقەی زۆری ئەکرد و ، لەگەڵ هەژاراندا زۆر چاك بوو . لەوە و پێش زەینەب هاوسەری طوفەیلی کوڕی حاریثی کوڕی موطەللیب بوو ،

پاشـان مێردی بـە عوبەیدەی كوڕی حاریثی كوڕی موطەللیب كرد . موطەللیب بـرای هاشمی باپیری پێغەمبەرە ﷺ و ، عوبەیدەش یەكێ بوو لەو سێ كەسـەی كـە چوونە مەیدانی سێ قوڕەیشی‌یەكە لە جەنگی بەدردا بـۆ زۆرانبـازیی . ئـەوەبوو عـەلیی و حەمزە عوتبە و وەلیدی كوڕیان كوشت و عوبەیدەش بە دەستی شەیبە زامـدار بـوو و پاشان لە ڕێگا كۆچی دوایی كرد و ، بووە یەكێ لە شەهیدانی بەدر . لە ڕیوایـەتێكی تردا هاوسەری عەبدوڵلای كوڕی جەحش بووە كە پوورزای پێغەمبەر بووە و لە جەنگی ئوحوددا شەهید بووە .

زەینەب هەر لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ كۆچـی دوایـی كـردووە . هەنـدێكیش ئەڵێن تەنها هەشت مانگ هاوسەری پێغەمبەر بووە و ، چوارصەد دیرهەمی كردۆتـە مارەیی .

ئەم مارەكردنە لەبەر ڕێز و پایەداریی ئەو ئافرەتە بووە ، كە خێزانی موسڵمانێكی موهاجیری شەهید بووە ، سەرەڕای دڵ گوشادیی و سنگ‌فراوانی‌یەكەی بەرامبـەر بـە هەژاران و دەست‌كورتان ، ئەگینا وەنەبێ ئافرەتێكی گەنج یان جوان بووبێت ..

( ٥ ) شووكردنی ئوم سەلەمە :

هەروەها لە شەوالی ساڵی چـوارەمدا پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئوم سـەلەمەی مـارە كرد .. ئوم سەلەمە ناوی هیندی كچی ئەبوئومەییەی[٢٢] كوڕی موغیرەی مەخزوومیی قوڕەیشیی بـووە ، كـە ئـامۆزای خالیـدی كـوڕی وەلیـد بـووە . سـەرەتا هاوسـەری ئەبوسەلەمە ، عەبدوڵلای كوڕی عەبدولئەسـەدی كـوڕی هـیلالی كـوڕی عـەبـدوڵلای مەخزوومیی بوو كە ئامۆزای خۆی و بـاوكی منداڵـەكانی بـوو ، كـە لـە جومـادیی یەكەمی هەمان ساڵدا ـ وەك لە پێشـەوە باسمـان كـرد ـ كۆچیی دوایـی كردبـوو . شایانی باسە كە ئەبوسەلەمە و ئوم سەلەمە دوو كـوڕ و دوو كچـیان بـووە بـە نـاوی سەلەمە و عومەر و زەینەب و ڕوقیە .

لە پێشەوە عومەری كوڕی خەططاب خوا لێی ڕازیی بێ بۆ خۆی خوازبێنیی كـرد، چونكە ئوم سەلەمە خزمی دایكی بوو ، بەڵام ئوم سەلەمە عوزری بۆ هێنایەوە كە بە كەڵكی ئەو نایەت و ، منداڵیشی وردن ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی ناچار بوو بۆ دڵدانەوەی ئەو شێرەژنە خوازبێنیی بكات بۆ خۆی .

---

[٢٢] ئەبوئومەییە ناوی حوذەیفە یان سوهەیل بووە و ، نازناوی ( زاد الراكب ـ توێشووی كاروان ) یان لێ ناوە ، ئەویش لەبەر ئەوەی كە لە سەفەردا ئەبوا نان و مەسرەفی هەموو ئەوانەی كە لەگەڵیا بوون لەسەر ئەو بوایە .

ئیمام ئەحمەد لە ( المسند ) دا لە ئوم سەلەمەوە ریوایەتی کردووە کە وتوویە : رۆژێکیان ئەبوسەلەمە لە خزمەتی پێغەمبەری خواوە ﷺ گەڕایەوە و وتی : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمایشتێکم بیستووە دڵم پێی شادمان بووە « ئەیفەرموو: (( لا يصيب أحداً من المسلمين مصيبة فيسترجع عند مصيبته ثم يقولِ : أللهم آجرني في مصيبتي ، وأخلف لي خيراً منها ، إلا آجره الله ، وأخلف له خيراً منها )) . ئەی فەرموو : هەر یەکێ لە موسڵمانان موصیبەتێکی تووش ببێ و « بڵێ : (( إنا لله وإنا إليه راجعون )) ، پاشان بڵێ : خوایە ! لەسەر ئەم موصیبەتەم پاداشتم بدەرەوە و ، چاکتریش بخەرە شوێنییەوە بۆم ، ئەوا خوای گەورە پاداشتی ئەداتەوە و، چاکتریش ئەخاتە شوێنییەوە بۆی . ئوم سەلەمە ئەڵێت : منیش ئەوەم لەبەر کرد . کاتێ ئەبوسەلەمە کۆچی دوایی کرد (( إنا لله وإنا إليه راجعون )) م وت و « وتیشم : خوایە ! لەسەر ئەم موصیبەتەم پاداشتم بدەرەوە و ، چاکتریش بخەرە شوێنییەوە بۆم . پاشان بە خۆمدا هاتمەوە و وتم : جا لە ئەبوسەلەمە چاکترم چۆن دەست ئەکەوێ ؟!

کە عیددەم تەواو بوو پێغەمبەری خوا ماوەی خواست تا بێتە ژوورەوە و منیش خەریکی پێستە چاککردن بووم ، خێرا دەستم شۆرد و ، ماوەم دا و ، پشتی یەکم بۆی دانا کە بە ریشاڵ پڕ کرابوویەوە و ، لەسەری دانیشت و ، خوازبێنییمی کرد بۆ خۆی . کە لە فەرمایشتەکەی بوویەوە ، وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ! شتێ نیە کە من نەمەوێ شووت پێ بکەم ، بەڵام من ئافرەتێکی زۆر توورەم و ، ئەترسم شتێکم پێوە ببینی و خوا لەسەری سزام بدات . هەروەها من ئافرەتێکم چووم بە ساڵدا و ، منداڵیشم وردن .

فەرمووی : (( أما ما ذكرتِ من الغَيرةِ فسيذهبها الله عنك ، وأما ما ذكرت من السن فقد أصابني مثل الذي أصابك ، وأما ما ذكرت من العيال فإنما عيالك عيالي )) . فەرمووی : ئەو توورەیی‌یەی کە باست کرد ئەوا خوای گەورە لای ئەبات ، ئەویش بە دوعای پێغەمبەر خۆی وەك لە ریوایەتێکی تردا هاتووە .. ئەوەش کە چوویت بە ساڵدا « منیش وەك تۆ چووم بە ساڵدا .. ئەوەش کە منداڵت هەن « منداڵی تۆ منداڵی منن . وتی : خۆم دایە دەست فەرمانی پێغەمبەری خوا . ئوم سەلەمە ئەڵێت : خوای گەورە بە پێغەمبەری خوا ﷺ شوێنی ئەبوسەلەمەی بە چاکتر بۆ پڕ کردمەوە ..

ئەوەبوو سەلەمەی کوڕی ، ئوم سەلەمەی لە پێغەمبەری خوا ﷺ مارە کرد و ، منداڵەکانی لە ماڵی پێغەمبەردا پەروەردە کران و هەستیان بەبێ باوکیی و دەست کورتیی نەکرد ..

حیکمەتی مارەکردنی ئوم سەلەمە لەلایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ بۆ دڵ دانەوەی بووە ، کە هاوسەری پاڵەوانێکی ئیسلام بووە و ، لەگەڵ مێردەکەیدا کۆچی بۆ حەبەشە و بۆ مەدینە کردووە و ، سەرەنجام مێردەکەی بە شەهیدیی لە پێناوی ئیسلامدا سەری ناوەتەوە . ئەم ئافرەتە بەڕێزە نەهاتووە بە بیریدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ داوای بکات ، بۆیە کەسی تریش شك نابات بۆ ئەو جێی ئەبوسەلەمە بگرێتەوە ، چ جای لەو چاکتر بێت ، بە تایبەتیی ئەو کە ئافرەتێکە چووە بە ساڵدا و منداڵی وردیشی بەسەردا کەوتوون . هەتا عومەری کوڕی خەططاب کە داوای ئەکات شووی پێ ناکات . کەواتە بە تەمای شووکردن نەبووە، تەنها ئەوەندەیە کە فەرمایشتی پێغەمبەری نەشکاندووە و ، پێغەمبەریش بۆ دڵ دانەوەی ئەو و سەروکاریی منداڵەکانی مارەی کردووە .

ئوم سەلەمە ئافرەتێکی ژیر و زانا و ریوایەت کەری فەرموودە بووە . خزمەتێکی چاکی بە زانستی شەریعەت کردووە و ، هەندێ جاریش بە هۆی پرسیاری ئەوەوە ئایەتی قورئانی پیرۆز هاتوونەتە خوارەوە . ئوم سەلەمە لە ناو دایکانی ئیمانداراندا دوای هەموویان ، لە ساڵی شەصت و یەك یان دووی کۆچییدا ، دوای شەهیدبوونی ئیمام حوسەین ، کۆچی دوایی کردووە و ، سێصەد و هەشتا و هەشت فەرموودەی ریوایەت کردووە ، کە بوخاریی و موسلیم لەسەر سیانزە فەرموودەیان رێك کەوتوون و، بوخاریی بە تەنیا سیان و موسلیمیش بە تەنیا سیانزە فەرموودەی ریوایەت کردووە .

**( ٦ ) زەیدی کوڕی ثابیت و فێربوونی زمانی جوولەکە :**

لەم ساڵەدا زەیدی کوڕی ثابیت ، بە فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ فێری زمان و نووسینی جوولەکە بوو .

لە صەحیحی بوخارییدا ، لە خاریجەی کوڕی زەیدی کوڕی ثابیتەوە ، لە زەیدی کوڕی ثابیتەوە ریوایەت کراوە کە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بەسەردا داوە خۆی فێری نووسینی جوولەکە بکات ، بۆ ئەوەی کە ئەگەر نامەیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ نووسیی ئەو بۆی بخوێنێتەوە .. ئەوەبوو بە پانزە ڕۆژ فێری بوو .

له ( المسند ) ی ئیمام ئەحمەدیش‌دا هاتووه که کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هاته مەدینه زەیدیان برد بۆ لای و وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەمه منداڵێکی نەوەی نەججاره ( خاڵوانی پێغەمبەر ) ، ده و ئەوەنده سوورەتی له قورئان لەبەره . ئەمه سەرنجی پێغەمبەری راکێشا و فەرمووی : (( یا زید ! تعلم لي كتاب يهود ، فإني والله ما آمن يهود على كتاب )) . فەرمووی : ئەی زەید ! فێری نووسینی جووله‌که ببه ، چونکه بەخوا من دڵم له خوێندنەوه و نووسینی جووله‌که بێ‌خەم نیه .

زەید ئەڵێ : خوێندن و نووسینیان بۆ پێغەمبەری خوا فێر بووم . پانزه شەوی پێ نەچوو چاك شارەزای بووم .. ئیتر ئەگەر نامەیان بۆی بنووسیایه بۆم ئەخوێندەوه و ، که نامەشی بۆ بنووسینایه من له بری ئەو بۆم ئەنووسین .

ئەمەش ئەوپەڕی زیرەکیی و هێزی لەبەرکردنه ، چونکه شارەزابوونی نووسین و خوێندنەوەی هەر زمانێك ماوەیەکی زۆری پێویسته ، بەڵام خوا بەرەکەتی به زەید بەخشیوه . هەتا سریانی و عبرانیی چاك شارەزا بووه ، سەرەڕای ئەوەش که هەر له سەردەمی ئازیزدا هەموو قورئانی لەبەربووه و ، له نووسەره ناودارەکانی وەحیی بووه و ، له سەردەمی خەلیفه ئەبوبەکریش‌دا به تەنیا هەموو قورئانی نووسی‌یەوه و ، له سەردەمی خەلیفه عوثمانیش‌دا یەکێ بووه له کاتبانی موصحەف .[٢٣]

**نۆهەم : غەزای ( دومة الجندل )**

پێغەمبەری خوا ﷺ له بەدر گەڕایەوه .. ئەمن و ئاسایش بەسەر ناوچەکەدا ڕژا .. دەوڵەتی ئیسلامییش پەرەی ئەسەند و ، ڕۆژ به ڕۆژ خەڵکییش شەیدای عەدالەتی ئیسلام ئەبوو .. حکوومەتی مەدینه باخچۆڵەیەکی صەوز و گەشاوەی بیابانی گەرم و وشك و برینگ بوو .. هەموو کەسێ به ئاوات بوو بەو خۆشی‌یه بگات .. بەڵام هەندێ دڵپیس و زیانەخرۆ هەمیشه ئاژاوەیان ئەنایەوه ..

ئەوەبوو شەش مانگێك بەسەر بەدری بچووك‌دا تێپەڕیی ، هەواڵ گەیشته مەدینه که هۆزەکانی دەوروبەری ( دومة الجندل ) به شێوەیەکی دڕندانه لەگەڵ خەڵك‌دا ئەجووڵێنەوه .. ڕێ له ڕێبواران ئەگرن و ، هەر کەسێ هەرچی پێ‌بێ لێی ئەسێنن .. سەرەڕای ئەوەش خەریکی کۆکردنەوەی خۆیانن بەو نیازەی هێرش بکەنه سەر مەدینه .

---

[٢٣] السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٢٤٥ ـ ٢٤٩ ، السيرة النبوية للصلابي : ٥٤٢ ـ ٥٤٨ .

( دومة الجندل ) شوێنێکی دوور بوو لە مەدینەوە و ئەکەوتە باکووری خۆرئاوای دوورگەی عەرەبی‌یەوە کە پانزە تا شانزە شەو ڕێ دوور بوو لە مەدینەوە ، بەڵام پێنج شەو ڕێی ئەما بۆ دیمەشق .

جا پێغەمبەری خوا ﷺ عادەتی وەهابوو لە ناکاودا ئەی‌دا بەسەر ئەو ئەعرابە دواکەوتووانەدا و ، جەنگی ئەگەیاندە ناوچەکەی ئەوان . ئەوەبوو هێزێکی سووکەڵەی پێکەوە نا ، کە هەزار جەنگاوەر ئەبوون و ، بە پەلە بەرەو ( دومة الجندل ) خستنیە ڕێ و ، لە بەر نەشارەزایی موسڵمانان چاوساغێکیان بە ناوی ( مذکور ) بە کرێ گرت کە لە هۆزی عوذرە بوو ، ئەمەش پێنج شەوی مابوو مانگی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی پێنجەم کۆتایی پێ بێت .

پێغەمبەری خوا ﷺ بەر لەوەی مەدینە بەجێ بهێڵێ ، بە پێی فەرمانێکی پێغەمبەرایەتیی خۆی سەبباعی کوڕی عەرفەطەی غیفاریی [٢٤] کردە ئەمیری مەدینە، تا لە ماوەی دەرچوونی‌دا لە مەدینە ئەو چاودێریی کاروباری موسڵمانان بکات .

سوپای ئیسلام بە سەرکردایەتیی پێغەمبەری خوا ﷺ بە پەلە مەدینەی بەجێ هێشت و ، بە گورجیی ڕێگای ئەبڕیی تا لە ناکاودا بدات بەسەر دوژمن‌دا و بە خۆیان نەزانن . بۆ ئەمە بە ڕۆژدا خۆی حەشار ئەدا و ، بە شەودا ڕێی ئەبڕیی .

بەڵام دانیشتوانی ئەو ناوچانە ڕۆژێ پێش گەیشتنی موسڵمانەکان هەواڵیان زانیی و ، یەکسەر ترس و لەرز چووە دڵیانەوە و ، بە پەلە بلاوەیان لێ کرد و ، بۆ خۆدەربازکردن ماوا و مەنزڵیان بەجێ هێشت .

کە گەیشتنە ماوا و مەنزڵی چۆڵیان ، مەذکووری چاوساغی سوپا لەوەڕگای مەڕومالاتی ئەوەی تەمیمی پیشان دا . ئەوەبوو سوپای ئیسلام هەڵمەتی دایە سەر ئەو لەوەڕگایانە و بڕێکی زۆر لە مەڕومالاتیان دەست بەسەردا گرت و ، هەندێکیشی شوانەکان فڕاندیان و دەربازیان کرد .

کە گەیشتنە شوێنی نیشتەجێ‌یان کەسیان تێ‌دا نەدیی ، بۆیە چەند ڕۆژێك لەوێ هەڵیان دا و ، بە هەموو لایەك‌دا سریە و دەوریەیان نارد و هیچ کەسیان تێ‌دا

---

[٢٤] سەبباعی کوڕی عەرفەطەی غیفاریی ، لە مێژووی بچووکی بوخاریی‌دا ، لە ئەبوهورەیرەوە هاتووە کە وتوویە : هاتمە مەدینەوە و پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەیبەر بوو و ، سەبباعی کوڕی عەرفەطەی کردبووە ئەمیری مەدینە . ئەوەبوو نوێژی بەیانییمان لەگەڵیا بە دەنگی بەرز بەجێ هێنا . ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ کە دوو جار کراوەتە ئەمیری مەدینە .

نەدیی جگە لەوەی کە موحەممەدی کوڕی مەسلەمە تاقە پیاوێکی گرت و هێنایەوە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ، کە هەواڵی خەڵکەکەی لێ پرسین ، وتی: دوێنێ رایان کرد . پێغەمبەر ﷺ داوای لێ کرد موسڵمان ببێ ، ئەویش موسڵمان بوو .

ئەم هەڵمەتە سەرکەوتوانەیە کە شانزە شەویان پێ چوو هەتا گەیشتنە ئەوێ ، کارێکی یەکجار گرنگ بوو :

**یەکەم** : تا ئەو کاتە موسڵمانەکان بەرەو شام ئەوەندە لە مەدینە دوور نەکەوتبوونەوە ، کە تەنها پێنج شەو رێگای بۆ دیمەشق مابوو ، ئەمەش بەو نیازەوە کە دانیشتوانی ئەو ناوچانە دەنگ و باسی دینی تازە بزانن ، لەلایەکی تریشەوە تا قەیصەر ئاگادار بێ کە سوپای ئیسلام سڵ لە هیچ هێزێك ناکاتەوە و، رۆژبە رۆژیش بەهێزتر ئەبێ ..

**دووهەم** : بڕینی ئەو هەموو رێگایە راهێنان بوو بۆ سەربازانی ئیسلام تا خۆیان ئامادەی جیهادی وڵاتە دوورەکان بکەن و ، گەلانی سەرزەویی چاوەڕوانی رزگارکەرن ، بگاتە لایان و ، لە زوڵم و ستەم رزگاریان بکەن .

لە رێگای گەڕانەوەدا پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ سەرۆکی هۆزی فەززارەدا ، کە عویەینەی کوڕی حیصن بوو ، پەیمانی دەستدرێژیینەکردنی بەست . عویەینە دادی بێبارانیی و بێلەوەڕیی ناوچەی نەجدی کرد ، بۆ ئەمە پێغەمبەری خوا ﷺ رێی دا هۆزی عویەینە لە ناوچەیەکی موسڵماناندا ، کە سیی و شەش میل لە مەدینەوە دوور بوو ، ئاژەڵەکانیان بلەوەڕێنن . شایانی باسە کە پێغەمبەری خوا ﷺ عویەینەی ناو نابوو (( الأحمق المطاع ـ ئەحمەقی گوێڕایەڵیکراو )) ، چونکە هەزار پیاوی هۆزەکەی ، لەبەر دواکەوتوویی و نەزانییان بە کوێرانە شوێنی کەوتبوون .

لە کۆتایی ئەم هەڵمەتەدا سوپای ئیسلام گەیشتەوە مەدینە کە پەنجا شەو ، یان مانگێکی پێ چوو .[25]

**دەهەم ، غەزای نەوەی موصطەلەق**

ئەم غەزایە زۆری پێ نەچوو و ، جەنگێکی قورس و کاریگەریش نەبوو ، بەڵام رووداوی زۆر و سەیر تێدا روویان دا ، کە بوونە مایەی ناڕەحەتیی موسڵمانان و ،

---

[25] السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٢٥١ ـ ٢٥٢ ، الرحيق المختوم : ٣٠٥ ـ ٣٠٦ ، غزوة الأحزاب لباشميل : ٩٠ ـ ٩٣ ، السيرة النبوية للصلابي : ٥٦٨ ـ ٥٧١ .

ئاشکرابوونی پیلانی موونافیقان ، تا ئەوەبوو قورئانی پیرۆز دەربارەیان هاتە خوارەوە و ، بووە مایەی حەسانەوە و دڵئارامیی موسڵمانان و ، بەرزبوونەوەی وورەی ئیمانداران .

ئەم غەزایە بە پێی هەندێ ریوایەت لە مانگی شەعبانی ساڵی پێنجەمدا بووە و، بە پێی هەندێکیش لە مانگی شەعبانی ساڵی شەشەمدا بووە . واتە بە پێی رای یەکەم پێش غەزای خەندەق و لەناوبردنی جوولەکەی نەوەی قورەیظە و ، بە پێی دووهەمیش دوای هەردووکیان بووە .

دیارە بارودۆخی پێش غەزای خەندەق بۆ موسڵمانەکان جۆرێك بووە جیاواز لە بارودۆخی دوای ئەو غەزایەیان . چونکە هەڵمەتی سوپا گەورەکەی ئەحزاب کە لە جەنگاوەرانی قورەیش و هەموو عەرەبەکانی دوورگە پێك هاتبوو و ، جوولەکەی قورەیظەش پەیمانیان شکاند و چوونە پاڵیان ، ئەم هەڵمەتە گەورەترین تەکان بوو کە کوفر و بتپەرستیی دایانە خۆیان بۆ نەهێشتنی ئیسلام . جا ئەم هەڵمەتە هیچی پێ نەکرا ، ئیتر هیچ کەس لە بیری ئەوەدا نەبوو بێنە سەر مەدینە ، کەواتە ناگونجێ سەرداری نەوەی موصطەلەق دوای سوپای ئەحزاب سوپایەکی بچکۆلە رێك بخات و تەماعی هەبێ دەست لە حکوومەتی مەدینە بووەشێنێ .. ئەمە یەك ..

دووهەمیش سەرۆکی نیفاق پێش هاتنی سوپای ئەحزاب و پێش لەناوبردنی جوولەکەی قورەیظە جۆرێکی تر بیری ئەکردەوە و هەستی بە پاڵپشتی کافر و جوولەکە ئەکرد ، بەڵام دوای تێکشکانی ئەو دوو لایەنگیرەی ناتوانێ هەڕەشە بکا لە موسڵمانان ، وەك لە غەزای نەوەی موصطەلەقدا هەڕەشە ئەکات کە ئەگەر گەیشتنەوە مەدینە ئەبێ دەسەلاتدارەکان بێدەستەکان دەرپەڕێنن ..

کەواتە جێی خۆیەتی ئەم جەنگە پێش غەزای ئەحزاب و غەزای نەوەی قورەیظە رووی دا بێ .

هۆی ئەم غەزایەش ئەوەیە کە هەواڵزانانی سوپای ئیسلام ئەو هەواڵەیان گەیاندە پێغەمبەری خوا ﷺ کە حاریثی کوڕی ئەبوضیراری [٢٦] سەرۆکی نەوەی موصطەلەق [٢٧]

---

[٢٦] حاریثی کوڕی ئەبوضیراری کوڕی خوبەیبی کوڕی عائیذی کوڕی مالیکی کوڕی موصطەلەقی خوزاعیی ، فەرماندەی ئەم هۆزە بووە لەو جەنگە دۆڕاوەیدا . باوکی جوەیریەی دایکی ئیمان دارانە . دوای غەزای نەوەی موصطەلەق بە چاکیی موسڵمان بووە .

خەریکی کۆکردنەوەی سوپایە لە خزمەکانی و لەو هۆزانەی کە لێوەی نزیکن و گوێ ڕایەڵیی ئەکەن ، تا هێرش بکاتە سەر مەدینە .

خێرا پێغەمبەری خوا ﷺ یەکێ لە پیاوە وریا و گورج وگۆڵ و دڵسۆزەکانی بۆ ئەم کارە تەرخان کرد تا بزانێ ئەو هەواڵە ڕاستە یان نەء ، ئەو پیاوەش بورەیدەی کوڕی حەصیبی ئەسلەمیی بوو .[٢٨]

بورەیدە بەر لەوەی بچێت بە دەم کارەکەیەوە ، داوای لە پێغەمبەری خوا کرد تا ماوەی بدات درۆ لەگەڵ دوژمن‌دا بکات ، کاتێ کە لە ناوچەی ئەوان‌دا ناچار ئەبێ . ئەویش ماوەی دا ..

دوای چەند ڕۆژێکی کەم بورەیدە گەیشتە ناوچەی نەوەی موصطەلەق و ، کە ورد بوویەوە ئەبینێ هەواڵەکە ڕاستە . هەتا خۆی گەیاندە لای فەرماندە و ، بە ناوێکی تر و ، لە هۆزێکی ترەوە خۆی پێ ناساند و ، هەواڵی هێرشی مەدینەی لە دەمی حاریث وەرگرت و ، بە پەلە گەڕایەوە بۆ مەدینە .

کە هەواڵەکە ساغ بوویەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا هاوەڵان خۆیان ئامادە بکەن . ئەوەبوو بە سوپایەکی حەوت صەد نەفەری‌یەوە کە سیی ئەسپیان لەگەڵ‌دا بوو ، لە دووهەم ڕۆژی شەعبان‌دا ، کەوتە ڕێ و ، کۆمەڵێکی زۆریش لە موونافیقان کەوتنە گەلی و ، زەیدی کوڕی حاریثەی کردە ئەمیری مەدینە و ، سوپاکەشی کردە دوو بەشەوە :

بەشێکی کە موهاجیرەکان بوون ، ئاڵاکەیانی دایە دەست ئەبوبەکری صددیق خوا لێی ڕازیی بێ .

بەشێکیشی کە ئەنصارەکان بوون ، ئاڵاکەیانی دایە دەست سەرداری خەزرەج سەعدی کوڕی عویادە خوا لێی ڕازیی بێ .

---

[٢٧] نەوەی موصطەلەق لقێکی خوزاعەن کە قەحطانیین و لە دوای ڕووخانی بەندی مەئرەب لە یەمەنەوە کۆچیان کردووە. موصطەلەقی باپیرە گەورەیان ناوی جوذەیمەی کوڕی عەمری کوڕی ڕەبیعەیە ، کە لە سەردەمی نەفامیی‌دا لەگەڵ هوذەیلی عەدنانیی جەنگی بەناوبانگ لە نێوانیان دا ڕووی ئەدا ..

[٢٨] بورەیدەی کوڕی حەصیبی کوڕی عەبدوڵلای ئەسلەمیی ، لە کاتی کۆچ کردنی پێغەمبەردا ﷺ موسڵمان بووە . یەکێ لە هاوەڵە پایەدارەکان بووە . لە بوخاریی و موسلیم‌دا هاتووە کە لەگەڵ پێغەمبەردا شانزە غەزای کردووە . بورەیدە یەکێ بووە لە فەرماندەکانی فەتحی ئیسلامیی و، لە سەردەمی خەلیفە عوثمان‌دا خۆراسانی ڕزگار کردووە . لە سەردەمی خەلافەتی یەزیدی کوڕی موعاویەدا کۆچی دوایی کردووە .

بۆ ئەم غەزایە زۆرێك لە مونافیقان هاتبوون کە بۆ هیچ غەزایەکی تر ئەوەندە زۆر بەشدارییان نەکردبوو ، بە تایبەتیی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی سەرۆکی نیفاق .

سوپای ئیسلام بە پەلە کەوتە ڕێ تا لە ناخلۆف دا بدەن بەسەر دوژمندا .. لە ڕێگادا پیاوێکیان دەستگیر کرد کە گومانی لێ ئەکرا و هێنایانە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و ، کە پرسیاری لێ کرا دەرکەوت لە پیاوانی حاریثی کوڕی ئەبوضیرارە و بۆ سیخوڕیی ناردوویەتی تا هەواڵی سوپای ئیسلام بزانێت . دوای ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ هەوڵی دا موسڵمان ببێ ، کەچیی نەیویست موسڵمان ببێ . ئیتر لەسەر سیخوڕییەکەی کە لەسەری ساغ بوویەوە ، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دا بەسەر عومەری کوڕی خەططابدا تا بە شمشێر بدا لە ملی .

کە دەنگ و باسی هێرشی موسڵمانان و ، کوژرانی سیخوڕەکەی لەلایەن موسڵمانانەوە گەیشتەوە لای حاریثی کوڕی ئەبوضیرار و سوپاکەی ترسێکی زۆر چووە دڵیانەوە و ، چیی عەرەبی هۆزەکانی لەلا جەم بووبوون بلاوەیان لێ کرد .

سوپای ئیسلام لەسەر ڕەوتی خۆی بەردەوام بوو هەتا گەیشتە ناوچەی قودەید ، لە نزیکی کەناری دەریای سوور و ، لە ناکاودا گەیشتە لای نەوەی موصطەلەق کە لەسەر ئاوێکیان بەناوی مورەیسیع جەم بووبوون و ، سوپای ئیسلام لەوێ خستیان .

پێغەمبەری خوا ﷺ بەر لەوەی کە فەرمان بە جەنگ بدات فەرمانی بەسەر عومەردا دا تا ڕوو لە نەوەی موصطەلەق بکات و داوای موسڵمانبوونیان لێ بکات، تا خوێن و سامانیان پارێزراو بن .. چونکە ئەوان لە کۆکردنەوەی سوپادا دەست پێش خەرییان کردبوو .

عومەر بەرامبەریان وەستا و بانگی کرد : ئەی نەوەی موصطەلەق ! بڵێن : (( لا إله إلا الله )) تا خۆتان و سامانتان بپارێزن . کەچیی ئەوان ملیان بادا و بە کوفر و جەنگ ڕازیی بوون .

پاشان هەردوو لا دەستیان کرد بە تیر وەشاندن و ، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی هێرشکردنی بە موسڵمانەکان دا و ، ئەوانیش بە وێنەی پڵنگ هەڵمەتیان دا و، خێرا چوار دەوری سوپای نەوەی موصطەلەقیان گرت و ، پیاوێکیان لێ دەرنەچوو.

سوپای دوژمن دوای ئەوەی کە دە کەسیان لێ کوژرا ، هەر هەموویان خۆیان دا بە دەستەوە و دیل کران . پاشان سوپای ئیسلام دەستی بەسەر ماوا و مەنزڵیاندا گرت و، هەرچیی ئەسپ و وشتر و مەڕوماڵاتێکیان هەبوو هێناو ژن و منداڵەکانیشیان بە

دیل گیران . بەڵام لە سوپای موسڵمانان تەنها پیاوێك كوژرا كە ناوی هیشامی كوڕی صەبابە بوو ، كە ئەوەبوو پیاوێكی ئەنصاریی شەهیدی كرد چونكە نەی‌ناسی بوو و ، لەو وایە جەنگاوەری دوژمنە . دروشمی موسڵمانان ڕۆژی جەنگی مورەیسیع ئەمە بوو: ((یا منصور ! أمِتْ ، أمِتْ )) .

دەستكەوتەكانی ئەم غەزایە یەكجار زۆر بوون .. دوو هەزار سەر وشتر و ، پێنج هەزار سەر مەڕ و ، ژن و منداڵی دیل حەوت صەد كەس كە یەكێكیان جوەیریەی كچی حاریثی سەرداریان بوو .

كە دەستكەوتەكان كۆ كرانەوە و، دەست و پێی پیاوە جەنگاوەرەكان بەستران ، لە مەیدانی جەنگ‌دا دەستكەوتەكان بەسەر موسڵمانان‌دا بە پێی یاسای جەنگ لە ئیسلام‌دا بەش كران . ئەوەی ئەسپ سوار بوو سێ بەشی وەر ئەگرت ، دوو بەش بۆ ئەسپەكەی و بەشێك بۆ سوارەكە و ، پیادەش بەشێكی وەرئەگرت ، ئەمەش دوای ئەوەی كە پێغەمبەری خوا ﷺ پێنج‌یەكی ، بە پێی قورئان ، بۆ خۆی دانا ، تا بە پێی بەرژەوەندیی گشتیی سەرفی بكات .

بەڵام دیلەكان هەندێكیان بەبێ بەرامبەر بەر دران و ، هەندێكیش هەر لە مەیدانی جەنگ‌دا كەس‌وكاریان فیدیەیان بۆ هێنان و ئازاد كران و ، هەندێكیشیان هێنرانەوە بۆ مەدینە .

یەكێ لەوانەی كە بە دیل گیرا بوون جوەیریەی كچی حاریث بوو كە لە ریوایەتێك‌دا وەها هاتووە كە بەر ثابیتی كوڕی قەیس ، یان ئامۆزایەكی كەوتووە .. جوێریە پێی خۆش نەبوو ، كە كچی سەرداری هۆزەكەی بێت، ببێتە كەنیزەك، بۆیە بە ( مكاتبة ) لەگەڵ ثابیت‌دا رێك كەوت تا مەبلەغێك پارەی بداتێ و ئازادی بكات . پاشان دێتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەڵێت : ئەی پێغەمبەری خوا ! من جوەیریەی كچی حاریثی كوڕی ئەبوضیرارم ، كە سەرداری هۆزەكەیەتی . ئاگاشت لێ‌یە كە تووشی چ بەلایەك بووم .. بەر ثابیتی كوڕی قەیس ، یان ئامۆزایەكی كەوتووم . منیش بۆ ئازادكردنم بە ( مكاتبة ) لەگەڵی رێك كەوتووم و ، هاتووم بۆ ئەم ( مكاتبة ) یەم داوای یارمەتییت لێ ئەكەم .[29]

---

[29] لە ریوایەتێكی تردا ( سیرة إبن هشام : ٢ / ٢٩٥ ) وەها هاتووە كە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ رێزنان لێی ، كە كچی سەرۆكی هۆزەكەیانە ، نەی‌داوە بە هیچ كەس هەتا باوكی هاتووە و ، وشتری هێناوە بۆ فیدیەدانی كچەكەی . كە حاریث ئەگاتە ( عقیق ) ـ شیوی نزیكی مەدینە ـ لەوێ دوان لە وشترەكان لا ئەدات ، گوایە زۆر بەنرخیان ئەزانێ . كە

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم هەڵوێستەی بە هەلێکی چاك زانیی بۆ موسڵمانبوونی هۆزی نەوەی موصطەلەق تا لە کافریی و لە دیلیی ڕزگاریان بێ . ئەوەبوو کە جوەیریە داوای یارمەتیی بۆ ئازادبوونی کرد ، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو : «فهل لك في خير من ذلك ؟» . فەرمووی : ئەی ئایا لەوە چاکترت ناوێ ؟ وتی : ئەوە چی‌یە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی : « أقضي عنك كتابتك وأتزوجك » . فەرمووی : پارەی ( مكاتبة ) کەت بۆ بدەم و مارەت بکەم . وتی : باشە .

کە ئەم دەنگ‌وباسە بە ناو خەڵكدا بڵاو بوویەوە و ، بیستیان کە پێغەمبەری خوا ﷺ جوەیریەی مارە کردووە ، وتیان : خەزوورانی پێغەمبەری خوا بکرینە کۆیلە ؟!! هەر کەسە لە ئاستی خۆیەوە چیی دیلی بەلاوە بوو ئازادی کردن .

خاتوعائیشە ئەم باسەی ڕیوایەت کردووە ئەڵێت : بە مارەکردنی جوەیریە لە نەوەی موصطەلەق صەد خانەوادە ئازاد کران . بە ڕاستیی هیچ ئافرەتێك شك نابەم فەڕ و بەرەکەتی بۆ کەس‌وکاری لەو زیاتر بوو بێت .

ئەوەبوو نەوەی موصطەلەقیش ئەم ڕەفتارە جوانانەی پێغەمبەر و هاوەڵانیان بینیی هەرهەموویان بە ویستی خۆیان موسڵمان بوون و ، بوونە سەربازی ئیسلام .

شایانی باسە کە لەوانەی بە دیلیی کەوتنە دەست موسڵمانان هیچ کەسیان لێ نەکوژرا ، بەڵکو هەر هەموویان ئازاد کران .

لە ڕاستیی‌دا خاتوجوەیریە ئافرەتێکی شایان بوو کە ببێتە هاوسەری پێغەمبەری خوا ﷺ و دایکی ئیمان‌داران .. چونکە هەر شتێکی لە دین ئەبیست فێری ئەبوو و، هەرچییشی بزانیایە ڕەفتاری پێ ئەکرد .. ئافرەتێکی زانای خواناس و خاوەن تەقوا و وەرەع و ، دڵ پاك و سینەساف و ، ژیر و بەسەلیقە بوو و ، خوا و پێغەمبەری خۆش ئەویستن و ، خێر و چاکەی بۆ موسڵمانان ئەویست .

خاتوجوەیریە فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ ڕیوایەت کردووە ، کە ئیبن عەبباس و ، عوبەیدی کوڕی سەبباق و ، ( کریب ) ی بەندەی ئازادکراوی ئیبن

---

گەیشتە خزمەتی ، پێغەمبەر پێی فەرموو : « أين البعيران اللذان غيبتهما في شعب كذا ؟ » . ئەفەرموێ : ئەو دوو وشترەی کە لە فلان شیودا شاردنتەوە کوان ؟ کە حاریث ئەمەی بیست خۆی پێ نەگیرا و شاهێدیی حەقی وت و موسڵمان بوو و وتی : بەخوا ، جگە لە خوا کەس ئاگای لەوە نەبووە . ئەوەبوو دوو کوڕی و کۆمەڵێ لە خزمانی لەگەڵی موسڵمان بوون و ، ناردی بە دوای دوو وشترەکەدا و تەسلیمی کردن و ، کچەکەی پێی درایەوە و ، ئەویش موسڵمان بوو و، پێغەمبەری خوا ﷺ لەلای باوکی خوازبێنیی کرد و ، ئەویش لێی مارە کرد .

عەبباس و ، موجاهید و ، ئەبوئەییووب یەحیای کوڕی مالیکی ئەزدیی لێیان وەرگرتووە .

خاتوجوەیریە زۆر خەریکی ذیکر و تەسبیحات بووە .. نزا و پاڕانەوە و ، لالآنەوەی لە حزووری خوادا زۆر بووە . خۆی بۆمان ئەگێڕێتەوە کە : پێغەمبەری خوا ﷺ بەیانیی زوو ، دوای بەجێهێنانی نوێژی بەیانیی ، لەلای جوەیریە دەر ئەچێت و ئەویش لە شوێنی خواپەرستی‌یەکەیدا ئەبێت . پاشان دوای ئەوەی کە نوێژی چێشتەنگاوی بەجێ هێنابوو ئەگەڕێتەوە مالّەوە ، هێشتا جوەیریە لە شوێنی خۆیدا دانیشتبوو . فەرمووی : (( ما زلت على الحال التي فارقتك عليها ؟ )) . فەرمووی: هێشتا لەو شوێنەتدای کە بەجێم هێشتی؟ وتی: بەلّێ . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( لقد قلت بعدك أربع كلمات ، ثلاث مرات ، لو وُزِنَت بما قلتِ منذ اليوم لوزنتهن : سبحان الله وبحمده عدد خلقه ، ورضا نفسه ، وزنة عرشه ، ومداد كلماته )) .[30] فەرمووی : دوای تۆ چوار وشەم سێ جار وتۆتەوە ، ئەگەر کێشانە بکرێن بەو ذیکر و ویردەی ئەم بەیانی‌یە تۆ وتووتە وەك کێشی ئەو دەرئەچن . یەکەم: (( سبحان الله وبحمده عدد خلقه )) ، دووهەم : (( ورضا نفسه )) ، سێهەم : (( وزنة عرشه )) ، چوارەم : (( ومداد كلماته )) .

خاتوجوەیریە خوا لێی رازیی بێ لە سالّی پەنجا یان پەنجا و شەشی کۆچیی‌دا کۆچی دوایی کردووە .

لە کاتی گەڕانەوەدا لە غەزای نەوەی موصطەلەق موسلّمانەکان تووشی دوو رووداوی گەورە بوون ، کە هەریەکەیان تاقیی‌کاری‌یەکی گەورە بوو بۆ کۆمەلّی موسلّمان .. لە هەر دوو رووداوەکەدا مونافیقان دەوری وێرانکاری‌یان بینیی و بێبەزەیی‌یانە پێیان خۆش بوو لەرزە بە دەولّەتی نەونەمامی موسلّمانان بخەن .

یەکەمیان خەریك بوو ئاژاوەیەکی گەورە لە نێوان موسلّماناندا بەرپا ببێ ، ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ بە ژیریی و سەلیقەی خۆی فریای بارودۆخەکە نەکەوتایە..

دووهەمیشیان ئەو بوختانە نەشیاوە بوو کە مونافیقان خستیانە دوای خاتو عائیشە و سەرەنجام قورئان بووە شاهیدی پاکیی و پاكداوێنیی خاتو عائیشە و ، بەو بۆنەشەوە شەریعەت ئامۆژگاریی خۆی بە موسلّمانان پێشکەش کرد ..

---

[30] مسلم ، كتاب الذكر والدعاء ، باب التسبيح أول النهار رقم ( ٢٧٢٦ ) .

**ڕووداوی یەکەم : بەرپابوونی ئاژاوە**

لە کاتێك‌دا کە موسڵمانان لەسەر ئاوی ( مورەیسیع ) خەریکی ئاودان بوون ، عومەری کوڕی خەططاب غولامێکی لەگەڵدا بوو بە کرێی گرتبوو و جڵەوی وڵاغەکەی بۆ ڕا ئەکێشا ، ناوی جەهجاهی کوڕی مەسعوودی غیفاریی بوو ، لەگەڵ سینانی کوڕی وەبری جوهەنیی ، کە هاوپەیمانی خەزرەج بوو ، لەسەر ئاودانەکە تێ گیران و ، دەستیان دایە لێدانی یەکتریی . دوای ئەوە کابرای جوهەنیی هاواری کردە ئەنصار و ، کابرای غیفارییش هاواری کردە موهاجیرین .. هەردوولا کۆبوونەوە و خەریك بوو دەست بدەنە یەخەی یەکتریی و بە شەڕ بێن . خێرا پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی بردە لایان و دەستی دایە ئامۆژگاریی کردنیان و فەرمووی : (( أبدعوى الجاهلية وأنا بين أظهركم ؟ دعوها فإنها منتنة )) . فەرمووی : من وام لە نێوانتان‌دا و بە ئیسلام بوونەتە برا و ، تازە ئەگەڕێنەوە سەر کار و کردەوەی نەفامیی ؟ واز لە دەمارگیریی و پەرتەوازەیی بهێنن ئەوە شتێکی بۆگەنە .

بەم شێوەیە هەر دوولای دامرکاندنەوە و ئاوی بەسەر ئاگرەکەدا کرد .

ئەم دەنگ و باسە گەیشتە سەرۆکی نیفاق عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی و ، ئەویش لە بیانوو بوو تا شتێکی وەهای دەست بکەوێ و ئاژاوەیەکی پێ دروست بکات . لەو کاتەدا لە نێوان کۆمەڵێك خزمی‌دا دانیشتبوو و ، لە ناو دانیشتووەکانیش‌دا منداڵێکی بچکۆلەی ئیمان‌دار دانیشتبوو ، کە ناوی زەیدی کوڕی ئەرقەم بوو . سەرۆکی نیفاق بە تووڕەیی‌یەوە وتی : شتی وەهایان کردووە ؟ بە ڕاستیی زۆریان بۆ هێناوین و ، لە وڵاتەکەمان‌دا پەڕەیان سەندووە ، بەخوا ئێمە و ئەوان وەك ئەوەمان لێ هاتووە کە پێشینە وتوویانە : (( سَمِّن كلبَكَ يأكُلْكَ )) واتە : صەگەکەت قەڵەو بکە تا بت‌خوا . بەخوا کە گەڕاینەوە بۆ مەدینە ئەبێ ئەوەی دەسەڵات‌دارە بێ‌دەسەتەکان دەربپەڕێنێ . پاشان رووی کردە ئامادەبووان و پێی وتن : ئەمە خۆتان بە خۆتان کرد .. هێناتاننە وڵاتەکەتانەوە و ، ماڵ و سامانتان لەگەڵیان بەش کرد . دە بەخوا ئەگەر ئەوەی وا لە دەستتان‌دا لێ‌یان بگرنەوە و بۆیان خەرج نەکەن بار ئەکەن بۆ شوێنێکی تر .

زەیدی کوڕی ئەرقەمی بچکۆلە ، لەبەر منداڵیی هیچ حیسابێکی بۆ نەکرا ، چونکە گوێ‌گرانی تر هەموویان موونافیق بوون ، لە وتەکەی سەرۆکی نیفاق بێ‌دەنگ بوون ، بەڵام زەیدی ئیمان‌دار ئەمەی بە ناپاکیی لە قەڵەم دا بۆ سەرۆکی نیفاق و ، بۆ

خۆیشی بە ناپاکیی ئەزانیی ئەگەر نەی گەیەنێتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ . سەرەتا هەواڵەکەی گەیاندە لای سەعدی کوڕی عوبادە ؛ کە لەبەر ئەوەی سەرۆکی خەزرەج بوو حیسابی مامەی بۆ ئەکرد و ئەویش گەیاندیە لای پێغەمبەری خوا ؛ کە عومەری بەلاوە بوو .

عومەر داوای کرد فەرمان بە عەببادی کوڕی بیشر بدرێ تا بی کوژێ . بەلام پێغەمبەری خاوەن رەوشتی بەرز و ، پیاوی دامەزراو و دووربین ؛ وتەکەی عومەری بە دڵ نەبوو و فەرمووی : (( فكيف يا عمر إذا تحدث الناس أن محمداً يقتل أصحابه، ولكن أذن بالرحيل )) . فەرمووی : عومەر ! شتی وا چۆن ئەبێ ؟ خەڵك بڵێن : موحەممەد هاوەڵانی خۆی ئەکوژێتەوە .. فەرمان بدە با بکەوینە رێ .

بەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵەکەی زۆر پێ ناخۆش بوو و رەنگی دەم و چاوی گۆڕرا . بەلام ئەو پێویستە بەرگەی لەوە زیاتریش بگرێ . پێویستە نەهێڵێ فیتنە و ئاژاوە سەر دەربهێنێ ، بۆیە وەهای دەرخست کە گومانی لە وتەکانی زەید هەیە ، چونکە منداڵە ؛ بۆیە پێی فەرموو : (( يا غلام ! لعلك غضبت عليه )) . فەرمووی : رۆڵە ! لەوانەیە لێی زیز بووبی . وتی : بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا ! گوێم لێی بوو وای ئەوت . فەرمووی : (( لعله أخطأ سمعك )) . فەرمووی : لەوانەیە خراپ تێ گەیشتبی .

چەند پیاوێکی خەزرەجیی خزمی زەید هاتن و لۆمەی زەیدیان کرد و وتیان : چۆن قسە بە دەم سەرداری خزمەکانتەوە هەڵ ئەبەستی بێ ئەوەی شتی وەهای وتبێ ؟ زەید وتی : بەخوا گوێم لێی بوو و وەهایشی وت ، خۆ ئەگەر ئەو قسەیە لە باوکیشم ببیستم ئەی گەیەنمە پێغەمبەری خوا ﷺ و ، هیواداریشم خوای گەورە بۆ دەرخستنی راستیی قسەکەی من وەحی بۆ پێغەمبەرەکەی بنێرێ .

کاتێك کە سەرۆکی نیفاق ئەوەی کەوتە گوێ کە زەیدی کوڕی ئەرقەم هەواڵەکەی بە پێغەمبەری خوا گەیاندووە ، بە پەلە خۆی گەیاندە خزمەتی پێغەمبەر و ، سوێندی بەخوا خوارد کە شتی وەهای نەوتووە و باسی نەکردووە .

هەندێ لەوانەش کە لەوێ ئامادە بوون لە دۆستانی سەرۆکی نیفاق وتیان : لەوانەیە ئەو منداڵە باسەکەی لێ تێك چووبێ و ، چاك قسەکەی وەرنەگرتبێ کە کابرا چیی وتووە . ئەمەش بۆ رازیی کردنی دڵی پێغەمبەر و لادانی ئەو تاوانە لە کوڕی ئوبەی .

هەتا هەندێ لە گەورە پیاوانی خزمانی سەرۆکی نیفاق هاتن بۆ لای و وتیان : ئەگەر شتی وەهات وتووە کە لێتی ئەگێڕنەوە ، ئەوا بە پێغەمبەری بڵێ ، تا داوای لێخۆشبوونت بۆ بکات ، نەك ئینکاریی بکەیت و ، دواییش لەو بارەوە قورئان بێتە خوارەوە و بکەویتە درۆوە . ئەگەر نەشت وتووە بچۆرە خزمەتی و عوزری بۆ بهێنەرەوە . کەچیی سوێندی بۆ خزمەکانیشی خوارد کە شتی وەهای نەوتووە و ، پاشان ئەوەبوو چووە خزمەتی پێغەمبەریش و سوێندی بۆ ئەویش خوارد .

پێغەمبەری خوا ﷺ وەك فەرماندەی باڵای سوپا و ، سەرۆکی دەوڵەتی لێ پرسراو، کە ئەو بارودۆخەی بەو شێوە بینیی و ، کە سەرنجی دا ئاگری ئاژاوە خەریکە خۆش بکرێ ، وای بە چاك زانیی هەنگاوێکی ژیرانە بنێ تا خەڵکەکە بپەشۆکێنێ و ، لەو باسە بگەڕێن .

ئەوەبوو فەرمانی دا سوپای ئیسلام بە پەلە بکەوێتە رێ .. لە یادمان نەچێ کە سوپا ئەرکی گرانە : خەڵکێکی زۆری نەوەی موصطلەق دیلن و ، مەڕوماڵاتێکی زۆریش دەستکەوت بووە و ، سوپای ئیسلام لەو ناوچانەدا کە لە مەککەوە نزیك ترە لەوەی کە لە مەدینەوە نزیك بێت ، یەکجار بەسام و هەیبەتە . بەرەو مەدینە کەوتنە رێ .. نزیکەی سیی سەعات سوپا بەڕێوە چوو ، بەبێ وەستان .. بۆ ئەوەی خەڵکەکە یەکجار ماندو و هیلاك بن و ، خەڵکەکە بیریان بە لای وتە ناشیرینەکەی سەرۆکی نیفاقەوە نەمێنێ .

ئیبن کەثیر ئەڵێت : پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو رۆژە هەتا ئێوارە و ، شەو هەتا بەیانیی و شتێکیش لە رۆژ رۆیشت خەڵکەکەی بەڕێوە برد ، هەتا خۆر گەرمی کرد و ئازاری خەڵکەکەی ئەدا ، ئیتر باریان خست . هەر ئەوەندە بوو تلان بە زەوییەوە یەکسەر خەویان پیا کەوت . پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمەی بۆیە کرد تا خەڵکەکە لە باس‌کردنی قسەکەی دوێنێی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی بپەشۆکێنێ .

کە پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتە رێ ئوسەیدی کوڕی حوضەیری تووش بوو ، کە یەکێ بوو لە سەردارانی ئەوس و ، سەلامی لێ کرد و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا! لە کاتێکدا کەوتیتە رێ ، لەوەو پێش لە کاتی وەهادا نەئەکەوتیتە رێ . پێی فەرموو : (( أو ما بلغك ما قال صاحبكم ؟ )) . فەرمووی : ئەی پێت نەگەیشتووە خزمەکەتان چیی وتووە ؟ وتی : چ خزمێکمان ئەی پێغەمبەری خوا ؟ فەرمووی : (( عبد الله بن أبيّ )) . وتی : چیی وتووە ؟ فەرمووی : (( زعم أنه إن رجع إلى المدينة ليخرجنَّ الأعز

منها الأذلّ )) . فەرمووی : وەهای دەربڕیوە کە ئەگەر گەڕایەوە مەدینە ، ئەوەی دەسەلاّتدارە بێدەسەلاّتەکان دەربپەڕێنێ . وتی : دەی بەخوا ، ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەگەر بتەوێ تۆ ئەو دەرئەپەڕێنی . بەخوا ئەو بێدەسەلاّت و زەلیلە و ، تۆش دەسەلاّتدار و عەزیز .

پاشان وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! نەرمیی لەگەڵدا بەکار بهێنە . بەخوا کاتێک کە خوا تۆی کردە خەلاّتی ئێمە ، خزمەکانی تاجیان بۆ ئەهۆنییەوە تا بیکەنە پادشا . بۆیە ئەو وەها ئەبینێ کە تۆ پادشایەتییت لێ سەندووە .

ئەم باسە ئەیسەلمێنێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە تەواوەتیی بڕوای بە زەیدی کوڕی ئەرقەم کردووە ، بەلاّم لەبەر پەڕەنەسەندنی باسەکە پێی فەرمووە : (( لعلك غضبت عليه )) یان : (( لعله أخطأ سمعك )) .

لەم رووداوەدا خوای گەورە سوورەتی (( المنافقون )) ی بە تەواویی ناردە خوارەوە، کە لە ئایەتی ( ٧ و ٨ ) دا ئەفەرموێ :

﴿ هُمُ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ لَا تُنفِقُواْ عَلَىٰ مَنۡ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ حَتَّىٰ يَنفَضُّواْۗ وَلِلَّهِ خَزَآئِنُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَٰكِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ لَا يَفۡقَهُونَ ۝٧ يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعۡنَآ إِلَى ٱلۡمَدِينَةِ لَيُخۡرِجَنَّ ٱلۡأَعَزُّ مِنۡهَا ٱلۡأَذَلَّۚ وَلِلَّهِ ٱلۡعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَلَٰكِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ لَا يَعۡلَمُونَ ﴾ ( المنافقون : ٧ ـ ٨ ) .

سوورەتەکە هاتە خوارەوە تا هەڵوێستی هیچ و پووچی ئەو دلاّنە کە لە ئیمان خاڵیین دەربخات ، کە سەرەنجامیان هەر سەرشۆڕییە . بە تایبەت ئەو دوو ئایەتە : حەوتەم و هەشتەم بە جوانیی وتەکانی سەرۆکی نیفاقیان سەلماند ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی دایە گوێی زەیدی راستگۆ و فەرمووی : (( هذا الذي أوفى الله بأذنه )).

بەر لەوەی سوپای ئیسلام بگاتەوە مەدینە ، ئەم دەنگ و باسەی عەبدوڵلاّی کوڕی ئوبەی گەیشتەوە لای عەبدوڵلاّی کوڕی عەبدوڵلاّی کوڕی ئوبەی ، کە نموونەی گەنجێکی ئیماندار بوو و ، قورئان دڵەکەی زاخاو دابوو .. کە ئەم هەڵە گەورەیەی باوکی بیست ، ئیمان و خۆش ویستنی ئیسلام هەموو پەیوەندییەکی لەبیر بردەوە ، هەتا پەیوەندیی باوك و فرزەندیی .. گەنجێکی ئیمانداری وەك ئەو رێ نادا هیچ کەس دەستدرێژیی بکاتە سەر پێغەمبەرەکەی ، کە بە دڵ و بە گیان ئیمانی بە راستگۆیی

ئەو هێناوە ، ئەگەرچیی ئەو کەسەش باوکی خۆشەویستی بێت .. خۆشویستنی باوك پلەیەکی زۆر نزمە لە چاو خۆشویستنی خوا و پێغەمبەرەکەیدا . کە عەبدوڵڵای جگەرگۆشە ئەم هەواڵەی بیست بە پەلە هاتە خزمەتی پێغەمبەری ئازیزی ، تا بۆ هەموو جیهانی بسەلمێنێ چ سەربازێکی گیان فیدای ئیسلامە ..

هاتە خزمەتی و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! پێم گەیشتووە کە ئەتەوێ عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی باوکم بکوژێت لەسەر ئەوەی کە وتوویەتی و پێت گەیشتووە. جا ئەگەر ئەیکوژی ، ئەوا فەرمان بە خۆم بدە بۆ ئەو کارە ، من خۆم سەری باوکمت بۆ دێنم .. دە بەخوا خەزرەج هەمووی ئەزانێ کە لە ناویاندا پیاوێکی تر نەبووە لەگەڵ باوکیدا لە من چاکتر بێت . من ئەترسم فەرمان بە کەسێکی تر بدەی و بیکوژێ و ، ئەو کاتە دەروونم ڕێم پێ نەدا سەیری بکوژی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی بکەم لەناو خەڵکدا هات وچۆ بکات و بیکوژمەوە . ئەو کاتە من موسڵمانێ لە بری کافرێ بکوژم و بچمە ئاگرەوە !!

بەڵام پێغەمبەری سنگفراوان وەها بیر ناکاتەوە .. خوای گەورە بەم دینە پاکەی ئەم لاوەی وەها پەروەردە کردووە کە ئامادەیە لەبەر خوا باوکی خۆی سەر ببڕێ .. سوپاس بۆ خوا ..

بەڵێ عومەر دڵسۆزی ئیسلامە ، بەڵام هێشتا قوتابی‌یە و، نەبۆتە مامۆستا ، پێویستی بەوەیە لە خزمەتی مامۆستادا وانە بخوێنێ ، تا کە کاروباری موسڵمانانی کەوتە دەست ئەو کاتە بزانێ کاروبار هەڵ بسوورێنێ ..

پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵامی گەنجی ئیمانداری دایەوە : (( ما أردتُ قتله ولا أمرت به ، ولنحسنن صحبته ما كان بين أظهرنا )) . فەرمووی : نەم ویستووە بیکوژم و فەرمانیشم بە کوشتنی نەداوە . هەتا لە ناوماندا بمێنێتەوە ئێمە بە چاکیی هاوەڵیی ئەکەین .

ئەم هەڵوێستە جوانە وای کرد زۆرێك لەو خزمانەی عەبدوڵڵا کە پشتیان ئەگرت دڵیان بۆ خۆشەویستیی خوا و پێغەمبەر کرایەوە و ، سەرۆکی نیفاق هەر هەڵەیەکی بکردایە ئەو خزمانەی پێش هەموو کەس لۆمە و سەرزەنشتیان ئەکرد .

عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵا هەر بەوەندە وازی نەهێنا ، مادام پێغەمبەری خوا باوکی ناکوژێ ، ئەبێت ئەمیش سنوورێك بۆ باوکی دابنێ و لەوە زیاتر پێی لێ ڕانەکێشێ ..

ئەگەر ئەو ئێستا وا بزانێ گەورە و بە دەسەڵاتی مەدینە خۆیەتی و ، هەرکەی بیەوێ پێغەمبەری خوا ﷺ و موسڵمانە میوانە مەککەیی‌یەکان ئەتوانێ دەر بکات، ئەوا بە هەڵەدا چووە ، چونکە ئەو عەزیزی شار نیە و پێغەمبەری خوا ﷺ زەلیل، بەڵکو بە پێچەوانەوە .

عەبدوڵڵای ئیمان‌دار بۆ ئەوەی سنوور بۆ باوکی دابنێ و تێی بگەیەنێ کە حاکمی مەدینە پێغەمبەری خوایە ، بە پەلە خۆی گەیاندە پێشی پێشەوەی سوپا و یەکەم کەس خۆی گەیاندە تەنگەبەرایی مەدینە و لەوێ شمشێرەکەی بەرز کردەوە و، موسڵمانان لە ژێر شمشێرەکەیەوە ئەچوونە ناو شار ، هەتا ئەوەبوو باوکی هات ، پێی وت : بووەستە ، بەخوا ناچیتە ناو شارەوە هەتا پێغەمبەری خوا ماوەت نەدا. هەروا سەرۆکی نیفاق وەستا هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هات و داوای مۆڵەتی لێ کرد و ، ئەویش ماوەی دا و ڕێی بۆ چۆڵ کرد ، بەڵام ڕووی لە باوکی وەرگێڕا هەتا تێپەڕ بوو .

ئەم هەڵوێستەی عەبدوڵڵای ئیمان‌دار بەرامبەر بە باوکی مونافیقی ، پینەکەری هەڵەکەی باوکی بوو و ، بۆ هەموو کەسێکیش سەلما کە سەرۆکی نیفاق ئەوەندە خوار و خێچە کوڕەکەشی پشتی ناگرێ ..

کە ئەم شتانە ڕوویان دا پێغەمبەری خوا ﷺ بە عومەری فەرموو : (( كيف ترى يا عمر ؟ أما والله لو قتلته يوم قلت لي لأرعدت له آنف لو أمرتها اليوم بقتله لقتلته !! )) . فەرمووی : عومەر ئێستە پێت چۆنە ؟ بەخوا ئەگەر ئەو ڕۆژە کە پێت وتم بت‌کوشتایە ، کەسانێك ئەبوونە پاڵپشتی ، ئەوانە ئەگەر ئەمڕۆ فەرمانیان پێ بدەم بۆ کوشتنی ئەی‌کوژن !!

عومەر فەرمووی : بەخوا ئەمزانیی کاری پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاری من بەرەکەتی زیاترە !!

پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەرەتای مانگی ڕەمەزانی ساڵی پێنجەمدا گەیشتەوە مەدینە کە ئەوەبوو بۆ غەزای نەوەی موصطەلەق بیست و هەشت و ڕۆژی پێ‌چوو .

کە موسڵمانەکان گەیشتنەوە مەدینە ، پیاوێك کە برای هیشامی کوڕی صەبابە، ئەو هاوەڵەی کە بە دەستی هاوەڵە ئەنصاری‌یەکە ، بە نەزانیی شەهید بوو ، ناوی مەقیسی کوڕی صەبابە بوو ، لە مەککەوە هات بۆ مەدینە و بە درۆ وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! موسڵمان بووم و هاتووم بۆ لاتان ، تا خوێنی ئەو برایەمم بدەنێ

کە بە هەڵە کوژراوە . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا خوێنی هیشامی برای پێ بدرێ و ، ئەوەبوو ماوەیەکی کەم لە مەدینە مایەوە . پاشان هەڵمەتی دایە سەر ئەو ئەنصاری‌یەی کە بە نەزانیی براکەی کوشتبوو و، کوشتی . پاشان لە دین وەرگەڕاو بەرەو مەککە هەڵات و ڕۆیشتەوە . لەسەر ئەم کارە ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەتحی مەککەی ، یەکێ لەوانەی کە خوێنیان حەلاڵ کرا و ئەگەر خۆشیان بە پەردەکانی کەعبەوە هەڵ بواسن ئەبێ لە ملیان بدرێ ، مەقیسی کوڕی صەبابە بوو ، چونکە کارێکی زۆر نامەردانەی کرد .

**ڕووداوی دووهەم ، بوختان بۆ خاتو عائیشە**

مونافیقان هەر بەوە کۆڵیان نەدا کە خەریك بوو ریزی موسڵمانان لەت بکەن و جەنگێکی گەورە لە نێوان موهاجیر و ئەنصاردا بنێتەوە ، بەڵکو هەوڵیان دا ئاژاوەی لەوە گەورەتر بۆ موسڵمانان بخولقێنن . ئەمجارەیان هەوڵیان دا شەرەفی پێغەمبەری خوا ﷺ لەکەدار بکەن .

جا وا خاتوعائیشە خۆی چیرۆکەکە ئەگێڕێتەوە کە لە ریوایەتی هەردوو ئیمامی پایەدار بوخاریی و موسلیمە .. ئەڵێت :

هەر کاتێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ بیویستایە بۆ سەفەرێك لە ماڵ دەربچێ لەنێوان خێزانەکانی‌دا قورعەی ئەکرد و ، ناوی هەرکامیان دەرچوایە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەیانی لەگەڵ خۆی‌دا ئەبرد .

ئەوەبوو لە یەکێ لە غەزاکانی‌دا قورعەی لە نێوانمان‌دا کرد و ناوی من دەرچوو . منیش دوای ئەوەی کە باسی حیجاب هاتە خوارەوە ، لە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووم . من لەناو کەژاوەکەم‌دا سوار ئەکرام و تیایشیا دائەگیرام . ڕۆیشتین تا ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ لەو غەزایەی بوویەوە و گەڕایەوە و ، لە مەدینە نزیك کەوتینەوە و شەوێکیان فەرمانی دا بکەوینە ڕێ . کە ویستیان بکەونە ڕێ . منیش هەستام و ڕۆیشتم هەتا لە سوپا تێ پەڕیم - واتە بۆ کاری پێویستی خۆی - ، کە کاری خۆمم تەواو کرد گەڕامەوە بۆ لای کەژاوەکەم ، کە دەستم لە سنگم دا، ملوانکەیەکم ، کە لە شەوەی ضەفاری ( شارێکی یەمەن ) دروست کراوە، پچڕاوە . منیش گەڕامەوە تا بی‌دۆزمەوە و ، گەڕان بە دوای‌دا دوای خستم.

ئەوانەی کە کەژاوەکەی منیان هەڵ ئەگرت دێن و دەست ئەدەنە کەژاوەکە و هەڵی ئەگرن و ئەی‌خەنە سەر ئەو وشترەم کە من سواری بووبووم و ، وا ئەزانن منی تێدایە.

ئافرەتان لەو کاتەدا سووکەڵە بوون و گۆشت قورسی نەکردبوون ، چونکە خواردنی کەمیان ئەخوارد .

کاتێ کە پیاوەکان کەژاوەکەیان بەرز کردەوە ، هەستیان بە سووکیی کەژاوەکە نەکرد و هەڵیان گرت ، منیش کچۆڵەیەکی کەم تەمەن بووم ، وشترەکەیان خستە رێ و رۆیشتن .

دوای ئەوەی کە سوپا جووڵا ملوانکەکەمم دۆزی‌یەوە و ، هاتمەوە شوێنی بارخستنیان و کەسی تێدا نەمابوو . رووم لەو مەنزڵەی خۆم کرد کە تیای‌دا بووم و، وام ئەزانیی ئەوان هەست بە نەبوونی من ئەکەن و ئەگەڕێنەوە بۆ لام . لە کاتێکدا کە لەو مەنزڵەمدا دانیشتبووم خەو زۆری بۆ هێنام و خەوم پیا کەوت . صەفوانی کوڕی موعەططەلی سولەمییش [31] بە دوای سوپاوە بوو و ، لە کۆتایی شەودا کەوتبووە رێ و کە رۆژ بوویەوە گەیشتە مەنزڵەکەی من ، رەشایی مرۆڤێکی خەوتوو ئەبینێ . لێم نزیك کەوتەوە و ، کە بینیمی ناسیمی . چونکە پێش هاتنی ئایەتی حیجاب ئەی‌بینیم . بە ئیستیرجاعەکەی ( وتنی : إنا لله وإنا إليه راجعون ) کاتێ کە ناسیمی بەخەبەر هاتم . خێرا بە سەرپۆشەکەم دەم و چاومم داپۆشیی .. بەخوا یەك وشە قسەی لەگەڵ‌دا نەکردم و جگە لە ئیستیرجاعەکەشی وشەیەکم لێ نەبیست ، هەتا ئەوەبوو چۆکی بە وشترەکەی دا دا و منیش سواری بووم ، ئیتر کەوتە رێ و جڵەوی وڵاغەکەی رائەکێشا ، هەتا گەیشتینە لای سوپا کە ئەوەبوو لە کاتی گەرمای نیوەڕۆدا بۆ حەسانەوە لایان دابوو . ئیتر ئەوەی تیاچوو تیاچوو و ، بەشی هەرەزۆری تاوانەکەش بەر عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوول کەوت .

گەیشتینەوە مەدینە .. کە گەیشتم مانگێ نەخۆش بووم و ، خەڵکیش خەریکی باس‌کردنی قسەی کۆمەڵی بوختان بوون و ، منیش هەستم بە هیچێ لەوە نەکردووە . پێغەمبەری خواش ﷺ بەو نەخۆشی‌یەم گومانی بۆ دروست ئەکردم ، چونکە لوتف و

[31] صەفوانی کوڕی موعەططەلی کوڕی روبەیعەی کوڕی خوزاعیی کوڕی موحاریبی سولەمیی ، پاشان ذەکوانیی ، یەکێکە لەوانەی زوو موسڵمان بووە . هاوەڵێکی پایەدار و خاوەن رێز بووە . ئەم غەزایە یەکەم غەزا بوو کە بەشداریی تێدا بکات و ، ئەمیری بەشی دواوەی سوپا بووە ، بۆیە دوا کەسی سوپا بووە کە بکەوێتە رێ .. ئەوەندە پاك بووە پێغەمبەری خوا ﷺ شاهیدیی بۆ داوە کە فەرموویە : (( ما علمت عليه إلا خيراً )) . لە بوخاریی و موسلیم‌دا چەسپاوە کە کاتێ ئەو بوختانە ئەبیستێ ئەڵێ : سبحان الله ! بەو خوایەی گیانمی بە دەستە هەرگیز کۆشی هیچ ئافرەتێکم نەدیوە . تا سەردەمی خەلیفە عومەر ئەژی و ، لە ئەنجام‌دا لە یەکێ لە غەزاکانی وڵاتی ئەرمینیەدا ، لە ساڵی نۆزدەی کۆچیی‌دا شەهید ئەبێت . وتراویشە کە تا ساڵی پەنجا و چوار ژیاوە و لە سەردەمی موعاویەدا لە خاکی رۆم شەهید بووە ( فتح الباري : ٨ / ٣٧١ ) .

سۆزی جارانم بە پێغەمبەری خواوە نەئەبینی کاتێ کە نەخۆش ئەکەوتم . هەر ئەوەندە ئەهاتە ژوورەوە لام و سەلامی ئەکرد و پاشان ئەی فەرموو : (( کیف تیکم ؟ )) ، واتە: چۆنن ؟ ئیتر ئەڕۆیشت . ئەوە گومانی بۆ دروست ئەکردم ، بەڵام هەستم بە هیچ خراپەیەك نەئەکرد . هەتا بەرەو چاك بوونەوە ئەڕۆیشتم ..

جارێکیان لەگەڵ ئوم‌میسطەح دا [٣٢] ئەچووین بۆ ( مناصع ) کە شوێنی دەست نوێژگرتنمان بوو و ، تەنها شەوا و شەو بۆی دەرئەچووین ، ئەمەش بەرلەوەی لە ماڵاندا شوێنی دەستنوێژ دروست بکرێت ، ئێمە هەر وەك عەرەبی پێشینەمان ئەکرد ..

من و ئوم میسطەح ، دوای تەواوکردنی کاری خۆمان ، بەرەو ماڵەوە گەڕاینەوە. ئەوەبوو ئوم میسطەح کراسەکەی کەوتە ژێر پێی و پێی هەڵ کەوت و، وتی: بەدبەخت بێ میسطەح ! پێم وت : شتێکی خراپت وت . ئایا جنێو بە پیاوێك ئەدەی کە بەشداریی بەدری کردبێ ؟ وتی : دادە گیان ! ئەی نەت‌بیستووە چیی وتووە ؟ وتم : چیی وتووە ؟ ئەوەبوو قسەکەی بوختان‌کەرانی بۆ گێڕامەوە .

نەخۆشی یەکەم لێمی هەڵدایەوە .. کە گەڕامەوە ماڵەوە و ، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەوە لام ، سەلامی کرد و پاشان فەرمووی : (( کیف تیکم ؟ )) . وتم : ماوەم ئەدەی سەرێك لە باوك و دایکم بدەم ؟ ئەم‌ویست هەواڵەکە لای ئەوان روون بکەمەوە. پێغەمبەری خوا ﷺ ماوەی دام و ، هاتمە لای دایك و باوکم و ، بە دایکمم وت : دایە گیان ! خەڵك باسی چیی ئەکات ؟ وتی : کچەکەم ! دان بە خۆتدا بگرە . دە بەخوا هەر ئافرەتێك بەلای پیاوێکەوە جوان بووبێ و خۆشی‌ویستبێ و هەوێی بووبن ، هەر شتیان بۆ هەڵ بەستووە . وتم : پاك و بێ‌گەردیی بۆ خوا ، خەڵك باسی ئەمەی کردووە ؟

عائیشە ئەڵێت : ئەو شەوە هەتا بەیانیی هەر گریام .. بێ‌ئەوەی فرمێسکم وشك ببنەوە و ، بێ‌ئەوەی چاویشم بچنە خەو هەتا بەیانیی هەر گریام ..

---

[٣٢] ئوم میسطەح کچی ئەبوڕوهمی کوڕی موطەللیبی کوڕی عەبدمەناقە ، واتە ئامۆزازای عەبدوڵلای کوڕی عەبدولموطەللیبە . دایکیشی کچی صەخری کوڕی عامیرە ، کە خوشکی دایکی ئەبوبەکری صددیقە . میسطەحی کوڕیشی کوڕی ئوثاثەی کوڕی عەببادی کوڕی عەبدولموطەللیبە . واتە ئوثاثەی مێردی ئوم میسطەح ئامۆزای پێغەمبەری خوایە ﷺ .

دوای ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کردە عەلیی کوڕی ئەبوطالیب و ئوسامەی کوڕی زەید ؛ ئەمەش کاتێ کە وەحیی ماوەیەك وەستا بوو ، تا بۆ جیابوونەوە لە هاوسەری پرسیان پێ بکات . ئوسامە دەربارەی ئەوەی هەرچیی لە بارەی پاکیی خێزانیەوە ئەیزانیی و ، هەرچیی لە دڵی خۆشیا رێزی بۆیان هەبوو ئاماژەی بۆ کرد و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! خێزانەکەت ، جگە لە چاکە هیچی لێوە نازانین .

بەڵام عەلیی کوڕی ئەبوطالیب ئەفەرموێ : ئەی پێغەمبەری خوا ! خوا دنیای لێت نەهێناوەتەوە یەك و ؛ ئافرەتی تریش زۆرن ، جا ئەگەر لە کەنیزەکەکەش پرسیار بکەیت راستییت پێ ئەڵێ .

[ لێرەدا ئوسامە پاکیی خوشکێکی ئیمانیی خۆی دەرئەخات ، کە لە ژیانیا گومانی هیچ خراپەیەکی لێ نەکردووە . بەڵام عەلیی ئەوەی گرنگ بێ بەلایەوە دوورکەوتنەوەی پێغەمبەری خوایە لە هەموو کارێك کە گومانی ئەوەی لێ بکرێ کە لەکە بۆ ئیسلام دروست بکات . کە ئافرەتێ گومانی ئەکەوێتە سەر ؛ با ئەو گومانە نەکەوێتە سەر بانگەواز و دینی خوا .. ئیتر ئەو چووزانێ عائیشە ئەوەندە پاکە ؛ قورئان لە حەوت طبەقەی ئاسمانەوە دائەبەزێت بۆ بە پاك دەرکردنی ؟! ]

بە ئاماژەی ئیمام عەلیی پێغەمبەری خوا ﷺ بەریرەی کەنیزەکی بانگ کرد و فەرمووی : (( أيْ بريرة ! هل رأيت من شيء يريبك ؟ )) . فەرمووی : ئایا شتێکت پێوە دیوە کە گومانت بۆ دروست بکات ؟

بەریرە وتی : نەء ، بەو کەسەی تۆی بە حەق رەوانە کردووە ، هیچ شتێکم پێوەی نەدیوە کە بە عەیبەی دابنێم لەسەری ، جگە لەوەی کە کچۆڵەیەکی منداڵە و کە هەوێر ئەشێلێ خەوی پیا ئەکەوێ و مەڕومالآت ، یان باڵندە دێن و ئەیخۆن .

[ کە پێغەمبەری خوا ﷺ پاکیی عائیشەی ساغ کردەوە و ، زانیشی ئەمە فڕوفێڵی کوڕی ئوبەی سەرۆکی نیفاقە ] ، هەر ئەو ڕۆژە چووە سەر مینبەر و لە موسڵمانەکان داوای کۆمەکیی کرد تا تۆڵەی لەو موناڤیقە بستێنن کە بە تاوانی شەرەف و ئابڕووی خاوخێزان ئازاری ئەدا و ، سوێندیشی خوارد کە چاکیی و پاکیی نەبێ بە هاوسەریەوە هیچی نەدیوە ، هەروەها ئەو پیاوەش کە ناوی براوە ، کە فەرمووی : (( يا معشر المسلمين ! من يعذرني من رجل قد بلغني أذاه في أهلِ بيتي؟ فوالله ما علمت على أهلي إلا خيراً ، لقد ذكروا رجلاً ما علمت عليه إلا خيراً ، وما كان يدخل على أهلي إلا معي )) .

سەعدی کوڕی موعاذی ئەنصاریی هەستا و وتی : من تۆڵەی لێ ئەسێنم بۆت، ئەگەر لە ئەوس بوو ئەدەم لە گەردنی و ، گەر لە خەزرەجی برامان بوو ، ئەوا فەرمانمان پێ ئەدەیت و ئێمەش فەرمانەکەت جێبەجێ ئەکەین .

سەعدی کوڕی عوبادە ـ کە سەرداری خەزرەج بوو ـ هەستا ، کە لەوەو پێش پیاوێکی صالح بوو ، بەڵام لەو کاتەدا دەمارگیریی بەسەریا زاڵ بوو ، بە سەعدی کوڕی موعاذی وت : بەخوا درۆت کرد ، نایکوژی و ناشتوانی بیکوژی . ئوسەیدی کوڕی حوضەیریش ، کە ئامۆزای سەعدی کوڕی موعاذ بوو ، هەستا و بە سەعدی کوڕی عوبادەی وت : بەخوا خۆت درۆت کرد ، ئەیکوژین و ، ئەم کارەی تۆش کە لەسەر مونافیقان ئەکەیتەوە ، لە کاری مونافیقان ئەچێت .

ئەوەبوو هەر دوو هۆزەکە ، ئەوس و خەزرەج ، هەڵ چوون ، بە رادەیەك کە ویستیان دەست بدەنە کوشتاری یەك و ، پێغەمبەری خواش ﷺ بەسەر مینبەرەوە وەستاوە . هەروا بەردەوام هێوری ئەکردنەوە هەتا ئەوان بێدەنگ بوون و ئەویش لەسەر مینبەرەکە دابەزیی .

ئەو رۆژە هەروا فرمێسکم وشك نەئەبوویەوە و ، خەویش نەئەچووە چاوم و ، دایك و باوکیشم لەلام بوون .. دوو شەو و رۆژێك بەو شێوەیە مامەوە .. لە کاتێکدا کە ئەوان لەلام بوون و منیش ئەگریام ، ئافرەتێکی ئەنصاریی داوای مۆڵەتی کرد و ، منیش ماوەم دا هات دانیشت و لەگەڵما ئەگریا . کە ئێمە لەو حاڵەدا بووین پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هێنایە ژوورەوە و ، سەلامی کرد و ، پاشان دانیشت ، کە لەو کاتەوە ئەو قسەیە کرابوو لەلام دانەنیشتبوو و ، مانگێکیش ئەبوو دەربارەی ئێمە وەحیی بۆ نەئەهات . کە دانیشت شایەتمانی هێنا و پاشان فەرمووی : (( أما بعد : يا عائشة ! فإنه قد بلغني عنك كذا وكذا ، فإن كنت بريئة فسيبرئك الله ، وإن كنت ألممت بذنب فاستغفري الله وتوبي إليه ، فإن العبد إذا اعترف بذنبه ثم تاب إلى الله تاب الله عليه )) . فەرمووی : عائیشە ! لەبارەی تۆوە واو وام پێ گەیشتووە ، جا ئەگەر پاك بیت ، ئەوا خوا بە پاکت دەر ئەکات و ، گەر تاوانیکیشت کردووە ئەوا داوای چاوپۆشیی لە خوا بکە و بگەڕێرەوە بۆ لای ، چونکە ئەگەر بەندە دانی بە گوناهی خۆیدا نا و گەڕایەوە بۆ لای خوا ، خواش تەوبەی لێ وەرئەگرێ ..

کە فەرمایشتەکەی تەواو بوو ، ( لە خەفەتدا ) فرمێسکەکانم وشك بوونەوە بە رادەیەك کە دڵۆپێك نەئەهاتە خوارەوە . جا بە باوکمم وت : بۆ ئەم فەرمایشتەی

وەڵامی پێغەمبەری خوا بدەرەوە . فەرمووی : بەخوا نازانم چیی بە پێغەمبەری خوا بڵێم . وتم بە دایکم : تۆ وەڵامی پێغەمبەری خوا بدەرەوە . ئەویش وتی : نازانم چیی بە پێغەمبەری خوا بڵێم . منیش کە کچۆڵەیەکی کەم تەمەن بووم و قورئانی زۆریشم لەبەر نەبوو ، وتم : بەخوا من ئەزانم کە ئێوە ئەو باسەتان بیستووە و ، چۆتە دڵتانەوە و ، بڕواتان پێ کردووە ، جا ئەگەر پێتان بڵێم من بێتاوانم - خوایش ئەزانێ کە من بێتاوانم - ئەوا بڕوام پێ ناکەن ، بەڵام ئەگەر دان بنێم بە کارێکدا - کە خوا ئەزانێ لە تاوانی وەها دوورم - ئەوا بڕوام پێ ئەکەن . بەخوا جگە لە فەرمایشتەکەی باوکی یووسف : ﴿ فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَٱللَّهُ ٱلْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴾ هیچ نموونەیەك بۆ ئێوەش و بۆ خۆیشم شك نابەم ..

پاشان هەڵ گەڕامەوە و لەسەر نوێنەکەم ڕاکشام و، لەو کاتەشدا چاك ئەمزانیی بێتاوانم و ، خوایش بە بۆنەی بێتاوانییمەوە بە پاك دەرم ئەکات ، بەڵام هەرگیز ئەوە بە دڵمدا نەئەهات کە خوای گەورە دەربارەی من قورئان بنێرێ و بخوێنرێتەوە و ، بەلای خۆمەوە خۆمم لەوە زۆر بێترخ تر ئەزانی کە خوا دەربارەی من فەرمایشتێك بکات کە بخوێنرێتەوە ، بەڵام هیوادار بووم کە پێغەمبەری خوا ﷺ خەوێك ببینێ و تیایا خوای گەورە پاکییم دەربخات . دە بەخوا پێغەمبەری خوا ﷺ لە شوێنی خۆی نەجوولا و ، کەسیش لە ماڵەکەدا نەچووە دەرەوە هەتا وەحی بۆ هات . ئەوەبوو ئەو حاڵەتەی بەسەردا هات کە لە کاتی وەحیدا بە سەریدا ئەهات ، بە ڕادەیەك کە بە وێنەی دەنکە مرواریی عەرەق لێی دائەچۆڕیی بە بۆنەی سەنگینیی ئەو وەحییەوە کە ئەهاتە سەری .

کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەو حاڵەتە ڕزگاری بوو ، پێکەنی و ، یەکەم وشەیەك کە فەرمایشتی کرد فەرمووی : (( یا عائشة ! أما والله عزوجل فقد برّأك )) . فەرمووی: خوای گەورە پاکیی تۆی ئاشکرا کرد ..

دایکم وتی : هەستە بچۆرە خزمەتی . وتم : بەخوا هەڵ ناسم و ، تەنها سوپاسی خوای عزوجل ئەکەم . ئەوەبوو خوای گەورە کۆمەڵە ئایەتی :

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ ۚ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَّكُم ۖ بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۚ لِكُلِّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُم مَّا ٱكْتَسَبَ مِنَ ٱلْإِثْمِ ۚ وَٱلَّذِى تَوَلَّىٰ كِبْرَهُۥ مِنْهُمْ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١١﴾ لَّوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْرًا وَقَالُوا۟ هَٰذَآ إِفْكٌ مُّبِينٌ ﴿١٢﴾ لَّوْلَا جَآءُو

عَلَيۡهِ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَۚ فَإِذۡ لَمۡ يَأۡتُواْ بِٱلشُّهَدَآءِ فَأُوْلَٰٓئِكَ عِندَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡكَٰذِبُونَ ﴿١٣﴾ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ لَمَسَّكُمۡ فِي مَآ أَفَضۡتُمۡ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٤﴾ إِذۡ تَلَقَّوۡنَهُۥ بِأَلۡسِنَتِكُمۡ وَتَقُولُونَ بِأَفۡوَاهِكُم مَّا لَيۡسَ لَكُم بِهِۦ عِلۡمٞ وَتَحۡسَبُونَهُۥ هَيِّنٗا وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٞ ﴿١٥﴾ وَلَوۡلَآ إِذۡ سَمِعۡتُمُوهُ قُلۡتُم مَّا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَٰذَا سُبۡحَٰنَكَ هَٰذَا بُهۡتَٰنٌ عَظِيمٞ ﴿١٦﴾ يَعِظُكُمُ ٱللَّهُ أَن تَعُودُواْ لِمِثۡلِهِۦٓ أَبَدًا إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١٧﴾ وَيُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلۡفَٰحِشَةُ فِي ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ﴿١٩﴾ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴾ ( النور : ١١ - ٢٠ ) **ناردنە خوارەوە .**

**کاتێك کە خوای گەورە ئەو ئایەتانەی دەربارەی پاکیی و بێتاوانیی من ناردنە خوارەوە ، ئەبوبەکری صدیق - کە یارمەتیی خەرج و مەسرەفی میسطەحی کوڕی ئوثاثەی ، بە بۆنەی خزمایەتیی و هەژارییەوە ئەدا - فەرمووی : بەخوا هەرگیز لە هیچ خەرج و مەسرەفێکدا یارمەتیی میسطەح نادەم ، دوای ئەوەی کە دەربارەی عائیشە وەهای وت . ئەوەبوو قورئانی پیرۆز هاتە خوارەوە :**

﴿ وَلَا يَأۡتَلِ أُوْلُواْ ٱلۡفَضۡلِ مِنكُمۡ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤۡتُوٓاْ أُوْلِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينَ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ وَلۡيَعۡفُواْ وَلۡيَصۡفَحُوٓاْۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَكُمۡۗ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴾ . ( النور : ٢٢ ) .

**ئایەتەکە فەرمانی بەسەر ئەبوبەکر و هەموو ئیمانداڕێکدا ئەدا تا سوێندی ئەوە نەخۆن کە یارمەتیی خزم و کەس و کار و هەژاران و کۆچکەرانی پێناوی خوا نەدەن . با چاوپۆشییان لێ بکەن .. ئایا ، ئیمانداران ! پێتان خۆش نیە خوا لێتان خۆش ببێ؟**

**ئەبوبەکر فەرمووی : بەڵێ ، بەخوا پێم خۆشە خوای گەورە لێم خۆش ببێ !! ئیتر ئەوەبوو وەك جاران یارمەتیی خەرج و مەسرەفی میسطەحی ئەدا و ئەیفەرموو: بەخوا هەرگیز لێی ناگرمەوە ..**

**عائیشە ئەڵێت : دەربارەی من پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لە زەینەبی کچی جەحش ئەکرد و ئەیفەرموو : (( یا زینب ! ماذا علمت أو رأیت ؟ )) . ئەی فەرموو :**

زەینەب ! چیی پێ ئەزانیی ، یان چیت دیوە ؟ ئەویش ئەی وت : ئەی پێغەمبەری خوا ! گوێم و چاوم ئەپارێزم ، جگە لە چاکە هیچم نەدیوە .

عائیشە ئەڵێت : لە ناو هاوسەرانی پێغەمبەری خوادا ﷺ ئەم زیاتر بەرابەرکێی ئەکردم ، کەچیی خوای گەورە بە هۆی وەرەعیەوە پاراستی ، بەڵام حەمنەی خوشکی لەسەری ئەکردەوە ، ئەوەبوو وەك کۆمەڵی بوختانکەران تیاچوون ، ئەویش تیاچوو..[33]

لە ریوایەتی تری بوخاریی و موسلیم و غەیری ئەوانیشدا روون کراوەتەوە کە ئەوانەی لەم بوختانە گەورەیەدا دەستیان هەبوو و تیایا رۆچوو بوون سەرۆکی نیفاق عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی و ، حەمنەی کچی جەحش و ، میسطەحی کوڕی ئوثاثە و، حەسسانی کوڕی ثابیت بوون ، کە سەرۆکی نیفاق رۆڵی گرنگی ئەو بوختانەی دیی و، دوای ئەویش حەمنە . ئەمانە هەموویان ، جگە لە کوڕی ئوبەی ، تەوبەیان کرد ، بە تایبەتیی حەسسان کە بە شیعرێك ستایشی عائیشە ئەکات .

لە یەکێ لەو ئایەتانەی کە هاتنە خوارەوە بۆ بێتاوان دەرکردنی عائیشە ، خوای گەورە نموونەی ژنان و پیاوانی ئیماندارانمان ئەخاتە پێش چاو کە کاتێ ئەو بوختانە نەشیاوەیان بیست ، هەر یەکە لە ئاستی خۆیەوە شاهێدیی دا کە ئەوە بوختانێکی روون و ئاشکرایە ، کە ئەفەرموێ :

﴿ لَّوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْرًا وَقَالُوا۟ هَٰذَآ إِفْكٌ مُّبِينٌ ﴾

( النور : ١٢ ) .

ئەم ئایەتە پیرۆزە مەبەستی لە ئەبوئەییووبی ئەنصاریی و هاوسەرەکەی بوو خوا لێیان رازیی بێ . ئیمام موحەممەدی کوڕی ئیسحاق ریوایەتی کردووە کە ئەبوئەییووب ، خالیدی کوڕی زەید ، ئومئەییووبی خێزانی پێی ئەڵێت : ئەبوئەییووب ! نابیستی خەڵکیی دەربارەی عائیشە چیی ئەڵێن ؟ وتی : بەڵێ . بەڵام ئەوە درۆیە . دایکی ئەییووب ! ئایا تۆ شتی وەهات ئەکرد ؟ وتی : نە بەخوا شتی وەهام نەئەکرد . وتی : دەی عائیشە لە تۆ چاکترە .

لە تەفسیری ئیمام ( زمخشري ) شدا هاتووە کە ئەبوئەییووبی ئەنصاریی بە ئوم ئەییووبی هاوسەری ئەڵێت : نابینی چیی ئەوترێ ؟ ژنەکەی وتی : ئەگەر تۆ لە جێی

---

[33] بوخاریی و موسلیم ریوایەتیان کردووە .

صەفوان‌دا بوویتایە ، ئایا شتی خراپت بۆ حورمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوجوا ئەبینیی ؟ وتی : نەء . ژنەکەی وتی: دەی ئەگەر منیش لە جێی عائیشەدا بوومایە، ناپاکییم لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ نەئەکرد . عائیشە لە من و ، صەفوانیش لە تۆ چاکترن . ڕاستیش ئەکات چونکە صەفوانیش و عائیشەش موهاجیرین و ئەوان خۆیان ئەنصارن .

دوای ئەوەی کە قورئان هاتە خوارەوە و باسی پاکیی عائیشەی ئەکرد ؛ دەست کرا بە لێکۆڵینەوە دەربارەی ئەوانەی کە ئەم بوختانەیان بڵاو کردەوە . بەم لێکۆڵینەوەیە تەنها سێ کەس پێوە بوون و تاوانبار بوون ؛ کە حەسسانی کوڕی ثابیت و میسطەحی کوڕی ئوثاثە و حەمنەی کچی جەحش بوون . ئەمانە هەرسێکیان هەشتا جەلد داری حەدیان لێ درا لەسەر ئەوەی کە قورئان سەلماندی ئەمانە بوختانیان بۆ ئافرەتی پاك داوێن کردووە ؛ بێ ئەوەی هیچیان دی بێ . بە مەرجێ ئەم سیانە موسڵمانی ڕێك و پێك بوون و هیچ کامیان موونافیق نەبوون ؛ بەڵکو دوانیشیان موهاجیریی بوون و زۆر خزمی پێغەمبەری خوا بوون . دایکی حەمنە کچی عەبدولموطەللیبە و ، دایکی میسطەحیش ئامۆزازای عەبدوڵڵای باوکی پێغەمبەرە و ، ئوثاثەیش کوڕی عەببادی کوڕی عەبدولموطەللیبە و ئوم میسطەح و ئەبوبەکریش دایکیان خوشکن . حەسسانیش شاعیری دڵسۆز و بەئیمانی ئیسلام بووە . ئەمانە بە پاکیی و نەزانیی پێوە بوون، کەچیی ئەو هەمووە موونافیقە و لە سەرووی هەموویانەوە سەرۆکی نیفاق ؛ چونکە فێڵباز بوون و بە وردیی پاگاندەیان ئەکرد هیچیان پێوە نەبوون ، هەر چەندە هەموو کەس ئەیزانیی ، هەتا پێغەمبەری خواش خۆی ، کە جوولێنەری یەکەمی ئەو بوختانە سەرۆکی نیفاق و حیزبەکەی بوون .

جا ئیبنولقەییم وای بۆ ئەچێ کە جەلد نەکردنی سەرۆکی نیفاق حیکمەتێك بووە بۆ ڕاگیرکردنی دڵی خزمەکانی . بەڵام ئیبن‌حەجەر لە ( الفتح ) دا وای بۆ ئەچێ کە جەلد کرابێ بە پێی ئەو ڕیوایەتەی حاکم لە ( الإكليل ) دا .( فتح الباري : ٨ / ٣٨٨ ) .

لەولاوە صەفوانی کوڕی موعەططەل کە موسڵمانێکی خەڵکی مەککەیە و لە پێناوی خوادا کۆچی کردووە و ، سەرومالّی کردۆتە قوربانی دینەکەی پێغەمبەر و، پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی بە چاکیی شارەزای دین و ئەمانەت و پاك‌داوێنیی صەفوانە.. ئەم پیاوە کە ئەو بوختانە ئەبیستێ خۆی پێ ناگیرێ ؛ چونکە شەرەف و دین و ئەمانەتی زامدار کراون ، هەڵمەت ئەداتە شمشێر و بە شمشێر حەسسان

دائەگرێتەوە.. لەناو مەدینـەدا و لـەناو ئەنصـاردا ئەچـێ بـە گـژی حەسسـان دا ..
ئەوەبوو خزمەکانی حەسسان صەفوان ئەگرن و ئەیبەنە خزمەتی پێغەمبەری خـوا ﷺ
و ئەویش بە حیکمەت ئاو ئەکات بەسەر ئاگردا ، کە خەریك بـوو جـەنگ لـە نێـوان
ئەنصار و موهاجیرین‌دا هەڵ بگیرسێ ، چونکە صەفوان موهاجیری‌یە و حەسسـانیش
ئەنصاری‌یە.

ئێستاش وا چاکە لەبەردەم ئەم تاقیی‌کردنەوە گەورەیەدا کەمێك هەڵوێستە بکـەین
تاهەندێ پەند و ئامۆژگاریی وەربگرین ..

١ ـ خوای گەورە کە خۆی پێغەمبەرانی لە بـەرزترین پلـەی ئـەخلاق و ئـەدەبدا
رەوانە کردووە بۆ هیدایەتی مرۆڤ ، بە سۆز و بەزەیی خـۆی ئـەو پێغەمبەرانـەی کـە
هەموو لەکەیـەکی بێڕەوشـتیی پاراسـتووە ، بـە تایبـەت لەکـەی زینـا و ناپـاکیی
خێزانیی، چونکە ئەوانەی کە شوێن ئـەو پێغەمبـەرە ئەکـەون بـۆ پـاکیی و رەوشـت
بەرزیی شوێنی ئەکەون ، جا ئەگەر شوورەیی لە ماڵەکەی خۆی‌دا هەبێ دینـی خـوای
پێ سووك ئەبێ .. بـەڵام ئـەگونجێ کـوفر و بێ‌دینیـی لـە هاوسـەر و کـەس‌وکـاری
پێغەمبەران‌دا هەبێ ، چونکە ئەوە نابێتـە مایـەی سـووکیی بـۆ ئـەو پێغەمبـەرە و
دینەکەی . ئەوەبوو هاوسەرانی نووح و لووط دوژمنـی دینیـی مێردەکانیـان بـوون ،
هەروەها باوکی ئیبراهیم و کوڕی نووحیش کافر بوون .

٢ ـ لەسەر زەوییدا هەر تەنها بوختان بۆ عائیشـە نـەکراوە ، بـەڵکو زۆرێـك لـە
ئافرەتە ئیمان‌دارە رەوشت‌بەرزە پاك‌داوێنەکان بوختانیان بۆ کراوە و بوختانیشیان بـۆ
ئەکرێ .. جا ئەم چیرۆکەی عائیشەی دایکی ئیمـان‌داران کـە خـۆی صددیقەیـە و،
کچی سەرۆکی صددیقانی هەموو نەوەی ئادەمـە و ، هاوسـەری بەتـەقوا و خزمـەت
کەری قورئانی پێغەمبەرە و ، لە حەوت طـەبەقەی ئاسمانەوە بەرگریی لە داوێنی پاکی
کراوە ، ئەبێتە دڵخۆشیی‌دانەوە بۆ ئەو خوشك و دایکە پاك داوێنانەی کە مونافیقـان
بوختانیان بۆ ئەکەن . ئەوەتا صددیقەی نـەوەی ئیسـرائیلیش ، حـەزرەتی مەریـەمی
بەتوول ، کە پەروەردەکراوی بەردەستی زەکەریا پێغەمبەر بووە ، بـە زینـا تـاوانبـار
ئەکرێت ، کەچیی لای خوا زیاتر پایەدار ئەبێت و قوڕ بەسەر ئەوانەی کـە بـە نـاڕەوا
شەرەفی خەڵك لەکەدار ئەکەن .

٣ ـ لەم چیرۆکەدا ئەدەب و رەوشتی هاوەڵانمان بۆ دەرئەکەوێ ، کـە چـۆن سـەیری
ئافرەتە موسڵمانەکان بکـەن ، بـە تایبـەت دایکـانی ئیمـان‌داران ، کـە هاوسـەرانی

پێغەمبەرن ﷺ ، بەوەی کە زۆر بە وردیی خۆیان و ئەوانیش لە گومان و دوودڵیی و تاوانبارکردن بپارێزن . ئەوەبوو صەفوان هەرکە دایکە عائیشەی ناسیی یەکسەر (( إنا لله وإنا إليه راجعون )) ی وت ، تا عائیشە بەخەبەر هات ، کە بەو وشەیە ئەوە دەرئەخات کە زۆر بەداخە ئەم دایکەی ئیمانداران بەجێ ماوە ، ئیتر هیچ وت و وێژێکی لەگەڵ ناکات ، بەڵکو وشترەکەی بۆ ئامادە ئەکات و لە کاتی سوار بوونەدا پشت هەڵ ئەکات و ، کە سواریش ئەبێ جڵەوی بۆ ڕائەکێشێ و دوای وشترەکە ناکەوێ ..

لە مێژووی کۆنیشدا مووسای پێغەمبەری خوا سەلامی لێ بێ فەرمانی دا بە کچەکەی شوعەیب پێغەمبەری خوا سەلامی لێ بێ لە دوایەوە بڕوا و ڕێگای پیشان بدات نەوەکو شەماڵ بدا لە کراسەکەی و شێوەی لاشەی بۆ دەرکەوێ .. کاتێك کە کچەکە ئەمەی بە مووساوە بینیی و ، پێشتریش دیتی چەندە لێ هاتوو، کە بە تەنیا پیاوێکی غەریب توانیی لەو قەرەباڵغی یەدا مەڕوماڵاتەکەیان بۆ ئاو بدات ، بۆیە دوو سیفەتی جوانی : بەهێز و ئەمانەتداری دایە پاڵ ، وەك قورئان باسی ئەکات :

﴿ قَالَتْ إِحْدَىٰهُمَا يَـٰٓأَبَتِ ٱسْتَـْٔجِرْهُ ۖ إِنَّ خَيْرَ مَنِ ٱسْتَـْٔجَرْتَ ٱلْقَوِىُّ ٱلْأَمِينُ ﴾

( القصص : ٢٦ ) .

٤ ـ لەم چیرۆکەدا بە سۆز و شەفەقەتێکی بێئەندازەوە پێغەمبەری خوا ﷺ دەرئەکەوێ ، لەوپەڕی غیرەتدا دەرئەکەوێ ، کە نایەوێ بە هیچ شێوەیەك چاوپۆشیی لە هەڵەیەك بکات کە ئەگەر خۆشەویستترین هاوسەریشی ئەنجامی دابێ .. لە هەمان کاتدا نایەوێ بە پەلە پەل و هەڵەشەیی ستەم لە ئافرەتێکی بێتاوان و پاك داوێن بکات هەتا شتی لەسەر ساغ نەبێتەوە .. ئەوەبوو ماوەی مانگێك بەو ئازارەوە ئەتلایەوە، بێئەوەی تەنیا قسەیەك لە نەزەری بدات .. بەڵکو بێئەوەی بیدات لە رووی کە چیی بیستووە دەربارەی ، هەتا دوای یەك مانگ نەخۆشیی و دوای ئەوەی بەرەو چاکبوونەوە ئەڕۆیشت لە ئوم میسطەحی بیست .

ڕێزی مرۆڤ لە دینی خوادا بە پلەیەك گیراوە ، مانگێك ئێش و ئازار ئەچێ بە دڵی پێغەمبەری خوادا ، بەڵام یەك وشە ڕووبەڕووی عائیشە نادرکێنێ .

کە عائیشە باسەکەی بەلاوە ئاشکرا بوو و ، ڕۆشتبووەوە سەردانی دایك و باوکی ، لەوێ پێغەمبەری خوا ﷺ بەوپەڕی یەقین و دامەزراویی و عەقیدەی ساغەوە ئامۆژگاریی عائیشە ئەکات . زۆر بە ئاسایی : ئەگەر عائیشە پاك بێت ئەو پاکی یەی

خوا دەری ئەخات . ئەگەر هەڵەیەکیشی کردووە دەبا تەوبە و پەشیمانیی بۆ خوا بنوێنێ ..

خۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەیتوانیی عائیشە تەڵاق بدا و ببڕێتەوە ، بەڵام لەسەر چیی ؟ بە پێی شەرع نابێ شتێ لەسەر ئەو ئافرەتە ساغ بێتەوە ؟

٥ ـ بۆ رێزلێنان لە پێغەمبەری خوا ﷺ ، لە ئاسمانەوە قورئان هاتەوە خوارەوە، تا پاکداوێنیی دایکە عائیشە بۆ موسڵمانان دەربخات و ، هەتا رۆژی قیامەتیش ئەو قورئانە بخوێنرێتەوە ، چونکە ئەبوبەکر شایانی ئەوەبوو خاوخێزانی بە ناڕەوا تۆمەت بار نەکرێن . چونکە ئەبوبەکر بە سەر و بە ماڵەوە ، لە یەکەم رۆژەوە خەریکی خزمەتی دین بوو .. کە بە گڕ و کڵپەی ئەو بوختانەوە ئەتلایەوە هیچی بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێ کە بفەرموێ : بەخوا لە سەردەمی نەفامییشدا شتی وەهامان پێ نەوتراوە، چ جای دوای ئەوەی کە خوا بە دینی ئیسلام پایەداری کردین !!

هەروەها عائیشەش شایانی ئەوەبوو ، چونکە بە دڵ و بە گیان خزمەتی ئازیزی ئەکرد و ، هەتا دوای کۆچی دوایی پێغەمبەریش ﷺ عائیشە بووە بەڕێوەبەری قوتابخانەیەکی شەرعیی گەورە کە ژنان و پیاوان بە نۆبە کەڵك لە دەرس و زانستەکەی وەربگرن . کاتێکیش بەو هەموو تەقوا و خواناسی‌یەیەوە ئەو بوختانە نەشیاوەی درایە پاڵ هیچی بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێ وەك حەزرەتی یەعقووب علیه السلام بڵێ :

﴿ فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَٱللَّهُ ٱلْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴾ (يوسف : ٢٨ ) .

٦ ـ بە پێی دەقی قورئان هاوسەرانی پێغەمبەری خوا ﷺ ، خوا لێیان رازیی بێ دایکانی ئیمانداران هەتا رۆژی قیامەت .. ملیۆنەها مرۆڤی صالح و خواناس شانازیی بەوە ئەکەن کە هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ دایکی بن . کەواتە ئەبێ ئەو دایکانە لە پاکیی و خواناسیی‌دا شایانی ئەوە بن کە ببنە دایکی ئەو هەموو ئیمام و خواناسانە . سەرەڕای ئەوەی کە عائیشە پلەیەکی تایبەتیی هەیە سەرباری هاوەڵێتیی کە ئەویش پلەی صددیقییەتە ، کە ئەگەر تەنها پلەی هاوەڵێتییشی هەبێ ئەوەندەی بەسە تا لە هەموو لەکەیەك بە دوور بێت .

٧ ـ لێرەدا پرسیارێك دێتە بەردەمان : بۆچ بەرگریی لە پاکیی عائیشە بە شتێکی تر نەکرا ، بەڵکو قورئان لە بارەیەوە هاتە خوارەوە ؟

أ ـ لە بەر ئەوەی کە ئەم بەرگرییە تەنها لە عائیشە و بنەماڵەی ئەبوبەکر بە تەنیا نیە ، بەڵکو بەرگرییە لە پێغەمبەر و دینەکەی و شەرەفی هەموو ئیماندارێك، بە سیفەتی ئەوەی کە عائیشە دایکی هەموو ئیمانداریکە . پێغەمبەری خواش ﷺ یەکسەر لە عائیشەی هاوسەری ، بەڵکو بەبێ لایەن وەستا هەتا خوای گەورە خۆی بڕیار بدا . جا لەبەر ئەمە و لە بەر ئەوەش کە ئەم بوختانە پەیوەندیی بە عەقیدە و یەقین و ئیماندامەزراویی موسڵمانانەوە هەیە ، تا لە گومان و دوودڵیی بۆ پاکیی خانەوادەی پێشەواکەیان بە دوور بن ، پێویست بوو بەرگرییەکە وەها بەهێز بێت ، لە هەموو چەرخێك و لە هەموو شوێنێکدا بەردەوام بێت . کەواتە شیاوی ئەوەیە قورئانی لەسەر بێتە خوارەوە تا ئەو بەرگرییە هەر بمێنێ و، ئەو ئایەتانە تا رۆژی قیامەت بەردەوام بخوێنرێنەوە ..

ب ـ بەرگریی لە شەرەف و ئابڕوو پێویستە لە هەموو بەرگرییەکی تر بەهێزتر بێ. ئەوەتا خوای گەورە حەزرەتی عیسا سەلامی لێ بێ دێنێتە زمان تا بەرگریی لە شەرەف و ئابڕووی دایکی بکات ، کە پاكداوێنە و ، بە فەرمانی خوا ، ئەم بەبێ باوك لە دایك بووە . هەروەها منداڵەکەی سەردەمی جورەیجی خواناس دێنێتە زمان تا بەرگریی لە پاکیی و بەدینیی جورەیج بکات ، چونکە لەکەداربوونی مەریەم و جورەیج - بۆ نموونە ـ لەکەداربوونی شەرەف و پاکیی دینی خوایە ، چونکە هەر یەکە لە مەریەمیش و جورەیجیش ئیمانداری تاقانەی زەمانە و ناو کۆمەڵی خۆیانن. جا ئەگەر ئەوان بشکێن بڕوا بە دین و تەقوای هیچ کەسی تر ناکرێت و ، تەوەککول و بەخوا پشتبەستنی ئیماندارانیش لاواز ئەبێت . کەواتە ئەوانە شیاون ، لەبەر خۆیان و لەبەر تێکڕای ئیماندارانیش خوای گەورە بەرگرییان لێ بکات .

کەواتە هەر دەستە و تاقمەیەك خوا بەرگریی لێ نەکردن ، ئەوە دینی خوایان وەك پێویست هەڵ نەگرتووە و ، کەم وکوڕیی لە تێگەیشتن و خزمەتکردنیاندا هەیە. واتە نەبوونەتە جێمتمانەی پەروەردگار و ، هەرچیشیان بەسەر بێت بەلای خواوە گرنگ نیە .

جا لەبەر ئەوەی کە بەرگرییکردن لە عائیشە لە چاو بەرگرییکردن لە مەریەم و جورەیج ، بۆ بەرژەوەندیی دینی خوا ، پێویستترە ، ئەوا بە شێوەی گرنگتر لە هێنانە زمانی منداڵی تازە لە دایك بوو بەرگریی خوایی لێ کرا ، کە ئەویش ناردنی قورئان بوو . چونکە شاهێدییدانی حەزرەتی عیسا و منداڵەکەی سەردەمی جورەیج

تەنها کۆمەڵێك خەڵك ئامادەی بوون و بە چاو و گوێی خۆیان لێی ئاگادار بوون ، بەڵام بەرگریی عائیشە لە قورئان‌دایە و ، تا ئاخرزەمان هەموو ئیمان‌دارێك لێی ئاگادار ئەبێت ..

ج ـ مرۆڤی بە ناهەق تاوانبارکراو ، چونکە لانی زەبوونە و ، کەس ناتوانێ شان بداتە ژێر لێ قەومانەکەی ، بە تایبەت لە کاری مەعنەوییدا ، بەڵکو خۆی بە تەنیا و بێ‌کەس ئەو تاوان و بوختانەی ئەدرێ بە کۆڵدا ، خوای گەورە بەزەیی زیاتری پێدا دێتەوە ..

حەزرەتی عائیشەی دایکمان ، هێشتا کچۆڵەیەکی کەم تەمەنە و ، تاقیی‌کاریی دنیاییشی هەر کەمە .. بەڵام کە چاوی هەڵ هێناوە دین و ئیمانی بە باوك و دایکیەوە دیوە و ، کە گوێی بەر بووە قورئان چووە بە گوێیدا .. هەرچیی تاوان و گوناه بێت لێی نزیك نەکەوتۆتەوە ، وا ئەم بوختانە روو بە رووی ئەبێتەوە .. هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندەی لێ دێ کە ئەفەرموێ : ئەگەر پاك بیت خوا پاکییت ئەخاتە روو و ، گەر تاوانباریشی تەوبە بکە ..

بەڵام کە ئایەتەکان هاتنە خوارەوە ، مژدەی پێ دا ، کە خوا بە پاکی دەر کردووە:
((یا عائشة ! أما الله عزوجل فقد برأكِ )) .

٨ ـ بۆ ئەم بوختانە مادام قورئان هاتۆتە خوارەوە ، ئیتر جگە لە رووڕەشیی و بەدبەختیی بۆ مونافیقان هیچی تێدا نامێنێتەوە ، چونکە بەڵگە و دەلیل لە قورئان بەهێزتر نیە .. ئەوەبوو لەناو کۆمەڵگای ئیسلامییدا یەك کەس نەما بە تەواویی دڵی ئاو نەخواتەوە و ، بە درێژایی مێژووش ئیمان‌داران بەوپەڕی شانازییەوە ئەو ئایەتانەی بە پاك دەرکردنی عائیشەی دایکیان ئەخوێننەوە ، چونکە ئەوانە بەرگریین لە ئابڕووی ئیمان‌داران هەر هەموویان .

ئیمام زەمەخشەریی رەحمەتی خوای لێ بێ لە تەفسیرەکەیدا دەری بڕیوە کە لە هەموو قورئاندا هەڕەشەیەکی تری توند وەك هەڕەشە لەو بوختانە نەشیاوەی عائیشەی دایکی ئیمان‌داران نیە ، کە ئەڵێت : (( ولوا قلّبت القرآن ، وفتشت ما أوعد به العصاة ، لم تر الله قد غلظ في شيء تغليظه في إفك عائشة رضوان الله عليها، ولا أنزل من الآيات القوارع المشحونة بالوعيد الشديد ، والعتاب البليغ ، والزجر العنيف ، واستعظام ما ركب من ذلك ، واستفظاع ما أقدم عليه ... )) .

هەروەها ئەم ریوایەتەشی لە ئیبن عەباس ەوە خوا لێیان رازیی بێ وەرگرتووە کە ئیبن عەبباس لە رۆژی عەرەفەدا لە بەصرە ئەبێ و ، دەربارەی تەفسیری قورئان پرسیاری لێ ئەکرێ ، هەتا ئەوەبوو دەربارەی ئەم ئایەتانە ( ی کە دەربارەی پاکیی عائیشە هاتن ) پرسیاری لێ کرا ، ئەویش وتی : هەرکەس گوناهێکی کرد و تەوبەی کرد تەوبەی لێ وەرئەگیرێ ، جگە لەو کەسەی کە چۆتە ناو ئەو باسەی عائیشەوە .

ئەمەش گەورەیی و ناهەمواریی تاوانی ئەو بوختانە دەرئەخات ..

ئەوەبوو خوای گەورە بە چوار شت چوار کەسی بە پاك دەرکردن :

بە زمانی شاهێدەکە یووسفی بە پاك دەرکرد : ﴿ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنْ أَهْلِهَا ﴾ .

لەو قسەیەی جوولەکە مووساشی بە پاك دەرکرد ، بەو بەردەی کە کراسەکەی فڕاند .[٣٤]

مەریەمیشی بە پاك دەرکرد ئەویش بە هێنانەگۆی عیسای کوڕی کە لە کۆشیدا فەرمووی : ﴿ إني عبدالله ﴾ .

عائیشەشی ، بەم ئایەتە مەزنانە ، لە قورئانە پیرۆزەکەیدا ، کە بە درێژایی مێژوو هەر ئەخوێنرێتەوە ، بە پاك دەرکرد ، بەڵام بەم شێوە مەزنە ، ئەمەش هەمووی لەبەر خاتری پێغەمبەری خوا ﷺ و دینە پاکەکەی .[٣٥]

---

٣٤ ئەم چیرۆکەی مووسا سەلامی لێ بێ لە صەحیحی بوخارییدا ریوایەت کراوە و ، خوای گەورە لە ئایەتی : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ ءَاذَوْاْ مُوسَىٰ فَبَرَّأَهُ ٱللَّهُ مِمَّا قَالُواْۚ وَكَانَ عِندَ ٱللَّهِ وَجِيهًا ﴾ ( الأحزاب : ٦٩ ) ئاماژەی بۆ کردووە . جوولەکە بوختانی ئەوەیان بۆ مووسا کرد کە گوایە عەورەتی ئاوساوە ئەوەبوو رۆژێکیان لەسەر دەریا خۆی ئەشۆرد و کراسەکەی لەسەر بەردێك دانابوو ، بە فەرمانی خوا بەردەکە کراسەکەی فڕاند و دوورکەوتەوە . مووساش ناچار بوو بە رووتیی بە دوای بەردەکە را بکا و ، ئەشی وت : ئەی بەردەکە ! کراسەکەم . لەم کاتەدا خەڵکیی دیان کە مووسا ئەو عەیبەیەی پێوە نیە .

٣٥ السيرة النبوة لأبي شهبة : ٢ / ٢٥٢ ـ ٢٧٣ ، الرحيق المختوم : ٣٣٣ ـ ٣٤١ ، غزوة الأحزاب لباشميل : ٩٤ ـ ١٣٠ ، السيرة النبوية للصلابي : ٥٧١ ـ ٥٩١ .

## بەشی بیست و حەوتەم

# غـەزای ئـەحـزاب

**یەکەم : پیلانی جوولەکە**

کە دینی ئیسلام هات ، بۆ ناو کۆمەڵێکی دواکەوتووی مێشك بەنج بـوو هـات . بۆیە دینـی تـازە لـە هـەموو لایەکـەوە دژایـەتیی ئـەکرا ، هەرچـەندە هەڵوێستی پێغەمبەری خوا ﷺ و موسڵمانان هەڵوێستێکی نەرم و نیان بوو و ، بە هیچ شێوەیەك دژایەتی یان لەگەڵ هیچ کەس‌دا نەئەکرد ، بەڵام لـەو دەور و بـەرە دواکـەوتووەدا بـە ناڕەوا دوژمـنایەتی‌یان بەرامبەر ئەکرا ..

ساڵەهای ساڵ قوڕەیش ستەمی لێ کردن و ، سزای نـاڕەوای دان و ، سـەرەنجام لـە مەککە دەری پەڕاندن و ، لە دواییش‌دا ئەو هەمووە جەنگە ناهەموارانەی بەسـت بـە کۆڵیا و ، ئابڕووی خۆی برد و، هەردەم لە هەل‌دا بوو تۆوی موسڵمانەکان نەهێڵێت..

لەولاوە موسڵمانەکان پەیمانی دۆستایەتی‌یان لەگـەڵ جوولەکـەدا بەسـت کـە نـەك ناپاکیی لەگەڵ یەکتردا نەکەن ، بەڵکو لـە کـاتی تەنگانـەش‌دا کۆمـەکیی یـەکتریی بکەن، کەچیی جوولەکەی قەینوقاع و نەضیر ناپاکی‌یان کرد و پەیـمانیان شـکاند و ، دژایەتیی موسڵمانانیان کرد، لەگەڵ ئـەوەش‌دا پێغەمبـەری خـوا ﷺ چاوپۆشـیی لێ کردن و لە ناوی نەبردن ، بەڵکو تـەنها لـە مەدینـە دووری خسـتنەوە ، کەچـیی لـە خەیبەر بۆ خۆیان دانەنیشتن ، بەڵکو کەوتنە دژایـەتیی و پـیلان‌گێـڕان تـا سـەرەنجام جەنگی ئەحزابیان هێنایە کایەوە و بوونە هۆی لەناو بردنی قوڕەیظەش .

لەلایەکی ترەوە موسڵمانەکان پێ‌یان خۆش بوو لەگەڵ تێکڕا هۆزەکـانی دوورگـەدا دۆستایەتیی بکەن و ، پەیمانی ئاشتیی لە نێوانیان‌دا بێ ، کەچیی یەك لە دوای هەوڵی ئەوەیان ئەدا بێنە سەر مەدینە و ، لە چەند لایەکیشەوە ناپاکی‌یان لەگەڵ موسڵمانان دا کرد و ، بە کۆمـەڵ موسـڵمانی بـێ‌زەرەر و زیانیـان شـەهید کـردن وەك ئەوانـەی (رەجیع ) و ( بیئر مەعوونە ) ، تا موسڵمانەکان ناچار ئەبوون دەستیان لێ بکەنـەوە و، خۆیان لە زیانیان بپارێزن .

ئەم سێ هێزە بێڕەحم و بێبەزەیی یە : هێزی قورەیش و ، هۆزە عەرەبەکانی تر و، جوولەکەی مەدینە و خەیبەر، بە جیا جیا هیچ کامیان چاری موسڵمانەکانیان نەئەکرد . لەگەڵ ئەوەش‌دا نەهاتنە سەر رێك کەوتن و پێکەوە ژیانی ئاشتیانە ، بەڵکو لە حاڵەتی جەنگ و هەرادا مانەوە ، بە تایبەت کاتێ کە جوولەکە کەوتنە هەڵ نانیان ئەوا هەر سێ هێزەکە یەکیان گرت و کەوتنە بیری ئەوەی رەگ و ریشەی موسڵمانەکان دەربهێنن .

خۆ ئەگەر جوولەکە نەبوونایە ، کە هەوڵیان لەگەڵ قورەیشیش و هۆزە عەرەبەکانی تریش‌دا دا ، لەوە ئەچوو کە هەموویان تەمێ بووبن و ، لە جەنگ وازیان هێنا بێ ، بە تایبەتیی کە قورەیش نەی‌توانیی لە کاتی دیاریی‌کراودا سوپا بگەیەنێتە بەدر و نەی‌توانی لە جەنگی بەدری دووهەم‌دا بەرامبەر بە موسڵمانەکان بوەستێ . لەو لاشەوە هەر هۆزێکی ئەعراب بە تەنیا بۆ خۆی نەی‌ئەوێرا بیر لە جەنگی موسڵمانەکان بکاتەوە ، چونکە زۆربەیان لەلایەن سوپا و سریەکانی ئیسلامەوە گورزی کاریگەری بەر کەوتبوو .. جوولەکەش خۆیان نەیان‌ئەوێرا بەرامبەر بە دەست و بازووی هاوەڵان شمشێر بە دەستەوە بگرن ، ناچار بوون عەرەبە زبر و دواکەوتووەکان هەڵ بنێن . بۆ ئەمە دوورگەی عەرەبی‌یان دژی موسڵمانەکان هەڵ نا و غەزای ئەحزاب یان خەندەق رووی دا.

**دووهەم : جوولەکە سوپای ئەحزاب رێک ئەخەن**

بەڵێ غەزای خەندەق بە رواڵەت و بە سەرباز هەڵمەتێکی قورەیشیی غەطەفانیی بوو ، بەڵام لە راستیی‌دا نەخشەیەکی جوولەکانە بوو بۆ لە ناوبردنی موسڵمانەکان.

ئەم غەزایە بریتیی بوو لە پیلانێك بۆ رووخاندنی دەوڵەتی نەونەمامی ئیسلام ، کە بە دەست کیسەی سەرکردە لێزانە ئیسرائیلی‌یەکان ئەنجام درا و ، بەشی زۆری مەسرەفی ئەو هەڵمەتە هەر لەسەر جوولەکە بوو .

ئەو جوولەکانەی کە بە درێژایی مێژوو سەرچاوەی فیتنە و ئاژاوە و هەرا بوون، توانی‌یان دە هەزار جەنگاوەر لە نێو هۆزە عەرەبەکانی دوورگەدا هەڵ بنێن و قەناعەتیان پێ بکەن کە هێرش بەرنە سەر مەدینە و موسڵمانەکان لەناو بەرن ، چونکە جوولەکە قەومێکی ئەوەندە دڵ پیس بوون ، بە درێژایی مێژوو دژی هەموو مرۆڤێك بوون لە غەیری خۆیان و ، هیچ کەسیان هەرگیز خۆش نەویستووە .

کاتێکیش کە پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی بۆ مەدینە کرد و ، بۆیان دەرکەوت کە پێغەمبەری ئاخرزەمانە و ، زنجیرەی پێغەمبەرایەتیی لە دەستی جوولەکە دەرچووە ؛ کەوتنە دژایەتیی خۆی و دینەکەی و شوێنکەوتووانی .

بەڵێ قورەیش رقیان لە پێغەمبەر و ئیسلام بوو ، بەڵام نەك وەك جوولەکە ؛ ئەوەندە هەبوو جوولەکە ئەو دەسەڵاتەیان نەبوو و ، وەك عەرەبەکان توانای چەك هەڵگرتن و دژایەتیی و بەرابەرکێیان نەبوو ، بۆیە ناچار بوون پەنا بەرنە بەر پیلان و نەخشەکێشان و فڕوفێڵ بۆ لەناوبردنی موسڵمانەکان ، چونکە کە موسڵمانەکان گەیشتنە مەدینە خێرا بوونە خاوەنی هێزێکی سەربازیی یەکجار لێهاتوو کە لە هۆزە قەحطانییەکانی یەثریب ( ئەوس و خەزرەج ) پێك هاتبوو ، سەرەڕای کۆچکەرانی مەککە کە لەبەر رەزامەندیی خوا نیشتمان و کەسوکاریان بە جێ هێشتبوو و ، خۆیان گەیاندبووە سەربازخانەی ئیسلام لە مەدینە . بەمە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە خاوەنی سوپایەکی عەقیدەیی قیامەتیی کە هەردەم هەموو ئەندامێکی خۆی تەرخان کردبوو بۆ پارێزگاریی لە ئیسلام و ، هەردەم لە خوایش ئەپاڕایەوە کە شەهیدیی خەڵات بکات .

بە بوونی سوپایەکی وەها بەغیرەت و کۆڵنەدەر و چاونەترس ؛ کە سەروماڵی بە خوا فرۆشتبێ ، جوولەکە چاوەکانیان کوێر ئەبوون و ، نەشیان ئەوێرا دەست بدەنە شمشێر و ، ئەشیانزانیی رۆژ بە رۆژ موسڵمانان بەهێزتر ئەبن ، بۆیە ئەوەی لێیان ئەهات فات و فیت و ئاژاوە و پیلانگێڕان بوو بۆ تێکدانی یەکیەتیی ریزی موسڵمانان ، تا ئەوەبوو لە دوا هەوڵیاندا نەوەی نەضیر تەکانیان دا و ، غیرەتیان نایە بەر خۆیان و هەوڵیان دا پێغەمبەری خوا ﷺ کە میوانیان بوو بکوژن ، کە لەوەشدا سەرنەکەوتن ئەوانیش لە مەدینە دەرکران .

جوولەکەی خەیبەر و قەینوقاع و نەضیر یەکیان گرت و ، سەردارانیان کەوتنە تەگبیری ئەوە کە نەخشەیەك بۆ ریشەکەنکردنی موسڵمانان بکێشن ، تا لە ئەنجامی ئەم هەوڵ و تەگبیرەیاندا سوپای ئەحزابیان هێنایە سەر مەدینە کە تەنها بە هێز و کۆمەکیی خوای گەورە موسڵمانان و دینەکەیان لە تیاچوونێکی حەتمیی رزگاریان بوو..

جوولەکەی نەضیر لە خەیبەر چەندین کۆبوونەوەیان گرێ دا ، تا باسی بارودۆخی خۆیان بکەن ، کە چۆن لە دوورگەدا شوێنیان پێ لێژ بووە ؛ بە تایبەت دوای

داڕووخانی بنکەی سەرەکی‌یان لە مەدینە و ، بەرپابوونی دەوڵەتێکی ئیسلامیی وەها بەهێز کە خاوەنی ئازاترین سوپا بێت لە دوورگەدا ..

ئەوەبوو دوای لێك‌دانەوە و سەرنج و هەڵسەنگاندنێکی ورد پەرلەمانی ئەو کاتەی جوولەکە لە خەیبەر گەیشتنە ئەو رایە کە نەخشەیەکی ورد دابڕێژێ تا هێرشێکی گشتیی و هەمە لایەنە بکرێتە سەر موسڵمانەکان ، بەڵام هێرشێك کە زۆرترین هۆزە عەرەبە بەهێزەکان ، بە تایبەت هۆزەکانی نەجد و کینانە و قورەیش ؛ بەشداریی جەنگی تیا بکەن و ، شارەزایانی جوولەکە بانگەواز بۆ ئەم هێرشە بکەن و ، بەشی زۆری خەرج و مەسرەفیش لەسەر جوولەکە بێت .

**سێهەم : نوێنەرانی جوولەکە**

بۆ جێبەجێ‌کردنی ئەم بڕیارە دوژمن‌کارییە سەردارانی جوولەکە لە خەیبەر بڕیاریان دا نوێنەرێك لە جوولەکە زۆرزانەکان بۆ ئەم کارە هەڵ ببژێرن ، تا پەیوەندیی بە هۆزە عەرەبەکانەوە بکەن ، بۆ ئەنجام‌دانی ئەم هێرشە سەرتاسەرییە .

نوێنەرەکانیش ئەمانە ناودارەکانیان بوون و لە ( الرحيق المختوم ) دا ژمارەیان بیست کەس بووە :

١ ـ حویەیی کوڕی ئەخطەب ، سەرۆکی نوێنەران .
٢ ـ سەللامی کوڕی میشکەم ، ئەندام .
٣ ـ کینانەی کوڕی رەبیعی کوڕی ئەبولحوقەیق ، ئەندام .
٤ ـ هووذەی کوڕی قەیسی وائیلیی ، ئەندام .
٥ ـ ئەبوعامیری فاسیق ؛ کە خەڵکی مەدینە بوو و ، لە ئوحوددا دژی موسڵمانەکان ئەجەنگا ، ئەندام .

لە سەرەتای مانگی شەعبانی ساڵی پێنجەمدا ( کە ئەمە راستترین مێژووی دەست‌پێ‌کردنە ) نوێنەرانی جوولەکە خەیبەریان بەجێ هێشت . جا هەرچەندە ماوا و مەنزڵی هۆزەکانی غەطەفان لە نەجددا لە خەیبەرەوە نزیك‌تر بوو ؛ بەڵام نوێنەرە جوولەکەکە راستەوخۆ بەرەو مەککە کەوتنە رێ ..

سەرەتا پەیوەندی‌یان بە سەرۆك و فەرماندەکانی قورەیشەوە کرد و ؛ باسی ئەو نەخشەیان بۆیان کرد ؛ کە ئەیانەوێ یەکگرتوویەکی سەربازیی خێڵەکیی گەورە ؛ لە

هەموو هۆزەکان دروست بکەن بۆ هێرش کردنە سەر مەدینە و ، لە ریشە دەرهێنانی موسڵمانەکان.
کە فەرماندە و سەرۆکانی مەککە ئەمەیان بیست زۆر پێی شادمان بوون و ، رەزامەندی‌یان لەسەری نواند و ، سوپاسێکی بێ‌پایانی جوولەکەیان کرد لەسەر ئەو هەموو زەحمەت و ماندووبوونەیان بۆ رێك‌خستنی ئەم هەڵمەتە ؛ چونکە قورەیش خۆیان نەیان‌ئەوێرا جارێکی تر لەبەر دەم موسڵمانەکان‌دا بە تەنیا شمشێر بەرز بکەنەوە ؛ بۆیە لە خوایان ئەویست یەکێك بێت بە هانایانەوە .
بۆ ئەمە گەورە پیاوان و فەرماندەکانی مەککە کۆبوونەوەیەکی تایبەتی‌یان ئەنجام دا تا ئەم نەخشە جوولەکانەیە تاوتوێ بکەن و ، یەکگرتوویەکی عەرەبیی یەهوودیی پێك بێنن بۆ لەناوبردنی ئیسلام و موسڵمانان .
کە پیاوانی ( دار الندوة ) ی مەککە لە پرۆژەکە تێ‌گەیشتن و زانی‌یان چاك‌ترین نەخشەیەکە بۆ لەناوبردنی دەوڵەتی مەدینە ؛ پێشوازی‌یەکی چاکیان لێ کرد ؛ هەتا ئەبوسوفیانی فەرماندەی گشتیی سوپای مەککە ، بە ئامادەبوونی نوێنەرە جوولەکە میوانەکان ؛ لە پەرلەمانی مەککەدا هەستایە سەر پێ تا وتارێك پێشکەش بە ئامادەبووان بکات .
ئەوەبوو بە ناوی ( دار الندوة ) و سوپای مەککەوە خۆشحاڵیی بەم نەخشەیە دەربڕیی ، بەو هیوایەوە موسڵمانەکان بهاڕن و ، بە جوولەکەی راگەیاند کە خۆشەویست‌ترین کەس بەلای قورەیشەوە ئەو کەسەیە کە بۆ دژایەتیی موحەممەد یارمەتی‌یان بدات .
هەر لەو دانیشتنەدا هەندێ لە گەورە پیاوانی مەککە ، بە هەلیان زانیی ؛ پرسیار لە زاناکانی جوولەکە بکەن کە ئایا دینی موحەممەد چاکترە یان بت‌پەرستیی قورەیش خۆیان؟
لێرەدا ناپاکیی و نامەردیی جوولەکە دەرئەکەوێ ، کە هەرچەندە چاك ئەیان زانیی ئەو عەرەبە بت‌پەرستانە چەند سەرگەردانن و ، چاك ئەشیان‌زانیی کە دینی ئیسلام دینی خوایە و ، موحەممەدیش دوا پێغەمبەرە کە خوا ناردوویەتی و ، خۆیان ساڵەهای ساڵ بوو چاوەڕوانی هاتنی بوون و ، هەموو ناونیشانێکیشیان بە جوانیی پێوە بینیوە.. لەگەڵ ئەمەدا بە پێچەوانەی راستی‌یەوە وەڵامیان دایەوە و وتیان : دینی ئێوە لە دینی ئەو چاك‌ترە و ، ئێوە لەسەر حەقن . هەتا جوولەکە بەو بوختانەوە

نەوەستان ، بەڵکو ، کە قورەیشی یەکان بۆ دڵمتمانەیی داوایان لە جوولەکە کرد کە سەجدە بۆ بتەکانیان بەرن ، بەبێ شەرمانە سەجدەیان بۆ بردن !!

بەم بۆنەوە قورئانی پیرۆز هات و ئەو کارە نامەردانەی جوولەکەی بە کارێکی ناشیرین لە قەڵەم دا و جوولەکەی خستە بەر لەعنەتی خوا ، کە فەرمووی :

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ يُؤْمِنُونَ بِٱلْجِبْتِ وَٱلطَّٰغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ هَٰٓؤُلَآءِ أَهْدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ سَبِيلًا ۝٥١ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ وَمَن يَلْعَنِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ نَصِيرًا ﴾ ( النساء : ٥١ - ٥٢ ) .

ئەوەتا یەکێ لە جوولەکە خوێندەوارەکان ئەو کارەی جوولەکە بە کارێکی هەڵە لە قەڵەم ئەدا ، کە ئەویش دکتۆر ئیسرائیل ولفنسۆنە و ، لە کتێبی « تأريخ اليهود في بلاد العرب » دا ئەوە تۆمار ئەکات کە جوولەکە نەئەبوو هەڵەی وەها بکەن و بڵێن کە بتپەرستیی لە تەوحیدی ئیسلامیی چاکترە ، ئەگەرچیی قورەیش نەخشەکەیانیشی بدایەتە دواوە .

دوای ئەوەی کە نوێنەرە جوولەکەکان قورەیشیان رازیی کرد و ، کاتی هێرشەکەشیان دیاریی کرد ، بەرەو نەجد ، بۆ ناو هۆزەکانی غەطەفان کەوتنە رێ..

ئەوەبوو بەناو هۆزی نەوەی موررە و ، نەوەی فەزارە و ، نەوەی ئەشجەع و ، نەوەی سولەیم و ، نەوەی سەعد و ، نەوەی ئەسەد و ، هەر هۆزێکی تریش‌دا کە داخ لە دڵی موسڵمانەکان بن ، گەڕان و ، دەستیان دایە خراپەوتنی موسڵمانەکان و هەڵنانی ئەو عەرەبانە لە دژیان و ، ئەوەشیان پێ گەیاندن کە نەخشەی هەڵمەت بردنە سەر مەدینەیان بە دەستەوەیە و ، قورەیشیش رەزامەندیی لەسەر ئەم پرۆژەیە نواندووە و ، ئێستە خەریکی خۆ ئامادەکردنە بۆ هەڵمەتبردنە سەر مەدینە .

جا لەبەر ئەوەی کە عویەینەی کوڕی حیصن [٣٦] بەهێزترین کەسایەتیی گوێڕایەڵی کراوی نێوان ئەو هۆزانە بوو ، نوێنەری جوولەکەکان بە تایبەتیی لەگەڵ ئەودا وت و

---

[٣٦] عویەینەی کوڕی حیصنی کوڕی بەدر سەرداری نەوەی فەززارە بوو ، کە بەشێك لە غەطەفان بوو . یەکێکە لەوانەی کە دڵی راگیراوە ( المؤلفة قلوبهم ) و پلەی هاوەڵێتییشی هەبووە . بەشداریی فەتحی مەککە و طائیفی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا کردووە . پیاوێکی رەق و زبر بووە . پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی ناوە ( الأحمق المطاع ـ ئەحمەقی گوێڕایەڵیی کراو ) چونکە ، وەك لەناو عەرەبەکان‌دا بەناوبانگ بووە ، هەزار کەس بە دوایەوە بوون . عویەینە لە سەردەمی خەلیفە ئەبوبەکردا لە ئیسلام هەڵ گەڕاوەتەوە و ، لە ژێر فەرماندەیی طولەیحەی کوڕی خوەیلیدی ئەسەدیی‌دا ـ کە داوای پێغەمبەرایەتیی ئەکرد ـ لەگەڵ موسڵمانەکان دا جەنگاوە ، پاشان گەڕاوەتەوە سەر ئیسلام ..

وێژیان کرد . هەروەها لە نێو سەرۆکی هۆزە غەطەفانی‌یەکان‌دا حاریثی کوڕی عەوفی فەرماندەی نەوەی موڕڕە و ، ئەبومەسعوودی کوڕی روخەیلەی فەرماندەی نەوەی ئەشجەع و ، سوفیانی کوڕی عەبد شەمسی فەرماندەی نەوەی سولەیم و طولەیحەی کوڕی خووەیلیدی فەرماندەی نەوەی ئەسەد بەشداریی ئەو وت و وێژەیان کرد .

سەرۆکانی ئەم هۆزانەش شادمانیی خۆیان بۆ ئەم پرۆژە جوولەکانەیە دەربڕیی و، زۆریان پێ خۆش بوو بە هەموویانەوە بچنە سەر دوژمنی هاوبەشی مەدینەیان و لەناوی بەرن ، چونکە سوپای موسڵمانان هەموویانی بە جیاجیا بەگیر هێنابوو . سەرەنجام ئەو سەرۆکانە لەگەڵ نوێنەرە جوولەکەکان‌دا لەسەر جێبەجێ‌کردنی ئەو نەخشەیە رێك کەوتن . بەم شێوەیە جوولەکە توانی‌یان ئەو یەکگرتووە عەرەبیی و جوولەکانە سەربازی‌یە فەرهەم بێنن .

**گرنگ‌ترین بەندەکانی ئەم رێك‌کەوتنە ئەمانە بوون :**

١ـ پێویستە هۆزە غەطەفانی‌یەکان سوپایەکی شەش هەزاریی بۆ ئەم هەڵمەتە پێکەوە بنێن .

٢ ـ جوولەکەی خەیبەریش ، بەرامبەر بەو کارەی غەطەفان ، بەرهەمی ساڵێکی هەموو دارخورماکانی خەیبەر بدەن بە غەطەفان .

دوای ئەم رێك‌کەوتنە نوێنەرە جوولەکەکان فەرماندەکانی قورەیشیان لەم رێك کەوتنەش ئاگادار کرد و ، قورەیش یەکجار خۆشحاڵ بوون .

**چوارەم : جەم کردنی سوپا**

بەم شێوەیە ، بە تەگبیری جوولەکە ، بەرەیەکی فراوان لە دوژمنی داخ لەدڵ لە دژی موسڵمانەکان یەکی گرت و ، کەوتنە خۆ ئامادەکردن بۆ هەڵمەتێکی گەورەی چڕ و پڕ تا دەوڵەتی مەدینە لەناو بەرن .

قورەیش ، بە سەرۆکایەتیی ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب ، توانیی چوار هەزار جەنگاوەر لە قورەیش و هۆزە هاوپەیمانەکانی جەم بکات ، بەڵام بەوپەڕی رێك و پێکیی و تفاقی چاکەوە ، کە ئەوەبوو هەزار و پێنج صەد وشتریان پێ بوو بۆ بار و بۆ سەربڕین و ، سێ‌صەد ئەسپیش بۆ سواریی و ، هەڵمەتی سەربازیی .

بۆ ئەمە قورەیش لە ( دار الندوة ) دا کۆبوونەوەیەکیان کرد و ، ئاڵایان دایە دەست عوثمانی کوڕی ئەبوطەلحەی عەبدەریی و ، فەرمانداییەتیی

سوپاش بە ئەبوسوفیان سپێررا و ، خالیدی کوڕی وەلیدی مەخزوومییش فەرماندایەتیی ئەسپ سوارانی پێ سپێررا . ئەم پێسپێررانەش بە یاسایەکی تایبەتیی بوو ، کە ئەوەبوو لە دێرزەمانەوە کارەکان لە نێو هۆزەکان‌دا دابەش کرابوون .

فەرماندەی گشتیی سوپا ئەبوایە لە نەوەی ئومەییەدا بوایە .

سیقایە و ریفادەش ئەبوایە لە دەستی نەوەی هاشم‌دا بوایە .

هەڵگرتنی ئاڵای جەنگیش تایبەت بوو بە نەوەی عەبدوددارەوە ، لەگەڵ حیجابە.

فەرماندایەتیی ئەسپ سوارانیش هەمیشە لە دەستی نەوەی مەخزووم‌دا ئەبوو . جا بۆ ئەوەی ئەم کارە بە راستیی دەستی بدرێتێ و بکرێتە کارێکی پیرۆز کە لێی پاشگەز نەبنەوە ، لە هەموو نەوەکانی قورەیش‌دا پەنجا پیاو هاتن بۆ لای کەعبە و ، سنگیان نا بە کەعبەوە و خۆیان بە پەردەکانی کەعبەدا هەڵواسیی و ، بەڵێن و پەیمانیان دا کە هیچ کەسێکیان پشتی ئەوانی تر بەر نەدات و ، بە یەك دەست و یەك هێز ، هەتا تاقە پیاوێکیان مابێ ، بچن بە گژی موحەممەددا ..

هۆزەکانی غەطەفانیش شەش هەزار جەنگاوەری دوڕوندەیان کۆکردنەوە . بەڵام غەطەفان وەك قورەیش خاوەنی یاسای دابەش‌کردنی کاروبار نەبوون ، بۆیە نەیان توانیی فەرماندەیەکی گشتیی بۆ سوپاکەیان دابنێن ، بۆیە هێزەکانی غەطەفان لە ژێر فەرماندەیەتیی چوار فەرماندەدا بوون :

١ ـ نەوەی فەززارە ، کە فەرماندەکەیان عویەینەی کوڕی حیصن بوو کە هەزار سوار چاکی لەگەڵ‌دا بوو . بە مەرجێ پێغەمبەری خوا ﷺ چاکەی لەگەڵ‌دا کردبوو و پارچە زەوی‌یەکی پێ دابوو بۆ لەوەڕاندنی ئاژەڵەکانی .

٢ ـ نەوەی ئەسەد ، کە فەرماندەیان طولەیحەی کوڕی خوەیلید بوو .

٣ ـ نەوەی ئەشجەع ، کە فەرماندەیان مەسعوودی کوڕی روخەیلەی کوڕی نووەیرە بوو.

٤ ـ نەوەی موڕڕە ، کە فەرماندەیان حاریثی کوڕی عەوف [illegible] چوارصەد جەنگاوەریان هەبوو .

هەروەها نەوەی سولەیم‌یش حەوت‌صەد جەنگاوەریان هەبوو .

لەم هۆزانە و لە هۆزی قورەیش و هاوپەیمانەکانی دە هەزار جەنگاوەر کۆ کرانەوە و، ئەبوسوفیان کرایە فەرماندەی گشتیی سوپای ئەحزاب و بەرەو مەدینە کەوتنە رێ.

وەنەبێ حکوومەتی مەدینە لەم هەموو رووداوانە بێئاگا بوویێ ، کە لە مەککە و لە بیابانی نەجددا پیلانێکی ترسناك بۆ دوارۆژی ئیسلام دائەڕێژن ، چونکە هەواڵ زانەکانی یەکجار وریا و گورج و گۆڵ بوون .

هەر لەو کاتەوە کە نوێنەری جوولەکە لە خەیبەر بەرەو مەککە دەرچوو بوو ، ئەوان ئاگایان لێ بوو و ، بە جوانییش ئاگاداری هەموو رێک کەوتن و تەگبیرێکی نێوان ئەو نوێنەرانە و قورەیش و غەطەفان بوون و ، یەك بە یەك ئەو هەواڵانەیان رەوانەی مەدینە ئەکرد . بۆیە موسڵمانەکان تەواو هۆشیار و ئاگادار بوون و چاوەڕوان بوون بزانن گفت وگۆی شەیتان پەرستان بە کوێ ئەگات .

کە ئەوان رێك کەوتن ، هەواڵی رێککەوتنەکە گەیشتە موسڵمانان و ، بە وردیی ژمارەی جەنگاوەرانی هەموو لایەك و ناوی فەرماندەکان و کاتی دیاریی کراوی هێرشیان زانیی .

**پێنجەم : پرۆژەکەی سەلمان**

پێغەمبەری خوا و موسڵمانەکان هەستیان کرد کە مەترسی یەکی گەورە رووی لە دەوڵەتی مەدینە ناوە و ، پێویستە دوای پشتبەستن بە خوا و لە خوا پاڕانەوە ، نەخشەیەکی ورد بکێشن تا بتوانن بەرگریی لە مەدینە بکەن و دینەکەیان و دەوڵەتە ساواکەیان لەم گەردەلوولە رەشە بپارێزن .

بۆ ئەمە پێغەمبەری خوا ﷺ کۆبوونەوەیەکی بە گەورە فەرماندەکانی سوپاکەی ، لە موهاجیر و ئەنصار ، کرد تا بە وردیی باسی مەترسیی ئەم نەخشە و پیلانە جوولەکانە بکەن .

موسڵمانەکان ئەوەیان لا روون بوو کە سوپای ئەحزاب مەبەستی ئەوەیە پایتەختی ئیسلام بگرێ و ، قەتڵ و عامی موسڵمانەکان بکات و ، هەرچیی تیایە تالانی بکات، بۆیە لە کۆبوونەوەکەدا باسی پارێزگاریی لە پایتەخت ئەکرا و، دوای وت و وێژ بڕیار درا کە لە شاردا بمێننەوە ، چونکە سوپای هێرش کەر لە دە هەزار کەس کەمتر نیە و ، بە هیچ شێوەیەك سوپای مەدینە لە سێ هەزار کەس زیاتر نیە ، کە زۆرێك موونافیقی ناپاکی تێدایە و لە کاتی جەنگدا نابێ موسڵمانان لێیان بێخەم بن .

ئەوەبوو ناوچەی باکووری مەدینە لەلایەن موسڵمانەکانەوە هەڵ بژێررا تا بیکەنە هێڵی بەرگریی سەرەکیی . لە هەمان کاتدا هاتنە سەر ئەو بڕیارە کە سوپای بچکۆلەی

ئیسلام توانای خۆڕاگریی نابێ لە دەشتێکی بەر بلاّوی وەك دەشتی بەدردا . تا لەگەڵ سوپایەکی وەها گەورەدا بجەنگێ ، چونکە ئەو سوپایە یەکجار زۆرە و . ئەگەر هێرش بکات، بە سوپای هاوەڵان پەرچ نادرێتەوە .

موسڵمانەکان خەریکی بیرکردنەوە بوون بۆ دۆزینەوەی هۆیەکی کاریگەر تا لە سوپای ئەحزاب رزگار بن و لەگەڵیا نەکەونە جەنگی راستەوخۆوە . خوای گەورەش نەخشەکانی زۆر جوانن .. لە ولاّتی فارسەوە ، پیاوێکی ئەم شار و ئەو شار گەیاندۆتە مەدینە تا دەرمان و چارەی ئەمرۆی پێ بێت . تاقە پیاوێك ئەکاتە هۆی سەرفرازیی دینەکەی .. ئەوەبوو سەلمانی فارسیی لەو کۆڕەدا ئامادە بوو .. ئەویش وەك بەشداربووان پرۆژەی خۆی پێشکەش بە فەرماندەی بالاّی سوپای ئیسلام کرد .. ئەو پرۆژەیەی سەلمان کارێکی ناوازە بوو و بە بیری هیچ عەرەبێك‌دا نەهاتبوو ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ رەزامەندیی لەسەر نواند و دوعای خێریشی بۆ کرد و ، موسڵمانانیش یەکجار دڵخۆش بوون پێی .

پرۆژەکەی سەلمان بریتیی بوو لە هەڵکەندنی چالێکی قووڵ لە هەموو ئەو ناوچەیەدا کە ئەکرێ سوپای ئەحزاب هێرشی لێوە بکەنە سەر مەدینە ، بە مەرجێ ئەم خەندەقە بەر لە گەیشتنی سوپای ئەحزاب تەواو ببێ ..

ئەوەبوو سەلمان وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئێمە لە ولاّتی فارس‌دا ئەگەر لە هێرشی ئەسپ سواران ترسمان ببوایە چاڵمان بە دەوری خۆماندا هەڵ ئەکەند.

بۆ بەرگریی‌کردن لە مەدینە فەرماندەکانی سوپای ئیسلام لەسەر ئەم خالاّنە رێك کەوتن:

١ ـ موسڵمانەکان لە ناو شاردا بمێننەوە و هەر لەوێ بەرگریی لە شار بکەن .

٢ ـ لای باکووری شار بکەنە هێڵی بەرگریی سەرەکیی . کە ئەکەوێتە بەردەم چیای ( سەلع ) بە مەرجێ ئەم چیایە بکەوێتە پشتی فەرماندەی ئیسلامی‌یەوە .

٣ ـ موسڵمانەکان چاڵێکی وەها قووڵ هەڵ بکەنن کە بەربەست بێت لە نێوان خۆیان و سوپای ئەحزاب‌دا .

٤ ـ موسڵمانەکان ناو شار لە ژن و منداڵ و پەك‌کەوتە چۆڵ بکەن و . لە ناو قەڵا سەختەکان‌دا بیان‌پارێزن . نەوەکو دوژمن هێرش بکاتە سەر شار ، بە تایبەت جوولەکەی نەوەی قورەیظە . کە ئەگونجێ پەیمانی ئاشتیی نێوانیان بشکێنن و هێرش بکەنە سەر ژن و منداڵی موسڵمانان و ، بیان‌دەنە دەست دوژمن .

٥ ـ پێویستە موسڵمانەکان هەموو شەوێك هەتا بەیانیی پاسەوان بۆ شار دابنێن.

**شەشەم : موسڵمانەکان لەوپەڕی مەترسییەدا بوون**

لە راستییدا سوپای دوژمن یەکجار زۆر بوو ، بەلاّم مەترسیی موسڵمانان هەر لەوەدا نەبوو کە سوپایەکی ملهوڕ هاتۆتە سەریان ، بەڵکو لە پاڵ ئەمەدا هەندێ لەوانەی کە بە دەم دەریان ئەبڕیی موسڵمانن موونافیق بوون و ، بۆ هەل ئەگەڕان هەتا زیان بە موسڵمانان بگەیەنن . دیسان هەر لە مەدینەدا موسڵمانەکان دوژمنێکی تری فێڵبازی ئاژاوەچییان هەبوو ، کە بە رواڵەت و لە کاتی ئاساییدا دۆست بوو ، بەلاّم لە کاتی تەنگانەدا ئاگری ژێر پووش بوو و ، بۆ هەل ئەگەڕا وەك مار موسڵمانەکان بگەزێ ، کە ئەوەش جوولەکەی نەوەی قورەیظە بوو ..

پێش هەموو شتێ سوپای ئیسلام کارێکی ژیرانەی کرد کە ناوچەی باکووری مەدینەی کردە بنکەی سوپا بۆ پارێزگاریی لە شار ، چونکە هەر کەس بیەوێ هێرش بکاتە سەر مەدینە ، لەو قوڵەوە ئەتوانێ هێرش بکات ، چونکە لایەکانی تری شار بە درەخت و دارخورمای چڕ و پڕ ، یان بە خانووبەرە ، یان بە کۆسپی سروشتیی وەك بەرد و بەرزایی گیرابوون و رێیان نەئەدا سوپای وەك سوپای ئەحزاب لەوێوە هەڵمەت بەرن . کەواتە ناوچەی باکوور ، روو بە کێوی ئوحود شوێنی گونجاو بوو کە دوژمن هێرشی لێوە بکات ، بۆیە فەرماندەیی سوپای ئیسلام بڕیاری دا لەو ناوچەیەدا خەندەق هەڵ بکەنن .

شایانی باسە کە هەردوو لای مەدینە ، لای خۆرهەلاّت و لای خۆرئاوای ناوچەی بەردەلاّن بوو .. ئەوەبوو ( حرة الوبرة ) لە خۆرئاواوە و ( حرة واقم ) یش لە خۆرهەلاّتەوە بوون ، لە باشووریشەوە هەندێکی دارستان و هەندێکی بەردەلاّن بوو . کەواتە ئەبوایە لە خۆرئاواوە هەتا خۆرهەلاّت لە باکوورەوە خەندەق هەڵ بکەنرایە . بەمە کە سوپای ئەحزاب لە ئاکاری ئوحود و ( مجمع أسيال ) ەوە ئەهات ئەو خەندەقە ئەبووە کۆسپ و نەئەگەیشتنە شار .

نەخشە کێشرا بۆ شوێنی هەڵکەندن و پیاوانی ئیسلام خێرا دەستیان بە چاڵ هەڵ کەندن کرد و ، پێغەمبەری خوایش ﷺ وەك هەر ئەندامێکی کۆمەڵگای ئیسلامیی کاری ئەکرد هەتا خەندەق تەواو بوو . موسڵمانەکانیش کە ئازیزی نازداریان ئەدیی وا لە کارکردن و ماندووبوون باکی نیە و ، وەك ئەوان ماندوو و برسیی ئەبێت ، دڵیان ئەهاتە جۆش و بەوپەڕی غیرەتەوە کاریان ئەکرد ، بەو هیوایەوە بەر لە گەیشتنی سوپای ئەحزاب لێ ببنەوە و ، تەواوی بکەن .

لە یادمان نەچێ کە پەیمانی ئاشتیی و دۆستایەتیی لە نێوان موسڵمانەکان و جوولەکەی قورەیظەدا هەبوو ، کە هەر کاتێ دوژمنێ بێتە سەر مەدینە هەردوولا دژی ئەو دوژمنە بووەستن ، واتە هەر کامیان کەوتە تەنگانەوە ئەوی‌تریان کۆمەکیی بکات . بە پێی ئەمە بێ ئەبوا جوولەکەی قورەیظە بهاتنایە و یارمەتیی سوپای ئیسلامیان بدایە و ، بەشداریی هەڵکەندنی خەندەقیان بکردایە .. کەچیی یەك جوولەکە بەشداری‌یان نەکرد و ، ئەمەش یەکەم نیشانە بوو کە ئەوان بە پێچەوانەی ئەو پەیمانە رەفتار ئەکەن ..

بۆ ئەوەی زوو خەندەقەکە هەڵ بکەنرێ و پێش تەواوبوونی سوپای ئەحزاب نەگاتە بەرەوە ، موسڵمانەکان بەبێ وچان هەر لە بەیانی‌یەوە هەتا ئێوارە کاریان ئەکرد و ، تەنها بە شەودا ئەحەسانەوە و ، پێغەمبەریش ﷺ خۆی چاودێریی ئەکرد و بە دەستی پیرۆزیشی چاڵی هەڵ ئەکەند .

ئەم کارە کارێکی یەکجار گران بوو ، چونکە ئەبوا موسڵمانەکان پێنج هەزار باڵ چاڵیان هەڵ بکەندایە ، سەرەڕای ئەوەش کە لەوساڵەدا موسڵمانەکان لە گرانیی‌دا ئەژیان و یەکجار دەست‌کورت و بێ‌خۆراك بوون ، بۆیە زۆربەی موسڵمانان کە ئەو کارە قورسەیان ئەنجام ئەدا خواردنی پێویستیان دەست نەئەکەوت تا لە برسێتیی رزگار بن ، هەتا پێغەمبەری مەزنیش ﷺ کە کاریشی ئەکرد ، لە تاو برسێتیی‌دا بەردێکی بە سکیەوە بەستبوو و ، خۆراکی سەرەکییشیان تەنها خورما بوو.

**حەوتەم : فەڕ و بەرەکەت**

بەڵگەی دەست‌کورتیی و هەژاریی موسڵمانەکان لە کاتی هەڵکەندنی خەندەق‌دا ئەم ریوایەتەی ئیبن ئیسحاقە کە لە سەعیدی کوڕی میناوە ئەگێڕێتەوە کە بۆی باس کردووە : کچێکی بەشیری کوڕی سەعد ، واتە خوشکی نوعمانی کوڕی بەشیر وتوویە: دایکم ، عومەرەی کچی رەواحە ، بانگی کردم و ، مشتێ خورمای کردە کۆشمەوە و وتی : کچەکەم ! خۆراکی نیوەڕۆ بۆ باوکت و عەبدوڵڵای کوڕی رەواحەی خاڵت بەرە.

کچەکە ئەڵێت : خورماکانم وەرگرت و رۆیشتم ، ئەوەبوو بەلای پێغەمبەری خوادا ﷺ تێپەڕم کرد و ، منیش بۆ باوکم و خاڵم ئەگەڕام ، فەرمووی : (( تعالي يا بنيّة ما هذا معك ؟ )) فەرمووی : کچی خۆم وەرە ، ئەوە چی‌یە پێت؟

ئەڵێت : وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەمە خورمایە و دایکم بە مندا ناردوویە بۆ بەشیری کوڕی سەعدی باوکم و عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەی خاڵم تا بۆ نیوەڕۆ بیخۆن .
فەرمووی : (( هاتِیهِ )) . ئەڵێت : خورماکانم کردنە هەردوو مشتی پێغەمبەری خواوە ﷺ و پڕیان نەکردن . پاشان فەرمانی دا کراسێکیان بۆ ڕاخست ، پاشان خورماکانی کردنە سەر کراسەکە و ، بەسەریدا پرژ و بڵاو بوونەوە . پاشان بە هاوەڵێکی فەرموو : بە ناو ئەهلی خەندەقدا جاڕ بدە و بڵێ : وەرن بۆ خواردنی نیوەڕۆ . ئەوەبوو ئەهلی خەندەق هەمووی کۆبوویەوە و دەستیان بە خواردنی خورمای سەر کراسەکە کرد و ، ئەویش هەر زیادی ئەکرد ، هەتا ئەهلی خەندەق دەستیان لێ هەڵ گرت و کشانەوە دوا و ، خورماش لە هەموو لایەکی کراسەکەوە ئەڕژان .
لە لایەکەوە دوژمنێکی سەرسەخت و ، لەلایەکی تریشەوە گرانیی و برسێتیی.. سەرەڕای ئەمانەش زستانێکی سارد و سەرما و ڕەشەبایەکی توند موسڵمانەکانیان بە گیر هێنابوو ..
بوخاریی لە سەهلی کوڕی سەعدەوە ریوایەت ئەکات کە وتوویە : لە کاتی هەڵ کەندنی خەندەقدا لە خزمەتی پێغەمبەردا بووین کە موسڵمانەکان هەڵیان ئەکەند و ئێمەش خۆڵمان بەسەر شان ئەگواستەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەیفەرموو:

ألّلهم لا عيش إلا عيش الآخرة فاغفر للأنصار والمهاجرة

هەروەها بوخاریی لە ئەنەسەوە ریوایەتی کردووە کە ( لە بەیانییەکی سارددا ) موهاجیر و ئەنصار خەریکی چاڵ هەڵکەندن بوون و ، بەندە و خزمەتگوزاریشیان نەبوون هەتا کاریان بۆ بکەن ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ دیتی وا ماندوو و برسین ، فەرمووی :

ألّلهم إن الأجر أجر الآخرة فارحم الأنصار والمهاجرة

ئەوانیش وەڵامیان ئەدایەوە :

نحن الذين بايعوا محمداً على الجهاد ما بقينا أبداً

ئەیان وت : ئێمە ئەوانەین کە هەتا ماوین بەیعەتی جیهادمان بە موحەممەد ﷺ داوە.
پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کاتە لە تەمەنی پەنجا وهەشت ساڵییدا بوو لەگەڵ ئەوەشدا وەك موسڵمانێکی چالاك کاری ئەکرد . بوخاریی و موسلیم لە بەرائی کوڕی عازیبەوە ریوایەتیان کردووە کە وتوویە : کە ڕۆژی ئەحزاب هاتە بەرەوە و پێغەمبەری

خوا ﷺ خەندەقی هەڵ ئەکەند ، چاوم لێی بوو ئەوەندە خۆڵی خەندەقی گواستبووەوە کە تۆز و خۆڵ پێستی سکی داپۆشیی بوو ، کە سکی تووکیشی زۆر بوو ، کە خۆڵی ئەگواستەوە شیعری عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەی دووبارە ئەکردەوە و ئەیفەرموو:

اللهم لولا أنت ما اهتدينا ولا تصدقنا ولا صلينا
فأنزلن سكينة علينا وثبت الأقدام إن لاقينا
إن الألى قد بغوا علينا وإن أرادوا فتنة أبينا

هیدایەت وەرگرتنیان و صەدەقە و نوێژکردنیان ئەگێڕێتەوە بۆ بەخششی خوای گەورە و ، داوای دامەزراویی و دڵ ئارامیی ئەکات و ، بەڵێنیش ئەدا کە بە گوێی ئەوانە نەکا کە ئەیانەوێ موسڵمانان لە ئیمان پاشگەز بکەنەوە ، هەر چەندە ستەمیان لێ ئەکەن .

نموونەیەکی تری فەڕ و بەرەکەت و کۆمەکیی خوا بۆ موسڵمانەکان ئەم ریوایەتەی جابیری کوڕی عەبدوڵڵایە کە ئەڵێ : ڕۆژی خەندەق خەریکی هەڵکەندن بووین ، ئەوەبوو بەردێکی ڕەق دەرکەوت . موسڵمانەکان هاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و وتیان : بەردێك هاتۆتە ناو خەندەقەکەوە . فەرمووی : (( أنا نازل )) . فەرمووی : من خۆم بۆی دائەبەزم . پاشان هەستا و بەردێکیشی بە سکیەوە بەستبوو و ، ئێمەش سێ ڕۆژ بوو تامی خواردنمان نەکردبوو . پێغەمبەر ﷺ دەستی دایە پیکەکە و لە بەردەکەی دا و ، بە وێنەی لم ورد و خاش بوو . وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ! ماوەم بدە بچمەوە ماڵەوە . بە هاوسەرەکەمم وت : پێغەمبەرم ﷺ وەها دیوە کە ئارامم لا نەماوە ، ئایا هیچت بەلاوە هەیە ؟ وتی : جۆ و گیسکە مێچکەیەکم لەلایە . گیسکەکەم سەر بڕیی و ، جۆکەشم هاڕیی ، گۆشتەکەمان خستە ناو قابلەمەوە . پاشان هاتمە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ هەویرەکەش ئامادە بوو بوو و ، قابلەمەکەش خرابووە سەر سێ بەردەکە و خەریك بوو پێ بگات . وتم : کەمێك خواردنم بە لاوەیە ، جا ئەی پێغەمبەری خوا ! خۆت و یەك دوو پیاو هەستن . فەرمووی : (( كم هو ؟ )) فەرمووی : چەندە ؟ منیش بۆم باس کرد . فەرمووی : (( كثير طيب ، قل لها : لا تنزع البرمةَ ولا الخبز من التنور حتى آتي )) . فەرمووی : زۆر و چاکە . بە خێزانەکەت بڵێ نە قابلەمەکە داگرێ و ، نە نانەکەش لە تەنوورەکە دەربهێنێ هەتا دێم .

فەرمووی : (( قوموا )) هەستن . هەموو موهاجیر و ئەنصار هەستان .

که چوومه ژوورەوە لای خێزانەکەم وتم : ماڵت ئاوابێ ! پێغەمبەر ﷺ بە موهاجیر و ئەنصار و هەرچیی وا لەگەڵیانا هەموویان تەشریفیان هێنا . وتی : ئایا پرسیاری لێ کردووی ( کە خۆراکەکە چەندە ؟ ) وتم : بەڵێ .

فەرمووی : (( أُدخلوا ولا تضاغطوا )) . فەرمانی دا هاوەڵان بچنە ژوورەوە . خۆیشی دەستی بە دەرهێنانی نان کرد و گۆشتی ئەخستە سەری و ، هەرچیی نان و گۆشتی دەرئەهێنا ، قابلەمەکە و تەنوورەکەشی سەر ئەگرتن و ، پێشکەشی هاوەڵانی ئەکرد ، پاشان هی تری دەرئەهێنا . هەروا خەریکی نان دەرهێنان بوو و ، گۆشتی ئەخستە سەر هەتا هەموویان تێر بوون .

لە ئەنجامدا هەندێ مایەوە ، فەرمووی : (( كلي هذا وأهدي ، فإن الناس أصابتهم مجاعة )) . فەرمووی : ئەوە بخۆن و لێیشی بە هەدیە بنێرن ، چونکە گرانیی یەخەی بەو خەڵکە گرتووە .

لە ریوایەتێکی تردا جابیر ئەڵێ : هاتمە خزمەتی و ، چپاندم بە گوێیدا و ، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ! حەیوانێکمان سەر بڕیوە و صاعێك جۆمان هەبوو هاڕیومانە . جا لەگەڵ چەند کەسێکدا تەشریف بهێنن . ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ بە دەنگی بەرز فەرمووی : (( يا أصحاب الخندق ! إن جابراً قد صنع سوراً )) . فەرمووی : ئەی ئەهلی خەندەق ! جابیر دەعوەتی کردووە .

**هەشتەم : مژدەی سەرفرازیی**

بەراء ئەڵێت : لە رۆژی خەندەقدا لە شوێنێکی خەندەقەکەدا بەردێکمان لێ هاتە پێش ، کە پیکەکان چاریان نەئەکرد ، ئێمە دادی ئەوەمان بردە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و تەشریفی هێنا و دەستی دایە پیکەکە و فەرمووی : (( بسم الله )) . پاشان یەك جار لێی دا و سێ یەکی شکاند و فەرمووی : (( الله أكبر ، أعطيت مفاتيح الشام ، والله إني لأبصر قصورها الحمر الساعة )) . فەرمووی : کلیلەکانی شامم پێ دران ، بەخوا لەم سەعاتەدا چاوم لە کۆشکە سوورەکانیەتی . بۆ جاری دووهەم لێی دا و سێ یەکێکی تری پەڕاند و فەرمووی : (( الله أكبر ، أعطيت مفاتيح فارس ، وإني والله لأبصر قصر المدائن الأبيض الآن )) . فەرمووی : کلیلەکانی وڵاتی فارسم پێ دران . بەخوا هەر ئێستا چاوم لە کۆشکە سپیەکەی مەدائینە . پاشان بۆ جاری سێهەم لێی دا و فەرمووی : (( بسم الله )) . ئەوەبوو پاشماوەی بەردەکەی پەڕاند و فەرمووی :

(( الله أكبر ، أعطيت مفاتيح اليمن ، والله إني لأبصر أبواب صنعاء من مكاني الساعة ))
. فەرمووی : کلیلەکانی یەمەنم پێ دران . بەخوا هەر ئێستە و لەم شوێنەمدا چاوم لە دەرگاکانی صەنعائە .

لە ریوایەتێکی تردا وا هاتووە کە بەردێکی سپی رەق دێتە بەردەمیان کە ناتوانن بیشکێنن ، خێرا سەلمانی فارسیی ئەچێتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و هەواڵەکەی ئەداتێ . ئەویش تەشریف ئەبا و پیکەکە لە سەلمان وەرئەگرێ و ، یەك پیك لە بەردەکە ئەدا و ئەیشکێنێ و ، بریسکەیەکی وەهای لێ دێت ، بە وێنەی چرا لە شەوی تاریکدا ، ئەمبەر و ئەوبەری مەدینەی رووناك کردەوە ، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ ( الله أكبر ) ی فەرموو موسڵمانەکانیش دووبارەیان کردەوە . پاشان پیکی دووهەمی لێ دا و بە هەمان شێوە و ، پاشان سێهەمیشی لێ دا . دەربارەی ئەوە پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد و ئەویش فەرمووی : (( لقد أضاء لي من الأولى قصور الحيرة ، ومدائن كسرى ، فأخبرني جبريل أن أمتي ظاهرة عليها ، ومن الثانية القصور الحمر من أرض الروم ، وأخبرني جبريل أن أمتي ظاهرة عليها ، ومن الثالثة قصور صنعاء ، وأخبرني جبريل أن أمتي ظاهرة عليها ، فأبشروا )) .
فەرمووی : بە لێدانی یەکەم کۆشکەکانی حیرە و مەدائینی کیسرام بۆ دەرکەوتن و ، جیبریل هەواڵی دامێ کە ئوممەتەکەم بەسەریاندا زاڵ ئەبن و ، بە لێدانی دووهەمیش کۆشکە سوورەکانی وڵاتی رۆمم بۆ دەرکەوتن و ، جیبریل هەواڵی دامێ کە ئوممەتەکەم بەسەر ئەوانیشدا زاڵ ئەبن و ، بە لێدانی سێهەمیش کۆشکەکانی صەنعائم بۆ دەرکەوتن و، جیبریل هەواڵی دامێ کە ئوممەتەکەم بەسەر ئەوانیشدا زاڵ ئەبێ . مژدە بێ لێتان ئەی موسڵمانەکان .

موسڵمانەکان بە مژدەیەکی چاکیان وەرگرت و وتیان : بەڵێنێکی راستە .

ئەم بەڵێنانە دوای چارەکە صەدەیەك هەموویان هاتنە دیی و دینی ئیسلام پەرەی سەند و بە خۆرهەڵات و خۆرئاوادا بڵاوەی کرد و ، گەلانی سەرزەویی باوەشی خۆشەویستیی و رێز و تەقدیریان بۆ کردەوە ، کە ئەمەش بە یەکێ لە موعجیزەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە قەڵەم ئەدرێت .

شایانی باسە کە ئەم خەندەقە لە نێوان موسڵمانەکاندا بەش کرا بوو ، هەر دە موسڵمان چل باڵ خەندەقیان پێ درا بوو و ، پێویست بوو بە پەلە بەشی خۆیان تەواو بکەن . لە کاتی بەشکردنی موسڵمانەکاندا چ موهاجیریی و چ ئەنصار هەر یەکە

ئەیانویست سەلمان لەسەر خۆیان حیساب بکەن ، چونکە ئەو نە خەڵکیی مەککە و نە خەڵکی مەدینە بوو ، بەڵکو خەڵکی وڵاتی فارس بوو . ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ پلەیەکی بەرزتری بە سەلمان دا کە لە ئال و بەیتی خۆی حیسابی کرد ، کە فەرمووی : (( سلمان منا أهل البيت )) .

موسڵمانەکان یەکجار دڵخۆش و شادمان بوون .. هەر چەندە چاوەڕوانی دوژمنێکی سەرسەختیان ئەکرد کە بریتیی بوو لە یەکگرتووی بێ‌ئیمانیی هەموو دوورگەی عەرەبیی ، سەرەڕای سەرمای زستانی سەخت و ، گرانیی و برسێتیی و کەمیی جل و بەرگ . کەچیی هەردەم خەریکی سروودخوێندن بوون .

یەکێ لە هاوەڵان ناوی جوعەیل بوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ناوەی بە دڵ نەبوو و ناوی نا عەمر . بۆ ئەمە موسڵمانەکان شیعرێکی سادەیان رێك خست و بە سروود دووبارەیان ئەکردەوە :

سَمَّاهُ مِن بَعدِ جُعَيلٍ عَمرًا وَكانَ لِلْبائِسِ يَومًا ظَهرًا

هەرچیی ئەوان ئەگەیشتنە عەمر پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەنگی بەرز ئەی‌فەرموو: عَمرا ، هەرچیی ئەگەیشتنە ظەهریش دیسان بە دەنگی بەرز ئەی‌فەرموو : ظَهرا .

ئەم سروودەیان بۆ یەك ئەسەندەوە و بە شەوق و تاسەوە چاڵیان هەڵ ئەکەند و ، بە خاکەناز لایان ئەدا و بە سەبەتە ئەیان‌گواستەوە و ، پێغەمبەریش ، بە برسێتیی لەگەڵیاندا کاری ئەکرد ..

یەکێ لەوانەی کە کاری ئەکرد زەیدی کوڕی ثابیت بوو . کە هێشتا منداڵێکی بچکۆلە بوو و خەریکی خۆڵ گواستنەوە بوو . کە پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی پێ کەوت و وا بەو منداڵی‌یە خەریکی کارکردنە ، ستایشی کرد کە فەرمووی : (( أما إنه نعم الغلام )) .

زەید دوای ماندووبوون و چەشتنی سەرما و سۆڵە ، هەستی بە کەمێ گەرمایی کرد و خەو زۆری بۆ هێنا و چاوی چووە خەو . یەکێ لە موسڵمانەکان بە ناوی عیمارەی کوڕی حیزام بۆ گاڵتە شمشێرەکەی شاردەوە . کە منداڵەکە هەستا شمشێرەکەی دیار نەبوو ، ترسا و پێغەمبەری خوایش ﷺ ئامادە بوو بۆ شۆخیی پێی فەرموو : (( يا أبارقاد ! نمت حتى ذهب سلاحك )) . فەرمووی : خەوتیت و شمشێرەکەت لە دەست چوو . پاشان فەرمانی دا شمشێرەکەی بۆ بهێننەوە و ، ترساندنی موسڵمان و شاردنەوەی کەل و پەلی بۆ گاڵتە لە موسڵمانان قەدەغە کرد.

لە کاتێکدا کە موسڵمانەکان سەرگەرمی کار بوون و ئەوپەڕی کۆششیان ئەکرد تا بەوپەڕی ئیخلاصەوە کاربکەن، بەڵکو لە هەڵکەندنی خەندەق زووتر لێ ببنەوە ، تا کە سوپای ئەحزاب گەیشتن تەواو بووبێ ، هەر لە یەکەم ساتەوە کۆمەڵی موونافیقی گێرەشێوێن هەوڵیان دا هەڵکەندنی خەندەق تەفرە بدەن و دواى بخەن .. ئەمانە بە ناو لەسەر موسڵمان ئەژمێرران ، کەچیی هەموو کارێکیان دژی ئیسلام و موسڵمانان بوو.

کە دەستیان ئەدایە کار بە تەمەڵیی و لاژگیی کاریان ئەکرد و ، هەر کارێکیش سووک و ئاسان و هیچ بوایە ئەوەیان ئەکرد . لە هەمان کاتدا ئەگەڕان بۆ کەسێکی لاواز هەتا لە کارکردن ساردی بکەنەوە ، بەڵکو هەڵکەندن دوا بکەوێ ، یان پەکی بکەوێ.

فەرمانی سەرکردایەتیی موسڵمانان وەهابوو کە هیچ کەس بەبێ مۆڵەت وەرگرتن شوێنی کار بە جێ نەهێڵێ ، کەچیی ئەو موونافیقانە کاریان بەجێ ئەهێشت و بەبێ مۆڵەت ئەگەڕانەوە ناو ماڵ و منداڵیان .

بەڵام موسڵمانە راستگۆکان ، کە خۆیان بە خوا فرۆشتبوو ، هەتا کارێکی گرنگیان نەبوایە و ، مۆڵەتیشیان وەرنەگرتایە لە کار وازیان نەئەهێنا . ئەوەبوو قورئانی پیرۆز لە ستایشی ئەو ئیمانداراانەدا هاتە خوارەوە و ، دەری ئەبڕیی کە ئیماندارە راستەقینەکان بەبێ وەرگرتنی مۆڵەت دەست لە کار هەڵ ناگرن ، کە ئەفەرموێ :

﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَإِذَا كَانُوا۟ مَعَهُۥ عَلَىٰٓ أَمْرٍ جَامِعٍ لَّمْ يَذْهَبُوا۟ حَتَّىٰ يَسْتَـْٔذِنُوهُ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ فَإِذَا ٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِبَعْضِ شَأْنِهِمْ فَأْذَن لِّمَن شِئْتَ مِنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمُ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٦٢﴾ لَّا تَجْعَلُوا۟ دُعَآءَ ٱلرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَدُعَآءِ بَعْضِكُم بَعْضًا ۚ قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ يَتَسَلَّلُونَ مِنكُمْ لِوَاذًا ۚ فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ (النور : ٦٢ - ٦٣ ) .

کە موسڵمانەکان مۆڵەتیشیان وەرئەگرت خێرا ئەگەڕانەوە سەر کار و بە پاکیی و دڵسۆزیی خەریک ئەبوون . بەڵام موونافیقان ئەوەندە خوار و خێچ بوون قورئان هەڕەشەی لێ ئەکردن کە با ئیتر لە فەرمانی سەرکردایەتیی دەرنەچن ، ئەگینا تووشی فیتنە ئەبن ، یان سزایەکی سەختیان تووش ئەبێت .

موسڵمانەکان هەر بەردەوام خەریك بوون و ، لارو وێریی مونافیقان دەورێکی ئەوتۆی نەبوو ، تا ئەوەبوو خەندەقەکە تەواو بوو .

درێژیی ئەو خەندەقە پێنج هەزار باڵ بوو ، بەڵام قووڵیی نەئەبوو لە حەوت باڵ و ، پانییشی لە نۆ باڵ کەمتر بێ ، ئەگینا ئەسپ سوار ئەیتوانیی بکاتە ئەوبەر. ئەوەبوو هەر دە کەس و چل باڵ لە خەندەقیان بەش درا و ، بە ماوەی مانگێك هەڵیان کەند .

بەم شێوەیە بە تەواوبوونی خەندەقەکە لەلای باکوورەوە و ، بوونی سێ ناوچەی بەردەڵان لە هەر سێ لاکەی تری مەدینەدا و ، بوونی دارودرەخت و خانووبەرە ، مەدینە بووە قەڵایەکی سەخت لە رووی هەر کەسێکدا کە بیەوێ هێرش بکاتە سەری. چونکە وەك خەندەقەکە رێی لە سوار و پیادە ئەگرت ، هەروەها هەر سێ ( حەرڕە ) کەش : یەکێکیان لە باشوورەوە و ، حەرڕەی وەبرە لە خۆرئاواوە و ، حەرڕەی واقم لە خۆرهەڵاتەوە بەربەستی سروشتیی بوون کە نە پیادە و نە سوار نەیانئەتوانیی بە ناو ئەو بەردە ڕەشە نووك تیژانەدا بە ئاسانیی هات و چۆ بکەن . بەمە مەدینە قەدەغە کرا و سوپای ئەحزاب دەستی نەئەگەیشتە موسڵمانان . دیارە سەرکردایەتیی ئەحزاب ئەمەی نەئەویست ، بەڵکو بۆ ئەوە هێرشی ئەکرد کە مەدینە راماڵن و ، تاقی موسڵمانان ببڕنەوە و ، وڵاتەکەش تاڵان بکەن .

کە خەندەق تەواو بوو سێ هەزار موسڵمان جل و بەرگ و تفاقی جەنگیان پۆشیی و بە سەرکردایەتیی پێغەمبەری خوا ﷺ لە پشتی خەندەقەکەوە سەربازگەیان دروست کرد و پاڵیان دا بە چیای سەلع ەوە و ، عەبدوڵڵای کوڕی ئوم مەکتوومیش کرایە ئەمیری مەدینە و ، موسڵمانەکان دوو ئاڵایان پێ بوو : ئاڵای موهاجیران کە بە دەستی زەیدی کوڕی حاریثەوە بوو و ، ئاڵای ئەنصاریش کە بە دەستی سەعدی کوڕی عوبادەوە بوو . فەرمانیش درا هەرچیی ژن و منداڵ و پەك کەوتەن بچنە قەڵاکانەوە و دەرگا لەسەر خۆیان دابخەن . لە هەمان کاتدا پاسەوانە موسڵمانەکان بە دەوری شاردا ئەسووڕانەوە و، بە دەنگی بەرز خەریکی وتنی « لا إله إلا الله » و « ألله أكبر » بوون ، نەوەکو دوژمن لە ناکاودا دەست بووەشێنێ ، بە تایبەت جوولەکەی قورەیظە، کە لەوانەیە پەیمان بشکێنن و ، دەست لە موسڵمانەکان بکەنەوە .

دیارە بەشی زۆری سوپا لە ئەنصار بوو ، چونکە کۆچ کەرانی مەککە لە چاو ئەنصاردا کەمتر بوون . کە سوپا ریز بوو چەند گەنجێك خرانە بەرچاوی پێغەمبەری خوا تا بەشداریی جەنگ بکەن ، بەڵام هەر کەس لە پانزە ساڵان بچوکتر بوو فەرمانی

دا بگەڕێتەوە و ، لە ناویشیان‌دا ماوەی دا چوار گەنجیان ، کە گەیشتبوونە پانزە ساڵیی ، بەشداریی بکەن کە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر و ، زەیدی کوڕی ثابیت و، ئەبوسەعیدی خودریی و ، بەرائی کوڕی عازیب بوون .

هەروەها هێزی تایبەت بۆ پاسەوانی شار کرایە دووبەش و، فەرماندایەتیی یەکێکیان بە زەیدی کوڕی حاریثە و ، ئەوی تریشیان بە مەسلەمەی کوڕی ئەسلەم [٣٧] سپێررا ، تا چاویان لە قەڵای ژن و منداڵەکان بێ نەوەکو جوولەکەی ترسنۆکی قورەیظە هەڵمەتیان بۆ بەرن.

**نۆهەم : سوپای ئەحزاب ئەکەوێتە ڕێ**

ئەمە نەخشە و تەگبیری مەدینە بوو .. با سەرێکیش لە بیابان بدەین بزانین سوپای ئەحزاب چی‌یان کردووە و خەریکی چین ؟

دوای ئەوەی کە سوپایان جەم کرد و کەرەسە و تفاقی جەنگ ئامادە کرا ، فەرماندەکانی سوپای ئەحزاب فەرمانیان دا کە سوپا بەرەو مەدینە بکەوێتە ڕێ ..

لە ناوچەی غەطەفان و هاوپەیمانانیانەوە شەش هەزار جەنگاوەر بە فەرماندەیەتیی چوار سەرۆکیان بەرێ کەوتن کە :

عویەینەی کوڕی حیصن فەرماندەی نەوەی فەززارە و ..

طولەیحەی کوڕی خوەیلید ، فەرماندەی نەوەی ئەسەد و ..

مەسعوودی کوڕی روخەیلە ، فەرماندەی نەوەی ئەشجەع و ..

حاریثی کوڕی عەوف ، فەرماندەی نەوەی موڕڕە بوون ..

هەروەها لە ناوچەی قورەیش و هاوپەیمانانیانەوە چوار هەزار جەنگاوەر بە فەرماندەیەتیی ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب بەرێ کەوتن ، کە ئەوانە حەوت صەدیان جەنگاوەری نەوەی سولەیم بوون و سوفیانی کوڕی عەبدشەمسی هاوپەیمانی نەوەی ئومەییە فەرماندەیان بوو و ، لە ( مر الظهران ) بە سوپای قورەیش گەیشتن .

هەروەها جوولەکە و قورەیش لەسەر ئەوە رێك کەوتبوون کە جوولەکەش بە سوپا بەشداریی جەنگ بکەن . ئەوەبوو حویەیی کوڕی ئەخطەبی سەرۆکی نوێنەرە جوولەکەکان پەیمانی بە فەرماندەکانی ئەحزاب دابوو کە قەناعەت بە جوولەکەی

---

[٣٧] مەسلەمەی کوڕی ئەسلەمی کوڕی حەریشی ئەنصاریی ، ئیبن عەبدولبیر وەها باسی کردووە کە لە جەنگی فارسەکان دا و لە رۆژی جیسردا شەهید کراوە .

ئەوەی قورەیظە بکات ، تا لە دواوە گورزی کاریگەر و جەرگبڕ ، لە سەعاتی صفردا، لە موسڵمانەکان بدەن .

لە هەمان کاتدا فەرماندەکانی سوپای ئەحزاب لەسەر ئەوە ڕێک کەوتن کە فەرماندەیەتیی گشتیی ئەم سوپا گەورەیە بدرێتە دەست ئەبوسوفیان صەخەری کوڕی حەربی کوڕی ئومەییەی کوڕی عەبدشەمسی کوڕی عەبدمەناف ، کە عەبدشەمسی باپیری برای هاشمی باپیری پێغەمبەری خوایە ﷺ و ، لەسەر ئەوەش ڕێک کەوتبوون کە لە مانگی شەووالی ساڵی پێنجەمدا لە دەوری مەدینە یەك بگرن .

**دەهەم : ژمارەی سوپای موسڵمانان**

بەم شێوەیە لە سەرەتای شەووالدا دە هەزار جەنگاوەری قوڕەیش و غەطەفان و هاوپەیمانەکانیان لە دەوری مەدینە جەم بوون ، سەرەڕای نۆ صەد جوولەکەی ناو مەدینە کە بۆ کاتی تەنگانە ئامادە کرابوون ، کەچیی بە زۆرترین تەقدیر سوپای موسڵمانەکان لە سێ هەزار کەس تێپەڕی نەئەکرد ..

لە ڕاستییدا سوپای موسڵمانەکان لەو کاتەدا زۆر لەوە کەمتر بووە ، ئەوەتا ئیبن حەزم لە کتێبی ( جوامع السيرة ) دا دەری بڕیوە کە سوپای موسڵمانەکان لە نۆصەد کەس زیاتر نەبووە .

ئەمە زۆر ڕاستە ، بە تایبەت دوای ئەوەی کە مونافیقان خۆیان دزییەوە و ، لە کاتی تەنگانەدا دەستبەرداری موسڵمانەکان بوون .. چونکە نە بۆ حودەیبیە و نە بۆ خەیبەر موسڵمانەکان خاوەنی سوپایەکی سێ هەزاریی نەبوون ! هەروەها لە جەنگی ئوحوددا ، کە هیچ موسڵمانێ دوا نەکەوت ، بگرە منداڵەکان پێیان خۆش بوو بەشدار بن و ، هەندێ ئافرەتیش لە ناچارییدا دەستیان دایە شمشێر بۆ کوشتاری کافران ، سوپای موسڵمانان حەوتصەد کەس بوون کە حەفتایان لێ شەهید کران و هەشتای تریان لە ڕەجیع و بیئر مەعونەدا لێ شەهید کران ، کەواتە پێنج صەد و پەنجایان مانەوە ، کە دیارە دوای دوو ساڵیش بێ ، کە موسڵمانەکان لە جەنگ و پشێوییدا بوون ، ئەوەندەیان زیاد نەکردووە کە بگەنە سێ هەزار جەنگاوەر .

لەلایەکی ترەوە ، ئەگەر سەرنجی ڕۆژانی دوایی غەزای ئەحزاب بدەین کە موسڵمانەکان گیان گەیشتبووە لووتیان لەوە ئەچێ سێ صەد کەسێك لە قەراغی

خەندەقەکەدا مابنەوە ، چونکە رۆژەکە یەکجار سەخت بوو ، هەر تەنها ئەو بەچکە شێرانە بەرگەی ئەو هەڵوێستەیان ئەگرت .

خۆ ئەگەر موسڵمانەکان خاوەنی سێ هەزار سوپا بوونایە زۆر بە ئاسانیی لە بەردەم سوپایەکدا ئەوەستان کە سێ قاتی خۆیان بێت . خۆ لە جەنگی بەدردا موسڵمانەکان لە سێیەك کەمتر و ، لە ئوحودیشدا لە چواریەك کەمتر بوون . کەواتە پێویستیی بە هەڵکەندنی خەندەق نەئەبوو .

جا ئەگەر موسڵمانەکان سێ هەزار بوونایە ئەوا لە دەشتدا بەرامبەر بە دوژمن ئەوەستان ، نەك لە پشت خەندەقەوە و ، پشتیان بە چاکیی بە بەردەڵان و دارو درەخت و بینا گیرا بێت ، ئەوسا گیان بگاتە لووتیان .. خۆ موسڵمانەکان هەر لە رۆژی دووهەمی ئوحوددا قورەیشیان راو نا .. خۆ یەك بە یەکی هۆزە عەرەبە نیاز خراپەکانیان تەمێ کردن .. خۆ ئەمان چوون بۆ بەدر و قورەیش نەیان وێرا بێن بۆ جەنگ .. خۆ نەوەی نەضیریان لە مەدینە دەرکردبوو .. کەواتە موسڵمانەکان ورەیان لە جاران بەرزتر بووە و ، هەر ئەوانیش بوون بەو کەمی‌یە دانیان بە خۆیاندا گرت و ملیان لەبەردەم رەشەبای کوفردا نەچەمایەوە ، چونکە خۆیان کەم و دوژمنیان زۆر بوون و ، وەك دوورگەیەك وەها بوون لە چاو دەریایەکی گەورەدا..

خۆ ئەگونجێ سەرەتا سوپای موسڵمانان دوو هەزارێك بووبێ ، ئەویش بە مونافیقەکانەوە . بەڵام بەرە بەرە مونافیقەکان خۆیان دزیوەتەوە ، دوای ئەوەی کە چاویان بە سوپایەکی زۆری دوژمن کەوتووە و ، تەنها ئیمانداره دامەزراوە بەغیرەتەکان ماونەتەوە کە نۆصەد کەس ئەبوون وەك ئیمام ئیبن حەزم دەری بڕیوە..

**یانزەهەم : نەخشەی کافران**

ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ بەر لە گەیشتنی سوپای ئەحزاب دوو پیاوی لە هەواڵ زانانی سوپای ئیسلامیی رەوانە کرد تا هەواڵی جم وجووڵی سوپای دوژمن بزانن . ئەو دوو پیاوەش سولەیط و سوفیانی کوڕی عەوف بوون . لە کاتێکدا کە خەریکی هەواڵ وەرگرتن بوون تووشیان بوو بە تووشی دەوری‌یەکی سوپای ئەحزابەوە و دەوریان گرتن و پاشان قۆڵ بەسیان کردن و دایاننە دەست فەرماندەیەتیی ئەحزاب . هەر کە زانی‌یان کار بۆ سوپای مەدینە ئەکەن خێرا هەردووکیان کوشتن . ئەوەبوو موسڵمانەکان هەر چۆن بوو توانی‌یان تەرمی هەردوو شەهیدەکە بەرنەوە بۆ مەدینە و

پێغەمبەری خوا ﷺ هەردووکیانی لە قەبرێكدا ناشت . ئەم دووانە یەکەم شەهیدی جەنگی ئەحزاب بوون .
دوای ئەوەی کە سوپای ئەحزاب گەیشتنە مەدینە ، سوپای مەککە لە ( مجمع الأسیال ) لە نێوان ( جُرف ) و ( زغابة ) سەربازگەی دروست کرد و ، سوپای غەطەفانیش لە ( ذنب نُقمی ) لەلای خۆرئاوای ئوحود سەربازگەی دروست کرد .
شایانی باسە کە سەرۆکی گەورەی جوولەکە ، حویەیی کوڕی ئەخطەب کە توانیی سوپای ئەحزاب پێکەوە بنێ لەگەڵ سوپای ئەحزابدا بوو و لە نێوان هەردوو سەربازگەی قوڕەیش و غەطەفاندا هاتوچۆی ئەکرد و ، هەمیشە پەیوەندیی بە هەردوولایانەوە هەبوو و نەخشەی ئەکێشا و راوێژی ئەکرد .
سوپای ئەحزاب بەر لەوەی بگەنە مەدینە نەخشەی داگیرکردنی مەدینەیان کێشا بوو ، بەو شێوە کە لەلای باکوورەوە ، هەر لەلای باکووری خۆرئاواوە هەتا باکووری خۆرهەڵات ، هێرشێکی توندی خێرای رامالەر بکرێتە سەر سوپای موسڵمانان کە لە دەروازەکانی باکووری مەدینەدا سەربازگەی دروست کردووە . بەو مەرجەی کە لە سەعاتی صفردا ، وەك ئەوەی کە سەرۆکە جوولەکەکان و فەرماندەکانی ئەحزاب رێك کەوتبوون ، نۆصەد جەنگاوەری نەوەی قورەیظە ، کە کەوتبوونە لای باشووری مەدینەوە و لە دوای سوپای ئیسلامەوە بوون ، لە دواوە گورزی کاریگەر ، لە کاتی گەرمبوونی جەنگدا ، لە سوپای ئیسلام بدەن و جەرگی ببڕن ، تا موسڵمانەکان لە ریشە دەربهێنن ، هەر چەندە پەیمانی ئاشتیی لە نێوان موسڵمانەکان و جوولەکەی قورەیظەدا بەسترابوو کە هاوبەشیی بەرگریی لە مەدینە بکەن . بەڵام جوولەکە جوولەکەیە و تەنها بەرژەوەندیی خۆی لەبەرچاو ئەگرێ . ئیتر گوێ ناداتە ناپاکیی و ئابڕووچوون ، بۆیە بە درێژایی مێژوو هەر سووك و ریسوا بوون .
ئەو نەخشەیەی کە سوپای ئەحزاب ، بۆ داگیرکردنی مەدینە ، کێشابوویان نەخشەیەکی مەحکەم و سامناك بوو . وایان دانا بوو مەدینە بە هیچ شێوەیەك لەبەردەم زۆر و زەبەندەیی سوپاکەیاندا خۆی پێ نەگیرێ و ، بە ئاسانیی موسڵمانەکان ریشەکەن بکەن و ، ئاسەواری دینەکەشیان نەهێڵن .. بەڵام خوای گەورە بە سۆز و بەزەیی خۆی لە وڵاتی فارسەوە سەلمانی گەیاند تا هەڵکەندنی خەندەق بخاتە بەرچاوی موسڵمانان .. سوپاس بۆ خوا بۆ نەخشە جوانەکانی .

خۆ ئەگەر ئەو خەندەقە نەبوایە ئەوا پانزە هەزار سەربازی داخ لە دڵ زۆر بە ئاسانیی ئەیانتوانیی نۆصەد سەربازی موسڵمان لەناو بەرن ، ئەیانتوانیی هەموو پیلانێك دژی موسڵمانەکان بگێڕن .

بەڵام خوا ئەوەی خستە دڵی موسڵمانانەوە تا خەندەق هەڵ بکەنن ، تا نەخشەی ئەحزاب پووچەڵ ببێتەوە و ، دەستی ئەو ملهوڕە بە سوپای بچووك و کەم تفاقی ئیسلام نەگات .

هەر کە فەرماندەکانی ئەحزاب گەیشتنە سەر خەندەقەکە سەرسام بوون لەم فێڵە کە موسڵمانەکان بۆ خۆپاراستن ئەنجامیان داوە ، کە لەوە و پێش عەرەب شتی وەهای نەکردووە و نەزانیوە .

ئەو خەندەقە ئەو هەزاران سەربازەی ئەحزابی قۆڵ بەست کرد ، تا نەتوانن دەست لە موسڵمانەکان بوەشێنن ، مەگەر جاروبار چەند کەسێك هەل بە دەست بهێنن و لە خەندەقەکە بکەنە ئەوبەر .

فەرماندەکانی ئەحزاب لەگەڵ حویەیی کوڕی ئەخطەبی جوولەکەدا ، کە سەری ئاژاوەکە بوو ، چوونە پێشەوە تا شوێن بۆ هەر سوپایەك دیاریی بکەن و ، چۆنیەتی هێرش‌کردنیان نەخشە بکێشن ، کەچیی شتێکی سەیریان بینیی .. تا ئێستە عەرەب فێڵی وای نەزانیوە .. خەندەقێکی دوو هەزار مەتر درێژ و چوار مەتر پان و سێ مەتر قووڵ هاتە بەردەمیان کە شەو و ڕۆژ سەربازە گیان‌فیداکانی ئیسلام لەو بەرەوە ، وەك شێری بێشە چاوەڕوانی نێچیر بێ ، پاسەوانن .

بە ڕاستیی سەریان لەم فێڵە سوڕ مابوو کە هەرچیی نەخشە و تەگبیریان بوون هەموویانی پووچەڵ کردنەوە .

دوای ئەوەی کە فەرماندەکانی ئەحزاب بە دەوری خەندەقەکەدا سووڕانەوە و بۆیان دەرکەوت کە ناتوانن لێیەوە بکەنە ئەوبەر ، بە داخ و خەفەتێکی زۆرەوە وتیان : ئەمە فێڵێکە تا ئێستا عەرەب نەیزانیوە .

ئەوانیش ڕاستیان ئەکرد لەوە و بەر لە مێژووی عەرەبدا کاری لەو جۆرە نەکرابوو. جا هەر چەندە زانی‌یان کە خەندەقەکە دەست و پەلی هەموویانی بەستووە ، لەگەڵ ئەوەش‌دا بڕیاریان دا لە دوای خەندەقەکەوە بمێننەوە و ئابلووقە بخەنە سەر موسڵمانەکان و بەردەوام ، بە شەو و بەڕۆژ ، بۆ ئازاردانیان تیریان تێ بگرن و ،

چاوەڕوانی هەلێك بن بۆ پەڕینەوە ، سەرەڕای ئەوەش کە چاوەڕوان بوون نەوەی قورەیظە لە دواوە دەستێك لە موسڵمانەکان یان لە ماڵ و منداڵیان بووەشینن ..

موسڵمانەکان بە کەمیی و کەم‌تفاقیی خۆیانەوە کە چاویان بە سوپای بێ شوماری ئەحزاب کەوت ، چونکە دڵەکانیان پڕ لە ئیمان بوون ، هەستیان کرد کە ئەمە ئەو بەڵێنەیە کە خوای پەروەردگار و پێغەمبەرەکەی ﷺ بە ئیماندارانیان داوە و ، قەناعەتیشیان کرد کە خوا و پێغەمبەرەکەی راستیان فەرمووە و ، بەمەش هەتا ئەهات ئیمان و خۆ تەسلیم‌کردنیان لە زیادکردندا بوو . ئەوەتا قورئانی پیرۆز ئەوەمان بۆ ئەگێڕێتەوە کە ئەفەرموێ :

﴿ وَلَمَّا رَءَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْأَحْزَابَ قَالُوا۟ هَـٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ ۚ وَمَا زَادَهُمْ إِلَّآ إِيمَـٰنًا وَتَسْلِيمًا ﴾ (الأحزاب : ٢٢) .

**دوانزەهەم : ناپاکیی قورەیظە و موونافیقان**

هەر چەندە خەندەقەکە دەورێکی باشی ئەبینیی بۆ پارێزگاریی موسڵمانەکان ، بەڵام ئەوان لەوپەڕی وریاییدا بوون .. ترسیان هەبوو نەوەی قورەیظە پەیمان بشکێنن و، ترسیشیان هەبوو موونافیقەکان بە پاگاندە ورەی ئیمان لاوازەکان بڕووخێنن و درز بخەنە نێوان ریزەکانی سوپاوە . بە تایبەتیی جەنگاوەرانی قورەیظە بە تەنیا ئەوەندەی سوپای موسڵمانان ئەبێت و ، ئەگەر پەیمان بشکێنن موسڵمانەکان ئەکەونە نێوان دوو ئاگرەوە : سوپایەك کە ئەوەندەی خۆیان بێت لە دواوە و ، دە هەزار ئەعرابیش لەوبەری خەندەقەکەوە ، وەك بڵێی ئیتر خەندەقەکە دەورێکی ئەوتۆی نامێنێ ، چونکە ئەگەر موسڵمانەکان ئاوڕ بەلای نەوەی قورەیظەوە بدەنەوە ، ئەوا ناتوانن پاسەوانیی خەندەقەکە بکەن و ئەوسا ئەحزاب هەل بە دەست ئەهێنن و ، ئەکەنە ئەم بەرەوە ، یان ئەوەتا بە پەڕینەوەی ئەسپەکانیان ، یان بە رووخاندن و پڕ کردنەوەی خەندەقەکە .

سەرەنجام ئەوەی موسڵمانەکان خەمیان بوو ، یەکەم پەیمان شکاندنی قورەیظە و، دووهەم ناپاکیی و ئاژاوەگێڕانی موونافیقان بۆ چۆڵبوونی پشتی خەندەق ، هەردووکیان روویان دا .

موسڵمانەکان زۆر بە وردیی چاودێریی هەڵس‌وکەوتی نەوەی قورەیظەیان ئەکرد و، هەر هەواڵێکی تازەیان دەست ئەکەوت ئەیان‌گەیاندە سەرکردایەتیی ، تا

موسڵمانەکان لە کاری خۆیان ئاگادار بن ، چونکە ئەوەیان لا روون بوو کە حویەیی کوڕی ئەخطبی سەرۆکی نەضیر ، تۆ بڵێی سەرۆکی جوولەکەی دوورگە ، وەك پەیوەندیی بە قورەیش و غەطەفانەوە کرد و دژی موسڵمانەکان سوپای پێ دروست کردن ، بە هەمان شێوە پەیوەندیی بە نەوەی قورەیظەشەوە ئەکات و ، هەوڵیان لەگەڵ دا ئەدات تا پەیمانەکەیان کە لەگەڵ موسڵمانەکان‌دا بەستوویانە بشکێنن و ، پاڵ بە سوپای ئەحزابەوە بدەن .

مێژوونووسان لەسەر ئەوە یەك‌دەنگن کە کەعبی کوڕی ئەسەدی سەرۆکی جوولەکەی قورەیظە بە هیچ شێوەیەك حەزی نەئەکرد پەیمانی نێوان خۆی و موسڵمانان بشکێنێ و ، نەشی‌ئەویست ناپاکی‌یان لەگەڵ‌دا بکات ، نەوەکو جوولەکەی نەوەی قورەیظەش تووشی مەترسیی بن و وەك نەوەی قەینوقاع و نەضیر قوڕیان بۆ بگێڕێتەوە، چونکە سەرکەوتنی سوپای ئەحزابی بەلاوە زۆر دوور بوو .

بەڵام ئەوەبوو حویەیی نەگبەت وەك نەضیری قوڕ بەسەر کردن ، بەڵێنیشی بە فەرماندەکانی قورەیش و غەطەفان دابوو کە قورەیظە رازیی بکات بۆ بەشداریی جەنگ . ئەوەبوو چوو بۆ لای نەوەی قورەیظە تا ئەم هەڵە بقۆزنەوە و ، تا سوپای ئەحزاب ئامادەیە ، با بە هەموویانەوە موسڵمانەکان ریشەکەن بکەن . کەعبی کوڕی ئەسەدی سەرۆکی نەوەی قورەیظە ئەم هەوڵە پڕ مەترسی‌یەی دایە دواوە و ، بیرەکەی حویەیی بەلاوە ناپەسەند بوو ، چونکە لەوانەیە بەم ناپاکی‌یە نەوەی قورەیظە دووچاری نەگبەتیی بن .

کەعب ئەوەندە سوور بوو لەسەر هێشتنەوەی پەیمانەکە ، کە زانیی وا کوڕی ئەخطەب هاتووە بۆ لای و ئەیەوێ چاوی پێ بکەوێ ، فەرمانی دا دەرگای قەڵاکە دابخەن و ، بڕیاری دا چاوی پێی نەکەوێ ، بگرە داوای کرد لە کوێوە هاتووە بگەڕێتەوە . چونکە ئەی‌زانیی بۆ پەیمان شکاندن هاتووە و ، ئەشی‌زانیی کوڕی ئەخطەب چەندە داخ لە دڵی پێغەمبەری خوایە ﷺ .

هەرچەندە دەرگای قەڵا داخرا بوو و ، داواشی لێ کرا ناوچەی نەوەی قورەیظە بەجێ بهێڵێ ، خۆی نووساند بوو بە دەرگای قەڵاکەدا و ، بەبێ کۆڵدان داوای ئەکرد کە دەرگای بۆ بکاتەوە تا قسەی لەگەڵ‌دا بکات ، تا ئەوەبوو کەعبی شەرمەندە کرد و ، ناچار بوو دەرگای بۆ بکاتەوە ..

هەردوو سەرۆکی نەضیر و قورەیظە کەوتنە وت و وێژ .. حویەیی لە دەرگای قەڵادا وەستا و ، بانگی کردە کەعبی کوڕی ئەسەد تا دەرگای بۆ بکاتەوە :

ـ ماڵت کاول بێ ، کەعب . دەرگاکەم بۆ بکەرەوە .

کەعب وتی :

ـ ماڵی تۆ کاول بێ ، حویەیی ، تۆ مرۆڤێکی شوومی و ، منیش پەیمانم بە موحەممەد داوە و ، پەیمانەکەشی ناشکێنم و ، جگە لە وەفا و راستگۆییش هیچم پێوە نەدیوە .

وتی : ماڵت کاول بێ ، دەرگاکەم بۆ بکەرەوە تا قسەت لەگەڵدا بکەم .

وتی : شتی وەها ناکەم .

حویەیی زۆر تووڕە بوو و ، بە کەعبی وت : بەخوا بۆیە دەرگاکەت داخست لە ترسی ئەوەی نەوەکو نانە زبرەکەت بخۆم .

بۆ ئەم وتە رەقەی حویەیی ، کەعب شەرمەزار بوو و دەرگای بۆ کردەوە .

کە چووە ژوورەوە وتی : ماڵت کاول بێ کەعب ، سەربەرزیی دنیام بۆ هێناوی.. قورەیشم هێناوە و لە ( مجمع الأسیال ) هەڵیان داوە ، غەطەفانیشم هێناوە و لە تەنیشت ئوحوددا هەڵیان داوە .. هەموویان بەڵێن و پەیمانیان پێ داوم کە ئەم شوێنە چۆڵ نەکەن هەتا موحەممەد و هاوەڵانی لە ریشەوە دەربهێنن .

کەعب پێی وت : بەخوا سەرشۆڕیی دنیات بۆ هێناوم . ئەوەی کە مەترسیی لێ ئەکرێ ، من تەنها راستگۆیی و وەفام بە موحەممەدەوە دیوە . ئەی حویەیی ! تۆ کۆمەڵە خەڵکێکت بۆ هێناوم وەك هەوری گەورە وەهان کە گرمەی گوێ کەڕ ئەکات و، بریسکەی چاو کوێر ئەکات بەلاّم دڵۆپێك ئاوی پێوە نیە .

پاشان کەعب وتی : ماڵت کاول بێ حویەیی ! وازم لێ بێنە و بەرۆکم بەر بدە ، من تەنها راستگۆیی و وەفام بە موحەممەدەوە دیوە .

بەلاّم کوڕی ئەخطەب هەر کۆڵی نەدا و ، بە شێوازە خەڵەتێنە دەست بڕەکەی بەردەوام بوو ، بۆ ئەوەی کار بکاتە سەر کەعب ، سەرەنجام کەعب ناچار بوو و داوای کرد سەرۆك و فەرماندەکانی قورەیظە کۆ ببنەوە ، تا لەم کارەدا راوێژ بکەن و ، بزانن چ بڕیارێك لەسەر راکەی کوڕی ئەخطەب بدەن .. ئایا رازی‌یانە پاڵ بە سوپای ئەحزابەوە بدەن و پەیمانی نێوان خۆیان و موحەممەد تێك بدەن ؟

بە مەرجێ نەوەی قورەیظە ، لەسەر ئەوەی پاڵیان دا بە نەوەی نەضیرەوە ، جارێکی تر چاوپۆشی‌یان لێ کراوە و ، ئەگەر ئەم جارە ناپاکیی بکەن ، بە تایبەت ئا لەم کاتەدا کە هەموو عەرەب هاتۆتە سەر مەدینە و ، موسڵمانەکان گیان گەییوەتە لووتیان ، ئەوا مەرج نیە پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە ئەحزاب رزگاری بوو ، بۆ ئەوانیش بە بارکردن و دوورکەوتنەوە رازیی ببێ ، چونکە کە پێغەمبەری خوا ﷺ قەتڵ و عامی قەینوقاع و نەضیری نەکرد و ، بە بارکردن بە سەلامەتیی رزگاریان بوو، نامەرد بوون و لە پیلان و ئاژاوە نەکەوتن . بۆیە ئەمجارە فەرماندەی گشتیی موسڵمانان بەو ئاسانی‌یە لە قورەیظە خۆش نابێت ئەگەر پەیمان بشکێنن و، خەیبەریش ، لەسەر ئەم کارە نامەردانەیەی ، کە گیانی هەموو موسڵمانانی بە ماڵ و منداڵیانەوە خستە مەترسی‌یەوە ، هەروا بە ئاسانیی بەسەریا ناڕوا ، بەڵکو رۆژێك دێت ئەویش تۆڵەی ناپاکیی خۆی لێ ئەسەنرێ .

کە کۆڕ گیرا و دەست بە وت‌وویژ کرا ، کوڕی ئەخطەب بەرە بەرە گەورە پیاوانی جوولەکەی رازیی ئەکرد ، بەڵام زانایەکی ژیریان ، کە ناوی عەمری کوڕی سوعدا بوو هاتە قسە و ، قورەیظەی ئاگادار کرد کە کارێکی چاك ناکەن ئەگەر پەیمان بشکێنن ، چونکە موحەممەد هەمیشە لە هەموو هەڵس و کەوتێکی‌دا وەفا و راستگۆیی پێوە بینراوە و ، پێویستە لەم جەنگەدا کۆمەکیی بکەن ، نەك شمشێری بۆ بەرز بکەنەوە و کۆمەکیی دوژمنەکەی بکەن .. داوای لێ کردن پارێزگاریی لە پەیمانی خۆیان بکەن و، گوێ بۆ کوڕی ئەخطەب نەگرن ، خۆ ئەگەر لەگەڵ موسڵمانەکان‌دا چەك هەڵ ناگرن و پارێزگاریی لە مەدینە ناکەن ، با هیچ نەبێ بێ‌لایەن بوەستن کە ئەیوت : ئەگەر پشت گیریی لە موحەممەد ناکەن ، دەی واز لە خۆی و دوژمنەکەشی بهێنن ..

بەڵام قسەی لووسی حویەیی کوڕی ئەخطەب زۆر کاریگەر بوون و ، یەك بە یەکی جوولەکەکانی قەناعەت پێ ئەکرد ، تا ئەوەبوو رازیی بوون و ، بە گوێی عەمری کوڕی سوعدایان نەکرد و ، هاتنە سەر ئەو بڕیارە کە پەیمان بشکێنن و ، بچنە پاڵ سوپای ئەحزاب .

نەوەی قورەیظە رازیی بوون پەیمان بشکێنن ، بەو مەرجەی کە حویەیی کوڕی ئەخطەب لە قەڵاکانیان‌دا ، لەگەڵیان بمێنێتەوە ، تا کە ئەگەر قورەیش و غەطەفان لە جەنگ کۆڵیان دا و گەڕانەوە و ، موسڵمانەکانیان لەناو نەبردن ، ئەمان چی‌یان بەسەر دێ حویەییشیان لەگەڵ‌دا بێ .

که کوڕی ئەخطەب ئەو بەڵێنەی بە قورەیظە دا ، کەعبی کوڕی ئەسەدی سەرۆکی قورەیظە لە پەیمانەکە پاشگەز بوویەوە و ، لە هەر ڕێکەوتنێك لەگەڵ پێغەمبەردا بوویێ خۆی داماڵیی ..

پاشان کەعبی کوڕی ئەسەد سەرۆکانی نەوەی قورەیظەی وەك : زوبەیری کوڕی باطا و ، عەززالی کوڕی مەیموون و ، شاسی کوڕی قەیس و ، عوقبەی کوڕی زەید و ، عەمری کوڕی سوعدای بانگ کردن و ، ئەو نووسراوەشی ئامادە کرد کە پەیمانی نێوان مۆسڵمانەکان و قورەیظەی تێدا نووسرا بووو ، داوای لێ کردن کە هەموویان ڕەزامەندیی لەسەر ئەوە بنوێنن کە بیدڕێنن و ، بچنە پاڵ سوپای ئەحزاب .

هەر هەموویان ڕەزامەندییان دەربڕیی جگە لە سەرۆکی قەرەظیی عەمری کوڕی سوعدا ، کە بە ئاشکرا دەری بڕیی ئەو لە تاوانی ناپاکیی ئاوەهادا بەشداریی ناکات و وتی : بەخوا هەرگیز لەگەڵ موحەممەددا ناپاکیی ناکەم . ئەم لەسەر پەیمانی خۆی مایەوە . ئەوەبوو سێ جوولەکەی تری ناوداریش ئەم هەڵوێستەی عەمریان بە دڵ بوو و لەسەر پەیمان شکاندن ڕازیی نەبوون . ئەو سیانەش ناویان ثەعلەبە و ئوسەیدی کوڕانی سەعیە و ئەسەدی کوڕی عوبەید بوو.

ئەم هەڵوێستە مەردانەیەی عەمری کوڕی سوعدا بووە هۆی ڕزگاربوونی لەو تیاچوونەی کە یەخەی بە نەوەی قورەیظە گرت و لە کوشتن دەرباز بوو . بەڵام سیانەکەی تر هەرسێکیان هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ موسڵمان بوون .

کەعبی کوڕی ئەسەد گێلانە قوڕی بۆ خۆیشی و بۆ نەوەی قورەیظەش گرتەوە ، ئەوەبوو لەگەڵ گەورەپیاوانی جوولەکەدا پەیماننامەکەیان هێنا و دڕاندیان . بەمە بوونە بەشێك لە سوپای ئەحزاب و کەوتنە جەنگەوە لەگەڵ موسڵمانانDا.

**سیانزەهەم : ساغ کردنەوەی هەواڵەکە**

لەبەر ئەوەی کە موسڵمانەکان بە وردیی چاودێریی نەوەی قورەیظەیان ئەکرد ، ئەوا چاك ئاگایان لەو کارە پڕمەترسی‌یە بوو کە جوولەکە خەریکی بوون ، بۆیە خێرا هەواڵەکەیان گەیاندە پێغەمبەری خوا ﷺ . کە بە نهێنیی هەواڵەکەیان گەیاندە پێغەمبەری خوا ﷺ، زۆری پێ گران بوو ، بەڵام نەی‌هێشت بڵاو ببێتەوە .

بۆ ئەمە پێغەمبەری خوا ﷺ سەعدی کوڕی موعاذی سەرداری ئەوسی بانگ کرد کە گەنجێك بوو و تەمەنی نەگەیشتبووە چل ساڵیی و ، هاوپەیمانی هۆزی قورەیظە بوو. هەروەها سەعدی کوڕی عوبادەی سەرداری خەزرەج و ، عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە

و، ئوسەیدی کوڕی حوضەیری [٣٨] بانگ کردن و ، هەمووشیان ئەنصار بوون . کە ئامادە بوون فەرمووی : (( انطلقوا حتى تنظروا أحق ما بلغنا عن هؤلاء القوم أم لا؟ فإن كان حقاً فألحنوا لي لحناً أعرفه ، ولا تفتوا في أعضاد الناس . وإن كانوا على الوفاء ، فأجهروا به للناس )) .

فەرمانی بەسەریاندا دا تا بچن بۆ ناو جوولەکەی نەوەی قورەیظە و بزانن کە ئەو دەنگ و باسەی گەیشتووە راستە یان نە؛ .

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا کە ئەگەر راست بوو جوولەکە پەیمانیان شکاندبوو و حاڵەتی جەنگیان راگەیاندبوو بڵاوی نەکەنەوە هەتا کار نەکاتە سەر ورەی سەربازە موسڵمانەکان ، کە بەر لەوەی ئەوەش بە راست دەرچێ لەوپەڕی ناڕەحەتییدان ، بەوەی کە بە شەو و بە رۆژ بەرامبەر بە سوپای ئەحزاب وەستاون و پاسەوانی خەندەقن .. فەرمانیشی پێ دان کە ئەگەر راست بێ بە شێوەیەك بیگەیەنن کە خۆی تێ بگات . خۆ ئەگەر لەسەر شەرت و پەیمانی خۆشیان بوون ئەوا بە ئاشکرا بیدەن بە گوێی خەڵکەکەدا .

نوێنەرەکانی پێغەمبەر رۆیشتن بۆ ماوا و مەنزڵی نەوەی قورەیظە تا راستیی بزانن چۆنە و ، گەر پەیمانیان شکاندووە هەوڵیان لەگەڵ بدەن تا بێنەوە سەر رێی راست .کە گەیشتنە بەرەوە سەرۆکانی نەوەی قورەیظە هاتن بە پیریانەوە و بردیانە ناو قەلاکانیانەوە و ، لەوێ موسڵمانەکان هاتنە سەر ئەو باسە کە یا پەیمانەکەیان بپارێزن، یان هیچ نەبێ ئەوان بێلایەن بۆ خۆیان دابنیشن .. هەر کە جوولەکە ناوی پێغەمبەری خوایان ﷺ و ، باسی عەهد و پەیمانیان بیست، بەوپەڕی بێئەدەبییەوە پرسییان : ئەو پێغەمبەری خوایە کێیە ؟ پاشان بە موسڵمانەکانیان وت : هیچ پەیمانێك لە نێوان ئێمە و موحەممەددا نیە . بە غروور و لە خۆباییبوونێکیشەوە ئەیان وت : ئێستە ئێوە هاتوون داوای بەسەر بردنی ئەو پەیمانەی نێوان ئێمە و موحەممەد ئەکەن ، کە ئەو ئەو پیاوە بوو باڵی ئێمەی شکاند و نەوەی نەضیری برامانی دەرکرد؟ بڕۆن نە پەیمان و نە بەڵێن لە نێوان ئێمە و موحەممەددا نیە .

لێرەدا سەرداری هۆزی خەزرەج ، سەعدی کوڕی عوبادە ( کە کەمێ تووڕەیی لە سروشتیدا هەبوو ) تووڕە بوو و دەستی کرد بە قسە وتن بە جوولەکە و ، ئەوانیش دەستیان کرد بە قسە وتن بە سەعد و یەکجار تووڕەیان کرد .

---

[٣٨] لە ریوایەتێك دا لە جیاتی ئوسەید خەوواتی کوڕی جوبەیرە .

بەڵام سەرداری ئەوس سەعدی کوڕی موعاذ کە هاوپەیمانی جوولەکەکان بوو داوای لە سەعد کرد کە خۆی بگرێ و پێی وت : واز لە قسە پێوتنیان بێنە ، ئەوەی وا لە نێوانماندا لە قسە پێ وتن گەورەترە .

سەعد دوا هەوڵی لەگەڵ جوولەکەکاندا دا تا واز لەو هەڵوێستەیان بهێنن و ، ئەنجامی خراپی پەیمان شکاندنیشی خستە بەرچاویان کە پێی وتن : ئەی نەوەی قورەیظە ! ئێوە چاک ئاگاداری ئەو پەیمانەی نێوانمانن . جا من ئەترسم رۆژێك وەك رۆژەکەی نەوەی نەضیر یان سەختتر بێتە رێتان !

جوولەکە نەیانئەزانی سەعد چەندە خەم خۆریانە بۆیە بە شێوەیەکی ناشیرین وەڵامیان دایەوە . کەچیی سەعد ، کە زۆر لەسەرخۆ بوو پێی وتن : ئەی نەوەی قورەیظە ! وا چاکتر و جوانتر بوو بۆتان کە ئەم قسانە نەکەن .

نەوەی قورەیظە دەستیان کرد بە قسە وتن بە پێغەمبەری خوا ﷺ و ، سەعدیش لێیان بێزار بوو و دەستی لەوە شۆرد کە بگەڕێنەوە سەر رێی راست ، بۆیە گەڕانەوە بۆ سەربازگەی موسڵمانان و چوونە خزمەتی پێغەمبەر و ، سەلامیان لێ کرد و ، بە هۆی وتەی نهێنیی نێوانیانەوە پێیان راگەیاند کە جوولەکە پەیمانیان شکاندووە .
وتەی نهێنیی نێوانیشیان کە هیچ کەس تێ نەگا ( عضل وقارة ) بوو، کە ناوی ئەو دوو هۆزە بوو لەسەر ئاوی ( رەجیع ) ناپاکییان لەگەڵ موسڵمانەکاندا ئەنجام دا هەر کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی بیست زانیی کە جوولەکە ناپاکییان کردووە ، لە خەفەتی ئەوەدا پێغەمبەری خوا ﷺ کراسەکەی دا بە سەری خۆیدا و پاڵ کەوت و ماوەیەکی زۆر هەڵ نەسایەوە ، بە رادەیەك کە خەڵکەکە بێتاقەت بوون ، پاشان هیوای سەرکەوتن بەسەریدا زاڵ بوو و ، هەستایەوە و ئەیفەرموو : (( ألله أكبر ! أبشروا يا معشر المسلمين بفتح الله ونصره )) . مژدەی بە موسڵمانەکان دا کە خوا سەرکەوتنی بۆ ناردن .

بەر لەوەی قورەیظە پەیمان بشکێنێ سوپای ئەحزاب چالاکییەکی ئەوتۆی نەبوو، ئەوەندە نەبێ کە بە ئەسپەکانیانەوە بە دەوری خەندەقەکەدا ئەسووڕانەوە ، ئیتر نەیان ئەتوانی بە کۆمەڵ هێرش بکەن و لەگەڵ موسڵمانەکاندا دەست بدەنە یەخەی یەکتریی. سوپای ئیسلامیش هەر هەمووی پاسەوانی خەندەقەکە بوو .

بەڵام کە ئەحزاب بە ئاشکرا دیتیان وا نەوەی قورەیظە پاڵیان داوە پێیانەوە. چالاکییان زیاتر بوو و ، هیوایان بەوە پەیدا بوو کە بتوانن لە خەندەقەکە بپەڕنەوە.

چونکە بە هەڵگەڕانەوەی قورەیظە لە موسڵمانەکان ، سوپای ئیسلام ناچار ئەبێ بەشێکی زۆر لە سوپاکەی بگێڕێتەوە دواوە ، تا پەرچی هێرشی نەوەی قورەیظە بدەنەوە کە ئەوان هیچ بەربەستێك لەبەر دەمیان‌دا نیە و ، بە ئاسانیی ئەتوانن هێرش بکەنە سەر سوپاش و سەر قەڵای ژن و منداڵەکان .

**چواردەهەم : هەڵوێستی یەکجار سەخت**

شایانی باسە کە موسڵمانەکان خۆیان زۆر کەم بوون تا لەبەردەم دە هەزار جەنگاوەردا خۆراگریی بکەن ، بۆیە زۆر ناڕەحەت بوون . بەڵام کە قورەیظەش پاڵی دا بە ئەحزابەوە ئەوەندەی تر باری موسڵمانان قورس بوو .. جاران هەر خەمی ئەوەیان بوو کە خەندەقەکە بپارێزن ، کەچیی ئێستا خەمی دواوەشیان هەیە کە قورەیظە ناپاکیی بکا و هێرش بکاتە سەریان . بە راستیی موسڵمانەکان لە بارودۆخێك‌دا ئەژیان کە هیچ کەس بەرگەی نەئەگرت ، چونکە ترس و لەرز لە رادە بەدەر بوو ، ئیتر با سەرما و سۆڵەی زستانی سەخت و ، برسێتیی و ئاتاجیی ساڵی گرانیی لاولاوە بووەستن .

قورئانی پیرۆز باسی ئەو بارودۆخە ناهەموارەی موسڵمانان ئەکات کە وای ئەگەیەنێ چاوەکان زاق بن و دڵەکانیش خەریك بێ لە قورگیانەوە دەرپەڕن .. ترسەکە ئەوەندە زۆر بوو ئازاترین کۆمەڵی سەرزەویی تیایا حەیران بوو بوو ، چونکە لە هەموو لایەکەوە .. لە سەرەوە و لە خوارەوە .. هێرش کرابووە سەر موسڵمانان .. لە باکوورەوە سوپای ئەحزاب و لە باشووریشەوە سوپای قورەیظە . قورئان ئەفەرموێ :

﴿ إِذْ جَآءُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنكُمْ وَإِذْ زَاغَتِ ٱلْأَبْصَٰرُ وَبَلَغَتِ ٱلْقُلُوبُ ٱلْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠ ﴿١٠﴾ هُنَالِكَ ٱبْتُلِىَ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا۟ زِلْزَالًا شَدِيدًا ﴾ (الأحزاب : ١٠ ـ ١١)

بەڵایەکی یەکجار گەورە و ترسێکی زۆر زۆر روویان لە دڵی هەموو موسڵمانێك کردبوو .. وەك بڵێی ئەم دینە پێویستی بە پیاوی تاقیی‌کراوە هەیە .. پێویستی بە پیاو هەیە ، بەڵام پیاوی پیاوانە .. مەرد و قارەمان .. ئەم دینە پێویستی بە کۆمەڵێك هەیە کە هیچ هێزێك چاریان نەکات .. ئەبێ بخرێنە کوورەی تاقیی کردنەوەوە تا لە دوارۆژدا شایان بن دینەکەی خوایان پێ بسپێرێ . سەرەنجام ئەو پیاوانە بە پەروەردەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێ گەیشتن و ، بەرگەی ئەو رۆژە سەختەشیان گرت .

بەڵام ئەوانەی کە خاوەنی ئەو ئیمانە نەبوون و ، وەك ئەوان دانەمەزرا بوون ، بەڵکو خۆیان بۆ بەرژەوەندیی بە ئیسلامدا هەڵ واسیی بوو ، ئەوانە دەرکەوتن .. نەیانوێرا لەو رۆژە سەختانەدا خۆیان تووشی مەترسیی بکەن و ، بەرگەی ئەو تاقیکردنەوەیان نەگرت .. ئەوانە دڵیان نەخۆش بوو .. هەموو رۆژێ لە ترسانا ئەمردن.. بەڵام بە یەکجاریی نەئەمردن و رزگاریان بێت .. ئەمردن و ئەژیانەوە .

ئەو ترسنۆکانە خۆیان بە موسڵمان لە قەڵەم ئەدا ، کەچیی لە دڵەوە دژی ئیسلام بوون و ، بە ئاوات بوون موسڵمانان تیا بچن .

ئەمانە لە دوژمنی دەرەوە خراپتر بوون بۆ موسڵمانان ، چونکە بە پاگاندە خەریك بوون ترسیان ئەخستە دڵی موسڵمانەکانەوە ، بە تایبەت لەو کاتە ناسکەدا و ، تایبەتتریش دوای ئەوەی کە قورەیظە دوژمنایەتیی خۆیانیان راگەیاند ..

ئیتر لەو کاتەوە موونافیقان دڵیان بێخەم بوو و هاتنە سەر ئەو رایە کە تیاچوونی دەوڵەتی ئیسلام یەکجار نزیکە و ، هیچ هێزێك ناتوانێ موسڵمانان لە دەستی ئەحزاب رزگار بکات ، بۆیە سامیان شکا و ، ترسیان لە دڵدا نەما و ، بە ئاشکرا قسەی ورە رووخێنیان ئەکرد .

یەکێ لە موونافیقان ، دوای ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەکەی ناو خەندەقی تێك شکاند و ، مژدەی فەتحکردنی وڵاتی رۆم و فارس و یەمەنی دا بە موسڵمانەکان، لەناو سەربازگەدا وەستا و بە گاڵتەپێکردنەوە ئەیوت : موحەممەد مژدەی ئەدایێ گەنجینەکانی کیسرا و قەیصەر بخۆین ، کەچیی هیچ کام لە ئێمە ناوێرێ دەست بە ئاو بگەیەنێ . هەرچیی بەڵێنێك خوا و پێغەمبەرەکەی بە ئێمەیان دا غروور و لە خۆباییبوون بوو . قورئانی پیرۆز ئەوەی بە موونافیق و بە خاوەنی دڵێکی نەخۆش لە قەڵەم دا و وتەکەشی گێڕایەوە :

﴿ وَإِذْ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ مَّا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ إِلَّا غُرُورًا ﴾
( الأحزاب : ١٢ )

کەواتە موسڵمانەکان بەرەنگاری سێ دوژمنی سەرسەخت بووبوونەوە : یەکەم سوپای ئەحزاب ، دووهەم : جوولەکەی نەوەی قورەیظە ، سێهەم : موونافیقانی ناو سوپای مەدینە . سەرەڕای گرانیی و سەرما و سۆڵەی زستانی سەخت .. سەرەڕای نەفس و شەیتانیش کە لە هەموو دوژمنێك دوژمنترن .

مونافیقان هەر بەوەوە نەوەستان کە گاڵتە بکەن و ترس و لەرز بڵاو بکەنەوە ، بەڵکو دەستیان دایە کشانەوە و هەڵنانی خەڵکیش بە کشانەوە ، بەو نیازەوە پشتی خەندەق چۆڵ ببێ و ، ئەحزاب توانای پەڕینەوەیان هەبێت و ، بە ئاسانیی مەدینە بگرن ، بە بیانووی ئەوەی کە ماڵەکانیان لە کەنارەوەیە و ترسیان هەیە جوولەکە هێرشیان بکەنە سەر .

لەو کاتە ناسکەدا یەکێ لەو مونافیقانەی کە لەناو سوپای موسڵمانان‌دا بوون ، بە ناوی چەند خزمێکیەوە ، داوای لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد کە ماوەیان بدا لەو سەربازگەیەدا کە بەرامبەر بە سوپای ئەحزاب وەستا بوون بکشێنەوە ، ئەویش بەو بیانووەوە کە بچنە ماڵەوە تا پارێزگاریی لە ماڵەکانیان بکەن ، چونکە دەوریان چۆڵە و ماڵەکانیان لەوپەڕی شارەوەن .

لە ڕاستیی‌دا مەبەستیان پاراستنی ماڵەکانیان نەبوو ، بەڵکو ئەیان‌ویست هەڵێن و، ترس و لەرز و تێکشکاویی لەناو سوپا بچکۆلەکەی ئیمان‌دا بڵاو بکەنەوە .

ئەو مونافیقەش ناوی ئەوسی کوڕی قەیظیی بوو کە لە نەوەی حاریثەی کوڕی حاریث بوو . ئەوەبوو قورئان هاتە خوارەوە و دەریبڕیی کە ئەوانە درۆ ئەکەن ئەگینا ماڵەکانیان پاراستنی ئەوانی نەئەویست ، بەڵکو ئەیانەوێ لە جەنگ ڕا بکەن کە ئەفەرموێ :

﴿ وَإِذْ قَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْهُمْ يَـٰٓأَهْلَ يَثْرِبَ لَا مُقَامَ لَكُمْ فَٱرْجِعُوا۟ ۚ وَيَسْتَـْٔذِنُ فَرِيقٌ مِّنْهُمُ ٱلنَّبِىَّ يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ وَمَا هِىَ بِعَوْرَةٍ ۖ إِن يُرِيدُونَ إِلَّا فِرَارًا ﴾ (الأحزاب : ١٣) .

سات بە سات هەڵوێستی موسڵمانەکان ناسکتر ئەبوو .. پێغەمبەری خوا ﷺ هەستی ئەکرد چ پاڵەپەستۆیەك لەسەر شانی هاوەڵەکانیەتی، بە تایبەتیی ئەنصار کە لە خاك و ئاو و ماڵ و حاڵی خۆیان‌دا چۆن گیریان خواردبوو و ، هەموو عەرەبی دوورگە ڕژاوەتە سەریان .. هەستی ئەکرد ئەم بەڕێزە پاکانە چەند دڵسۆز و بەغیرەتن بۆ دینەکەی خوای گەورە . بۆیە وای بە چاك زانیی بیرێك لەم هەڵوێستە بکاتەوە و ، باری سەر شانی سوپا بچکۆلەکەی سووك بکات و ، ئەو پاڵە پەستۆیەش لەسەر شانی ئەنصار لا بەرێت ، چونکە مەترسیی ئەوەش ئەکرێت کە جوولەکە نامەردەکانی نەوەی قورەیظە لە دواوە هێرش بکەنە سەر موسڵمانان .

جا بەر لەوەی موسڵمانەکان شپرزە و سەرگەردان بىن واى بـە چـاك زانیـی ، وەك فەرماندەیەکی سەربازیی دنیادیدە ، ناکۆکی یەك بخاتە نێوان سوپای ئەحزابەوە ، هەتا باری سەرشانی موسڵمانەکان سووك ببێ و ، لە هەمان کات‌دا جوولەکـەش دڵ سـارد بن لە جەنگەکە و ، هێرش نەکەن ، چونکە ئـەو هێرشـە کـارێکی سـامناك بـوو و ، موسڵمانەکانیش هەموو ساتێك چاوەڕوانی بوون .

بۆ ئەم مەبەستە ، مەبەستی تێك‌دانـی یـەکێتیی ریزەکـانی ئـەحزاب و ، سـووك کردنی باری سەرشانی موسڵمانان ، پێغەمبەری خوا ﷺ بە نهێنیی پەیوەندیی کرد بە هەردوو فەرماندەی غەطـەفانەوە ، عویەینەی کـوڕی حیصـنی فـەززاریی و حـاریثی کوڕی عەوفی موڕڕیی، کە سەرۆکی نەوەی فەززارە و نەوەی موڕڕە بوون . ئەوەبوو لە تاریکایی شەودا یەکێ لە پیاوە ئەمینە زیرەکەکانی هەواڵزانانی سوپاکەی نـارد بـۆ لایان تا پێیان رابگەیەنێ کە پێی خۆشە لـە مەڵبەنـدی فەرماندەیـەتیی خۆیدا لـە پشتی خەندەقەوە ، بە نهێنیی چاوی پێیان بکەوێ .

پێغەمبەری خوا ﷺ ، بە وێنەی فەرماندەی گشتیی لێ پرسراو و ، سیاسیی لێزان و خاوەن تاقیی‌کاریی ، خەڵکی چاك ئەناسی . بۆیە ئەیزانیی مەبەستی هەر یەکە لە سەرۆکانی سوپای ئەحزاب لە هاتنەیان‌دا چی‌یە ؟

ئەیزانیی غەطەفان و فەرماندەکانی خاوەن مەبـدەء و سیاسـەت و فیکـرە نـین ، بیانەوێ بیروباوەڕێك سەر بخەن و بڵاوی بکەنەوە . ئەمانـە خـاوەنی عـەقیدەیـەك نـین بەرگریی لێ بکـەن . بـەڵکو لـەم بەشداریی‌کردنەیان‌دا مەبەسـتیان ئەوەیـە هەنـدێ تالآنیان دەست بکەوێ .

بەڵام قورەیش و نەوەی قورەیظە خاوەنی عەقـیـدە و سیاسـەتن .. خـاوەنی دیـن و بیروباوەڕن ، ئەگەر چیی بە لارو وێریی دەستیان پێوە گرتبێ . بۆیە پێغەمبەری خـوا ﷺ نەیویست پەیوەندیی بە حویەیی کوڕی ئەخطەب ، یـان ئەبوسـوفیانەوە بکـات ، چونکە مەبەستی جەنگ‌کردنی ئەو دوانە بۆ دەست خستنی پـارە و سـامان نـەبووە ، بەڵکو مەبەستی سەرەکیی ئەمان خستنی ئەو دینەیە کە هاتووە و عەقیـدەی ئـەوان هەردووکیان لەناو ئەبات . بۆیە قوڕەیش و قورەیظە پارەیان ناوێ و ، بە پارەش رازیی نابن. بەڵام غـەطەفان و عـەرەبی تری دوورگـە مەبەسـتیان سـامان دەسـت خسـتنە و هیچی تر .

هەرواش بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بە دوایاندا هەردووکیان هاتن و لەگەڵ چەند یارمەتی‌دەرێکیاندا ئامادە بوون و ، بێ‌ئەوەی هیچ کەس پێیان بزانێ لە مەڵبەندی فەرمانداەیەتیی سوپای ئیسلامدا پێکەوە کەوتنە وت و وێژ .

پێغەمبەری خوا ﷺ پێشنیارێکی خستە بەردەمیان تا غەطەفان و موسڵمانەکان رێك بکەون و جەنگ لە نێوانیاندا هەڵ بگرن . دوای وت و وێژ هاتنە سەر ئەوەی کە بڕیار لەسەر ئەم خاڵانە بدەن :

١ ـ هەردوو لا ، موسڵمانەکان و غەطەفان لە نێوان خۆیاندا بە دوو لایەنە رێك بکەون ، واتە صولح بکەن .

٢ ـ غەطەفان بە هیچ شێوەیەك بە چەکەوە بەرامبەر بە موسڵمانەکان نەوەستێت ، بە تایبەت لەم ماوەیەدا ..

٣ ـ غەطەفان گەمارووی سەر مەدینە هەڵ بگرێ و سوپای هەموو هۆزە غەطەفانی‌یەکان بگێڕێتە دواوە .

٤ ـ بەرامبەر بەم کارانەی غەطەفان ، موسڵمانەکان سێ‌یەکی هەر هەموو بەرهوومی مەدینە ، بۆ ماوەی ساڵێك بدەن بە غەطەفان .

هەردوو فەرماندەی غەطەفان ، عویەینەی کوڕی حیصن و حاریثی کوڕی عەوف ئەم پێشنیارەیان بە دڵ بوو و ، زۆریش پێی دڵ خۆش بوون ، بەڵام داوایان کرد لە جیاتی سێ‌یەك نیوەی دەست هاتی مەدینەیان پێ بدرێ ، کەچیی پێغەمبەری خوا ﷺ پێی لەسەر سێ‌یەك داگرت و ، سەرەنجام ئەوانیش رازیی بوون و ، هەردوو لا ئامادەیی‌یان دەربڕیی و ، فەرمان درا بە عوثمانی کوڕی عەففان بەندەکانی ئەم رێك کەوتنە بنووسێت . ئەویش نووسینی و جگە لە مۆرکردنی لەلایەن هەردوو لاوە و ئاگاداربوونی شاهێد هیچی نەما ..

دیارە پێغەمبەری خوا ﷺ مەرجێکی تری داناوە بۆ ئەم رێككەوتنە کە ئەویش رەزامەندیی سەرۆکەکانی ئەوس و خەزرەجە لەسەر ئەم رێككەوتنە ، چونکە بەرهوومی باخ و باخاتی مەدینە هی ئەنصارە و بێ‌پرسی ئەوان ناکرێت دەستی بۆ ببرێت.

لەبەر ئەمە دوای نووسینی رێككەوتن نامەکە و ، پێش ئیمزاکردنی ، پێغەمبەری خوا ﷺ سەعدی کوڕی موعاذی سەرۆکی ئەوس و ، سەعدی کوڕی عویادەی سەرۆکی خەزرەجی بانگ کردن و ، بە ئامادەبوونی هەردوو سەرۆکە غەطەفانی‌یەکە ، رێك کەوتن نامەکەی بۆ باس کردن ، کە چۆن لەگەڵ غەطەفاندا رێك کەوتووە بەو

مەرجەی شەش هەزار جەنگاوەری غەطەفان لە مەدینە بکشێننەوە و ، دەست لە جەنگ هەڵ بگرن ، بەرامبەر بە سێ یەکی بەروبوومی مەدینە .

جا پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێ کردن رای خۆیان دەربڕن ، بە تایبەت دەربارەی سێ یەکی بەروبوومی مەدینە . چونکە بارودۆخەکە پڕمەترسی یەو ئەنصار ئەگەر هەندێ لە بەروبوومی ساڵێکی باخەکانیان بدەن ، لەوە ئاسانترە کە دوژمنان بنیشنە ملیان و ژن و منداڵیان بە دیل بگرن و ماڵ و سامانیان تالآن بکەن و ، باخ و باخات وزەویی و زاریان داگیر بکەن .

ئەمە لێکدانەوەی پێغەمبەری خوا بوو کە پێی خۆش نەبوو ئەنصار ، کە بە سنگی فراوانەوە جێی خۆی و هاوەڵانیان کردەوە ، تووشی ناڕەحەتیی لەوە زیاتر بێن.. داوای لێ کردن رای خۆیان بۆ ئەو باسە گرنگە دەربڕن .

کە هەردوو سەعد گوێیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ گرت و ، چاوێکیان بە خاڵەکانی رێککەوتننامەکەدا خشاند ، ئەو باسەیان بە دڵ نەبوو ، بە تایبەت ئەو خاڵەی کە سێ یەکی بەروبوومی مەدینە بدرێ بە غەطەفان . دڵیان وەری نەگرت و بە لایانەوە کارێکی نەگونجاو بوو.

بەڵام هەردووکیان وەك دوو سەربازی گوێڕایەڵ ، کە هەرگیز ماوە بە خۆیان نەدەن لە فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچن ، ئەگەر مردنی هەردووکیانی تێدا بێ ئەو فەرمانە ، بەڕێز و ئیحترامەوە و ، بە ناوی هەموو ئەنصارەوە بەم شێوەیە داوای روون کردنەوەیان لێ کرد.

هەردوو سەعد وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئایا ئەمە کارێکە خۆت حەزی لێ ئەکەیت ، یان کارێکە خوا فەرمانی بەسەردا داوی و هەر ئەبێ ئەنجامی بدەین ، یان شتێکە و بۆ ئێمەی ئەکەیت ؟ ئەگەر فەرمانێکە لە ئاسمانەوە هاتووە ئەوا بڕۆ بە دەمیەوە و ئەنجامی بدە . ئەگەر کارێکیشە فەرمانت پێ نەدراوە بەڵام حەزی پێ ئەکەی ، ئەوا گوێڕایەڵ و فەرمانبەردارین . ئەگەر را دەربڕینیشە ، لە لایەن ئێمەوە هیچیان پێ نادرێ شمشێر نەبێ .

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( لو أمرني الله ما شاورتكما ، والله ما أصنع ذلك إلا لأني رأيت العرب قد رمتكم عن قوس واحدة ، وكالبوكم من كل جانب ، فأردتُ أن أكسر شوكتهم إلى أمر ما )) .

فەرمووی : ئەگەر خوا فەرمانی پێم بکردایە راوێژم پێتان نەئەکرد . بەخوا ئەوە لەبەر ئەوە ئەکەم کە ئەبینم هەموو عەرەب بۆتە دوژمنتان و ، لە هەموو لایەکەوە هێرشیان کردۆتە سەرتان . جا ویستم تا رادەیەك چزوویان بشکێنم .

سەرۆکی ئەوس ، سەعدی کوڕی موعاذ وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئێمەش و ئەوانەش ـ مەبەستی لە غەطەفانە ـ شەریکمان بۆ خوا دائەنا و بتمان ئەپەرست.. نە خوامان ئەپەرست و نە ئەشمان‌ناسیی ، ئەو کاتە تەماعی ئەوەیان نەبوو یەك دەنکە خورمامان بخۆن ئەگەر بە میوانداریی یان کڕین نەبوایە . ئایا کاتێك کە خوای گەورە بەم ئیسلامە رێزی لێ ناوین و ، هیدایەتی داوین و ، بە هاتنی تۆیش بۆ ناومان پایەداری کردووین ، ئێستە ماڵ و سامانمان بدەین پێیان ؟!! بەخوا پێویستییمان بە شتی وەها نیە . بەخوا جگە لە شمشێر هیچیان نادەینێ ، هەتا خوا حوکمی خۆی بۆ هەردوولامان دەر بکات .

کە پێغەمبەری خوا ﷺ غیرەتی هەردو سەرداری ئەنصاری بینی کە چۆن بەو رێك کەوتنە ناڕازیین ، کە نووسرا بوو بەڵام نە ئیمزا کرابوو و نە شاهێدیشی لەسەر گیرابوو، پێغەمبەری خوا ﷺ وازی لە راکەی خۆی هێنا و، چووە سەر رای هەردوو سەعد و بە سەعدی کوڕی موعاذی فەرموو : (( أنت و ذاك )) .

لێرەدا سەعدی کوڕی موعاذ دەستی دایە ئەو پەڕەیەی کە رێك‌کەوتن‌نامەکەی تێدا نووسرا بوو و دڕاندی . پاشان رووی کردە هەر دوو سەرکردەی غەطەفان عویەینە و حاریث و ، بە تووڕەبوونەوە ئەی‌نەڕاند بەسەریان‌دا : بگەڕێنەوە ، تەنها شمشێرمان هەیە بۆتان .

ئەوانیش بێ دەنگ گەڕانەوە بۆ بنکەی سەرکردایەتیی خۆیان .

دڕاندنی نووسراوی ئەو رێك‌کەوتن‌نامەیە ، بەڵێ ئەو هیوایەی نەهێشت کە باری سەرشانی موسڵمانەکان سووك ببێ ، بەڵام لە هەمان کات‌دا بۆ فەرماندەی هەردوو لای سەلماند ، چ موسڵمانەکان و چ ئەحزاب ، کەوا لەناو ئەو سوپا بچکۆلەدا شێر و پڵنگ وەها خۆیان ئامادەی نەبەرد کردووە ، کە بە هیچ هێزێك کۆڵ نادەن .. ئەوانە هەر پیاوێکیان هەزار پیاوە .. هەتا بەڵا و موصیبەتیان بەسەردا بباری ئەوان بەهێزتر و ، ئیمان دامەزراوتر ئەبن و ، چاکتریش دەوری پێغەمبەری ئازیزیان ئەدەن .

کە موسڵمانەکان سەرنجی ئەو هەڵوێستە پتەوەیان دا ورەیان ئەوەندەی تر بەرز بوویەوە .. لە هەمان کات‌دا هەردوو سەردارەکەی غەطەفان سەرسامی ئەو نەڕە

شێرانە بووبوون .. ئەمانە لە هەزار کەس کەمترن و ، بە سوپایەکی دوژمنی سەرسەختی یانزە هەزاریی ، لەم ساڵە گرانیە دا و ، لەم زستانە سەختەدا ، دەوریان گیراوە ، کەچیی ئەوەندەش بەغیرەتن !! ئەمانە ژیان و مردنیان بەلاوە یەکسانە ، تەنها ئەوەندەیان لەلا مەبەستە کە خوا رازیی بێ و بیروباوەڕی خوایی سەرکەوێ .. سەریان لەو وتە بەجەرگەی نەڕەشێر سوڕ ئەما ، کە چۆن لەو هەڵوێستەدا ئەتوانێ قسەی وەها بکات ..

بەڵێ ، ئەمە کاری عەقیدەیە و ، هەر بەو عەقیدەیەش موسڵمانان توانییان جیهانی ئاوەدانکراوەی ئەو رۆژە بە ئیسلام ئاشنا بکەن و ، هەر بە وازهێنان لەو عەقیدەیەش موسڵمانانی چەرخی نوێ بوونەتە ژێرچەپۆکی کافران و ، بە نۆکەرییش لێیان رازیی نابن و ، نەوت و خورماکەشیان ئەخەنە ژێر پێی دوژمنانەوە هێشتا بە نۆکەریش وەریان ناگرن .. ئەمە ئاونیشانی موسڵمانانی سەردەمی نووسینی ئەم ژیان نامەیە.. لەگەڵ ئەوەش‌دا یەقینمان هەیە کە رۆڵەکانی خاکی ئیسلام لە وریابوونەوەدان و ، خەریکە باوەش بە قورئانەکەیان‌دا ئەکەن .. جا کە رۆژی خۆی هات حسابێ بۆ زالمان و خوێن‌مژان ئەکەن ..

هەندێ لە مێژوونووسان وەهای بۆ ئەچن کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە راستیی نەیویستووە ئەو صوڵحە لەگەڵ غەطەفان‌دا بکات ، بەڵکو ویستوویەتی پلەی پتەویی و دامەزراویی ئەنصاری بۆ دەربکەوێ ، تا بزانێ تا چ رادەیەك ئامادەی پاراستنی مەدینەن و ، تا چەندێ ئارامی لەلا هەڵگرتوون . ئەوەبوو بۆی دەرکەوت کە هەردوو سەعد و ، هەموو ئەنصاریش لە دوایانەوە مێشێك میوانیان نیە و هەموو ئاواتێکیان ئەوەیە رەزامەندیی خوایان دەست بکەوێ . هەروەها بۆی دەرکەوت کە ئەنصار دینی ئیسلام بە دەستکەوتێکی یەکجار بەنرخ ئەزانن .. وا ئەزانن خەلاتێکی گەورەیە و ، خوای گەورە لەناو هەموو مەردوم‌دا ئەوانی خۆش ویستووە و ئەوانی بە شیاو زانیوە کە خەلاتەکەیان پێشکەش بکات .. ئەوان خاوەنی رەوشتێکی وەها بەرزن کە پێغەمبەری خوا و هاوەڵانی ببنە میوانیان !!

کە جوولەکەی قورەیظە هەڵگەڕانەوە و ، لەگەڵ غەطەفانیش‌دا پەیمانی ئاشتیی مۆر نەکرا ، ناڕەحەتیی موسڵمانان گەیشتە چڵەپۆپە . لەبەرئەوە پێویست بوو موسڵمانان لە جاران وریاتر بن و ، زیاتریش خۆیان ماندوو بکەن . جا هەندێ شوێن هەبوون لە خەندەقەکەدا کە تەسك بوون و دوژمن ئەیتوانیی بپەڕێتەوە ، ئەگەر بە

چاكیی پاسەوانیی ئەكرایە . هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی كام شوێنە پڕ مەترسیی بوو لەوێدا پاسەوانیی ئەكرد و ، ئەوانەش كە بە هەمیشەیی بە دەوری خەندەقەكەدا ئەسووڕانەوە و پاسیان ئەكرد لە جاران زیاتر چالاكی‌یان ئەنواند . هەروەها هێزێكی تایبەتی‌یان تەرخان كردبوو بۆ چاودێریی جوولەكە و ، بەرهەڵستیی هێرشیان بكەن .

لەو لاوە مونافیقەكان بەرە بەرە شوێنەكانیان چۆڵ ئەكرد و خۆیان ئەدزی‌یەوە ..

بەڵام هاوەڵە ئیمان دارە تایبەتی‌یەكانی ئازیز پاڵەوانانە لە دەوری پێغەمبەری خوا ﷺ جەم بوو بوون .. لەو شەوە تاریك و ساردانەدا كە جەرگی پیاو لە ترسا ئەبڕا ، ئەوان ئەوپەڕی دامەزراوی‌یان نواند ..

خۆ مێژوو .. ژیان .. شارستانیی .. دەوڵەت .. یاسا .. ماف .. نرخ .. رێز .. سەربەرزیی دنیا و قیامەت بە ئاسانیی و بە گاڵتە نایەنە دیی .. ئەمانە هەر هەموو پیاو .. غیرەت .. فیداكاریی .. لە خۆبوردن .. خزمەت .. ئازایەتیی .. كۆڵنەدانیان ئەوێ .

لە دەور و بەرماندا هەندێ ئەبینین كە بە ناوی ئیسلامەوە ، یا غەیری ئیسلامەوە، بە پێڵاو ماچ كردنی خەڵك و ، بە نۆكەریی و ، بە كۆكردنەوەی مرۆڤی خۆپەرست و فشەباز و ، زەلیل و ، ترسنۆك ئەیانەوێ شتێ صەوز بكەن .. ئەوانە تەنها سووكیی و ریسوایەتی‌یان بۆ ئەمێنێتەوە ..

هیواداریین دڵسۆزانی ئیسلام بە سەراب نەخەڵەتێن .. هیواداریین هەوڵ بدەن پیاوی قیامەتیی پێ بگەیەنن .. ئەوانەی كە هەڵپە ناكەن .. دنیایان ناوێ .. بە زەلیلیی و نۆكەریی ناچنە پێشەوە .. راستی‌یان ئەوێ و ، لە پێناویدا خۆیان بەخت ئەكەن ..

**پانزەهەم : وەڕەووخانی ئەحزاب**

بەڵێ ، سوپای ئەحزاب تا ئەهات لە بێ‌ئەنجامیی هەڵمەتەكەیان رۆژ بە رۆژ بێزار ئەبوون ، تەنها خۆشی‌یەك هاتە بەردەمیان پەیمان شكاندنی قورەیظە بوو .. هەر كە فەرماندەكانی مەككە ئەوەیان بیست چالاكی‌یان زیاتر بوو ..

ئەوەبوو چەند فەرماندەیەك وەك ئەبوسوفیان و ، خالید و ، عەمری كوڕی عاص و، ضیراری كوڕی خەططابی فیهریی و ، عیكریمەی كوڕی ئەبوجەهل و ، هوبەیرەی كوڕی ئەبووەهب و ، نەوفەلی كوڕی عەبدوڵلا لەسەر ئەوە رێك كەوتن كە خۆیان فەرماندەیی ئەو هێزانە بكەن كە تیر ئەگرنە موسڵمانەكان و بێزاریان ئەكەن . لەسەر

ئەوەش ڕێك كەوتن كە هەر ڕۆژەی یەكێكیان فەرماندەیی بكات و ئەو ڕۆژە بۆ ئەو و پیاوەكانی دەوریەری ئەبێت .

قورەیش هەروا خەریكی ترساندن و ناڕەحەتكردنی موسڵمانەكان بوو ، تا ئەوەبوو ڕۆژێكیان چەند سوارچاكێكی ئازا و بەجەرگیان هەلیان دەست كەوت و ، لە شوێنێكی تەنگە بەرەوە كردیانە ئەوبەری خەندەقەكەو ، و جەنگیان خستە پشتی خەندەقەوە .

ئەوەبوو عەمری عەبد وددی عامیریی و ، عیكریمەی كوڕی ئەبوجەهلی مەخزوومیی و ، ضیراری كوڕی خەططابی فیهریی و ، هوبەیرەی كوڕی ئەبووەهبی مەخزوومیی و ، نەوفەلی كوڕی عەبدوڵلای كوڕی موغیرەی مەخزوومیی ، كە هەموویان قورەیشیی بوون ، كردیانە ئەوبەر و ، خێرا كۆمەڵێك پاڵەوانی موسڵمان بۆیان دەرپەڕین . یەكەم جار هەوڵیان دا ئەو ڕێیەیان لێ بگرن كە كردوویانەتە ئەم بەر تا را نەكەنەوە و ، دووهەم جار هەڵمەتیان بردە سەریان و بە جەنگێكی پەلە و كوت و پڕیی و سەخت زۆربەیان لە ناوبردن و ، ئەوانەشیان كە مابوون ناچاری هەڵاتنیان كردن ..

شایانی باسە كە سەرۆكی ئەو هاوەڵانە كە تەپیان كوتایە سەر سوارچاكە قورەیشی یەكان عەلیی كوڕی ئەبوطالیب بوو .

عەمری كوڕی عەبد ود یەكەم كەس بوو كە لە خەندەقەكە كردیە ئەوبەر . ئەوەبوو لە جەنگی بەدردا بەشداریی كردبوو و زامدار بووبوو ، بە رادەیەك كە بۆ جەنگی ئوحود هێشتا چاك نەبووبوویەوە . زۆر داخی لێ هات پاڵەوانێكی وەك ئەو لە دژی موسڵمانەكان دەورێكی نەبێ ، بۆیە لە ڕۆژی خەندەقدا نیشانەیەكی بۆ خۆی دروست كردبوو تا دیار بێت . كە هاتە پێشەوە داوای پاڵەوانی كرد بۆ زۆرانبازیی . ئەوەبوو عەلیی كوڕی ئەبوطالیب خوا لێی ڕازیی بێ لێی هاتە پێش . بە مەرجێ تەمەنی عەلیی لە دەوروبەری بیست و شەش ساڵیی‌دا بوو و ، عەمریش سوارچاكێكی بەناوبانگی بەتەمەن بوو ، كە تەمەنی لە هەشتا ساڵیی تێپەڕیی بوو . كە عەلیی بەرەو عەمر ڕۆیشت تا زۆرانبازیی بكەن ، پێی‌فەرموو: ئەی عەمر ! تۆ جاران ئەت وت : هەركەسێ داوام لێ بكا لە سێ شت یەكێكیان هەڵ ببژێرم ، ئەوا قبووڵی ئەكەم. وتی : بەڵێ وایە.

فەرمووی: دەی من داوات لیّ ئەکەم شاهیّدیی بە ( لا إله إلا الله محمد رسول الله ) بدەیت و خۆت تەسلیمی پەروەردگاری جیهانەکان بکەیت .

عەمر وتی : کوڕی برام ! ئەمەم لیّ دوور خەرەوە .

عەلیی فەرمووی : دەی یەکێکی تر .. بگەڕێیتەوە بۆ وڵاتەکەت .. جا ئەگەر موحەممەد پێغەمبەری خوا بوو بە راستیی ، ئەوا تۆ لە هەموو کەسیّ زیاتر پێی بەختەوەر ئەبی و ، گەر درۆزنیش بوو ئەوەی تۆ ئەتەویّ دێتە دیی .

عەمر وتی : ئەمە شتێکە هەرگیز ژنانی قوڕەیش باسی ناکەن . من ئێستە هەڵم دەست کەوتووە تا ئەوەی کە نەذرم کردووە جیّبەجێی بکەم ، چۆن وازی لیّ دێنم .

پاشان عەمر وتی : ئەی سێهەم چیی یە ؟

عەلیی فەرمووی : زۆرانبازیی ..

سوارچاکی قوڕەیش دەستی دایە پێکەنین و ، پاشان بە شانازییەوە وتی : ئەمەیان بڕوا ناکەم تاقە کەسێك لەناو عەرەبدا هەبیّ کە منی پیّ بترسێنیّ .

پاشان بە عەلیی وت : کوڕی برام ! بۆچ داوای زۆرانبازیی ئەکەیت ؟ دە بەخوا من پێم خۆش نیە بتکوژم .

عەلیی ( کرم الله وجهه ) فەرمووی : دە بەخوا من پێم خۆشە تۆ بکوژم .

عەمر هیچ حیسابێکی بۆ عەلیی گەنج و کەم تاقیی کاریی نەئەکرد ، بۆیە کە وەڵامەکەی عەلیی بیست یەکجار تووڕەبوو .. بە پێی باو و نەریتی عەرەبەکانی ئەو سەردەمە ، عەمر لە ئەسپەکەی دابەزیی و چوار پەلی قرتاند و بە پیادەیی هاتە مەیدانی عەلیی و بە شمشێر دەستیان بە لێدانی یەك کرد تا ئەوەبوو لە ئەنجامدا عەلیی عەمری کوشت و موسڵمانانی لە دڕوندەی وا رزگار کرد . ئەوەبوو لە کاتی شەڕە شمشێردا سەری عەلییش کەمیّ زامدار بوو بوو .

حافیظ بەیهەقیی لە کتێبی ( دلائل النبوة ) دا وتوویە : کاتیّ کە عەمر بە عەلیی گەیشت وتی : تۆ کێیت ؟

فەرمووی : من عەلییم .

وتی : کوڕی عەبدمەناف ؟ ( ناوی ئەبوطالیبە ) .

فەرمووی : عەلیی کوڕی ئەبوطالیبم .

عەمر وتی : کوڕی برام ! با لە مامەکانت یەکێکیان بێت کە لە تۆ بە تەمەنتر بێت . من پێم ناخۆشە خوێنی تۆ بڕژێنم .

عەلیی پێی فەرموو : بەڵام بەخوا من پێم ناخۆش نیە خوێنی تۆ بڕژێنم .

بەمە عەمر تووڕە بوو و ، لە ئەسپەکەی دابەزیی و شمشێرەکەی ، کە وەك بڵێسەی ئاگر وەها بوو ، لە کێلان دەرهێنا ، پاشان بە تووڕەیی یەوە بەرەو عـەلیی هـات و ، عەلییش بە قەڵغانە چەرمەکەیەوە لـە رووی‌دا وەسـتا و ، عـەمریش شمشـێرێکی بـۆ قەڵغانەکەی داهێنایەوە و ، لەتی کرد و شمشێرەکە تیایا وەستا و بەر سەری عەلییش کەوت و ، کەمێ زامداری کرد ..

عەلییش کە نۆبەی هات شمشێرێکی بۆ کۆنەسوار داهێنایەوە و ، دای لە دەمـاری سەرشانی و ، کەوتە زەویی و ، تەپ و تۆزێکی زۆر بەرپا بـوو و ، پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمووی: ( ألله أكبر ) . بەمە موسڵمانەکان زانی‌یان کە عەلیی عەمری کوشت.

عەمر لەم هەڵمەتەدا فەرماندەی ئەو کۆمەڵـە فیداکارە بـوو .. کـە ئـەو کـوژرا ئەوانی تر وایان بە چاك زانیی خۆیان بگەیەننەوە تەنگە بـەرایی یەکـەی خەنـدەق تـا خۆیان دەرباز کەن .

هەرواش بـوو ئەسـپەکانیان خـەریك بـوو بـاڵ بگرنـەوە ، هەنـدێ لـە سوارچـاکە موسڵمانەکانیش دوایان کەوتن .. ئەوەبوو زوبەیری کوڕی عەووام نیشتە سەر نەوفەلی کوڕی عەبدوڵلاّ و بە شمشێر دای گرتەوە و ، کردی بە دوو کەرتەوە و شمشـێرەکە دوای بڕینی نەوفەل گەیشتە سەر لاشەی ئەسپەکەش .

کە موسڵمانان ئەمەیان دیی بە زوبەیریان وت : ئەبوعەبدوڵلاّ ! تا ئێستە وەك ئەم شمشێرەی تۆمان نەدیوە .. وتی : بەخوا ئەوە شمشێر نیە .. بەڵکو بازۆڵەیە.

هەروەها زوبەیر سوارێکی تری لەو کۆمەڵە فیدائی‌یە قورەیشی‌یـەی راو نـا ، کـە هوبەیرەی کوڕی ئەبووەهب بوو . دای لە دەمی ئەسپەکەی و بڕیـی ، بـەڵام هوبـەیرە توانیی هەڵ بێت .

ئەوەبوو دوان لەو سوارانە هەوڵیان دا تۆڵەی عەمری فەرماندەیان لە عەلیی کوڕی ئەبوطالیب بکەنەوە ، کە ئەو دوانەش ضیراری کوڕی خەططاب و [39] هوبەیرەی کـوڕی

---

[39] ضیراری کوڕی خەططابی کوڕی میرداسی فیهریی قورەیشیی ، یەکێ بووە لە سوارچاکە دیارەکانی قورەیش و ، لە شیعردا دەستێکی بالاّی هەبووە و ، جەنگاوەرێکی بەناوبانگ بووە و زۆر دژایەتیی موسڵمانانی کردووە .. باوکی سەرۆکی نەوەی فیهر بووە .. لە قورەیش‌دا کەسێ نەبووە لەو شارەزاتری شیعر بێ . ضیرار لە سەردەمی نەفامیی‌دا ئەی‌وت : ( حور العين ) م کردوونەتە هاوسەری دە هاوەڵی موحەممەد ، مەبەستی ئەوەیە شەهیدی کردوون . لە ساڵی فەتحی مەککەدا موسڵمان بووە . هەر ئەو بوو بە خەلیفە ئەبوبەکری وتبوو : ئێمە لە ئێوە بۆ قورەیش چاکترین . ئێمە ئەوانمان خستۆتە بەهەشتەوە ( مەبەستی لەو موسڵمانانەیە کە بە دەستی کافرە قورەیشی‌یەکان شەهید کراون ) بەڵام

ئەبووەهب بوون ، بەڵام عەلیی پاڵەوانانە لەبەر دەمیاندا دامەزرا و هەردووکیانی راو نا.

ئەوانەی پەڕیبوونەوە بۆ ئەم جەنگە بچکۆلەیە تەنها سیانیان دەرچوون کە ضیرار و هوبەیرە و عیکریمە بوون ، ئیتر ئەوانی تر هەر هەموویان کوژران ، هەتا عیکریمە لە کاتی هەڵاتندا ناچار بوو رمەکەی فڕێ بدا و بە جێی بهێڵێ .

بەڵام موسڵمانەکان هەموویان سەلامەت بوون ، جگە لە عەلیی کوڕی ئەبوطالیب کە کەمێ سەری زامدار بوو.

دوای کۆتایی هاتنی ئەم جەنگە لاوەکییە فەرماندەکانی قورەیش دە هەزار دیرهەمیان لە نرخی جەستەی عەمری کوڕی عەبد وددا نارد بۆ موسڵمانەکان تا لاشەکەیان پێ بدەنەوە ، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ پارەکەی وەرنەگرت و فەرمووی : (( هو لكم لا نأكل ثمن الموتى )) . فەرمووی : بۆ خۆتان ئێمە لەسەر مردووان پارە ناخۆین.

لە ریوایەتەکەی ئیمام ئەحمەددا ، وەك لە ( البداية والنهاية ) دا هاتووە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە : (( إدفعوا إليهم جيفته ، فإنه خبيث الجيفة ، خبيث الدية )) . فەرمووی : لاشەکەی بدەنەوە پێیان ، ئەوە هەم لاشەکەی پیسە و ، هەم پارەی خوێنەکەشی.

لەم کاتانەدا تیرێك بەر قۆڵی سەعدی کوڕی موعاذ کەوت و دەماری قۆڵی بڕیی، کە لە ئەنجامدا دوای غەزای قورەیظە پێی کۆچی دوایی کرد .

ئەمە هەموو هەڵمەتێکی قورەیش و پاڵەوانەکانی بوو ..

بەڵام لەلایەن هۆزەکانی ترەوە کە لەگەڵ قورەیشدا هاتبوون و ، هەر هەموو هۆزەکانی غەطەفانیش هیچ جوولە و هەڵمەتێکیان نەبوو ..

دوای هەڵمەتی ئەم کۆمەڵە پاڵەوانەی قورەیش ، ئیتر سوپای ئەحزاب هیچ هەڵمەتێکی تری لەو جۆرەی نەدا هەتا کشانەوە لە مەدینە .

---

ئێوە ئەوانتان خستۆتە دۆزەخەوە ( مەبەستی ئەو کافرانەی قورەیشە کە بە دەستی موسڵمانەکان کوژراون ) . جارێکیان ئەوس و خەزرەج باسی ئەوە ئەکەن کە لە جەنگی ئوحوددا کام لایان ئازاتر بوویێ . لەو کاتەدا ضیرار تێپەڕ ئەکات و ئەڵێن : ئەوە ئامادەی بووە و چاك ئەزانێ . گەنجێکیان نارد بۆ لای تا پرسیاری لێ بکا . وتی : من ئەوس و خەزرەجتان نازانم . بەڵام لە رۆژی ئوحوددا ( حور العين ) م لە یانزە پیاوتان مارە کردووە . مەبەستی ئەوەیە کە لەو رۆژەدا ئەوەندەی لێ کوشتوون . ضیرار بەشداریی جەنگی یەمامەی کردووە و ، لەوێ بە شەهیدیی سەری ناوەتەوە .

بەلاّم سوپای ئەحزاب ئابلووقەی سەر موسلّمانانی توند کردەوە و ، ئەو سوپا بچکۆلەی پشتی خەندەق تووشی بەلاّ و نارەحەتیی زۆر هات کە تەنها ئەو بەرپێزانە بەرگەیان ئەگرت ئەویش بە هۆی ئیمانی دامەزراویانەوە و ، پشت بەستنیان بە خوای بەدەسەلاّت .

هەر لە کاتی هەڵکەندنی خەندەقەکەدا بوو موسلّمانەکان دادی برسێتیی و گرانیيان بوو و ، سەرمای زستانی سەختیش ئازاری ئەدان چونکە ئەو ساڵە موسلّمانەکان یەکجار دەستکورت و کەمدەرامەت بوون .

لە یەکێ لەو شەوانەدا کە موسلّمانەکان یەکجار موحتاج بوون ، خوای گەورە رزقێکی بۆ ناردن . ئەوەبوو جوولەکە بیست وشتریان لە خورما و جۆ و کا بار کرد و ویستیان شەو بە نهێنیی بێنێرن بۆ قورەیش بۆ یارمەتیی و کۆمەکیی . خوای گەورە وەهای رێك خست ئەو شەوە موسلّمانێکی ئەنصار کۆچی دوایی کردبوو و ، ئەو پیاوانەی کە ئەو شەوە پاسەوان بوون ئەو پیاوەیان بۆ قەبرستان ئەبرد ، لە رێگا تووشی ئەو کاروانە وشترە بوون و دەستیان بەسەردا گرت و ، هێنایانە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ . ئەوەبوو تا رادەیەك باری برسێتیی سەرشانی موسلّمانانی سووك کرد ..

کاتێك کە ئەو هەواڵە بە ئەبوسوفیان گەیشت کە موسلّمانەکان دەستیان بەسەر کاروانەکەدا گرتووە وتی : حویەیی کوڕی ئەخطەب ئەوەندە شوومە نانی ئێمەی بڕیوە و ، کە گەڕاینەوە ولاّغ و شتمان نیە تا سواری ببین ..

جار لە دوای جار چالاکیی ئەسپ سوارانی قورەیش زیادی ئەکرد و بە کۆمەڵێکی یەکجار زۆر هەموو شەوێ بە دەوری خەندەقەکەدا ئەسووڕانەوە و هەتا بەرەبەیان دەست کۆتا نەئەبوون . کە رۆژیش ئەبوویەوە دەستەیەکی تر ئەو کارەیان هەتا ئێوارە ئەنجام ئەدا و ، بە ئاواتەوە بوون موسلّمانەکان بێ ئاگا بن و ، لە ناخلۆفدا بکەنە ئەوبەر . بەمە موسلّمانەکان بە تەواوەتیی ماندوو ئەبوون ، چونکە لە شەوەکانی کۆتاییدا ناچار بوون هەتا بەرەبەیان هەر بەخەبەر بن و نەخەون ..

**شانزەهەم : غیرەتی ئازیز ﷺ**

کە موسلّمانەکان ئەوەندە نارەحەتی دەستی کافرەکان بوون ، پێغەمبەری خوا ﷺ خۆیشی ناچار بوو لە کام شوێنەدا زیاتر مەترسیی لێ ئەکرێ ، ببێتە پاسەوان.

لە خاتوو عائیشەوە خوا لێی رازیی بێ ریوایەت کراوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە شەودا لە کەلێنێکی خەندەقەکەدا پاسەوانی ئەکرد ، تا نەهێڵێ دوژمن لێیەوە هێرش بکات . ئەوەبوو ئەیفەرموو : (( ما أخشى أن يؤتى المسلمون إلا منها )) . ئەیفەرموو : تەنها لەم کەلێنەوە ئەترسم بێنە سەر موسڵمانەکان .

جا ئەگەر سەرما زۆری بۆ بهێنایە ئەهاتەوە ناو چادرەکەی تا کەمێ گەرمی بێتەوە . کە گەرمی ئەبوویەوە ئەگەڕایەوە بۆ کەلێنە پڕمەترسییەکە و خۆی تیایا پاسەوانیی ئەکرد ..

شەوێکیان کە زۆر سارد بوو و ، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتبووەوە ناو چادرەکەی کە لە نزیکی کەلێنەکەدا بوو و ، بیریشی هەر بەلای ئەو کەلێنەوە بوو ، فەرمووی : (( ليت رجلاً صالحاً يحرس هذه الثلمة الليلة )) . فەرمووی : خۆزگە ئەمشەو پیاوێکی صالح ئەهات و ئەبووە پاسەوانی ئەم کەلێنە ..

ئەوەبوو لەناو تاریکایی شەوەکەدا و لە نزیك چادرەکەیەوە دەنگی چەك هات ، فەرمووی : (( من هذا ؟ )) .

سەعدی کوڕی ئەبووەقاص وتی : سەعدە ، ئەی پێغەمبەری خوا ! هاتووم پاسەوانییت بکەم .. ئەویش فەرمانی بەسەردا دا کە ئەو شەوە لە جیاتی خۆی لەو کەلێنە گرنگەدا پاسەوان بێت ، کە پێی فەرموو : ((عليك هذه الثلمة فاحرسها )) .

سەعدیش گوێڕایەڵیی فەرمانی کرد و بە خۆی و ئەو پیاوانەوە کە لەگەڵیا بوون پاسەوانیی ئەو شوێنەیان کرد ..

کە پێغەمبەری خوا ﷺ بێخەمی پاسەوانیی ئەو خاڵە گرنگە بوو ، کە پاڵەوانێکی متمانە پێکراو چاودێریی ئەکات و ، لەبەر ئەوەش کە ماوەیەك بوو بێخەم نەخەوتبوو و ، زۆر هیلاك و ماندوو بوو ، سەری نایەوە و بەشێك لە شەوەکە خەوی پیا کەوت بە رادەیەك ( وەك خاتوو عائیشە ئەیگێڕێتەوە ) پرخەی لێ دا ..

دوای ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەشی خۆی خەوت ، بەر لەوەی شەو تەواو ببێ ، لە خەو هەستا و ، دوو رەکعەت نوێژی بەجێ هێنا ، پاشان لە چادرەکەی چووە دەرەوە و ، بەرەو رۆخی خەندەقەکە رۆیشت هەتا لە پاسەوانییدا بەشداریی بکا و چاودێریی دوژمن بکات کە بە درێژایی شەو بە وڵاغەوە بە دەوری خەندەقەکەدا ئەسووڕانەوە.

لە کاتێکدا کە خۆی ئەسووڕایەوە ، ئەمەش لە سێیەکی دوایی شەودا بوو ، هەستی بە چرپەی ئەسپی بتپەرستەکان کرد لەوبەری خەندەقەکەوە ، خێرا هاوەڵانی ئاگاداری شوێنەکەیان کرد و فەرمووی : (( هذه خيل المشركين )) .

پاشان بانگی کردە سەرۆکی پاسەوانی تایبەتیی خۆی و ، فەرمانی بەسەردا دا تا بە خۆی و پیاوەکانیەوە چاودێریی ئەسپ سوارانی دوژمن بکەن کە فەرمووی: (( يا عبّاد بن بشر ! )) . وتی : لبیك ، ئەی پێغەمبەری خوا . فەرمووی : (( هل معك أحد ؟ )) . فەرمووی : کەست لەگەڵایە ؟ وتی : بەڵێ ، ئەی پێغەمبەری خوا ! بە خۆم و چەند کەسێکەوە پاسەوانی دەوری چادرەکەتین .

فەرمانی دا ئەویش بە دەوری خەندەقدا بسووڕێتەوە .

لە شەوێکی تری شەوە سەختەکانی خەندەقدا خالیدی کوڕی وەلید لەگەڵ کۆمەڵێك ئەسپسواری قوڕەیشیی هەوڵیان دا لە شوێنێکی تەنگەبەرەی خەندەقەکەوە بکەنە ئەوبەر . بەڵام دەوریە و پاسەوانەکانی سوپای ئیسلام لەوان شارەزاتر بوون بە کەلێنەکانی خەندەقەکە ، بۆیە هەمیشە پاسەوانی چاکیان بە دیارەوە بوون .

کە خالید ویستی لە تاریکاییدا بکاتە ئەوبەر ، ئەبینێ وا دەوریەیەکی چەکداری گەورەی موسڵمانەکان ، بە سەرکردایەتیی ئوسەیدی کوڕی حوضەیری ئەنصاریی ، کە دووصەد کەس ئەبوون ، وان لەو بەریانەوە . ئیتر ئەوەبوو خالید کشایەوە دوا ..

بەڵام پیاوەکانی خالید لەو شەوەدا لەوبەری خەندەقەوە تیر و حەربەیان ئەگرتە موسڵمانەکان ، ئەوەبوو لە دەست وەشاندنی ئەو شەوەدا یەکێ لە موسڵمانەکان ، بە ناوی طوفەیلی کوڕی نوعمان ، بە دەستی وەحشیی کوڕی حەرب ، کە بکوژی حەمزە بوو ، بە حەربەیەك ، کە لەوبەری خەندەقەوە تێی گرت ، شەهید بوو .

هەتا فەرماندەی گشتیی سوپای ئەحزاب ، ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب خۆی بووە فەرماندەی چەند ئەسپ سوارێك تا بە دەوری خەندەقەکەدا بسووڕێنەوە ، ئەمەش بە هاوبەشیی لەگەڵ ئەسپ سوارانی خالیدی کوڕی وەلید و عیکریمەی کوڕی ئەبو جەهل و عەمری کوڕی عاص . بەڵام هیچ کەڵکی نەبوو .

لە راستییدا خەندەقەکە پشتی ئەحزابی شکاندبوو و ، زیاتر لە بیست رۆژ بێکار لەو ناوەدا بەند بووبوون ، ئەمەش لە خۆیدا بێزارییەکی دروست کردبوو ، بە تایبەتیی بۆ سوپایەکی وەها گەورە کە لە کەس و کار وناوچەی خۆیانەوە دوور بن.

**حەڤدەهەم : هانابردن بۆ خوا**

ئەمجارەیان فەرماندایەتیی ئەحزاب هاتە سەر ئەو رایە کە دوا هەوڵ بدرێت بۆ ناچارکردنی موسڵمانەکان بۆ ئەوەی بێنە مەیدانی جەنگەوە ، چونکە ئەیانزانیی لەوە زیاتر جەنگاوەران ناتوانن چاوەڕوانیی بکەن .

بۆ ئەمە فەرماندەکانی قوڕەیش هەر هەموویان چیی ئەسپ سواریان لەگەڵدا بوون هێنانیانە کەناری خەندەقەکە و زۆرێك جەنگاوەری پیادەشیان لە دوایانەوە بۆ کاتی پێویست وەستاند.

ئەم هەوڵە بریتیی بوو لەوەی ئەسپ سوارێکی زۆر خۆیان ئامادەی پەڕینەوە بکەن، بەشکوم کۆمەڵێکی زۆریان بچنە ئەوبەری خەندەق و ، لەوێ بنکەیەکی سەربازیی بە هێز دروست بکەن . بەمە چەند شوێنێکی خەندەق لەم بەرو لەو بەرەوە لە ژێر دەسەڵاتی خۆیاندا ئەبن و ، سوپای ئەحزاب بە پاسەوانیی ئەو هێزانەیان ئەتوانن لە خەندەقەکە بکەنە ئەوبەر، ئەویش بە پڕکردنەوە ناوچەیەکی خەندەقەکە، بەمە ئەتوانن لەگەڵ موسڵمانەکاندا جەنگ بەرپا بکەن و، ئەو قەیرانە ئاڵۆزە کۆتایی پێ بهێنن.

فەرماندەکانی ئەحزاب لایان یەقین بوو کە ئەگەر بچنە مەیدانی موسڵمانەکانەوە، بەسەریاندا زاڵ ئەبن ، بە تایبەت دوای ئەوەی کە قورەیظە پەیمانیان شکاند ، چونکە سوپای مەدینە زۆر بچکۆلەیە و ، بەرگەی شاڵاوی سوپاکانی ئەحزاب ناگرێ.

بۆ ئەمە ئەحزاب فشاری زۆریان ئەخستە سەر سەربازگەی موسڵمان کە لەوبەری خەندەقەوە بوو . جاران ئەبوسوفیان چەند کەسێکی ئەنارده سەر خەندەق ، کەچیی لەم دواییەدا خۆی سەروکاریی ئەو هەڵمەتانەی ئەکرد.

ئەم هەوڵە بەش بە حاڵی خۆی فشاری خستە سەر سوپای مەدینە و ، ترس و ناڕەحەتیی زیاتری بۆ هێنانە پێش ، سەرەڕای برسێتیی و سەرما و سۆڵەی زستانی سەخت و، سەرەڕای ترسی ئەوەش کە قورەیظە لە دواوە هێرش بکەنە سەریان.

ئەم فشار و ناڕەحەتی یە بووە هۆی ئەوەی هەندێکی تر لە ئیمان لاوازان ریزەکانی سوپای ئیسلام بەجێ بهێڵن .. تا سەرەنجام لەو شەوە تاریکانەی کۆتاییدا تەنها کۆمەڵێکی کەم لە هاوەڵە یەکجار دڵسۆزەکان لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ مانەوە ، ئەوانەی کە چارەنووسی خۆیان بەستبوو بە چارەنووسی ئەوەوە ، بە وێنەی ئەبوبەکر و عومەر و عوثمان و عەلیی و طەلحە و زوبەیر و سەعدی کوڕی

موعاذ و طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلا و ، ئەوانەش کە لە ئازایەتیی و یەقین و ئیماندا هاوشانی ئەوان بوون .

هەتا ئەم بەڕێزە ئیمان دامەزراوانەش ناڕەحەتیی و بەلا و ترس و لەرز کارێکی زۆری کردبووە سەریان ، بە رادەیەك لە دوا ساتەکانی ئەو مەینەتە ترسناکەدا هاتنە خزمەتی پێغەمبەری فەرماندە ﷺ و ، راستەوخۆ دەریان بڕیی کە لە چ ترس و لەرز و ناڕەحەتیی و تەنگانەدان .

پیٚیان وت : ئەی پێغەمبەری خوا ! گیانمان گەییوەتە قوڕگمان ، ئایا شتێك بڵێین؟ فەرمووی :

(( نعم ، قولوا : أللّهم استر عوراتنا وآمن روعاتنا )) .

فەرمووی : بەڵێ ، بڵێن : خوایە شەرەف و ناموسمان بپارێزە و ، ترس و لەرزیش لە دڵمان دەر بکە .

لەو ساتانەدا کە موسڵمانان بە تەواویی بەلا و ناڕەحەتیی یەخەی پێ گرتبوون ، جیبریل هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ مژدەی ئەوەی دایە کە تێکشکانی سوپای ئەحزاب نزیك بۆتەوە و ، خوای گەورە لەلایەن خۆیەوە رەشەبا و سەربازیان بۆ ئەنێرێ.

ئەو هەواڵەی کە جیبریل هێنای ، پێغەمبەری خوا ﷺ بە موسڵمانەکانی گەیاند و، هەردوو دەستیشی بەرەو ئاسمان بەرز کردنەوە و ، ئەیفەرموو : شکراً ، شکراً .

لە صەحیحی بوخارییدا هاتووە کە کاتێ موسڵمانەکان تەنگیان پێ هەڵ چنرا و، گەمارووی کافران فشاری زۆری خستە سەریان لە شەوەکانی کۆتایی غەزای خەندەق دا و، کە پێغەمبەری خوا ﷺ ترسی زۆری بە هاوەڵانیەوە بینیی دەستی بە پاڕانەوە کرد و فەرمووی : (( أللهم منزل الكتاب ، سريع الحساب ، أهزم الأحزاب .. أللهم أهزمهم وانصرنا عليهم و زلزلهم )) . فەرمووی : خوایە ! ئەی نێرەری قورئان ، ئەی ئەو خوایەی کە بە زوویی حیسابی بەندەکان تەواو ئەکەیت ، سوپای ئەحزاب بشکێنە .. خوایە بیان شکێنە و سەرمان بخە بە سەریان دا و لەرزەشیان پێ بخە.

پاشان بە پێوە وەستا و دەستی بە وتاردان کرد و فەرمووی : (( يا أيها الناس ! لا تمنوا لقاء العدو ، واسألوا الله العافية . فإن لقيتم العدو فاصبروا ، واعلموا أن الجنة تحت ظلال السيوف )) . فەرمووی : خەڵکینە ! ئاوات مەخوازن لەگەڵ دوژمندا دەست بکەن بە جەنگ ، بەڵکو بێوەیی لە خوا داوا بکەن . خۆ ئەگەر خوا ویستی

لەسەر بوو و لەگەڵ دوژمن‌دا بە جەنگ هاتن ئەوا ئارام بگرن و ، ئەوەش چاك بزانن كە بەهەشت وا لە ژێر سێبەری شمشێرەكان‌دا ..

ئیسلام حەزی لە جەنگ و كوشتار نیە .. حەزی لە ئاشتی‌یە .. بەڵام بەبێ سوپا و هێز و چەك موسڵمانانیش و مرۆڤایەتییش ناحەسێنەوە ، چونكە بەرەی كوفر زاڵم و ستەم‌كارە و، ئەگەر موسڵمانان بێ‌دەسەڵات بن ئەیان هاڕن . بەڵام ئەگەر موسڵمانان بەهێز بوون ، ئەوان خاوی ئەكەنەوە ..

یەكێكی تر لە دوعاكانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە رۆژی خەندەق‌دا ئەی‌فەرموو: (( یا صریخ المكروبین ! یا مجیب المضطّرین ! اكشف همي وغمي وكربي ، فإنك ترى ما نزل بأصحابي )) ئەی‌فەرموو : ئەی بە هاناوە هاتووی لێ‌قەوماوان و، گیرخواردووان! خەم و خەفەت و تەنگانەم لەسەر لا بەرە .. خۆت ئەبینی هاوەڵانم چی‌یان بەسەر هاتووە.

**هەژدەهەم : نامەردیی جوولەكە**

دیارە موسڵمانەكان یەكجار ناڕەحەت و گیرخواردە بووبوون . لەولاوە فەرماندەیەتیی سوپاكانی ئەحزابیش چاك ئاگادار بوون كە چ ترس و لەرزێك و ناڕەحەتی‌یەك ، بە بۆنەی ئەم هەڵمەتانەی دواوە ، رووبەڕووی موسڵمانەكان بوونەتەوە. بۆیە چالاكیی خۆیان زیاتر كرد و ئاماژەشیان بۆ نەوەی قورەیظە كرد كە لە دواوە هەڵمەت بەرنە سەر موسڵمانەكان ، بەوەی كە دەست لە قەڵای ژن و منالەكانیان بووەشێنن ، تا موسڵمانەكان بپەشۆكێنن . هەروەها جوولەكەیان ئاگادار كرد كە ئامادەی كاتی دیاریی‌كراو بن بۆ هێرشی گشتیی و ئەوانیش دەست‌بەكار بن.

هەرواش بوو جوولەكە دەستیان كرد بە هەڕەشە و گوڕەشە لە قەڵای ژن و منداڵە موسڵمانەكان . موسڵمانەكانیش هیچ شتێك ئەوەندەی ئەو كارەی جوولەكە دڵەڕاوكەی تووش نەئەكردن ، چونكە بە دیل‌گیرانی ژن و منداڵ لە هەموو شتێك زەحمەت‌ترە.

بەڵام لەبەر ئەوەی كە قەڵاكان لە سوپای موسڵمانانەوە زۆر دوور نەبوون ، موسڵمانەكان هەمیشە چاودێری‌یان ئەكرد و پاسەوانی تایبەتی‌یان بۆیان دائەنا ، بە تایبەتیی بە شەودا .

فەرماندایەتیی موسڵمانەکان ژن و منداڵی قەڵاکانیشی ئاگادار کردبوون کە هەرکاتێ مەترسیی دەورەی دان بە سەربانی قەڵاکانەوە شمشێر هەڵ بسوورێنن تا موسڵمانەکان فریایان بکەون .

طبەرانیی لە رافیعی کوڕی خودەیجەوە ریوایەتی کردووە کە وتوویە : هیچ قەڵایەك ئەوەندەی قەڵای نەوەی حاریثە مەحکەم نەبوو ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ ژنان و منداڵانی لەوێ دائەنان و ئەشیفەرموو: (( إن لم يكن أحد فـألمعنَ بالسيف )) .

فەرمووی : ئەگەر کەستان بەلاوە نەبوو شمشێرەکان هەڵ بسوورێنن تا بتریسکێنەوە .

پیاوێك لە نەوەی قورەیظە لە تیرەی ثەعلەبەی کوڕی سەعد کە ناوی نەجدان بوو بەسەر ئەسپێکەوە هات گەیشتە بنی قەڵاکە و بە ژنەکانی ئەوت : دابەزنە خوارەوە لای من ئەوە چاکە بۆتان . ئافرەتەکانیش شمشێریان هەڵ سووڕاند و هاوەڵان بە چاوەوە بوون . خێرا کۆمەڵێك موسڵمان هەڵمەتیان دا ، کە یەکێکیان پیاوێکی ئەنصاریی لە نەوەی حاریثە بوو و ، ناویشی ظەفەری کوڕی رافیع بوو وتی: نەجدان وەرە پێشەوە بۆ زۆران بازیی . کە هاتە پێشەوە ، تەپی کوتایە سەری و کوشتی و ، سەری بڕیی و سەرەکەی برد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ .

جوولەکەی قورەیظە هەر بەوەوە نەوەستان کە هێرش بکەنە سەر ژنی هاوەڵان بۆ دیل کردنیان ، بەڵکو هەوڵیان دا هێرش بکەنە سەر دایکانی ئیمانداران و ئەو ژنانەی کە لەگەڵیانا بوون.

ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ خێزانەکانی و صەفیەی پووری لە قەڵایەکدا دانابوون کە قەڵای حەسسانی کوڕی ثابیت بوو و ، ناوی قەڵاکەش ( فاریع ) بوو . حەسسان خۆیشی لەوێ بووە . ئیترسا لەبەر نەخۆشیی یان پیریی بووبێت ..

صەفیە ئەڵێت : جوولەکەیەك بە لامان دا تێپەڕیی و بە دەوری قەڵاکەدا ئەسووڕایەوە ، ئەوەبوو نەوەی قورەیظەش چووبوونە حاڵەتی جەنگەوە و ، پەیوەندیی نێوان خۆیان و پێغەمبەری خوایان ﷺ بڕیی بوو . کەسیش لەوێ نەبوو بەرگریمان لێ بکا ، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ و موسڵمانەکان بەرامبەر بە دوژمن وەستابوون و ، ئەگەر کەسێك بهاتبایەتە سەرمان نەیان ئەتوانیی واز لە دوژمن بێنن و بێن بەلای ئێمەوە .

صەفیە ئەڵێت : پشتوێنەکەمم توند بەست و دەستم دایە کۆڵەکەیەك و ، لە قەڵاکەوە بۆی دابەزیم و بە کۆڵەکەکە ئەوەندەم لێ دا هەتا کوشتم.

لە ریوایەتەکەی ( بزار ) دا وەها هاتووە کە ئەو جوولەکەیە سەرکەوتۆتە سەر قەڵاکە ( ئەو قەڵایەی کە دایکانی ئیماندارانی تێدا بووە ) و ، کە صەفیە لە کوشتنی ئەبێتەوە ، سەری ئەبڕێت و ، سەرەکەی بەسەر قەڵاکەوە فڕێ ئەدات بەسەر ئەو جوولەکانەدا کە بە دەوری قەڵاکەدا بوون ، ئەوانیش کە ئەوەیان دی ترس و لەرزیان لێ نیشت و ، وا هات بە بیریاندا کە ئەبێ سوپایەك بۆ پاسەوانیی ئافرەتەکان تەرخان کرابێ ..

جوولەکەکان بە هەڵاتنەوە ئەیان وت : ئەبوایە هەر بمانزانیایە کە ماڵ و منداڵەکەی بێکەس بەجێ ناهێڵێ . ئیتر بڵاوەیان لێ کرد ..

ئەم کارەی جوولەکە هەر چەندە کارێکی پووچەڵ و هیچ و پووچ بوو ، بەڵام موسڵمانەکانی ئەپەشۆکاند ، بۆیە ئەوانیش ناچار بوون کە پاسەوانی زیاتر بۆ قەڵاکان دابنێن . ئەمەش ئەبووە هۆی کەم بوونەوەی پاسەوانەکانی خەندەق . بت پەرستەکانیش هەستیان بەو کەمکردنە کرد و ، بە هەلیان زانیی لە هەموو لایەکەوە بیانپەشۆکێنن و ، نەهێڵن وچان بدەن و ، ماوەیان نەبێ بحەسێنەوە ، بگرە نەتوانن نوێژیش ئەنجام بدەن ، چونکە ناچاریان کردبوون کە بە شەو و بە رۆژ لەسەر قەراغی خەندەق ، بەوپەڕی ئامادەباشی‌یەوە ، بێ‌ئەوەی چەك دابنێن ، هۆشیار و ئاگادار بن ، بە تایبەتیی لە نزیك ئەو شوێنانەدا کە مەترسیی ئەوەی لێ ئەکرا ، لەبەر تەسکیی خەندەقەکە ، کافرەکان لێیەوە بپەڕنەوە ، بەمە موسڵمانەکان لەبەر کەمی یان ماوەیان نەبوو پشوو بدەن ..

ئەوەبوو لەو شەوە سامناکە تاریکە سەختانەدا پێغەمبەر و هاوەڵە کەمەکانی نەیان توانیی نوێژی نیوەڕۆ و عەصر و مەغریب و عیشا لە کاتی خۆیاندا بەجێ بهێنن ، بە رادەیەك کە هاوەڵان دەنگیان لێ بەرز بوویەوە کە نوێژیان بەجێ نەهێناوە، ئەویش ئەیفەرموو : (( ولا أنا والله ما صليت ! )) هەتا ئەوەبوو خوا بتپەرستانی پێچایەوە .

لە دواجاردا بت پەرستەکان کەتیبەیەکی بەهێزیان بەرەو مەنزڵی پێغەمبەری خوا ﷺ نارد کە ئەو رۆژە هەتا شەو جەنگیان لەگەڵ کردن . کە کاتی نوێژ هات ، کەتیبەکە نزیك کەوتەوە ، ئیتر پێغەمبەری خوا ﷺ و هیچ هاوەڵێکی لەوانەی کە لەگەڵیا بوون نەیان توانیی وەك پێویست نوێژەکانیان بەجێ بهێنن ، تا ئەوەبوو لەگەڵ هاتنی شەودا کشانەوە .

ئا لەم کاتە ناسکانەدا زۆرێك لە خەڵکەکە تووشی نیفاق بوون و قسەی نابەجێیان کرد . جا کە پێغەمبەری خوا ﷺ دیتی وا خەڵکەکە بەلا و ناڕەحەتیی زۆری بۆ هێناون ، دەستی دایە مژدەدان بە خەڵکەکە و ئەیفەرموو :

(( والذي نفسي بيده ليفرجن عنكم ما ترون من الشدة ، وإني لأرجو أن أطوف بالبيت العتيق آمناً وأن يدفع الله إلي مفاتيح الكعبة وليهلكن الله كسرى وقيصر ولتنفقن كنوزهما في سبيل الله )) .

مژدەی دا کە موسڵمانەکان لەو ناڕەحەتی‌یە رزگاریان ئەبێت و ، هیواشی خواست کە بە دڵێکی ئارامەوە طەوافی ماڵی خوا بکات و ، خوایش کلیلەکانی کەعبەی پێشکەش بکات و ، کیسرا و قەیصەریش لەناو بەرێت و ، گەنجینەکانیان بە دەستی موسڵمانەکان لە پێناوی خوادا خەرج بکرێن .

لە ریوایەتی بوخاریی‌دا هاتووە کە رۆژی خەندەق عومەری کوڕی خەططاب دوای ئاوابوونی خۆر دێت و ، جنێو بە کافرەکانی قورەیش ئەدات و ، ئەفەرموێ : ئەی پێغەمبەری خوا ! نەمتوانی نوێژ بەجێ بهێنم هەتا خۆر ئاوا بوو . ئەویش فەرمووی : بەخوا منیش بەجێم نەهێناوە . لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ دابەزینە سەر شیوی بوطحان و دەستنوێژی گرت و ئێمەش دەست نوێژمان گرت . ئەوەبوو دوای ئاوابوونی خۆر نوێژی عەصری بەجێ هێنا و پاشانیش نوێژی مەغریب ..

لە موسنەدی ئیمام ئەحمەدیش‌دا لە ئیبن عەبباس‌ەوە ریوایەت کراوە وتوویە : پێغەمبەری خوا ﷺ جەنگی لەگەڵ دوژمن‌دا کرد و لێ نەبوویەوە هەتا نوێژی عەصری لە کاتی خۆی دوا خست . کە ئەوەی دیی فەرمووی : (( أللهم من حبسنا عن الصلاة الوسطى فاملأ بيوتهم ناراً ، واملأ قلوبهم ناراً )) . فەرمووی : خوایە! هەرکەس لە نوێژی ناوەڕاستی کردین ماڵیشیان و دڵیشیان پڕ لە ئاگر بکە .

هەروەها لە موسنەدی ئیمام ئەحمەددا لە ئیبن مەسعوودەوە هاتووە کە بت پەرستەکان رۆژی خەندەق پێغەمبەری خوایان ﷺ لە چوار نوێژ پەشۆکاند ، هەتا ئەوەندەی کە خوا ویستی لەسەر بوو لە شەو رۆیشت . جا فەرمانی بە بیلال دا بانگی دا و پاشان قامەتی کرد و نوێژی نیوەڕۆی بەجێ هێنا ، پاشان قامەتی کرد و نوێژی عەصریشی بەجێ هێنا ، پاشان قامەتی کرد و نوێژی مەغریبیشی بەجێ هێنا، پاشان قامەتی کرد و نوێژی عیشاشی بەجێ هێنا ..

**نۆزدەهەم : سەرکەوتن بە تاقە پیاوێک**

نزیکەی بیست و دوو شەو موسڵمانەکان لە ژێر ئابڵوقەی سوپای ئەحزاب‌دا بوون.. رۆژ بە رۆژ بەرەو کزیی و بێدەسەڵاتیی ئەرۆیشتن .. سوپای ئەحزاب بێشومار و موسڵمانانیش سوپایەکی بچکۆلە .. خۆ ئەگەر ئیمان‌دار نەبوونایە بەرگەی ساتێکیان نەئەگرت .. ئەمەش تاقیی‌کاری‌یەکی سەخت بوو بۆ ئوممەتی موحەممەد ، تا هەموو کەسێ بزانێ کە متمانەکردنی دینی خوا بە موسڵمان دوای تاقیی‌کردنەوەیەتی .. ٠

بە هەموو حیسابێکی دنیایی سوپایەکی وەها بچکۆلە ، لەبەردەم سوپایەکی مل هوڕدا و ، قورەیظەش لە خوارەوە و ، رەشەبا و سەرما و سۆڵە و کەم خۆراکیی و کەم بەرگیی ساڵی گرانییش هەموو لەولاوە بووەستن ، بە هەموو حیسابێك ئەو سوپا بچکۆلە ئەبێ تیا بچێ .. هەزار گیانی هەبن گیانێك دەر ناکا ..

هاوەڵان هیچیان بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێ کە لە پێغەمبەری خوا ﷺ داوای دوعایەك بکەن فێریان کات تا لەم هەڵوێستە ناسکە رزگاریان بێ .. ئەویش پیشانی دان :

« أللهم استر عوراتنا ، وآمن روعاتنا » .

هاوەڵان بە دڵ روویان کردە ئاسمان ..

خوای پەروەردگار ! شەرەفمان بپارێزی ..

خوای پەروەردگار ! ترس و لەرزمان لێ دوور بخەیتەوە ..

ئێمە بەندەی خۆتین ، پەروەردگار ! چاوت لێمان بێ ..

بگەرە فریامان ..

دوژمنمان بۆ بشکێنە ..

جا چۆن ؟

بەم سوپا بچکۆلە ؟

خوایە ! خۆت نەخشە بکێشە ..

هەرکەسێ لەگەڵ خوادا راست بکات ، خوا خۆی نەخشەی بۆ ئەکێشێ ..

ئەوەبوو لە دواساتەکانی تەواوبوونی وزە و ، نەمانی بەرگەدا خوا هۆی نارد ..

دەرمانی دەرد ..

سوپای نارد ..

سەرکەوتنی نارد ..

چۆن ؟
خوای گەورە هیدایـەتی تاقـە پیـاوێکی دا و بـووە هـۆی تێـکشـکانی کـافران و سەرکەوتنی ئیمانداران !
چۆن ؟ جا ئێستە وەختی ئیمانهێنانە ؟
وا خاوەن ئیمانەکان دڵیان سارد ئەبێتەوە ، ئەو ئێستە ئیمان ئەهێنێ ؟
دیارە پیاوێکی ناوازەیە ..
پێغەمبەری خوا و دینەکەی و هاوەڵەکانی لەوپەڕی مەترسییدان و ، سوپای مـل هوڕ هەڕەشەی نەمانیان لێ ئەکات ، ئەو ئێستە دڵی گەرم ئەبێ بۆ دینی خوا؟
ئەو هەمووە هاوەڵانە ، کە هەیانە هەژدە ساڵە وا لە خزمەتی ئیمـاندا ، دەسـتە پاچەن و ، ئەبێ چاوەڕوان بـن نەموسـڵمانێك بێـت ئیمـان بهێنـێ و ، کـە هێشـتا نوێژێکی بەجێ نەهێناوە ، ئیسلام و موسڵمانان سەر بخات ؟
ئەبێ ئەو کەسەی کە ئەوەی لێ بێت چەند بەغیرەت و زیرەك و لێهاتوو بێت ؟
ئەبێ ئەو کەسە چەندە خاوەن شانس و ئیقباڵ بێت ؟
دینی ئیسلام هەڕەشەی تیاچوونی لێ ئەکرێت و تاقـە کەسـێك فریـای هەڵوێسـتە پڕمەترسییەکە ئەکەوێت ؟
بەڵێ ، ئەو پیاوەی کە گەیشتە فریای پێغەمبەر و هـاوەڵانی و ، لـەو هەڵوێسـتە سەختە ڕزگاری کردن ، دیـارە بـە ویسـت و دەسـەڵاتی خوا ، پیاوێکـە لـە نـەوەی ئەشجەعی هۆزی غەطەفان کە ناوی نوعەیمی کوڕی مەسعوودە ..
هۆزی غەطـەفان شەش هەزار جەنگاوەریان هێناوەتە سەر مەدینە ، کەچیی خـوای گەورە بە هۆی تاقە پیاوێکیانەوە سوپای ئەحزاب هەمووی تەفر و توونا ئەکات .
نوعەیمی کوڕی مەسعوود پیاوێکی پیاوانە و ناودار و ناسـراو و متمانـە پێکـراوی هـەموو دانیشـتوانی دوورگـەی عـەرەبیی بـوو .. لـەلای عەرەبـەکانیش و لـەلای جوولەکەش سەنگی تایبەتیی خۆی هەبوو .. لەناو سوپای ئەحزابیشدا خاوەنی تەگبیر و ڕاوێژ بوو و ، لە ڕای ڕێك و پەسەندی کەڵك وەرئەگیرا .
ئیتر ئەوەبوو ، بە پێی حیکمەتی خوای گەورە شەوێك پـێش دواشـەوی ئـەحزاب ، خوا هیدایەتی دا و دڵەکەی بە ئیمان ئاشنا بوو و ، لەو کاتە ناسکەدا نـووری ئیمـان گەشەی کرد .

ئەم گەش‌بوونەوە ئیمانی‌یەی لای هیچ کەس باس نەکرد .. پیاوێکی پیاوانە بوو.. خاوەن سەلیقە بوو .. بەبێ دەنگ لە سەربازگەی ئەحزاب خۆی دزی‌یەوە و لەبەردەم خەندەقەوە ، لە تاریکایی شەودا بەرەو سەربازگەی پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتە ڕێ ، کە ئەوەبوو پێغەمبەر و هاوەڵان لەوێ پاسەوانی خەندەق بوون .

ئەمەش ئەوپەڕی ئازایەتی‌یە ، لەو تاریکە شەوەدا بپەڕێتەوە .. دیارە مەلائیکەتەکانی خوا چاودێری‌یان کردووە .. موسڵمانەکان ئەی‌گەیەننە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ . لەوێ بە نهێنیی ڕای ئەگەیەنێ کە خوا هیدایەتی داوە و ، دڵی چۆتە سەر ئیمان .. ئامادەیە ببێتە سەربازێکی گوێڕایەڵی بە کەڵك بۆ ئەم هەڵوێستە ناهەموارە ..

ڕای‌گەیاند موسڵمان بووە و ، ئەیەوێ پێغەمبەری فەرماندە فەرمانی بەسەردا بدات..

نوعەیم وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! من موسڵمان بووم و ، خزمەکانیشم بەم موسڵمان بوونەمیان نەزانیوە . چیت پێ خۆشە فەرمانم بەسەردا بدە ..

پێغەمبەری فەرماندە ﷺ فەرمووی : (( أنت رجل واحد فخذّل عنا إن استطعت، فإن الحرب خدعة )) . فەرمووی : تۆ تاقە پیاوێکی ، ئەگەر توانیت دوژمنمان لێ دوور بخەرەوە ، چونکە جەنگ خەڵەتاندن و فرِوفێڵە .

لە ریوایەتێکی تردا داوا ئەکات کە پێغەمبەری خوا ﷺ ماوەی بدات کە ئەگەر پێویست بوو شتانێ بڵێ کەوا نەبن ، فەرمووی : (( قل ما بدا لك فأنت في حل )) . ئەویش ماوەی دا .

بەمە ماوەی دا کە بە هەر جۆرێك بۆی ڕێك ئەکەوێ با سوپای ئەحزاب تێك بدات و پەرتەوازەیان بکات .

نوعەیم بە پەلە هەستا و بەرەو ناوچەی نەوەی قورەیظە کەوتە ڕێ کە بە بۆنەی هەڵگەڕانەوەی ئەوانەوە بارودۆخەکە ئاڵۆزتر بوو .

نوعەیم لەلای جوولەکەی نەوەی قورەیظە کەسێکی ناسراو بوو و ، جوولەکە هۆگری بووبوون و ، لەسەردەمی نەفامیی‌دا دۆستایەتیی و تێکەڵیی لەگەڵدا کردبوون . ئەوەبوو لە باسەکانی پێشەوەی ئەم ژیان‌نامەیەدا باسی ئەوەمان کرد کە نوعەیم لە یەکێ لە مەی‌خانەکانی جوولەکەدا لە مەدینە ( پێش حەرامبوونی عەرەق ) .. بە سەرخۆشیی باسی تێپەڕبوونی کاروانێکی قورەیشیی کرد و ، یەکێ لە هاوەڵانیش

لەوێ ئامادە بوو ، کە ئیستیخباراتی سوپای ئیسلام بوو ، بە پەلە هەواڵەکەی گەیاندە پێغەمبەری خوا و ، ئەویش خێرا هەڵمەتێکی سەربازیی رێك خست و زەیدی کوڕی حاریثەی کردە ئەمیری سریەکە و ، فەرمانی بەسەردا دا کە هەر کاتێ ئەو کاروانە لە شامەوە گەڕایەوە رێی پێ بگرن . ئەوەبوو زەید توانیی دەست بەسەر ئەو کاروانەدا بگرێ و ئەم هەڵمەتەش ناو نرا سریەی زەیدی کوڕی حاریثە کە پێش جەنگی ئوحود رووی داوە .

کاتێك کە نوعەیمی کوڕی مەسعوود گەیشتە قەڵاکانی نەوەی قورەیظە ( بەڵام موسڵمانبوونی ئاشکرا نەبوو بوو ) دەستی کرد بە هەڵبەستنی ئەو فێڵەی کە بە تەما بوو سوپای ئەحزاب و جوولەکەی پێ تێك بدات . ئەو فێڵەی کە بە راستیی بووە هۆی تێکشکانی ئەحزاب و سەرفرازبوونی سوپا بچکۆلەکەی ئیسلام .

نوعەیم پێی وتن : ئەی نەوەی قورەیظە ! دۆستایەتیی من بۆ جوولەکە و ، بە تایبەتیی بۆ ئێوە هەمووتان چاك ئەیزانن .. بەبێ ئینکاریی هەموویان پشتگیریی قسەکەیان کرد و وتیان : راست ئەکەی ، بەلای ئێمەوە هیچ تاوانبارییەکت نیە .

نوعەیم دەستی بە کارەکەی خۆی کرد ، کە بریتیی بوو لە دروستکردنی گومان و دوودڵیی لە نێوان جوولەکە و سوپاکانی ئەحزابدا ، تا بتوانێ رێککەوتنەکەیان تێك بدات .

سەرۆکەکانی نەوەی قورەیظە کۆبوونەوە ، چونکە هەموویان ئەیانناسیی و متمانەیان پێ ئەکرد . ئەویش خۆی وەها لە قەڵەم ئەدا کە یەکێکە لەوان و ، بە چاکیی خەمیان ئەخوات ، بۆیە پێی وتن : قوڕەیش و غەطەفان وەك ئێوە نین .. ئێوە وڵات وڵاتی خۆتانە .. ماڵ و سامان و ژن و منداڵتانی تێدایە .. ناتوانن بەجێی بهێڵن و بچن بۆ شوێنێکی تر . قوڕەیش و غەطەفان هاتوون لەگەڵ موحەممەد و هاوەڵانیدا بجەنگن ، ئێوە لە دژی موحەممەد پشتی ئەوانتان گرتووە و، ئەوان وڵات و خاو خێزان و سامانیان لە شوێنێکی ترە ، ئەوان وەك ئێوە نین . جا ئەوان ئەگەر هەلیان دەست کەوت ئەوا دەستی خۆیان ئەوەشێنن و ، گەر وایش نەبوو ئەگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان و ، ئێوە و کابرا لەم وڵاتەی خۆتانا بەجێ ئەهێڵن .

هەروا لەسەر ترساندنیان بەردەوام بوو تا وتی : دیارە ئێوەش بە تەنیا چاری ئەو ناکەن ! واتە بەرگەی موسڵمانەکان ناگرن ..

کە زانیی ترسیان لەلا دروست بووە و ، راستیشە بەرگەی سوپای ئیسلام ناگرن، نوعەیم دواگورزی کاریگەری وەشاند .. رێی بۆ دانان و وتی : جا ئێوە لەگەڵ ئەحزاب دا جەنگ نەکەن هەتا حەفتا پیاوتان بەلاوە بە شێوەی بارمتە دانەنێن ، تا لە مشتتاندا بن و ، بۆ متمانەی ئەوەی کە سوپای ئەحزاب بەبێ کۆڵدان لەگەڵ موحەممەددا ئەجەنگن هەتا بیدەن بە زەوییدا .

قسەکەی نوعەیم بە راستیی لە جێی خۆیدا بوو . جوولەکە نەزانکار بوون خۆیان خستە ئەو گێژاوەوە .. خۆ هەتا نەیانتوانیی وەك پیاو بچنە سەر قەڵای ژن و منداڵەکان ، چ جای بچنە سەر سەنگەری پیاوەکان .. خۆیان خستە جەنگەوە بەبێ مانا .. ئەحزابیش سوپایەکی دوڕندەی بێ سەروبەرە و هەر سەعاتێك ویستیان ئەدەن لە ئاوزەنگیی و ، بەرەو ماڵەوە ئەکشێن . تەنها جوولەکەی قوڕ بەسەر ماوەی هەڵاتنیان نییە ..

لەبەر ئەمە بە چاکیی بڕوایان بە قسەکانی نوعەیم هەبوو و ، هەستیان کرد کە پێویستییان بە بارمتە و زامن بوون هەیە تا لە ناپاکیی پارێزراو بن .. بەمە جوولەکە سوپاسێکی بێپایانی نوعەیمیان کرد لەسەر ئەم ئامۆژگارییە دۆستانەیە و پێیان وت : بە راستیی رای چاکت دەست نیشان کرد . ئیتر بڕیاریان دا کە لێی لا نەدەن.

نوعەیم کە هەستی کرد وا قۆناغی یەکەمی نەخشەکەی ، کە بۆ رماندنی یەکگرتووی بتپەرستیی و جوولەکە دایڕێژا بوو سەری گرت و ، لەوەش بێخەم بوو کە نەوەی قوریظە بڕوایان بە قسەکانی کردووە و ، گومانیان لە دۆستایەتیی ئەو نییە بۆیان ، بە پەلە خۆی گەیاندە بنکەی فەرماندەیەتیی گشتیی ئەحزاب تا بەشەکەی تری نەخشەکەی ، کە بۆ تێکدانی ئەحزاب دایڕێژا بوو ، ئەنجام بدات ..

کە گەیشت لە پێشەوە داوای کرد لەگەڵ فەرماندەی گشتیی ئەحزاب ، ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب و ، دەستەی ئەرکانی جەنگی قورەیشییدا کۆ ببێتەوە..

کە دانیشتن ( دیارە نەیانئەزانی موسڵمان بووە ) هەواڵی دانێ کە بۆ کارێکی گرنگ هاتووە بۆ لایان ، کە پەیوەندیی بە سەلامەتیی خۆیان و سوپاکانیانەوە هەیە و، لەبەر ئەوەی کە بێوەی بن و ئابڕووی سوپاکانیان نەچێ ، خۆی بە ناچار زانیوە ، وەك دۆستێك ، بێت و لە کارێکی گرنگ ، کە پەیوەندیی بە نەوەی قورەیظەی هاوپەیمانیانەوە هەیە ، ئاگاداریان بکات .

به ئەبوسوفیان و دەستەی ئەرکانی جەنگی قورەیشیی وت : خۆشتان ئاگادارن کە من دۆستی ئێوە و دوژمنی موحەممەدم .

ئەوانیش ئینکاریی ئەم قسانەیان نەکرد ، چونکە ئەیانزانیی وەك خۆیان بت پەرستە و ، یەکێکە لە پیاوە ناودارەکانی ئەحزاب ، کە لە ئابلووقەی مەدینە و دەستوەشاندن لە موسڵمانەکان دەورێکی گرنگی هەبووە ..

کە نوعەیم زانیی قورەیش متمانەی پێ ئەکەن ، وەك ئامۆژگارێکی دڵسۆز لێیان هاتە پێش و ، کەوتە باسی ئەو پیلانەی کە جوولەکە بە دەستیانەوەیە لە دژی قورەیش و غەطەفان ، کە ئەنێرن بۆ لایان و داوای حەفتا پیاو لە قورەیش و غەطەفان ئەکەن تا بە وێنەی بارمتە لەلایان بن و ، دڵیان متمانە بکات کە سوپای ئەحزاب دەوری مەدینە چۆڵ ناکەن هەتا بە تەواویی موسڵمانەکان لە ناو بەرن .

جا لەلایەن خۆیەوە شتێکی تری بۆ زیاد کرد تا هەردوولا ـ چ جوولەکە و چ ئەحزاب ـ متمانەیان بە یەك نەمێنێ ..

نوعەیم بە فەرماندەکانی قورەیشی وت : دەنگ و باسێکم بیستووە ، کە بە پێویستم زانیی ، وەك ئامۆژگارییەك بۆتان پێتانی رابگەیەنم . بەڵام بڵاوی مەکەنەوە . وتیان : باشە .

پێی وتن : ئەزانن کە جوولەکە پەشیمانی ئەوەن کە نێوان خۆیان و موحەممەدیان تێك داوە ( واتە پەیمانەکەیان شکاندووە ) . جا ناردوویانە بۆ لای کە ئێمە پەشیمانی ئەو کارەمانین . پاشان پێیان راگەیاندووە کە ئامادەن سەرلەنوێ دەست بخەنە ناو دەستیەوە و ، ئامادەشن لەگەڵیا بن دژی سوپای ئەحزاب . جا بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە راست ئەکەن لەگەڵیا ، پێیان وتووە : ئایا بەوە رازیی ئەبیت کە ئێمە لە هەردوو هۆزەکە ، لە قورەیش و لە غەطەفان چەند پیاوێکی ماقووڵیان وەربگرین و بیان دەینە دەستت و بدەی لە ملیان ، پاشان ئێمە لەگەڵتا بین دژی ئەوانەیان کە ماون هەتا ریشەکەنیان بکەین ، ئەویش ( واتە پێغەمبەری خوا ﷺ ) رەزامەندیی بۆ ئەوە نواندووە.

پاشان بە شێوەی ئامۆژگاریی نوعەیم بە فەرماندەکانی قورەیشی وت : ئەگەر جوولەکە ناردیان بۆ لاتان و داوای چەند پیاوێکیان بە بارمتە لێتان کرد ، تاقە پیاوێکیان نەدەنێ .

دوای ئەوەی نوعەیم دڵ و مێشکی سەرداره قورەیشی‌یەکانی لە گومان و دوودڵیی دەرهەق بە جوولەکە پڕ کرد ، خێرا هەستا و خۆی گەیانـدە لای غـەطـەفـانی خـزم و کەسی . لە ناو سەربازگەی گەورەی غەطەفان‌دا داوای کۆبوونەوەیەکی نهێنیی لەگەڵ سـەردار و فەرمانـدەکانیانا ( عویەینـەی کـوڕی حیصـن و ، طـولەیــحەی کـوڕی خوەیلیدی ئەسەدیی و ، حاریثی کوڕی عەوفی موڕڕیی ) کرد..

کە لەلای کۆبوونەوە پێی وتن :

ئەی کۆمەڵی غەطـەفان ! ئێوە بنەڕەت و عەشیرەتم و ، خۆشەویست‌ترین کەسمن و، بڕوا ناکەم بە تاوان‌بارم بزانن .

وتیان : ڕاست ئەکەیت و ، بە لامانەوە هیچ تاوان‌باری‌یەکت نیە .

ئـەویش ئاگـاداری کـردن کـە هـەواڵێکی گرنگـی بەلاوەیـە و پەیوەندییشـی بـە سەلامەتیی ئەوانەوە هەیە . جا پێی وتن : ئەم هەواڵەم بپارێزن و بـڵاوی مەکەنـەوە.

وتیان : باشە .

چیی بـە قـوڕەیش وت و ، چـۆن ئاگـاداری کـردن کـە وریـا بـن و بـە جوولەکـە نەخەڵەتێن، بەوانیشی گەیاند و ئاگـاداری کـردن کـە نەکـەن بارمتـە بدەنـە دەسـت جوولەکەی ناپاك..

زۆر سوپاسی نوعەیم‌یان کرد لەسـەر ئـەو کـارەی و ، جەختیشـیان لەسـەر ئـەوە کردەوە کە خەمی نەبێ تاقە پیاوێکیان بە بارمتە نادەنە دەست نەوەی قورەیظە.

بەم شێوەیە نوعەیم لە یەکەم ڕۆژی موسڵمانبوونیا ، بە ژیریی و سەلیقەی خـۆی، توانیی داوێك بۆ ئەو سوپا مل‌هـوڕە بنێتـەوە کـە ببێتـە مایـەی تێـك چـوونیان و، سەرەنجام پاشەکشەیان لە دەوری مەدینە .

لە ڕاستیی‌دا فەرماندایەتیی قوڕەیش و غەطەفان بایەخی تـەواویان بـەو دەنـگ و باسەی نوعەیی کوڕی مەسعوود دا ، چونکە لەوە بێ‌گومان بوون کە دۆسـتیانە و بـۆ بەرژەوەندیی ئەوان ئەم قسەیەی کردووە . لە هەمان کات‌دا یەکجار پێی بـێ تاقـەت بوون.. ئەو شەوە هـەردوولا بـە داخ و خەفـەتێکی زۆرەوە سـەریان نایـەوە و ، ڕق و قینێکی زۆریشیان لە نەوەی قورەیظە هەڵ گرت .

دوای ئەوەی کە سەرکردایەتیی قوڕەیش و غەطەفان بە تەواوەتیی قەناعەتیان بـەو پیلانە کرد ، هـەر ئـەو ئێوارەیـە کـە ڕۆژی جومعـە بـوو بڕیاریـان دا کـە کۆمەڵـە

پیاوێکیان لە سەرۆك و فەرماندەکانیان بە نوێنەریی بنێرنە لای نەوەی قورەیظە تا لەوێ جەخت لەسەر راستیی ئەو هەواڵەی نوعەیم بکەنەوە .

جا بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لە راستیی هەواڵەکە ئاگادار بن ؛ بەو نوێنەرانەیان وت کە داوا لە جوولەکە بکەن تا خۆیان ئامادە بکەن تا رۆژی شەممە، واتە سبەینێ ، بە هەموویانەوە هێرش بکەنە سەر موسڵمانەکان .. ئەوەبوو هەر ئەو شەوە ، بە نهێنیی و لە تاریکیی‌دا نوێنەرەکان گەیشتنە مەنزڵگای نەوەی قورەیظە ، کە کەوتبوونە ئەودیوی سوپای موسڵمانەکانەوە .

کە گەیشتن هەستیان بە سارد و سڕیی سەرۆکە جوولەکەکان کرد ؛ بەڵام هەرچۆن بوو نوێنەرەکان بە نەوەی قورەیظەیان گەیاند کە فەرماندایەتیی هاوبەشی سوپای ئەحزاب ئەیەوێ هێرشێکی ناخلۆفیی بکاتە سەر موسڵمانەکان ، وەك لە بناغەدا لەسەری رێك کەوتوون و داوا لەوانیش ئەکرێ کە ئامادە بن . ئەوەبوو وتیان : ئەی نەوەی قورەیظە ! ئێمە نین لە شوێنی خۆماندا .. ئەوەتا چ وشتر و چ ئەسپمان هەموویان تیاچوون . ئێوەش خۆتان ئامادە بکەن هەتا بچین بە گژ موحەممەددا و ناکۆکیی نێوانمان ببڕینەوە .

سەرۆکە جوولەکەکان نەیانویست راستەوخۆ بە رووی نوێنەرەکانی ئەحزاب‌دا هەڵ چن، بەوەی کە دەری ببڕن ئەوان ئامادە نین جەنگ بکەن هەتا بارمتەیان لەلا دانەنێن، بەڵکو هەنگاو بە هەنگاو بۆی چوون .

کە ئەحزاب داوای بەشداریی جەنگیان کرد ، جوولەکە ئەوەیان کردە بیانوو کە سبەینێ شەممەیە و ، ئەوانیش بە پێی ئامۆژگاریی دینەکەیان لە شەممەدا هیچ شتێك، بایەخی هەبێ یا نەیبێ ، ئەنجام نادەن ، بۆیە ناتوانن لەو رۆژەدا جەنگ بکەن.

دوای ئەوە بەرە بەرە هاتنە سەر باسە سەرەکی‌یەکە ، کە ئەوان ترسیان لە دڵدایە سوپای ئەحزاب تا سەر لەسەر جەنگ بەردەوام نەبن و ، بەبێ ئەوەی موسڵمانەکان ریشەکەن بکەن بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان و ، نەوەی قورەیظە بە تەنیا لەبەردەم سوپای موسڵمانەکان‌دا بەجێ بهێڵن . ئەوەبوو راستەوخۆ بە نوێنەرەکانی ئەحزابیان وت : لەگەڵ ئەوەش‌دا ئێمە جەنگتان لەگەڵ ناکەین دژی موحەممەد هەتا چەند پیاوێکتان بە بارمتە لەلامان دانەنێن ، تا دڵمان متمانە بکات بۆ ئەوەی موحەممەد بدەین بە زەوییدا ، چونکە ئێمە ئەترسین کە ئەگەر جەنگ ناڕەحەتی کردن و کوشتار

نارەحەت بوو بۆتان ، پشتمان تێ بکەن و بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆتان و ئێمە و کابرا لەم وڵاتەماندا بەجێ بهێڵن و ، ئەو کاتە ئێمەش چاری ئەو ناکەین.

کاتێك کە نوێنەرانی ئەحزاب ئەمەیان لە دەم سەرۆکە جوولەکەکان بیست ، بەبێ وەڵام دانەوە و مشت و مڕ گەڕانەوە بۆ بنکەی فەرماندایەتیی گشتیی و ، وەڵامی قورەیظەیان بۆ باس کردن . بەمە هیچ گومانێك لە دڵی قورەیش و غەطەفان دا دەرهەق بە نوعەیمی کوڕی مەسعوود نەما و ، بڕوایان کرد کە ئەو جوولەکانە نیازی خراپیان کردووە و ، راستە ئەو بارمتانەیان بۆ ئەوە ئەوێن کە بیان دەنە دەست پێغەمبەری خوا ﷺ تا ئەویش تۆڵەی خۆی بە کوشتنی ئەوانە بکاتەوە ، تا بەم کارە لە جوولەکەش خۆش ببێ دەرهەق بە پەیمان شکاندنیان .

فەرماندەکانی ئەحزاب هەموو بە یەك دەنگ بە یەکتری‌یان وت : بەخوا ئەوەی کە نوعەیمی کوڕی مەسعوود بۆی باس کردن راست بوو . بەمە هەموویان هاتنە سەر ئەو رایە کە جوولەکە ناپاکی‌یان کردووە و ، بێ‌گومان ئەگەر بارمتەیان بدەنێ تەسلیمیان ئەکەن .

هەر هەموو خۆیان ئەخواردەوە بۆ ناپاکیی جوولەکە ، بۆیە بە پەلە کۆمەڵێکی تر پیاویان رەوانەی لای جوولەکە کرد ، تا پێ‌یان رابگەیەنن کە بارمتە لەلایان دانانێن و، داوای ئەوەش ئەکەن کە بە پێی رێك‌کەوتنی هەردوولا پێکەوە هێرش بکەنە سەر موسڵمانەکان.

بۆ جاری دووهەم نوێنەری ئەحزاب خۆیان گەیاندە مەنزڵی قورەیظە و ، بە ناوی فەرماندایەتیی ئەحزابەوە پێ‌یان راگەیاندن کە تاقە پیاوێك بە شێوەی بارمتە بە دەستەوە نادەن ، چونکە ئەمە بێ‌متمانەیی‌یە بە فەرماندایەتیی ئەحزاب . جا ئەگەر جەنگیان ئەوێ با دەرچن و بەشداریی جەنگ بکەن .

کە گەورە جوولەکەکان ئەم وەڵامەیان لە فەرماندەی ئەحزابەوە وەرگرت ، هیچ گومانێکیان بەلاوە نەما کە نوعەیمی کوڕی مەسعوود راستی کردووە دەربارەی قورەیش و غەطەفان . ئەوەبوو بە یەکتری‌یان ئەوت :

ئەوەی کە نوعەیمی کوڕی مەسعوود بۆی باس کردن راست بوو . ئەو خەڵکە ئەیانەوێ ئێوە جەنگ بکەن . جا ئەگەر هەلیان دەست کەوت ئەوا ئەی‌قۆزنەوە و ، ئەگەر وایش نەبوو ، ئەوا پشت هەڵ ئەکەن و ئەگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان و دەست بەرداری ئێوە ئەبن لەبەردەم کابرادا ..

دوای ئەم بۆچوونە قورەیظەش نێرراویان نارد بۆ لای سەرکردایەتیی ئەحزاب و پێ یان راگەیاندن کە جوولەکە بە هیچ شێوەیەك بەشداریی جەنگی دژی موسڵمانەکان ناکەن هەتا بارمتەیان لەلا دانەنرێت ، بۆ ئەوەی دڵیان پڕ لە متمانە بێ کە بە تەنیا بەجێیان ناهێڵن .

دیارە فەرماندایەتیی ئەحزاب بۆ جارێکی تر داواکاریی جوولەکەیان دایە دواوە کە بارمتە دانانێن .

سەرۆکی فیتنە ، گەورە جوولەکەی نەوەی نەضیر ، حویەیی کوڕی ئەخطەب ، کە لە بنەڕەتدا ئاگرەکە ئەو هەڵی گیرساند ، ئەم عەرەبانەی بۆ ئەوە کۆ کردەوە موسڵمانان ریشەکەن بکەن . کە سەرنجی بارودۆخەکەی دا ، ئەبینێ وا خەریکە رێسەکەی ئەبێتەوە بە خوریی ، بۆیە هەوڵی دا نەهێڵێ بەینیان لەگەڵ نەوەی قورەیظەدا تێك بچێ . ئەوەبوو چوو بۆ لای نەوەی قورەیظە و هەوڵی لەگەڵدا دان هەتا قەناعەتیان پێ بکا بۆ هێرش‌کردنە سەر موسڵمانەکان ، بەڵام بێ‌سوود بوو ، چونکە جوولەکە لەسەر بیانووی خۆیان سوور بوون کە ئەبێ حەفتا پیاوی بارمتە بدرێنە دەستیان تا لە خۆیان بێ‌خەم بن .

بەم شێوەیە فێڵەکەی نوعەیمی کوڕی مەسعوود سەری گرت و ، ناکۆکیی کەوتە نێوان جوولەکەی قورەیظە و ئەحزابەوە و ، ئەمەش ئاسوودەیی‌یەك بوو بۆ موسڵمانەکان..

ئیمام بەیهەقیی لە کتێبی ( الدلائل ) دا ئەوەی گێڕاوەتەوە کە کاتێ نێوان جوولەکە و ئەحزاب تێك چوو و ، بارمتەیان نەدایە دەست جوولەکە ، نەوەی قورەیظە پەیوەندی‌یان بە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد تا لەگەڵیا رێك بکەون بەو مەرجەی ئەویش رێگا بدا برا جوولەکەکانی نەوەی نەضیریان بگەڕێنەوە بۆ مەدینە ، کەچیی ئەم داواکاری‌یە لەلایەن پێغەمبەری خواوە درایە دواوە .

هەرچۆنێك بوو نێوان ئەحزاب و نەوەی قورەیظە تێك چوو و ، هەریەکەیان ئەوی تری تاوانبار ئەکرد کە بۆتە مایەی سەرنەکەوتنی ئەم هەڵمەتە ، ئەویش بە تێك دانی پەیمانی نێوانیان .

**بیستەم : کشانەوەی ئەحزاب**

کە نێوان یەهوود و ئەحزاب بە تەواویی تێك چوو ، فەرمانداەی گشتیی و هاوبەشی ئەحزاب هاتنە سەر ئەو رایە کە ئابلۆقەی سەر مەدینە هەڵ بگرن و ، هەر یەکە

سوپای خۆی بگێڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی و ، جوولەکەش لەو ناوەدا ، وەك سەبەتەی بەن براو ، لەبەردەم موسڵمانەکاندا بەجێ بهێڵن تا بە چارەی رەشی خۆیان بگەن ، بە تایبەتیی کە جەنگاوەرانی ئەحزاب نزیکەی مانگێك ئەبوو کە هاتبوونە سەر مەدینە و ، لە شوێنی خۆیاندا دایان کوتا بوو ، بێئەوەی بتوانن دەستێك لە موسڵمانەکان بوەشێنن و ، هەڵمەتێکیان بەرنە سەر . چونکە جەنگاوەرانی قورەیش و غەطەفان رانەهاتبوون ئاوەها بەبێ کار و چالاکیی لە شوێنێکدا بمێننەوە ، بەڵکو ئەوان لەگەڵ هەڵمەت و راکردندا راهاتبوون کە دەست بوەشێنن و تاڵانیان دەست بکەوێ .

لەولاشەوە خوای گەورە وەك نوعەیمی نارد تێکیان بدات ، رەشەبایەکی سەختیشی بۆیان نارد کە ئەوەندە بەهێز بوو چادری هەڵ ئەکێشا و ، بینای ئەڕووخاند و ، قابلەمەی بەسەر ئاگرەوە قلپ ئەکردەوە و ، نەیئەهێشت ئاگر بگرێ.

ئەم بارودۆخە بە یەکجاریی سوپای ئەحزابی ناڕەحەت کرد ، بە رادەیەك کە ئەبوسوفیانی فەرماندی گشتیی ، دوای راوێژکردن لەگەڵ فەرماندەکانی تردا ، ناچار بوو بێتە سەر ئەو بڕیارە کە فەرمان بۆ سوپاکانی ئەحزاب دەر بکات تا لە دەوری مەدینە بکشێنەوە و ، هەریەکە بگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی . ئەمەش دوای ئەوەی کە هۆی ئەم وازهێنانەی بۆیان باس کرد ، بەتایبەتیی ئەوە کە بڕوایان وەها بوو کە جوولەکە لەگەڵ موسڵمانەکان رێك کەوتبن و ، ناپاکییان لەگەڵ ئەماندا کردبێ.

جا لەبەر ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە تەما هەبوو سوپای ئەحزاب ، دوای تێك چوونیان لەگەڵ ئەوەی قورەیظەدا ، لە دەوری مەدینە بکشێنەوە ، فەرمانی بەسەر یەکێ لە پیاوە دڵسۆزە زیرەکەکانیدا دا کە بچێت بۆ ناو سەربازخانەی ئەحزاب و ، خۆی وا لێ بکا کە هیچ کەس نەیناسێت و ، خۆی لەوێ بە وردیی دەنگوباس وەربگرێ و بیهێنێتەوە بۆی . ئەمەش لە دوا شەودا کە سەختترین و تاریکترین و ساردترین شەوی خەندەق بوو، کە مەگەر ئەو کارە لە هاوەڵان هاتبێ و بەس.

ئەو پیاوەی کە هەڵی بژارد حوذەیفەی کوڕی یەمان بوو ..

حاکم و بەیهەقیی لە ریوایەتی عیکریمەی کوڕی عەممارەوە ئەگێڕنەوە کە وتوویە: حوذەیفەی کوڕی یەمان باسی ئەو رووداوانەی ئەگێڕایەوە کە لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بووبوون . هاوکۆڕەکانی پێیان وت : بەخوا ئەگەر ئێمە لەوێ ئامادە ئەبووین، ئەوا وەها و وەهامان ئەکرد ..

حوذەیفەش وتی : ئاواتی بۆ مەخوازن .. پاشان وتی: شەوی ئەحزاب بە دانیشتنانەوە ریز بوو بووین و ، ئەبوسوفیان لە ژوورمانەوە ، جوولەکەی قورەیظەش لە خوارمانەوە بوون ئەترساین هێرش بکەنە سەر ماڵ و منداڵمان.

شەوێکی تری وەها یەکجار تاریك و ، رەشەبای بەهێزمان نەدیوە ، کە دەنگی رەشەباکەی وەك هەورە تریشقە وەهابوو و ، ئەوەندەش تاریك بوو کەسمان پەنجەی خۆی نەئەبینیی . ئەوەبوو مونافیقەکان ماوەیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەخواست و ئەیان وت : ماڵەکانمان چۆڵن و وەهاش نەبوو.

هەرکەس داوای رۆیشتنەوەی ئەکرد ماوەی ئەدا و ئەوانیش ئەرۆیشتن . ئێمەش نزیکەی سێ صەد کەس مابووینەوە ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ پیاو بە پیاو گەڕا بەسەرمان دا هەتا گەیشتە لای من کە بۆ خۆ پاراستن لە دوژمن و لە سەرما تەنها کۆڵەوانەیەکی ژنەکەمم بەلاوە بوو کە تا ئەژنۆم ئەگەیشت .

حوذەیفە ئەڵێ : پێغەمبەری خوا ﷺ لێم نزیك کەوتەوە و ، منیش هەر دوو ئەژنۆم لەسەر زەویی دانا بوو و فەرمووی : (( من هذا ؟ حذيفة ؟ )) . فەرمووی : ئەمە کێ‌یە ؟ حوذەیفەیە ؟

وتم : حوذەیفە . خۆم نووساند بە زەوی‌یەکەوە و ، وتم : بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، پێیشم خۆش نەبوو هەستم ، بەڵام هەستام .

فەرمووی : دوژمن هەواڵێکی لێ رووداوە ، ئەو هەواڵەم بۆ بێنە .

لە ریوایەتەکەی ئیبن ئیسحاق‌دا ، کە لە موحەممەدی کوڕی کەعبی قەرەظیی وەرگرتووە وتوویە : پیاوێکی خەڵکی کووفە بە حوذەیفەی کوڕی یەمانی وت : ئەی باوکی عەبدوڵلا ! ئێستە ئێوە پێغەمبەری خواتان ﷺ دیوە و هاوەڵێتییشتان کردووە؟

وتی : بەڵێ ، کوڕی برام .

وتی : دەی چۆنتان ئەکرد ؟

وتی : هەرچییمان لە تواناداا بوایە .

پیاوەکە ( کە تابیعیی بوو و پێغەمبەری نەدیی بوو ) وتی : بەخوا ئەگەر ئێمە لەگەڵیا ئەبووین نەمان ئەهێشت بەسەر زەویی‌دا بە پێ بڕوا ، بەسەر شان هەڵمان ئەگرت ..

حوذەیفە وتی : کوڕی برام ! لە خەندەق‌دا لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین کە پێغەمبەری خوا بەشێکی شەو شەونوێژیی کرد و ، پاشان ئاوڕی دایەوە بۆ لامان و فەرمووی : (( من ينظر لنا ما فعل القوم ثم يرجع )) . فەرمووی : کێ ئەچێ بزانێ

دوژمن چی‌یان کردووە و پاشان بگەڕێتەوە . مەرجی ئەوەشی دانا کە بگەڕێتەوە .
پاشان فەرمووی : (( أسأل الله أن يكون رفيقي في الجنة )) . فەرمووی : لەسەر ئەوە داوا لە خوا ئەکەم کە لە بەهەشتدا هاوڕێم بێ .

حوذەیفە وتی : لەبەر ترسی زۆر و برسێتیی و سەرمای زۆر پیاوێکمان هەڵ نەسا . جا کە هیچ کەس هەڵ نەسا ، منی بانگ کرد . منیش چارم نەبوو کە بانگی کردم هەستام .

فەرمووی : (( يا حذيفة ! إذهب فادخل في القوم فانظر ولا تُحدِثَنَّ شيئاً حتى تأتينا ... )) . فەرمووی : ئەی حوذەیفە ! بڕۆ خۆت بکە بەناو سوپای دوژمندا و سەیر بکە و هەواڵ بزانە ، بەڵام هەتا دێیتەوە لامان هیچ نەکەیت .

حوذەیفەش هەستا و ، لەگەڵ ئەوەدا ترس و سەرما و برسێتیی و تاریکیی تەنگیان پێ هەڵ چنی بوو فەرمانی پێغەمبەری خوای ﷺ بەجێ هێنا .

حوذەیفە ئەڵێت : ڕۆیشتم ( واتە لە خەندەق کردمە ئەوبەر ) و خۆم کرد بەناو دوژمندا ، دیتم ڕەشەبا و سەربازەکانی خوا چی‌یان پێ ئەکردن کە نە قابلەمە و نە بینایان ڕاگیر نەئەبوون .

ئەبوسوفیان پیاوێکی ژیر و دنیادیدە بوو ، ترسی ئەوەی لە دڵدا بوو کە یەکێ بۆ سیخوڕیی خۆی بە ناو سوپادا کردبێ ، بۆیە لە ناو سوپاکەیدا هەستا و ، بەر لەوەی بیەوێ وتار بدات ، وتی :

ئەی کۆمەڵی قوڕەیش ، هەر یەکە لە ئێوە با سەرنج بگرێ بزانێ کێ لە تەنیشتیا دانیشتووە ..

حوذەیفەش چۆتە ناویان و ئەگەر دوو قوڕەیشی‌یەکەی ئەمدیو و ئەودیوی پرسیاری لێ بکەن ئاشکرا ئەبێ و ئەی‌گرن . خێرا زیرەکانە هەوڵی دا لەو قەیرانە خۆی رزگار بکا .. نەوەستا بە دیار دوو سەربازەکەی تەنیشتیەوە تا بڵێن تۆ کێی، ئەم خێرا پرسیاری لە هەردوولای خۆی کرد و وتی : تۆ کێی ، ئەویش وەڵامی دایەوە فلانی کوڕی فلان ، بەم شێوە هەردووکیانی پەشۆکاند و ئەوان نەیان‌پرسیی ئەی تۆ کێی . بەمە خۆی دەرباز کرد ، کە خەریك بوو پێیی بزانن و بی‌گرن ..

لە ریوایەتێکی تردا وەها هاتووە کە حوذەیفە وتوویە : گوێم لە ئەبوسوفیان بوو ئەی‌وت : ئەی کۆمەڵی قوڕەیش ! با هەر یەکە لە ئێوە بزانێ کێ لە تەنیشتیا دانیشتووە و ، ئاگاداری سیخوڕ و جاسووس بن . منیش دەستی ئەوەم گرت کە لەلای

ڕاستمەوە دانیشتبوو و، وتم : تۆ کێیت ؟ وتی : موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیانم . دەستی ئەوەشم گرت کە لەلای چەپمەوە بوو و ، وتم : تۆ کێیت ؟ وتی : عەمری کوڕی عاصم . ئەمەشم لە ترسی ئەوە کرد نەوەکو پێم بزانن .

حوذەیفە ئەڵێ : ( پاشان ) ئەبوسوفیان وتی : ئەی کۆمەڵی قوڕەیش ! بەخوا ئێوە نین لە شوێنی خۆتانا .. وا هەرچیی وڵاغمان هەیە تیاچوو و ، نەوەی قورەیظەش بەڵێنیان نەبردە سەر و ، ئەوەی کە پێمان ناخۆش بێ لەوانەوە پێمان گەیشت و، ئەش بینن کە ڕەشەبا چیی پێ کردووین کە نە قابلەمەمان بۆ ئەوەستێ و ، نە ئاگرمان بۆ ئەگرێ و ، نە چادرمان بۆ ڕاگیر ئەکرێ . جا کۆچ بکەن و وا من کۆچم کرد .. پاشان هەستا بۆ لای وشترەکەی کە بەسترابوویەوە ، لەسەری دانیشت و پاشان لێی دا و ئەویش هەستایەوە ..

هەتا حوذەیفە باس ئەکات کە بە ئاسانیی ئەیتوانیی ئەبوسوفیانی فەرماندەی گشتیی بکوژێ ، ئەگەر لەبەر فەرمانەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ نەبوایە کە فەرمانی دا هەتا ئەگەڕێتەوە هیچ دەستێك نەوەشێنێ . هەتا هەوڵیشی داوە بیکوژێ .

ئەوەتا خۆی بۆمان ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : کەوتمە ڕێ هەتا نزیکی سەربازگەی دوژمن بوومەوە ئەبینم وا ڕووناکیی ئاگرێکیان دیارە و ، پیاوێکی ڕەشی زلەیان بەسەر ئاگرەکەوە وەستاوە و دەست بە کەللەکەیا ئەهێنێ و ئەڵێ : ( الرحيل .. الرحيل ) داوای بارکردن ئەکات . منیش لەوەوبەر ئەبوسوفیانم نەدیبوو ، تیرێکی پەڕ سپییم لە تیردانەکەم دەرهێنا و، ویستم بیخەمە ناو کەوانەکەوە و لەبەر ڕۆشنایی ئاگرەکە بیتەقێنم ، خێرا فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوام ﷺ هاتەوە یاد : (( لا تحدثن شيئاً حتى تأتيني )) ، ئیتر دەستم گرتەوە و تیرەکەم خستەوە ناو تیردانەکەم .

حوذەیفە خوا لێی ڕازیی بێ ئەڵێ : پاشان غیرەتم نایە بەرخۆم و چوومە ناو سەربازگەکەوە ، ئەبینم نزیکترین کەس لێمەوە نەوەی عامیرن ، ئەڵێن : بار بکەن.. بار بکەن دانیشتنتان بۆ نەماوە .. ڕەشەباش سەربازگەکەی بەگیر هێنا بوو.. دە بەخوا گوێم لە دەنگی بەرد بوو لەناو بار و پێخەفەکانیاندا ڕەشەبا لێی ئەدان. ئەڵێ: گوێیشم لە غەطەفان بوو وەك قوڕەیش خۆیان ئەپێچایەوە و گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان.

حوذەیفە لەسەر باسەکەی ئەڕوا و ئەڵێ : پاشان گەڕامەوە ، هەروەك بە ناو حەمامدا بەڕێوە بچم ( لەبەر گەرما ) . هاتمەوە بۆ لای پێغەمبەری ﷺ خوا ، کە گەیشتمە نیوەی ڕێ ، ئەبینم نزیکەی بیست سوار دەم و چاویان هەڵ بەستووە و وتیان : هاوەڵەکەت ئاگادار بکە کە خوا سەرفرازی کرد !

گەڕامەوە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ، ئەبینم قوماشێکی لـە خـۆی پێچـاوە و نوێژ ئەکات .. دە بەخوا هەر ئەوە بوو گەڕامەوە دوا ، ئیتر سەرماکەم بۆ هاتەوە و ، لە سەرمان دا هەڵ ئەلەرزیم . پێغەمبەری خوا ﷺ هەر خـەریکی نوێـژ بـوو و ، بـە دەستی ئاماژەی بۆ کردم ، منیش نزیك کەوتمەوە ، قوماشەکەی دا بەسەر منیش دا.. هەرکاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ ناڕەحەتی‌یەکی ببوایە دەستی بە نوێژ ئەکرد . هـەواڵم دایە کە من ئەحزابم بەجێ هێشتن باریان ئەکرد ..

سوپای کوفر هەر ماندووبـوون و ، مونافیقـانیش سەرشـۆڕیی‌یـان بـۆ مایـەوە ، موسـڵمانە بەغیرەتـە دڵسـۆزەکانیش ، بـە سـەری بـەرزەوە ، ڕۆژانـی سـەخت و ناهەمواریان تەواو کردن .. سوپای ئەحزاب دەستیان دایە هەڵگرتنی ئابلووقە لەسـەر مەدینە و ، کەتیبە لە دوای کەتیبە بە سەری شۆڕەوە کلکیان ئەخستە ناو گەڵیان و ، بەرەو وڵاتی خۆیان ، بەبێ هیچ قازانجێك ئەگەڕانەوە .

بەڵام ئەبوسوفیان چونکە شارەزای جەنگ بوو بڕیـاری دا بـە حەکیمانـە بکشـێنە دواوە . بۆ ئەمە فەرمانی بۆ فەرماندەی ئەسپسوارانی سـوپای قـوڕەیش ، خالیـدی کوڕی وەلید و عـەمری کوڕی عاصی یارمەتی‌دەری دەرکرد کە دواى سـوپای ئـەحزاب بگرن نەوەکو موسڵمانەکان لە دواوە لێی بدەن .

ئەوەبوو خالید و عەمر دووصەد ئەسپسـواریان هـەڵ بژارد و لـە نێـوان سـوپای ئەحزاب و سوپای موسڵمانەکان‌دا وەستان ، هەتا کەتیبـە کەتیبـە سـوپای مـل‌هـوڕ کشایە دواوە .

ئەبوسوفیان پێش ئەوەی بکشێتەوە نامەیەکی بۆ پێغەمبـەری خـوا نووسـیی کـە تیایا سوێندی بە بتەکانی قوڕەیش خوارد بوو بـۆ ئـەوە هـاتبوون کـە موسـڵمانەکان ریشەکەن بکەن ، بەڵام بە خەندەق هەڵکەندن خۆیان دەرباز کـرد . پێغەمبـەریش ﷺ وەڵامی نامەکەی بەم شێوەیە دایەوە :

(( بسم الله الرحمن الرحيم . من محمد رسول الله إلى أبي سفيان بـن حـرب ، أمـا بعد ، فقد أتاني كتابك ، وقديماً غرك ـ يا أحمق بني غالب وسفيههم ـ بـالله الغـرور، وسيحول الله بينك وبين ما تريد ويجعل الله لنا العاقبة ، وأما مـا ذكـرت أنـك سـرت إلينا في جمعكم وأنك لا تريد أن تعود حتى تستأصـلنا ، فـذلك أمـر الله يحولِ بينـك وبينه ويجعل لنا العاقبة وليأتين عليك يـوم أكسـر فيـه الـلات والعـزى وأسـافاً ونائلـة

وهُبَل حتى أذكرك بذلك ـ يا سفيه بني غالب ـ وأما قولك : ( من علمك ) ، الذي صنعنا من الخندق فإن الله تعالى ألهمني ذلك لما أراد من غيظك به وغيظ أصحابك )).
جا كە سوپای ئەحزاب لە چاو ون بوون ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا موسڵمانەكان شوێنەكانیان چۆڵ بكەن و بگەڕێنەوە بۆ مەدینە .
لە كاتی چۆڵ كردندا پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی ئاگادار كرد كە جارێكی تر دوژمنان ناتوانن ئاوەها سوپا بخەنە ڕێ و بێنە سەر مەدینە ، بەڵكو موسڵمانەكان هێرش ئەبەن كە فەرموویە : (( لا يغزونكم بعدها أبداً ولكن أنتم تغزونهم )) .
پێغەمبەر و موسڵمانەكان بە سەری بەرزەوە گەڕانەوە و لە ڕێگادا خەریكی تەكبیر بوون و ئەیان وت : (( لا إله إلا الله وحده لا شريك له ، له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير .. آيبون تائبون ، عابدون ساجدون ، لربنا حامدون .. لا إله إلا الله وحده ، صدق وعده ، ونصر عبده ، وهزم الأحزاب وحده ، فلا شيء بعده )) .
لە ڕاستییدا جەنگی ئەحزاب مەترسییدارترین هێرش بوو كە كرایە سەر ئیسلام و موسڵمانان بە درێژایی مێژوو ، چونكە لە هیچ هێرشێكدا ئەو زیانە لە موسڵمانان نەئەكەوت وەك ئەو زیانەی كە لە موسڵمانان ئەكەوت كە ئەگەر ئەو هەڵمەتەی سوپای ئەحزاب سەری بگرتایە . چونكە ئەو كاتە ئیسلام ئەڕووخا و موسڵمانەكانیش تاقیان ئەبڕایەوە .

**بیست و یەكەم : كوژراوی هەردوو لا**

جا هەرچەندە ئەم غەزایە گەورەترین غەزا بوو كە موسڵمانەكان تیایا تووشی ترس و دڵەڕاوكە و ماندووبوون بوون ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا كوژراوی هەردوولا زۆر كەم بوون.
لەم غەزایەدا موسڵمانەكان هەشت شەهیدیان دا ، كە هەر هەموویان لە ئەنصار بوون ، كە ئەمانەن :
( أ ) لە نەوەی عەبدولئەشهەلی ئەوسیی سێ پیاو :
( ١ ) سەردار و فەرمانده‌ی ئەوس سەعدی كوڕی موعاذ كە لە كاتی هێرشدا تیرێكی بەركەوت و ، دوای تیاچوونی نەوەی قورەیظە بە شەهیدیی سەری نایەوە .
( ٢ ) ئەنەسی كوڕی ئەوسی كوڕی عەتیك .[40]

[40] ئەنەسی كوڕی ئەوسی كوڕی عەتیكی كوڕی عەمری ئەنصاریی ئەوسیی ، بەشداریی بەدری نەكردووە ، بەڵام ئامادەی ئوحود بووە . مووسای كوڕی عوقبە وتوویە : ڕۆژی خەندەق خالید تیرێكی تێ گرتووە و شەهیدی كردووە .

( ٣ ) عەبدوڵڵای کوڕی سەهل .[٤١]

( ب ) لە نەوەی جەشم کە خەزرەجیی بوون دوو پیاو :

( ١ ) طوفەیلی کوڕی نوعمان ، کە وەحشیی بە حەربە ـ کە لەوبەری خەندەقەوە وەشاندی ـ کوشتی .

( ٢ ) ثەعلەبەی کوڕی غونمە .[٤٢]

( ج ) لە نەوەی نەججار کە تیرەیەکی خەزرەجن یەك پیاو :

( ١ ) کەعبی کوڕی زەید .[٤٣]

ئەم شەش شەهیدە ئیبن ئیسحاق ناوی بردوون ، بەڵام دوو شەهیدی تریش هەن، وەك لە پێشەوە باسمان کرد ، کە ناویان سولەیط و سوفیانی کوڕی عەوفە . ئەم دوانە بۆ هەواڵزانین ، لە مەدینە، بە فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بوون . ئەوەبوو سوپای ئەحزاب گرتنی و شەهیدی کردن . بەڵام لە کتێبە مێژووییەکاندا دەرنەکەوتوون کە ئایا ئەنصارن یان موهاجیر ، بەڵام وا دەرئەکەوێ ئەنصار بن ، چونکە ئەوان شارەزای ناوچەی دەوروبەری مەدینەن ، نەك ئەوانەی کە لە مەککەوە کۆچیان کردبوو ..

سەرەڕای ئەم هەشت شەهیدە کۆمەڵێکی تر موسڵمان لە خەندەقدا شەهید بوون و زامدار بوون بێئەوەی ژمارەیان دیار بێ .

---

[٤١] عەبدوڵڵای کوڕی سەهلی کوڕی زەیدی کوڕی عامیری ئەنصاریی ئەوسیی ، کە برای رافیعی کوڕی سەهل بووە، ئەم دوو برایە لە ئوحوددا هەردووکیان زامدار بوو بوون و ، بۆ سبەینێش هەردووکیان بەرەو ( حمراء الأسد ) کەوتنە ڕێ و ، لە ڕێگادا وڵاغیان پێ نەبوو . ناچار یەکێکیان کە زامەکانی ئاسانتر بوون براکەی تری بە کۆڵ هەڵ ئەگرت چونکە زامەکانی ئەو سەخت بوون . عەبدوڵڵا بەشداریی بەدریشی کردووە .

[٤٢] ثەعلەبەی کوڕی غونمەی کوڕی عەدیی کوڕی سینانی کوڕی نابیئی ئەنصاریی خەزرەجیی ، یەکێکە لەو بەڕێزانەی کە بەشداریی پەیمانی عەقەبەیان کردووە . گەنجێکی تازە پێگەیشتوو بوو کە موسڵمان بوو . لەگەڵ موعاذی کوڕی جەبەل و عەبدوڵڵای کوڕی ئونەیس هەڵمەتیان ئەدایە بتەکانی نەوەی سەلیمە لە مەدینە و ئەیان شکاندن . بەشداریی بەدر و ئوحودی کردووە و ، بە دەستی هویەیرەی کوڕی ئەبووەهبی مەخزوومیی قورەیشیی لە خەندەقدا شەهید بوو .

[٤٣] کەعبی کوڕی زەید ، زوو بە زوو موسڵمان بووە و بەشداریی بەدریشی کردووە ، یەکێکە لەو حەفتا قورئان خوێنەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئامانەت ناردنی بۆ ناوچەی نەجد کەچیی لە ( بئر معونة ) ناپاکییان لەگەڵ کرا و، تەنها ئەم دەرچوو و لەگەڵ عەمری کوڕی ئومەییە گەڕایەوە مەدینە . ئیبن ئیسحاق وتوویە : تیری وێڵ لێی داوە و نەزانراوە لە کوێوە هاتووە . بەڵام واقیدیی ئەڵێ : ضیراری کوڕی خەططابی فیهریی کوشتوویە .

شەوێکیان دوو دەوریە لە سوپای ئیسلام بۆ پاسەوانیی لە خەندەق دەرچوون ، کە شەو بە یەك گەیشتن یەکتریان نەئەناسیی و ، هەریەکەیان بە دەوریەی دوژمنی زانیی، بۆیە دەستیان لە یەك وەشاند و هەندێ زامدار و کوژراو کەوتە بەینیان ، تا ئەوەبوو دروشمی ئیسلامیان بە یەکتر وت کە (( حم لا ینصرون )) بوو و ، دەستیان گرتەوە . کە هەواڵەکە گەیشتە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( جراحكم في سبيل الله ومن قتل منكم فإنه شهيد )) . فەرمووی : زامەکانتان لە پێناوی خوادا و ، هەر کەسیشتان لێ کوژراوە شەهیدە . ئەمانە لە هیچ سەرچاوەیەكدا ناویان نەهاتووە .

بەڵام کوژراوانی سوپای ئەحزاب لەم جەنگەدا تەنها چوار کەس بوون ، کە هەمووشیان لە قورەیش بوون ، کە ئەمانەن :

( أ ) لە نەوەی عەبدوددار یەك پیاو :

( ١ ) مونەببیهی کوڕی عوثمانی کوڕی عوبەید .

( ب ) لە نەوەی مەخزووم یەك پیاو :

( ١ ) نەوفەلی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی موغیرە ، کە زوبەیری کوڕی عەووام کوشتی ، دوای ئەوەی بە ئەسپەکەیەوە لە خەندەقەکە پەڕییەوە .

( ج ) لە نەوەی عامیری کوڕی لوئەی دوو پیاو :

( ١ ) عەمری کوڕی عەبد ود ، کە عەلیی کوڕی ئەبوطالیب کوشتی .

( ٢ ) حسسەل ی کوڕی عەمری کوڕی عەبد ود ، کە بە پێی ریوایەتی ئیبن هیشام لە زوهەرییەوە ئەویش عەلیی کوشتوویەتی .

**بیست و دووهەم : قورئان و باسی ئەم غەزایە**

ئەوەبوو دەربارەی رووداوەکانی ئەم غەزا گەورەیە خوای گەورە حەڤدە ئایەتی لە سوورەتی ( الأحزاب ) ناردنە خوارەوە :

سەرەتا ئەفەرموێ :

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَآءَتْكُمْ جُنُودٌ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا وَجُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴾ (الأحزاب : ٩) .

قورئان روو لە ئیمانداران ئەکات و فەرمانیان بەسەردا ئەدا کە بیر لە نیعمەتی خوا بکەنەوە کە چۆن ئەو سوپا ملهوڕە خوانەناسە هاتبووە سەریان ، کەچیی خوای

گەورە رەشەبایەکی بۆ ناردن کە لاشەی کوتان و چادری هەڵ کێشان و ، ئاگری کوژاندنەوە و ، قابلەمەی قڵپ کردنەوە . هەروەها سەربازی بۆ ناردن کە موسڵمانەکان نەیانئەبینین . کە مەلائیکە بوون ، تا ترس ولەرز بخەنە دڵیانەوە و ، ورەیان برووخێنن .

پاشان باسی ورەڕووخان و ترس و لەرزی موسڵمانەکان ئەکات :

﴿ إِذْ جَآءُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنكُمْ وَإِذْ زَاغَتِ ٱلْأَبْصَـٰرُ وَبَلَغَتِ ٱلْقُلُوبُ ٱلْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠ ﴿١٠﴾ هُنَالِكَ ٱبْتُلِىَ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا۟ زِلْزَالًا شَدِيدًا ﴾ (الأحزاب : ١٠ ـ ١).

باسیان بۆ ئەکا کە بەڵایەکی یەکجار گەورە بەسەر موسڵمانەکاندا هاتبوو : قورەیش و غەطەفان لەلای باکوورەوە و قورەیظەی ناپاکیش لەلای باشوورەوە تەنگیان بە موسڵمانان هەڵ چنی بوو ، بە رادەیەك کە چاویان زاق بووبوو و ، دڵەکان لە سنگ دا بەرز بووبوونەوە و ، زەلزەلە بە ئیمانداران گەیشتبوو .

پاشان باسی هەڵوێستی نامەردانەی مونافیقە ترسنۆکەکان ئەکات کە خۆیان دڵیان نەخۆش بوو کەچیی گاڵتەیان بە بەڵێنەکانی خوا و پێغەمبەر ئەکرد ، دوایی‌ش رۆژگار سەلماندی کە ئەو بەڵێنانە راست دەرچوون و دینی ئیسلام لە هەموو دنیادا بڵاو بوویەوە و ، هەتا ئێستاش هەر دڵە پاکەکان بۆ لای خۆی رائەکێشێ :

﴿ وَإِذْ يَقُولُ ٱلْمُنَـٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ مَّا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ إِلَّا غُرُورًا ﴾ (الأحزاب : ١٢) .

هەروەها باسی کۆمەڵێکیان ئەکا کە چۆن دانیشتوانی یەثریبیان سارد ئەکردەوە بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە دوا و ، هەندێکیشیان داوای مۆڵەتیان ئەکرد ، بەڵام لە راستیی‌دا هەڵ ئەهاتن ، بە مەرجێ کاتێ کە موسڵمان بووبوون بەڵێنیان دابوو کە پشت هەڵ نەکەن .

﴿ وَإِذْ قَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْهُمْ يَـٰٓأَهْلَ يَثْرِبَ لَا مُقَامَ لَكُمْ فَٱرْجِعُوا۟ ۚ وَيَسْتَـْٔذِنُ فَرِيقٌ مِّنْهُمُ ٱلنَّبِىَّ يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ وَمَا هِىَ بِعَوْرَةٍ ۖ إِن يُرِيدُونَ إِلَّا فِرَارًا ﴿١٣﴾ وَلَوْ دُخِلَتْ عَلَيْهِم مِّنْ أَقْطَارِهَا ثُمَّ سُئِلُوا۟ ٱلْفِتْنَةَ لَـَٔاتَوْهَا وَمَا تَلَبَّثُوا۟ بِهَآ إِلَّا يَسِيرًا ﴿١٤﴾ وَلَقَدْ كَانُوا۟ عَـٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ مِن قَبْلُ لَا يُوَلُّونَ ٱلْأَدْبَـٰرَ ۚ وَكَانَ عَهْدُ ٱللَّهِ مَسْـُٔولًا ﴾ (الأحزاب : ١٣ ـ ١٥) .

پاشان ئاگاداریان ئەکات کە بە هەڵاتن لە مەرگ یان کوژران رزگاریان نابێت و، گەر خوا بیەوێ خراپەیەکیان تووش بکات کێ ئەگاتە فریایان :

﴿ قُل لَّن يَنفَعَكُمُ ٱلْفِرَارُ إِن فَرَرْتُم مِّنَ ٱلْمَوْتِ أَوِ ٱلْقَتْلِ وَإِذًا لَّا تُمَتَّعُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٦﴾ قُلْ مَن ذَا ٱلَّذِى يَعْصِمُكُم مِّنَ ٱللَّهِ إِنْ أَرَادَ بِكُمْ سُوٓءًا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ رَحْمَةً ۚ وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴾ ( الأحزاب : ١٦ ـ ١٧ )

**دوای ئەوە باسی ئەو مونافیقانە ئەکات کە لە ترساندا پاڵیان لێ دابوویەوە و جەنگیان نەئەکرد . ئەوانە لە کاتی ترس و لەرزدا ، وەك ئەو کەسەی کە لە سەرەمەرگدا بێت چاویان ئەجوولێنن ، بەڵام ترس نەما زمانیان درێژ ئەبێتەوە . ئەوانە بێ‌ئیمانن و هیچ چاکەیەکیشیان بۆ نانووسرێت :**

﴿ قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلْمُعَوِّقِينَ مِنكُمْ وَٱلْقَآئِلِينَ لِإِخْوَٰنِهِمْ هَلُمَّ إِلَيْنَا ۖ وَلَا يَأْتُونَ ٱلْبَأْسَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٨﴾ أَشِحَّةً عَلَيْكُمْ ۖ فَإِذَا جَآءَ ٱلْخَوْفُ رَأَيْتَهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ تَدُورُ أَعْيُنُهُمْ كَٱلَّذِى يُغْشَىٰ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْمَوْتِ ۖ فَإِذَا ذَهَبَ ٱلْخَوْفُ سَلَقُوكُم بِأَلْسِنَةٍ حِدَادٍ أَشِحَّةً عَلَى ٱلْخَيْرِ ۚ أُوْلَـٰٓئِكَ لَمْ يُؤْمِنُوا۟ فَأَحْبَطَ ٱللَّهُ أَعْمَـٰلَهُمْ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴾ ( الأحزاب : ١٨ ـ ١٩ ) .

**ئەو مونافیقانە ئەوەندە ترسنۆکن ، ئەگەر جارێکی تر ئەحزاب بێنەوە ئاواتە خوازن لە مەدینەدا نەبن بەڵکو لە دەشت بن تا تووشی ئازار نەبن . ئەو ترسنۆکانە کەڵکیان پێوە نیە :**

﴿ يَحْسَبُونَ ٱلْأَحْزَابَ لَمْ يَذْهَبُوا۟ ۖ وَإِن يَأْتِ ٱلْأَحْزَابُ يَوَدُّوا۟ لَوْ أَنَّهُم بَادُونَ فِى ٱلْأَعْرَابِ يَسْـَٔلُونَ عَنْ أَنۢبَآئِكُمْ ۖ وَلَوْ كَانُوا۟ فِيكُم مَّا قَـٰتَلُوٓا۟ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ ( الأحزاب : ٢٠ ) .

**دوای ئەوە روو لە ئیمانداران ئەکات هەتا لە خۆشیی و ناخۆشییدا چاو لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن :**

﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْـَٔاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴾ ( الأحزاب : ٢١ ) .

**پاشان باسی ئیمان و عەقیدەی دامەزراوی موسڵمانان ئەکات کە هەتا بەڵایان بەسەردا بباری ئەوان ئیمانیان زیاتر ئەبێ و ، زیاتریش بڕوا بە بەڵێنەکانی خوا و پێغەمبەرەکەی ئەکەن .**

**پاشان باسی ئەو ئیمان دارانە ئەکات کە بە راستیی و پاکیی وەعد و پەیمانیان بە خوا داوە ، ئەوانە دوو بەشن : بەشێکیان کە شەهیدانی بەدر و ئوحودن ، ئەو شەهیدییەیان دەست کەوتووە کە خۆیان بۆ ئامادە کردووە و ، بەشەکەی تریشیان**

هەر چاوەڕوانن و بە ئاواتن بەو پلە بەرزە بگەن و، هیچ ئاڵ و گۆڕێکیان بەسەردا نەهاتووە :

﴿ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَـٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ۖ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ۖ وَمَا بَدَّلُوا۟ تَبْدِيلًا ﴾ (الأحزاب : ٢٣).

ئەمەش تاقیی‌کردنەوە بوو ، تا ڕاستگۆکان پاداشتی چاکی خۆیان وەربگرن و ، مونافیقەکانیش یا سزا بدات ، یان چاوپۆشی‌یان لێ بکات ؛ چونکە خوای گەورە لێ بووردە و خاوەن بەزەیی‌یە . ئەو کافرانەش کە بە نیازی خراپ هاتبوونە سەر مەدینە، واتە سوپای ئەحزاب ؛ خوای گەورە تێکی شکاندن و ، موسڵمانەکانی لە جەنگ پاراست ؛ چونکە خوا بەهێز و بەدەسەڵاتە :

﴿ لِّيَجْزِىَ ٱللَّهُ ٱلصَّـٰدِقِينَ بِصِدْقِهِمْ وَيُعَذِّبَ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ إِن شَآءَ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٢٤﴾ وَرَدَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِغَيْظِهِمْ لَمْ يَنَالُوا۟ خَيْرًا ۚ وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلْقِتَالَ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا ﴾ (الأحزاب : ٢٤ ـ ٢٥ ).

دوای کشانەوەی سوپای ئەحزاب ، موسڵمانەکان بوونە خاوەنی گرنگی و بایەخ و سوپاکەشیان حیسابی چاکی بۆ ئەکرا . لە هەمان کاتدا قورەیش و غەطەفان ئەوەندەی تر تێك شکان و ، بە سەری شۆڕ و خەجاڵەت و ماندووبوونێکی زۆرەوە خۆیان گەیاندەوە وڵاتی خۆیان .

لە هەمان کات دا خەجاڵەتیی و زەرەرۆمەندی‌یەکی بێ‌ئەندازە تووشی ئەو جوولەکانە بوو کە لە خەیبەرەوە خۆیان گەیاندە مەککە و ، پاشان ناوچەی غەطەفان تا سوپای ئەحزاب بخەنە رێ دژی مەدینە . لە هەمان کاتدا پارە و پووڵێکی زۆریان لە کیس چوو ؛ سەرەڕای ئەوەی کە دەستی جوولەکەی نەوەی قورەیظەیان بڕیی ، کە پەیمانی نێوان خۆیان و موسڵمانانیان شکاند و ، وایان ئەزانی ئیتر موسڵمانەکان تەواو بوون و ، هەڵسانەوەیان بۆ نیە .

ماوە بڵێین : چیی جم وجووڵ و هەڵمەت و جەنگ و کوشتار و کوژران لە دەوری خەندەق دا رووی دا ؛ تەنها قورەیش پێی هەڵسان ، غەطەفان هیچ بەشداری‌یەکیان نەکرد و هیچ کەسیان نەکوشت و کەسیشیان لێ نەکوژرا .. لەبەر ئەوەی غەطەفان پیاوی تاڵان و بڕۆ بوون ، جا کە خەندەقەکەیان دیت ؛ ئیتر لایان سەلما کە ئەو کارەیان بۆ ئەنجام نادرێ . خۆ ئەگەر هەوڵی گرتنی مەدینە بدەن مەگەر قوربانی‌یەکی

زۆری بۆ بدەن ، دیارە ئەوانیش ئامادەی ئەو قوربانی‌یە زۆرە نەبوون . سەرەڕای ئەوەش کە قورەیش لە روانگەی عەقیدە و دینەوە رقی لە موسڵمانەکان ئەبوویەوە ؛ بەڵام غەطەفان لەو لایەنەوە لەگەڵ موسڵمانەکان دا هیچ دژایەتی‌یەکی نەبوو .

بەم شێوەیە جەنگی سەختی ئەحزاب یان غەزای خەندەق کۆتایی هات و پێغەمبەری خوا ﷺ لە رۆژی چوارشەممەدا ؛ کە حەوت شەو لە مانگی ذولقەعیدە مابوون، لە دەوری خەندەق گەڕایەوە مەدینە .[٤٤]

---

[٤٤] غزوة الأحزاب لباشميل : ١٣١ ـ ٣٠٨ ؛ الرحيق المختوم : ٣٠٧ ـ ٣٢٠ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٢٧٥ ـ ٢٩٣ .

## بەشی بیست و هەشتەم

# غەزای نەوەی قورەیظە

**یەکەم : جوولەکە پەیمانی نیە**

لە پێشەوە باس کرا کە پەیمانێك لە نێوان موسڵمانەکان و جوولەکەی مەدینەدا لەسەر بناغەی ئاشتیی و دۆستایەتیی بەسترا .. خۆ ئەگەر دوژمنێکیش هێرشی کردە سەر مەدینە ، بە هەردوولایانەوە پەرچی ئەو دەستدرێژی یە بدەنەوە و ، بەرگریی لە دانیشتوان بکرێ .

بەم پێ یە ئەبوایە جوولەکەی نەوەی قوریظە پاڵپشتی موسڵمانەکان بوونایە و ، وەك ئەوان بەرگری یان لە مەدینە بکردایە ، کاتێك کە سوپای ئەحزاب هاتە سەری . ئەبوایە جوولەکەش بەشێك بوونایە لە سوپای ئیسلام بۆ دەرکردنی داگیرکاران ..

بەڵام نەوەی قورەیظە نامەرد بوون و ، بە وێنەی نەوەی قەینوقاع و نەوەی نەضیری جوولەکە ، لە جیاتیی دۆستایەتیی ناپاکی یان لێ دەرکەوت .. لە جیاتیی ئەوەی کۆمەکی موسڵمانەکان بن ، لە ناسکترین کاتدا و ، لە ناڕەحەتترین هەڵویستدا شکاندنی پەیمانەکەیان دەربڕیی و بە ئاشکرا پاڵیان بە داگیرکەرانەوە دا ، ئەمەش دوای ئەوەی کە لایان یەقین بوو کە ئیتر موسڵمانەکان ، لە دەست ئەم سوپا ملهوڕە، دەرچوونیان نیە .

ئەمە کارێکی یەکجار نامەردانە بوو کە قورەیظە ئەنجامیان دا . ئەو ناپاکی یەیان بەو شێوە دژی موسڵمانەکان ئەنجام دا .. بە مەرجێ سەرۆکەکەیان ، کەعبی کوڕی ئەسەد بە ئاشکرا دەری بڕیی کە جوولەکە جگە لە راستگۆیی و وەفا هیچی بە پێغەمبەر و هاوەڵانەوە نەدیوە . ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە حویەیی کوڕی ئەخطبی سەرۆکی نەوەی نەضیر و هەڵ گیرسێنەری ئاگری جەنگی ئەحزاب ، چووبووە بەردەم قەڵاکەی کەعبی کوڕی ئەسەد و ئەیویست قەناعەت بە نەوەی قورەیظە و سەرۆکەکەیان بکات ، تا پەیمانی نێوان خۆیان و موسڵمانەکان واز لێ بهێنن و ، ببنە

کۆمەکی ئەحزاب . هەروەش بوو حویەیی توانیی کار بکاتە سەر کەعب و ، لەو هەلوێستە ناسکەدا لە موسلمانەکان هەلّ بگەڕێنەوە .
جا پێغەمبەری خوا ﷺ هەوڵی دا جولەکە لە پەیمانەکەیان لا نەدەن و ، بە جوانیی بە گوێی بکەن ، کە ئەوەبوو چەند پیاوێکی ، بە سەرکردایەتیی سەعدی کوڕی موعاذی سەرۆکی ئەوسی هاوپەیمانیان ، نارد بۆ لایان تا ئامۆژگارییان بکەن و، لە ئەنجامی خراپی هەڵگەڕانەوە و پەیمانشکاندن ئاگاداریان بکەن ، چونکە لەوانەیە ببێتە مایەی تیاچوونیان .
بەڵام جوولەکە زۆر بە ناشیرینیی وەڵامی پیاوە ئامۆژگارییکەرەکانیان دایەوە و، بەوپەڕی بێئەدەبییەوە دەریان خست کە لەسەر رای خۆیان بەردەوام ئەبن و ، تازە ئەمان بوونەتە کۆمەکی ئەحزاب و دوژمنی موسلمانان .. هەتا ئەوەشیان دەربڕیی کە نە موحەممەد ئەناسن و، نە هیچ بەڵێن و پەیمانێکیش لە نێوانیاندا هەیە . بەڵکو دەستیشیان دایە هێرش بۆسەر قەڵای ژن و منداڵەکان و ، بە نهێنییش خۆراکیان بۆ سوپای ئەحزاب ئەنارد بۆ یامەتییدانیان ، کە ئەوەبوو کاروانێکی بیست حوشتریی خۆراکیان کەوتە دەست موسلمانەکان .
نەوەی قورەیظە لایان یەقین بوو کە سوپای ئەحزاب ئەتوانن ریشەی موسلمانەکان دەربهێنن ، بۆیە پێیان خۆش بوو ، ئەوانیش بەشداریی ئەو هەڵمەتە بکەن ، تا ئەوەبوو خوای گەورە بە سۆزی بەلێشاوی بەزەیی بە موسلمانەکاندا هاتەوە و رەشەبایەکی بەهێزی ناردە سەر ئەحزاب و ، نوعەیمی کوڕی مەسعوودیش نێوانی تێك دان و ئەحزاب کشایەوە و ، نەوەی قورەیظەی بەدبەختیش ، بە تاقی تەنیا و ، بەبێ کەس لەبەردەم سوپای ئیسلامدا مانەوە ، تا سزای ئەو دەغەڵیی و ناپاکییەیان بچێژن و، ببنە پەند و ئامۆژگاریی تا مرۆڤەکان خۆیان تووشی ناپاکیی وەها نەکەن..
کەواتە غەزای نەوەی قورەیظە بەشێکە لە غەزای ئەحزاب و تەواوکەریەتی ، چونکە هێرشی ئەحزاب هێرشێکی سێ لایەنە بوو کە جوولەکەش لایەنێکی بوون وەك قورەیش و غەطەفان هەریەکە لایەنێکی بوون ..
کەواتە نەوەی قورەیظە هەر ئەوەندە تاوانیان لەسەر نەبووە کە پەیمانیان شکاندووە و ، لە جیاتی ئەوەی داگیرکەران لە مەدینە دووربخەنەوە ، بوونەتە کۆمەکیان ، کە ئەمە خۆی لە خۆیدا لە یاسای مرۆڤایەتییدا بە ناپاکیی گەورە ( الخيانة العظمى ) لە قەڵەم ئەدرێ ، بەڵکو سەرەڕای ئەوەش بە دوژمنی چەك هەڵ گرتوو لە قەڵەم

ئەدرێن ، بە بۆنەی ئەوەوە کە پاڵیان بە ئەحزابەوە دا و ، بە ئاشکرا دەریان بڕیی کە دوژمنی موسڵمانانن و هیچ پەیمانێکیان لە نێوان‌دا نیە .

کەواتە ئەوەندەی کە خوێنی سوپای ئەحزاب ، بە قوڕەیش و غەطەفانەوە ، بۆ موسڵمانەکان حەڵاڵە بیڕێژن ، کە هاتوونەتە سەریان و دەست‌درێژی‌یان ئەکەنە سەر، خوێنی هەموو جوولەکەیەکی نەوەی قورەیظەش بۆ موسڵمانەکان ئەوەندە حەڵاڵە ..

چەندە رشتنی خوێنی عەمری کوڕی عەبد ود حەڵاڵ بوو کە عەلیی کوشتیی ، خوێنی هەموو جوولەکەیەکی نەوەی قورەیظەش ئەوەندە حەڵاڵە ..

کەواتە کە سوپای ئەحزاب کۆڵیان دا و گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان ، ئەوە تێک شکانی ئەحزاب و سەرکەوتنی موسڵمانەکان بوو ، لە هەمان کات‌دا کۆتایی جەنگی قوڕەیش و غەطەفان بوو لەگەڵ موسڵمانەکان‌دا ، چونکە ئەوان کشانەوە و خۆیان دەرباز کرد ، بەڵام نەوەی قورەیظە کە باڵی سێهەمی ئەو یەکگرتنە ستەم کارانەیە بوون ، لەبەر دەستی موسڵمانەکان‌دا بە کزۆڵەیی و دەستەپاچەیی مابوونەوە ، هەتا موسڵمانەکان بە جوانیی حیسابیان بۆ بکەن و بی‌خەنە مشتیان ..

خۆ جوولەکەی نەوەی قورەیظە ئەوەیان چاك ئەزانیی کە لەبەردەم موسڵمانەکان‌دا بە تەنیا ئەمێننەوە و ، بە سەریشیان‌دا ناڕوا ، چونکە ئەوان تاوانێکی یەکجار گەورەیان دەرهەق بە موسڵمانەکان ئەنجام دا ، بە مەرجێ جگە لە وەفا و راستگۆیی و چاکە هیچیان بە سەرکردە و لە سوپای ئیسلامەوە نەدیی بوو . هەر ئەو شەوە کە حویەیی کوڕی ئەخطەب چووە لای کەعبی کوڕی ئەسەدی سەرۆکی نەوەی قورەیظە تا پەیمان بشکێنێ ، مەرجیان لەگەڵا کرد کە بەجێ‌یان نەهێڵێ تا هەر مەترسی‌یەك روو لەمان ئەکات ئەویش بەشدار بێت ..

**دووهەم : فەرمانی ئاسمان**

کە ئەحزاب کشانەوە ، جوولەکە چوونە ناو قەڵاکانیانەوە و ، لە ترسی موسڵمانەکان هەڵ ئەلەرزین ، چونکە ئەیان‌زانیی چ تاوانێکی بێ‌وێنەیان ئەنجام داوە، کە بریتی‌یە لە تیاچوونی دوا ئەندامی کۆمەڵگای ئیسلامیی و رووخانی دینی ئیسلام بۆ هەتا هەتایی .. ئەیان‌زانیی سزاکەیان ، لەبەر گەورەیی تاوانەکەیان ، یەکجار گەورەیە ..

خۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی‌زانیی کە پێویستە سزای پڕعەدالەت بخرێتە مشتی ئەو ترسنۆکە تاوانبارانەوە ، بەڵام وای بە چاك زانیی پشوویەك بە سوپا برسیی و

ماندووەکەی بدات ، ئەوسا هێرش بکاتە سەر قەڵای غەدر و ناپاکیی .. کەچیی خوای گەورە بەوە رازیی نەبوو ..فەرمانی توندی بە پەلە نارده سەری کە پشوو نەدات و ، بە خۆی و هاوەڵانیەوە چەك دانەنێن هەتا هەڵمەت بەرنە سەر قەڵای ئەو ناپاکە سپڵانەی کە بەرامبەر بە چاکەی موسڵمانان ئەو پیلانە گڵاوەیان نەخشە کێشا . نەخشەیەك کە خەریك بوو سوپای ئیسلام بە تەواویی تیا بچێ ..

بەیهەقیی لە خاتو عائیشەوە خوا لێی رازیی بێ ریوایەتی کردووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەلای ئەو بووە . ئەڵێت : لەماڵەوە بووین پیاوێك سەلامی لێمان کرد و ، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستایە سەر پێ و ، منیش بە دوایدا هەستام ، ئەبینین پیاوێك وا بەسەر ئەسپێکەوە و پێغەمبەریش ﷺ شانی بەسەر یاڵی ئەسپەکەدا داداوە و قسەی لەگەڵدا ئەکات . ئەڵێت : منیش گەڕامەوە دوا . کە پێغەمبەر ﷺ هاتە ژوورەوە وتم : ئەو پیاوە کێ بوو کە قسەت لەگەڵا ئەکرد ؟

فەرمووی : (( بمن تشبهينه ؟ )) . فەرمووی : بەلای تۆوە لە کێ ئەکات ؟

وتم : لە دیحیەی کەلبیی ئەکات .

فەرمووی : (( ذاكِ جبريل عليه السلام ، أمرني أن أمضي إلى بني قريظة )) .

فەرمووی: ئەوە جیبریل بوو، فەرمانی بەسەرمدا دا تا بچمە سەر نەوەی قورەیظە .

ئیبن ئیسحاقیش ریوایەتی کردووە و وتوویە : کە پێغەمبەری خوا ﷺ رۆژی لێ بوویەوە ، لە خەندەق بەرەو مەدینە گەڕایەوە و موسڵمانەکانیش چەکیان دانابوو . کە نیوەڕۆ هاتە بەرەوە جیبریل هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و ، مێزەرێکی لە ئیستەبرەق دروستکراوی لەسەر نابوو و ، سواری ئێسترێك بوو بوو کە کەل و پەلەکەی بەسەریەوە بوو و، قەدیفەیەکی ئاوریشمیش بەسەر ئەودا درابوو ، فەرمووی:

ئایا چەکت داناوە ، ئەی پێغەمبەری خوا ؟

فەرمووی : نعم .

جیبریل فەرمووی : هێشتا مەلائیکە چەکیان دانەناوە و ، هەر ئێستا لە راونانی سوپای ئەحزاب گەڕاونەتەوە .. خوای گەورە فەرمانت بەسەردا ئەدا کە هێرش بکەیتە سەر نەوەی قورەیظە ، وا من ئەچمە سەریان و دڵیان دێنمە لەرزە .

لە هەندێ ریوایەتدا وەها هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ داوای کردووە ئەو هێرشە چەند رۆژێك دوا بخرێت ، تا لەو رۆژانەدا سەربازە ماندووەکانی هەندێ

بحەسێنەوە ، بۆیە بە جیبریلی فەرموو : (( إن في أصحابي جهداً فلو نظرتهم أياماً )) . فەرمووی : هاوەڵانم ماندوون ، خۆزگە چەند رۆژێك ماوەت بدانایە .

جیبریل سەلامی لێ بیێ داوای کرد بە پەلە هەستێ و بەرەو جوولەکە بڕوا و ، خۆیشی بە کۆمەڵێك مەلائیکەتەوە ، بۆ لەرزەپێخستنیان کەوتە رێ .

لەبەردەم ئەم فەرمانە بە پەلەیەدا ، بۆ هێرش بردنە سەر جوولەکەی نەوەی قورەیظە ، پێغەمبەری خوا ﷺ چاری نەما و ، دەستی دایە جێ بەجێ کردنی ئەو فەرمانەی کە جیبریل بۆی هێنا .

ئەوەبوو فەرماندەی باڵای سوپای ئیسلام ، پێغەمبەری خوا ﷺ بە پەلە فەرمانی بۆ سەربازە گیانفیداکانی ئیسلام دەرکرد ، تا بەبێ وەستان بەرەو مەنزڵ و ماوای قورەیظە بکەونە رێ ، تا سزای دادپەروەرانەی خۆیان وەربگرن .

ئەم فەرمانەی پێغەمبەری پێشەوا لە شێوەی مەرسوومێکدا بیلالی کوڕی رەباحی بانگوێژی پێغەمبەر ﷺ بۆ سەربازانی ئیسلامی خوێندەوە .. ئەوەبوو بەم شێوەیە دای بە گوێی خەڵکەکەدا : هەر کەس گوێڕایەڵ و فەرمان بەردارە با لە ناو نەوەی قورەیظەدا نەبێ نوێژی عەصر بەجێ نەهێنێ .

بەم فەرمانە دوای نیوەڕۆی یەکەم رۆژی گەڕانەوەی موسڵمانەکان بوو لە خەندەق.

خێرا موسڵمانەکان فەرمانی فەرماندەی باڵایان جێ بەجێ کرد و ، بە پەلە هەڵمەتیان دایە چەکەکانیان و ، موسڵمانەکان دەستە لە دوای دەستە خۆیان گەیاندە قەڵاکانی جوولەکە . پێغەمبەری خوایش ﷺ بە پەلە خۆی پێچایەوە و ، قەڵغان و زرێ و حەربەی پۆشیی و رمی بە دەستەوە گرت ، پاشان سواری ئەسپەکەی بوو و ، فەرمانیشی بۆ ئیبن ( أم مكتوم ) دەرکرد کە لە ماوەی دەرچوونی خۆیدا ئەو ئەمیری مەدینە بێت.

کە پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی بکەوێتە رێ ، ئاڵای سوپای دایە دەست عەلیی کوڕی ئەبوگالیب خوا لێی رازیی بێ ، کە ئەم ئاڵایە هەر ئەو ئاڵایە بوو کە لە خەندەق دا موسڵمانەکان هەڵیان کردبوو و هێشتا دانەگیرا بوو . پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بۆ عەلیی دەرکرد کە لە پێشەوەی سوپاوە بڕوات و ، پێش موسڵمانان بگاتە خانووبەرەی نەوەی قورەیظە . ئەویش بە خۆی و مەفرەزەیەکەوە بە پەلە خۆی گەیاندە قەڵاکانی جوولەکە و لەوێ ئاڵاکەی داچەقاند و ، نەوەی قورەیظەش زانییان هێرشیان کراوەتە سەر .

جا لەبەر ئەوەی کەماوەی نێوان مەدینە وخانووبەرەی جوولەکە نزیک بوو ، موسڵمانەکان بە دەستە دەستە ڕۆیشتن بۆ ئەوێ .
لە پێشەوە باسمان کرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندە بە پەلە بوو موسڵمانەکان بگەنە لای نەوەی قورەیظە فەرمانی دا نوێژی عەصر بەرنە مەنزڵگای جوولەکە .. موسڵمانەکان بە پەلە خۆیان پێچایەوە و کەوتنە ڕێ . لە ڕێگادا بوون کاتی نوێژی عەصر هاتە بەرەوە .
لێرەدا هاوەڵان بۆ گوێڕایەڵیی فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕایان هەبوو :
هەندێکیان وەهای بۆ چوون ئەم فەرمانە بۆ ئەوە نیە کە نوێژ دوا بخەن ، بەڵکو بۆ ئەوەیە کە پەلە بکەن و ، بەبێ خۆدواخستن بگەنە ئەوێ .. بۆیە ئەمانە لە ڕێگادا نوێژی عەصریان بەجێ هێنا کە ئەمە فەرمانی خوایە و ، فەرمانەکەی تریشیان بە چاکیی بەجێ هێنا کە ئەوەبوو بە پێی توانا بۆ گەیشتن بە مەنزڵی جوولەکە پەلەیان کرد .
بەشی دووهەمیان وەها باسەکەیان لێك دایەوە کە هیچ کەس نوێژی عەصر بەجێ نەهێنێ ، هەتا بگەنە بەرەوە ، جا هەر کاتێ گەیشتن ئەوا نوێژی عەصر بەجێ بهێنن.. بۆیە ئەمانە لە ڕێگا نوێژیان بەجێ نەهێنا و ، بە پەلە خۆیان گەیاندە نەوەی قورەیظە ، هەرچەندە دوای خۆرئاوا بوون گەیشتن و ، لەوێ نوێژی عەصریان بەجێ هێنا ..
هەر دوو دەستە موسڵمانەکە ئیجتیهادیان کرد و ، هەردووکیشیان مەبەستیان گوێڕایەڵیی بوو بۆ فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ.
کاتێك ئەم هەواڵە بە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت گلەیی لە هیچ لایەکیان نەکرد، بەڵکو دانی بە ڕاستیی هەڵوێستی هەردووکیان‌دا نا : ئەوانەی لە ڕێگادا و لە کاتی خۆی‌دا عەصریان بەجێ هێنا و ، ئەوانەش کە دوایان خست هەتا دوای خۆرئاوابوون گەیشتنە بەرەوە . فەرمانی نەدا هیچ لایەکیان نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە.
ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئیسلام دینێکی نەرم و نیانە و ، ئەوەی بە ڕاستیی و پاکیی شوێنی بکەوێ ، بێبەش نابێ .. هەرچیی بکات ، گرنگ ئەوەیە بۆ خوای بکات و ، مەبەستی لەگەڵ ئیسلام‌دا پاك بێت . ئەمەش تا موسڵمانەکان ڕێز

لە رای کەسانی تری دڵسۆز و پاك بگرن و ، هەموویان بیر و زانستیان بخەنە خزمەتی دینی خواوە ، تا سەرەنجام خوایش خزمەتی دینیان بۆ ئاسان بکات .

**سێهەم : موسڵمانەکان ئابلۆوقەی جوولەکە ئەدەن**

کاتێك کە عەلیی کوڕی ئەبوطالیب خوا لێی رازیی بێ نزیکی قەڵاکانی جوولەکە کەوتەوە ، جوولەکە بەبێ شەرمانە دەستیان دایە هەڵڕێژانی ئەو پیسیی و نزمیی و سووکی یەی کە لە ناو دەروونیاندا پەنگیان خواردبۆوە .. دەستیان دایە جنێودان بە پێغەمبەر و هاوسەرانی ، بە رادەیەك کە هیچ مێژوونووسێك نەیتوانیوە ئەو قسە پیسانە بنووسێت . لەگەڵ ئەوەشدا موسڵمانەکان بە رەوشتی بەرزیان بێدەنگ بوون و، وەڵامیان نەدانەوە ، جگە لە عەلیی هەڵگری ئاڵا ، کە زۆر داخی لێ هات ئەو قسانە دەربارەی ئازیز لە دەمی ئەو پیسانە ببیستێ ، ئەویش هەر ئەوەندەی فەرموو: شمشێر وا لە نێوانماندا ..

کە عەلیی چاوی لێ بوو وا پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوورەوە تەشریفی هێنا ، خێرا بنکەی کەتیبەی ئاڵای بەجێ هێشت و کاری فەرماندایەتیی کەتیبەی بە ئەبوقەتادەی ئەنصاریی سپارد و ، خۆی بە پەلە گەڕایەوە دوا بە پێری پێغەمبەری خواوە ﷺ تا لە قەڵای جوولەکە زۆرنزیك نەبێتەوە و، لە دوورەوە بیوەستێنێ . نەکا بە بیستنی جنێوەکانی جوولەکە خەمبار ببێ ..

عەلیی فەرمووی : نەکەی ، ئەی پێغەمبەری خوا ! لەو پیسانە نزیك بکەویتەوە.

فەرمووی : (( لعلك سمعت منهم لـي أذىً )) . فەرمووی : لەوانەیە دەربارەی من شتی ناخۆشت بیستبێ ؟

فەرمووی : بەڵێ ، ئەی پێغەمبەری خوا !

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( لـو رأوني لم يقولـوا مـن ذلـك شـيئاً )) . فەرمووی: ئەگەر بم بینن هیچێ لەوەم پێ ناڵێن . هەروا بەردەوام لە نێوان دەستەی ئەرکانی جەنگی سوپای ئیسلامەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی بەرەو پێشەوە چوو هەتا لە قەڵاکانی جوولەکەی ناپاك نزیك کەوتەوە .

ئەوەندە نزیك کەوتەوە کە قسەی یەکتریی ببیستن ، بانگی کردە چەند فەرماندەیەکیان ، کە لەسەر قەڵاکانەوە دەرکەوتن فەرمووی : (( يا إخوة القردة وعبدة الطاغوت ، هل أخزاكم الله وأنزل بكم نقمته ؟ )) .

فەرمووی :ئەی براکانی مەیموون و ، طاغووتپەرستان ! ئایا خوای گەورە سەرشۆڕی کردن و ، غەزەبی خۆی باراند بەسەرتان دا ؟

کە دی‌یان وا موسڵمانەکان بڕیاریان داوە تۆڵەیان لێ بسێنن و لەسەر ئەو ناپاکی‌یە سزایان بدەن ، چاریان نەما ئەوە نەبێ کە دەست بە پاڕانەوە لە پێغەمبەری خوا بکەن.

سەرەتا ئینکاریی ئەوەیان کرد کە جنێویان بە خۆی و بە هاوسەرانی دابێ و ، بە درۆ سوێندیان ئەخوارد کە هیچێ لەوەی کە بەو گەیشتووە بە دەمیاندا نەهاتووە .
پاشان دەستیان بە قسەی لووس کرد ، بۆ دڵ نەرم‌کردنی پێغەمبەری خوا ﷺ ، بەو هیوایەی کە سزایان لەسەر سووك بکات . ئەمە سروشتی جوولەکەیە : کە دەستی رۆی یەکجار بێ‌بەزەیی و بێ‌ویژدانە و ، کە بێ‌دەستیش کەوت پێڵاو ماچ ئەکات.

دەستیان کرد بە پاڕانەوە و ، ئەوەیان لە بیری خۆیان بردەوە کە چۆن پەیمانیان شکاند و، وەك نەچوونە یارمەتیی موسڵمانەکان ، بوونە کۆمەکی دوژمنەکانیان. هەروەها لە بیریان چوو کە چۆن نوێنەرە موسڵمانەکانیان بە دەستی خاڵیی گێڕایە دواوە و ، وەهایان دەرئەخست کە نە موحەممەد ئەناسن و ، نە پەیمانیشیان لە نێواندا بووە . هەروەها لە بیریان چوو کە چۆن لە ژێرەوە بە خۆراك و بە پارە یارمەتیی سوپای ئەحزابیان ئەدا تا موسڵمانەکان ریشەکەن بکەن .

جا ئەگەر ئەمڕۆ موسڵمانەکان دەستیان بە قورەیش و غەطەفان نەگات ، وا قورەیظە ئامادەیە تۆڵەی لێ بسەنرێ ، تا خوا دەست بدات قورەیش و غەطەفانیش کەوڵ بکەن ..

**چوارەم : نەخشەی دەربازبوون**

لە پێشەوە باسمان کرد کە چوار لە سەردارە ژیرەکانی قورەیظە ئامۆژگاریی جوولەکەیان کرد ، کە نەکەن پەیمان لەگەڵ موسڵمانەکاندا بشکێنن و ، بە گوێی شەیتانی نەوەی نەضیر : حویەیی کوڕی ئەخطەب نەکەن .

ئەو چوارە کە عەمری کوڕی سوعدا سەرۆکیان بوو ، ئامادە نەبوون بەشداریی لەو ناپاکی‌یەدا بکەن و بە ئاشکرا دەریان بڕیی کە ئەوان وان لەسەر پەیمان و بەڵێنی خۆیان . ئەوەبوو دواتریش سیانیان موسڵمان بوون ، بەڵام چوارەمیان عەمری کوڕی

سوعدا لەسەر دینی خۆی مایەوە ، بەڵام لەسەر پەیمانی خۆی دامەزراو بوو و بڕیاری دا ناپاکیی لەگەڵ موسڵمانەکان‌دا نەکات ..

ئەم جوولەکە ژیرە هەوڵی دا ڕێگاچارەیەك بۆ ڕزگارکردنی قەومەکەی بدۆزێتەوە، تا لە سزای سەختی ئەو غەدر و ناپاکی‌یە دەرباز بن کە چاوەڕوانی‌یان ئەکات .. ئەوەبوو نەخشەی بۆ دانان تا شوێن پێغەمبەری خوا ﷺ بکەون و ، موسڵمان بن ، بە تایبەتیی ئەوان بەلایانەوە روونە و ، خۆیان بە چاوی خۆیان ئەبینن کە لە تەورات‌دا نووسراوە کە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایە .

هەرکە عەمری کوڕی سوعدا هەواڵی کشانەوەی سوپای ئەحزابی بیست ، هات بۆ لای خزمەکانی و ، داوای کۆبوونەوەیەکی پەلەی کرد .. ئەمە هێشتا سوپای موسڵمانەکان دەورەی قەڵاکانی نەدابوو .

لەم کۆبوونەوەدا هەموو سەرۆکەکانی نەوەی قورەیظە ئامادە بوون . سەرەتا لۆمەیەکی باشی کردن لەسەر ئەو نەزان‌کاری‌یەیان کە ئەنجامیان دا و شوێن حویەیی شەیتان کەوتن و ، خۆیان کردە دوژمنی موسڵمانەکان و ئەو ناپاکی‌یەیان بەسەر خۆیان‌دا هێنا . دوای ئەوە ئەوەی هێنانەوە یاد کە جوولەکەی نەضیر لە چ خۆشیی و دەسەڵات و پایەداری‌یەك‌دا بوون ، کەچیی بە هۆی ناپاکی‌یانەوە ، وا ئەو هەموو سامان و دارایی‌یەیان کەوتە دەست کەسانی تر و ، بە زەلیلیی و سەری شۆڕەوە وڵاتیان بەجێ هێشت .

پاشان وەك زانایەك و شارەزایەکی تەورات بۆی روون کردنەوە کە هەر کەسێ دژایەتیی موحەممەدی ﷺ کردبێ سەرەنجام زیانی کردووە . پێی وتن : بە تەورات هەر کۆمەڵێك کەڵکیان پێوە مابێ ، خوا ئەمەی ( واتە پێغەمبەر ﷺ ) بەسەریان‌دا زاڵ نەکردووە . ئەوەبوو دەستی لە نەوەی قەینوقاع وەشاند کە خاوەنی دەسەڵات و چەك و غیرەت بوون ...

پاشان عەمری کوڕی سوعدا داوای لە خزمەکانی کرد کە بچنە سەر دینی ئیسلام تا خوێنی خۆیان بسێننەوە و شوێن حەقیش بکەون ، کە پێی وتن :

خزمینە ! خۆتان بە چاوی خۆتان دیتان ، جا بە گوێم بکەن و ، وەرن با شوێن موحەممەد بکەوین . دە بەخوا چاك ئەزانن کە پێغەمبەرە و ، زاناکانمان مژدەیان پێ داوین.

پاشان بە جەنگ و بە دیل‌کردن ترساندنی و ، رووی کرد بە لای کەعبی کوڕی ئەسەدی سەرۆکیانەوە و پێی وت :
بەو تەوراتەی کە لە رۆژی ( طور سیناء ) دا هاتە خوارەوە سەر مووسا سەلامی لێ بێ ، ئەوە ( واتە موسڵمان بوون ) پایەداریی و شەرەفی دنیایە .
لەو کاتەدا کە عەمر ئەم قسانەی بۆ نەوەی قورەیظە ئەکرد پێشەنگی سوپای ئیسلام دەرکەوت و هێرشی هێنایە سەر قەڵاکانیان .
کە عەمر سوپای ئیسلامی بینیی قسەکانی بڕیی و وتی : ئا ئەمە ئەوەیە کە پێتانم وت .
بەڵام نەوەی قورەیظە قسەکەی ئەویان وەرنەگرت و ، نەهاتنە سەر ئەوە کە موسڵمان بن .
بۆ دوا جار هەوڵێکی تری لەگەڵدا دان بەو هیوایەی کە رزگاریان بکات ، ئەوەبوو پێی وتن : ئێوە دژایەتیی موحەممەدتان کرد و ، منیش لەو غەدرەتاندا بەشداریيم نەکردن ، جا ئەگەر ناکەن بچنە سەر دینەکەی ، دەی لەسەر یەهوودیەت بمێننەوە و جزیە بدەن .. دە بەخوا نازانم ، ئایا لێتان وەرئەگرێ یان نەء .
نەوەی قورەیظە ئەم رایەشیان دایە دواوە و ، بەوپەڕی سەرکەشیەوە وتیان : هەرگیز دان نانێن بە سەرانەیەکدا عەرەب لێمان بسێنن ، کوشتن لەوە چاکترە .
عەمری کوڕی سوعدا دەستی لە قەومەکەی شۆرد و بۆی دەرکەوت ملە جەڕە و عینادی بەرەو هەڵدێریان ئەبەن ، لەبەر ئەوە خۆی لێیان داماڵیی و ، بۆ هەتا هەتایی بەجێی هێشتن .
لەو کاتەدا کە قەڵاکان دەورەیان گیرابوو ، شەو عەمری کوڕی سوعدا چووە دەرەوە و ، کە تووشی پاسەوانانی سوپای ئیسلام بوو گرتیان و بردیانە لای فەرماندەکەیان موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی ئەنصاریی . کە کوڕی مەسلەمە عەمری ناسیی و ، پێشتریش هەواڵی هەڵوێستی مەردانەی ئەویان بیستبوو ، فەرمانی دا بەری بدەن با بە سەربەستیی بۆ خۆی بڕوا ، هەرچەند، لەسەر دینی خۆی مابوویەوە و موسڵمان نەبوو بوو . ئەو شەوە بەبێ خەم لە مزگەوتی پێغەمبەری خوادا ﷺ لە مەدینە مایەوە، پاشان سەری خۆی هەڵ گرت و کەس نەیزانیی رووی لە کوێ نا و چیی بەسەر هات . کە باسەکەشی کەوتە گوێی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( ذاك

رجـل نجـاه الله بوفاتـه )) . فـەرمووی : ئـەوە پیاوێکـە بـە بۆنـەی بەسـەربردنی پەیمانەکەیەوە خوا رزگاری کرد ..

سوپای موسڵمانەکان بە چـاکیی ئابلووقـەی قـەڵاکانی دا و ، دەستیشی بەسـەر هەموو کشت وکاڵ و دارخورماکانی نەوەی قورەیظەدا گرت کە لە دەرەوەی قەڵاکاندا بوون.

سەرەتا جوولەکە بەرگریی چـاکیان ئـەکرد ، بـەڵام دوای تێپـەڕبوونی بیست ڕۆژ بەسەر ئابلووقەدا ، بەرەبەرە ترس و لاوازیی سەریان دەرهێنا و ، جوولەکە بێتاقـەت بوون ، چونکە لایان یەقین بوو کە هەرگیز موسڵمانەکان وازیان لێ ناهێنن ، یان ئەبێ خۆیان بە دەستەوە بدەن ، یان بە زۆر دەرگای قەڵاکان ئەشکێنن و ئەچنە ژوورەوە .

شایانی باسە لـەناو قـەڵاکاندا چ ئـاو و ، چ خـۆراك ئەوەنـدە زۆر بـوون کـە بـۆ ماوەیەکی زۆر پەکیان نەکەوێ . بەڵام جوولەکە ورەیان رووخا و ، کەوتنە بیرکردنـەوە بۆ ئەوەی خۆیان لەسەر بڕین رزگار بکەن .

**پێنجەم : سێ ڕێگا**

لەم کاتە یەکجار ناسکەدا سەرداری نەوەی قورەیظە کەعبی کوڕی ئەسەد داوای لە سەرۆکەکانی جوولەکە کرد کە کۆببنەوە تـا تـەگبیرێکی ئـەم هەڵوێستـەیان بکـەن و بزانن چ هەڵوێستێك وەربگرن چاکە .

شایانی باسە کە کەعب پیاوێکی ژیر بوو و ، سەرەتا نە پێی خۆش بوو دەرگـا لـە حویەیی بکاتەوە و ، نە پێیشی خۆش بوو پەیمانی موسـڵمانەکان بشـکێنێ ، چـونکە موسڵمانەکان لەگەڵ ئەواندا بە راستیی و پاکیی جووڵابوونەوە .

کە دانیشـتن کـەعب بـیری هـەموویانی خستـەوە ، بـە تایبـەت حویـەیی کـوڕی ئەخطەب، کە ئەو ئەیزانیی بەم چارەنووسە ئەگەن ، بۆیـە نـاڕازیی بـوو پەیمانەکـەی نێوان خۆیان و موسڵمانان بشکێنێ .

لەو کۆبوونەوەیەدا پێی وتن :

ئەی کۆمەڵی جوولەکە ! ئەبینن چ کارێك هاتۆتە ڕێتان ، منیش پـەیمان شـکاندنم بەلاوە ناخۆش بوو .

پاشان ئاوڕی بۆ لای حویەیی دایەوە و ، ئاماژەی بۆ کرد کە هەرچیی بەڵا و شـووم هەیە لەم پیاوە دانیشتووەیە .

ئەوەبوو حویەیی لەو کاتەدا کە پەیمانی نەوەی قورەیظەی شکاند ، بەڵێنی دا لە قەڵاکانی ئەواندا بمێنێتەوە ، تا هەرچیی هاتە ڕێیان ئەویش لەگەڵیاندا بەشدار بێت. خوا وای هێنایە پێش کە لە کاتی گەمارۆدانەکەدا لە قەڵاکاندا بێ ، تا بەری ڕەنجەکەی دەستگیر ببێ .

پاشان کەعبی کوڕی ئەسەد سێ ڕێگای بۆ جوولەکە دانا تا فریای خۆیان بکەون و، لەو ڕۆژە ڕەشە ڕزگار بن .

یەکەم جار کەعب ئەوەی وەبیری نەوەی قورەیظە هێنایەوە کە ماوەیەك لەوە و بەر زانایەکیان بە ناوی ( إبن خراش ) ەوە پێی وتوون کە لە مەدینەدا پێغەمبەرێك پەیدا ئەبێ و ، داواشی لێ کردوون کە ببنە شوێنکەوتووی ، بەمەئەبنە ئیماندار بە هەردوو کتێبی یەکەم و دوایین ( واتە تەورات و قورئان ) . جا کەعب ڕووی تێ کردن و وتی:

دە بەخوا بۆتان دەرکەوتووە کە پێغەمبەر و خوا ڕەوانەی کردووە و ، ئەو پێغەمبەرەیە کە سیفاتەکانی لە تەوراتدا هەن و ، تەنها حەسادەت بردن بە عەرەب لە موسڵمانبوون قەدەغەی کردووین ، چونکە لە نەوەی ئیسرائیل هەڵ نەکەوتووە . دەی شوێنی بکەون تا سەرومال و منالتان ڕزگار کەن .

نەوەی قورەیظە ڕێگای یەکەمی کەعبیان دایە دواوە و وتیان : هەرگیز دەست بەرداری حوکمی تەورات نابین و بە هیچیشی ناگۆڕینەوە .

دوای ئەوە پێشنیاری دووهەمی خستە بەردەمیان کە بریتییە لەوەی هەرچیی ژن و منداڵ و پەككەوتەیان هەیە هەر هەموویان سەر ببڕن و تەنها جەنگاوەرەکانیان بمێننەوە ، ئەو کاتە بە یەك هەڵمەت لە قەڵاکانەوە هێرش بکەنە سەر سوپای موسڵمانەکان و شمشێر بخەنە گەردنیان و ترسیان لە هیچ شتێك نەبێ ، هەتا خوا حوکمی خۆی لە نێوان ئەوان و پێغەمبەری خوادا ﷺ دەر بکات . جا ئەگەر تیا بچن ئەوا نە ژن و نە منداڵیان لە دوا بەجێ نامێنێ تا خەمی بخۆن ، خۆ ئەگەر سەریش کەوتن بە خوا ژنیش و منداڵیشیان دەست ئەکەونەوە .

نەوەی قورەیظە ئەمەشیان دایە دواوە و بە ترس و لەرزێکەوە وتیان : ئەو بەستەزمانانە بکوژین ؟ جا دوای ئەوانە ژیان بۆ چیی چاکە ؟

پاشان کەعب پێشنیاری سێهەمی خستە بەردەمیان کە بریتی‌یە لەوەی کە شەوی شەممە لە ناکاودا هەڵمەت بەرنە سەر موسڵمانەکان و دەستیان لێ بوەشێنن، چونکە لەوانەیە موسڵمانەکان لەوە بێخەم بن کە ئەمان لە شەممەدا هەڵمەت بەرنە سەریان.

ئەمەشیان دایە دواوە و وتیان : شەممەکەمان لێ تێك ئەدەی ؛ بەوەی کە شتێك ئەنجام بدەین تیایا کە پێشینانمان شتی وەهایان ئەنجام نەداوە ، جگە لەوانەی کە خۆیشت ئەزانیی کە چۆن مەسخ بوون ..

ئیتر کەعب دەستی لێ شۆردن و ، کۆتایی بە کۆڕەکەی هێنا و وتی : هیچ پیاوێکتان لەو رۆژەوە کە لە دایك بووە شەوێك بە پیاوانە سەری نەناوەتەوە .

کە لەم کۆبوونەوەیەدا هیچیان بۆ نەکرا هاتنە سەر ئەوە کە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ هەوڵ بدەن تا بەڵکو وازیان لێ بهێنێ .

یەکەم هەوڵیان ئەوەبوو پیاویان نارده لای پێغەمبەری خوا ﷺ تا پێی رابگەیەنن کە ئامادەن وەك نەوەی نەضیر دوای جەنگی ئوحود کۆچیان کرد ؛ ئەمانیش بەو شێوەیە مەدینە بەجێ بهێڵن .

ئەم پێشنیارە یەکێ لە سەرۆکەکانیان بردی کە ناوی نەبباش ی کوڕی قەیس بوو. داوای مۆڵەتی کرد کە لە بنکەی فەرماندایەتیی موسڵمانان بە خزمەتی پێغەمبەری خوا بگات . کاتێك کە پاسەوانەکانی ئیسلام ئەم سەرۆکە جوولەکەیان هێنایە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ پێشنیارەکەی نەوەی قورەیظەی خستە روو کە بریتی‌یە لەوەی کە رێیان پێ بدرێ بە خۆیان و ماڵ و منداڵیانەوە دەرچن و هەرچی‌یان بە کۆڵی وشتر بۆ ئەڕوات ، جگە لە چەك ، لەگەڵ خۆیاندا بی‌بەن و هەرچیی لە یەثریب بەجێ ئەهێڵن بۆ موسڵمانەکان بێت ..

بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم رایەی وەرنەگرت و بە نێرراوی نەوەی قورەیظەی راگەیاند کە هیچ شتێ لە نەوەی قورەیظە وەرناگرێ جگە لە خۆ بەدەستەوەدانیان ؛ ئەویش بەبێ هیچ مەرجێك ..

کابرا بە دەستی خاڵیی گەڕایەوە ؛ کەچیی قورەیظە کابرایان بۆ جاری دووهەم ناردەوە تا پێشنیارێکی تر بخاتە بەردەم موسڵمانەکان ، کە بریتی‌یە لەوەی رێیان پێ بدرێ بە پیاو و ئافرەت و منداڵەوە لە یەثریب دەرچن و ، گیانی خۆیان دەرکەن ؛ ئیتر هەرچیی موڵك و سامان و پارە و پووڵیان هەیە هەمووی بۆ موسڵمانەکان بەجێ بهێڵن..

ئەمە دیارە بەو نیازەوە کە وەك جاری پێشوو حویەیی کوڕی ئەخطەب چاوپۆشیی لێ کرا ، کەچیی چوو سوپای ئەحزابی کۆ کردەوە ، ئەمجار ئەمانیش کارێکی تری لەو شێوە ئەنجام بدەن .

دیسان پێغەمبەری فەرماندە ﷺ ئەمەشی دایە دواوە و ، دووبارەی کردەوە کە ئەبێ بەبێ هیچ مەرجێك خۆیان بە دەستەوە بدەن ..

**شەشەم : ئەوبەی ئەبولوبابە**

کە نەوەی قورەیظە ئەم وەڵامەیان وەرگرت ترس و لەرز دایگرتنەوە و ، نەیان ئەزانیی چیی بکەن ، بە تایبەت کە ئابڵووقەدانەکە یەکجار شپرزەی کردبوون .

ئەمجار کەوتنە بیرکردنەوە لەوەی کە کۆمەکی‌یان بۆ بێت و ، هێزێك بگاتە فریایان، بەڵکو لە کوشتن رزگاریان بێت ، کە خۆیان ئەیانزانیی سزای ئەو ناپاکی‌یە گەورەیان هەر کوشتنە .

بیریان کردەوە کە ئەوان بە دەستی خۆیان قورەیش و غەطەفانیشیان لە خۆیان زیزکردن ، هەر چەندە ئەو هۆزانە بەو ئاسانی‌یە سوپای ماندوو و مردوویان جارێکی تر بۆ کۆ نابێتەوە ، بگرە هەر ناوێرن روو لە مەدینە بکەن !

ئەی پەنا بۆ جوولەکەی نەضیر و خەیبەر بەرن ، کە لەبەر ئەوەی سوپای ئەحزاب هیچی پێ نەکرا ، ترس و لەرز دای گرتبوونەوە . خۆ دیارە نەوەی نەضیریش بە زەلیل و داماویی دەرکرابوون و حویەیی سەرۆکیشیان وا لەناو قەڵاکانی نەوەی قورەیظەدا . کەواتە ئەوانیش شتێکیان پێ ناکرێ .

بەم شێوەیە هەموو رێیەك لەبەردەم جوولەکەدا داخرا تەنها دوو رێ نەبن :

یەکەمیان : جوولەکە دەرگای قەڵاکان بخەنە سەرپشت و هەڵمەت بدەنە موسڵمانەکان و جەنگێکی سەروماڵیی لەگەڵ موسڵمانەکاندا بکەن .

دووهەمیشیان : تەسلیم بە فەرماندەی گشتیی ئیسلام بن ، بەبێ هیچ مەرج و پەیمانێك .

هەنگاوی یەکەم بە مردووان ئەنرێت ، بەڵام بە نەوەی قورەیظە نانرێت . چونکە جوولەکەن ، جوولەکە ..

ئەگەر رۆژێك هاتە بەرەوە موسڵمانان جوولەکەیان بەو شێوە ناسیی ، ئەوسا ئەبنەوە بە شێری مەیدان ..

کەواتە تەنها ڕێگایەك لەبەردەمیاندا ماوە کە ئەویش بریتی‌یە لـە تەسـلیم بـوون بەبێ هیچ مەرجێك . دیارە جوولەکە بە هیوا بوون پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانیش وەك نەوەی قەینوقاع و نەوەی نەضیر چاوپۆشیی لێ بکا و وازیان لێ بێنێ مەدینـە بـەجێ بهێڵن.

جا بەر لەوەی تەسلیم بن ، هەوڵێکی تریان دا ، بـەو هیوایـەی سـزاکەیان شـتێك سووکتر ببێت .

ئەوەبوو دوای پشت‌گوێ‌خستنی هەردوو پێشنیارەکانی پێشەوەیان ، جوولەکـە کـۆ بوونەوەیەکیان کرد و تیایا ڕایان بە یەك دەنگیی هاتە سەر ئەوە کە پیـاو بنێـرن بـۆ لای پێغەمبەری فەرماندە ﷺ داوای لێ بکەن ڕێ بە ئەبولوبابەی هاوپـەیمانیان بـدات بێت بۆ لایان و ڕاوێژی پێ بکەن .

ئەبولوبابە یەکێ بوو لە هاوەڵە پایەدارەکان و ، لە هەمان‌دا کات‌دا لەگەڵ نـەوەی قورەیظەدا دۆستایەتیی هەبوو و ، جوولەکەش متمانەیان پێ ئەکرد ..

بۆ ئەم داوایە پێغەمبەری خوا ﷺ ماوەی دا کە ئەبولوبابە بـڕوات بـۆ لای نـەوەی قورەیظە . ئەوەبوو بانگی کرد و فەرمووی : (( إذهب إلى حلفائك فإنهم أرسلوا إليـك من بين الأوس )) . فەرمووی : بڕۆ بۆ لای هاوپەیمانەکانت ، لە ناو ئـەوس‌دا بـە دوای تۆیان‌دا ناردووە .

ئەبولوبابە چوو بۆ ناو جوولەکە و ، هەر کە چووە ناو قەڵاکەیانەوە ژنان و منـداڵان هاتن بە ڕووی‌دا و لە تاوی ئابڵووقەدا دەستیان بە گریان کرد . لەوە ئەچـێ ئەمـەیان بە دەست قەست ڕێك خستبێ تا کار بکاتە سەر دڵی ئەبولوبابـە و بـەزەیی پیایـان‌دا بێتەوە..

کە ئەبولوبابە لەگەڵ سەرۆکەکانیان دانیشت ، باسی بارودۆخی سەختی خۆیان بۆی کرد و ، پرسیشیان پێ کرد کە ئایا لە بەرژەوەنـدیی ئـەوان ئـەبێت ئەگـەر بێ‌مـەرج تەسلیم بن ؟

کە ئەبولوبابە ژن و منداڵەکانی بینیـی وا ئـەگریان و هاواریـان ئـەکرد ، بـەزەیی پیایانا هاتەوە و دڵی نەرم بوو بۆیان ، بۆیە ـ وەك خۆی دوایی دانی پیا نا ـ ناپاکیی گەورەی دەرهەق بە ئیسلام و موسڵمانان ئەنجام دا ..

ئەبوایە ئەبولوبابە خوا لێی ڕازیی بێ بە شێوەیەکی تر بەزەیی بەو ژن و منداڵانەدا بهاتبایەتەوە ، کە ئەم بەستەزمانانە بوون بە تووشی ئەو مارە ژەهراوی‌یانەوە ، کە بە

درێژایی مێژوو هەر خەریکی خیانەت و ناپاکیی بوون و ، ژن و منداڵی بەستەزمانیان بە خۆیانەوە فەوتاندووە .. ئەو بەستەزمانانە تا زوو لە دەستی ئەو بەرازانە رزگاریان بێ درەنگە .. هەتا ئەگەر بە دیل بگیرێن و ببنە کۆیلەی دەستی موسڵمانان گەلێك ژیانی دنیا و قیامەتیان چاکتر ئەبێت . هەرواش بوو ئەوانە لە پیسیی جوولەکایەتیی رزگاریان بوو و بەرە بەرە موسڵمان بوون و ، لە دنیاش و لە قیامەتیشدا سەرفراز بوون.

دوای ئەوەی کە کەعبی کوڕی ئەسەد باسەکەی خستە بەردەم ئەبولوبابە و ، بەڵێنیشان دا کە ئەگەر وڵات بەجێ بهێڵن ، جارێکی تر خەڵك لە دژی موسڵمانەکان کۆ ناکەنەوە ، راوێژی بە ئەبولوبابە کرد کە ئایا ئەو حوکمەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەربگرن ؟ ئایا لە خۆیان بێخەم بن ؟

لێرەدا هەڵەیەکی گەورە لە دەستی ئەبولوبابە دەرچوو . ئەوەبوو وەڵامی کەعبی دایەوە : بەڵێ ، لە هەمان کاتدا دەستی بۆ ملی برد و وتی : سەربڕینە . واتە تەسلیم بن ، ئەکوژرێن .

ئەبولوبابەی ئیماندار هەر ئەوەندە بوو تا دوا وشەی لە دەم دەرچوو ، خێرا هەستی بە خۆی کرد .. هەستی کرد کە چ تاوانێکی گەورەی لە دەست دەرچوو دەرهەق بە پێغەمبەر و بە ئیسلام و موسڵمانان .

ئەبولوبابە شڵەژا .. پاشان ( إنا لله وإنا إليه راجعون ) ی وت و ، لە پەشیمانییدا هەردوو چاوی لە فرمێسك پڕ بوون ..

کەس پێی نەزانیوە ، تەنها کەعبی سەرۆکی جوولەکە ئاگای لێ بوو ، چۆن ئەترسا و چۆن شڵەژا بوو .. بەسەر سووڕمانەوە پرسیی : ئەبولوبابە ! ئەوە چیتە ؟

وتی : ناپاکییم لەگەڵ خوا و پێغەمبەردا کرد . مەبەستی لە ناپاکیی ئەو ئاماژەکردنەی بوو کە بە جوولەکەی راگەیاند چارەنووسیان مردنە ، ئەگەر بچنە سەر حوکمی پێغەمبەری خوا ﷺ .

دنیا لە ئەبولوبابە هاتەوە یەك .. ویژدانی سزای ئەدا .. چ کارێکی ناشیرینی کرد؟ خێرا بە خەمباری‌یەوە قەڵای جوولەکەکانی بەجێ هێشت و گەڕایەوە دوا .. گەڕایەوە ، بەڵام لە شەرماندا نەچووە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ، بەڵکو بە چاوی فرمێسکاوی‌یەوە رووی لە مزگەوتی مەدینە نا .. ئەو شوێنە تاقانە پیرۆزەی کە هەموو جارێك ئەو هەوڵی داوە دڵ و دەروونی تێدا زاخاو بدات ، ئێستاش وای بە چاك زانیی خۆی بگەیەنەتە ئەوێ .. لەوێ بڕیاری دا خۆی بە یەکێ لە کۆڵەکەکانی

مزگەوتەوە ببەستێتەوە ، تا یا ئەوەتا ئەمرێ ، یان خوای گەورە تەوبەی لێ وەرئەگرێت.

ئەبولوبابە خۆی باسەکە ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : بەخوا هەردوو پێم لە شوێنی خۆیان دا نەجوولاند بوو ، زانیم ناپاکییم لەگەڵ خوا و پێغەمبەرەکەی‌دا کردووە .

هەرواش بوو خۆی بەست بە کۆڵەکەیەکی مزگەوتەوە ، هەتا سوێندیش ئەخوا کە هەرگیز نەچێتە لای نەوەی قورەیظە و ، لە وڵاتێکیش‌دا نەبینرێت کە تیایا ناپاکیی لەگەڵ خوا و پێغەمبەرەکەی‌دا کردووە ..

بە راستیی تاقیی‌کردنەوەیەکی یەکجار سەخت بوو بۆ هاوەڵێکی وەها بەڕێزی هەستیار .. خۆی بەست بەو کۆڵەکەوە کە دواى نوێژی بەیانیی پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی ئەهاتە لای .

پێغەمبەری خوا ﷺ سەری لە دواکەوتنی ئەبولوبابە سوڕ ئەما ، تا ئەوەبوو هەواڵەکەی پێ گەیشت و ئەویش فەرمووی : (( أما إنه لو جاءني لاستغفرت له ، فأما إذ قد فعل ما فعل ، فما أنا بالذي أطلقه من مكانه حتى يتوب الله عليه )) . فەرمووی : ئەگەر بهاتایە بۆ لای من داوای لێ خۆش بوونم بۆ ئەکرد ، بەڵام کە ئاوەهای کردووە ، ئەوا من ناتوانم بەری بدەم ، مەگەر خوا خۆی تەوبەی لێ وەربگرێ..

ئیتر کاتی دەستنوێژگرتن و نوێژکردن و پێویستیی تر ژنەکەی ئەبولوبابە و کچەکەی ئەهاتن ئەیان کردەوە ، تا پێویستیی جێ بەجێ ئەکرد و ، پاشان ئەیان بەستەوە هەروا مایەوە هەتا حەڤدە شەو ، کە لەو ماوەیەدا خەریك بوو ئەبولوبابە چاو وگوێی لە دەست بدات .

دوای تەواوکردنی ماوەی تاقیی‌کردنەوەی بەوپەڕی ئارامەوە ، خوای گەورە تەوبەی لێ وەرگرت و پێغەمبەری خوایش ﷺ بە دەستی پیرۆزی کردیەوە .

ئیبن ئیسحاق ئەڵێت : تەوبە وەرگرتن لە ئەبولوبابە لە کاتی بەرەبەیان دا هاتە خوارەوە سەر پێغەمبەری خوا ﷺ ، کە ئەوەبوو لە ماڵی ئوم سەلەمەی هاوسەری‌دا بوو..

ئوم‌سەلەمە ئەڵێت : لە بەرەبەیان‌دا گوێم لێ بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێ ئەکەنیی . ئەڵێت : وتم : بە چیی پێ ئەکەنیی ، خوا هەموو تەمەنت بکاتە پێکەنین؟

فەرمووی: (( تيب على أبي لبابة )) . فەرمووی: تەوبە لە ئەبولوبابە وەرگیرا .

ئەڵێت : وتم : ئەی مژدەی نەدەمێ ، ئەی پێغەمبەری خوا ؟
فەرمووی : (( بلی )) . ئەڵێت : ئوم سەلەمە لە دەرگای ژوورەکەی‌دا وەستا ، ئەمەش پێش ئەوەی ئایەتی حیجاب بێتە خوارەوە و ، وتی : ئەبولوبابە ! مـژدە بێـت ، خـوا تەوبەی لێ وەرگرتیت. ئـەڵێت ، خەڵکەکە هەڵمەتیان دا تا بی‌کەنەوە و بەری بـدەن . وتی : نا ، بەخوا مەگەر پێغەمبەری خـوا ﷺ بـە دەسـتی خـۆی بـەرم بـدات . کـە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ نوێژی بەیانیی دای بەلای‌دا کردیەوە .
داخۆ ئەبولوبابە چەندی پێ خۆش بووبێ کە لە ئاسمانەوە وەحی هاتبێ بۆ لێ‌خـۆش بوونی خوا لە تاوانەکەی ؟
لە خۆشی‌یانا ئەی‌ویست هەرچیی هەیە هەر هـەمووی بکـا بـە صـەدەقە ، بـەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ ئامۆژگاریی کرد کە سێ‌یەك بکـا بـە صـەدەقە بەسیەتی ، کـە فەرمووی : (( يجزيك الثلث أن تتصدق به )) .
ئەو ئایەتەی کە لەو بارەوە هاتە خوارەوە ئەمە بوو :
﴿ وَءَاخَرُونَ ٱعۡتَرَفُواْ بِذُنُوبِهِمۡ خَلَطُواْ عَمَلٗا صَٰلِحٗا وَءَاخَرَ سَيِّئًا عَسَى ٱللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴾ ( التوبة : ١٠٣ ) .
هەروەها ئەو ئایەتەش کە ئامـاژەی بۆ هەڵەکەی ئەبولوبابە تیایە ، ئـەم ئایەتەیـە کە ئامۆژگاریی ئیمان‌داران ئەکات کە نەکـەن ناپـاکیی لەگـەڵ خـوا و پێغەمبـەر و سپاردەکانیان‌دا نەکەن کە ئەفەرموێ :
﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَخُونُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓاْ أَمَٰنَٰتِكُمۡ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴾ ( الأنفال : ٢٧ ).
کە ئەبولوبابە ئامـاژەی کـرد بـە دەسـتی کـە ئـەگـەر خۆیـان بـە دەسـتەوە بـدەن چارەنووسیان مردنە ، جوولەکە دوا هیوایان بڕا و ، لە جیاتیی ئەوەی غیرەت بیان‌گرێ و دەست بدەنە جەنگ و کوشتار ، ترس و لەرز دای‌گرتنەوە و، بە تەواویی ورەیان رووخا..
نەوەی قورەیظە ئەیان‌توانیی چەند مانگێك بەرگریی بکەن ، تـا سـەرەنجام سزایان لەسەر سووك ببێ ، چونکە موسڵمانەکانیش یەکجار ماندوو و برسیی و دەست کورت بوون ، بە بۆنەی ئەوەوە کە سوپای ئەحزاب زیاتر لە بیسـت و پێـنج رۆژ نەی‌هێشت تێریش بخەون ، سەرەڕای سـەرمای زسـتانی سـەخت کـە ئـەوانیش دەسـت کـورت و بێ‌بەرگ بوون.

**حەوتەم : هێرشی موسڵمانان**

کە موسڵمانەکان گەمارۆوی جوولەکەیان دابوو لە دەشتدا بوون و سەرما و برسێتیی یەکجار بێزاری کردبوون ، بەڵام جوولەکە زۆر دەوڵەمەند بوون و ، لەناو قەڵای مەحکەمدا هیچ باکیان نەبوو .. سەرەڕای ئەوەی بیری زۆریش لەناو قەڵاکاندا هەبوون و ، بۆ ئاویش پەکیان نەئەکەوت ..

جوولەکە هەر جوولەکەن . بەڵام ئەڵێی چیی لەم زەمانەی ئێمەدا موسڵمانی بەغیرەت کەم بۆتەوە وا جوولەکە بۆتە شێری مەیدان ؟ هاکا شێری ئیسلام رۆژی هاتەوە و شێرە بەفرینەش توایەوە !!

بەو هەموو چەك و تفاقەوە خەریك بوو زیرە بکەن .. بیریان لە هەموو شتێ ئەکردەوە جگە لە شمشێر و بەرگریی ..

موسڵمانەکان ئەیانزانیی جوولەکە چەندە رووخاو و بێوورەن ؛ لەگەڵ ئەوەشدا تەسلیم نەئەبوون و دەستیی دەستییان ئەکرد ، بەڵکو شتێکیان بۆ بگات و رزگاریان ببێ .. بۆ ئەمە موسڵمانەکان کەوتنە هەڕەشە لێیان کە ئەگەر خۆیان بە دەستەوە نەدەن ، بە زۆری شمشێر دەرگای قەڵاکانیان پێ ئەکەنەوە . چونکە موسڵمانەکان یەکجار ماندوو بوون یەکەم بە بۆنەی کەمیی خۆراکەوە و ، دووهەمیش بە بۆنەی سەرما و سۆڵەوە .

بۆ ئەمە عەلیی کوڕی ئەبوطالیب ، کە هەڵگری ئاڵای موسڵمانەکان بوو ، لەگەڵ زوبەیری کوڕی عەووامی پووزایدا هەردووکیان بە دەنگی بەرز هاواریان کرد : بەخوا یا ئەوەی کە حەمزە چەشتی ئەیچەژم ، یان دەرگای قەڵاکەیان ئەکەمەوە .

کە جوولەکە ئەم هەڕەشەیان بیست و ، بە چاویشەوە بوون وا کەتیبەکانی سوپای ئیسلام کەوتنە جم و جووڵ و خۆیان بۆ هێرشی گشتیی ئامادە ئەکەن ، تا قەڵاکان بگرن ، داوایان کرد با موسڵمانەکان هێرش بووەستێنن و ، ئامادەن خۆیان بە دەستەوە بدەن و ، بەبێ هیچ مەرجێك قبووڵی حوکمی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەکەن .

موسڵمانەکان هێرشیان وەستاند و ، جوولەکە هاتن دەرگای قەڵاکانیان کردەوە و ، هەموو چەکیان فڕێ دا و ، بۆ خۆ بەدەستەوەدان لە قەڵاکان هاتنە دەرەوە . خێرا سەربازانی خوا دەوریان لێ گرتن و لەلایەکەوە کۆیان کردنەوە ، هەتا هەموویان هاتنە دەرەوە . پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا هەرچیی پیاوی باڵغیان بوو بگیرێن و

کۆت بخرێته دەستیانەوە . ئەمەش بە سەرپەرشتیی فەرمانـدەی پاسـەوانی ئیسلام موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی ئەنصاریی .

بەڵام ژن و منداڵ لە پیاوەکان جیا کرانەوە و ، خرانە لایەکەوە و ، بـە عەبـدوڵڵای کوڕی سەلام سپێرران . کە هەموو خەڵکەکـە جیـا کرانـەوە ، پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمانی دا پیاوەکان لە بەندیخانەیەکی تایبەتییدا بەند بکرێن . ئـەوەبوو نزیکـەی هەشت صەد پیاویان لە ماڵی ئوسامەی کوڕی زەید بەند کران .

ژن و منداڵیش لە شـوێنێکدا دەسـت بەسـەر کـران ، بـەڵام وەك پیاوەکـان بەنـد نەبوون. ئەوان لە یانەی میوانداریی‌دا مانەوە ، کە ماڵی کچی حەرثـی نەجاریی بـوو و، بە هەمیشە بۆ میوانی مەدینە تەرخان کرابـوو . ئـەم ژن و منداڵانـەش نزیکـەی هەزار کەس ئەبوون .

**هەشتەم : بڕیاری سەعد**

لە پێشەوە باس کرا کە پێش هـاتنی ئیسـلام هـۆزی ئـەوس و نـەوەی قـورەیظـە هاوپەیمان بوون و ، کە ئیسلامیش هات قەدەغەی ئەو دۆستایەتی‌یەی نەکرد.

کە ئەوس دی‌یان وا هاوپەیمانەکانیان دەستگیر کران ، چەند پیـاوێکی ناوداریـان چوون بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا تا قسەیەکی بەسوود بۆ جولەکە هاوپەیمانـەکانیان بکەن . دیارە ئەمەش لە وەفای خۆیانەوە .

کە نوێنەرەکان بە خزمەتی گەیشتن داوایان کرد کە سزای ئـەو جوولەکانـە سـووك بکـات . ئـەوەبوو ئـەوەیان هێنایـەوە یـادی پێغەمبـەری خـوا ﷺ کـە چـۆن تکـای عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی وەرگرت کاتێ کە تکای بۆ نەوەی قەینوقاع کـرد تـا سـزایان سووك بکات ، چونکە ئەو جوولەکانە ئەو کاتـە هاوپـەیمانی هـۆزی خـەزرەج بـوون . داوایان ئەکرد کـە هـیچ نـەبێ بـا نـەوەی قـورەیظـەش لـە مەدینـە دەربکـرێن و نەکوژرێن..

بەڵێ نەوەی قورەیظە ناپاکیی گەورەیان ئەنجام دابوو ، بەڵام پێغەمبـەری خـوا ﷺ بە بۆنەی سۆز و بەزەیی دڵیەوە و ، بۆ ڕاگیرکردنی دڵی ئـەو هاوەڵانـەی کـە باوەشـی خزمەتیان بۆ ئیسلام کردەوە ، نەی‌ویست پاڕانەوەکـەیان بداتـە دواوە .. چـونکە بـە دڵسۆزیی هاوەڵان بوو وا ئیسلام بنکـەی بـەهێزی وەك مەدینـەی دەسـت کـەوت و ، هاوەڵان بە تەواویی خۆیان کردبووە فیداکاری ئیسلام .

بۆ ئەمە پێغەمبەری خوا ﷺ چارەنووسی ئەو جوولەکانەی دایە دەست هۆزی ئەوس . ئەوەبوو کاری نەوەی قورەیظەی خستە دەستی سەرداری ئەوس ، سەعدی کوڕی موعاذ و ، ئەوسیش زۆریان پێ خۆش بوو و ، هیوایان هەبوو سەعدی سەرداریان سزای هاوپەیمانەکانیان کەم بکاتەوە ، کەچیی بە پێچەوانەوە بڕیاری سەعد بەو شێوە نەبوو کە ئەوس بە تەمای بوون .

هەر کە ئەوس بیستیان وا کاری نەوەی قورەیظە لەلایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ درایە دەست سەعدی سەرداریان ، کۆمەڵێك لە سەرۆکانی ئەوس گەڕانەوە بۆ مەدینە تا بچنە لای سەعد و داوای لێ بکەن کە بڕیارێکی بەڕەحمانە بۆ جوولەکە دەربکات.

سەعد بەشداریی ئابڵووقەی نەوەی قورەیظەی نەکردبوو ، چونکە لە مەدینە بوو و، خەریکی چارەسەرکردنی برینە سەختەکەی بوو کە لە غەزای خەندەق‌دا زامدار بووبوو و دەماری خوێن‌بەری پچڕا بوو .

لە مزگەوتی مەدینەدا بە فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ چادرێك بۆ ئافرەتێکی ئیمان‌داری صالحە هەڵ درابوو ، کە ناوی ( روفەیدە ) بوو ، تا لە پێناویی خوادا ، دەرمانی ئەو زامدارانە بکات کە کەسیان نەبوو چارەسەریان بکات .

کە سەعد زامدار بوو کەس و کاری زۆر بوون و دەسەڵاتیان هەبوو دەرمانی سەعد بکەن ، بەڵام لەبەر خۆش‌ویستنی سەعد پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا بە خزمەکانی تا سەعد لە مزگەوت لای ئەو ئافرەتە شارەزایە بهێڵنەوە ، تا سەعد لە خۆیەوە نزیك بێت و زوو زوو هەواڵی بزانێ .

بەڵێ ، ئەو پیاوانە هاتنە لای سەرداری گەنجی زامداریان و بڕیارەکەی پێغەمبەریان پێ ڕاگەیاند ، تا ئەو بڕیارێك بۆ چارەنووسی نەوەی قورەیظە دەربکات.

بۆ ئەمەش پێویستە بچێت بۆ ئەو شوێنەی کە سوپای ئیسلام ئابڵووقەی نەوەی قورەیظەی دابوو . بەڵام زامەکەی سەعد سەخت بوو و ، خۆیشی لاشەی بەخۆوە بوو ، خزمەکانی وڵاغیان بۆ ئامادە کرد تا بە سواریی ئەو وڵاغە بگاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ . کە کەوتە ڕێ پیاوماقووڵانی ئەوس کەوتنە گەڵی و ، ئەوەیان بە گوێی‌دا ئەدا کە بەزەیی بە قورەیظەی هاوپەیمانیان‌دا بێتەوە .

کە ئەو باسەیان زۆر دووبارە کردەوە ، پێی ڕاگەیاندن کە ئەوەی شیاو بن ئەوەیان بۆ بڕیار ئەدات و ، هاوپەیمانێتیی سزای شیاوی خۆیانیان لە بیر ناباتەوە .

پێی وتن : ئێستە کاتی ئەوە هاتووە کە سەعد لەبەر ڕەزامەندیی خوا گوێ بە گلەیی هیچ گلەیی‌کەرێك نەدات .

جا لەبەر ئەوەی کە سەعد خاوەنی پلە و پایەیەکی تایبەتیی بوو بەلای پێغەمبەری خوا ﷺ و ، بەلای موسڵمانەکانیشەوە ، کە لە بنکەی پێغەمبەری خوا ﷺ نزیك کەوتەوە ، پێغەمبەر فەرمانی بەسەر ئەو موسڵمانانەدا دا کە لە دەورو بەری‌دا بوون تا لەبەر سەعد هەڵ بسنەوە و بچن بە پیریەوە کە فەرمووی: (( قوموا إلى سيدكم )). ئەوانیش هەڵسان و دوو ریز وەستان و بەخێرهاتنیان کرد ، هەتا گەیشتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ .

کە سەعد دانیشت پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو : (( أحكم فيهم يا سعد )) . وتی : خوا و پێغەمبەرەکەی بە حوکم دەرکردن شایان‌ترن . فەرمووی : (( قد أمرك الله أن تحكم فيهم )) . فەرمووی : خوا فەرمانی داوە تۆ حوکمیان بۆ دەربکەیت .

سەعد ئەیزانیی خزمەکانی ئەوەیان پێ خۆشە کە بۆ نەوەی قورەیظە دەست دانەگریّ ، لەبەر ئەوە پێی خۆش بوو کە هەموو لایەك : پێغەمبەر و هۆزی ئەوس و نەوەی قورەیظە ، دەری ببڕن ڕەزامەندی‌یان لەسەرە ئەو حوکم دەر بکات و ، هەر بڕیارێکی دەرکرد هەموویان پێی رازیی ئەبن .

بۆ ئەمە لە ناو سوپای موسڵمانان‌دا وەستا و بە تایبەتیی رووی لە هۆزی ئەوسی کەس‌وکاری و ، بە گشتییش لە هەموو سەربازە موسڵمانەکان کرد و پێی وتن : بەڵێن و پەیمان بە خوا ئەدەن کە حوکم و بڕیار بەو شێوە ئەبێ کە من دەری ئەکەم ؟ وتیان : بەڵێ . پاشان وەك پرس بە پێغەمبەری خوا ﷺ بکات رووی لەویش کرد و ئاماژەی بۆ لای ئەو کرد ، پاشان لەبەر ڕێزلێنانی رووی لێ وەرگێڕا و وتی : ئەو کەسەش کەوا لێرەدا ؟ ئاماژەی بۆ ناو چادرەکە کرد . فەرمووی : (( نعم )) . پاشان ئاماژەشی بۆ نەوەی قورەیظە کرد کە لەلایەکی سەربازگەکەوە بەند کرابوون و پێی وتن : ئایا ئێوەش بە حوکمی من رازیین ؟ وتیان : بەڵێ .

دوای ئەم وت و وێژانە سەرەی سەعد هات کە بڕیاری کۆتایی بۆ چارەنووسی جوولەکەی نەوەی قورەیظە بدات . جوولەکە چاك گوێ‌یان هەڵۆڵ کردبوو تا جوانتر بڕیارەکەی سەعد ببیستن و ، چاویشیان زاق بوو بوو و ، تەپەی دڵیشیان ئەهات..

سوپای ئیسلامیش هەرهەموو چرکەیان لە خۆیان بڕیی بوو هەتا بزانن سەعد چ حوکمێك دەرئەکات ، دەرهەق ئەو پێڕە پیسەی کە مرۆڤایەتیی بە دەست پیلانیانەوە گیری خواردووە؟

بەڵێ ، سەعد بڕیاری دەرکرد چیی نێرینەی بالغی نەوەی قورەیظە هەیە هەر هەموویان بە شمشێر لە ملیان بدرێ و ، چیی ژن و منداڵیشیان هەیە بە دیل بگیرێن و، ماڵ و سامانیشیان هەمووی دەستی بەسەردا بگیرێ .. دوای ئەوە بە ئیجتیهادی خۆی بڕیاری دا خانووەکانی نەوەی قورەیظە بدرێن بە موهاجیران ، چونکە ئەوان ماڵ و سامان و خانووبەرەیان لە مەککە بۆ کافرەکان بەجێ هێشتووە و ، لە دەست ئازاری قوڕەیش بە خۆیان و دینەکەیانەوە هەڵاتوون . ئەمەش تا باری سەرشانی ئەنصاریش سووك ببێت.

کە سەعد ئەم بڕیارەی دەرکرد هۆزی ئەوس هیچ ناڕەزایی‌یەکیان دەرنەبڕیی ، چونکە لە پێشەوە بەڵێنیان پێ دابوو کە رازیی بن .

بەڵام جوولەکە کە ئەو بڕیارەیان بیست وەك هەورە تریشقە لێ‌یان بدا واقیان وڕما و بێ‌دەنگ دەمیان دادڕیی ، بەڵام هیچ ناڕەزایی‌یەکیان دەرنەبڕیی چونکە بەبێ هیچ مەرجێك تەسلیم بە سوپای ئیسلام بووبوون و ، دوای ئەوەش دوای تەسلیم بوونیان بە حوکمی سەعد رازیی بوون .

بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ کە گوێی لە حوکمەکەی سەعد بوو ، فەرمووی :

(( حکمت فیهم بحکم الله من فوق سبع سموات )) . فەرمووی : ئەو حوکمەی کە دەرت کرد بۆیان حوکمی خوا بوو لە سەرووی حەوت ئاسمانەکەوە .

کە سەرنجی هەڵوێستی سەعدی کوڕی موعاذ ئەدەین کە کاری نەوەی قورەیظە دراوەتە دەستی و ، خزمەکانی داوای لێ ئەکەن کە رەحم و سۆز بەرامبەر بە هاوپەیمانەکانیان بە کار بهێنێ و ، لەولاشەوە جوولەکە بە تەمای دۆستایەتیی کۆن بوون کە دڵی سەعد نەرم بکات بەرامبەریان و حوکمێکی ئاسانیان بۆ بدات ، سەعد وەك پیاوێکی لێپرسراو لە چارەنووسی ئیسلام و موسڵمانان .. وەك فەرماندەیەك کە خەمی دینەکەیان بخوات ، ئەوەی لە یاد نەچوو بوو کە کاتێك سوپای ئەحزاب هاتنە قەراغی خەندەقەکە و ، جوولەکەی نەوەی قورەیظە لە جیاتیی ئەوەی کە بێنە کۆمەکیی موسڵمانەکان ، پەیمانیان شکاند و ، ناپاکی‌یان لەگەڵ موسڵمانان‌دا ئەنجام دا .. لە یادی نەئەچوو چۆن ئیسلام و موسڵمانەکان و مەدینە و هەرچیی باخ و

بەروبووم و ماڵ و سامانیان هەبوو هەر هەمووی چاوەڕوانی تیاچوونی لێ ئەکرا ئەگەر خوای گەورە خۆی بەو دەسەڵاتەیەوە موسڵمانەکانی رزگار نەکردایە ..

لە یادی بوو ئەگەر سوپای ئەحزاب سەربکەوتایە شەرەف و نامووسی موسڵمانان ئەکەوتە دەست دوژمن ، نەوەی قورەیظەش بێشەرمانە پاڵیان دا بەو سوپا مل هوڕەوە، تا ئەوەبوو کە کاتێ خزمەکانی سەعد بۆ جوولەکە پاڕانەوە سەعد وتی : ئێستە کاتی ئەوە هاتووە کە سەعد لەبەر رەزامەندیی خوا گوێ بە گلەیی هیچ گلەییکەرێك نەدات .. تا ئەوەبوو ئەو حوکمەی دەرکرد بۆیان ..

کاتێ کە نەوەی قورەیظە هەڵ گەڕانەوە ، سەعد یەکێ بوو لەو نوێنەرانەی کە چوون بۆ لای جوولەکە ، تا ئامۆژگاری‌یان بکەن و داوایان لێ بکەن کە پارێزگاریی لە پەیمانەکەیان بکەن و ، لە جیاتیی ئەوەی کۆمەکیی موسڵمانەکان بکەن ، نەبنە دوژمنیان .. سەعد لەوێ بوو ئەو ناپاکانە چۆن جنێویان بە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەدا و ، لەو ساتە ناسکەدا بەبێ شەرمانە پەیمانیان شکاندەوە و ، بە شانازی‌یەوە بۆ ریشەکەن‌کردنی موسڵمانەکان بەشداری‌یان ئەکرد ..

ئەو رۆژە سەعد دڵی لە خۆی داما کە ئەو ناپاکە بێشەرمانە چەند نامەردانە هاتن بە دەمیەوە و ، بۆی دەرکەوت کە جوولەکە چەند سووك و بێ‌نرخە و ، بۆ هیچ پیاوەتی‌یەك ناشێت لەگەڵیا بکرێت .. هەتا زوو تۆویان ببڕێتەوە درەنگە ..

سەعد ئەو رۆژە دانی بە خۆی‌دا گرت و ، ئامۆژگاریی نەوەی قورەیظەی کرد ، کە با ئاگادار بن نەوەکو رۆژێکی وەك رۆژەکەی نەوەی نەضیر ، یا لەویش رەش‌تر یەخەیان پێ بگرێت . کەچیی جوولەکە بە قسەی سووك وەڵامی سەعدیان دایەوە و ، جنێویان بە پێغەمبەری خوا دا .. بۆ ئەمە هەمووی سەعد زۆر داخ لە دڵ بوو .. لە خوایەکی ئەویست رۆژێ بێتە بەرەوە کە بە دڵی خۆی تۆڵە لەو رەش مارانە بکاتەوە..

کاتێکیش کە لە جەنگی خەندەق‌دا بە سەختیی زامدار بوو لە خوا پاڕایەوە و ، وتی: خوایە ! ئەگەر جەنگی قوڕەیش شتێکی ماوە ، ئەوا بم هێڵە بۆی ، چونکە هیچ کۆمەڵێك نیە ئەوەندەی ئەوان پێم خۆش بێ جیهادیان بکەم ، چونکە ئەوانە کۆمەڵێك بوون کە ئازاری پێغەمبەرەکەتیان دا و بە درۆیان خستەوە و دەریشیان پەڕاند . خۆ ئەگەر جەنگیشت لە نێوانمان‌دا هەڵ گرتووە ، ئەوا ئەم زامداری‌یەم بکە بە شەهادەت بۆم ، بەڵام داوا ئەکەم کە نەم‌کوژی هەتا چاوم بە تیاچوونی قورەیظە گەش ببنەوە.

هەروایش بوو ، هەر چەندە زامەکەی سەخت بوو ، کە ئەو دوعایەی کرد زامەکەی خوێنی وەستا هەتا جوولەکە تەسلیم بوون و کاریان درایە دەست سەعد و ئەویش ئەو بڕیارەی بۆ دەرکردن و ، بەشداریی کوشتنی هەموویانی کرد و ، دوای ئەوە خوێنی دەمارەکەی بەر بوویەوە و ، مرد . دیارە دوای ئیعدام کردنی نەوەی قورەیظە.

لە صەحیحی بوخاریی و موسلیمدا لە جابیرەوە هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە : (( إهتز عرش الرحمن لموت سعد بن معاذ )) . فەرموویە : بۆ مردنی سەعدی کوڕی موعاذ عەرشی خوا هاتە لەرزە . دیارە لەرزەی پێ خۆش بوون بە هاتنی ڕۆحەکەی .

لە حەدیثی ئەنەسەوە تیرمیذییش بە صەحیحی دەرکردووە کە وتوویە : کاتێ کە جەنازەکەی سەعدی کوڕی موعاذ هەڵ گیرا ، موونافیقان وتیان : جەنازەکەی چەند سووکە ! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( إن الملائكة كانت تحمله )) . فەرمووی: مەلائیکە هەڵیان گرتبوو .

ئەوەبوو جبەیەکی نەرم و شل پێشکەش بە پێغەمبەری خوا ﷺ کرا و ، هاوەڵان لە نەرم و شلیی ئەو جبەیە سەرسام بوون ، ئەویش فەرمووی : (( أتعجبون من هذه؟ لمناديل سعد بن معاذ في الجنة خير منها أو ألين )) . فەرمووی: ئەمەتان بەلاوە سەیرە؟ دەستەسڕەکانی سەعدی کوڕی موعاذ لە بەهەشت دا لەمە چاکترن ، یان نەرم ترن.

**نۆهەم : جێبەجێ کردنی بڕیارەکە**

دوای ئەوەی سەعد ئەو بڕیارەی دەرکرد ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بۆ سوپای ئیسلام دەرکرد کە بەرەو مەدینە بگەڕێتەوە و خۆیشی گەڕایەوە ، ئەمەش لە ڕۆژی حەوتەمی مانگی ذولحەججەی ساڵی پێنجەمدا بوو ..

هەروەها فەرمانی دا نەوەی قورەیظە بهێننەوە بۆ مەدینە .. ئەوەبوو پیاوەکان بە سەروکاریی موحەممەدی کوڕی مەسلەمە و ، ژن و منداڵەکانیش بە سەروکاریی عەبدوڵڵای کوڕی سەلام ـ کە زانایەکی جوولەکە بوو و ، سەرەتا کە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە مەدینە عەبدوڵڵا ئیمانی پێ هێنا ـ برانەوە بۆ مەدینە و وەك باس کرا پیاوەکان لە ماڵی ئوسامەی کوڕی زەید بەند کران و ، ژن و منداڵەکانیش ، بەبێ بەندکردن ، لە خانەی میوان داریی‌دا دانران .

دوای ئەوە فەرمان درا بە هەڵ کەندنی چاڵی قووڵ تا لاشەی پیسی ئەو ناپاکانەیان تێ فڕێ بدرێ ، ئەمەش لە ناو بازاڕی مەدینەدا ، کە ئێستە پێی ئەوترێ : بازاڕی

( مناخه ) . شوێنێکیش بۆ دانیشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵە ناودارەکانی چاك کرا . پاشان پیاوەکانی نەوەی قورەیظە کە حوکمی ئیعدامیان بەسەردا درابوو ئامادە کران و ، یەك لە دوای یەك و دەستە بە دەستە ئیعدام ئەکران ، هەتا یەکێکیان نەما . جا هەرچیی کە کۆمەڵێك ئەکوژران ، خێرا هاوەڵان هەڵیان ئەدانە چاڵەکانەوە و بە خۆڵ دایان ئەپۆشین .

هەندێ لە مێژوونووسان ئەڵێن : شەش صەد تا حەوت صەد و ، هەندێکیش ئەڵێن: هەشت صەد تا نۆصەد کەس ئەبوون .

ئەم جوولەکانە هەر هەموویان بە شەوێك کوژران و ، ئەوەی کە سەروکاریی کوشتنی ئەکردن ، عەلیی کوڕی ئەبوطالیب و زوبەیری کوڕی عەووام بوون ..

جا لەبەر ئەوەی وەها لە قەڵەم درابوو کە ئەوس پێیان خۆش نەبێ قورەیظە بکوژرێن ، هەندێ لە سەردارەکانی ئەوس داوایان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد کە با لە ئیعدام کردن‌دا چەند پیاوێکی هۆزی ئەوسیش بەشداریی بکەن . ئەمەش بۆ ئەوەی ئەو تاوانەیان لێ دوور بکەوێتەوە ..

پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی ئامادەی ئەم ئیعدام‌کردنە بوو .. ئەوەبوو سەرۆکی فیتنە و ، هەڵگیرسێنەری جەنگی ئەحزاب ، حویەیی کوڕی ئەخطەبی سەرۆکی نەوەی نەضیر سەرەی هات تا لە ملی بدرێ .. ئەم ئاژاوە چی‌یە بوو نەوەی قورەیظەی لە پەیمان هەڵ گێڕایەوە و ، هەڵیشی نان تا لە دواوە خەنجەری ناپاکیی بۆ موسڵمانەکان، لە کاتی یەکجار ناسکی مێژوویاندا ، بەرز بکەنەوە .

حویەیی ناپاك بەری ڕەنج و تەقەلای خۆی هاتەوە بەردەم .. ئەویش وەك نەوەی قورەیظە خۆی بە دەستەوە دا و ئەو ڕۆژە لەگەڵ ئەوان‌دا ، ئەویش ئیعدام کرا..

کاتێك کە حویەیی هێنرایە پێشەوە بۆ کوشتن ، تا لەو کاتەش‌دا هەر خەریك بوو دژایەتیی و رق بوونەوەی لە پێغەمبەری دەرئەبڕیی . کە هێنرایە پێشەوە هەردوو دەستی بە ملیەوە بەسترابوون .

کە پێغەمبەری خوا ﷺ سەیری کرد وتی : بە خوا لۆمەی خۆمم نەکردووە لەسەر دژایەتییت ، بەڵام هەرکەس پشتی ڕێی خوا بەربدا خوایش پشتی ئەو کەسە بەر ئەدات..

لە ( الروض ) ی سوهەیلیی‌دا وەها هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ کە بە باڵ بەستراویی حویەیی کوڕی ئەخطەب ئەبینێ پێی ئەفەرموێ : « ألم یمکن الله

منـك ؟ )) . فەرمووی : ئایا خوا چاری نەکردیت ؟ وتی : بەڵێ ، هەرکەس پشتی تـۆ بەربدا خوایش پشتی ئەو بەر ئەدات . لەگەڵ ئەوەش‌دا حویەیی هیچ ترس و بیمێکـی دەرنەئەبڕیی ، بەڵکو لەوپەڕی ئازایەتیی‌دا لە ئیعدام ئەچووە پێشەوە .

کـاتێ کـە هێنایان بۆ مەیدانی کوشتن ، داوای کرد مۆڵەتی بدرێ تا قسە بکات . کە مۆڵەتی وەرگرت وتی :

خەڵکینە ! فەرمان فەرمانی خوایە . ئەمە کتێـب و قەدەرێکـە خـوا لـە چـارەی نەوەی ئیسرائیلی نووسیوە ..

دوای ئەوە دانیشت و لە ملی درا و ، موسڵمانان لاشەکەیان هەڵدایە ناو چاڵەکەوە..

شایانی باسە کە لەم پیاوە خراپە صەفیەی کچی حویەیی کەوتۆتـەوە کـە دوای فـەتحی خەیبەر و کوژرانی مێردەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ مارەی ئەکات و ، ئەبێتە دایکی ئیمـان داران و ئەچێتە ریزی ئافرەتە موسڵمانە پایەدارەکانەوە ..

بـەڵێ لـە سـەردەمە پێشـووەکان‌دا مرۆڤـە زیـرەك و ئازاکـان ئەبوونـە گـەورە و بەدەسەڵات ، بۆیە بەش بە حاڵی خۆیان سەردار و گـەورەکان غـیرەت و جوامێرییـان بەلاوە هەبوو .. بەڵام لەم سەردەمەی سیاسەت‌دا هەرچیی تەمەڵ و ترسنۆك و گەندەڵ بێت ئەبێتە کاربەدەست .. ئەوانەی چاوشۆڕی بەردەمی ستەم‌کارانی جیهانن و ، هیچ سیفەتێکی مەردایەتی‌یان تیا بەدیی ناکرێ .. ئەوەتا حویەیی لەو رۆژە رەشـەدا دەری ئەخات کە هەندێ دامەزراویی و نەترسـانی بـەلاوە هەیـە و ، باکیشـی لـە رووداوی رۆژگار نیە ..

دوای ئیعدام‌کردنی سەرۆکی نـەوەی نـەضـیر ، نۆبـەی کوشـتنی سـەرۆکی نـەوەی قورەیظە، کەعبی کوڕی ئەسەد هات .. پاسەوانان ئەویشیان هێنایە مەیدانی کوشتن.

شایانی باسە کە کەعب پیاوێکی ژیر و بەسـەلیقە بـوو و ، حـەزی لـە پاراسـتنی بەرژەوەندیی هۆزەکەی بوو و ، پێیشی خۆش نەبوو پەیمانی نێوان خـۆی و موسـڵمانان بشکێنێ .. هەتا حەزی لە موسڵمان‌بوونیش بوو ، بۆیە داوای لە جوولەکەکان کرد کە با ئیمان بهێنن ، کەچیی ئەوان بە گوێ‌یان نەکرد و ، موسـڵمان نـەبوون ، سـەرەنجام بەدبەختیی یەخەی بە هەموویان گرت و ، شەیتانی نەوەی نەضیر هەڵی خەڵەتانـدن و قوڕبەسەری کردن .

کەعب پیاوێکی هێمن و لەسەرخۆ و بەئەدەب بوو . کاتێك کە سەربازە پاسەوانەکان هێنایان تا ئیعدام بکرێت ، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فـەرموو : (( یـا کعـب ! )) وتـی :

بەڵێ ، ئەی ئەبولقاسم ! فەرمووی : (( ما انتفعتم بنصح ابن خراش لكم وكان مصدقاً بي، أما أمَرَكُم باتباعي وإن رأيتموني تُقرِؤني السلام ؟ )) . فەرمووی: کەڵکتان لە ئامۆژگاری یەکانی ئیبن خەڕاش[٤٥] وەرنەگرت کە ئەو تەصدیقی منی کردبوو . ئەی فەرمانی پێ نەدان کە شوێنم بکەون و ، گەر منتان دیی سەلامم لێ بکەن ؟

کەعب وتی : بەڵێ ، ئەی ئەبولقاسم ! بە تەورات وایە و ، گەر جوولەکەش بەوەیان دانەنابایە کە من لە شمشێر ترساوم ، شوێنت ئەکەوتم . بەڵێ کەعبی جوولەکەش بەش بە حاڵی خۆی غیرەت و وەفای لەلایە، چونکە دەستی سیاسەتی ئەم زەمانەی پێ نەگەیشتووە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا هێنایانە پێش و بە شمشێر ملیان پەڕاند . هەموو پیاوەکانی هۆزی قورەیظە لەسەر ناپاکییان کوژران ، بەڵام ژنان شیاوی کوژران نەبوون، چونکە نە حەدیان لەسەر بوو ، نە قیصاص و ، نە بەشداریی جەنگیان کردبوو، جگە لە تاقە ئافرەتێکیان ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا لە بری خوێنی پیاوێکی موسڵمان بکوژرێتەوە .

ئەم ئافرەتە ناوی ( مەزینە ) بوو و ، لە کاتی کوشتنی پیاوەکاندا لە ماڵی خاتوو عائیشە بوو و ، پاسەوانان هاتن و لەناو ئافرەتەکاندا تەنها داوای ئەویان کرد .. کە بانگیان کرد : مەزینە لە کوێیە ؟ وتی : بەخوا منیان ئەوێ . عائیشە پێی وت : ئەوە چیتە ؟

وتی : ئەکوژرێم .. پیاوەکەم کوشتمی .

عائیشە پرسیی : مێردەکەت چۆنی کوشتی ؟

وتی : فەرمانی بەسەرمدا دا کە دەستهارێك بەسەر کۆمەڵێك لە هاوەڵانی موحەممەددا بەربدەمەوە کە لە سێبەری قەڵاکەدا دانیشتبوون . ئەوەبوو خەللادی کوڕی سوەیدی پێکا و سەری لەت کرد و پێی مرد.. وا منیش لەسەری ئەکوژرێمەوە. شایانی باسە کە مێردی ئەم ئافرەتە ناوی حەسەنی قەرەظیی بووە .

هەروەها لە ناو پیاوەکانی نەوەی قورەیظەش دا تاقە پیاوێك لە کوشتن رزگاری بوو، کە ناوی ریفاعەی کوڕی سەمەوئەلی قەرەظیی[٤٦] بووە . پێغەمبەری خوا ﷺ کردوویەتیە

---

[٤٥] وەك لە پێشەوە باس کرا ئیبن خەڕاش زانایەکی گەورە و خواناسی جوولەکە بووە ، کە پێش هاتنی ئیسلام مردووە. هەمیشە ئامۆژگاریی جوولەکەی ئەکرد کە شوێنی پێغەمبەری ئاخرزەمان بکەون ..

[٤٦] ریفاعەی کوڕی سەمەوئەلی قەرەظیی بە چاکیی موسڵمان بووە و ، بۆتە هاوەڵێکی پایەدار و لە صەحیحی بوخارییشدا ناوی هاتووە .

خاتری ئافرەتێکی نەوەی نەججار، کە ناوی سەلمای کچی قەیس بووە،[٤٧] ئەو پیاوە بالّغ بوو بوو بەلاّم پەنای بردە لای سەلما و ئەویش چووە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! دایك و باوکم بە قوربانت بێ ریفاعە بە من ببەخشە ، چونکە وای دەرئەبڕێ کە نوێژ ئەکات و گۆشتی وشتر ئەخوات . ئەویش بەخشیی بەو .

**دەهەم : وەفای موسلّمان**

لە کاتی ئیعدامکردنی نەوەی قورەیظەدا ڕووداوێکی تری سەیر ڕووی دا .

جەنگاوەرێکی جوولەکە ناوی زوبەیری کوڕی باطا بوو و ، لە سەردەمی نەفامییدا چاکەی لەگەڵ یەکێ لە هاوەڵاندا کرد بوو ، کە ناوی ثابیتی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماسی خەزرەجیی بوو ، جا ئەم هاوەڵە پێی خۆش بوو پاداشتی چاکەی ئەو جوولەکەیە بداتەوە ..

بۆ ئەمە ثابیت چووە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و باسی چاکەی ئەو جوولەکەیەی کرد و ، داوای لێ کرد چاوپۆشیی لەو جوولەکەیە بکات کە فەرمانی کوشتنی دەرچووە ، تا پاداشتی چاکەکەی بداتەوە . پێغەمبەری خواش ﷺ ڕەزامەندیی لەسەر ئەم پێشنیارە دەربڕیی ، بەلاّم دوای دەرچوونی ئەم بڕیارە زوبەیری جوولەکە پێی ڕازیی نەبوو ، بەڵکو داوای ئەکرد ئەمیش وەك جوولەکەکانی تر بکوژرێت.

ئەو چاکەیەی کە زوبەیر لەگەڵ ثابیتدا کردبووی ئەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی نەفامیی پێش هاتنی ئیسلام .. کاتێك کە نەوەی قورەیظە و هۆزی ئەوس لەلایەکەوە و، نەوەی قەینوقاع و نەوەی نەضیر و خەزرەج لەلایەکی ترەوە هاوپەیمانی یەکتر بوون.. کاتێك کە جەنگی بوعاث ڕووی دا ، ثابیتی کوڕی قەیس کە خەزرەجیی بوو بە دیلیی کەوتە دەست فەرماندەی جوولەکە زوبەیری کوڕی باطا . زوبەیر دوای ئەوەی قژی پێشەوەی ثابیتی بڕیی ، ثابیتی ئازاد کرد و ، ثابیتیش هەر لە یادی بوو. بۆیە کە قورەیظە خۆیان بە دەستەوە دا ، ثابیت پێی خۆش بوو چاکەی زوبەیر بداتەوە.

---

[٤٧] سەلمای کچی قەیسی کوڕی عەمری کوڕی عوبەیدی نەججاریی ئەنصارییە ، کە نازناوی ( أم المنذر ) ە وتوویە : لەگەڵ ئەو ئافرەتانەدا کە بەیعەتیان بە پێغەمبەری خوا دا منیش بەیعەتم دا . سەلما پێیشی ئەوترا پووری پێغەمبەری خوا ﷺ چونکە دایکی عەبدوڵلاّی باوکی لە نەوەی نەججارە ، کەواتە نەوەی نەججار خاڵوانی عەبدوڵلاّی کوڕی عەبدولموطەللیبن . بەمە بە خاڵوانی پێغەمبەریش ئەژمێررێن . سەلما لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژی هەردوو قیبلەکەی کردووە .

ثابیت هات بۆ لای زوبەیر و پرسیاری لیٚ کرد کە ئایا ئەیناسیٚتەوە ؟

وتی : جا پیاوی وەکو من ئەگونجیٚ پیاوی وەکو تۆ نەناسیٚت ؟

ثابیت وتی : پیٚم خۆشە پاداشتی ئەو چاکەیەت بدەمەوە .

وتی : پیاوی بەخشندە پاداشتی پیاوی بەخشندە ئەداتەوە .

کاتیٚك کە ثابیت مژدەی چاوپۆشیی لیٚکردنی بە زوبەیر دا ، زوبەیر وتی: پیاویٚکی پیری بەساڵدا چوو و بیٚماڵ و منداڵ ژیانی بۆ چییە ؟

بۆ ئەمە ثابیت دیٚتە خزمەتی پیٚغەمبەری خوا ﷺ و داوای ژن و منداڵەکەی زوبەیر ئەکات تا بیان‌بەخشیٚ بەو، کە پیٚی ئەبەخشیٚ دیٚتەوە بۆ لای زوبەیر تا مژدەی بداتیٚ.

ئەڵیٚت : خاوخیٚزانیٚك لە حیجازدا ماڵ و سامانیٚکیان نەبیٚ ، مانیان بۆ چیی چاکە؟

دیسان ثابیت هەوڵی دا ماڵ و سامانەکەشی بۆ وەربگریٚتەوە و ، کە مژدەی ئەوەشی پیٚ دا ، کابرای جوولەکە پرسیی :

ئەی ثابیت ! ئەو کەسەی کە دەم و چاوی وەك ئاویٚنەی چینیی وەهابوو و کچانی گەڕەکی تیٚدا دیار بوون ، واتە کەعبی کوڕی ئەسەد چیی بەسەر هات ؟

وتی : کوژرا .

پرسیی : ئەی سەرداری شار و بیابان ، حویەیی کوڕی ئەخطەب چیی بەسەر هات ؟

وتی: کوژرا .

پرسیی : ئەی ئەو پیاوەی لە کاتی هیٚرشماندا پیٚش ئەکەوت و ، لە کاتی هەڵاتنماندا ئەیپاراستین ، غەززالی کوڕی سەمەوئەل چیی بەسەر هات ؟

وتی : کوژرا .

پرسیی : ئەی هەردوو نەوەی کەعبی کوڕی قورەیظە و نەوەی عەمری کوڕی قورەیظە چی‌یان بەسەر هات ؟

وتی : رۆیشتن .. کوژران ..

وتی : ئەی ثابیت ، لەبەر خاتری ئەو چاکەیەی کە لەگەڵتم کردووە بم گەیەنە بە کەس‌وکارەکەم .. دە بەخوا دوای ئەوانە ژیان خۆشیی تیٚدا نیە .. هەموو تاواتیٚکی ئەوەبوو بە خۆشەویستانی بگاتەوە .

ثابیت بردیە پیٚشەوە و ئەویش لە ملی درا ..

کە باسی گەیشتنەوە بە خۆشەویستانی گەیشتە لای ئەبوبەکر فەرمووی : لە ناو ئاگری دۆزەخدا بە ئەمریی و هەتا هەتایی پیٚیان ئەگاتەوە ..

شایانی باسە کە ثابیت هەوڵی دا لە منداڵانی زوبەیر ، عەبدورڕەحمانی کوڕی زوبەیر لە کوشتن رزگار بکات و ، ئەویش موسڵمان بوو و بووە هاوەڵیش .

**یانزەهەم : دەست کەوتەکان**

دوای کوشتنی پیاوەکانی نەوەی قورەیظە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا لە گەورە هاوەڵان دەستەیەك هەڵ ببژێررێن بۆ ئامارکردنی ماڵ و سامانی نەوەی قورەیظە، لە چەك و ، کەلوپەل و ، کێڵگە و ئەسپ و مەڕومالات . ژن و منداڵیش هەزار ئەبوون .

لە قەڵاکانی جوولەکەدا ئەم چەکانە بوونە دەستکەوتی موسڵمانەکان :

أ ـ هەزار و پێنج‌صەد شمشێر .

ب ـ دوو هەزار رم .

ج ـ سێ‌صەد دیرع .

د ـ پێنج‌صەد قەڵغان .

هەروەها کووپەیەکی زۆریان دۆزی‌یەوە کە پڕ لە عەرەق بوون ، هەموویان رێژا و بەشیان نەکرد ..

کە ئەو شتانە سەرژمێریی کران ، بە فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ بەسەر جەنگاوەراندا ، بە پێی حوکمی شەریعەت ، دابەش کران .

پێش هەموو شتێك قورئان فەرمانی ئەدا کە پێنج یەکی دەست کەوتەکان جیا بکرێتەوە تا پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ بەرژەوەندیی گشتیی بە کاری بهێنێ . چوار بەشەکەی تریش بەسەر جەنگاوەراندا دابەش کرا ، کە سوار سێ بەش و پیادە یەك بەشی وەرئەگرت .

سەرەڕای ئەمانەش شەش ئافرەت بەشداریی جەنگیان کردبوو ، ئەمانە شتێکیان پێ درا بەڵام نەك وەك بەشی پیاوەکان ، کە ئەمانە بوون :

١ـ ئوم عومارە ، نوسەیبەی کچی کەعب ، کە بەشداریی جەنگی ئوحودیشی کرد..

٢ ـ صەفیەی کچی عەبدولموطەللیب ، پووری پێغەمبەری خوا ﷺ ، کە دەوری کاریگەری هەبوو لە پاراستنی قەڵای ژن و منداڵەکان لە جەنگی ئەحزاب دا.

٣ ـ ئوم سولەیط ، کە یەکێکە لە ئافرەتە بەیعەتدەرەکان و بەشداریی ئوحودیشی کردووە . کە عومەر ئەیفەرموو : ئەمە یەکێکە لەو ئافرەتانەی کە لە رۆژی ئوحوددا کوندە ئاوی بۆ ئەهێنایین . دایکی هاوەڵی پایەدار ئەبوسەعیدی خودرییە.

٤ ـ ئوم عەلاء ، کچی حاریثی کوڕی ثابیت کە دایکی خاریجەی کوڕی زەید بووە و هاوەڵێکی پایەدار بووە .

٥ ـ سومەیرائی کچی قەیس .

٦ ـ دایکی سەعدی کوڕی موعاذ ، تا دوای کۆچی دوایی سەعد ژیاوە .

هەروەها بەشی خەللادی کوڕی سووەید ، کە بە دەستی مەزینەی جوولەکە شەهید کرا ، درا بە کەس وکاری و ، پێغەمبەری خوا ﷺ ئاگاداری کردن کە پاداشتی دوو شەهیدی هەیە.

هەروەها ئەبوسینانی کوڕی میحصەن کە برای عوکاشە بوو ، بە مەرگی خۆی لە رۆژانی ئابلۆوقەدا کۆچی دوایی کرد و کەس وکاری بەشە دەست کەوتەکەیان وەرگرت.

ژن و منداڵەکانیش دابەش کران بەسەر موسڵمانان‌دا ، بەڵام لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرمان دەرکرا کە هیچ موسڵمانێك دایك و رۆڵەکەی لە یەك جیا نەکاتەوە ، یان پێکەوە بفرۆشرێن ، یان پێکەوە بهێڵرێنەوە . هەتا خوشك و خوشك و برا و براش جیا نەکرێنەوە ، هەتا بالغ ئەبن . هەتا لە جەنگەکانی تری ئیسلام‌دا فەرماندە موسڵمانەکان ئەم یاسایەیان بەڕێوە ئەبرد . ئیمام شافیعییش فەتوای نادروستیی کڕین و فرۆشتنی ئەوانەی‌داوە کە ئەگەر لێك جوێ بکرێنەوە .

پێغەمبەری خوا ﷺ ئافرەتێکی لەو دیلانە بە ناوی رەیحانەی کچی زەیدی کوڕی عەمری ئازاد کرد و پاشان داوای لێ کرد موسڵمان بوو و دوای ئەوەش رەزامەندیی نواند کە شووی پێ بکات . ئەوەندە هەیە پێش کۆچی دوایی پێغەمبەر ئەو کۆچی دوایی کردووە .

لەو دیلانە موسڵمانەکان هەندێکیان لێ ناردن بۆ ناوچەی نەجد و هەندێکیش بۆ شام تا بفرۆشرێن و بە پارەکەیان ئەسپی زۆر بکڕرێن و بەسەر موسڵمانەکان‌دا دابەش بکرێن ، ئەمەش بۆ بەهێزکردنی سوپای ئیسلام .

بەم شێوەیە کۆکردنەوەی سوپای مل‌هوڕی ئەحزاب بە دەستی جوولەکە ، تا بێنە سەر موسڵمانەکان و ، شوێنەواریان نەهێڵن ، تەڵەیەك بوو بۆ موسڵمانەکان

ترابوویەوە ، کەچیی خوای بەسۆز و عەدالەت فریای موسڵمانەکان کەوت و ، سەرەنجام جوولەکە خۆیان بوون بە تەڵەکەوە ..

بەڵێ جوولەکە ، بە سەرۆکایەتیی حویەیی کوڕی ئەخطەب ، داوێکی گەورەیان بۆ موسڵمانەکان نایەوە ، بەڵام ئەوەبوو نەوەی قورەیظە بوون بە تەڵەکەوە و ، شوێنەواریان بڕایەوە .. سوپاس بۆ خوا حویەیی نەخشەکێشی ئاژاوەکەش لەناو قەڵاکانی نەوەی قورەیظەدا بوو و ، ملی ئەویش بە شمشێری سوپای ئیسلام قرتا ..

لە راستییدا نەوەی قورەیظە و کەعبی کوڕی ئەسەدی سەرۆکیان بە تەما نەبوون پەیمان بشکێنن ، بەڵام حویەیی شەیتان لێیان نەگەڕا هەتا فریوی دان و ، بڕیاریان دا بچنە بەرەی جەنگەوە دژی موسڵمانەکان .. کەواتە نەوەی قورەیظە کە دۆستی هاوپەیمانی موسڵمانەکان بوون ، بەبێ هیچ هۆیەك بوونە دوژمن و چوونە ریزی دوژمنە داخ لە دڵەکانیانەوە .. ئیتر کە خوێنیان رژا ، تاوان تاوانی حویەیی بوو و ، ئەو لە خوێنیان بەرپرسە کە ئاوەها سەرگەردانی کردن .

لە راستییدا ئەگەر یەکێك بەبێ وردبوونەوە و ، سەرنجدان سەیری ئەم حوکمەی ئیسلام ئەکات کە دەربارەی نەوەی قورەیظە دەرکراوە ، بە سادەیی خۆی وا تێ ئەگا کە ستەمێك ، یا دڵڕەقییەك رووی داوە ..

پێش هەموو شتێك ئەم حوکمە سەعدی کوڕی موعاذ ، بە پێی عەدالەتی هاوەڵان، دەری کردووە ، کە بە راستیی بۆ خوا دەری کردووە و ، شیاوی ئەو هەڵوێستەی جوولەکەیە، ئەگینا خۆ سەعد دوژمنی جوولەکە نەبوو ، بەڵکو دۆستیان بوو .. بەڵام کارەکەیان ئەوەندە ستەمکارانە بوو ، ئەتوانین بڵێین کە ئەگەر جوولەکە ئەم کارەیان لەگەڵ سوپایەکی تری هاوپەیمان و بێتاوانا ئەنجام بدایە ، ئەبوایە سەعدی هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ هەر ئەو حوکمە پڕعەدالەتەی بۆیان دەربکردایە .. چونکە باس باسی شیاوی حوکمە لەگەڵ تاوان دا ، ئیتر ئەو تاوانە بەرامبەر بە هەر کەسێك ئەنجام بدرێت.

جا وەك سەعد ئەم بڕیارەی دەرکرد ، یەکسەر پێغەمبەری خوا ﷺ دانی پیانا ، کە ئەمە حوکمێکە خوا پێی رازییە و ، ئەوپەڕی عەدالەتە .. کەواتە حوکمەکە لە دەستی سەعدیش و پێغەمبەریش دەرچوو ، حوکمی خوایە .. خوا بڕیاری لەسەر

داوه، چونکه پێغەمبەری خـوا ﷺ ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ۝ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ﴾ ( النجم : ٣ ـ ٤ ) .

کەواتە بۆ هیچ موسڵمانێك نـالوێ بـەو حوکمـە نـاڕازیی بـێ ، چـونکە حـوکمی خوایە.. بەڵام پێویستە ئەمە روون بکەینەوە تا هەموو کەسێ لـە پـاکیی و راسـتیی فەرمانی خوا ئاگادار بێ .

جوولەکە لە قووڵایی دڵیانا ، بە درێژایی مێژوو جگە لە غەدر ناپاکیی هیچیان لێ نەهاتووە .. هەرکەی دەستیان بـڕوا نـە دینیـان هەیـە ، نـە پـەیمان ئـەپارێزن ، نـە شوورەیی لێك ئەدەنەوە ..

لە پێشەوە ، لە کاتی هیجرەتدا ، باسی پەیمانی نێوان موسـڵمانەکان و هەرسـێ هۆزە جوولەکەکەی مەدینەمان کرد ، کە گرنگترین بەندی ئەو پەیمانـە بریتیـی بـوو لەوەی کە موسڵمانەکان و جوولەکە یەك ئوممەت بن و ، لە یەك نیشـتمان‌دا هاوبـەش بن و ، پێکەوە بەرگریی لەو وڵاتەیان بکەن .

ئەم پەیمانە چوار ساڵی بەسەردا تێپەڕیی و ، موسڵمانەکان جگە لـە راسـتگۆیی و وەفا و دراوسێتیی چاك هیچیان پێوە نەبینرا ، بـەڵام جوولەکـە یـەك لـە دوای یـەك هەلۆێستی لار و وێریان نواند و ، بەرامبەر بە موسڵمـانان ناپاکی‌یان لێ وەشایەوە.. هەرکە هەلیان بە دەست هێنابایە و بیان‌زانیایە ئەتوانن زیـان لـە موسـڵمانان بـدەن هەرچیی نامەردیی بوو لێ‌یان ئەوەشایەوە . بە تایبەتیی کە دی‌یان وا سوپای ئەحزاب دەوری شاری گرتووە ، ئیتر دەماری بێ‌وەفایی و نامەردی‌یان و، سروشتی لار و وێریان سـەریان دەرهێنـا و ، هـەموو پـەیمان و رێـك کـەوتنێکیان لـە یـادچـوو ، بگـرە نووسراوەکانیان دڕاند و خستیانە ژێر پێ‌یان . کە موسڵمانەکانیش هاتن تـا پـێ‌یـان رابگەیەنن کە وا چاکە پارێزگاریی لە پەیمانەکەیان بکەن ، دەستیان دایـە گاڵتـەکردن بە پێغەمبەر و موسڵمانەکان و دەریان بڕیی کە موحەممەد ناناسن .

خۆ ئەگەر ئەو جوولەکانە دەستیان بەسەر موسڵمانەکان‌دا بڕۆیشتایە ، لەوە خـراپ تریان بە موسڵمانەکان ئەکرد . هەر بۆ ئەوەش داوایان لە سوپای ئەحزاب ئـەکرد کـە بارمتەیان لەلا دابنێن ، بۆ ئەوەی نەتوانن دەست لە جەنگ هـەڵ بگـرن هـەتا تـاقی موسڵمانەکان ببڕنەوە .

کەواتە ئەو سزایەی کە نەوەی قورەیظە چەشـتیان مـافی خۆیـان بـوو .. چـونکە ئەوانیش وەك موسـڵمانەکان دانیشـتووی یـەثریـب بـوون و ، یـەثریـب نیشـتمانی

هاوبەشیان بوو و ، بەڵێنی ئەوەشیان دابوو کە بەرگریی لەو نیشتمانەیان بکەن و دوژمن بێتە سەر هەر کامیان ئەوی تریشیان لەسەری بکاتەوە .

جا جوولەکە دوای ئەم پەیمانە ، هەستان بوونە یارمەتیی دەری ئەحزاب تا مەدینە بگرێ ، کەواتە بە هەموو عورف و یاسایەك ئەبنە کۆمەڵێکی ناپاکی نیشتمانفرۆش، کە خیانەتی گەورەیان دەرهەق بە وڵاتەکەیان ئەنجام دابێ . چونکە لە پەیمانەکەدا ئەوەش هەیە کە نابێ یارمەتیی دوژمن بدەن ، بە تایبەتیی قورەیش، کە یەکەم دوژمنی موسڵمانەکانە ..

لە پەیمانەکەشدا دانیان بەوەدا ناوە کە حکوومەتی مەدینە حکوومەتێکی ئیسلامییە و کاروباری بە دەستی پێغەمبەری خواوەیە و ، جوولەکە ، جگە لە کاروباری دینی خۆیان، هەموو کارێکیان لە پێغەمبەری خواوە وەرئەگرن ، کەواتە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ حاکمی باڵادەستی جوولەکەیشە و، جوولەکە هیچ کارێك بەبێ پرسی ئەو ئەنجام نەدەن.

جوولەکە ئەم بەڵێنانەیان داوە ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هەمووە ناپاکییەیان لێ ئەوەشایەوە . بە مەرجێ کاتێك ئەم پەیمانەیان مۆر کرد کە ئیسلام هێشتا سوپای وەها بە هێزی نەبوو ، بگرە جوولەکە بە هێزتر بوون .

جا کە جوولەکە دوای ئەم رێككەوتننامەیە خۆیان گێل ئەکەن و ، دژایەتیی نیشتمان و ئوممەتی خۆیان ئەکەن بە کۆمەڵێکی ناپاك لە قەڵەم ئەدرێن کە لە هەموو یاسایەكدا لە کوشتن بەولاوە شیاوی هیچ سزایەکی تر نین ، چونکە جوولەکە لە جەنگی خەندەقدا سێ تاوانیان ئەنجام دا کە هەر یەکێکیان بەسە بۆ ئەوەی شیاوی کوشتن بن :

یەکەم : لە ژێرەوە پەیوەندییان بە دوژمنەوە کرد و ، نهێنیی سەربازییان دایە دەست دوژمن کە سوپای ئیسلامی ئەکەوتە مەترسییەوە .

دووهەم : دەستی یارمەتیی مادديی و مەعنەوییان بۆ دوژمن درێژ کرد ، تا داگیرکردنی مەدینەی بۆ ئاسان ببێ .

سێهەم : کە لە هەموویان تاوانەکەی زیاترە ، چەکیان لە دژی سوپای مەدینە، کە سوپای پارێزگاری وڵاتەکەیانە ، بەرز کردەوە و ، خەنجەری خیانەتیان لە دواوە بۆ موسڵمانان بەرز کردەوە . هەر یەکە لەم تاوانانە ، جگە لە کوشتن و سەربڕین ، چ سزایەکی تریان هەیە ؟ بە چ یاسایەکی جیهانیی ئەمانە لە کوشتن دەرباز ئەبن ؟

لەلایەکی ترەوە جوولەکە دوژمنی جەنگاوەر نەبوون ، لەگەڵ سوپای ئیسلامدا جەنگا بن و ، لە و جەنگەدا شکا بن و بە دیل گیرابن ، تا ئازاد بکرێن . بەڵکو ئەمانە هاووڵاتیی خۆفرۆش بوون و ، پەیمانیان شکاند .

خۆ ئەگەر تەماشای هەڵوێستی کافران بکەین لە هەر کاتێکی مێژوودا دەستیان بەسەر موسڵماناندا رۆیشتبێ ، لە هیچ خراپەیەك درێغی یان نەکردووە .

هۆلاکۆ .. گاورانی ئەندەلوس بۆ نموونە بەرامبەر بە موسڵمانە بێدەسەڵاتە بێتاوانەکان چی یان نەکردووە ؟!

ئەمریکا و دانیشتوانی هیرۆشیما .. ئەوانەی کە جەنگاوەر نەبوون .. تاوانێکیان ئەنجام نەدابوو .. لەسەر چیی بەو شێوە دڕندانەیە صەدان هەزار ژن و منداڵ و پیر و پەككەوتەیان کوشت ؟!

هەروەها دانیشتوانی شاری ناجازاکیی بێتاوان و بێدەسەڵات چی یان کردبوو ، وەك هیرۆشیما درانە بەر بومبای ئەتۆم و ، لەو شارەشدا سەرەڕای کوشتنی صەدان هەزار ، خەڵکێکی زۆریان ناتەواو و ئیفلیج کرد .[48]

ئەی ریچارد ( قلب الأسد ) ی فەرماندەی هەڵمەتی خاچ پەرستان لە فەلەسطین بەڵێنی ئەمانی بە سێ هەزار موسڵمان نەدا ئەگەر بێت و بەبێ جەنگ خۆیان بە دەستەوە بدەن ، کەچیی دوابیش هەموویانی ئیعدام کردن ؟

با سەرێکیش لە شەریعەتی نەوەی قورەیظە بدەین ، بزانین حوکمی ئەو چۆنە دەرهەق ناپاکی یەك وەك ئەوەی کە جوولەکە ئەنجامیان دا .. داخۆ ئەو حوکمەی کە سەعد دەری کرد و پێغەمبەری خواش ﷺ جێ بەجێی کرد لەگەڵ حوکمی شەریعەتی مووسادا گونجاوە یان نەء ؟

لە ئیصحاحی بیستەمدا ، لە ( سفر التثنية ) دا هاتووە کە ئەگەر دەستیان رۆی، بۆیان هەیە هەموو پیاوانی دوژمنیان بکوژن و ببنە خاوەنی ژن و منداڵ و ماڵ و سامانیان . ئەمەش دەقەکەیەتی : « وإن لم تسالمك أية قرية بل حاربتك فحاصرها وإذا دفعها الرب إلهك إلى يدك فاضرب جميع ذكورها بحد السيف ، وأما النساء

---

[48] نووسەری موسڵمان مامۆستا محمد أحمد باشمیل ئەگێڕێتەوە کە لە ساڵی ١٣٨٢ ك ـ ١٩٦٢ ز دا سەردانی وڵاتی ئەڵمانیا ئەکات ، سەردانی شاری هامبۆرگی بەناوبانگیش ئەکات و ، کاتێك کە بەناو گەڕەکێکی ناوداری ئەو شارەدا پیاسەیان کردووە ، دەڵ[illegible]یان پێی وتوون : لە یەك شەودا بە هۆی هێرشی فرۆکەکانی هاوپەیمانانەوە بۆ سەر دانیشتوانی هامبۆرگ [illegible] شارەدا چل هەزار کەس کوژراون . ئەمە تەنها لە یەك شەودا و لە شارێك دا .. داخۆ ئاشتیی خوازان سەرجەمی کوشتاری ناڕەوای بەستەزمانانیان چەند بێت ؟!

والأطفال والبهائم وكل ما في المدينة ، كل غنيمتها ، فتغتنمها لنفسك ، وتأكل غنيمة أعدائك التي أعطاك الرب إلهك)) .

کەواتە ئەگەر جوولەکە بەسەر موسڵمانان‌دا سەر بکەوتنایە ئەوا هەر وایان ئەکرد، بە مەرجێ ئەو ناپاکی‌یەی کە جوولەکە ئەنجامیان دا ، موسڵمانەکان ئەنجامیان نەدابوو ، خۆ ئەگەر جوولەکە ناپاکی‌یان نەکردایە موسڵمانان لەسەر پەیمانی خۆیان بە پاکیی ئەمانەوە و ، دژیان نەئەوەستان :

کەواتە باسەکە زۆر دوورە لە یەکەوە :

ئەو ئەیەوێ تۆی بێ‌تاوان لەناو بەرێ ..

بەڵام رێ نادا تۆ ئەوی تاوانبار لەناو بەریت !!

ئەم دوو هەڵوێستە جیاوازی‌یان زۆرە !! [٤٩]

---

[٤٩] غزوة بني قريظة لباشميل : ١٥١ ـ ٢٦٨ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٤٠٦ ـ ٤١١ ، الرحيق المختوم : ٣٢١ ـ ٣٢٦ .

## بەشی بیست و نۆهەم

# هەندێ ڕووداوی ساڵی پێنجەم

لەو ماوەیەدا چەند ڕووداوێك لە ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ و موسڵمانان‌دا ڕوویان دا کە ئەمانە گرنگەکانیانن :

**یەکەم : مارەکردنی زەینەبی کچی جەحش :**

زەینەبی کچی جەحشی ئەسەدیی ، خوشکی شەهیدی لووت و گوێکراوی جەنگی ئوحود : عەبدوڵڵای کوڕی جەحشە . دایکی خاتوو ئومەیمەی کچی عەبدولموطەللیبە کە پووری پێغەمبەری خوایە ﷺ .. ئافرەتێکی قوڕەیشیی خاوەن نەسەب و بنەماڵەیە .. دوای ئەوەی کە زەیدی کوڕی حاریثەی بەندەی ئازادکراوی پێغەمبەری خوا تەڵاقی دا ، پێغەمبەری خوا ﷺ ، بە فەرمانی خوا ، مارەی کردووە ، ئەمەش بۆ ئەنجامدانی دوو مەبەستی شەرعیی بەرز و پیرۆز : یەکەمیان : بەتاڵ‌کردنەوەی ئەوە کە ژنی پیاوی بەکوڕکراو مەحرەم نییە ، واتە وەك بووك نییە و ، دووهەمیش : لەناوبردنی فیز و دەمار و خۆبەگەورە زانینی سەردەمی نەفامیی ..

چونکە عەرەبەکان بەکوڕکردنیان لە ناودا باو بوو و ، ئەو کوڕەیان وەك کوڕی ڕاستەقینە سەیر ئەکرد و ، لە میرات‌دا مافی ئەبوو و ، ژنەکەشی بۆ ئەو کەسە مەحرەم بوو کە کریبوویە کوڕی خۆی . ئەم باوە لەناویانا ڕەگی داکوتا بوو .

هەروەها بە لایانەوە زۆر گران بوو کە کچی پیاوماقووڵان شوو بە هەژار و بەندەکان بکەن ، ئەگەرچیی ئازادیش کرا بن .

بەڵام ئیسلام کە هات و نووری پەخشانی سەرزەویی کرد ، یەکێ لە مەبەستەکانی نەهێشتنی جیاوازیی نێوان چینەکان بوو ، بەو مانایە کە هەموو لە ئادەمن و ، ئادەمیش لە گڵە و ، هیچ هۆز و زمان و گەلێك لە یەکێکی تر گەورەتر نییە و ، جیاوازی‌یان تەنها بە تەقوا ئەکرێت .

بۆ چەسپاندنی ئەم یاسایە ، ویستی خوا وەها بوو کە یەکەم کەسێك لەو بەندە ئازادکراوانە کە ئافرەتێکی عەرەبیی نەسەب مارە بکات زەیدی کوڕی حاریثە بێ و ، یەکەم سەردارێکیش کە ئەم یاسا نەفامی یە بەتاڵ بکاتەوە ، پێغەمبەری خوا بێت ، بۆ ئەوەی هەموو کەسێك چاو لە زەینەب بکات ، وا مێردی بە زەید کرد .

هەروەها دوای ئەوەی کە زەینەب و زەید جیا ئەبنەوە ، بە فەرمانی ئاسمان ، پێغەمبەری خوا ﷺ مارەی ئەکات ، تا ئەو دەرگایە ئەو بیخاتە سەر پشت و بە هەموو جیهانی بگەیەنێ کە هاوسەری تەڵاقدراوی ئەو بەکوڕکراوە حەڵاڵە بۆ بەکوڕکەرەکە .

سەرەتا پێغەمبەری خوا ﷺ زەینەبی پوورزای خوازبێنیی ئەکات بۆ زەید کە وەك کوڕی جەرگی خۆی حسابی بۆ ئەکات .. بەڵێ لەو ڕۆژەوە کە زەیدی منداڵ لەگەڵ باوك و مامەی نەڕۆیشتەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ لەناو کرۆکی دڵیدا جێی کردەوە . نەك هەر زەید ، بەڵکو ئوسامەی کوڕی زەیدیشی وەك حەسەن و حوسەینی کچەزای ئەخستە سەر ڕانی و ئەی لاواند .. کە زەینەبی خوازبێنیی کرد بۆ زەید ، زەینەبیش و هەندێ کەس‌وکاریشی بەو کارە ڕازیی نەبوون ، بەڵام ئەوەبوو قورئان هاتە خوارەوە کە نابێ هیچ ئیماندارێك ، چ ژن و چ پیاو ، لە فەرمانی خوا و پێغەمبەر دەرچێت ، کە فەرمووی :

﴿ وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَـٰلًا مُّبِينًا ﴾ (الأحزاب : ٣٦) .

بە بۆنەی ئەم ئایەتە پیرۆزە زەینەب ڕەزامەندیی نواند و ، شووی بە زەید کرد .. بەڵام زەید هەستی ئەکرد کە زەینەب خۆی بە گەورەتر ئەزانێ و ، ئەمە ئەبوە هۆی ئازاردانی دەروونی .. بۆیە زەید حەزی لە جیابوونەوە بوو و ، چووە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ تا ڕاوێژیی پێ بکا بۆ تەڵاقدانی و ، ئەویش ئامۆژگاریی ئەکرد کە ڕاگیری بکات ..

لەلایەکی ترەوە جیبریل هەواڵی بە پێغەمبەری خوا دابوو کە زەینەب ئەبێتە هاوسەری و ، ئەو باوە نەفامی‌یەش بەتاڵ ئەکرێتەوە . بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ بە لایەوە زۆر گران بوو کە زەید لەم فەرمانەی ئاسمان ئاگادار بکا ، تا ژنەکەی تەڵاق بدا و ئەم مارەی بکات .. ئەو کاتە دەمی خەڵك بەرەڵا ئەبێ کە موحەممەد هاوسەری

کوڕەکەی مارە کردۆتەوە . ئەوەندە لە دەمی خەڵك ئەترسا ئەوەی کە خوا ئەیویست دەریکەوێ ﷺ ئەو ئەیشاردەوە . چونکە خوای گەورە بۆ حیکمەتێك ئەم کارەی ئەنجام ئەدا و، پێغەمبەریش لە شتێکی تر ئەترسا، تا سەرەنجام قورئان هات و عیتابی کرد:

﴿ وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِيٓ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَٱتَّقِ ٱللَّهَ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَٰكَهَا لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِيٓ أَزْوَٰجِ أَدْعِيَآئِهِمْ إِذَا قَضَوْا۟ مِنْهُنَّ وَطَرًا وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا ﴾ (الأحزاب : ٣٧) .

ئایەتەکە ئەوە دەرئەخات کە خوا نیعمەتی بە زەید داوە ، کە بە موسڵمانیی خەلقی کردووە و ، پێغەمبەریش چاکەی لەگەڵ کردووە بە ئازاد کردن و ﷺ پێغەمبەر ﷺ هەردەم ئامۆژگاریی زەیدی ئەکرد تا لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بگونجێ و ، فەرمانەکەی جیبریلی لەدڵی خۆیدا ئەشاردەوە ، لە کاتێکدا کە ئەو فەرمانە خوا ئاشکرای ئەکات . هەروەها گلەیی لە ئازیز ئەکرێت کە پێویستە لە خوا بترسێ ، نەك لە دەمی خەڵکیی . هەروەها ئایەتەکە دەری ئەخات کە خوا بڕیاری داوە زەینەب بکاتە هاوسەری .. خوا بۆی مارە کردووە هەتا ئەو یاسا نەفامی یە بەتاڵ بێتەوە .. خۆ هەر کارێکیش خوا بیکات رەخنەی لێ ناگیرێ :

﴿ مَّا كَانَ عَلَى ٱلنَّبِيِّ مِنْ حَرَجٍ فِيمَا فَرَضَ ٱللَّهُ لَهُۥ ﴾ (الأحزاب : ٣٨) .

پێغەمبەرە پێشینەکان هاوسەری زۆریان بوون ، سەرەڕای کەنیزەکەکانیان .

لە هەمان کاتدا یاسای بەکوڕکردن بەتاڵ کرایەوە :

﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا ﴾ (الأحزاب : ٤٠) .

هەروەها قورئان فەرمانی دا کە بەکوڕکردن بەتاڵە و با بە ناوی باوکیانەوە بانگ بکرێن ، بۆ ئەمە کە زەیدی کوڕی حاریثە پێی ئەوترا زەیدی کوڕی موحەممەد ، خەڵکیی بە زەیدی کوڕی حاریثە ناویان ئەبرد . هەروەها هەموو بەندەیەکی تریش .

لە صەحیحی بوخارییدا لە ئەنەسەوە خوا لێی رازیی بێ هاتووە کە ئەم ئایەتە : ﴿ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ ﴾ دەربارەی زەینەبی کچی جەحش و زەیدی کوڕی حاریثە هاتۆتە خوارەوە ..

لە ریوایەتێکی تردا هەر لەوەوە وتوویە : زەیدی کوڕی حاریثە هات و شکاتی ئەکرد ، پێغەمبەریش ﷺ ئەی فەرموو : ((اتق الله وأمسك عليك زوجك )) . ئەی فەرموو : تەقوای خوات لە دڵدا بێ و ، ژنەکەت ڕاگیر بکە . ئەنەس ئەڵێت : ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ شتێکی لە وەحی بشاردایەتەوە ئەوا ئەم ئایەتەی ئەشاردەوە . واتە ئەوەندە گلەیی تێدایە . ئەمەش گەورەترین بەڵگەیە کە ئەو پێغەمبەرە و وەحی بۆ دێت .

حافیظی پایەبەرز ئیبن حەجەر لە ( فتح الباري ) دا شتێکی جوانی لەسەر ریوایەتەکەی بوخاریی نووسیوە : ( إبن أبي حاتم ) لە ڕێی ( السدي ) ەوە ئەم چیرۆکەی تەخریج کردووە و ، بە شێوەیەکی ڕوون و جوان ، بەم لەفزە هێناویەتی : پێمان گەیشتووە کە ئەم ئایەتە دەربارەی زەینەبی کچی جەحش هاتۆتە خوارەوە ، کە دایکی ئومەیەی کچی عەبدولموطەللیبی پووری پێغەمبەری خوا بووە . ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی لە زەیدی کوڕی حاریثەی بەندەی ئازادکراوی خۆی مارە بکات و ، زەینەب ئەوەی بە دڵ نەبوو . پاشان بە کرداری پێغەمبەری خوا ﷺ ڕازیی بوو و لێی مارە کرد . پاشان خوای گەورە ـ عز وجل ـ پێغەمبەرەکەی خۆی لەوە ئاگادار کرد کە زەینەب ئەبێتە یەکێ لە هاوسەرانی . ئەویش شەرمی ئەکرد فەرمان بە زەید بدا بە تەڵاقدانی . هەروا ئەو ناکۆکی یەی لە نێوان خەڵکییدا ئەبێت، لە نێوان زەید و زەینەبیشدا هەبوو ، بۆیە پێغەمبەری خوا فەرمانی پیا ئەدا کە ژنەکەی ڕاگیر بکات و ، تەقوای خوای لە دڵدا بێت و ، لەوە ئەترسا کە خەڵکیی شوورەیی لێ بگرن و بڵێن : بووکەکەی خۆی مارە کردۆتەوە ، چونکە کاتی خۆی زەیدی کردبووە کوڕی خۆی .

هەروەها ( إبن أبي حاتم ) و طەبەریی لە عەلیی کوڕی حوسەینی کوڕی عەلیی یەوە ریوایەتی کردووە کە وتوویە : خوای گەورە پێغەمبەرەکەی ئاگادار کرد کە زەینەب ئەبێتە هاوسەری ، ئەمەش پێش مارەکردنی . جا کاتێ کە زەید هات و شکاتی لە زەینەب ئەکرد ، پێی فەرموو : ((اتق الله وأمسك عليك زوجك)) . خوای گەورەش ئاگاداری کرد کە : من هەواڵم پێ داوی کە لێتی مارە ئەکەم کەچیی ، ئەو شتەی کە خوا ئاشکرای ئەکات ، تۆ ئەیشاریتەوە .

ئەمە تەفسیری ( خشية ) یە کە ئیمامە پایەبەرزەکان بۆی ئەچن .

کەواتە پێش ئەوەی زەید بێت بۆ شکاتی زەینەب خوای گەورە پێغەمبەری ئاگادار کردووە کە زەینەب مارە ئەکات . بەڵام ئەم فەرمانەی خوا لە شەرمانا ئەشارێتەوە و، دواییش گلەیی دێتە سەری .

بەو شێوەی کە خوا ویستی زەید و زەینەب جیا بوونەوە ، هەر چەندە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بەسەر زەیددا ئەدا کە لەگەڵ هاوسەریدا بگونجێ . کە ئایەتەکان هاتنە خوارەوە پێغەمبەری خوا ناچار بوو فەرمانی خوا جێبەجێ بکات .

ئیمام ئەحمەد و موسلیم بە سەنەدی خۆیان لە ئەنەسەوە ریوایەتیان کردووە کە وتوویە : کاتێك کە عیددەی زەینەب تەواو بوو پێغەمبەر ﷺ بە زەیدی فەرموو : (( إذهب فاذكرها علي )) . فەرمانی دا بە زەید بچێ بۆ لای زەینەب تا بیخوازێ بۆ پێغەمبەر . رۆیشت بۆ لای کە لەو کاتەدا هەویری ئەشێلا . زەید ئەڵێ : کە چاوم پێ کەوت لە دڵمدا ئەوەندە گەورە بوو کە نەم توانی سەیری بکەم ، بە بۆنەی ئەوەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خۆی باسی کردبوو ، بۆیە پشتم تێ کرد . ( چونکە ئەزانێ کە ئەبێتە دایکی ئیمانداران ) . پاشان وتم : زەینەب مژدە بێت پێغەمبەری خوا ﷺ ناردوومی بۆ خوازبێنییت بۆ خۆی .. وتی : من هیچ شتێك ناکەم هەتا پرس بە پەروەردگارم - عزوجل - بکەم . پاشان هەستا و چوو بۆ شوێنی خواپەرستی یەکەی. ئەوەبوو قورئان هاتە خوارەوە و ، پێغەمبەری خواش ﷺ هات و بەبێ ماوەخواستن چووە ژوورەوە ..

جا خوای گەورە خۆی ئەیزانیی ئەوانەی کە تانە و تەشەر ئەدەن چیی ئەکەن ، بۆیە خوای گەورە ئەوەی خستە دڵی پێغەمبەرەکەیەوە کە زەید بنێرێ بۆ خوازبێنیی تا زمانی ئەوانە ببڕێ و پەرچی بوختانەکەیان بداتەوە .

ئەو گەورەیی‌یەی زەینەبیش کە زەید دەری ئەبڕێ هاتووە بە دڵیدا لەبەر ئەوە بووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی بردووە و ، زەید رێی بە خۆی نەداوە کە هەتا چاویشی بۆ بخات ، ئەمە لە پیاوێکەوەیە کە ناڕەزاییەکی لە باسەکەدا نەبوویێت .[50]

---

[50] بە سەرنج دانی رووداوەکان دەرئەکەوێ کە زەید ئەمە یەکەم ژنی نەبوویێت ، چونکە پێش ئەوەی کە خەدیجە شوو بکات بە پێغەمبەری خوا ﷺ زەید بۆتە بەندەی خەدیجە و ، ئەویش دوای شووکردنی ئەیدا بە پێغەمبەر و ، لەو کاتانەدا زەید لە دەوروبەری دە ساڵیی‌دا بووە و ، لە کاتی کۆچ کردنیش دا تەمەنی زەید لە دەوروبەری سیی و هەشت ساڵیی‌دا بووە ، کەواتە پێش زەینەب ئوم ئەیمەنی مارە کردووە ، کە ئوسامەی لێ بووە و لە کاتی کۆچی دوایی ئازیزدا بە لایەنی کەمەوە ئوسامە شانزە ساڵان بووە ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاڵای سوپای ئەداتە دەست ، تا فەرماندەی سوپا بێت و بچێت بۆ غەزا .. کەواتە کە زەید زەینەب مارە ئەکات و تەڵاقیشی ئەدا هاوسەری تری هەبووە .

ئەم بە شوودانەی زەینەب بەلای پێغەمبەر و بەلای زەینەب و بەلای زەید و بەلای هەموو موسڵمانە ئامادەبووەکانەوە ئەوەندە سەنگین بووە ، یەك وشەی لەسەر باس نەکراوە ، بگرە بە پێچەوانەوە ، زەینەب شانازیی بەسەر هاوسەرەکانی تری پێغەمبەری خوادا ﷺ ئەکرد و ئەی وت : ئێوە کەس وکارتان ئێوەی بە شوو داوە ، بەڵام من خوای گەورە لە سەرووی حەوت ئاسمانەکەوە بە شووی داوم .

زەینەب یەکێ بووە لەو ئافرەتانەی سەرەتا کە لە پێناوی خوادا کۆچیان کردووە و، هەمیشە خەریکی خێر و صەدەقە و سیلەی ڕەحم بووە و ، خاتوو عائیشە خوا لێی ڕازیی بێ ، بە خاوەنی وەرەع و تەقوای باس کردووە . لە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ یەکەم هاوسەری بووە کە کۆچی دوایی بکات .

ئیمام موسلیم لە صەحیحەکەیدا بە سەنەدی خۆی لە عائیشەی دایکی ئیمان دارانەوە ڕیوایەتی کردووە کە وتوویە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە : (( أسرعكن لحوقاً بي أطولكن يداً )) . فەرموویە : کامەتان خێر و صەدەقەی زۆر بکات ئەوەتان زوو پێم ئەگاتەوە . ئەڵێت : هاوسەرەکانی وت و وێژیان ئەکرد کە دەستی کامیان درێژتر بێت . عائیشە ئەڵێت : زەینەب لە هەموومان خێر و صەدەقەی زیاتر بوو چونکە بە دەستی خۆی کاری ئەکرد و ئەیکردە خێر و صەدەقە .[٥١]

زەینەب لە ساڵی بیستەمی کۆچییدا کۆچی دوایی کردووە و ، ئەمیری ئیمان داران عومەری کوڕی خەططاب خوا لێی ڕازیی بێ نوێژی لەسەر کردووە و ، لە بەقیع نێژراوە و ، یەکەم ئافرەتێکیش بوو کە بەسەر تەرمەکەیەوە ، بۆ داپۆشرانی قوببەی بۆ دروسست بکرێ .[٥٢]

**دووهەم : هاتنە خوارەوەی ئایەتی حیجاب :**

کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ زەینەبی کچی جەحشی گواستەوە ، دەعوەتێکی وەهای بۆ موسڵمانان کرد کە بۆ هیچ ژنێکی ترینەیکردبوو .. ئەمەش بووە هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی حیجاب .

بوخاریی و موسلیم لە صەحیحەکەیاندا لە ئەنەسەوە خوا لێی ڕازیی بێ ڕیوایەتیان کردووە کە وتوویە : بۆ گواستنەوەی زەینەبی کچی جەحش بۆ پێغەمبەر

---

[٥١] سەرەتا وایان ئەزانی مەبەست لە درێژیی دەست درێژیی هەستییە ، پاشان بۆیان دەرکەوت کە مەبەست لە دەستی درێژ ، دەستێکە خێر و صەدەقەی زیاتر بێت .

[٥٢] السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٢٩٤ ـ ٣٠٩ .

ﷺ نان و گۆشتێکی زۆر دروست کرا و ، منیش نێررام بۆ خەڵك بانگ کردن بۆ نان خواردن . هەروا کۆمەڵێك ئەهاتن و نانیان ئەخوارد و ئەچوونە دەرەوە ، پاشان کۆمەڵێکی تر ئەهاتن و نانیان ئەخوارد و ئەچوونە دەرەوە ، هەروا خەڵکم بانگ کرد هەتا وای لێ هات کەسم دەست نەئەکەوت بانگی بکەم . وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ! کەسم دەست ناکەوێ تا بانگی بکەم . فەرمووی : (( إرفعوا طعامكم )) . فەرمووی : نانەکەتان هەڵ بگرن . سێ دەستە خەڵك لە ژوورەکەدا مانەوە و قسەیان ئەکرد . پێغەمبەری خوا ﷺ چووە دەرەوە و ، چوو بۆ ژوورەکەی عائیشە و فەرمووی: (( السلام عليك أهل البيت ورحمة الله )) . عائیشەش وتی : وعليك السلام ورحمة الله . ماڵ و خێزانەکەت چۆنە ؟ خوا فەڕ و بەرەکەتت بەسەردا برژێنێ . هەروا سەری لە ژووری هەموو ژنەکانی تری دا و ، ئەوەی کە بە عائیشەی فەرموو ، بەوانیشی فەرموو و ، ئەوانیش وەك عائیشە وەڵامیان ئەدایەوە .

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە بۆ ژوورەکە و ئەبینێ هەروا سێ دەستەکە لە ماڵەکەدان و قسە و باس ئەکەن . پێغەمبەری خواش زۆر بە شەرم و حەیا بوو ، دیسان بەرەو ژوورەکەی عائیشە تەشریفی بردەوە ، ئیتر نازانم ئەو هەواڵی دایە یان هەواڵی بۆ هات کە خەڵکەکە رۆیشتوون ، گەڕایەوە و ، هەرکە قاچێکی خستە ئەودیوی ژێر دەرگاکە و قاچێکیشی لە دەرەوە بوو ، پەردەکەی لە نێوان من و خۆی دا دادایەوە ( ئەنەس قسە ئەکات ) ، ئیتر ئەوەبوو ئایەتی حیجاب هاتە خوارەوە .

مەبەست لە ئایەتی حیجابیش ئەم ئایەتە پیرۆزەیە :

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدْخُلُواْ بُيُوتَ ٱلنَّبِيِّ إِلَّآ أَن يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيْرَ نَٰظِرِينَ إِنَىٰهُ وَلَٰكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَٱدْخُلُواْ فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَٱنتَشِرُواْ وَلَا مُسْتَـْٔنِسِينَ لِحَدِيثٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ يُؤْذِى ٱلنَّبِىَّ فَيَسْتَحْىِۦ مِنكُمْ ۖ وَٱللَّهُ لَا يَسْتَحْىِۦ مِنَ ٱلْحَقِّ ۚ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَٰعًا فَسْـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٍ ۚ ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ ﴾

( الأحزاب : ٥٣ ) .

کە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ، فەرمان بوو بۆ ئیمانداران کە هەتا ماوە نەخوازن نەچنە ماڵی پێغەمبەرەوە ﷺ ، جا ئەگەر بانگ کران ، با بچن و ، کە نانیان خوارد بڵاوەی لێ بکەن و دانەنیشن بۆ قسە و باس‌کردن . چونکە ئەو کارە ئازاری پێغەمبەر ئەدات و ئەویش شەرمیان لێ ئەکات . بەڵام خوا لە حەق شەرم ناکات . جا ئەگەر

ئیمان‌داران داوای کەل و پەلێکیان لە دایکانی ئیمان‌داران کرد با لە پشتی پەردەوە داوایان لێ بکەن .. چونکە ئەم کارە بۆ بە پاك پاراستنی دڵی هەموو لایەك چاکترە .

کە ئەمە هاتە خوارەوە ، هەندێ مونافیقی دڵ نەخۆش ڕەخنەیان گرت و وتیان : ئایا لە قسەکردن لەگەڵ کچە مامەکانماندا ، لە پشتی پەردەوە نەبێ ، قەدەغە ئەکرێین ؟ ئەگەر موحەممەد مرد من عائیشە مارە ئەکەم . ئەوەبوو پاشماوەی ئایەتەکەی پێشەوە هاتە خوارەوە ، کە نابێ هیچ ئیمان‌دارێك ئازاری دڵی پێغەمبەر بدات و ، ناشبێ دوای خۆی هیچ کەس هاوسەرەکانی مارە بکاتەوە ، چونکە ئەوانە دایکانی ئیمان‌دارانن :

﴿ وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا۟ رَسُولَ ٱللَّهِ وَلَآ أَن تَنكِحُوٓا۟ أَزْوَٰجَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦٓ أَبَدًا ۚ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمًا ﴾ ( الأحزاب : ٥٣ ) .

بەر لەوەی کە ئەم ئایەتە پیرۆزە بێتە خوارەوە ، عومەری کوڕی خەططاب خوا لێی ڕازیی بێ ، بە فیطرەتی پاك و هەستیاری خۆی دەرکی بەوە کرد و ، بۆ دایکانی ئیمان‌داران غیرەت گرتی کە نابێ خەڵك بیان‌بینێ .

بوخاریی لە صەحیحەکەی‌دا ، لە ئەنەسەوە ئەگێڕێتەوە کە وتوویە : عومەری کوڕی خەططاب خوا لێی ڕازیی بێ فەرموویە : وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ! تۆ پیاوی چاك و پیاوی خراپ سەرت لێ ئەدا ، خۆزگە فەرمانت بدایە دایکانی ئیمان‌داران پەردەیان بگێڕایە ، ئەوەبوو خوای گەورە ئایەتی حیجابی ناردە خوارەوە .

ئەمەش یەکێکە لە بۆچوونە جوانەکانی عومەر ، کە پێش دەرچوونی حوکمی شەرع دڵە پاکە نوورانی‌یەکەی ئەو فەرمانی بۆ دەرئەکرد .

ئەم فەرمانەی قورئان بۆ دایکانی ئیمان‌داران بوو لەبەر ئەوەی کە ئەوان پایەدارترن، بۆیە باوکان و کوڕان و خزمان بە پێغەمبەری خوایان ﷺ وت : ئێمەش لە پشتی پەردەوە قسەیان لەگەڵ بکەین ؟ ئەوەبوو ئەم ئایەتەش هاتە خوارەوە :

﴿ لَّا جُنَاحَ عَلَيْهِنَّ فِىٓ ءَابَآئِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآئِهِنَّ وَلَآ إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآءِ إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآءِ أَخَوَٰتِهِنَّ وَلَا نِسَآئِهِنَّ وَلَا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُنَّ ۗ وَٱتَّقِينَ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدًا ﴾ ( الأحزاب : ٥٥ ) .

بەم پێیە ماوە درا باوك و برا و برازا و خوشکەزا و ئافرەتانی خزمیان و بەندەکانیان بەبێ پەردە بیان‌بینن .

هەروەها قورئان هاتە خوارەوە کە هاوسەرانی پێغەمبەر وەك ئافرەتانی تر نین ، پێویستە لە هەموو کەم و کورِیەك خۆیان بپارێزن و ، لەماڵەوە دانیشن و خۆیان داپۆشن و ، نوێژ و زەکات جێ بەجێ بکەن و گوێڕایەڵی فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی بن ، کە ئەیفەرموو :

﴿ يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ لَسۡتُنَّ كَأَحَدٖ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِنِ ٱتَّقَيۡتُنَّ فَلَا تَخۡضَعۡنَ بِٱلۡقَوۡلِ فَيَطۡمَعَ ٱلَّذِي فِي قَلۡبِهِۦ مَرَضٞ وَقُلۡنَ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗا ﴿٣٢﴾ وَقَرۡنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجۡنَ تَبَرُّجَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ ٱلۡأُولَىٰۖ وَأَقِمۡنَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتِينَ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِعۡنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذۡهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجۡسَ أَهۡلَ ٱلۡبَيۡتِ وَيُطَهِّرَكُمۡ تَطۡهِيرٗا ﴾ ( الأحزاب : ٣٢ ـ ٣٣ ) .

شایانی باسە کە جومهووری ئەهلی تەفسیر لەسەر ئەو رایەن کە حوکمی ئەم ئایەتانە دوای دایکانی ئیمانداران فەرمانە بۆ هەموو ئافرەتێکی موسڵمان .

فەرمان‌دان بە ئافرەتان تا لە ماڵەوە بمێننەوە کارێکی پێویستە ، مەگەر بۆ ناچاریی لە ماڵ دەرچن .

تیرمیذیی و بەززار لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعوودەوە تەخریجیان کردووە ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە : (( إن المرأة عورة ، فإذا خرجت من بيتها استشرفها الشيطان ، وأقرب ما تكون من رحمة ربها وهي في قعر بيتها )) . فەرموویە : ئافرەت عەورەتە ، کە لە ماڵ دەرئەچێ شەیتان دەری ئەخات و ئەی رازێنێتەوە و ، نزیك ترین کاتیشی کە لە رەحمەتی خواوە نزیك بێت ، ئەو کاتەیە کە لەناو جەرگەی ماڵەکەیدا بێت.

هەروەها بەززار لە ئەنەسەوە تەخریجی کردووە کە وتوویە : ئافرەتان هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ! پیاوان بە جیهاد لە پێناوی خوادا پێشی ئێمەیان دایەوە ، ئایا کردەوەیەکیش هەیە کە ئێمە ئەنجامی بدەین تا بگەینە پایە و پلەی ئەوانەی کە لە پێناوی خوادا جیهاد ئەکەن ؟ پێغەمبەری خوا فەرمووی : (( من قعدت منكن في بيتها فإنها تدرك عمل المجاهدين في سبيل الله تعالى )) . فەرمووی : بەڵێ ، هەرکام لە ئێوەی ئافرەتان لە ماڵەکەی خۆیدا بە حەیا و حورمەت دابنیشێ ئەوا پاداشتی ئەگاتە پاداشتی ئەوانەی کە لە پێناوی خوادا جیهادیان کردووە ..

هەروایشە ، فەسادی هەرە زۆری ئەمڕۆی سەرزەویی ، کە دین کز بووە و خراپە پەرەی سەندووە ، کە پێویست بە جیهاد و هەوڵ و کۆششی پیاوان ئەکات تا

سەرزەویی پاك بکەنەوە ، لە تێکەڵبوونی ژن و پیاو و رووت و قووتیی و بەرەڵایی ئافرەتانە . جا کە ئافرەت لە ماڵی خۆیدا بە حەیا و حورمەت منداڵی خۆی لەسەر رەوشت بەرزیی پەروەردە کرد ، دیارە ئەوەندەی پیاوان کە جیهاد ئەکەن ، ئەوانیش فەساد و بێدینیی کەم ئەکەنەوە..

**سێهەم : مارەکردنی ئوم حەبیبە :**

هەر لەم ساڵەدا ، بە پێی بۆچوونی ئیبن کەثیر ، پێغەمبەری خوا ﷺ خاتو رەملە، ئوم حەبیبەی کچی ئەبوسوفیانی کوڕی حەربی کوڕی ئومەییەی کوڕی عەبدشەمسی مارە کرد ، کە دایکیشی ناوی صەفیەی کچی ئەبولعاصی کوڕی ئومەییەیە و ، پێش هاتنی وەحی بە حەڤدە ساڵ لە دایك بووە . ئەوەبوو سەرەتا هاوسەری عوبەیدوڵڵای کوڕی جەحش بووە ، عوبەیدوڵڵا پوورزای پێغەمبەری خوا ﷺ بووە . هەردووکیان دوای موسڵمانبوونیان کۆچ بۆ حەبەشە ئەکەن و ، لەوێ کچێکیان ئەبێت و ناوی ئەنێن حەبیبە ، بۆیە پێی ئەوترێ : ئوم حەبیبە . وتراویشە کە ئەو کچەی ، پێش کۆچ‌کردن بۆ حەبەشە ، لە مەدینەدا بووە . پاشان لەوێ عوبەیدوڵڵا ئەبێتە گاور و هاوسەرەکەی لەسەر دینی ئیسلام ئەمێنێتەوە و ، دوای ئەوەش عوبەیدوڵڵا ئەمرێ..

دیارە ئافرەتێك کە کچی ئەبوسوفیانی گەورەی قورەیش ، بگرە گەورەی هەموو دوورگەی عەرەبیی ، بێت و ، واز لە باوکی بهێنێ و شوێن دینەکەی بکەوێ بۆ غەریبیی و ، لەوێش مێردەکەی پشتی تێ بکات و ، بێکەس دابکەوێ ، ئەوپەڕی لێقەومانە و ، شیاوی ئەوەیە دڵنەوایی بکرێ ، بە تایبەتیی هاوسەرێکی گونجاوی بۆ هەڵ ببژێرێ . جا ئەو وەك کچی سەرۆکێك شایانی ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە بەرزترین پلەدا دایبنێ و ، بۆ خۆی داوای بکات ..

جا کە عیددەی تەواو بوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ نامەی بۆ نەجاشیی پادشای حەبەشە نووسیی تا لێی مارە ببڕێ . وتراوە کە بۆ ئەم کارە عەمری کوڕی ئومەییەی ضەمریی ناردووە . نەجاشییش کارەکەی ئەنجام داوە و ، لە بریی پێغەمبەری خوا ﷺ چوارصەد دینار مارەیی داوە و ، خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاصیش ، کە ئامۆزای ئوم حەبیبە بووە ، بۆی مارە بڕیوە ..

ئوم حەبیبە لە حەبەشە مایەوە هەتا لەگەڵ موسڵمانەکاندا ، لە ساڵی حەوتەمدا گەڕانەوە.

ئەم کارەی پێغەمبەری خوا ﷺ کارێکی بەرزی مرۆڤانە بوو و ، بە تەواوی بووە مایەی لابردنی خەم و خەفەتی ئەو ئافرەتە بەڕێزەی کە لەسەر دینەکەی ئەو دوو جار لێی قەوما بوو . جارێکیان باوکی دەستی لێ بەردا بوو ، لەسەر ئەوەی کە دەست بەرداری دینی قورەیش بوو بوو و ، جاری دووهەمیش مێردەکەی دەستی لێ بەردا بوو، چونکە نەئەچووە سەر دینی گاوران .

ئوم حەبیبە ؓ لە مەدینەدا و ، لە ساڵی چل و چوارەمینی کۆچیی‌دا کۆچی دوایی کردووە .

**چوارەم : فەرزکردنی حەج :**

هەر لەم ساڵەدا ، ساڵی پێنجەم ، بە پێی بۆچوونی زۆرێك لە زانایان خوای گەورە بە پێی فەرمایشتی : ﴿ ولله على الناس حج البيت من استطاع إليه سبيلاً ﴾ حەجی لەسەر موسڵمانان فەرز کرد . بە رای ئیمام شافیعییش لەساڵی شەشەم‌دا بووە .

فەرزبوونی حەج بە قورئان و سوننەت و ئیجماع چەسپاوە ؛ بە رادەیەك کە بۆتە یەکێ لە روکنەکانی ئیسلام و ، پێویستە هەموو موسڵمانێك ئاگاداری بێت ..

لە سەرەتای ئەم ژیان‌نامەوە باسی ئەوەمان کردووە کە ئیبراهیم پێغەمبەر لەگەڵ ئیسماعیلی کوڕی‌دا سەلامیان لێ بێ کەعبەیان دروست کرد و ، پاشان خوای گەورە فەرمانی بەسەر ئیبراهیم خەلیل‌دا دا تا لەسەر کێوی ئەبوقوبەیس لە مەککەدا بووەستێ و ، خەڵك بانگ بکات بۆ حەج . ئیبراهیم سەری سوڕ ئەما و فەرمووی : پەروەردگارم جا دەنگی من بە کوێ ئەگات ؟

خوای گەورەش فەرمووی : ئەی ئیبراهیم ! تۆ جاڕ بدە و ، منیش ئەی‌گەیەنم .[٥٣]

ئیبراهیمیش جاڕی دا و فەرمووی : خەڵکینە ! خوای گەورە حەجی لەسەرتان فەرز کردووە ، دە بێن حەج بکەن . ئەوەبوو خوای گەورەش دەنگی ئەوی گەیاند بەوانەی کە لە پشتی پیاوان و ، لە رەحەمی دایکان و ، لە جیهانی ( ذر ) دان پێش ئەوەی بێن، ئیتر لەو رۆژەوە تا ئاخرزەمان خوای گەورە کێی ویستبێ حەج بکا ، هەر هەموویان وەڵام ئەدەنەوە و ئەڵێن :

---

٥٣ با هەموو موسڵمانێك کەڵك لەم ئامۆژگارییە وەربگرێت و ، لەسەر بچووکیی و کەم وکورتیی خزمەتەکەی دڵی سارد نەبێتەوە . ئەو با خزمەت بکات و ، خوای گەورە خۆی بەرەت ئەخانە ئەو خزمەتەیەوە .

(( لبيك اللهم لبيك ، لبيك لا شريك لك لبيك . إن الحمد والنعمة لك والملك ، لا شريك لك )) .

ئیتر لە ماوەی نێوان ئیبراهیم و پێغەمبەری خۆماندا سەلامیان لێ بێ عەرەبەکان حەجی ماڵی خوایان ئەکرد ، بەڵام بەوەی کە کەعبەیان پڕ لە بت کردبوو و ئەیان پەرستن ، حەجیان تێك دابوو و ، شێوە ڕوونەکەیان لێڵ کردبوو ، بەوەی کە هەندێ لە مەناسیك‌یان دەستکاریی کردبوو و ، بیدعەی زۆریان داهێنا بوو . جا کە ئیسلام هات هەموو داهێنراوەکانی لە حەج کردەوە و ، حەجی بردەوە سەر شێوە پاکەکەی کە مایەی تەوحید و ناسینی خوای تاك و تەنیایە .

حەج حیکمەت و فەلسەفەی زۆری هەیە ، کە یەکێ لەو حیکمەتانەی بریتی‌یە لەوە کە کۆبوونەوەیەکی ساڵانەی موسڵمانانە و ، لە هەموو گۆشەیەکی زەوی‌یەوە موسڵمانان ڕوو ئەکەنە ئەو شوێنە پیرۆزە و ، لەوێ دوای بەجێ هێنانی کاروباری حەج، لە خۆشیی و ناخۆشیی موسڵمانانی سەرزەویی ئاگادار ئەبن و ، بە پێی توانا و، تێ گەیشتنی خۆیان نەخشە بۆ بەرژەوەندیی موسڵمانان ئەکێشن و ، بە پێی تواناش دەستی یارمەتیی بۆ موسڵمانان درێژ ئەکەن !

یەکێ تر لە حیکمەتەکانی ئەوەیە کە ئەبێتە مایەی پاك‌کردنەوەی دڵ و دەروون و، بەرزبوونەوەی پلەی ئیمان .. چونکە ئەو کەسەی گەیشتە ئەو شوێنە پیرۆزە هەست بە فڕینی ڕۆح ئەکات : ئەمە ئەو شوێنەیە کە ئیبراهیم و ئیسماعیل و دایکی ئیسماعیل خۆیان فرۆشت بە خوا .. ئیبراهیم ژنەکەی و کۆرپەکەی هێنایە ئەو شوێنە چۆڵە و بۆ ڕەزامەندیی خوا بەجێی هێشتن . کە هاجەرە خاتوونیش زانیی فەرمانی خوایە ڕەزامەندیی نواند و ، پشتی بە خوا بەست ـ هەر چەندە بە ڕواڵەت هیچ هۆیەکی ژیانیان نیە ـ کە خوا چاودێری‌یان ئەکات .

هەروەها ئیبراهیم و ئیسماعیل تەسلیمی خوا بوون بۆ سەربڕینی ئیسماعیل . لەم شوێنە پیرۆزەدا پێغەمبەری خوا ﷺ بە تاقیی تەنیا دەستی دایە بڵاو کردنەوەی ئیسلام ، تا یەکە یەکە مرۆڤە خوا پێداوەکان ئیمانیان هێنا و ، لە پێناوی ئەو ئیمانەشدا هەموو ناڕەحەتی‌یەکیان قبووڵ کرد ، تا سەرکەوتن .

هەروەها لەم شوێنە پیرۆزەدا مرۆڤ فێری تەقوا ئەبێت .. لە واتای یەکسانیی تێ ئەگات ، کە هەموو یەك جل و بەرگیان پۆشیوە و ، هەر ئەڵێی ساحەی مەحشەرە ..

ئیتر به هیچ شێوەیەك پیرۆزیی بۆ دار و بەرد دانانێ . عومەری کوڕی خەططاب خوا لێی رازیی بێ ، وەك بیەوێ بیری موسڵمانانی بخاتەوە کە نەکەن بت پەرستیی تێکەڵ بە ئیسلامی بێگەرد بکەن ، ئەی فەرموو :

بەردە رەشەکە ! من ئەزانم تۆ بەردێکی نە زیانت لایە و نە کەڵك .. خۆ ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە چاوم لێ بووە پێغەمبەری خوا ﷺ ماچی ئەکردی ، ماچم نەئەکردی .[٥٤]

[٥٤] السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٢٩٤ ـ ٣١٨ .

## بەشی سییەهەم

# ڕووداوەکانی نێوان قورەیظە و حودەیبیە

کە ئیسلام هات هەموو هۆزێکی بتپەرستی دوورگەی عەرەبیی دەستی دایە دژایەتیی و بەربەرەکانێ لەگەڵیا ، هەتا ئیسلام زیادی ئەکرد و دەسەلاتی پەیدا ئەکرد ، ئەوان پلەی دژایەتی‌یان بەرزتر ئەکردەوە ، بە تایبەت کاتێك کە ئیسلام کۆمەڵێك پیاوی مەردی وەهای پەروەردە کردن ، کە چەندە غیرەتیان بۆ بەرگریی ژن و منداڵیان ئەجوولا ، چەند قاتی ئەوە بۆ پاراستنی ئیسلام بەپەرۆش بوون . هەتا ئەو هۆزە دژانە زۆریان هەوڵی ئەوەیان ئەدا کە سوپای گەورە کۆبکەنەوە و ، مەدینەی پایتەخت بگرن ..

بەڵام کە سوپای ئەحزاب شکستی هێنا و ، لۆژە لۆژ جەنگاوەرەکان گەڕانەوە وڵاتی خۆیان ، ورەی سوپای ئیسلام بەرز بوویەوە و ، ناوبانگی ئەو سوپا خواناسە دوورگەی پڕ کرد ..

بۆ ئەمە پێغەمبەری خوا ﷺ لەوە ئاگادار بوو کە ئەگەر ئەو بتپەرستانە بۆیان بلوێ لەگەڵ خەیبەردا سوپایەکی تری وەك سوپای ئەحزاب دێننەوە سەر مەدینە ، بۆیە بە پێویستی زانیی کە یەك بە یەکی ئەو هۆزانە دەرس دابدات .. بۆ ئەمە سوپای ئیسلام ئەم چالاکی‌یانەی نواند :

**یەکەم : هەڵمەتی ( القرطاء )**

لە ناو هۆزە بیابان نشینەکان‌دا عەشیرەتە نەجدی‌یەکان لە هەموو هۆزێك زیاتر دوژمنی موسڵمانان بوون ، چونکە ئەوانە یەکجار دڕ و لێ‌هاتوو و ، زۆر بوون . هەتا ئەوەبوو بەشی زۆری سوپای ئەحزاب ، کە ئەگەیشتە شەش هەزار جەنگاوەر، لە غەطەفان و ئەشجەع و ئەسلەم و فەزارە و ئەسەد بوو ، لەبەر ئەم هۆیە هەر کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە غەزای ئەحزاب و قورەیظە دەستی بەتاڵ بوویەوە ، یەکەم هەڵمەتی سەربازیی بەرەو هۆزە نەجدی‌یەکان ، لە ئەوەی بەکری کوڕی کیلاب ، خستە

رێ ، که له ناوچەی ( القرطاء ) دا ئەژیان و حەوت شەو رێگا لە مەدینەوە دوور بوون..

ئەوەبوو له دەی مانگی موحەڕڕەمی ساڵی شەشەمی کۆچییدا ، پێغەمبەری خوا ﷺ ، هەڵمەتێکی ژێرکردن و دامرکاندنەوەی ، بە سەرکردایەتیی سەرۆکی پاسەوانی تایبەتیی خۆی ، موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی ئەنصاریی ، نارده سەر ئەو ئەعرابە تێنەگەیشتوانە .. ئەم هەڵمەتە بریتیی بوو له سیی سوار و ، لەوە ئەچێ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە کوڕی مەسلەمە دابێ کە ژن و منداڵ بە دیل نەگرن ..

موحەممەدی کوڕی مەسلەمە بە خۆی و جەنگاوەرەکانیەوە کەوتە رێ .. بە شەو ئەرۆیشتن و بە رۆژ خۆیان ئەشاردەوە ، هەتا ئەوەبوو لە ناخلۆفدا دایان بەسەر نەوەی بەکری کوڕی کیلابدا و ، سەرەتا هەندێ بەرگرییان کرد و نزیکەی دە کوژراویان لێ بەجێما و ، پاشان هەڵاتن و ، موسڵمانەکانیش پەنجا وشتر و سێ هەزار سەر مەڕیان دەست کەوت . کە گەڕانەوە پێغەمبەری خوا ﷺ پێنج یەکی لێ جیا کردەوە و ، ئەوانی تری بەسەر جەنگاوەرەکاندا دابەش کرد.. ئەم هەڵمەتە نۆزدە رۆژی خایاند..

ئەم سریەیە لە کاتی گەڕانەوەیدا تووشی یەکێ لە سەردارانی نەوەی حەنیفە بوو ، بە ناوی ثومامەی کوڕی ئوثالی حەنەفیی و ، بە دیل گرتیان بێئەوەی بیناسن کێیە، چونکە خۆی وەها گۆڕیی بوو کە نەناسرێتەوە و ، بە دەست کیسەی موسەیلەمەی درۆزن ، بۆ کوشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ ، نێررا بوو . کە پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی پێ کەوت فەرمووی : (( أتدرون من أخذتم ؟؟ هذا ثمامة بن أثال الحنفي ، فأحسنوا أساره )) . فەرمووی : ئایا ئەزانن کێتان گرتووە ؟ ئەمە ثومامەیە و لە بەندکردنیدا بە چاکیی لەگەڵیا بجووڵێنەوە . واتە رێزی لێ بگرن . فەرمانیشی دا وشترێکی بۆ تەرخان بکەن تا هەموو بەیانیی و ئێوارەیەك شیرەکەی بهێنن بۆ ئەو..

پێغەمبەری خوا ﷺ رێزی لە سەرداری نەوەی حەنیفەی دیل گرت و ، لە شوێنی بەندکردنەکەیدا سەری لێ ئەدا و دڵخۆشیی ئەدایەوە ، بە رادەیەك کە کاری کردە سەر دڵ و دەروونی .

جارێکیان کە سەری لێ دا ، بۆ لاواندنی فەرمووی : (( ما عندك یا ثمامة ؟ )) فەرمووی : ثومامە چیت لایە ؟ وتی : ئەی موحەممەد ! خێرم وا بەلاوە .. ئەگەر بم کوژی ، خاوەن خوێنێك ئەکوژی و ، گەر چاوپۆشییم لێ بکەی ، چاوپۆشیی لە سوپاس گوزارێك ئەکەی و ، گەر سامانیشت بوێ ، داوا بکە ، چەندت بوێ ئەتدرێتێ !!

تا سێ جار ئەم وت و وێژە لە نێوانیاندا ڕووی دا ، هەتا داوای لە ثومامە ئەکرد کە موسڵمان ببێ ، کەچیی موسڵمان نەبوو و ، لە دواجاردا فەرمووی : (( أطلقوا ثمامة )) . ئەوانیش بەریان دا و ، بەرەو کۆمەڵە دارخورمایەکی نزیکی مزگەوت ڕۆیشت و ، لەوێ خۆی شۆرد و ، پاشان گەڕایەوە .

بەڵێ ، بە ڕەفتاری جوانی پێغەمبەری خوا ﷺ دڵ و دەروونی ثومامە تەسلیم بوون و دڵی بۆ موسڵمان بوون نەرم بوو .. کە گەڕایەوە هاتەوە خزمەتی پێغەمبەری خوا و وتی : ئەی موحەممەد ! بەخوا لەسەر زەوییدا دەم و چاوێکی تر نەبووە ئەوەندەی دەم و چاوی تۆ رقم لێی بێ ، کەچیی ئێستا دەم و چاوت لە هەموو دەم و چاوەکان لەلام خۆشەویستترە .. بەخوا لەسەر زەوییدا دینێکی تر نەبووە ئەوەندەی دینەکەی تۆ رقم لێی بێ ، کەچیی ئێستا دینەکەت لە هەموودینەکان لەلام خۆشەویست ترە .. بەخوا وڵاتێکی تر نەبووە ئەوەندەی وڵاتەکەی تۆ رقم لێی بێ ، کەچیی ئێستا وڵاتەکەت لە هەموو وڵاتەکان لەلام خۆشەویستترە ..

پاشان شایەتمانی حەقی هێنا و موسڵمان بوونی خۆی ئاشکرا کرد و ، بووە هاوەڵێکی زۆر چاك و ، دامەزراوترین پیاوی نەوەی حەنیفە بوو کە لەسەر ئیسلام مایەوە و ، لە کاتی فیتنەی موسەیلەمەدا دایە پاڵ سوپای ئیسلام و دژی موسەیلەمە ئەجەنگا ..

جا لە صەحیحی بوخارییدا هاتووە کە ثومامە دوای موسڵمانبوونی بە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەڵێت : کاتێك کە ئەسپ سوارەکانت گرتمیان دەم ویست بۆ عومرە بچم ، ئێستە چیی ئەفەرمووی ؟ ئەویش ماوەی دا بچێت بۆ عومرە .

ثومامە وەك سەردارێکی چاونەترسی دوورگە وای بە چاك زانیی ، کە بۆ عومرە ئەچێتە کەعبەوە ، بە دەنگی بەرز ( تلبية ) بکات ، بۆیە کە گەیشتە شیوی مەککە دەنگی ( تلبية ) ی بەرز کردەوە ..

کە قورەیش ئەمەیان دیی پێیان ناخۆش بوو و ، بە دەست درێژییان لە قەڵەم دا ، بۆیە ثومامەیان گرت و بەندیان کرد و ، بە وەرگەڕان لە دینیش تاوانباریان کرد .

کەچیی ثومامە وەڵامی دانەوە کە لە دین وەرنەگەڕاوە ، بەڵکو شوێن چاکترین دین کەوتووە ، دینی موحەممەد . بەمە قورەیش زۆر ناڕەحەت بوون و ، بەندکرنەکەیان توندتر کرد . ئەویش سوێندی خوارد دەنکە گەنمێکی یەمامەیان بۆ

نانێرێ هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ ماوە نەدات ، چونکە دانیشتوانی مەککە بۆ خۆراك پشتیان بە دانەوێڵەی یەمامە ئەبەست ..

کافرەکانی مەککە ویستیان ثومامە بکوژن ، لەسەر ئەوەی کە شوێن ئیسلام کەوتووە ، بەڵام پیاوێکی ژیریان لەوە قەدەغەی کردن کە وتی : لێی گەڕێن ، ئێوە پێویستتان بە یەمامە ئەبێ . ئەوانیش لە ترسی ئەوەی خزمەکانی خۆراکی یەمامەیان لێ بگرنەوە بەریان دا ..

ثومامە کە گەڕایەوە ناو خزمەکانی سوێندەکەی خۆی بەسەر برد و خۆراك و دانەوێڵەی لە قورەیش قەدەغە کرد و ، ئەوانیش پێی ناڕەحەت بوون و ، لە ناو مەککەدا گرانیی و برسێتیی بڵاو بوویەوە .

قورەیش کە تەنگیان پێ هەڵ چنرا ، ناچار بوون پەنا بەرنە بەر پێغەمبەری خوا ﷺ تا فەرمان بدات بە سەرداری نەوەی حەنیفە ئابلۆوقەی ئابووری‌یان لەسەر هەڵبگرێ ، ئەمەش بە بۆنەی سیلەی رەحمەوە .

هەر چەندە موسڵمانەکان و قورەیش لە حاڵەتی جەنگ‌دا بوون ، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ دڵی بۆیان جۆشا و ، فەرمانی دا ثومامە رێ بدا دانەوێڵەیان بۆ بڕوات ، تا دانیشتوانی مەککە لە گرانیی رزگار بن .

**دووهەم : هەڵمەتی ( الغمر )**

نەوەی ئەسەد ئازاترینی هۆزەکانی نەجد بوون ، کە بەشداریی جەنگی ئەحزابیان کرد ، بە سەرکردایەتیی طولەیحەی کوڕی خووەیلیدی ئەسەدیی ، بەمە ئەمانیش بوونە دوژمنی موسڵمانەکان . بۆیە ئەمانیش ئەبوایە ترس و بیم بخرایەتە دڵیانەوە ، هەتا بیر لەوە نەکەنەوە جارێکی تر بێنە سەر مەدینە و ، موسڵمانەکانیش بە خاوەنی هێزێکی وەها سەنگین بزانن کە ئەتوانن تا ناوجەرگەی خاکی نەوەی ئەسەد هەڵمەت بەرن .

بۆ ئەمە پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵمەتێکی ژێرکردنی کردە سەر ناوچەی نەوەی ئەسەد ، ئەگەرچیی سەربازەکانی ئەو هەڵمەتە کەم بوون ، بەڵام کاریگەریی گەورەیان هەبوو ..

فەرماندایەتیی ئەم سریەیە بە هاوەڵی پایەدار عوکاشەی کوڕی مەحصەنی ئەسەدیی سپێررا ، کە لە نەوەی ئەسەد خۆیان بوو و ، ژمارەی جەنگاوەرەکانیش چل سوار بوون .

عوکاشە پێی خۆش بوو لە ناخلۆف‌دا بدا بەسەر نـەوەی ئەسـەددا ، کەچیی بـەر لەوەی بگاتە لایان هەواڵیان زانیـی و ، خەڵکەکـە بـە پەلـە خۆیـان گەیانـدە کێـوە بەرزەکان و ، کە عوکاشە گەیشت ناوچەکە چۆڵ بوو ..

خێرا شوجاعی کوڕی وەهبی نارد تا هەواڵ بزانێ ، کە گەڕایەوە هەواڵی دایـە کـە شوێنەواری وشتری لەم نزیکانە دیوە . عوکاشە بـە خـۆی و جەنگاوەرەکانـەوە دوای شوێنەوارەکە کەوتن و ، دیتیان وا پیاوێك لەوێ خەوتووە . دەربارەی نـەوەی ئەسـەد پرسیاریان لێ کرد ، ئـەویش وتـی : کـە هـەواڵی ئێوەیـان بیسـت خۆیـان گەیانـدە بەرزاییـیەکان . دەربـارەی وشـترگەلی نـەوەی ئەسـەد پرسـیاریان لێ کـرد ، وتـی : بردوویانە لەگەڵ خۆیان‌دا .. کە موسـڵمانەکان ترسـاندیان وتـی : ئایـا لـە کوشـتنم بێ‌خەمم ئەکەن تا شوێنی هەندێ وشترتان پیشان بدەم کە لە هاتنتـان ئاگـادار نـین ؟ وتیان : بەڵێ .

کابرا ئەی‌ویست چەواشەیان بکات ، بۆیە کە عوکاشە هەستی بەوە کرد بە کـابرای وت : بەخوا یا راستمان پێ ئەڵێیت یان لە ملت ئەدەین .

کە دەست نیشانی بۆ کردن موسڵمانەکان هێرشیان بـرد و ، دەسـتیان بەسـەر دووصـەد وشتردا گرت و خەڵکەکەش هەلاتن . پاشان موسڵمانەکان بـەرەو مەدینـە بـە سـەلامەتیی گەڕانەوە .. ئەم هەڵمەتە لە رەبیعی یەکەم یان دووهەمی ساڵی شەشەم‌دا بووە .

**سێهەم : غەزای نەوەی لیحیان**

هۆزەکانی نەوەی لیحیان ، کـە لـە ناوچـەی حیجـازدا بـوون ، لەگـەڵ کۆمـەڵێك موسڵمان‌دا ناپاکی‌یان کرد ، کە لە هاوەڵە چاکەکانی پێغەمبەری خوا بوون .

ئەوەبوو هاتنە مەدینە و داوایان کرد پێغەمبـەری خـوا ﷺ چـەند شـارەزایەکیان لەگەڵ‌دا بنێرێ تا نەوەی لیحیان لە شەریعەت شـارەزا بکـەن . ئـەوەبوو دە هـاوەڵی قورئان شارەزا بە سەرکردایەتیی عاصم ی کوڕی ثابیت ڕۆیشتن و لـەوێ غـەدریان لێ کردن و شەهیدیان کردن ، وەك لە پێشەوە باس کرا ..

پێغەمبەری خوا ﷺ ئازاری زۆر بە دڵی گەیشت بۆ ئـەو نامـەردی‌یـە ، بۆیـە بـۆ هەلێك ئەگەڕا کە تۆڵە لەو هۆزە ناپاکانە بستێنێ و خـوێنی ئـەو شـەهیدانە هـەروا نەفەوتێ . بەڵام لەو کاتەدا بۆ موسڵمانان نەئەگونجا سوپا ئەوەندە لـە مەدینـە دوور بخەنـەوە و ، نزیـك دوژمنـی گـەورە ، قـوڕەیش ، بکەونـەوە . لەلایـەکی تریشـەوە

موسڵمانان بە دوژمنی زۆرەوە ، چ ناوەکیی و چ دەرەکیی ، پەشۆکا بوون ، بە تایبەت پیلانە پڕمەترسییەکانی جوولەکە ، کە ئەوەبوو سوپای ئەحزابیان هێنایە سەر مەدینە .

هەر بە لاچوونی مەترسیی ئەحزاب و ، دەست هێنان بەسەر قورەیظەدا ، مەترسیی لە موسڵمانان دوورکەوتەوە و ، پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتە ڕێکخستنی هەڵمەتێك بۆ تەمێ‌کردنی ئەعرابی نەوەی لیحیان لە هۆزی هوذەیلی ناپاك ..

خۆی بووە فەرماندەی دووصەد جەنگاوەری موسڵمان کە بیست ئەسپ سواریان لەگەڵدا بوو و ، بەرەو ناوچەی نەوەی لیحیان کەوتنە ڕێ ، ئەمەش دوو مانگ دوای تیاچوونی نەوەی قورەیظە ، کە ئەمە یەکەم هەڵمەتی موسڵمانان بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی فەرماندەی سوپا بێت .

ئەو ناوچەیەی کە نەوەی لیحیانی لێ ئەژیان زیاتر لە دووصەد میل لە مەدینەوە دوور بوو ، بۆیە ئەم ڕێگایە بۆ یەکێك کە بە سوپاوە بیبڕێ زۆر ناڕەحەت بوو ، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ باکی لەو ناڕەحەتییە نەبوو ، بەو مەرجەی تۆڵەی هاوەڵە خۆشەویستە بێ‌تاوانەکانی بستێنێ .

سەرەتا بۆ ئەوەی دوژمن چەواشە بکات ، پێغەمبەری خوا ﷺ بە سوپاکەیەوە بەرەو باکوور کەوتە ڕێ ، بە مەرجێ هۆزە ستەم کارەکەی نەوەی لیحیان لەوپەڕی باشوورەوە بوون . بەر لەوەش کە بەرەو باکوور بکەوێتە ڕێ وەهای بڵاو کردەوە کە ئەیەوێ بەرەو شام هێرش بکات ، چونکە وای دانا بوو کە لە ناو و دەوروبەری مەدینەدا سیخوڕی دوژمن هەبن و هەواڵی سوپاکەی بگەیەنن پێی .

جا کە بەرەو باکوور کەوتنە ڕێ وەهای ئەگەیەنێ کە بەرەو شام هێرش ئەبات و ئەو سیخوڕانە ئەو دەنگ و باسە چەواشەیە بە هۆزەکانیان ئەگەیەنن . هەتا هاوەڵانیش کە لە ناو سوپاکەدا بوون گومانیان نەبوو کە بەرەو شام ئەڕۆن ، تا ئەوەبوو بەرەو باکوور نزیکەی بیست میلێك ڕۆیشت ، پاشان بەرەو باشوور هەڵ گەڕایەوە . بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا هوذەیلی تاوانبار لە هێرش ئەترسان و سیخوڕی زۆریان بڵاو کردبوویەوە ، بۆیە کە سوپای ئیسلام لە ناوچەکەیان نزیك کەوتەوە ، هەر هەموویان هەڵاتن و خۆیان گەیاندە لووتکەی چیاکان .

کە سوپای ئیسلام گەیشت و هەواڵی هەڵاتنی تاوانبارانی زانیی لە ناوچەکەیاندا سەربازگەی دروست کرد و ، سریەی بە هەموو لایەکدا ڕەوانە کرد تا چەندێ لەو پیاو

خراپانەیان دەستگیر ئەبێ بیانهێنن . کەچیی دوای دوو ڕۆژ لە هەوڵ و کۆشش کەسیان دەست نەکەوت .

دوای ئەوەی کە ناوچەی دوژمنان دوو ڕۆژ لە ژێر دەستی سوپای ئیسلامدا بوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ وای بە چاك زانیی ترسێك بخاتە دڵی قورەیشەوە ، چونکە سوپاکەی یەکجار لە مەککە نزیك کەوتبوویەوە ، ئەوەبوو بەرەو دۆڵی عوسفان کەوتە ڕێ و ، کە گەیشت ئەبوبەکری بانگ کرد و دە سوارچاکی هاوەڵی خستە گەلی و فەرمانی پیا دا کە بەرەو مەککە بکەوێتە ڕێ ، تا ترس و لەرز بخاتە دڵی دانیشتوانەکەیەوە . صددیقیش بە خۆی و سوارەکانیەوە ڕۆیشتن هەتا گەیشتە ( کوراعولغەمیم ) کە یەکجار لە مەککەوە نزیکە . کە قورەیش ئەمەیان زانیی وایان زانیی سوپای ئیسلام هێرشیان ئەکاتە سەر ، بۆیە ترس و لەرز چووە دڵیانەوە .

جا کە صددیق کاری خۆی ئەنجام دا بە سەلامەتیی گەڕایەوە خزمەتی پێغەمبەر و، سوپاش بەرەو مەدینە کەوتە ڕێ و ، ئەی فەرموو : (( آیبون تائبون عابدون لربنا حامدون )) . ئیبن ئیسحاق یش لە جابیرەوە ئەم زیادەیەی گێڕاوەتەوە کە فەرموویە : (( أعوذ بالله من وعثاء السفر وكآبة المنقلب وسوء المنظر في الأهل والمال )) .

کە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە شیوی ( غران ) ، کە هاوەڵەکان لەو شوێنەدا شەهید کرابوون ، داوای ڕەحمەتی بۆ کردن و دوعاشی بۆ کردن . موسڵمانەکان لە ڕەبیعی یەکەم یان جومادی یەکەمی ساڵی شەشەمدا دەرچوون و ، ئەم سەفەرەی سوپای ئیسلام چواردە شەوی پێ چوو .

**چوارەم : هەڵمەتی ( ذوالقصة )**

ذولقەصصە شوێنەواری نەوەی ثەعلەبەیە لە هۆزی غەطەفان ، کە دوژمنی سەرسەختی پێغەمبەری خوا بوون و ، بیست و چوار میل لە مەدینەوە دوور بوو .

ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ ، بە سەرکردایەتیی سوارچاکی بەناوبانگ موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی ئەنصاریی ، دەوریەیەکی دە کەسیی بۆ ناوچەی ذولقەصصە ڕەوانە کرد .

کە سیخوڕەکانی نەوەی ثەعلەبە هەواڵی جم و جووڵی ئەم دەوریەیان زانیی کە بەرەو ناوچەی ئەوان ئەڕوات ، خۆیان بۆی ئامادە کرد و ، بۆ ئەوەی دەوریان بگرن صەد پیاو خۆیان بۆیان حەشار دا ..

که کوڕی مەسلەمە گەیشتە ذولقەصصە کەسی تیا نەدیی . ماوەی دا هاوەڵەکانی بحەوێنەوە ، ئەوانیش خەویان پیا کەوت و ، بە خۆیان نەزانیی هەتا صەد سوارەکەی نەوەی ثەعلەبە هەموو لایەکیان لێ گرتن . کە هاوەڵان بەخەبەر هاتن هەڵمەتیان دایە شمشێرەکانیان و دەستیان کرد بە تیر وەشاندن بۆ دوژمن ، بەڵام کەڵکی نەبوو ، چونکە دوژمن زۆر بوون و چاریان نەئەکرا . ئەوەبوو کافرەکان هەڵمەتیان دایە هاوەڵان و هەر هەموویان کوشتن ، بەڵام فەرماندەی موسڵمانەکان بە زامداریی کەوتبووە ناو کوژراوەکان و ، کە کافرەکان دایان لە پاژنەی و نەجوولایەوە وایانزانیی ئەویش مردووە و ، وازیان لێ هێنا .. ئیتر ئەسپ و چەکەکانیان بردن ، هەتا جل و بەرگەکانیان لێ داماڵین و ڕۆیشتن .

لەو کاتەدا پیاوێکی موسڵمان ڕێی ئەکەوێتە ئەو ناوە و ، کە کوڕی مەسلەمە و هاوەڵانی دیی وا کوژراون (( إنا لله وإنا إليه راجعون )) ی وت .. کە موحەممەدی کوڕی مەسلەمە بۆی دەرکەوت ئەم پیاوە موسڵمانە ، جوولایەوە و ، بۆ موسڵمانەکە دەرکەوت کە ماوە ئەویش هەڵی گرت و گەیاندیەوە مەدینە و ، لەوێ تیماری زامەکانی کرا هەتا چاك بوویەوە .. ئەمە لە مانگی ڕەبیعی یەکەم یان دووهەمی ساڵی شەشەمدا بووە .

**پێنجەم : هەڵمەتێکی تری ذولقەصصە**

هۆی ئەنجام دانی ئەم هەڵمەتە ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی گەیشت کە نەوەی موحاریب و نەوەی ثەعلەبە و ئەنمار لە ناوچەی تەغلیبین و میراض ەوە ، کە سیی و شەش میل لە مەدینەوە دوورن ، کەوتوونەتە ڕێ ، تا هێرش بکەنە سەر شوێنی لەوەڕاندنی ڕانە وشتری موسڵمانەکان لە شوێنێکدا کە حەوت میل لە مەدینەوە دوور بوو ، بە نیازی تاڵان کردنی ئەو مەڕوماڵاتانە .

بۆ ئەمە پێغەمبەری خوا ﷺ بە پەلە کۆمەڵێك سوارچاکی لە هاوەڵان هەڵ بژارد ، کە چل کەس ئەبوون و ، بە پەلە و ، بە سەرکردایەتیی ئەبوعوبەیدە ( عامیری کوڕی جەڕڕاح ) ناردنی بۆ پارێزگاریی ئەو ماڵیاتانە و دەرکردنی کافرەکان .

ئەبوعوبەیدە بە خۆی و سوارەکانیەوە دوای نوێژی مەغریب مەدینەیان بەجێ هێشت و ، لەگەڵ تاریك و لێلیی بەرەبەیاندا گەیشتنە ذولقەصصە و ، ئەبینن وا ڕاستە بتپەرستەکان خۆیان ئامادە کردووە کە هەڵمەت بەرنە سەر ئاژەڵەکانیان . ئەبوعوبەیدە بە شێوەیەکی ناخلۆف و چاوەڕوان نەکراو هەڵمەتی دانێ و ، ئەوانیش لە ترساندا بەرەو چیاکان هەڵاتن و ، خۆیان دەرباز کرد ، بەڵام توانییان پیاوێکیان لێ

بە دیل بگرن و ، دەستیش بەسەر چەند وشتر و کەل و پەلێکیان‌دا بگرن کە بەجیٚ‌یان هێشتبوون .

ئەبوعویەیدە و سریەکەی بە سەلامەتیی گەڕانەوە مەدینە و ، لەویٚ دیلەکە موسلمان بوو و بەریان دا و ، دەست کەوتەکانیش ، دوای دەرکردنی پێنج یەك بۆ بەرژەوەندیی گشتیی ، بەسەر جەنگاوەرەکان‌دا دابەش کران .

ئەم هەلمەتەش لە مانگی رەبیعی دووهەمی سالی شەشەم‌دا بووە .

**شەشەم : هەلمەتی جەمووم**

نەوەی سولەیم‌یش ، کە دانیشتووی جەمووم بوون و ئێستە پێی ئەوتریٚ : (( وادي فاطمة )) ، لە کاتی جەنگی ئەحزاب‌دا ، بەشداری‌یان لەگەلٚ قورەیش‌دا کرد دژی موسلمانەکان .. ئەوەبوو نزیکەی حەوت‌صەد جەنگاوەریان بەشداریی ئەو جەنگەیان کرد و ، لە ( مر الظهران ) گەیشتن بە سوپای ئەبوسوفیان کە بەرەو مەدینە کەوتبووە ریٚ .. بەمە نەوەی سولەیم‌یش ، بە وێنەی ئەعرابەکانی تر کە بەشداری‌یان کردبوو ، بوونە دوژمنی موسلمانان .

جا مافی خۆیان بوو ، دوای تێك شکانی ئەحزاب ، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو هۆزانە تەمیٚ بکا ، تا بیر لە هێرش کردنە سەر مەدینە نەکەنەوە ، بەوەی کە ولاتی ئەو هۆزانە بکاتە مەیدانی جەنگ و هێرش ، هەر چەندە ناوچەی نەوەی سولەیم زۆر لە مەککەوە نزیك بوو . ئەمەش ئەوەی ئەبردە دلی دانیشتوانی دوورگەوە کە موسلمانەکان خاوەنی سوپایەکی وەهان کە بتوانن هەلمەت بەرنە سەر هەر ناوچەیەك کە بیانەویٚ .. کەواتە دەستیان ئەگاتە هەموو تاوان بارێك و ، وا چاکە خۆیان لە قەرەی موسلمانەکان نەدەن .

ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ سریەیەکی بە فەرماندایەتیی زەیدی کوڕی حاریثە ناردە سەر نەوەی سولەیم تا هێرش بکەنە سەریان و لە جەمووم بیان ترسێنن .

کاتێك کە زەید هێرشی کردە سەریان ، لە رێگادا تووشی ئافرەتێکی موزەینە بوو بە ناوی ( حليمه ) کە شوێنێکی نەوەی سولەیی بۆ دەست نیشان کردن و ، ئەوانیش هەلمەتیان بردە سەریان و ، دەستیان لیٚ وەشاندن . ئەوەی توانیی هەلات و ، ئەوەش بۆی نەکرا بە دیلیی کەوتە دەست سریەی موسلمانەکان . هەروەها پیاوانی زەید

دەستیان بەسەر کۆمەڵێك مەڕ و وشتری نەوەی سولەیمدا گرت و بەرەو مەدینە گەڕانەوە و ؛ حەلیمەی موزەنیی و مێردەکەشی بە دیلیی لەگەڵیانا بوون .
که گەیشتنە مەدینە پێغەمبەری خوا ﷺ حەلیمە و مێردەکەی ؛ لە بریی ڕێ نیشاندانی سریەکە ؛ ئازاد کردن . ئەم هەڵمەتەش لە ڕەبیعی دووهەمی ساڵی شەشەمی کۆچییدا بووە .

**حەوتەم ؛ هەڵمەتی عیص**

هۆی ئەم هەڵمەتە ئەوەیە کە دەنگ و باس گەیشتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ کە کاروانێکی قورەیش لە شامەوە بەرەو مەککە گەڕاوەتەوە و ، کەل و پەلێکی زۆری پێیە ..
لەو ماوەیەدا هیچ صوڵح و ڕێك کەوتنێك لە نێوان موسڵمانەکان و قورەیشدا نەبوو ؛ بەڵکو جەنگ و دژایەتیی لە نێوانیاندا بوو ، چونکە قورەیش لە هەل ئەگەڕا تا موسڵمانەکان لە ناو بەرێت و ، موسڵمانەکانیش ئەو ستەمە گەورەیان لە یاد نەئەچوو کە قورەیش و هاوپەیمانانی ئەنجامیان دا ، بە هێنانی سوپای ئەحزاب بۆ سەر مەدینە ، بە نیازی ڕیشەکەن کردنی ئیسلام و موسڵمانان .
بۆیە موسڵمانەکانیش لە هەل ئەگەڕان هەتا پشتی قورەیش بدەن بە زەوییدا .. جا کە هەواڵ گەیشتە پێغەمبەری خوا ﷺ کە کاروانەکەی قورەیش گەیشتۆتە خاکی حیجاز ؛ خێرا کەتیبەیەکی سوارچاکی ئامادە کرد کە بریتیی بوو لە صەد و حەفتا ئەسپ سوار و ، فەرماندایەتیی ئەو کەتیبەیەی دایە دەست زەیدی کوڕی حاریثە و ، فەرمانی دا ڕێ بەو کاروانە بگرن و ، هەرچیی پێیە دەستی بەسەردا بگرن ، چونکە ماڵ و سامانی دوژمنێکی دەست بە چەکە .
زەید و کەتیبەکەی لە مەدینەوە دەرچوون هەتا گەیشتنە ناوچەی عیص و ، لەوێ بە کاروانەکەی قورەیش گەیشتن و ، دەستیان بەسەردا گرت و ، پیاوەکانیشیان هەموو دیل کردن . لەوەش ناچێ کە دەستیان لە یەك کردبێتەوە ؛ چونکە نە کوژراو و نە زامدار لە هیچ لایەك باس نەکراوە . شایانی باسە کە کاروانەکە زیوێکی زۆری بازرگانی گەورەی قورەیش ، صەفوانی کوڕی ئومەییەی پێ بوو .
زەید بە خۆی و کاروان و دیلە قورەیشییەکانەوە گەڕایەوە مەدینە .

شایانی باسە کە ئەبولعاصی کوڕی ڕەبیعی مێردی زەینەبی کچی پێغەمبەری خوا ﷺ یەکێ بوو لەو دیلانە . جا لەبەر ئەوەی کە موسڵمان نەبووبوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ زەینەبی لێ سەندبۆوە و هێنابوویەوە مەدینە . کە ئەبولعاص لەگەڵ دیلەکاندا گەیشتە مەدینە خۆی خستە پەنای زەینەبی هاوسەریەوە ، بۆیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی فەجری تەواو کرد ، زەینەب لەناو مزگەوت و ، لە ڕیزی ئافرەتەکاندا بە دەنگی بەرز وتی : من پەنای ئەبولعاصم داوە .

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : « هل سمعتم ما سمعت ؟ » . فەرمووی : ئایا ئەوەی کە من بیستم ئێوەش بیستتان ؟ وتیان : بەڵێ .

فەرمووی : « أما والذي نفسي بيده ما علمت شيئاً من هذا » . فەرمووی : بەو خوایەی کە گیانی بە دەستە ئاگاداری هیچێ لەوە نەبووم . پاشان ڕێی بە کردەوەی زەینەبدا کە فەرمووی : « وقد أجرنا من أجرت » .

وا دەرئەکەوێ ئەبولعاص فەرماندەی ئەو کاروانەی قورەیش بوویێ ، بە بۆنەی ئەوەوە کە زەینەب دوای ئەوەی پەنای مێردەکەی دا ، چووە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ تا کەتیبەکەی زەید چیی ماڵ و سامانی ئەو کاروانەیان دەست بەسەردا گرتووە بیگێڕنەوە بۆ ئەبولعاص . پێغەمبەریش ﷺ زەید و پیاوانی کەتیبەکەی بانگ کردن تا پرسیان پێ بکات کە ئەبولعاص خزمی ئەوە و ، ئەو ماڵ و سامانەشی کە دەستی بەسەردا گیراوە ، سپاردەی کافرانی مەککەیە بەلایەوە هەتا لە شام کەل و پەلیان بۆ بکڕێت ، جا ئەگەر پێیان خۆش بێ بۆی بگێڕنەوە و ، گەر دڵیشیان پێوە نەبێت ، ئەوە دەستکەوتێکە و خوا بۆی ناردوون .

هەموو بە جارێ ڕەزامەندی‌یان لەسەر نواند و کەل و پەلەکەیان گێڕایەوە بۆی و ، هەموو دیلەکانیشیان بەردان .

دوای ئەمە هەندێ لە موسڵمانان بە ئەبولعاص ئەڵێن : ئەبولعاص ! تۆ پیاوێکی پایەداری لە قوڕەیشدا و ، ئامۆزای پێغەمبەری خوایت ( چونکە لە عەبدمەناف دا بە یەك ئەگەن ) ، ناتوانی موسڵمان ببی و چیی سامانی ئەهلی مەککەت لایە ببێتە دەست کەوتی خۆت ؟

پیاوی ئەو ڕۆژە پیاو بوون .. خۆی ئامۆزای پێغەمبەری خوایە و ، خوشکەزای خەدیجەیە و ، مێردی زەینەبە ، هەتا لە قووڵایی دڵیەوە قەناعەت بە ئیسلام نەکات شوێنی ناکەوێ ، بە مەرجێ ژنەکەشی ، کە زۆری خۆش ئەویست ، لەسەر موسڵمان

نەبوونی ، لیّ سەندراوەتەوە .. بەلاّم زۆربەی ئەوانەی کە ئەمڕۆ بۆ ئیسلام کار ئەکەن، خزمەکانیان هەر ڕێبازێکیان بە دڵ بوو ئەوانیش ئەوە بە ڕاست ئەزانن .. لە کوێ بەرژەوەندیی خۆیان و ماڵ و منداڵیان پارێزرا لەوێ کار ئەکەن .. ئا ئەمانە پیاوێک نین کە ئیسلام پشتیان پیّ ببەستیّ و ، هەرگیز ئەوانە توانای کۆڵ هەڵگرتنیان نیە .. هەتا زووتر خوا ئەو جۆرانە لە کۆڵی ئیسلام بکاتەوە چاکترە !! بە چاوی خۆمان زۆرێك لەوانەمان دین کە بە کاری ئیسلامی یەوە داوەرین !!

ئەبولعاص ئەو بەرژەوەندیبازی یەی بە دڵ نەبوو ، بۆیە بەو موسڵمانەی وت : سەرەتای دینەکەم بە ناپاکیی دەست پیّ بکەم ؟ نا ، بەخوا..

ئەبولعاص لە دڵەوە موسڵمان بووبوو ، بەلاّم ویستی مەردانە موسڵمان ببیّ .. ئەوەبوو بە خۆی و کاروانەکەوە گەڕایەوە مەککە و ماڵ و سامانی یەك بە یەکی ئەو خەڵکەی گێڕایەوە بۆیان و ، پاشان وەستا و وتی : ئەی دانیشتوانی مەککە ! ئایا کەسێکتان ماوە ماڵ و سامانی خۆی وەرنەگرتبێتەوە ؟ ئایا هەرچییم لە ئەستۆدا بوو گێڕامەوە ؟

وتیان : بەڵیّ : خوا پاداشتی چاکەت بداتەوە . بە ڕاستیی پیاوێکی بەوەفا و بەڕێز دەرچوویت .

دوای ئەوەی لەبەردەم ئەو هەمووە خەڵکەدا موسڵمانبوونی خۆی ئاشکرا کرد و وتی : من شاهێدیی ئەدەم کە جگە لە زاتی ( الله ) هیچ خوایەکی تر نیە و ، موحەممەدیش بەندە و پێغەمبەری خوایە ، بەخوا هەر لەبەر ئەوە لەوێ ( لە مەدینە ) موسڵمان نەبووم ، نەوەکو ئێوە وەها بزانن کە دەمەویّ ماڵ و سامانەکەتان بخۆم .

ئیتر ئەوەبوو مەککەی بەجیّ هێشت و گەڕایەوە مەدینە و ، هەر بە نیکاحی یەکەم جاری پێغەمبەری خوا ﷺ زەینەبی بۆ گێڕایەوە .. ئەم هەڵمەتەی زەید لە مانگی جومادیی دووهەمی ساڵی شەشەمدا بووە .

### هەشتەم : هەڵمەتی طورەف

طورەف ئاوێکە لە ناوچەی غەطەفاندا کە سیی و شەش میل لە مەدینەوە دوورە و، لە مانگی جومادیی دووهەمی ساڵی شەشەمدا زەیدی کوڕی حاریثە بە خۆی و دەوریەیەکی سەربازیەوە ، کە پانزە پیاو ئەبوون ، هێرشیان کردە سەر ناوچەی نەوەی ثەعلەبە کە تیرەیەکی غەطەفان بوون و ، بەشداریی سوپای ئەحزابیان کردبوو .

کە موسڵمانەکان گەیشتنە ناوچەکە ، ئەوەی ثەعلەبە هەواڵیان زانیی بوو و ، هەڵ هاتبوون . ئەوەبوو زەید و پیاوانی دەورییەکەی دەستیان بەسەر بیست وشتری هەڵاتووەکاندا گرت و ، دوای چوار شەو گەیشتنەوە مەدینە ..

لەوانەیە پیاوی جەنگاوەری ئەم هۆزە لە هەزار تێپەڕیی بن ، کەچیی هەر هەموویان لەبەردەم پانزە موسڵماندا هەڵاتن ، ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ کە هەر موسڵمانێ حیسابێکی جیاوازی بۆ کراوە و ، جەنگاوەری موسڵمان خاوەنی ناوبانگییەکی کەموێنە بووە ..

**نۆهەم : هەڵمەتی حیسما**

حیسما ناوچەیەکی شاخاویی سەختە ، لە هەمان کاتدا زەویی و زاری بە بەرەکەتی تێدایە کە دارخورمای تێدا ئەڕوێ و ، ئەکەوێتە خۆرئاوای تەبووکەوە ، واتە ئەکەوێتە نێوان کەنداوی عەقەبە و بیابانی سینائەوە ، کە دوو شەو ڕێگا لە ( وادي القرى ) وە دوورە ..

ئەم هەڵمەتە زەیدی کوڕی حاریثە ئەنجامی دا بۆ تەمیٚ‌کردنی هۆزی جوذام کە لەو ناوچەیەدا ئەژیان .

هۆی ناردنی ئەم هەڵمەتە ئەوەبوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەو ساڵەدا دیحیەی کوڕی خەلیفەی کەلبیی [55] بە نامەیەکەوە نارد بۆ لای قەیصەری ڕۆم و تیایا بانگی ئەکرد بۆ سەر ئیسلام .

کە دیحیە گەیشتە لای پادشای ڕۆم ڕێزی لێ گرت و پۆشاکی پێشکەش کرد و دیاریی و خەلاتی پێ دا . پاشان دیحیە بەرەو مەدینە گەڕایەوە ، کاتێک گەیشتە ناوچەی حیسما ، لەسەر سنووری باکووری خۆرئاوای دوورگەی عەرەب ، هونەیدی کوڕی عارض و عارضی کوڕی و چەند چەکدارێکی تری هۆزی جوذام ڕێیان پێ گرت و ، چیی پێ بوو هەموویان لێ سەند و ، تەنها کراسێکی شڕیان لەبەریدا هێشت .

---

[55] دیحیەی کوڕی خەلیفەی کوڕی فەروەی کەلبیی ، هاوەڵێکی ناودارە و ، یەکەم جەنگێك کە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بەشدار بووبێ غەزای خەندەق بووە . زۆر جوان و ڕێك و پێك بووە ، بە ڕادەیەك کە نموونەی پێ ئەهێنرایەوە . پیاوانی فەرموودە وەهایان باس کردووە کە جیبریل لە شێوەی دیحیەدا دائەبەزییە خوارەوە و وەحی ئەهێنا . پیاوێکی ژیر و ئازا و بەجەرگ بووە . بەشداریی جەنگی یەرمووکی کردووە و ، فەرماندەی یەکێ لە کەتیبەکانی ئەو جەنگە گەورەیە بووە . دیحیە تا سەردەمی خەلافەتی موعاویە ژیاوە و ، نیشتەجێی ( مزە ) بووە لە نزیك شاری دیمەشق .

هەر لە هۆزی جوذام ، لە نەوەی ضوبەیب چەند کەسێك موسڵمان بووبوون و ، کە ئەو کارەی هونەیدیان بیست کە دەرهەق بە دیحیە چی یان کردووە ، هێرشیان کردە سەریان و ، بە زۆر هەرچی یان لێ سەندبوو ، وەریان گرتەوە و دایانەوە دەست دیحیە .

کە دیحیە گەڕایەوە مەدینە و هەواڵەکەی دایە پێغەمبەری خوا ﷺ کە هونەید و دەستەکەی چۆن بوونەتە جەردەی سەرە ڕێ ، پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری دا هەڵمەتێکی سەربازیی گەورە ، کە پێنج صەد جەنگاوەر بن ، بنێرێتە سەر ئەو تاوان بارانە و بیان‌کاتە دەرس بۆ خەڵکی تریش .

ئەم جارەش زەیدی کوڕی حاریثە فەرماندەی هەڵمەتەکە بوو . زەید بە خۆی و پیاوەکانیەوە بەرەو باکوور کەوتە ڕێ و دیحیەشی لەگەڵدا بوو ..

زەید بە شەو ئەڕۆیشت و بە ڕۆژ خۆی و سوپاکەی حەشار ئەدا هەتا دوژمن هەواڵ نەزانێ .. پیاوێکی نەوەی عوذرەش دەلیلی ڕێ‌یان بوو .. هەروا ڕۆیشت هەتا لەگەڵ بەرەبەیاندا دای بەسەریاندا و ، لە هەموو لایەکەوە دەورەیان گرتن و ، ژمارەیەکیان لێ کوشتن ، بە تایبەت هونەید و عارضی کوڕی و ، دەستیشیان بەسەر ئاژەڵ و وشتر و ژن و منداڵی هۆزی هونەیددا گرت .. ئەوەبوو هەزار وشتر و پێنج هەزار مەڕ و صەد ژن و منداڵی دیلیان دایە بەر ..

نەوەی ضوبەیب وەك بەرگری‌یان لە دیحیە کرد و ، هونەید هەرچیی لێ سەندبوو ، لێ‌یان سەندەوە بۆی ، وەهاش بەرگری‌یان لە خزمەکانیان کرد ، بە تایبەت کاتێك کە بە دەستی هەڵمەتەکەی زەید تووشی زیان بوون .

ئەوەبوو یەکێ لە سەرۆکەکانیان هاتە لای زەیدی فەرمانده و ناڕەزایی دەربڕیی کە ئەمان موسڵمانن و ، هەر ئەمانیش کەل‌وپەلەکەی دیحیەیان لە ڕێبڕەکان سەندۆتەوە و، بۆیان گێڕاوەتەوە .

زەید داوای لەو سەرۆکە کرد کە ئەگەر ئەو موسڵمانە با سوورەتی ( فاتحە ) بخوێنێ، ئەویش خوێندی . وەك فەرمانی پێ نەبێ ، نەی‌توانیی دیل و ژن و منداڵ و مەڕومالاتەکەیان بۆ بگێڕێتەوە .. لەبەر ئەوە بە سوپاکەی و بە دەست کەوتەکانەوە بەرەو باشوور ، بەرەو مەدینە کەوتنە ڕێ .

یەکێکی تر لە سەرۆکانی هۆزی جوذام ، کە زەیدی کوڕی ریفاعە بوو لەگەڵ چەند خزمێکی‌دا بەرەو مەدینە ، بۆ بە خزمەت گەیشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتنە ڕێ و ، پێشی زەید و سوپاکەیان دایەوە ..

که کوڕی ریفاعە بە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت ناڕەزایی لە کارەکەی زەیدی کوڕی حاریثە دەربڕیی کە هێرشی کردبووە سەر ناوچەی حیسما و وتی :
ئەی پێغەمبەری خوا ! نە حەڵاڵمان لێ حەرام بکە و ، نە حەرامیشمان بۆ حەڵاڵ بکە .
پاشان ئەو نامەیەی دایێ کە لە شەوی موسڵمان بوونیاندا پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خۆی و قەومەکەی نووسیبووی .
هێشتا زەیدی کوڕی حاریثە نەگەیشتبۆوە مەدینە ، پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری دا هەرچیی شتێکی هۆزی جوذام لەلایەن سوپای زەیدەوە دەستی بەسەردا گیراوە بگەڕێتەوە بۆیان .
هێشتا پێغەمبەری خوا ﷺ بەوەشەوە نەوەستا ، بەڵکو هاتە سەر باسی ئەوانەی کە بە دەستی هێزەکەی زەید کوژراون ، کە فەرمووی : (( کیف أصنع بالقتلی ؟ )) .
یەکێ لە سەردارانی هۆزی جوذام کە لەگەڵ نوێنەرەکاندا هاتبوو ، کە ئەبوزەیدی کوڕی عەمر بوو ، وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەوانەمان بۆ بەر بدە کە بە دیل گیراون ، ئیتر هەرچیی کوژراون ئەیانخەمە ژێر هەردوو پێمەوە .
فەرمووی : (( صدق أبوزید )) .
پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ عەلیی کوڕی ئەبوطالیبی بانگ کرد و ، فەرمانی بەسەردا دا کە ئەو نوێنەری تایبەتیی خۆی ئەبێت بۆ لای فەرماندەی هەڵمەتەکە ، زەیدی کوڕی حاریثە ، تا پێی رابگەیەنێ کە هەرچیی دیل و ژن و منداڵ و مەڕوماڵاتیان دەست بەسەردا گرتووە هەر هەمووی ـ کە یەکجار زۆر بوو ـ بگێڕنەوە.
عەلیی فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ! زەید بە گوێم ناکات . فەرمووی : (( خذ سیفي هذا )). فەرمووی: ئەم شمشێرەم ( وەك ناونیشان ) لەگەڵ خۆتدا بەرە ..
عەلیی لەگەڵ زەیدی کوڕی ریفاعە و خزمەکانیدا بەرەو باکوور کەوتنە رێ ، تا فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ بە زەید بگەیەنێ . لە رێگادا تووشی رافیعی کوڕی مەکیثی جوهەنیی [٥٦] بوو کە سواری وشترێکی دەستکەوتەکان بوو بوو و ، زەیدی کوڕی حاریثە بە پەلە ناردبووی تا مژدەی سەرکەوتن بە مەدینە بگەیەنێت . عەلیی وشترەکەی لێ وەرگرت و گێڕایەوە بۆ نوێنەرەکان و رافیعی مژدەدەری لە پاشکۆی

---

[٥٦] رافیع بەشداریی ( بیعة الرضوان ) ی کردووە و ، رۆژی فەتحی مەککە هەڵ گری ئاڵای جوهەینە بوو. پێغەمبەر ﷺ کۆکردنەوەی زەکاتی خزمەکانی پێ سپارد . لەگەڵ خەلیفە عومەردا ئامادەی جابیەی شام بووە .

خۆیدا سوار کرد و هەروا ڕۆیشتن هەتا گەیشتن بە زەید و سوپاکەی و ، ئەو هەمووە دەستکەوتانەشیان پێ بوون . کە تووشی زەید هات فەرمانەکەی پێ ڕاگەیاند کە پێویستە هەموو دەستکەوتەکان بگەڕێننەوە بۆ خاوەنەکانیان .

زەید وتی : نیشانەی ئەمە چییە ؟

فەرمووی : ئەمە شمشێرەکەی پێغەمبەری خوایە ﷺ زەید شمشێرەکەی ناسیی و ، بانگی کردە گەورە پیاوانی هەڵمەتەکە و ، ئەوانیش کۆبوونەوە و ، فەرمانی بەسەردا دان کە هەرچییان لە هۆزی جوذام سەندووە بیگێڕنەوە بۆیان و وتی : ئەمە شمشێرەکەی پێغەمبەری خوایە ﷺ . پیاوەکانیش گوێڕایەڵییان کرد و ، هەرچیی دیل و دەست کەوت بوو گێڕایانەوە بۆیان .

**دەهەم : هەڵمەتی ( وادي القرى )**

ئەم سریەیە لە دوانزە پیاو پێك هاتبوو ، کە لە مانگی ڕەجەبی ساڵی شەشەمدا بەرەو ( وادي القرى ) ، بە فەرماندایەتیی زەیدی کوڕی حاریثە لە مەدینە دەرچوون . کاری ئەم دەورییە ئەوەبوو هەر دوژمنێك لەو ناوچانەدا جم و جووڵی هەبێ ئەوان لێی ئاگادار بن . بەڵام خەڵکی ( وادي القرى ) کەوتنە خۆ و زانییان موسڵمانەکان کەمن، هێرشیان کردە سەریان و ، نۆیان لێ کوشتن و ، سیانیان دەرباز بوون کە یەکێکیان زەیدی کوڕی حاریثە بوو .

**یانزەهەم : هەڵمەتی ( دومة الجندل )**

ئەم هەڵمەتە لە مانگی شەعبانی ساڵی شەشەمی کۆچییدا بووە و ، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوفیش فەرماندەی بووە . پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر دەستی خۆیدا دایئەنیشێنێ و ، بە دەستی موبارەکی مێزەرێکی ڕەشی لەسەر ئەبەستێ و ، بەرەو وڵاتی ( دومة الجندل ) ،[57] ماوا و مەنزڵی نەوەی کەلب ڕەوانەی ئەکات و پێی ئەفەرموێ : (( أُغزُ بسمِ اللهِ وفي سبيل الله ، فقاتل من كفر بالله ، لا تغل ولا تغدر ولا تقتل وليداً فهذا عهد الله وسنة نبيكم )) . فەرمووی : بە ناوی خواوە و ، لە

[57] ( دومة الجندل ) شوێنێکی بەناوبانگە و دۆڵێکی ناودار و سەوز و گەشاوەیە . قەڵاکەی لە تاشەبەردی گەورە دروست کراوە . لە سەردەمی نەفامییدا وڵاتێك بووە کە پادشا قەحطانیەکانی کیندە حوکمیان کردووە ، کە دوا پادشایان ئوکەیدەری کوڕی عەبدولمەلیکی سکوونیی کیندیی بووە و ، لەسەر دینی گاوران بووە . هەر ئەم پادشایە بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە تەبووکەوە خالیدی کوڕی وەلیدی ناردە سەری ، کە ئەوەبوو خالید پادشای بە دیل گرت و ، حەسسانی برای پادشای کوشت و ، ( دومة الجندل ) ی فەتح کرد کە شووورای بەرزی هەبوون . پادشا موسڵمان بوو ، بەڵام دوای کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ پەیمانی شکاند و ، عومەریش باری پێ کرد بۆ عێراق .

پێناوی خوادا غەزا بکە . هەرچیی بێئیمان و کافر، بچۆ بە گژیدا .. لە دەست کەوتەکان هیچ بۆ خۆت لانەدەیت ، غەدر نەکەیت ، منداڵ نەکوژی ، ئەمە عەهدی خوا و سوننەتی پێغەمبەرەکەتانە .

عەبدوڕڕەحمان بە خۆی و سوپاکەیەوە ، کە حەوتصەد جەنگاوەر ئەبوون ، بەرەو باکوور کەوتە ڕێ ، کە بە شەودا ڕێی ئەبڕیی و ، بە ڕۆژیش خۆی کەنار ئەدا هەتا گەیشتە ( دومة الجندل ) .

جا لەبەر ئەوەی کە ئەوانە گاور بوون ، وەك ئەعرابە بتپەرستەکان هێرشی نەکردە سەریان ، بەڵکو دەستی دایە بانگکردنیان بۆ سەر ئیسلام و سێ ڕۆژ وت و وێژی لەگەڵیاندا کرد و ، ئەوانیش هەر ئەیان وت : یان بگەڕێنەوە یان جگە لە شمشێر هیچتان نادەینێ . تا ئەوەبوو لە ڕۆژی سێهەمدا پادشاکەیان ئەصبەغی کوڕی عەمری کەلبیی دڵی نەرم بوو و موسڵمان بوو و ، خەڵکێکی زۆریش بە دوایدا موسڵمان بوون کە هەر هەموویان مەسیحیی بوون .

بەم شێوەیە ئەم هەڵمەتە بەرهەمێکی باشی بۆ ئیسلام هەبوو و ، ئەوانەش کە لەسەر دینی کۆنیان مانەوە ، عەبدوڕڕەحمان لەگەڵیان ڕێك کەوت تا سەرانە بە دەوڵەتی ئیسلامیی بدەن و ، بە سەربەستیی لەسەر دینی خۆیان بمێننەوە .

ئەوەبوو لە کاتی ڕەوانەکردندا پێغەمبەری خوا ﷺ ئامۆژگاریی عەبدوڕڕەحمانی کرد و پێی فەرموو : (( إن أطاعوك فتزوج إبنة ملكهم )) . فەرمووی : ئەگەر گوێ ڕایەڵییان بۆ کردیت و دژت نەوەستان ، ئەوا کچی پادشاکەیان مارە بکە .

هەروایش بوو ، دوای موسڵمانبوونیان عەبدوڕڕەحمان تەماضوری کچی ئەصبەغی مارە کرد و هێنایەوە لەگەڵ خۆیدا بۆ مەدینە و لەوێ سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی لێ بوو ..

**دوانزەهەم : هەڵمەتی ترساندنی نەوەی سەعد ، لە فەدەك** [58]

ئەم هەڵمەتە بریتیی بوو لە دەورییەیەکی گەورە کە صەد سوار ، یان دووصەد پیاو بوون و ، بە فەرماندایەتیی عەلیی کوڕی ئەبوطالیب هەڵمەتیان بردە سەر

---

[58] فەدەك : گوندێکی گەورەی کشتوکاڵیە نزیك بە خەیبەر . شارەکەی جوولەکەنشین بوون و ، بە بۆنەی ئاوی زۆر و خاکی بە پیتەوە خەریکی کشتوکاڵ بوون ، بەڵام بیابانەکەی هەر هەموو عەرەبی نەوەی سەعد بوون و ، عەلیی کوڕی ئەبوطالیب خوا لێی ڕازیی بێ هێرشی بۆ ئەمانە هێنا بوو .

هۆزەکانی نەوەی سەعدی کوڕی بەکر لە فەدەك . ئەمەش دوای ئەوەی کە هەواڵ گەیشتە پێغەمبەری خوا ﷺ کە نەوەی سەعد بڕیاریان داوە کۆمەکیی جوولەکەی خەیبەر بکەن و پیاویان جەنگیان بۆ بکەن دژی موسڵمانەکان ، بەرامبەر بەوەی کە جوولەکەش بەشێکی زۆری خورمای خەیبەریان بدەنێ .

دیارە جوولەکەی خەیبەر دەمێك بوو چاوەڕوان بوون کە پێغەمبەری خوا ﷺ بچێتە سەریان ، بۆیە هەوڵیان ئەدا ، بە هەر رێیەك بووە ، خۆیان بە هێز بکەن ..

عەلیی کوڕی ئەبوطالیب بە خۆی و سریەکەیەوە شەش شەو رێگای بڕیی و ، بە رۆژدا خۆیان حەشار ئەدا . لە رۆژی حەوتەمدا موسڵمانەکان گەیشتنە دەوروبەری فەدەك و ، لەوێ پیاوێکیان دەستگیر کرد ، کە دیار بوو سیخوڕی نەوەی سەعدە . زۆر ترسا بەڵام موسڵمانەکان دڵ خۆشییان دایەوە کە نیازی خراپیان لەگەڵ ئەودا نیە. ئەویش داوای لێ کردن کە بەڵێنی سەلامەتیی بدەنێ تا شوێنی دوژمنیان پیشان بدات . ئەوانیش بێخەمیان کرد و ، ئەو شیوەی نیشان دان کە نەوەی سەعد تیایدا کۆ ئەبنەوە . هەروەها دانیشی بەوەدا نا کە نەوەی سەعد ناردوویانە بۆ لای جوولەکەی خەیبەر هەتا کۆمەکییان بکەن و ئەوانیش لە خورمای خەیبەر بەشیان بدەن ..

ئیمام عەلیی هێرشی کردە سەر دوژمن کە سەرۆکیان وەبرەی کوڕی عەلیم بوو . جا هەرچەندە دوژمن زۆر بوون ، بەڵام بەرهەڵستییان نەکرد و بە خۆیان و ماڵ و منداڵەوە هەڵاتن و ، مەڕ و ماڵاتەکەیان بەجێ هێشت ، کە پێنج صەد وشتر و دوو هەزار مەڕ بوون و موسڵمانەکان دەستیان بەسەردا گرت و ، ئیمام عەلیی دوای ئەوەی کە پێنج یەکی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ جیاکردەوە ، تا لە بەرژەوەندیی گشتی موسڵمانان‌دا خەرجی بکات ، ئەوی تری بەسەر جەنگاوەران‌دا دابەش کرد ..

ئیتر بەبێ هیچ جەنگ و ئاژاوەیەك موسڵمانەکان گەڕانەوە مەدینە .

### سیانزەهەم : هەڵمەتی ئەمێکردنی نەوەی فەزارە

نەوەی فەزارە ئەگەڕێنەوە سەر فەزارەی کوڕی ذبیانی کوڕی بەغیضی کوڕی رەیثی کوڕی غەطەفان ، واتە تیرەیەکی گەورەی غەطەفانن . لە سەردەمی نەفامیی‌دا سەرۆك و فەرماندەیان عویەینەی کوڕی حیصن بوو ، کە لە جەنگی ئەحزاب‌دا سوپای عویەینە لە چوار قۆڵ قۆڵێکی سوپای غەطەفان بوون . لەگەڵ ئەوەش‌دا نەوەی فەزارە

هۆزێکی دڕ و چاونەترس بوون . ئەم هۆزە زۆر دوژمنــی موسـڵمانەکان بــوون و ، لـە هەموو هۆزەکانی تریش زیاتر گێچەڵیان پێیان ئەگێڕا ، ئەویش بە بۆنەی ئـەوەوە کـە لە مەدینەوە نزیك بوون .

ئەم هۆزە چەندین جار شەڕیان بە موسڵمانان گێڕاوە و ، زۆر جاریش جوولەکـە بـە کرێی ئەگرتن تا بێن بە گژی موسڵمانەکاندا .

جا بۆ ئەوەی ئەوان ئاژاوەکەیان نەگوێزنەوە دەوروبـەری مەدینـە ، موسـڵمانەکان هەمیشە بۆ هەل ئەگەڕان کە دەرفەت بۆ ئەم هۆزە بە دەست بهێنن و ، جەنگ و هەرا بخەنە ناوچەکەی ئەوان و ، چاوترسێنیان بکەن . بە تایبەت کە موسڵمانەکان سەرنجیان ئەدا کـە کـاتی هـاتووە دەستێك لـە جوولەکـەی خەیبـەر بوەشـێنن و ، وەك داری زەقنەبووت لەسەر خاکی دوورگە هەڵی بکێشن و فڕێی بدەن . چونکە هەرچیی ئاژاوە بۆ موسڵمانان دروست ئەبوو ، دەستێکی ئەوانی تێدا بوو . جا لەبەر ئەوەی کە ئەوەی فەزارە لەسەر ڕێی نێوان مەدینە و خەیبەردا بوون ، ئەبوایە ئەمانە تەمێ بکرانایە بۆ ئـەوەی دەسـتی یارمـەتیی و کۆمـەکیی بـۆ خەیبــەر درێـژ نـەکەن ، کـاتێ کـە موسڵمانەکان بیانەوێ هێرش بکەنە سەر خەیبەر .

پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵمەتێکی سـەربازیی بـەهێزی پێکـەوە نـا و ، ئەبوبـەکری صددیقی ـ بە پێی ڕیوایەتی ئیمام موسلیم ـ کردە فەرماندەی . ئەوەبوو لـە مـانگی ڕەمەزانی ساڵی شەشەمدا ئەم هێزە موسـڵمانە ، کـە لـە موهـاجیر و ئەنصـار پێـك هاتبوو ، مەدینەی بەجێ هێشت و بەرەو ناوچەی ئەوەی فەزارە کەوتە ڕێ .

ئەم هەڵمەتە کاریگەری‌یەکی چاکی هەبوو ، چونکە تـرس و لـەرزی خسـتە دڵـی ئەوەی بەدرەوە کە تیرەیەکی فەزارە بوون . چونکە هەر بە هەست‌کردنیان بە گەیشتنی ئەبوبەکری صددیق ، ئەوەندە ترسیان لێ نیشت کە نـەیان‌تـوانیی بـەرگریی بکـەن ، بەڵکو کۆمەڵ کۆمەڵ هەڵاتن .. بـەڵام موسـڵمانەکان دەرفـەتی هـەڵاتنیان نـەدان ، بەڵکو توانی‌یان ژمارەیەکیان لێ بکوژن و ژمارەیەکی تریشیان لێ بە دیل بگرن ، کـە یەکێ لەو دیلانە ئافرەتێك بوو کە پێی ئەوترا ( ئـوم قـەرفـە ) و ناویشـی فـاطیمـەی کچی ڕەبیعەی کوڕی بەدر ، لەگەڵ کچەکەی کە ناوی جاریەی کچـی مـالیکی کـوڕی حوذەیفەی کوڕی بەدر بوو ، کە لە جوان‌ترینی کچانی عەرەب بوو .

ئوم قەرفە ئافرەتێکی شـەیتان و فێڵبـاز بـوو و ، لـەناو کـەس و کارەکـەیدا زۆر پایەدار بوو و ، لە ناویانا وەك سەرۆکی هۆز وەها بوو .. لە ماڵەکەیدا پەنجا شمشێر

به ریز هەڵ ئەواسران و ، خاوەنی هەر هەمووشیان بەو ئافرەتە شەیتانە مەحرەم بوون. دوانزە کوڕی چەك بە دەستیشی هەبوون .

لە دەسەلات و توانادا لەناو عەرەبدا نموونەی پێ ئەهێنرایەوە .

ئەم ئافرەتە بەلایە زۆر رقی لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ بۆیە نەخشەی کێشا کە لە ناوی بەرێت .

بۆ ئەمە لە کوڕ و کوڕەزاکانی سیی ئەسپ سواری هەڵ بژارد و ، فەرمانی بەسەردا دان کە بچن بۆ مەدینە و ، پێغەمبەری خوا ﷺ بکوژن ، کەچیی بۆیان نەکرا و ، هەر سییەکە کوژران .

وا دەرئەکەوێ کە ئەم ئوم قەرفەیە سەرۆکی تیرەی بەدری نەوەی فەزارە بووبێ ؛ چونکە هەندێ لە مێژوونووسان ئەم هەڵمەتەیان بە سریەی ئوم قەرفە ناو بردووە .

شێوەی هەڵمەت بردنەکەش سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ئەیگێڕێتەوە کە ئەویش لەگەڵ ئەو سوپایەدا بووە و ، دوای نوێژی بەیانیی لە تاریك و لێڵییدا هەڵمەتیان بردۆتە سەر دوژمن و هەندێکیان لێ کوژراوە . سەلەمەش کۆمەڵێك ژن و منداڵ ئەبینێ کە نیازیان بووە خۆیان بگەیەننە شاخەکە . ئەمیش تیرێك ئەگرێتە نێوانیان و شاخەکە و ئەوەستن و فریایان ئەکەوێ و ، ئوم قەرفە و کچەکەی لەگەڵیانا ئەبن و هەموویان بە دیلیی ئەبا بۆ لای ئەبوبەکر و کچی ژنەکە ئەدا بە خۆی .

کە ئەگەڕێنەوە مەدینە پێغەمبەری خوا ﷺ داوا لە سەلەمە ئەکات کە ئەو کچەی پێ ببەخشێ کە فەرمووی : (( يا سلمة ! هب لي المرأة لله أبوك )) . فەرمووی : سەلەمە ئەو ئافرەتەم پێشکەش بکە . سەلەمە ئەڵێت : بۆ تۆ ، ئەی پێغەمبەری خوا! خێرا پێغەمبەری خوا ﷺ ئافرەتەکە ئەنێرێ بۆ مەککە تا چەند دیلێکی موسڵمانی پێ بەر بدات .

ئا لێرەدا سەرنج ئەگرین کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە خەمی ئیسلام و موسڵمانانی خواردووە . ئەگەر بیویستایە ئەو ئافرەتەی بۆ خۆی ئەهێشتەوە ؛ کە جوانێکی ناوداری ئەو رۆژەی دوورگەی عەرەبیی بووە .

**چواردەهەم : سریەی کەرزی فەهریی** [٥٩]

لە مانگی شەووالی ساڵی شەشەمی کۆچیی‌دا هەشت پیاوی عوکەل و عورەینە [٦٠] هاتنە مەدینە و موسڵمان‌بوونی خۆیان راگەیاند . بە ماوەیەکی کەم ئاو و هەوای مەدینەیان پێ نەکەوت و نەخۆش کەوتن .

بۆ ئەمە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا ببرێن بۆ ناوچەی ( جدر ) لە لای ( قباء ) ەوە کە نزیکی چیای ( عیر ) ە و شەش میل لە مەدینەوە دوورە ، تا لەوێ شیری ئەو وشترانەیان دەرخوارد بدرێ کە لەوێ بە خێو ئەکران و ، ناوچەیەکی سازگاریش بوو. [٦١]

ئەو میوانانە ماوەیەك لەوێ مانەوە ، لە لایەکەوە ، هەوای سازگار و ، لە لایەکیشەوە خواردنەوەی شیری وشترەکان بوونە هۆی چاك بوونەوە و قەڵەوبوونیان . ئەوانە لەبەرامبەر ئەم خزمەتەدا نامەردی‌یان لێ وەشایەوە .

هەستان ئەو وشترانەی کە بە شیرەکەیان قەڵەو بوو بوون دایاننە بەر و ویستیان بیان‌دزن و بیان‌بەنەوە بۆ وڵاتی خۆیان . کە یەساری [٦٢] بەندەی ئازادکراوی پێغەمبەری خوا ﷺ لەمە ئاگادار بوو ، لەگەڵ چەند کەسێکی کەم دا ، کەوتنە دوایان هەتا وشترەکانیان لێ بسێننەوە . کە گەیشتە لایان دەستیان دایە کوشتار و یەساریان کوشت و ، دەست و پێ‌یان بڕیی و دڕکیان چەقاند بە زمان و هەردوو چاوی دا ..

کە ئەم دەنگ و باسە گەیشتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ، بیست ئەسپ سواری لە هاوەڵانی هەڵ بژارد و ، فەرماندایەتیی دانە دەست کەرزی کوڕی جابیری فەهریی و ، فەرمانی دا بکەونە دوای عورەینیەکان و بیان‌گرن . دوای ناردنیان دوعاشی لەو نامەردانە کرد و فەرمووی : (( أللهم ! أعمِ عليهم الطريق ، واجعلها عليهم أضيق من مسك )) . فەرمووی : خوایە ! رێیان لێ ون بکەیت . هەرواش بوو خوا رێی لێ ون

[٥٩] کەرز کوڕی جابیری کوڕی حسسەلی کوڕی لاحبی فەهریی قورەیشیی ، فەرماندە و سەرداری جەنگاوەران بووە لە سەردەمی نەفامیی‌دا .. پێش موسڵمان بوونی هێرش ئەکاتە سەر مەدینە و ، پێغەمبەری خوا ﷺ تا ناوچەی سەفوان راوی ئەنێت ، بەڵام فریای ناکەوێ .. کە موسڵمان ئەبێ دەوری ئازایەتیی ئەبینێ . لە کاتی فەتحی مەککەدا فەرماندەی یەکێ لەو کەتیبانە بووە کەسەر بە سوپای خالید بووە . لە سوپای خالیددا دوو لە هاوەڵان ، لە کاتی چوونە ناو مەککەوە شەهید بوون ، کە یەکێکیان کەرز بوو و ، ئەوەی تریشیان حویەیشی کوڕی ئەشعەری خوزاعیی بوو .

[٦٠] عورەینە : شوێنێکە لە وڵاتی فەزارە لە نەجد ، جا وا دەرئەکەوێ ئەو عورەینیانە لە هۆزی فەزارە بن .

[٦١] بە فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ کۆمەڵێك وشتر لەو شوێنەدا بۆ شیردان راگیر کرابوون ، تا دەرخواردی میوان و نوێنەران بدرێ و ، دەستی یارمەتییش بۆ هەژاران و لاوازان درێژ بکرێت .

[٦٢] یەساری نوبیی بەندەی ئازادکراوی پێغەمبەری خوا بووە ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ سەرنجی یەسار ئەگرێت بە جوانیی نوێژ بە جێ ئەهێنێ ، ئازادی ئەکات و ، ئەی‌نێرێ بۆ سەروکاریی ئەو وشترانەی کە بۆ شیردان راگیر کرابوون .

کردن و ، سریه موسڵمانەکە بە پەلە ڕۆیشتن و فریایان کەوتن و ، دەورەیان لێ دان و، دەست و پەلیان بەستن و هێنانیانەوە بۆ مەدینە .

ئەو نمەك بەحەرامانەیان بردنە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ تا بڕیاریان بۆ دەر بکات .

دوای لێکۆڵینەوە دەرکەوت کە تاوانبارن ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ حوکمێکی توندی بۆ دەرکردن تا ببنە پەند و ئامۆژگاریی بۆ هەموو نمەك بە حەرامێکی نامەرد. فەرمانی دا دەست و پێیان ببڕێت و ، چاویان دەربهێنرێت ، یان چاویان بە بزمار بتەقێنرێت ، چونکە ئەوان بە درك چاوی یەساری شوانیان تەقاندبوو . پاشان فڕێ درانە سەر ناوچە بەرداوی یەکە و داوای ئاویان ئەکرد هیچ کەس پێی نەئەدان هەتا مردن .

ئەم دەست و پێ بڕین و چاو کوێرکردنە بە ( تمثیل ) ناژمێردرێ ، چونکە ئەوانە یەکەم : دزیی و ، دووهەم : کوشتن و ، سێهەم : ( تمثیل ) کردن بە یەسار و ، چوارەم: دوای موسڵمانبوون کافر بوونەوە و ، پێنجەم : دژایەتیی کردنی خوا و پێغەمبەریان ئەنجام داوە .. دەست و پێیان لەسەر دزیی و جەردەیی بڕاون و ، کوشتن و چاو دەرهێنانیشیان لە تۆڵەی کوشتن و چاو دەرهێناندا .

ئیبن سەعد ئەڵێت : بۆ ئەمە خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە :

﴿ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ ذَٰلِكَ لَهُمۡ خِزۡيٞ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾ ( المائدة : ٣٣ )

**پانزەهەم : ناردنی عەمری کوڕی ئومەییە بۆ کوشتنی ئەبوسوفیان**

لە مانگی شەووالی ساڵی شەشەمدا و ، یەك مانگ پێش حودەیبیە ، پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵی ئازا و لێهاتووی بەناوبانگ عەمری کوڕی ئومەییەی ضەمریی ، لەگەڵ سەلەمەی کوڕی ئەسلەمدا نارد بۆ لای ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب ، کە فەرماندەی گشتیی سوپای مەککە بوو و ، فەرمانی بەسەر هەردووکیاندا دا کە لە هەرکوێ چاویان پێی کەوت بیکوژن .

هۆی ئەم ناردنەش بۆ کوشتنی ئەبوسوفیان ئەوەبوو کە ئەبوسوفیان ئەعرابی یەکی بە کرێ گرتبوو و، فەرمانی بەسەردا دابوو کە بچێت بۆ مەدینە و ، پێغەمبەری خوا

بکوژێت . کابرا گەیشتە مەدینە و ، هەوڵیشی دا کە پێغەمبەری خوا ﷺ بکوژێت ، کەچیی خوای گەورە کارەکەی ئاشکرا کرد و ، بەر لەوەی دەست بەکار بێت ، موسڵمانان گرتیان و ، دوایش دانی نا بە هەموو شتێکدا و ، پێغەمبەری خواش چاوپۆشیی لێ کرد و ، دوایش کابرا موسڵمان بوو .

کورتەی چیرۆکەکە ئەمەیە کە ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب لەگەڵ چەند قورەیشییەك کەوتە باسی ئەوەی کە هێزی موسڵمانەکان لە زیادبوونایە و ، بت پەرستان تێك ئەشکێنن . پاشان ئەبوسوفیان وتی : ئەوە کەسێك نیە بچێت موحەممەد بکوژێت و ، لە دەستی بحەسێینەوە ؟

کە ئەم قسەیەی ئەبوسوفیان بلاو بوویەوە ، ئەعرابییەك هات بۆ لای و پێی وت : وا ئەو پیاوەت دۆزییەوە کە لە هەموو پیاوێك دڵ پتەوتر و ، دەستوەشێن تر و ، لە ڕێبڕیندا خێراتر بێت ( مەبەستی خۆیەتی ) جا ئەگەر تۆ کۆمەکییم بکەیت ، ئەوا ئەچم بۆ ئەوێ و ئەیکوژم . خەنجەرێکم پێیە هەر ئەڵێی دەنووکی بازە و ، هیچ کەسیش ناگات بە تۆزی پێمدا ، من خۆم شارەزای هەموو ڕێگایەکم .

ئەبوسوفیان ئەمەی بە دڵ بوو و ، وشترێك و هەندێ پارەی پێ دا و داوای لێ کرد کە ئەم باسە لای کەس نەدرکێنێ .

شەو لە مەککەوە دەرچوو .. ماوەی نێوان مەککە و مەدینە بە یانزە ڕۆژ ئەبڕرا ، کەچیی ئەم ئەعرابییە بە پێنج ڕۆژ بڕیی و سەر لە بەیانیی ڕۆژی شەشەم گەیشتە مەدینە .

کە گەیشت وشترەکەی بەستەوە و ، پاشان هەواڵی پێغەمبەری خوای ﷺ پرسیی . لەبەر ئەوەی پاسەوانی نەبوو ، بە ئاسانیی دۆزییەوە ..

لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوتی ئەوەی عەبدولئەشهەل بوو و ، کۆمەڵێك لە هاوەڵان لە دەوری بوون . کابرا بێخەم خۆی کرد بە ژووردا .. کە پێغەمبەری خوا ﷺ سەرنجی دا ، هەستی کرد ئەو کابرایە نییەتی خراپە ، بۆیە فەرمووی : (( إن هذا ليريد غدراً ! والله حائل بينه و بين ما يريد )) . فەرمووی : ئەمە ئەیەوێ غەدرێك ئەنجام بدات و ، خوایش نایەڵێ .

ئەعرابیی پرسیی : کامەتان کوڕی عەبدولموطەللیبە ؟ فەرمووی : (( أنا )) . کابرا بە پەلە لە پێغەمبەری خوا ﷺ نزیك کەوتەوە و ، وەك بیەوێ نهێنییەکی پێ بڵێ ، بەسەریا چەمییەوە و ، ئەیویست خەنجەری لێ بدا ، کەچیی ئوسەیدی کوڕی حوضەیر

دەستی دایە ئەعرابیی و رای کێشایە دواوە و ، وتی : لە پێغەمبەر دوور بکەوەرەوە . خێرا هەردوو دەستی گرت و کە ئیزارەکەی راکێشا ، ئەبینێ وا خەنجەرێکی پێیە و ، وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەمە کاری خراپی بە دەستەوەیە . ئەعرابیی هاواری کرد : خوێنەکەم ، خوێنەکەم . ئوسەیدی کوڕی حوضەیر کاکۆڵی گرت و خەریك بوو بیخنکێنێ ..

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( أصدقني ما أنت ، وما أقدمك ؟ فإن صدقتني نفعك الصدق ، وإن كذبتني فقد اطلعت على ما هممت به )) . فەرمووی: راستم پێ بڵێ تۆ کێیت و ، بۆچیی هاتووی ؟ ئەگەر راستم پێ بڵێیت بە کەڵکت دێ و ، گەر درۆیشم لەگەڵدا بکەیت ئەوا لەوەی کە نیازت کردووە ئاگادار کراوم .

ئەعرابیی وتی : لە خۆم بێخەم بم ؟

فەرمووی : (( وأنت آمن )) .

باسەکەی بە وردیی بۆ گێڕایەوە .

ئەعرابیی‌یەکە لای ئوسەیدی کوڕی حوضەیر بەند کرا و ، بۆ سبەینێ پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کرد و ، فەرمووی : (( قد أمنتك فاذهب حيث شئت ، أو خير لك من ذلك ؟ )) . فەرمووی : ئەمانم پێ دابوویت ، بۆ کوێت پێ خۆشە بڕۆ . ئایا لەوە چاکترت ناوێ ؟ وتی : کامەیە ؟

فەرمووی : (( أن تشهد أن لاّ إله إلا الله وأنّي رسول الله )) .

کابرا موسڵمان بوو و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! هەرگیز لە هیچ پیاوێك نەترساوم ، کەچیی کە تۆم دیی هۆشم بە خۆمەوە نەما و ترس دای گرتم و ، تۆش بە نیازی دڵمت زانیی . خۆ رێبوارانیش پێشم نەکەوتوون و ، کەسیش لێی ئاگادار نەبووە . ئیتر زانییم کەس چاری تۆ ناکات و ، تۆ لەسەر حەقیت و ، حیزبی ئەبوسوفیانیش حیزبی شەیتانە !! پێغەمبەری خوایش زەردەخەنەی ئەکرد ..

لێرەدا سەرنجی ئەم پیاوە ئەگرین کە لەناو دوورگەی عەرەب دا کەم کەس لەمە خراپترە .. خۆی ئامادە کردووە پێغەمبەری خوا بکوژێ ، کەچیی هێشتا هەر حەقی خۆش ئەوێ . وا ئەزانێ ئەبوسوفیان لەسەر حەقە و موسڵمانان لایان داوە . جا کە بۆی دەرئەکەوێ پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر حەقە و خوا وا لەگەڵ ئەم دا یەکسەر ئەکەوێتە شوێن حەق ..

كەچیی نەك خوانەناسانی ئەم چەرخە ، بەڵكو ئەوانەیش كە خۆیان بە هەڵگری ئیسلام ئەزانن ، كە پاڵ ئەدەن بە لایەكەوە ، هەتا بەرژەوەندی‌یان لەو لایەنەدا بێ وازی لێ ناهێنن ، ئەگەرچیی بە چاوی خۆیان لادان لە شەرعیش ببینن !! كە بەرژەوەندییشیان نەما ، ئەگوازنەوە بۆ ئەو لایەی كە كەڵكی بۆیان هەیە ..

ئەمە بۆچوونی موسڵمانان بێ ، داخۆ ئەبێ كەسێك بڕیاری دژایەتیی خوای دابێ ، چەند لار و بێ‌وەفاو ناپاك و زیانەخرۆ بێ ؟ ئەوانە هەزار حەق ببینن ، وەك كافرانی پێشوو ویژدانیان نابزوێ تا شوێنی حەق بكەون .

ئەعرابی‌یەكە دوای موسڵمانبوونی چەند ڕۆژێك لە مەدینە مایەوە ، پاشان ماوەی خواست و مەدینەی بەجێ هێشت . جا بۆ تۆڵەسەندن لە ئەبوسوفیان پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی كردە عەمری كوڕی ئومەییەی ضەمریی ، كە چاو نەترسێكی كەم وێنە بوو و ، فەرمانی بەسەردا دا لەگەڵ سەلەمەی كوڕی ئەسلەمی كوڕی حەریش بچن بۆ مەككە و پێی فەرموون : (( أخرجا حتى تأتيا أبا سفيان بن حرب ، فإن أصبتما منه غرة فاقتلاه )) . فەرمووی : بڕۆن بۆ مەككە و ئەگەر هەلتان بۆ هەڵ كەوت ئەبوسوفیان بكوژن .

ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە مەككە و ، طەوافی بەیتیان كرد و یەكی دوو ڕەكعەت نوێژیان بەجێ هێنا و ، ویستیان ئەبوسوفیان بدۆزنەوە ، لەو كاتەدا پیاوێكی خەڵكی مەككە ، كە ئەڵێن موعاویە بووە ، سەرنجی عەمر ئەگرێت و ئەڵێت : عەمری كوڕی ئومەییەی ضەمریی خراپەیەكی بە دەستەوەیە . ناچار هەڵ دێن و ، قوڕەیشیش دوایان ئەكەون و بەرەو چیاكانی مەككە ڕاویان ئەنێن ، تا سەرەنجام كۆڵیان لێ ئەدەن و ئەگەڕێنەوە مەدینە . ئەوەبوو لە كاتی فەتحی مەككەدا ئەبوسوفیان موسڵمان بوو و بە كافریی نەمرد .

**شانزەهەم ، كوشتنی ئەبورافیع سەللامی كوڕی ئەبولحوقەیق**

سەللامی كوڕی ئەبولحوقەیق لە جوولەكەی نەوەی نەضیرە و ، دوای ئەو پیلانەی كە جوولەكە ویستیان پێغەمبەری خوا ﷺ بكوژن ، لە مەدینە دەركران و خۆیان گەیاندە خەیبەر . ئەم جوولەكەیە یەكێ بووە لە پیلان گێڕان . لە خەیبەریش بۆ خۆیان دانەنیشتن خەریكی دینداریی خۆیان بن ، بەڵكو وەك لە پێشەوە باس كرا ، چەند سەرزلێكیان كەوتنە پیلانگێڕان بۆ لەناوبردنی موسڵمانەكان .. ئەوەبوو قوڕەیش

و غەطەفانیان هەڵ نان تا دە هەزار جەنگاوەری قورەیش و غەطەفان بهێننە سەر مەدینە بۆ جەنگی ئەحزاب و سەرەنجام خوای گەورە موسڵمانانی لە دەستیان دەرباز کرد . دوای ئەوەی کە جوولەکەی قورەیظشیان لە موسڵمانەکان هەڵ گێڕایەوە .. کە حویەیی کوڕی ئەخطەب لەگەڵ جوولەکە نەوەی قورەیظەدا کوژرا ، ئیتر سەللامی کوڕی ئەبولحوقەیق بووە پادشای گەورەی خەیبەر و جوولەکانی هەموو دوورگە .

سەللام دوو برای بەناوبانگی هەبوون کە یەکێکیان ناوی کینانە بوو و مێردی صەفیەی کچی حویەیی کوڕی ئەخطەب بوو پێش ئەوەی ببێتە دایکی ئیمانداران . ئەوی تریشیان ناوی رەبیع بوو . ئەم دوو برایەی هەردووکیان لە غەزای خەیبەردا کوژران ..

کاتێك کە نەوەی نەضیر ناپاکی‌یان کرد و پێغەمبەری خوایش ﷺ چاوپۆشیی لێ کردن و بە دەرچوون لە مەدینە لێ‌یان گەڕا ، حویەیی و سەللام لە هەموو کەسێك خراپ‌تر پیلانیان دژی موسڵمانان ئەگێڕا .. ئەوەیان لەبەر چاو نەبوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ نەی‌کوشتن . هەر بەو دڵ و نییەتە پیسەی خۆیانەوە دژی قورئان ئەوەستان . جا کە حویەیی کوژرا ، سەللام خۆی گەیاندەوە خەیبەر و ، پەیوەندیی لەگەڵ سەرۆکی هۆزە بت پەرستەکان بەست ، بەو نیازەی لە دژی موسڵمانەکان هەڵیان بنێ ، تا جەنگێکی تری وەك جەنگی ئەحزاب بەرپا بکەنەوە . بۆ ئەمە پێویست بوو موسڵمانان لە کۆڵی خۆیانی بکەنەوە ، چونکە جوولەکە ئاشتیی و برایەتیی و تەبایی نازانێ و ، هەر خراپەیەکی بۆ لوا درێغیی ناکات ، بەو مەرجەی کەڵکی بۆ خۆیان تیابێ .

شایانی باسە کە خوای گەورە دوو هۆزی لێ‌هاتوو و بەغیرەتی بۆ خزمەتی ئیسلام رام کرد کە ئەوانیش ئەوس و خەزرەج بوون .. هەمیشە لە پێش برکێ‌دا بوون بۆ ئەوەی خزمەتی زیاتر بە دینی ئیسلام پێشکەش بکەن . هەرکامیان کارێکی بە خزمەتیان ئەنجام بدایە ، ئەوی تریشیان هەوڵی ئەدا کارێکی تر وەك ئەوە بەخزمەت یان زیاتر ئەنجام بدات .

کاتێك کە هۆزی ئەوس کەعبی کوڕی ئەشرەفی جوولەکەیان کوشت ، خەزرەج وتیان : بەخوا نابێ بەو کارە پێشمان بکەون . کەوتنە بیرکردنەوە کە چ پیاوێکی تر وەك کوڕی ئەشرەف دژایەتیی پێغەمبەری خوا ئەکات ؟ سەللامی کوڕی ئەبولحوقەیقیان هاتەوە یاد ، کە لە خەیبەر لە قەڵاکەی خۆی‌دا ئەژیا .

هاتن پرسیان بە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد تا مۆڵەتیان بدات بچن بۆ خەیبەر بۆ کوشتنی ..

فەرماندایەتیی گشتیی موسڵمانان وای بە چاك زانیی بە زووترین کات ئەم بەڵایە لە کۆڵی موسڵمانان بخات ، چونکە مەترسیی ئەوەی لێ ئەکرێ ، وەك جاری پێشوو ، عەرەبە بتپەرستەکان کۆ بکاتەوە و بێنەوە سەر مەدینە و ، بۆ زیان گەیاندن بە دینی ئیسلام هەموو رێیەك ئەگرێتە بەر . بە تایبەتیی لەو کاتەدا کە موسڵمانەکان دوژمنی زۆری سەرسەختیان هەبون و ، ئەگونجا هێرش بکەنە سەر مەدینە .

جوولەکەش دوژمنێکی سەرسەختی دەوڵەمەند بوون و ، لە خەیبەردا مۆڵیان خواردبوو و ، تەنها حەفتا میل لە مەدینەوە دوور بوون . بەڵێ ئەوان پیاوی جەنگ و هێرش نەبوون و ، وەك قورئان وەصفیان ئەکات مەگەر لە پشتی سەنگەر و قەڵای سەختەوە بتوانن بجەنگن ، بەڵام مەترسیی ئەوەیان لێ ئەکرا کە ئەعرابی بتپەرستی شەڕانیی جەم بکەن لە دژی موسڵمانان .

بۆیە وا چاك بوو هەوڵی فەوتاندنی سەرانیان بدرێ تا ئەو کارە نامەردییانە ئەنجام نەدەن و ، لە هەمان کاتدا ئەوانی تریشیان بترسێنن و ، لە دوژمنایەتیی دەست بەردار بن .

پیاوانی خەزرەج داوای مۆڵەتیان کرد بچن پادشای جوولەکە لە کۆشکەکەیدا و ، لەسەر نوێنی خەوتنی بکوژن . ئەمەش ئەوەی لای هەموان ئەسەلماند کە موسڵمانەکان دەستیان ئەگاتە هەموو شوێنێك و ، لە پێناوی خوادا هەموو کارێکیان پێ ئەنجام ئەدرێ و ، جوولەکەش تێ ئەگەیەنن کە شوێنێك نەماوە ئەوان بتوانن تیایا ئۆقرە بگرن و دەستی موسڵمانەکانیان نەگاتێ . کەواتە با ئیتر بیر لە هێرش بۆ سەر مەدینە نەکەنەوە و ، با بچنە ناو قەڵاکانیانەوە و ، خۆیان حەشار دەن .

کێ بیستوویەتی پادشایەك لە قەڵای سەختدا چەندین دەرگای لەسەر خۆی داخستبێ و پاسەوانی بە دەوردا بن ، کەچیی کەسانێك لە دوور دوورەوە بێن و دەستی لێ بووەشێنن و ، بە سەلامەتییش بگەڕێنەوە دوا !

پیاوە خەزرەجییەکان کە گیانیان خستبووە سەر لەپی دەستیان بۆ ئەوەی پادشای خەیبەر بکوژن پێنج کەس بوون :

١ ـ عەبدوڵڵای کوڕی عەتیك .

٢ ـ مەسعوودی کوڕی سینانی ئەسلەمیی .

٣ ـ عەبدوڵڵای کوڕی ئونەیسی جوهەنیی .
٤ ـ حاریثی کوڕی رەبعیی ، ئەبوقەتادەی ئەنصاریی .
٥ ـ خوزاعیی کوڕی ئەسوەد .
ئەم پێنجە دوای راوێژکردن لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بەرەو خەیبەر کەوتنـە رێ و ، عەبدوڵڵای کوڕی عەتیك ئەمیریان بوو تا کاریان لێ تێك نەچێ .
پێش دەرچوونیان لەلایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ ئامۆژگاریی کران کە نە منداڵ و نە ئافرەت نەکوژن و دەستدرێژی‌یان نەکەنە سەر . ئەمەش لـە مـانگی رەمـەزانی ساڵی شەشەمی کۆچیی‌دا بووە ..
دوای چەند رۆژێك هەر پێنجیان گەیشتنە خەیبەر .
خەیبەر بازارێکی گەورە بوو بۆ کڕین و فرۆشتنی کەل و پەلی پێویست بە تایبـەت خۆراك ، وەك خورما و گەنم و جۆ و گەنمە شامیی . بۆیە عەرەبەکانی ئەو دەوروبـەرە بە ئاسانیی هات و چۆیان ئەکرد و ، بەڵام پێنج پاڵەوانە خەزرەجی‌یەکە ئـەوەیان پـێ نەئەکرا ، چونکە نەوەی نەضیر چەند مانگێك بوو لە مەدینە دەرکرابـوون و یـەك بـە یەکی ئەوس و خەزرەجیان ئەناسیی ، هەتا دەنگیان ئەناسین لەبـەر ئـەوەی هـەر بـە منداڵیی پێکەوە ژیا بوون و ، ئەگەر بیان‌دیبانایە ئەیان‌گرتن و ئەیان‌کوشتن ، چونکە موسڵمانانی مەدینە لەگەڵ خەیبەردا ناکۆك بوون .
بەڵام شتێك کاری بۆ ئاسان کردن ، کە ئەویش ئەوەبوو عەبدوڵڵای کوڕی عـەتیکی ئەمیریان شارەزایی لە زمانی جولەکەدا هەبوو ، بۆیە هاوەڵەکانی حەشار دان و خۆی تێکەڵی هەندێ جولەکە بوو و توانیی بە زمـانی خۆیـان بیـان دوێنـێ ، بـۆ ئـەوەی زانیاریی پێویست دەربارەی ئـەبورافیع ، سـەللامی کـوڕی ئەبولحوقـەیق وەربگـرێ ، ئەمەش بۆ ئاسان‌کردنی کوشتنی . دوای ئەوە نەخشەیان بۆ خۆیان دانـا کـە بریتیـی بوو لەم خاڵانە :
١ ـ هەر هەموویان بە شەودا بچنە ناو قەڵاکەوە ، ئەویش بە رێگایەك کە لەسەری رێك بکەون .
٢ ـ دوای چوونە ژوورەوە دەستیان بگاتە کلیلەکانی دەرگاکانی قەڵا ، دیارە ئەمیر شوێنی هەڵ گرتنیانی ئەزانی .

٣ ـ لە شوێنی ولاغ و ئاژەڵدا خۆیان حەشار بدەن تا بەشێکی زۆری شەو بڕوات و ئەو سەرۆکانەی شەوانە ئەچنە دیواخانی پادشا هەڵسن و چۆڵی بکەن و ، خەڵك بێدەنگ ببێ و پاسەوان بخەون .

٤ ـ لە نیوەشەو بە دواوە پاڵەوانەکان لە تاریکیی شەودا بەرەو ئەو سالۆنانە هەڵمەت بەرن کە بەرەو ژووری خەوتنی ئەبورافیع ئەڕۆن ، بەلاّم بە هێمنیی و لەسەرخۆ ..

٥ ـ لە هەر دەرگایەك چوونە ژوورەوە لە ناوەوە دایبخەن و کلیلەکان بە دەستەوە بگرن .

٦ ـ ئەو ژوورانەی خەڵکیان تێدا خەوتووە ، یان پاسەوان وا تیایانا لەسەریان دابخەن تا بەند بکرێن و نەیەن بە دەم هیچ کەسەوە .

٧ ـ دوای ئەوە بە چەکی شارراوەی ژێر جلەکانیانەوە هەڵمەت بەرەو ژووری دۆزەخی‌یەکە بەرن کە ئەمیر لە کاتی وەرگرتنی زانیارییدا دیاریی کردبوو و ، ئەیزانیی لە کوێوەیە .

٨ ـ لەسەر ئەوەش ڕێك کەوتن کە هەر هەموویان خۆیان بکەن بە ژووری خەوتنی سەللامدا ، بەلاّم جگە لە ئەمیر هیچ کامیان بە هیچ شێوەیەك قسە ناکەن و ، ئەویش لە کاتی ناچارییدا و بە زمانی جوولەکانە قسە بکات .

٩ ـ لەناو قەلاّکەدا هیچ جوولەکەیەك لاقە نەکەن و ، بۆ بەرگریی لە نەفسیش نەبێ کەسێکی تر نەکوژن ، چونکە تەنها فەرمانی کوشتنی ئەبورافیع‌یان پێ‌یە .

١٠ ـ بە پێی فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ ژنەکەی نەکوژن ، ئەگەر لە ژوورەکەیدا بوو ، چونکە لەوانەیە بەرگریی بکات ، یان هاوار بکات ، ئەو کاتە هەڕەشەی لێ بکرێ تا بێدەنگ بێ ، یان دەمی دابخرێ با هاوار نەکات .

بەلاّم بیریان لەوە نەکردەوە کە پادشای جوولەکەیان کوشت ، چۆن فریا ئەکەون لەو هەموو هەیوان و سالۆنانەوە تێپەڕ بکەن و ، جوولەکە بە خەبەر نەیەن و ڕێیان پێ نەگرن ، چونکە مەبەست لە گەڕانەوەی خۆیان نەبوو ، بەڵکو مەبەست کوشتنی ئەو زاڵمە ملهوڕە بوو و هیچی تر . ئیتر ئەگەر خۆشیان نەگەڕێنەوە گرنگ نیە ..

چۆنیەتیی کوشتنی ئەبورافیع بە دوو شێوە هاتووە ، بەلاّم ئێمە ڕیوایەتەکەی ئیمام بوخارییمان هەڵ بژارد :

کاتێك کە موسڵمانەکان ئەگەنە خەیبەر ، عەبدوڵڵای کوڕی عەتیکی ئەمیریان فەرمانیان بەسەردا ئەدا ئەوان لە جێی خۆیان‌دا دا بمێننەوە ، تا خۆی بچێ هەواڵ بزانێ کە وتی : لە شوێنی خۆتان‌دا دابنیشن تا سەیر بکەم .

کوڕی عەتیك ئەڵێت : هەوڵم دا بچمە ناو قەڵاکەوە ، ئەوەبوو گوێدرێژێکیان ون بوو بوو و بە شۆڵەیەکەوە لە قەڵا دەرچوو بوون و بە دوای‌دا ئەگەڕان . منیش ترسام بم‌ناسن ، بۆیە سەرم و قاچم داپۆشین هەروەك دەست بە ئاو بگەیەنم . پاشان دەرگاوانەکە بانگی کرد : بەرلەوەی دەرگاکە داخەم کێ دێتە ژوورەوە با بێت . لە ریوایەتێك‌دا بانگ لە عەبدوڵڵای کوڕی عەتیك ئەکات : ئەی بەندەی خوا ! ئەگەر ئەتەوێ بێیتە ژوورەوە وەرە ، ئەمەوێ دەرگاکە داخەم .

ئەڵێت : چوومە ناو قەڵاوە .. کە خەڵکەکە چوونە ژوورەوە دەرگاکە داخرا و کلیلەکانیان بە کۆڵەکەیەکەوە هەڵ واسین . منیش لە شوێنی بەستنەوەی گوێدرێژێك دا ، لە نزیك دەرگای قەڵاکەدا ، خۆم حەشار دا . ئەبورافیعیش لە بالاخانەیەکی‌دا میوانی هەبوون ، لەلای ئەو نانی ئێوارەیان خوارد و ، بە قسەکردنەوە بەشێکی شەو رۆیشت ، پاشان گەڕانەوە ماڵی خۆیان . کە دەنگە دەنگ نەما و جم و جووڵم نەبیست ، هەستام بۆ کلیلەکان و دام گرتن و دەرگای قەڵام کردەوە و ، وتم : ئەگەر پێ‌یان زانیم لەسەرخۆ بۆی دەرئەچم .

ئەڵێت : دوای ئەوە چووم دەرگای ژوورەکانیانم لە دەرەوە لەسەریان داخست و ، هەرچیی دەرگایەکم ئەکردەوە ، لە ناوەوە لەسەر خۆمم دائەخستەوە . وتم : ئەگەر پێیشم بزانن ئەوان ناگەنە لام ، من ئەو ئەکوژم . گەیشتمە لای ئەبوڕافیع ، ئەبینم وا لە ژوورێکی تاریك‌دا لە ناو خاوخێزانی‌دا و ، نەم‌ئەزانی لە چ شوێنێکی ژوورەکەدایە.

وتم : ئەبوڕافیع !

وتی : ئەوە کێ‌یە ؟

ئەڵێت : بەرەو دەنگەکە خۆم هەڵ دا و بە شمشێر دام‌گرتەوە و ، سەریشم سوڕ ئەما لێدانی شمشێرەکەم هیچی پێ نەکرد . هاواری لێ بەرز بوویەوە و ، منیش لە ژوورەکە چوومە دەرەوە بەڵام دوور نەکەوتمەوە .[٦٣]

---

[٦٣] کاتێك کە خاوەنی ( السيرة الحلبية ) ریوایەتەکەی بوخاریی نەقڵ ئەکات ئەڵێت : ژنەکەی ئەبوڕافیع بە مێردەکەی ئەڵێت : ئەوە دەنگی عەبدوڵڵای کوڕی عەتیکە ، مێردەکەی پێی ئەڵێت : دایکت رۆڵەڕۆت بۆ بکا ، عەبدوڵڵای کوڕی

پاشان وەك فریای بکەوم هاتمە لای و دەنگی خۆمم گۆڕیی ( و بە عیبریی ) پێم وت : ئەوە چیتە !

وتی : دایکت تیا چێت . پیاوێك هاتە ژوورەوە و بە شمشێر لێی دام .

ئەڵێت : جارێکی تر بۆی چوومەوە و ، بە شمشێر لێم دایەوە ، بەڵام هیچی پێ نەکرد .. هاواری لێ بەرز بوویەوە و کەس‌وکاری بەخەبەر هاتن .. بە شێوەی فریاگوزار هاتم بە دەمیەوە و ، دەنگی خۆمم گۆڕیی ، ئەبینم کەوتووە بە پشتا . منیش شمشێرەکەم خستە سەر ورگی و خۆم دا بەسەری‌دا هەتا کرچەی ئێسقانەکەم بیست ( دوای ئەوەی کە شمشێرەکە لە پشتیەوە دەرئەچێ ) . ئیتر زانیم کوشتوومە .

ئەڵێت : هاتم یەك بەیەك دەرگاکانم کردنەوە و ، بە سەرسامی‌یەوە هاتمە دەرەوە هەتا گەیشتمە لای پەیژەکە و ئەم‌ویست بێمە خوارەوە ، بەسەریەوە کەوتمە خوارەوە و پێم دەرچوو و ، خێرا بەستم و ، بە شەلە شەل هاتمەوە لای هاوەڵەکانم . وتم : دەرچن ، مژدە بدەن بە پێغەمبەری خوا ﷺ . من لێرە ناجوولێم هەتا دەنگی ئافرەتی شیوەن‌کەر ببیستم .

کە کەڵەشێری بەرەبەیان خوێندی شیوەن‌کەر لەسەر شووراکە وەستا و هەواڵی مردنی ئەبوڕافیعی گەورە بازرگانی ئەهلی حیجازی دا بە خەڵکەکە .. ئیتر منیش فریای هاوەڵەکانم کەوتم و بەر لەوەی کە بچنە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ، مژدەم دایە و بۆم باس کرد .. فەرمووی : ئادەی قاچت درێژ بکە . کە درێژم کرد دەستی پیا هێنا ، هەروەك هەرگیز ئازاری نەبووبێ .

بوخاریی ئەڵێت : زوهەریی وتوویە : ئویەی کوڕی کەعب وتوویە : هاتنەوە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ کە لەسەر مینبەر بوو و فەرمووی: (( أفلحت الوجوه )). عەبدوڵلای کوڕی عەتیکیش وتی : دەم و چاوی خۆت گەشاوە بێ ، ئەی پێغەمبەری خوا ! فەرمووی : (( أفتكتموه ؟ )) فەرمووی : ئایا دەستتان لێی وەشاند ؟ وتیان : بەڵێ . فەرمووی : (( ناولني السيف )) . کە شمشێرەکەی لە کێلان دەرهێنا ، فەرمووی : (( أجل ، هذا طعامه في زباب السيف )) . فەرمووی: بەڵێ ، ئەوە خواردنەکەیەتی بە دەمی شمشێرەکەیەوە . ( البداية والنهاية ) .

با سەرێك لە خەیبەر بدەینەوە .. دوای ئەوەی کە پێنج موسڵمانەکە سەللامیان کوشت و ، جوولەکە هەواڵەکەیان زانیی کە موسڵمان لە مەدینەوە هاتوون و،

---

عەتیك لە کوێیە ؟ ( لەبەر ئەوەی نەوەی نەضیر و هۆزی خەزرەج دۆست و هاوپەیمان بوون ، تێکەڵی‌یان هەبووە و یەکتریان ناسیوە ) .

کوشتوویانه ، به تایبەت که هاوسەرەکەی هاواری کرد ئەو پیاوە عەبدوڵڵای کوڕی عەتیك بووە و دەنگی ناسیوەتەوە ، جوولەکە هەوڵیان دا ئەوانە بگرن یان بیان‌کوژن. ئەوەبوو بە سەرکردایەتیی حاریث ئەبوزەینەب پێش بەرەبەیان سێ هەزار جوولەکە بلاوەیان لێ کرد و ، بە دوای بکوژانی ئەبوڕافیعدا گەڕان ، بەڵام بێ‌هوودە بوو نەیان دۆزینەوە ، چونکە بە چاکیی خۆیان شاردبۆوە . هەتا ئەڵێن دوو ڕۆژ خۆیان حەشار داوە ئەوسا بەرەو مەدینە کەوتوونەتە ڕێ .

**حەڤدەهەم : کوشتنی دووهەم پادشای خەیبەر**

که له مانگی ڕەمەزانی ساڵی شەشەمدا پادشای خەیبەر ئەبوڕافیع بە دەستی پێنج پاڵەوانە خەزرەجی‌یەکە کوژرا ، جوولەکە ئوسەیری کوڕی زارمیان کردە پادشای خەیبەر .

ئوسەیریش کەوتە هەوڵ و تەکان ، تا بە وێنەی ئەبوڕافیعی پادشای پێش خۆی هەڵمەتێك وەك هەڵمەتی ئەحزاب لە دژی موسڵمانان، لە عەرەبەکان ڕێك بخات ..

که کرایە پادشا سەردارانی جوولەکەی خەیبەری کۆکردنەوە و ، پێی ڕاگەیاندن کە نەخشەیەکی وەهای بە دەستەوەیە بۆ هێرش‌کردنە سەر موسڵمانەکان کە هیچ پادشایەکی خەیبەر ڕێی لێ نەکەوتبێ .

بە سەرۆکە جوولەکەکانی وت : کارێك بە موحەممەد ئەکەم کە هاوەڵانم نەیان‌توانی بێ بی‌کەن .

وتیان : چیی ئەکەی ؟

وتی : ئەچم بۆ ناو غەطەفان و خۆم کۆیان ئەکەمەوە تا لەگەڵیا بجەنگن .. ئەوانیش ڕەزامەندی‌یان نواند .

ئوسەیر خەیبەری بەجێ هێشت و ، بە نیازی جێبەجێ‌کردنی نەخشە گلاوەکەی بۆ لەناوبردنی موسڵمانان ، بەرەو ناوچەی هۆزەکانی نەجد ( غەطەفان و ئەوانی تریش ) کەوتە ڕێ و ، یەك بە یەك سەری لێ ئەدان و ، لە دژی پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵی ئەنان و ، بەڵێنی ئامادەبوون بۆ جەنگی لێ وەرئەگرتن ..

ئەمیش وەك هەردوو پادشای پێش خۆی حویەیی و سەللام بەرتیلی ئەدا بە سەرەك هۆزەکان تا ژمارەیەکی زۆر لەو ئەعرابە وشکانە هەڵ بنێن ، تا بە وێنەی سوپای ئەحزاب بێنە سەر مەدینە .

وە نەبێ حكوومەتی پڕ شكۆی مەدینە لە خنەخنی جوولەكەی ناپاك بێ ئاگا بووبێ ، بەڵكو دوای ناپاكیی هەرسێ هۆزە جولەكەكەی مەدینە سوپای ئیسلام زۆر بە وردیی چاودێریی هەڵس و كەوتی خەیبەری ئەكرد ، نەوەكو ئەعراب كۆ بكاتەوە دژی مەدینە .

ئەوەبوو دەنگ و باسی پرۆژەكەی ئوسەیری تازە پادشای خەیبەر گەیشتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ، بەڵام ئەم پەلەی نەكرد و بڕیاری دا لە باسەكەی بكۆڵێتەوە تا بە جوانیی بۆی دەركەوێ كە راستە . بۆ ئەمە بانگی كردە هاوەڵی پایەدار عەبدوڵڵای كوڕی رەواحە و دوو هاوەڵی تریشی خستە گەلی تا هەرسێكیان بچن بۆ خەیبەر و ئەو هەواڵەی ئوسەیر ساغ بكەنەوە .. عەبدوڵڵا و هەردوو هاوەڵەكەی خۆیان گۆڕیی و ، خۆیان گەیاندە خەیبەر و ، لەوێ بۆیان روون بوویەوە كە هەواڵەكە راستە .

لێرەدا پێغەمبەری خوا ﷺ وای بە چاك زانیی ئەم كارە بە حەكیمانە چارەسەر بكات .. ئەگەر جوولەكە عەرەبەكانی دوورگە لە دژیان كۆ بكاتەوە لەوانەیە ئەمجارە موسڵمانەكان لەناو بەرن . بۆیە بە پێویستی زانیی موسڵمانەكان لەو بەڵایە لا بدات.

ئەوەبوو سیی هاوەڵی سوارچاكی هەڵ بژاردن و عەبدوڵڵای كوڕی رەواحەی كردە ئەمیریان و ، فەرمانی بەسەریاندا دا كە بچن بۆ خەیبەر و ، پەیوەندیی بە پادشای تازەوە ( ئوسەیر ) بكەن و بە ئاشتیانە هەوڵی لەگەڵدا بدەن تا واز لە دژایەتیی موسڵمانان بهێنێ و ، لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ وت و وێژ بكات و ، رێك بكەون .

ئەوەبوو لە سەرەتای مانگی شەووالی ساڵی شەشەمی كۆچییدا عەبدوڵڵا و هەر سیی سوارەكە بەرەو خەیبەر كەوتنە رێ . كە نزیكی خەیبەر كەوتنەوە ، عەبدوڵڵای كوڕی رەواحە ناردی بۆ لای ئوسەیری پادشای خەیبەر كە پێی خۆشە وت و وێژ بكەن و ، داوای ئەمان ئەكات بە خۆی و پیاوەكانیەوە بچنە ناو خەیبەرەوە ، تا ئەوەی كە بۆی هاتوون پێی رابگەیەنن .

ئوسەیر رەزامەندیی نواند و داوای ئەمانی بۆ خۆشیان كرد .

دوای متمانەكردنی هەردوولا عەبدوڵڵا و هاوەڵانی چوونە ناو خەیبەرەوە و ، لەوێ هەردوولا كۆبوونەوە و ، پێی راگەیاند كە نامەیەكی زارەكیی پێغەمبەری خوای ﷺ پێیە بۆی .

پێغەمبەری خوا ﷺ لە نامەکەی‌دا داوای لە ئوسەیر ئەکرد کە بچێت بۆ مەدینە ، تا لەوێ جەنگ و ناکۆکیی نێوانیان لەناوبەرن و ، پێغەمبەری خوا ﷺ ئوسەیر بە گەورەی خەیبەر دابنێ و چاکەشی لەگەڵدا بکات .

کە پادشای خەیبەر ئەمەی بیست ، داوای لە نێرراوانی مەدینە کرد کە لەگەڵیا بخایەنن هەتا لەو بارەوە وت و وێژ لەگەڵ سەرۆکەکانی تری خەیبەردا بکات .

ئوسەیر گەورە پیاوانی جوولەکەی لەو باسە ئاگادار کرد و ، داوای راوێژی لێ کردن . ئەوانیش رایان وەهابوو کە گوێ بۆ ئەو باسە نەگرێ و ، نەشچێ بۆ مەدینە . ئەوەبوو وتیان : ناگونجێ موحەممەد پیاوێکی نەوەی ئیسرائیل بکاتە کاربەدەست .

ئوسەیر بڕیاری دا بچێت بۆ مەدینە و پێغەمبەری خوا ﷺ ببینێ و وتیشی : موحەممەد لە جەنگ بێزار بووە . سەرۆکەکان رەزامەندی‌یان نواند و ، پادشای خەیبەریش سیی دۆستی خۆی هەڵ بژارد و ، لەگەڵ موسڵمانەکان‌دا بەرەو مەدینە کەوتنە رێ .

هەر سیی موسڵمانەکە وڵاغیان پێ بوو ، بەڵام جوولەکە وڵاغیان لەگەڵ خۆیان نەهێنا .. بەڵکو هەریەکەیان لە پاشکۆی موسڵمانێك‌دا سەرکەوتن .. پادشای خەیبەر خۆیشی لە پاشکۆی عەبدوڵڵای کوڕی ئونەیس‌دا سەرکەوت . بەڵام ئوسەیر لە ئازایەتیی‌دا ناوبانگی بووە . شایانی باسە کە عەبدوڵڵای کوڕی ئونەیس ئەو پاڵەوانە بەجەرگە بوو ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بۆ کوشتنی سەرۆکی هۆزی هوذەیل خالیدی کوڕی سوفیانی هەذەلیی .

عەبدوڵڵا و هاوڵانی بە پاکیی نامەکەیان گەیاند و ، بە پاکیی و راستییش بەڵێنی ئەمانیان بە جوولەکە دا و ، لە خوایان ئەویست جەنگ و ئاژاوەیان لە کۆڵ ببێتەوە .. بۆیە زۆریان پێ خۆش بوو پادشای جوولەکە لەگەڵیان هات بۆ مەدینە بۆ رێك‌کەوتن . ئیتر هیچ نیازێکی خراپ لە دڵیانا نەبوو دەست لەو جوولەکە میوانانە بوەشێنن و ، هەرگیز لەلای موسڵمان شتی وەها پەسەند نیە .

بەڵام جوولەکەی ناپاك هەرگیز پاك نابنەوە .. هەتا شمشێریان بۆ بەرز نەکرێتەوە مل بە حەق نادەن . بۆیە عەبدوڵڵا و هاوەڵانی زۆر هوشیار بوون و ئەترسان جوولەکە ناپاکیی و غەدر بکەن .

بۆیە هەر یەکە لە موسڵمانەکان جوولەکەیەکی خستبووە پاشکۆی خۆی ، وەك ئەوە کە چاودێر بێ بەسەریەوە .

ماوەیەك بەرەو مەدینە رێیان بڕیی ، دوای ئەوە جوولەکە هەوڵیان دا ناپاکیی لەگەڵ موسڵمانەکاندا بکەن . ئەوەبوو یەکەم کەس ئوسەیری کوڕی زارم بەسەر ئەسپەکەو، و لە پاشکۆی عەبدوڵڵای کوڕی ئونەیسدا ناپاکیی کرد . ئەوەبوو هەڵمەتی دایە شمشێرەکەی عەبدوڵڵای کوڕی ئونەیس تا لێی بستێنێ و بیکوژێ ، کەچیی عەبدوڵڵا لەو وریاتر بوو ، بە کارەکەی زانیی و شمشێرەکەی لە دەستی سەندەوە و ، کوشتی . بەمە هەردوولا دەستیان دایە جەنگ و ، سەرەنجام موسڵمانەکان توانییان دەستەی ناپاك لەناو بەرن ، جگە لە تاقە پیاوێکیان کە توانیی هەڵ بێت .[٦٤]

---

[٦٤] صلح الحديبية لمحمد أحمد باشميل : ٢٠ ـ ١١٢ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٣٢١ ـ ٣٢٤ ، ٤١٢ ـ ٤١٣ ، الرحيق المختوم : ٣٢٧ ـ ٣٣٢ ، ٣٤٢ ـ ٣٤٤ .

## بەشی سیی و یەکەم

# ڕێکەوتننامەی حودەیبیە

**یەکەم : ستەمێکی تری قوڕەیش**

قوڕەیش هەوڵی زۆری دا بۆ ئەوەی موسڵمانەکان لەناو بەرێت ، کەچیی بێهوودە بوو .. لە مەککە ستەمی زۆری لە موسڵمانە لاوازەکان کرد ؛ بێئەوەی تاوانێکیان ئەنجام دابێ .. سەرەنجام دەری پەڕاندن و ئاوارەی کردن ، بەوەشەوە نەوەستا هەموو هەوڵێکی خستە گەڕ بۆ لەناوبردنیان ؛ کەچیی خوای گەورە پشتی بەرنەدان و ؛ بە هێز و قودرەتی خۆی بەرگریی لێ کردن .

دواهەڵمەتی نامەردانەی قوڕەیش هێنانی سوپای ئەحزاب بوو بۆ سەر مەدینە ؛ بەڵام ئەوەبوو خوا بۆ موسڵمانان بە خێری گێڕا و ، کافران بە سەری شۆڕەوە گەڕانەوە.

ستەمێکی تری قوڕەیش دەرهەق بە موسڵمانان ، چ موهاجیر و چ ئەنصار ، بریتیی بوو لە قەدەغەکردنیان لە سەردانی کەعبەی پیرۆز . ئەوە شەش ساڵ بوو موسڵمانان لە مەککەوە کۆچیان بۆ مەدینە کردبوو و ، قوڕەیش ماوەی نەئەدان ؛ یان لە ترسی قوڕەیش نەیان ئەوێرا سەردانی کەعبە بکەن ، بە مەرجێ لە صەدان ساڵەوە، وەك عورف و یاسای ناو عەرەبەکان ، هیچ کەسێك لە طەوافی کەعبە و ئەنجامدانی حەج قەدەغە نەکراوە ، ئیتر ئەو کەسە هەر چۆن بیری کردبێتەوە و ، ژیانی بەسەر دابێت .

دوای شکانی ئەحزاب و ، پاككردنەوەی مەدینە لە جوولەکەی ناپاك و ، دەست وەشاندنی موسڵمانان لە هەر هۆزێکی دوورگە کە نیازی خراپی دەرهەق بە موسڵمانەکان کردبێ و ، کوشتنی دوو پادشای خەیبەر ؛ موسڵمانەکان گەیشتنە ئاستێکی سەربازیی زۆر چاك کە هەموو لایەك حیسابیان بۆ بکات ..

بەم بۆنەوە موسڵمانەکان وایان بە چاك زانیی سەردانێکی کەعبەی پیرۆز بکەن، چونکە ئەوە مافی خۆیانە و ، قوڕەیش هەر کاتێ قەدەغەیان بکات ئەوە ستەمیان لێ ئەکات و ، مافیان پێ شێل ئەکات . تا ئێستە ئەمانیش لەبەر لاوازیيان نەیان

توانیوه داوای ئەو مافەیان بکەن . بەڵام ئێستا کە توانای سەربازی‌یان هەیە، پێویستە بەرگریی لەو مافەیان بکەن و ، لە ئەنجامدانی ئەو کارە پیرۆزەدا کەمتەرخەمیی نەکەن .. خۆ ئەگەر تاقە دەستەیەك شایان بن سەر لە کەعبەی پیرۆز بدەن ئەوە موسڵمانەکانن و ، لەوان بەولاوە هەر هەموو بتپەرست و سەرگەردانن و ، فریان بە بنەماکانی دینی ئیبراهیم خەلیلەوە ـ سەلامی لێ بێ ، نەماوە ..

خۆ ئەگەر ئەوان مەدینە بەجێ بهێڵن و بەرەو مەککە بکەونە ڕێ ، تەنها مەگەر جوولەکەی خەیبەر مەترسیی ئەوەیان لێ بکرێ هەڵمەت بەرنە سەر مەدینە و ، ئەوانیش وەها چاوترسێن کراون ، ناوێرن بیر لە هێرشی لەو جۆرە بکەنەوە .

هۆی سەرەکییش بۆ ئەم تاسەمەندی‌یە بۆ سەردانی کەعبە ، خەوێك بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ دیتی ، کە بە خۆی و هاوەڵانیەوە چوونەتە مزگەوتی حەرامەوە و، کلیلەکانی کەعبەی وەرگرتووە و ، طەواف و عومرەیان ئەنجام داوە و ، هەندێکیان سەریان تاشیوە و ، هەندێکیش کورتیان کردۆتەوە . پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم خەوەی بۆ هاوەڵەکانی گێڕایەوە و ، ئەوانیش یەکجار دڵخۆش بوون و ، گەیشتنە ئەو قەناعەتە کە ئەو ساڵە ئەچنە مەککەوە ..

**دووهەم : بەرەو مەککەی پیرۆز**

بۆ ئەنجامدانی ئەو مەبەستە پیرۆزە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بۆ موسڵمانی شار و دەوروبەری دەرکرد کەوا بڕیاری داوە بەرەو مەککە بکەوێتە ڕێ و ، دەریشی بڕیی کە بۆ عومرە ئەچێ و بە ئاشتیانە ، دوور لە داگیرکردن و جەنگ‌کردن . بۆ ئەمە جوابیشی بۆ قورەیش نارد کە بەم مەبەستەوە رووی لە مەککە ناوە و ، نیازی جەنگی نیە .

جا هەر چەندە پێغەمبەری خوا ﷺ مەبەستی ئاشتیی و ، ڕێزلێنانی کەعبەی پیرۆز بوو ، بەڵام ئەوەشی بەرچاو گرتبوو کە قورەیش ئەوەندە راست نین ، بەڵکو بۆ بیانوو ئەگەڕێن تا شەڕ بە موسڵمانان بفرۆشن و ، نەهێڵن عومرەکەیان بەجێ بهێنن ، بۆیە وای بە چاك زانیی موسڵمانەکان کۆ بکاتەوە و ، جاڕ بدا ئەعرابی دەوروبەریشی هەڵ بنێ تا هەر هەموویان بێن بۆ عومرە ، بەو هیوایەی قورەیش بڕوا بکەن کە مەبەستیان جەنگ و هەرا نیە . ئەوەبوو ئەعراب کەمێکیان هاتن بە دەمیەوە و زۆریشیان گوێیان پێ نەدا ..

موسڵمانەکان خۆیان ئامادە کرد .. دیارە ئیماندامەزراوەکان هەر هەموو جەم بوون ، بەڵام مونافیقە ئیمان لاوازەکانی مەدینە و دەوروبەری کەوتنە بڕوبیانوو بۆ خۆدزینەوە ، چونکە بڕوایان وا بوو کە بتپەرستەکانی مەککە ناهێڵن ئەو عومرەیە ئەنجام بدەن و ، تووشی جەنگێکی ناهەموار ئەبن ، بەڵام جەنگێك لە شوێنێکی دووردا ، کە ئەوپەڕی مەترسیی تیاچوونی لێ بکرێ .. بەو بۆنەوە مونافیقان لە کاروانی ئیمان جیابوونەوە . بە بیانووی ئەوەی کە بە کەس‌وکار و ماڵ و سامانیانەوە پەشۆکاون و ، فریا ناکەون بەشداریی ئەم گەشتە بکەن . بەڵام لە ڕاستییدا لە ترسان دا خۆیان ئەدزییەوە . دەربارەی ئەم ڕەفتارە ناشیرینە قورئانی پیرۆز هاتە خوارەوە :

﴿سَيَقُولُ لَكَ ٱلْمُخَلَّفُونَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ شَغَلَتْنَآ أَمْوَٰلُنَا وَأَهْلُونَا فَٱسْتَغْفِرْ لَنَا ۚ يَقُولُونَ بِأَلْسِنَتِهِم مَّا لَيْسَ فِى قُلُوبِهِمْ ۚ قُلْ فَمَن يَمْلِكُ لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا إِنْ أَرَادَ بِكُمْ ضَرًّا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ نَفْعًۢا ۚ بَلْ كَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًۢا﴾ (الفتح : ١١) .

بێ‌ئەوەی لە دڵیانەوە بێت ، بە دەم ئەیان وت : داوای لێ‌خۆش‌بوونمان بۆ بکە ، قورئانیش دەری ئەبڕێ کە زیانیش و قازانجیش هەردووکیان بە دەستی خوان .

هەروەها قورئان ئاشکرای ئەکات کە چۆن بە تەمای تیاچوونی موسڵمانەکان بوون:

﴿بَلْ ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَنقَلِبَ ٱلرَّسُولُ وَٱلْمُؤْمِنُونَ إِلَىٰٓ أَهْلِيهِمْ أَبَدًا وَزُيِّنَ ذَٰلِكَ فِى قُلُوبِكُمْ وَظَنَنتُمْ ظَنَّ ٱلسَّوْءِ وَكُنتُمْ قَوْمًۢا بُورًا﴾ (الفتح : ١٢) .

موسڵمانەکان لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ لە ڕۆژی دووشەممەی یەکەم ڕۆژی مانگی ذولقەعیدەی ساڵی شەشەمدا لە مەدینە دەرچوون ، کە هەزار و چوارصەد ، یان هەزار و پێنج‌صەد کەس ئەبوون و ، دووصەد ئەسپ سواریان لەگەڵدا بوو . کە گەیشتنە ذولحولەیفە کە نزیکەی دە میل لە مەدینەوە دوورە ، لەوێ پێغەمبەری خوا ﷺ ئیحرامی بۆ عومرە بەست و بەلای خەڵکەوە ئاشکرای کرد کە بۆ سەردانی ماڵی خوا ئەڕۆن و مەبەستی جەنگ و هەرایان نیە . ئیتر زۆربەی هاوەڵانیشی ئیحرامیان بەست .

پێش دەرچوون لە شار پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری دا کە نومەیلەی کوڕی عەبدوڵڵای لەیثیی [٦٥] ئەمیری مەدینە بێ و ، ئیبن ئوم مەکتوومیش ئیمامی نوێژی

---

[٦٥] نومەیلەی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی فەقیمی لەیثیی، لە هۆزی کەلبە کە ئەکەوتە باکووری خۆرهەڵاتی دوورگە . هاوەڵێکی بەجەرگ بووە . بەشداریی فەتحی مەککەی کردووە و ، لە کاتی چوونە ناو مەککەوە لەگەڵ سوپای خالیددا

موسڵمانان بێت هەتا ئەگەڕێتەوە .. ئەوەبوو لە ماڵەوە خۆی شۆرد و دوو کراسی لەبەرکردن و ، لە دەرگای ماڵەکەی‌دا سواری وڵاغەکەی ( القصواء ) بوو و ، هەروا لەگەڵ موسڵمانەکان‌دا ڕۆیشت هەتا گەیشتنە ( ذوالحليفة ) و لەوێ وەستا و ، نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردن .

کە گەیشتنە ذولحولەیفە عومەری کوڕی خەططاب و سەعدی کوڕی عوبادە وایان بە چاك زانیی کە پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵانی پڕ چەك بکات ، نەوەکو قوڕەیش هەڵمەتیان بدەنێ . بۆ ئەمە ناردی لە مەدینە چیی چەکیان هەبوو هەر هەموویان هێنا.

کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری سەفەری عومرەی دا ، داوای لە پیاو چاکێکی دۆستی کرد ، کە بوسری کوڕی سوفیانی کەعبیی پاشان خوزاعیی بوو ،[٦٦] تا لە بیابان وشتری بۆ بکڕێ و بیان‌نێرێتە لەوەڕگا و لەوێ بەخێو بکرێن . ئەوەبوو بوسر حەفتا وشتری کڕیی و هێنانیەوە مەدینە و ، پێغەمبەریش ﷺ وشترەکانی بە نیشانەی عەمرە نیشانە کردن و ، ناجیەی کوڕی جوندوبی ئەسلەمیی کردە کاربەدەستی وشترەکان .

هەروەها هاوەڵە دەوڵەمەندەکانیش ، وەك ئەبوبەکر و عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف و عوثمانی کوڕی عەففان و ، طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلا و سەعدی کوڕی عوبادە ، بۆ خۆیان ئاژەڵی ( هدي ) یان تایبەت بە خۆیان لەگەڵ خۆیان‌دا هێنا .

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا وشترەکانی عومرە نیشانە بکرێن و ، بە دەستی خۆیشی چەند دانەیەکی ، کە روو بە قیبلە وەستا بوون ، نیشانە کردن و ، یەکێ لەو وشترانەش وشترە رەسەنە بەناوبانگەکەی ئەبوجەهل بوو کە لە بەدردا بووبووە دەست کەوتی پێغەمبەر و ، بۆ داخی بت‌پەرستان ئەویشی هێنابوو .

کە ئیحرامیشی بەست داوای وشترەکەی کرد هێنایان و لە دەرگای مزگەوت‌دا سواری بوو و بەرەو قیبلە ڕۆیشت و ، بە چوار وشە ( تلبية ) ی فەرموو : (( لبيك اللهم لبيك، لبيك لا شريك لك لبيك ، إن الحمد والنعمة لك والملك ، لا شريك لك )) .

هەندێ لە موسڵمانانیش لە جوحفەی نزیك ( رابغ ) ئیحرامیان بەست .

---

بووە . نومەیلە بە فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ مەقیسی کوڕی صابەی کوشت کە یەکێ بوو لەو تاوان‌بارانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ خوێنی حەڵاڵ کردبوون ، ئەگەرچیی خۆیشی بە پەردەکانی کەعبەدا هەڵ واسیێ . دوای فەتحی خەیبەر بە فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆتە والیی خەیبەر .

[٦٦] بوسری کوڕی سوفیانی کوڕی عەمری کوڕی عوەیمیری خوزاعیی ، یەکێکە لە سەردار و سەرۆکەکانی خوزاعە کە لە سەرۆکیی‌دا هاوشانی بودەیلی کوڕی وەرقا بوو . ساڵی شەشەم موسڵمان بووە .

بۆ ئەم عومرەیە لە مەدینەوە چوار ئافرەت لەگەڵ موسڵمانان‌دا هاتن . یەکێکیان ئوم سەلەمەی دایکی ئیمان‌داران بوو و ، سێ ئافرەتی ئەنصارییش کە ئوم عومارە و، ئوم مەنیع و ، ئوم عامیر بوون .

هەروەها کۆمەڵێك لە مونافیقان لەگەڵ سوپادا هاتن ، بە تایبەت دوو مونافیقی گەورە ، عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول و ، جەددی کوڕی قەیسی کوڕی صەخەری خەزرەجیی کە سەرداری نەوەی سەلیمە بوو . بەڵام زۆربەی مونافیقان دەرنەچوون . ئەمانەش بۆ ئاژاوەگێڕان هاتبوون .

**سێهەم : هەواڵی کافرانی مەککە**

هەرچەندە موسڵمانەکان بۆ جەنگ دەرنەچووبوون و ، هەرچەندەش ئیحرامیان بەستبوو، بەڵام ئەبوا موسڵمانەکان لە فڕوفێڵی قورەیش بێخەم نەبن ، چونکە مرۆڤی بێئیمان متمانەی پێ ناکرێ . بۆ ئەمە پێغەمبەری خوا ﷺ دوو کاری گرنگی ئەنجام دا :

**یەکەم** : فەرمانی بەسەر بوسری کوڕی سوفیانی کەعبیی‌دا دا ، کە سەردارێکی خوزاعە بوو تا لە نێوان قورەیش‌دا هەواڵ بۆ موسڵمانەکان کۆ بکاتەوە ، بزانێ نیازیان چی‌یە و ، هەڵوێستیان بەرامبەر بەم سەفەرەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ عومرە چی‌یە ؟پاشان بگەڕێتەوە لای .

بوسر رۆیشتە مەککە و هەواڵی کۆکردەوە و ، کە گەڕایەوە دوا سوپای ئیسلام گەیشتبووە عوسفان .

**دووهەم** : پێغەمبەری خوا ﷺ هەر لە ذولحولەیفە کۆمەڵێك سوارچاکی هەڵ بژاردن تا پێش سوپا بکەون و هەواڵ بزانن بۆ ئەوەی سوپا بە کوێرانە نەنیشێتە مل . ئەم دەستە سوارە لە بیست سوارچاك پێك هاتبوون لە موهاجیر و ئەنصار ، کە میقدادی کوڕی ئەسوەد و ، ئەبوعەییاشی زەرقیی و ، حوبابی کوڕی مونذیر و ، عامیری کوڕی رەبیعە و ، موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی ئەنصاریی و ، سەعدی کوڕی زەید و ، عەببادی کوڕی بیشریان لەگەڵ‌دا بوون و، عەبباد ئەمیری ئەو دەستە سوارچاکە بوو..

ئەسپ سواران لە پێشی سوپاوە بوون و ، بە دوایان‌دا ناجیەی کوڕی جوندەب [٦٧] بە وشترەکانی عومرەوە ئەڕۆیشت و چەند گەنجێکی ئەسەلمیشی لەگەڵ‌دا بوون .

---

[٦٧] ناجیەی کوڕی جوندوبی کوڕی عومەیری ئەسلەمیی ، ناوی ذەکوان بوو ، کە لە دەستی قورەیش رزگاری بوو پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی نا ناجیە . ئەم بوو پێش موسڵمانان کەوت رێی پێ‌گۆڕیین ، تا تووشی قورەیش نەبن ، کاتێك بیستیان وا خالید لەسەر شارێی نێوان مەککە و مەدینەدا هەڵی داوە و ئامادەی جەنگە لەگەڵیانا و ، لەو رێوە گەیشتنە حودەیبیە. ناجیە لە مەدینەدا و ، لە سەردەمی خەلافەتی موعاویەدا کۆچی دوایی کردووە .

بۆ بەیانیی سێ‌شەممە گەیشتنە مەلەل و بۆ ڕۆژی چوارشەممە گەیشتنە ڕەوحاء.
لەوێ تووشی ئەصرەم بوون لە نەوەی نەهد کە مەڕومالاتیان پێ بوو . پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کردن بۆ ئیسلام ، کەچیی بە دەمیەوە نەهاتن ، دوای ئەوە شیریان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ نارد ، ئەویش شیرەکەی وەرنەگرت و فەرمووی : (( لا أقبل هدية مشرك )) . بەلام فەرمانی دا لێیان بکڕن .

کە موسڵمانەکان لە مەدینە دەرچوون دەنگ و باسی ئەم دەرچوونەیان بەناو هۆزەکاندا بلاوەی کرد و ، بەلای دانیشتوانی دوورگەوە کارێکی ئاسایی بوو و ، ئەیانزانیی کە مافی هەموو مرۆڤێکە تەوافی کەعبە بکات ، بە تایبەت لە مانگەکانی حەرامدا ، هەتا بۆ کەسانێکیش کە دوژمنایەتییان لەگەل قوڕەیشدا هەبێ ، بە مەرجێ نیازی جەنگ و کوشتاری نەبێ و ، لەو شوێنە پیرۆزەدا خوێن نەڕژێ .

بەلام قوڕەیش ئەم مافەی لە موسڵمانەکان زەوت کرد و ، هەرچەندە ئەیزانیی موسڵمانەکان نیازی جەنگیان نیە ، کەوتە قەدەغەکردنیان ، چونکە سەردارانی قوڕەیش چاویان بەو هەمووە موسڵمانەدا هەل نەئەهات کە دەورەیان لەو موحەممەدەی خزمیان دابوو و ، ڕێزیان لێ ئەگرت ، لە کاتێکدا کە قوڕەیش بە هەموو شێوەیەك دژایەتییان کرد ..

قوڕەیش بە عاریان ئەزانیی ڕێ بدەن ئەو موسڵمانانەی کە خۆیان دەریان پەڕاندن و، ئاوارەی ولاتانیان کردن ، بێن زیارەتی کەعبە بکەن و ، نیشانەی هێز و پەرەسەندنیان پێوە دیاربێ . چونکە ئەوان ساڵەهای ساڵە خەلك چاوبەست ئەکەن و پاگاندەی لەناوبردنی موسڵمانان ئەکەن ، جا ئەگەر دانیشتوانی مەککە ئەو هەمووە موسڵمانە پەروەردەکراوە گوێڕایەڵە ببینن ، چۆن دڵ بە دینی قوڕەیش خۆش ئەکەن؟ بۆیە کە قوڕەیشییەکان ئەو هەواڵەیان بیست زۆر پێی تێك چوون .. چونکە ڕێدانیان شوورەیی‌یە و ، ڕێنەدانیشیان ئاژاوەی لە دواوەیە .

بۆ ئەمە سەرۆکانی قوڕەیش لە ( دار الندوة ) کۆبوونەوەیەکیان گرێ دا تا لە نێوان خۆیاندا لەسەر نەخشەیەك ڕێك بکەون و ، بزانن چیی بکەن . لە ئەنجامدا لەسەر ئەوە ڕێك کەوتن کە ئەم کارە بە سێ پیاویان بسپێرن و ، ئەوانیش وەك لیژنەیەك چیی بە چاك ئەزانن ، بڕیاری لەسەر بدەن . کە ئەو سیانەش ئەمانە بوون :

١ـ عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهلی مەخزوومیی .

٢ ـ صەفوانی کوڕی ئومەییەی جومەحیی .

٣ ـ سوهەیلی کوڕی عەمری عامیریی .
ئەوانیش لەگەڵ سەردارانی مەککەدا نەخشەیەکی وردیان بۆ بەگژا چوون و گێڕانەوەی موسڵمانان داڕشت ، کە ئەگەر موسڵمانەکان ویستیان هەر بێنە مەککەوە، ئەگەر بە هێزی چەکیش بووە بیان‌گێڕنە دواوە . نەخشەکەش بەم جۆرە بوو :
١ ـ هەر قوڕەیشییەك توانای هەڵگرتنی چەکی هەیە بۆ جەنگی موسڵمانان ئامادە بکرێ .
٢ ـ داوای یارمەتیی لە ئەحابیش و ثەقیف بکرێ تا کۆمەکیی قوڕەیش بکەن .
٣ ـ مەبلەغێك پارە کۆبکەنەوە بۆ پڕچەك‌کردن و نان‌دانی ئەو جەنگاوەرانەی کە دێنە کۆمەکی قوڕەیش دژی موسڵمانەکان .
٤ ـ ئەوانەی کە ئامادەی جەنگ ئەکرێن ، بۆ ئەوەی دەست بەکار بن ، بەر لەوەی موسڵمانەکان بگەنە ناوچەی حەرەمی مەککیی ، پێویستە هەموو ئەوانە دەرچنە دەرەوەی مەککە ، تا نەهێڵن موسڵمانەکان بێنە ناوچەی حەرەمەوە ..
٥ ـ کاتێك کە بت‌پەرستەکان لە مەککە دەرئەچن بۆ گێڕانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ ژن و منداڵیان لەگەڵ خۆیاندا بەرنە دەرەوە ، تا موسڵمانەکان بە بەڵگەیەکی کرداریی لایان روون بێ کە قوڕەیش لە نەخشەی خۆی پاشگەز نابێتەوە و ، بڕیاری گێڕانەوەی موسڵمانەکان واز لێ ناهێنن ..
٦ ـ هێزێکی چروپڕ لە سوارچاکان پێکەوە بنێن و ، فەرماندەیی ئەمانە بە سوارچاکی بەناوبانگی قوڕەیش ، خالیدی کوڕی وەلید بسپێرن . بە مەرجێ ئەم هێزە لەسەر شارێگەی نێوان مەککە و مەدینە و ، لە نزیك حەرەم‌دا سەربازگە دروست بکات ، تا پیشانی موسڵمانەکانی بدات کە قوڕەیش لەسەر بڕیاری خۆی سوورە و کۆڵ نادات .
٧ ـ قوڕەیش کۆمەڵێك پیاوی وریا لەسەر ئەو رێگایانە ، بۆ هەواڵ زانین ، دابنێ ، کە موسڵمانەکانی لێوە تێپەڕ ئەکەن ، تا یەك بە یەك هەواڵەکان بگەیەنن بە سەربازگەی سەرەکیی قوڕەیش و ، لە هەر جم و جووڵێکی موسڵمانەکان و هێز و توانایان ئاگاداری بکەن .
قوڕەیش توانیی ئەحابیش بێنێتە کۆمەکیی خۆی ، ئەویش بە خەڵەتاندنی حولەیسی کوڕی زەببانی سەرۆکی ئەحابیش ، بەوەی کە هەڵوێستی ئاشتیی‌خوازانەی موسڵمانەکانیان لێ هەڵ گێڕایەوە کە ئەمانە بۆ جەنگ هاتوون .

هەروەها توانیی هۆزی ثەقیف و عوروەی کوڕی مەسعوودی سەرداریان قەناعەت پێ بکەن و بێنە کۆمەکی‌یان .. ئەوەبوو بە قوڕەیش و هاوپەیمانانیەوە هەشت هەزار چەکداریان جەم کرد بۆ جەنگی موسڵمانان .

هێزی قوڕەیش لە ناوچەی ( بلدح ) لە خۆرئاوای مەککە دابەزیی و ژن و منداڵیشیان لەگەڵ خۆیان هێنا .

خالیدیش بە خۆی و دووصەد سوارەکەیەوە لە ( کراع الغمیم ) وەستان و ، بڕیاری دا کە بە هیچ شێوەیەك نەهێڵێ موسڵمانەکان تێپەڕ بکەن ..

بۆ هەواڵ زانینیش قوڕەیش دە پیاوی بۆ ئەو کارە دانا و حەکەمی کوڕی عەبدمەنافی کردە سەرکردەیان تا لە شوێنە بەرزەکانی سەرەڕێی موسڵمانان‌دا دابەش بن و یەك بە یەك هەواڵەکان بگەیەنن بە سەربازگەی بەلدەح .

ئەو سەربازە ناقوڕەیشی‌یانەش کە هاتبوونە کۆمەکی‌یان چوار لە سەرۆکەکانی قوڕەیش خۆراکیان ئەدا پێیان « کە سوهەیلی کوڕی عەمر و « عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل و ، صەفوانی کوڕی ئومەییە و ، حوەیطبی کوڕی عەبدولعوززا بوون » کە سیانەکەی پێشەوەیان ئەندامی لیژنەی جەنگ بوون .

لە پێشەوە باسمان کرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەر لە نزیك مەدینەدا « لە ( ذوالحليفة ) بوسری کوڕی سوفیانی خوزاعیی نارد بۆ مەککە تا هەواڵی قوڕەیش بە وردیی بزانێ و ، لە هەڵوێستیان بەرامبەر بەم گەشتەی موسڵمانان ئاگاداری بکات .

بە چەند ڕۆژێك گەیشتە مەککە و ، چەند ڕۆژێك تیایا مایەوە تا بە وردیی هەموو دەنگ و باسێکی وەرگرت .

بوسر پیاوانە کارەکەی ئەنجام دا و لەگەڵ سوپای قوڕەیش‌دا هات هەتا گەیشتە سەربازگەی بەلدەح و لەوێ قوڕەیش هەڵیان دا و کردیانە سەربازگە ، ئیتر لەوان جیا بوویەوە و خۆی گەیاندەوە» خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە سنووری حەرەمەوە زۆر دوور نەبوو .

کە چاوی پێ کەوت فەرمووی : ((يا بسر ما وراءك ؟ )) فەرمووی : ئەی بوسر، چ دەنگ و باسێکت پێیە ؟

ئەویش بۆی باس کرد کە قوڕەیش بە خۆیان و ژن و منداڵیانەوە دەرچوون و ، ئەحابیش و ثەقیفیشیان پێچاوە بە خۆیانەوە و ، بڕیاریان داوە کە نەهێڵن بچێتە مەککەوە» و ، خالیدیش فەرماندەی ئەسپ سوارانە لە ( کراع الغميم ) .

**چوارەم : راوێژی موسڵمانان**

که پێغەمبەری خوا ﷺ لە عوسفان هەواڵی قورەیشی زانیی ، هاوەڵانی کۆکردنەوە و ، راوێژی ئەم بارودۆخەی لەگەڵدا کردن کە ئەوەتا قورەیش هەشت هەزار جەنگاوەری هێناوەتە رێیان و خالیدیش بە دووصەد ئەسپ سوارەوە ئامادەی جەنگە و ، لە هاوەڵانی پرسیی چیی بکەن ؟تایا لەسەر گەشتی خۆیان بەردەوام بن و هەرکەس هاتە رێیان بی‌کوژن ؟ یان چیی بکەن ؟

ئەبوبەکری صدیق هەستا و فەرمووی : خوا و پێغەمبەرەکەی چاك ئەزانن . ئەی پێغەمبەری خوا ! وای بە چاك ئەزانین کە رێی خۆمان بگرینە بەر و ، هەر کەسێ ویستی لە سەردانی کەعبە بمان‌گێڕێتەوە ئەچین بە گژیا .

میقدادی کوڕی عەمری کیندییش وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئێمە وەك نەوەی ئیسرائیل نالێین کە بە مووسایان وت : ﴿ فَٱذۡهَبۡ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ ﴾ ( المائدة : ٥ ) ، بەڵکو ئەڵێین : بڕۆن تۆ و خواکەت بجەنگێن ، ئێمەش واین لە گەڵتانا و ئەجەنگێین . بەخوا ، ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەگەر بەرەو( برك الغماد ) بڕۆیت ، هەتا پیاوێکمان بمێنێ لەگەڵتدا دێین .

ئوسەیدی کوڕی حوضەیری سەرداری ئەوسیش وەك فەرمایشتەکەی ئەبوبەکری وت.

بەمە هەموو لایەك ئامادەیی خۆیان دەربڕیی بۆ سەردانی ماڵی خوا و ، ئەگەر قورەیشیش بێتە رێیان ، بچن بە گژیدا .

ئەم هەڵوێستەی قورەیش ناهەقیی بوو ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ بە داخەوە بوو بۆ ئەو هەڵوێستە و فەرمووی :

(( یا ویح قریش لقد أکلتهم الحرب ، ماذا علیهم لو خلّوا بیني وبین سائر العرب، فإن هم أصابوني کان الذي أرادوا ، وإن أظهرني الله علیهم دخلوا في الإسلام وافرین ، وإن لم یفعلوا قاتلوا وبهم قوة )) . فەرمووی : تیاچوون بۆ قورەیش ، جەنگ لەناوی بردن . چیی ئەبوو ئەگەر لە من و لە عەرەبەکانی تر بگەڕانایە . جا ئەگەر عەرەب منیان لەناو ببردایە ، ئەوا ئەوەبوو کە ئەوان ئەیان ویست و ، ئەگەر خوایش سەری بخستمایە ئەوا بە سەری بەرزەوە موسڵمان ئەبوون ، خۆ ئەگەر موسڵمانیش نەبوونایە بە هێز و تواناوە ئەجەنگان .

پاشان بڕیاری دا کە لەسەر کاری خۆی کۆڵنەدەرانە بەردەوام ئەبێت ، کە فەرمووی: (( فوالله لا أزال أجاهد على الذي بعثني الله به ، حتى يظهره الله أو تنفرد هذه السالفة )) .

بەڵێ قوڕەیش خالیدیان بۆیە ناردبووە سەرەڕێی موسڵمانان تا نەهێڵێ بچنە مەککەوە ، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ پێی خۆش بوو خۆی لە جەنگ لا بدا و ، هەتا ئەتوانێ نەهێڵێ خوێن بڕژێ ، چونکە ئەو بۆ سەردانی کەعبەی پیرۆز هاتووە و هیچی تر . بۆ ئەم مەبەستە بڕیاری دا لە شاڕێوە نەڕوا چونکە خالید پێشی لێ گرتوون .

بەڵام خالید لە شوێنی خۆی نەوەستا بزانێ موسڵمانان دێنە پێش یان نە، ، بەڵکو ئەو بە پەلە ڕووبەڕووی موسڵمانان لە ( كراع الغميم ) ەوە بەرەو عوسفان کەوتە ڕێ ، تا موسڵمانان ناچاری جەنگ بکات .

موسڵمانەکان کە دیان وا پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی لە جەنگ لا ئەدا ، ئەوانیش دانیان بە خۆیاندا گرت و دەستیان نەوەشاند ، هەرچەندە خالید شەڕی زۆری پێ فرۆشتن ، هەتا لە کاتی بەجێهێنانی نوێژدا ، بە خۆی و دووصەد ئەسپ سوارەکەیەوە هاتنە بەردەمی موسڵمانان ، کە گوایە قوڕەیش ئەوەندە بەهێزە کە نەهێڵێ ئەمان بچنە مەککەوە ..

بۆ ئەم کارەی خالید ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا عەببادی کوڕی بیشری سەرکردەی سوارچاکانی سوپای ئیسلام بە خۆی و سوارچاکەکانیەوە لە بەردەم هێزەکەی خالیددا بووەستن و ، هەر جووڵەیەك لە خالیدەوە دەرچوو پەرچی بدەنەوە ، نەوەك خالید هێرش بکات ، بەڵام ئەمان بە هیچ شێوەیەك دەست نەوەشێنن و ، تەنها ئامادەی بەرگریی بن .

کە کاتی نوێژیش هات موسڵمانەکان نوێژی ترسیان ئەنجام دا ، کە ئەو نوێژە تایبەتە بە کاتی جەنگەوە ، لەبەر ئەوەی کە نوێژەکەیان لە کیس نەچێ و ، لە هەمان کاتیشدا دوژمن نەتوانێ بێتە سەریان ..

واقیدیی لە ( المغازي : ٢ / ٥٨٢ ) دا ئەڵێت :

خالیدی کوڕی وەلید بە خۆی و ئەسپ سوارەکانیەوە ئەوەندە نزیك کەوتەوە کە هاوەڵانی پێغەمبەری خوای ﷺ ئەبینی . ئەوەبوو لە نێوان پێغەمبەری خوا ﷺ و قیبلەدا ئەسپەکانی ڕیز کرد ، کە دووصەد ئەسپ سوار بوون . پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمانی بەسەر عەببادی کوڕی بیشردا دا تا بە خۆی ئەسپ سوارەکانیەوە بچنە

پێشەوە و بەرامبەر بە خالید بووەستن . خۆیشی هاوەڵانی ریز کردن و ، کاتی نوێژی نیوەڕۆ هاتە بەرەوە و ، بیلال بانگی دا و قامەتی کرد و، پێغەمبەری خوا ﷺ روو بە قیبلە وەستا و خەڵکەکە لە دوایەوە ریزیان بەست و ، نوێژی پێ کردن . پاشان سەلامی دایەوە و ، موسڵمانەکان هەستانەوە بە لای کاری خۆیانەوە . خالیدی کوڕی وەلید وتی : لە ناخلۆفدا بوون ئەگەر هەڵمەتمان بېردایەتە سەریان دەستمان لێیان ئەوەشاند . بەڵام لەم سەعاتەدا نوێژێکیان کاتی دێتە پێشەوە کە لە خۆیشیان و منداڵەکانیشیان بەلایانەوە خۆشەویست ترە . واتە نوێژی عەصر .

( خالید بڕیاری دا لە کاتی نوێژی عەصردا هێرش بکاتە سەر موسڵمانەکان و ، زیانێکی زۆریان پێ بگەیەنێ . بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو هەلەی لە کیس خالید دا و ، نوێژی ترسی بە موسڵمانەکان ئەنجام دا ) ..

واقیدیی ئەڵێت : کاتی نوێژی عەصر هات و ، بیلال بانگی دا و قامەتی کرد و، پێغەمبەری خوا ﷺ روو بە قیبلە وەستا و ، دوژمنیش لەبەردەمی‌دا بوو و هەردوو ریزی موسڵمانانیش ( ألله أكبر ) یان فەرموو ، پاشان ئەو چوو بە رکووعدا و هەردوو ریزەکەش چوون بە رکووعدا . پاشان سەجدەی برد و ریزی یەکەمیش سەجدەی برد و ، ریزی دووهەم وەستان و پاسەوان بوون . جا کە پێغەمبەری خوا ﷺ سەجدەی بە ریزی یەکەم برد و ، لەگەڵیا هەستانەوە ، ریزی دووهەمیش هەردوو سەجدەکەیان برد . پاشان ریزی یەکەم کشانە دواوە و ، ریزی دووهەم هاتنە پێشەوە و ، لە دوای پێغەمبەری خواوە ﷺ وەستان و هەر هەموو پێکەوە وەستان و ، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ رکووعی برد و هەردوو ریزەکەش رکووعیان برد ، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ سەجدەی برد و ، ریزی دوای خۆیشی سەجدەیان برد و ، ریزی دواوە بە پێوە وەستان و پاسەوانی بوون و روویان لە دوژمن بوو . جا کە پێغەمبەری خوا ﷺ سەری لە هەردوو سەجدەکە بەرز کردەوە ( لەگەڵ ریزی یەکەم دا) ریزی دواوەش ئەو دوو سەجدەیان برد کە لەسەریان مابوو و ، پێغەمبەری خوا ﷺ تەخت دانیشت و تەشەهھودی خوێند و ، پاشان سەلامی پێ دانەوە . ئیبن عەبباس‌یش ئەیوت : ئەمە یەکەم نوێژی ترس بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە جێی هێناوە .

**پێنجەم : گۆڕینی رێگا**

قورەیش ئامادەبوونی بۆ جەنگ نواند و ، خالیدیش سەلماندی کە قورەیش ئامادەی جەنگە ، بەڵام موسڵمانەکان حەزیان لە سەردانی ماڵی خوا بوو ، نەك

جەنگ ، بۆیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی دەرکەوت قورەیش ڕێی سەرەکیی لێیان گرتووە و ، ئەگەر لەوێوە بڕۆن تووشی جەنگ ئەبن ، بڕیاری دا کە واز لەو ڕێیە بێنێ کە لە ( تەنعیم ) ەوە [٦٨] بەرەو مەککە ئەڕوا و ، هەوڵ بدا لە ڕێیەکی ترەوە بڕۆن ، بۆیە فەرمووی : (( هل من رجل يخرج بنا على طريق غير طريقهم التي هم بها )) .
داوای کرد پیاوێك بێت و لە ڕێیەکی ترەوە دەریان بکات و تووشی جەنگ نەبن .

لێرەدا بورەیدەی کوڕی حەصیبی ئەسلەمیی ئامادەیی خۆی دەربڕیی کە شارەزایە و، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی پێ دا کە پێشیان بکەوێ ..

بورەیدە بەلای ڕاستدا گەڕایەوە و بە ڕێیەکی سەختدا بردنی هەتا لە دەربەندی ( ذات الحنظل ) ەوە گەیاندیە دەشتی حودەیبیە .

پێغەمبەر و هاوەڵان لەو ڕێیەدا تووشی ناڕەحەتیی زۆر هاتن ، بە ڕادەیەك کە سێ جار ڕێیان لێ تێك چوو . چاوساغی یەکەم ، بورەیدەی ئەسلەمیی چەند جارێك لەو ڕێوە ڕۆیشتبوو ، کەچیی کە ماوەیەك ڕۆیشتن ، بەرد و دار و درەخت ڕێی نەئەدان دەرچن و بورەیدەش سەری لێ شێوا .

کە پێغەمبەری خوا ﷺ دیتی وا بورەیدە توانای نیە ، فەرمانی دا سوار بێت و ، جاڕی دا و فەرمووی : (( من رجل يدلنا على طريق ذات الحنظل ؟ )) . داوای پیاوێکی تری کرد تا ڕێیان پیشان بدات .

حەمزەی کوڕی عەمری ئەسلەمیی دابەزیی و وتی : من ، ئەی پێغەمبەری خوا ! ڕێت پیشان ئەدەم . ئەویش کەمێ ڕۆیشت و کەوتە ناو بێشەڵانەوە و نەی ئەزانیی بەرەو کوێ بڕوا . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بەسەر ئەویشدا دا تا سواری وڵاغەکەی ببێ و ، جارێکی تر داوای کرد کەسێك چاوساغیی‌یان بکات . ئەم جارەش عەمری کوڕی عەبد نەهمی ئەسلەمیی هات و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! من ڕێت پیشان ئەدەم . ئەویش فەرمانی دا پێش بکەوێ .

عەمر لە پێشیانەوە ڕۆیشت هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی بە دەربەندەکە کەوت و ، فەرمووی : (( هذه ثنية ذات الحنظل ؟ )) . عەمر وتی : بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا !

---

[٦٨] تەنعیم : شوێنێکە لە مەککە ، بەڵام لە دەرەوەی سنووری حەرەم و سێ میل لە مەککەوە دوورە .

دوای ئەوەی کە موسڵمانەکان گەیشتنە ( ذات الحنظل ) ئەو شەوە ، بێ ئەوەی مانگەشەو بێ ، ئاسمان زەویی ڕووناك کردەوە . بۆ ئەمە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( والذي نفسي بيده ما مثل هذه الثنية الليلة إلا مثل الباب الذي قال الله لبني إسرائيل : ﴿ وادخلوا الباب سجداً و قولوا حطة ﴾ )) . فەرمووی : بەو خوایەی کە گیانمی بە دەستە ئەمشەوی ئەم دەربەندە وەك ئەو دەرگایە وەهایە کە خوای گەورە فەرمانی بەسەر نەوەی ئیسرائیلدا دا ، تا لەو دەرگاوە بچنە ژوورەوە و سەجدە بەرن و داوای لێ خۆشبوونی گوناهەکانیان بکەن .

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (( الكلمة التي عرضت على بني إسرائيل : ( لا إله إلا الله وادخلوا الباب سجداً ) قال : باب بيت المقدس ، فدخلوا من قبل أستاهم وقالوا : ( حبة في شعيرة ) )) . فەرمووی : ئەو فەرمایشتەی کە بەسەر نەوەی ئیسرائیلدا درا بیڵێن : (( لا إله إلا الله )) بوو و بە سەجدەوە لە دەرگای ( بيت المقدس ) ەوە بچنە ژوورەوە ، کەچیی ئەوان بە پاشە و پاش چوونە ژوورەوە ( تا سەجدە نەبەن ) و ، فەرمایشتەکەشیان نەوت .

هەروەها فەرموویە : (( الكلمة التي عرضت على بني إسرائيل ، أن يقولوا : ( نستغفر الله ونتوب إليه ) )) . فەرمووی : ئەو فەرمایشتەی کە لە نەوەی ئیسرائیل داوا کرا بیڵێن ئەوەبوو داوای لێ خۆش بوون لە خوا بکەن و بڕیار بدەن بگەڕێنەوە بۆ لای ئەو .

کاتێك کە موسڵمانەکان ئەو ڕێگا سەختەیان بڕیی و گەیشتنە دەربەندەکە و دەشتی حودەیبیەیان لێوە دەرکەوت ، پێغەمبەری خوا ﷺ بە هاوەڵانی فەرموو : (( قولوا : نستغفرالله ونتوب إليه )) . کە هاوەڵان ئەوەیان وت : فەرمووی : (( والله إنها للحطة التي عرضت على بني إسرائيل ، فلم يقولوها )) . فەرمووی : بەخوا ئەمە ئەو فەرمایشتە بوو کە لە نەوەی ئیسرائیل داوا کرا بیڵێن ، کەچیی نەیان وت.

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ( لەو کاتەدا کە لە دەربەندەکەوە تێپەڕیان ئەکرد ) فەرمووی : (( لا يجوز هذه الثنية أحد إلا غفر الله له )) . فەرمووی : هەر کەسێك ئەمشەو لەم دەربەندەوە تێ بپەڕێ خوای گەورە لێی ئەبووری .

ئەبوسەعیدی خودریی ئەڵێت : قەتادەی کوڕی نوعمانی برای دایکیم لە دوای خەڵکەکەوە بوو ، منیش لە دەربەندەکە وەستام و بە خەڵکەکەم ئەوت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە : هەر کەسێك لەم دەربەندەوە تێپەڕ بکات خوا لێی ئەبووری .

خەڵکەکەش ( کە هەزار و چوار صەد کەس بوون ) بە پەلە تێ پەڕین هەتا لە دوای هەموویانەوە براکەشم تێپەڕی کرد ، کە ئەترسام ڕۆژ ببێتەوە و ، ئەو تێپەڕ نەکات .

لەولاوە کە خالیدی کوڕی وەلید هەواڵی زانیی وا موسڵمانەکان ڕێیان گۆڕیوە و ، گەیشتوونەتە دەشتی حودەیبیە و ، ئەیانەوێ لای ڕۆژئاواوە بچنە ناو مەککەوە ، زۆری پێ ناخۆش بوو ، چونکە ئەو هەلەی ئەو بە تەمای بوو لە کیسی چوو ، چونکە خۆی ئامادە کردبوو کە موسڵمانەکان بێن و دەستیان لێ بوەشێنێ . خالید بە پەلە بە خۆی و سوارەکانیەوە گەڕایەوە مەککە تا سەرکردەکانی قوڕەیش لەوە ئاگادار بکات کە موسڵمانەکان ڕێیان گۆڕیوە و ، وازیان لە ڕێی تەنعیم هێناوە .

مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەبوو عومرە جێبەجێ بکەن و ، سەردانی کەعبەی پیرۆز بکەن و ، هەتا بۆیان ئەکرێ ، هەوڵ بدەن خوێن نەڕژێ .

**شەشەم : چۆکدادانی قەصوا**

قوڕەیش ئەو سوپایەی کە لە تەنعیم مۆڵی دابوو هەمووی هێنایە ناوچەی حودەیبیە و ، هەر لەناو حەرەمی مەککییدا سەربازخانەی دروست کرد و ، بڕیاری دا کە نەهێڵێ موسڵمانەکان پێ بنێنە مەککەوە .

دیسان هەردوو سوپاکە بەرامبەر بە یەك وەستانەوە و ، جەنگ‌کردنیان زۆر نزیك بوو . چونکە پێغەمبەر و موسڵمانان ئیحرامیان بەستبوو و ، بڕیاریان دابوو لەسەر ئەنجامدانی کاری خۆیان سوورین و ، ئەگەر قوڕەیشیش ببێتە کۆسپ لەبەر دەمیاندا بچن بە گژیا ..

لەم کاتەدا کە خەریك بوو بەرەو پێشەوە بکەونە ڕێ ، ڕووداوێکی سەیر رووی دا ، کە بووە مایەی ئەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ سنووری حەرەم نەبڕێت . هەروەك خوای گەورە بیەوێ خوێن لەو شوێنە پیرۆزەدا نەڕژێت و ، خەڵکێك کە لە دواڕۆژدا موسڵمان ئەبن نەکوژرێن .

ئەو ڕووداوەش بریتیی بوو لە چۆکدادانی ( قەصوا ) کە وشتری پێغەمبەری خوا بوو ، بە مەرجێ لە وشترە ڕەسەنەکان بوو . کە گەیشتنە سنووری حەرەم لەوێ خۆی بە زەوییدا دا و ، هەرچەندە هەوڵیشی لەگەڵ درا بێ‌هوودە بوو . لە خەڵکەکە وابوو وشترەکە لەبەر ماندووبوون لە پێ کەوتووە ، بۆیە وتیان : ( خلأت القصوى ) . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : « ما خلأت وما هو لها بخلق ولكن حبسها حابس

الفيل عن مكة )) . فەرمووی : نە لە پێ کەوتووە و نە ئەوەش رەفتاریەتی . ئەوەندە هەیە کە ئەو خوایەی فیلەکەی لە مەککە قەدەغە کرد ئەمیشی قەدەغە کردووە . پاشان فەرمووی : (( والذي نفس محمد بيده لا تدعوني قريش اليوم إلى خطة يسألوني فيها صلة الرحم إلا أعطيتهم إياها )) . فەرمووی : بەو خوایەی کە گیانی موحەممەدی بە دەستە ئەمڕۆ قوڕەیش داوای هەر نەخشەیەکم لێ بکەن کە مایەی سیلەی رەحم بێت ، ئەیان دەمێ .

بەمە دەری بڕیی کە ئەمان ئامادەی رێکەوتنن بۆ ئەوەی خوێن نەرژێ . پاشان خوڕیی لە وشترەکەی و ئەویش هەڵسایەوە ، ئیتر گێڕایەوە دوا و ، فەرمانیشی بە هاوەڵانی دا کە لە حودەیبیە بار بخەن و ، بڕیاری دا لە سنووری حەرەم تێپەڕ نەبێت ، ئەمەش هەتا ماوەیەکی تر . هەر هەموو هاوەڵان لە لای بیرێکی حودەیبیە خستیان. ئەمەش ئارام و دانبەخۆداگرتنی ئازیزمان ئەخاتە پێش چاو ، کە پێی خۆش بوو ماوەیەك چاوەڕوان بکات ، بەڵکو ژیر و بەسەلیقەکانی قوڕەیش لغاوی نەفامەکان بگرن و ، بە ناڕەوا هێز لە دژی گەشتە ئاشتی‌یانەکەی موسڵمانان بە کار نەهێنن و ، ماوە بدەن موسڵمانان عومرە بەجێ بهێنن ، چونکە ماڵی خوا مافی هەموو کەسێکی پێوەیە و ، نابێ هیچ کەسی لێ قەدەغە بکرێ ، مادام نیازی خراپی نەبێ .

لەگەڵ ئەم چاوپۆشیی و ئارامەدا قوڕەیش هەر شەڕی ئەفرۆشت و ، لە هەل ئەگەڕا دەست لە موسڵمانەکان بوەشێنێ . هەتا ئەوەبوو ئەو هاوەڵانەی کە لەگەڵ موحەممەدی کوڕی مەسلەمەدا ئەرکی پاسەوانی‌یان گرتبووە ئەستۆ پیلانێکی نەفامانی قوڕەیشیان پووچەڵ کردەوە ، کە ئەوەبوو ئەیانویست شەو دزە بکەن بۆ ناو سەربازخانەی موسڵمانان ، بە نیازی کوشتن و لەناوبردن .

کە موسڵمانەکان لە حودەیبیە مانەوە و ، قوڕەیشیش مەترسیی دەستدرێژیی لێ ئەکرا ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا لە هاوەڵانی سێ کەتیبە بۆ پاسەوانیی شەوانەی سەربازخانەی موسڵمانان پێك بهێنرێن ، تا هەر کە نەفامێکی قوڕەیشیی دەستدرێژیی کرد پەرچی بدەنەوە . جا فەرماندەی هەرسێ کەتیبەکە ئەم سێ ئەنصارە بوون :

١ـ عەببادی کوڕی بیشر .

٢ ـ ئەوسی کوڕی خەولیی .

٣ ـ موحەممەدی کوڕی مەسلەمە .

هەر شەوێك یەکێ لەم سیانە بە خۆی و کەتیبەکەیەوە هەتا بەیانیی پاسەوانی موسڵمانان ئەبن و ، بە دەوری سەربازگەدا ئەسووڕێنەوە .

**حەوتەم : موعجیزەی ئاو**

لە کاتی بارخستنی موسڵمانان‌دا لە حودەیبیە ، موسڵمانان ـ هەر هەموویان ـ موعجیزەیەکی روون و ئاشکرایان ، بە پێغەمبەری خواوە ﷺ بینیی .

ئەوەبوو لەسەر بیرێك خستیان کە ئاوێکی زۆر کەمی تێدا بوو . هاوەڵان کەوتنە پێش برکێ کە هەر کەسە ئەی‌ویست خۆی ئاو بخواتەوە و ، وڵاغەکەشی ئاو بدات . سەیریان کرد ئاوەکە یەکجار کەمە ، کە بەشی چەند کەسێکی کەمیش ناکات ، چ جای ئەوان کە هەزار و چوارصەد کەس بوون و ، زۆربەشیان وڵاغیان پێ بوو .

ئەبوا موسڵمانەکان ماوەیەك لە حودەیبیە بمابانەوە ، بۆیە سەرنجیان دا حاڵ و گوزەرانی خۆیان و وڵاغەکانیان یەکجار سەخت ئەبێت و ، بەبێ ئاو ناژین و ، لەو نزیکانەش‌دا ئاویان دەست ناکەوێ ، چونکە لە هەر شوێنێکیش ئاو هەبێ قوڕەیش دەستی بەسەردا گرتووە و ، ناهێڵن کەڵکی لێ وەربگرن .

کە هاوەڵان هیچ چارەیەکیان ، بۆ پەیدا کردنی ئاو، لەبەردەم‌دا نەمایەوە ، هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و دادی بێ‌ئاوی‌یان کرد . ئەویش پەنای بردە بەر بارەگای خوای گەورە و ، پاشان فەرمانی بەسەر یەکێ لە هاوەڵانی‌دا دا تا بچێتە ناو بیرە کەم ئاوەکەوە و ، ئەو تیرەی پیا بچەقێنێ کە بە دەستی موبارەکی خۆی پێی دا .. ئەو هاوەڵە ناوی ناجیەی کوڕی ئەعجەم[٦٩] بوو ..

جا ناجیەی کوڕی ئەعجەم ئەی‌وت : کە دادی کەم ئاویی برایە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کردم و ، لە تیردانەکەی‌دا تیرێکی دەرهێنا و ، دای پێم و، داوای دۆلکەیەك لە ئاوی بیرەکەی کرد . کە بۆم هێنا دەست‌نوێژی پێ گرت و ، ئاوی لە دەمی رادا و ، تفی‌یەوە ناو دۆلکەکە و ، خەڵکەکەش گەرما زۆری بۆ هێنابوون و ، تەنها یەك بیریش هەبوو و ، بت‌پەرستەکان زوو گەیشتبوونە بەلدەح و دەستیان بەسەر ئاوەکانی‌دا گرتبوو . فەرمووی : (( إنزل بالماء فصبه في البئر وأثر

---

[٦٩] ناجیەی کوڕی ئەعجەمی ئەسلەمیی ، لە رۆژی فەتحی مەککەدا نەوەی سولەیم دوو ئالایان هەبوو کە یەکێکیان ناجیە و ئەوی تریان بورەیدەی کوڕی حەصیب هەڵیان ئەگرتن .. ئیبن شاهین وتوویە: ناجیە لە مەدینەدا و لە کۆتایی سەردەمی خەلافەتی موعاویەدا کۆچی دوایی کردووە .

ماءها بالسهم )) . فەرمووی : دابەزە ناو بیرەکەوە و ، ئەم ئاوە بکەرەوە ناو بیرەکە و، تیرەکەش بە بیرەکەدا بچەقێنە .

ئەڵێت : منیش چووم وەهام کرد . دەی بەو خوایەی کە ئەوی بە حەق رەوانە کردووە نەهاتبوومە دەرەوە ، هەتا ئاو خەریك بوو دام پۆشێ و ، بە وێنەی قابلەمە هەڵ چوو هەتا پڕلە ئاو بوو و ، ئاو گەیشتە لێوی بیرەکە و ، لە قەراغیا بە دەست ئاویان دەرئەهێنا ، هەتا دوا یەکیان تێر ئاو بوون .

کاتێك کە ئەم موعجیزەیە رووی دا هەموو سوپای ئیسلام بە چاوی خۆیان بینییان و ، بە هیچ کەس ئینکاریی نەئەکرا .. هەتا مونافیقەکان وەك کوڕی ئوبەی و جەددی کوڕی قەیس بە چاوی خۆیان ئەمەیان دیی و ، هەندێ لە خزم و نزیکانیان کەوتنە گلەیی و لۆمەی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کە واز لە رێی چەوت و چەوێڵی نیفاق ناهێنێ .

یەکێ لەوانەی کە لۆمەی کوڕی ئوبەی ئەکەن ئەوسی کوڕی خەولیی خەزرەجی‌یە ،[٧٠] کە لە هۆزەکەی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی خۆیەتی ، کە تا کەی قەناعەت بە راستگۆیی پێغەمبەری خوا ﷺ ناکات ؟ بەڵام عەبدوڵلا خۆی ئاسا ، بەبێ ئیمانانە وەڵامی نەداتەوە و ، ئەوس لێی تووڕە ئەبێت . ئەڵێت : شتی وەهام دیوە . ئەوسیش ئەڵێت خوا خۆت و را و بۆچوونت ناشیرین کات .

ئەم ملەجەڕەی عەبدوڵلا گەیشتەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ . جا کە عەبدوڵلا هات بۆ دانیشتن لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ ، پێی فەرموو : (( أي أبا الحباب! أين رأيت مثل ما رأيت اليوم ؟ )) . فەرمووی : عەبدوڵلا ! ئەوەی ئەمڕۆ دیت لە چ شوێنێکی تر دیوتە ؟ وتی : هەرگیز وەك ئەمەم نەدیوە . پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی وەبیر هێنایەوە کە بە ئەوسی کوڕی خەولیی وتبوو ، عەبدوڵلاش چاری نەما و، ئینکاریی ئەو وتە ناشیرینەی نەکرد . جا بۆ ئەوەی نەکەوێتە بەر خەشمی موسڵمانان

---

[٧٠] ئەوسی کوڕی خەولیی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی حاریثی خەزرەجیی ئەنصاریی ، لەگەڵ شوجاعی کوڕی وەهەبدا پێغەمبەری خوا کردنیە برا و ، بەشداریی جەنگی بەدری کردووە . ئەوس یەکێ بووە لەو پێنج کەسەی کە پادشای خەیبەر ، سەللامی کوڕی ئەبولحوقەیقیان کوشت . لە حودەیبییەش‌دا یەکێ بوو لەو سێ کەسەی کە بوونە فەرماندەی پاسەوانەکانی سوپای ئیسلام . جا لەبەر ئەوەی کە پیاوێکی جەستە بەهێز بووە ، پێغەمبەری خوا هەر لە ( ذي طوى ) کردوویەتیە فەرماندەی ئەو مەفرەزەیە کە لە هاوەڵانی پێکی هێنابوو ، تا لە عومرەی قەزادا ، چاودێریی قوڕەیش بکەن ، نەوەکو بیانەوێ ناپاکیی دەرهەق بە موسڵمانەکان بکەن . کاتێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد ، ئەوسیش لە شۆردنی‌دا بەشداریی کرد . ئەوس لە سەردەمی خەلافەتی خەلیفە عوثمان‌دا ، پێش ئەوەی لە ماڵەکەی‌دا گەمارۆ بدرێ ، کۆچی دوایی کردووە ..

وتی : (( أستغفرالله )) . عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕیشی کە گەنجێکی چاك و خواناس بوو وتی : داوای لێ خۆش بوونی بۆ بکە ، ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەویش داوای لێ خۆش بوونی بۆ کرد ..

هەروەها جەددی کوڕی قەیسیش بەش بە حاڵی خۆی لەناو خزمەکانی‌دا سەردار بوو ، بەڵام ئەمیش لە نیفاق‌دا هاوتای کوڕی ئوبەی کرد و ، وەك ئەویش رقی لە پێغەمبەری خوا بوو ، بەڵام بۆ ئاژاوە لەگەڵ سوپای ئیسلام‌دا هاتبوو .

واقیدیی لە ئەبوقەتادەوە باسی کردووە کە وتوویە : کاتێك کە لە حودەیبیە خستمان و ، ئاو کەم بوو ، گوێم لە جەددی کوڕی قەیس بوو ئەی‌وت : دەرچوونمان بۆ ناو ئەو خەڵکە هیچی بەسەر نەبوو ، هەر هەموومان لە تینوانا ئەمرین . ئەبوقەتادە ئەڵێ : وتم : باوکی عەبدوڵڵا ! ئەوە مەڵێ . جا بۆچ بە رێ کەوتوویت ؟ وتی : لەگەڵ خزمەکانم‌دا هاتووم . وتم : ئەی بۆ عەمرە نەهاتوویت ؟ وتی : نەخێر ، بەخوا ئیحرامم نەبەستوە . ئەبوقەتادە وتی : نییەتی عومرەشت نەهێناوە ؟ وتی : نەء . کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوەکەی بانگ کرد و بە تیرەکەوە دابەزی‌یە ناو بیرەکە و ، پێغەمبەری خوا ﷺ لە دۆلکەکەدا دەست نوێژی گرت و ئاوەکەی ناو دەمیشی تفی‌یەوە ناوی و ، پاشان ئاوەکەی گەڕاندەوە بۆ ناو بیرەکە و ئاوی بیرەکە هەڵ چوو ، ئەبینم جەدد هەردوو پێی لە قەراغی بیرەکەوە بۆ ناو ئاوەکە شۆڕ کردوونەتەوە . منیش وتم : باوکی عەبدوڵڵا ! ئەوەی تۆ وتت کوا ؟ وتی : گاڵتەم لەگەڵ کردی . ئەوەی کە وتم هیچی بۆ موحەممەد نەگێڕیتەوە .

ئەبوقەتادە ئەڵێ : منیش ئەوەم زووتر بۆ پێغەمبەر ﷺ باس کردبوو . جەدد تووڕە بوو و وتی : لەگەڵ چەند منالێکی خزمان هەڵس و کەوت ئەکەین کە گوێ بە پایە و تەمەنمان نادەن . بە راستیی ئەمڕۆ ناوسکی زەویی چاك‌ترە لەسەر زەویی .

ئەبوقەتادە ئەڵێ : ئەوەبوو قسەیەکم بۆ پێغەمبەر ﷺ باس کردبوو ، ئەویش فەرمووی : (( إبنه خير منه )) . فەرمووی : کوڕەکەی لە خۆی چاك‌ترە .

ئەڵێ : چەند کەسێك لە خزمانم تووشم بوون و دەستیان دایە سەرزەنشت کردنم لەسەر ئەوەی کە قسەیەکم گەیاندبوو بە پێغەمبەری خوا ﷺ . منیش پێم وتن : بە راستیی خزم‌گەلێکی خراپن . تیاچن ، لە جەددی کوڕی قەیس بەرگریی ئەکەن ؟ وتیان : بەڵێ ، گەورە و سەردارمانە . وتم : بەخوا پێغەمبەری خوا ﷺ سەرداریی ئەوی لەسەر ئەوەی سەلیمە لا بردووە و ، بیشری کوڕی بەرائی کوڕی مەعروری

کردۆتە سەردارمان و ، هەر پایە و پلەیەك لە دەرگای جەددا بووە رووخاندوومانە و ، لە دەرگای بیشری کوڕی بەراءدا بنیاتمان ناوەتەوە و ، هەتا ڕۆژی قیامەت هەر ئەو سەردارمانە .

جەددی موونافیق هەروا بە ترسنۆکیی ژیانی بەسەر برد و ، لە کاتی بەیعەت دانیش‌دا لە ترسان‌دا خۆی ئەشاردەوە ..

**هەشتەم : هەوڵی نوێنەران**

موسڵمانەکان لە حودەیبییەدا لە نزیکی ماوا و مەنزڵی هۆزی خوزاعەی یەمەنییدا بوون . ئەم هۆزە بە موسڵمان و کافریانەوە دۆستی موسڵمانان بوون و ، پێیشیان خۆش بوو کە دۆستایەتیی خۆیان بۆیان دەربخەن . ئەوەبوو عەمری کوڕی سالم و ،[٧١] بوسری کوڕی سوفیان ، کە هەردووکیان خوزاعیی بوون چەند مەڕو وشترێکیان بە دیاریی بۆ موسڵمانان هێنا . هەردووکیشیان چەند سەر مەڕێکیان بە دیاریی دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ و ، عەمر چەند وشترێکیشی بە دیاریی دا بە سەعدی کوڕی عوبادە کە دۆستی بوو . سەعدیش هێنانی بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئاگاداری کرد کە ئەوانە دیاریی عەمرن و دوعای بەرەکەتیشی بۆ کرد ..

ئەوەی کە ئەو دیاری‌یانەی هێنا منداڵێکی بچکۆلە بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر دەستی‌دا دای‌نیشاند ، بەڵام جل‌وبەرگی منداڵەکە زۆر شڕ بوون . هەندێ پرسیاری دەربارەی حاڵ و گوزەرانی ناوچەکەیان لێ کرد و منداڵەکە بەوپەڕی ژیریی و بەلاغەتەوە وەڵامی پرسیارەکانی پێغەمبەری دایەوە و ، پێغەمبەریش زمان پاراویی منداڵەکەی بە لاوە سەیر بوو و ، فەرمانی دا پۆشتەی بکەنەوە . منداڵەکە داوای کرد بۆ بەرەکەت دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ ماچ بکات . ئەویش فەرمانی دا بێتە پێشەوە . کە نزیك بوویەوە دەستی گرت و ماچی کرد و ، پێغەمبەری خوایش ﷺ دەستی هێنا بە سەری‌دا و ، دوعای بەرەکەتی بۆ کرد کە فەرمووی : (( بارك الله فيك )) . منداڵەکە بووە پیاوێکی دیار لەناو قەومەکەی‌دا و ، لە سەردەمی وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك‌دا کۆچی دوایی کرد .

---

[٧١] عەمری کوڕی سالمی کوڕی حوضەیری کوڕی سالمی خوزاعیی ، پێش فەتحی مەککە موسڵمان بووە .. یەکێك بووە لەو نوێنەرانەی کە هاتنە مەدینە و، پێغەمبەریان ﷺ لە پەیمان شکاندنی قورەیش و نەوەی بەکر ئاگادار کرد، بەوەی کە دەست درێژی‌یان کردە سەر خوزاعە ، بە مەرجێ ڕێك‌کەوتن نامەی حودەیبیە لە نێوانیان‌دا بوو . لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا عەمری کوڕی سالم هەڵگری یەکێك لە ئاڵاکانی هۆزی خوزاعە بوو .

پێغەمبەری خوا ﷺ پێی خۆش بوو ڕاستەوخۆ قورەیش ئاگادار بکا کە نیازی جەنگی نیە و ، تەنها ئەیەوێ خۆی و هاوەڵانی عومرە ئەنجام بدەن و ، بەرەو مەدینە ئەگەڕێنەوە . بۆ ئەمە نێرراوی تایبەتیی خۆی خیراشی کوڕی ئومەییەی کەعبیی [٧٢] بە نامەیەکی زارەکی‌یەوە نارده لای قورەیش و ، وشترەکەی خۆی ، کە ناوی ( ثعلب ) بوو ، دا بە خیراش ، بەڵکو بچێ قەناعەت بە قورەیش بکات و ، واز لە عینادیی و ملەجەڕێ بهێنن.

خیراش چوو بۆ بەلدەح ، کە گەورە و بچووکی قورەیش لەوێ کۆمەڵیان کردبوو ، تا ئاگاداریان بکات کە موسڵمانان داوای ئاشتیی ئەکەن . کەچیی گەنجە هەڵەشەکان ڕێیان پێ گرت و ، نەیانهێشت بگاتە لای پیاوماقوولان ـ هێرشیان کردە سەری و وشترەکەیان کوشت و خەریك بوو خۆیشی بکوژن . ئەم کارە منالآنەیە لەلایەن عیکریمەوە ئەنجام درا .. ئیتر خیراش گەڕایەوە و داوای لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد کە پیاوێکی تر بنێرێ کە قورەیش نەتوانن دەستی بۆ بەرن .

مێژوونووسان ئەوە باس ئەکەن کە یەکەم نوێنەرێکی عەرەبی ناوچەی حەرەم و دەوروبەری ، نوێنەری هۆزی خوزاعە بوو ، کە هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ، شایانی باسە کە خوزاعە بە دڵ دۆستی موسڵمانان بوون .

نوێنەرانیان بە سەرکردایەتیی بودەیلی کوڕی وەرقاء هاتن و سەلامیان لە پێغەمبەری خوا کرد . پاشان بودەیل ویستی ناکۆکیی نێوان موسڵمانەکان و قورەیش نەهێڵێت ، بۆیە بە پێغەمبەری وت : ئێمە لەلایەن خزمەکانتەوە ، کەعبی کوڕی لوئەی و عامیری کوڕی لوئەی ، هاتووین ، کە ئەحابیش و هەر هۆزێکیش گوێڕایەڵی‌یان بۆ کردبن ، بە ژن و منداڵی خۆیانەوە ، هەر هەموویان لە دژت کۆکردوونەتەوە و ، سوێندیش ئەخۆن هەتا تاقیان لێ نەبڕێتەوە لێت ناگەڕێن بگەیتە ماڵی خوا ..

پێغەمبەری خوایش ﷺ وەڵامی سەرداری خوزاعەی دایەوە و فەرمووی : (( إنا لم نأت لقتال أحد ، إنما جئنا لنطوف بهذا البيت ، فمن صدَّنا قاتلناه ، وقريش قوم قد أضرت بهم الحرب و نهكتهم ، فإن شاؤوا ماددتهم مدة يأمنون فيها ويخلون فيما بيننا

---

[٧٢] خیراشی کوڕی ئومەییەی کوڕی ڕەبیعەی کوڕی فەضلی خوزاعیی ، هاوپەیمانی نەوەی مەخزووم بووە . بەشداریی حودەیبیە و خەیبەر و لەوەو دوای کردووە . کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە حودەیبیەوە ناردی بۆ مەککە ، قورەیشی‌یەکان ئازاریان دا و وشترەکەیان کوشت و خەریك بوو خۆیشی بکوژن ، بەڵام ئەحابیش نەیان هێشت . لە عەمرەی قەزادا ، ساڵێك دوای حودەیبیە ، لە مەروەدا سەری پێغەمبەری خوای ﷺ تاشیوە .

وبين الناس ، والناس أكثر منهم ، فإن ظهر أمري على الناس كانوا بين أن يدخلوا فيما دخل فيه الناس ، أو يقاتلوا وقد جمعوا ؛ والله لأجهدنَّ على أمري هذا حتى تنفرد سالفتي أو ينفذ اللهُ أمره )) .

تێی گەیاندن کە موسڵمانەکان بۆ جەنگ نەهاتوون ، بەڵام هەرکەس لە زیارەتی ماڵی خوا قەدەغەیان بکا ، ئەچن بە گژیدا .. قورەیشیش جەنگ ماندووی کردوون و، گەر بیانەوێ ماوەیەك رێك بکەون تا ئەگەر موسڵمانەکان بەسەر خەڵکی تردا سەرکەوتن ، ئەوا ئەو کاتە قورەیش بە ویستی خۆیانە : یا موسڵمان ئەبن ؛ یا ئەتوانن بجەنگن . پاشان سوێندی خوارد کە لەسەر ئەم کارەی خەریك ئەبێت ، تا یا لە پێناویا ملی ئەپەڕێ ، یان خوا دینی خۆی سەر ئەخات .

تا ئەو کاتە بودەیل موسڵمان نەبوو بوو و ، پەیمانی دۆستانەیان لە نێوان‌دا هەبوو. فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خواش ﷺ ئاشتیی و برایەتیی ئەگەیاند ؛ لە هەمان کات دا دیار بوو کە موسڵمانەکان خاوەنی هێزن .

بەڵێ بودەیل لە خۆیەوە هاتبوو و حەزی لە قازانجی موسڵمانەکان بوو ، بەو فەرمایشتەش تێ گەیشت کە موسڵمانەکان دەسەڵاتیان هەیە ؛ بەڵام جەنگ نافرۆشن. لە هەمان کات‌دا مل بۆ هیچ بیانوویەکی قورەیش کەچ ناکەن .

بودەیل بەو فەرمایشتە کاری تەواوی تێ کرا . هەروەها عەمری کوڕی سالمیش، کە ئەویش یەکێ بوو لەو نوێنەرانە ، فەرمایشتە ئاشتیی‌خوازەکە کاری تێ کرد و بۆی دەرکەوت کە تاوان لەلایەن موسڵمانانەوە نیە . کاتێکیش کە گەڕانەوە دوا ( لەبەر خۆیەوە وەك قورەیش بدوێنێ ) ئەیوت : بەخوا هەرگیز بەسەر کەسێك‌دا سەرناکەون کە ئەمە پێشنیار بکات .

بودەیل بە خۆی و نوێنەرەکانەوە بەرەو سەربازگەی قورەیش کەوتە رێ . بەڵام بەر لەوەی بگەنە سەربازگە ، هەندێ هەرزەی نەزان‌کاری قورەیشیش هەوڵیان دا کە قەناعەت بە قورەیش بکەن تا گوێ لە نوێنەرانی ئاشتیی نەگرن ، چونکە بۆ ئەوە هاتوون کە نەهێڵن جەنگ روو بدات .

کە بودەیل و دەستەکەی گەیشتن قورەیش هیچ هەواڵێکیان لێ‌یان نەپرسیی . کە بودەیل ئەوەی دیی وتی : ئێمە لەلایەن موحەممەدەوە هاتووین ؛ ئایا پێتان خۆشە هەواڵتان بدەینێ ؟ خێرا عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل و حەکەمی کوڕی عاص وتیان :

تا بەخوا پێویستییمان بەوە نیە هەواڵی ئەومان بدەنێ ، بەڵکو هەواڵی ئێمە بۆ ئەو ببەن ، کە هەرگیز ئەمساڵ نایەتە کەعبەوە هەتا تاقمان نەبڕێتەوە .

لەو کاتەدا عوروەی کوڕی مەسعوودی سەرداری ثەقیف ، کە ئەویش بەشداریی لە سوپای قوڕەیش‌دا کردبوو ، لەوێ بوو و ، گوێی لە وت و وێژی نێوان نوێنەرانی خوزاعە و هەڵەشەکانی قوڕەیش بوو .

عوروە وەك پیاوێکی ژیری دنیادیدە و ، خاوەن تاقیی‌کاریی ، ئەم کردەوەیەی عیکریمە و هەڵەشەکانی قوڕەیشی بە دڵ نەبوو ، بۆیە وتی : بەخوا تا ئێستە رای سەیری وەك ئەمەی ئەمڕۆم نەدیوە . بۆچیی پێتان ناخۆشە گوێ لە بودەیل و هاوەڵانی بگرن ؟ ئەگەر کارێکتان بە دڵ بوو وەری ئەگرن و ، هەر شتێکیشتان پێ ناخۆش بوو وازی لێ ئەهێنن . هەر کۆمەڵێك ئەمە کاریان بێت هەرگیز سەرناکەون .

بەڵام هەندێ پیاوی ژیر و ماقووڵی مەککە ، وەك حاریثی کوڕی هیشام [٧٣] و صەفوانی کوڕی ئومەییە وایان بە چاك زانیی کە گەنجە هەڵەشەکان بێ دەنگ بکەن و، ئامۆژگاریی‌یەکەی عوروە بگرنە گوێ ، ئەوەبوو بە بودەیلیان وت : چیتان دیوە و بیستووە بۆمان باس بکەن .

ئەوانیش ئەوەی کە خۆیان بە پێغەمبەری خوایان وتبوو و ، ئەوەی کە ئەویش فەرمووبووی پێیان ، بۆیان باس کردن ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ داوای ئاشتیی ئەکات ، تا هەریەکەیان لەوی تر بێ‌خەم بێ ، ئەگەرچیی بۆ ماوەیەکی دیاریی کراویش بێت ، ماوەی موسڵمانەکان بدەن تا عومرە جێ‌بەجێ بکەن و ، قوڕەیش لە زۆران‌بازیی نێوان موسڵمانان و بت پەرستە عەرەبەکانی تردا بێ‌لایەن بن ، جا ئەگەر

[٧٣] حاریثی کوڕی هیشامی کوڕی موغیرەی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی مەخزووم ، برای ئەبوجەهل و ئامۆزای خالیدی کوڕی وەلید بووە . لە سەردەمی نەفامیی‌دا یەکێ بووە لە ماقووڵانی مەککە . حاریث بەشداریی جەنگی بەدر و ئوحودی لە دژی موسڵمانان کردووە . پاشان لە ساڵی فەتحی مەککەدا بە چاکیی موسڵمان بووە و ، بۆتە هاوەڵێکی پایەدار . حاریث بەشداریی کۆبوونەوەی کەپری نەوەی ساعیدەی کردووە ، کە لەو کاتەدا سەرداری نەوەی مەخزووم بووە و بەشداریی وت و وێژی نێوان ئەنصار و موهاجیریی کردووە و ، لەو بارەوە وتەیەکی جوانی ژیرانەی هەیە کە بەڵگەیە لەسەر سەلیقە و دین داریی حاریث ، کە ئەڵێت : بەخوا ئەگەر فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ نەبوایە کە فەرموویە: (( الأئمة من قريش )) ئەنصارمان لە کاری خەلافەت دوور نەئەخستەوە و ، شیاویشی بوون . بەڵام ئەوە فەرمایشتێکە کە گومانی تێدا نیە . دە بەخوا ئەگەر لەناو قوڕەیش‌دا تەنها پیاوێك بمێنێ ، خوای گەورە ئەم کارەی پێ ئەسپێرێ .

کاتێك کە سوپای ئیسلام بۆ جیهاد کەوتە رێ ، حاریثیش بە ماڵ ومنداڵیەوە ، لە سەردەمی عومەردا ، بەرەو شام کەوتە رێ ، تا بەشداریی جیهاد بکات . ئیتر لەوێ هەر خەریکی جیهاد بوو هەتا لە جیهاددا بە طاعوونی عەمەواس کۆچی دوایی کرد ..

پێغەمبەر ﷺ بەسەریان‌دا زاڵ بوو ، ئەوا عەرەب چیی کرد با قورەیشیش وەها بکات. گەر سەریش نەکەوت ، ئەوا قورەیش بە هێزێکی زۆرەوە ئەجەنگێت.

ئەم نامە ئاشتی‌یانەی کە بودەیل بۆی بردن وەریان نەگرت ، بۆیە بودەیل کەوتە ئامۆژگاری‌یان و پێی وتن : ئەی کۆمەڵی قورەیش ! ئێوە پەلە لەگەڵ موحەممەددا ئەکەن و ، موحەممەد هەوڵی جەنگی نەداوە و ، بۆ جەنگ و کوشتاریش نەهاتووە ، بەڵکو بۆ سەردانی ئەم ماڵە هاتووە .

دەستیان کرد بە جنێو پێ دانی و ، بەوەش تاوانباریان کرد کە لایەنی موسڵمانەکان ئەگرێت و ، دەریان بڕیی کە ئەگەر بۆ جەنگیش نەهاتبێ هەر نایەڵن عومرە بکات ، چونکە لای عەرەب ئابڕوویان ئەچێت و ، وای دائەنێن کە موسڵمانەکان بە زۆری شمشێر چوونەتە مەککەوە .

عورروەی کوڕی مەسعوودی [٧٤] سەرداری هۆزی ثەقیف کە پشتی قورەیشی ئەگرت، کە ئاگاداری ئەم هەڵوێستە جوانەی پێغەمبەری خوا بوو ، ئامۆژگاریی هاوپەیمانەکانی کرد تا قسەکەی بودەیل نەدەنە دواوە .

عورروە سەرەڕای ئەوەی کە پشتی قورەیشی ئەگرت و بە خۆی و ثەقیفی قەومیەوە لەگەڵ قورەیش‌دا سەنگەریان گرتبوو ، دایکی لە قورەیش بوو کە ناوی ( سەیعە ) ی کچی عەبدشەمسی کوڕی عەبدمەناف بوو ، واتە دایکی ئامۆزای عەبدولموطەللیب بووە .

[٧٤] عورروەی کوڕی مەسعوودی کوڕی موعتیبی کوڕی مالیکی ثەقەفیی سەردارێکی گەورەی هۆزی ثەقیف بووە و ، بۆ ڕێك خستنی قورەیش و موسڵمانان لە حودەیبیەدا دەوری کاریگەری هەبووە . ساڵی نۆهەمی کۆچیی بە چاکیی موسڵمان بووە . لە صەحیحی موسلیم دا پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی عورروە فەرموویە: (( عرض علي الأنبياء ورأيت عيسى ، فإذا أقرب من رأيت به شبهاً عروة بن مسعود )) . فەرموویە : پێغەمبەرانم پیشان دران و چاوم بە عیسا کەوت ، ئەبینم نزیك ترین کەسێك کە من دیومە و لەو بکات عورروەی کوڕی مەسعوودە . دوای ئەوەی کە موسڵمان بوو ، داوای مۆڵەتی لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد تا بچێتەوە ناو ثەقیفی قەومی و ، بۆ سەر ئیسلام بانگیان بکات . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( إني أخاف أن يقتلوك )) . فەرمووی : ئەترسم بت کوژن . وتی : ئەگەر بم بینن خەوتووم هەڵم ناسێنن . بەمە مۆڵەتی دا . کە ڕۆیشتەوە دەستی بە بانگ کردن و ئامۆژگاریی قەومەکەی کرد ، کەچیی لێی یاخیی بوون و ، پاشان کوشتیان . پیاوێکیان بە تیر کوشتی . کە هەواڵی کوشتنی بە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت فەرمووی : (( مثل عروة مثل صاحب ياسين ، دعا قومه إلى الله فقتلوه )) . فەرمووی : عورروەش وەك پیاوە ئیمان دارەکەی سوورەتی ( یاسین ) ە کە قەومەکەی بانگ کرد بۆ لای خوا ، کەچیی ئەوان کوشتیان . لە کاتی سەرەمەرگی‌دا پرسیاریان لە عورروە کرد : ئەی دەربارەی خوێنەکەت ؟ وتی : ڕێزێکە خوای گەورە لێمی گرتووە و شەهیدی‌یەکە بۆی ناردووم .

عوروە زۆر بە وردیی سەرنجی ڕووداوەکانی ئەگرت و ، هەتا زیاتر لێیان ئاگادار ئەبوو ، لە نییەتی پاکی پێغەمبەر و هاوەڵانی و ، هەڵوێستی ڕاستیان ئاگادار ئەبوو. زانیی هەڵوێستیان بە پێچەوانەی پاگاندەکانی قوڕەیشەوەیە و ، ئەیانەوێ بە شێوەیەکی بێ‌زیان عومرە بەجێ بهێنن و ، نیازیان بە دژایەتیی نیە .

هەروەها حولەیسی کوڕی زەببانی سەرداری ئەحابیش ، کە ئەوانیش هاتبوونە کۆمەکیی قوڕەیش ، بۆی دەرکەوت کە موسڵمانەکان بێ‌تاوانن و ، قوڕەیش مافی ئەوەی نیە ڕێ لە هیچ کەسێك بگرێ تا بێتە مەککە و ، حەج و عومرە ئەنجام بدات.

ئەم دوو پیاوە پشتگیری سەرەکیی قوڕەیش بوون و ، قوڕەیش بە درۆ موسڵمانەکانی بە تاوانبار لە قەڵەم دابوو ، بۆیە بە هاتنی بودەیل بۆیان دەرکەوت کە قوڕەیش شەڕ ئەفرۆشێ ، بێ‌ئەوەی هیچیشی لێ بێ . بۆ ئەمە عوروە ڕاستەوخۆ گلەیی لە قوڕەیش کرد و ، ئامۆژگارییشی کردن تا ئەو پێشنیارە ئاشتی‌خوازانەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەربگرن و پەیمانێکی ئاشتی‌یانە ببەستن .

عوروە بە قوڕەیشی وت : ئەی کۆمەڵی قوڕەیش ! ئایا بە تاوان‌کارم ئەزانن ؟ وتیان : نەخێر . وتی : ئایا ئێوە باوك نین و من کوڕ؟ ئەوەبوو ئەهلی عوکاظم هەموو بانگ کرد بۆ کۆمەکییتان ، کە نەهاتن بە دەممەوە ، بە خۆم و منداڵ و کەس و کار و ئەوانەوە کە گوێڕایەڵی‌یان بۆ کردم هاتووین . وتیان : ڕاستە . پاشان تێی گەیاندن کە ئەو پێشنیارەی بودەیل هێنای نەخشەیەکی ژیرانەیە و هەرکەسێ بیداتە دواوە خراپ‌کارە .

پاشان داوای کرد بیکەنە نێرراوی خۆیان تا بچێتە خزمەتی پێغەمبەری خوا و ، ڕاستیی باسەکەیان بۆ وەربگرێ و ، هەموو هەواڵێکی موسڵمانانیان بۆ وەربگرێ .

قوڕەیش ڕەزامەندی‌یان نواند و هات بۆ حودەیبیە و ، پێغەمبەری خوا ﷺ پێشوازیی لێ کرد ، بە هیوای ئەوەی جەنگ و کوشتار دوور بکەوێتەوە .

عوروە کە هاتە حودەیبیە چاك ئەی‌زانیی موسڵمانەکان نییەتیان پاکە و قوڕەیش شەڕ ئەفرۆشێ ، بەڵام وەك ناوبژیکارێکی سیاسیی وای بە چاك ئەزانی کە گلەیی لەسەر قوڕەیشی هاوپەیمانی لابەرێ و ، موسڵمانەکان تاوان‌بار بکات . ئەمە لە لایەکەوە .

لە لایەکی ترەوە وەهای دەرئەبڕیی کە پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکێکی هەرچیی و پەرچیی کۆکردۆتەوە و ، هێناونی کەس و کار و عەشرەتەکەی خۆی پێ‌یان لەناو بەرێت .

لە لایەکی ترەوە باسی هێز و دەسەڵاتی قورەیش و هاوپەیمانانی کرد کە هەتا تاقیان نەبڕێتەوە ڕێگە نادەن موسڵمانەکان بچنە مەککەوە . جا ئەگەر جەنگ ڕوویدات ، یا ئەوەتا موسڵمانەکان تیا ئەچن ، یان ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ کەس وکارەکەی خۆی لەناو ئەبات ، کە لەناو عەرەبدا هیچ کەس کاری وەهای بە قەومی خۆی نەکردووە .

لە لایەکی ترەوە عوروە ویستی دڵی پێغەمبەری خوا ﷺ سارد بکاتەوە ، کە ئەمانەی ئەم پشتیان پێ ئەبەستێ لەوانەیە بلاوەی لێ بکەن و بە تەنها بمێنێتەوە.

لەو کاتەدا کە عوروە ئەم سیاسەتە چەوتەی بەکار ئەهێنا ، ئەبوبەکری صددیق خوا لێی ڕازیی بێ لە دوای پێغەمبەری خواوە ﷺ وەستابوو و ، زۆر بە توندیی لە عوروە تووڕە بوو کە قورەیشی بەهێز لە قەڵەم ئەدا و ، موسڵمانەکانیشی بە ناتەواو ئەخستە پێش چاو . بۆیە لە عوروە تووڕە بوو و قسەشی پێ وت و پرسیی : ئێمە لە دەوری ڕا ئەکەین ؟!

عوروە پرسیی : ئەمە کێیە ، ئەی موحەممەد ؟!

فەرمووی : ئەمە ئەبوبەکری کوڕی ئەبوقوحافەیە .

عوروە ڕووی لە ئەبوبەکر کرد و وتی : بەخوا لەبەر ئەوە نەبوایە کە پیاوەتییەکت بەسەرمەوەیە و هێشتا پاداشتتم نەداوەتەوە ، وەڵامم ئەدایتەوە .[٧٥]

لەم کاتەدا ڕووداوێکی سەیر ڕووی دا .. ڕووداوێك کە دەوری گرنگی ئیسلام دەر ئەخات ، کە تاقانە بەرنامەیەکە بۆ گۆڕینی خراپترین مرۆڤ بۆ مرۆڤێکی چاك ..

لەو کاتەدا کە عوروە وت و وێژی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ئەکرد ، جار و بار ، وەك خۆی بە هاوشانی پێغەمبەر بزانێ ، دەستی بۆ ڕیشی پێغەمبەر ئەبرد و ، یەکێ لە پاسەوانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ کە موغیرەی کوڕی شوعبە[٧٦] بوو و ، برازای

---

[٧٥] عوروە پیاوێکی ناودار بوو و هەمیشە هەوڵی ئەدا ناکۆکیی ناو هۆزەکان نەهێڵێ و خوێنی نێوانیشی ئەبژارد . جارێکیان پارەی خوێنێکی خستە ئەستۆی خۆی و ، داوای کۆمەکیی لە پیاوماقووڵان کرد و ، ئەوانیش دوو سێ ( فەریضە ) یان بۆ دا و ئەبوبەکر بە تەنیا (١٠) فەریضەی بۆ بژارد و ، هێشتا عوروە خۆی بە قەرزاری ئەزانیی .

[٧٦] موغیرەی کوڕی شوعبەی کوڕی ئەبوعامیری کوڕی مەسعوودی ثەقەفیی ، لە سەردەمی نەفامییدا گەنجێکی سەرچڵ و زیانەخرۆ بووە . پیاوێکی باڵا بەرز و کەڵەگەتی ناوشان پان بووە .. یەکێ لە تازایانی دوورگە بووە و ، جەردە و ڕێبڕ بووە . پێش حودەیبیە موسڵمان ئەبێت و یەکەم جار لە حودەیبیەدا بەشداریی ئەکات و ، کۆچ ئەکات .. پەیمانی ( رضوان ) ی ژێر درەختەکەی بەستووە ، موغیرە لەناو عەرەب دا بە زۆرزانیی ناوبانگی دەرکردووە و ، یەکێکیش بووە لە فەرماندەکانی فەتحی ئیسلامیی و ، خەلیفە عومەر کردوویەتیە والیی بەصرە و ، ناوچەی میسان و هەمەذان و چەند وڵاتێکی تری فەتح کردوون . لە سەردەمی

عورووە بوو ، ئەمەی بەلاوە گران بوو ، بێ ئەوەی عورووە بیناسێ ، لە عورووە تووڕە ئەبوو و ، بە دەسکی شمشێرەکەی دەستی عورووەی دوور ئەخستەوە و، ئەیوت : بەر لەوەی تێت بسرەوێنم ، دەستت لە گرتنی ریشی پێغەمبەری خوا دوورخەرەوە ..

عورووە ئەمەی زۆر پێ ناخۆش بوو کە پاسەوانێك بەو شێوە هەڕەشەی لێ بکات ، بۆیە پێی وت : ماڵت کاول بێ ، چەند رەق و زبریت !

پێغەمبەری خواش ﷺ زەردەخەنەی بۆ ئەم هەڵوێستەیان ئەکرد ..

لەبەر ئەوەی کە موغیرە جل و بەرگی جەنگی پۆشیبوو و ، زرێی لەبەر کردبوو عورووەی مامەی نەی‌ئەناسی‌یەوە . بۆیە خەریك بوو لە داخا بتەقێت و پرسیاری کرد : ئەی موحەممەد ! خۆزگە ئەم‌زانیی لەناو هاوەڵەکانتا ئەمە کێیە وا ئازاری دام ، بەخوا وا ئەزانم لەمە نامەردتر و خراپترتان لەناودا نیە .

پێغەمبەری خواش ﷺ زەردەخەنەیەکی کرد و فەرمووی : (( هذا إبن أخيك المغيرة بن شعبة )) . فەرمووی : موغیرەی برازاتە .

---

عومەردا ئامادەی جەنگەکانی وڵاتی فارس بووە و ، یەکێکیش بووە لەو نوێنەرانەی کە سەعدی کوڕی ئەبووەققاص ناردنی بۆ لای فەرمانداەی باڵای فارس تا بانگیان بکەن بۆ سێ شت : یان موسڵمان بوون ، یان جزیە ، یان جەنگ . کە چوونە لای رۆستەم موغیرە بە رمەکەی فەرشەکانی رۆستەمی کون کرد و، بۆ شکاندنی بەزم و باوی نەفامیی چوو لە تەنیشت رۆستەم‌دا لەسەر تەختەکەی دانیشت . کە پاسەوانەکان تووڕە بوون و ، ویستیان بە زۆر لەسەر کورسی‌یەکەی رۆستەم دای‌گرن ، وتی : ئیتر بۆم دەرکەوت کە موڵك و دەسەڵاتتان نامێنێ.. چاك تر وەهابوو ، لە جیاتی ئەمەی کە لەگەڵ من دا کردتان ، بڵێن : هەندێکتان خوای هەندێکی ترتانن . ئێمەی موسڵمانان یەکسانین .. لە صەحیحی بوخاریی‌دا هاتووە کە : موغیرە یەکێ بووە لە راوێژکارانی فەرمانداەی خواناس و بەتەقوای مەزن نوعمانی کوڕی موقەڕڕەن ، کە رزگارکەری نەهاوەند بووە و، ئەو فەتحەش بە (( فتح الفتوح )) ناوی دەرکردووە ، چونکە دوای فەتحی نەهاوەند ئیتر فارسەکان خۆیان بەسەر پێوە نەگرت و ، توانای بەرابەرکێی سوپای ئیسلامیان نەما .. ئەوەبوو تاوانێکیان دایە پاڵ موغیرە و خەلیفە عومەریش لە کاری خست ، بەڵام دوایی کە تاوانەکە بە پێی شەرع ساغ نەبوویەوە لەسەری ، خەلیفە بەو بۆنەوە جەلدی سێ هاوەڵی کرد . عومەر والێتیی ( بەحرێن ) یشی پێ سپارد . موغیرە یەکەم کەس بووە کە بە ناوی ( أميرالمؤمنين ) بانگی لە خەلیفە عومەر کردووە . کە جەنگی خوێناویی نێوان عەلیی و موعاویە بەرپا بوو ، موغیرە لە هەردوولا کەناری گرت و ، پاشان کە ئیمام شەهید کرا و حەسەنیش وازی لە خەلافەت هێنا بۆ موعاویە و ، موسڵمانان بە یەك دەنگیی بەیعەتیان بە موعاویە دا ، ئەویش بەیعەتی پێ دا.. موغیرە بەشداریی جەنگی یەرمووکی بەناوبانگی کردووە و ، لەو جەنگەدا چاوێکی لە دەست داوە . موعاویە والێتیی کووفەی پێ سپاردووە و ، هەتا کە ساڵی ٥٠ ی کۆچیی کۆچی دوایی کردووە ، هەر والیی بووە . موغیرە لەگەڵ ئەبوسوفیان دا ، بۆ رووخاندنی بتی گەورەی ثەقیف ( لات ) ، بەشداریی کردووە.

که زانیی موغیرەیە ئەوەندەی تر تووڕە بوو و ، خەریك بوو وەك فیشەکە شیتە بچێت بە ئاسمان‌دا و ، وتی : هەی غەددار! بەخوا دوێنێ لە عوکاظ غەدرەکەتم شۆردەوە و ، تا ئاخرزەمان ثەقیفت کردووە بە دوژمنمان .[٧٧]

عورووە حەزی ئەکرد قەناعەت بە پێغەمبەری خوا ﷺ بکات تا لە کوێوە هاتوون بە دوای خۆیانا بگەڕێنەوە ، چونکە قورەیش هەرگیز ڕێیان نادات طەواف بکەن . بەڵام هەوڵ و حەزەکانی عورووە سەریان نەگرت ، چونکە پێغەمبەری خوا بە مافی خۆی و هاوەڵانی ئەزانی ، وەك هەموو عەرەبێکی تری دوورگە ، بچنە ناو مەککەوە و ، طەوافی کەعبەی پیرۆز بکەن ، ئەوەندە هەیە پەلە ناکەن و ، زوو دەست بۆ شمشێر نابەن ، بە هیوای ئەوەی کە ژیر و سەلیقەدارەکانی مەککە لەگەڵیانا ڕێك بکەون و ، خوێنی هیچ لایەکیان نەڕژێت .

بەم شێوەیە پێغەمبەر و عورووە ڕێك نەکەوتن . موسڵمانەکان داوای ئەنجامدانی عومرەیان ئەکرد و ، عورووەش داوای گەڕانەوە . بەڵام لە ئەنجامی وتوویژەکان‌دا عورووە لای یەقین بوو کە موسڵمانەکان ڕاست ئەکەن و ، تەنها بۆ خواپەرستیی هاتوون و ، قورەیش بوختانیان بۆ ئەکات کە ئەڵێت بۆ جەنگ هاتوون .

عورووە بە دەستی خاڵیی گەڕایەوە لای قورەیش ، چونکە نەی‌توانیی قەناعەت بە موسڵمانەکان بکات بۆ گەڕانەوە . کە گەڕایەوە دەستی دایە ئامۆژگاریی قورەیش تا خۆیان تووشی نەگبەتیی نەکەن و ، نەچنە مەیدانی جەنگی موسڵمانانەوە ، چونکە بە پێی سەرنج و وردبینی‌یەکانی ئەو تێك شکان بەشیانە و ، موسڵمانەکان ئەوەندە یەك دڵ لێ بڕاون هیچ هێزێك چاریان ناکات و ، تا ئێستە سەربازی وەها دڵسۆزی نەدیوە، کە بە سەروماڵ ئاوەها خۆیان بکەنە قوربانی پێغەمبەرەکەیان و، بە دڵ و بە گیان پارێزگاریی لە دینەکەی بکەن .

عورووە بە سەردارە قورەیشی‌یەکانی وت : ئەی کۆمەڵی قورەیش ! من بە نوێنەریی چوومەتە لای پادشایان .. بۆ لای کیسرا و هیرەقل و نەجاشیی ، بەڵام بەخوا هیچ پادشایەکم نەدیوە لەلایەن دەست و پێوەندیەوە گوێڕایەڵیی بۆ بکرێ ، ئەوەندەی کە

[٧٧] موغیرە لە نەوەی مالیك سیانزە پیاو ئەکوژێت و کەل و پەلەکەیان کۆ ئەکاتەوە و دێت بۆ مەدینە و موسڵمان ئەبێ. بەڵام پێغەمبەری خوا ئەم کارە بە غەدر ئەزانێ و پێنج یەکی کەل و پەلەکە وەرناگرێت ، بەڵام موغیرە موسڵمان ئەبێت و ، بە ماوەیەکی کەم لە جەردە و پیاوکوژێکەوە ئەبێتە خواناسێکی ڕێك و پێك کە ببێتە پاسەوانی پێغەمبەر و لە مامەی تووڕە ببێ .

موحەممەد لەلایەن هاوەڵانیەوە گوێڕایەڵیی بۆ ئەکرێ .. بەخوا لە ئاستیا چاو بەرز ناکەنەوە و ، لە خزمەتیا دەنگ هەڵ نابڕن و ، ئاماژە بۆ هەر کارێك بکا ئەنجام دراوە و . هەر چڵم و بەڵغەمێك فڕێ بدا ئەکەوێتە ناو دەستی پیاوێکیانەوە و ئەیسوێ بە لاشەی خۆیدا و ، کە دەست نوێژیش ئەگرێ هەموو دەورەی لێ ئەدەن بزانن کامیان کارێکی بەر ئەکەوێ . جوان سەرنجی ئەو خەڵکەم داوە و ، چاکیش بزانن ئەگەر شمشێرتان بوێ ئامادەن بێنە مەیدانتان .. من کۆمەڵێکم دیوە بۆ پارێزگاریی گەورەکەیان باکیان نیە هەرچی‌یان بەسەر بێت . بەخوا کۆمەڵە ئافرەتێکم لەگەڵیا دیوە هەرگیز دەست بەرداری نابن و وازی لێ ناهێنن . جا ئێوەش رای خۆتان یەك لایی بکەنەوە . بەڵام نەکەن رای هیچ و پووچ پەسەند بکەن ..

پاشان عوروە ئامۆژگاریی قورەیشی کرد کە با ئەو پێشنیارەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەربگرن و ، جەنگ لە نێوانیاندا نەمێنێ . چونکە تازە قورەیش چاری موسڵمانانی پێ ناکرێ و ، هەموو ئەندامێکی سوپای ئیسلام بەسەر و ماڵیی و فیداکاریی جەنگ ئەکات و ، لە هەمان کاتدا خۆیان بە مەزڵووم ئەزانن و ، بەوپەڕی غیرەتەوە ئەجەنگێن .. ئەوان بە عەقیدەی خۆیان بکوژن و بکوژرێن ، مادام تاوانبار نین ، هەر قازانجیانە .

دیسان دایەوە بە گوێی قورەیشدا و وتی : کابرا هاتووە بۆ رێزلێنان لە ماڵی خوا و، وشترەکانی لەگەڵدایە سەریان ئەبڕێ و ئەگەڕێتە دواوە .

بەمە قورەیش کەمێ نەرم بوون و ، هاتنە سەر ئەوە کە نەڵێن هەرگیز ناهێڵین ، بەڵکو ئەهێڵن ، بەڵام ئابڕوویان نەچێ ، بەوەی کە موسڵمانان ئەمساڵ بگەڕێنەوە و ، ساڵێکی تر بێنەوە و ، طەواف و سەعی بکەن .

بەڵام عوروە بێ‌تاقەت بوو و ، بە خۆی و سوپاکەیەوە قورەیشی بەجێ هێشت و گەڕایەوە بۆ طائیف . ئەوەش بەشی خۆی و کاریگەریی هەبوو بۆ سەر ورەی قورەیش. لەگەڵ ئەوەشدا قورەیش هەر ئەیویست خۆی وەها دەر بخات کە باکی نیە ، بەڵکو موسڵمانەکان بێ‌تاقەت بن و بگەڕێنەوە . بەڵام موسڵمانەکان هەر ئەوەبوو کە پێیان خۆش بوو خوێن نەڕژێ ئەگینا بە ئاسانیی سوپای قورەیشیان تێك ئەشکاند .

کاتێك کە پڕۆژەکەی عوروەی کوڕی مەسعوود سەری نەگرت ، قورەیش هەستان شەیتانێکی فێڵبازی وەك موکەررەزی کوڕی حەفص یان [٧٨] نارد بۆ حودەیبیە ، تا بەڵکو بە هەر فێڵێك بووە کارەکە بە قازانجی قورەیش رێك بخات ، چونکە دواخستنی رێك کەوتن لە بەرژەوەندیی قورەیش نیە ، بە تایبەت دوای کشانەوەی عوروەی ناوبژیوانی دووهەم .

کە ناوبژیوانی سێهەم ، موکەررەز گەیشتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ چارەسەریی کێشەی نێوان موسڵمانەکان و قورەیش ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی پێ کەوت وا هات بەرەو روویان ، فەرمووی : (( هذا رجل غادر )) . لەگەڵ ئەوەشدا لەگەڵیا دانیشت و ، نەیگێڕایە دواوە ، هەرچەندە ئەیزانیی کە ئەمە جێی بڕوا و متمانە نیە .

موکەررەز ئەیویست بە زمانی قورەیشەوە بگەیەنێ کە با لە کوێوە هاتوون بگەڕێنەوە ، چونکە قورەیش ناهێڵێت بچنە مەککەوە . پێغەمبەریش ﷺ هەر یەك وەڵامی لا بوو . هەر ئەو وەڵامە بوو کە بە بودەیل و عوروەدا بۆ قورەیشی نارد : موسڵمانەکان بۆ جەنگ نەهاتوون ، بەڵکو بۆ سەردانی کەعبە هاتوون ، بەڵام ئامادەشن هەرکەس رێیان لێ بگرێ بچن بە گژیدا ..

دوای ئەوە قورەیش هانایان بردە لای حولەیسی کوڕی زەببانی سەرۆکی ئەحابیش و، گەورەترین هاوپەیمانی قورەیش ، تا بەڵکو ئەو ببێتە ناوبژیوانی چوارەم و ئەم ناکۆکی‌یە حەل بکات .

حولەیس پیاوێکی ژیر و دووربین بوو .. گەورەیەکی وتە بیستراو بوو .. پێغەمبەری خواش ﷺ چاك ئەی‌ناسیی کە چەندە قەدر و حورمەتی ماڵی خوای لە دڵ دایە . قورەیشیش پێیان خۆش بوو ئەم پیاوە لە قوڕاودا دەریان بهێنێ .. کەچیی کارەکە بە پێچەوانەی ئاوات و خواستی قورەیش دەرچوو .. ئەم سەردانەی حولەیس بووە مایەی قازانج بۆ سوپای ئیسلام ..

جا قورەیش بە پاگاندە و درۆ و دەلەسە قەناعەتی بەم پیاوە کردبوو کە موسڵمانەکان شەڕ ئەگێڕن و ، بۆ هەتکی حورمەتی ماڵی خوا هاتوون .. کە حولەیس

---

[٧٨] موکەررەز قورەیشی‌یە لە نەوەی عامیری کوڕی لوئەی . هەندێك ئەڵێن موسڵمان بووە و هەندێکیش ئەڵێن نەبووە. لە دوای بەدر دێتە مەدینە و فیدیە بۆ سوهەیلی کوڕی عەمر ئەدات ، دوای ئەوەی کە بە دیلیی کەوتبووە دەست موسڵمانەکان .

چوو بۆ ناو سوپای موسڵمانان ، موسڵمانەکانی بە کۆمەڵێك جەردەی شەڕانیی ئەزانیی ، چونکە قورەیش پاگاندەیەکی زۆری دابوو بە گوێیدا ..

کە لە دوورەوە دەرکەوت و رووە و موسڵمانەکان هات ، پێغەمبەری خوا ﷺ بە هاوەڵەکانی فەرموو : (( إن هذا من قوم يتألهون ، و يعظمون الإله ، ابعثوا الهَدْيَ في وجهه حتى يراه )) . فەرمووی : ئەم پیاوە لە کۆمەڵێكدایە کە خواپەرستیی ئەکەن و، خوا بە گەورە ئەزانن . وشترەکانی ( هەدی ) بەرنە بەردەمی تا بیان بینێ . موسڵمانەکانیش وەهایان کرد .

کە حولەیس چاوی بە وشترەکان کەوت لە شیوەکەدا و ، کە چاوی بە موسڵمانەکانیش کەوت پێشوازییان لێ کرد و خەریکی تەلیبە بوون و ، لەبەر ئەوەی ماوەیەکی زۆریش بە ئیحرامەوە مابوونەوە دژرا بوون ، کردەوە زاڵمانەکەی قورەیشی دایە دواوە و ، هاواری کرد : پاك و بێگەردیی بۆ خوا ، ناگونجێ ئەمانە بۆ زیارەتی ماڵی خوا رێیان لێ بگیرێ . خوای گەورە رازیی نابێ رێ لە حەجی لەخم و جوذام و نەهەد بگیرێ ، ئێستە قەدەغەی کوڕی عەبدولموطەللیب بکرێ ؟؟

زیاتر ناڕەزایی لە قورەیش دەربڕیی و وتی : بە پەروەردگاری کەعبە ، قورەیش تیاچووە .. ئەمانە بۆ عومرە هاتوون .

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی : (( أجل يا أخا بني كنانة )) .

ئیتر سەرداری نەوەی کینانە ، واتە حولەیس ، هیچ باس و راوێژێکی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ نەکرد ، بەڵکو هەر بە بینینی دیمەنی موسڵمانەکان قەناعەتی کرد کە قورەیش ستەمکارە و ستەم لە موسڵمانەکان ئەکات ، بۆیە بە دوای خۆیدا گەڕایەوە و ، بە قورەیشی راگەیاند کە نابێ رێ لەو موسڵمانانە بگیرێ کە بۆ رێزلێنانی کەعبە هاتوون و ، ئەمانیش لە سەر ستەم و جەور پەیمانیان لەگەڵ قورەیشدا نەبەستووە ..

قورەیش ئەو راستگۆیییەیان پێ ناخۆش بوو و ، وتیان : دانیشە ، تۆ ئەعرابییت، هیچ نازانی .

حولەیس تووڕە بوو و ، دەستی دایە هەڕەشەی ئەوە کە ئەگەر قورەیش دەست لە ستەم و جەور هەڵ نەگرێ و ، رێ بە موسڵمانان نەدا وەك هەموو عەرەب طەوافی کەعبە بکەن ئەو پەیمانەی نێوانیان هەڵ ئەوەشێنێتەوە و پاڵ ئەدات بە حەقەوە.

بەم هەڕەشەیەی حولەیس کافرانی مەککە راچڵەکین و ترسیان لێ نیشت ، چونکە جیابوونەوەی ئەحابیش زیانی گەورەی لە قورەیش ئەدا و پشتی ئەشکاندن . لەبەر ئەوەی کە ئەحابییش لەم هۆزە بەهێزانە پێك هاتبوون : ئەوەی هەونی کوڕی خوزەیمە و، ئەوەی حەرثی کوڕی عەبدمەنافی کوڕی کینانە و ، ئەوەی موصطەلەقی کوڕی خوزەیمە . جا پەیمان شکاندنی ئەمانە پشتی قورەیشی ئەشکاند ، بۆیە قورەیش کەوتنە خۆیان و ، بۆیان دەرکەوت کە کاری هەرزەکانیان کارێکی ناشیرینی لێ دەرچوو و ، سەری قورەیشی پێ شۆڕ ئەبێت ، چونکە بۆ هەموو لایەك دەرکەوت کە موسڵمانەکان ئاشتیی‌خوازن . بۆ ئەمە کەوتنە لاواندنی حولەیس تا ماوەیەك مۆڵەتیان بدات بۆ ئەوەی چارەی هەڵوێستەکە بکەن کە بریتی‌یە لە رێككەوتن لەگەڵ موسڵمانەکان .

حولەیسیش کە بۆی دەرکەوت قسەکانی کاریگەریی لەسەر هەڵوێستی قورەیش هەیە ، دانی بە خۆیدا گرت ، تا ئەوەبوو لەناو قورەیشیش‌دا دەنگی نارەزایی بەرز بوویەوە ، کە لە پێناوی چیی‌دا ژیان و گوزەرانیان بخەنە مەترسی‌یەوە ؟ خۆ موسڵمانەکان بۆ رێزگرتن لە کەعبە هاتوون ، ئیتر جەنگ و هەرای بۆ چی‌یە ؟

لە لایەکی ترەوە ئەم کارە لەسەر قورەیش زۆر ئەکەوت : تا دوێنێ چەند هەژار و دەست‌کورتێکی لە مەککەدا دەرپەڕاند و ، بە چ حاڵێك ئەو موسڵمانە بێ‌کەسانە خۆیان گەیاندە مەدینە ، کەچیی وا ئێستا بوونەتە سوپایەکی وەها بەهێز کە هیچ حیسابێك بۆ چەك‌بەدەستانی دوورگە ناکەن .. ئەمە دوارۆژی دەسەڵاتی قورەیش ئەخاتە مەترسی‌یەوە .. رۆژێك دێت سوپای ئیسلام ببێتە خاوەنی دەسەڵات و ئەو چاودێریی کەعبە بکات .. کەواتە رەنجی قورەیش بە فیڕۆ رۆیشت .. نەك هەر رەنجی ئەوان ، بەڵکو رەنجی هەموو ستەم‌کارێك ، کە دژی دینی خوا ئەوەستێ ، بە فیڕۆ ئەڕوا ..

بەم بۆنەوە قورەیش گیریان خواردبوو ..

لە لایەکەوە ئەگەر رێ بە موسڵمانان ئەدەن طەواف و سەعی بکەن ، ئەوا دەسەڵاتی قورەیش لە کزیوون‌دا ئەبێت و ، بەرە بەرە موسڵمانان بەرەکە لە ژێریان دەرئەهێنن . لە لایەکی ترەوە ئەگەر ناهێڵن بچنە مەککەوە ، ئەوا جەنگ بەرپا ئەبێ و ، قورەیشیش لای یەقینە کە چاری سوپای رێك و پێکی ئیسلام ناکات ، لە کاتێك دا کە ئەو سوپایە خۆی لەسەر حەق حیساب بکا و ، قورەیشیش بە ستەم‌کار بزانێ .

ئیتر با هەڵوێستی حولەیس لەولاوە بوەستێ کە بەرگریی لـە هەڵوێستی موسـڵمانان ئەکات و ، هەڕەشەی ئەوەش ئەکات کە ئەگەر قورەیش جەنگ بکات ، ئـەو ئامـادە نیە دەستی بەر خوێنی بە ناڕەوا ڕژراو بکەوێت . هەروەها بـودەیلی کـوڕی وەرقـائی سەرۆکی خوزاعـە و ، عـورووەی کـوڕی مەسـعوودی سـەرۆکی ثـەقیـفـیـش دەنگـی ناڕەزاییی‌یان لێ بەرز بوویەوە .

هەرچەندە ، وەك لە پێشەوە باس کرا ، قورەیش لە لیتـەی نـەزان‌کـاریی خـۆیدا چەقیی بوو ، کەچیی هـەرزە و نەفامـەکانی پەلـەیان بـوو جـەنگ و کوشـتار هـەڵ بگیرسێ. حەزیان ئەکرد خوێن بڕژێ .. بەڵام موسڵمانەکان بە جـوانیی پارێزگاریـیـان لە هەڵوێستی خۆیان ئەکرد .

قورەیش جڵەوی بۆ هەرزەکانی شل کردبوو .. ئەوانیش هەردەم لـە شـەڕ فرۆشتن‌دا بوون . ئەوەبوو شەوێکیان بە چەند کۆمەڵێك ، حەفتا ئەسپ سواریان هێرشیان کـردە سەر ئۆردوگای موسڵمانان بەو هیوایەوە دەست لە موسڵمانەکان بوەشێنن ، ئـیتر سـا بە دیل‌گرتن بێ یان کوشتن .. سەرەتا ئەو ئەسپ سوارانە هێرشیان کردبووە سەر چەند موسڵمانێکی بێ‌چەك و بە دیل‌گرتبوونیان ، بەڵام دەوریەی موسڵمانان توانی‌یـان ئـەو دیلانە ڕزگار بکەن و ، هێرش‌بەرەکانیش دەستە لە دوای دەستە بە دیل بگرن ، هـەتا ژمارەیان ئەگاتە حەفتا ئەسپ سوار و ، قۆڵ بەستیان ئەکەن و ، ئەیان‌هێننە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ . بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ چاوپۆشی‌یان لێ ئەکات و ، فەرمان ئەدا کە بەریان بدەن . سەرەڕای ئەم چاکەیە ، قورەیش پیاوێکی موسڵمان ئـەکوژن ، هەر بۆ ئەوەی موسڵمانەکان تووڕە بن و جەنگ بەرپا ببێ ، کەچیی پێغەمبەری خـوا ﷺ بە حەکیمانە ئەوەشی چارەسەر کرد و ، نەی‌هێشت جەنگ بەرپا ببێ .

هـەتا طـبـەریی وەهـای بـاس کـردووە کـە دوای شـەهیدکردنی ئـەو موسـڵمانە پێغەمبەری خوا ﷺ چەند ئەسپ سوارێك ئەنێرێ و ، ئەوانیش دوانزە سـواری کـافری بۆ ئەگرن . پێغەمبەری خوا ﷺ پێ‌یان ئەفەرموێ : (( هل لكم عليّ عهـد ؟ هـل لكـم عليّ ذمة ؟ )) ئەفەرموێ : هیچ پـەیمان و پەنایـەکتان بـە لامـەوە هەیـە ؟ ئـەڵێن : نەخێر. لەگەڵ ئەوەش‌دا بەریان ئەدا و نایان‌کوژێ .

**نۆهەم : ناردنی عوثمان بۆ مەککە**

لە پێشەوە باسمان کرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ خیراشی کوڕی ئومەییەی کەعبیی ، بە شێوەی نوێنەری تایبەتیی خۆی نارد بۆ لای قورەیش تا نییەتی ئاشـتی خوازانـەی

موسڵمانانیان پێ بگەیەنێ ، کەچیی نەك هەر قسەیان لێ وەرنەگرت ، بەڵکو نەفامەکانیان ویستیان خیراشیش بکوژن . جا کە گەڕایەوە داوای کرد یەکێکی تر بۆ ئەم کارە بچێتە لای قورەیش کە کەس و کاری زیاتری لە مەککەدا بێ ، تا بیپارێزن.

بۆ ئەمە پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی عومەری کوڕی خەططاب بنێرێ بۆ تێ گەیاندنی قورەیش کە موسڵمانەکان جەنگیان ناوێ . بەڵام عومەر عوزری هێنایەوە کە ئەو بەلای قورەیشەوە زۆر تاوانبارە و ، کەس وکارێکی وەهاشی لەوێ نیە بیپارێزن . پاشان ئاماژەی کرد بۆ عوثمانی کوڕی عەففان ، چونکە ئەو لە تیرەی عەبدشەمسی کوڕی عەبدمەناف بوو.

پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەکەی عومەری بە دڵ بوو و ، ناردی بە دوای عوثمان دا و پێی فەرموو : « إذهب إلى قريش فأخبرهم أنا لم نأت لقتال أحد ، وإنما جئنا زواراً لهذا البيت معظمين حرمته ، معنا الهدْي ننحره وننصرف » . فەرمانی پیا دا تا بچێ بۆ لای قورەیش و هەواڵیان بداتێ کە موسڵمانەکان نەهاتوون لەگەڵ هیچ کەسێکدا بجەنگن ، بەڵکو بۆ زیارەتی ماڵی خوا و ڕێزلێگرتنی هاتوون . وشترەکانیان سەرئەبڕن و، ئەگەڕێنەوە ..

عوثمانیش ، هەرچەندە بارودۆخەکە زۆر نالەبار بوو ، فەرمانی پێغەمبەری خوای ﷺ خستە سەر چاوانی و ، خۆی و گەیاندە بەلدەحی مۆڵگای قورەیش .

ئەوەی عومەر بیری لێ ئەکردەوە ڕاست بوو ، کە قورەیش عەیبە و تاوان نافامن و، هەر موسڵمانێکیان دەست بکەوێ چاوپۆشیی لێ ناکەن ، ئەگەرچیی لە پەنای کەعبەشدا بێت .

ئەوەبوو عوثمان سنووری حەرەمی بڕیی و ، چووە سنووری دەسەڵاتی قورەیشەوە ، بێباك لەوەی کە چیی دێتە ڕێی . کە نزیك کەوتەوە خەریك بوو بت پەرستان بیکوژن. ئەوەبوو لە قەراغ مۆڵگای قورەیشدا عوثمان تووشی کۆمەڵێك چەکداری قورەیش بوو و ، کە ناسییان هەوڵیان دا بیکوژن ، بەڵام خزمێکی عوثمان ، کە ناوی ئەبانی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص [٧٩] بوو ، تووشی بوو و ، پەنای دا و ، نەیهێشت

---

[٧٩] ئەبان کوڕی سەعیدی کوڕی عاصی کوڕی ئومەییەی کوڕی عەبدشەمسی کوڕی عەبدمەنافی قورەیشیە، واتە ئومەییە ئامۆزای عەبدولموطەللیبە . خۆیشی و باوکیشی لە گەورە و ناودارانی قورەیش بوون . کاتێك کە تووشی عوثمانی ئامۆزای بوو خستیە پەنای خۆیەوە و بۆ دڵ نەواییشی شیعرێکی لەو بارەوە وت . ئەبان چەند کوڕێکی بەڕێزی هەبوون ، کە خوای گەورە پێش باوکیان هیدایەتی دوانیانی دابوو بۆ سەر ئیسلام کە ئەو دوانەش خالید و عەمر بوون و، لەو موسڵمانە پێشینانە بوون کە کۆچیان بۆ حەبەشە کرد . بەڵام ئەبان خۆی

بی‌کوژن ، کە وتی : ئەی کۆمەڵی قورەیش ! عوثمانی کوڕی عەففان وا لە پەنای مندا و ، کەس دەستی بۆ نەبات.

ئەم پەنادانە یاسایەکی زۆر پیرۆز بوو بە لای هەموو هۆزەکانەوە ، ئەگەرچیی نەنووسرابوو ، بەڵام هەر ئەندامێکی هەر هۆزێك پەنای هەرکەسی بدایە ، ئەوا هۆزەکەی ئەچووە ژێر زامنیی پاراستنی ئەو کەسە و ، هەرکەسیش ئەو یاسایەی پێ‌شێل بکردایە ، تووشی بەڵا و نەگبەتیی ئەهات .. کە ئەبانیش پەنای عوثمانی دا، واتە تیرەی عەبدشەمس هەر هەمووی پەنای داوە و ، ئەو تیرەیەش کێشی تایبەتیی خۆی هەبوو .

دوای ئەوە عوثمان خوا لێی ڕازیی بێ لە شیوی بەلدەح لە ئۆردوگای قورەیش‌دا چاوی بە گەورە پیاوانی قورەیش کەوت تا سپاردەکەی پێغەمبەری خوایان ﷺ پێ بگەیەنێ ، کە بریتیی بوو لە وەرگرتنی یەکێ لە دوو کار :

یان موسڵمان بن ، یان لەگەڵ موسڵمانەکان‌دا پەیمانی ئاشتیی ببەستن و ، واز لە پێغەمبەر و عەرەبەکانی تر بهێنن ، بەو مەرجەی موسڵمانەکان لەگەڵ هەر هۆز و سوپایەکی تری عەرەب‌دا ناکۆك بن ، قورەیش بێ‌لایەن بێ . هەروەها ئەوەش ڕابگەیەنێ کە ئەمان بۆ جەنگ نەهاتوون و ، هەر کە عومرەیان تەواو کرد ئەگەڕێنەوە بۆ مەدینە .

بەڵام قورەیش هەر وەڵامی جارانیان ئەزانی و ئەیانوت : هەرگیز ناهێڵین بێتە مەککەوە.

دوای ئەم ڕوون‌کردنەوەیە عوثمان وەهای بە چاك زانیی کە سەرێکیش لە مەککە بدا بۆ بینینی ئەو سەرۆکانەی کە لە مەککەدا بوون . جا بۆ ئەوەی هیچ کەس دەست بۆ عوثمان درێژ نەکات ، ئەبان وای بە چاك زانیی خۆی لەگەڵیا بێت . بۆ ئەمە ئەسپەکەی هێنا و عوثمانی لە پاشکۆی خۆی‌دا سوار کرد . کە قورەیش عوثمانیان

---

پێش فەتحی مەککە کۆچی بۆ مەدینە کردووە و ، لە کاتی جەنگی خەیبەردا موسڵمان بووە و ، بەشداریی خەیبەری لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ کردووە و ، کراوەتە فەرماندەی یەکێ لە سریەکان . ئەبان لەگەڵ قورەیش دا بەشداریی بەدری دژی موسڵمانەکان کردووە و ، لەو جەنگەدا دوو برای بە کافریی کوژراون کە ناویان عاص و عوبەیدە بووە . پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبانی کردۆتە والیی بەحرەین و تا کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا هەر لەوێ والیی بووە . ئەبان بەشداریی جەنگە جیهادیەکانی شامی کردووە و ، لەوە ئەچێ لە جەنگی ئەجنادین لە فەلەسطین لە ساڵی سیانزەهەمی کۆچیی‌دا شەهید بووبێ .

بینیی ، زۆریان پیّ خۆش بوو گەورە هاوەڵیّکی پیّغەمبەر بکوژن ، بەلاّم کە لە پاشکۆی ئەباندا بوو ، واتە وا لە پەنایدا ..

ئەبان لە مەککەدا سەربەستیی تەواوی بە عوثمان دا ، کە چەند لەویّ ئەمیّنیّتەوە یان بۆ کویّ ئەچیّ ، یان سەر لە چ سەرداریّك ئەدات .

جا لەبەر ئەوەی کە ئەبوسوفیان سەرداری تیرەی عەبدشەمس و ، سەرۆکی گەورەی هەموو قورەیش بوو ، ئەبان راستەوخۆ لەویّوە عوثمانی برد بۆ ماڵی ئەبوسوفیان .

ئەو سەرۆکانەی کە لە بەلدەح ئامادە نەبوون ، وەك ئەبوسوفیان و ، صەفوانی کوڕی ئومەییە ، عوثمان لە مەککە چاوی پیّ کەوتن و ، نامەکەی پیّغەمبەری خوای ﷺ پیّ راگەیاندن ، کەچیی ئەوانیش هەر هەمان وەلاّمیان لابوو !!

لەبەر ئەوەی کە عوثمان میوانی نەوەی ئومەییە بوو ، هیچ کەسیّك نەیئەویّرا دەستی بۆ بەریّ ، بگرە داوایان لیّ کرد کە طەوافی کەعبە بکات ، بەلاّم عوثمان فەرمووی : هەتا پیّغەمبەری خوا ﷺ طەواف نەکات منیش طەواف ناکەم .

لە حودەیبیە لەناو موسڵمانەکاندا دەنگ و باسی ئەوە بلاّو بوویەوە کە عوثمان طەوافی کردووە . بەلاّم پیّغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( ما أظن عثمان يطوف بالبيت ونحن محصورون )) . فەرمووی : پیّ نازانم لە کاتیّکدا کە ئیّمە ئابلووقە دراین و عوثمان بچیّ طەواف بکات . وتیان : ئەی پیّغەمبەری خوا ! ئەو کە گەیشتبیّتە ماڵی خوا چیی ریّی لیّ ئەگریّ ؟ فەرمووی : (( ظني بە ألا يطوف حتى نطوف )) . فەرمووی : من وا پیّ ئەزانم تا ئیّمە طەواف نەکەین ئەو طەواف ناکات .

پاشان کە گەڕایەوە گلەیی لە موسڵمانەکان کرد کە بەو شیّوە ظەنیان پیّ بردووە و، فەرمووی : ئەگەر ساڵیّك لە مەککەدا بوومایە و پیّغەمبەر ﷺ لە حودەیبیەدا بوایە طەوافم نەئەکرد .. قورەیشیش داوایان لیّ کردم تا طەواف بکەم ، بەلاّم بە گوێم نەکردن .

لەو ماوەیەدا عوثمان خوا لیّی رازیی بیّ کە لە مەککەدا بوو ، سەردانی موسڵمانە بیّدەسەلاّتەکانی مەککەی کرد و ، چاوی بە ژن و پیاویان کەوت و مژدەی پیّ دان کە بەم نزیکانە لە ژیّر چەپۆکیی رزگاریان ئەبیّ و ، ئەمەش بەڵیّنی پیّغەمبەری خوایە ﷺ. موسڵمانەکان ، چ ژن و چ پیاو، کە ئەم مژدەیەیان ئەبیست لە خۆشیانا دەستیان بە گریان ئەکرد و ، خەریك بوو گیانیان دەرچیّ . ئەو موسڵمانە بیّدەسەلاّتانە بە

عوثمان‌دا سەلامیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ نارد و وتیشیان : ئەو خوایەی ئەوی هێناوەتە حودەیبیە ، ئەتوانێ بی‌هێنێتە مەککەیشەوە .

**دەهەم : بەیعەتی مردن**

موسڵمانەکان بۆ ماوەی بیست رۆژێك لە دەشتی حودەیبیەدا مانەوە و ، قورەیش نەی‌ئەهێشت بچنە مەککەوە . لەو ماوەیەدا موسڵمانەکان لە ئیحرام‌دا بوون ، بۆیە نە نینۆکیان ئەبڕیی و ، نە قژیان کورت ئەکردەوە و ، نە بۆن خۆشی‌یان لە خۆیان ئەدا و ، نە نزیکی خێزانیان ئەکەوتنەوە .. هەر هەموویان دژرابوون . ئەوەی کە زۆر ناڕەحەتی ئەکردن ئەوەبوو هیچ هیوایەك و دڵخۆشی‌یەك لە قورەیشەوە بەدیی نەئەکرا.. بۆیە موسڵمانەکان هاتنە سەر ئەو رایە کە بە زۆری شمشێر خۆیان بگەیەننە کەعبە و ، هەر کەس بێتە ڕێیان لێی بدەن ، چونکە موسڵمانەکان قەناعەتیان بە هەموو لایەك کرد کە ئاشتیی‌خوازن و ، تەنها زیارەتی کەعبەیان مەبەستە و ، قورەیش شەڕ ئەفرۆشێ .. بەڵام تاقە شتێك موسڵمانەکانی لە هێرش‌کردنە سەر مەککە قەدەغە ئەکرد ، ئەویش حەزکردنی پێغەمبەری خوا بوو ﷺ تا جەنگ روو نەدات ..

بەڵام لە ناکاو ڕووداوێکی سەیر هاتە بەردەم موسڵمانەکان . هەرچەندە بیست رۆژێك ئەبێت بەرامبەر بە کارە هەرزەیی‌یەکانی قورەیش دانیان بە خۆیان‌دا ئەگرت ، بەڵام ئەو ڕووداوە بووە مایەی بەسەرچوونی ماوەی ئارام و دان بە خۆداگرتن و ، خۆ ئامادەکردن بۆ جەنگ . ئەوەبوو لە لایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ بڕیاری هێرش‌کردنە سەر قورەیش دەرچوو .. ترس و لەرز رووی کردە سەردارانی مەککە و لە قسەی زل و وتەی نابەجێ کەوتن .. لە لایەن سەرکردەی موسڵمانانەوە فەرمان بۆ هەموو سەربازانی ئیسلام دەرچوو کە خۆیان ئامادەی جەنگ بکەن .

کە ئەم هەواڵە گەیشتە قورەیش ، ئیتر ئەوان کەوتنە پاڕانەوە بۆ ڕێك‌کەوتن و ، دەست لە جەنگ هەڵگرتن ..

ئەی ئەو ڕووداوە چیی بوو کە هەڵوێستی موسڵمانەکانی لە ئارامەوە گۆڕیی بۆ بڕیاری جەنگ ؟

کاتێك کە عوثمان لە مەککە بوو ، هەواڵ گەیشتە پێغەمبەری خوا ﷺ کە قورەیش دەستیان لە عوثمانی کوڕی عەففان و ئەو دە هاوەڵەش کە لەگەڵیا چوون بۆ

مەککە ، وەشاندووە و ، هەر هەموویان کوشتوون .[٨٠] کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی عوسمان و هاوەڵانی بیست ، چاری نەما ، بڕیاری دا سوپای ئیسلام هەر هەمووی خۆی ئامادەی جەنگ و هێرش بکات . بۆ ئەمە موسڵمانانی بانگ کرد بۆ بەیعەت دان لەسەر مردن ، ئەمەش بە فەرمانی ئاسمان ..

هەزار و چوارصەد هاوەڵ ، هەر هەموویان بە پەلە چوون بە دەم فەرمانەکەی پێغەمبەری خواوە و ، لە ژێر درەختەکەی حودەیبییەدا بەیعەتیان پێ دا و ، خوای گەورەش ، بۆ ستایش و ڕێزی ئەو کارەیان ، بە وەحیی ڕەزامەندیی خۆی لەو هاوەڵانە دەربڕیی و هێمنیی ئاسایشی بەسەر دڵیاندا داباراند کە ئەفەرموێ :

﴿لَّقَدْ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا﴾ (الفتح : ١٨) .

ئەم بەیعەتە لە مێژوودا بەناوبانگە و بە بەیعەتی ( رضوان ) ناوی دەرکردووە..

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ئەگێڕێتەوە کە وتوویە : بەیعەتمان بە پێغەمبەری خوا ﷺ دا و ، عومەریش لە ژێر درەختەکەدا ، کە درەختی سەمورە بوو ، دەستی بە دەستییەوە گرتبوو و ، جگە لە جەددی کوڕی قەیسی ئەنصاریی کە لە ژێر سکی وشترەکەیدا خۆی حەشار دابوو هەر هەموومان بەیعەتمان پێ دا ..

ئوم عومارە باسێکی ئەو ڕۆژەمان بۆ ئەکات و ئەڵێت : نێرراوان لە نێوان پێغەمبەری خوا ﷺ و قورەیشدا هاتوچۆیان بوو .. ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هێنا بۆ مەنزڵەکەمان ، کە وام زانیی شتێکی پێویستە . ئەبینم ئەوەی پێ گەیشتووە کە عوسمانی کوڕی عەففان کوژراوە . ئەوەبوو لە شوێنەکەماندا دانیشت و، پاشان فەرمووی : خوای گەورە فەرمانی پێ داوم بەیعەت بکەم . ئەڵێت : خەڵکەکە هاتن لە شوێنەکەی ئێمەدا دەستیان کرد بە بەیعەت پێدانی ، هەتا خەڵکەکە نیشتنە مل کەل و پەلەکەمان و هەمووی شێلرا . ئەو ڕۆژە پێغەمبەری خوا ﷺ بەیعەتی لە خەڵکەکە وەرگرت . ئەڵێت : سەیری موسڵمانەکانم ئەکرد چۆن چەکیان پۆشیی بوو ،

---

[٨٠] واقیدیی ئەوەی باس کردووە کە لەگەڵ عوسمان دا دە هاوەڵی تریش چوون بۆ مەککە بۆ سەردانی خزم و کەسیان، کە ئەو دە کەسە ئەمانە بوون : کەرزی کوڕی جابیری فیهریی و ، عەبدوڵڵای کوڕی سوهەیلی کوڕی عەمر و ، عەییاشی کوڕی ئەبوڕەبیعە و ، هیشامی کوڕی عاصی کوڕی وائیل و ، حاطبی کوڕی ئەبوبەلتەعە و ، ئەبوحاطبی کوڕی عەمری کوڕی عەبدشەمس و ، عەبدوڵڵای کوڕی حوذافە و ، ئەبوڕوومی کوڕی عومەیر و ، عومەیری کوڕی وەهبی جومەحیی و ، عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوئومەییەی کوڕی وەهب . ( المغازي : ٢ / ٦٠٣ ) .

هەر چەندە چەکی کەممان پێ بوو ، چونکە ئێمە بۆ عومرە هاتبووین . سەیری غوزەییەی کوڕی عەمریشم ( واتە مێردەکەی ) ئەکرد کە شمشێرەکەی لە کێلان دەرهێنابوو . منیش هەستام و ئەو کۆڵەکەیەی کە بۆ سێبەر بە کارمان ئەهێنا گرتمە دەست و ، چەقۆیەکیشم لابوو بەستم بە قەدمدا و وتم : هەرکەس لێم نزیك ببێتەوە بە هیوام بی‌کوژم .

ئەوەبوو ئەو ڕۆژە پێغەمبەری خوا ﷺ بەیعەتی لە خەڵکەکە وەرئەگرت و ، عومەریش دەستی گرتبوو ، بەیعەتی لەسەر ئەوە لێ وەرئەگرتن کە پشت هەڵ نەکەن.. هەندێکیش وتوویانە : بەیعەتی لەسەر مردن لێ وەرئەگرتن .

وتراویشە کە : یەکەم کەسێك کە بەیعەتی کردبێ سینانی کوڕی ئەبوسینانی کوڕی میحصەن بووە ، کە برازای عوکاشە بووە . سینان وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! لەسەر ئەوەی کە وا لە دڵتدا بەیعەتت پێ ئەدەم . ئیتر ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر بەیعەتی سینانی کوڕی ئەبوسینان بەیعەتی لە خەڵکیی وەرئەگرت ..

جا لەبەر ئەوەی کە عوثمان لەوێ ئامادە نەبوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی لە جیاتی ئەو بەیعەتی دا ، بەوەی کە بە دەستێکی دای لە دەستەکەی تری .

ئیبن بورهانوددین وتوویە : کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە بریی عوثمان بەیعەتی کرد ، فەرمووی : (( أللهم ! إن عثمان ذهب في حاجة الله وحاجة رسوله ، فأنا أبايع عنه )) . فەرمووی : خوایە ! عوثمان بە دوای کاری خوا و کاری پێغەمبەرەکەی‌دا چووە ، وا من لە بریی ئەو بەیعەت ئەدەم . ئەوەبوو دەستی ڕاستی کێشا بە دەستی چەپی خۆی‌دا .. کاتێکیش کە عوثمان لەلای قوڕەیش گەڕایەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ هێنای بۆ لای درەختەکە و ، لە ژێریا بەیعەتی لەویش وەرگرت .

**یانزەهەم : قوڕەیش نوێنەر ئەنێرن**

کە بارودۆخەکە هەروا مایەوە ، قوڕەیش وای بە چاك زانیی چەند سەردارێکی قوڕەیشیی ، بە ناوی وت و وێژەوە ، بنێرێتە ئۆردوگای موسڵمانان تا بە وردیی سەرنجی حاڵی موسڵمانان بدەن و ، بزانن ورە و لێ‌هاتنیان لە چ ئاستێك‌دایە ، تا بەو پێیە بڕیارێکی یەکجاریی بۆ ئەم قەیرانە بدەن .

ئەو سەردارانەی کە قورەیش ناردنی یەکێکیان سوهەیلی کوڕی عەمر و یەکێکی تریشیان حوەیطبی کوڕی عەبدولعوززا بوو ،[٨١] لەگەڵ چەند سەردارێکی تردا .. ئەمانە هاتن بۆ حودەیبییە بۆ ناو موسڵمانەکان .. لەوێ چاك لە وەرەی بەرزی موسڵمانەکان و ، ئامادەبوونیان بۆ جەنگێك کە قورەیش بەستوویەتی بە کۆڵیا و کۆڵی لێ نادا ، ئاگادار بوون .. خۆشیی لەوەدا بوو ئەم سەردارە قورەیشیی‌یانە کاتێك گەیشتنە حودەیبییە موسڵمانەکان خەریکی بەیعەت‌دان بوون بە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر بەخت‌کردنی سەروماڵ ..

سوهەیل و هاوەڵانی بە چاوی خۆیان غیرەتیان ئەبینی .. فیداکاریی و خزمەتی عەقیدەیان ئەبینی .. کۆمەڵێك سەربازی هەڵ بژاردەی پەروەردەکراویان ئەبینی ، کە قورەیش پیاوی وەها شك نابات بتوانێ لەبەردەم ئەو پاڵەوانانەدا خۆی بگرێ ..

سوهەیل و هاوەڵانی بە چاوی خۆیان پێشبڕکێی موسڵمانانیان دیی کە چۆن بۆ مردن بەیعەتیان ئەدا و ، گەڕانەوە بۆ لای قورەیش و ، تێیان گەیاندن کە مەککە توانای جەنگی سوپای ئیسلامی نیە و ، ئەدۆڕێ .. چونکە هاوەڵان بۆ پاراستنی عەقیدە گیانیان خستۆتە سەر لەپی دەستیان ..

کە سەردارانی قورەیش ئەمەیان بۆ دەرکەوت ، قەناعەتیان کرد کە پێویستە واز لە جەنگ بهێنن و لەگەڵ موسڵمانەکان رێك بکەون . بۆ ئەمە سوهەیلی کوڕی عەمر و، حوەیطبی کوڕی عەبدولعوززا و ، میکرەزی کوڕی حەفصیان ناردن بۆ لای موسڵمانەکان و بە سوهەیلیان وت : برۆ بۆ لای موحەممەد و لەگەڵی رێك بکەوە . جا با لە رێككەوتنەکەت‌دا ئەوە هەبێ کە ئەمساڵ نەیەتە ناو مەککەوە ..

پێش بەیعەتی ( رضوان ) قورەیش بە هیچ شێوەیەك رێی بە موسڵمانەکان نەئەدا بچنە ناو مەککەوە ، بەڵام کە ئەو بڕیارەی پێغەمبەریان بیست ، هاتنەوە بە خۆیان‌دا

[٨١] حوەیطبی کوڕی عەبدولعوززای کوڕی ئەبوقەیسی کوڕی عەبد وددی عامیری قورەیشیی‌یە .. ساڵی فەتحی مەککە موسڵمان بووە و ، یەکێ بووە لەوانەی کە دڵیان راگیراوە ( مؤلفة قلوبهم ) . بەشداریی جەنگی حونەینی کردووە و ، دۆستی ئەبوذەریش بووە و ، هەر ئەو بردییە خزمەتی پێغەمبەر و موسڵمان بوو . پێغەمبەری خوا ﷺ بە موسڵمان بوونی زۆر دڵ خۆش بوو . حوەیطب دەوڵەمەند بووە ، هەتا ئەوەبوو چل هەزاری بۆ جەنگی حونەین بە قەرز بە پێغەمبەری خوا دا . دوای فەتحی مەککە هاتەوە مەدینە و ، لە ساڵی پەنجا و چواری کۆچیی‌دا و ، لە سەردەمی خەلافەتی موعاویەدا کۆچیی دوایی کردووە . حوەیطب لە سەردەمی خەلیفە عومەردا پایەکانی حەرەمی نوێ کردونەتەوە.

و، بڕیاریان دا ڕێیان پێ بدەن ، بەڵام ئەمساڵ نا ، بۆ ئەوەی لەناو عەرەبەکاندا ئاوی رووبان نەچێت . بۆیە هەموو کارێکی ڕێککەوتنیان دایە دەست سوهەیل ، بەو مەرجەی ئەمساڵ موسڵمانەکان بگەڕێنەوە .

سوهەیل و هاوەڵانی بەرەو حودەیبیە کەوتنە ڕێ ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ سوهەیلی بینیی ، مژدەی سەرفرازیی بە هاوەڵانی دا ، کە فەرمووی : (( سَهَّلَ الله لكم من أمركم )) . فەرمووی : خوای گەورە کاری بۆتان ئاسان کرد .. هەروەها فەرمووی : (( قد أراد القوم الصلح حين بعثوا هذا الرجل )) . فەرمووی : کە ئەم پیاوەیان ناردووە ، ئەوە ڕێککەوتنیان ئەوێ ..

لە ڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەری خوا فەرموویە : (( سهّل الله أمركم ، القوم ماتوّن إليكم بأرحامكم وسائلوكم الصلح ، فابعثوا الهدي وأظهروا التلبية ، لعل الله يُلين قلوبهم )) . فەرمووی : خوا کارتانی ئاسان کرد .. قوڕەیش سیلەی ڕەحمتانی ناردووە و، داوای ڕێککەوتن ئەکەن. ئێوەش وشترەکانی عومرە بخەنە ڕوو و ، بە ( تلبيه ) ش دەنگ بەرز بکەنەوە.

هاوەڵان وشترەکانیان خستنە ڕوو و ، بە وتنی ( تلبيه ) ش لە هەموو لایەکی ئۆردوگاکەو ، دەنگیان بەرز کردەوە ..

کە نوێنەرانی وت و وێژ گەیشتن و کۆڕیان بەست ، دانیشتنێکی یەکجار هێمن و ئاسایی بوو ، چونکە قوڕەیش ئەمجارە بە دڵ حەزی لە ڕێککەوتن بوو ، بەو هیوایەی لە جەنگ و هەرا دەرباز بن ، چونکە ئەیانزانیی بەرگەی موسڵمانەکان ناگرن ، ئەگەرچیی قوڕەیش هەشت هەزار و موسڵمانەکان هەزار و چوارصەد کەس ئەبوون ، ئەویش بە پێی جەنگە پێشووەکانی نێوانیان ، بە تایبەت موسڵمانەکان ئەمڕۆ لە هەموو کاتێك زیاتر خۆیان بە بێ‌تاوان ئەزانن ..

ئەوەبوو قوڕەیش عوثمان و دە هاوەڵەکەی تریان دەست بەسەر کردبوون ، بەڵام نەیان‌کوشتبوون ، ئەگەرچیی دەنگ و باس بڵاوەی کرد کە ئەوانە کوژراون و، ئەمەش بوو ، مایەی ناڕەحەت‌بوونی پێغەمبەر و موسڵمانان و ، سەرەنجام ئەو بەیعەتە مێژوویی‌یە گرنگەیان ئەنجام دا کە بووە مایەی گۆڕینی هەڵوێستی هەردوو لا..

موسڵمانەکان بڕیاری جەنگیان دا و ، قوڕەیشیش بەو بۆنەوە ناچاری ڕێککەوتن بوو..

سوهەیل پیاوێکی ژیری ، زمان پاراوی ، وتە شیرین بوو ، دوور لە خۆ هەڵکێشان و ملەجەڕێ و هەڵچوون ..

که کۆڕیان بەست ، یەکەم جار عوزری بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هێنایەوە دەربارەی چەند هەڵەیەك کە لە لایەن هەندێ هەرزەکاری مەککەوە روویان داوە .

یەکێ لەو هەڵە و دەست درێژییانە بریتییە لە هەڵمەتبردنی چەند یەکەیەکی سەربازیی قورەیش بۆ دەستوەشاندن لە موسڵمانەکان ، وەك لە پێشەوە باس کرا..

یەکێ تریش لەو هەڵانە دەست بەسەرکردنی عوثمان و دە هاوەڵەکەی بوون لە مەککەدا.. ئەوەبوو خێرا ناردی قورەیش ئەو بەندکراوانە بەر بدات . ئەوەندەی پێ نەچوو عوثمان و هاوەڵانی بەر دران و گەیشتنەوە حودەیبییە . هەروەها موسڵمانەکانیش ئەو قورەیشییانەیان ئازاد کردن کە بە دوژمنانە هاتبوونە سەر ئۆردووگای موسڵمانان و پاسەوانان دەستگیریان کردبوون ..

دوای ئەوەی پیاوانی هەردوو لا بەر دران پێغەمبەری خوا ﷺ و سوهەیلی کوڕی عەمر کەوتنە باسی رێككەوتنەکە ، تا بزانن لەسەر چ خاڵێك رێك بکەون .

وت و وێژ درێژەی کێشا .. هەریەکە پێی خۆش بوو مەرجی خۆی فەرز بکات.. زۆر جاریش کۆسپ دروست ئەبوو .. جار بە جاریش دەنگ و هەرایان بەرز ئەبوویەوە.. هەموو جارێ کە سوهەیل ئەیویست مەرجێکی بسەپێنێ ، دەنگی بە تووڕەییەوە بەرز ئەکردەوە ، بە رادەیەك کە هەردوو فەرماندەی پاسەوانانی پێغەمبەر ﷺ ، کە عەببادی کوڕی بیشر و سەلەمەی کوڕی سەلەمە بوون ، کە بەسەر سەری پێغەمبەری خواوە ﷺ وەستا بوون ، سوهەیلیان دائەچڵەکاند ، تا سنووری خۆی بزانێ و ، لە پێویست زیاتر دەنگ بەسەر پێغەمبەری خوادا بەرز نەکاتەوە.

گرێکوێرەی ئەم رێككەوتنە بابەتی چوونە ناو مەککە و گەڕانەوەی ئەم ساڵ بوو . بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ بە حیکمەتی خۆی وای بە چاك زانیی قەیرانەکە چارەسەر بکات ، چونکە جاران موسڵمانەکان ئەو مافەیان لێ زەوت کرابوو . جا کە ئێستە قورەیش رەزامەندیی بۆ ساڵێکی تر نواندووە ، دەستکەوتێکی چاکە بۆ موسڵمانان ، بە تایبەت ئەگەر ئەو مافە بەبێ خوێن رژان دەستیان بکەوێ ..

سەرەنجام هەردوو لا لەسەر ئەم خاڵانە رێك کەوتن :

( ١ ) ئەمساڵ موسڵمانەکان نەچنە مەککەوە و بگەڕێنەوە بۆ مەدینە .

( ٢ ) بۆ ساڵی داهاتوو موسڵمانەکان مافی ئەوەیان هەیە بێنەوە و ، بچنە مەککەوە و ، خواپەرستیی خۆیان ئەنجام بدەن .

( ٣ ) قورەیش نابێت بە هیچ شێوەیەك دژایەتیی موسڵمانان بکات و ، نابێ ڕێیان لێ بگرێت .

( ٤ ) موسڵمانەکان کە ئەچنە مەککەوە ، پێویستە تەنها چەکی ڕێبواریان پێ بێت ، کە بریتییە لە شمشێر .

( ٥ ) موسڵمانەکان کاتێك کە وان لە مەککەدا ، نابێت چەك دەرخەن ، بەڵکو شمشێرەکانیان هەر لە کێلان‌دا بن .

( ٦ ) ماوەی مانەوەی موسڵمانان لە مەککەدا تەنها سێ ڕۆژە ، دوای ئەوە پێویستە مەککە بەجێ بهێڵن .

( ٧ ) کۆتایی‌هێنان بە جەنگی نێوان موسڵمانەکان و قورەیش ، ئەویش بە وەستاندنی جەنگ بۆ ماوەی دە ساڵ کە هەموو کەسێك لە خۆی بێ‌خەم بێت .

( ٨ ) دوای ئەم پەیمانە لەلایەن قورەیشەوە هەر کەسێك بەبێ مۆڵەت وەرگرتن لە کەس‌وکاری را بکات بۆ ناو موسڵمانەکان ، ئەگەرچیی پەناهەندەی موسڵمانیش بێت، پێویستە پێغەمبەری خوا ﷺ بی‌گێڕێتەوە بۆ ناو قورەیش .

( ٩ ) بەڵام قورەیش پێویست ناکات ئەو کەسانەی کە لە ئیسلام هەڵ ئەگەڕێنەوە و ئەچنە لای قورەیش بیان‌گێڕێتەوە .

( ١٠ ) سەربەستیی تەواو بە هۆزەکانی دراوسێی حەرەم بدرێ تا بە ویستی خۆیان پاڵ بە هەر لایەکیانەوە ئەدەن بدەن .

( ١١ ) هەر هۆزێك پاڵی بە هەر سوپایەکیانەوە دا ، ئەبێتە بەشێکی ئەو سوپایە و ، هەموو ئەرکێك لە ئەستۆیا ئەبێ و ، هەموو مافێکیشی هەیە ، بۆیە پێویستە ئەو هۆزەش پابەندی خاڵەکانی ئەم پەیمانە بێ .

( ١٢ ) هەر کەس دەستدرێژیی بکاتە سەر هەر هۆزێك وەك ئەوە وەهایە دەست درێژیی سەر ئەو سوپایە کرابێ کە ئەو هۆزە پاڵی پێوە داوە و ، ئەو کاتەش ڕێککەوتن نامەکە دەربارەی جەنگ وەستان بە تاڵ ئەبێتەوە. واتە ئەچنەوە دۆخی جەنگ و ناکۆکیی..

**دوانزەهەم : موسڵمانەکان ناڕەزایی دەر ئەبڕن**

وەرگرتنی ئەم خاڵانە لەلایەن حیکمەتی پێغەمبەری خواوە بووە ، بۆیە موسڵمانەکان هەندێکیان خێرا بەو پێوانەیە سەیری خاڵەکانیان کرد ، کە ئەمە کارێکە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنجامی داوە و ، وایان بە چاك زانیی ڕەزامەندیی لەسەر ڕێككەوتنەکە بنوێنن ، وەك ئەبوبەکری صدیق خوا لێی رازیی بێ .

بەلاَم موسڵمانەکان بە گشتیی بە تەما بوون هەر ئەو ساڵە عومرە ئەنجام بدەن، بۆیە کە خاڵی یەکەمیان بیست لەگەڵ خاڵی هەشتەم و نۆیەم زۆریان بە لاوە گران بوو.. ئەوانەی کە زۆر ناڕەحەت بوون و بە سووکی‌یان ئەزانیی سێ پیاوی زۆر دڵسۆز و ناوداری ئیسلام بوون . عومەری کوڕی خەططاب و ، ئوسەیدی کوڕی حوضەیری سەرۆکی ئەوس و ، سەعدی کوڕی عوبادەی سەرۆکی خەزرەج بوون ..

ئەوەبوو عومەر بە ناڕەحەتی‌یەکی زۆرەوە هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و ناڕەزایی خۆی لەم ڕێككەوتنە دەربڕیی . نەك هەر عومەر بەڵكو زۆربەی موسڵمانەکان وەها بیریان ئەکردەوە.

ئەوەبوو عومەر فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئایا تۆ پێغەمبەری خوا نیت ؟ فەرمووی : (( بلی )) . فەرمووی : ئەی ئێمە موسڵمان نین ؟ فەرمووی : (( بلی )) . فەرمووی : ئەی ئەوان موشریك نین ؟ فەرمووی : (( بلی )) . فەرمووی : دەی بۆچ سووکیی بۆ دینەکەمان قبووڵ بکەین ؟ فەرمووی : (( أنا عبدالله ورسوله لن أخالف أمره ، ولن يضيعني )) . فەرمووی : من بەندە و پێغەمبەری خوام و لە فەرمانی دەرناچم و ، خوایش دەستبەردارم نابێت .

عومەر ئەوەندە تووڕە بوو و ، ئەوەندەش موسڵمانەکانی بە خەڵەتاو ئەزانیی ، لە مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ تێ نەگەیشت ، لەبەر ئەوە وەك سەری خۆی هەڵ بگرێ و چارێکی نەبێ ، خۆی گەیاندە لای گەورە وەزیر ، ئەبوبەکری صدديق و ، دادی ئەم ڕێككەوتن نامەیەی بردە لای ئەو ، کە موسڵمانەکان ستەمیان لێ کراوە ، ئەوەبوو فەرمووی : ئەی ئەبوبەکر ! ئایا ئەو پێغەمبەری خوا نیە ؟ فەرمووی : بەڵێ . فەرمووی : ئەی ئێمە موسڵمان نین ؟ فەرمووی : بەڵێ . فەرمووی : ئەی ئەوان موشریك نین ؟ فەرمووی : بەڵێ . فەرمووی : دەی بۆچ سووکیی بۆ دینەکەمان قبووڵ بکەین ؟

ئەبوبەکر دەستی کرد بە ئامۆژگاریی عومەر تا دەست لە ناڕەزایی هەڵ بگرێ و ملکەچی فەرمان بێ ، کە فەرمووی : شوێنی بکەوە . من شاهێدیی ئەدەم کە ئەو پێغەمبەری خوایە و ، حەقیش ئەو فەرمانەیە کە بەو سپێرراوە .. ئێمەش لە فەرمانی خوا دەرناچین و ، خواش دەستبەرداری ئەو نابێت .

لە مێژووی طەبەریی‌دا عومەر لە پێشەوە بۆ خزمەتی ئەبوبەکر ڕۆیشتووە .

وەنەبێ تەنها عومەر بۆ مەرجەکانی قورەیش ناڕەحەت بووبێ ، بەڵکو زۆربەی هاوەڵان لە داخانا ئەتلانەوە ، ئەوەندە هەیە هەموویان وەك عومەر دەریان نەئەبڕیی . چونکە ئەوان گومانیان لەوەدا نەبوو، بە بۆنەی خەوەکەی پێغەمبەرەوە ﷺ ، ئەچنە مەککەوە ، جا کە هەواڵی گەڕانەوەیان بیست یەکجار پێی ناڕەحەت بوون ، بە رادەیەك کە خەریك بوو خەفەت بیان‌کوژێ . جا بۆ ئەمە چەند پرسیارێکیان ئاراستەی پێغەمبەری خوا ﷺ کرد .

پرسی‌یان : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئایا تۆ بۆمانت باس نەکرد کە ئەچیتە مزگەوتی حەرامەوە و ، کلیلەکانی کەعبە بە دەست ئەگریت و ، سەردانی عەرەفات ئەکەیت ؟ ئەوەتا نە خۆمان و نە وشترەکانی عومرەکەشمان نەگەیشتنە ماڵی خوا !

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( قُلت لكم في سفركم هذا ؟ )) . فەرمووی : پێم وتن لەم سەفەرەتانا ؟ عومەر فەرمووی : نەخێر .

فەرمووی : (( أما إنكم ستدخلونه وآخذ مفتاح الكعبة ، وأحلق رأسي و رؤوسكم ببطن مكة )) . فەرمووی : دەی ئێوە ئەچنە مەککەوە و ، منیش کلیلەکانی کەعبە وەرئەگرم و سەری خۆیشم و سەری ئێوەش لە شیوی مەککەدا ئەتاشم .

**سیانزەهەم : قەیرانی ئەبوجەندەل**

لە کاتێك‌دا کە موسڵمانەکان بە خەم و خەفەتی ئەم ڕێككەوتنەوە ئەتلانەوە و، دادیان ئەبردە لای پێغەمبەری خوا ﷺ تا بەڵکو پیاچوونەوەیەکی بەندەکان بکات ، چونکە بە راستیی دڵی موسڵمانان سارد ئەکەنەوە و ، خۆیان زۆر بە دۆڕاو ئەزانن و ، لەولاوە پێغەمبەری خواش ﷺ هەوڵی ئەدا دڵیان بداتەوە و ، هێوریان بکاتەوە ، ئا لەم کاتە ناسکەدا ڕووداوێك هاتە بەردەم موسڵمانەکان کە ئەوەندەی تر ڕێككەوتنەکەیان لەبەر چاو کەوت و ، پێ‌یان خۆش بوو کە وازی لێ بهێنن و بیبڕێتەوە ..

ئەوەبوو کە پێغەمبەر و سوهەیل لەسەر بەندەکان ڕێك کەوتن و ، تەنها نووسینی مابوو تا مۆر بکرێ ، لەو کاتەدا یەکێ لە گەنجە موسڵمانەکانی مەککە کە بەند کرا بوو و ، لە ژێر ئازار و ئەشکەنجەدا بە کۆتەکانیەوە ، شمشێرێکیشی بە دەستەوە بوو ، هەڵات بوو و ، داوای ئەکرد موسڵمانەکان مافی پەنابەرێتیی بدەنێ تا ڕزگاری بێ ..

خۆی گەیاندە ئەو شوێنەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ سوهەیل‌دا دانیشتبوون ..

که گەنجەکە گەیشتە لای کوڕەکە ، قەیرانەکە یەکجار ئاڵۆز بوو ، بە رادەیەك کە خەریك بوو رێككەوتنەکە هەڵ وەشێتەوە ، ئەمەش بە بۆنەی ئەوەوە کە ئەم گەنجە سزادراوە ، کە بە دەست کەس‌وکاریەوە هەڵاتووە ناوی ( ئەبوجەندەل ) ، و ، کوڕی سوهەیلی کوڕی عەمرە ، کە ئێستە خەریکی دیاریی‌کردنی بەندەکانی رێككەوتن نامەی حودەیبیەیە ..

که سوهەیل چاوی بە کوڕەکەی کەوت ، چاوی پەڕییە تەوقی سەری و ، بە بیر و هەستێکی نەفامانەوە ، لە کوڕەکە هەستا و دای بە دەم‌وچاوی کوڕەکەیدا و ، دەستی دایە کاکۆڵی و رای ئەکێشا ، بەو نیازەی کە بی‌باتەوە بۆ ناو ئۆردووگای موشریکان ، تا بیبرێتەوە بۆ بەندیخانەکەی لە مەککەدا ..

که سوهەیل بەو شێوەیە دەستی بە لێدانی کوڕەکەی کرد و ، پاڵی پێوە ئەنا و ، ئەبوجەندەلیش هاواری ئەکردە موسڵمانەکان : ئەی کۆمەڵی موسڵمانان ! ئایا بگێڕرێمەوە بۆ لای موشریکان و ، ئەوانیش لە دین وەرم گێڕن ؟

بەمە موسڵمانەکان گریان تێ بەر بوو و ، ئەوەندەی تر رقیان لە رێككەوتنەکە هەستا .. موسڵمانەکان خۆیان پێ نەگیرا ، رزگاریان کرد .. باوکی پەنای بردە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و داوای کرد کوڕەکەی ، بە پێی رێككەوتنی نێوانیان ، بدەنەوە دەستی . پێغەمبەری خوا ﷺ هەوڵی دا ئەبوجەندەل تەسلیم نەکاتەوە ، چونکە پەیمانەکە هێشتا نەنووسراوە و مۆر نەکراوە ، کە فەرمووی : (( إننا لم نقض الكتاب بعد )) . بەڵام سوهەیلی کوڕی عەمر کۆڵی نەدا و ، پێی لە زەویی کوتا کە پەیمانەکە هەموو شتێکی بڕاوەتەوە و ، هەڕەشەی ئەوەی کرد کە ئەگەر بە گوێی نەکەن رێککەوتنەکە هەڵ ئەوەشێنێتەوە .

پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر ئەوەی کە پەیمانەکە هەڵ نەوەشێتەوە و ، جەنگ و هەرا و کوشتار بەرپا نەبێ و ، لەبەر ئەوەش کە لەلایەن موسڵمانەکانەوە کارەکە تێك نەچێ و ، بە پەیمان شکێن دەرنەچن ، بڕیاری دا ئەبوجەندەلی سەربازی ئیسلامی گوێ‌ڕایەڵ تەسلیم بکەنەوە ، هەرچەندە کارێکی یەکجار سەخت بوو ، بەڵام پەیمان بەسەربردن زۆر لەوە بەرزتر ، بەلای موسڵمانەوە ..

جا پێغەمبەری خوا ﷺ عوزری بۆ ئەبوجەندەل هێنایەوە کە نابێ لەلایەن موسڵمانانەوە ناپاکیی و لادان دەرکەوێت ، کە دیارە ئەبوجەندەلیش کاری وەها بۆ هیچ موسڵمانێك بە شایان نازانێ ، چ جای پێغەمبەری خوا ﷺ . ئەوەبوو پێی

فەرموو : (( یا أبا جندل ! إصبر واحتسب ، فإن الله جاعل لك ولمن معك فرجاً ومخرجاً، إنا قد عقدنا بيننا وبين القوم صلحاً وأعطيناهم وأعطونا على ذلك عهداً ، وإنا لا نغدر )) . فەرمووی : ئەبوجەندەل ! ئارام بگرە و بە تەمای پاداشتی خوا بە . چونکە خوا دەروو لە تۆیش و ئەوانەش کە وەك تۆ وەهان ، لە بێدەسەڵاتانی موسڵمانان ، ئەکاتەوە . تازە ئێمە پەیمانمان لەگەڵیان بەستووە و ، عەهد و بەڵێنمان بە یەکتر داوە و ، ئێمەش نابێ غەدر بکەین .

ئەبوجەندەل ، بە وێنەی فیداکارێکی خوناس قەناعەتی بە فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ کرد و ، دوای ئەوەی کە مژدەی پێ دا ، بە دڵێکی پڕ لە متمانەوە کە خوای گەورە دەروو لەویش و لە هەموو موسڵمانێکی بێدەسەڵاتیش ئەکاتەوە ، خۆی تەسلیمی باوکی کردەوە و ، بە کۆت و زنجیرەوە گەڕایەوە بەندیخانەکەی مەککە ، بەڵام بە دڵێکی یەکجار ئاسوودەوە .. ئەوەبوو ساڵێك بەسەر ئەو ناڕەحەتی‌یەدا تێ نەپەڕی هەتا خوای گەورە ئەبوجەندەل و حەفتا گەنجی موسڵمانی تری مەککەی ، بە شێوەیەکی نادیار ، لەو ناڕەحەتی‌یە رزگار کرد . ئەوەبوو رایان کرد و ، کۆمەڵێکیان لەسەر رۆخی دەریای سوور ، لەسەر رێی هاتوچۆی کاروانەکانی قوڕەیش نێوان مەککە و شام ، پێك هێنا . ( لە دواوە بە درێژە باس ئەکرێت ) .

ئەبوجەندەل خۆی ئارامی هەبوو ، بەڵام موسڵمانەکان قرچە لە جەرگیان هەستابوو و ، ئارامیان لا بڕابوو ، لەسەر ئەوەی کە برایەکی ئیمانی‌یان بەو شێوە ستەمی لێ ئەکرێ . ئەوەندە ناڕەحەت بوون دەستیان بە گریان کرد ، چونکە لەبەر فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەریان نەئەکردەوە .

دوای تەسلیم‌کردنەوەی ئەبوجەندەل ، پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لە سوهەیل کرد کە کوڕەکەی ببەخشێ پێی و ئازادی بکات ، کەچیی سوهەیل داواکەی دایە دواوە .. کەچیی کە دوو هاوەڵەکەی سوهەیل ، حوەیطبی کوڕی عەبدولعوززا و میکرەزی کوڕی حەفص ، دی‌یان وا سوهەیل داواکەی سەرۆکی موسڵمانانی دایە دواوە ، لە شەرمان‌دا بە پێغەمبەری خوایان ﷺ گەیاند کە ئەبوجەندەل لە پەنای ئەوان‌دا ئەبێ و، ناهێڵن باوکی خراپەی لەگەڵ بکات . ئیتر بە سوهەیلیان گەیاند کە ئەبوجەندەل وا لە پەنای ئەوان‌دا . بەمە خستیانە ناو چادرێکەوە و ، باوکیشی لە سزادانی دەست کۆتا بوو . ئەمە یەکەم هاتنە دیی بەڵێنەکەی پێغەمبەری خوا بوو بۆ دەروو کرانەوە

لـه ئەبوجەنـدەل . لـه هـەمان کـات‌دا تەسـلیم کردنـەوەی ئەبوجەنـدەل لەلایـەن موسڵمانەکانەوە بە یەکەم بەری تـاڵی پـەیمانی حودەیبیـە لـە قەڵـەم ئـەدرا . بۆیـە ناڕەزایی لە پەیمانەکە ، لەلایەن موسڵمانانەوە سەری هـەڵ دایـەوە و ، کۆمـەڵێکیان چوونە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و دەستیان بە وت و وێژ کردەوە و ، ناڕەزایی‌یـان دەربڕیی ..

هەندێکیان ئەوەندە خەفەتیان زۆر بوو بیریان لـەوە ئـەکردەوە ، لـە فـەرمان هـەڵ گەڕێنەوە و ، عەهد و پەیمانەکە بشکێنن و دەست بە کوشتاری مـوشریـکان بکەن..

ئەوەبوو خەلیفە عومەر لە سەردەمی خەلافـەتی خۆی‌دا باسـی ڕێکـەوتن‌نامـەی حودەیبیەی ئەکرد ، وەك ئیبن عەبباس لی‌یەوە ئەگێڕێتەوە ، کە لەو کاتەوە موسڵمان بووە وەها شك و گومان نەچۆتە دڵیەوە ..

ئەبوسەعیدی خودرییش ئەڵێت : ڕۆژێکیان لـەلای عومـەری کـوڕی خـەططاب‌دا دانیشتبووم ، باسی ڕێکەوتنی حودەیبیەی کرد و فەرمووی : ئەو ڕۆژە گومـان چـووە دڵمەوە و ، بە شێوەیەك چوومە خزمـەتی پێغەمبـەری خـوا ﷺ کـە هـەرگیز وەهـا نەچووبوومە خزمەتی ، ئیتر لەو ڕۆژەوە چەندین بەندەم ئازاد کـردووە و ، ماوەیـەکی زۆریش بە ڕۆژوو بووم و ، هەرچیی کە بە تەنیا ئەبم و ئەو کـارەم بـیر ئەکەوێتـەوە ، ئەبێتە گەورەترین خەفەتم . پاشان خوای گەورە سەرەنجامی کارەکەی بە چاکیی گێڕا . بۆیە پێویستە بەندەکان لە رای خۆیان بەگومان بن . بەخوا ئەو ڕۆژە ئەوەنـدە گومـان چووە دڵمەوە هەتا ئەوەبوو لە دڵی خۆم‌دا وتم : ئەگەر صەد کەس لەسـەر ئـەم رایـەی من ئەبووین هەرگیز نەئەچووینە ناو ئەو ڕێك‌کەوتنـەوە . کەچیی کـە ڕێکەوتنەکـە هاتە کایەوە ، لە کاتی ئەو ئاگر بەستەدا ئەوەندە موسڵمان بوون زیـاتر لەوانـەی کـە لەو ڕۆژەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بانگەوازی کردووە هـەتا ڕۆژی حودەیبیـە موسـڵمان بووبوون و ، لە ئیسلامیش‌دا فەتحێکی تر نیە لە حودەیبیە گەورەتر بێت .

لەو کاتەدا کە ئەبوجەنـدەل تەسـلیمی بـاوکی کرایـەوە و ، موسـڵمانەکان ـ لـە سەرووی هەموویانەوە عومەر ـ خۆیان ئەخواردەوە ، عومـەر خـۆی لـە ئەبوجەنـدەل نزیك کردەوە و ، دای بە گوێی‌دا کە ئێستە هەلی بۆ هەڵ کەوتووە با باوکە کافرەکەی بکوژێ .. عومەر هاتە تەنیشـتی و لەگـەڵیا ئەچـوو بەڕێـوە و ئەی‌فـەرموو : ئـەی ئەبوجەندەل ! ئارام بگرە . ئەوانە موشریکن و ، خـوێنی هەریەکـەیان بـایی خـوێنی صەگێکە . تۆش پیاوی و ئەویش پیاوە و ، شمشێریشت پی‌یە . عومـەر ئەفـەرموێ :

بە هیوا بووم دەست بداتە شمشێرەکە و بیدا لە باوکی ، کەچیی کابرا دڵی باوکی نەهات . عومەر فەرمووی : ئەبوجەندەل ! پیاوی وا هەیە لە ڕێی خوادا باوکی خۆی ئەکوژێ . بەخوا ئەگەر باوکمان بە زیندوویی بدیایە لە ڕێی خوادا ئەمان کوشتن .[٨٢] پیاوێك بە پیاوێك .. ئەبوجەندەل لە عومەر نزیك ئەبێتەوەو ئەڵێت : ئەی تۆ بۆ نای‌کوژی ؟ عومەریش ئەفەرموێ : پێغەمبەری خوا ﷺ لە کوشتنی ئەو و غەیری ئەویش قەدەغەی کردووم . ئەبوجەندەل ئەڵێت : منیش ئەوەندەی تۆ پێویستە گوێڕایەڵیی پێغەمبەری خوا بکەم .

کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم هەوڵەی عومەری بیست کە ویستوویە سوهەیل بە کوڕەکەی بە کوشت بدات ، فەرمووی : (( یا عمر! لعله أن يقوم في الله مقاماً يحمد عليه )) . فەرمووی : عومەر ! بەڵکو بۆ خوا لە شوێنێك‌دا بووەستێ کە مایەی سوپاس و پێزانین بێت ..

کاتێکیش کە موسڵمانەکان ناڕەزاییان دەربڕیی ، پێغەمبەری خوا ﷺ بە عومەری فەرموو : (( أنسيتم يوم أحد إذ تصعدون ولا تلوون على أحد وأنا أدعوكم في أخراكم ؟ أنسيتم يوم الأحزاب إذ جاؤوكم من فوقكم ومن أسفل منكم وإذ زاغت الأبصار وبلغت القلوب الحناجر ؟ أنسيتم يوم كذا ؟ )) . فەرمووی : ئەوە ڕۆژی ئوحودتان لە یاد چوویەوە کە سەرئەکەوتن و ئاوڕتان لە کەس نەئەدایەوە و ، منیش لە خوارتانەوە بانگم لێ ئەکردن ؟ ئەوە ڕۆژی ئەحزابتان لە یاد چوویەوە کە لە سەروو و لە خوارووتانەوە بۆتان هاتبوون ، بە ڕادەیەك کە چاوتان زاق بووبوون و ، گیانیشتان گەیشتبووە قورگتان ؟ فلان ڕۆژتان لە یاد چوویەوە ؟ هەروا پێغەمبەری خوا ﷺ شتانێکی ئەهێنایەوە یادیان و موسڵمانەکانیش ئەیان وت : ئەی پێغەمبەری خوا ! خوا و پێغەمبەرەکەی ڕاستیان فەرموو .. ئەوەی تۆ بیرت لێ کردەوە ، ئێمە بیرمان لێ نەکردەوە ، بە ڕاستیی تۆ بە خوا و بە فەرمانەکەی زاناتری .

واقیدیی ئەڵێت : کاتێ کە ساڵی داهاتوو بۆ عومرە پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی چووە مەککەوە و سەری تاشیی فەرمووی : (( هذا الذي وعدتكم )) . فەرمووی : ئەمە ئەو بەڵێنەیە کە پێتانم دا .. کە ڕۆژی فەتحی مەککەش هاتە بەرەوە کلیلەکەی کەعبەی گرتە دەست و فەرمووی : (( أدعوا لي عمر بن الخطاب )) . فەرمووی :

---

[٨٢] شایانی باسە کە لە جەنگی بەدردا ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح باوکی خۆی کوشتووە .

عومەری کوڕی خەططابم بۆ بانگ بکەن . پاشان فەرمووی : (( هذا الذي قلت لكم )).
فەرمووی : ئەمە ئەوەبوو کە پێتانم وت . کە لە ساڵی ( حجة الوداع ) یشدا لە عەرەفە وەستا بە عومەری فەرموو : (( أي عمر ! هذا الذي قلت لكم )) . فەرمووی : عومەر ! ئەمە ئەوەبوو کە پێتانم وت . عومەر فەرمووی : بەڵێ ، ئەی پێغەمبەری خوا ، لە ئیسلامدا هیچ فەتحێك نەبووە لە ڕێككەوتنی حودەیبیە گەورەتر بێت .

لەو کاتانەدا کە عومەر ئاگربەستی حودەیبییەی بە دڵ نەبوو ، ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح ئامۆژگاریی عومەری ئەکرد کە گوێ لە پێغەمبەری خوا ﷺ بگرێت و پەنا بگرێ بە خوا لە فڕوفێڵی شەیتان و ، لە ڕای خۆی بەگومان بێت . ئەویش دەست بە وتنی ( إستعاذة ) ئەکات .

**چواردەهەم : نووسینی بەندەکانی پەیمانەکە**

دوای ئەوەی کە موسڵمانە ناڕازییەکان قەناعەتیان بە بەندەکانی پەیمانی حودەیبیە کرد ، نوێنەری هەردوولا پێکەوە دانیشتنەوە تا بینووسنەوە . ئەوەبوو لە کاتی نووسیندا هەندێ جیاوازیی کەوتە نێوان هەردوولا ، کە خەریك بوو کارەکە تێك بچێ.

کە پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی شێوازی پەیمانەکە بە نووسەرەکە بفەرموێ ، فەرمانی دا کە بنووسێ : ( بسم الله الرحمن الرحيم ) ، لێرەدا سوهەیلی کوڕی عەمر لەسەر ئەم ڕستەیە ڕەخنەی گرت و وتی : من ڕەحمان ناناسم ، بنووسە : ( باسمك اللهم ) . لەولاوە هاوەڵان ، بۆ ئەم ناڕەزاییەی سوهەیل ، دەنگی ناڕەزاییان لێ بەرز بوویەوە و ، لەسەر پشتگوێخستنی ڕەخنەکەی سوهەیل سوور بوون و وتیان : خوای پەروەردگار ( رحمان ) ، و ، جگە لە ڕەحمان هیچ نانووسین . بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ بە پێی حیکمەت و ژیریی خۆی بە گوێی سوهەیلی کرد و بە نووسەرەکەی فەرموو : (( أكتب باسمك اللهم )) . پاشان کە فەرمانی دا بە نووسەرەکە بنووسێت : (( هذا ما اصطلح عليه رسول الله )) ، ئەمە ئەو پەیمانەیە کە پێغەمبەری خوا لەسەری ڕێك کەوتووە ، دیسان سوهەیل لەسەر وشەی ( رسول الله ) ڕەخنەی گرت و داوای کرد لە پەیمانەکەدا بکوژێتەوە، کە ئەی وت : ئەگەر بمزانیبایە کە تۆ پێغەمبەری خوایت پێچەوانەت نەئەجوولامەوە و ، شوێنت ئەکەوتم . ئایا حەزت لە ناوی خۆت و ناوی باوکت ، موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا نیە ؟ ئەگەر تۆ پێغەمبەری خوا بیت ئێمە ستەممان لێ کردوویت ، ئەو کاتە لە طەوافی ماڵی خوا قەدەغەمان نەئەکردی . ئەگەر

من شاهێدیی بدەم کە تۆ پێغەمبەری خوایت لەگەڵتدا نەئەجەنگام . نـاوی خـۆت و نـاوی باوکـت بنووسە .

بۆ ئەم ڕەخنەیەش موسڵمانەکان یەکجار ناڕەحـەت بـوون ، بۆیـە دەنگیـان بـەرز کردەوە و ، سوور بوون لەسەر ئەوەی کـە نـەهێڵن ( رسـول الله ) بکوژێتـەوە و ، بـە نووسەرەکەشیان وت : جگـە لـە ( محمـد رسـول الله ) هیچـی تـر نەنووسـی . بگـرە ئوسەیدی کوڕی حوضـەیری سەرداری ئەوس و ، سـەعدی کـوڕی عوبـادەی سـەرداری خەزرەج ئەوەندە ناڕەحەت بوون دەستیان دایە دەستی نووسەرەکە کـە نـابێ بنووسـێ هەتا وشەی ( رسول الله ) لە پەیمانەکەدا نەنووسرێ . هەتا هاتنـە سـەر ئـەوەش کـە چەك بەکار بهێنن و ، کوشتاری قوڕەیشـی هەڵەشـە بکـەن ، چـونکە ئەمـەیان بـە سووکایەتیی کردن بە موسڵمانان لە قەڵەم دا ، بۆیە بە نووسەرەکەیان وت : جگە لـە ( محمد رسول الله ) هیچ نەنووسی ، ئەگینا شمشێر بـە کـار ئـەهێنین ! لەسـەر چیی سووکایەتیی بە دینەکەمان بکەین ؟

دیسان بارودۆخ ئاڵۆز بوویەوە .. خەریك بوو پەیمانەکـە تێـك بچـێت ، ئـەمجارەش پێغەمبەری خوا ﷺ فریا کەوت و ، بە حیکمەت و دووربینییەکەی خۆی گرفتەکـەی چارەسەر کرد ، بەوەی کە فەرمانی دا هاوەڵان بێدەنگ بن ، تا خۆی بە پێی قازانج و بەرژەوەندیی موسڵمانەکان کارەکـە ئـەنجام بـدات .. کـە هـاوەڵان بـێدەنگ بـوون ، فەرمانی دا بە نووسەرەکە تا وشەی ( رسـول الله ) بکوژێنێتـــەوە و ، لـە جێگـەیدا وشەی ( محمد بن عبدالله ) بنووسێت .. بەمـە کۆتـایی بـە ناجۆرییـەکان هـات و ، پەیمانەکە بە دوو نوسخە نووسرا و شاهێدی لەسەر نووسران و مۆر و ئیمزا کرا ..

دەربارەی ئەو ڕەخنەیەی سوهەیل کە بۆ ( بسم الله الـرحمن الـرحيم ) دەری بڕیـی و ئەیوت کە من ڕەحمان ناناسم ئایەتی : ﴿ قُلِ ٱدۡعُواْ ٱللَّهَ أَوِ ٱدۡعُواْ ٱلرَّحۡمَـٰنَۖ أَيّٗا مَّا تَدۡعُواْ فَلَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ ﴾ ( الإسراء : ١١٠ ) هاتە خوارەوە .

کاتێکیش کـە موسـڵمانان بـۆ کوژاندنـەوەی وشـەی ( رسـول الله ) ناڕەزاییـان دەرئەبڕیی و ، دەنگیان بەرز ئەکردەوە ، حوەیطـەبی کـوڕی عەبـدولعوززای ئەنـدامی نوێنەری قوڕەیش سەری لەو کارەی هاوەڵان سووڕ ئەما و ، سەیری میکـرەزی کـوڕی حەفصی ئەکرد و ئەیوت : تا ئێستە کەسم نەدیوە وەك ئەمانـە بـەرگریی لـە دینـی خۆی بکات !!

سەرەنجام پەیمانەکە بەم شێوەیە نووسرا :

( باسمك اللّهم ، هذا ما اصطلح عليه محمد بن عبدالله وسهيل بن عمرو ، اصطلحا على وضع الحرب عشر سنين ، يأمن فيها الناس ويكف بعضهم عن بعض ، على أنه لا إسلال ولا إغلال ، وأن بيننا عيبة مكفوفة ، وأنه من أحب أن يدخل في عهد محمد وعقده دخل ، ومن أحب أن يدخل في عهد قريش وعقدها فعل ، وأنه من أتى محمداً منهم بغير إذن وليه رده إليه ، وأنه من أتى قريشاً من أصحاب محمد لم ترده ، وأن محمداً يرجع عنا عامه هذا بأصحابه ، ويدخل علينا قابل في أصحابه فيقيم ثلاثاً ، لا يدخل علينا بسلاح إلا سلاح المسافر ، السيوف في القُرب ) .

دوای نووسینی پەیمانەکە ، کە یەکەم جار یەك نوسخە بوو سوهەیلی کوڕی عەمر وتی : بەلای منەوە ئەبێت .

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی : بەڵکو لای من ئەبێت . ئەمەش بە نووسینەوەی نوسخەیەکی تر چارەسەر کرا ..

پاشان نۆ شاهێد کە حەوتیان موسڵمان بوون بانگ کران تا لەسەر پەیمانەکە شاهێدیی بدەن کە ئەمانە بوون :

١ ـ ئەبوبەکری صددیق .

٢ ـ عومەری کوڕی خەططاب .

٣ ـ عوثمانی کوڕی عەففان .

٤ ـ عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف .

٥ ـ سەعدی کوڕی ئەبووەققاص .

٦ ـ ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح .

٧ ـ موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی ئەنصاریی .

دوو شاهێدە قوڕەیشییەکەش ئەمانە بوون :

١ ـ حوەیطبی کوڕی عەبدولعوززا .

٢ ـ میکرەزی کوڕی حەفص .

کە ئەم پەیمانە مۆر کرا جەنگ و ئاژاوەی نێوان موسڵمانەکان و قوڕەیش کۆتایی پێ هات ، کە خەریك بوو لە دەشتی حودەیبییەدا خوێنی هەردوولا بڕژێ .

هەروەها بۆ ماوەی دە ساڵ جەنگ لە نێوان موسڵمانەکان و قوڕەیشدا وەستا ، دوای ئەوەی کە چەند جەنگێکی خوێناویی لە نێوانیاناندا رووی دا .

هەروەها ئەم پەیمانە جەنگی نێوان دوو هۆزی گەورەی دراوسێی حەرەمی کۆتایی پێ هێنا . ئەوەبوو هۆزی خوزاعە و هۆزی کینانەش بۆ ماوەی دە ساڵ لەسەر ئاشتیی ڕێك کەوتن ، دوای ئەوەی کە خوزاعە چووە پاڵ موسڵمانەکان و کینانەش چووە پاڵ قورەیش . مەبەست لە هۆزی کینانە نەوەی بەکری کوڕی کینانەی کوڕی خوزەیمەی کوڕی مودریکەی کوڕی ئیلیاسی کوڕی نەزاری کوڕی عەدنانە ...

لەوەو پێش قورەیش و کینانە ناجۆر بوون ، هەتا ئەوەبوو کە قورەیش سوپای بەرەو بەدر هێنا ، بۆ جەنگی بەدر ، ئەترسا کینانە لە دواوە دەستیان لێ بووەشێنێ ، بۆ ئەمە سوراقەی کوڕی مالیکی کینانی بەڵێنی پێ دان تا لە خۆیان بێخەم بن و بچن بۆ جەنگی موسڵمانان .

بەڵام خوزاعە دوژمنی قورەیش نەبوو و ، هیچ جەنگ و هەرایەکیش لە نێوانیان‌دا ڕووی نەدابوو ، بەڵکو لە سەردەمی نەفامیی و سەردەمی ئیسلامیش‌دا ، هەتا پەیمانی حودەیبیە ، قورەیش و خوزاعە دۆست بوون و ، خوزاعە خۆیان بە خاڵوانی قورەیش ئەژمارد و ، بودەیلی کوڕی وەرقائی خوزاعییش کە سەرۆکی خوزاعە بوو لە مەککەدا ئەژیا و خانوو و خێزانیشی لەوێ بوو .. بەڵام کە ئیسلام هات ، خوزاعە دۆستایەتیی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ هەبوو ، هەرچەندە موسڵمان نەبووبوون .. هەتا ئەوەبوو لە غەزای ( حمراء الأسد ) دا مەعبەدی کوڕی ئەبومەعبەدی خوزاعیی دڵسۆزیی بۆ موسڵمانەکان نواند ..

بەڵێ ، قورەیش و کینانە دوژمنایەتی‌یان هەبوو ، بەڵام چونکە هەردووکیان دوژمنی ئیسلام بوون ، لە یەك نزیك کەوتبوونەوە .. ئەوەبوو لە جەنگی ئوحوددا، جەنگاوەریان بە سەرکردایەتیی حولەیسی کوڕی زەببان بۆ یارمەتیی قورەیش ، بەشداری‌یان کرد و ، وەك لە پێشەوەش باس کرا چەند کەتیبەیەکی کینانە بە سەرکردایەتیی حولەیس بەشداریی حودەیبیەیان کرد، تا ئەوەبوو حولەیس بۆی دەرکەوت کە قورەیش تاوانبارە و موسڵمانەکان بێ‌تاوانن و کشایەوە ..

شایانی باسە کە نوێنەری هەردوو هۆزی خوزاعە و کینانە ئامادەی وت و وێژەکانی حودەیبیە بوون و ، سەرەنجام ئەوانیش چوونە ناو پەیمانەکەوە و ، بەڵێنی پابەندبوونیان دا .

بەڵام هەر ئەو ڕۆژە لەلایەن قورەیشەوە دژایەتیی دەستی پێ کرد ، ئەوەبوو حوەیطەب دوژمنایەتیی خۆی بۆ خوزاعە دەربڕیی ، لەسەر ئەوەی کە چوونەتە پەنای موسڵمانەکانەوە و ، بڕیاری دا کۆمەکیی کینانە ( واتە نەوەی بەکر ) بکات لە دژیان.

پێش ڕێككەوتنی حودەیبیە چەند گەنجێكی بێدەسەلاَت لە مەككە هەڵاتبوون و هاتبوونە پەنای موسڵمانەكانەوە . كە پەیمانەكە بەسترا قورەیش داوای گێڕانەوەی ئەو موسڵمانانەیان ئەكرد ، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ بە گوێی نەكردن و نەیگێڕانەوە ، بەڵكو فەرمووی : (( هم عتقاء الله )) .

هەرچەندە هەردوولا پەیمانیان بەست ، بەڵام لەلایەن قورەیشەوە هەندێ پێیان خۆش بوو ئاژاوە بگێڕن و ڕێككەوتنەكە تێك بدەن .

كە پەیمانەكە بە تەواویی مۆركرا و هەرلایەكیان نوسخەیەكی لای خۆی هێشتەوە و، نوێنەرانی قورەیش بەرەو مەككە گەڕانەوە ، پێغەمبەری خوایش ﷺ بڕیاری دا بە خۆی و هاوەڵانیەوە بەرەو مەدینە بگەڕێنەوە . بۆ ئەمە فەرمانی بە هاوەڵان دا كە ئیحرام بشكێنن و وشترەكان سەر ببڕن و ، سەریشیان بتاشن ..

موسڵمانەكان زۆریان پێ ناخۆش بوو بەو شێوەیە بگەڕێنەوە . ئەوان پێیان خۆش بوو بچنە كەعبەوە و طەوافی بكەن و وشترەكانی ( هدي ) سەر ببڕن و لەوێ سەر بتاشن . بۆیە سەرەتا بە گوێی پێغەمبەریان نەكرد و ، كەسێك وەڵامی نەدایەوە ..

پێغەمبەری خوا ﷺ تا ئێستە هاوەڵانی بەو شێوە نەدیبوو .. لەوەوپێش هەر فەرمانێكی دەربكردایە خێرا جێ بەجێ ئەكرا .. بەڵام ئەمڕۆ هاوەڵان لە مەراقا بە گوێی ناكەن .. بە تووڕەیی و خەمباریەوە چووە ناو خێوەتەكەی ، كە ئوم سەلەمەی هاوسەری تێدا بوو . كە ئوم سەلەمە خەفەت و تووڕەیی بە دەم و چاویەوە دیی پرسیاری لێ كرد و ، ئەویش هەواڵی دایە كە هاوەڵان نە ئیحرامیان شكاندووە و ، نە وشتریان سەر بڕیوە و ، نە سەریشیان تاشیوە .

لێرەدا ئوم سەلەمە دەورێكی باشی بینیی بۆ دڵدانەوەی پێغەمبەری خوا و ، بۆ چارەسەركردنی قەیرانەكەش . هەروەها سەلماندی كە ڕاوێژكردن لە ئیسلامدا كارێكی یەكجار مەزنە و ، ڕای ڕاست لە هەموو كەسێ وەر ئەگیرێ ، ئیتر سا لە ئافرەتەوە دەرچێ یان لە پیاوەوە .. لە گەورەوە دەرچێ یان لە بچووكەوە .. گرنگ ئەوەیە خزمەت بكات .

ئوم سەلەمە ئاماژەی بۆ كرد كە جارێكی تر پێیان نەڵێ ئەو كارە بكەن ، بەڵكو بە شێوازێكی تر لەگەڵیان بجووڵێتەوە ، خۆی كارەكە ئەنجام بدات . ئەوەبوو وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! خۆت تەشریف بەرە بۆ لای وشترەكەت و سەری ببڕە ، ئیتر ئەوان چاوت لێ ئەكەن .

ئەم وتەیە بەلای پێغەمبەری خواوە ﷺ زۆر جوان بوو ، بۆیە خێرا جێبەجێی کرد . بە دەستی پیرۆزی خۆی وشتری ( هدي ) ەکەی خۆی سەربڕیی .. هەر کە ئەم دەستی بە سەربڕین کرد ، دەست بەجێ هاوەڵانیش ، بە چاوکردن لە پێغەمبەری خوا ﷺ ، کەوتنە پێش بڕکێی وشتر سەربڕین .. پاشان سەرتاشەکەی کە خیراشی کوڕی ئومەییەی خوزاعیی بوو بانگ کرد و سەری تاشیی و ، هاوەڵانیش دەستیان بە تاشینی سەری یەکتریی کرد ، هەتا خەریك بوو لە خەفەتدا یەکتریی بکوژنەوە .

لەلای واقیدیی وەها هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ چووە ژوورەوە ، لە تووڕەیی‌دا ڕاکشا و ، کە ئوم سەلەمە پرسیاری ئەو خەفەت و ناڕەحەتی‌یەی لێ کرد ، فەرمووی: (( عجباً يا أم سلمة ! إني قلت للناس إنحروا واحلقوا وحلّوا مراراً ، فلم يجيبني أحد من الناس إلى ذلك ، وهم يسمعون كلامي وينظرون في وجهي !! )) . فەرمووی : ئوم سەلەمە ، شتێکی سەیر .. چەند جارێك بە خەڵکەکەم وت وشترەکان سەر ببڕن و سەرتان بتاشن و ئیحرام بشکێنن ، کەچیی تاقە کەسێك بە گوێمی نەکرد ، بە مەرجێ قسەکەمیان ئەبیست و سەیریشیان ئەکردم .

لە کاتی ئیحرام شکاندن‌دا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەحمەتی کرد لەوانەی کە سەریان تاشیوە کە فەرمووی : (( رحم الله المحلّقين )) . وتیان : ئەوانەش کە سەریان کورت کردۆتەوە ، ئەی پێغەمبەری خوا ؟ فەرمووی : (( يرحم الله المحلقين )) . وتیان : ئەوانەش کە سەریان کورت کردۆتەوە ، ئەی پێغەمبەری خوا ؟ فەرمووی : (( يرحم الله المحلقين )) . وتیان : ئەوانەش کە سەریان کورت کردۆتەوە ؟ فەرمووی : (( والمقصرين )) . کە هاوەڵان پرسی‌یان : ئەی پێغەمبەری خوا ! بۆچ ڕەحمەتت بە تەنیا بۆ ئەوانە نارد کە سەریان تاشیوە ؟ فەرمووی : (( لأنهم لم يشكوا )) . فەرمووی : چونکە ئەوان گوێڕایەڵ بوون ..

**پانزەهەم : وشترەکەی ئەبوجەهل**

کاتێك کە ئەبوجەهل هات بۆ جەنگی بەدر و سەرکردەی سوپای قوڕەیش بوو ، وشترێکی میهریی ڕەسەنی پێ بوو ، کە دوای سەرکەوتنی موسڵمانەکان لە بەدردا ، کەوتە دەست موسڵمانەکان و لەگەڵ دەستکەوتەکانی تردا بۆ جەنگ کەڵکی لێ وەرئەگیرا و ، لەناو وشترەکانی صەدەقەدا بۆ پەڕین بەکار ئەهێنرا ، تا ئەوەبوو لە هێرشی ( غابە ) دا عویەینەی کوڕی حیصن لەگەڵ وشترەکانی تردا دایە بەر و ، دوایی موسڵمانەکان فریاکەوتن و لێیان سەندەوە .

جا بۆ داخی دڵی قورەیش ، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم وشترەشی لەگەڵ وشترەکانی ( هدي ) دا هێنا بوو تا لە مەککەدا سەرببڕێت .
کە ئەو وشترە گەیشتە ناوچەی حودەیبیە و لەگەڵ وشترەکانی تردا ئەلەوەڕێنرا ، بەرەو مەککە هەڵات ، بۆ نیشتمانی راستەقینەی خۆی ، هەرچەندە ئەو ماوەیە لە پانزە میل زیاتر ، و ، چوار ساڵ ئەبوو لەو ناوە بڕرا بوو . راستەوخۆ چووەوە بەر دەرگای ماڵەکەی ئەبوجەهل و لەوێ چۆکی دادا ، ئەوسا خەڵکیی پێیان زانیی .. تا ئەمە رووی دا پەیمانی حودەیبیە مۆر کرا و ئەبوایە ئەو وشترە بگەڕێتەوە بۆ موسڵمانەکان . بۆ ئەمە عەمری کوڕی عەنەی سوللەمیی چوو بە دوایدا و ، دوای ئاگادارکردنی سوهەیلی کوڕی عەمر فەرمان درا بە گێڕانەوەی وشترەکە . بەڵام هەندێ لە هەرزەکارانی مەککە پێیان خۆش بوو ئەو وشترە ، کە یادگاریی ئەبوجەهلی سەرۆکیان بووە ، نەنێرنەوە ، بۆیە ئامادە بوون لە نرخی ئەو وشترەدا صەد وشتر بدەن بە موسڵمانەکان . کە ئەم باسەش گەیشتەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ دەری بڕیی کە ئەو پێشنیارەی وەرئەگرت و بە صەد وشتر رازیی ئەبوو ئەگەر ئەو وشترە بۆ ( هدي ) ناوی لێ نەنرایە . ئەوەبوو هێنرایەوە لە حودەیبیە لە بری حەوت کەس سەر بڕرا ، کە لەوانە ئەبوبەکر و عومەریشیان لەناودا بوو .

**شانزەهەم : کەم بوونەوەی خۆراک**

کە پەیمانەکە بەسترا و جەنگ لە نێوان موسڵمانەکان و قورەیشدا هەڵ گیرا ، پێغەمبەری خوا ﷺ لە وشترەکانی ( هدي ) بیست وشتری بە پیاوێکی هۆزی ئەسلەم دا ناردن بۆ مەککە تا لەوێ سەر ببڕێن و دەرخواردی دانیشتوان بدرێن . ئەوەبوو ئەو پیاوە لە نزیك مەروەدا سەری بڕین و ، بە پێی ئامۆژگاریی پێغەمبەری خوا ﷺ گۆشتەکەی دابەش کرد ..
دوای ئەوە پێغەمبەر و هاوەڵان لە رێی ( مرّ الظهران ) ەوە ، کە ئەمڕۆ پێی ئەڵێن: ( وادي فاطمة ) ، بە رێگای ئاساییدا گەڕانەوە مەدینە .
جا چونکە موسڵمانەکان ماوەیەکی زیاتریان پێ چوو، لە کاتی گەڕانەوەیاندا ، بەر لەوەی بگەنە عوسفان خواردنیان کەم بوویەوە و ، برسێتیی رووی تێ کردن . ئەوانیش دادی ئەمەیان هێنایە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و ، داوایان لێ کرد کە

مۆڵەتیان بدات تا ئەو وشترانەی کە پێیانە و ، بۆ سواربوون و کەل و پەل هەڵ گرتن کەڵکیان لێ وەرئەگرن ، سەریان ببڕن .

کە عومەری کوڕی خەططاب بیستی وا خەریکە پێغەمبەری خوا ﷺ ماوەی سەربڕینی وشترەکان ئەدات ، بە پەلە هاتە خزمەتی و فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ! شتی وەها نەکەیت . ئەو خەڵکە وا چاکە ولاغەکانیان بمێنن ، فەرمان بدە با چ خواردنێکیان پێ ماوە بیهێنن و ، لە خوا بپاڕێرەوە بەرەکەتی تێ بخات .

بۆ ئەمە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا چیی سفرەیان لایە رایان بخەن ، پاشان جارچی‌یەکەی جاڕی دا کە هەر کەس شتێك خۆراکی لا ماوەتەوە هەڵی ڕێژێتە سەر سفرەکان.

هی وا هەبوو دەنکە خورمایەکی ئەهێنا و ، زۆربەی خەڵکەکەش هیچی نەئەهێنا هی واش هەبوو مشتێك ئارد ، یان سەویقی ئەهێنا .. سەرەنجام شتێکی زۆر کەم کۆکرایەوە . پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هێنایە سەر سفرەکان و ، دوعای کرد خوا بەرەکەتی تێ بخات . پاشان فەرمانی دا موسڵمانەکان دەفرەکانیان بهێننە پێشەوە . راویی دەری ئەبڕێ کە هەرکەسە ئەوەندە خۆراکی ئەبرد ، هی وایان هەبوو بۆی هەڵ نەئەگیرا .. کاتێکیش کە کەل و پەلیان پێچایەوە و ، باریان کرد بە دڵی خۆیان بارانیان بۆ باریی و ، موسڵمانەکانیش لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا دابەزین و ئاویان خواردەوە و ، وتاریشی بۆ دان ..

**حەڤدەهەم : قورئان باسی حودەیبیە ئەکات**

قورئانی پیرۆزیش هاتە خوارەوە تا باسی ئەم پەیمانە گەورەیە بکات و ، ئەم پەیمانەی بە سەرکەوتنێکی وەها گەورە لە قەڵەم دا بۆ ئیسلام و موسڵمانان ، ناوی نا ( الفتح المبين ) ، کە ئەفەرموێ :

﴿ إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ﴿١﴾ لِّيَغْفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ وَيَهْدِيَكَ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ﴾ (الفتح : ١ ـ ٢) .

شایانی باسە کە زۆربەی زانایانی تەفسیر و فەرموودە لەسەر ئەو رایەن کە مەبەست لە ( الفتح ) پەیمانی حودەیبیەی مێژوویی‌یە، وەك لە بوخاریی‌دا هاتووە .

هەر لەم سوورەتەدا خوای گەورە ستایشی ئەوانەی کردووە کە لە ژێر درەختەکەدا پەیمانی مردنیان بە پێغەمبەری خوا ﷺ داوە و ، رەزامەندیی خۆیشی بۆیان تۆمار کردووە کە ئەفەرموێ :

﴿ لَّقَدْ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ﴾ ( الفتح : ١٨ ) .

ئەهلی تەفسیر ( سكینة ) یان بە دڵ ئارامیی لێك داوەتەوە ، كە بریتییە لە پەیمانی ( رضوان ) و ، ( الفتح القریب ) یشیان بە رێكەوتنی حودەیبیە وتووە .

قورئان کاری ئەو پەیماندەرانەش یەکجار بەرز ئەنرخێنێ ، بە رادەیەك وای لێك ئەداتەوە کە پەیماندانیان بە پێغەمبەری خوا ﷺ پەیماندانە بە خوای گەورە ، کە ئەمەش بەرزترین پلەی رێزلێگرتنە ، کە ئەفەرموێ :

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ يَدُ ٱللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ ۚ فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَوْفَىٰ بِمَا عَٰهَدَ عَلَيْهُ ٱللَّهَ فَسَيُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴾ ( الفتح : ١٠ ).

پاشان هەڕەشە لەو مونافیق و موشریکانەی ئەعراب ئەکات کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەو گەشتە مێژوویی‌یەی‌دا بە لایاندا تێ پەڕیی و ، داوای لێ کردن لە گەڵیا بڕۆن، کەچیی ئەوان ترسنۆك بوون و ، نەیان وێرا ، چونکە وایان ئەزانیی سوپای ئیسلام بەرگەی سوپای مەککە ناگرێ ، قورئان ئەفەرموێ :

﴿ وَيُعَذِّبَ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلْمُشْرِكِينَ وَٱلْمُشْرِكَٰتِ ٱلظَّآنِّينَ بِٱللَّهِ ظَنَّ ٱلسَّوْءِ ۚ عَلَيْهِمْ دَآئِرَةُ ٱلسَّوْءِ ۖ وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَلَعَنَهُمْ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَهَنَّمَ ۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ﴾ ( الفتح : ٦ ) .

دیسان قورئان کۆمەڵێکی تر دەرئەخات کە لە ناو لیتەی نیفاق‌دا چەقیون . ئەوانە لە سەرەتاوە وایان دەرئەبڕیی کە دەستیان بە ماڵ و منداڵیانەوە گیراوە و ناتوانن بکەونە گەل سوپای ئیسلام ، کەچیی لە راستیی‌دا وایان ئەزانیی موسڵمانەکان بۆ شوێنێ ئەچن کە بە سەلامەتیی نەگەڕێنەوە و ، بەو ئاسانیی‌یەش لە چنگی قورەیش دەرباز نابن . کاتێکیش کە بە سەربەرزیی گەڕانەوە ، داوایان ئەکرد پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێخۆش‌بوونیان بۆ بکات ، ئەفەرموێ :

﴿سَيَقُولُ لَكَ ٱلْمُخَلَّفُونَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ شَغَلَتْنَآ أَمْوَٰلُنَا وَأَهْلُونَا فَٱسْتَغْفِرْ لَنَا ۚ يَقُولُونَ بِأَلْسِنَتِهِم مَّا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ ۚ قُلْ فَمَن يَمْلِكُ لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا إِنْ أَرَادَ بِكُمْ ضَرًّا أَوْ أَرَادَ

بِكُمْ نَفْعًا ۚ بَلْ كَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿١١﴾ بَلْ ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَنقَلِبَ ٱلرَّسُولُ وَٱلْمُؤْمِنُونَ إِلَىٰٓ أَهْلِيهِمْ أَبَدًا وَزُيِّنَ ذَٰلِكَ فِى قُلُوبِكُمْ وَظَنَنتُمْ ظَنَّ ٱلسَّوْءِ وَكُنتُمْ قَوْمًۢا بُورًا ﴾(الفتح:١١ -١٢)

**پاشان باسی گرنگیی ئەم ڕێکەوتنە ئەکات کە ئەگەر جەنگ ڕووی بدابایە ، ئەوا زۆرێك لە موسڵمانە کەمدەسەڵاتەکان بە دەستی سوپای ئیسلام ، بە نەناسین و نەزانین، تیا ئەچوون . جا ڕزگاربوونی ئەمانە بووە هۆی خێر و بێر بۆ کافرەکانیش ، ئەگینا ئەوان سزای سەخت ئەدران . قورئان ئەفەرموێ :**

﴿ هُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوكُمْ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَٱلْهَدْىَ مَعْكُوفًا أَن يَبْلُغَ مَحِلَّهُۥ ۚ وَلَوْلَا رِجَالٌ مُّؤْمِنُونَ وَنِسَآءٌ مُّؤْمِنَٰتٌ لَّمْ تَعْلَمُوهُمْ أَن تَطَـُٔوهُمْ فَتُصِيبَكُم مِّنْهُم مَّعَرَّةٌۢ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۖ لِّيُدْخِلَ ٱللَّهُ فِى رَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ لَوْ تَزَيَّلُوا۟ لَعَذَّبْنَا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴾ ( الفتح : ٢٥ ) .

**هەروەها قورئان باسی سەرکەوتوویی کاری ئەم پەیمانە ئەکات کە بووە مایەی پاراستنی خوێنی هەردوولا :**

﴿وَهُوَ ٱلَّذِى كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ مِنۢ بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴾ ( الفتح : ٢٤ ) .

**کاتێکیش کە موسڵمانان لە حودەیبیە گەڕانەوە تەئکیدی لەسەر ئەوە کردەوە ، کە ئەو هەواڵەی پێغەمبەرەکەیان پێیانی داوە کە ئەچنە مەککەوە ، ڕاستە و بە سەری بەرزەوە ئەچن بۆ عومرە ، کە ئەفەرموێ :**

﴿ لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ ۖ لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ ۖ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا۟ فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا ﴾ ( الفتح : ٢٧ ) .

**هەروەها قورئان هاتە خوارەوە و، مژدەی بە ئەهلی ئیمان دا بە فەتحی خەیبەر :**

﴿ وَعَدَكُمُ ٱللَّهُ مَغَانِمَ كَثِيرَةً تَأْخُذُونَهَا فَعَجَّلَ لَكُمْ هَٰذِهِۦ وَكَفَّ أَيْدِىَ ٱلنَّاسِ عَنكُمْ وَلِتَكُونَ ءَايَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ وَيَهْدِيَكُمْ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ﴾ ( الفتح : ٢٠ ) .

**( فعجل لكم هذه ) مەبەست لە خەیبەرە .**

هەروەها ئاماژە بۆ هەڵوێستی مونافیقە ترسنۆکەکان ئەکات کە نەیان وێرا بەشداریی حودەیبیە بکەن ، کەچیی کە هەست ئەکەن موسڵمانەکان لە خەیبەردا دەستکەوتیان ئەبێت ، پێیان خۆشە لەگەڵیانا بچن . جا قورئان فەرمان ئەدا بەسەر پێغەمبەری خوادا ﷺ تا نەهێڵێ ئەو نامەردانە بچن لەگەڵیانا . ئەمەش ئیعجازێکی قورئانە کە لە پێشەوە ئایەتەکە دابەزیوە و ، دەری ئەخات کە مونافیقەکان چ هەڵوێستێکیان ئەبێت و چیی ئەڵێن :

﴿ سَيَقُولُ ٱلْمُخَلَّفُونَ إِذَا ٱنطَلَقْتُمْ إِلَىٰ مَغَانِمَ لِتَأْخُذُوهَا ذَرُونَا نَتَّبِعْكُمْ يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُوا كَلَٰمَ ٱللَّهِ قُل لَّن تَتَّبِعُونَا كَذَٰلِكُمْ قَالَ ٱللَّهُ مِن قَبْلُ فَسَيَقُولُونَ بَلْ تَحْسُدُونَنَا بَلْ كَانُوا لَا يَفْقَهُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ ( الفتح : ١٥ ) .

بەمە بڕیاری ئاسمان وەها بوو کە تەنها بەشدارانی پەیمانی حودەیبیە لە غەزای خەیبەردا بەشداریی بکەن ، چونکە قورئان بەڵێنی دەست کەوتی زۆری خەیبەری داوە بۆ سوپای ئیسلام ، لەبەر ئەوە نابێ ترسنۆکانی ڕۆژی سەخت لە جادەی پاندا سنگ دەرپەڕێنن ..

لەگەڵ ئەوەشدا قورئان ئەو ئەعرابە دواکەوتووانە لە حودەیبیە دڵ ئەداتەوە کە ئەگەر ڕاست ئەکەن ، دوای خەیبەر ، جەنگ و غەزای تر دێنە پێشەوە ، با مەردانە قۆڵی لێ هەڵ بماڵن و ، خۆیان بکەنە شیاوی ئەوە کە خوا پاداشتی چاکیان پێشکەش بکات . خۆ ئەگەر وەك جاری پێشوو دیسان پشت هەڵ ئەکەن ئەوا خوا سزایەکی سەختتان ئەدات ، کە ئەفەرموێ :

﴿ قُل لِّلْمُخَلَّفِينَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ سَتُدْعَوْنَ إِلَىٰ قَوْمٍ أُولِي بَأْسٍ شَدِيدٍ تُقَٰتِلُونَهُمْ أَوْ يُسْلِمُونَ فَإِن تُطِيعُوا يُؤْتِكُمُ ٱللَّهُ أَجْرًا حَسَنًا وَإِن تَتَوَلَّوْا كَمَا تَوَلَّيْتُم مِّن قَبْلُ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴾ ( الفتح : ١٦ ) .

لە ڕاستییدا ئەو جەنگە سەختانەش ، وەك حونەین و یەمامە و فارس و ڕۆم ، ڕوویان دا و ئەوانەی کە خۆیان بە خوا فرۆشتبوو دەوری چاکیان بینیی و بەو پاداشتە گەیشتن کە خوای گەورە بەڵێنی دابوو ..

ئەهلی حودەیبیە پایەی تایبەتییان هەیە . لە صەحیحی بوخارییدا جابیری کوڕی عەبدوڵڵا وتوویە : پێغەمبەری خوا ﷺ پێمانی فەرموو : (( أنتم خير أهل الأرض )) . فەرمووی : ئێوە چاکترینی ئەهلی زەویین . جابیر ئەڵێ : ئێمە ، لە ڕۆژی حودەیبیەدا

هەزار و چوارصەد کەس بووین و ، گەر ئێستە بم بینیایە شوێنی درەختەکەم پیشانتان ئەدا.

هەروەها لە جابیرەوە ئەگێڕنەوە کە وتوویە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە : (( لا یدخل النار أحد ممن بایع تحت الشجرة )) . رواه الشعبي مسنداً . فەرموویە : هەرکەسێ لە ژێر درەختەکەی حودەیبییەدا بەیعەتی کردبێ ناچێتە ئاگرەوە .

لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەری خوا ﷺ دەری بڕیوە کە خوای گەورە چاوپۆشیی لە هەموو ئەهلی بەدر و حودەیبییەی کردووە کە فەرموویە : (( یاأیها الناس ! إن الله غفر لأهل بدر والحدیبیة )) . ( إبن عبدالبر ) یش لە ( غزوات ) ەکەیدا وتوویە : هیچ غەزایەك هاوتای بەدر ناکات ، یان لێی نزیك نابێتەوە ، جگە لە غەزای حودەیبییە .

دەربارەی فەرمایشتی خوای گەورەش ﴿ والسابقون الأولون من المهاجرین والأنصار﴾ شەعبیی وتوویە : ئەمانە ئەوانەن کە ئامادەی پەیمانی ( رضوان ) بوون.

**هەژدەهەم : پەندەکانی حودەیبییە**

ڕێك‌کەوتنی حودەیبییە دەرس و ئامۆژگاری‌یەکی زۆری تێدا بوو بۆ موسڵمانان کە ئەمە هەندێکیانن .

**( ١ ) وریایی و ئاگاداربوون :**

بەڵێ پێغەمبەر و موسڵمانەکان بە نیازی عومرەوە بەرەو مەککە کەوتنە ڕێ و ، ئەو نیازە ئاشتی‌یانەیان بۆ هەموو لایەك سەلماند ، لەگەڵ ئەوەشدا چەکی بە هاوەڵانی هەڵ گرت و ، کۆمەڵێ سوارچاکی خستە پێشی سوپاوە و ، فەرمانده‌یی‌یشی سپارد بە عەببادی کوڕی بیشر ، تا ڕێ بۆ سوپای ئیسلام پاك بکەنەوە و ، لە داو و تەڵەی دوژمن وریا بن ، نەوەکو قوڕەیش بە سوپاوە بێتە ڕێیان و شەڕیان پێ بفرۆشێ. هەروەها پیاوێکیشی نارد بۆ ناو مەککە تا هەڵوێستی قوڕەیش بۆ ئەم کارە هەڵ بسەنگێنێ و ، فەرماندەی گشتیی موسڵمانان ئاگادار بکات ، تا نەخشەی پێویست بەرچاو بگیرێت . ئەوەبوو موسڵمانان لە ئەسپسوارانی خالید ئاگادار بوون و ڕێیان گۆڕیی تا جەنگ ڕوو نەدات ..

**( ٢ ) خۆ گرتن لە کاتی هەڵەشەیی نەفاماندا :**

کارێکی زۆر جوانە کە موسڵمان نەچێتە ئاستی نەفامی بێ‌پەروەردەوە ، بەوەی کە بەرامبەر کاری هەرزە و نەفامان دان بە خۆیدا بگرێ و ، نەهێڵێ مرۆڤەکان تووشی زیان ببن و ، پرۆسەی گەیاندنی ئیمان بە دڵەکان دوا نەکەوێت ..

ئەوەبوو قورەیش بیستیان کە موسڵمانەکان نیازی سەردانی کەعبەی پیرۆزیان هەیە و ، بە شێوەیەکی ئاشتیی هاتوون ، کەچیی شەیتان چووە بنکلێشیان و سوپایەکی زۆریان جەم کرد و ، رێیان لە موسڵمانان گرت ، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ بە حەکیمانە هەڵس و کەوتی کرد .. هەتا قورەیش هەوڵیان دا دەست لە ئۆردوگای موسڵمانان بووەشێنن کۆمەڵە پیاوێکیشیان لێ بە دیل گیران ، بەڵام لەلایەن سەرکردایەتیی موسڵمانانەوە ئازاد کران .. ئەگەر جەنگ رووی بدایە لەوانەیە لە ریزی موسڵمانەکاندا زۆرێك شەهید بکرابانایە و ، زۆرتریش لە سوپای قورەیش بکوژرانایە ، کە ئەوەبوو زۆربەیان لەوە و دوا بوونە فەرمانـدەی سوپای ئیسلام بۆ گەیاندنی بە گەلانی جیهان .

( ٣ ) رێزگرتن لە رەخنەگری مەبەست پاك :

لە کاتی بەستنی پەیمانەکەدا ، هەندێ لە موسڵمانان بە هەندێ لە بەندەکانی ناڕازیی بوون .. هەرچەندە ئەیانزانیی ئەم کارە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنجامی ئەدا ، بەڵام لە دڵسۆزیی خۆیانەوە ، خۆیان پێ نەئەگیرا و ، وایانئەزانیی ئەو خاڵانە بە زیانی ئیسلام تەواو ئەبن ، بۆیە دەنگی ناڕەزاییان لێ بەرز بوویەوە . جا پێغەمبەری خوا ﷺ چاك ئەیزانیی کە ئەوانە نییەتیان پاکە ، بۆیە بە حەکیمانە تێی گەیاندن کە ئەمە مایەی سەرکەوتنی ئیسلامە ، نەك سەرشۆڕیی ..

( ٤ ) روونکردنەوەی خاڵێکی گرنگ :

یەکێ لەو خاڵانەی کە هاوەڵان پێی نارەحەت بوون ، ئەو خاڵە بوو کە هەر کەس لەلایەن قورەیشەوە بێتە ناو موسڵمانەکان بیگێڕنەوە ، ئەگەرچیی موسڵمانیش بێ ، بەڵام بە پێچەوانەوە هەر کەس بچێتە لای قورەیش ئەوان نەیگێڕنەوە . جا کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی دەرکەوت وا هاوەڵان بۆ ئەوە خەم بارن ، بۆی روون کردنەوە کە فەرمووی : (( أما من أراد أن يلحق بنا منهم فسيجعل الله تعالى له مخرجاً ولنا . ومن أتاهم منا فأبعده الله ، وهم أولى بمن كفر )) . فەرمووی : هەر کەسێك ویستی بێتە لای ئێمە و وەرمان نەگرت ، ئەوا خوای گەورە دەروو لەویش و لە ئێمەش ئەکاتەوە .. هەر کەسیش ئێمەی بەجێ هێشت و چووە لای ئەوان و خوا لە دین وەری گێڕا و دووری خستەوە ، ئەوا هەر ئەوان شایانی ئەو کەسەن کە کافر بێتەوە .

کەواتە موسڵمانان تەنها ئەوانەیان لا مەبەستە کە بە دڵ و بە گیان لەگەڵ ئیسلام دان ، بۆیە دینی خوا هیچ کەس بە زۆر نابەستێتەوە .

( ٥ ) بەڵێن بەسەربردن :

گەورەترین دەرسی حودەیبیە ئەو بەڵێن بەسەربردنەیە کە موسڵمانەکان توانی‌یان بە مەردانە بەسەری بەرن ، هەر چەندە تووشی تاقیی‌کردنەوەیەکی یەکجار سەخت هاتن . ئەو بەڵێن بەسەربردنەش بریتیی بوو لە رووداوە گرنگەکەی ئەبوجەندەل .

کە ئەبوجەندەل رای کردە ناو موسڵمانەکان و ، ئەوانیش بە گەرمیی پێشوازی‌یان لێ کرد ، کەچیی باوکی دەستی بە لێدانی کرد و ، دەستی دایە کاکۆڵی و دایە بەر هەتا بی‌باتەوە بۆ مەککە و لەوێ بەندی بکات . سەرەنجام سوهەیل بە پێی پەیمانەکە ئەبوجەندەلی وەرگرتەوە ، هەرچەندە خەریك بوو خەم و خەفەت موسڵمانەکان بکوژێ. بەڵام لەبەر ئەوەی کە موسڵمانان بە پەیمان‌شکێن دەرنەچن ، خۆیان گرت و دەستیان نەکردەوە .

**نۆزدەهەم : دەستکەوتەکانی حودەیبیە**

ئێستاش با هەندێ لە دەستکەوتە گرنگەکانی رێککەوتنی حودەیبیە بخەینە بەردەست خوێنەری ئازیز :

( ١ ) **دان‌نانی قورەیش بە قەوارەی موسڵمانەکان‌دا** :

لەو کاتەوە کە ئیسلام هات و کۆمەڵێك مرۆڤی بەرێز شوێنی کەوتن ، هەتا پەیمانی حودەیبیە ، تا لەو ماوەیەدا قورەیش بە هیچ شێوەیەك دانی بە قەوارەی موسڵمانەکان‌دا نەنەنا ، بەڵکو بە کۆمەڵێك رووتەڵەی رێ بڕ و لە یاسا دەرچوو لە قەڵەمی ئەدان و ، بە پێویستی ئەزانیی بیان‌هێنێتەوە ژێر رکێفی خۆی . ئیتر بە هیچ شێوەیەك بە بیری قورەیش‌دا نەئەهات کە رۆژێ لە رۆژان دان بە قەوارەی موسڵمانان‌دا بنێ و ، لەگەڵیان دانیشێ و وت‌ووێژ بکەن .

کەواتە بە بەستنی پەیمانی حودەیبیە قورەیش دانی بە دەوڵەت و سوپای موسڵمانان‌دا نا.. یەکێ لە بەندەکان ئەوەبوو بۆ ماوەی دە ساڵ جەنگ بوەستێنن .

ئەوەبوو لە سەرەتادا قورەیش وەهای دەرئەخست کە هەرگیز ناهێڵێ موسڵمانەکان پێ بنێنە خاکی حەرەمەوە ، کەچیی لە پەیمانەکەدا دانی بەوەدا نا کە ئەگەر ئەمساڵ موسڵمانەکان بگەڕێنە دواوە ، ساڵێکی تر مافی ئەوەیان هەیە کە بێنە خاکی حەرەمەوە و طەوافی کەعبەی پیرۆز بکەن و دروشمەکانی عومرە ئەنجام بدەن .

( ٢ ) شارەزابوونی موشریکان لە ئیسلام :

لەو چەند رۆژەدا کە گەورە پیاوانی سوپای شیرك لە حودەیبییە مانەوە ، سەرنجی رەوشتی بەرزی پێغەمبەر و هاوەڵانیان دا و ، تێ گەیشتن کە ئەم سوپا مەزنەی ئیسلام زۆر دوورە لەو بوختانانەوە کە قورەیشی ستەمکار بە ناوی ئەوەوە بڵاوی ئەکردنەوە . ئەمەش ئەبووە هۆی بەرزبوونەوەی سومعەیان . لە هەمان کاتدا گلەیی لە قورەیش ئەکرا کە شەڕ فرۆشتن لەلایەن ئەوەوەیە ..

( ٣ ) پەرتەوازە بوونی ئۆردووگای کوفر :

کە ناوبژیوانەکان ، وەك سەرۆکی ثەقیف عوروەی کوڕی مەسعوود و ، سەرۆکی ئەحابیش حولەیسی کوڕی زەببان ؛ بۆیان دەرکەوت کە موسڵمانەکان بێ تاوانن ، کەوتنە لۆمە و گلەیی لە قورەیش و ، ئامۆژگارییشیان کرد کە واز لە موسڵمانەکان بهێنێ با بێنە مەککەوە و عومرەی خۆیان بەجێ بهێنن ؛ چونکە ئەوانیش وەك هەموو دانیشتوویەکی دوورگە مافی ئەوەیان هەیە . سەرەنجام ئەوەبوو سەرداری ثەقیف بە خۆی و سوپایەوە کشایەوە و ، وازی لە پشتگیریی قورەیش هێنا . هەروەها سەرداری ئەحابیشیش هەڕەشەی لە قورەیش کرد کە پەیمانی نێوانیان هەڵ ئەوەشێنێتەوە .

( ٤ ) کاریگەریی ژیانی موسڵمانان لەسەر بتپەرستان :

لە کاتی بەستنی پەیمانی حودەیبییەدا موسڵمانەکان و بتپەرستەکان چاویان بە یەك کەوت و ، سەرەنجام کافرەکان لە هەڵس وکەوتی موسڵمانەکان شارەزا بوون و ، بە جوانیی کاریگەریی ئیسلامیان بۆ دەرکەوت . بۆیە زۆرێك لە پیاوە ژیرەکان هەستیان بە پەروەردەی دڵ و دەروونی موسڵمانەکان کرد ، بە رادەیەك کە بە کەمتر لە دوو ساڵ ئەوەندە لەو بتپەرستانە موسڵمان بوون کە لەوەوپێش ئەوەندە موسڵمان نەبووبوون . هەتا ئەوەبوو سوپای حودەیبییەی هەزار و چوارصەد کەسیی ، لە دوای دوو ساڵ ، بۆ فەتحی مەککە گەیشتە دە هەزار کەس ، بۆیە ئەم پەیمانە پڕ فەڕ و بەرەکەتە ناو نرا ( الفتح العظیم ) .

بتپەرستەکان هەرچیی سەرنجی رەوشتی موسڵمانەکانیان ئەدا ؛ سەریان سوڕ ئەما ، چونکە لە وەفا و راستگۆیی و گوێڕایەڵیی و ئازایەتیی و مەردایەتییدا هەنگاوی زۆریان نابوو . جا ئەم سەرسووڕمانە پرسیاری بۆ دروست ئەکردن : ئەمانە چۆن بەم پلە بەرزانە گەیشتوون ؟!

عوروەی کوڕی مەسعوودی سەرداری ثەقیف سەری لە موغیرەی کوڕی شوعبەی برازازای سوڕ ئەما ، کە لە پێش موسڵمان‌بوونی‌دا چەندە زیانەخرۆ و جەردە و پیاوکوژ بوو ، کەچیی دوای موسڵمان‌بوونی بە ماوەیەکی کەم ، بووە خاوەنی متمانەیەکی وەها کە ببێتە پاسەوانی پێغەمبەری خوا ﷺ .

( ٥ ) چەکەرەی ئیمان بە گوێڕایەڵیی موسڵمانان :

کە کافران سەرنجی رێك و پێکیی ژیانی ئیمان‌دارانیان دا ، سەریان لە گوێڕایەڵیی یەکە یەکەی شوێن‌کەوتوان سوڕ ئەما . بۆ نموونە : ئەبوجەندەل بە چ حاڵە حاڵێك خۆی لە بەندیخانە دەرباز کردبێ ، کە باوکی بیانوو ئەگرێ ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بەسەردا ئەدا تا بگەڕێتەوە . ئەویش مل کەچ ئەکات و لە فەرمان دەر ناچێت . لەبەر فەرمانی سەرۆکەکەی ئەچێتەوە زیندانی پڕ لە ئەشکەنجە و ، دڵیشی پڕە لە متمانە کە خوا دەرووی لێ ئەکاتەوە .. ئیتر بیر لە هەڵگەڕانەوە و سارد‌بوونەوە لە دین ناکاتەوە .. هەروەها موسڵمانەکانیش لەبەر فەرمانی ئازیز ﷺ بێ‌دەنگ ئەبن ، هەر چەندە لەسەر دڵ و دەروونیان یەکجار سەختە برایەکی ئیمانیی ، بێ دەسەڵاتیان بەو شێوەیە بدرێتەوە دەست ستەم‌کاران . ئەوەبوو زۆرێك لە ژیرەکانی مەککە بە چاوی رێزەوە سەیری گوێڕایەڵیی سەربازانی ئیسلامیان ئەکرد .. ئەوەبوو چەکەرەی ئیمان لە دڵی فەرماندەکانیان‌دا ، بە وێنەی خالیدی کوڕی وەلید و ، عەمری کوڕی عاص و ، عوثمانی کوڕی طەلحە ، صەوز بوو و ، دوای ماوەیەك خۆیان گەیاندە مەدینە و موسڵمان بوون .

خالید کە موسڵمان بوو پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی نا ( سیف الله ـ شمشێری خوا )، کە بە راستیی هەر وابوو و ، خوای گەورە وڵاتی شامی بە دەستی ئەو فەتح کرد.. عەمریش بووە یەکێك لە فەرماندە مەزنەکانی سوپای ئیسلام کە ئەوەبوو فەتحی وڵاتی میصریش بە دەستی ئەو کرا ..

( ٦ ) ئاوڕدانەوە بەلای خەیبەر و باکووردا :

بەم پەیمانە پێغەمبەری خوا ﷺ یەك لایی بوویەوە بۆ جوولەکەی خەیبەر ، کە لە هەموو لایەك زیاتر مەترسی‌یان بۆ سوپای موسڵمانان هەبوو . چونکە لە خەیبەردا دە هەزار جەنگاوەری جوولەکە هەبوون ، کە زۆر داخ لە دڵی موسڵمانان بوون . ئەوانە زۆریش بەدەسەڵات و دەوڵەمەند بوون .. بۆیە پێویست بوو موسڵمانان ئەو مەترسی‌یە لە بانگەوازەکەیان لادەن ..

کەواتە فەتحی خەیبەر بە بەرهەمێکی پڕ بەرەکەتی پەیمانی حودەیبیە ئەژمێررێت ..

هەروەها لە کاتی پەیمانی حودەیبیەدا ، کە جەنگی نێوان موسڵمانەکان و قورەیش وەستا بوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵمەتێکی سێ هەزار کەسیی نارده سەر سنووری شام ، هەتا گەیشتە گوندی (موئتە ) و ، لە ئەنجامدا جەنگ لە نێوان سوپای ئیسلام و سوپای رۆمدا رووی دا ، کە سوپای رۆمەکان بریتیی بوو لە صەد هەزار کەس .

**( ٧ ) بانگکردنی پادشایانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست :**

لە کاتی پەیمانی حودەیبیەدا ، پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوڕی بە لای پادشا و میرەکانی دەوروبەری دوورگەی عەرەبییەوە دایەوە و ، بۆ لای هەریەکەیان یەکێ لە هاوەڵانی رەوانە کرد و ، نامەی بۆ ناردن تا بە خۆیان و گەلانی ژێر دەستیانەوە موسڵمان بن ، وەك لە بەشی داهاتوودا بە درێژە باس کراوە .

هەر لەم ساڵەدا ـ بە پێی هەندێ ریوایەت ـ عەرەق لەسەر موسڵمانان حەرام کرا و، موسڵمانان بە شێوەیەکی ناوازە دەستیان لەو کارە چەپەڵە هەڵ گرت ؛ هەرچەندە عەرەق خواردنەوە لەگەڵ خوێن و دەماریانا تێکەڵ بووبوو . ئەمەش دیارە گەورەیی ئیسلام دەر ئەخات کە حکومەتێکی وەك ئەمەریکا نەیتوانیی قەدەغەی بکات..[٨٣]

لە کۆتایی باسی حودەیبیەدا ماوە باسی شۆڕشگێڕانی ( عیص ) بکەین ، بەڵام ئەو باسە هەڵ ئەگرین بۆ شوێنی خۆی .

---

[٨٣] صلح الحديبية لباشميل : ١١٣ ـ ٣٥٦ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٣٢٥ ـ ٣٥٦ ؛ الرسول القائد لمحمود شيت خطاب : ٢٦٩ ـ ٢٨٨ ، السيرة النبوية للندوي : ٢٧٥ ـ ٢٨٥ ؛ الرحيق المختوم : ٣٤٥ ـ ٣٥٥ .

## بەشی سیی و دووهەم

# بـانـگ کـردنـی پـادشـایـان

بەستنی پەیمانی حودەیبیە سەرەتای قۆناغێکی گرنگ و نوێ بوو لە مێژووی ئیسلام‌دا .. چونکە وەك لە پێشەوە بۆ تازیزان دەرکەوت لە دوورگەی عەرەبیی‌دا سێ ئۆردوگای بەهێز و پڕمەترسیی لەبەردەم موسڵمانان‌دا بە چەك و تفاقەوە خۆیان مەلاس داوە ..

ئەوەبوو لە جەنگی ئەحزاب‌دا هەرسێ قۆڵی دوژمنایەتیی ، کە بریتیی بوون لە قورەیش و هاوپەیمانانی و ، غەطەفان و هۆزەکانی دەوروبەری و ، جوولەکەی خەیبەر کە هێلانەی پلانی نامەردانە بوون ، بە هەرسێکیانەوە هێرشیان کردە سەر مەدینە و، تەنها ئەوەبوو خوا گەیشتە فریای موسڵمانەکان ئەگینا تیاچووبوون ..

کە پەیمانی حودەیبیە بەسترا بەهێزترین سوپای ئەو سێ قۆڵە قۆڵی بەسترا ، تا واز لە دژایەتیی بهێنێ .. بەمە موسڵمانەکان هەستیان بە بارسووکیی کرد .. غەطەفانیش کە دیتی وا قورەیش وازی لە چەك هێنا ، ئەو تەماعەی بە مەدینە نەما و بیری لە هەڵمەت بۆسەر مەدینە نەما ..

بەلاّم جوولەکەی ترسنۆکی خەیبەر هەردەم بۆ هەلێك ئەگەڕان تا ئەو عەرەبە بت پەرستانە لە دژی مەدینە هەڵ بنێن . بۆیە یەکەم هەڵمەتی گەورەی سوپای موسڵمانان دوای حودەیبیە بریتیی بوو لە دەرهێنانی رەگ و ریشەی جوولەکەی خەیبەر ، تا دوورگەی عەرەبیی لە شەڕ و فیتنەیان رزگار بێت ..

بەلاّم بەر لەوەی ئەم هەڵمەتە بریێتە سەر خەیبەر ، بەڵکو دوای گەڕانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە حودەیبیە و ، لە کۆتایی ساڵی شەشەمی کۆچیی‌دا ، یان سەرەتای ساڵی حەوتەم‌دا نامەی بۆ میر و پادشایانی ناوچەکە نووسیی و ، بانگی کردن بۆ سەر ئیسلام .

کە پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە سەر ئەوە کە نامە بۆ پادشایانی ناوچەکە بنێرێ ، رۆژێکیان هاتە ناو هاوەڵانی و فەرمووی : « يا أيها الناس ! إن الله قد بعثني رحمة

وكافة ، فلا تختلفوا علي كما اختلف الحواريون على عيسى ابن مريم )) . فەرمووی: خەڵكینە ! خوای گەورە منی بە رەحمەت بۆ سەر هەموو مرۆڤ رەوانە كردووە ، جا با ئێوەش دەربارەی من ناكۆكییتان تێ نەكەوێ ، وەك حەواری‌یەكان دەربارەی عیسای كوڕی مەریەم تێیان كەوت . هاوەڵانی فەرموویان : ئەی پێغەمبەری خوا ! حەواری‌یەكان ناكۆكی‌یان چۆن تێ كەوت ؟ فەرمووی : (( دعاهم إلى الذي دعوتكم إليه ، فأما من بعثه مبعثاً قريباً فرضي وسلّم ، وأما من بعثه مبعثاً بعيداً فكهر وجهه وتثاقل )) . فەرمووی : بانگی كردن بۆ ئەوەی كە من ئێوەم بۆی بانگ كردووە ، جا هەركامیان بۆ شوێنێكی نزیكی رەوانە كرد ئەوا پێی رازیی بوو و ، رۆیشت ، هەركامیشیان بۆ شوێنێكی دووری رەوانە كرد ، ئەوا رەنگی دەم و چاوی هەڵ گەڕا و بە كارێكی گرانی زانیی و ئەنجامی نەدا .. پاشان باسی بۆ كردن كە نامە بۆ هیرەقل و كیسرا و موقەوقەس و نەجاشیی و غەیری ئەوانیش ئەنێرێ و ، بانگیان بۆ سەر ئیسلام ئەكا . بۆ ئەمە هاوەڵانی رەزامەندی‌یان نواند . كاتێكیش كە دەستی بە نووسینی نامەكان كرد پێی وترا كە بەبێ مۆر نامە گل نادەنەوە . ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ لە زیو ئەمووستیلەیەكی دروست كرد و ، بە نەخش لەسەری نووسیی : ( محمد رسول الله ) كە هەرسێ وشەكە یەك لەسەر یەك بوون ( الله ) لەسەرەوە و ( رسول ) لە ژێری‌دا و ( محمد ) یش لە ژێری ( رسول ) دا نووسرابوون :

الله
رسول
محمد

ئیتر نامەكانی بەمە مۆر ئەكردن .

ئەمەش هەندێ لە نامەكانیەتی بۆ پادشا و میرەكان :

**١ ـ نامەی بۆ نەجاشیی پادشای حەبەشە :**

با لە پێشەوە لە یادمان بێت كە لە ماوەی پێغەمبەرایەتیی پێغەمبەردا ﷺ دوو پادشا حوكمی حەبەشەیان كردووە . یەكێكیان ئەو نەجاشی‌یەیە كە لە قۆناغی مەككەدا موسڵمانەكان ، لە تاوی ئازاری قورەیش ، كۆچیان بۆ لای كرد و ، پێغەمبەری خواش ﷺ جەعفەری كوڕی ئەبوطالیبی كردە ئەمیریان و ، داوای لە نەجاشییش كرد كە جێیان بكاتەوە ، ئیتر نامەی بۆ نەنووسیی ، داوای موسڵمان بوونی لێ بكات ، چونكە وا دەرئەكەوێ كە پێش هیجرەت بە گونجاوی نەزانیی بێ داوای موسڵمان بوون لە هیچ دەسەڵاتدارێك بكات .. واش دەرئەكەوێ كە ئیمان

چووبێته دڵیەوە و ، قەناعەتی كردبێ كە عیسای كوڕی مەریەم بەندە و پێغەمبەری خوایە و ، بە فەرمانی خوا بەبێ باوك لە دایك بووە .

دووهەمیشیان ئەوەیە كە پێغەمبەری خوا ﷺ نامەی بۆ ناردووە و داوای لێ كردووە موسڵمان ببێ . جا موسڵمان بووە و ، لە مانگی رەجەبی ساڵی نۆهەمی كۆچییدا ، لە كاتێكدا كە پێغەمبەری خوا ﷺ بە خۆی و سوپای ئیسلامەوە لە غەزای تەبووك ئەگەڕایەوە ، كۆچیی دوایی كردووە و ، پێغەمبەری خوا ﷺ بە غائیبیی نوێژی جەنازەی لەسەر كردووە ..

ئەمەش دەقی نامەكەیە كە بە عەمری كوڕی ئومەییەی ضەمرییدا ناردی بۆ نەجاشیی : (( بسم الله الرحمن الرحيم .. من محمد رسول الله إلى النجاشي عظيم الحبشة ، سلام على من اتبع الهدى ، أما بعد .. فإني أحمد إليك الله الذي لا إله إلا هو الملك القدوس السلام المؤمن المهيمن ، وأشهد أن عيسى ابن مريم روح الله وكلمته ألقاها إلى مريم البتول الطيبة الحصينة فحملت بعيسى من روحه ونفخه ، كما خلق آدم بيده ، وإني أدعوك إلى الله وحده لا شريك له والموالاة على طاعته وأن تتبعني وتؤمن بالذي جاءني فإني رسول الله إني أدعوك وجنودك إلى الله عزوجل ، وقد بلغت ونصحت فاقبل نصيحتي ، والسلام على من اتبع الهدى )) .

كە عەمر نامەكەی دایە دەست نەجاشیی ، نەجاشیی لێی وەرگرت و ، بەسەر دەستی جەعفەری كوڕی ئەبوطالیبدا موسڵمان بوو .. دوای ئەوە ئەم نامەیەشی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ نووسیی :

(( بسم الله الرحمن الرحيم . إلى محمد رسول الله من النجاشي أصحمة ، سلام عليك يا نبي الله من الله ورحمة الله و بركاته . الله الذي لا إله إلا هو، أما بعد :

فقد بلغني كتابك يا رسول الله فيما ذكرت من أمر عيسى ، فورب السماء والأرض ، إن عيسى لا يزيد ما ذكرت تفروقاً ، إنه كما قلت ، وقد عرفنا ما بعثت بها إلينا ، وقد قرينا إبن عمك وأصحابك ، فأشهد أنك رسول الله صادقاً مصدقاً، وقد بايعتك ، وبايعت إبن عمك ، وأسلمت على يديه لله رب العالمين )) .

لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لە نەجاشیی كرد كە جەعفەر و هاوەڵە كۆچكەرەكانی بنێرێتەوە . ئەویش سواری دوو كەشتیی كردن و لەگەڵ عەمری كوڕی ئومەییەدا ناردنیەوە و ، لە كاتێكدا كە پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەیبەردا بوو گەیشتنە بەرەوە . ئەوەبوو ئەم پادشایە لە رەجەبی ساڵی نۆدا كۆچی دوایی كرد و ،

پادشایەکی تر هاتە جێی و ، پێغەمبەری خوا ﷺ نامەیەکی بۆ ئەویش نارد ، ئیتر نازانرێ موسڵمان بووە یان نەء ..

**٢ ـ نامەی بۆ مقەوقەس پادشای میصر :**

هەروەها نامەشی بۆ مقەوقەسی پادشای میصر و ئەسکەندەریە نارد ، کە ناوی جورەیجی کوڕی مەتتا بووە و ، لە لایەن دەوڵەتی بیزەنطی‌یەوە کراوە بە کاربەدەستی میصر . پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەم کارە هاوەڵی ناودار حاطبی کوڕی ئەبویەلتەعەی هەڵ بژارد .

حاطب نامەکەی برد و لە ئەسکەندەریە نامەکەی دایە دەست مقەوقەس . ئەویش وەری گرت و ماچی کرد و ، ڕێزێکی باشی لە حاطب گرت .

ئەمەش دەقی نامەکەی پێغەمبەری خوایە ﷺ :

(( بسم الله الرحمن الرحيم . من محمد عبد الله ورسوله إلى المقوقس عظيم القبط . سلام على من اتبع الهدى . أما بعد . فإني أدعوك بدعاية الإسلام . أسلم تسلم، وأسلم يؤتك الله أجرك مرتين . فإن توليت فإن عليك إثم أهل القبط .

﴿ قُلْ يَـٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًۭٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًۭا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَقُولُوا۟ ٱشْهَدُوا۟ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴾ ( آل عمران : ٦٤ ) .

پاشان پادشا قەشەکانی لە دەوری خۆی کۆکردنەوە و ، کەوتە پرسیارکردن لە حاطب :

بە حاطبی وت : من دەربارەی شتێك پرسیارت لێ ئەکەم ، جا پێم خۆشە کە لێم تێ بگەی . وتی : فەرموو . وتی : دەربارەی گەورەکەت هەواڵم بدەرێ ، ئایا ئەو پێغەمبەر نیە ؟ وتم : بەڵێ ، پێغەمبەری خوایە . وتی : دەی کە ئەو وەهایە ، بۆچ دوعای لە قەومەکەی نەکرد وا لە وڵات دەریان پەڕاند ؟ ئەڵێت : وتم : عیسای کوڕی مەریەم ، ئایا شاهێدیی ئەوە نادەی کە پێغەمبەری خوایە ؟ وتی : بەڵێ . دەی ئەویش کە قەومەکەی گرتیان و ویستیان چوارمێخەی بکێشن ، بۆچ دوعای لێ نەکردن تا خوا لەناویان بەرێت ، ئەوەبوو کە خوا بەرزی کردەوە بۆ ئاسمانی دنیا ؟

پادشا وەڵامەکەی حاطبی زۆر بە دڵ بوو ، بۆیە پێی وت : بە ڕاستیی تۆ حەکیمی و لەلایەن حەکیمیشەوە هاتووی .

پاشان وتی : من سەرنجی کاری ئەم پێغەمبەرەم داوە و ، بۆم دەرکەوتووە کە فەرمان بە کارێکی نەویستراو و بێکەڵك ناکات و ، سیحربازێکی گومڕا و ، کاهینێکی درۆزنیش نیە و ، دواییش سەرنج ئەدەم .. ئیتر نامەکە بە جوانیی هەڵ ئەگرێت .

پاشان وەڵامی نامەکەی نووسی‌یەوە :

(( لمحمد بن عبدالله من المقوقس عظيم القبط . سلام عليك ، أما بعد .. فقد قرأت كتابك ، وفهمت ما ذكرت فيه ، وما تدعو إليه ، وقد علمت أن نبياً قد بقي ، وكنت أظنه بالشام ، وقد أكرمت رسولك ، وبعثت لك بجاريتين لهما مكان عظيم في القبط ، وبثياب ، وأهديت إليك بغلة تركبها ، والسلام عليك )) .

دوای ڕێزگرتنی حاطەب دوو کەنیزەك و ، جل و بەرگ و ، ئێسترێك بۆ سواریی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنێرێت ، کە دوو کەنیزەکەکە ناویان ماریە و سیرین بووە . ماریە بۆ خۆی گل ئەداتەوە و ئیبراهیمی کوڕی لێی ئەبێ و ، سیرینیش ئەدات بە حەسسانی کوڕی ثابیت و ، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی لێی ئەبێت . ئێسترەکەش ناوی ئەنێت ( دلدڵ ) و ، تا سەردەمی خەلافەتی موعاویەش ئەمێنێ ، ئەو ئێسترە یەکجار سپیی بووە و هیچ ئێسترێك وەها نەبووە .

نامەکەی موقەوقەس ڕێزێکی زۆری بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ تێدا بوو ، بەڵام دیارە موسڵمانیش نەبووە و ، لەوە ئەچێ لە ترسی موڵك و پادشایەتیی موسڵمان نەبووبێ .

**٣ ـ نامەی بۆ کیسرا پادشای فارس :**

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بەسەر عەبدوڵلای کوڕی حوذافەی سەهمیی‌دا دا تا نامەیەکی بەرێت بۆ کیسرا خوسرەوی پەروێزی دووهەم ، کوڕی هورمزی چوارەم و کوڕەزای کیسرای یەکەم کە نۆشیروانی عادڵ بووە .

ئەمەش دەقی نامەکەیە :

(( بسم الله الرحمن الرحيم . من محمد رسول الله إلى كسرى عظيم فارس ، سلام على من اتبع الهدى ، وآمن بالله ورسوله ، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأن محمداً عبده ورسوله ، وأدعوك بدعاية الله ، فإني أنا رسول الله إلى الناس كافة ، لينذر من كان حياً ويحق القول على الكافرين . فأسلم تسلم ، فإن أبيت فإن إثم المجوس عليك )) .

کاتێك کە نامەی پیرۆز بۆ پەروێز خوێنرایەوە تووڕە بوو و ، نامەکەی دڕاند و ، بە فیز و دەمارێکەوە وتی : بەندەیەکی هیچ و پووچی ژێر دەستەم ناوی خۆی لە پێش ناوی منەوە ئەنووسێ . کاتێکیش هەواڵەکە گەیشتە پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای لێ کرد کە خوا موڵك و دەسەڵاتی پارچە پارچە بکات کە فەرمووی : (( مزق الله ملكه )) . هەر وایش بوو دوعاکەی گیرا بوو .. خێرا کیسرا نامەی بۆ باذان نووسیی، کە کاربەدەستی خۆی بوو لەسەر یەمەن تا دوو پیاوی ئازای لێ هاتوو لە یەمەنەوە بنێرێ بۆ حیجاز بە دوای پێغەمبەری خوادا ﷺ تا قۆڵ بەستی بکەن و بە پەلە بیگەیەننە لای پادشا .

باذانیش دوو پیاوی لەلایەن خۆیەوە هەڵ بژاردن کە یەکێکیان ناوی ( یابەوەی ) بوو و ، بە نامەیەکەوە ناردنیە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و ، فەرمانی بەسەردا ئەدا هەتا لەگەڵ ئەو دوو پیاوەیدا بڕوا بۆ لای کیسرا .

کە گەیشتنە مەدینە و ، چوونە خزمەتی ، یەکێکیان وتی : شاهەنشا کیسرا نامەی بۆ باذانی پادشامان نووسیوە تا پیاو بە دوای تۆدا بنێرێ و بت با بۆ لای کیسرا خۆی . ئەویش منی ناردووە بۆ لات تا بێیت لەگەڵمدا .. ئیتر چەند هەڕەشەیەکیشی لێ کرد . پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ وەڵامی نەدانەوە ئەوەندە نەبێ کە فەرمانی دا سبەینێ بێنەوە خزمەتی .

لەو کاتانەدا سوپای فارس لەبەردەم سوپای رۆمدا شکابوو ، بۆیە لەسەر ئەمە لەناو کەسوکاریدا شۆڕشێك لە دژی کیسرا بەرپا بووبوو . سەرەنجام شێرۆیەی کوڕی پەروێز باوکی ئەکوژێت و لە شوێنی باوکیدا خۆی ئەبێتە پادشا .

ڕووداوی کوشتنی پەروێز لە شەوی سێشەممەی دەی جومادیی یەکەمی ساڵی حەوتەمدا بووە ، ئەمەش هەر ئەو شەوە بوو کە جووتە پیاوەکەی باذان لە مەدینەدا بوون . خوای گەورە بە وەحیی پێغەمبەری خوای ﷺ ئاگادار کرد و ، کە بۆ سبەینێ جووتە پیاوەکە هاتنەوە خزمەتی هەواڵی کوژرانی کیسرای دانێ ، کە فەرمووی : (( أبلغا صاحبكما أن ربي قتل ربه في هذه الليلة )) . فەرمووی : بە باذان بڵێن کە پەروەردگارم ئەمشەو پادشاکەی ئەوی کوشتووە . وتیان : ئەوە تۆ ئەزانیت چیی ئەڵێیی ؟ ئێمە لەسەر شتی بچووکتر رقمان لێت هەستاوە ، ئایا ئەوە بە زمانی تۆوە بنووسین و ، هەواڵ بە پادشا بدەین ؟ فەرمووی : (( نعم ، أخبراه ذلك عني ، وقولا له: إن ديني وسلطاني سيبلغ ما بلغ كسرى ! وينتهي إلى منتهى الخف والحافر ، وقولا له:

إن أسلمت أعطيتك ما تحت يديك ، وملكتك على قومك من الأبنـاء )) . فـەرمووی: بەڵێ ، ئەمەی لەلایەن منەوە پێڕابگەیەنن و ، پێـی بڵـێن : دیـن و دەسـەڵاتی مـن ئەگاتە ئەوەی کە دەسەڵاتی کیسرای پێ گەیشتووە و ، لە کوێش کۆتایی بە وشکایی دێت لەوێ ئەویش ئەوەستێ .. هەروەها پێی بڵێن : ئەگەر موسڵمان ببێت ، ئـەوەی کە لە ژێر دەستتدایە ئەیسپێرم بە خۆت و ، ئەتکەمە پادشای خزمەکانت .

هەردوو پیاوەکە مەدینەیان بەجێ هێشت و گەڕانەوە بـۆ یەمـەن و ، هەواڵەکـەیان بـە باذان دا و ، دوای کەمێکیش نامە گەیشت کە شێرۆیە باوکی خۆی کوشـتووە و ، شـێرۆیە فەرمانی بە باذان دا کە واز لە پێغەمبەری خوا ﷺ بهێنێ تا خۆی جوابی بۆ ئەنێرێ .

شایانی باسە کە کیسرا بە ئاماژەی قوبادی کوڕی ، کە نازناوەکەی شێرۆیـە بوو ، لە ساڵی ٦٢٨ ز دا کوژرا و ، دوای ئەوە ئیتر دەوڵەتی ساسانیی پارچە پارچە بوو و ، شێرۆیەش تەنها شەش مانگ ما و ، دوای ئەو لە ماوەی چوار سـاڵدا ( دە ) پادشـا هاتنە سەر تەختی پادشایەتیی ، تا سـەرەنجام یـەزدیگورد کـاری گرتـە دەسـت و ، ئەویش دواپاشای دەوڵەتی ساسان بوو و ، بە راکردنی ئەو دەوڵەتەکـە رووخـا ، دوای ئەوەی کە چوار صەدە حوکمیان لە دەست دا بوو ..

بەڵێ ، دوای هەشت نۆ ساڵ لە فەرمایشتەکەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ ، واتـە لـە ساڵی ( ٦٣٧ ) ی ز دا هەواڵدانەکە هاتە دیی و ، ئیتر ئەو دەوڵەتە هەڵ نەستایەوە، بەمە فەرمایشتێکی تری پێغەمبەری خواش ﷺ هاتە دیی کە بەڵێن ئەدا کە ئەگـەر کیسرا تیاچوو ، ئیتر دوای ئەو کیسرایەکی تر نایـەت ، کـە فـەرمووی : (( إذا هلـك كسرى فلا كسرى بعده )) .

ئیتر ئەوەبوو سوپای ئیسلام ئەو وڵاتەشی رزگار کرد و ، لە رۆڵەکانیان پیاوی وەها هەڵ کەوت ( مەبەست لە ئیمام ئەبوحەنیفەیە ) کە ئەگەر زانست لەسـەر ئەسـتێرەی ثورەییا بێت دەستی ئەوانی ئەگـاتێ ، کـە فەرمـــووی : (( لـو كـان العلم بالثريا لتناوله أناس من أبناء فارس )) .

بەم رووداوە باذان و هەرچی دارودەستەی هەبوون لـە ئـەهلی فـارس هـەر هـەموو موسڵمان بوون .

٤ ـ نامەی بۆ قەیصەری رۆم ( هیرەقل ) :

پێغەمبـەری خـوا ﷺ هـاوەڵی پایـەدار دیحیـەی کـوڕی خەلیفـەی کـەلبیی بـە نامەیەکەوە نارد بۆ لای قەیصەر و ، فەرمانی دا نامەکە بداتە دەست حاکمی شاری

بوصرا ، تا ئەویش لەلایەن خۆیەوە بیگەیەنێتە لای هیرەقلی قەیصەری رۆم . ئەمەش دەقی نامەکەیە :

(( بسم الله الرحمن الرحيم . من محمد عبد الله ورسوله إلى هرقل عظيم الروم . سلام على من اتبع الهدى . أما بعد .. فإني أدعوك بدعاية الإسلام . أسلم تسلم ، يؤتك الله أجرك مرتين ، فإن توليت فإن عليك إثم الأريسيين .

﴿ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَقُولُوا۟ ٱشْهَدُوا۟ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴾ ( آل عمران : ٦٤ ) .[٨٤]

کاتێك کە نامەکە گەیشتە دەست هیرەقل ، کە پیاوێکی ژیر بوو وتی : پیاوێکم بۆ بهێنن کە خزم و کەسی موحەممەد بێت تا پرسیاری لێ بکەم . کاربەدەستان بە فەرمانی پادشا ئەگەڕێن بۆ پیاوێکی خەڵکی مەککە ، ڕێیان لە ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب ئەکەوێ ، کە دوای پەیمانی حودەیبیە ، لەگەڵ کۆمەڵێك پیاوی قورەیشیی‌دا هاتبوون بۆ شام بۆ بازرگانیی . ئەیان هێنن بۆ لای پادشا و ، بە هۆی تەرجومانەکەیەوە لێی پرسین کە کامتان بە خزمایەتیی لەم پیاوەوە نزیك‌ترن کە وای رائەگەیەنێ پێغەمبەر بێت ؟

ئەبوسوفیان وتی : من . وتی : لێم نزیك بەرەوە . لەبەردەم خۆی‌دا دای‌نیشاند و خەڵکەکەی تریشی لە دوای ئەوەوە دانیشاند ، تا ئەگەر ئەبوسوفیان لە وەڵام دانەوەدا درۆی کرد ، ئەوان شەرم نەکەن پەرچی بدەنەوە . لە هەمان کات‌دا گەورە پیاوانی رۆمی لە دەوری خۆی کۆکردبوونەوە .

لەو کاتەدا قەیصەر هیرەقل لە حیمص‌ەوە هاتبوو بۆ ( بیت المقدس - ئیلیاء ) تا سوپاسی خوا بکات کە بەسەر فارسە مەجووسەکان‌دا سەری خستبوون . ئەوەبوو فارسەکان پەروێزیان کوشت و ، لەگەڵ رۆم‌دا ڕێك کەوتن و چیی خاکی قەیصەر داگیر کرابوو دایانەوە دوا و ئەو صەلیبەش کە لێیان سەنرابوو بۆیان گەڕایەوە . بۆ ئەمە قەیصەر لە ساڵی ٦٢٩ زاینیی بەرامبەر بە حەوتەمی کۆچیی هاتە ( بیت المقدس ) تا صەلیب بخاتەوە شوێنی خۆی .

---

[٨٤] لە کاتێك دا کە خەریکی نووسینی ئەم باسە بووم ، هەر لەم رۆژەدا بۆ پیاچوونەوەی لە بەرکردنی قورئان گەیشتمە ئەم ئایەتە پیرۆزەی سوورەتی ( آل عمران ) کە لە لـ٥٨ـی موصحەفە سعوودییەکەدایە . ئەمەش ئیتتیفاقێکی جوانە ، سوپاس بۆ خوا .

هیرەقل دەستی دایە پرسیار لە ئەبوسوفیان :
هیرەقل : نەژاد و بنەماڵەی لە ناوتاندا چۆنە ؟
ئەبوسوفیان : خاوەنی نەژاد و بنەماڵەیە لە ناوماندا .
هیرەقل : ئایا کەسێکی تر لە پێشی ئەمەوە ئەم قسەیەی کردووە ؟
ئەبوسوفیان : نەخێر .
هیرەقل : ئایا لە باوباپیرانیدا کەسیان خاوەنی دەسەڵات بووە ؟
ئەبوسوفیان : نەخێر .
هیرەقل : ئایا پیاوماقووڵان شوێنی کەوتوون یان لاوازەکان ؟
ئەبوسوفیان : لاوازەکان .
هیرەقل : ئایا زیاد ئەکەن یان کەم ؟
ئەبوسوفیان : زیاد ئەکەن .
هیرەقل : ئایا کەس هەیە دوای موسڵمان بوون پشت لە دینەکەی بکات و هەڵ بگەڕێتەوە ؟
ئەبوسوفیان : نەخێر .
هیرەقل : ئایا پێش ئەمەی کە ئەیڵێ درۆتان لێ ئەبیست ؟
ئەبوسوفیان : نەخێر .
هیرەقل : ئایا غەدر ئەکات ؟
ئەبوسوفیان : نەخێر ، ئێستە پەیمانمان لە نێواندایە نازانین چیی تیا ئەکات .
هیرەقل : ئایا جەنگتان لەگەڵیا کردووە ؟
ئەبوسوفیان : بەڵێ .
هیرەقل : ئەنجامی جەنگەکەتان چۆنە ؟
ئەبوسوفیان : جەنگ لە نێوانماندا بە نۆرەیە . دەستمان لێ ئەوەشێنێ و ، دەستی لێ ئەوەشێنین .
هیرەقل : چ فەرمانێکتان بەسەردا ئەدات ؟
ئەبوسوفیان : ئەڵێت : خوا بە تاك و تەنیا بپەرستن و ، هیچ شتێك مەکەنە هاوتای و ، واز لە بیروبۆچوونی باوباپیرانتان بهێنن و ، فەرمانمان بەسەردا ئەدا کە نوێژ بکەین و راستگۆ و پاکداوێن بین و سیلەی رەحم بەجێ بهێنین .

هیرەقل بە تەرجومانەکەی وت : تۆش ئەوەت باس کرد کە خاوەنی نەژادە لە ناوتاندا . پێغەمبەرانیش لەناو قەومەکانیاندا خاوەنی نەژادن .

پرسیاریشم لێ کردی : ئایا لەوەو پێش کەسێکی تر ئەم قسەیەی کردووە ؟ وتت : نەخێر ، وتم : ئەگەر کەسێکی تر لەوە و پێش ئەمەی وتبێ ؛ ئەوا ئەم وت : کابرا شوێن وتەی پێشووەکەی کەوتووە .

پرسیاریشم لێ کردی : ئایا لە باوباپیرانیدا کەسیان خاوەنی دەسەڵات بووە ؟ وتت: نەخێر ، خۆ ئەگەر لە باوباپیرانیدا کەسیان دەسەڵاتی بوایە ، ئەوا ئەم وت : کابرا داوای موڵك و دەسەڵاتی باوکی ئەکات .

پرسیاریشم لێ کردی : ئایا پێش ئەمەی کە ئەیڵێت درۆتان لێ ئەبیست ؟ وتت : نەخێر . دەی من ئەوە ئەزانم کە ناگونجێ کەسێ لەگەڵ خەڵكدا دەست لە درۆ هەڵ بگرێ ، کەچیی لەگەڵ خوادا درۆ بکات .

پرسیاریشم لێ کردی : ئایا پیاوماقووڵان شوێنی کەوتوون یان لاوازەکان ؟ وتت: لاوازەکان شوێنی کەوتوون ، کە ئەوانەش شوێنکەوتوانی پێغەمبەرانن .

پرسیاریشم لێ کردی : ئایا زیاد ئەکەن یان کەم ؟ ئەوەت باس کرد کە زیاد ئەکەن. کاری ئیمانیش وەهایە هەتا تەواو ئەبێت .

پرسیاریشم لێ کردی : ئایا کەس هەیە دوای موسڵمان بوون پشت لە دینەکەی بکات و هەڵ بگەڕێتەوە . وتت : نەخێر . ئیمانیش وەهایە کاتێ کە بە گەشاوەیی تێکەڵ بە دڵ ئەبێت .

پرسیاریشم لێ کردی : ئایا غەدر ئەکات ؟ وتت : نەخێر . پێغەمبەرانیش غەدر ناکەن .

پرسیاریشم لێ کردی : چ فەرمانێکتان بەسەردا ئەدات ؟ باسی ئەوەت کرد کە فەرمانتان بەسەردا ئەدات کە خوا بپەرستن و ، هیچ شتێك نەکەنە هاوەڵی و ، لە بت پەرستیی قەدەغەتان ئەکات و ، فەرمان بە نوێژکردن و راستگۆیی و پاك داوێنیی ئەدات . جا ئەگەر ئەوەی تۆ ئەیڵێیت راست بێ ؛ ئەوا ژێر ئەم دوو پێیەم ئەبێتە موڵکی ئەو . ئەشمزانیی کە رەوانە ئەکرێ ؛ بەڵام نەم ئەزانیی لەناو ئێوەدا هەڵ ئەکەوێ .. خۆ ئەگەر بزانم ئەیگەمێ ؛ ئەوا هەوڵم ئەدا بە خزمەتی بگەم و ، گەر لە خزمەتیشیا بوومایە ئەوا ئاوم بەسەر پێیدا ئەکرد ..

پاشـان فـەرمانی دا نووسـراوەکەی پێغەمبـەری خوایـان ﷺ هێنـا و ، بـۆ ئامادەبووانیان خوێندەوە .. دەنگی ناڕەزایی و بۆڵە بۆڵ بـەرز بوویـەوە . هیرەقلیش فەرمان ئەدات تا ئەبوسوفیان و هاوەڵانی بکرێنە دەرەوە .

ئەبوسوفیان ئەڵێت : کـاری موحەممـەد گـەورە بـووە ، ئـەوەتا پادشـای رۆم لێـی ئەترسێ ..

دوایی ئەبوسوفیان ئەی وت : هەروا بە لامەوە یەقین بوو کە پێغەمبـەری خـوا ﷺ سەرئەکەوێت ، تا ئەوەبوو خوا ئیسلامی خستە دڵمەوە ..

دوای ئـەوە قەیصـەر هیرەقـل فـەرمانی دا گـەورە پیـاوانی رۆم بێنـە کۆشـك و، فەرمـانی دا دەرگاکانی کۆشکیان داخستن ، پاشان روو بە خەڵکەکە وەستا و ، وتـی: ئەی کۆمەڵی رۆم ! ئایا سەرکەوتن و ژیرییتان ئەوێن ؟ ئایـا پێتـان خۆشـە موڵـك و دەسەڵاتتان دامەزراو بێت ؟ وەرن بەیعەت بەم پێغەمبەرە بـدەن . هـەموو بـە جـارێ هەستانەوە بەرەو دەرگاکان هەڵاتن ، ئەبینن دەرگاکان داخراون . هیرەقـل کـە دیتـی خەڵکەکە بە گوێی ناکەن و ، دەستی لە ئیمانیان شۆرد ، وتی : بیانگێڕنـەوە بـۆم و، وتی : بەم وتەیەم غیرەتی ئێوەم بۆ دینەکەتان تاقیی کردەوە و ، وا بە چاوی خۆم دیم. هەموو بە جارێ سەجدەیان بۆ برد و ، لێی رازیی بوون . ئیتر هیرەقل لە ترسـی هـەڵ گەڕانەوەی گەورە پیاوانی رۆم و ، سەرەنجام لە دەستدانی موڵك و پادشـایەتیی وازی لە موسڵمانبوون هێنا و ، هەر لە سەردەمی ئەبوبەکر و عومەردا جەنگی سەخت لـە نێوان موسڵمانەکان و رۆمدا روویان دا و ، ئەمـەش بووە هۆی لاواز بـوون و رووخـانی دەوڵەتی رۆم .

ئێستاش با کورتەیەك دەربارەی حوکمڕانیی هیرەقل بنووسین .

لـەو سـەردەمەدا جیهـانی ئـاوەدانکراوە بەشـی هـەرە زۆری بەسـەر هـەردوو ئیمپراتۆریەتی جیهانیی ساسانیی و رۆمییدا دابەش کرابـوو . دەوڵـەتی رۆم دەسـتی بەسەر ناوچەیەکی زۆری هەرسێ کیشوەری ئاسیا و ئەورووپا و ئەفریـقیـادا گرت بوو.. هیرەقلیش لە خێزانێکی یۆنانییدا ، لە شاری ( کیبودیشیە ) لـە دایـك بووە و ، لـە ( قرطاجنە ) دا گەورە بووە . باوکی حاکمی ئەفریقیـە بـوو لەلایـەن رۆمەکانـەوە .. ناوی هیرەقل نەکەوتبووە ناو ناوانەوە تا ئەوەبوو ( فوقاس ) ی داگیـرکار دەسـتی لە ( موریقس ) ی ئیمپراتۆری شەرعیی رۆم وەشاند و کوشتی ، ئـەمـەش لـە سـاڵی ( ٦٠٢ ) زاینییدا . ئـیتر فارسـەکان هـەلیان بـە دەسـت هێنـا و هەڵمـەتیان دا و

پاشـان فـەرمانی دا نووسـراوەکەی پێغەمبـەری خوایـان ﷺ هێنـا و ، بـۆ ئامادەبووانیان خوێندەوە .. دەنگی نارەزایی و بۆڵە بۆڵ بـەرز بوویـەوە . هیرەقلیش فەرمان ئەدات تا ئەبوسوفیان و هاوەڵانی بکرێنە دەرەوە .

ئەبوسوفیان ئەڵێت : کـاری موحەممـەد گـەورە بـووە ، ئـەوەتا پادشـای رۆم لێـی ئەترسێ ..

دوایی ئەبوسوفیان ئەی وت : هەروا بە لامەوە یەقین بوو کە پێغەمبـەری خـوا ﷺ سەرئەکەوێت ، تا ئەوەبوو خوا ئیسلامی خستە دڵمەوە ..

دوای ئـەوە قەیصـەر هیرەقـل فـەرمانی دا گـەورە پیـاوانی رۆم بێنـە کۆشـك و، فەرمـانی دا دەرگاکانی کۆشکیان داخستن ، پاشان روو بە خەڵکەکە وەستا و ، وتـی: ئەی کۆمەڵی رۆم ! ئایا سەرکەوتن و ژیرییتان ئەوێن ؟ ئایـا پێتـان خۆشـە موڵـك و دەسەڵاتتان دامەزراو بێت ؟ وەرن بەیعەت بەم پێغەمبەرە بـدەن . هـەموو بـە جـارێ هەستانەوە بەرەو دەرگاکان هەڵاتن ، ئەبینن دەرگاکان داخراون . هیرەقـل کـە دیتـی خەڵکەکە بە گوێی ناکەن و ، دەستی لە ئیمانیان شۆرد ، وتی : بیانگێڕنـەوە بـۆم و، وتی : بەم وتەیەم غیرەتی ئێوەم بۆ دینەکەتان تاقیی کردەوە و ، وا بە چاوی خۆم دیم. هەموو بە جارێ سەجدەیان بۆ برد و ، لێی رازیی بوون . ئیتر هیرەقل لە ترسـی هـەڵ گەڕانەوەی گەورە پیاوانی رۆم و ، سەرەنجام لە دەستدانی موڵك و پادشـایەتیی وازی لە موسڵمانبوون هێنا و ، هەر لە سەردەمی ئەبوبەکر و عومەردا جەنگی سەخت لـە نێوان موسڵمانەکان و رۆمدا روویان دا و ، ئەمـەش بووە هۆی لاواز بـوون و رووخـانی دەوڵەتی رۆم .

ئێستاش با کورتەیەك دەربارەی حوکمڕانیی هیرەقل بنووسین .

لـەو سـەردەمەدا جیهـانی ئـاوەدان کـراوە بەشـی هـەرە زۆری بەسـەر هـەردوو ئیمپراتۆریەتی جیهانیی ساسانیی و رۆمییدا دابەش کرابـوو . دەوڵـەتی رۆم دەسـتی بەسەر ناوچەیەکی زۆری هەرسێ کیشوەری ئاسیا و ئەوروپا و ئەفریـقیـادا گرت بوو.. هیرەقلیش لە خێزانێکی یۆنانییدا ، لە شاری ( کیبودیشیە ) لـە دایـك بووە و ، لـە ( قرطاجنە ) دا گەورە بووە . باوکی حاکمی ئەفریقیـە بـوو لەلایـەن رۆمەکانـەوە .. ناوی هیرەقل نەکەوتبووە ناو ناوانەوە تا ئەوەبوو ( فوقاس ) ی داگیـرکار دەسـتی لە ( موریقس ) ی ئیمپراتۆری شەرعیی رۆم وەشاند و کوشتی ، ئـەمـەش لـە سـاڵی ( ٦٠٢ ) زاینییدا . ئـیتر فارسـەکان هـەلیان بـە دەست هێنـا و هەڵمـەتیان دا و

بەشێکی زۆر لە خاکی رۆمیان داگیر کرد و ، سووك و رسوایان کرد ، بە رادەیەك کە ئەو ئیمپراتۆریەتە گەورەیە کەوتە گیانکەنشت . ئەو کاتە هیرەقل لە ( قرطاجنة ) بوو بانگیان کرد و ( فوقاس ) ی کوشت و لە ساڵی ٦١٠ زایینییدا دەسەڵاتی گرتە دەست . بەڵام دەوڵەوت لەوپەڕی لاوازییدا بوو ، لەبەر ئەوەی کە گرانیی و ، دەرد و دا و ، هەژاریی باڵیان بەسەر وڵاتدا کێشا بوو . تا پێنج شەش ساڵێك هەروا بەو لاوازییەوە هیرەقل وڵاتی بەڕێوە ئەبرد تا ئەوەبوو لە ساڵی ٦١٦ دا ، ئەو ساڵەی کە قورئان بەڵێنی سەرکەوتنی رۆمی دا ، غیرەت کرا بە بەر هیرەقلدا و ، سوپای بەرەو ناوجەرگەی دەوڵەتی ساسانیی خستە رێ و ، چیی وڵاتی لێ داگیر کرابوو سەندییەوە و ، یەك لە دوای یەك شارەکانی ئێرانیشی ئەگرتن ، تا گەیشتە ناوجەرگەی ئێران و ، کوشتارێکی زۆری لێ کردن و ، وەها سووك و ریسواشی کرد ، کە خەریك بوو ئەو دەوڵەتە گەورەیە کۆتایی پێ بێت . دوای ئەوە هیرەقل بە سەرکەوتوویی ، لە ساڵی ٦٢٥ دا گەیشتەوە قوسطەنطینیە .

شایانی باسە لە ساڵی ٦٢٦ ی زایینییدا جەنگی بەدری گەورە رووی دا و موسڵمانەکان بەسەر بتپەرستەکانی مەککەدا سەرکەوتن ، هەروەك رۆمی ئەهلی کیتاب بەسەر فارسە مەجووسەکاندا سەرکەوتن . بەمە بەڵێنەکەی قورئان هاتە دیی، کە بەڵێنی سەرکەوتنی رۆمی دابوو .

هەروەها لە ٦٢٩ دا وەك لە پێشەوە باس کرا هیرەقل هاتبووە ( بيت المقدس ) بۆ دانانەوەی صەلیب و لەوێ نامەکەی بە دەست گەیشت .

شایانی باسە کە ئەو نامەیەی بۆ هیرەقل نێررا بوو ، تا صەدەی حەوتەمی کۆچیی لە ئەسپانیا هەڵ گیرابوو و ، سوهەیلیی زانای پایەبەرزی فەرموودە و مێژوونووسی بەناوبانگ ، کە کەڵە پیاوی صەدەی شەشەمی کۆچیی بووە ، ئاماژەی بۆ بوونی ئەو نامەیە کردووە .

لە ( إرشاد الساري لشرح صحيح البخاري : ١ / ٨١ ) دا ئەم چیرۆکەش هاتووە : ئەگێڕنەوە کە پادشای ئەفرەنج لە سەردەمی دەوڵەتی ( الملك المنصور قلاوون الصالحي ) دا صندوقێکی بە زێڕ دەورگیراو بۆ ( سيف الدين قلج ) دەر ئەهێنێ و ، لە ناویدا جێ قەڵەمێکی ئاڵتوون دەر ئەهێنێ و ، لە ناو ئەویشدا نووسراوێك دەرئەهێنێ ، کە زۆربەی نووسینەکەی رۆیشتبوو و ئەڵێت : ئەمە نامەی پێغەمبەرەکەتانە بۆ قەیصەری باپیرم ، هەتا ئێستا دەستا و دەست هەڵی ئەگرین و ، باپیرانمان وەسیەتیان

بۆمان کردووە کە هەتا ئەو نووسراوە لەلامان بمێنێ ، موڵك و دەسەڵاتیش لە دەستمانا نەبێت . بۆیە ئێمەش ئەیپارێزین .

کورتەکەی هیرەقل موسڵمان نەبوو ، بەلام رێزی لە دیحیەی هەڵگری نامەکە گرت و ، بە جوانیی رەوانەی کردەوە و ، بەرگ و سامانی پێشکەش کرد .

کە گەیشتە حەسمیی چەند پیاوێکی جوذام رێیان پێ گرت و ، رووتیان کردەوە . ئەویش خۆی گەیاندەوە مەدینە و هەواڵەکەی بە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیاند . بۆ ئەمە پێغەمبەری خوا ﷺ زەیدی کوڕی حاریسەی کردە فەرماندەی پێنج صەد پیاو و رەوانەی ئەو ناوچەیەی کرد . ئەویش هەڵمەتی بردە سەریان و کوشتاری کردن و ، هەندێکی لە بەدیل گرتن کە صەد ژن و منداڵ بوون و ، هەزار وشتر و پێنج هەزار مەڕیشی دەست کەوت بوون .

بەلام چونکە پەیمانی دۆستایەتیی لە نێوان موسڵمانەکان و جوذامەدا هەبوو ، خێرا یەکێ لە سەرۆکەکانیان کە زەیدی کوڕی ریفاعەی جوذامیی بوو ، کە بە خۆی و چەند پیاوێکی هۆزەکەیەوە موسڵمان بوو بوون و ، کۆمەکیی دیحیەشیان کردبوو کاتێ کە رێی پێ گیرا بوو ، هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و داوای دیل و دەست کەوتەکانی کردنەوە و ، پێغەمبەریش ﷺ بۆی گێڕایەوە .

**٥ ـ نامەی بۆ مونذیری کوڕی ساوا حاکمی بەحرەین :**

ناوچەی بەحرەین ئێستە پێی ئەوترێ ( الإحساء ) . ئەو کاتە زۆربەی دانیشتوانی لە هۆزی ( عبد القيس ) و ( بكر بن وائل ) و ( تميم ) بوون ، کە مونذیری کاربەدەستی لە هۆزی تەمیم بوو .

ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ عەلائی کوڕی حەضرەمیی هەڵ بژراد بۆ هەڵ گرتنی نامەیەك بۆ لای مونذیر تا بۆ سەر ئیسلام بانگی بکات . کە مونذیر نامەکەی پێ گەیشت موسڵمان بوو و هەندێکیش لە خەڵکەکە موسڵمان بوون . بۆ ئەمە مونذیر نامەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ نووسیی :

أما بعد .. ئەی پێغەمبەری خوا ! نامەکەتم بۆ دانیشتوانی بەحرەین خوێندەوە . جا هی وایان هەبوو ئیسلامی خۆش ویست و دڵی بۆی کرایەوە و موسڵمان بوو ، هی واشیان هەبوو پێی خۆش نەبوو و ، لە خاکەکەشمدا ئاگرپەرست و جوولەکە هەن . جا لەو بارەوە فەرمانی خۆتم بۆ بنێرە .

پێغەمبەری خواش ﷺ بەم نامەیە وەڵامی دایەوە کە با هەر خۆی کاربەدەست بێ و ، کەسیش بە زۆر موسڵمان نەکات و ، ئاگرپەرست و جوولەکەش با جزیە بدەن :

(( بسم الله الرحمن الرحيم . من محمد رسول الله إلى المنذر بن ساوى ، سلام عليك . فإني أحمد إليك الله الذي لا إله إلا هو ، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله . أما بعد .. فإني أذكرك الله عزوجل ، فإنه من ينصح فإنما ينصح لنفسه ، وإنه من يطع رسلي ويتبع أمرهم فقد أطاعني . ومن نصح لهم فقد نصح لي . وإن رسلي قد أثنوا عليك خيراً ، وإني قد شفعتك في قومك . فاترك للمسلمين ما أسلموا عليه ، وعفوت عن أهل الذنوب ، فأقبل منهم . وإنك مهما تصلح فلن نعزلك عن عملك . ومن أقام على يهودية أو مجوسية فعليه الجزية )) .

**٦ ـ نامەی بۆ هەوذەی کوڕی عەلیی گەورەی یەمامە :**

ئەم نامەیەشی بۆ هەوذە نووسیی :

(( بسم الله الرحمن الرحيم . من محمد رسول الله إلى هوذة بن علي . سلام على من اتبع الهدى . واعلم أن ديني سيظهر إلى منتهى الخف والحافر ، فأسلم تسلم . وأجعل لك ما تحت يديك )) .

بەڵێنی پێ دا تا ئەو شوێنەی کە خەڵکی بگاتێ ئەم دینەی بڵاوە ئەکات و ، ئەگەر موسڵمانیش ببێ ، دەسەڵاتی ئەو ناوچەیەی هەر لە دەستی خۆیدا ئەبێت ..

بۆ گەیاندنی نامەکەش سولەیطی کوڕی عامیریی هەڵ بژارد . کاتێ کە سولەیط نامەکەی بە مۆرکراویی دایە دەست سولەیط بەخێرهاتنی لێ کرد و ، ئەویش نامەکەی بۆ خوێندەوە و ، هەوذەش وەڵامی دایەوە و ، ئەمەشی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ نووسیی : ئەوەی تۆ بانگەوازی بۆ ئەکەیت زۆر چاك و جوانە ! عەرەبیش سام و هەیبەتی منیان لە دڵدایە . جا هەندێ لەو کارەش بە من بسپێرە تا شوێنت بکەوم .

هەوذە خەڵاتێکی سولەیطی کرد و چەند کراسێکیشی پێشکەش کرد . ئەویش ئەو شتانەی هەموو هێنایەوە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( لو سألني قطعة من الأرض ما فعلت ، باد ، وباد ما في يديه )) . فەرمووی : ئەگەر داوای پارچە زەوییەکیشی بکردایە نەم ئەدایە . خۆیشی و هەرچیی وا لە دەستیدا هەمووی تیا ئەچێ .

کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەتحی مەککە گەڕایەوە جیبریل سەلامی لێ بێ هات و هەواڵی مردنی هەوذەی بۆ هێنا . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( أما

اليمامة سيخرج بها كذاب يتنبأ ، يُقتل بعدي )) . فەرمووی : لە یەمامەدا درۆزنێك هەڵ ئەكەوێ كە داوای پێغەمبەرایەتیی ئەكات ، بەڵام دوای مردنی من ئەكوژرێت . ئەمەش ئاماژەیە بۆ موسەیلەمەی درۆزن كە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ داوای پێغەمبەرایەتیی كرد ، بەڵام لە سەردەمی خەلافەتی ئەبوبەكردا خوا لێی رازیی بێ كوژرا . یەكێ پرسیاری كرد : ئەی پێغەمبەری خوا ! كێ ئەیكوژێ ؟ (( أنت وأصحابك )) . فەرمووی : تۆ و هاوەڵانت . هەروایش بوو ..

**٧ ـ نامەی بۆ حاریثی كوڕی ئەبوشیمری غەسسانیی حاكمی دیمەشق :**

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بەسەر هاوەڵی پایەدار شوجاعی كوڕی وەهبدا دا تا نامەیەك بۆ حاریثی گەورەی دیمەشق ببات كە ئەگەر موسڵمان ببێت لە شوێنی خۆی پادشا ئەبێت ، كە بەم شێوەی بۆ نووسیی :

(( بسم الله الرحمن الرحيم . من محمد رسول الله إلى الحارث بن أبي شمر ، سلام على من اتبع الهدى ، وآمن به وصدق ، وإني أدعوك إلى أن تؤمن بالله وحده لا شريك له، يبقى لك ملكك )) .

كە نامەكە گەیشتە دەست حاریث فڕێی دا و وتی : كێ ئەتوانێ دەسەڵاتم لێ بستێنێ ؟ من ئەچمە سەر ئەو . ئەوەبوو خۆی ئامادە كرد تا سوپا بنێرێتە سەر پێغەمبەری خوا ﷺ . بە هەڵگری نامەشی وت : ئەوەی ئەیبینیی ( لە ئامادە كردنی سوپا ) بۆ گەورەكەتی بگێڕەوە . نامەشی بۆ قەیصەر نارد تا مۆڵەتی بدات و هێرش بكاتە سەر پایتەختی ئیسلام . ئەوەبوو هەر لەو كاتەدا دیحیەی كەلبییش هاتبوو و نامەی بۆ هیرەقل هێنابوو . هیرەقل جوابی بۆ حاریث نارد تا لەو بڕیارەی واز بهێنێ .

كە جوابی قەیصەر هیرەقل گەیشتە لای حاكمی دیمەشق شوجاعی هەڵگری نامەی بە جوانیی رەوانە كردەوە ، دوای ئەوەی كە جل و بەرگ و پارە و مەسرەفێكیشی دایە.. بەڵام موسڵمان نەبوو.

**٨ ـ نامەی بۆ جەیفەر و عەبد كوڕانی جولەندا پادشای عومان :**

جەیفەر برا گەورە و پادشا بوو و هەردووكیان حاكمی عومان بوون . ئەم دوو برایەش لەلایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ نامەیان بۆ چوو و هەردووكیشیان موسڵمان بوون.

**٩ ـ نامەی بۆ ئەمیری بوصرا :**

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ حاریثی کوڕی عومەیری ئەزدیی بە نامەیەکەوە نارد بۆ لای ئەمیری بوصرا . کاتێك کە حاریث گەیشتە موئتە ، لەسەر سنووری شام ، شورەحبیلی کوڕی عەمری غەسسانیی ڕێی پێ گرت و ، لێی پرسیی : نیازی کوێت هەیە ؟ وتی : شام . وتی : لەوە ئەچێ تۆ یەکێ لە نێرراوەکانی موحەممەد بیت ؟ وتی: بەڵێ . شورەحبیل فەرمانی دا لە ملی بدرێت . جگە لە حاریث هیچ نێرراوێکی تری پێغەمبەری خوا ﷺ نەکوژراوە .

هەروەها نامەی بۆ جەبەلەی کوڕی ئەیهەم و ، بۆ حاریثی کوڕی عەبد کەلالی حمێریی پادشای یەمەن نووسیی .[٨٥]

**غەزای ذوقەرەد :**

مێژوونووسان وەهایان باس کردووە کە ئەم غەزایە لە ساڵی شەشەمدا و پێش پەیمانی حودەیبیە ڕووی داوە ، بەڵام بوخاریی دەری بڕیوە کە سێ ڕۆژ پێش خەیبەر بووە . واتە یەکەم غەزا بووە دوای حودەیبیە و پێش خەیبەر . هەروەها موسلیمیش پشتی گرتووە .. ڕووداوەکەش بەم جۆرە بووە :

عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عویەینەی کوڕی حیصنی فەزاریی لەگەڵ هێزێکی گەورەی نەوەی غەطەفان‌دا هێرش ئەکەنە سەر ئەو کۆمەڵە وشترەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ شیردان بە موسڵمانانی بەخێو ئەکردن ، لە ناوچەی ( الغابە ) ی باکووری مەدینە . شوانی ئەم وشترانە کوڕێکی ئەبوذەرری غیفاریی بوو و، سوارچاکی بەناوبانگیش سەلەمەی کوڕی ئەکوەع لەوێ بوو .[٨٦]

شایانی باسە کە باوکی ئەو پیاوەی هێرشی کردبوو عویەینەی کوڕی حیصنی فەزاریی بوو ، کە یەکێك بوو لە چوار سەرۆکەکەی غەطەفان لە جەنگی ئەحزاب دا.. جا یەکەم موسڵمانەکان و غەطەفان ، کە فەزارە یەکێ لە هۆزەکانی غەطەفان بوو، لە حاڵەتی جەنگ‌دا بوون و ، دووهەمیش فەزارە لە مەدینەوە نزیك بوون ، بۆیە ئاسایی بوو هەڵمەت بەرن و دەست لە موسڵمانەکان بوەشێنن .

---

[٨٥] السيرة النبوية للندوي : ٢٨٧ ـ ٣١٢ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٣٥٧ ـ ٣٦٥ ، الرحيق المختوم : ٣٥٧ ـ ٣٧١ ، هذا الحبيب : ٢٢٩ ـ ٢٣٣ .

[٨٦] سەلەمەی کوڕی عەمری کوڕی ئەکوەعی ئەسلەمیی ، یەکەم جار بەشداریی حودەیبیەی کردووە . یەکێ بووە لە پیاوە بە جەرگە ناودارەکان کە لە پێشبڕکێی ئەسپ سوارییدا کەم وێنە بووە . لە ژێر درەختەکەی حودەیبیەدا بەیعەتی بە پێغەمبەری خوا ﷺ داوە . ساڵی حەفتا و چواری کۆچیی کۆچی دوایی کردووە .

ناوچەی ( غابە ) ش ناوچەیەکی بە پیتی پڕ رووەك و درەخت بوو و ، بە یەکێ لە مێرگە سەرەکی‌یەکانی مەدینە ئەژمێررا .

کوڕی عویەینە هەڵمەتی بردە سەر غابە و دەستیان بەسەر هەر هەموو وشترەکان‌دا گرت و ، دایاننە بەر خۆیان . جا کە کوڕەکەی ئەبوذەرری غیفاریی بەرگریی لە وشترەکان کرد تا بیان‌گێڕێتەوە، ئەویان کوشت و ، ژنەکەشیان بە دیل گرت و بردیان.

لە کاتی ئەو هێرشەدا تەنها سەلەمە لەوێ بوو کە جەنگی پێ بکرێت ، ئەویش سواری ئەو ئەسپە بوو بوو کە بۆ پێویست لە طەلحەی کوڕی عویەیدوللای وەرگرتبوو .

ماوەی نێوان ( غابە ) و ( مەدینە ) هەشت میل بوو و ، پێویستیش بوو بە پەلە هەواڵ بە پێغەمبەر و هاوەڵان بدرێ ، تا بە خێرایی کۆمەك بنێرن بۆ سەندنەوەی رانە وشترەکە .

سەلەمە سەرنجی دا خۆی بە تاقی تەنیا ناتوانێ ئەو وشترانە لەو هێزە گەورەیە بسەنێتەوە ، بۆیە وای بە چاك زانیی لەسەر ئەسپەکەی طەلحە دابەزێ و ، ئەو تاقە شوانە بانگ بکات کە لە کوشتن رزگاری بوو بوو و ، سواری ئەسپەکەی بکات ، تا بە پەلە بەرەو مەدینە بڕوا و هەواڵ بە پێغەمبەری خوا ﷺ بدات و ، کۆمەك بنێرێ بۆ رزگارکردنی وشترەکان .

شوانەکە ناوی رەباح بوو ، سواری ئەسپەکەی سەلەمە بوو و ، بە پەلە خۆی گەیاندە مەدینە و هاواری لێ بەرز بوویەوە : ( الفزع ، الفزع ) . ئەم هاوارە بووە هۆی ئەوەی کە چیی جەنگاوەر لە مەدینەدا بوو خۆی ئامادە بکا ، چونکە ئەوەی ئەگەیاند کە دوژمنان هێرشیان هێناوەتە سەریان .

کە پێغەمبەر و موسڵمانەکان بە وردیی لە هەواڵەکە گەیشتن ، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمەی بە سووکایەتی‌یەکی گەورە ژمارد کە غەطەفان ترسی سوپای ئیسلامیان لە دڵدا نەبێ و هێرش بکەنە سەر ئاژەڵیان و بە تاڵان بی‌بەن . دوایییش ئەگەر موسڵمانان لێی بێ‌دەنگ بوون ، هێرش بکەنە سەر پایتەخت ، چونکە ئەوەی فەزارە خاوەنی سوپایەکی گەورە بوون .

لەبەر ئەمە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم رووداوەی بە گرنگ زانیی و ، بایەخی پێ دا و ، سوپایەکی گەورەی پێك هێنا بۆ راونانی دوژمنان ، کە بریتیی بوو لە حەوت‌صەد جەنگاوەر و ، بە فەرماندایەتیی خۆی بەرەو ناوچەی ( غابە ) کەوتنە رێ ، بەڵام لە پێشەوە ، بە سەرکردایەتیی سوارچاکی بەناوبانگ سەعدی کوڕی زەیدی کوڕی مالیك

هێزێکی بچکۆلەی پێش خست بۆ راونانی دوژمنـــان و پەشـۆکاندنیان ، تـا سـوپا گەورەکە فریا بکەوێ ..

ئەو هێزە بچکۆلەیە چەند هاوەڵێکی پاڵەوانیان لەگەڵدا بوو ، وەك میقدادی کوڕی ئەسوەد و ، عەببادی کوڕی بیشر و ، عوکاشەی کوڕی میحصەن و ، ئەبوقەتادە ..

بەر لەوەی کە ئەم هێزە بچکۆلەیەش بگات ، سەلەمەی کـوڕی ئـەکوەع خـۆی بـە تاقی تەنیا بە تیر دەستدرێژییکەرانی راو ئەنا و ئەیپەشۆکاندن ، بـە رادەیـەك کـە بەشی هەرە زۆری وشترەکانی لێ سەندنەوە و ، ئەوەندەش بـە گـیری هێنـا بـوون بـۆ بارسووکیی سیی بوردە و سیی رمیان فڕێ دان و کەوتنـە دەسـت سـەلەمە ، چـونکە وایان ئەزانیی سەلەمە کۆمەکیی زۆری لەگەڵدایە، نەیانئەزانی بە تاقی تەنیایە .

کاتێك کە هێزە بچکۆلەکەی موسـڵمانان گەیشـت ، ئەبوقـەتادە هەڵمـەتی دایـە عـەبدوڕڕەحمانی کـوڕی عویەینـە ، کـە فەرماندەی هەڵمەتەکـە بـوو و ، کوشـتی ، هەروەها حەبیبی براشی کوژرا و سوارچاکێکی فەززارەییش کە ناوی مەسـعەدە بوو.. بەڵام لە موسڵمانان میحرەزی کوڕی نەضلە کە نازناوەکـەی ئـەخرەمی ئەسـەدییە ، عـەبدوڕڕەحمانی کـوڕی عویەینـە کوشـتی و ، وەققاصـی کـوڕی میحـرەزیش لەگـەڵ کوڕەکەی ئەبوذەر کوژران .

ئەو ئافرەتەش کە بە دیل گیرا بوو ، توانیی شەو دەسـت و پـێی بەسـتراوی خـۆی بکاتەوە و ، بێدەنگ خۆی بگەیەنێتە لای وشترەکان تا سواری یەکێکیان ببێ و خۆی دەرباز بکات . لە هەر وشترێك نزیك ئەکەوتەوە ، نەیئەهێشت بیگرێ و سواری ببێ، هەتا گەیشتە لای ( عضـباء ) وشترەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ . ئەو هێشتی سـواری ببێ و بە پەلە بەرەو مەدینە کەوتە رێ .. کە دوژمن زانییان وا ژنەکە رای کردووە ، دوای کەوتن بەڵام بێهوودە بوو .. ئافرەتەکە لە رێگا نـەذری کـرد کـە ئەگـەر خـوا رزگاری بکات ، وشترەکە سەر ببڕێ . دوای گەیشتنەوە مەدینە کە هەواڵەکەی دا بـە پێغەمبەری خوا ﷺ ، زەردەخەنەیـەکی کـرد و فـەرمووی : (( بئسـما جزيتيهـا ، أن حملك الله عليهـا ونجـاك بهـا ، ثـم تنحرينهـا ، إنـه لا نـذر في معصـية ، ولا فيمـا لا تملكين، وإنما هي ناقة من إبلي )) . فەرمووی : ئای کە پاداشتێکی خراپت داوەتـەوە . خوا ئەوی کردۆتە هۆ هەڵت بگرێ و رزگارت بکا ، پاشان تۆ سەری ئەبڕیی !! نەذر لە کاری تاوان‌دا نیە و ، هەر شتێکیش هی خۆت نەبێ نەذری دروست نیە . چونکە ئەوە وشتری منە .

که کافرەکان هەموو وشترەکانیان لیّ بەجیّ ما و ، هەلاّتن ، پیّغەمبەری خوا ﷺ گەیشت و لەسەر ئاوی ( ذوقەرد ) شەو و رۆژیّك مایەوە .

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع وتی : ئەی پیّغەمبەری خوا ! ئەگەر ماوەت بدایە لەگەلّ صەد پیاودا شویّنیان بکەوتینایە ، ئەوا هەرچی‌یان لا مابوو لیّمان ئەسەندن و ، ملی هەموویانم ئەگرت . بەلاّم پیّغەمبەری بە رەحم فەرمووی : (( یا سلمة ! ملكت فأسجع ، إنهم الآن ليغبقون في غطفان )) . فەرمووی : سەلەمە کە دەستت رۆی چاوپۆشیی بکە . ئەوان ئیّستە شیری ئیّوارەیان لە ولاّتی خۆیان ئەخۆنەوە ..

پاشان پیّغەمبەری خوا ﷺ دەستکەوتەکانی بەش کرد و ، دوو بەشی بۆ سەلەمە دانا ، بەشی پیادەیەك و بەشی سواریّك ، ئەمەش بۆ ریّز لیّنانی لەسەر ماندووبوون و غیرەتی ناوازەی . کە گەڕانەوە سەلەمەی لە پاشکۆی خۆیدا سواری ( عضباء ) کرد. لە ریّگای گەڕانەوەدا بەرەو مەدینە فەرمووی : (( خير فرساننا اليوم أبوقتادة ، وخير رجالتنا سلمة )) . فەرمووی : چاکترین سواری ئەمرۆمان ئەبوقەتادەیە و ، چاك ترین پیادەشمان سەلەمەیە ..

بەم شیّوەیە موسلّمانەکان دەرسیّکی چاکی غەطەفانیان دادا و ، پاشان گەڕانەوە بۆ مەدینە .[87]

[87] السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٣٦٧ ـ ٣٦٩ ، صلح الحديبية لباشميل : ٣٩ ـ ٤٥ ، الرحيق المختوم : ٣٧٢ ـ ٣٧٣ .

## بەشی سیی و سێهەم

# فـەتـحی خـەیـبـەر

**یەکەم : پێشەکیی**

فەتحی قەڵای خەیبەر درێژترین جەنگی موسڵمانانە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ ، کە ئەوەبوو بە سەرکەوتنی موسڵمانەکان کۆتایی پیٚ هات و ، ریشکی جوولەکە لە ناوچەی خەیبەردا لە بن دەرهێنرا ، کە دوا قەڵا و بەهێزترین قەڵای جوولەکە بـوو لە دوورگەی عەرەبییدا .. دوای ئەوەش فەدەك ( وادي القرى ) و تەیماءیش خۆیان بە دەستەوە دا ..

هەرچەندە پێغەمبەری خوا ﷺ ، دوای کۆچ کردنی بۆ مەدینـە ، زۆر بـە نـەرمیی لەگەڵ جوولەکە جووڵایەوە ، بەڵام جوولەکە لـە پـیلان و ناپـاکیی نەکـەوتن .. هـەر جارێکیش کە ناپاکیـیان دەرهەق بە موسڵمانان دەر ئەکەوت ، موسڵمانەکان بە چاوی لیٚ بووردنـەوە سـزایان ئـەدان ، بـەڵکو بیرێـك بکەنـەوە و ، فێـری دراوسـێتیی و ، پاراستنی پەیمان و بەڵێن بن ، کەچیی جار لە دوای جار ناپـاکیی گـەورەتریان ئـەنجام ئەدا ..

یەکەم ناپـاکیی نـەوەی قـەینوقاع ئـەنجامیان دا دژی ئـافرەتێکی موسـڵمان کـە ویستیان سووکایەتیی پیٚ بکەن ، ئەوەبوو بەبیٚ دەنگ دەرکران . دووهـەم ناپاکیـیـان گەورەتر کرد ، ئەوەبوو نەوەی نەضیر نیازیان بـوو پێغەمبـەری خـوا بکـوژن ، بـەڵام خوای گەورە ئاگاداری کرد و لەو داوە رزگاری بوو . ئـەم جـارەش بـە دوورخسـتنەوە لیٚیان رازیی بوو ..

کە نەوەی نەضیرکۆچـیان کـرد بـۆ خـەیبـەر ، لـەوێش کەوتنـە پـیلانگێـڕان دژی موسڵمانەکان . ئەوەبوو سـوپای ئـەحزابیان هێنایـە سـەر مەدینـە و ، خـەریك بـوو پێغەمبەر و موسڵمانەکان ، بە ماڵ و منـداڵ و ، عەقیـدە و دینیانـەوە تیـا بچـن . بـەوەشەو، نەوەستان جوولەکەی نەوەی قورەیظەیان لە موسڵمانەکان هەڵ گێڕانەوە و ، وەك ئەحزاب بەردەمی موسـڵمانانی گرتبـوو ، قـورەیظـەش دوای لیٚ گـرتن .. واتـە

موسڵمانەکان کەوتنە نێوان هەردوو بەرداشەکەوە .. تەنها خوا پاراستنی و دەربازی کردن ، ئەگینا تیا چوو بوون .. ئیتر ئەمجارە مافی خۆیان بوو ، دوای پەیمان شکاندن و پشتگیریی دوژمن ، قورەیظە ملی یەك بە یەکی جەنگاوەرانیان بقرتێنرێت و ، بکرێنە دەرس بۆ هەموو ناپاکێك ..

خۆ پێغەمبەر و موسڵمانەکان چاك ئەوەیان ئەزانیی کە جوولەکەی خەیبەر لە پیلان و ئاژاوە دەست کۆتا نابن و ، هەر نەخشەیەك بکێشن بۆ لەناوبردنی یەکجاریی دینی ئیسلامە ، بە پێچەوانەی عەرەبە موشریکەکان کە دڵیان بە تاڵان و بڕۆ و شت فڕاندن خۆش بوو . بۆیە پێویست بوو دوای پاك‌کردنەوەی مەدینە لە جوولەکە ، هەڵمەتێك ببرێتە سەر خەیبەریش ، تا ئەوێش لەو تۆوە پیسە پاك بکرێتەوە . چونکە هەر کاتێك بۆیان بگونجێ سوپایەکی تری وەك سوپای ئەحزاب ، بەڵکو سوپایەکی دوڕندەتر ئەهێننەوە سەر مەدینە .

هەروەها موسڵمانەکان ئەوەشیان لا روون بوو کە تێك‌شکاندنی سوپای ئەحزاب و سەربڕینی جەنگاوەرە ناپاکەکانی نەوەی قورەیظە بریتی‌یە لە قرتاندنی کلکی مارەکە و، هێشتا مەترسیی لا نەچووە ، چونکە سەری مارەکە وا لە خەیبەر و ، تا ئەو سەرە پان نەکرێتەوە ، دینی ئیسلام لە مەترسیی دەرباز نەبووە . بۆیە سەرکردایەتیی مەدینە بڕیاری وەها بوو لە نزیك‌ترین هەلدا سەری مارەکەی خەیبەر پان بکاتەوە . ئەمەش لە ساڵی حەوتەمی کۆچییدا بۆ موسڵمانەکان لوا ، چونکە موسڵمانەکان بە پەیمانی حودەیبیە هەردوو دەستی قوڕەیشیان بەست بوو ، بەمە لە هێرشی قوڕەیش بێ‌خەم بوون .

**دووهەم : کورتەیەك لە مێژووی یەهوودی خەیبەر**

خەیبەر ، لە دێرین زەمانەوە مێرگێکی فراوانی پڕ پیت و بەرەکەت و ، ئاو و کانیاوی زۆر بووە .. خۆڵەکەی بۆ چاندنی دانەوێڵە و میوەی جۆراوجۆر زۆر چاکە و ، یەکێکە لە گەورەترین مێرگی دارخورما لە دوورگەی عەرەبیی‌دا ، کە ئەوەبوو لە کاتی فەتحی خەیبەردا تەنها لە شیوی ( نطاة ) دا ، کە یەکێکە لە شیوە زۆرەکانی خەیبەر ، موسڵمانەکان چل هەزار دارخورمایان ژمارد ..

خەیبەر ئەکەوێتە باکووری مەدینەوە و ، نزیکەی حەفتا میل لێیەوە دوورە .

سێ هەزار ساڵ لەمەوبەر ناوچەی یەثریب و حیجاز هەتا سنووری شام هەر هەمووی لە ژێر دەسەڵاتی عەمالیقەدا بوو ، کە کۆمەڵێك عەرەبی بەدەسەڵات بوون لەو گەلە عەرەبانەی کە دوایان بڕاوەتەوە .

بەڵام بۆ چۆنیەتیی هاتنی جوولەکە بۆ خەیبەر ، هەندێك ئەڵێن کە مووسا پێغەمبەر سەلامی لێ بێ بەر لە مردنی سوپایەك ئەنێرێتە سەر عەمالیقە فاسیدەکان، کە ناوچەی حیجاز و ناوچەکانی تریشیان بە دەستەوە بوو . هەتا خەیبەریش . ئەم سوپایەی حەزرەتی مووسا توانیی عەمالیقە لە ناو بەرێت و بە سەرکەوتوویی بگەڕێتەوە . بەڵام لە رێگای گەڕانەوەدا مووسا کۆچی دوایی ئەکات ، ئیتر ئەوانەی کە ئەبنە خەلیفەی مووسا لەسەر شام ناهێڵن سەربازانی ئەو هەڵمەتە بگەڕێنەوە شام . لە تۆڵەی ئەوەدا کە ئەم سوپایە هەرچیی دیلی دەست کەوتووە لە عەمالیقە هەموویانی کوشتووە ، جگە لە تاقە پیاوێك . کە ئەبوا ئەویشی بکوشتایە، چونکە ئەوە پێچەوانەی دینی جوولەکەیە ، کە ئەبێ دیلەکان هەر هەموو بکوژرێن ، ئەمەش لە ( إصحاح ) ی بیستەمی ( سفر التثنية ) ی تەوراتدا هاتووە. ئیتر پیاوانی ئەو سوپایە کە خەلیفەکانی مووسا نەیان هێشت بچنەوە شام . گەڕانەوە بۆ حیجاز و لە ناوچەی یەثریب و خەیبەر نیشتەجێ بوون ، ئەمەش لە دەوروبەری ساڵی ١٢٠٠ پێش زاییندا .

هەندێ لە مێژوونووسان هۆی نیشتەجێبوونی جوولەکە لە حیجاز و خەیبەردا ئەگەڕێننەوە بۆ ئەوە کە هەندێ لە زانایانی جوولەکە ، کە لە سیفەتی پێغەمبەری ئاخرزەمان ئاگادار ئەبوون کە لەو ناوچەیەدا و ، لە شوێنێکدا کە دارخورمای لێ بێ و ، لە نێوان دوو کۆمەڵە بەرددا ، وەحی بۆ دێت . لە شامەوە دائەبەزین بەڵکو ئەو کارە پیرۆزەیان پێ بسپێررێ .. ئەوەبوو هەندێکیان لە ( تەیماء ) مانەوە و ، هەندێکی تریشیان لە خەیبەر و . زۆربەشیان هاتنە یەثریب چونکە هەموویان دارخورمایان لێ بوو .

ئەوەی گومانی تێدا نیە لە دوو کاتدا جوولەکە هاتوونەتە ناوچەی حیجازەوە :

یەکەمیان ١٢٠٠ ساڵ پێش زایین ، وەك لە پێشەوە باس کرا .

دووهەمیشیان لە ساڵی حەفتای زاییندا ، دوای ئەوەی کە دەوڵەتی رۆمانیی بت پەرست ، فەلەسطینی گرت و هەیکەلی رووخاند و . دوای ئەوەش کە هەدریان یان ئەدریان لە ساڵی ١٢٢ ی زاییندا زۆرێك لە عیبرانییەکانی کوشت .

شایانی باسە کە جوولەکەی خەیبەر ، بە درێژایی مێژوو ، لەگەڵ ئەوەدا کە ئازاترین و بەئارامترینی جوولەکە بوون لە جەنگ و کوشتاردا ، لەوپەڕی یەکگرتن و، تەبایی‌دا بوون ، بە پێچەوانەی جوولەکەکانی ترەوە ، کە هەمیشە پەرتەوازە بوون، کە هەتا جاری وابووە لە نێوان خۆیان‌دا جەنگ و کوشتاریان کردووە . لە هەمان کات‌دا جوولەکەی خەیبەر بە سەلیقە و ژیریی خۆیان نەیان‌هێشتووە لەگەڵ عەرەبە موشریکە دراوسێ‌کانیان‌دا جەنگ و هەرایان ببێ ، ئەمەش بۆتە هۆی بەهێزبوون و دەوڵەمەندبوونیان .

بەڵام جوولەکەی یەثریب لە نێوان خۆیان‌دا جەنگ و هەرایان ئەبوو ، وەك ئەو ناکۆکی‌یەی نێوان نەوەی قەینوقاع و نەوەی نەضیر کە هەتا هاتنی دینی ئیسلامیش هەر مابوو .

هەروەها جوولەکەی یەثریب ، پێش هاتنی ئیسلام ، گورزی سەربازیی کاریگەریان لەلایەن عەرەبە دراوسێ‌کانیانەوە بەرکەوتووە ، کە لەوەدا بوو بە یەکجاریی تیا بچن. وەك ئەو جەنگە ناهەموارەی کە لە صەدەی یەکەمی زایین‌دا ، لە نێوان جوولەکەی یەثریب و ئەو هۆزە یەمەنی‌یانەدا رووی دا ، کە دوای رووخاندنی بەندی مەئرەب بەرەو یەثریب کۆچیان کرد . چونکە ئەو هۆزانە ، واتە ئەوس و خەزرەج ، کە لە یەمەنەوە هاتبوون ، جوولەکەیان بە بێگانە ئەزانیی لە دوورگەی عەرەب‌دا ، ئەوەبوو سەرنجام بە کۆمەکیی غەساسینەی برایان ، کە ئەوانیش لە یەمەنەوە کۆچیان کردبوو، توانی‌یان جوولەکە ببەزێنن و بێ‌دەسەڵاتیان بکەن . ئەمەش بە سەرکردایەتیی پادشای ئەوس و خەزرەج لەو سەردەمەدا کە مالیکی کوڕی عیجلان بووە . خۆ ئەگەر جوولەکە ترسنۆکی‌یان نەنواندایە و سەریان بۆ عەرەبەکان شۆڕ نەکردایە تاقیان ئەبڕایەوە .

ئەگێڕنەوە کە ( فطیون ) ی پادشای جوولەکەی یەثریب ، هەموو دانیشتوانی یەثریبی ناچار کردبوو ، بە عەرەب و جوولەکەوە ، کە هەر کچێکیان شووی بکردایە ئەبوایە بەر لەوەی زاوا بچێتە لای ، پادشا بچوایەتە لای .

ماوەیەکی زۆر پادشا ئەوە کاری بوو ، هەتا ئەوس و خەزرەج لە یەمەنەوە هاتن و پادشا ویستی ئەو کارە لەگەڵ ئەوانیش‌دا ئەنجام بدات .

ئەوەبوو خوشکی مالیکی کوڕی عیجلانی پادشای ئەوس و خەزرەج شووی بە پیاوێکی نەوەی سولەیم کرد . ( فیطون ) ناردی بۆ لای کەس و کاری بووك کە

کچەکە لە پێشەوە بنێرن بۆ لای ئەو و ، مالیکی برای بووکیش لە ماڵ نەبوو . بووک لەبەر شەرم و شوورەیی بە پەلە لە ماڵ دەرچوو هەتا پادشای برای بدۆزێتەوە . کە دیتی وا پادشا لە ناو کۆمەڵە خەڵکێکدایە بانگی لێ کرد .. کە پادشا ئەمەی بە خوشکەکەیەوە دیی شەرمەزار بوو و پێی راگەیاند کە ئەوپەڕی شوورەیییە بۆی خوشکی بانگی لێ بکات و شەرم نەکات . خوشکەکەی وتی : ئەوەی لە منیان داوا کردووە لەوە شوورەییتر . کە هەواڵەکەی دایە ، پادشا تووڕە بوو و بە خوشکەکەی وت : خەمت نەبێ ، خۆم رزگارت ئەکەم . وتی : چۆن ؟ وتی : خۆیشم جلی ژنانە لەبەر ئەکەم و لەگەڵتدا دێمە ژوورەوە لای و ، ئەیکوژم . کە ئێوارە داهات مالیك خۆی گۆڕیی و جلی ژنانەی لەبەر کرد و لە ژێرەوە شمشێری داشارد و لەگەڵ ژناندا چووە لای پادشای جوولەکە . کە خەڵکی دەوروبەری کەم بوونەوە هەڵمەتی دایە و کوشتی و خوشکەکەی هێنایەوە ناو کەسوکاری و ، مالیك خۆی گەیاندە شام لای خزمانی ( غەساسینە ) و چووە لای پادشای غەساسینە کە ناوی ئەبوجوبەیلە بوو و داوای یارمەتیی لێ کرد . ئەویش بە خۆی و سوپاکەیەوە بەرەو یەثریب کەوتە رێ و ، کوشتارێکی زۆری لە جوولەکە کرد و ، زۆربەی فەرماندە و سەرکردەکانیان لەناو چوون.

لەلایەکی ترەوە ئەگەر سەرنج بدەین ئەبینین جوولەکەی خەیبەر لە هەموو جوولەکەکانی تر ئازاتر بوون و ، لەبەر دەم سوپای ئیسلامدا ئەوپەڕی دامەزراوییان نواند ، کەچیی ئەوانی تر ئەوەندە بەرگرییان نەنواند .. لەگەڵ ئەمەشدا پێش هاتنی ئیسلام ، جوولەکەی خەیبەر بەشداریی هیچ جەنگ و ئاژاوەیەکیان نەکردووە دژی عەرەبەکان لەگەڵ جوولەکەکانی یەثریبدا ، واتە بەبێ لایەن ماونەتەوە .

کە ئیسلامیش هاتە مەدینەوە جوولەکەی خەیبەریش وەك جوولەکەی مەدینە دڵیان بە دینی تازە نەئەکرایەوە ، بەڵام هەتا ساڵی چوارەمی کۆچیی بێلایەن و بێدەنگ بوون ، تا ئەوەبوو جوولەکەی نەوەی نەضیر کە لە مەدینە دەرکران خۆیان گەیاندە خەیبەر و ، شەیتانەکەی نەوەی نەضیر حویەیی کوڕی ئەخطەب کەوتە پیلان گێڕان و ، خەیبەری بێلایەن و دوور لە ئاژاوەی پێچا بە خۆیەوە و ، ئەوانیشی لە خیانەت و پیلان گێڕاندا بەشدار کرد .

کە جوولەکەی نەوەی نەضیر لەسەر ناپاکییان لە مەدینە دەرکران ، چیی کەل و پەلێکی بەنرخیان هەبوو ، بە تایبەت ئاڵتوون و زیو و ، شەش صەد وشتریان لێ بار کرد و بەرەو خەیبەریان برد .

نەوەی نەضیر زۆر دەوڵەمەند بوون، بۆ نموونە سەللامی کوڕی ئەبولحوقەیق ، کە لە پێشەوە باسی چۆنیەتیی کوژرانی کراوە، یەکێك بوو لە دەوڵەمەندە ناوەنجییەکانیان، کاتێك کە مەدینە بەجێ ئەهێڵێ ؛ چەرمی گاجووتێك لە ئالتوون و زیو پڕ ئەکات و بەرەو خەیبەر ئەیبات ، کە خەڵك تووشی ئەبن ، دەست لە چەرمەکە ئەدات و ئاماژە بۆ زێڕ و زیوەکەی ناوی ئەکات و ئەڵێت : بۆ بەرزکردنەوە و نزمکردنەوەی زەویی ئەمەمان ئامادە کردووە . جا ئەگەر ئێمە لێرە دارخورمامان بەجێ هێشتبێ ؛ ئەوا لە خەیبەریش دارخورما هەیە .

ئەو هەڕەشەیە فیزێکی بێئەنجام بوو و ، ئەو هەمووە زێڕ و زیوەی جوولەکە لە ڕۆژی ڕەشی ناپاکییان دەربازی نەکردن .

کە نەوەی نەضیر گەیشتنە خەیبەر خۆیان بەسەر ئەهلی خەیبەردا زاڵ کرد و ، دەسەلاتیان لێ وەرگرتن ، چونکە خۆیان لە هەموو جوولەکەیەکی تر لە پێشتر ئەدایە قەڵەم ، کە گوایا ئەمان لە نەوەی هاروون پێغەمبەری برای مووسا پێغەمبەرن سەلامیان لێ بێ ؛ هەروەها خاوەنی فڕوفێڵ و سیاسەتبازیی بوون ، بۆیە بە ئاسانیی خۆیان کردە حاکمی خەیبەر و ، خەیبەری بێلایەن و بێئاژاوەیان گۆڕیی بۆ مەڵبەندی دژایەتیی موسڵمانان .. ئەوەبوو وەك لە باسەکانی پێشەوە باس کرا ، سوپای ئەحزابیان هێنایە سەر مەدینە و ، جوولەکەی نەوەی قورەیظەشیان لە موسڵمانەکان هەڵ گێڕایەوە ..

نەوەی نەضیر کە لە کوشتن دەرباز بوون و بە سەلامەتیی گەیشتنە خەیبەر ؛ نەچوون بۆ خۆیان خەریکی کاروباری ڕۆژانەی خۆیان بن ، بەڵکو کەوتنە تەماعی ئەوەی ڕۆژێك بێتە بەرەوە کە موسڵمانەکان لە ناو بەرن و بگەڕێنەوە مەدینە و ، خۆیان حوکمی بکەن .. ئەیانتوانیی واز لە پیلان و ئاشوبە بهێنن و بە سەلامەتیی بژین ، بەڵام سروشتی جوولەکە هەر وایە ؛ حەزیان لە ئاژاوە و پشێوییە ؛ بەو هیوایەی خەڵك بە کوشت بدەن و ، خۆیان بەری ڕەنج و زەحمەتەکە کۆ بکەنەوە ..

جوولەکەی خەیبەریش هەموو توانا و لێهاتنێکیان خستە بەر دەم شەیتانەکانی نەضیر بەو هیوایەی لە دینی تازە ڕزگاریان بکەن .

خۆ بەر لەوەی سوپای ئەحزاب ڕێك بخرێ ، جوولەکەی خەیبەر و نەوەی نەضیر ئەیانتوانیی سوپایەکی دە هەزاریی بەرەو مەدینە بخەنە ڕێ .. نۆ هەزاریان لە خەیبەر و هەزاریشیان لە نەوەی نەضیر ، بە مەرجێ لە ساڵی چوارەمی کۆچییدا

موسڵمانەکان خاوەنی هەزار جەنگاوەر زیاتر نەبوون و ، ئەوەی قورەیظەی جوولەکەش، کە هێشتا لە مەدینەدا مابوون ، نــزیکەی هــەزار جـەنگاوەریان هـەبوو . ئـیتر بـا دەسەڵاتی سامان و دارایی‌یان بووەستێ . کەچیی ئەو جوولەکانـە ئـەوەیان بـە بـیردا نەهات کە سوپا بۆ سەر مەدینە رێك بخەن ، هەر چەندە ئەوپەڕی ئاواتیان لە ناوبردنی ئیسلام و سوپای ئیسلام بوو .. هۆی ئەمەش ئەگەڕێتەوە بـۆ ترسـنۆکیی جوولەکـە، لەبەر ئەوەی لەلایەکەوە نەیان ئەوێرا بەرامبەر بە موسڵمانەکان شمشێر بەرز بکەنەوە، چونکە ئاگاداری دەست و بازووی جەنگاوەری موسـڵمان بـوون . لەلایـەکی تریشـەوە ئەترسان ئەگەر هێرش بکەنە سەر مەدینە ، هۆزە موشریکەکانی دەوروبەریان خەیبەر تالان بکەن و ژن و منداڵیان بە دیـل بگـرن . سـەرەنجام هاتنـە سـەر ئـەوە عەرەبە موشریکەکان بە پارە و پووڵ هەڵ بخەڵەتێنن و ، بیاندەن بـە گـژی موسـڵمانەکاندا ، بەمە سوپای ئەحزاب لە قورەیش و غەطەفان پێك هێنرا .. [88]

سێهەم : خۆ ئامادە کردن بۆ غەزای خەیبەر

دوای ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ پەیمانی حودەیبیەی لەگەڵ قـورەیشدا بەسـت و، یەکێ لە بەندەکانیشی بریتیی بوو لە گەڕانـەوەی موسـڵمانەکان لـەو سـاڵەدا بـۆ مەدینە ، ئەوەبوو موسڵمانەکان بە لایانەوە زۆر ناڕەحەت بوو .. ئەوەبوو خوای گەورە بـۆ دڵدانـەوەی پێغەمبـەر و موسـڵمانەکان ، تـا ورەیـان بـەرزتر بێـت و ، دڵیـان دامەزراوتر بێت ، قورئانی پیرۆز بە مژدەوە هاتە خوارەوە .. هاتە خوارەوە و مـژدەی بە موسڵمانان دا کە خوا بەڵێنی دەستکەوت و سەرکەوتنێکی گەورەی بە موسڵمانان داوە ، کە مەبەستی لە فەتحی خەیبەر بوو ، کـە ئەیفەرموو :

﴿ وَعَدَكُمُ ٱللَّهُ مَغَانِمَ كَثِيرَةً تَأۡخُذُونَهَا فَعَجَّلَ لَكُمۡ هَٰذِهِۦ ... ﴾ ( الفتح : ٢٠ ) .

مژدەی پێ دان خەیبەر و مێرگە صەوزەکانی و باخ و باخاتە فراوانەکانی ئەبێتە دەسـت کەوتی موسڵمانان ، لە پاداشتی دامەزراویی و فیداکاریی و خۆنەویسـتیی ئیمـانداراندا ، کە هەردەم سەروماڵیان ئامادە کردووە تا بیکەنە قوربانیی لە پێناوی رەزامەندیی خوادا..

کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا موسڵمانەکان خۆیان بـۆ هێـرشکردنـە سـەر خەیبەر ئامادە بکەن ، خۆشـیی و شـادیەکی بێوێنـە رووی کـردە موسـڵمانەکان ، چونکە ئەیانزانیی ئەوە ئەنجامدانی فەرمانی خوایە ..

---

[88] غزوة خيبر لباشميل : ١١ ـ ٦٣ .

ئەوەبوو لە ساڵی پێشوودا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا موسڵمانەکان خۆیان ئامادە بکەن بۆ عومرە ، بەڵام هەر چەندە خەڵك زۆر بووبوو ، کە لەسەر ئیسلام حیساب بکرێ ، کەچیی ( ١٤٠٠ ) پیاوێکی زۆر دڵسۆز خۆیان ئامادەی ئەو سەفەرە کرد ، کە مەترسیی جەنگ و کوشتاری لێ ئەکرا . ئەوانە خوای گەورە رەزامەندیی خۆی بەرامبەریان دەربڕیی ، بە تایبەت لەو کاتەدا کە لە ژێر درەختەکەی حودەیبیەدا پەیمانی بەخشینی سەروماڵیان بە پێغەمبەری خوا دا .. قورئان ئەفەرموێ :

﴿ لَّقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ ﴾ ( الفتح : ١٨ ) .

بەڵام مونافیق و ئەعرابە ئیمان لاوازەکان بە دەم بانگەوازی ئازیزەوە نەهاتن و ، لێی دواکەوتن و ، هەر یەکە بۆ خۆی بیانوویەکی درۆینەی هێنایەوە .

موسڵمانەکان سەفەری خۆیان ئەنجام دا و ، لەسەر ئیخلاص و فیداکاری‌یان خوای گەورە بە سەری بەرزەوە گێڕانیەوە دوا ، دوای ئەوەی کە قورەیش دانی پیا نان و ، رەزامەندیی نواند کە ساڵێکی تر عەمرە ئەنجام بدەن . بەمە موسڵمانەکان بوونە خاوەنی ورەیەکی بەرز .

جا کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا با موسڵمانەکان خۆیان ئامادە بکەن تا هەڵمەت بەرنە سەر خەیبەر ، مونافیقە ترسنۆکە دواکەوتووەکانی حودەیبیەش کەوتنە خۆ ئامادەکردن ، بۆ بەشداریی ئەو هەڵمەتە ، بەڵام وەك ئیمانداره‌کان نییەتی جیهاد و رەزامەندیی خوایان نەبوو ، بەڵکو مەبەستیان دەستکەوتی زۆری خەیبەر بوو تا ئەوانیش تیایا بەشدار بن ، چونکە ئەیانزانی قورئان بەڵێنی بە موسڵمانان داوە ..

بەڵام خوای گەورە پێغەمبەرەکەی خۆی ﷺ لە نیازی دڵی ئەو مونافیقانە ئاگادار کرد ، کە ئەوانە بۆ بەرژەوەندیی ماددیی نیازی ئەو سەفەرەیان کردووە و ، لە نییەتی جیهاد و شەهیدی‌یەوە زۆر دوور بوون ، بۆیە ئەوەی لە گەشتی حودەیبیە ئامادە نەبووبێ ، نابێ بەشداریی غەزای خەیبەریش بکات .

جا پێش ئەوەی رۆژی غەزای خەیبەر بێتە پێشەوە قورئان زووتر هاتە خوارەوە و پێغەمبەر و موسڵمانەکانی ئاگادار کرد کە دواکەوتووە بەرژەوەندیی پەرستەکان دێن و ، داوا ئەکەن با بێین لەگەڵتاندا بۆ غەزای خەیبەر ، بۆ بەشداربوون لە دەستکەوت دا .. تۆش ، ئەی موحەممەد ! پێیان بڵێ : نابێ بێن لەگەڵماندا ، چونکە خوا وەهای فەرمووە ، کەچیی پێتان ئەڵێن : ئەوە حەسوودییمان پێ ئەبەن . هەروایش بوو .

قورئان له پێشەوە چۆن باسەکەی گێڕابۆوە ، هەمووی رووی دا و ، ئەو مونافیقانە ئەیانوت : حەسوودییمان پێ ئەبەن . قورئان ئەفەرموێ :

﴿ سَيَقُولُ ٱلْمُخَلَّفُونَ إِذَا ٱنطَلَقْتُمْ إِلَىٰ مَغَانِمَ لِتَأْخُذُوهَا ذَرُونَا نَتَّبِعْكُمْ يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُوا۟ كَلَـٰمَ ٱللَّهِ ۚ قُل لَّن تَتَّبِعُونَا كَذَٰلِكُمْ قَالَ ٱللَّهُ مِن قَبْلُ ۖ فَسَيَقُولُونَ بَلْ تَحْسُدُونَنَا ۚ بَلْ كَانُوا۟ لَا يَفْقَهُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ (الفتح : ١٥) .

بەمە بڕیار درا تەنها ئەوانە بەشداریی غەزای خەیبەر بکەن کە لە ژێر درەختەکەی حودەیبیەدا پەیمانیان دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ کە تەنها هەزار و چوارصەد کەس ئەبوون . ئەوانەش کە هاتن و داوای مۆڵەتیان کرد کە بەشداریی بکەن ، پێغەمبەری خوا ﷺ دای بە گوێیاندا کە ئەگەر بۆ جیهاد دێن ئەوا باشە ، ئەگینا لە دەستکەوتدا بەشدار نابن ، کە فەرمووی : (( لا تخرجوا معي إلا راغبين في الجهاد ، فأما الغنيمة فلا )) .

بەمەش ویستی ئەوانە تاقیی بکاتەوە ، تا راستگۆی غەزاکەر و درۆزنیان جیا ببنەوە و ، تا پاداشتێکیش بێ بۆ ئەوانەی ئامادەی حودەیبیە بوون . ئەوەبوو تاقە کەسێك لەو دواکەوتوانە رازیی نەبوو بەبێ دەستکەوت ئامادەی خەیبەر ببێت و ، تەنها بەشداربووانی حودەیبیە بەشداریی خەیبەریان کرد ..

بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ ماوەی دا بیست لە ئافرەتە هاوەڵەکان بەشداریی خەیبەر بکەن ، تا یارمەتیی جەنگاوەران بدەن و ، نان و ئاویان بۆ ئامادە بکەن و ، دەرمانی زامدار و نەخۆشیان بکەن ، کە دیارە ئەمانە هەر هەموویان ئامادەی حودەیبیە نەبووبوون . چونکە فەرمان بۆ پیاوان دەرکرابوو بەشداریی حودەیبیە بکەن. لەوانەی کە بەشداری خەیبەر بوون : صەفیەی کچی عەبدولموطەللیب و ، ئوم سولەیم و ، ئوم عەطیەی ئەنصاریی و ، ئوم عومارە . هەروەها ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەری خواش ﷺ لە حودەیبیە و لە خەیبەریش ئامادە بوو .

لە کاتێکدا کە موسڵمانەکان خۆیان بۆ غەزای خەیبەر ئامادە ئەکرد ، لەناو مەدینەدا هەندێ جوولەکە مابوون و ، بەوپەڕی سەربەستییەوە ژیانی خۆیان بەسەر ئەبرد ، بگرە دەوڵەمەندیش بوون و ، کەم کەس لە هاوەڵان لەبەر دەست کورتیی پارە و پووڵی لە جوولەکە قەرز نەکردبێ ، هەتا پێغەمبەری خواش ﷺ زۆر جار قەرزی بەلاوە کردوون .

جا هەرچەندە ئیسلام مافی ئەو جوولەکانەی ئەپاراست ، بەڵام ئەوان لەبەر چاویان نەبوو ، بگرە بە ئاشکرا لایەنگیریی خۆیان بۆ جوولەکەی خەیبەر دەرئەبڕیی . کە بیستیشیان وا موسڵمانەکان ئەیانەوێ هێرش بکەنە سەر خەیبەر ، کەوتنە بیانووگرتن بە موسڵمانە قەرزارەکان تا قەرزەکەیان لێ وەربگرنەوە ، بەڵکو توانایان نەبێ بچنە سەر خەیبەر .

یەکێ لە هاوەڵان ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : کاتێك کە خۆمان بۆ خەیبەر ئامادە ئەکرد ، هەرچیی جوولەکەیەکی مەدینە قەرزی بە لای هەر موسڵمانێکەوە ببوایە داوای ئەکرد .. جوولەکەیەکیش کە ناوی ئەبوشەحم بوو پێنج دیرهەمی بە لای عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوحەدرەدی ئەسلەمی‌یەوە بوو ، کە هەندێ جۆی پێ دابوو بۆ منداڵەکانی ، هات و داوای لێ کرد . ئەویش وتی : لەگەڵمدا بخایەنە ، إن شاء الله کە گەڕامەوە قەرزەکەت ئەدەمەوە . خوای گەورە بەڵێنی بە پێغەمبەرەکەی داوە کە خەیبەر بکاتە دەستکەوتی . عەبدوڵڵا یەکێ بوو لەوانەی کە بەشداریی حودەیبییەی کردبوو . کە جوولەکەکە ئەوەی لێ بیست لە حەسوودیی‌دا وتی : وا ئەزانیی جەنگ کردن لەگەڵ خەیبەردا وەك جەنگی ئەعراب وەهایە ؟ بە تەورات دە هەزار جەنگاوەری تێدایە . عەبدوڵڵاش وتی : ئەی دوژمنی خوا ! تۆ وای لە پەنای ئێمەدا ، کەچیی بە دوژمنەکەمان ئەمانترسێنی ؟ بەخوا ئەمەت ئەگەیەنمە لای پێغەمبەری خوا ﷺ .

کە عەبدوڵڵا هەواڵەکە ئەگەیەنێ ، پێغەمبەری خوا ﷺ بێدەنگ ئەبێ ، بەڵام جوولەکەکە داوای قەرزەکەی ئەکات ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا کە عەبدوڵڵا قەرزەکەی بداتەوە .

عەبدوڵڵا ناچار یەکێ لە دوو کراسەکەی بە سێ دیرهەم ئەفرۆشێ و دوو دیرهەمەکەی تریش پەیدا ئەکات و ، قەرزی جوولەکەکە ئەداتەوە . تەنها یەك کراس لەبەر ئەکات ، بەڵام مێزەرێکی ئەبێ بۆ خۆپاراستن لە سەرما لە خۆی ئەپێچێت و ، سەلەمەی کوڕی ئەسلەمیش کراسێکی تری ئەداتێ و بەو دوو کراسەوە ئەکەوێتە ڕێ. لە دوای خەیبەر هەندێ دەستکەوتی دەست ئەکەوێت .

جوولەکەی مەدینە بەوەوە نەوەستان کە خۆیان بە لایەنگیری جوولەکەی خەیبەر بزانن ، بەڵکو سیخوڕییشیان ئەنجام دا .. ئەوەبوو ئەعرابی‌یەکی نەوەی ئەشجەعیان بەکرێ گرت و ناردیان بۆ لای فەرماندەکانی خەیبەر و هەموو زانیاری‌یەکیان دەربارەی سوپای ئیسلام پیادا ڕەوانە کرد و ، داوایان لێ ئەکردن کە دان بە خۆیاندا بگرن . خوای گەورە وەهای هێنایە پێش کە ئەو ئەشجەعی‌یە بکەوێتە دەست سوپای ئیسلام.

ئەوەشمان لە یاد نەچێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە زۆربەی غەزاکاندا راستیی شوێنی مەبەستی بلاو نەئەکردەوە، بەلام بۆ غەزای خەیبەر هاوەلانی لێ ئاگادار کرد.

لەلایەکی ترەوە مەدینە پڕی بوو لە سیخوڕی مونافیق کە پێیان خۆش بوو هەموو نهێنییەکی موسلمانان بۆ خەیبەر بنێرن . پێش هەموو کەس عەبدوللای کوڕی ئوبەی سەرۆکی نیفاق جوولەکەی خەیبەری لە نیازی موسلمانان ئاگادار کرد و داوای لێ کردن کە خۆیان ئامادە بکەن و ، لە موسلمانان نەترسن چونکە موسلمانەکان کەمیشن و چەك و تفاقیشیان هەر کەمە . با ماڵ و سامانیان بەرنە ناو قەلاکانەوە و خۆیان بێنە مەیدانی موسلمانەکان .

جوولەکەی خەیبەریش کە ئەم هەواڵەیان پێ گەیشت خۆیان ئامادە کرد ، بەلام بڕیاریان وەهابوو کە لەناو قەلاکانیاندا بمێننەوە و ، بەرگریی لە خۆیان بکەن و ، ژن و منداڵەکانیشیان گواستنەوە بۆ ناو قەلاکانی دواوە و ، قەلاکانی پێشەوە تەنها جەنگاوەری چەکداریان تیا هێشتنەوە .[89]

**چوارەم : خەیبەر خۆی ئامادە ئەکات**

کە سەردارانی جوولەکەی خەیبەر هەواڵی هێرشی موسلمانیان بیست ، خێرا کۆبوونەوەیەکی سەربازییان ئەنجام دا، تا نەخشەیەك بۆ بەرامبەر بوونەوە بکێشن.

کە باسیان هەڵ درپی ، سەرکردەکان سێ رایان هەبوو : کە جوولەکە لە قەلاکانیان دا بمێننەوە و لە پشتی شووراکانەوە لەگەڵ موسلمانەکان بجەنگێن ، تا بێزاریان بکەن و سەرەنجام ناچاری کشانەوە ببن و ، لەبەر سەختیی و مەحکەمیی نەتوانن هیچ قەلایەك بگرن .

کۆمەلێکی تریان رایان وەها بوو هەرچیی چەکداری خەیبەر هەن هەر هەموو لە قەلاکان بێنە دەرەوە و ، ئۆردووگا لە دەشتدا دروست بکەن و بچن بە گژ موسلمانە کەم و کەم تفاقەکاندا .. نەك لە قەلاکاندا سەر کز بکەن هەتا بدەن بەسەریاندا ..

سەرۆکی ئەم رایە یەکێ لە سەرکردە ناودارەکانیان بوو ، بە ناوی حاریث کە نازناوی ( باوکی زەینەب ) بوو و، برای مەرحەبی پالەوانی بەناوبانگی خەیبەر بوو.[90]

---

[89] غزوة خيبر لباشميل : ٨٤ ـ ١٠١ .

[90] ئەبوزەینەب بە زۆرانبازیی لەبەر دەرگای قەلای ( ناعم ) دا کوژرا . ئەم پیاوە یەکەم سەرۆکی گەورەی جوولەکە بوو لەم جەنگەدا بکوژرێ و ، عەلیی کوڕی ئەبوطالیب ، یان ئەبودوجانە کوشتوویە .

بەڵگەی حاریث بۆ ئەم رایەی ئەوەبوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ چووبێتە سەر هەر قەڵایەك کۆڵی نەداوە هەتا خۆیان بە دەستەوە داوە . هەر سێ تیرە جوولەکەکەی مەدینەش چاکترین نموونەن بۆ ئەم رایەی .

هەر چەند ئەم رایەی حاریث بەهێز بوو بەلاّم لەلایەن فەرماندە جوولەکەکانەوە درایە دواوە و ، پشتی ئەو رایەیان گرت کە حەزی لە مانەوەی ناو قەڵاکان بوو ، بە بیانووی ئەوەی کە قەڵاکانی خەیبەر وان لە شوێنی سەختدا و یەکجار مەحکەمن .

بەلاّم دەستەی سێهەمیان زیاتر پێیان بە جەرگی خۆیاندا ناو لە ئەبوزەینەب زیاتر پێیان راکێشا .. بڕیاریان وەها بوو کە نەك لە قەڵاکان بێنە دەرەوە بۆ جەنگ ، بەڵکو سوپا بەرەو مەدینە بخەنە رێ و ، ئەوان دەست لە موسڵمانەکان بووەشێنن و ، نەهێڵن سوپای ئیسلام بەرەو خەیبەر بکەوێتە رێ .

سەرۆکی ئەم رایەش سەللامی کوڕی میکشەم بوو لە نەوەی نەضیر ، کە فەرماندەی گشتیی هێزی جوولەکەی خەیبەر بوو و ، لێپرسراوی جەنگیان بوو . لە کۆبوونەوەیەکدا حویەیی کوڕی ئەخطەب تاوانبار ئەکات کە ئەو بۆتە هۆی دەرکردنی نەوەی نەضیر لە مەدینە ، بەوەی کە ویستوویەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بکوژێت ، هەروەها بۆتە هۆی تیاچوونی نەوەی قورەیظە بە هۆی ئەوەوە کە پەیمانی پێ شکاندن. لەو کاتەدا کە نەوەی نەضیر ویستیان بەرد بەسەر پێغەمبەردا بخەن ، سەللام رازیی نەبوو .. ئەم پیاوە سەرەڕای ئەوەی کە فەرماندەیەکی جەنگاوەر بوو ، لە هەمان کات دا زانایەکی لێهاتوو بوو لە دینی جوولەکەدا ، بۆیە پێی خۆش نەبوو حویەیی ئاژاوە دژی موسڵمانەکان بەرپا بکات و ، دواییش جوولەکە تووشی نەهامەتیی بێن .

کینانەی کوڕی ئەبولحوقەیقی پادشای جوولەکە وتی : ئێستە وەختی گلەیی نیە و ، کاریش لەبەر چاوتانە و ئەیبینن .

سەللام وتی : موحەممەد دەستی لە جوولەکەی یەثریب بەتاڵ بۆتەوە و ، روو لە ئێوەش ئەنێت و ، دێتە مەیدانتانەوە و ، چیی بە نەوەی قورەیظە کرد بە ئێوەشی ئەکات .

وتیان : ئەی چار چیە ؟

وتی : چیی جوولەکەی خەیبەرمان لەگەڵدایە بەرەو رووی ئەیانخەینە رێ ، کە زۆریشن و ، جوولەکەی تەیما و فەدەك و وادیلقوڕاش لەگەڵ خۆمان ئەبەین . بەلاّم داوای کۆمەکیی لە هیچ عەرەبێك ناکەین . خۆ دیتان لە غەزای خەندەقدا عەرەب

( واته غەطەفان ) چی‌یان پێتان کرد ؟ ئێوه بەڵێنی خورمای خەیبەرتان دا پێ‌یان کەچیی پەشیمان بوونەوه و ، پشتی ئێوەیان بەر دا و ، داوای کرد موحەممەد هەندێ خورمای ئەوس و خەزرەجیان بداتێ تا وازی لێ بهێنن .

سەللام زۆر سوور بوو لەسەر ئەوەی کە خەیبەر هەڵمەت بەرێته سەر مەدینە ، بە رادەیەك کە زۆربەی فەرماندەکانیان رایان هاتە سەر رای سەللام ، کەچیی کینانەی پادشای خەیبەر رای لەسەر نەبوو .

سەللامی کوڕی میکشەم تووڕە بوو و پەنجەی بۆ کینانە راکێشا و وتی : ئەمە پیاوێکە هەتا ملی نەگری جەنگ ناکات، .

هەر وایش بوو جوولەکە کزۆڵەیان کرد هەتا شێرەکانی ئیسلام تەپیان کوتایە سەریان و کینانە و هەر هەموو فەرماندەکانی خەیبەر کوژران ..

کە لەلایەن جوولەکە و مونافیقانی مەدینەوە هەواڵ گەیشتە خەیبەر کە موسڵمانەکان نیازی هێرشیان بۆ سەر خەیبەر هەیە ، جوولەکەی خەیبەر وایان بە چاك زانیی داوای کۆمەکیی لە دۆست و دراوسێ کۆنەکانی ئەعرابی نەجدیان بکەن ..

ئەوەبوو لە سەرۆکانی خەیبەر کۆمەڵێکیان دەستیان دایە سەردانی هۆزە بت پەرستەکانی دەوروبەریان تا بێنە کۆمەکیان و لە دژی سوپای ئیسلام بوەستن . ئەم کۆمەڵە نوێنەرە بریتیی بوون لە چواردە کەس کە کینانەی پادشای خەیبەر و ، هەوذەی کوڕی قەیسی وائیلیی ، کە یەکێ لە فەرماندە دیارەکانیان بوو ، لەگەڵیاندا بوون ..

ئەو هۆزانە ، بە تایبەت غەطەفان و ئەسەد ، هاتن بە دەم هانا بردنەکەی جوولەکەوە . ئەوەبوو بە سەرکردایەتیی عویەینەی کوڕی حیصن و طولەیحەی کوڕی خوەیلیدی ئەسەدیی چەند کەتیبەیەك لە جەنگاوەرانیان نارده لایان . هەروەها بەڵێنیان دا بە چوار هەزار جەنگاوەر کۆمەکیی جوولەکە بکەن . بەڵام ژمارەی سەربازانی ئەو کەتیبانە دیاریی نەکراون ، کە ئەگونجێ ژمارەیان لە هەزار کەس کەمتر نەبووبێ . بەمە دەرئەکەوێ کە جەنگاوەرانی خەیبەر لە یانزە هەزار کەس کەمتر نەبوون ، بەرامبەر بە هەزار و چوارصەد موسڵمانی جەنگاوەر . ئەمەش ئەوپەڕی ئازایەتی‌یە کە ئەگەر ژمارەیەکی وەها کەم لە دەشتێکی دەور چۆڵدا بیانەوێ بچن بە گژی ژمارەیەکی وەها زۆری پڕ چەك و تفاقی لە قەڵا پەنادراودا .

بەڵام هۆزی نەوەی موڕڕە ، کە باڵێك لە چوار باڵەکەی سوپای غەطەفان بوو لە سوپای ئەحزاب‌دا ، ئامادە نەبوو پیاو بنێرێتە کۆمەکیی خەیبەر ، هەتا تاقە پیاوێکیش . ئەمەش بە ئامۆژگاریی حاریثی کوڕی عەوفی موڕڕیی سەرۆکیان ، کە بە ژێریی خۆی ، دوای زانینی هەواڵ لە جوولەکە خۆیانەوە ، قەناعەتی کرد بوو کە جوولەکە ئەدۆڕێن و ، پشت‌گرتنیان مانایەکی نیە .

هەتا حاریث بەوەوە نەوەستا کە هۆزەکەی خۆی لە یارمەتیی خەیبەر دوور بخاتەوە، بەڵکو چوو بۆ لای عویەینەی کوڕی حیصنی فەززاریی و ئامۆژگاریی کرد کە واز لە کۆمەکیی خەیبەر بهێنێ ، با تووشی هەڵە نەبێ ، کە پێی وت : عویەینە ! تۆ بە هیچ و خۆڕایی خۆت ماندوو ئەکەیت . بەخوا ، ئەی عویەینە ! موحەممەد بەسەر نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوادا زاڵ ئەبێ . جوولەکە خۆیان ئەم هەواڵەیان پێ داوین . شاهێدیی ئەدەم کە گوێم لە ئەبوڕافیع سەللامی کوڕی ئەبولحوقەیق بووە وتوویە : ئێمە لەسەر پێغەمبەرایەتیی حەسوودیی بە موحەممەد ئەبەین ، بەوەی لە نەوەی هاروون دەرچووە و ، ئەو بۆتە پێغەمبەر . جا جوولەکە لەمەدا گوێڕایەڵییم بۆ ناکەن و .. دوو جار لەلایەن ئەوەوە تووشی کوشتار ئەبین ، یەکێ لە یەثریب ( کە ئەوەبوو رووی دا ) و یەکێکیش لە خەیبەر .

حاریثی کوڕی عەوف ئەڵێت : پێم وت : ( ئەی سەللام ) ! ئەبێتە خاوەنی هەموو زەویی ؟ وتی : بەڵێ ، بەو تەوراتەی بۆ مووسا هاتووە . پێیشم خۆش نیە جوولەکە بەم قسەیەم بزانن دەربارەی ئەو .. [٩١]

**پێنجەم : سوپای ئیسلام بەرەو خەیبەر**

لە کاتێك‌دا کە جوولەکەی خەیبەر خەریکی خۆ ئامادەکردن بوون بۆ بەرەنگاریی سوپای مەدینە و ، پەیوەندی‌یان بە هاوپەیمانەکانیانەوە ئەکرد ، تا بێنە کۆمەکی‌یان، موسڵمانەکانیش خەریکی خۆ پێچانەوە بوون بۆ هەڵمەت بردنە سەر خەیبەر ، چونکە چەند ساڵێکە خەیبەر بۆتە بنکەی ئاژاوە بۆ موسڵمانان ..

دوای خۆ ئامادەکردن و ، پێچانەوەی تفاقی پێویست بۆ سوپای ئیسلام ، پێغەمبەری خوا ﷺ سوپای خستە رێ و ، مەدینەی بەجێ هێشت ، ئەمەش لە سەرەتای مانگی موحەڕڕەمی ساڵی حەوتەمی کۆچیی‌دا بوو ..

---

[٩١] غزوة خيبر لباشميل : ١٠٢ ـ ١٠٩ .

بەر لە دەرچوونی سوپا ، وەك هەموو جارێك ، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمیری بۆ مەدینە لە جێی خۆی دانا . ئەمیری ئەم جارەش سیباعی كوڕی عەرفەطەی غیفاریی بوو ، تا كاروباری مەدینە هەڵ بسووڕێنێ .

ژمارەی سەربازانی سوپای ئیسلام تەنها ئەوانە بوون كە بەشداریی پەیمانی حودەیبییەیان كردبوو ، كە هەزار و چوارصەد جەنگاوەر بوون ، كە دووصەدیشیان ئەسپ سوار بوون و ، تا ئەو كاتە موسڵمانەكان لە هیچ جەنگێكدا ئەوەندە ئەسپیان لەگەڵدا نەبووە . بەڵام وڵاغی كەل و پەل گواستنەوە وەك وشتر ، دیاریی نەكراوە چەندیان لەگەڵدا بووە .

بەر لەوەی سوپا بكەوێتە رێ ، پێغەمبەری خوا ﷺ كۆمەڵێك سوارچاكی جیا كردنەوە و ، فەرماندەیی ئەمانەی بە یەكێ لە فەرماندە پاسەوانەكانی خۆی سپارد كە عەببادی كوڕی بیشری ئەنصاریی بوو ، تا بكەونە پێشی سوپای ئیسلامەوە ، بۆ پاككردنەوەی رێگاكان و ، لەوەش بێخەم بن كە دوژمن كەمینی بۆیان دانەناوە . لە لایەكی ترەوە پێغەمبەر و هاوەڵان شارەزای رێگاوبانی نێوان مەدینە و خەیبەر نەبوون، لەبەر ئەوە پێویست بوو دەلیل بۆ رێگا پەیدا بكەن تا چاوساغیی سوپا بكەن بۆ گەیشتنە خەیبەر . بۆ ئەمەش پێغەمبەری خوا ﷺ چەند دەلیلێكی بە كرێ گرتن كە دوانیان ناویان حوسەیلی كوڕی خاریجە و عەبدوڵڵای كوڕی نوعەیمی ئەشجەعیی بوون ، كە زۆر شارەزای ئەو ناوە بوون .

پێغەمبەری خوا ﷺ هەردوو دەلیلەكەی بانگ كردن و تێی گەیاندن كە ئەیەوێ لەلای باكووری خەیبەرەوە هێرش بكاتە سەر خەیبەر ، ئەمەش بۆ ئەوەی جوولەكەی خەیبەر ماوەیان نەبێت بەرەو شام هەڵ بێن .

حوسەیل بەڵێنی دا كە بەو شێوەیە بیان بات .

لە كاتێكدا كە عەببادی كوڕی بیشر بە خۆی و سوارچاكەكانیەوە كەوتبوونە پێشی سوپاوە، تووشی پیاوێك بوون لە نەوەی ئەشجەع كە گومانی ئەوەی لێ ئەكرا سیخوڕ بێت.

سەرەتا كابرای ئەشجەعیی دانی بەوەدا نەنا كە سیخوڕ بێت ، بەڵام سەرەنجام دانی پیانا كە بۆ جوولەكە سیخوڕیی ئەكات .

سەرەتا كە عەبباد لێی پرسیی : تۆ كێیت ؟ وتی : چەند وشترێكم گوم بوون و بە دوایاندا ئەگەڕێم .

عەبباد پرسیی : ئەی دەربارەی خەیبەر زانیارییت لایە ؟

وتی : تازە لەوێوە گەڕاومەتەوە ، دەربارەی چیی هەواڵی لێم ئەپرسیی ؟

وتی : دەربارەی جوولەکە

وتی : بەڵێ ، کینانەی کوڕی ئەبولحوقەیق [92] و هەوذەی کوڕی قەیس [93] چوون بۆ ناو هۆزەکانی غەطەفانی هاوپەیمانیان تا بێن بۆ کۆمەکییان و ، بەری ساڵێکی دارخورماکانی خەیبەریان بدەنێ . ئەوانیش بە چەك و تفاقەوە هاتوونەتە کۆمەکییان و سەرکردەشیان حوذەیفەی کوڕی بەدرە و ، چوونەتە ناو قەڵاکانیانەوە . خەیبەر خۆیشی دە هەزار جەنگاوەری تێدایە و ، خاوەنی قەڵای وەهان کە چار ناکرێن و ، چەك و خۆراکی زۆریان لایە ، کە ئەگەر بۆ چەند ساڵێکیش ئابلۆقە بدرێن بەشیان ئەکات و ، هەر لە ناو قەڵاکاندا ئاوی هەمیشە و بەردەوامیان لایە و ، نابینم کەس چاریان بکات ..

بەم هەڵنانەی جوولەکەی خەیبەر ، بۆ عەبباد روون بوویەوە کە ئەم ئەعرابییە سیخوڕی یەهوود و ، کرێگرتەی ئەوان بێت ، بۆیە وای بە چاك زانیی کە بە قامچیی دایبگرێتەوە و ، پێی بلێ : تۆ سیخوڕی جوولەکەیت . پاشان هەڕەشەی لێ کرد : راستم پێ بلێ ، ئەگینا لە ملت ئەدەم .

ئەشجەعیی وتی : ئایا ئەمانم ئەدەیتێ ئەگەر راستیی بلێم ؟

عەبباد وتی : بەڵێ . ئەعرابییەکە وتی : کە ئەوەتان بە جوولەکەکانی یەثریب کرد ، جوولەکەی خەیبەر ترس و لەرز چۆتە دڵیانەوە . جوولەکەی یەثریبیش ئامۆزایەکی منیان لە مەدینە چاو پێ کەوتووە ، کە هاتووە و کەل و پەلی بۆ فرۆشتن هێناوە ، ناردوویانە بۆ لای کینانەی کوڕی ئەبولحوقەیق و هەواڵیان داوەتێ کە ئێوە کەمن و ، ئەسپ و چەکیشتان کەمە و ، پێشیان وتووە کە بە چاکیی لێیان بدەن ، تا وازتان لێ بهێنن ، چونکە ئەو تووشی کەسانێك نەبووە کە جەنگ بە چاکیی بزانن! قوڕەیش و عەرەبیش بەو هاتنەی بۆ سەرتان دڵ خۆش بوون ، چونکە ئەزانن ئێوە کەرەسەتان هەیە و ، ژمارە و چەکتان زۆرە و ، قەڵای چاکتان هەیە . قوڕەیش و هی تری غەیری قوڕەیش کە دڵیان لای موحەممەدە چاوەڕوانیی ئەکەن .. قوڕەیش وتوویە :

---

[92] کینانە : یەکێ لە پادشایانی خەیبەر بووە و ، یەکێ بوو لەو جوولەکانەی کە سوپای ئەحزابیان هەڵ نا تا بێنە سەر مەدینە .

[93] هەوذە : پیاوێکی عەرەب بووە و بۆتە جوولەکە ، ئەویش یەکێ بوو لەوانەی کە قوڕەیش و غەطەفانیان هەڵ نا تا بە سوپای ئەحزابەوە بێنە سەر مەدینە.

خەیبەر سەرئەکەوێ و ، ئەوانی تریش وتوویانە : موحەممەد سەرئەکەوێ ، خۆ ئەگەر موحەممەد سەر بکەوێ ئەوە سەرشۆڕیی زەمانەیە.

ئەعرابی‌یەکە بە عەببادی وت : منیش هەموو ئەوەم ئەبیست . ئیتر کینانەی کوڕی ئەبولحوقەیق پێمی وت : بڕۆرە بەردەم موسڵمانەکان ، ئەوان ئەوەیان بە لاوە ناخۆش نیە . جا تەخمینیان بکە بۆمان و ، وەك پرسیارکەر تا ئەتوانیی لێیان نزیك بەرەوە ، پاشان زۆریی ژمارەمان و کەرەسەمان بخەرە بەرچاویان ، چونکە ئەوان واز لە پرسیار لێ کردنت ناهێنن .. بە پەلە بگەڕێرەوە و هەواڵیان بۆمان بهێنە .

دوای ئەم لێ پرسینەوە ، عەبباد سیخوڕەکەی بردە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و هەواڵی دایە کە دانی بە کارەکەی‌دا ناوە . عومەر فەرمووی : لێم گەڕێ با لە گەردنی بدەم .

عەبباد وتی : نەخێر ، ئەمانم داوە .

پێغەمبەری خوا ﷺ بە عەببادی فەرموو : (( أمسكه معك يا عباد )) . فەرمووی: لای خۆت ڕاگیری بکە . عەببادیش بەستیەوە . کە پێغەمبەری خوا ﷺ خەیبەری فەتح کرد ، فەرمانی دا کابرای سیخوڕیان هێنا و ، داوای لێ کرد موسڵمان ببێ ، ئەویش موسڵمان بوو ..[٩٤]

**شەشەم : پیلانێکی نێوان خەیبەر و غەطەفان**

کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە سوپاکەیەوە بەرەو خەیبەر کەوتە ڕێ ، ئەوەی لە یاد نەچوو بوو کە بەم سوپا کەمەیەوە بەرەو ڕووی دوژمنێکی دەوڵەمەندی پڕ چەك و تفاق و ژمارە زۆر ئەبێتەوە ، ئەمە یەك . دووهەم : ئەوەشی لە یاد نەچوو بوو کە سوپاکەی بەسەر خاکی چەندین هۆزی نەفامی دوژمن‌دا تێ ئەپەڕێت و، لەوانەیە دوای لێ بگرن و لە دواوە دەستی لێ بوەشێنن .

هەرچۆن بێ ئەوە لە یادی هیچ فەرماندەیەك ناچێت ، چ جای لە یادی پێغەمبەری ئیسلام بچێت .

ئەوەبوو جوولەکەی خەیبەر و هۆزەکانی غەطەفان نەخشەیەکیان کێشا بۆ ئەوەی کۆمەکیی خەیبەر بکەن ، کە لەم خاڵانە پێك هاتبوو :

---

[٩٤] غزوة خيبر لباشميل : ١٠٩ ـ ١١٦ .

١ ـ غەطەفان چەند کەتیبەیەك لە جەنگاوەرانی بنێرێت بۆ ناو قەڵاکانی خەیبەر . ئەوەبوو ئەم خاڵەیان ئەنجام دا و کەتیبەکانیان بە فەرماندایەتیی حوذەیفەی کوڕی بەدر ناردن .

٢ ـ چوار هەزار جەنگاوەری غەطەفان خۆیان ئامادە بکەن ، تا چوار دەوری سوپای ئیسلام بگرن ، کاتێ کە ئابلۆوقەی قەڵاکانی خەیبەر ئەدات و ، لە کاتی گونجاودا لێی بدەن .

٣ ـ سەرۆکانی خەیبەر بەڵێنیان دا نیوەی بەروبوومی خەیبەر ، بەرامبەر بەم یارمەتی‌یە سەربازی‌یە بدەن بە غەطەفان .

وەك لە پێشەوە باس کرا خاڵی یەکەم زوو جێ بەجێ کرا . بەڵام خاڵی دووهەم دوای ئەوەی سوپای ئیسلام گەیشتە خەیبەر ، بت پەرستەکان کەوتنە ئەنجامدانی ، بۆ ئەوەی بەرودوا لە سوپای ئیسلام بگرن و ماوەی دەربازبوونی نەبێ .

ئەمە کارێکی یەکجار سەخت بوو بۆ موسڵمانەکان . خۆیان هەزار و چوارصەد جەنگاوەر بوون ، بەڵام خەیبەر و کەتیبەکانی غەطەفان یانزە هەزار و چوار هەزاری غەطەفانیش لە دواوە ئەمە پانزە هەزار جەنگاوەر بەوپەڕی چەك و تفاق و خواردەمەنی‌یەوە .

کە غەطەفان هەواڵیان زانیی سوپای ئیسلام بەرەو خەیبەر کەوتۆتە رێ ، سوپا چوار هەزاری‌یەکەیان کەوتە رێ تا لە دواوە لە سوپای ئیسلام بدەن . ئەوەبوو شەو و رۆژێکیش رێیان بڕیی .

کە پێغەمبەری خوا ﷺ ، وەك فەرماندەیەکی شارەزا و ، لەلایەن خواوە پشت گیریی‌کراو ، وای بە چاك زانیی وەك بە پەیمانی حودەیبیە دەست و پەلی قوڕەیشی بەستەوە ، وەهاش لەگەڵ غەطەفان‌دا رێك بکەوێ تا دەست و پەلی ئەوانیش ببەستێ ، بۆ ئەوەی دوژمنی سێهەم کەوڵ بکات کە جوولەکەی خەیبەر بوون . بۆ ئەمە پەیوەندیی بە فەرماندەکانی غەطەفانەوە کرد و ، ئامۆژگاریی کردن کە بۆ ئەوان وەها چاکە بێ‌لایەن بن ، چونکە خوا بەڵێنی فەتحی خەیبەری پێ داوە و ، بەڵێنی خواش راستە و دێتە دیی . هەروەها بەڵێنی پێ دان ئەگەر غەطەفان بێ‌لایەن بن ، کە خەیبەر فەتح کرا نیوەی بەروبوومی ئەدات بەوان .

بەڵام ئەو موشریکە نەفامانە ، کە چاویان بەو سوپا بچکۆلەی ئیسلام ئەکەوت وا لە ناوچە و پایتەختی خۆیشی دوورکەوتۆتەوە و ، وەك دوورگەیەکی بچکۆلە وەهایە

لە ناوەڕاستی پانزە هەزار جەنگاوەردا ، لە خۆیان بایی بوون و ، وایان دانا ئەم جارە سوپای ئیسلام بە سەلامەتیی ناگەڕێتەوە . بۆیە پێشنیارەکەی ئازیزیان دایە دواوە و، بێلایەنی‌یان نەویست و ، هەواڵیان دا بە موسڵمانەکان کە بەرگریی لە جوولەکە هاوپەیمانەکانیان ئەکەن و ، لەگەڵیانا بەشداریی جەنگ ئەکەن .

ئیمام واقیدیی وەهای گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك هەواڵی زانیی کە غەطەفان پشت‌گیریی لە خەیبەر ئەکەن ، سەرداری خەزرەج ، سەعدی کوڕی عوبادەی نارد بۆ لای فەرماندەی غەطەفان ، عویەینەی کوڕی حیصن ، کە لەو کاتەدا لە قەلاّکەی مەرحەبدا بوو .

کە عویەینە زانیی سەعد بۆ لای ئەو هاتووە ، ویستی بیباتە ژوورەوە ناو قەلاّکە و لەوێ قسەی لەگەڵدا بکات ، کەچیی مەرحەب نەیهێشت لە ترسی ئەوەی کە سەعد چاوی بە ناتەواویی قەلاّکانیان نەکەوێ ، بە عویەینەی وت با لە دەرەوە بیبینێ .

سەعد بە عویەینەی ڕاگەیاند کە پێغەمبەری خوا ﷺ جوابی بۆ ناردووە کە خوا بەڵێنی پێ داوە بە فەتحی خەیبەر ، جا وا چاکە ئەوان بگەڕێنەوە و ، واز لە جوولەکە بهێنن . خۆ ئەگەر سەرکەوتین ئەوا بەرهەمی ساڵێکی خورمای خەیبەر بۆ ئەوان .

عویەینە دەری بڕیی کە هەرگیز بۆ هیچ شتێك پشتی هاوپەیمانەکانیان بەر نادەن و، چاکیش ئەزانن کە موسڵمانەکان توانای جەنگی خەیبەریان نیە ، چونکە قەلاّکانیان سەختن و ، پیاویان زۆرن و ، چەك و تفاقیان بێشومارە . ئەگەر موسڵمانەکان ئەمێننەوە تیا ئەچن و ، گەر جەنگیش ئەکەن ئەوان پیاو و چەکیان زۆرە و ، ئەمانەش وەك قوڕەیش نین . ئەمانە لە جەنگدا فیلّ ئەکەن و خاوە خاو ئەکەن هەتا بێزار بن و بەجێیان بهێڵن .

عویەینە پێی خۆش بوو سەعد ئەم باسە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بگێڕێتەوە .

سەعد بەر لەوەی بگەڕێتەوە دای بە گوێی عویەینەدا کە وا ئێمە پێشنیارمان کرد و تۆ وەرت نەگرت ، بەڵام ڕۆژێك دێت تۆ داوای ئەم پێشنیارە ئەکەیت و ، ئێمەش جگە لە شمشێر هیچت نادەینێ . باشترین بەڵگەش هەر سێ تیرە جوولەکەکەی یەثریبە چۆن تیاچوون !

دوای ئەوە سەعد گەڕایەوە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و هەواڵەکەی دایە . پاشان سەعد وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەو بەڵێنەی کە خوا پێی داوی بۆت

جیٚبەجیٚ ئەكات و دینەكەت سەر ئەخات ، جا تۆش دەنكە خورمایەك مەدە بەو ئەعرابیی‌یە ( واتە عویەینە ) . ئەی پیٚغەمبەری خوا ! ئەگەر لیٚدانی شمشیٚر بچەژیٚ پشتیان بەر ئەدا و را ئەكاتەوە بۆ ولاٚتی خۆی ، وەك رۆژی خەندەق پشتی بەر دان .

كە ئەو پیٚشنیارەی بۆ غەطەفان كەلٚكی نەبوو ، پیٚغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا سوپای ئیسلام هیٚرش بكاتە سەر ئەو قەلاٚیەی كە هیٚزی غەطەفان و جوولەكەی پیٚكەوە تیٚدایە ، كە بریتی‌یە لە قەلاٚی ( ناعم ) ، قەلاٚكەی مەرحەبی جوولەكە ، كە یەكەم قەلاٚبوو موسلٚمانەكان فەتحی بكەن .

ئەوەبوو غەطەفان فەرمانیان بۆ كەتیبەكان دەركرد تا لە شویٚنی خۆیاندا بمیٚننەوە بۆ كۆمەكیی جوولەكە و ، چوار هەزار جەنگاوەرەكەیش كەوتنە ریٚ تا لە سەعاتی صفردا لە دواوە هەلٚمەت بەرنە سەر موسلٚمانەكان .

كە غەطەفان و ئەسەد لە پشتیوانیی خەیبەر وازیان نەهیٚنا ، موسلٚمانەكان كەوتنە هەلٚویٚستیٚكی یەكجار ناتەواوەوە ، بەلاٚم وەنەبیٚ شیٚرەكانی ئیسلام ورەیان بەردابیٚ و ، دەستیان سارد بووبیٚنەوە . بیٚباك لەسەر هیٚرشی خۆیان بەردەوام بوون و ، لایان یەقین بوو كە فەتحی خەیبەر ئەكەن ، ئیتر باكیان لەو هەمووە دوژمنە نەبوو ، مادام خوای بەدەسەلاٚت بەلیٚنی دابوو .. ئەوان پشتیان بە زۆریی سوپا نەئەبەست ، بەلٚكو بە تەمای كۆمەكیی خوا بوون ، بۆیە هەر یەكەیان خاوەنی ورەیەكی یەكجار بەرز بوو و، سەنگی بالٚە میٚشوولەیەكی بۆ هیچ هیٚزیٚكی زەویی دا نەئەنا .

كورتەكەی : بە هەموو حیسابیٚك هیٚزی خەیبەر هیٚزیٚكی چار نەكراوە و ، موسلٚمانەكان هیچ كات جەنگی وەها سەختیان پیٚ نابریٚتەوە و ، تەنها مەگەر بەلیٚنەكەی خوا فریایان بكەویٚ ، ئەگینا بە هیچ حیسابیٚك ئەوان چاری ئەو هەمووە هیٚزەی خەیبەر و هاوپەیمانەكانیان ناكەن .

بەر لەوەی جەنگ بەرپا ببیٚ ، لە ئاسۆوە هەندیٚ مژدەی سەركەوتن بۆ موسلٚمانەكان دەرئەكەوتن و ، سەربازە خواناسەكانی ئیسلام بە روونی بەلیٚنی خوایان بۆ دەرئەكەوت . بەمە دەروونیان بەهیٚزتر ئەبوو و ، لەسەر كاری پیرۆزیان زیاتر سوور ئەبوون . بۆیە لایان یەقین بوو كە هەر چەندە سوپای دوژمن زۆر بیٚ ، ئەوا خوای گەورە بەهیٚز و توانای خۆی تەفروتوونایان ئەكات .

پیٚغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەیەكی دا فەرموویە : (( نُصِرتُ بالرعب )) . فەرموویە : خوای گەورە بە سام و هەیبەت سەری خستووم .

ئەم بەڵێنەی ئازیز ﷺ لێرەش‌دا هاتە دیی .. خوای گەورە بە دەستی قودرەتی خۆی ترسی خستە دڵی دوژمنانەوە ، بە تایبەت عەرەبە بتپەرستەکان ، بە رادەیەك کە مەیدانی جەنگ بەجێ بهێڵن .

ئەو چوار هەزار سەربازەی غەطەفان کە کەوتنە شوێن موسڵمانەکان ، بە نیازی ئەوەی کە لە دواوە لە موسڵمانەکان بدەن ، دوای ئەوەی کە قۆناغێك رێیان بڕیی ، لە دوایانەوە گوێیان لە دەنگێك بوو کە هاواری لێیان ئەکرد و ، ئاگاداری ئەکردنەوە کە چەند کەتیبەیەکی موسڵمانان هێرشیان کردۆتە سەر ماوا و مەنزڵیان و ، هاکا دەستیان بەسەر ماڵ و سامانیان‌دا گرت و ژن و منداڵیشیان بە دیل گرتن .

لە هەندێ ریوایەت‌دا ئەڵێ : دەنگەکە سێ جار ئەبیستن ، بێ‌ئەوەی بزانن کە ئەم دەنگە لە ئاسمانەوە دێت ، یان لە زەوی‌یەوە . ناچار غەطەفان بە پەلە بە دوای خۆیان دا گەڕانەوە و ، وازیان لە پشتیوانیی جولەکە و ، بەگژاچوونی موسڵمانان هێنا .

کە کینانەی کوڕی ئەبولحوقەیقی پادشای خەیبەر ئەمەی بیست زۆری پێ ناخۆش بوو و ، هاتە سەر ئەو رایە کە تازە تیا ئەچن و ، قسەکەی سەللامی کوڕی ئەبولحوقەیقی برایشی ، کە پێش خۆی پادشای خەیبەر بوو و ، پێنج موسڵمانە فیداکارەکە پێش غەزای خەیبەر کوشتیان ، هاتەوە یادی کە با پشت بەو ئەعرابە تێنەگەیشتوانە نەبەستن .

کە غەطەفانی‌یەکان بە هەڵە و داوان گەیشتنە ( حەیفاء ) ، ئەو شوێنەی کە ئەترسان هێرش کرابێتە سەر کەس و کاریان ، ئەبینن کەس وکاریان وەك خۆیان وان لەوێ . پرسی‌یان : ئایا شتێکی خراپ هاتۆتە بەردەمتان ؟ وتیان : نە بەخوا . ئێمە وامان زانیی ئێوە غەنیمەتتان دەست کەوتووە ، کەچیی هیچتان دیار نیە !!

عویەینەی کوڕی حیصن بە هاوەڵانی خۆی وت : بەخوا ئەمە فڕوفێڵی موحەممەد و هاوەڵانیەتی . بەخوا ئێمەی خەڵەتاندووە !

حاریثی کوڕی عەوفی موڕڕیی ، کە لە پێشەوە باسی هات و حەزی نەئەکرد عویەینە یارمەتیی خەیبەر بدات و ، یەکێ لە چوار فەرماندەکەی سوپای غەطەفان بوو لە جەنگی ئەحزاب‌دا ، بە عویەینەی وت : بە چیی ئێمەیان خەڵەتاندووە ؟

عویەینە وتی : ئێمە لە قەڵای ( نطاة ) دا بووین ، دوای تێپەڕبوونی بەشی یەکەمی شەو ، گوێمان لە دەنگێك بوو کە هاواری ئەکرد و نەمانئەزانیی لە

ئاسمانەوەیە ، یان لە زەوییەوە : کەس وکارتان ، کەس وکارتان لە حەیفاء ، سێ جار هاواری کرد . نە خاك و نە سامانتتان نەمان .
حاریث سوێندی بۆ عویەینە خوارد کە ئەو دەنگەی ئەو بیستوویەتی لە ئاسمانەوە بووە و ، هەر کەسیش دژایەتیی موحەممەد بکات ، ئەوا بەسەریا زاڵ ئەبێ ، هەتا ئەگەر چیاکانیش دژایەتیی بکەن هەرچیی بوێ پێیان ئەکات .
عویەینە چەند ڕۆژێك لەلای کەس وکارەکەی مایەوە ، پاشان داوای لە هاوەڵانی کرد کە بچنەوە بۆ کۆمەکیی جوولەکە . حاریثی‌کوڕی عەوف هاتەوە بۆ لای و وتی : عویەینە ! بە گوێم بکە و ، لە ماڵی خۆت دابنیشە و ، واز لە کۆمەکیی جوولەکە بهێنە . هەر چەند من وای ئەبینم تا تۆ ئەگەڕێیتەوە بۆ خەیبەر ، موحەممەد فەتحی کردووە و ، لێیشت بێ‌خەم نیم .
عویەینە بە گوێی نەکرد و، وتی : بۆ هیچ شتێك واز لە هاوپەیمانەکانم ناهێنم .
عویەینە لە هەر کەسێکی غەطەفان کە هات بە دەمیەوە سوپایەکی پێك هێنا و گەڕایەوە بەرەو خەیبەر بۆ کۆمەکیی جوولەکە ، کەچیی ئەو نەگەیشتە خەیبەر ئەبینێ وا سوپای ئیسلام پاکتاوی خەیبەری کردووە ..[95]

**حەوتەم : سوپای ئیسلام لە خەیبەردا**

سوپای ئیسلام لەسەر ڕەوتی خۆی بەردەوام بوو بەرەو خەیبەر ، لە ڕێدا پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لە یەکێ لە هاوەڵانی کرد ، کە عامیری کوڕی ئەکوەع بوو تا بە ئاوازەی خۆش دەنگ بەرز بکاتەوە ، چونکە ئەوە ئەبێتە هۆی چالاك بوونی وشترەکان . ئەویش گوێڕایەڵیی فەرمانی کرد و بەم شیعرانە دەستی پێ کرد :

والله لولا الله ما اهتدينا ولا تصدّقنا ولا صلّينا
فأنزلن سكينةً علينا وثبت الأقدام إن لاقينا

بەم ئاواز و گۆرانییە پێغەمبەری خوا ﷺ دڵ خۆش بوو ، بۆیە بە عامیری فەرموو: (( يرحمك الله )) . بە هەر کەسیش بیفەرمووایە خوا ڕەحمت لەگەڵدا بکات شەهید ئەبوو .. بۆیە عومەری کوڕی خەططاب فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ! واجب بوو ( واتە شەهیدییەکە ) ناکرێ دڵی ئێمەشی پێ خۆش بکەیت ؟

---

[95] غزوة خيبر لباشميل : ١١٧ ـ ١٣٠ .

هەر وایش بوو .. لە جەنگی خەیبەردا شەهیدیی پێشکەش بە عامیری کوڕی ئەکوەع کرا . ئەوەبوو لەگەڵ جوولەکەیەك کە ناوی مەرحەب بوو کەوتنە شمشێربازیی و ، لە کاتی شەڕە شمشێردا ویستی شمشێرێك لە قاچی جوولەکەکە بدات ، جا لەبەر ئەوەی کە کورتە باڵا بوو شمشێرەکە گەڕایەوە و دای لە ئەژنۆی و بەو زامە کۆچی دوایی کرد . هەندێ ئەیانوت : عامیری کوڕی ئەکوەع کردەوەکانی بەتاڵ بوونەتەوە ، بە هۆی ئەوەوە کە خۆی کوشتبێتەوە . سەلەمەی کوڕی ئەکوەعی برای یان برازای بۆ ئەم قسەیە زۆر خەمبار بوو . کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوەیە بینیی، دەستی گرت و فەرمووی : (( ما لك ؟ )) . فەرمووی : چیتە ؟ وتی : دایك و باوکم بە قوربانت بن ، وای دەر ئەبڕن کە کردەوەکانی عامیر بەتاڵ بوونەتەوە . فەرمووی: (( کذب من قال ، إن لـه أجرين ( هەردوو پەنجەی جووت کردن ) : إنه لجاهِدٌ مُجاهِدٌ ، قلّ عربي مشى بها مثله )) . فەرمووی : هەرکەس وای وتووە راستی نەکردووە . ئەو دوو پاداشتی هەن ، هەردوو پەنجەشی جووت کردن ، ئەو جاهیدیشە و موجاهیدیش ، کەم عەرەب وەك ئەو ئەوەی دەست کەوتووە .

لە رێگادا سەربازانی ئیسلام کەوتنە ذیکر و یادی خوا ، بەڵام بە دەنگی بەرز ، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا کە ذیکری خوا بەبێ دەنگ بکەن .

کاتێك گەیشتنە سەر بەرزایییەك کە ئەیڕوانیی بەسەر خەیبەردا ، فەرمانی دا سوپا بووەستێ ، پاشان دەستی بە خوێندنی ئەم دۆعایە کرد :

(( أللّهمَّ ربَّ السَّمواتِ ومَا أظلَلنَ ، وربَّ الأرضِينَ ومَا أقلَلنَ ، وربَّ الشَّياطِينِ ومَا أضلَلنَ ، وربَّ الرياحِ ومَا أذرَينَ ، نسألُكَ خَيرَ هذهِ القريةِ وخيرَ أهلِها ، ونَعوذُ بكَ مِنْ شرِّها وَشرِّ ما فِيها )) .

داوای لە خوای گەورە کرد کە لە خێر و بەرەکەتی خەیبەر و دانیشتوانی بەشیان بدات و ، لە شەڕ و خراپەشیان بە دووریان بگرێت . پاشان بە هاوەڵانی فەرموو : (( أقدموا باسم الله )) . فەرمووی : بە ناوی خواوە بەرەو پێشەوە برۆن ..

خوای گەورە چاوی جوولەکەی خەیبەری لە ئاستی سوپای ئیسلامدا کوێر کردن و ، بە خۆیان نەزانیی هەتا ئەوەبوو لە بەرەبەیاندا سوپای ئیسلام هێرشی کردە سەر قەڵاکانیان ، هەر چەندە جوولەکە و مونافیقانی مەدینە هەواڵیان بۆ خەیبەر ناردبوو کەوا سوپای ئیسلام بەرەو خەیبەر دێت .

کە موسڵمانەکان گەیشتنە خەیبەر شەو بوو ، ئیتر موسڵمانەکان شەو لە نزیک خەیبەر مانەوە ، تا بەرەبەیان ئەوسا هەڵمەتیان دایە سەر خەیبەر .

شایانی باسە کە جوولەکەی خەیبەر لەو کاتەوە کە هەواڵی سوپای ئیسلامیان بیستبوو وا بەرەو خەیبەر دێت ، هەموو شەوێك پێش فەجر لە خەو هەڵ ئەستان و چەکیان ئەپۆشیی ، نەوەکو سوپای ئیسلام بەسەریاندا بدات و ، هەموو رۆژێکیش جەنگاوەر ، جوولەکەکانیان سەرژمێریی ئەکردن ، تا ورەیان بەرز بێت و خۆیان ئامادەی هێرشی موسڵمانەکان بکەن .. کەچیی بە فەرمانی خوا ئەو بەرەبەیانەی کە سوپای ئیسلام گەیشتبووە سەریان خەو بەری نەدان .. هەڵ نەستان و چەکیشیان نەپۆشیی ، بەڵکو خەوتن و نەجوولانەوە و ، کەڵەشێرێکیان نەیخوێند هەتا خۆر سەری دەر هێنا .. کە رۆژیان لێ بوویەوە دڵیان ئەلەرزیی . ئیتر بە خۆیان نەزانیی هەتا سوپای ئیسلام گەیشتە بەردەم قەڵاکانیان .

بەبێ ئاگا ئەو بەیانیە دەرگای قەڵاکانیان کردەوە و ، بە پاچ و خاکەنازەوە بەرەو کێڵگەکانیان کەوتنە رێ . کە چاویان بە موسڵمانەکان کەوت بە ترس و لەرزەوە هاواریان کرد : سوێند بە پێنج شەممە ئەوە موحەممەدە ! بە پەلە خۆیان کردەوە بەناو قەڵاکانیاندا .. کە پێغەمبەریش ﷺ چاوی پێ کەوتن مژدەی فەتحی خەیبەری دا بە هاوەڵان کە فەرمووی : (( ألله أکبر ، خربت خیبر ، إنا إذا نزلنا بساحة قوم فساء صباح المنذرین )) .

پێغەمبەری خوا ﷺ سەرنجی دا پاڵەوانەکانی ئیسلام حەزیان لە کوشتاری کافرانە، لێرەدا ئامۆژگاریی کردن کە ئیسلام بۆ جەنگ نەهاتووە ، بەڵام دوژمنەکانی شەڕ بە موسڵمانان ئەفرۆشن ، بۆیە وا چاکە ئاواتی جەنگ و هەرا نەخوازن ، بەڵکو داوای سەلامەتیی لە خوا بکەن ، چونکە نازانن بە چیی تاقیی ئەکرێنەوە . ئەوەبوو پێیانی فەرموو : (( لا تمنوا لقاء العدو ، واسألوا الله العافیة ، فإنکم لا تدرون ما تبتلون به، فإذا لقیتموه ، فقولوا : أَللّهُمَّ أنتَ رَبُّنَا وربُّهُم ، وَنَواصِینا وَنواصیهِم بِیَدِكَ ، وَإِنَّما تَقتُلُهُم أنتَ )) . فەرمووی : ئەگەر تووشی دوژمن هاتن ئەوا ئەم ویردە بخوێنن کە تیایا بڕیار ئەدەن خوای گەورە پەروەردگاری ئێوەش و ئەوانیشە و ، کاروباری هەردوولاش بە دەستی ئەوە و ، کوشتنی کافرانیش بە دەستی خوایە .[٩٦]

[٩٦] غزوة خیبر لباشمیل : ١٣٢ ـ ١٣٥ .

**هەشتەم : سەرەتای دەست پێکردنی جەنگ**

ئەو رۆژە خەیبەر ئەکرا بە دوو بەشەوە ، کە هەر بەشەیان بریتیی بوو لە چەند قەڵایەکی سەختی جەنگ . لە هەموویان گرنگتر هەشت قەڵا بوون کە پێنجیان ئەکەوتنە بەشی یەکەمی خەیبەر کە سەختترین و دژوارترین جەنگیان تێدا بەرپا بوو.

ئەو پێنج قەڵایانەش ئەمانە بوون :

١ ـ قەڵای ( ناعم ) کە یەکەم قەڵا بوو موسڵمانەکان هێرشیان کردە سەری و ، لەبەردەمیدا پاڵەوانی ناوداری جوولەکە ، مەرحەب و براکانی لە ئەنجامی بەرگریی لە قەڵاکە کوژران .

٢ ـ قەڵای ( صعب بن معاذ ) گەورەترین قەڵایەك بوو کە موسڵمانان فەتحیان کرد و خۆراك و تفاقی جەنگی زۆری تێدا بوو .

٣ ـ قەڵای زوبەیر . ئەم سیانە لە ناوچەی ( نطاة ) دا بوون .

٤ ـ قەڵای ئوبەی .

٥ ـ قەڵای نزار . ئەم دوانەش لە ناوچەی ( الشق ) دا بوون . ئەم پێنج قەڵایە هێڵی بەرگریی یەکەمی هەموو خەیبەر بوون و، قورسترین جەنگیان تیا بەرپا بوو.

بەڵام بەشی دووهەمی خەیبەر سێ قەڵای گرنگی تێدا بوون :

١ ـ قەڵای قەمووص کە تایبەت بوو بە نەوەی ئەبولحوقەیقەوە .

٢ ـ قەڵای وەطیح .

٣ ـ قەڵای سەلالیم .

ئەم سێ قەڵایە بە ئاسانیی خۆیان بە دەستەوە دا .

سەرەتا پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لە جوولەکە کرد کە بێنە سەر دینی ئیسلام و ببنە بەشێکی خێزانی ئیسلام و ، وەك موسڵمانان هەموو مافێکیان هەبێت .

بوخاریی ئەوەی گێڕاوەتەوە کە عەلیی کوڕی ئەبوطالیب یەکەم فەرماندەیەك بوو کە ئەم پێشنیارە بخاتە بەردەم جوولەکە ، ئەمەش بە فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ .

یەکەم جار کە موسڵمانەکان گەیشتن پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کردە عەلیی و ئاڵاکەی دایە دەستی و ، عەلیی فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ! بچم بە گژیانا هەتا وەك خۆمانیان لێ بێت ؟ فەرمووی : (( أنفذ على رِسلك حتى تنزل بساحتهم ثم ادعهم إلى الإسلام وأخبرهم بما يجب عليهم من حق الله فيه ، فوالله لئن يهدي الله بك

رجلاً واحداً خير من أن يكون لك حمر النعم )) . ( صحيح البخاري ) . فەرمووی : لەسەرخۆ برۆ هەتا ئەگەیتە بەردەمیان ، پاشان بانگیان بۆ سەر ئیسلام بکە و : هەواڵیان بدەرێ کە چ مافێکی خوایان بەسەرەوە ئەبێت . دە بەخوا ئەگەر خوا بە هۆی تۆوە هیدایەتی تاقە پیاوێك بدات لەوە چاکترە رانە وشتری رەسەنت هەبن .

ئەوەبوو جوولەکە ملیان بە موسڵمانبوون نەدا و ، دواتر جەنگ هەڵ گیرسا . جوولەکەی خەیبەر بە سەختیی قەڵا و : زۆری جەنگاوەر و ، دەوڵەمەندیی خۆیاندا ئەیاننازیی : بۆیە هەر لە یەکەم رۆژدا ئەوان هێرشیان کردە سەر موسڵمانەکان : کە ئەوەبوو چەند کەسێکیان لە موسڵمانان شەهید کردن و پەنجاشیان زامدار کردن و ، موسڵمانەکان بە پەلە زامدارەکانیان گەیاندە دواوە بۆ چارەسەریی .

ئاڵای فەرماندەی گشتیی موسڵمانان لە رۆژی خەیبەردا بریتیی بوو لە ئاڵایەکی سپیی کە پێی ئەوترا ( عقاب ) و بە رەشیش لەسەری نووسرا بوو : ( لا إله إلا الله محمد رسول الله ) . هەر ئەم ئاڵایە بوو کە لە رۆژی یەکەمدا درایە دەست عەلیی کوڕی ئەبوطالیب .

پێش ئەوەی موسڵمانەکان هەڵمەت بەرن ، پێغەمبەری خوا ﷺ چوار ئاڵای بەسەر چوار فەرماندەدا دابەش کردن . دوو ئاڵایان بۆ موهاجیرەکان و درانە دەست ئەبوبەکر و عومەر و ، دوانیش بۆ ئەنصار و درانە دەست سەعدی کوڕی عوبادە و حوبابی کوڕی مونذیر .

هەروەها فەرمانی دا کە هێزێك بۆ پاسەوانیی ئۆردووگا تەرخان بکرێت ، تا بە شەودا چاودێریی جم و جووڵی دوژمن بکەن : کە یەکێ لە سەربازانی ئەو هێزە عومەری کوڕی خەططاب بوو .

دوای ئەوەی کە جوولەکە موسڵمانبوونیان قبووڵ نەکرد : یەکەم کارێك کە موسڵمانەکان لە دژیان ئەنجامیان دا : بریتیی بوو لە دەستگرتن بەسەر کێڵگە و باخە خورماکانیاندا : هەتا دەستیان دایە بڕینی هەندێ دارخورما بۆ ترساندنیان . ئەوەبوو نزیکەی چوارصەد دارخورمایان بڕیی ، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ لەوە قەدەغەی کردن .

سەرەڕای ئەوەی کە قەڵاکان سەخت بوون و ، چەکدارێکی زۆریشیان تێدا بوون ، ئاو و هەوای ناوچەکەش ئەوەندە خراپ بوو کە زۆرێك لە موسڵمانەکان تووشی ( تا )

بوون و هێشتا دەستیان بە هێرش نەکردبوو ، ئەمەش بە بۆنەی ناسازیی ئاو و هەوای خەیبەر کە زۆرێك گۆماوی تێدا بوو .

یەکەم جار موسڵمانەکان هێرشیان کردە سەر قەڵای ( ناعم ) . جا لەبەر ئەوەی کە قەڵاکان سەخت بوون و ، موسڵمانەکانیش هەندێ جۆری چەکیان پێ نەبوو ، وەك مەنجەنیق و هاوێژەری نەوتی گڕگرتوو ، بۆ وێرانکردنی قەڵاکان ، تووشی نارەحەتیی زۆر هاتن .

لە پێشەوە باسی ئەوەمان کرد کە سوپای ئیسلام لەلای باکوورەوە هێرشی هێنایە سەر خەیبەر ، یەکەم بۆ ئەوەی جوولەکە نەتوانن بەرەو شام هەڵ بێن و ، دووهەمیش تا غەطەفان نەتوانن کۆمەکییان بۆ بنێرن . لە رۆژی یەکەمی جەنگدا هێرش کرایە سەر ( ناعم ) و ، پێغەمبەری خوا ﷺ خۆیشی لەو هێرشەدا بەشدار بوو .

ئەو رۆژە پێغەمبەری خوا ﷺ سواری ئەسپێك بوو بوو بە ناوی ظەریب و ، دوو کراسی لە زریێ چنراو و ، سەرپۆشێکی زریێ و ، کڵاوێکی ئاسنینی لەبەر کردبوون و ، رمێك و سپێرێکیش بە دەستیەوە بوون .

لەبەردەم ئەو قەڵایەدا جەنگێکی ناهەموار لە نێوان موسڵمانەکان و جوولەکەدا رووی دا ، کە ئەوەبوو بە درێژایی ئەو رۆژە موسڵمانەکان خەریکی هەڵمەت بردن بوون.

جوولەکەش ، بە فەرماندایەتیی مەرحەب و هەردوو براکەی یاسیر و حاریث ، ئەوپەڕی دامەزراوییان نواند ، بە رادەیەك توانییان هەموو هەڵمەتەکانی موسڵمانان پەرچ بدەنەوە . بگرە ئەوەندە بە سەروماڵیی بەرگرییان لە قەڵای ( ناعم ) ئەکرد، دەرگای قەڵایان کردەوە و ، ئەوان هێرشێکی توندیان کردە سەر موسڵمانەکان.

ئەوەبوو کەتیبە لە دوای کەتیبە جوولەکە بە سەرکردایەتیی حاریث ( أبو زینب ) هێرشیان ئەکرد ، تا ئەوەبوو کەتیبەکانی ئەنصار بەرەنگاریان بوونەوە و ، دوای جەنگێکی سەخت توانییان هێرشەکەی حاریث پەرچ بدەنەوە و ، راویان بنێن و ، ناچاریان بکەن خۆیان بە قەڵاکەدا بکەنەوە و ، دەرگا لەسەر خۆیان دابخەن ..

جوولەکە جارێکی تر دەرگایان کردەوە و ، بە سەرکردایەتیی ئوسەیری خزمی مەرحەب ، چەند هێرشێکی توندیان کردە سەر موسڵمانەکان .. هەرچەندە موسڵمانەکان لەبەردەمیاندا دامەزرا بوون ، بەڵام بەرە بەرە هێرشی جوولەکە توندتر

بوو ، بە رادەیەك پێیان بە موسڵمانەکان هەڵ کێشا و راویان نان ، هەتا گەیشتنەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەویش زۆری پێ ناخۆش بوو .

وەك لە پێشەوە باس کرا ئەو رۆژە چەند موسڵمانێك شەهید بوون و پەنجای تریش زامدار بوون . چونکە جوولەکە بەسەر قەڵاکەوە تیریان بۆ ئەهاویشتن . ئەوانە رەوانەی شیوی ( رجیع ) کران بۆ دەرمانکردن . شایانی باسە کە یەکەم شەهیدی یەکەم رۆژ مەحموودی کوڕی مەسلەمەی برای موحەممەدی کوڕی مەسلەمە بوو .

مەحموود ئەو رۆژە لە جەنگدا شەهید نەبوو . ئەو رۆژە پاڵەوانانە جەنگی کرد و، رۆژگار زۆر گەرم بوو، بۆیە ویستی بچێتە سێبەری بینایەکەو، نزیك بە قەڵای ( ناعم ) و نەیزانی کە خەڵکیی تێدایە ، کەچیی مەرحەب بەرداشێکی خست بەسەریدا و سەری پێکا و ، بردیان بۆ شوێن دەرمانکردن و لەوێ دوای سێ رۆژ کۆچی دوایی کرد..

لە رۆژی یەکەمدا موسڵمانەکان تووشی زیانێکی زۆر بوون ، ئەوەبوو یەکێ لە گەورە فەرماندانی سوپای ئیسلام ، کە حوبابی کوڕی مونذیر بوو سەرنجی دا کە ئەو شوێنەی پێغەمبەری خوا ﷺ کردوویەتی‌یە مەڵبەندی سەرکردایەتیی ، لەلایەنی سەربازی‌یەوە بە کەڵك نایەت ، بۆیە داوای کرد لەو شوێنە بگوازێتەوە . چونکە قەڵاکانی جوولەکە لە شوێنی بەرزدا دروست کرابوون و ، ئۆردووگای موسڵمانەکانیش لە نزمایی‌دایە و ، تیری جوولەکەیان بە ئاسانیی ئەگاتێ . هەروەها سەرنجی دا ئەو شوێنە شوێنی دەرد و دایە و ئاوی تێ ئەزێ .

وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! لەم شوێنەدا کە دابەزیوی ، ئەگەر فەرمانت بەسەردا دراوە ئەوا هیچ ناڵێین ، بەڵام ئەگەر رادەربڕینە قسە ئەکەین .

فەرمووی : (( بل هو الرأي )) . فەرمووی : رادەربڕینە .

حوباب وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! لە قەڵاکە نزیك کەوتوویتەوە و ، لە نێوان دار خورما و لە ناوچەیەکی ئاو تێزاودا دابەزیوی ، بە مەرجێ دانیشتوانی قەڵاکانی ( نطاة ) من چاکیان ئەناسم : هەتا بفەرمووی تیریان دوور ئەڕوا و هیچ کەسیش ئەوەندەی ئەوان نیشانە باش ناپێکێ و ، ئەوانیش وان لە ژووری ئێمەوە و تیریان ئاسان دێتە خوارەوە و ، لە هێرشی شەویشیان دڵم بێخەم نیە . خۆیان ئەکەن بە ناو دارخورماکان دا .. ئەی پێغەمبەری خوا ! بگوازەرەوە بۆ شوێنێکی وەها کە لە

تەڕیی و دەردودا دوور بێت .. ئەو بەردەلانە ئەخەینە نێوانمانەوە هەتا تیریان نەمان گاتێ ..
پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاکەی حوبابی بە دڵ بوو و ، بەڵێنی دا ئێوارە لەو شوێنە ئەگوازنەوە ، بەڵام جەنگی نەوەستان هەتا ئێوارە و تاریك بكات ، تا بتوانن شوێنەکەیان بگوازنەوە . دوای ئەوەش بانگی کردە فەرماندەی پاسەوانەکانی موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی ئەنصاریی و ، فەرمانی بەسەردا دا تا شوێنێ بۆ سوپای ئیسلام بدۆزێتەوە ، کە یەکەم لە قەڵای دوژمنانەوە دوور بێت و ، دووهەمیش بێ دەردوبەلا بێ . موحەممەدی کوڕی مەسلەمەش دوای گەڕان و وردەکاریی شیوی ( ڕەجیع ) ی نزیك خەیبەری دەست نیشان کرد ، پاشان گەڕایەوە خزمەتی ئازیز ﷺ کە لەبەردەم قەڵاکەدا خەریکی جەنگ بوو . وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! مەنزڵم بۆت دۆزیوەتەوە . ئیتر باسی شیوی ( ڕەجیع ) ی بۆ کرد و ، ئەویش فەرمووی: (( علی برکة الله )) . ئەوەبوو هەر ئەو ئێوارەیە گواستیانەوە ئەوێ و ، کردیانە بنکەی هەڵمەتە سەربازییەکانیان ، کە بەیانیان دەرئەچوون و ئێوارە ئەگەڕانەوە .
پێغەمبەری خوا ﷺ لەو ئۆردووگایەدا بنکەیەکی تەندروستیی کردەوە ، تا زامدارەکانی تێدا دەرمان بکرێن . فەرماندایەتیی ئەم ئۆردووگایەش بە عوثمانی کوڕی عەففان سپێررا ..
لە غەزای خەیبەردا ڕووداوێك ڕووی دا و بەو بۆنەوە پێغەمبەری خوا ﷺ دەرسێکی باشی موسڵمانەکانی دادا تا فێری گوێڕایەڵیی بن .
لەو کاتەدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەیویست هێرش بکاتە سەر قەڵاکە ، فەرمانی دا هیچ کەس لە خۆیەوە دەست بە جەنگ و کوشتار نەکات . کەچیی پیاوێکی موسڵمانی هۆزی ئەشجەع چاوی ئەکەوێ بە جوولەکەیەك و هەڵمەت ئەداتە سەری تا بیکوژێ . لەولاوە سوارچاك و پاڵەوانی بە ناوبانگی خەیبەر ، کە ناوی مەرحەب بوو ڕێی بە کابرای ئەشجەعیی گرت و کوشتی .
خەڵکەکە وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ! فلانە کەس شەهید بوو . فەرمووی: (( أبعد ما نهيتُ عن القتال ؟ )) . فەرمووی : دوای ئەوەی کە من جەنگم قەدەغە کردبوو ؟ وتیان : بەڵێ . دوای ئەم ڕووداوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بەسەر جارچییەکدا دا تا جاڕ بدات : بەهەشت بۆ هیچ یاخییبوویەك نابێت . مەبەستیشی لادانی ئەو موسڵمانە ئەشجەعییە بوو کە ویستی لە خۆیەوە جەنگ بکات .

لەو کاتەدا کە قەڵاّی ناعم گەمارۆ درابوو بەندەیەکی حەبەشیی موسڵمان بوو ، کە بەندەی یەکێ لە پێنج سەردارەکەی جوولەکە بوو ، کە ناوی عامیر بوو و ، لەگەڵ مەرحەبدا کوژرا ، ئەو بەندەیە ناوی ئەسلەم بوو و ، مەڕی بۆ ئاغاکەی ئەلەوەڕاند ، کە دیتی وا خەڵکی خەیبەر قەڵاکانیان مەحکەم ئەکەن و ، خۆیان بۆ جەنگ ئامادە ئەکەن ، پرسیی ئەوەچیی ئەکەن ؟ وتیان : ئەچین بە گژی ئەو پیاوەدا کە وای رائەگەیەنێ پێغەمبەرە . ئەم قسەیە کاری کردە سەر دڵی شوانەکە و ، بە خۆی و مەڕەکانیەوە هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ، پاشان داوای کرد بچێتە خزمەتی و ، رێی پێ درا . کە چووە لای پرسیی : ئەی موحەممەد ! چیی ئەڵێی ؟ بۆ چیی بانگ ئەکەی ؟

پێغەمبەری خوا ﷺ بەوپەڕی سادەکارییەوە فەرمووی : (( أدعوا إلى الإسلام ، وأن تشهد أن لا إله إلا الله وأني رسول الله ، وأن لا تعبد إلا الله )) . فەرمووی : خەڵك بۆ سەر ئیسلام بانگ ئەکەم و، تۆ شاهێدیی بدەی کە جگە لە زاتی ( الله ) هیچ خوایەکی تر نیە و ، منیش پێغەمبەری خوام و ، جگە لە خوا هیچی تر نەپەرستی.

بەندەکە وتی : جا ئەگەر من شاهێدیی بدەم و ئیمان بە خوای گەورە بهێنم چیم بۆ ئەبێت ؟

فەرمووی : (( لك الجنة إن مت على ذلك )) . فەرمووی : ئەگەر لەسەر ئەوە بمریت ئەچیتە بەهەشتەوە .

ئیسلام چووە دڵیەوە و ، موسڵمان بوو .

لێرەدا بەندە ئەوموسڵمانەکە هەستی کرد سپاردەیەك وا لە ئەستۆیدا ، بۆیە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەم مەڕانەم سپاردەن بە لای منەوە ، چییان لێ بکەم؟

فەرمووی : (( أخرجها من العسكر ثم صح بها وارمها بحصيات ، فإن الله عز و جل سيؤدي عنك أمانتك )) . فەرمووی : لە ئۆردووگاکە دەریان بکە ، پاشان بە دەنگی بەرز لێیان بخوڕە و دەنکە چەویان تێ بگرە ، ئیتر خوای گەورە ئەمانەتەکەت بۆ ئەگەیەنێتەوە شوێنی خۆی .

بەندە حەبەشییەکە مشتێ چەوی هەڵ گرت و بە رووی مەڕەکاندا هاویشتی و وتی : بگەڕێنەوە بۆ لای خاوەنەکەتان ، بەخوا من سەروکاریتان ناکەم . مەڕەکان هەر هەموویان پێکەوە وەك کەسێك لێیان بخوڕێ کەوتنە رێ هەتا چوونەوە ناو قەڵاکەی

مەرحەب . ئیتر کابرای جوولەکە بۆی دەرکەوت کە بەندەکەی موسڵمان بووە . ئەڵێن: عەلیی کوڕی ئەبوطالیب خوا لێی رازیی بێ کە ئالاکەی هەڵ گرت و بۆ جەنگی جوولەکەی قەڵای ناعم کەوتە رێ ، بەندە حەبەشی یەکەش کەوتە دوای و کوشتاری جوولەکەی کرد هەتا شەهید بوو . کە برایەوە بۆ بنکەی فریا کەوتن و ، لەوێ پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی پێ کەوت ، بە هاوەڵانی فەرموو :(( لقد أكرم الله هذا العبد ، وساقه إلي خير ، ولقد رأيت عند رأسه اثنتين من الحور العين ، ولم يصل لله سجدة قط )) . فەرمووی : بە راستیی خوا رێزی لەم بەندەیە نا و ، بەرەو چاکەی هێنا. چاویشم کەوت بە دوو حۆریی کە لەلای سەریدا بوون ، بە مەرجێ سەجدەیەکیشی بۆ خوا نەبردووە.

لە ریوایەتێکی تردا وەها هاتووە کە پیاوێکی رەش دێتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و ئەڵێت : من پیاوێکی رەش پێست و ، دەم و چاو ناشیرین و ، بۆن ناخۆش و ، بێ پارە و پووڵم ، ئەگەر لەگەڵ ئەمانە بجەنگم هەتا بکوژرێم ، ئایا ئەچمە بەهەشتەوە ؟ فەرمووی : (( نعم )) . ئەوەبوو چووە پێشەوە هەتا شەهید بوو . جا کاتێك کە شەهید بوو بوو پێغەمبەری خوا ﷺ و تەشریفی هێنایە سەری و فەرمووی : (( حسن الله وجهك ، وطيب ريحك ، وكثر مالك )) ثم قال : (( لقد رأيت زوجتيه من الحور العين ينزعان جبته عنه ويدخلان فيما بين جلده وجبّته )) . فەرمووی : خوا دەم و چاوتی جوان کرد و ، بۆنتی خۆش کرد و ، سامانیشتی زۆر کرد ، پاشان فەرمووی : هەردوو ژنە حۆرییەکەیم بینیی کە جبەکەیان لەبەریا دائەکەند و ئەچوونە نێوان پێستی و جبەکەیەوە.[٩٧]

**نۆهەم : سەختیی قەڵای ناعم**

قەڵای ناعم لە هەموو قەڵاکانی خەیبەر سەخت تر بوو و ، جەنگاوەرانیشی ئازاترینی جوولەکەی خەیبەر بوون ، بۆیە چەندین جەنگی سەخت لەبەردەمیا روویان دا.

بەڵگە بۆ ئەمەش ئەوەیە کە مەرحەبی سوارچاك و پاڵەوانی خەیبەر فەرماندەی سوپای پاراستنی ئەم قەڵا سەختە بوو و ، دوو سوارچاکی تریش ، کە هیچیان لەو کەمتر نەبوو لە ئازایەتیی و بەجەرگییدا ، یارمەتیی دەری بوون ، کە ئەوانیش یاسیر

---

[٩٧] غزوة خيبر لباشميل : ١٣٦ ـ ١٥٩ .

و حاریثی برای بوون و ، تا موسڵمانەکان ئەم سێ پاڵەوانەیان نەکوشت نەیان توانیی قەڵاکە بگرن ..

هەرچەندە خاوخێزانی مەرحەب و سەربازەکانیان پاڵەوانانە بەرگرییان لەم قەڵایە کرد و ، هەر چەندە موسڵمانەکانیش تووشی ماندووبوونێکی زۆر هاتن لەبەردەم بەرگریی‌کەرانی قەڵاکەدا و ، هەر چەندە زۆرێک لە موسڵمانان تووشی نەخۆشیی هاتن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا فشاری زیاتر بخرێتە سەر قەڵاکە و ، تابلووقەی توندتر بخەنە سەر جوولەکە تا ناچار بن و ، خۆیان بە دەستەوە بدەن .

جوولەکە بە درێی بەرگرییان ئەکرد و ، پێغەمبەری خوایش ﷺ کەتیبە لە دوای کەتیبە موهاجیر و ئەنصاری ڕەوانە ئەکردن بۆ هەڵمەت بردنە سەر ناعم ، کەچیی ئەو هەموو کەتیبانە دەستەوسان بوون .

لە کاتێکدا کە قەڵاکە تابلووقە درابوو ، مەرحەبی جوولەکە لە دەرگای قەڵا هاتە دەرەوە و ، داوای زۆرانبازیی ئەکرد . ئەوەبوو عامیری کوڕی سینانی کوڕی ئەکوەعی لێ دەرپەڕیی بەڵام شمشێرەکەی عامیر لە دەستیدا هەڵ گەڕایەوە و ، عامیری زامدار کرد و شەهید بوو ، وەك لە پێشەوە باس کرا .

دەربارەی کوشتنی مەرحەبیش ئیبن ئیسحاق بەم شێوەیە باسەکە ئەگێڕێتەوە کە کاتێك مەرحەب دێتە بەردەم قەڵاکە و داوای شمشێربازیی ئەکات ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( من هذا ؟ )) . فەرمووی : کێ ئەچێتە مەیدانی ئەمە ؟ موحەممەدی کوڕی مەسلەمە ئەڵێت : من ئەی پێغەمبەری خوا ! من ستەم لێ کراوی تۆڵەسێنم .. دوێنێ براکەمی کوشت . لە پێشەوە باسمان کرد کە مەرحەب بەردێکی خست بەسەر مەحموودی کوڕی مەسلەمەدا و بووە هۆی شەهیدکردنی . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( فقم إليه ، اللهم أعنه عليه )) فەرمووی : دە هەستە بۆی . خوایە یارمەتیی بدەی تا بەسەریدا زاڵ ببێ .

کە لە یەك نزیك کەوتنەوە درەختێك کەوتە نێوانیان و ، هەر یەکە بۆ خۆی خۆی ئەدایە پەنای درەختەکە . ئیتر هەرچیی یەکێکیان خۆی ئەدایە پەنای ئەوی تریان بە شمشێر شتێکی لە درەختەکە ئەبڕیی ، هەتا بۆ یەکتریی دەرکەوتن و درەختەکە وەك پیاوێکی وەستاو وەها بوو لە نێوانیاندا ، ئیتر ئەوەبوو مەرحەب هەڵمەتی دایە کوڕی مەسلەمە و ، شمشێرەکەی بۆ داهێنایەوە و ، ئەویش قەڵغانەکەی دایە بەری کە

پێستێکی ئەستوور بوو و ، شمشێرەکەی مەرحەب کەوتە ناویەوە و ئەویش توند گرتی و بەری نەدا . ئیتر موحەممەدی کوڕی مەسلەمە دای گرتەوە هەتا کوشتی .

بەڵام واقیدیی وەهای باس کردووە کە موحەممەدی کوڕی مەسلەمە هەردوو قاچی مەرحەب ئەپەڕێنێ و ، ئەیخاتە سەرزەویی . پاشان مەرحەب پێی ئەڵێ : دەی یەکجاریی بم کوژە . ئەڵێت نا ، تۆش تامی مەرگ ، وەك مەحموودی کوڕی مەسلەمەی برام چەشتی ، بچێژە .[98] دوای ئەوە عەلیی کوڕی ئەبوطالیب بە لای دا تێپەڕ ئەبێت و ، ملی ئەپەڕێنێ .

بۆ بردنی کەل و پەلەکەی مەرحەب عەلیی و کوڕی مەسلەمە ئەچنە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ تا بزانن بە کێیان ئەدرێت . ئەوەبوو شمشێر و رم و سەرپۆشە زرێکەی و کڵاوە ئاسنەکەی دا بە موحەممەدی کوڕی مەسلەمە . بەڵام مەقریزیی ئەوەشی باس کردووە کە عەلیی کوڕی ئەبوطالیب بەر لەوەی مەرحەب بکوژێ حاریثی برای مەرحەبی کوشتووە .

شایانی باسە کە بنەماڵەی مەرحەب لە هۆزی حیمیەری یەمەنیین ، بۆیە زۆر ئازا و بەجەرگ بوون . هەتا دوای کوژرانی مەرحەب قەڵاکە خۆی نەدا بە دەستەوە ، بەڵکو جوولەکە بەوپەڕی ئازایەتی‌یەوە ئەجەنگان . دوای کوژرانی مەرحەب و حاریث یاسیری برایان پاڵەوانانە ئەجەنگا . بگرە هاتە سەر ئەوە کە لە قەڵاکە بە خۆی و کۆمەڵێك جەنگاوەرەوە لە قەڵا بێتە دەرەوە بۆ شمشێربازیی . ئەوەبوو لەبەردەم قەڵاکەدا رمەکەی داچەقاند و ، بە ئەسپەکەیەوە ئەمسەر و ئەوسەری ئەکرد و ، بە شیعری عەرەبیی داوای پیاوی ئەکرد بێتە مەیدانی .

لە راستیی‌دا یاسر گاڵتەی پێ نەئەکرا .. ئەوەبوو زوبەیری کوڕی عەووامی لێ دەرپەڕی .. لەو کاتەدا صەفیەی کچی عەبدولموطەللیبی پووری پێغەمبەری خوا و دایکی زوبەیر لەوێ ئامادە بوو و ترسی لێ نیشت و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! کوڕەکەم ئەکوژێ . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (( بل ابنك يقتله إن شاء الله )). فەرمووی ، بەڵکو کوڕەکەی تۆ ئەو ئەکوژێت .

---

[98] ئەو رۆژە کە مەرحەب کوژرا هێشتا مەحموودی کوڕی مەسلەمە زامدار بوو و کۆچی دوایی نەکردبوو . بۆیە هەر ئەو رۆژە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( من يبشر محمود بن مسلمة أن الله قد أنزل فرائض البنات ، وأن محمد بن مسلمة قد قتل قاتله ؟ )) . فەرمووی : کێ مژدە بۆ مەحموودی کوڕی مەسلەمە ئەبات کە خوای گەورە باسی میراتی کچانی ناردۆتە خوارەوە و ، موحەممەدی برایشی مەرحەبی کوشتووە ؟ ئەوەبوو جوعاڵەی کوڕی سوراقە هەواڵەکەی بۆ برد و ئەویش دڵ خۆش بوو و سەلامیشی پیا ناردەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ.

کە زوبەیر هاتە مەیدانی بە شیعر وەڵامی یاسری دایەوە . ماوەیەك خەریکی شمشێربازیی بوون، تا سەرەنجام زوبەیر جوولەکەکەی کوشت . کە هەرسێ فەرماندە گەورەکەی ناعم کوژران ئیتر جوولەکە ورەیان نەما و دەستیان شل بوون .

کە زوبەیر یاسیری کوشت پێغەمبەری خوا ﷺ ستایشی کرد و فەرمووی : (( فداك عم وخال ، لكل نبيّ حواريّ وحواريّ الزبير )) . فەرمووی : مام و خاڵ بە قوربانت بن. هەموو پێغەمبەرێك قوتابیی و پشتیوانی بوون و ، قوتابیی و پشتیوانی منیش زوبەیرە.

ئەگەر بە زوبەیریان بوتایە : ئەو رۆژە شمشێرەکەت بەبڕشت بوو ، ئەیوت : بەبڕشت نەبوو ، بەڵام ناچارم کرد .

هەروەها ئەوەش هاتووە کە لەبەردەم قەڵای ناعمدا فەرماندەیەکی تری ئازای جوولەکە بە دەستی ئیمام عەلیی ئەکوژرێت کە ناوی عامیر بووە .

هەروەها فەرماندەی پێنجەمیشیان بە دەستی موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی ئەنصاریی کوژراوە ، کە ناوی ئوسەیر بووە .

دوای کوژرانی ئەم پێنج فەرماندەیە ئیتر بە جارێك ورەی جوولەکەی ناعم رووخا و، موسڵمانەکانیش بە توندیی هێرشیان کردە سەر قەڵاکە و فەتحیان کرد ، کە ئەمە یەکەم قەڵای خەیبەر بوو موسڵمانەکان بیگرن ..

لە ریوایەتێکی تردا هاتوو، کە ئەبودوجانە حاریثی باوکی زەینەبی ، برای مەرحەبی کوشتووە نەك عەلیی کوڕی ئەبوطالیب .

واقیدیی ئەڵێت : کوڕی ئەبوسەبرە لە عەمری کوڕی ئەبوعەمرەوە بۆی باس کردم کە وتوویە : لە سەردەمی سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیكدا چوومە شاری ئەریحا ، ئەبینم گەڕەکێکی جوولەکەنشینە و ، پیاوێکی لێیە کە لە پیرییدا لارە لار ئەڕوا . وتی : ئێوە خەڵکی کوێن ؟ وتمان : خەڵکی حیجازین . جوولەکەکە وتی : ئای کە بۆ حیجاز بە تاسەوەم . من کوڕی حاریثی جوولەکەم سوارچاکی خەیبەر ، لە رۆژی جەنگی خەیبەردا پیاوێ لە هاوەڵانی موحەممەد کوشتی کە پێی ئەوترا ئەبودوجانە . ئێمە عومەری کوڕی خەططاب باری پێ کردین بۆ شام . وتم : ئەی موسڵمان نابی ؟ وتی : خۆ موسڵمانبوون بۆم چاکە ئەگەر ببوومایە . بەڵام شوورەییم ئەخرێتە دوا .. جوولەکە عەیبدارم ئەکەن . ئەڵێن : باوکت کوڕی سەرداری جوولەکە بوو و وازی لە یەهوودییەت نەهێنا و لەسەری کوژرا ، ئێستە تۆ پێچەوانەی ئەو ئەجوولێیتەوە ؟

ئەبورافیع ئەڵێت : کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئالاکەی دایە دەست عەلیی، ئێمەشی لەگەڵدا بووین . ئەوەبوو لە دەرگای قەلاکەدا عەلیی تووشی پیاوێك بوو و ، شمشێرێکی لە عەلیی دا و ، ئەویش بە قەڵغانەکەی خۆی پاراست . خێرا عەلیی دەستی دایە دەرگایەك کە لەلای قەلاکەدا بوو و کردیە قەڵغان بۆ خۆی و ، هەروا بە دەستیەوە بوو هەتا خوای گەورە قەلاکەی بۆ فەتح کردن ..

کەمێك بەر لەوەی قەڵای ناعم بە دەستەوە بدرێت و ، لە کاتێکدا کە عومەری کوڕی خەططاب ئێشکچیی شەو بوو ، پیاوەکانی پیاوێکی جوولەکەیان دەست گیر کرد و هێنایان بۆ لای عومەر . عومەریش وایزانیی سیخوڕی جوولەکەیە ، بۆیە فەرمانی دا لە ملی بدرێت . بەلاّم کابرای جوولەکە بە عومەری وت : بم بە بۆ لای پێغەمبەرەکەتان هەتا قسەی بۆ بکەم . عومەر گرتی و هێنایە بەر دەرگای چادرەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبینێ وا نوێژ ئەکات . بردیە ژوورەوە لای . ئەویش بە جوولەکەکەی فەرموو : (( ما وراءك ، ومن أنت ؟ )) . فەرمووی : تۆ کێیت و ، دەنگ و باست چییە ؟ وتی : ئەی موحەممەد ! ئەگەر راستت پێ بڵێم ئەمانم ئەدەیتێ ؟ فەرمووی : (( نعم )) .

کابرای جوولەکە کە ناوی ( سمّاك ) بوو وتی : لە قەڵای ( نطاة ) ، واتە ناعم ەوە و، لەلایەن کۆمەڵێك خەڵکی بێیاساوە هاتووم ، من بەجێم هێشتن بەم شەوە خۆیان لە قەڵاکە ئەدزییەوە . پێغەمبەری خوا ﷺ بە جوولەکەکەی فەرموو : (( فأين يذهبون ؟ )) . فەرمووی: بۆ کوێ ئەچن ؟ وتی : ئەچن بۆ قەڵاکانی ( شق ). ئەوەندەش لێت ترساون ، دڵیان تەپە تەپ ئەکات . ئەمەش قەڵای جوولەکەیە و چەك و خواردەمەنیی و رۆنی تێدایە ، هەروەها ئامێری قەڵاکانیانی تێدایە کە پێی کوشتاری یەکتریان ئەکرد . ئەمەیان لە ماڵێکی قەڵاکەدا لە ژێر زەوییدا شاردۆتەوە ، ( واتە قەڵای دووهەم کە ناوی صەعب بووە ) .

پێغەمبەری خوا ﷺ بە جوولەکەکەی فەرموو : ئەو ئامێرە چییە ؟ وتی : مەنجەنیقی هەڵوەشاو و ، دوو دەبابە و چەك : زری و کڵاوی ئاسن و شمشێری زۆر . جا ئەگەر سبەینێ چوویتە ناو قەڵاکەوە ( ئەشچیتە ناوی ) فەرمووی : (( إن شاء الله )) . جوولەکەکەش وتی : (( إن شاء الله )) لەسەر شوێنی نهێنیی چەکەکە ئەت وەستێنم ، چونکە جگە لە من هیچ جوولەکەیەك پێی نازانێ .

جوولەکەکە وتی : شتێکی تریش . وتیان چی‌یە ؟ وتی : ئەو چەکە دەر ئەهێنی ؛ پاشان من مەنجەنیقەکە رووە و قەڵای ( شق ) دائەمەزرێنم و ، پیاوەکانیش لە ناو دوو دەبابەکەدا ئەڕۆنە پێشەوە و ژێر قەڵاکە هەڵ ئەکەنن و هەر ئەو رۆژە فەتحی قەڵاکە ئەکەیت و ، هەمان کاریش لەگەڵ قەڵای کەتیبەدا ئەکەیت .

عومەری کوڕی خەططاب وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! وای لێك ئەدەمەوە کە راستی کردبێ . جوولەکەکە وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! خوێنم بپارێزە . فەرمووی : (( أنت آمن )) . وتی : ژنێکم هەیە وا لە قەڵای نزاردا بی‌بەخشەرەوە پێم . فەرمووی : (( هي لك )) .

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لە ( سمّاك ) کرد : (( ما لليهود حوّلوا ذراريهم من النطاة ؟ )) . فەرمووی : بۆچ جوولەکە ماڵ و منداڵیان لە قەڵاکانی ( نطاة ) گواستۆتەوە ؟ وتی : بۆ ئەوەی یەك لایی ببنەوە بۆ جەنگ و ، ماڵ و منداڵیان ناردۆتە قەڵاکانی ( شق ) و کەتیبە . داوای لە ( سماك ) کرد تا موسڵمان ببێ ، کەچیی وتی : چەند رۆژێك مۆڵەتم بدە .

موسڵمانەکان وازیان لەو جوولەکە هێنا تا بە سەربەستیی بۆ خۆی بگەڕێ ، تا ئەوەبوو موسڵمانەکان دواهەمین قەڵای خەیبەریان فەتح کرد کە قەڵای نزار بوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵێنەکەی بۆ کابرای جوولەکە بەسەر برد و ، ژنەکەی پێ دایەوە و ئەویش موسڵمان بوو .

گرتنی قەڵای ناعم موسڵمانانی زۆر ماندوو کرد ، ئەوەبوو هەر لە یەکەم رۆژدا ( ٥٠ ) کەسیان لێ زامدار بوو . لەوە ئەچێ لە پانزە رۆژ زیاتری خایاندبێ و ، ئەمەش گەورەترین جەنگی نێوان موسڵمانەکان و جوولەکە بووە . جوولەکەش تا فەرماندە بەناوبانگەکانیان نەکوژرا بوون ، جار لە دوای جار هێرشیان ئەکردە سەر موسڵمانەکان ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەی کوژراوانی هەردوولا دەست نیشان نەکراوە . تەنها پێنج فەرماندەی جوولەکە ناویان هەیە ، لەگەڵ سێ شەهیدی موسڵماناندا : مەحموودی کوڕی مەسلەمە و ، عامیری کوڕی ئەکوەع و ، ئەو بەندە حەبەشی‌یەی کە شوانی جوولەکەکان بوو . دیارە جوولەکە لە رۆژی فەتحی قەڵاکەدا بەرگریی زۆریان کردووە و ، زۆریشیان لێ کوژراون ، هەروەها موسڵمانەکانیش بەبێ شەهید و زامدار قەڵاکەیان بۆ فەتح نەکراوە .

هەروەها باسی ژمارەی چەك و دەستكەوتەكانی ئەم قەڵایە نەكراوە .[٩٩]

**دەهەم : فەتحی قەڵای (( صەعب ))**

قەڵای ( صەعب ) یەكێكە لە قەڵاكانی ( نطاة ) كە بریتی‌یە لـە بەشـی یەكـەمی خەیبەر . ئەو قەڵایە لە مەحكەمیی و سەختیی‌دا بە دووهەم قەڵا ئـەژمێررێ ، دوای قەڵاكەی مەرحەب . جا لەبەر ئەوەی جوولەكە لە قەڵای یەكەم‌دا ژن و منداڵ و كـەل و پەل و پەلیان نەهێشتبوو و گواستبوویانەوە بۆ قـەڵای ( نـزار ) ، ئـەوەبوو كـە لـە قەڵای یەكەم‌دا ورەیان رووخا ، بە ئاسانیی توانی‌یان بكشـێنـەوە بۆ قـەڵای دووهـەم ( صەعب ) ، هەتا كە قەڵای ناعم گیرا ، لە هیچ سەرچاوەیەك‌دا باسی بە دیل‌گیرانی جوولەكە نەكراوە.

موسـڵمانەكان ئابڵوقـەیان خسـتە سـەر قـەڵای دووهـەم تـا ناچـاری خـۆ بـە دەستەوەدانی بكەن . جا وەك بۆ فەتحی قەڵای یەكەم ، پێغەمبەری خوا ﷺ ئاڵاكـەی دایە دەست عەلیی كوڕی ئەبوطالیب ، بۆ فەتحی قـەڵای دووهـەمیش ئاڵاكـەی دایـە دەست پاڵەوانێكی ئەنصاریی كە حوبابی كوڕی مونـذیر بوو تا هەڵمەت بەرێتـە سـەر قەڵای صەعب ، ئەویش مەردانە هێرشی ئەكرد تا قەڵاكەی فەتح كرد .

جا لەبەر ئەوەی موسڵمانەكان زۆر مانەوە ، هەندێ لە كەتیبەكانی سوپای ئیسلام خۆراكیان تەواو بوو بوو و ، برسێتیی تەنگی پێ هەڵ چنی بوون ..

موعەتتیبی ئەسلەمیی ئەڵێت : ئێمەی نەوەی ئەسلەم تووشـی دەسـت كـورتیی و برسێتیی بووین لە خەیبەردا . ئەوەبوو چەند رۆژێك لە دەوری قـەڵای ( نطـاة ) واتـە ناعم ماینەوە ، كە فەتحمان ئەكرد خۆراكی تێدا نەبوو . بۆ ئەمە ئەسلەم هاتنە سـەر ئەو رایە كە ئەسمای كوڕی حاریثە بنێرنـە خزمـەتی پێغەمبـەری خوا ﷺ . وتیـان : بڕۆرە خزمەتی موحەممەدی پێغەمبەری خوا ﷺ و پێی بڵێ : ئێمە بە دەست برسێتیی و لاوازی‌یەوە تەواو بەگیر هـاتووین . ئـەسمای كـوڕی حـاریثـە هـات و وتـی : ئـەی پێغەمبەری خوا ! ئەسلەم[١٠٠] ئەڵێت : ئێمە لەبەر برسێتیی و لاوازیی یەكجار بە گـیر هاتووین، لە خوا بۆمان بپاڕێرەوە . ئەوەبوو پێغەمبـەری خـوا ﷺ بۆیـان پاڕایـەوە ، پاشان فەرمووی : (( والله ما بيدي ما أقريهم )) . فەرمووی : بەخوا شتێكی وەهام لە

---

[٩٩] غزوة خيبر لباشميل : ١٥٩ ـ ١٨٣ .

[١٠٠] ئەسلەم : هۆزێكی بەناوبانگ بووە كە لە نەوەی ئەسلەمی كوڕی قوصەی بوون لە خوزاعە ، كە لە بنەڕەت‌دا قەحطانیین و ، ماوا و مەنزڵیان لە مەدینەوە نزیكە .

دەستدا نیە دەرخواردیان بدەم. پاشان بە دەنگی بەرز فەرمووی : (( أللهم افتح عليهم أعظم حصن فيه أكثره طعاماً وأكثره ودكاً )) . فەرمووی : خوایە کام قەڵایە خواردن و رۆنی زیاتری تێدایە ئەوەیان بۆ فەتح بکەیت .

برسێتیی تەنگی بە چەند بەشێکی سوپای ئیسلام هەڵ چنی بوو ، تا ئەو رادەیە کە ناچار بێن گوێدرێژ سەر ببڕن و بیخۆن . کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای کۆمەڵە موسڵمانێکدا تێ ئەپەڕێ و ، خەریکی کولاندنی گۆشتی گوێدرێژ ئەبن لە قابلەمەدا ، پرسیار ئەکات و هەواڵی ئەدەنێ ، خێرا فەرمان ئەدا تا جاڕ بدرێت کە پێغەمبەری خوا ﷺ موسڵمانان لە گۆشتخواردنی گوێدرێژی ماڵیی و ، لە نیکاحی میتعە و ، لە خواردنی گۆشتی کەڵبەدار و نینۆکدار قەدەغە ئەکات . بەلام ماوەی داوە گۆشتی ئەسپ بخورێت .

ئەبولیەسەر کە ناوی کەعبی کوڕی عەمری کوڕی عەببادی ئەنصارییە و ، بەشداریی عەقەبە و بەدری کردووە و ، لە بەدردا پاڵەوانێتیی زۆری نواندووە و ، بە دەستی ئەو عەبباسی کوڕی عەبدولموطەللیب لە بەدردا بە دیل گیراوە و ، دوا هاوەڵی بەدریی بووە کە لە ساڵی پەنجا و پێنجەمی کۆچییدا لە مەدینەدا کۆچی دوایی کردووە ، باسی ئابلووقەی قەلای صەعبی کوڕی موعاذ ئەکات ، کە دوای سێ رۆژ رانەمەڕێکی پیاوێکی جوولەکە لە دەرەوەی قەلاکە بە دیی ئەکەن ، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ : (( من يطعمنا من هذه الغنم ؟ )) فەرمووی : کێ ئەتوانێ لەو مەڕانەمان بۆ بگرێ و دەرخواردمان بدات ؟ ئەڵێت : منیش وتم : من ئەی پێغەمبەری خوا ! بە شێوەی ئاسك بۆی دەرچووم . کە پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی لێم بوو وا رۆیشتم فەرمووی : (( أللهم متعنا به )) . منیش فریای مەڕەکان کەوتم و ، سەرەتاکەیان چووە ناو قەلاکەوە و ، منیش دوو مەڕم گرتن و باوەشم پیایانا کرد . پاشان وەك هیچم پێ نەبێ بە راکردن هاتمەوە ، هەتا گەیشتمە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و فەرمانی دا سەریان بڕیین ، پاشان هەردووکی بەش کردن ، بە شێوەیەك کە هیچ کەس لە ئۆردووگاکەدا نەما لەوانەی ئابلووقەی قەلاکەیان دابوو لێی نەخۆن .

شایانی باسە کە قەلای دووهەم پێنج صەد کەس بەرگرییان لێ ئەکرد ، کە لە ژێر فەرماندایەتیی دوو فەرماندەیان دا، بە ناوی دەییال و یووشەع ، ئەجەنگان .. ئەمانە بە وێنەی قەلای یەکەم بەرگرییان لە قەلای صەعبیش ئەکرد ، بەڵکو زیاتریش چونکە قەلای دووهەم سامان و کەل و پەل و چەکی زۆری تیا بوو .

سەرەتا یووشەعی گەورە فەرماندەیان بە سواریی ئەسپەکەیەوە هاتە بەردەم قەڵاکە و، داوای پاڵەوانێکی کرد کە بچێتە بەر دەمی . ئەوەبوو فەرمانده‌ی سوپای هەڵمەت بەر ، حوبابی کوڕی مونذیری هەڵگری ئاڵا لێی هاتە پێش و ، دوای هەڵمەت و بگرە و بەردەیەك و شەڕە شمشێرێکی توند فەرماندەی موسڵمانان توانیی یووشەعی جوولەکە بکوژێ .

کە فەرماندەی یەکەم کوژرا ، جوولەکە یەکجار تووڕە بوون ، ئەوەبوو خێرا فەرماندەی دووهەمیان ، کە ناوی دەییال بوو ، دەرپەڕیی و ، رمەکەی لەبەردەم قەڵادا داچەقاند و ، ئەویش داوای شمشێربازیی کرد . ئەوەبوو عومارەی کوڕی عەقەبەی غیفاریی لێی هاتە پێش و ، هەردووك بەسەر ئەسپەکەیانەوە ماوەیەك یەکتریان راو نا ، بەو هیوایەی هەریەکە دەست لە بەرامبەرەکەی بووەشێنێ . دوای ئەوە شەڕە شمشێرێکی سەختیان کرد و ، لە ئەنجامدا عومارە هەڵمەتی دایە دەییال و بە شمشێرێك یەکجاری کرد ..

بە کوژرانی ئەم دوو فەرماندەیە زیانێکی گەورە لە جوولەکە کەوت . بۆیە هەر هەموو چاویان پەڕییە تەوقی سەریان و ، هێرشێکی توندیان کردە سەر موسڵمانەکان ، کە سەرەتا بە تیر موسڵمانەکانیان داگرتەوە و ، تیریان وەك لێزمە باران بەسەریاندا ئەباراند ، بە تایبەت تیریان بۆ ئەو شوێنە ئەهاویشت کە پێغەمبەری خوای ﷺ لێ بوو ، بەو نیازەی بیپێکن و بیکوژن .

جا لەبەر ئەوەی کە جوولەکەی خەیبەر تیریان زۆر ئەرۆیشت و ، نیشانەشیان راست بوو ، زۆرێك لەو تیرانە لە نزیك پێغەمبەری خوادا ﷺ دائەکەوتن ، بۆیە موسڵمانان خۆیان کردە قەڵغان بۆ پاراستنی ئازیزیان ، کە سواری ئەسپەکەی بوو بوو و ، چاودێریی جەنگی ئەکرد .

موسڵمانانیش بە تیر وەڵامی جوولەکەکانیان ئەدایەوە ، بەڵام وەك موسڵمانەکان لە دەشتێکی رووتدا بوون ، جوولەکە بەسەر قەڵاکانیانەوە ، لە پشتی قوللەکانەوە خۆیان حەشار ئەدا ..

دوای ئەوەی کە موسڵمانەکان لە شەڕە شمشێردا لەبەردەم قەڵای صەعبدا سەرکەوتن و ، دوای تیرباراندن بەسەر یەکتردا ، موسڵمانەکان وایان بە چاك زانیی هێرشێکی توند بکەنە سەر قەڵاکە بەو هیوایەوە بچنە ناویەوە . کەچیی لەلایەن جوولەکەکانەوە بەوپەڕی توندیی وەڵام درانەوە . بەڵکو جوولەکە غیرەتیان خستە بەر

خۆیان و دەرگاکانی قەڵایان خستە سەر پشت و ، ئـەوان هێرشـێکی تونـدی وەهایـان کردە سەر موسڵمانەکان بۆ دواوە راویان نان تا ئەو شوێنەی کە پێغەمبەری خوای ﷺ تێدا وەستا بوو ، هەتا خەریك بوو بگەنە لای ئەویش . بەڵام ئەو خۆی ئاسا ، وەك لە هەموو هەڵوێستێکی سەختدا دامەزراو ئەبوو ، لە شوێنی خۆی نـەبزوا و ، دەسـتی دایە هەڵنانی موسڵمانەکان تا لەبەر هێرشی سەختی جوولەکەدا خۆیان بگرن . هـەتا کە پێغەمبەری خوا ﷺ تێك شکان و کشانەوەی موسڵمانەکانی ـ جگـە لـە حوبـابی کوڕی مونـذیری فەرماندەیان ـ دیی ، لەسەر ئەسپەکەی دابەزیی تا غیرەت بخاتە بـەر موسڵمانەکان .. تا ئەوەبوو بە بانگەوازی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ موسڵمانەکان ، تـا بە غیرەتەوە دامەزراو بن ، هاوەڵان هۆشیان بە خۆیاندا هاتەوە و ، گەڕانەوە مەیدان و، دەورەیان لە ئازیزیان دا ، تا بە جوانیی دەرسی دامەزراویی ، لە کاتی تەنگانەدا، بە لایەوە بخوێنن .. ئیتر ئەوەبوو جوولەکەیان ناچاری کشانەوە کردن و ، گەڕانەوە ناو قەڵا و دەرگاکانیان داخستنەوە و ، چیی کوژراویان هەبوون لە دەرەوەی قەڵا بەجیّیان هێشتن و ، موسڵمانەکانیش لەگەڵ حوبابی فەرماندەیاندا ، لە دوای خۆ رێك و پێـك کردنەوە ، ئەو جوولەکانەیان تا دەرگای قەڵا راو نان .

که موسڵمانەکان لە قەڵا نزیك کەوتنەوە ، جوولەکە بەسەر قوللەکانەوە تیربارانیان کردنەوە و ، بەو بەردانەش کە بۆ رۆژێکی ئاوەها ئامادیان کردبوون دایان گرتنـەوە ، بۆیە ناچار کشانەوە ..

کە موسڵمانەکان دوور کەوتنەوە ، دیسان جوولەکـە دەرگاکانیـان خستەوە سـەر پشت و هەڵمەتێکی توندیان دایە موسڵمانەکان . بەڵام ئەم جارە موسڵمانەکان لەگەڵ حوبابی فەرماندەیان بە دامەزراویی هێرشێکی سەختیان کردە سـەر جـوولەکە ، تـا ئەوەبوو لەبـەردەم قـەڵادا جـەنگێکی سـەروماڵیی و خوێنـاویی رووی دا کـە چـەند هاوەڵێکی تێدا شەهید بوون [١٠١] ، بەڵام سەرکەوتن بۆ موسڵمانەکان بوو کە توانی‌یـان جوولەکە بشکێنن و ، بەرەو دواوە بکشێنەوە و ، دەرگاکانی قـەڵاکان لەسـەر خۆیـان دابخەنەوە .

---

[١٠١] لەو هێرشەدا سێ موسڵمان شەهید بوون : یەکەم : ( أبوصیاح ) کە بەشداریی بەدری کردووە و ، جوولەکەیەك بە شمشێر لێی ئەدا و کلاوەی سەری هەڵ ئەگرێت . دووهەم : عەدیی کوڕی موررەی کوڕی سوراقە ، کە جوولەکەیەك حەربەیەکی دا لە نێوان هەردوو مەمکی و شەهید بوو. سێ هەم : حاریثی کوڕی حاطب کە بە شداریی بەدری کردووە. جوولەکەیەك لە قەڵاکەوە بەردی تێ گرت و بەر سەری کەوت . بەرامبەر بەمانە ئەوانیش کۆمەڵێکیان لێ کوژران .

سەللامی کوڕی میشکەمیش ، کە سەردارێکی نەوەی نەضیر و ، مێردی زەینەبی کچی حاریثی برای مەرحەب بوو لە کاتی فەتح کردنی قەلاکانی ( نطاة ) دا کوژرا . شایانی باسە کە ئەم سەردارەی جوولەکە فەرماندەی گشتیی هێزە جوولەکەکانی ناوچەی ( نطاة ) بووە ، بەلاّم لەبەر ئەوەی کە نەخۆش بووە ، دەوری جەنگ و هەلّمەتی دیار نەبووە ، هەر چەندە لە فەتحی قەلاکانی ( نطاة ) دا کوژراوە .. ئەم پیاوە غیرەتی قبوولّی نەکردووە بە نەخۆشییش بچێتە قەلاکانی کەتیبەوە ، کە لە دواوە بوون و جەنگیان لێوە دوور بوو و ، هاوەلاّنی لێی پاڕانەوە تا خۆی کەنار بدات. ئەوەشمان لە بیر بێ کە زەینەبی هاوسەری سەللام بوو مەڕە ژەهراوییەکەی دەرخواردی پێغەمبەر و هاوەلاّن دا ، وەك لە دواوە ـ إن شاء الله ـ باسی لێوە ئەکەین .

ئەوەبوو لە دواجاردا فەرماندەی موسلّمانان حوبابی کوڕی مونذیر و موسلّمانەکان جوولەکەیان ڕاونان و خۆیان بە قەلاّی صەعبدا کردەوە و ، دەرگایان لەسەر خۆیان داخست ، کەچیی لەناو قەلاّدا بە یەكدا ئەهاتن و ، بە جارێك ورەیان رووخا بوو . جا کە حوباب سەرنجی ئەمەی دا ، بە هەلی زانیی و ، خێرا کەوتە نەخشەڕێژیی بۆ فەتحی قەلاّی صەعب .

بە پێی ئەو نەخشەیە حوباب لەگەلّ موسلّمانەکاندا کەوتنە هێرشێکی گورج و ناخلۆفیی و ، جەنگێکی سەختیان دەست پێ کرد ، تا ئەوەبوو قەلاکەیان فەتح کرد و، دەستیان بەسەر ئەو چەك و خواردەمەنییانەدا گرت کە تیایا بوون . ئەمەش دەروویەکی خوایی بوو کە لە موسلّمانەکانی کردەوە و ، لە برسێتیی رزگاری کردن .

لەم جەنگەدا جوولەکە بە توندیی بەرگرییان ئەکرد ، بۆیە زۆرێکیان لێ کوژران و، ژمارەیەکیشیان لێ بە دیل گیران .

لە پالّ خۆراك و خواردەمەنیی زۆردا ، موسلّمانەکان لە ژێر زەویی قەلاّی صەعب دا کەرەسەیەکی زۆری جەنگیان دۆزییەوە کە قەلّغان و شمشێر و مەنجەنیق و دەبابە بوون.

مەنجەنیق جۆرە چەکێك بووە کە بۆ رووخاندنی قەلاّ و سەنگەری سەخت بەکار هاتووە . دەبابەش بریتیی بووە لە لەوحی ئاسنی ئەستوور و گەورە تا سەربازان لە کاتی هێرشدا بچنە پەنایەوە و لە تیری دوژمن پارێزراو بن . شایانی باسە کە لە دوورگەی عەرەبییدا تەنها لە خەیبەردا ئەو چەکانە بوو و ، ئەو چەکانەش مەگەر لە سوپای فارس و رۆمدا بەکارهاتبن . ئیتر نازانرێ خەیبەر ئەم چەکانەیان چۆن دەست کەوتوون . ئایا لە شامەوە بۆیان هاتوون ، یان خۆیان دروستیان کردوون ! بە مەرجێ

ئەم چەکانە بۆ هێرش بەکار دێن ، کە لەوانەیە بە نیازی هێرش‌کردنە سەر مەدینە دەستیان کەوتبێ . جا کە ماوەی هێرشیان نەبووە ناچار بوون بیان شارنەوە .

کە دەست گیرا بەسەر قەلاکەدا جارچیی پێغەمبەری خوا ﷺ جاڕی دا کە جگە بۆ پێویستیی کاتیی خۆیان و ولاغەکانیان هیچ موسلمانێك دەست بۆ شتێکی قەلاکە نەبات . دەست‌کەوتەکان هەموو گوازرانەوە بۆ ئۆردووگای پێغەمبەری خوا ﷺ .

لەگەڵ کەلوپەلدا ، لەو قەلایەدا ، عەرەق و شەرابێکی یەکجار زۆر دەستی بەسەردا گیرا ، هەر هەمووی ڕژێنرا و دەفرەکانیشی شکێنران ، ئەوەندە زۆر بوو لافاوی لە قەلاکەدا هەڵساند .

واقیدیی ئەگێڕێتەوە کە عویەینەی کوڕی حیصن سەیری قەلای صەعب ئەکات وا موسلمانەکان ئەو هەمووە خواردن و ئالیك و چەوری‌یەیان ئەگواستەوە ، ئەڵێت: کەسێك نیە ئالیکی ولاغەکانمان بدات و ، لەو خۆراکەش دەرخواردمان بدات .

شایانی باسە کە پێش دەست‌پێ‌کردنی جەنگ عویەینە خۆی ئامادە کرد تا بە چوار هەزار جەنگاوەرەوە بچێتە کۆمەکی جوولەکەی خەیبەر و ، پێغەمبەری خواش ویستی عویەینە یارمەتیی خەیبەر نەدا ، بۆ ئەمە بەڵێنی دا کە ئەگەر عویەینە واز لە کۆمەکیی خەیبەر بهێنێ ، کە موسلمانەکان خەیبەریان گرت نیوەی دەست هات و بەرهەمی خەیبەر بدرێ بە عویەینە . کەچیی عویەینە ئەمەی دایە دواوە و ، بڕیاری دا بچێتە کۆمەکیی خەیبەر . ئەوەبوو بە خۆی و جەنگاوەرەکانیەوە لە ( حیفاء ) ەوە بەرەو خەیبەر کەوتە ڕێ ، بەلام کە گەیشت قەلای صەعب فەتح کرابوو . بۆیە خەریك بوو عویەینە لە داخدا بتەقێ .

بە فەتح کردنی قەلای ناعم و صەعب بە یەکجاریی ورەی جوولەکە رووخا .. لەوەوپێش ئەوەیان بە بیردا نەئەهات کە دە هەزار جەنگاوەری جوولەکە لە پشت قەلا و سەنگەری مەحکەمەوە و بە چەکی چاك و خواردەمەنیی چاکەوە ، بەرگەی هەزار و چوار صەد موسلمانی کەم تفاقی بێ‌سەنگەر نەگرن .[١٠٢]

**یانزەهەم : فەتحی قەلای زوبەیر**

دوای فەتحی قەلای یەکەم و دووهەم جوولەکە خۆیان گەیاندە قەلای سێ‌هەم کە قەلای زوبەیر بوو . ئەم قەلایە ئەکەوتە سەر لووتکەی چیایەکی سەخت و ڕێگا پێچاو

---

[١٠٢] غزوة خيبر لباشميل : ١٨٢ ـ ٢٠٧ .

پـێچ ، کـە قەڵایـەکی یـەکجار سـەخت بـوو . جوولەکـە چـوونە قەڵاکـەوە و موسڵمانەکانیش ئابڵووقەیان دان .

موسڵمانەکان بۆ فەتحی ئەم قەڵایە چەند هەوڵێکیان دا ، کەچیی بێهـوودە بـوو، چونکە رێگاکانی قەڵاکە سەخت بوون و ، لەبەردەم تیری جوولەکەدا بوون .

جوولەکە بە بۆنەی تفاق و ئـاوی زۆرەوە باکیـان لـە گـەماروودان نـەبوو ، بـەڵام موسڵمانەکان حەزیان لەوە بوو خێرا کۆتایی بـە جـەنگ بێـت ، چـونکە مانـەوەیان بۆیان خراپ بوو .

ئەوەبوو خـوای گـەورە بـە دەسـەڵاتی خـۆی یارمـەتیی بـۆ نـاردن .. یـەکێ لـە جوولەکەکان بە نهێنیی خۆی گەیاندە سەربازگەی موسـڵمانان و ، داوای بـە خزمـەت گەیشتنی پێغەمبەری خوای ﷺ کرد .. ئەم جوولەکەیە ناوی غەززال بوو ..

کە پێکەوە دانیشتن هەواڵی بە پێغەمبەری خوا ﷺ دا کە سوپای ئیسلام بە هێزی سەربازیی قەڵای زوبەیری بۆ ناگیرێت و ، هەر چەندە بۆ ماوەیـەکی دوور و درێژیـش گـەمارۆیان بدەن بێهوودەیە ، چونکە قەڵاکەیان سەختە و ئاویان زۆرە و ، خۆراك و پێویستییشیان بۆ ماوەیەکی زۆر لایە .

غەززال ئامادەیی خۆی دەربڕیی تا رێگای فەتح کردنی قەڵاکـەیان پیشـان بـدات ، بەوەی کە جوولەکە ناچـاری جـەنگ بکـەن ، بـەو مەرجـەی موسـڵمانەکان بـەڵێنی پاراستنی سامان و ماڵ و منداڵەکەی بدەن . پێغەمبەری خوایش ﷺ بەڵێنی دایە .

غەززال ئەوەی ئاشکرا کرد کە جوولەکەی قەڵای زوبەیر کانیاوی نهێنییان هەیە و قازانی گەورەیان دروست کردووە بۆ رۆژانـی جـەنگ و تەنگانـە ، کـە بـە رێـی ژێـر زەمینییەوە بە شەودا دائەبەزنە خوارەوە و بەشی خۆیـان ئـاو سـەر ئەخـەن . بـەڵام سەرچـاوەی ئـەم ئاوانـە لـە دەرەوەی قـەڵاوە هـاتووە ، بۆیـە ئەگـەر موسـڵمانەکان کانیاوەکان بگرن ، جوولەکە ناچار ئەبن ، بێنە دەرەوە بۆ جەنگ . کە موسـڵمانەکان دەستیان بەسەر ئاوەکەدا گرت جوولەکە ناچـار بـوون دەرگاکـانی قـەڵا بکەنـەوە و ، هێرشێکی توند بکەنە سەر موسڵمانەکان . بەمە جـەنگێکی سـەخت لـە نێوانیـاندا رووی دا و موسڵمانەکان دانیان بە خۆیاندا گرت ، تا ئەوەبوو لە بەرگرییـەوە هاتنـە دۆخی هێرش و ، بە یەك دەنگ هێرشیان کردە سـەر جوولەکـە و هـەڵیان بـڕین . جوولەکە بە پەلە بەرەو قەڵا کەوتنە رێ ، بەو هیوایەی بچـنە ژوورەوە و ، دەرگاکـان

دابخەنەوە ، بەلاّم موسڵمانەکان ماوەی ئەوەیان پێ نەدان و ، دەرگای قەڵاّیان گرت و هەڵمەتیان دایە ژوورەوە و قەڵاّکەیان رزگار کرد ..

لەم جەنگەدا موسڵمانەکان چەند شەهیدێکیان هەبوون ، هەروەها جوولەکەش دە کەسیان لێ کوژران ، بەلاّم دەرنەکەوتووە دەستکەوتی موسڵمانەکان لەم قەڵاّیەدا چەند بووە ..[١٠٣]

**دوانزەهەم : فەتحی قەڵاّی ئوبەی**

لە پێشەوە باس کرا کە خەیبەر ئەکرێ بە دوو بەشی سەرەکی‌یەوە :

بەشی یەکەم کە پێك هاتووە لە پێنج قەڵا :

سیانیان بەشی ( نطاة ) بوون و هەرسێکیان فەتح کران .

دوانیشیان کە بەشی ( شق ) بوون یەکێکیان ( ئوبەی ) و ئەوی تریان ( نزار ) بوون .

ئەم دوانەش دوای جەنگێکی سەخت فەتح کران ، وەك لەمەولا ــ إن شاء الله ــ باسی لێوە ئەکەین .

ئەوەبوو یەکەمجار پێغەمبەری خوا ﷺ لە ( المنزلة ) لە نێوان ( نطاة ) و ( شق ) دا موسڵمانەکانی دابەزاند ، کە ئەوەبوو لە یەکەم رۆژی جەنگدا پەنجا موسڵمان زامدار کران ، تا ئەوەبوو حوبابی کوڕی مونذیر داوای لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد کە سەربازگەکەی بگوازێتەوە بۆ ( وادي الرجيع ) تا لە تیری جوولەکە و هەڵمەتی شەویان موسڵمانەکان سەلامەت بن .

بەلاّم کە هەر سێ قەڵاّکە گیران ئیتر مەترسیی نەما موسڵمانەکان ئەو شوێنە بکەنە سەربازگە ، بۆیە سەربازگەی گواستەوە بۆ ( المنزلة ) .

شایانی باسە کە ئەو سێ قەڵاّیە گیران ، جوولەکە هەڵاّتووەکان خۆیان ئەگەیاندە جووتە قەڵاّکەی ( الشق ) بە تایبەتیی قەڵاّی ئوبەی کە هێزی سەرەکیی لەوێ جەم بوو ، تا بەرگریی لە خۆیان بکەن .

قەڵاّی ئوبەیش لەسەر قولەی چیایەك بوو و ئەوەندە سەخت و مەحکەم بوو ، یەکجار زەحمەت بوو کەسێ بتوانێ دەستی لێ بووەشێنێ . بەلاّم هەر چۆنێك بێت نەئەگەیشتە سەختیی سێ قەڵاّکەی پێشەوە . بۆیە سوپای ئیسلام هێرشی کردە سەری

---

[١٠٣] غزوة خيبر لباشميل : ٢٠٧ ـ ٢١٢ .

و پێغەمبەری خوا ﷺ لە شوێنێکی بەرزەوە کە پێی ئەوترا ( سموان ) خۆی سەروکاریی جەنگەکەی ئەکرد .

جوولەکە کەوتنە جەنگی سەرومالّیی .. زۆر بە توندیی پەرچی هێرشی موسڵمانەکانیان ئەدایەوە و ، بەرگرییەکی چاکیان لە قەلاّی ئویەی ئەکرد .

فەرماندەی ئەو موسڵمانانەی کە هێرشیان کردە سەر قەلاّی ئویەی سوارچاکی پالەوانی بەناوبانگ ئەبودوجانەی ئەنصاریی بوو .

جوولەکەکانی ئەم قەلاّیە یەکجار بێباك بوون و گالتەیان بە کوژران و مردن ئەهات ، بۆیە دەرگای قەلاّیان کردنەوە و ، هاتنە بەردەم موسڵمانەکان بۆ زۆران بازیی ، هەر چەندە سوپای موسڵمانان دەورەی قەلاّی گرتبوو .

یەکەم جار سوارچاکێکیان بە ناوی ( عزول ) لە قەلاّ هاتە دەرەوە و ، لەبەردەم شوورای قەلاّکەدا بە ئەسپەکەیەوە کەوتە ئەم سەر و ئەو سەر و ، داوای زۆران بازیی ئەکرد ..

لە ناو ریزی موسڵمانەکاندا حوبابی کوڕی مونذیری ئەنصاریی دەرپەڕی و ، بۆ ماوەی سەعاتێك خەریکی ئەمسەر و ئەوسەر بوون و ، سەرەنجام حوباب هەڵمەتی بردە سەر جوولەکەکە و ، دای لە دەستی راستی و پەڕاندی . جوولەکە بەرەو قەلاّ هەلاّت و ویستی بە دەستێکەوە خۆی دەرباز بکات .. کەچیی موسڵمانە پالەوانەکە نیشتە سەری و ، بەر لەوەی بگاتە دەرگای قەلاّ قاچێکیشی پەڕاند و ، یەکجاریی کرد .. پاشان حوباب گەڕایەوە ناو سوپای ئیسلام .

دوای کوژرانی ( عزول ) سوارچاکێکی تری جوولەکە لە قەلاّ دەرپەڕیی کە مێژوونووسان ناویان نەداوە و ، بە دەنگی بەرز نرکاندییە موسڵمانان تا بێنە مەیدانی .

لەناو ریزی موسڵمانەکاندا پیاوێك بۆی هاتە دەرەوە ، کەچیی جوولەکەکە خێرا موسڵمانەکەی کوشت .

جوولەکە کەوتە کەش و فش و ، بە ئەسپەکەیەوە ئەمسەر و ئەوسەری ئەکرد و، داوای ئەکرد با بێنە شمشێربازیی . ئەوەبوو سوارچاکی ئەنصاریی بەناوبانگ ئەبودوجانە ، سەماکی کوڕی خەرراش هاتە مەیدانی . ئەبودوجانە بەسەر کلاّوە ئاسنەکەیدا ، بە دەستەسرێکی سوور سەری بەستبوو و ، بە فیز و دەمارێکەوە بەرێوە ئەچوو . دوای بگرە و بەردە ، ئەبودوجانە هەڵمەتی دایە و هەردوو قاچی

پەڕاند و ، پاشان هەڵمەتی دایە سەری و قـەڵغان و شمشێرەکەی دەسـت خـۆی خست و ، هێنایەوە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و ، ئەویش پێشکەشی خۆی کرد .

ئیتر جوولەکە لە پاڵەوانبازیی دەست کۆتا بوون و کەسیان نەهاتـە مەیدانـەوە . موسڵمانەکان بە وتنی ( ألله أكبر ) دەنگیان بەرز کردەوە و ، هەڵمـەتیان بـردە سـەر قەڵاکە و ، چوونە ناویەوە و ، ئەبودوجانەش لە پێشیانەوە بوو . ئەبینن ئـەو قەڵایـە کەل و پەل و خـۆراکێکی زۆری تێدایـە . جـەنگاوەرە جوولەکـەکان هـەر هـەموویان هەڵاتن و بە پەلە خۆیان گەیاندە قـەڵای ( نـزار ) ، بـەڵام دیـارە دوای بەرگرییـەکی سەخت [١٠٤]

**سیانزەهەم : فەتحی قەڵای نزار**

قەڵای نزار پێنجەم قەڵای جوولەکە بوو کە موسڵمانەکان هێرشیان کـردە سـەری ، کە بە راستیی جوولەکەی تێدا کۆبوونەوە و بەرگرییەکی بەهێزیان تیا کـرد ، چـونکە ئەمە دوا هیوای جوولەکەی خەیبەر بوو ، لەبەر ئەوەی زۆر مەحکەم و سەخت بـوو . بۆیە بە تەما نەبوون بە هیچ شێوەیەك ئەم قەڵایە خۆی بە دەستەوە بدات .

لە چوار قەڵاکەی پێشەوەدا ، جوولەکە نەیانئەهێشت ژن و منداڵان تیایا بمێننەوە، بۆ ئەوەی پیاوەکان ماوەیان هەبێ بجەنگێن و ، بەوانەوە نەپەشۆکێن و ، کاتێکیش کە قەڵاکان گیران ژن و منداڵیان نەکەونە دەست موسڵمانەکان .

بەڵام جوولەکە متمانەیان بە سەختیی و مەحکەمیی قەڵای نـزار زۆر بـوو ، بۆیـە هەموو ژن و منداڵانیان لەوێ جەم کرد ، کە دوو هەزارێك ئەبوون و ، لە هەمان کات دا قەڵایان لە جوولەکەی جەنگاوەر پڕ کرد و ، کردیانە سەنگەرێکی وەها سەخت کـە هیچ هێزێك نەتوانێ فەتحی بکات . چونکە دوا هیوای جوولەکە ئـەم قەڵایـە بـوو و ، ئەیانزانیی کە ئەم قەڵایە بگیرێ ئیتر هەموو خەیبەر گیراوە و، بە تەواویی تیا ئەچن.

کە قەڵای ئوبەی فەتح کـرا و جوولەکـە بـەرەو نـزار رایـان کـرد ، موسـڵمانـەکان کەوتنە شوێنیان بەو هیوایەی کە تەسلیم بن .

بەڵام جوولەکە بەرگرییەکی سەروماڵییان لە قەڵاکە ئەکرد ، هەر چەندە لـە قـەڵا نەهاتنە دەرەوە بۆ زۆران بازیی ، یان بۆ جەنگی دەستەو یەخە ، وەك چـوار قەڵاکـەی تر . ئەوەبوو قوللەکانی ئەم قەڵایەیان مەحکەم کردن و ، بە جـەنگاوەری ئـازا ، بـە

---

[١٠٤] غزوة خيبر لباشميل ، ٢١٢ ـ ٢٢٢ .

تایبەت تیرهاوێژی لێهاتوو ، پڕ کرد و ، وەك لێزمەی باران تیریان ئەگرتە موسڵمانەکان و ، بە بەردیش قەدەغەی نزیککەتنەوەی موسڵمانەکانیان ئەکرد لە قوللەکان .

موسڵمانەکانیش بە تیر ئەوانیان دائەگرتەوە ، بەڵام تیری جوولەکە ، چونکە لە بەرزایی قەڵاکەوە ئەیان هاویشت ، زۆرتر کاریگەر بوون . پێغەمبەری خواش ﷺ تیری ئەگرتە جوولەکە و ، جوولەکەش بە تایبەت شوێنەکەی ئەویان دائەگرتەوە ، تا ئەوەبوو تیرێکی جوولەکەی بەرکەوت و زامدار بوو و ، هەندێ تیریش بەر جل و بەرگی کەوتن و دڕاندیان .

لەوە ئەچێ جەنگاوەرانی نزار ماوەیەکی زیاتر دانیان بە خۆیاندا گرتبێ و ، هەر هێرشێك لەلایەن موسڵمانەکانەوە کرابێتە سەریان ، پەرچیان دابێتەوە ، چونکە قەڵاکە سەخت و مەحکەم بوو . ئەمەش بووە هۆی بێزاریی موسڵمانەکان و کەوتنە تەگبیری ئەوە کە مەنجەنیق بەکار بهێنن بۆ وێرانکردنی بورج و قەڵاکان . ئەوەبوو موسڵمانەکان لە قەڵای دووهەمدا مەنجەنیقیان دەست کەوت . بەڵام جوولەکە جەنگێکی ناهەمواریان کرد ، سەرەنجام تێك شکان و هەڵاتن و ، دوو هەزار ژن و منداڵیان بەجێ هێشت و ، بوونە دیلی دەستی موسڵمانەکان .

موحەممەدی کوڕی مەسلەمە ئەی وت : پێغەمبەری خوا ﷺ سەیری قەڵای نزاری کرد و فەرمووی : (( هذا آخر حصون خيبر كان فيه قتال )) . فەرمووی : ئەمە دوا قەڵای خەیبەرە کە جەنگی تێدا روو دابێت .[١٠٥]

**چواردەهەم : مارەکردنی صەفیەی دایکی ئیمانداران**

صەفیەی کچی حویەیی کوڕی ئەخطەب بووە کە زنجیرەی پشتیان ئەگەڕێتەوە سەر هاروون پێغەمبەری برای مووسا پێغەمبەر سەلامیان لێ بێ ، هەروەها ئەچنەوە سەر لاویی کوڕی یەعقووب . کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ تاوانباریی جوولەکەی نەوەی نەضیری بۆ دەرکەوت و ، فەرمانی دا مەدینە بەجێ بهێڵن ، زۆربەیان روویان لە خەیبەر نا، کە لەوانە حویەیی سەرداری نەوەی نەضیر لەگەڵ نەوەی ئەبولحوقەیق . ئەو کاتە هێشتا صەفیە باڵغ نەبوو بوو . کە گەورە بوو سەللامی کوڕی میکشەم خواستی ، بەڵام بەر لەوەی بیگوازێتەوە تەڵاقی دا ، پاشان کینانەی کوڕی رەبیعی کوڕی ئەبولحوقەیق ، کە سەرداری خەیبەر بوو مارەی کرد .

---

[١٠٥] غزوة خيبر لباشميل : ٢٢٢ ـ ٢٣١ .

مێژوونووسان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە صەفیەش بە دیلیی کەوتۆتە دەست موسڵمانەکان ، بەڵام بۆ چۆنیەتیی بە دیل‌گیرانی جیاوازی‌یان هەیە .

ئیبن هیشام وەهای باس کردووە کە صەفیە لە قەلای ( قموص ) دا بە دیل گیراوە، کە قەلای مێردەکەی بووە ، لە بەشی دووهەمی خەیبەر .

بەلام واقیدیی وەهای باس کردووە کە لە قەلای نزاردا بە دیل گیراوە ، هەرچەندە مێردەکەی لەوێ نەبووە . واقیدیی ئەڵێت : عەبدورڕەحمانی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر بۆی باس کردم کە لە جەعفەری کوڕی مەحموودی پرسیوە : صەفیە چۆن گەیشتە قەلای نزار لە ( شق ) و ، قەلای ئالی ئەبولحوقەیقیش وا لە ( سولالیم ) ، واتە لە بەشی دووهەمی خەیبەردا و ، نە لە قەلاکانی ( نطاة ) و نە لە ( شق ) دا ، جگە لە قەلای نزار ، هیچ ژن و منداڵێك بە دیل نەگیراون ؟

وتی : جوولەکەی خەیبەر ژن و منداڵیان ناردن بۆ کەتیبە و ، قەلای ( نطاة ) یان چۆڵ کرد بۆ جەنگاوەران ، بەمە هیچ کەسیان لێ بە دیل نەگیرا جگە لەوانەی کە لە قەلای نزاردا بوون ، صەفیە و کچە ئامۆزایەکی و چەند ژنێك لەگەڵیا . ئەوەبوو کینانەی کوڕی ئەبولحوقەیق وای ئەبینیی کە قەلای نزار مەحکەم‌ترین قەلایە ، بۆیە ئەو شەوەی کە بۆ بەیانی‌یەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ رووی بەرەو ( شق ) وەرگێڕا ، کینانە صەفیەی هێنایە ئەو قەلایە ، هەتا ئەوەبوو خۆی و کچە مامەکەی و ئەو منداڵە جوولەکانەی کە لەگەڵیا بوون بە دیل گیران .

لە شوێنێکی تردا واقیدیی لە صەفیەی دایکی ئیمان‌داران خۆیەوە ریوایەت ئەکات کە وتوویە : جوولەکە منداڵەکانیان لە کەتیبە دانان و ، قەلای ( نطاة ) یان بۆ جەنگاوەران چۆڵ کرد . کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزی‌یە خەیبەر و قەلاکانی نطاة ی فەتح کردن و ، کینانە هاتە لام و وتی : موحەممەد لە قەلاکانی نطاة بوویەوە و ، لێرەش کەسێك نیە جەنگ بکات و ، کە ئەهلی نطاة کوژران ئیتر هەموو جوولەکە کوژران و ، عەرەبیش درۆیان لەگەڵمان کرد ( مەبەستی لە غەطەفانە کە بەڵێنی کۆمەکی‌یان بە خەیبەر دا و نەگەیشتنە فریاشیان ) . ئیتر منی هێنایە قەلای نزار لە ( الشق ) و وتیشی لە هەموو قەلاکانمان سەخت‌ترە . ئەوەبوو من و کچە ئامۆزایەکم و چەند ژنێکی تر لەگەڵمانا بوون هێنانی بۆ ئەوێ . ئیتر من لە نزاردا بە دیل گیرام ، بەر لەوەی پێغەمبەر ﷺ روو بکاتە کەتیبە .

لە صەحیحی بوخارییدا هاتووە صەفیە ئەبێتە بەشی یەکێ لە هاوەڵان بە ناوی دیحیەی کەلبیی ، لەو کاتەدا پیاوێك دیتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و ئەڵێت : ئەی پێغەمبەری خوا ! صەفیەی کچی حویەییت داو، بە دیحیە کە خانمی قەومەکەیەتی و ، تەنها بۆ تۆ چاکە . واتە پلەی کۆمەڵایەتیی ئەو ئافرەتە بەرزە و ، ئەو کچی پادشا و هاوسەری پادشا بووە ، مافی خۆیەتی ڕێزی لێ بگیرێ و، دڵی بدرێتەوە . پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی ئەو پیاوەی بە چاك زانیی ، بۆیە فەرمانی بە دیحیە دا تا لە بریی صەفیە ئافرەتێکی تر هەڵ بگرێ . ئەمەش تا ڕێزێکی تایبەتیی لە ئافرەتێکی نازدار پەروەردەی لێقەوماو بگرێ ، هەرچەندە باوکی دوژمنێکی سەرسەختی پێغەمبەری خوا و ئیسلام بوو . بەڵام ڕەوشتی ئیسلامیی دوورە لە تۆڵەسەندن و ڕقەبەرایەتیی . پێغەمبەری خوا ﷺ وەك دەستوورێك بۆ موسڵمانان نەخشە بکێشێ ، ئەیفەرموو : (( أكرموا عزيز قوم ذلّ )) . ئەیفەرموو : ئەوەی کە دەسەلاتداری کۆمەڵێك بوو و ، زەلیلیی و بێدەستیی هات بەسەریدا ، ئێوە ڕێزی لێ بگرن .

پێش هەموو شتێك ئازادی کرد تا لە داوی کۆیلەیەتیی ڕزگاری ببێ ، پاشان دوو ڕێگای بۆ دانا تا بە دڵی خۆی یەکێکیان هەڵ ببژێرێ :

یەکەم : بە سەری بەرز و بەوپەڕی ئازادییەوە بگەڕێتەو، ناو خزمە جوولەکەکانی و سەربەست بێت .

دووهەم : موسڵمان ببێ و بە ویستی خۆی ببێتە هاوسەری پێغەمبەری خوا ﷺ.. ئەو کاتە ببێتە هاوشانی عائیشەی کچی ئەبوبەکر و حەفصەی کچی عومەر کە کچی جووتە وەزیرەکەی بوون .

صەفیە چونکە خوا پێداو بوو ، خۆشویستنی ئیسلام چووە دڵیەوە .. هەستی کرد ئەم ڕەوشتە بەرزە و ، ئەم موعامەلە مرۆڤانەیە کاری پێغەمبەرانە .. ئەویش بە فیطرەتە پاکەکەی کە لە زنجیرەی پێغەمبەرانەو، بۆی هاتبۆوە ، هەستی بە نوور و ڕۆشنایی ئەکرد ، بۆیە هاتە سەر ئەو بڕیارە کە واز لە جوولەکایەتیی بهێنێ .. تۆ بڵێ واز لە ناز و نیعمەتی دنیا بهێنێ و ، ئیسلام و پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵ ببژێرێ، هەرچەندە برسێتیی و دەستکورتیی وا بە دواوە ، بەڵام ڕەزامەندیی خوای دەستگیر ئەبێ .

صەفیە ئەڵێت : پێغەمبەری خوا ﷺ ناردمی بۆ لای کەل و پەلەکەی . پاشان لای ئێوارەو، هاتەو، لامان و بانگی کردم . منیش هاتم دەم و چاوم بە پەچە داپۆشیی بوو

و شەرمم ئەکرد و ، لەبەر دەستی‌دا دانیشتم . فەرمووی : (( إن أقمت علی دینك لم أكرهك ، وإن اخترت الله ورسوله فهو خير لـك )) . فەرمووی : ئەگەر لەسەر دینەکەی خۆت بمێنیتەوە ناچاری موسڵمانبوونـت ناکـەم . ئەگـەر خـوا و پێغەمبـەریش هـەڵ ببژێری ئەوا چاکترە بۆت . ئەڵێت : منیش خوا و پێغەمبەر و ئیسلامم هەڵ بژاردن . ئیتر پێغەمبەری خوا ﷺ ئازادی کردم و مارەشی کردم .

هەروەها لە صەفیەوە خوا لێی رازیی بێ ئەگێڕنەوە کە وتوویە : کە گەیشتمە لای پێغەمبەری خوا ﷺ کەسێکی تر نەبوو وەك ئەو رقم لێی بێت .. باوکم و مێردەکەم و کەس و کارەکەمی کوشتن . فەرمووی : (( يا صفية ! أما إني أعتذر إليك مما صنعت بقومك . إن قومك صنعوا كذا و كذا )) . فەرمووی : صەفیە ! من دەربارەی ئـەوەی کە بە کەس وکارەکەت کردم عوزرت بۆ دێنمەوە .. کەس و کارەکەت وەها و وەهایان کرد .. ( دەستی کرد بە هەڵدانی ئەو هۆیانەی کە ناچار بوو وەهایان پێ بکات ) .

صەفیە ئەڵێت : هەروا خەریك بوو عوزری بۆ ئەهێنامەوە هەتا ئـەوەی لـە دڵـمدا بوو رۆیشت .. ئەوەبوو لەو شوێنەی خۆمدا هەڵ نەسام هەتا هـیچ کەسـێ نـەبوو لـە پێغەمبەری خوا ﷺ بەلامەوە خۆشەویستتر بێ .

پاشان وتی : هەرگیز کەسم نەدیوە رەوشتی لە رەوشتی پێغەمبەری خوا ﷺ جوانتر بێ.

صەفیە لە کاتی کۆچ‌کردنیش‌دا دیتی وا باوکی و مامەی چەندە خەمبارن ، بەوەی کە پێغەمبەرایەتیی لە دەستی جوولەکە دەرچووە و ، چۆن دانیشیان بەوەدا ئـەنا کـە پێغەمبەری خوایە ، کەچیی بڕیاری دژایەتیی‌یان دا هەتا مردن .

ئیبن سەعد ئەوەی باس کردووە کـە واقیـدیی وتوویـە : بـەر لـەوەی پێغەمبـەری خوا ﷺ خەیبەر بەجێ بهێڵێ صەفیە پاك بوویەوە و ، ئـەویش لـە پاشـکۆی خـۆیدا سواری کرد . کاتێك گەیشتنە مەنزڵێك کە شەش میـل لـە خەیبـەرەوە دوور بێـت ، ویستی بی‌کاتە بووك کەچیی صەفیە رازیی نەبوو ، پێغەمبەریش ﷺ پێی گران بوو . کە گەیشتنە ( صهباء ) لەوێ دای‌بەزاند و ، ئوم سولەیم رێـك و پێکـی کـرد و بـۆن خۆشی کرد و پێغەمبەر ﷺ گواستیەوە . جا لێی پرسیی : (( ما حملك على الامتناع من النزول أولا ؟ )) . پرسیی : بۆچ یەکەم جار نارەزاییت دەربڕیـی ؟ وتـی : لـە تـۆ ئەترسام چونکە جوولەکە نزیك بوون . بەم وەڵامەی لە دڵیا زۆر گەورە بوو . سـێ رۆژ لە ( صهباء ) مایەوە و ، دەعوەتی بۆ کرد و ، موسڵمانەکانی بۆ بانگ کرد ، بـەڵام

دەعوەتەکە گۆشتی تیا نەبوو ، بەڵکو خورما و ( أقط ) و چەوریی بوو . موسڵمانەکان وتیان : ئەمە یان یەکێکە لە دایکانی ئیمانداران یان کەنیزەکیەتی . کە کەوتە رێ لە دوای خۆیەوە شتی بۆ راخست و پەردەی بەسەردا کێشا . ئیتر بە لای موسڵمانەکانەوە یەقین بوو کە یەکێکە لە دایکانی ئیمانداران ..

ئەوەندە رێزی لەم ئافرەتە لێقەوماوە ئەگرت لەلای وشترەکەیدا دائەنیشت و ئەژنۆی بۆی دائەنا تا صەفیە قاچ بخاتە سەر ئەژنۆی و سواری وشترەکە ببێ . صەفیەش ئەوەندە خاوەنی ئەدەب بوو پێی نەئەخستە سەر ئەژنۆی بەڵکو ئەژنۆی ئەخستە سەر ئەژنۆی و سوار ئەبوو .

صەفیە غەریب و بێکەس بوو . نە عەرەب بوو نە قورەیشیی .. بۆیە هەندێ لە هاوسەرانی پێغەمبەری خوا ئەیانویست نازی بەسەردا بکەن و ، دای بەزێنن . کەچیی خاوەن عەدالەتی بە ئینصاف و ، هەمیشە کۆمەکی لاواز و بێدەستان لەسەری ئەکردەوە و دڵی ئەدایەوە و ، فێریشی ئەکرد چۆن وەڵامیان بداتەوە .

جارێکیان کەوتە گوێی پێغەمبەری خوا ﷺ کە عائیشە و حەفصە وەهایان دەربڕیوە کە لەو چاکتر بن . ئەویش پێی فەرموو : (( ألا قلت : وكيف تكونان خيراً مني وزوجي محمد ، وأبي هارون وعمي موسى ؟ )) . ( رواه الترمذي ) پێی فەرموو : ئەی بۆچ نەت وت : ئێوە چۆن لە من چاکتر ئەبن ، کە من موحەممەد مێردمە و هاروون پێغەمبەر و مووسا پێغەمبەر باوك و مامەمن ؟

جارێکیشیان زەینەبی کچی جەحش قسەی بە صەفیە وتبوو و ، بە جوولەکە ناوی بردبوو . لەسەر ئەمە پێغەمبەری خوا ﷺ ماوەیەك دەنگی لە زەینەب دابڕیی . ( رواه ابن سعد ) .

صەفیە خاوەنی ئیمانێکی یەکجار دامەزراو بوو .. خاوەنی عەقل و سەلیقە و دڵ و دەروونێکی پاك بوو .. یەکجار پێغەمبەری خوای ﷺ خۆش ئەویست . ئەوەبوو لە دوا نەخۆشیی پێغەمبەردا هەموو هاوسەرانی لە دەوری جەم بوو بوون ، صەفیەش وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئاواتەخوازم ئەو نەخۆشیەی کە وا بە تۆوە بە منەوە بوایە . ژنەکانی تر بە چاو جوولاندن گاڵتەیان پێ ئەکرد . خێرا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( مضمضن )) . فەرمووی : ئاو لە دەمتان را بدەن . وتیان: لەبەر چیی؟ فەرمووی : (( من تغامزكن بها، والله إنها لصادقة )) . فەرمووی : لەو گاڵتەکردنەتان پێی . بەخوا ئەو راستگۆیە .

ئەم ڕەوشتە جوانەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەناو هاوەڵاندا ڕەنگی دایەوە ، بگرە بووە ڕەوشتێکی ڕەسەنی ئیسلامەتیی ، ڕێزگرتن لەوانەی کە دوای پایە و دەسەڵات بێناز کەوتوون ، بە تایبەت چینی ئافرەت هەستێکی بەرزی موسوڵمانانە و ، بە درێژایی مێژوو لەگەڵ ئەو ڕەوشتە بەرزەدا دەست لە ملی یەك بوون .

جوانترین نموونە بۆ دەرخستنی ئەم ڕەوشتە بەرزەی موسوڵمانان ، کە هیچ کۆمەڵ و دینێکی تر بایەخی پێ نادا ، ئەو هەڵوێستە جوانە بوو کە خەلیفە عومەر و عەلیی کوڕی ئەبوطالیبی وەزیری گرتیانە بەر .

مێژوونووسان ئەگێڕنەوە کە لە کاتی فەتحی وڵاتی فارس‌دا کۆمەڵێك ئافرەت بە دیلیی ئەکەونە دەست سوپای ئیسلام و ئەیانهێننەوە بۆ مەدینە ، کە سێ کچی پادشای ئێران ( یەزدیگورد ) یان لەناودا بوون . خەلیفە عومەر فەرمانی دا کەنیزەکەکانی تر بفرۆشرێن . . بەڵام ئیمام عەلیی ئاماژەیەکی بە خەلیفە دا کە ئەو کچانە پێویستە بە چاوێکی تر سەیر بکرێن و ، لەبەر ئەوەی کە لە بنەماڵەی شاهانەن ڕێزیان لێ بگیرێ .

فاروق ئەمەی پێ خۆش بوو ، بۆیە عەلیی کردە سەر پشك تا چیی ئەکات با بیکات . ئەویش هەرسێکی کڕین و ئازادی کردن .. کە بوونە سێ کچی ئازاد ئەوسا بە پێی شان هەڵگرتن سێ پیاوی بۆ هەڵ بژاردن کە خاوەنی پایە و پلە بن لەناو موسوڵماناندا .. ئەوەبوو یەکێکیانی لە حوسەینی کوڕی و ، دووهەمیانی لە موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر و ، سێ‌هەمیانیشی لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر مارە کردن . تا دڵیان بداتەوە .. کچەکانیش بەم پایەپێدانە یەکجار دڵخۆش بوون و ، هەموو ئێش و ئازارێکیان لە یاد چوو .

ئەوەبوو خوای گەورە لە کچەکەی کیسرا کوڕێکی بە ئیمام حوسەین بەخشیی و ناوی نا عەلیی و دوایی بووە ئیمام ( زین العابدین ) . ئیتر هەرچیی نەوەی بەڕێز لە دوای عەلیی کوڕی حوسەین کەوتوونەتەوە ، هەر هەموویان لە نەوەی ئەو ئافرەتە بەڕێزەن .

جارێکیان وت و وێژێك لە نێوان هیشامی کوڕی عەبدولمەلیك و ئیمام زەیدی کوڕی ئیمام زین العابدینی کوڕی ئیمام حوسەین‌دا ڕووی دا ، لەسەر ئەوەی کە ئیمام زەید داوای خەلافەتی ئەکرد ..

هیشام پێی وت : تۆ کە کوڕی کەنیزەکێکی چۆن بە تەمایت خەلافەت وەربگریت؟ زەیدیش وەڵامی دایەوە : کوڕی کەنیزەك لە پلەی خەلافەت زیاتری وەرگرتووە کە پلەی پێغەمبەرایەتی‌یە . ئەوەش ئیسماعیل پێغەمبەر سەلامی لێ بێ بە دەستی هێنا کە کوڕی کەنیزەك بوو .. ئیتر هیشام بەزێنرا و ورتەی لێوە نەهات .

خاتوصەفیە چەندین فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ ریوایەت کردوون ، هەروەها ئافرەتێکی یەکجار ژیر و لەسەرخۆ و راستگۆ بووە . ئەگێڕنەوە کە کەنیزەکێکی صەفیە دێتە لای خەلیفە عومەر خوا لێی رازیی بێ و ، ئەڵێت : صەفیە شەممەی خۆش ئەوێت و ، سیلەی رەحم لەگەڵ جوولەکەدا بەجێ دێنێ . ئەویش ناردی بە دوای‌دا و لەو بارەوە پرسیاری لێ کرد . وتی : سەبارەت بە شەممە ، لەو رۆژەوە کە خوا بۆمی گۆڕیوە بە جومعە ئیتر خۆشم نەویستووە .. بەڵام بۆ جوولەکە ، لە ناویان‌دا کەس و کارم هەن و منیش سیلەی رەحمیان لەگەڵ بەجێ ئەهێنم . عومەر ئەمەی لێ وەرگرت . پاشان صەفیە بە کەنیزەکەکەی وت : چیی پاڵی پێوە نای ئەم کارە بکەی ؟ وتی : شەیتان . ئەویش وتی : دە برۆ ئازاد بە .

لەم باسەی پێشەوەدا دەرکەوت کە مارەکردنی صەفیە لەبەر ئارەزووی دنیایی نەبووە ، ئەگینا لە ناو ئەو دیلانەدا ئافرەتی جوانتر هەبووە ، بەڵکو لەبەر چەند حیکمەتێك مارەی کرد کە ئەمە هەندێکیانن :

**یەکەم** : بۆ رێزلێنانی ، کە کچی پادشا و هاوسەری پادشا بووە و ، ئەوپەڕی سەربەستیی پێ دا تا یەکێ لە دوو رێ هەڵ بژێرێ : یان لەسەر دینی خۆی بمێنێتەوە و بگەڕێتەوە ناو کەس‌وکاری ، یان موسڵمان ببێ و ببێتە هاوسەری پێغەمبەری خوا ﷺ ببێتە هاوشانی عائیشە و حەفصە ..

**دووهەم** : بۆ دڵدانەوەی ، چونکە زووتر باوکی کوژرا بوو و ، لە جەنگی خەیبەریش‌دا مێردەکەی و زۆرێك لە خزمانی کوژرابوون .

**سێهەم** : ئەم ئافرەتە لە نەوەی پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل بوو ، بۆیە شایانی ئەوەبوو شوو بە پێغەمبەری خوا ﷺ بکات . دوایش بە رەوشتی بەرزی و خواپەرستیی رێك و پێکی ئەوەی سەلماند .

کاتێکیش کە سەرنجی دا دەم و چاوی پەڵەیەکی مۆری پێوەیە پرسیی ئەمە چی‌یە؟ وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! بەر لەوەی ببێتە سەرمان لە خەوم‌دا مانگم بینیی کە لە شوێنی خۆی جوولا و ، کەوتە کۆشی منەوە . دە بەخوا هیچ باسێکی تۆم لە یاد

نەبوو . کە گێڕامەوە بۆ مێردەکەم زللەیەکی لە دەم و چاوم دا و وتی : ئاوات ئەخوازیی ئەو پادشایەی مەدینە ببێتە مێردت ؟

کاتێك کە صەفیە کرایە بووك و برایە چادرێکی پێغەمبەرەوە ، ئەو شەوە هاوەڵی پایەدار ئەبوئەییووبی ئەنصاریی ، بەبێ ئاگاداریی پێغەمبەری خوا ﷺ ، خۆی کردە پاسەوانی و بە دەوری چادرەکەدا ئەسووڕایەوە . کە ڕۆژ بوویەوە و ، پێغەمبەری خوا ﷺ شوێنەکەی ئەبوئەییووبی بینیی ، پرسیی : (( مالك یا أبا أیوب ؟ )) . فەرمووی : ئەبوئەییووب ! ئەوە چیتە ؟ وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! لە تۆ ترسام لە دەست ئەم ئافرەتە ، کە باوك و مێرد و کەس‌وکارەکەی کوژراون و، ماوەیەکی کەمە وازی لە کوفر هێناوە . بەم کارە پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر دڵ خۆش بوو ، چونکە ئەوپەڕی خۆشەویستیی و ئیمان‌داریی ئەسەلماند بۆیە دوعای بۆ کرد تا خوا بیپارێزێ کە فەرمووی : (( أللهم احفظ أبا أیوب کما بات یحرسني )) .

ئەوەبوو ئەبوئەییووب لە نزیك ئەستەمبووڵ کۆچی دوایی کرد و لە خاکێکدا نێژرا کە بۆ ماوەیەکی زۆر بە دەستی ڕۆمەکانەوە بوو و ، ئەوپەڕی ڕێزیان لە خۆی و لە قەبرەکەی ئەگرت .

صەفیە خوا لێی ڕازیی بێ لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی پەنجای کۆچییدا و لە سەردەمی خەلیفە موعاویەدا خوا لێی ڕازیی بێ کۆچی دوایی کردووە .[١٠٦]

**پانزەهەم : هێرش بۆ سەر بەشی دووهەمی خەیبەر**

دوای فەتح‌کردنی هەر پێنج قەڵاکەی بەشی یەکەمی خەیبەر ، جوولەکە هەڵاتن بۆ بەشی دووهەم .. ئەوەی ڕاستیی بێ جوولەکە جەنگێکی سەروماڵیی یەکجار ئازایانەیان کرد .. ئەوەبوو دەرگای قەڵاکانیان ئەخستە سەر پشت و داوای پاڵەوانی موسڵمانیان ئەکرد بۆ شەڕە شمشێر ، بگرە جاری وا ئەبوو ئەهاتنە دەرەوە و هێرشی موسڵمانەکانیان پەرچ ئەدایەوە و ، موسڵمانەکانیان تا بنکەی سەرکردایەتیی ڕاو ئەنا.. بەمە دەرئەکەوێ کە ، لە ئازایەتییدا ، جوولەکەی خەیبەر جیاوازییان زۆر بووە لەگەڵ جوولەکەی مەدینەدا کە بە هیچ شێوەیەك نەیان‌توانیی بەرگریی چەکدارانە لە خۆیان بکەن . بۆ ئەمە هەندێ لە مێژوونووسان ، کە یەکێ لەوانە ئیبن

---

[١٠٦] غزوة خیبر لباشمیل : ٢٣١ ـ ٢٤٠ ، الرحیق : ٣٨٦ ، السیرة النبویة لأبي شهبة : ٢ / ٣٨٣ ـ ٣٨٥ .

هیشامه ، باسی ئەوەیان کردووە کە جوولەکەی خەیبەر لە بنەڕەتدا عەرەبن و ، یەهوودییەتیان بە دین وەرگرتووە و ، ئەگەڕێنەوە سەر هۆزی حیمیەری یەمەنیی .

بەڵێ جوولەکە تێك شکاوەکانی بەشی یەکەم خۆیان گەیاندە بەشی دووهەم کە سێ قەڵایان مەحکەم بوون ، کە بریتیی بوون لە قەمووص و وەطیح و سەلالیم .

قەمووص قەڵای نەوەی ئەبولحوقەیق بوو ، کە بنەماڵەی حویەیی کوڕی ئەخطەبن و، لە جوولەکەی نەوەی نەضیرن کە لە مەدینە دەرکران و لە خەیبەر نیشتەجێ بوون .

لە راستییدا بەشی دووهەمی خەیبەریش بە جەنگ و تێكشکاندن فەتح کراوە ، جگە لە دوو قەڵایان ، وەطیح و سولالیم ، دوای ئابلووقەیەکی زۆر و هەڕەشەکردن ، کە ئەگەر خۆیان بە دەستەوە نەدەن بە مەنجەنیق لێیان ئەدرێت ، خۆیان بە دەستەوە دا ، بەو مەرجەی خۆیان سەلامەت بن و ، ژن و منداڵیشیان نەکرێنە کۆیلە .

مێژوونووسان باسی ئەوەیان کردووە کە جوولەکەی بەشی دووهەمی خەیبەر چوونەتە ناو قەڵاکانیانەوە و ، خۆیان مەحکەم کردوو، و ، بە رادەیەکی وەها بەرگرییان کردووە کە موسڵمانەکان نەیانتوانیی بچنە ناو قەڵاکانەو، ، ئەگەرچیی زیاتر لە نیوەی مانگێك ئابلووقەی توندیان دابوون ، تا ئەوەبوو ناچار بوون بە دامەزراندنی مەنجەنیق ترساندیانن و ، ئەوانیش لە ترساندا خۆیان بە دەستەو، دا .

دوای خۆ بە دەستەوەدان پێغەمبەری خوا ﷺ زەویی و زاری بەشی یەکەمی بەسەر جەنگاوەراندا دابەش کرد و هی بەشی دووهەمیشی بۆ بەرژەوەندیی موسڵمانان هێشتەوە . چونکە بەشی یەکەم چوار ئەوەندەی بەشی دووهەم ئەبوو و ، هەر هەمووی بەسەر بەشداربووانی پەیمانی حودەیبیەدا دابەش کرد و ، بەشی دووهەمیش وەك پێنج یەك حیساب کرا . بەمە کوتەیبە کرایە پێنج یەکی پێغەمبەری خوا ﷺ .

لە کاتی فەتحی خەیبەردا پێغەمبەری نازدار ﷺ دەرسێکی گرنگی موسڵمانانی دادا .. تا هەموو سەربازێکی موسڵمان لە کاتی جیهاددا دەستی پێوە بگرێ و ، بە هەموو جیهانی بسەلمێنێ کە سوپای ئیسلام سوپای پاك و بێگەردییە و ، مەبەستی دروست بوونیشی پەخشان کردنی رەوشت بەرزییە لەسەر زەوییدا ..

ئەوەبوو فەرمانی دابوو کە هیچ سەربازێك دەست بۆ بچووکترین دەست کەوتی جەنگ نەبات هەتا دابەش نەکرێت .. ئەم فەرمانە تەنها لە ناو موسڵماناندا ، کە تاقە ئوممەتی راستیین لەسەر زەوییدا، جێ بەجێ ئەکرێت .. جارچیی پێغەمبەری خوا

ﷺ جاڕی دا کە ( غلوول ) ، واتە ئەو شمەکەی لە دەستکەوتی جەنگدا ببرێت پێش دابەشکردنی ، شوورەیی و ئابڕووچوونی قیامەتە ، دەرزی و دەزوویەکیش بگێڕنەوە .

واقیدیی ئەڵێت : لەو رۆژەدا فەروەی کوڕی عەمر ، کە فرۆشتنی دەست کەوتەکانی پێ سپێررابوو ، کەل و پەلەکەی فرۆشت و ، دەستەسرێکی هەڵ گرت و لەسەری خۆی بەست تا لەبەر خۆردا سێبەری بۆ بکات . پاشان گەڕایەوە شوێنەکەی خۆی و هەر بە سەریەوە بوو . کە هاتەوە یادی هاتە دەرەوە و فڕێی دا و ، هەواڵیشی بە پێغەمبەری خوا ﷺ دا . ئەویش فەرمووی : دەستەسرێکی ئاگر بووە بەستووتە لە سەرت . لەو رۆژەدا داوای کرد تا پێغەمبەری خوا ﷺ لە دەستکەوتەکان شتێکی بداتێ ئەویش فەرمووی : (( لا يحل لي من الفيء خيط ولا مخيط ، ولا آخذ ولا أعطي )) . فەرمووی : دەزوویەك و دەرزییەك دەستکەوتم بۆ حەڵاڵ نیە .. نە ئەتوانم بۆ خۆم وەریگرم نە بە خەڵکیش بدەم .

پیاوێکیش داوای رەشوویەکی لێ کرد ، ئەویش فەرمووی : (( حتى تقسم الغنائم ثم أعطيك عقالاً وإن شئت مراراً )) . فەرمووی : مەگەر دەست کەوتەکان دابەش بکرێن ، پاشان رەشوویەك و گەر بشتەوێ چەند گوریسێکت پێ ئەدەم .

ئەوانەی کە ئیسلام ئەکەنە دینی خۆیان ئەبنە سەربازی ئیسلام .. ئەبنە سەربازی ژێر دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ ، لەبەر ئەوە پێویستە هەموو گیانیان هەر ئیخلاص و نییەتی چاك بێت .. جا مێژووی ئیسلام هەر هەمووی بەو پاڵەوانە خۆنەویستانە دروست بووە . با لەم دەرفەتەشدا نموونەیەك بخەینە بەر دیدی ئازیزان :

بەیهەقیی و نەسسائیی ریوایەتیان کردووە کە پیاوێکی ئەعراب دێتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و ئیمان دێنێ و شوێنی ئیسلام ئەکەوێ . ئەڵێت : لەگەڵتدا کۆچ ئەکەم . ئەویش دایە دەست یەکێ لە هاوەڵان . کە غەزای خەیبەر هاتە بەرەوە و پێغەمبەری خوا ﷺ شتێکی دەست کەوت بوو ، دابەشی کرد و ، بەشی کابرای ئەعرابییشی دا و ، بەشەکەی دایە دەست هاوەڵەکانی ، چونکە ئەو خەریکی لەوەڕاندنی وشترەکانیان بوو .

کە ئەعرابیەکە گەڕایەوە بەشەکەیان پێ دا . ئەویش وتی : ئەمە چییە ؟ وتیان : بەشی خۆتە ، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆتی داناوە . بەشەکەی هەڵ گرت و هێنایە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و وتی : ئەمە چییە ئەی پێغەمبەری خوا ؟ فەرمووی : (( قسم قسمته لك )) . بەشی خۆتە بۆم داناوی . وتی : من بۆ ئەمە شوێنی تۆ

نەکەوتووم ، بەڵکو بۆ ئەوە شوێنت کەوتووم کە تیرێك بێت و بدا لێرەم ـ ئاماژەی بۆ قورگی کرد ـ و بمرم و ، بچمەوە بەهەشتەوە .

فەرمووی : (( إن تصدق الله يصدقك )) . فەرمووی : ئەگەر لەگەڵ خوادا راست بکەیت ، خواش راستت بۆ دێنێتە پێش . پاشان هەستان بۆ جەنگی دوژمن . ئەوەندەی پێ نەچوو بە شەهیدیی هێنایانەوە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ.

فەرمووی : ئەمە خۆیەتی ؟ وتیان : بەڵێ .

فەرمووی : (( صدق الله فصدقه )) . فەرمووی : لەگەڵ خوادا راستی کرد و ، خواش راستی بۆ هێنایە پێش .

پێغەمبەری خوا ﷺ بە جبەکەی خۆی کەفەنی بۆ کرد ، پاشان هێنایە بەردەمی و نوێژی لەسەر کرد و، یەکێ لە دوعاکانیشی بۆی ئەمەبوو: (( أَللَّهُمَّ ! هَذَا عَبدُكَ خَرَجَ مُهَاجِراً فِي سَبِيلِكَ قُتِلَ شَهِيداً وَأَنَا عَلَيهِ شَهِيدٌ )) . فەرمووی : خوایە ! ئەمە بەندەی خۆتە و ، لە پێناوی تۆدا کۆچی کردووە ، وا بە شەهیدیی سەری ناوەتەوە و ، منیش لەسەری شاهێدم .

پێغەمبەری خوا ﷺ عادەتی وەهابوو دەست کەوتەکانی جەنگی تەنها بەسەر ئەوانەدا دابەش ئەکرد کە بەشداریی جەنگیان کردبوو ، ئیتر هەر کەس ئامادە نەبوایە بەشی نەبوو . بەڵام ئەوەبوو لە بەدردا هەشت کەسی بەشدار کرد ، وەك لە باسی بەدردا باسیان هاتووە . هەروەها لە خەیبەریشدا چەند پیاوێکی ئامادە نەبووی پەیمانی حودەیبیەی بەشدار کرد ، چونکە بڕیار وابوو تەنها بەشداربووانی حودەیبیە لە دەستکەوتەکانی خەیبەردا بەشیان هەبێ .

ئەوەبوو ئەم پیاوانە : موررییی کوڕی سینان و ، ئەیمەنی کوڕی عوبەید و ، سەبباعی کوڕی عەرفەطەی غیفاریی و ، جابیری کوڕی عەبدوڵڵا دوا کەوتن و ، دوو پیاویش دوای حودەیبیە مردبوون و ، پێغەمبەری خوا ﷺ بەشی بۆ دواکەوتووەکان و، بۆ کەس و کاری مردووەکان دانا و ، چەند نێرراوێکیش وەك مەحیصەی کوڕی مەسعوود و غەیری ئەویش نێرراو بوون بۆ لای دانیشتوانی فەدەك و ، سێ موسڵمانیش کە سوەیدی کوڕی نوعمان و ، عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی کوڕی خەیثەمە و ، پیاوێکی نەوەی خوطامە بوون لەبەر نەخۆشیی بەشداریی جەنگیان نەکرد و بەشیان بۆ دانرا و ، ئەوانەش کە شەهید بوون بەشیان بۆ دیاریی کرا ..

هەروەها دە پیاوی جوولەکەی مەدینە لەگەڵ سوپای ئیسلام‌دا هاتن بۆ جەنگی خەیبەر و پێغەمبەری خوا ﷺ وەك موسڵمانان بەشی بۆ دانان .

شایانی باسە ـ وەك لە پێشەوە باس کرا عویەینەی کوڕی حیصنی فەزاریی ، فەرماندەی غەطەفان بە گوێی حاریثی کوڕی عەوفی موڕڕیی نەکرد و بڕیاری دا بە دژایەتیی موسڵمانان ببێتە کۆمەکی خەیبەر . ئەوەبوو بە چوار هەزار جەنگاوەرەوە بەرەو خەیبەر کەوتە رێ ، دوای ئەوەی کە بەرەو ناوچەکەی خۆی گەڕایەوە و ، وای زانیی موسڵمانەکان هێرشیان کردۆتەوە سەر غەطەفان .

کە عویەینە گەیشتەوە خەیبەر کار لە کار ترازا بوو . چونکە خەیبەر هەر هەمووی خۆی بە دەستەوە دابوو و ، تاکە جوولەکەیەك چەکی لە دەست نەما بوو ..

کە عویەینە گەیشت و ، ئەم بارودۆخەی دیی ، خێرا کەوتە تەماعی ئەوە کە داوای بەشی خۆی لەو دەستکەوتانە بکات ، بەو بیانووەی کە ئەو یارمەتیی موسڵمانەکانی داوە ، چونکە وازی لە جەنگ و کۆمەکیی جوولەکە هێناوە و ، بە چوار هەزار جەنگاوەرەوە کشاوەتەوە ..

پێغەمبەری خوا ﷺ رووی لە عویەینەی منالۆچکە کرد و فەرمووی : (( كذبت ، ولكن الصياح الذي سمعت أنفرك إلى أهلك )) . فەرمووی : درۆت کرد .. بەڵکو بەدەم ئەو هاوارەوە کە بەر گوێت کەوت بە خۆت و سوپاکەتەوە گەڕایتەوە ناوچەکەی خۆتان .

عویەینە خۆی گەیاندە لای جوولەکەی خەیبەر و ئەیوت : کاری وەك ئەمڕۆم نەدیوە .. بەخوا وەهام نەئەبینیی کە غەیری ئێوە هیچ کەسێك دەست لە موحەممەد بووەشێنێ .. وتم : ئەوانە خاوەن قەڵا و چەك و سامانن .. ئێوە لەم قەڵا سەختانەدا و ئەو هەمووە خۆراکە کە کەس نیە بیخوات و ئەم ئاوە سەرەمڕە بە دەستی خۆتان خۆتان بە دەستەوە دا ..

وتیان : ویستمان لە قەڵای زوبەیردا دان بە خۆماندا بگرین ، کەچیی کاریزی ئاوەکانمان لێ بڕڕا و ، دنیاش گەرم بوو و ، بەرگەی تینووەتییمان نەگرت .

وتی : لە قەڵای ناعم هەڵاتوون و بە شکاویی خۆتان گەیاندۆتە قەڵای زوبەیر .. پاشان پرسیاری کوژراوانی کرد ، کە هەواڵیان دایە وتی : بەخوا هەرچیی خاوەنی غیرەت و ئازایەتی‌یە کوژراوە .. ئیتر هەرگیز جوولەکە لە حیجازدا هەڵ ناسنەوە ..

جوولەکە هەموو وڕ بوو بوون و نەیانئەتوانیی وەڵامی کابرا بدەنەوە ؛ کەچیی جوولەکەیەك بە ناوی ثەعلەبەی کوڕی سەللامی کوڕی ئەبولحوقەیق ، کە خۆیان بە ژیریان دائەنا و بیری بە لایانەوە لاواز بوو ؛ لە عویەینە هاتە وەڵام و وتی : عویەینە! تۆ هەڵت نان و دوایش پشتت بەردان و وازت لێ هێنان بۆ جەنگی موحەممەد . پێشتریش ئەوەت بە نەوەی قورەیظە کرد کە کردت .

مەبەستی لەوەیە کە عویەینە یەکێ بووە لە چوار فەرماندەکەی غەطەفان کە فەرماندەی سوپای ئەحزاب بوون و جوولەکەی نەوەی قورەیظەیان هەڵ نا - بە زمانی لووسی حویەیی کوڕی ئەخطەب - تا پەیمانی نێوان خۆیان و موسڵمانەکان هەڵ بوەشێننەوە ، و ، بەشداریی جەنگ بکەن و ، سەرەنجام بە دەستی موسڵمانەکان تیا بچن.

عویەینە بۆ خۆ دەرباز کردن وتی : موحەممەد ئێمەی خستە داوەوە و ، وامان زانی هەڵمەتی بردۆتە سەر ناوچەکەمان ، بۆیە کە هاوارەکەمان بیست ، ئێمەش گەڕاینەوە لای کەس‌وکارمان ، کەچیی هیچمان نەدیی و ، دیسان گەڕاینەوە دوا بۆ لاتان بۆ کۆمەکییتان .

ثەعلەبە وتی : جا کێ ماوە کۆمەکیی بکەیت ؟ ئەوەی کوژراوە کوژراوە و ، ئەوەش کە ماوە بۆتە بەندەی موحەممەد و ، هەر هەموومانی دیل کرد و ماڵ و سامانی بردین !

عویەینەی ئەحمەق نە ئەوەبوو کۆمەکیی جوولەکە بکات و ، بگاتە فریایان تا شتێکی دەست بکەوێ ، نە ئەوەش بوو پێشنیارەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەربگرێ بەوەی کە دەستبەرداری جوولەکە ببێ و بەری ساڵێکی دارخورماکانی خەیبەر لە موسڵمانەکان وەربگری .. بووە کوردی لە هەردوو جەژنەکە بوو .

کە گەڕایەوە ماڵەوە حاریثی‌کوڕی عەوفی موڕڕیی هاتە لای و پێی وت :

من پێم نەوتی : هیچ کارێك لە شوێنی خۆی‌دا دانانێی ؟ بەخوا موحەممەد بەسەر نێوانی خۆرهەڵات و خۆرئاوادا زاڵ ئەبێ .. جوولەکە ئەم هەواڵەیان پێمان ئەدا .. شاهێدیی ئەدەم کە گوێم لە ئەبوڕافیع سەللامی کوڕی ئەبولحوقەیق بووە ئەی‌وت : ئێمە لەسەر پێغەمبەرایەتیی حەسادەت بە موحەممەد ئەبەین ، بەوەی کە لە دەستی نەوەی هاروون دەرچووە .. ئەو ( واتە موحەممەد ) پێغەمبەرە و جوولەکە بە گوێم

ناکەن .. ئێمە دووجار بە دەستی ئەو سەر ئەبڕڕین : جارێك لە یەثریب و جارێکیش لە خەیبەر ..

حاریث ئەڵێ : بە سەللامم وت : ئەبێتە خاوەنی هەموو زەویی ؟ وتی : بەڵێ ، بەو تەوراتەی هاتۆتە سەر مووسا .. پێیشم خۆش نیە جوولەکە بەم وتەیەم بزانن کە دەربارەی ئەو کردم .

بەشی دووهەمی خەیبەریش بریتیی بوو لە چەند قەلایەك ، کە گرنگەکانیان ئەم سیانە بوون :

١ ـ قەمووص . ٢ ـ سولالیم . ٣ ـ وەطیح .

جوولەکە لەم سێ قەلایەدا خۆیان ئامادەی جەنگ کرد و ، تا ماوەیەکی زۆر دانیان بە خۆیاندا گرت و نەیانئەویست خۆیان بە دەستەوە بدەن ، تا ئەوەبوو گەمارۆو زۆری بۆ هێنان و ، پێغەمبەری خوایش ﷺ بڕیاری دا مەنجەنیق بۆ رماندنی قەلاکانیان بە کار بهێنێت . ئەمەش دوای چواردە رۆژ گەمارۆودان ، هاتنە سەر ئەوە کە داوای رێككەوتن بکەن ..

ئەگێڕنەوە کە کینانەی کوڕی ئەبولحوقەیق لە تیرهاویشتندا دەستی زۆر راست بووە.. لەو کاتەدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ هاتبووە سەر قەلاکەیان و ، خەڵکی قەلاکەش هەر هەموو بە تیروکەوانەوە لە دەرگای قەلاکەدا وەستا بوون و ، خۆیان ئامادە کردبوو ، وتیان : ئەوە پێغەمبەری خوایە لە ( شق ) ەوە لەگەڵ هاوەڵانیدا هات . خێرا کینانە هەستا و دەستی گەیاندە تیروکەوانەکەی ، کەچیی لەرزێکی وەهای لێ هات کە نەیتوانیی تیری پێ بهاوێژێ و ، ئاماژەشی بۆ جوولەکەکان کرد کە تیرنەهاوێژن .. ئەوەبوو ترس چووە دڵیانەوە و هیچیان پێ نەکرا ..

سەرەنجام کینانەی پادشایان بڕیاری خۆ بە دەستەوەدانی دا و ، نوێنەری ناردنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ تا ماوە بدات و پێکەوە کۆ ببنەوە ، تا لەسەر جەنگ وەستاندن و خۆبەدەستەوەدان رێك بکەون .. سەرۆکی ئەم نوێنەرەی کینانەش ناوی شەمماخ بوو ..

کە شەمماخ هاتە دەرەوە لە قەلا پاسەوانانی سوپای ئیسلام گرتیان و ئەویش کارەکەی خۆی بە موسڵمانان راگەیاند و ، سەرەنجام کینانە فەرمانی دا جوولەکە لە جەنگ بوەستن و لەگەڵ چەند سەرۆکێکی جوولەکەدا لە بنکەی سەرکردایەتیی موسڵماناندا بە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتن .

که هەردوولا دانیشتن و کەوتنە گفتوگۆ ، نوێنەرەکانی جوولەکە ، بە سەرۆکایەتیی کینانە ، هەوڵی ئەوەیان دا کە چەندین مەرج بخەنە بەرچاوی موسڵمانان ، تا بە شێوەی ئەهلی ذیمە حیسابیان بۆ بکرێت .. بۆ ئەوەی لە وڵاتی خۆیاندا و لەسەر خاك و ئاوی خۆیان بمێننەوە و ، خاوەنی ماڵ و سامان و کەل و پەلی خۆیان بن و ، ژن و منداڵیان لە دیلیی بە دوور بن و ، خوێنی هەر هەمووشیان پارێزراو بێت . ئەو کاتە ئەوانیش ئامادەن جزیە بدەن و ، دان بە دەسەڵاتی ئیسلامدا بنێن و ، ملکەچی قانوون و یاساکانی بن .

بەڵام هەڵەیەك کە جوولەکە کەوتە ناویەوە ، ئەوەبوو درەنگ داوای ئەو رێك کەوتنەیان کرد .. سەرەتا ئامادەی جەنگ بوون ، نەك رێك کەوتن .. ئەوپەڕی بەرگرییان کرد و ، بە توندیی لەگەڵ سوپای ئیسلامدا جەنگان ، بە رادەیەك کە سوپای ئیسلام نەیتوانی بە شمشێر هیچیّ لەو قەڵایانە فەتح بکات ، تا سوپای ئیسلام ناچار بوو بیر لە بەکارهێنانی مەنجەنیق بکاتەوە .. کە جوولەکەش ئەوەیان دیی زانییان بەرگرییان بۆ ناکریّ و ، وا چاکە زوو فریای خۆیان بکەون .

جا هەرچەندە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی زانیی کە جوولەکە لە جەنگ درێغیی ناکەن ئەگەر لە توانایاندا هەبێ و ، کە ئێستەش داوای رێك کەوتن ئەکەن ئەوە توانای جەنگیان نەماوە . کەواتە وەك ئەوە وەهایە کە بە زۆری شمشێر قەڵاکانیان فەتح کرابن . بەمە مافی موسڵمانەکانە کە جەنگاوەرانیان بە دیل بگیرێن ژن و منداڵیشیان بکرێنە کۆیلە و ، ماڵ و سامانیشیان بکرێتە غەنیمەتی جەنگ . لەگەڵ ئەمەشدا پێغەمبەری خوا ﷺ چاوپۆشیی لەگەڵ جوولەکەدا بەکار هێنا .. ئەوەبوو پەیمانێکی لە گەڵیانا مۆر کرد تا چاك ترین مەرجیان دەستگیر ببێ ، کە بریتیی بوو لە پاراستنی خوێنیان و وازهێنان لە بەکۆیلەکردنی ژن و منداڵانیان ، کە ئەمەش تەنها لە سایەی شەریعەتدا دەستیان ئەکەوت ..

ئەمانەش خاڵی رێك کەوتنەکەن :

١ ـ جوولەکەی خەیبەر هەموو قەڵاکان بۆ موسڵمانەکان چۆڵ بکەن و ، چیی چەك و کەرەسەی جەنگیشیان تێدایە وازی لێ بهێنن بۆ سوپای سەرکەوتووی ئیسلام .

٢ ـ جوولەکە چیی چەکیان لایە هەر هەمووی تەسلیم بکەن .

٣ ـ پێغەمبەر ﷺ پەیمانی ئەوە بدات کە خوێنی جوولەکە پارێزراو بێت و ، ژن و منداڵیشیان نەکرێنە کۆیلە .

٤ ـ جوولەکەی خەیبەر خەیبەر چۆڵ بکەن و بار بکەن بۆ شام .

٥ ـ موسڵمانەکان ڕێ بە جوولەکە بدەن چیی کەل و پەلێك بۆیان ئەڕوا لەگەڵ خۆیان بیبەن .

٦ ـ جوولەکە پەیمانی ئەوە بدەن ، بە تایبەت کینانەی سەرداریان ، چیی سامان و گەنجینەی شاراوەیان هەیە بۆ موسڵمانەکانی ئاشکرا بکەن .

٧ ـ ئەگەر جوولەکە پێچەوانەی ئەم ڕێکەوتنە بجووڵێنەوە ، ئەوا هیچ پەیمان و بەڵێنێك لە ئەستۆی موسڵماناندا نامێنێت ، ئەو کاتە خوێن و سامان و ژن و منداڵی جوولەکە بۆ موسڵمانان حەلاڵ ئەبێت و ، هیچ کات لە پەنای موسڵماناندا نابن ، چونکە ئەمە یەکەم پەیمانی نێوان موسڵمانان و جوولەکە نەبوو .

لە بنکەی سەرکردایەتیی پێغەمبەردا ﷺ ئەم ڕێككەوتنە ئیمزا کرا و ، لەلایەن موسڵمانانەوە ئەبوبەکر و عومەر و عەلیی و زوبەیر بوونە شاهێد و ، لەلایەن جوولەکەشەوە دە پیاویان بە شاهێد گیران .

دوای بڕینەوەی ئەم ڕێككەوتنە جوولەکە قەڵاکانیان تەسلیمی موسڵمانەکان کرد و، پێغەمبەریش ﷺ پیاوی تەرخان کردن بۆ وەرگرتنی سامان و چەك و کێڵگە و باخ و باخاتەکان ..

بەمە جەنگ لە خەیبەردا کۆتایی هات ، ئەویش بە سەرکەوتنی یەکجاریی موسڵمانان ، کە ئەوەبوو نزیکەی دوو مانگی خایاند ، کە ئەمە یەکەم جەنگێکە ئەوەندەی پێ چوو بێ لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ.

بەم شێوەیە دوا قەڵای دەسەڵاتی جوولەکە ڕووخا ، کە ئەوەبوو دوو هەزار ساڵ بوو هاتبوونە دوورگەی عەرەبیی و بۆ پاراستنی بەرژەوەندیی خۆیان هەمیشە خەریکی ئاشۆب و ئاژاوە نانەوە بوون .. هەمیشە هەوڵیان ئەدا عەرەبەکانی دوورگە خوێنی یەکتر بڕێژن تا خۆیان سامان کۆبکەنەوە و ، هەمیشە خاوەنی دەسەڵات بن .[١٠٧]

### شانزەهەم : دەستکەوتەکانی خەیبەر

دوای خۆبەدەستەوەدانی بەشی دووهەمی خەیبەر ، موسڵمانەکان دەستیان دایە کۆکردنەوە و هەژماردنی دەستکەوتەکان ، کە ئەوەندە زۆر بوون ، تا ئەو ڕۆژە سوپای ئیسلام دەستکەوتی وەهای لە هیچ جەنگێکدا دەست نەکەوتبوو .. جا

---

[١٠٧] غزوة خيبر لباشميل : ٢٤٣ ـ ٢٦٨ .

سەرەڕای ئەو هەموو چەك و تفاقەی كە لە بەشی یەكەمدا ، وەك دەبابە و مەنجەنیق دەستیان كەوت ، لە بەشی دووهەمیشدا كەرەسەیەكی زۆری جەنگیان دەست كەوت، وەك :

١ ـ هەزار رم . ٢ ـ چوارصەد شمشێر . ٣ ـ پێنجصەد تیروكەوانی عەرەبیی بە كیسەكەیانەوە ..

دەستكەوتی سامانییش بریتیی بوو لەو هەمووە زێڕ و زیوە لە ژمارە نەهاتووەی كە بە درێژایی مێژووی دوو هەزار ساڵەی جوولەكە لە دوورگەدا كۆیان كردبووویەوە ، هەر هەمووی كەوتە دەست موسڵمانەكان ، ئیتر با ئەو هەموو كانیاو و باخ و باخات و زەویی و زارە بێشومارەی خەیبەر لەولاوە بووەستن ، كە صەدەها میلی دووچا ئەبوون . شایانی باسە كە موسڵمانەكان تەنها لە كوتەیبەدا ، كە مێرگێكە لە دەیان مێرگی خەیبەر ، چل هەزار دارخورمایان دەست كەوت .. چونكە بە راستیی خەیبەر یەكەم ناوچەی كشت و كاڵیی هەر هەموو دوورگەی عەرەبییە و ، تا ئێستاش صەدان كانیاوی لێیە ، ئیتر با بە پیت و بەرەكەتیی خاكەكەی بووەستێ ..

لە كاتی هەژمارەكردنی دەستكەوتەكەدا ، موسڵمانەكان چەند بەشێكی تەوراتیان دۆزییەوە . ئەوەبوو جوولەكە داوایان لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد كە ئەو بەشانەی تەوراتیان بۆ بگێڕێتەوە ، ئەویش داواكەی جێ بەجێ كردن و گێڕانیەوە بۆیان .

ئەوە رەفتاری جوانی پێغەمبەر و موسڵمانان لە رۆژی سەركەوتنیاندا .. ئەوەش رەفتار و كرداری نامەردانەی گاورو جوولەكە لە رۆژی سەركەوتنیاندا .. هەركەسێ سەرنجی ئەندەلوس بدات لەو رۆژەدا كە موسڵمانەكان دەستیان بەسەردا گرت و بۆ ماوەی هەشت صەدە دەوڵەتی ئیمان و زانستیان تیا بەرپا كرد چۆن مایەی خێر و پێشكەوتن بوون بۆ هەموو ئەورووپا ، كاتێكیش كە گاورەكان بەسەر موسڵمانەكاندا زاڵ بوون چۆن دوو رێگەیان بۆ دانان : یان بە گاور بوون ، یان كوشتن و سووتاندن بە ئاگر .. هەر كەسێ سەرنجی ئەو دوو هەڵوێستە بگرێ لە مێژووی پرشنگداری ئیمان و لە مێژووی رەش و دێزی ئیلحاد و كافرێتیی تێ ئەگات ..

بەڵێ فیردیناندی پادشای گاوران و ئیزابیللای شاژنی كە لە ئەندەلوسدا سەركەوتن ( محاكم التفتیش ) یان بەوپەڕی بێویژدانیی و هەمەجیی یەتەوە بۆ موسڵمانە بێ تاوانەكاندا نا تا بە بێ رەحمانە صەدان هەزار موسڵمان بە شمشێر لە ملیان بدرێ ،

یان بە ئاگر بسووتێنرێن . ئەم کارە نامەردانەیە بەردەوام بوو هەتا هەموو موسڵمانان ئاگادار کران کە پێویستە دەست لە ئیسلام هەڵ بگرن و ببنە مەسیحیی .

هەروەها پادشای صەلیبیی ( شێردڵ ـ قلب الأسد ) پێش گرتنی قودس بەڵێنی پاراستنی خوێنی دانیشتوانی شاری دا ، کەچیی دوای گرتنی شار سێ هەزار دیلی موسڵمانی تێدا سەربڕیی ، بە مەرجێ ئەمانە جەنگیان نەکرد و خۆیان بە دەستەوە دا.. کەچیی کە دوای ئەوە ( صلاح الدین ) قودسی بە جەنگ و کوشتار گرتەوە ، یەك دیلی مەسیحیی تێدا نەکوشت ، ئەگەرچیی ( قلب الأسد ) پێشتر ئەو نامەردییەی لێ وەشایەوە .. هەتا ( صلاح الدین ) ئەوەندە لێ بووردە بوو سەری لە پادشای ئینگلیز ( قلب الأسد ) دا کاتێك کە نەخۆش بوو و ، فەرمانیشی دا دکتۆرە تایبەتییەکەی خۆی دەرمانی بکا هەتا چاك بوویەوە !![108]

**حەڤدەهەم : مانەوەی جوولەکە لە خەیبەردا**

لە رێکەوتنەکەی نێوان موسڵمانەکان و جوولەکەی خەیبەردا ئەوەش هاتبوو کە جوولەکە خەیبەر چۆڵ بکەن و ، موسڵمانەکانیش خوێنیان بپارێزن و ژن و منداڵیان نەکەنە کۆیلە ، بەڵام بەو مەرجەی هیچێ لە ماڵ و سامانیان لە موسڵمانەکان نەشارنەوە .. خۆ ئەگەر ناپاکییان لێوە دەرکەوێ ئەوا خوێنیان بۆ موسڵمانان حەڵاڵ ئەبێت و بەکۆیلەکردنی ژن و منداڵیان مافی موسڵمانان ئەبێت . بەڵام جوولەکە ، وەك رەفتاری هەمیشەییان ، ناپاکییان کرد و ، شتیشیان شاردەوە ، کەچیی لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەری خوا ﷺ چاوپۆشیی لێ کردن و خوێنی حەڵاڵ نەکردن ، جگە لە دوو پیاویان ( کینانە و رەبیعی کوڕانی ئەبولحوقەیق ) ، کە لێپرسراوی یەکەمی ئەو پەیمان شکاندنە بوون ، ئیتر ئەو هەزارەها جوولەکەیە چاوپۆشییان لێ کرا ..

بۆ چۆڵکردنی خەیبەر لەلایەن جوولەکەوە نارەزاییەك نەبوو ، بەڵام پێشنیارێکیان خستە بەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ تا لەوێ بیان هێڵێتەوە و ، وەك کرێگرتە لەسەر خاك و ئاوی خەیبەر کشت و کاڵ بکەن بەرامبەر بە نیوەی دەستهاتی باخ و زەوییەکان ، چونکە ئەوان شارەزاییان زیاتر بوو . پێغەمبەری خوا ﷺ بەمە رازیی بوو بەو مەرجەی هەر کاتێ موسڵمانەکان ویستیان دەر بچن ، ئەوان دەر بچن.

---

[108] غزوة خيبر لباشميل : ٢٧٠ ـ ٢٧٤ .

هەروا لە سەردەمی پێغەمبەر و ئەبوبەکردا و زۆربەی خەلافەتی عومەردا مانەوە..

لەو ماوەیەدا جوولەکەی خەیبەر سەروماڵ و نامووسیان لە ئەستۆی موسڵمانان‌دا بوو و ، کەسێك بۆی نەبوو دەستیان بە نارەوا بۆ درێژ بکات .. بۆیە بەوپەڕی سەربەستی‌یەوە ، سەرەڕای کشت و کاڵی خەیبەر ، دەستیان دایە بازرگانیی ، کە لە راستیی‌دا جوولەکەی خەیبەر ، خاوەنی چەندین سیفەت بوون کە لە جوولەکەی شوێنانی تردا نەبوون ، وەك ئازایەتیی لە جەنگ‌دا و ، پێکانی نیشانە بە تیروکەوان ... هتد .

کە جوولەکە دەستیان لە خۆیان و قەڵاکانیان شۆرد ، زۆربەی زێڕ و زیویان حەشار دا و شاردیانەوە .. جا هەر چەندە ئەمە لەلای سەرکردایەتیی موسڵمانان ئاشکرا بوو، بەڵام هەر چاوپۆشی‌یان لێ کرا ..

چاك‌ترین بەڵگە بۆ ئەمە ئەوەبوو دوای دابەش‌کردنی دەست‌کەوتەکانی جەنگ ، جوولەکەی خەیبەر بەشی زۆری ئەو کەل و پەلانەیان کڕیی و قازانجێکی زۆریان دەست گیر بوو ..

دوای ڕێك‌کەوتن لەسەر مانەوەی جوولەکە لە خەیبەردا . جاری وا ئەبوو موسڵمانەکان ئەچوونە ناو کشت و کاڵەکانیانەوە .. جوولەکە لای پێغەمبەری خوا ﷺ شکاتیان کرد .. ئەویش هەموو موسڵمانانی کۆکردنەوە و ئاگاداری کردن کە بە هیچ شێوەیەك دەست بۆ شتێکی خەیبەر نابەن . موسڵمانەکانیش مەردانە فەرمانەکەی سەرداریان جێ بەجێ کرد ، بە رادەیەك جاری وا ئەبوو کابرای جوولەکە ئەی‌ویست شتێك بە موسڵمانێك بەبێ بەرامبەر ببەخشێ ، کەچیی موسڵمانەکە وەری نەئەگرت .

جوولەکەی خەیبەر هەروا لەوێ مانەوە ، بەڵام جار لە دوای جار ناپاکی‌یان لێ دەرئەکەوت .. کە خەلافەت کەوتە دەست عومەری کوڕی خەططاب ، خوا لێی رازیی بێ ، جوولەکە تاوانی زۆریان لەسەر کۆبوویەوە ، بۆیە لەسەر ئەم هۆیانەی خوارەوە باری پێ کردن بۆ شام :

١ ـ خەلیفە عومەر لە ئاخر و ئۆخری تەمەنی‌دا ئەوەی پێ گەیشت کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوا نەخۆشیی‌دا کە پێی کۆچی دوایی کرد ، فەرمانی داوە کە لە دوورگەی عەرەب‌دا دوو دین نەمێنن ، بۆیە فەرمانی هاتە سەر دەرکردنیان.

٢ ـ رێك کەوتنی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ جوولەکەی خەیبەردا تا ببنە کرێکاری سەر خاك و ئاوی خەیبەر ئەو دەقەشی لەگەڵدایە کە موسڵمانان هەرکەی بیانەوێ خەیبەر لەوان وەرئەگرنەوە و ، تیایا دەریان ئەکەن .

٣ ـ هەرچەندە جوولەکە ئەوپەڕی سەربەستی‌یان هەبوو و ، ماوە نەئەدرا هیچ موسڵمانێك خراپەیان بەرامبەر بکات ، ئەوان هەر ناپاکی‌یان لێ دەرئەکەوت و هەر خەریکی پیلان و ئاژاوە بوون . لەبەر ئەوە ئەو پەیمانەیان شکاند کە بە پێی ئەوە لەوێ مابوونەوە .

هێشتا پێغەمبەری خوا ﷺ لە ژیاندا بوو ، ئەوان دەستیان لە موسڵمانان ئەوەشاند . یەکێ لەو خراپەکاری‌یانەیان بریتیی بوو لە کوشتنی عەبدوڵڵای کوڕی سەهل کە یەکێ بوو لە هاوەڵە ناودارەکان .. هەرچەندە عەبدوڵڵا بە کوژراویی دۆزرایەوە ، هەموو بەڵگەکان ئەوەیان ئەسەلماند کە جوولەکە کوشتوویانە ، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ سزای نەدان ، چونکە بە پێی یاسای ئیسلامیی بەسەریاندا نەبڕرا کە ئەوان بووبن . بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا لە ( بیت المال ) ی موسڵمانان خوێنی عەبدوڵڵا بدرێت .. بەڵام ئیتر موسڵمانان تیرۆرکردنی عەبدوڵڵایان هەر لە یاد بوو و لایان یەقین بوو کە جوولەکە لەگەڵ موسڵماناندا پاکی‌یان نایەت ..

یەکێ تر لە ناپاکی‌یەکانی جوولەکە لە سەردەمی خەلیفە عومەردا بوو .. ئەویش ئەوەبوو مەظهەری کوڕی رافیعی حاریثیی لە شامەوە دە کرێکاری گاوری هێنا بوون تا لە زەوی‌یەکەی‌دا لە مەدینە کاری بۆ بکەن . کە لە رێوە هات و گەیشتە نزیکی خەیبەر ، لەوێ لای دا و ، سێ رۆژ لەوێ مانەوە . لەو کاتەدا پیاوێکی جوولەکە هات بۆ لایان و پێی وتن : ئێوە نەصارا و ئێمەش یەهوود و ، ئەمانە قەومێکن ئێمەیان بە شمشێر کردۆتە ژێر دەستە ، ئێوەش دە پیاون و پیاوێك لەوان هاتووە ئێوەی داوەتە بەر لە خاکی شەراب و عەرەق و خێرەوە ئەتان با بۆ رەنج و بەدبەختیی.. ئەو کاتە ئەبنە کۆیلە . کە لەم گوندەی ئێمە دەرچوون بی‌کوژن . وتیان: چەکمان پێ نیە. ئەوەبوو جوولەکە دوو سێ چەقۆیان بە نهێنیی بۆ هێنان و خەیبەریان بە جێ هێشت، بەو هیوایەوە کە ئەوەی جوولەکەکە پێی وتن جێ بەجێی بکەن .

بەرەو مەدینە کەوتنە رێ هەتا گەیشتنە ( ثِبار ) کە شەش میل لە خەیبەرەوە دوورە ، لەوێ مەظهەری کوڕی رافیعی حاریثیی[١٠٩] داوای شتێکی لە یەکێکیان کرد،

---

[١٠٩] مەظهەر ئەنصاری یە و، بە وتەی واقیدیی بەشداریی ئوحودی کردووە و، تا سەردەمی خەلیفە عومەریش ژیاوە.

هەموو بە جارێ لێی راپەڕین و بە چەقۆ هەڵمەتیان دایە سەری ، بێ ئەوەی هیچ هەڵەیەکی لەگەڵیانا کردبێ . کە مەظهەر ئەوانی وەها بینیی بە پەلە بەرەو شمشێرەکەی رای کرد ، کەچیی بەر لەوەی شمشێرەکەی لە کێلان دەربهێنێ ، ئەوان بە چەقۆ سکیان دڕیی . کە کوشتیان گەڕانەوە بۆ خەیبەر و ، لەوێ جوولەکە داڵدەیان دان و ، ماوەیەك شاردیاننەوە ، پاشان کەل و پەلی پێویستیان دانێ و ، ئەوانیش خۆیان گەیاندەوە شام ..

تاوانێکی تری جوولەکە ئەوەبوو عەبدوڵلای کوڕی عومەر لە خەودا بوو هێرشیان کردە سەری و دەستیان لە جێی خۆی ترازاند ، کەچیی لە کاتی خۆیدا خەلیفە عومەر هیچ کارێکی دەرهەقیان نەکرد ..

کاتێك کە هەواڵی کوژرانی مەظهەر و ناپاکیی جوولەکە گەیشتەوە بە خەلیفە عومەر ، لە مزگەوتی مەدینە وتارێکی بۆ موسڵمانان دا و، فەرمووی:

خەڵکینە ! جوولەکە ئەوەیان بە عەبدوڵلا کرد و ، ئەوەشیان بە مەظهەری کوڕی رافیع کرد ، سەرەڕای دەستدرێژییان بۆ گیانی عەبدوڵلای کوڕی سەهل لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ ...

خەلیفە داوای لە موسڵمانان کرد با هەموو کەسێ بچێ بە دەم ماڵ و سامانیانەوە لە خەیبەر چونکە جوولەکەی تێدا دەرئەکات ..

کە خەلیفە وتارەکەی تەواو کرد طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلا هەستا و وتی : بەخوا ئەی ئەمیری ئیمانداران چاکت پێکاوە و خواش تەوفیقی داوی .

عومەر پێی فەرموو : کێی تر لەگەڵتا ئەم رایەی هەیە ؟ وتی : هەموو موهاجیر و ئەنصار .. عومەر بەمە دڵخۆش بوو ..[١١٠]

**هەژدەهەم : هەولی کوشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ**

جوولەکەی خەیبەر مافی کوشتنیان هەبوو .. ژن و منداڵیان ئەبوایە بە کۆیلە بکرانایە .. کەچیی موسڵمانان چاوپۆشییان لێ کردن .. ناپاکییان کرد بەوەی ماڵ و سامانیان شاردبۆوە ، لەسەر ئەوەش سزا نەدران .. ئەبوایە خەیبەریان چۆڵ بکردایە ، لەوەش وازیان لێ هێنرا و لەسەر باخ و باخاتەکەیان مانەوە .. سوپای ئیسلام بووە

---

[١١٠] غزوة خيبر لباشميل : ٧٨ ـ ٨١ و ٢٧٤ ـ ٢٧٩ .

پاسەوانی سەر و ماڵ و نامووسیان ، کەچیی ئەو ناپاکانە هەر بێبەڵێن و بێوەفا و سپڵە بوون .. هەوڵی کوشتنی پێغەمبەری خوایان دا ..

ئەو باسەش بەم شێوەیە بوو : ئافرەتێکی جوولەکە بە ناوی زەینەبی کچی حاریث کە برای مەرحەب بوو و هەردووکیان لە یەکەم قەلاَدا کوژران و ، ژنی سەللامی کوڕی میکشەم بوو کە ئەویش لە ( نطاة ) کوژرا بوو ، بڕیاری دا بە ژەهر پێدان پێغەمبەری خوا ﷺ بکوژێ ..

ئەم ئافرەتە ، بە یارمەتیی و راوێژی چەند جوولەکەیەك ، مەڕێك سەر ئەبڕێت و سامناکترین ژەهری کوشندە پەیدا ئەکات ، کە هەر کەسێ بیخوات خێرا بیکوژێ و، ئەیوەشێنێ لە گۆشتی مەڕەکە ، بە تایبەتیی هەردوو قۆڵی ژەهری زیاتریان پێوە ئەکات . چونکە زانیبووی کە پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی لە گۆشتی قۆڵ و شانە .. ئیتر مەڕەکە بە سوورەوەکراویی ئەبات بۆ سەربازگەی موسڵمانان و ، بە شێوەی دیاریی ئەیبات ، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ لە دیاریی ئەخوارد ، بەلاَم لە صەدەقە نەء.

کە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی مەغریبی بەجێ هێنا ، گەڕایەوە بۆ بنکەی فەرماندەیی لە خەیبەر و ئەبینێ وا زەینەبی جوولەکە لەوێ لە نزیك کەل و پەلەکەیدا دانیشتووە ، کە پرسیاری لێ کرد چیی ئەوێ ؟ وتی : ئەبولقاسم ! دیاری یەکم بۆ هێناوی . ئەویش وەری گرت و فەرمانی دا لە دەستیان گرت .. پاشان مەڕە ژەهراوییەکە خرایە بەردەمی و هەندێ لە هاوەلاَنیشی لەگەڵ دا بوون و فەرمانی دا بێنە پێشەوە و نانی ئێوارە بخۆن . ئەوانیش هاتنە پێشەوە و ، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی دایە قۆڵەکەی و هەندێ گۆشتی لێ کردەوە و ، پاروویەکی خستە دەمی و قووتی دا و ، بیشری کوڕی بەڕائیش [111] دەستی دایە ئێسقانێك و پاروویەکی لێ

---

[111] بیشری کوڕی بەڕائی کوڕی مەعرووری ئەنصاریی لەگەڵ باوکیدا ئامادەی پەیمانی عەقەبە بووە و ، بەشداری جەنگی بەدر و هەموو جەنگەکانی تریش بووە لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ . پێغەمبەری خوا ﷺ کردیە سەرداری قەومەکەی کە نەوەی نەضلە بوون . لە کتێبی ( الجود ) دا ، لە رێی ئیبن شیهابی زوهەرییەوە هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە : (( من سیدکم یا بني نضلة ؟ )) فەرموویی : ئەی نەوەی نەضلە ! کێ سەردارتانە ؟ وتیان : جەددی کوڕی قەیس . فەرمووی : (( وبم تسودونه ؟ )) . فەرمووی : بە بۆنەی چییەوە ئەیکەنە سەرداری خۆتان؟ وتیان : لە هەموومان ماڵ و سامانی زیاترە ، لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە بە چرووکی ئەزانین . فەرمووی : (( وأي داء أدوى من البخل ؟ ليس ذا سيدكم )) . فەرمووی : جا چ دەردێك لە چرووکیی دەردترە ؟ ئەوە سەردارتان نیە . وتیان : ئەی کێ سەردارمان بێ ؟ فەرمووی : (( بشر بن براء بن معرور )) .

خوارد . خێرا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بەسەر هاوەڵەکانی‌دا دا تا لە خواردنی گۆشتی ئەو مەڕە دەست بگرنەوە، کە فەرمووی: (( کفوا أیدیکم ، فإن هذه الذراع تخبرني أنها مسمومة )) . فەرمووی : دەست بگرنەوە ، چونکە ئەم قۆڵە هەواڵی دامیٚ کە ژەهراویی کراوە . بیشر وتی : بەو خوایەی کە ڕێزی لیٚ ناوی لەو پارووەدا کە خواردم منیش هەستم بەوە کرد ، بەڵام لەبەر ئەوەی کە خواردنەکە لە تۆ تێك نەدەم لە دەمم دەرم نەهێنایەوە فڕێی بدەم . چونکە کە ئەوەم بە دەستتەوە دیی ، نەفسی خۆمم لە تۆ خۆشەویستتر دانەنا ..

بیشر لەو شوێنەی خۆی هەڵ نەستا بە بۆنەی کاریگەریی ژەهرەکەوە ڕەنگی ڕەش هەڵ گەڕا و بۆ ماوەی ساڵێك بە دەست ئازاریەوە ئەتلایەوە و تووشی ئیفلیجیی بوو ، تا سەرەنجام بە کاریگەریی ئەو ژەهرە مرد ..

هەندیٚ هاوەڵی تریش شتێکیان لەو مەڕە ژەهراوی‌یە خواردبوو ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بەسەر ئەوانەدا دا تا بە کەڵەشاخ خوێنی خۆیان بگرن ، هەروەها خۆیشی کەڵەشاخی گرت بۆ ئەوەی کاریگەریی ژەهرەکە کەم بێتەوە ..

ئیبنولقەییم وتوویە : پێغەمبەر ﷺ بۆ ماوەی چوار ساڵی ڕەبەق بە دەست کاریگەریی ئەو ژەهرەوە ئەتلایەوە هەتا خوای گەورە بردیەوە بۆ لای خۆی ..

ئەگێڕنەوە کە لەو نەخۆشی‌یەی‌دا کە کۆچی دوایی کرد فەرموویە : (( ما زلتُ أجد - أي أتألم - من الأكلة التي أكلت من الشاة يوم خيبر ، فهذا أوان إنقطاع الأبهر مني )) . فەرموویە : لەو کاتەوە کە لە خەیبەر لەو مەڕەم خوارد هەتا ئێستا هەر ئازاری ئەچێژم . ئیتر کاتی پچڕانی دەماری شاخوێن بەرمە .

زوهەریی وتوویە : پێغەمبەری خوا ﷺ بە شەهیدیی کۆچی دوایی کردووە ..

کە دەستیان لە خواردنی گۆشتی مەڕە ژەهراوی‌یەکە کێشایەوە ، پێغەمبەری خوا فەرمانی دا زەینەبی جوولەکە بانگ بکەن بۆ لیٚ پرسینەوە .

کە پرسیاری لیٚ کرا ، دانی بەوەدا نا کە بە مەبەستی کوشتنی پێغەمبەری خواوە ژەهری پێوە کردووە . کاتێکیش کە پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری هۆی ئەو کارەی لیٚ کرد ، بە ئاشکرا وتی : ئەوەی کە بە قەومەکەی منت کرد شتێکی شاراوە نیە .. مێردەکەم و باوکم و مامەمت کوشتن . منیش وتم : ئەگەر پێغەمبەر بێت خوا ئاگاداری ئەکات و ، گەر پادشایش بێت ئەوا لە دەستی ڕزگارمان ئەبێت .

پێغەمبەر ﷺ لێی خۆش بوو . بەڵام ئەم لێ خۆش بوونە لەسەر مافی خۆی بوو..

بەڵام کە دوای ساڵێك بیشری کوڕی بەڕاء بە کاریگەریی ئەو ژەهرە کۆچی دوایی کرد، ئەوا لە خوێنی بیشردا فەرمانی کوشتنەوەی زەینەبی دا ، چونکە وەرگرتنەوەی خوێن ، خوێنی موسڵمان بێ یان کافر، لە شەریعەتی ئیسلامدا هەرگیز پشتگوێ ناخرێ ..

دەربارەی بەشداریی ئافرەتان لە جەنگی خەیبەردا ، ئیمام ئەحمەد ریوایەتی کردووە لە حەشرەجی کوڕی زیادەوە ، لە دایکی باوکیەوە کە وتوویە : من یەکێ بووم لەو شەش ئافرەتەی کە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بۆ غەزای خەیبەر کەوتینە رێ . ئەڵێت : هەواڵ گەیشتە لای پێغەمبەر ﷺ کە ئافرەت لەگەڵیا هاتوون . ئەڵێت : ناردی بە دواماناو بانگی کردین ، ئەبینین تووڕەیی لە دەم و چاویا دەرئەکەوێ . فەرمووی : (( ما أخرجكن ؟ وبأمر من خرجتن ؟ )) . فەرمووی : بۆ چیی کەوتوونەتە رێ و؟ بە فەرمانی کێش کەوتوونەتە رێ ؟

وتمان : بۆ ئەوە بە رێ کەوتووین تیر بدەینە دەست جەنگاوەران و ، سەویقیان دەرخوارد بدەین و ، دەرمانیشمان پێیە بۆ زامداران و ، خوریی ئەڕێسین ، بەمە کۆمەکیی دینی خوا ئەکەین . ئەویش رازیی بوو .

ئەڵێت : کە خوای گەورە خەیبەری بۆ فەتح کرد ، وەك بەشی پیاوان بەشی بۆ ئێمەش دانا .[112]

**نۆزدەهەم : کوژراوانی جەنگی خەیبەر**

لە غەزای خەیبەردا لە سوپای موسڵمانان ئەمانەی خوارەوە شەهید بوون :

**أ ـ لە قورەیش چوار کەس :**

سیانیان لە نەوەی ئومەییەی کوڕی عەبدمەناف :

١ ـ رەبیعەی کوڕی ئەکثەمی کوڕی سەحبەرەی ئەسەدیی کە هاوپەیمانی نەوەی عەبدشەمس بووە . بەشداریی بەدر و ئوحودی کردووە و ، لە تەمەنی سیی ساڵییدا ، لە خەیبەردا ، بە دەستی حاریثی جولەکە شەهید بووە .

٢ ـ ثەقیف یان ثەقافی کوڕی عەمر کە ئەویش هاوپەیمانیان بووە و ، بەشداریی بەدری کردووە بە خۆی و هەردوو براکەیەوە ( مدلاج ) و ( مالك ) . لە خەیبەر بە دەستی ئوسەیری جولەکە شەهید بووە .

---

[112] غزوة خيبر لباشيل : ٢٧٩ ـ ٢٨٥ .

٣ ـ ریفاعەی کوڕی مەسرووح لەهۆزی ئەسەد کە ئەویش هاوپەیمانیان بووە و حاریثی جوولەکە لەخەیبەر شەهیدی کردووە .

یەکێکیشیان لە نەوەی ئەسەدی کوڕی عەبدولعوززا کە :

٤ ـ عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوئومەییەی کوڕی وەهب بووە و ، هاوپەیمانیان بووە ، لە خەیبەر شەهید بووە .

**ب ـ لە نەوەی غیفار یەک کەس :**

١ ـ عیمارەی کوڕی عوقبە بە تیر شەهید بووە .

**ج ـ لە نەوەی ئەسلەم یەک کەس :**

١ ـ عامیری کوڕی سینانی کوڕی ئەکوەع : شمشێرەکەی خۆی بۆی هەڵ گەڕایەوە و شەهیدی کرد .

**د ـ لە دانیشتوانی خەیبەر یەک کەس :**

١ ـ ئەسوەدی شوان یان شوانە رەشەکە ، ناوی نەزانراوە ، لەو رۆژەدا کە موسڵمان بوو شەهید بووە .

**هـ ـ لە نەوەی ئەشجەع یەک کەس :**

١ ـ پیاوێکە ناوی نەهاتووە .

**و ـ لە نەوەی زوهرە یەک کەس :**

١ ـ مەسعوودی کوڕی رەبیعە کە هاوپەیمانیان بووە .

**ز ـ شەهیدەکانی ئەنصار :**

**یەکەم : لە هۆزی خەزرەج سێ کەس :**

١ ـ بیشری کوڕی بەڕائی کوڕی مەعروور کە بە ژەهر بە دەستی زەینەبی جوولەکە شەهید بوو .

٢ ـ فوضەیلی کوڕی نوعمانی ئەنصاریی سولەمیی ..

٣ ـ مەسعوودی کوڕی سەعدی کوڕی قەیس .

**دووهەم : لە هۆزی ئەوس هەشت کەس :**

١ ـ مەحموودی کوڕی مەسلەمە ، کە بە دەستی مەرحەبی جوولەکە شەهید بوو، بەوەی کە بەرداشێکی بەسەر قەڵای ناعم ەوە دا بە سەریدا و دوای سێ رۆژ گیانی لە دەست دا..

٢ ـ ئەبوضەییاحی کوڕی ثابیتی کوڕی نوعمان ، کە ناوی عومەیرە و بەشداریی بەدر و ئوحود یان خەندەق و حودەیبییەی کردووە .

٣ ـ حاریثی کوڕی حاطبی ئەنصاریی کە لەگەڵ سوپای بەدردا بوو لە ڕەوحا ، پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕایەوە بۆ مەدینە و ، وەك بەشداربوویەکی بەدریش لە دەست کەوتەکانی جەنگ بەشی بۆ دانا . حاریث بەشداریی ئوحود و خەندەقیشی کردووە .

٤ ـ عوروەی کوڕی مورڕەی کوڕی سوراقەی ئەنصاریی .

٥ ـ ئەوسی کوڕی قائید ، لە ( إصابة ) دا بە ئەوسی کوڕی عابید هاتووە .

٦ ـ ئونەیفی کوڕی حەبیب لە نەوەی عەمری کوڕی عەوف .

٧ ـ ثابیتی کوڕی ئەثلە لە نەوەی عەمری کوڕی عەوف .

٨ ـ طەلحەی کوڕی یەحیای کوڕی مولەیل .

لە جوولەکەی خەیبەریش نەوەد و سێ کەس کوژراون ، کە زۆربەیان لە قەڵاکانی ( نطاة ) و ( شق ) لە بەشی یەکەمی خەیبەر کوژراون ، کە یانزە کەسیان لە سەرکردە و فەرماندە ناودارەکانی جوولەکە بوون ، کە ئەمانەن :

١ ـ مەرحەب : کە لەبەردەم قەڵای ( ناعم ) دا ، بە شمشێربازیی بە دەستی عەلیی کوڕی ئەبوطالیب ، یان موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی ئەنصاریی کوژراوە .

٢ ـ حاریثی برای مەرحەب و باوکی زەینەب کە مەڕەکەی ژەهراویی کرد ، ئەویش لەبەردەم ناعمدا بە شمشێربازیی عەلیی کوڕی ئەبوطالیب کوشتوویە .

٣ ـ یاسیر کە ئەویش لەبەردەم قەڵای ناعمدا بە شمشێربازیی بە دەستی زوبەیری کوڕی عەووام کوژراوە .

٤ ـ ئوسەیر کە ئەویش موحەممەدی کوڕی مەسلەمە لەبەردەم قەڵای ناعمدا کوشتوویەتی .

٥ ـ عامیر کە عەلیی کوڕی ئەبوطالیب لەبەردەم ناعمدا بە شمشێربازیی کوشتوویەتی .

٦ ـ یووشەع کە حوبابی کوڕی مونذیر لەبەردەم قەڵای صەعبدا بە شمشێربازیی کوشتوویەتی .

٧ ـ دەییال کە عومارەی کوڕی عوقبەی غیفاریی کوشتوویە .

٨ ـ سەللامی کوڕی میکشەم کە مێردی زەینەب بووە لە جەنگەکانی ( نطاة )دا کوژراوە .

٩ ـ عەززوول کە حوبابی کوڕی مونذیر بە شمشێربازیی لەبەردەم قەڵای ئوبەیدا کوشتوویەتی .

١٠ ـ کینانەی کوڕی ئەبولحوقەیق ، پادشای خەیبەر لەسەر ناپاکیی و پەیمان شکاندن لە بەشی دووهەمی خەیبەردا ئیعدام کرا .

١١ ـ رەبیعی کوڕی ئەبولحوقەیق ئەمیش برای پادشا بوو ، بە هەمان تاوان ئیعدام کرا..

ئیتر کوژراوانی تری جوولەکەی خەیبەر ناوی هیچ کامیان نەهاتووە .[١١٣]

**بیستەم : فەتحی فەدەک و ، تەیما و ، وادیلقورا :**

دوای فەتحی خەیبەر بە دەوری خەیبەردا لەم لاو لەو لا چەند ناوچەیەکی جوولەکەنشین مابوون ، کە ئەیانویست بە گژی موسڵمانەکاندا بچن ، بەڵام چاوەڕوان بوون بزانن هێرشی موسڵمانەکان بۆ سەر خەیبەر بە کوێ ئەگات ، چونکە هەرگیز بە بیریاندا نەئەهات خەیبەر بە موسڵمانەکان چار بکرێت ، لەبەر ئەوەی کە جەنگاوەری زۆری لێ بوون و خاوەنی چەك و تفاقێکی بێشومار بوون .. جا کە قەڵاکانی خەیبەر، خۆیان بە دەستەوە دا ، بە تایبەت قەڵای یەکەمیان ، قەڵای ناعم . کە ئەوەیان دیی هەندێك خۆیان بە دەستەوە دا و ، هەندێکیش بە ( جزیە ) دان رازیی بوون و ، هەندێکیش کەوتنە بەرگریی و دوای جەنگ ئەوسا خۆیان بە دەستەوە دا ..

کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە سوپاوە هێرشی کردە سەر خەیبەر ، یەکێ لە هاوەڵانی ، کە ناوی موحەییصەی کوڕی مەسعوود بوو ، نارد بۆ لای جوولەکەی فەدەك ، تا بانگیان بکات بۆ سەر ئیسلام ..

بەڵام جوولەکەی فەدەك بە لایانەوە یەقین بوو کە خەیبەر بە موسڵمانەکان ناگیرێت ، بۆیە هەندێ هەڵیان بەرامبەر بە بانگەوازەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەکرد و ، بە جوانیی وەڵامی موحەییصەیان نەئەدایەوە ..

موحەییصە ئەڵێت : هاتمە ناویان و ، دوو رۆژ لەلایان مامەوە و ، خۆیان بۆ هەڵێك ئامادە کردبوو و ، ئەیان وت : ( نطاة ) عامیر و ، یاسیر و ، ئوسەیر و ، حاریث و ، مەرحەبی سەرداری جوولەکەی لێیە .. وا نابینین کە موحەممەد بتوانێ لەوانە نزیك بکەوێتەوە .. خەیبەر دە هەزار جەنگاوەری تێدایە .

---

[١١٣] غزوة خيبر لباشميل : ٢٨٥ ـ ٢٨٩ .

که موحەییصه هەست بە فێڵ و لاری‌یان ئەکات ، ئەیەوێ بگەڕێتەوە ، ئەوانیش ئەڵێن چەند پیاوێکت لەگەڵدا ئەنێرین تا رێك بکەوین .. بەو هیوایەوە کە خەیبەر خۆگر بێت . بەڵام کە هەواڵی کوژرانی پاڵەوانەکانیان بۆ هات پشتیان شکا و ، کەوتنە پاڕانەوە لە موحەییصە تا قسەکانیان نەگێڕێتەوە و ، ئاڵتوون و پارەیەکی زۆریان بۆ کۆکردەوە ، کەچیی مەردانە دەنگ و باسەکەی هەر هەموو بۆ پێغەمبەر گێڕایەوە .. ئەوانیش چەند کەسێکی بە سەرکردایەتیی نوونی کوڕی یووشەع لەگەڵدا ئەنێرن بۆ رێككەوتن .

سەرەنجام ویستیان دەست بکەنەوە . موحەییصە پێی وتن کە ئەوان ئەو هێزەیان نیە بەرگریی بکەن ، خۆ ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها صەد پیاویان بۆ بنێرێ هەموویان ئەدەنە بەر . ئەوانیش هاتنە سەر رێككەوتن . ئەوەبوو لەسەر نیوەی زەویی و زاریان رێك کەوتن .

جوولەکەی فەدەکیش لەوێ مانەوە تا سەردەمی خەلیفە عومەر و ، ئەوەبوو لەگەڵ بڕیاری دەرکردنی خەیبەردا ، بڕیاری دەرکردنی ئەمانیش دەرچوو .. ئەوەبوو خەلیفە پیاوی شارەزای ناردن تا تەقدیری کێڵگە و زەویی و زارەکانی فەدەك بکەن ، تا نیوەی ئەو مەبلەغە بدرێ بە جوولەکەی فەدەك چونکە نیوەی زەویی و زارەکان هی خۆیان بوو .. دوای ئەوە ئەوانیش باریان کرد بۆ شام ..

بەڵام ( وادي القرى ) کە ئەکەوتە نێوان مەدینە و خەیبەر و ، شیوێکی بە پیت و بەرەکەت بوو و ، کانیاوی زۆر و کێڵگەی زۆری تێدا بوو ، دانیشتوانی کۆمەڵە جوولەکەیەکی بەهێز بوون ، کە دوای فەتحی خەیبەر ئەوان یەکەم کۆمەڵی جوولەکە بوون کە خۆیان نەدا بە دەست موسڵمانەکانەوە و ، بڕیاریان دا لەگەڵیان بجەنگێن ، چونکە ئەوانیش وەك خەیبەر خاوەنی قەڵای سەخت بوون . هەروەها داوای کۆمەکی‌یان لە عەرەبە بتپەرستەکانی ئەو ناوچەیە کرد و ، ئەوانیش هاتن بە هانایانەوە خۆیان ئامادەی جەنگ کرد ..

سوپای ئیسلام لێیان نزیك کەوتەوە ، بەڵام هەرگیز پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی بە کوشتاری هیچ کۆمەڵێك نەکردووە ، هەتا بانگیان نەکا و ئاگاداریان نەکات . خۆ ئەگەر موسڵمان ببونایە ، ئەوا ئەبوونە بەشێکی کۆمەڵگای ئیسلامیی .

بەڵام جوولەکەی ( وادي القرى ) ماوەی موسڵمانەکانیان نەدا بانگیان بکەن ، بەڵکو بە گەیشتنی سوپا ، هەتا بەر لەوەی بار بخەن ، جوولەکە هێرشیان کردە سەر

موسڵمانەکان و پیاوێکی موسڵمانیان کوشت ، کە خزمەت گوزاری پێغەمبەری خوا بوو و ، ناویشی مودعەم بوو و کەل و پەلەکەی ئەوی دائەگرت ..
خێرا پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵانی ڕێك و پێك کردن و کەتیبەکانی دابەش کردن و ئاڵای دایە دەست فەرماندە هەڵ بژێرراوەکان .
ئەوەبوو ئاڵاکەی خۆی دایە دەست سەرداری خەزرەج ، سەعدی کوڕی عوبادە و، هەر یەکە لە حوبابی کوڕی مونذیر و ، عەببادی کوڕی بیشر و ، سەهلی کوڕی حونەیف ئاڵای دایە دەستیان .
هەرچەندە جوولەکە دەستیان وەشاند ، بەڵام ئەمە کاری نەکردە سەر هێمنیی پێغەمبەری خوا ﷺ و ، پێی خۆش بوو خوێن نەڕژێ و ، خوا هیدایەتی ئەوان بدات ، بۆیە بانگی کردن بۆ سەر ئیسلام و پێیشی ڕاگەیاندن کە ئەگەر بێت و موسڵمان ببن سەروماڵیان پارێزراو ئەبن و حیسابیشیان لای خوا ئەبێ .
جوولەکە نە ئاشتیی و نە موسڵمانبوونیان وەرنەگرت ، بەڵکو دەستیان دایە جەنگ و کوشتار . ئەوەبوو پاڵەوانێکیان لە قەڵاکان هاتە دەرەوە و ، داوای شمشێر بازیی ئەکرد .. خێرا زوبەیری کوڕی عەووامی بۆ دەرپەڕیی و کوشتی .. دوای ئەو جوولەکەیەکی تر هاتە دەرەوە و عەلیی کوڕی ئەبوطالیبیش ئەوی کوشت .. دوای ئەوان دوانی تر هاتنە دەرەوە و ، ئەبودوجانە یەك لە دوای یەك هەر دووکیانی کوشت.. هەروا جوولەکە ئەهاتنە دەرەوە و پاڵەوانەکانی ئیسلام بێگیانیان ئەکردن هەتا ژمارەیان گەیشتە یانزە کوژراو و ، هەرچی جارێك یەکێکیان ئەکوژرا ، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانی تری بانگ ئەکردن بۆ سەر ئیسلام !!
ئەو ڕۆژە هەتا ئێوارە جەنگ درێژەی کێشا .. کە نوێژێك ئەهاتە کایەوە ، پێغەمبەر و هاوەڵان بە جەماعەت بەجێیان ئەهێنا و ، دوای هەر نوێژێکیش پێغەمبەر ﷺ بانگی جوولەکەی ئەکرد بۆ سەر ئیسلام ، کەچیی ئەوان داواکەیان ئەدایە دواوە و لەسەر جەنگ بەردەوام ئەبوون .
بۆ ڕۆژی دووهەم موسڵمانەکان هێرشێکی توندیان کردە سەر جوولەکە .. ئەوەبوو هێشتا ئەوەندەی ڕمێك خۆر لە زەویی بەرز نەبووبوویەوە ، جوولەکە خۆیان دا بە دەستەوە و ، ناوچەکە بووە دەست کەوتی موسڵمانان .. جوولەکەی ( وادي القرى ) دوای تەسلیم بوونیان هیچیان لێ نەکوژرا..

پێغەمبەری خوا ﷺ بە وێنەی دانیشتوانی خەیبەر دانیشتوانی ( وادي القرى ) شی لەسەر باخ و زەویی و زارەکانیان هێشتنەوە ، تا بە نیوەیی کاریان لەسەر بکەن. لەم شوێنەدا سوپای ئیسلام تەنها چوار رۆژ مایەوە ..

تەیمائیش ئەکەوتە گۆشەی باکووری خۆرئاوای دوورگەوە کە کۆمەڵێك جوولەکەی تێدا بوون و ، خاوەنی قەلای سەخت بوون بەسەر لووتکەی چیاکانەوە .. ئەوانیش بە تەما بوون بەرگریی بکەن ، بەلام کە دی‌یان وا خەیبەر و پاشان فەدەك و ( وادي القرى ) خۆیان بە دەستەوە دا ، هەر لە خۆیانەوە پیاویان نارده خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و داوای صولحیان کرد و ، ئامادەیی‌یان دەربڕیی کە جزیە بدەن بە سوپای ئیسلام و ، لەسەر ماڵ و حاڵی خۆیان دانیشن و ئیسلام چاودێری‌یان بکات . ئیتر ماڵ و سامانیان و ، زەویی و زار و هەموو شتێکیان پارێزراو بوو.

کاتێکیش کە خەلیفە عومەر لە سەردەمی خەلافەتی خۆی دا جوولەکەی خەیبەری، لەسەر لاریی و چەوتی‌یان دەرکردن بۆ شام ، جوولەکەی تەیمائی دەرنەکردن بەڵکو لە جێی خۆیان بەسەری بەرزەوە مانەوە ، چونکە ئەمان وەك جەنگیان نەکرد ، دوای پەیمان بەستنیش پەیمانیان نەشکاندەوە ..

لە پێشەوە باسمان کرد کە هۆزی فەززارە و عویەینەی سەرداریان چۆن بە چوار هەزار جەنگاوەرەوە دژی موسڵمانەکان وەستان و بوونە کۆمەکی جوولەکە ، هەرچەندە خوای گەورە دەرفەتی نەدان دەست بووەشێنن ، تا کە عویەینە جاری دووهەم هاتەوە خەیبەر بۆ کۆمەکیی جوولەکە ، موسڵمانەکان جوولەکەی خەیبەریان کەوڵ کردبوون . جا هەرچەندە هۆزی فەززارە بە چاوی خۆیان تێك شکانی جوولەکەیان بینیی ، بە ئاوات بوون دەستێك لە موسڵمانەکان بووەشێنن ..

بۆ ئەمە عویەینە هاتە سەر ئەو بڕیارە کە ڕێ لە موسڵمانان بگرن کاتێ کە بەرەو مەدینە ئەگەڕێنەوە .. بۆ ئەمە هێزێکی زۆری لە جەنگاوەران کۆ کردەوە . کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم هەواڵەی بیست خێرا هەواڵی بۆ فەززارە نارد کەوا موسڵمانەکان بە تەحەدداوە لە فلانە شوێن‌دا چاوەڕوانی ئەوان ئەکەن تا لەوێ دەست بدەنە یەخەی یەکتر و بزانن کێ سەرئەکەوێ ..

کە ئەم هەواڵە بە فەززارە و سەرکردەکانیان گەیشت ، دەست و پەلیان وشك بوو و، ترسێکی زۆر چووە دڵیانەوە و ، وازیان لەو بڕیارەیان هێنا و ، بڵاوەیان لێ کرد.. جا لەوە ئەچێ سەرۆکەکانی فەززارە ویستبێتیان موسڵمانەکان بەوە بترسێنن کە ڕێ

یان لیٚ ئەگرن و دەستیان لیٚ ئەوەشێنن ، بەو هیوایەی بەڵکو موسڵمانەکان بەرامبەر بە شتێك لەگەڵیان ڕێك بکەون ، چونکە پێش فەتحی خەیبەر پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵێنی دا ئەگەر عویەینە واز لە کۆمەکیی جوولەکە بهێنێ بەروبوومی ساڵێکی خەیبەری بداتیٚ . ئەوەبوو عویەینەی ئەحمەق وەری نەگرت .. بەڵام هەڵوێستی سیاسیی و عەسکەریی موسڵمانان پێش فەتحی خەیبەر و دوای فەتح زۆریان جیاواز بوو .. چونکە دوای لە ناوبردنی هێز و سامان و فڕ و فێڵی جوولەکە لە دوورگەدا ، موسڵمانەکان بوونە خاوەنی هێزێکی چارنەکراو ، لەلایەن بتپەرستانی دوورگەوە ..

شایانی باسە لەو کاتەدا کە موسڵمانەکان سەرگەرمی پاککردنەوەی خەیبەر و دەوروبەری بوون و سوپاسی خوایان ئەکرد لەسەر ئەو سەرکەوتنەی کە پێی بەخشین، ئەو موسڵمانانەی کە بۆ حەبەشە کۆچیان کردبوو بە سواریی دوو کەشتیی گەڕانەوە. جا موسڵمانان ئەمەشیان بە سەرکەوتنێك وەك سەرکەوتنەکەی خەیبەر لە قەڵەم ئەدا.. خوا کۆمەك بێت دواتر سەربەخۆ ئەم باسە پێشکەش ئەکەین .[114]

**بیست و یەکەم : گرەوی قورەیشییەکان**

کە دەنگوباسی هێرشی موسڵمانان بۆ سەر خەیبەر کەوتە گوێی قورەیش ، چیی پیاویان هەبوو ، چ دۆست ، چ دوژمن بە موسڵمانان ، هاتنە سەر ئەو رایە کە سەرەنجامی زۆرانبازیی خەیبەر سەرەنجامە بۆ زۆرانبازیی نێوان ئیمان و کوفر ، چونکە ئەمە گەورەترین جەنگێکە کە موسڵمانەکان تووشی بن و ، لە دوورگەی عەرەبییدا هێزێکی تر نیە ئەوەندەی جوولەکەی خەیبەر و غەطەفانە بتپەرستەکان - کە یەکیان گرتبوو لە دژی موسڵمانەکان - بەدەسەڵات بێ ، چ لە بارەی ژمارەی چەك دار و ، چ لە بارەی سامان و چەك و تفاق و مەحکەمیی قەڵا و سەنگەرەوە و ، چ لە بارەی ئازایەتیی و بەجەرگیی جوولەکەی خەیبەرەوە بیٚ لە چاو جوولەکەکانی تری دوورگەدا.

بۆ ئەمە دانیشتوانی مەککە بایەخێکی چاکیان بە سەرنجامی ئەم غەزایەی موسڵمانان ئەدا .. هەتا هاتنە سەر را دەربڕین و وتوویژ و باسکردن لە هەموو کوڕ و کۆمەڵێکیان دا. کۆمەڵێك لە بتپەرستانی مەککە ، لە سەروویانەوە حوەیطبی کوڕی عەبدولعوززا [115] پیٚیان ئەکوتا بە زەوییدا کە موسڵمانەکان ئەم جەنگە ئەبەنەوە.

---

[114] غزوة خيبر لباشميل : ٨١ ـ ٨٢ ، ٢٩٠ ـ ٣٠١ .

[115] حوەیطەب لە ساڵی فەتحدا موسڵمان بووە و بەشداریی جەنگی حونەینی کردووە .. یەکێ بووە لە زۆر دەوڵەمەندەکانی قورەیش ، کە چل هەزاری بە قەرز داوە بە پێغەمبەری خوا ﷺ . حوەیطەب لە مەککە کۆچ ئەکات بۆ مەدینە و لەویٚ کۆچی دوایی ئەکات .

کۆمەڵێکیش لە سەروویانەوە صەفوانی کوڕی ئومەییە لەسەر ئەوە سوور بوون کە جوولەکەی خەیبەر سەر ئەکەون . سەرەنجام ئەوەندە مشت و مڕیان کرد ، گەیاندیانە گرەوکردن کە هەر کەسێ قسەکەی ڕاست دەرچوو صەد وشتر بباتەوە . بۆ ئەوەش کە هەواڵ بزانن گەورەپیاوانی قورەیش ڕۆژانە چەند میلێک لە مەککە دەرئەچوون تا هەواڵ لە ڕێبواران وەربگرن .

ئیمام واقیدیی ئەوەی گێڕاوەتەوە کە حوەیطەب وتوویە : کە لە ڕێکەوتن‌نامەی حودەیبیە گەڕامەوە بە لامەوە یەقین بوو کە موحەممەد بەسەر ئەو خەڵکەدا سەرئەکەوێ ، کەچیی حەمییەی شەیتان ئەی‌ویست دەست بە دینەکەمەوە بگرم ..

ئەوەبوو عەبباسی کوڕی مەرداسی سوللەمیی[116] هات بۆ لامان و ، هەواڵی پێمان دا کە موحەممەد بەرەو جوولەکەی خەیبەر ڕۆیشتووە و ، ئەوانیش سوپایان بۆ کۆکردۆتەوە و ئەمجارە موحەممەد دەرباز نابێت .. پاشان عەبباس ئەڵێت : هەر کەسێ بیەوێ بەیعەتی پێ ئەدەم کە ئەمجارە موحەممەد دەرباز نابێت .

حوەیطەب ئەڵێ : من گرەوت لەگەڵ ئەکەم . صەفوانی کوڕی ئومەییە وتی : عەبباس ! من لەگەڵت‌دام .

نەوفەلی کوڕی موعاویەش[117] وتی : عەبباس ! منیش لەگەڵت‌دام .

چەند کەسێکیش لە قورەیش دایانە پاڵ من و کردمانە گرەو لەسەر صەد وشتر . من و دەستەکەم ئەمان‌وت : موحەممەد سەرئەکەوێ و ، عەبباس و دەستەکەشی ئەیان وت : غەطەفان و جوولەکە سەرئەکەون ؟. دەنگ بەرز بوویەوە .

سەرەنجام هەواڵ گەیشت بە سەرکەوتنی پێغەمبەری خوا ﷺ و حوەیطەب و ، دەستەکەی گرەوەکەیان بردەوە .[118]

---

[116] عەبباس سەرداری قەومەکەی بووە و پێش فەتحی مەککە موسڵمان بووە . کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە خۆی و سوپای ئیسلامەوە بەرەو فەتحی مەککە کەوتبووە ڕێ عەبباسی کوڕی مەرداسیش بە خۆی و حەوت صەد جەنگاوەری خزمیەوە پاڵیان بە سوپای ئیسلامەوە دا و ، بەشداریی فەتحی مەککەیان کرد .. هەروەها بەشداریی حونەینیشی کردووە . ئەڵێن عەبباس لە سەردەمی نەفامییش‌دا عەرەقی بە حەرام داناوە .

[117] نەوفەل ڕۆژی فەتح موسڵمان بووە . ئیبن حەجەر لە ( إصابة ) دا وتوویە : لە سەردەمی نەفامیی‌دا شەصت ساڵ و لە سەردەمی ئیسلامیش‌دا شەصت ساڵ ژیاوە .. لە سەردەمی یەزیدی کوڕی موعاویەدا لە مەدینە کۆچی دوایی کردووە..

[118] غزوة خيبر لباشميل : ٣٠١ ـ ٣٠٤ .

**بیست و دووهەم : حەججاجی کوڕی عیلاط[١١٩]**

پیاوێکی خەڵکی مەککە بە ناوی حەججاجی کوڕی عیلاط لە یەکێ لە گەشتەکانی دا لە مەککە دەرچوو .. لەو کاتەدا ئەوەی بەر گوێ کەوت کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە سوپاوە گەیشتۆتە خەیبەر . هات بۆ لای و موسڵمان بوو و بەشداریی خەیبەری کرد . ئوم شەیبەی کچی عومەیریش هاوسەری بوو کە خوشکی موصعەبی کوڕی عومەیر بوو .. حەججاج زۆر دەوڵەمەند بوو .. وتی : ئەی پێغەمبەری خوا! مۆڵەتم بدە بچم پارە و سامانەکەم لای ژنەکەم وەربگرمەوە . ئەگەر بزانێ موسڵمان بووم هیچم دەست ناکەوێتەوە . ئەویش ماوەی دا .. وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ناچار ئەبێ هەندێ شت بڵێم . ئەویش ماوەی دا چیی ئەڵێ با بڵێ .

حەججاج ئەڕوات هەتا ئەگاتە سنووری حەرەم ئەبینێ وا چەند پیاوێکی قورەیشیی لەشار دەرچوون و ئەیانەوێ هەواڵیان دەست بکەوێ ، چونکە هەواڵی جەنگی خەیبەریان بیستبوو و ، خۆیشیان لە نێوان خۆیاندا گرەویان کردبوو .. کە حەججاج ئەبینن ئەڵێن : ئەوە حەججاجی کوڕی عیلاطە بەخوا هەواڵی بە لاوەیە . ئەی حەججاج ! پێمان گەیشتووە کە ئەو ڕەحمبڕە بەرەو خەیبەری وڵاتی جوولەکە و ، لادێی حیجاز ڕۆیشتووە ..

ئەویش ئەڵێت : پێم گەیشتووە کە بەرەو ئەوێ ڕۆیشتووە و، هەواڵی وەهایشم لایە کە دڵتان خۆش بکات .. ئەم دیوو ئەو دیوی ولاغەکەی ئەگرن و داوای لێ ئەکەن هەواڵیان بداتێ .

ئەڵێت : تا ئێستە موحەممەد و هاوەڵانی تووشیان بە تووشی کۆمەڵێکەوە نەبووە جەنگ بزانێ جگە لە دانیشتوانی خەیبەر . لەناو هۆزە عەرەبەکاندا سووڕاونەتەوە و، خەڵکیان بۆ کۆکردۆتەوە ، تا ئەوەبوو دە هەزاریان پێکەوە نا و ، بە شێوەیەك شکاوە تا ئێستە کەس شتی وەهای نەبیستووە .. موحەممەد خۆیشی بە دیل گیراوە.. وتوویانە نای کوژین هەتا بینێرینەوە بۆ ناو دانیشتوانی مەککە ، تا لە ناویانا، لە تۆڵەی خوێنی کوژراوەکانمان و کوژراوەکانیاندا بیکوژینەوە .. بەم بۆنەوە دێنەوە

---

[١١٩] حەججاج یەکەم کەسێك بووە کە زەکاتی کانزای نەوەی سولەیمی ناردووە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ .. لە جەنگەکانی فەتح کردنی شامدا بەشداریی کردووە . نێرراوی ئەهلی شام بووە بۆ لای عومەر ، کاتێ کە بۆی نووسین : پیاوێکی ماقووڵتان بنێرنە لام. حەججاج لە خەلافەتی عومەردا کۆچی دوایی کردووە .

لاتان و ، داوای ئەمان لە عەشرەتەکانیان ئەکەن پاشان ئەگەڕێنەوە سەر بەزمی خۆیان . ئەکەن دوای ئەوەی کە پێتانیان کرد لێیان قبووڵ بکەن .

بەناو مەککەدا جاڕ ئەدەن کە هەواڵ گەیشت ..

بەم زوانە موحەممەد ئەگات ..

حەججاج داوا لە خەڵکەکە ئەکات تا لە کۆکردنەوەی قەرزەکانی‌دا یارمەتیی بدەن تا بە زووترین کات بگەڕێتەوە خەیبەر و هەندێ لە موسڵمانە دیل‌کراوەکان بکڕێت ، بەر لەوەی بازرگانەکانی تر پێشی بکەون و ، بگەنە ئەوێ . ئەوانیش یارمەتی‌یان دا و بە چاک‌ترین شێوە بۆیان کۆکردەوە ..

پاشان ئەچێتە لای هاوسەرەکەی و پارەکەی لای ئەویش وەرئەگرێتەوە ، بەو بیانووەی زوو بچێتەوە بۆ خەیبەر ، بەر لەوەی بازرگان بگەنە ئەوێ .

عەبباسی کوڕی عەبدولموطەللیب کە هەواڵەکەی بیست ، ویستی هەستێتەوە . خەم و خەفەتێکی زۆر چووە دڵیەوە .. فەرمانی دا دەرگای خانووەکەی بخرێتە سەر پشت و خۆیشی پاڵ کەوت .. بانگی کردە قوثەمی کوڕی کە شێوەی زۆر لە پێغەمبەری خوا ئەچوو و ، دەنگی بەرز کردەوە و شیعری ئەوت ، بۆ ئەوەی دوژمنان هەست نەکەن کە خەمبارە و دەست بەسەر دڵیانا بهێنن . خەڵکێکی زۆر لەبەردەم دەرگاکەی عەبباس‌دا کۆ بوونەوە ، هەندێ خەم بار و ، هەندێ دڵشاد و هەندێکیشیان ژن و پیاوی موسڵمانی مەککە بوون کە داخ لە دڵی ئەو دەنگ و باسە بوون .. کە موسڵمانەکان دڵخۆشیی عەبباسیان دیی ئەوانیش دڵیان خۆش بوو و ، هێزیان بە بەردا هاتەوە .. عەبباس بانگی کردە خزمەت‌کارێکی کە ناوی ئەبوزەبینە بوو و ، پێی وت : بڕۆ بۆ لای حەججاج و بڵێ : عەبباس ئەڵێ : خوا لەوە بالاتر و مەزن‌ترە لەوەی کە ئەو هەواڵەی راست بێت . حەججاج وتی : بە ئەبولفەضل بڵێ : لە ماڵێکت‌دا چاوەڕوانم بە هەتا نیوەڕۆ بێم بۆ لات و هەندێ دەنگ‌وباسی خۆشت بۆ بهێنم ، بەڵام بۆم بشارەوە .

ئەبوزەبینە گەڕایەوە لای عەبباس و مژدەی خۆشیی پێ دا و ، عەبباس باوەشی پێ‌دا کرد و ، ئازادی کرد و ، ئەویش هەواڵەکەی دایە .

عەبباس وتی : لەسەرم نەزر بێ دە بەندە لە ڕێی خوادا ئازاد بکەم ..

کاتی نیوەڕۆ حەججاج هات بۆ لای و ، داوای لێ کرد لەبەر خوا سێ ڕۆژ دەنگ وباس بلاو نەکاتەوە . عەبباسیش بەڵێنی پێ دا ..

حەججاج وتی : من موسڵمان بووم ، جا پارەم بە لای ژنەکەم و قەرزم بە لای خەڵکەوەیە ، گەر بزانن موسڵمان بووم پارەکەم بۆ ناگێڕنەوە .. من هاتم پێغەمبەری خوا ﷺ خەیبەری فەتح کردبوو و ، بەشی خوا و پێغەمبەری لێ جیا ئەکرایەوە و ، چیی تێدا بوو بووە دەست کەوتی و ، صەفیەی کچی حویەیی کوڕی ئەخطەبی گواستەوە و ، کینانەی پادشای خەیبەریشی کوشت ..

کە ئەو رۆژە ئێوارە هات حەججاج لە مەککە دەرچوو و ، ئەو سێ شەوە لە عەبباس نەئەڕۆیشتن . عەبباس بە حەججاجی ئەوت : حەججاج ! بزانە چیی ئەڵێی. من شارەزای خەیبەرم ، ئەو لادێی هەر هەموو حیجازە .. زۆر بەهێز و خاوەنی پیاوی لێهاتوون . ئایا ئەوەی ئەیڵێیت راستە ؟! وتی : ئەرێ ، بەخوا ، شەو و رۆژێک بڵاوی مەکەرەوە ..

کە ماوەکە بەسەر چوو ، خەڵکەکە هەموو بۆ گرەوەکەیان ماخولانیان بوو ، لەولاوە عەبباسی کوڕی عەبدولموطەللیب دەستێك جلی جوانی لەبەر کرد و بۆنی خۆشی لە خۆی دا و ، داردەستێکی بە دەستەوە گرت و هات تا گەیشتە دەرگای ماڵەکەی حەججاجی کوڕی عیلاط و تەقەی لێ دا . ژنەکەی وتی : ( ئەبولفەضل ) نەیەیتە ژوورەوە . وتی : ئەی حەججاج کوا ؟ وتی: چووە ئەوەی لە سوپای موحەممەد دەست جوولەکە کەوتووە ، بی‌کڕێ ، بەر لەوەی بازرگانەکان پێشی بکەون . عەبباس پێی وت : ئەو پیاوە مێردی تۆ نیە هەتا شوێن دینەکەی نەکەویت ، چونکە ئەو موسڵمان بووە و ، لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بەشداریی فەتحی کردووە و ، بە خۆی و سامانەکەیەوە لە تۆ و کەس‌وکارت هەڵاتووە ، تا لێی نەستێنن .

ژنەکەی وتی : ئەبولفەضل ! بە راستتە ؟

وتی : ئەرێ ، بەخوا !

سوێندی خوارد تۆ راست ئەکەی . ئیتر چوو کەس‌وکارەکەی ئاگادار کرد ..

عەبباس بەرەو مزگەوتی کەعبە کەوتە رێ .. قوڕەیشیش خەریك بوون باسی قسەکانی حەججاجیان ئەکرد .. کە عەبباسیان کەوتە بەر چاو وا خۆی گۆڕیوە ، بە دەم و چاو یەکتریان ئاگادار کرد و ، سەریشیان لەوە سوڕ ئەما کە چۆن بەرگە ئەگرێ. پاشان دەستی دایە طەوافی کەعبە و ، وتیان : ئەبولفەضل! بەخوا ئەم خۆگرییەت ئەوپەڕی موصیبەتە . سێ رۆژە لە کوێیت ، لە ماڵ دەرناچیت ؟

عەبباس وتی : نەخێر ، بەو خوایەی کە سوێندتان پێی ئەخوارد خەیبەری فەتح کردووە و کچی حویەیی کوڕی ئەخطبی پادشایانی مارە کردووە و ، لە گەردەنی نەوەی ئەبولحوقەیقی سپیی و قژلوولی داوە کە ئێوە دیوتانن سەرداری نەضیر بوون لە یەثریبدا و ، حەجاجیش بە خۆی و سامانەکەیەوە کە بەلای ژنەکەیەوە بوو هەلاتووە .

وتیان : کێ ئەم هەواڵەی دایتێ ؟ عەبباس تێی گەیاندن کە حەجاج ئەم هەواڵەی داوەتێ و ، داواشی لە ژنەکەی کردووە کە هەتا ڕۆژ ئەبێتەوە هەواڵی دەرچوونی بە کەس نەدات .

ئەم هەواڵە بە تەواوەتیی پشتی کافرانی شکاند و ، دڵی موسڵمانە چەوساوەکانی مەککەی خۆش کرد . ئەوەبوو دوای پێنج ڕۆژ هەواڵی سەرکەوتنی سوپای ئیسلام گەیشتە مەککە ..[١٢٠]

---

[١٢٠] غزوة خيبر لباشميل : ٣٠٥ ـ ٣٠٩ .

## بەشی سیی و چوارەم

# هەندێ رووداوی تری ساڵی حەوتەم

**یەکەم : گەڕانەوەی کۆچکەرانی حەبەشە**

لە کاتێك‌دا کە موسڵمانەکان سەرگەرمی سوپاسی خوا بوون بۆ ئەو فەتحە گەورەیەی کە پێشکەشی کردن و ، لەوپەڕی خۆشیی‌دا بوون ، کۆچ‌کەرەکان بۆ وڵاتی حەبەشە ، بە سەرکردایەتیی جەعفەری کوڕی ئەبوطالیب گەڕانەوە ..

پێغەمبەری خوا ﷺ و موسڵمانەکان بە گەڕانەوەی ئەو کۆچ‌کەرانە زۆر شادمان بوون ، بە رادەیەك کە پێغەمبەری خوا ﷺ نێو چاوانی جەعفەری ماچ کرد و ئەشی فەرموو :

(( ما أدري بأيهما أنا أسرُّ : بفتح خيبر ، أم بقدوم جعفر ؟ )) . ئەی فەرموو : نازانم بە کامیان زیاتر شادمان ببم : بە فەتحی خەیبەر ، یان بە گەڕانەوەی جەعفەر.

ئەوانەی کە گەڕانەوە ئەمانە بوون کە پێغەمبەری خوا ﷺ عەمری کوڕی ئومەییەی ضەمریی نارد بە دوایان‌دا و بە سواریی دوو کەشتی هێنانیەوە :

جەعفەری کوڕی ئەبوطالیب ، لەگەڵ ئەسمائی کچی عومەیسی هاوسەری‌دا و ، عەبدوڵلای کوڕیان‌دا کە لە حەبەشە لە دایك بوو ..

خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص ، لەگەڵ ئومەینە ، یان هومەینەی کچی خەلەف و کوڕ و کچەکەیان‌دا سەعیدی کوڕی خالید و ، ئەمەی کچی خالید ، کە هەردووکیان لە حەبەشە لە دایك بوون ، لەگەڵ رەملەی کچی ئەبوسوفیان.

عەمری کوڕی سەعیدی کوڕی عاص ، برای خالید ، لەگەڵ فاطیمەی کچی صەفوانی کوڕی ئومەییە کۆچیان بۆ حەبەشە کرد ، بەڵام فاطیمە لەوێ کۆچی دوایی کرد.

موعەیقیب کوڕی ئەبوفاطیمە ، کە گەنجینەداری ( بيت المال ) بوو لە سەردەمی خەلیفە عومەردا .

ئەسوەدی کوڕی نەوفەلی کوڕی خوەیلید .

جەهمی کوڕی قەیس و هەردوو کوڕەکەی عەمر و خوزەیمە ، بەڵام ئوم حەرمەلەی کچی عەبدولئەسوەدی هاوسەری لە حەبەشە کۆچی دوایی کرد ..
عامیری کوڕی ئەبووەققاص و عوتبەی کوڕی مەسعوود .
حاریثی کوڕی خالیدی کوڕی صەخەر . ئەویش ڕەیطەی کچی حاریثی جویەیلەی لەگەڵدا بوو و لە حەبەشە کۆچی دوایی کرد ..
عوثمانی کوڕی ڕەبیعەی کوڕی ئوهبان .
مەحمییەی کوڕی جەزء .
مەعمەری کوڕی عەبدوڵلای کوڕی نەضلە .
ئەبوحاطبی کوڕی عەمری کوڕی عەبدشەمس و مالیکی کوڕی ڕەبیعەی کوڕی قەیسی کوڕی عەبدشەمس لەگەڵ عەمرەی کچی سەعدیی کوڕی وەقدانی کوڕی عەبدشەمسی هاوسەری‌دا ..
حاریثی کوڕی عەبدقەیسی کوڕی لەقیط .
ئەمانە لەگەڵ کەس‌وکارەکەی ئەبومووسای ئەشعەریی‌دا گەڕانەوە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ .
ئەبومووسای ئەشعەریی لە وڵاتی یەمەن‌دا ئەبێت و هەواڵی کۆچ‌کردنی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبیستێ . جا لەگەڵ دوو براکەی‌دا ئەبوبوردە و ئەبورەهم و پەنجا و ئەوەندە پیاوی دانیشتوانی یەمەن‌دا بە نییەتی کۆچ‌کردنەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە یەمەن دەرئەچن و ، سواری کەشتی‌یەك ئەبن . بەڵام بە فەرمانی خوا با کەشتی‌یەکە بەرەو کەناری حەبەشە ئەبات و لەوێ دائەبەزن ئەچنە لای جەعفەر و هاوەڵانی و ، ئەویش داوایان لێ ئەکات لەلایان بمێننەوە . ئەوانیش ئەمێننەوە تا ساڵی حەوتەم و هەموویان پێکەوە ئەگەڕێنەوە مەدینە . کە ئەگەنە بەرەوە ئەبینن وا فەتحی خەیبەر کراوە ، لەوێ بەشی ئەوانیش لە دەست‌کەوتەکانی خەیبەر جیا ئەکاتەوە.
کە ئەسمائی کچی عومەیس گەیشتە بەرەوە و عومەر تووشی بوو پێی فەرموو: ئێمە پێش ئێوە کۆچمان کرد ، کەواتە ئێمە لە ئێوە لە پێشترین بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ. ئەسماء توورە ئەبێت و ئەڵێت : نا ، بەخوا .. ئێوە لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بوون ، برسییەتانی تێر ئەکرد و ، نەفامتانی ئامۆژگاریی ئەکرد ، بەڵام ئێمە لە خانەی دووران و نەویستراوان‌دا بووین .. ئەوەش لە پێناوی خوادا و بۆ گوێڕایەڵیی

پێغەمبەری خوا . پاشان ئەسماء ئەو فەرمایشتەی عومەری سەردارمانی گەیاند، لای پێغەمبەر و ئەویش پێی فەرموو : (( لیس بأحق بي منكم ، له ولأصحابه هجرة واحدة، ولكم أنتم أهل السفينة هجرتان )) . فەرمووی : ئەو مافی لە ئێوە زیاتری بە منەوە نیە . ئەو و هاوەڵانی یەك كۆچیان كردووە ، بەڵام ئێوەی كۆمەڵی كەشتی‌یەكە دوو كۆچتان كردووە..

هیچ شتێك نەبوو ئەوەندەی ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ كۆمەڵی كەشتی‌یەكە دڵ خۆش‌كەر بێت .

هەروەها ئەبوهورەیرەش لە كاتی فەتحی خەیبەردا هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا و موسڵمان بوو .. پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی بەش‌دانی ئەبوهورەیرە لە دەست كەوتەكانی خەیبەر راوێژی لەگەڵ هاوەڵانی‌دا كرد و ، ئەوانیش رەزامەندی‌یان لەسەر بەش‌دانی نواند .[121]

**دووهەم : غەزای ( ذات الرقاع )**

كە پێغەمبەری خوا ﷺ بە یارمەتیی و كۆمەكیی خوای گەورە توانیی دوو باڵی بەهێز لە سێ باڵەكەی هێزی ئەحزاب بشكێنێ ، واتە لەگەڵ قورەیش‌دا رێك كەوت و، خەیبەریشی تێك شكاند ، بە تەواوەتیی خۆی یەك لایی كردەوە بۆ باڵی سێ‌هەم، كە بریتیی بوو لە هێزی عەرەبە دڵڕەقەكان كە لە بیابانی كاكی بە كاكیی نەجدا ئەژیان، كە هەر خەریكی جەردەیی و تاڵان و بڕۆ بوون .

بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو بیابان‌نشینانە شارێك یان شارۆچكەیەكیان نەبوو تیایا نیشتەجێ بن و ، قەڵا و سەنگەریان نەبوو ، زۆر بە ناڕەحەتیی دەسەڵاتیان بەسەردا ئەسەپێنرا .. لەبەر ئەوە خۆلادان لە ئاگری شەڕ و خراپەشیان كارێكی سەخت بوو ، سەخت‌تر لە شەڕی دانیشتوانی مەككە و خەیبەر . بۆیە تەنها ئەوەندەیان لەگەڵدا ئەكرا ، بەینا و بەین هەڵمەتی سەربازی‌یان ببرێتە سەر و تەمێ بكرێن و ترس و لەرز بخرێتە دڵیانەوە .

ئەوەبوو دوای خەیبەر ، بۆ نواندنی سام و هەیبەتی موسڵمانان پێغەمبەری خوا ﷺ ، هەڵمەتێكی تەمێ‌كردنی بردە سەر ئەو بیابان‌نشینانەی كە خەریك بوون خۆیان

[121] الرحيق المختوم : ٣٨٥ ـ ٣٨٦ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٣٧١ ـ ٣٧٢ ، السيرة النبوية لإبن هشام : ٤ / ٣ ـ ٥ .

جەم ئەکرد تا هێرش بکەنە سەر دەوروبەری مەدینە ، کە بە غەزای ( ذات الرقاع ) ناسراوە..

زۆربەی مێژوونووسانی ئیسلام ئەم غەزایەیان لە ساڵی چوارەمی کۆچییدا باس کردووە ، بەڵام لەبەر ئەوەی کە ئەبوموسای ئەشعەریی و ئەبوهورەیرە لەم غەزایەدا بەشداری‌یان کردووە ، دیارە ئەو دووانەش دوای فەتحی خەیبەر هاتوونەتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ، ئەوا غەزاکە دوای خەیبەر ڕووی داوە و ، زیاتر لەوەش ئەچێ لە مانگی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی حەوتەمی کۆچییدا ڕووی دابێ . بوخارییش بەڵگەی لەسەر ئەوە هێناوەتەوە کە دوای خەیبەر بووبێ .

کورتەی ئەم غەزایەش بەم جۆرە بووە :

پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی ئەوەی بیست کە نەوەی ثەعلەبە و ، نەوەی موحاریب لە غەطەفان سوپایان کۆ کردۆتەوە بۆ ئەوەی دەست لە موسڵمانەکان بوەشێنن .. بۆ ئەمە ئەو دەست پێش خەریی کرد و ، بە خۆی و چوارصەد ، یان حەوت‌صەد سەربازەوە بەرەو ئەو ناوچەیە کەوتنە ڕێ و ، ئەبوذەر ، یان عوثمانی کوڕی عەففانی کردە ئەمیری مەدینە .

ڕۆیشت هەتا گەیشتە شوێنێك کە پێی ئەوترا ( نەخل ) و دوو ڕۆژ ڕێ لە مەدینەوە دوور بوو .. لەوێ تووشی کۆمەڵێك چەکداری غەطەفان بوون و ، بەرامبەر بە یەك وەستان ، بەڵام جەنگ ڕووی نەدا ، ئەگەرچیی لەو ماوەیەدا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ترسی بە موسڵمانەکان کرد ، لە ترسی ئەوەی نەوەکا کافرەکان لە کاتی نوێژدا هەڵمەتیان بەرنە سەر ..

شێوەی بەجێ هێنانی نوێژی ترسیش بەم جۆرە بەجێ‌یان هێنا : کۆمەڵێك لە هاوەڵان ڕیز بوون و پێغەمبەری خوا لە بەریانەوە پێش نوێژیی بۆ ئەکردن و کۆمەڵێکیش بەرامبەر بە دوژمن پاسەوان بوون . کۆمەڵی یەکەم ڕەکعەتێکیان بەجێ ئەهێنا و پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵ ئەستایەوە بۆ ڕەکعەتی دووەم و ئەوەستا ، هەتا کۆمەڵی یەکەم ڕەکعەتی دووهەمیان بە جیا بۆ خۆیان تەواو ئەکرد و ، دوای سەلام دانەوە ئەبوونە پاسەوان و کۆمەڵی دووهەم ئەهاتن و لەگەڵ ڕەکعەتی دووهەمی پێغەمبەردا ڕەکعەتی یەکەمی خۆیان بەجێ ئەهێنا . پێغەمبەر دوای تەواوکردنی دوو ڕەکعەت بە دانیشتنانەوە ئەوەستا هەتا ئەوان هەڵ ئەستان و ڕەکعەتی دووهەمیان تەواو ئەکرد و سەلامی پێ ئەدانەوە ..

لە بوخاریی‌دا هاتووە کە ئەبوموسای ئەشعەریی خوا لێی ڕازیی بێ وتوویە : لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ کەوتینە ڕێ کە ئێمە شەش کەس بووین و یەك وشترمان پێ بوو کە بە نۆبە سواری ئەبووین .. ئەوەبوو پێمان زامدار بوون .. پێی منیش زامدار بوون و ، نینۆکەکانم کەوتن . ناچار پەڕۆمان لە پێمان ئەپێچا . جا بە بۆنەی بەستنی پارچە پەڕۆوە لە پێمان ئەم غەزایە ناو نرا (( ذات الرقاع )).

هەروەها لە بوخاریی دا هاتووە کە جابیر وتوویە : لە غەزای ( ذات الرقاع ) دا لە خزمەتی پێغەمبەردا بووین ﷺ . ئەگەر بهاتنایەتە لای درەختێکی سێبەردار وازمان لێ ئەهێنا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ . پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزی و ، خەڵکەکەش بەناو دڕکەزی‌یەکان‌دا بلاوەیان لێ کرد و ، خۆیان گەیاندە سێبەری درەختەکان . پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزی‌یە ژێر دارێك و شمشێرەکەی پیا هەڵواسیی .

جابیر ئەڵێت : سەرخەوێکمان شکاند . ئەوەبوو پیاوێکی موشریك هاتبوو و دەستی گەیاندبووە شمشێرەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ و پێی ئەڵێت : لێم ئەترسیی ؟ ئەفەرموێ : (( لا )) . ئەڵێت : کێ ئەگاتە فریات ؟ ئەفەرموێ : (( أللە )) .

جابیر ئەڵێت : ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی ئەکردین . ئێمەش هاتین ئەبینین ئەعرابی‌یەك وا لەلای دانیشتووە . فەرمووی :

(( إن هذا اخترط سيفي وأنا نائم ، فاستيقظت ، وهو في يده صلتاً ، فقال لي : من يمنعك مني ؟ قلت : أللە . فها هو ذا جالس )) . فەرمووی : کە من خەوتبووم ئەمە دەستی گەیاندبووە شمشێرەکەم . کە لە خەو هەستام ، شمشێرەکە بە رووتیی لە دەستی‌دا بوو . پێمی وت : کێ ئەگاتە فریات ؟ منیش وتم : أللە . ئا ئەوەتا ئێستە دانیشتووە .

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ عیتابی لەو ئەعرابی‌یە نەگرت .

لە ڕیوایەتەکەی ئەبوعەوانەدا هاتووە : ئەوەبوو شمشێرەکە لە دەستی کەوتە خوارەوە و، پێغەمبەری خواش ﷺ هەڵی گرت و فەرمووی: (( من يمنعك مني ؟ )) . فەرمووی : تۆ کێ ئەگاتە فریات ؟ وتی : پیاوی چاك بە . فەرمووی : (( تشهد أن لا إله إلا الله ، وأني رسول الله ؟ )) . فەرمووی : شاهێدیی ئەدەی کە جگە لە زاتی ( أللە ) هیچ خوایەکی تر نیە و منیش پێغەمبەری خوام ؟

ئەعرابی‌یەکە وتی : پەیمانت ئەدەمێ کە نەیەم بە گژت‌دا و ، نەبم لەگەڵ هەر قەومێکیش‌دا کە بێن بە گژت‌دا ..

ئیتر بەری دا و ، کابرا هاتەوە لای قەومەکەی و ، وتی : لەلایەن چاکترین کەسەوە هاتوومەتەوە لاتان ..

لە ڕیوایەتەکەی بوخارییدا هاتووە کە ناوی ئەو پیاوە ( غورث ) ی کوڕی حاریث بووە.

کاتێك کە سوپای ئیسلام لەم غەزایە گەڕایەوە ئافرەتێکی بتپەرستیان بە دیل کەوتە دەست . کە پیاوەکەی ئەوەی بیست رقی هەستا و نەزری کرد دوای سوپای ئیسلام بکەوێ و نەگەڕێتەوە هەتا خوێن لە هاوەڵانی موحەممەد ﷺ بڕژێنێ . ئەوەبوو بە شەودا هات بە دوایانا . پێغەمبەری خواش ﷺ دوو پیاوی کردبوونە پاسەوانی موسڵمانان کە عەببادی کوڕی بیشر و عەمماری کوڕی یاسیر بوون و ، فەرمانی دا لە دەمی شیوەکەدا پاسەوان بن .

کە چوونە دەمی شیوەکە ئەنصارییەکە ، واتە عەبباد بە موهاجیرییەکەی وت کە عەممار بوو : حەز ئەکەی کام بەشی شەو من پاسەوانیی بگرم : سەرەتای یان کۆتایی. وتی : سەرەتاکەیم بۆ بگرە . بەمە عەممار ڕاکشا و خەوت و ، عەببادیش بووە پاسەوان و دەستی بە نوێژ کرد .

پیاوە بتپەرستەکە هات و ، تارمایی عەببادی بەرچاو کەوت زانیی چاودێری سوپای موسڵمانەکانە . تیرێکی بۆ هاویشت و پێکای ، ئەویش تیرەکەی لەلاشەیدا دەرهێنا و خستیە ئەو لاوە و بە پێوە لەسەر نوێژەکەی بەردەوام بوو .. تیری دووهەمی بۆ هاویشت و ئەویشی پێکا . ئەویش تیرەکەی دەرهێنایەوە و خستیە ئەولاوە و بە پێوە لەسەر نوێژەکەی بەردەوام بوو .. تیری سێهەمی تێ گرت و ئەویشی پێکا . ئەویش دەری هێنایەوە و خستیە ئەولاوە . پاشان ڕکووع و سجوودی برد و هاوەڵەکەی بەخەبەر هێنا و وتی : هەستە ، من پێکراوم ، بەڵام بە شێوەیەك کە جووڵەم بۆ ناکرێ ..

کە عەممار دیی وا لاشەی عەبباد خەڵتانی خوێنە ، وتی : سبحان الله ! ئەی بۆچ هەر یەکەم جار تیری تێ گرتی ئاگادرت نەکردم ؟ وتی : ( لە نوێژەکەمدا ) لە سوورەتێکدا بووم و ئەمخوێند نەمویست بیبڕم هەتا تەواوی بکەم . جا کە تیر تێ گرتنەکەی دووبارە کردەوە چووم بە ڕکووعدا و ئاگادارم کردی . سوێندیشم بەخوا، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کەلێنێك لە دەست بدەم کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی

بەسەرم داوە چاودێریی بکەم ، ئەبوایە یا هەناسەم لێ ببڕایە ئەوسا سوورەتەکەم ببڕیایە ، یان تەواوم بکردایە .

بەم غەزایە موسڵمانەکان توانی‌یان ترس و لەرز بخەنە دڵی ئەو عەرەبە دڵ ڕەقانەوە، بە رادەیەك ئیتر نەتوانن لەبەردەم هێزی ئیسلام‌دا سەربەرز بکەنەوە ، بگرە بەرە بەرە شل بوون و خۆیان بە دەستەوە دا ، بەڵکو موسڵمانیش بوون . بە رادەیەك کە چەند هۆزێکیان لەگەڵ موسڵمانان‌دا بەشداریی فەتحی مەککەیان کرد و ، چوون بۆ غەزای حونەین و ، لە دەستکەوتەکانیش بەشیان درا .[122]

**سێهەم : سریەی تورەبە**

لە مانگی شەعبانی ساڵی حەوتەم‌دا موسڵمانەکان بە سەرکردایەتیی عومەری کوڕی خەططاب سریەیەکیان بەرەو ناوچەی هەوازین ، بۆ تورەبە خستە ڕێ . ئەم دەوریەیە بریتیی بوو لە سیی پیاو ، بە نیازی هەواڵ زانین و ئاگاداربوون لە هەڵوێستی ئەو هۆزە دوژمنانە . ئەو شوێنە لەسەر ڕێی صەنعا و نەجران بوو و چوار شەو ڕێگا لە مەککەوە دوور بوو .. بۆ ئەمە پیاوێکی نەوەی هیلالیان کردە دەلیل ، ئەویش بە شەو بەڕێوەی ئەبردن و ڕۆژ حەشاری ئەدان ..

جا هەر چەندە موسڵمانەکان زیاتر لە سێ‌صەد میل ڕێیان لە مەدینەوە بڕیی بوو و، هەوازینیش یەکجار زۆر بوون ، هەر کە هاتنی عومەریان کەوتە بەرگوێ ، بە جارێك هەڵ هاتن . کە عومەریش کەسی لە مەنزڵەکانیان‌دا نەدیی ، ئیتر دوایان نەکەوت و ، بەبێ جەنگ گەڕایەوە دوا ..

ئەم هەڵمەتە کە ئەم سریە بچکۆلەیە ئەنجامی دا ، بۆ شوێنێکی وەها دوور و ، بە ناو چەندین هۆزی دڕی دوژمن‌دا ، ئەوپەڕی ئازایەتیی بوو .. بۆیە ئەو هۆزانە حیسابی تایبەتی‌یان بۆ هێز و توانای موسڵمانان ئەکرد و ، پیاوێکیان بیری لەوە نەئەکردەوە ڕێ لەو سریەیە بگرێت .. ئەمەش دیارە دوای فەتحی خەیبەر بوو .[123]

**چوارەم : سریەی بەشیری کوڕی سەعد بۆ سەر فەدەك**

نەوەی موڕڕە یەکێ لە هۆزە نەجدی‌یەکانە و دوژمنی داخ لە دڵی موسڵمانەکان بووە . لە جەنگی ئەحزاب‌دا سوپای غەطەفان بریتیی بوو لە چوار باڵ ، کە یەکێکیان نەوەی موڕڕە بوو ، بە فەرماندایەتیی حاریثی کوڕی عەوفی موڕڕیی .

---

[122] سيرة إبن هشام : ٣ / ٢١٨ ـ ٢١٩ ، الرحيق المختوم : ٣٩٠ ـ ٣٩٢ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٣٧٠ .

[123] غزوة مؤتة لباشميل : ٩٦ ـ ٩٩ .

لە جەنگی خەیبەردا جوولەکە داوای یارمەتی‌یان لە هۆزە عەرەبەکان کرد ، بەلاّم حاریث نەچوو بە هانایانەوە، بگرە ئامۆژگاریی عویەینەی کوڕی حیصنی سەرداری نەوەی فەززارەی کرد ، تا خۆی بە جەنگی جوولەکەوە خەریك نەکات ، چونکە جوولەکە ئەم جەنگە ئەدۆڕێنن . ئەوەبوو عویەینە کۆمەکیی کردن و جگە لە سەرشۆڕیی هیچی بۆ نەمایەوە .

نەوەی موڕڕە زۆر داخ لە دڵی موسڵمانەکان بوون ، بۆیە هەردەم بۆ هەلێك ئەگەڕان تا موسڵمانەکان لە ناو بەرن ، بۆیە ئەوانیش یەکێ بوون لەو هۆزانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە تەما بوو ، دوای تێك شکاندنی خەیبەر ، تەمێ‌یان بکات ، تا تێ بگەن دژایەتیی ئیسلام و موسڵمانەکان کارێکی بێ‌هوودەیە و ، خۆیان ماندوو ئەکەن .

ئەوەبوو لە مانگی شەعبانی ساڵی حەوتەمدا ، واتە پێنج مانگ دوای خەیبەر ، پێغەمبەری خوا ﷺ سیی پیاوی هەڵ بژارد و سریەیەکی لێ پێك هێنان و ، فەرماندایەتیی ئەم سریەیەی بە بەشیری کوڕی سەعدی ئەنصاریی سپارد و ، فەرمانی بەسەردا دا بگاتە ماوا و مەنزڵی هۆزی نەوەی موڕڕە لە فەدەك کە چەند میلێك لە خەیبەرەوە دوور بوو .

کە بەشیر گەیشتە ئەو ناوچەیە هیچ پیاوێکی جەنگاوەری نەدیی ، بەڵکو تەنها مەڕوماڵاّت و شوان لە ناوچەکەدا بوون . ئەوەبوو چیی ئاژەڵ لەو ناوەدا بوو دایانە بەر و گەڕانەوە دوا .. بە هەر حاڵێك بوو شوانێکیان خۆی دەرباز ئەکات و ، بە پەلە هەواڵی مەڕوماڵاّتەکە بە پیاوانی هۆزەکە ئەگەیەنێ .

نەوەی موڕڕەش ئازا و جەنگاوەر بوون و لە هەموو هۆزەکان دڕتر بوون . کە هەواڵەکەیان بیست بە پەلە کەوتنە دوای موسڵمانەکان و ، تەنها چەند میلێکی کەم لە فەدەك دوور کەوتبوونەوە گەیشتنە لایان . لەولاوە بەشیریش هەواڵی ئەوەی بیست کە نەوەی موڕڕە دوایان کەوتوون ، بۆیە ئەمانیش خۆیان مەحکەم کرد .. هەردوولا دەستیان دایە شەڕە تیر ، هەتا شەویان بەسەردا هات .. سەرەنجام سریە موسڵمانەکە تیریان تەواو بوو و کەوتنە هەڵوێستێکی سەختەوە . خەڵکێکی زۆری نەوەی موڕڕە خۆیان گەیاندە شوێنی جەنگەکە .

کە ڕۆژیان لێ بوویەوە بەشیر سەرنجی دا هەر چوار دەوریان بە دوژمنی چەك دار گیراوە . ناچار دەستیان دایە بەرگریی لە گیانی خۆیان .. جەنگێکی خوێناویی ڕووی

دا .. بەڵام هاوەڵان هەرچەندە ئازا و بەجەرگ بوون بەڵام ژمارەیان کەم بوو . دوژمن لە هەر چوار لاوە هێرشی ئەکردە سەریان و توانیی سریەکە هەر هەمووی بکوژێت و تەنها تاقە پیاوێکیان ، کە ئەویش عولبەی کوڕی زەید بوو ، توانیی خۆی دەرباز بکات . بەڵام بەشیری فەرماندە جەنگێکی یەکجار سەختی کرد ، تا ئەوەبوو لە چەندین لاوە زامدار بوو و ، کەوتە ناو کوژراوەکانەوە و ، خوێنێکی زۆری لێ ڕۆیشت. کە نەوەی موڕڕە بەناو کوژراوەکاندا گەڕان ، وایان زانیی بەشیریش کوژراوە، چونکە چاك ئەم دیو و ئەو دیویان کرد و ، ئەویش جووڵەی لە خۆی بڕیی بوو.

ئیتر ئەوەبوو نەوەی موڕڕە مەڕومالاتەکەیان دایەوە بەر و گەڕانەوە دوا.. بەشیریش کە زانیی وا دوژمن لەو ناوە نەماوە ، بەهەر حاڵ هەستایەوە و ، خۆی گەیاندە گوندی فەدەك و ، لەوێ جوولەکەیەکی ئەهلی ذیمە حەشاری دا هەتا زامەکانی سارێژ بوون . عولبەی کوڕی زەیدیش خۆی گەیاندەوە مەدینە و هەواڵەکەی گەیاند و ، پاشانیش بەشیر گەیشتەوە مەدینە .[١٢٤]

**پێنجەم : هەڵمەتی ئەبوبەکر بۆ سەر نەوەی کیلاب**

هەروەها لە مانگی شەعبانی ساڵی حەوتەمدا پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵمەتێکی سەربازیی ، بە سەرکردایەتی ئەبوبەکر خوا لێی ڕازیی بێ ، ناردە سەر نەوەی فەززارە و نەوەی کیلاب ، لە ناوچەی نەجد، لە شوێنێك کە پێی ئەوترا ( ضرية ) .

ئەم هەڵمەتەی موسڵمانان مەبەستی هاتە دیی . ئەوەبوو گەیشتنە ناوچەی دوژمنان و هەڵمەتیان بردە سەریان و تێکیان شکاندن و ، دەستیان بەسەر هەموو شتێکی ناوچەکەدا گرت و ، هەر کەسێکیان نەیتوانیی بێ ڕا بکات ، کەوتە دەست موسڵمانەکان .. هەتا ئافرەتێکی جوانیان ئەبێتە بەشی هاوەڵێك ، پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێ ئەکا دەستی لێ هەڵ بگرێ هەتا بی‌نێرێ بۆ مەککە و لە بریی بەردانی ئەو ئافرەتە چەند دیلێکی موسڵمانی پێ بەر بدرێ .[١٢٥]

**شەشەم : سریەی غالیبی کوڕی عەبدوڵڵا**

لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی حەوتەمی کۆچییدا پێغەمبەری خوا ﷺ غالیبی کوڕی عەبدوڵڵای لەیثیی [١٢٦] کردە سەرکردەی هەڵمەتێك تا هێرش بەرێتە سەر هۆزەکانی

---

[١٢٤] غزوة مؤتة لباشميل : ١٠١ ـ ١٠٥ ، الرحيق : ٣٩٣ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٣٧٣ .

[١٢٥] غزوة مؤتة لباشميل : ١٠٦ ـ ١٠٨ .

نەوەی عەوال و نەوەی ثەعلەبە کە مەنزڵەکانیان لە خۆرهەڵاتی مەدینەوە نەوەد میـل دوور بوون..

ئەم هۆزانە لقێکی هۆزی هەرە گەورەی غەطەفان بوون ، کە لە جەنگی ئـەحزابدا دەورێکی گرنگیان هەبوو بۆ هێرش هێنانە سەر موسڵمانان .

ئەم هەڵمەتەی موسڵمانان بۆ سەر ناوچەی مەیفەعە لەسەر داوای یەساری بەنـدەی ئازادکراوی پێغەمبەری خوا بووە ، کە بەڵێنی داوە دەلیلی ڕێگای سریەکە بێت ، کـە بریتیی بوو لە صەد و سیی پیاو ، کـە ئەبومەسـعوودی بـەدریی و ، کـەعبی کـوڕی عەجەرە و، ئوسامەی کوڕی زەیدیان لەگەڵدا بوون .

دەلیلیش یەسار بوو کە ڕێگایەکی درێژی پڕ مەینەتی پـێ گرتنـە بـەر ، کـە زۆر ماندوو بوون و، خەریکیش بوو لە ناو بچن بە بۆنەی تـەواوبوونی خواردنەکەیانـەوە ، بەر لەوەی بگەنە ماوا و مەنزڵی دوژمن . هەتا موسڵمانەکان لـە ڕاسـتیی و پـاکیی یەسار کەوتنە گومان کە لەوانەیە بیانخاتە کەمینی غەطەفانەوە .. بـەڵام زۆری پـێ نەچوو گەیشتنە ناوچەی دوژمن و تـوانییـان دەسـتیان لێ بووەشـێنن ، بـەوەی کـە ژمارەیەکیان لێ کوشتن و زۆربەی مەڕوماڵاتیان دەست بەسـەردا گـرت ، بـەڵام تاقـە پیاوێکیان بە دیلیی نەکەوتە دەست موسڵمانەکان ..

لەم هەڵمەتە سەربازیی‌یەدا ئوسامەی کوڕی زەیـد تووشـی هەڵەیـەك بـوو کـە زۆر پەشیمان بوو لەسەری ، بە ڕادەیەك ئاواتی خواست کە لەوە و پێش موسڵمان نەبوایە..

ئەوەبوو لە کاتی جەنگدا ئوسامە گەیشت بە میرداسی کوڕی نوهەیك و هەڵمەتی دایە کە بیکـوژێ .. هـەروەها هـاوەڵێکی ئەنصـاریش هەڵمـەتی دایـە مـیرداس ، میرداس بەر لەوەی دەستی جووتە موسڵمانەکەی بگاتێ بە دەنگی بەرز وتی : ( لا إله إلا الله محمد رسـول الله ) . هاوەڵە ئەنصاریی‌یەکە کە ئەمـەی بیسـت گەڕایـە دواوە ، بەڵام ئوسامە نەگەڕایە دواوە و وای بۆ چوو کە ئەم پیاوە لە ترسی کوشـتن شـایەتمانی بە دەمدا هات ، بۆیە لێی نەگەڕا و لێی دا و کوشتی .. ئەمە ئیجتیهادی خۆی بوو .

---

[١٢٦] غالیبی کوڕی عەبدوڵلای کەنانیی لەیثیی ، پاشان کەلبیی ، یەکێ بووە لە فەرماندەکانی سوپای پێغەمبەر . غالیب لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا فەرماندەی بەشی پێشەکیی سوپای موسڵمانان بووە . تەمەنی درێژ بووە و ، لە سەردەمی موعاویەدا بۆتە ئەمیری خۆراسان . بەشداریی جەنگی قادسیەی کردووە و ، لە وڵاتی ئەرمینیاش هورموزی پادشای ( باب ) ی کوشتووە ..

فەرماندەی سریەکە لە ئوسامەی پرسی‌یەوە و بەوە تاوانباری کرد کە پیاوێکی موسڵمانی کوشتووە ، بەڵام کارەکەی وازلێ هێنا تا بچنەوە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ. کە پێغەمبەری خواش ئەمەی بیست زۆری پێ ناخۆش بوو و گلەیی‌یەکی زۆری ئوسامەی کرد کە فەرمووی :

(( أقتلته بعدما قال : لا إله إلا الله ؟ فكيف تصنع بلا إله إلا الله إذا جاءت يوم قيامة ؟ )) .

فەرمووی : دوای ئەوەی کە وتی : ( لا إله إلا الله ) کوشتت ؟ جا لە رۆژی قیامەت دا چیی لە ( لا إله إلا الله ) ئەکەیت ؟

ئوسامە وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! لە ترسی شمشێرەکە وەهای وت .

فەرمووی : (( ألا شققت قلبه فتعلم صادق أم كاذب ؟ )) . فەرمووی : ئایا دڵیت لەت کرد تا بزانی راستگۆیە یان درۆزنە ؟

پاشان ئەم ئایەتە پیرۆزەشی خوێند کە موسڵمان لەوە قەدەغە ئەکات بەو کەسەی کە داوای ئاشتیی و موسڵمانبوون ئەکات بڵێت : تۆ ئیماندار نیت:

﴿ وَمَن يَقۡتُلۡ مُؤۡمِنٗا مُّتَعَمِّدٗا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدٗا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمٗا ﴾ ( النساء : ٩٣ ) .

ئوسامە زۆر پەشیمانی کارە هەڵەکەی بوو .. لەبەر خۆیەوە خراپەی نەویستبوو ، بگرە بەرگریی لە ئیسلام کردبوو ، کەچیی وەها بەسەری‌دا شکایەوە . بۆیە داوای کرد پێغەمبەری خوا ﷺ لە خوا بپاڕێتەوە بۆی تا لێی خۆش ببێ . ئەویش فەرمووی: (( فكيف بلا إله إلا الله ؟ )) .

ئوسامە ئەڵێت : هەروا ئەم فەرمایشتەی دووبارە ئەکردەوە هەتا ئاواتم خواست کە تا ئەو کاتە موسڵمان نەبوومایە .

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێ خۆش بوونی لە خوا بۆ کرد ، دوای ئەوەی کە بڕیاری لەسەر دا کە ئەمە کوشتنی ئیمانداریکە بە هەڵە و ، حوکمی ئەوەشی بۆ دا کە بەندەیەکی ئیماندار ئازاد بکات ، تا ببێتە کەففارەتی ئەو کوشتنە هەڵەیە کە بە ئیجتیهادێکی هەڵە کوشتبووی .

ئوسامە دەرسێکی وەهای وەرگرت کە تا ماوە لە یادی نەکات . هەتا ئەوەبوو لە جەنگی نێوان موسڵمانەکانیش‌دا ، چ جەنگی جەمەل و چ جەنگی صیففین نەچووە پاڵ

ئیمام عەلییش جەنگ بکات ، بەڵکو کەناری گرت . بەمە ئوسامەش یەکێ بوو لەو هاوەڵە پایەدارانەی کە بەشداریی جەنگیان نەکرد ، کە لە ڕاستییدا تەنها چەند دانەیەك لە هاوەڵە ناودارەکان بەشداریی‌یان کرد ..

لە ئوسامەوە ڕیوایەت کراوە کە بە ئەمیری ئیمان‌داران عەلیی ( کاتێ کە عوزری بۆ دێنێتەوە کە ناتوانێ بچێ بە گژی موعاویە و زوبەیردا ) ئەڵێت : ئەی ئەمیری ئیمان‌داران ! ئەگەر دەست بکەی بە دەمی ئەژدیهایەك‌دا ، منیش دەستمی پیا ئەکەم لەگەڵتا ، بەڵام خۆ خۆت بیستووتە کە پێغەمبەری خوا ﷺ چیی پێم فەرموو کاتێ کە ئەو پیاوەم کوشت کە شایەتمانی بە ( لا إله إلا الله ) هێنا و ، منیش پێم وت : بەڵێن و پەیمان بەخوا ئەدەم کە هەر پیاوێك بڵێ ( لا إله إلا الله ) نەیکوژم.[١٢٧]

**حەوتەم : هەڵمەتی جیناب**

ئەمە گەورەترین هەڵمەتی سەربازیی بوو کە سوپای پێغەمبەر بی‌کاتە سەر بت پەرستەکان لە ناوچەی نەجد ، دوای سەرکەوتن لە خەیبەردا ..

ئەم هەڵمەتە لە مانگی شەووالی ساڵی حەوتەم‌دا بووە ، بە فەرماندایەتیی بەشیری کوڕی سەعد[١٢٨] بۆ سەر غەطەفان و فەززارە ، بۆ پووچەڵ‌کردنەوەی ئەو پرۆژەیەی کە سەرداری فەززارە عویەینەی کوڕی حیصن نیازی بوو ئەنجامی بدا ، کە بریتیی بوو لە هێرش کردنە سەر مەدینە .

شایانی باسە کە هۆزەکانی غەطەفان و فەززارە و ئەسەد و ئەشجەع و حەنیفە ، کە ئەکەوتنە خۆرهەڵاتی مەدینەوە ، یەکەم زۆر دوڕندە و داخ لە دڵی موسڵمانان بوون و، توانای سەربازیشیان یەکجار زۆر بوو کە ئەیان‌توانیی لە ماوەیەکی کەم‌دا سوپایەکی بیست هەزاریی پێکەوە بنێن . بۆیە چەندین جار نیازی هێرشیان کردووە بۆ سەر مەدینە تا موسڵمانەکان لە ناو بەرن . هەروەك لە جەنگی ئەحزاب‌دا دەوریان بینیی و بە شەش هەزار سەرباز بەشداریی‌یان کرد ..

هەروەها لە جەنگی خەیبەریش‌دا بوونە کۆمەکی جوولەکەی خەیبەر و ، تەنها نەوەی فەززارە و نەوەی ئەسەد بە پێنج هەزار سەرباز کۆمەکی‌یان کرد ، کە ئەوەبوو

---

[١٢٧] غزوة مؤتة لباشميل : ١٠٨ ـ ١١٧ ، الرحيق : ٣٩٣ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٣٧٣ .

[١٢٨] بەشیری کوڕی سەعد خەزرەجی یە و ، هاوەڵێکی ئازایە و ، بەشداریی بەدر و هەموو ڕووداوەکانی کردووە . باوکی هاوەڵی ناودار نوعمانی کوڕی بەشیری ئەنصاری یە . بەشیر لە جەنگی یەمامەدا شەهید کراوە .

هەزاریان چوونە ناو قەڵاکانەوە و بەرگرییان کرد و ، چوار هەزاریشیان بە سەرکردایەتیی عویەینە خۆیان ئامادە کرد تا لە دواوە بدەن لە موسڵمانەکان ، کەچیی خوای گەورە دەست و پەلی شکاندن .

هەروەها لە مانگی شەووالی ساڵی حەوتەمدا ، واتە حەوت مانگ دوای فەتحی خەیبەر فەرماندایەتیی ئیسلامیی مەدینە ، لە ڕێی ئەو پیاوانەیەوە کە بەناو دوورگەدا بڵاوەیان کردبوو ، هەواڵی زانیی کە سەرداری فەززارە ، عویەینەی کوڕی حیصن خەریکە لەو هۆزانە لە ناوچەی یەمن و جوباردا سوپا جەم ئەکات ، تا لە ناکاودا بدەن بەسەر مەدینەدا .

کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو هەواڵەی بیست ، خێرا هەردوو وەزیرەکەی ، ئەبوبەکر و عومەری بانگ کردن و ، باسەکەی لەلا درکاندن . ئەوانیش داوایان کرد هێزێکی گەورە بە پەلە بنێرێ بۆ تەمێ کردنی ئەو نەزانانە . ئەویش خێرا بەشیری کوڕی سەعدی فەرماندەی بەناوبانگی بانگ کرد و ، فەرمانیدا هێرش بکاتە سەر ئەو ئەعرابانە بەر لەوەی ئەوان خۆیان کۆك بکەن ..

بۆ ئەمە پێغەمبەری خوا ﷺ لە موهاجیر و ئەنصار سێ‌صەد پیاوی هەڵ بژارد و، ئالاکەیانی دایە دەست بەشیر . ئەویش خێرا بەرەو شوێنی دیاریی‌کراو کەوتە ڕێ ..

جا بۆ ئەوەی کە دوژمن بە خۆی نەزانێ و سوپای ئیسلام بێ‌دەنگ بگاتە مەنزڵ و گورزی کاریگەر بووەشێنێ ، فەرمانی دا بەشیر بە شەودا ڕێ ببڕێت و بە ڕۆژدا خۆی حەشار بدات . دەلیلی ئەم جارەش حوسەیلی [129] کوڕی نوەیرە بوو ، هەروەك بۆ ڕۆژی خەیبەر دەلیلی موسڵمانەکان بوو .

ئەوەبوو عویەینە و کۆمەڵەکەی بە خۆیان نەزانی هەتا موسڵمانەکان دایان بەسەر ناوچەی جیناب‌دا و ، دەستیان دایە کۆکردنوەی ئاژەڵ و سامانیان ، بە ڕادەیەك کە ترس و لەرز چووە دڵیانەوە و ، بە دەشت و دەردا ڕایان کرد و ، بێ ئەوەی ئاوڕ لە هیچ شتێ بدەنەوە خۆیان گەیاندە لووتکەی چیاکان ..

بەمە موسڵمانەکان هەر چی‌یەکیان دەست کەوت بە غەنیمەتی جەنگیان ژمارد کە لە دوژمنێکی جەنگاوەر بە جێ بمێنێ .. لە هەمان کاتدا کەوتنە شوێن هەڵاتوان ،

---

[129] حوسەیل لە ( إصابە ) دا بە حوسەیلی کوڕی خاریجە هاتووە . پێش فەتحی خەیبەر موسڵمان بووە . حوسەیل ئەڵێت : جەڵەبێك ئاژەڵم هێنا بۆ مەدینە هەتا بی‌فرۆشم . کە هاتمە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەی حوسەیل ! ئایا ئامادەی بیست صاع خورمات بدەمێ بەرامبەر بەوەی کە ببیتە دەلیلی هاوەڵەکانم بۆ سەر خەیبەر ؟ منیش وەهام کرد . ئەڵێ : پێی دام و منیش موسڵمان بووم ..

بەتایبەت دەستەی عویەینە کە ماوەیەك جەنگی کرد و پاشان هەڵات و ، موسڵمانەکانیش توانی‌یان سیخوڕێکی بکوژن و دوو پیاویشی بە دیل بگرن ، کە گەیشتنەوە مەدینە دوو دیلەکە موسڵمان بوون و ، پێغەمبەری خواش ﷺ بەری دان .

بەمە دوا نەخشەی هەڵمەتی هۆزەکانی نەجد بۆ سەر مەدینە تێك شکێنرا و ، موسڵمانەکان لەو مەترسی‌یە رزگار بوون .

شایانی باسە کە کاتێك عویەینە لە هۆزەکانی غەطەفان سوپای دژی مەدینە کۆ ئەکردەوە ، سەرداری هۆزی موڕڕە ، کە حاریثی کوڕی عەوف بوو ، هەروەك بۆ کۆمەکیی خەیبەر رەخنەی لە هەڵوێستی عویەینە هەبوو ، لەم کارەیشی‌دا لەگەڵیا نەبوو و ، تاقە پیاوێکی نەوەی موڕڕە ئامادەیی خۆی لەگەڵیا دەرنەبڕیی ..

جا کاتێك کە موسڵمانەکان عویەینەیان راو ئەنا ، حاریث تووشی عویەینە بوو ، کە سواری ئەسپێك بوو بوو و ، بە پرتاو هەڵ ئەهات ، حاریث داوای لێ کرد تا بوەستێ ، عویەینە وتی : ناتوانم بوەستم ، هاوەڵانی موحەممەد بە دوامەوەن .

حاریثی کوڕی عەوف وتی : ئیتر کاتی ئەوەت نەهاتووە کە ببینی لە چ هەڵوێستێك‌دای ؟ وا موحەممەد هاتۆتە ناوچەکەوە و ، تۆش بەبێ هیچ خۆت لەناو ئەدەی ..

حاریث ئەڵێ : لەسەر رێی ئەسپ سوارەکانی موحەممەد کشامەوە دواوە هەتا من ئەوان ببینم و ئەوان من نەبینن .. لە دوای نیوەڕۆوە هەتا شەو بەسەردا هات من لەوێ وەستام ، هەر کەسم بدیایە و ئەوان راویان بنایە ترس چووبووە دڵیەوە ..

دوای ئەوە حاریث تووشی عویەینە ئەبێتەوە و هەواڵی ئەداتێ کە موسڵمانان بە دوایان‌دا ناگەڕێن .. جا حاریث دەستی دایە ئامۆژگاریی عویەینە و وتی:

کابرا ! تۆیش و ئێمەش کارێکی روون و ئاشکرامان دیی .. دەربارەی نەوەی نەضیر و ، خەندەق و ، قورەیظە و ، پێش ئەوەش قەینوقاع و ، خەیبەر .. ئەمانە بەدەسەڵاتترینی جوولەکەی حیجاز هەر هەمووی بوون و ، هەموو کەسێ دانی بە ئازایەتیی و دەوڵەمەندی‌یان‌دا ئەنا .. خاوەنی قەڵای سەخت بوون .. خاوەنی دارخورمای زۆر بوون .. بەخوا ئەگەر عەرەب بچوایەتە پەنایان ئەدا .. ئەوەبوو حاریثەی کوڕی ئەوس ، کە لەگەڵ قەومەکەی‌دا ناکۆکی‌یان هەبوو ، چووە لایان و پەنایان دا .. پاشان دیت ئەوەی کە بەسەریان هات ، چۆن دەسەڵاتی نەهێشتن و دەوڵەتیان رووخا ؟

عویەینە وتی : بەخوا وەهایە ، بەڵام دەروونم لەگەڵمدا نایەت ..

حاریث وتی: موسڵمان ببە ..

وتی : ببمە شوێنکەوتە ؟ هەندێ لە خزمانم رۆیشتوون بۆ لای ، ئەوان هەر کەس دوای خۆیان موسڵمان ببێ بە کەمی ئەزانن . ئەڵێن : ئێمە جەنگی بەدر و هی تریشمان دیوە ..

حاریث وتی : ئەوەیە کە ئەیبینیی .. خۆ ئەگەر ئێمە لێی بچینە پێش ، ئەبینە یەکێ لە هاوەڵە پایەدارەکانی .

هەردووکیان هاتنە سەر ئەوە کۆچ بکەن بۆ مەدینە موسڵمان بن ، کەچیی لەو کاتەدا فەروەی کوڕی هویەیرەی قوشەیریی ، کە نیازی عومرەی هەبوو ، دای بەلایان دا و ئەوانیش خەریکی وت و وێژ بوون . باسەکەیان بۆ ئەویش گێڕایەوە .

فەروە وتی : خۆزگە پەلەتان نەکردایە هەتا بزانن لەم ماوەیەدا کە لەسەری رێک کەوتوون خزمەکانی چیی ئەکەن و ، من هەواڵیان بۆتان دێنم . ئیتر چوون بۆ مەدینەیان دوا خست و ، فەروە چوو بۆ مەککە ، سەرنجی بارودۆخی مەککەی دا ئەبینێ خەڵکی مەککە دژی پێغەمبەرن و هەرگیز بە تەما نین بە ویستی خۆیان موسڵمان بن . ئەویش هەواڵی سەرکەوتنی پێغەمبەریان ئەداتێ لە خەیبەردا و ، تێیشیان ئەگەیەنێ کە هەموو دانیشتوانی بیابان دژی موحەممەدن . قورەیش داوای را ئەکەن لە فەروە ، ئەویش پێیان را ئەگەیەنێ : با ئەم ماوەی رێکەوتنەیان بەسەر بچێ، هەموو عەرەب دێننە سەری و لە ناوی ئەبەن .

فەروە چەند رۆژێك لە مەککەدا مایەوە و بەسەر کۆڕەکانی قورەیشدا ئەگەڕا ، تا ئەوەبوو نەوفەلی کوڕی موعاویەی دیلیی هەواڵی هاتنی فەروەی بۆ مەککە بیست ، ئەویش هات بۆ مەککە و ، لەگەڵ فەروە کەوتنە وت و وێژ . نەوفەلیش دوژمنی موسڵمانەکان بوو .. پێی خۆش بوو رێک کەوتنی موسڵمانەکان و قورەیش هەڵ بوەشێتەوە ، بۆیە دای بە گوێی فەروەدا کە دوژمنێکی نزیکیان هەیە و دۆستی موحەممەدە، کە هۆزی خوزاعەیە. خۆزگە قورەیش کۆمەکی‌یان بکردایە هەتا لەناوی بەرن.

فەروە بەڵێنی بە نەوفەل دا کە سەرۆکە قورەیشی‌یەکان رازیی بکات . ئەوەبوو چاوی بە صەفوانی کوڕی ئومەییە و ، عەبدوڵڵا کوڕی ئەبورەبیعە و ، سوهەیلی کوڕی عەمر کەوت و پێی راگەیاندن کە کاری چاکیان نەکردووە . وتیان : ئەی چیی بکەین؟ وتی : کۆمەکیی نەوفەل بکەن دژی دوژمنەکەی هەردووکتان ، واتە خوزاعەی دۆستی

موسڵمانەکان . وتیان : ئەو کاتە موحەممەد بە سوپایەکی وەهاوە کە پێمان چار نەکرێ دێتە سەرمان و داگیرمان ئەکات . ئەو کاتە ئەبێ بچینە سەر بڕیاری ئەو، بەڵام ئێستە ئێمە ماوەمان لەگەڵیا هەیە و ، واین لەسەر دینی خۆمان.

فەڕوە گەڕایەوە لای نەوفەل و تێی گەیاند کە قوڕەیش هیچی لێ نایەت .

فەروە دوای عومرە گەڕایەوە لای عویەینە و حاریث و هەواڵی دانێ کە قوڕەیش دەستیان لە خۆیان شۆردووە و ، ئەمانیش با خەمی خۆیان بخۆن . ئەوانیش نەیان ئەزانیی چیی بکەن .[130]

**هەشتەم : ( عمرة القضاء )**

ئەم عومرەیە سێ ناوی هەیە : ( عمرة القضاء ، عمرة القضية ، عمرة القصاص ) .[131] دوای بەستنی پەیمانی حودەیبیە لە ساڵی شەشەمی کۆچییدا چەند ڕووداوێك ڕوویان دا و ، ساڵیش سووڕایەوە و ، کاتی ئەو عومرەیە هاتە بەرەوە کە قوڕەیش لە پەیمانی حودەیبیەدا پەیمانی دابوو ڕێ بە موسڵمانان بدات بێنە مەککەوە و عومرە ئەنجام بدەن .

کە مانگی ذولقەعیدەی ساڵی حەوتەم هاتە بەرەوە ، جارچیی پێغەمبەری خوا ﷺ جاڕی دا تا هاوەڵان خۆیان ئامادە بکەن بۆ بەجێ هێنانی عومرە . ئەوەبوو هەرچیی ئامادەی حودەیبیە بوو بوو ، جگە لەوانەی کە لە ماوەی ئەو ساڵەدا مرد بوون ، یان شەهید بوو بوون ، هەر هەموویان ئامادەی ئەو عومرەیە بوون و ، موسڵمانی تریش بەشداری یان کرد و ژمارەی موسڵمانە عومرەکەرەکان گەیشتە دوو هەزار ، جگە لەو ژن و منداڵانەش کە لەگەڵیانا هاتبوون . ئەمیریی مەدینەش بە عوەیفی کوڕی ئەضبەط ، یان بە ئەبوڕەهمی غیفاریی سپێررا ..

موسڵمانەکان ، بە تایبەت موهاجیرەکان ، سەردانی مەککەی پیرۆزیان زۆر پێ خۆش بوو ، بۆیە بەوپەڕی شەوق و تاسەوە خۆیان ئامادە کرد ..

---

[130] غزوة مؤتة لباشميل : ١١٧ ـ ١٢٩ ، الرحيق المختوم : ٣٩٣ ـ ٣٩٤ .

[131] کە ناونراوە ( عمرة القضاء ) مەبەست لە بە قەزا گێڕانەوەی عومرەی یەکەمی ساڵی پارە . هەرچەندە سوهەیلیی وەهای بۆ ئەچێ کە مەبەست لە صولح کردن و ڕێك کەوتنی حودەیبیەی نێوان موسڵمانەکان و موشریکەکانە. ناویش نراوە ( عمرة القضية ) بۆ بە قەزا گێڕانەوەی عومرەی ڕابوردووە . هەروەها ( قصاص ) یش بۆ جێ پڕکردنەوەی عومرەی حودەیبیە .

پێغەمبەری خوا ﷺ بە ( تلبية ) وتنەوە کەوتە ڕێ و ، موسڵمانانیش لەگەڵیا دووبارەیان ئەکردەوە و ، هەر هەمووشیان لە دەرگای مزگەوتەوە ئیحرامیان بۆ عومرە بەستبوو و ، ئاژەڵەکانی ( هدي ) شیان دابوو بەر .. ئەو بیابانە بە دیمەنێکی یەکجار قەشەنگ ڕازابوویەوە .. سوپای ئیمان بە دڵێکی گەرمی پڕ لە جۆشەوە بەرەو پیرۆزترین خاکی سەرزەویی .. بۆ کەعبەی پیرۆز کەوتبووە ڕێ .. ویرد و سروودی سەر زمانی یەکە یەکە لەو سەربازانە بریتیی بوو لە دروشمی تەوحید .. دڵەکان لەوپەڕی خۆشیی و شادیی‌دا بوون .. دەمێك بوو قوڕەیش سەردانی ماڵی خوای لێ قەدەغە کردبوون .. پاریش هەوڵیان دا بە بینینی کەعبەی پیرۆز و خاکی مویارەك چاویان بڕەژن ، بەڵام قوڕەیش قیرسیچمەیی کرد و، ماوەی نەدان .. وا ئەم ساڵ بە تەمان بەو ئاواتەیان بگەن .. دەمێك بوو کۆچ کەرانی مەککە شاخ و دۆڵی خۆشەویستی مەککەیان نەدیی بوو .. دڵیان هەڵ ئەقرچا بۆ دیتنی دیمەنە جوانەکانی نیشتمانی پیرۆز..

ئاژەڵەکانی ( هدي ) وەك ساڵی ڕابردوو شەصت وشتر بوون و ئەمساڵیش بە ناجیەی کوڕی جوندوبی ئەسلەمیی سپێررا بوون . بەڵام ئەم جارەیان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا چوار گەنجی خزمی ناجیە خۆی لەگەڵیا بن و یارمەتیی بدەن.

جا لەبەر ئەوەی نەوەکو قوڕەیش نیازی جەنگیان هەبێ لەگەڵ موسڵمانەکاندا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا ئەسپ و چەك لەگەڵ خۆیان بهێنن .. ئەسپەکانی بە موحەممەدی کوڕی مەسلەمە و چەکەکانیش بە بەشیری کوڕی سەعد سپارد . شایانی باسە کە ئەو چەکانە ئەوەندە هەبوون تا ئەو دوو هەزار سەربازە پڕ چەك بن. هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ کەتیبەیەك سوارچاکی چەك داری ئامادە کردبوو کە صەد کەس ئەبوون و ، فەرمانی بەسەریاندا دابوو کە لە پێش سوپای ئیسلامەوە بن، تا سنووری حەرەم.

هەندێ لە هاوەڵان ئەترسان هەڵگرتنی چەکی تەواو هەڵ وەشاندنەوەی پەیمانی حودەیبیە بێت . بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ تێی گەیاندن کە بەم چەکەوە ناچێتە ناو حەرەمەوە ، تەنها خۆ ئامادەکردنە بۆ کاتی پێویست ، چونکە ئەگەر قوڕەیش بزانێ موسڵمانەکان بێ‌چەکن لە کاتی ئەنجامدانی عومرەدا دەستیان لێ ئەوەشێنێ.

بەڵێ ئەم کارەی ئازیز بۆ پارێزگاریی لە پەیمانی حودەیبییە بوو ، نەك هەڵوەشاندنەوەی ، چونکە کە قوڕەیش چەکیان بینیی ، ئیتر شەڕ نافرۆشن و ، موسڵمانەکان کاری سەرشانی خۆیان ئەنجام ئەدەن و ، بێدەنگ ئەگەڕێنە دواوە .

کە گەیشتنە ( مَرّ الظهران ) چەند قوڕەیشی‌یەك تووشی موسڵمانەکان بوون و چاویان بەو ئەسپ و چەکانە کەوت .. بە پەلە گەڕانەوە مەککە و هەواڵیان بە قوڕەیش دا کە موسڵمانەکان چەکیان پێیە .. قوڕەیش ترسان و وتیان : بەخوا هیچ کارێکمان نەکردووە و ، لەسەر پەیمان و جەنگ وەستاندنی خۆمانین . ئیتر موحەممەد و هاوەڵانی بۆ داگیرمان ئەکەن ؟

کە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە ( بطن یأجج ) لەوێ ئەسپ و چەکەکانی هەر هەموو بەجێ هێشت و ، بە ئەمیریی ئەوسی کوڕی خەولیی ئەنصاریی بە دووصەد پیاوی سپاردن و، موسڵمانەکان تەنها بە چەکی سوارەوە، واتە شمشێر لە کێلاندا ، بەرە و مەککە ئەڕۆیشتن ..

قوڕەیش بە پەلە موکەررەزی کوڕی حەفص و چەند پیاوێکی ناردن و ، لە ( بطن یأجج ) تووشی موسڵمانەکان بوون . وتیان : ئەی موحەممەد ! تۆ چ بە منداڵیی چ بە گەورەیی غەدرت پێوە نەبینراوە ، خۆ تۆ ئەوەت بە مەرج گرتبوو کە بە شمشێری ناو کیلانەوە بچیتە ناو مەککەوە ..

فەرمووی : (( إني لا أدخل عليهم السلاح )) . فەرمووی : ئەو چەکانە نابەمە ناو مەککەوە .

موکەررەز وتی : هەر بەم سیفەتانەوە ناسراوی : چاکەکاریی و وەفا .. ئەوەبوو گەڕایەوە مەککەو هەواڵەکەی بە قوڕەیش دا ..

کە سوپای ئیسلام لە مەککە نزیك کەوتەوە ، بت پەرستەکانی مەککە لە شار دەرچوون و چوونە سەر لووتکەی چیاکان تا لەوێوە سەیری موسڵمانەکان بکەن .. هەندێکیشیان ئەوەندە داخ لە دڵ بوون پێیان ناخۆش بوو چاویان بە پێغەمبەر و موسڵمانەکان بکەوێ ، بۆیە دوور کەوتنەوە .

دوای ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە شیوی ( یأجج ) پاسەوانیی چەکەکانی رێك و پێك کرد ، بەرەو ( ذوطوی ) کەوتە ڕێ .. لەوێ ئاژەڵەکانی وەستاند هەتا هەموو هاوەڵان بگەنە بەرەوە . لەو کاتەدا سواری وشترەکەی ( القصوی ) بوو بوو و ، هاوەڵە دڵسۆزەکانی بە شمشێرەوە دەوریان گرتبوو و ، هەر هەموو خەریکی وتنی ( تلبیة )

بوون و دەنگیان بەرز کردبوویەوە : (( لبيك اللهم لبيك ، لبيك لا شريك لك لبيك . إن الحمد والنعمة لك والملك ، لا شريك لك )) .
کافرەکانی مەککە بەسەر چیاکانەوە سەیری دیمەنی ئیمانیان ئەکرد .. وا پێغەمبەر و هاوەڵانی بەرەو کەعبەی پیرۆز ئەکشێن .. ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە ئەوان چاوەڕوانی بوون .. بە دڵی خۆیان بە کۆڵانەکانی مەککەدا بگەڕێن و کەسێك نەتوانێ دەست بێنێتە ڕێیان ..
کافرەکان بیریان لەو ڕۆژە ئەکردەوە کە حەوت ساڵ لەوەو بەر چۆن ئەو ئیماندارە بەستەزمانە بێتاوانانەیان لەسەر ماڵ و حاڵی خۆیان دەرپەڕاند ، کەچیی وا ئێستە دینەکەیان پەرەی سەندووە و ، قورئانەکەیان خەڵکێکی زۆری کەمەندکێش کردووە و، بوونەتە سەربازی گیان فیداکاری ئیسلام و ، موحەممەدی ئازیزیان لە هەموو خۆشەویستێکیان بەلاوە خۆشەویستترە .
حەوت ساڵ لەوە و پێش ستەمکارانی مەککە خەلاتێکی صەد وشتری یان دانا بوو بۆ هەرکەسێ ، بە مردوویی یان بە زیندوویی سەری موحەممەدیان بۆ بهێنێ ، کەچیی وا ئێستا لەگەڵ ئەو هەمووە هاوەڵە دڵسۆزەی‌دا بە سەری بەرزەوە بەرەو کەعبەی شەریف ئەکشێن .. هاتوون ڕێز لە ماڵی خوا بگرن و ، بی‌سەلمێنن ئەم دینەیە وا خوا پێی ڕازی‌یە و ، دینی قورەیش بتپەرستی‌یە و ، لە دینی ئیبراهیمەوە سەلامی لێ بێ زۆر دوورە ..
با هەموو دنیا ببینێ وا ئاشتی‌خوازانی مەدینە بەوپەڕی دەسەڵاتەوە هاتوونەتە سەردانی ماڵی خوا و ، نیازی هیچ ستەم و دەستدرێژی‌یەکیان نیە .. ئەیانەوێ خوا ڕازیی بکەن .. خوایش ڕاستیی و پاکیی و دادی ئەوێ ..
بەڵێ شێر و پڵنگەکانی مەدینە هەموو دەسەڵاتێکیان هەبوو ، بتپەرستانیش ئەیانزانیی تازە بیروباوەڕەکەی ئەوان خەریکە ئەچێتە زبڵدانی مێژووەوە ..
موسڵمانەکان لە باکوورەوە لەلای ( حجون ) ەوە چوونە ناو مەککەوە و ، هەتا تێکەڵ بە خانووەکانی بوون هەر خەریکی وتنی ( تلبية ) بوون . ئیتر لەوێ لە ( تلبية ) وەستان .
عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەی ئەنصاریی جڵەوی وشترەکەی پێغەمبەری خوای ﷺ گرتبوو و ، لە ( حجون ) ەوە بەرەو کەعبەی شەریف ئەهاتن و ، هاوەڵە موهاجیر و ئەنصار، پایەدارەکانیش دەوری پێغەمبەریان دابوو ، بەڵام هەر هەموو لە بەر و دوا

و، لە راست و چەپیەوە بە رێکیی ریزیان بەستبوو و ، لەوپەڕی ویقار و دامەزراوییدا و، بە ملی کەچ و خشووعەوە بۆ خوای گەورە و ، بە سوپاس و ستایشەوە بۆ ئەو رۆژە رووناکەی کە خوا لە خۆیان و لە دینەکەیانی کردەوە ، رێیان ئەبڕیی ..

لە هەمووی سەیرتر لەو رۆژە مێژوویی‌یەدا ئەو رەفتار و هەڵس و کەوتە جوانە بوو کە هاوەڵان ژیانی رۆژانەیان پێ رازاندبۆوە ، ئەمە دڵ و دەروون و مێشکی پیاوە ژیرەکانی قوڕەیشی هەژاند .. ئەمانە ئەم یەکیەتیی و برایەتیی و گوێ ڕایەڵی‌یە ناوازە بێ‌وێنەیە لە کوێ فێر بوون ؟!

هەر هەمووی بێ‌دەنگ .. لەسەر خۆ .. نەرم و نیان بەرێوە ئەڕۆیشتن .. لە جیاتیی رق و قین چاوپۆشیی و برایەتیی فێر بوو بوون ..

ئەوانەی ئەمڕۆ بە فەرمانی قورئان پەروەدە کراون و بوونەتە سەربازی گیان فیدای ئیسلام و ، هەموو رەوشتێکی بەرزیان پێوە دیارە ، تا دوێنێ بوو ، لە نەفامیی‌دا ئەگەوزانەوە .. خەریکی دژایەیتی و ، دەستدرێژیی و ، حەرام‌خواردن بوون ..

موسڵمانەکان لەم رۆژە رووناکەدا ئەژیان ، کەچیی لەولاوە کافرانی مەککە ، کە شاریان چۆڵ کردبوو و پەرپیی‌بوونە سەر لووتکەی چیاکانی مەککە لەوپەڕی خەجاڵەت‌دا ئەژیان ..

ئەو دینەی ئەوان بەرگری‌یان لێ کرد و پیاوی پاڵەوانیان لە پێناوی‌دا بە کوشت دا، خەریکە بەتاڵ ئەبێتەوە ..

جا لەبەر ئەوەی کە دانیشتوانی مەککە بە رەوشت و هەڵوێستی موسڵمانەکان دڵ خۆش نەبن و ، دڵیان نەچێتە سەر ئەو دینەی کە پەروەردەی کردوون ، کافرەکان کەوتنە پاگاندە دژی موسڵمانەکان کە گوایا موسڵمانەکان لەڕ و لاواز بوون و تووشی تا و نەخۆشیی یەثریب بوون و ئەو نەخۆشی‌یە لە گۆی خستوون . کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم هەواڵەی بیست ، کەوتە بیری ئەوە کە ئەم پاگاندەیە لە دڵ و دەروونی قوڕەیش‌دا بشواتەوە ، بۆ ئەمە خۆی ( إضطباع ) ی کرد ، واتە قوماشەکەی سەرشانی راستی خستە ژێر باڵی راستیەوە و ، پاشماوەکەشی خستە سەر شانی چەپی و ، دەستی بە هەروەلە کرد و ، فەرمانی دا تا موسڵمانەکانیش وەك ئەو بکەن و فەرموویشی :

(( رحم الله امرأً أراهم اليوم من نفسه قوة )) .

فەرمووی : سۆزی خوا بەسەر کەسێكدا برژێ کە ئەمڕۆ لەبەر چاویان‌دا خۆی بەهێز دەربخات .

هەرچیی دەستی لە بەردە رەشەکە ئەدا دەستیشی بە هەروەلە ئەکرد و ، موسلمانەکانیش هەروەلەیان ئەکرد ، تا کە ئەگەیشتە لای روکنی یەمانیی و ئەکەوتە پەنای کەعبەوە و لە موسلمانەکانەوە دیار نەبوو لەسەر خۆ بەڕێوە ئەچوو و ئەوانیش بە هەمان شێوە ، هەتا جارێکی تر ئەگەیشتەوە لای بەردە رەشەکە و دیسان هەروەلەی ئەکردەوە .. بەم شێوەیە سێ سووڕی یەکەمی بەسەر برد و ، چوارەکەی تریش لەسەر خۆ بەڕێوە ئەچوون . خۆ ئەگەر بەزەیی بە موسلمانەکان‌دا نەهاتبایەتەوە هەموو سووڕەکانی بە هەروەلە پێ تەواو ئەکردن ..

کە کافرەکانی مەککە چاویان لە هەلمەت و تەکانی موسلمانەکان بوو ، ئەیان وت: ئا ئەمانە بوون ئەتان وت تا و نەخۆشیی لە گۆی خستوون . خۆ ئەمانە ئەوەندە و ئەوەندە لێ هاتوون ..

دوای طەواف دوو رەکعەت نوێژیان لەلای مەقامی ئیبراهیمدا ئەنجام دا و ، پاشان سەعیی نێوان صەفا و مەروەشیان بەجێ هێنا . ئاژەلەکانی ( هدي ) شیان لەلای مەروە وەستاند و فەرمووی : (( هذا المنحر وكل فجاج مكة منحر )) . فەرمووی : ئەمە شوێنی حەیوان سەربڕینە و ، هەموو کۆلانێکی مەککە شوێنی حەیوان سەربڕینە . ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ لە نزیك مەروەدا حەیوانەکانی سەربڕیی و ، هەر لەوێش سەری تاشیی و ، موسلمانەکانیش بە دوای‌دا ..

کە موسلمانەکان عومرەیان تەواو کرد ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا کۆمەلێك لە موسلمانان بچن بۆ ( بطن يأجج ) تا جێی پاسەوانانی چەك و ئەسپەکان بگرنەوە و ، ئەوانیش بێنە مەککەوە و عومرە ئەنجام بدەن ..

دوای بەجێ هێنانی کاروباری عومرە ، پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بۆ لای قورەیش کە پێی خۆشە بچێتە ناو کەعبەوە ، کەچیی رێیان پێ نەدا ، بەو بیانووەی کە لە بەندەکانی پەیمانی حودەیبیەدا شتی وەها نەنووسراوە . ئەویش وازی هێنا تا ئەوەبوو لە سالی هەشتەم‌دا و ، دوای فەتحی مەککە چووە ناویەوە.

دوای ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا بیلال سەربکەوێتە سەر کەعبە و بانگی نیوەڕۆ بدات . کافرەکانی مەککە ئەمەیان زۆر پێ ناخۆش بوو ، چونکە بیلال

بەندەیەکی حەبەشیی ڕەش پێست بوو و ، لەلایەکی تریشەوە فەرمایشتی تەوحیدی بە دەنگی بەرز ئەدا بە گوێی خەڵکدا ..

ئەوەبوو عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل وتی : خوا ڕێزی لە ئەبولحەکەم ـ واتە ئەبوجەهل ـ گرت وا بە گوێی ئەم کۆیلەوە نەبوو ئەمە بڵێ .

خالیدی کوڕی ئوسەیدیش [١٣٢] وتی : سوپاس بۆ خوا کە باوکمی لەناو برد و ئەمڕۆی بە چاوی خۆی نەدیی وا بیلال بەسەر کەعبەوە ئەزەڕێ .

سوهەیلی کوڕی عەمریش لەگەڵ چەند پیاوێکدا کە دییان وا بیلال سەرکەوتە سەر کەعبە و ، بانگیان لە دەمی بیست ، لە داخانا دەم و چاویان داپۆشیی .

پێغەمبەر و موسڵمانەکان سێ ڕۆژ لە مەککەدا مانەوە .. طەوافیان ئەکرد و ، نوێژیان بەجێ ئەهێنا و ، لە ئاوی زەمزەم دەفریان پڕ ئەکرد و ، تاسەیان لە کەعبەی پیرۆز شکا .

لەم عومرەیەدا پێغەمبەری خوا ﷺ دواهاوسەری مارە کرد .. ئەوەبوو فەرمانی دا بە جەعفەری کوڕی ئەبوطالیب تا پێشی بکەوێ و بچێ خوازبێنیی مەیموونەی کچی حاریثی عامیریی بۆ بکات ، کە خوشکی ئوم فەضلی هاوسەری عەبباسی کوڕی عەبدولموطەللیب و خوشکی دایکیی ئەسمائی کچی عومەیسی هاوسەری جەعفەر و ، خوشکی سەلمای کچی عومەیسی هاوسەری حەمزەی سەرداری شەهیدان بوو و ، لەوە و پێشیش هاوسەری ئەبوڕەهمی کوڕی عەبدولعوززا یان حوەیطبی کوڕی عەبدولعوززا بووە.

مەیموونە کاری شووکردنی خۆی دابووە دەست ئوم فەضل ( لُبابة الکبری ) ی خوشکی و ئەویش ئەو کارەی بە عەبباسی مێردی سپاردبوو .. کە بێوەژن کەوتبوو عەبباس خستیە بەرچاوی پێغەمبەری خوا کە بی‌خوازێ ، ئەویش ڕەزامەندیی نواند.. ئەوەبوو عەبباس چوارصەد دیرهەمی کردە مارەیی .

---

[١٣٢] خالیدی کوڕی ئوسەیدی کوڕی ئەبولعاصی کوڕی ئومەییەی کوڕی عەبدشەمس بووە . برای عەتتابی کوڕی ئوسەید بووە . ساڵی فەتحی مەککە موسڵمان بووە .. یەکێ بووە لەوانەی کە دڵیان ڕاگیر کراوە . عەتتابی برای لە گەورە پیاوان و فەرمانددەکانی هاوەڵان بووە .. لە جەنگی پاشگەزبووەکاندا عەتتاب ئەی‌کاتە ئەمیری یەکێ لە سریەکان .. لە ڕۆژی یەمامەدا ون بووە . ( سەیری إصابە بکە ) .

لە کاتێکدا کە مەیموونە بەسەر وشترێکەوە سوار بوو بوو ، ئەوەی پێ گەیشت کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خۆی خوازبێنیی کردووە . ئەویش وتی : وشترەکە و ئەوەش کە وا بەسەریەوە پێشکەشی پێغەمبەری خوا بێت .

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی‌ویست لە مەککەدا بمێنێتەوە هەتا هاوسەرە تازەکەی بگوازێتەوە ، کەچیی سەر لە بەیانی رۆژی چوارەم سوهەیلی کوڕی عەمر و ، حوەیطبی کوڕی عەبدولعوززا هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ کە لەگەڵ سەعدی کوڕی عوبادەدا فەرمایشتی ئەکرد . حوەیطب هاواری کرد : لەبەر خاتری خوا و پەیمانی نێوانمان لە خاکمان دەرچۆ ، وا سێ رۆژەکە تەواو بوو .. سەعد وتی : درۆت کرد . نە خاکی تۆیە و نە هی باوباپیرت .. بەخوا دەرناچێت . خێرا پێغەمبەری خوا ﷺ ناکۆکی‌یەکەی چارەسەر کرد و بە دوو پیاوەکەی فەرموو : (( إني قد نكحت فيكم امرأة ، فما يضركم أن أمكث حتى أدخل بها ، ونصنع الطعام ونأكل وتأكلون معنا ؟ )) . فەرمووی : ئافرەتێکم لە ناوتان‌دا مارە کردووە ، چیی تیایە بۆتان لێرە بمێنمەوە هەتا بی‌گوازمەوە و، نان دروست بکەین و پێکەوە بی‌خۆین ؟ ئەمەش بۆ دڵ دانەوەیان . کەچیی رازیی نەبوون و ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا بە ئەبوڕافیع تا بار بکەن . باریان کرد هەتا گەیشتنە دێیەکی نزیك مەککە کە پێیان ئەوت سەریف و لەوێ لایان دا و ، پێغەمبەری خوا ﷺ مەیموونەی گواستەوە ، دوای ئەوە باریان کرد و بەرەو مەدینە کەوتنە رێ و ، زمانیشیان خەریکی سوپاس و ستایشی خوای گەورە بوو ، لەسەر ئەوەی کە بەڵێنی خۆی بردە سەر و ، پشت‌گیریی لە بەندەکەی کرد و سەری خست ..

موسڵمانەکان هەردەم خەریکی دووبارە کردنەوەی ئەم ئایەتە پیرۆزە بوون :

﴿ لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ ۖ لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ ۖ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا۟ فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا ﴾ ( الفتح : ٢٧ ) .

ویستی خوا وەها بوو مەیموونە لە ساڵی پەنجا و یەکەم یان شەصت و یەکەمی کۆچیی‌دا لە گوندی سەریف‌دا کۆچی دوایی بکات و هەر لەوێش بنێژرێ ، خوا لێی رازیی بێ ..

سەرەڕای ئەوەی کە مەیموونە خوشکی ئوم فەضل و ئەسماء و سەلما بوو و خزمایەتی‌یان پتەوتر ئەبوو ، مەیموونە خوشکی ( لُبابة الصغری ) ی دایکی خالیدی کوڕی وەلید بوو ، کە ئەبووە هۆی ڕاکێشانی دڵی خالید ، هەروەها پەیوەندییش لەگەڵ بەڕێزترین هۆزی عەرەبدا پتەو ئەبوو کە نەوەی هیلال بوو . پێغەمبەری خوا ﷺ بە چاوێکی ڕێزەوە سەیری ئەو چوار خوشکەی ئەکرد و ناوی نابوون : (( الأخوات المؤمنات )) . کە پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی مەککە بەجێ بهێڵێ فاطیمەی کچی حەمزەی شەهیدی ئوحود ، کە کچۆڵەیەکی بچکۆلە بوو ، کەوتە دوای و ئەی‌وت : مامە گیان ! مامە گیان ! عەلیی کوڕی ئەبوطالیب گرتی‌یە لای خۆی و ، بە فاطیمەی هاوسەری فەرموو : کچەکەی مامەت با لای تۆ بێ ، ئەویش لەگەڵ خۆیدا هێنای .

کە گەیشتنەوە مەدینە عەلیی و زەیدی کوڕی حاریثە و جەعفەری کوڕی ئەبوطالیب ، هەریەکەیان داوای ئەکرد کە ئەو کچە بدرێتە لای ئەو.

عەلی ئەی فەرموو : خۆم هێناومەتەوە و ، ئامۆزامە و ، کچەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاوسەرمە و ، ئەو زیاتر مافی پێوەی هەیە . جەعفەریش ئەی وت : ئامۆزامە و پووریشی واتە خوشکی دایکی هاوسەرمە . زەیدیش ئەی وت : برازامە ، مەبەستی لەوەبوو پێغەمبەر ﷺ زەید و حەمزەی کردبوونە برای یەك .. ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ دایە لای پووری واتە ئەسمائی کچی عومەیس کە هاوسەری جەعفەر بوو و فەرمووی : (( الخالة بمنزلة الأم )) . فەرمووی : پوور لە جێی دایکە . پاشان دڵی هەرسێکیانی دایەوە .

ئەوەبوو بە عەلیی فەرموو :

(( أنت مني وأنا منك )) .

بە جەعفەریشی فەرموو :

(( أشبهت خَلقي و خُلُقي )) .

فەرمووی : بە لاشەش و بە ڕەوشتیش لە خۆم ئەکەیت .

بە زەیدیشی فەرموو :

(( أنت أخونا ومولانا )) .

فەرمووی : تۆ برا و گەورەمانی .

که ئەو کچە گەورە بوو ، عەلیی بە پێغەمبەری فەرموو : ئایا کچەکەی حەمزە مارە ناکەیت ؟ فەرمووی :

(( إنها إبنة أخي من الرضاعة )) .

فەرمووی : کچی برای شیریمە .

شایانی باسە کە قورەیش بە دیتنی موسڵمانەکان لە نزیکەوە هەڵوێستیان گۆڕا ..

جاران وایان پێ گەیشتبوو کە موسڵمانەکان کۆمەڵێك خەڵکی ئاژاوەچیین کە لە دینی خۆیان وازیان هێناوە و سەرگەردان بوون . کەچیی کە چاویان پێیان کەوت تێ گەیشتن کە یەك بە یەکی هاوەڵان رەوشت و هەڵس و کەوتیان گۆڕاوە .. دڵ و دەروونیان ئەوەندە پاك بۆتەوە ، هەموو ئاواتێکیان بریتی‌یە لە خزمەتی مرۆڤەکان و، بوونەتە خاوەنی بەزەیی و خۆشەویستیی و لێبوردنێکی کەموێنە ..

ئەم سەرنجدانە کارێکی گرنگی کردە سەر دڵ و دەروونی قورەیشی‌یەکان ، بە شێوەیەك کە هەریەکەیان بگاتە ئەو قەناعەتە کە دینی قورەیش هیچی تیا بەسەر نیە و ، دینی ئیسلام لە سەرانسەری زەویی‌دا بڵاو ئەبێتەوە .. کەواتە ئەو خۆی ماندوو ئەکات وا دژی دینێك ئەوەستێ کە رۆژێك دێت باوەشی خۆشەویستیی بۆ ئەکرێتەوە.. چونکە کۆمەڵە سەربازێك ئالای دینی تازەیان هەڵ گرتووە لە کێوەکان دامەزراوترن و ، هیچ هێزێکی سەرزەوییش ناوێرێ لەبەر دەمیان‌دا بوەستێ ، نموونەی ئەمانە خالیدی کوڕی وەلید و ، صەفوانی کوڕی ئومەییە و ، عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل و ، خالیدی کوڕی ئوسەید و، عەمری کوڕی عاص و ، موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان ..

لە راستیی‌دا دانیشتوانی مەککە بوونە دوو بەشەوە : دەستەیەك دڵ و دەروونی پڕ بوو بوو لە ترس و لەرز لە موسڵمانەکان کە بوونەتە خاوەنی سوپایەکی چار نەکراو .. دەستەیەکیش گەیشتبوونە قەناعەت کە ئیسلام دینی حەقە و ، راست نیە مرۆڤی ژیر لەوە زیاتر لێی دوا بکەوێ .

یەکێ لەوانەی کە دڵی چووبووە سەر ئیسلام خالیدی کوڕی وەلید بوو ، کە پاڵەوانی لێهاتووی قورەیش و ، فەرماندەی ئەسپ سوارانی بوو ، بە رادەیەك کە خۆی پێ نەگیرا و درکاندی و پێی راگەیاندن کە لەمرۆ بە دواوە بۆ هیچ پیاوێکی ژیر نیە لە موسڵمانبوون دوا بکەوێ ، چونکە دینی ئیسلام راستە و ، هەرکەس دژی بووەستێ خوای لێ ئەرەنجێ ..

ئەوەبوو دوای گەڕانەوەی موسڵمانەکان لە بەجێ هێنانی عومرەکەیان بە سێ مانگ خالید لەناو کۆمەڵێکی قورەیش‌دا وەستا و، بەوپەڕی دەنگی بەرزیەوە وتی: بۆ هەموو خاوەن ژیری‌یەك روون بۆتەوە کە موحەممەد نە ساحیرە و ، نە شاعیرە و، فەرمایشتەکانی فەرمایشتی ( رب العالمین ) ن و ، لەسەر هەموو ژیرێك پێویستە شوێنی بکەوێ ..

عیکریمە کە خالید ئاسا پاڵەوان بوو و ، ئەویش لە فەرماندایەتیی سوارچاکان‌دا هاوەڵی بوو ، ئەمەی بە دڵ نەبوو و وتی : بە راستیی ، لە دین وەرگەڕایت ، خالید !

خالیدیش بەوپەڕی ئازایەتی‌یەوە وەڵامی دایەوە : لە دین وەرنەگەڕاوم ، بەڵکو موسڵمان بووم .

عیکریمە وتی : ئەگەر لەناو قورەیش‌دا کەسێك هەبێ لە هەموان زیاتر مافی ئەوەی هەبێ کە ئەم قسەیە نەکات ئەوە تۆی .

خالید وتی : بۆچ ؟

عیکریمە وتی : چونکە موحەممەد شەرەف و پایەداریی باوکتی هێنایە خوارەوە کە لە بەدردا زامدار بوو و ، مامەت و ئامۆزاکەتی کوشتن . دە بەخوا من نە موسڵمان ئەبم و ، نە ئەو قسەیەی تۆش ئەکەم ، ئەی خالید ! نابینی قورەیش ئەیانەوێ بچن بە گژیا ؟

خالید وتی : ئەوە کار و دەمارگیریی نەفامی‌یە .. بەڵام بەخوا من کە راستییم بۆ دەرکەوتووە موسڵمان بووم ..

ئەم قسانەی خالید گەیشتنەوە لای فەرماندەی گشتیی سوپای مەککە ، ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب ، بۆیە بە تووڕەیی‌یەوە هات و لە خالیدی پرسیی کە ئایا ئەوەی بیستوویەتی راستە ؟

خالید وتی : بەڵێ ، راستە .

ئەبوسوفیان تووڕە بوو و وتی : بە لات و عوززا ئەگەر بزانم ئەوەی کە ئەی لێیت بە راستتە ، ئەوا بەر لەوەی بچم بە گژی موحەممەددا ، بە گژی تۆدا ئەچووم.

خالید وتی : دە بەخوا راستە.

ئەبوسوفیان بە تووڕەیی‌یەوە بەرەو خالید ئەکانی دا و ئەی‌ویست بچێت بە گژی‌دا، خێرا عیکریمە کەوتە نێوانیانەوە و ، بە ژیرانە وتی : ئەبوسوفیان لەسەرخۆ ، بەخوا منیش لە ترسی ئەوەی شتێ روو نەدات ئەگینا ئەوەی خالید وتی ئەم وت و،

ئەچوومە سەر دینەکەی . ئێوە ئەتانەوێ لەسەر بۆچوونێك کە خالید بە چاکی زانیوە بی‌کوژن . بەخوا ترساوم کە سالّی بەسەردا نەیەتەوە و دانیشتوانی مەککە هەموو شوێنی بکەون .. [١٣٣]

**نۆهەم : حەرام‌کردنی گۆشتی گوێدرێژ**

یەکێ تر لە رووداوەکانی سالّی حەوتەمی کۆچیی بریتیی بوو لە حەرام کردنی گۆشتی گوێدرێژی مالّیی و ، دڕندەی کەلّبەدار و ، بالّندەی چڕنووق‌دار . ئەمەش لە غەزای خەیبەردا .. بوخاریی و موسلیم لە صەحیحەکەیان‌دا ، لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە خوا لێ‌یان رازیی بێ ، ریوایەتیان کردووە کە وتوویە : لە رۆژی خەیبەردا پێغەمبەری خوا ﷺ خواردنی گۆشتی گوێدرێژی مالّیی قەدەغە کرد ..

موسلیم‌یش لە ئیبن عەبباس‌ەوە ریوایەتی کردووە کە وتوویە : پێغەمبەری خوا ﷺ لە خواردنی گۆشتی هەموو دڕندەیەکی کەلّبەدار و ، هەموو بالّندەیەکی چڕنووق دار قەدەغەی کردین . ریوایەتەکەی تیرمیذییش دەری خستووە کە ئەوە لە خەیبەردا بووە. [١٣٤]

**دەهەم : حەرام‌کردنی ( نكاح المتعة )**

هەروەها لە خەیبەردا پێغەمبەری خوا ﷺ نیکاحی ( متعة ) ی حەرام کرد ، کە بریتییە لە ژن‌هێنانێکی کاتیی ، کە نە تەلاقدانی پێویستە و نە عیددە و ، نە میراتیشی لێ وەرئەگیرێ ، ئەم جۆرە نیکاحە هی سەردەمی نەفامیی عەرەبەکان بوو. جا کە ئیسلام هات لە هەندێ غەزادا بۆ پێویستیی رێگای دا . دەربارەی حەلاّلیی نیکاحی ( متعة ) و پاشان حەرام‌کردنی فەرموودەی زۆر هەن بە تایبەت لە بوخاریی و موسلیم‌دا ..

کورتەی باسەکەش ئەمەیە کە دووجار ئەو نیکاحە حەرام کراوە . جارێك لە خەیبەر و جارێکیش لە فەتحی مەککەدا تەنها سێ رۆژ ماوەی درا ، ئیتر بە شێوەیەکی یەکجاریی هەتا رۆژی قیامەت حەرام کرا .. بەمە هەموو زانایانی ئیسلام بە یەك‌دەنگیی هاتوونەتە سەر حەرام‌کردنی هەتا هەتایی ، جگە لە شیعە رێیان پێ

---

[١٣٣] الرحيق المختوم : ٣٩٥ ـ ٣٩٧ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٣٧٥ ـ ٣٨٠ ، ٣٨٦ ـ ٣٨٧ ، غزوة مؤتة لباشميل : ١٢٩ ـ ١٧٢ .

[١٣٤] السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٣٨١ .

داوە ، هەرچەندە لە بوخاریی و موسلیمدا لە ئیمامی عەلی‌یەوە ریوایەت کراوە کە پێغەمبەر ﷺ ئەو نیکاحەی قەدەغە کردووە و ، ڕێ‌پێ‌دانیشی نەسخ کراوەتەوە .
( صحيح مسلم بشرح النووي : ٩ / ١٧٩ ـ ١٨١ ، فتح الباري بشرح صحيح البخاري : ٩ / ١٣٦ ) .[١٣٥]

**یانزەهەم : سریەی ئیبن ئەبولعەوجاء**

دوای گەڕانەوەی سوپای ئیسلام بۆ مەدینە چەند سریەیەك بۆ تەمێ کردنی ناحەزان بە ڕێ کران کە یەکێکیان لە ساڵی حەوتەم و ئەوانی تریش لە ساڵی هەشتەم دا بوون .

ئەم سریەیە لە مانگی ذولحەججەی ساڵی حەوتەم دا بە ڕێ کرا ، کە بریتیی بوو لە پەنجا پیاو و ، بە فەرماندایەتیی ئیبن ئەبولعەوجاء ، نێرران بۆ سەر نەوەی سولەیم ، تا بانگیان بکەن بۆ سەر ئیسلام . وتیان : هیچ پێویستی‌یەکمان بەوە نیەکە بانگمان ئەکەی بۆ سەری . ئەوەبوو دەستیان دایە جەنگێکی خوێناویی سەخت ، کە فەرماندەی موسڵمانەکان زامدار بوو و ، لە دوژمنیش دوو پیاو بە دیل گیران .[١٣٦]

[١٣٥] السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٣٨١ ـ ٣٨٢ .
[١٣٦] الرحيق : ٣٩٧ .

## بەشی سیی و پێنجەم

# ڕووداوەکـانـی سـاڵـی هـەشـتـەم

**یەکەم : موسڵمان بوونی خالید و عەمر**

یـەکێ لـە ڕووداوە گرنگـەکانی سـاڵی هەشـتـەمی کۆچـیی ، کـە بـووە مایـەی بەهێزبوونی سەربازگەی ئیسلام و ، لاوازبوونی سەربازگەی قوڕەیش ، موسڵمان بوونی سێ فەرماندەی قوڕەیشیی ناودار بوو ، کە ئەوەبوو مەککەیان بەجێ هێشـت و ، بـە ویستی خۆیان ، خۆیان گەیانـدە مەدینـە و موسـڵمان بـوون .. ئـەو سـێ فەرمانـدە پاڵەوانەش خالیدی کوڕی وەلید و ، عەمری کوڕی عاص و ، عوثمانی کـوڕی طـەلحـە بوون..

خالیدی کوڕی وەلید سوارچاکی قـوڕەیش و ، فەرمـانـدەی هێـزی ئەسـپسـواران بوو..

عەمری کوڕی عاص‌یش پەنای قوڕەیش بوو بۆ چارەسـەرکردنی هـەر گیروگرفتێـك کە بهاتایەتە ڕێی ، چونکە عەمر خاوەنی ژیریی و سەلیقەیەکی وەهابوو کە پەی بـە هەموو کارێك ئەبرد ..

عوثمانی کوڕی طـەلحەش سەرداری نەوەی عەبدوددار بوو ، کـە هـەڵ گـری ئـاڵای قوڕەیش و ، کلیلەوانی کەعبە بوون ..

لە پێشەوە شتێکمان دەربارەی دڵگۆڕانی خالید باس کرد ، کە بە ئاشکرا لەبەردەم ئەبوسوفیان‌دا دەری بڕیی کە دڵی بەرەو موسڵمان بوون گۆڕاوە .. ئێسـتـەش وا خـۆی چیرۆکی مـوسڵمان‌بوونی ئەگێڕێتەوە .

خالید ئەڵێت : کە خوای گەورە ویستی خێـرم بەسـەردا ببـارێنێ ، خۆشەویستیی ئیسلامی خستە دڵمەوە و ، ژیرییم لەلام جەم بوو . وتم : ئـەم هـەموو هەڵوێسـتانەم دژی موحەممەد بینیون ، کەچیی کە لە هەر هەڵوێستێك دەرئەچم ئەبینم کارەکەم لـە جێی خۆی‌دا نیە و ، موحەممەدیش سەرئەکەوێت .. کاتێکیش کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەو حودەیبیە کەوتە ڕێ ، منیش لەگەڵ سوارچاکانی بت پەرستان کەوتمە ڕێ و ، لە

عوسفان تووشی پێغەمبەری خوا و هاوەڵانی بووم و ، هاتمە بەر دەمی و ڕێم پێ گرت، ئەویش نوێژی نیوەڕۆی ، لەبەر دەممان‌دا ، بە هاوەڵانی کرد و ، ویستمان هەڵمەت بەرینە سەری ، کەچیی بۆمان ڕێك نەکەوت و ، خێری تیا بوو ، ئەوەبوو بەو نیازەی دڵمانی زانیی و نوێژی عەصری بە شێوەی نوێژی ترس بە هاوەڵانی بەجێ هێنا ، بۆیە شتێك کەوتە دڵمەوە و وتم : ئەم پیاوە پارێزراوە و ، بڵاوەمان لێ کرد ..

ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای ڕاست‌دا لای دا و ، خۆی لە ئەسپ سوارەکانمان لادا. کاتێکیش کە لە حودەیبییەدا لەگەڵ قورەیش‌دا ڕێك کەوت و ، قورەیش لە ( رواح ) دا بەرگریی کرد ، لە دڵی خۆم‌دا وتم : ئیتر چیی ماوەتەوە ؟ بۆ کوێ بڕۆم ؟

بۆ لای نەجاشیی ؟ ئەو خۆی شوێنی موحەممەد کەوتووە و ، هاوەڵانیشی لە پەنای‌دا لە خۆیان بێ‌خەمن .

ئایا بچم بۆ لای هیرەقل ؟ واتە لە دینەکەی خۆم دەرچم و بچمە سەر نەصرانیەت یان یەهوودیەت ؟

ئایا بچم شوێن‌کەوتە بم و لەناو عەجەم‌دا نیشتەجێ ببم ؟

یان لە ماڵی خۆم‌دا ، لەگەڵ ئەوانەی ماونەتەوە دانیشم ؟

لەم بیرکردنەوانەدا بووم پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ( عمرة القضية ) تەشریفی هێنا. ڕۆیشتم خۆم پەنا دا و چاوم لە هاتنە ناو شاری نەبوو ..

ئەوەبوو وەلیدی کوڕی وەلیدی برام [١٣٧] لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ عومرە هاتبوو و ، بە دوام‌دا گەڕا بوو و منی دەست نەکەوتبوو ، ناچار نامەیەکی بۆ نووسیی بووم کە تیایا هاتبوو :

( بسم الله الرحمن الرحيم . أما بعد . من لەوە سەیرترم نەدیوە کە تۆ چۆن لە ئیسلام وەرگرتن لات داوە ، کە تۆ خاوەنی ئەو عەقڵەش بیت . ئایا شتێ وەك ئیسلام

---

[١٣٧] وەلیدی کوڕی وەلید لەگەڵ سوپای قورەیش دا بەشداریی بەدری کردووە و ، بە دیلیی دەست موسڵمانەکان نەکەوێت و ، هیشامی برای دایك و باوکیی فیدیەکەی بۆ ئەدات . دوای بەربوونی موسڵمان ئەبێت و ، لەسەر ئەم موسڵمان بوونەی خاڵۆکانی لە مەککەدا بەندیان کرد ، بەڵام توانیی لە بەندیخانەکەی خۆی دەرباز بکات ، ئەمەش لە ماوەی پەیمانی حودەیبییەدا و ، خۆی گەیاندە لای شۆڕش‌گێڕانی ( عیص ) بە فەرماندایەتیی ئەبوبەصیری زوهەریی . جا کە قورەیش لە موسڵمانەکانی داوا کرد با شۆڕش گێڕانی عیص وەربگرن ، وەلیدیش گەڕایەوە مەدینە . لەوێ پەنجەی بڕڕا و لێی پیس کرد و پێی مرد . وەلید کە هەستی کرد وا ئەمرێ ، داوای لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد کە لە جل و بەرگی زیادەی خۆی کەفەنی بکات ، ئەویش لە جل و بەرگی خۆی کەفەنی کرد ..

کەسێ هەیە لێی شارەزا نەبێت ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی تۆ پرسیاری لێم کرد و فەرمووی : (( أين خالد ؟ )) . وتم : خوا ئەیهێنێ .. فەرمووی: (( مثله جهل الإسلام ؟ ولوكان جعل نكايته وجدّه مع المسلمين كان خيراً له ، ولقدّمناه على غيره )). فەرمووی : ئایا ئەبێ پیاوی وەك ئەو لە ئیسلام نەشارەزا بێ ؟ ئەگەر ئەو دەست وەشاندن و هەوڵ و کۆششی لەگەڵ موسڵمانەکان یەك بخستایە بۆی چاکتر بوو و ، ئێمەش پێشی کەسانی ترمان ئەخست . جا براکەم فریای ئەوە بکەوە کە لە چەندین شوێنی چاکدا لە دەستت دەرچووە ).

کە نامەکە گەیشتە دەست خالید هەستی کرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێزی تایبەتیی بۆ داناوە ، بەمە دڵی زیاتر چووە سەر موسڵمان بوون . خەوێکیشی بینی ئەوەش زیاتر دڵی خۆش کرد .. لە خەویدا بینیی کە لە وڵاتێکی تەنگەبەر و ڕەق و تەقدا بوو و بەرەو وڵاتێکی سەوزی فراوان ڕۆیشت .. دوایی خەوەکە بۆ ئەبوبەکر ئەگێڕێتەوە ، ئەویش وەهای بۆ لێك ئەداتەوە کە لە نەفامیی و شیرك ڕزگاری ئەبێ و، بەرەو جیهانی ئیسلامی فراوانی بە پیت و بەرەکەت دێت ..

خوای گەورە نووری خۆی ڕژاندە ناو دڵی خالیدەوە و دڵی بۆ موسڵمانبوون نەرم بوو و بڕیاری دا بەرەو مەدینە بکەوێتە ڕێ .. جا بۆ ئەوەی کەسانێکی لێهاتووی لەگەڵدا بن ، چوو بۆ لای صەفوانی کوڕی ئومەییە و ، دای بە گوێیدا وا موحەممەد بەسەر عەرەب و عەجەمدا زاڵ بوو و ، تا کەی ئەمانیش شوێنی نەکەون ؟ بەڵام لەبەر ئەوەی کە باوکی و براکەی لە بەدردا کوژرا بوون ، بڕیاری دا کە ئەگەر لە قوڕەیشدا تەنها ئەو بمێنێ شوێنی ئیسلام نەکەوێ ..

دوای ئەو تووشی عیکریمە ئەبێت و بەویش ئەڵێ با بچین بۆ مەدینە و موسڵمان ببین، ئەویش بە هەمان شێوەی صەفوان مل بۆ موسڵمان بوون نادات .

دوای ئەویش تووشی عوثمانی کوڕی طەلحە بوو . جا هەرچەندە کەسوکاری زۆری لە ئوحوددا کوژرا بوون ، خوا هیدایەتی دا و ، بە گوێی کرد ، بگرە ئەویش خۆی ئامادە کردبوو .. بەڵێنیان بە یەك دا لە ( یأجج ) چاوەڕوانی یەکتر بن . لەگەڵ بەرە بەیاندا ئەگەنە ئەوێ و ، ئەڕۆن هەتا ئەگەنە ( هدە ) عەمری کوڕی عاصیان لەوێ تووش ئەبێ .. لە خالید ئەپرسێ کە بۆ کوێ ئەڕوا ؟ ئەویش وەلامی ئەداتەوە کە هەموو شتێ روون بۆتەوە و ، موحەممەد پێغەمبەرە و ، نیازی وەهایە بچێ بۆ لای و موسڵمان ببێ .. ئیتر تاکەی ؟

هەرسێکیان بە کۆمەکیی خوا بەرەو مەدینە ئەڕۆن .. پێش خۆیان هەواڵ ئەگاتە پێغەمبەری خوا ﷺ و زۆر دڵ خۆش ئەبێ . کە ئەگەنە کەناری شار چاکترین جل و بەرگیان لەبەر ئەکەن و ، بەرەو مزگەوت ئەکەونە ڕێ .. لە ڕێدا وەلیدی برای خالید تووشیان بوو و ، بە خالیدی وت : خێرا کە ، پێغەمبەری خوا ﷺ بە هاتنت دڵ خۆش بووە و ، چاوەڕوانتە .. ئەوانیش بە پەلە ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە خزمەتی و ، ئەویش زەردەخەنەی ئەکرد .. خالید لێی چووە پێشەوە و سەلامی پێغەمبەرایەتیی لێ کرد و، ئەویش بە ڕوویەکی گەشەوە وەڵامی دایەوە .

خالید شایەتومان دێنێ و پێغەمبەریش ﷺ ئەفەرموێ : (( تعالَ ، الحمد لله الذي هداك ،كنت أرى لك عقلاً رجوت أن لا يسلمك إلا إلى خير )) . فەرمووی : وەرە ، سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە هیدایەتی دایت .. بە خاوەنی عەقڵێکم ئەزانیت کە هیوادار بووم بەرەو چاکەت بەرێت ..

خالید کە بیر لەو هەمووە دژایەتی یەی حەق ئەکاتەوە لە ماوەی بیست و یەك ساڵدا، داوا ئەکات دوعای بۆ بکات تا خوا لێی خۆش ببێ .. فەرمووی : (( الإسلام يجبُّ ماكان قبله )) . ئەفەرموێ : ئیسلام چاوپۆشیی لەوە و پێش ئەکات ..

پاشان عوثمانی کوڕی طلحه چووە پێشەوە و بەیعەتی دا و ، دوای ئەویش عەمری کوڕی عاص موسڵمان بوو ..

ئەمە لە مانگی صەفەری ساڵی هەشتەمی کۆچیی دا بووە .

چیرۆکی موسڵمانبوونی عەمریش خۆی ئەی گێڕێتەوە .

عەمر کە لە جەنگی خەندەق ئەگەڕێتەوە چەند پیاوێکی قورەیشیی ، کە وەك خۆی بیریان ئەکردەوە و گوێشیان بۆی ئەگرت ، کۆ ئەکاتەوە و پێیان ئەڵێت : بەخوا ئەزانن کە من وەهای بۆ ئەچم کاری موحەممەد لە بەرزبوونەوەدایە و ، شتێکیش بە بیرمدا هاتووە ، بزانن ئێوە چۆنی لێ تێ ئەگەن ؟

وتیان : چییت بە بیردا هاتووە ؟ وتی : وای ئەبینم خۆمان بگەیەنینە لای نەجاشیی و لەوێ لەلای بمێنینەوە . جا ئەگەر موحەممەد بەسەر قورەیشدا سەرکەوت، ئەوا ئێمە لای نەجاشیی ئەبین و ، گەر خزمەکانیشمان سەرکەوتن ئەوا ئێمە ئەوانەین کە ناسراوین و ، لەلایەن ئەوانەوە چاکەمان تووش ئەبێ.

وتیان : ئەمە رایەکی جوانە.

ئەڵێت : دەی پارە کۆبکەنەوە تا دیاریی بۆ پادشا بەرین . خۆشەویستترین شتیش کە لە مەککەوە بۆی بڕوا پێستە بوو . بۆیە پێستەیەکی زۆری بۆ کۆ ئەکەنەوە و ئەچن بۆ حەبەشە .

لە کاتێکدا کە ئەوان لەلای نەجاشیی ئەبن ، عەمری کوڕی ئومەییەی ضەمریی، کە نێرراوی پێغەمبەری خوا بوو ناردبووی بۆ لای نەجاشیی ، دێت و ئەچێتە لای نەجاشیی و ، عەمری کوڕی عاص بیر لەوە ئەکاتەوە کە لە نەجاشیی داوا بکا تا عەمری کوڕی ئومەییە بداتە دەستی تا بی‌کوژێ .

عەمری کوڕی عاص ئەچێتە ژوورەوە لای پادشا و لەبەر دەمیا سەجدە ئەبات . ئەویش بەخێرهاتنی ئەکات و پرسیار ئەکات تا بزانێ لە مەککە دیاریی بۆ هێناوە ؟ عەمریش پێی رائەگەیەنێ کە پێستەیەکی زۆری بۆ هێناوە . پادشا زۆر دڵی خۆش ئەبێ .. پاشان داوای تەسلیمکردنی عەمری کوڕی ئومەییە ئەکات تا لە گەردنی بدات . نەجاشیی توورە ئەبێت و بە توندیی دەستی ئەدا بە لووتی خۆیدا و عەمر ئەترسێ لووتی پادشا شکابێ .. عەمر لە شەرماندا نازانێ چیی بکات ، ناچار عوزر بۆ پادشا دێنێتەوە و ، پادشاش ئەوپەڕی نارەزایی لە عەمر دەرئەبڕێ کە چۆن ئەو داوای لێ ئەکا نێرراوی پیاوێکی تەسلیم بکا ، کە بە وێنەی مووسا لە ئاسمانەوە نامووسی ئەکبەری بۆ هاتووە !!

عەمر ئەپرسێ : ئەی پادشا ! ئایا ئەو وەهایە ؟ پادشا ئەڵێت : تیاچیت ، عەمر! بە گوێم بکە و شوێنی بکەوە . بەخوا ئەو لەسەر حەقە و ، چۆن مووسا بەسەر فیرعەون و سەربازەکانیدا سەرکەوت ، ئەمیش بەسەر ناحەزانیدا سەرئەکەوێ ..

عەمر ئەڵێت : دەی لەسەر موسڵمان بوون بەیعەتم لێ وەربگرە بۆی ..

پادشا ئەڵێ : بەڵێ و ، دەست ئەخاتە دەستی عەمر و بەیعەتی لێ وەرئەگرێ و دێتە دەرەوە بۆ لای هاوەڵانی .

عەمر ئەم موسڵمانبوونەی لە هاوەڵەکانی ئەشارێتەوە و ، ئەگەڕێنەوە بۆ مەککە.. دوای ماوەیەك بەرەو مەدینە ئەکەوێتە ڕێ تا لە خزمەتی پێغەمبەری خوا دا ﷺ موسڵمان بوونی خۆی ئاشکرا بکات . ئەوەبوو لە ڕێ تووشی خالید و عوثمانی کوڕی طەلحە بوو .

کە ئەگەنە مەدینە عەمریش دوای خالید و طەلحە دێتە بەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ تا بەیعەت بدات ..

عەمر ئەڵێت : دە بەخوا هەر ئەوەندە بوو کە لەبەر دەستی‌دا دانیشتم ، ئیتر شەرمم ئەکرد لێی چاوی بۆ بەرز بکەمەوە ..
جا لەسەر ئەوەی کە لە گوناهە رابوردووەکانم خوا لێم خۆش ببێ ، بەیعەتم پێ دا.
ئەویش فەرمووی :
(( إن الإسلام يجبُّ ما كان قبله ، والهجرة تجب ما كان قبلها )) .
فەرمووی : بە موسڵمانبوون چاوپۆشیی لە گوناهی لەوە و پێشی ئەکرێت و ، بە کۆچ‌کردنیش چاوپۆشیی لە گوناهی لەوە و پێشی ئەکرێت .. دە بەخوا لەو کاتەوە کە موسڵمان بووین ، پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەر کارێک‌دا کە ناڕەحەتیی هاتبێتە بەردەمی هیچ هاوەڵێکی بە هاوتای من و خالیدی کوڕی وەلید نەزانیوە . لە لای ئەبوبەکریش هەمان پایە و پلەمان هەبوو و ، من لە لای عومەریش هەمان پایە و پلەم هەبوو ، بەڵام عومەر گلەیی لە خالید هەبوو ..[١٣٨]

**دووەم : سریەی غالیبی کوڕی عەبدوڵڵا بۆ کودەید**

ئەم سریەیە لە دە و ئەوەندە پیاو پێك هاتبوو ، بەڵام لە ( الرحيق ) دا ل٣٩٧ وەها هاتووە کە دووصەد پیاو بووبن ، بۆ سەر نەوەی مولەووەح کە تیرەیەکی نەوەی لەیث بوون . ئەمانە خاوەنی هێزێکی گەورە بوون کە مەترسیی ئەوەیان لێ ئەکرا هێرش بکەنە سەر مەدینە . بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ وای بە چاك زانیی هەڵمەتێك بنێرێتە سەریان و تەمێ‌یان بکات.
لە مانگی صەفەری ساڵی هەشتەمی کۆچیی‌دا لە مەدینە دەرچوون و ، ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە قودەید ، لەسەر ڕۆخی دەریای سوور ، لەوێ تووشی پیاوێك بوون بە ناوی حاریثی کوڕی مالیکی کوڕی بورصاء و ، لە ترسی ئەوەی کە سیخوڕیی بۆ دوژمن بکات ، گرتیان ، هەرچەندە ئەو بۆ موسڵمانبوون هاتبوو ..
کە ئێوارەیان لێ دێت لە قودەید، یەکێ لە موسڵمانەکان ئەنێرن بۆ هەواڵزانین . موسڵمانەکەش سەر ئەکەوێتە سەر گردێك و بە سەریەوە پاڵ ئەکەوێت . پیاوێك لە خێوەتەکەی دێتە دەرەوە و بە ژنەکەی ئەڵێت : بەخوا ڕەشاییەك بەسەر ئەو گردەوە ئەبینم کە ئەمرۆ نەم دیوە ، بزانە صەگەکان جەوەندە و مەشکەیان نەبردوویت ؟ ژنە

[١٣٨] غزوة مؤتة لباشميل : ١٧٣ ـ ١٨٠ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٤٢٣ ـ ٤٢٥ .

وتی : نەخێر .. کابرا تیرێك ئەگرێتە ڕەشاییەکە و لە موسڵمانەکە ئەدا و ، ئەویش خێرا تیرەکە دەر ئەکات و جووڵە لە خۆی ئەبڕێ . تیری دووهەمی تێ ئەگرێت و ئەویشی لێ ئەدات و ، بە ژنەکەی ڕائەگەیەنێ کە ئەگەر گیاندار بوایە ئەجوولا ، چونکە هەردووکی لێ داوە . موسڵمانەکە دەنگ ناکا هەتا تاریك ئەکات ، ئەوسا هەڵمەت ئەهێننە سەریان و هەندێکیان لێ ئەکوژن و هەندێکیشیان لێ بە دیل ئەگرن و ، مەڕومالاٌتەکەیان ئەدەنە بەر.

کە هەواڵ ئەگات بە خەڵکەکە کۆ ئەبنەوە و دوای موسڵمانەکان ئەکەون ، بەلاٌم خوای گەورە لافاوێکی وەهای هەڵسان کە چەمەکەی پڕ کردبوو و نەیانئەتوانیی بپەڕنەوە ، بە مەرجێ هاوەڵەکە سوێند ئەخوا کە لە پێش ئەوەوە هەور و بارانیان نەدیوە .[139]

**سێهەم : سریەی شوجاعی کوڕی وەهب بۆ هەوازین**

هەوازین یەکێ لە هۆزە بەهێزەکانی حیجاز بوو کە هەمیشە لە هەلێك ئەگەڕا بۆ دەست وەشاندن لە موسڵمانەکان . پێغەمبەری خواش ﷺ بەینا و بەین تاقیی ئەکردنەوە و بە هەڵمەت بردنە سەریان ترسی ئەبردە دڵیانەوە ، تا بیر لە هێرش بۆ سەر موسڵمانان نەکەنەوە .

جا هەرچەندە ناوچەی هەوازین زۆر دوور بوو ، موسڵمانەکان هەڵمەتیان ئەبردە سەریان ، چونکە هەوازین زۆر بەهێز بوون ، کە ئەوەبوو دواییش گەورەترین جەنگیان لەگەڵ موسڵمانەکاندا ، لە سەردەمی پێغەمبەردا ، کە جەنگی حونەین بوو ، ئەنجام دا ، کە موسڵمانەکان دوانزە هەزار و هەوازین بیست هەزار بوون .

لە مانگی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی هەشتەم دا پێغەمبەری خوا ﷺ سریەیەکی بیست و پێنج کەسیی ، بە فەرماندایەتی شوجاعی کوڕی وەهبی ، بۆ ناوچەی ئەوەی عامیری هەوازینیی ، لە خۆرهەلاٌتی طائیف دا ڕەوانە کرد.

شوجاع کەوتە ڕێ .. بە شەودا ئەڕۆیشت و بە ڕۆژدا خۆی حەشار ئەدا ، تا لە ناکاودا بگاتە سەر ناوچەی دوژمن و نەهێڵێ دەست بکەنەوە ..

ئەوەبوو لە کاتی بەرەبەیاندا دای بەسەر دوژمندا و مەڕومالاٌتێکی زۆریان دەست کەوت ، بەلاٌم تووشی جەنگ و کوشتار نەبوون ، چونکە جەنگاوەرەکان هەلاٌتبوون و ،

---

[139] غزوة مؤتة لباشميل : ٢٤٣ ـ ٢٤٧ ، الرحيق : ٣٩٧ .

هەندێ ئافرەتیش کەوتنە دەست موسڵمانەکان و هێنانیانەوە مەدینە ، کە پانزە ڕۆژیان پێ چوو .. ئەوەبوو لە نەوەی عامیر کۆمەڵێکیان هاتنە مەدینە و موسڵمان بوونی خۆیان ئاشکرا کرد ، پاشان دەربارەی ئافرەتە دیلەکان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ دوان و ، ئەویش داوای لە شوجاع و پیاوانی دەوریەکەی کرد کە ئەو ئافرەتانە بگێڕنەوە بۆ کەس‌وکاریان و ، ئەوانیش مل کەچی‌یان نواند .[140]

**چوارەم : سریەی کەعبی کوڕی عومەیر**

لە مانگی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی هەشتەمدا پێغەمبەری خوا ﷺ چواردە هاوەڵی خۆی لەگەڵ کەعبی کوڕی عومەیردا بەرەو باکوور ڕەوانە کرد و ، گەیشتنە ( ذات أطلح ) لە خاکی شام کە لە شەش‌صەد میل زیاتر دوور بوو ..

مەبەستی ناردنی ئەم هاوەڵانە مەبەستێکی ئاشتی‌یانە بوو بۆ گەیاندنی ئیسلام . جا کە گەیشتنە ئەو شوێنە دوورە تووشی کۆمەڵێکی یەکجار زۆری خەڵك بوون ، کە لەوە ئەچێ غەساسینەی نەصرانیی بووبن ، موسڵمانەکان بانگیان کردن بۆ سەر ئیسلام کەچیی ئەوان هەڵیان کوتایە سەر موسڵمانەکان . ئەمانیش هەوڵیان دا بەرگریی لە خۆیان بکەن و ، جەنگێکی ئازایانەیان کرد ، بەڵام لەبەر کەمی‌یان هەر هەموویان شەهید بوون ، جگە لە زامدارێکیان کە شەوی بەسەردا دێت و بە هەر حاڵێك بووە خۆی ئەگەیەنێتەوە مەدینە و هەواڵەکە بە پێغەمبەر ئەگەیەنێ و ، ئەویش زۆری پێ ناخۆش ئەبێت ، بۆیە بڕیارئەدا سوپایان بنێرێتە سەر، بەڵام کە ئەبیستێ وا ئەوانە لەو ناوچانە نەماون واز لە بڕیارەکەی ئەهێنێ .[141]

**پێنجەم : موسڵمان بوونی خوزاعە**

خوزاعە هۆزێکی گەورەی قەحطانی‌یە لە ئەزد ، کە نەوەی خوزاعەن و ، خوزاعەش ناوی کەعبی کوڕی عەمری کوڕی ڕەبیعەیە و ، ڕەبیعەش ناوی لەحی کوڕی حاریثەی کوڕی عەمر ( مزیقیا ) ی پادشای مەئرەب بووە ، کە باوکی ئەنصار ( واتە ئەوس و خەزرەج ) و غەساسینە بووە . خوزاعەش یەکێ بووە لەو هۆزانەی کە دوای ڕمانی بەندی مەئرەب یەمەنی بەجێ هێشتووە و ، لە مەککە نیشتەجێ بووە و،

[140] غزوة مؤتة لباشيل : ٢٤١ ـ ٢٤٧ ، الرحيق : ٣٩٨ .
[141] غزوة مؤتة لباشيل : ٢٤٧ ـ ٢٤٨ ، الرحيق : ٣٩٧ .

دەستی بەسەریدا رۆیشتووە . تا ئەوەبوو عەمری کوڕی لەحی ( وەك پێشتر باسمان کردووە ) کە باوکی خوزاعە بووە بت پەرستیی هێناوەتە حیجازەوە و تێکەڵ بە دینی ئیبراهیمی کردووە .

سەرەتا خوزاعە و کینانە هاوپەیمان ئەبن ، بەڵام کە نەوەی ئەسەد ، لە سەردەمی نەفامییدا ، هێرشیان کردە سەر خوزاعە و ، کینانە نەهاتن بە دەمیانەوە و ، نەوەی ئەسەد بەسەریاندا زاڵ بوون ، هەروەها چەند جەنگێکیش لە سەردەمی نەفامییدا لە نێوان نەوەی بەکر و خوزاعەدا روویان دا ، کینانە و خوزاعە ناکۆك بوون و ، سەرەنجام خوزاعە پاڵی بە موسڵمانەکانەوە دا ..

لە باسی پەیمانی حودەیبییەدا ئەوەمان باس کرد کە خوزاعە چوونە لای موسڵمانەکان و بوونە هاوپەیمان . بەڵام کە موسڵمانەکان دوای حودەیبیە گەیشتنەوە مەدینە زۆری پێ نەچوو هەموو تیرەکانی خوزاعە موسڵمان بوون ، بەمە بوونە بەشێك لە کۆمەڵگای موسڵمان .

ئەوەبوو لە مانگی جومادی دووەمی ساڵی هەشتەمدا پێغەمبەری خوا ﷺ نامەیەکی بۆ خوزاعە نووسیی کە تیایا فەرمووی :

(( بسم الله الرحمن الرحيم . من محمد رسول الله إلى بديل [١٤٢] وبشر وسروات بني عمرو ! سلام عليكم . فإني أحمد إليكم الله الذي لا إله إلا هو ، أما بعد . فإني لم آثم بالكم ، ولم أضع في جنبكم وإن أكرم تهامة عليّ أنتم ومن تبعكم من الطيبين ، فإني قد أخذت لمن هاجر منكم مثلما أخذت لنفسي - ولو هاجر بأرضه ـــ غير ساكن مكة إلا معتمراً أو حاجّاً، وإني لم أضع فيكم إذ سالمت وإنكم غير خائفين من قبلي ، ولا محصورين . أما بعد . فإنه قد أسلم علقمة بن علاثة وابناه وتابعا وهاجرا على تبعهما من عكرمة. أخذت لمن تبعني ما آخذ لنفسي ، وإن بعضنا من بعض أبداً في الحل والحرم ، وإنني والله ما كذبتكم وليحبكم ربكم )) [١٤٣] .

---

[١٤٢] بودەیلی کوڕی وەرقائی کوڕی عەمری کوڕی عەبدولعوززای کوڕی رەبیعەی خوزاعیی . پێش فەتحی مەککە موسڵمان بووە .. سەرداری قەومەکەی بووە . لە تەمەنی نەوەد ساڵییدا موسڵمان بووە و قژی هەموو سپیی بوون . کە پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی پێ کەوت دوعای بۆ کرد تا خوای گەورە جوانتری بکات ، کە فەرمووی : (( زادك الله جمالاً )).

[١٤٣] غزوة مؤتة لباشميل : ١٨١ ـ ١٨٣ .

## بەشی سیی و شەشەم

# غــەزای مــوئــتــە

**یەکەم : هۆی ئەم غەزایە**

غەزای موئتەش یەکێکە لە رووداوەکانی سالّی هەشتەمی کۆچیی ..

ئەم غەزایە گەورەترین جەنگی خوێنایی بوو کە لە سـەردەمی پێغەمبـەری خـوادا ﷺ موسلّمانەکان لەگـەلّ دوژمـــندا کردیـان ، کـە بـووە پێشـەکی یـەك بـۆ ئـەوەی موسلّمانەکان سامیان لە ئیمپراتۆریەتی رۆمیی بشکێ و ، دوای ئەوە دەست بە فەتح کردنی ولاّتانی ژێر دەستی بکەن ..

موئتە گوندێکە لە ناوچەی بولقاء لە سنووری شام کە شمشێری تێدا دروست کراوە و، دوو قۆناغی ئەمێنێ بۆ ( بيت المقدس ) .

بولقاء ناوچەیەکە لە نێوان شام و ( وادي القرى ) دا و پایتەختەکەی شاری عەممانە و گوندێکی زۆر و کێلّگە و باخ و باخاتێکی فراوانی بە دەوردایە .

ئەوەبوو ـ وەك لە باسەکانی پێشەوە باس کراوە ـ پێغەمبەری خـوا ﷺ ویسـتی ، لە رێی ناردنی هاوەلّەکانیەوە ، پەیوەندیی بە پادشا و میرانی خۆرهەلاّتی ناوەڕاستەوە بکات بە تایبەت هیرەقلی پادشای قوسطەنطینیە ، کە لەو کاتەدا لـە شـاری قـودس بوو و ، بۆ دەربڕینی سوپاسی بێ پایان بۆ خوای گەورە لەسەر ئـەو سـەرکەوتنەی کـە پێی بەخشیی ، تا پشتی سوپای فارس بدا بە زەوییدا ، بە پـێ هـاتبوو بـۆ حـەجی شاری قودس . کە نامەکە گەیشتە لای هیرەقل خـۆی بـە نهێنیـی موسـلّمان بـوو و هەولّیشی دا قەشە و بەتریکەکانی لەگەلّیا موسلّمان بن ، کەچـیی بـێ هـوودە بـوو.

یەکێ لەو پادشـایانەش کـە پەیوەنـدییان بـە دەولـەتی رۆمیـیەوە هـەبوو پادشـای غەساسینە ، حاریثی کوڕی ئەبوشومەری غەسسانیی بوو ، کە بنکەی لە جەولان بـوو و ، بە ناوی رۆمەکانەوە حوکمی جەولان و بوصرا و هەموو ئەو ناوچانەی ئەکرد کە تا سنووری دوورگە درێژ ئەبنەوە .

ئەم پادشایە تا رادەیەکی زۆر خاوەنی سەربەخۆیی بوو و ، سوپایەکی گەورەشی لەو عەرەبە بە گاوربووانەی غەساسینە هەبوو کە نزیکەی صەد هەزار ئەبوو.

ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ یەکێ لە هاوەڵانی ، کە ناوی حاریثی کوڕی عومەیری ئەزدیی بوو ، نارد بۆ لای حاریثی کوڕی ئەبوشومەری پادشای جەولان و بوصرا ، تا بانگی بکات بۆ سەر ئیسلام . کە گەیشتە گوندی موئتە تووشی شورەحبیلی کوڕی عەمری غەسسانیی بوو ، کە کاربەدەستی پادشا حاریث بوو و ، پرسیی لەوە ئەچێ لە نێرراوانی موحەممەد بیت ؟ وتی : بەڵێ . دەست و پێی بەست و پاشان دای لە ملی و کوشتی . ئەمە یەکەم نێرراوە کە موسڵمانان بی‌نێرن و بکوژرێ. کە هەواڵەکە گەیشتە پێغەمبەری خوا ﷺ بەلایەوە زۆر گران بوو ..

ئەمە یەك ، لەلایەکی ترەوە ، وەك لە پێشەوە باسمان کرد ، بە فەرماندایەتیی کەعبی کوڕی عومەیر چواردە هاوەڵ بەرەو خاکی شام کەوتنە رێ ، بە نیازی گەیاندنی ئیسلام ، کەچیی بە ناڕەوا ئەو هاوەڵانە شەهید کران .

لەلایەکی تریشەوە پادشا حاریثی کوڕی ئەبوشومەر دوای ئەوەی کە کاربەدەستەکەی نێرراوەکەی پێغەمبەری خوای ﷺ شەهید کرد ، کەوتە هەڕەشەکردن کە نیازی هەیە هێرش بکاتە سەر مەدینە و دەوڵەتە ساواکەی ئیسلام بڕووخێنێ ..

ئەمانە هۆی سەرەکیی بوون تا پێغەمبەری خوا ﷺ سوپای موئتە بەرەو ناوچەی دەستدرێژیی رەوانە بکات ، تا ئەو دەستدرێژیی‌کەرانە تەمێ بکرێن و ، رۆمەکانیش ئاگادار بکرێن کە ئەوان بەو ئاسانی‌یە ناتوانن مەدینەی پایتەختی شێر و پڵنگەکانی ئیسلام بگرن ، چونکە ئەگەر رۆم بە ژمارە زۆر بن ، خاوەنی غیرەت و جوامێری‌یەك نین کە بتوانن پشتی موسڵمانان بە زەوییدا بدەن ..[144]

### دووهەم : بەڕێکردنی سوپا

ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ لە هاوەڵە دڵسۆزەکانی سێ هەزاری هەڵ بژاردن ، بێ ئەوەی سەرەتا مەبەستی ئەم کارە دەربخات ، تا ئەوەبوو سوپا لە مەدینە کەوتە رێ و، سەربازگەی لە جورف دروست کرد ، کە سێ میل لە مەدینەوە دوور بوو ، لەوێ

[144] غزوة مؤتة لباشميل : ٢٤٩ ـ ٢٥٤ ، الرحيق : ٣٩٩ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٤٢٦ .

هەواڵی دانێ کە ئەیەوێ ئەم سوپایە بەرەو شام رەوانە بکات ، تا کوشتاری ئەوانە بکەن کە ستەمیان لە هاوەڵانی کردووە.

لە جورف ، پێغەمبەری خوا ﷺ سێ فەرماندەی بۆ سوپا هەڵ بژارد کە یەك لە دوای یەك ، ئەگەر شەهید بوون ، ببنە فەرماندەی سوپا کە زەیدی کوڕی حاریثە و جەعفەری کوڕی ئەبوطالیب و عەبدوڵڵای کوڕی رەواحە بوون .

فەرمانی دا کە زەید فەرماندەی خەڵکەکە بێ . جا ئەگەر زەید شەهید بوو ئەوا جەعفەر فەرماندە بێ . گەر جەعفەریش شەهید بوو ئەوا عەبدوڵڵا فەرماندە بێ . خۆ ئەگەر عەبدوڵڵاش شەهید بوو با موسڵمانەکان بە کێ رازیی بوون بیکەنە فەرماندەی خۆیان.

ئیمام ئەحمەد ریوایەتی کردووە کە سوپای ئیسلام لە رۆژی جومعەدا و پێش بەجێ هێنانی نوێژی جومعە کەوتۆتە رێ . بەڵام عەبدوڵڵای کوڕی رەواحە لە مەدینە ئەمێنێتەوە بەو هیوایەی لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ نوێژ بەجێ بهێنێ ، ئەوسا دەرچێت ، پێغەمبەری خواش ئاگاداری ئەکات کە جیهاد چاکترین کردەوەیەکە کە موسڵمان ئەنجامی بدات . ئەوەبوو لێی پرسیی : (( ما خلفك ؟ )) فەرمووی : چیی دوای خستی ؟ وتی : ویستم لەگەڵتدا جومعە بەجێ بهێنم . فەرمووی :

(( لغدوة أو روحة خير من الدنيا وما فيها )) . سەرلەبەیانییەك یان ئێوارەیەك بەسەر بردن لە جیهاددا لە دنیا و هەرچیی وا تیادا چاکترە ..

لە ریوایەتێکی تردا کە ئیبن عەبباس گێڕاویەتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بە کوڕی رەواحە ئەفەرموێ :

(( ما منعك أن تغدو مع أصحابك ؟ )) . فەرمووی : چیی لەوەی کردی کە لەگەڵ هاوەڵانتدا سەر لە بەیانیی دەرچیت ؟ وتی : ویستم نوێژی جومعەت لەگەڵدا بەجێ بهێنم . فەرمووی :

(( لو أنفقت ما في الأرض جميعاً ما أدركت غدوتهم )) . رواه الترمذي . فەرمووی : ئەگەر هەرچیی وا لە زەوییدا هەر هەمووی خەرج بکەیت ناگەیتە پاداشتی ئەم بەیانییەیان .. بەڵێ سێ هەزار ئیماندار لە رۆژی جومعەی مانگی جومادی یەکەمی ساڵی هەشتەمدا کەوتنە رێ .

کاتێ کە سوپا کەوتە رێ عەبدوڵڵای کوڕی رەواحەی فەرماندەی سێهەمی سوپا ، کە پیاوێکی خواناسی زاهید و شاعیرێکی زۆر چاك بوو ، لە کاتی خوا حافیزیی کردنیا لەگەڵ پێغەمبەر و موسڵمانەکاندا بە پێغەمبەری خوای ﷺ وت : فەرمانێکم بەسەردا بدە تا لێتەوە وەری بگرم . فەرمووی :

(( إنك قادم غداً بلداً السجود فيه قليل ، فأكثر السجود )) . فەرمووی : سبەینێ ئەچیتە وڵاتێکەوە سەجدەبردنی تێدا کەمە ، تۆ سەجدەی زۆر بۆ خوا بەرە ..

عەبدوڵڵا وتی : بۆم زیاد کە ، ئەی پێغەمبەری خوا !

فەرمووی : (( أذكر الله ، فإنه عون لك على ما تطلب )) . فەرمووی : ذیکری خوا بکە ، چونکە ئەو بۆ هەموو داوایەکت کۆمەکتە .

عەبدوڵڵا هەستا و کەمێ رۆیشت و گەڕایەوە و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! خوا تاکە و تاکی خۆش ئەوێ .

فەرمووی : (( یا ابن رواحة ! ما عجزت ، فلا تعجزن إن أسأت عشراً أن تحسن واحدة )) . فەرمووی : کوڕی رەواحە ! بۆ هەر شتێ دەستەوسان بوویت ، بۆ ئەوە دەستەوسان نەبیت کە ئەگەر دە خراپەت ئەنجام دان ، چاکەیەك ئەنجام بدەیت .

عەبدوڵڵا وتی : دوای ئەوە ئیتر پرسیاری هیچت لێ ناکەم .

لەو کاتەدا کە عەبدوڵڵای کوڕی رەواحەی فەرماندە خوا حافیزیی لە پێغەمبەری خوا ئەکرد ، دەستی بە گریان کرد . وتیان : چیی ئەتگریێنێ ؟

وتی : بەخوا نە لەبەر خۆشویستنی دنیایە و نە لەبەر بێتاقەتیی ئێوەش ، بەڵام من گوێم لە پێغەمبەری خوا بووە ﷺ کە ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆزی ئەخوێند کە باسی ئاگری تێدایە و ئەفەرموێ :

﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ۚ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴾ ( مريم : ٧١ ) . جا نازانم کە چوومە ناویەوە چۆن بێمە دەرەوە .

موسڵمانەکان وتیان : خواتان لەگەڵ بێت و هەموو خراپەیەکتان لێ دوور بخاتەوە و، بە پیاوچاکیی بتان گێڕێتەوە لامان .

عەبدوڵڵا بە دڵێکی گەرمەوە بە شیعر کەوتە ئاوات خواستنی شەهیدیی :

ولكنني أسأل الرحمن مغفرة ... وضربة ذات فرع تقذف الزبدا
أو طعنة بيدي حران مجهزة ... بحربة تنفذ الأحشاء والكبدا
حتى يقال إذا مروا على جدثي ... أرشده الله من غازٍ فقد رشدا

پاشان هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ رووی تێ کرد و وتی :

فثبت الله ما آتاك من حسن  تثبيت موسى ونصراً كالذي نصروا
إني تفرستُ فيك الخير نافلة  فراسة خالفت فيك الذي نظروا
أنت الرسول فمن يحرمْ نوافله  والوجه منه فقد أزرى به القدر

کە سوپا کەوتە رێ و پێغەمبەری خواش ماوەیەك لەگەڵیانا رۆیشت و گەڕایەوە عەبدوڵلا دیسان سەلامی لێ کردەوە :

خلّف السلام على امريء ودّعته  في النخل خير مشيع وخليل

لەو کاتەدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەرسێ فەرماندەکەی دیاریی کردن ، پیاوێکی جوولەکە بە ناوی نوعمانی کوڕی فنحەص لەوێ ئامادە بوو و وتی : ئەبولقاسم ! ئەگەر تۆ پێغەمبەر بیت ، زۆر و کەم چەند کەس ناو بهێنی هەموویان ئەکوژرێن ، چونکە پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل کە پیاوێکیان ئەکردە ئەمیری کۆمەڵێك و ، پاشان بیان وتایە : ئەگەر فلان کوژرا ، ئەوا ئەگەر ناوی صەد کەس بهێنرایە هەموویان ئەکوژران . پاشان بە زەیدی فەرماندەشی وت : وەسیەت بکە ، ئەگەر موحەممەد پێغەمبەر بێت ، هەرگیز ناگەڕێیتەوە لای .

زەید وتی : منیش شاهێدیی ئەدەم کە پێغەمبەرێکی راستگۆی پیاوچاکە .

شایانی باسە کە خالیدی کوڕی وەلیدی سوارچاکی پاڵەوانی بەناوبانگ سێ مانگ بوو موسڵمان بوو بوو ، بۆیە بە وێنەی سەربازێك لەگەڵ ئەم سوپایەدا کەوتبووە رێ.. تا بۆ یەکەم جار لە پێناوی رەزامەندیی خوادا بجەنگێ . خالید لەم جەنگەدا ـ وەك لە دواوە بە درێژە باس ئەکرێ ـ دەورێکی وەها کاریگەری بینیی تا ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ بە نازناوی ( سيف الله ) ، واتە شمشێری خوا ، خەڵاتی کرد.. دوای دیاریی‌کردنی هەرسێ فەرماندەکە پێغەمبەری خوا ﷺ وتارێکی گرنگی بۆ سوپای ئیسلامدا ، کە یاسایەکی پڕ لە داد و یەکسانیی تێدا بوو و ، تا ئێستاش مرۆڤایەتیی بەو عەدالەتە نەگەیشتووە . فەرمایشتەکانی ئەوەیان ئەگەیاند کە هیچ کارێکی نامرۆڤانە ئەنجام نەدەن و ، لاقەی ژن و منداڵ و پەككەوتە و خواپەرستان نەکەن ، کە ئەی فەرموو :

(( أوصيكم بتقوى الله ومن معكم من المسلمين خيراً . أغزوا بسم الله في سبيل الله، فقاتلوا من كفر بالله ، لا تغلوا ، ولا تغدروا ، ولا تقتلوا وليداً )) .

فەرمووی : ئامۆژگارییتان ئەکەم کە لە خوا شەرم بکەن و لەگەڵ ئەو موسڵمانانەی کە وان لەگەڵتاندا بە چاکیی بجووڵێنەوە .. بە ناوی خواوە و لە پێناوی خـوادا غـەزا بکەن .. کوشتاری ئەوانە بکەن کە ئیمانیان بە خـوا نیـە ، بـەڵام ناپـاکیی و غـەدر مەکەن و منداڵ مەکوژن .

پاشان رووی کردە فەرماندەی گشتیی سوپا و فەرمووی :

(( وإذا لقيت عدوك من المشركين فادعهم إلى إحدى ثـلاث ، فـأيتهن مـا أجـابوك إليها فأقبل منهم واكفف عنهم .. أدعهم إلى الدخول في الإسلام . فإن فعلـوا فأقبـل منهم واكفف عنهم . ثم ادعهم إلى التحول من دارهم إلى دار المهاجرين . فـإن فعلـوا فأخبرهم أن لهم ما للمهـاجرين وعلـيهم مـا علـى المهاجرين . وإن دخلـوا في الإسـلام واختاروا دارهم فأخبرهم أنهم يكونون كأعراب المسلمين ؛ يجري علـيهم حكم الله ؛ ولا يكون لهم في الفيء ولا في القسمة شيء إلا أن يجاهدوا مع المسلمين . فإن أبوا فـادعهم إلى إعطاء الجزية ؛ فإن فعلوا فأقبل مـنهم واكفـف عـنهم . فـإن أبـوا فاسـتعن بـالله وقاتلهم . وستجدون رجالاً في الصوامع معتزلين فلا تتعرضوا لهـم . وسـتجدون آخرين للشيطان في رؤوسهم مفاحص فاقلعوها بالسيوف . ولا تقتلن امرأة ولا صغيراً مرضعاً ولا كبيراً فانياً . لا تغرقن نخلاً ولا تقطعنَّ شجراً ولا تهـدموا بيتاً )) .

پێی فەرموو : ئەگەر تووشی دوژمنە موشریکەکانت بوویت ، ئەوا سێ رێـیـان بـۆ دابنێ ؛ جا ئەوان کامیان هەڵ بژارد تۆ لێیان وەربگرە و دەستیان لێ بگرەوە .

یەکەم ؛ بانگیان بکە بۆ موسڵمان بوون . جا ئەگەر موسـڵمان بـوون ئـەوا لێـیـان وەربگرە و دەستیان لێ بگرەوە . پاشان داوایان لێ بکە لە ماوا و مەنزڵی خۆیان کۆچ بکەن بۆ لای موهاجیرەکان . جا ئەگەر وەهایـان کـرد ؛ ئـەوا هـەواڵیان بـدەرێ کـە هەموو مافێکی موهاجیرانیان هەیە و ، هەموو ئەرکێکی ئەوانیش لەسـەر شـانیانە. خۆ ئەگەر موسڵمان بوون و ویستیان لە ناوچەی خۆیـان بمێننـەوە ، ئـەوا بـە وێنـەی ئەعرابی موسڵمانان حوکمی خوایان بەسەردا جێ بەجێ ئەکرێ و ؛ لە دەستکەوتـەکان و یارمەتیی دان بەشیان نادرێ ، مەگەر بەشداریی جیهادی ئیسلامیی بکەن .

دووهەم : ئەگەر ملیان بۆ موسڵمان بوون نەدا ، ئەوا داوایان لێ بکە جزیـە بدەن . جا ئەگەر وەهایان کرد؛ ئەوا لێیان وەربگرە؛ و دەستیان لێ بگرەوە .

سێهەم : ئەگەر ملیشیان بە جزیەدان نەدا ئەوا پشت بە خوا ببەستە و کوشتاریان بکە . جا کەسانێك ئـەبینن کـە لـە پەرسـتگاکاندا خـەریکی خواپەرستیین ئەوانـە

دەستیان بۆ نەبەن . بەلاّم هەندێکی تر ئەبینن کە شەیتان لە تەوقە سەریان‌دا هێلانەی کردووە ، ئەوانە بە شمشێر لە ریشە بهێنن .. ئافرەت و ، منالّی ساوا و ، پیری بەسالّدا چوو نەکوژن .. دارخورما نوقم نەکەن و درەخت نەبڕن و ، مالّ نەڕووخێنن .

پێغەمبەری پێشەوا ﷺ ئەم یاسا جوانانەی خستنە بەردەم موسلّمانان و ، ئەوانیش مەردانە جێ بەجێیان ئەکردن ، بۆیە ئیسلام بەلای خەلّکەوە خۆشەویست بوو و ، پۆل پۆل خەلّکی ناوچە جۆرا و جۆرەکان موسلّمان ئەبوون و ، ئەهاتنە ژێر سایەی ئیسلامی بێ گەردەوە ..

دواجار پێغەمبەری خوا ﷺ ئالاّیەکی سپیی دایە دەست فەرماندەی سوپا و ، موسلّمانەکانیش خواحافیزی‌یان لە سوپای ئیسلام کرد و ئەیانوت : خوا هەموو خراپەیەکتان لێ دوور بخاتەوە و، بە پیاوچاکیی و دەست‌کەوتەوە بتان‌گێڕێتەوە لامان.

ئەم سوپا سێ هەزاری‌یە ، کە ئەمە یەکەم جار بوو سوپای وەها گەورەی موسلّمانان بکەوێتە رێ ، مەدینەی بەجێ هێشت و بەرەو باکوور کەوتە رێ .[١٤٥]

**سێهەم : هەوالّ گەیشتن بە رۆم**

هەر کە موسلّمانان جەم بوون ناحەزانی موسلّمانان لە مەدینەدا ، لە جوولەکە و مونافیقەکان خێرا هەوالّیان بەرەو شام نارد ، تا رۆمەکان لە هەلّمەتی موسلّمانان ئاگادار بن .

ئەوەبوو شورەحبیلی کوڕی عەمری غەسسانیی ، کاربەدەستی رۆرمەکان بەسەر ناوچەکانی باشووری شامەوە کە هاوسنووری دوورگە بوو ، یەکەم کەس بوو هەوالّی سوپای موسلّمانەکانی پێ گەیشت . ئەویش خێرا پیاوی ناردە لای سەرکردایەتیی رۆمان و هەوالّەکەی دایە . خۆیشی خێرا لە هۆزەکانی دەوروبەری سوپای کۆ کردەوە و ، ( سەدوس ) ی برایشی لەگەلّ هەندێ پیاوی‌دا، کە مەقریزیی دەری بڕیوە ( ٥٠ ) پیاو بوون ، ناردنە ناو خاکی دوورگەوە تا هەوالّ دەست بخەن .

سوپای ئیسلام بەرەو باکوور کشا هەتا گەیشتە ( وادي القرى ) و چەند رۆژێک لەوێ پشووی دا و ، پاشان کەوتەوە رێ .

---

[١٤٥] غزوة مؤتة لباشميل : ٢٥٤ ـ ٢٦٥ ، الرحيق : ٤٠٠ ـ ٤٠١ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٤٢٧ ، شرح حياة الصحابة : ١ / ٧١١ ـ ٧١٢ ، ١ / ٨١١ ـ ٨١٣ .

موسڵمانانیش لە پێش سوپاوە پێشەنگیان ناردبوو تا لـە دەنـگ و باسـی دوژمـن ئاگادار بن ، ئەوەبوو تووشی ( سـدوس ) ی بـرای شـورەحبیل بـوون و ، جـەنگ لـە نێوانیاندا رووی دا و ، موسڵمانەکان توانی‌یان سدوس بکوژن .

شـورەحبیل ، کـە بە ناڕەوا نێرراوەکەی پێغەمبەری خوای ﷺ کوشت ، زۆر ترسا، بۆیە بە پەلە داوای لە فەرماندایەتیی ڕۆمان کرد کە کۆمەکیی بۆ ناوچـەکە بنێـرن . شایانی باسە کە لەو کاتەدا ئیمپراتۆر هیرەقل لە ( بيت المقدس ) بوو .

ئەوەبوو لە هۆزە عەرەبە بە گاوربووەکان و غەسسان صـەد هـەزار جـەنگاوەر کـۆ کرانەوە و ، فەرماندەکەیان پیاوێکی هۆزی ( بلي ) بـوو بـە نـاوی مـالیکی کـوڕی رافیلە.

ڕۆمانیش صەد هەزارێکیان لـە خۆیـان ئامـادەی جـەنگی موسـڵمانەکان کـرد و ئیمپراتـۆر خـۆی فەرمانـدەی بـوو و ، هـەردوو بەشـەکە لـە شارۆچـکەی ( مـآب ) سەربازگەیان هەڵ دا . هەندێ لە مێژوونووسانیش دەریان بڕیوە کـە تیـۆدۆری بـرای هیرەقل فەرماندەی سوپای ڕۆم بووە ، چونکە دوای گەیشتنی نامەکـەی پێغەمبـەری خوا ﷺ بە هیرەقل ، ئەو حەزی بە جەنگی موسڵمانەکان نەبوو و ، دینی ئیسلامی بە ڕاست زانیوە.

سوپای موسڵمانەکانیش کە ( وادي القرى ) ی بەجێ هێشت ، بەرەو باکوور کشا ، هەتا گەیشتە شاری مەعان ، لە وڵاتی ئوردون . لەوێ زەیدی فەرماندە هـەواڵی پـێ گەیشت کە ڕۆمـەکان خۆیان ئامادەی جەنگ کردووە و سوپایەکی دووصـەد هـەزاری یان ئامادەیە ، کە دەیان هەزار ئەسپ سواریان لەگەڵ دایە .

لێرەدا پرسیارێك هاتە بەردەم فەرماندەی موسڵمانەکان : ئایا سێ هەزار موسڵمان توانای جەنگ کردنیان هەیە لەگەڵ دوو صەد هەزار جەنگاوەردا کە لە هەموو تفـاق و چەکێك دا لەمان زیاترن ؟ سەرەڕای ئەوەی کە سەرکەون ؟

بۆ وەڵامی ئەمە فەرماندەکانی سوپای کۆ کردنەوە و لەگـەڵ سـەرەك هۆزەکـاندا کۆبوونەوەیەکی بە پەلەیان کرد . لەو کۆبوونەوەیەدا باسی زۆریی ئەو سوپایە کرا کـە ڕۆم بۆ جەنگی موسڵمانەکانی ئامادە کردووە و ، فەرماندە داوای لێ کـردن بڕیارێـك بۆ ئەم هەڵوێستە بدەن .

فەرماندەکان دوو رایان هەبوو ، واتە بوونە دوو دەستە :

دەستەیەکیان رای وەها بوو کە پەلە نەکەن و نەچن بە گژی رۆمدا هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ ئاگادار بکەن . چونکە هەرگیز نەبووە سوپایەکی ئاوەها بچکۆلە بچێ بە گژی سوپایەکی وەها زۆردا .. لە مێژووی جەنگ دا شتی وەها رووی نەداوە .

بەڵام دەستەی دووهەمیان رایان وەهابوو هیچ لێی نەوەستن . چونکە ئەمان بۆ شەهیدیی هاتوون و ، ئاواتیان ئەوەیە دەستیان بکەوێت .. لە جەنگێکی ئاوەهادا کە یا شەهیدیی یان سەرکەوتنی بە دواوەیە ، پێویست بە وەستان ناکات .

جێگری دووهەمی فەرماندەی گشتیی ، کە عەبدوڵلای کوڕی رەواحە بوو ، سەرۆکی دەستەی ئەم رایە بوو ، کە بە پێویستیان نەئەزانیی پرس بە پێغەمبەری خوا بکەن . ئەمانە ئەوەشیان بەرچاو گرتبوو کە سوپای مل‌هوڕی رۆم ناوەستێ هەتا ئەمان پیاو بنێرنەوە مەدینە و ، پرس بکات و بگەڕێتەوە ، بەڵکو هێرش ئەکاتە سەریان و ئەیان هاڕێت ، بە تایبەت کە سوپای ئیسلام بە قووڵیی پەنجا میل چوو بووە ناو خاکی وڵاتی شامەوە و ، سوپای رۆم هەرگیز قبووڵی ئەوە ناکات سوپایەکی ئاوەها بچکۆلە بێت و خاك و ئاوی ژێر دەسەڵاتی ئەو داگیر بکات .

خۆ ئەگەر موسڵمانەکان نەچن بە گژ سوپای رۆمدا و بکشێنە دواوە ، سوپای رۆم ئەکەوێتە سەریان و ، وازیان لێ ناهێنێ . ئەو کاتە مەدینەش داگیر ئەکات و دەوڵەتەکەشیان لەناو ئەبات .. لەلایەکی ترەوە موسڵمانەکان کەوتوونەتە بارودۆخێکی ناسك کە ناچارن یەکێ لەم دوو رێیە هەڵ ببژێرن :

بگەڕێنەوە بۆ مەدینە و جەنگ نەکەن ، کە دیارە ئەمەش پێچەوانەی فەرمانی پێغەمبەری خوایە ﷺ . یان یەکسەر هەڵمەت بەرنە سەر سوپای رۆم چونکە ئەگەر ئەمان هەڵمەت نەبەن ئەوا رۆمەکان هێرش ئەکەنە سەر ئەمان .

بۆ ماوەی دوو رۆژ لە شاری مەعان‌دا وت و وێژ و را هەڵ سەنگاندن بەردەوام بوو.. سەرەنجام زۆربەی ئەندامانی دەستەی ئەرکانی جەنگی سوپای ئیسلام هاتنە سەر ئەو رایەی کە بە خێرایی بچن بە گژی دوژمن‌دا و لێی نەوەستن و ، پرس و رای مەدینەی ناوێت .

تاکە کەسێك کە زۆر کاریگەریی لەسەر سەرکەوتنی ئەم رایە هەبوو جێگری دووهەمی فەرماندەی گشتیی بوو ، واتە عەبدوڵلای کوڕی رەواحەی ئەنصاریی .

ئەوەبوو لە رۆژی دووهەم و ، لە دوا دانیشتنی فەرماندەکانی سوپا و سەرۆك هۆزەکان‌دا عەبدوڵلای کوڕی رەواحە هەستایە سەرپێ و ، دەستی دایە شیی کردنەوە

و روون‌کردنەوەی بۆچوونەکەی کە بریتیی بوو لـە نەوەسـتان و هەڵمـەت بردنـە سـەر دوژمن . ئەوەبوو وتی : خزمینە ! ئەوەی کە پێتان ناخۆشە ، بۆ ئەوە هاتوون .. ئێوە داواکـاری شـەهیدیین . ئێمـەش بـە ژمـارە و هێـز و زۆریـی لەگـەڵ ئـەو خەڵکـەدا ناجەنگێین. ئێمە تەنها بەم دینەوە لەگەڵیان ئەجەنگێین کـە خـوا بۆمـانی نـاردووە و رێزی پێ گرتووین . بەخوا رۆژی بەدر تـەنها دوو ئەسـپ و ، رۆژی ئوحـودیش تـەنها یەك ئەسپمان پێ بوو . هەستن با پێکەوە بکەوینە رێ .. هەر ئەوەندەیە ، یـەکێ لـە دوو کارە چاکەکەمان دەست ئەکـەوێ : یـان سـەرکەوتن بەسـەریان‌دا ، کـە ئـەویش ئەوەیە کە پێغەمبەرەکەمان بەڵێنی پێ داوین و ، بەڵێنیشی دواکـەوتنی نیـە ، یـان شەهیدی‌یە ، ئەو کاتە بە برایان ئەگەینەوە و لە بەهەشت‌دا هاوەڵێتی‌یان ئەکەین.

جا هەرچەندە راکەی عەبدوڵلاّ رایەکی پڕ مەترسیی بوو ، بەلاّم وشە حەماسـی‌یـە دڵ تەزێنەکانی کاریگەری‌یەکی بـێ‌وێنـەیان کـردە سـەر دڵ و دەروونـی فەرمانـدە و سەرکردەکان ، بۆیە هەموو بە جارێ هاتنە سەر ئەو رایە کـە باکیـان لـە زۆریـی رۆم نەبێ و بچنە مەیدانی سوپای مل هوڕەوە و ، هەر ئەوەندەیە یەکی مەرگێ قەرزارن.. بەم شێوەیە موسڵمانەکان بڕیاری جەنگیان دا..

دوای تەواوبوونی کۆبوونەوەی مەعان ، فەرماندەی گشتیی سوپای ئیسلام زەیدی کوڕی حاریثە فەرمانی بۆ هەموو تیپ و کەتیبەکانی سوپا دەرکرد تـا بـەرەو سـوپای بێ‌شوماری رۆم بکەونە رێ ..

لەهەمان کات‌دا تیۆدۆری برای هیرەقل بە خۆی و سوپا دوو صەد هەزاری‌یەکەیەوە بەرەو سوپای ئیسلام ئەکشا .. تا ئەوەبوو لە گوندێك لـە گـونـدەکـانی ( بلقاء ) کە ناوی ( مشارف ) بوو سوپای موسڵمانەکان بە سوپای رۆم گەیشت ..

زۆر و زەبەندەیی سوپای رۆم و عەرەبە نۆکەرەکانیان لە رادە بەدەر بـوو .. چـەك و ولاّغ و ، ئاوریشم و زێڕ و زیویان بێ شومـار بوو ..

ئەبوهورەیرە ئەڵێت : کە ئەوەم بینی چاوم بریقەیان لێ ئەهات ، بۆیە ثابیتی کوڕی ئەقرەم وتی : ئەبوهورەیرە ! ئەوەچیتە ؟ هەروەك سوپایەکی زۆرت بەرچاو کەوتبێ .. وتم : بەڵێ . وتی: لە بەدردا لەگەڵمان نەبووی .. ئێمە بە زۆریی سەر ناکەوین..[١٤٦]

---

[١٤٦] غزوة مؤتة لباشيل : ٢٦٥ ـ ٢٧٨ . الرحيق : ٤٠١ .

**چوارەم : خۆ مەحکەم کردن لە موئتە**

شتێکی زۆر ئاسایی بوو کە سەرکردایەتیی سوپای رۆم نەخشەی ئابلووقەدانی سوپای موسڵمانان بکێشێت ، تا بەخێرایی ئەو سوپا بچکۆلە لە ناو بەرێت ، یان ناچاری بکات خۆی بە دەستەوە بدات . چونکە سوپای رۆم وەك زۆر بوو ، چەك و تفاقیشی زۆر رێك و پێك بوو ، بۆیە بە بیری تیۆدۆریش‌دا نەئەهات کە سوپای ئیسلام لە سەعاتێك زیاتر جەنگی پێ بکرێت و ، هیچ کەسیش لەو نەخشەیەی‌دا رەخنەی لێ ناگرێ ، چونکە موسڵمانەکان هەرگیز بە تەمای سوپای وەها نەبوون بێتە بەردەمیان و ، ئەو بڕیارەش کە دەریان کرد تا بچن بە گژی رۆم‌دا ، تەنها بڕیاری کەسانێك بوو کە شەهیدی‌یان بەرچاو گرتبوو و ، دەستیان لەم دنیایە شۆرد بوو . واتە حیسابێکی زۆر کەمیان بۆ سەرکەوتنی دنیایی ئەکرد .. ئەوەشمان لە یاد بێ کە لەو کاتەدا سوپای رۆم تاکە سوپای بەدەسەڵاتی دنیا بوو ، کە ئەوەبوو تازە بە تازە سوپای فارسیشی تێك شکاند بوو ..

جا زەیدی کوڕی حاریثەی فەرماندەی موسڵمانان زۆر باش لەو نەخشەیەی ( تیۆدۆر ) ئاگادار بوو و حیسابی چاکیشی بۆ کردبوو . بۆ ئەوەی سوپا بچکۆلەکە لەو مەترسی‌یە لا بدات و هەردەم توانای کشانەوەی هەبێت ، تا رۆمەکان چوار دەورەی نەگرن خۆی گەیاندە ناوچەی گوندی موئتە و ، دوای ئەوە زەیدی فەرماندە سوپاکەی بە چاکیی رێك و پێك کرد . ئەوەبوو یەکێ لە سەردارانی نەوەی عوذرە ، کە قوطبەی کوڕی قەتادە بوو [١٤٧] ، کردە فەرماندەی دەستەڕاستی سوپا و ، عەبایە یان عەبادەی کوڕی مالیکی ئەنصارییشی کردە فەرماندەی دەستە چەپ . بەڵام لە ناوجەرگەی سوپادا هەر سێ فەرماندەکە ، زەید و جەعفەر و عەبدوڵڵا ، دامەزرا بوون..

بەرە بەرە سوپای رۆم لە موئتە نزیك کەوتەوە .. زرم و هۆڕی ئەو ناوەی هەراسان کردبوو .. تەپ و تۆزی سوپای زۆر و زەبەندە ئاسمانی داپۆشیی بوو و ، وەك دەریا شەپۆلی ئەدا..

---

[١٤٧] کاتێك کە خەریك بوو موسڵمانەکان بشکێن ، قوطبە هاواری ئەکرد : خزمینە ! ئەگەر پیاو رووبەڕوو بکوژرێت لەوە چاکترە کە لە پشت‌هەڵکردن‌دا بکوژرێت . ئەم پیاوە توانیی فەرماندەی هێزە عەرەبە بە گاوربووەکانی رۆمان ، کە ناوی مالیکی کوڕی رافیلە بوو ، بکوژێت و شیعرێکیشی بۆ ئەوە وت .

سوپای موسڵمانەکانیش سوپایەکی بچکۆلەی کەم تفاق بوو .. لە هەمان کاتدا پێغەمبەری خوایان ﷺ لەگەڵدا نەبوو .. بە راستیی هەڵوێستێکی یەکجار سامناک بوو بۆ موسڵمانەکان کە دڵان پێی ئەهاتنە لەرزە .. لە پێشەوە باسی وت و وێژی نێوان ئەبوهورەیرە و ،[١٤٨] ثابیتی کوڕی ئەقرەممان کرد .[١٤٩]

بەڵێ ، بەلای هەموو یاسایەکی سەربازییەوە شتێکی دوور لە عەقڵە هەر سەربازێکی موسڵمان حەفتا سەربازی کافری لە بەرامبەرەوە وەستا بێ و ، بیەوێ بچێت بە گژی دوژمندا و بیەوێ دین بڵاو بکاتەوە .

ئەم بڕیارەی فەرماندەکانی سوپای ئیسلام لەو شوێنە دوورەدا بڕیارێکی یەکجار سەیرە بە لای هەموو شارەزایانی جەنگەوە .. هەتا ئەگەر لەم چەرخەدا فەرماندەیەک خاوەنی سوپایەکی وەها کەم بێت و ، بچێتە جەنگی سوپایەکی وەها بێشومارەوە ،

---

[١٤٨] ئەبوهورەیرە ناوی ( عبد نهم ) بووە و، دوای موسڵمانبوونی ، پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی ناوە ( عبد الرحمن ). ئەوەبوو مەڕی بۆ خزمەکانی بەخێو ئەکرد و پشیلەیەکی بچکۆلەشی هەبوو ، کە بە شەو ئەیخستە سەر درەختێك و ، بە رۆژیش ئەیبرد لەگەڵ خۆیدا بۆ دەرودەشت یاریی لەگەڵ ئەکرد ، بەو بۆنەوە ناویان نا ئەبوهورەیرە . ئەبوهورەیرە لە ساڵی حەوتەمی کۆچییدا و ، لە کاتێکدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ خەریکی جەنگی خەیبەر بوو ، هاتە مەدینە و ، خۆی گەیاندە خەیبەر و ، لەوێ موسڵمان بوو و بەشداریی غەزاکەشی کرد . فەرمووده‌ناسان لەسەر ئەوە یەكدەنگن كە ئەبوهورەیرە لە هەموو هاوەڵێك زیاتر فەرموودەی گێڕاوەتەوە ، کە ژمارەیان ئەگاتە پێنج هەزار و سێ صەد و ئەوەندە فەرموودە . ئەبوهورەیرە زۆر خواناس بووە . ئیمام ئەحمەد لە ( المسند ) دا ئەخریجی کردووە کە ئەبوهورەیرە و ژنەکەی و خزمەت کارەکەیان شەویان ئەکرد بە سێ بەشەوە و هەر یەکەیان بەشێکی هەڵ ئەستا بۆ شەونوێژیی و یەکتریان بەخەبەر ئەهێنا .. بە لای عومەرەوە جێی متمانە بووە ، بۆیە والیێتیی بەحرەینی پێ سپاردووە . کە گەڕایەوە مەدینە دە هەزار دیرهەمی پێ بوو ، بۆیە عومەر کەوتە گومان و پرسیی کە ئەم پارەیەی لە کوێ بووە ؟ ئەویش بۆی روون کردەوە کە بە حەلاڵیی پاشەکەوتی کردووە و عومەریش بڕوای پێ کرد . پاشان بانگی کردەوە تا کاری پێ بسپێرێ ، ئەویش ملی نەدا بە کاربەدەستیی و عومەریش فەرمووی : پیاوی لە تۆ چاكتر داوای کاربەدەستیی کردووە . ئەبوهورەیرە وتی : ئەو پیاوە پێغەمبەری خوای کوڕی پێغەمبەری خوابووە و منیش ئەبوهورەیرەی کوڕی ئومەیمەم و ، لە سێ شت ئەترسم : بەبێ زانست قسە بکەم یان بەبێ حوکم بڕیار بدەم و ، قامچیی لە پشتم بدرێ و ، جنێو بە ناموسم بدرێ و ، ماڵ و سامانیشم لێ بسەنرێ . ئەبوهورەیرە لە ساڵی پەنجا و نۆی کۆچییدا و لە تەمەنی هەشتا ساڵییدا کۆچی دوایی کردووە .

[١٤٩] ثابیتی کوڕی ئەقرەم : بەلەویی و هاوپەیمانی ئەنصار بووە . مووسای کوڕی عوقبە لە بەشداربووانی بەدری لە قەڵەم داوە . مێژوونووسان لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە لە سەردەمی خەلیفە ئەبوبەکردا شەهید بووبێ .. واتە لە جەنگی پاشگەزبووەکاندا ، کە ئەوەبوو طولەیحەی کوڕی خوەیلیدی ئەسەدیی داوای پێغەمبەرایەتیی بەرز کردبوویەوە . طولەیحە ئەویش و عوکاشەی کوڕی میحصەنیشی پێکەوە کوشتن ، لە کاتێکدا کە هەردووکیان بە فەرمانی خالید پێش سوپای ئیسلام کەوتبوون تا هەواڵی سوپای طولەیحە بزانن . ئەگێڕنەوە کە خەلیفە عومەر بە طولەیحە( دوای تەوبەکردن و گەڕانەوەی بۆ سەر ئیسلام ) ئەفەرمووێ : چۆنم خۆش بوێیت ، دوای ئەوەی کە تۆ ئەو جووتە خواناسەت شەهید کردن عوکاشەی کوڕی میحصەن و ثابیتی کوڕی ئەقرەم ؟ طولەیحەش ئەڵێت : خوای گەورە رێزی لەوان نا و بە دەستی من شەهیدیی خەلات کردن و ، منی بە دەستی ئەوان سووك و ریسوا نەکرد و بە کافریی نەیانکوشتم .

راستەوخۆ بە دادگای سەربازیی ئـەدریٚ و ، تۆمـەتی فەوتانـدنی سـوپاکەی ئەدرێتـە پالّی، واتە حیسابی ناپاکیی بۆ ئەکریٚ ..

بەلاّم سوپای موئتە ، سـوپایەکی قیامـەتیی بـوو ، نـەك سـوپایەکی دنیـایی .. شەهیدیی بەلای یەکە یەکـەی سـەربازەکانەوە زۆر خۆشەویسـت تـر بـوو لـە ژیـانی دنیایی. بۆیە باکیان لە مان و مردن نەبوو ، چـونکە کشـانەوە لەبـەردەم رۆم‌دا واتـە تیاچوونی مەدینەش و ، رووخانی دەولّەتە نەونەمامەکەی ئیسلام ..[150]

**پێنجەم : دەست پیٚ کردنی جەنگ**

هەردوو سوپا لە یەك نزیك کەوتنەوە .. هەرسیٚ فەرماندەکەی سوپای ئیسـلام لـە ناوجەرگەی سوپادا و ، لە ریزی پیٚشی پیٚشەوە وەستا بوون . هەمیشە موسـلّمانەکان وەهایان ئەکرد .. ئەبوا فەرمانـدە بچـێتە پیٚشـی پیٚشـەوە و بەرامبـەر بـە دوژمـن بوەستیٚ.. ئەگەر شەهیدیی ئاواتی موسلّمانە ، پیٚویستە فەرمانـدە زیـاتر دلّـی بـۆی بگریٚ.. نەك بە کوشتدانی ملیۆنەها بەستەزمانی زۆر لیٚ کراو ، لە جەنگیٚکی هـیچ و پووچ و بیٚ‌مەبەستدا و ملهوڕان لە تەلاّی مەحکـەم‌دا خـەریکی مـەی نۆشین و رابواردن بن .. تەنها لە ئیسلام‌دا مرۆڤ مافی هەیە .. با لـە پیٚشـەوە فەرمانـدە بـە شەهیدیی بکات پاشان سەربازەکانیش ، بە بینینی مەردایەتیی فەرمانـدە ، غـیرەت بیان گریٚ و ، باوەش بۆ شەهیدیی بگرنەوە ..

سوپای رۆم هاتە پیٚشەوە تا سەیرترین جەنگ لـە میٚـژوودا روو بـدات . دووصـەد هەزار جەنگاوەری گەورەترین دەولّەتی جیهان لەگەلّ سیٚ هەزار جـەنگاوەری بیابـانی دوورگەی عەرەبیی بچن بە گژی یەك‌دا ..

بە راستیی موسلّمانەکان دامەزراو بوون .. ئەبوا هەر بە بیستن و دیتنی هیٚزی رۆم یەك بە یەکی سەربازانی سوپای ئیسلام هەلاّتنایە و ، بـە هـیچ شـیٚوەیەك دەسـتیان شمشیٚری نەگرتایە . بەلاّم پالّەوانەکانی ئیسـلام ، کـە زۆربـەی زۆریشـیان قـەلّغان و زریٚیان پیٚ نەبوو مەردانە چوونە مەیدان ..

بە پیٚی هەموو پیٚوەریٚك ئەبوا بە کەم‌ترین مـاوە سـوپای رۆم سـوپا بچـکۆلەکەی ئیسلامی بهارِیایە، بە تایبەت کە پەنجا هەزار جەنگاوەری رۆم ئەسـپسـوار بـوون .. بەلاّم ئیمان و غیرەتی یـەك بـە یـەکی جـەنگاوەرانی ئیسـلام لـە چیـای سـەختیش

---

[150] غزوة مؤتة لباشميل : ٢٧٨ ـ ٢٨٦ .

دامەزراوتر بوون ، بۆیە بە هەڵمەتێکی بێوێنەوە لە سوپای رۆم ئەچوونە پێش و لافاوی خوێنیان لێیان هەڵساند بوو ..

سوپای رۆم کەتیبە لە دوای کەتیبە ئەڕژایە گوندە بچکۆلەکەی موئتە و ، پاڵەوانە کەمەکانی ئیسلامیش مەردانە بەرگرییان ئەکرد ..

ئەبوایە بە چەند سەعاتێك تاقە سەربازێکی ئیسلام چەکی لە دەستدا نەمایە . یا ئەوەتا بکوژرایە ، یان دیل بکرایە . کەچیی موسڵمانەکان ئەوپەڕی پاڵەوانێتییان نواند و جەنگ حەوت رۆژی خایاند .

هەڵمەتی موسڵمانان سوپای رۆمی سەرسام کردبوو .. ئەو سوپا بچکۆلەیە چۆن توانیی حەوت رۆژ جەنگ بکات ؟

کە جەنگ گەرم بوو ، موسڵمانەکان بۆ پەرچدانەوەی هێرشی رۆمەکان هێرشێکی توندیان ـ بەو کەمییەیان ـ کردە سەر دوژمن ، کە ئەوپەڕی کاری سەیریان لێ وەشایەوە . بە صەدەها سەربازی رۆمیان تەختی مەیدانی جەنگ کرد.

زەیدی فەرماندەی یەکەم لە پێشی پێشەوەدا بوو و بە خۆی و جەنگاوەرانی دەوروبەریەوە هێرشیان ئەکردە سەر رۆم و ، خۆیان ئەکرد بە ناو ریزەکاندا و لاشەی بێسەریان لێ ئەخستن .. هەتا هەندێك لە سوپای رۆم هەڵاتن ، چونکە موسڵمانەکان زۆر سەیر ئەجەنگان .

رۆمەکانیش جار لە دوای جار هەوڵیان ئەدا سوپای موسڵمانان ئابڵووقە بدەن ، کەچیی بێهوودە بوو ..

هەر لە بەیانییەوە جەنگیان ئەکرد هەتا دنیا تاریکی ئەکرد ، ئەوسا هەردوولا دەستیان لە یەخەی یەکتر بەر ئەدا و ئەگەڕانەوە دوا ..

هەتا شەش رۆژ زەید پاڵەوانانە لە پێشی پێشەوە خۆی بەناو ریزەکانی دوژمندا ئەکرد .. موسڵمانەکانیش کە هەڵمەت و غیرەتی فەرماندەی یەکەمی سوپایان ئەدیی و ، ئەشیان دیی فەرماندەکانی تریش شان بە شانی ئەو جەنگیان ئەکرد ، ئەوەندەی تر گڕیان تێ بەر ئەبوو و ، وەك شێری بێشە هەڵمەتیان ئەدا ..

ئەوەبوو لە رۆژی شەشەمدا هەرسێ فەرماندەکە ، یەك لە دوای یەك ، شەهید کران.. بە شەهیدکردنی ئەوان ، سوپای رۆم کەوتە هەڵمەتدان و خەریك بوو سوپای ئیسلام باری لارە سەنگ ببێ .. خوای گەورە پاڵەوانی هۆزی مەخزوومی ، واتە خالیدی کوڕی وەلید ، بۆ ئەو هەڵوێستە ناهەموارە گەیاند و ، سوپای موسڵمانان بە

سەلامەت دەرچوو . ئەو سوپایەی کە خەریك بوو شپرزە ببـێ و سـەری لێ بشـێوێ ، یەکی پێ گرتەوە و ، بە شێوازێکی زۆر جوان رزگاری کرد ..

پێش هەموان زەیدی کوڕی حاریثە شەهید بوو ..

زەید ئاڵای موسڵمانانی هەڵ گرتبوو و ، بۆ ماوەی پێنج رۆژ لەگەڵ رۆمدا جـەنگا، تا ئەوەبوو لـە رۆژی شەشـەمدا هێرشـی رۆم پـەرەی سـەند و ، پاڵەپەسـتۆی لەسـەر موسڵمانان گران بوو و ، زەیدیش مەردانە لە روویاندا وەستا و ، بە توندیی بە گژیان دا چوو ، تا ئەوەبوو رمی دوژمن هەموو پارچەیەکی لاشەیان کون کون کـرد و ، وەك شێری ناو بێشە ، روو بەرەو دوژمن ، کەوتە زەویی و ، باوەشی بە شەهیدییدا کرد..

کە زەید شەهید بوو ، پێویست بوو جەعفەر ببێتە فەرمانـدەی گشـتیی و ئاڵاکـە بگرێتە دەست . جەعفەریش لە نزیك زەیدەوە ئەجەنگا بۆ ئەوەی ئاگـاداری بـارودۆخ بێت .. شەش رۆژە زەید ئاڵای بە دەستەوەیە و ئەجەنگێ .. لـەو بیابانـە چۆڵەدا .. لەگەڵ سوپایەکی ملهوڕدا ..

جەعفەر هەڵمەتی دایە ئاڵا و هەڵی گـرت و ، بـووە فەرمانـدە و ، دەسـتی دایـە جەنگێکی سەروماڵیی ، بە رادەیەك کە رۆمەکان حەپەسـا بـوون . جەعفـەر لەسـەر ئەسپەکەی ئەجەنگا و ، بە ئاڵاکەی سوپاوە خۆی بە ناو ریزەکانی دوژمندا ئەکرد و ، موسڵمانەکانیش مەردانە دوای کەوتبوون و درەوی سوپای رۆمیان ئەکرد .

هەر کە جەعفەر فەرماندایەتیی وەرگرت ، بە خۆی و ئەسپەکەیەوە خۆی ئەکرد بە ناو کەتیبەکانی رۆمدا .. ئەوەندە قەڵەباڵغ بوو نەیئەتوانی بەسەر ئەسپەکەیەوە هـەڵ بسوورێ ، بۆیە ناچار لەسەر ئەسپەکەی هاتە خوارەوە و کوشتی ، تا دڵی بـۆ مـەرگ یەكلایی ببێتەوە و ، بە تەمای خۆدەربازکردن نەبێت .. جەعفەر یەکەم کەسێك بـوو لە ئیسلامدا لە کاتی جەنگدا ئەسپ بکوژێت .

کە جەعفەر بووە پیادە ، رۆمەکان لە هەر چوار لاوە دەورەیان دا .. ئەویش پاڵەوانانە ئەچوو بە گژیاندا و ئاڵا سپییەکەی پێغەمبەری خوایش ﷺ بە دەستیەوە بوو .. لـە ناکاو یەکێ لە ئەسپ سوارە رۆمییەکان هەلی بە دەست هێنا و توانیی ئەو دەسـتەی جەعفەر بپەرێنێ کە ئاڵاکەی پێ بـەرز کردبـۆوە . جەعفـەر ناچـار بـوو ئاڵاکـە بـە دەستەکەی تری بگـرێ . لـەولاوە جـەنگاوەرێکی تـر دای لـە دەسـتەکەی تریشـی و

ئەویشی پەڕاند .. جەعفەر نەئەبوو ئالاکە بخاتە زەویی .. ئەی چیی بکا کە ئەو هەردوو دەستی پەڕێنراون؟

وای بە چاك زانیی بە هەردوو قۆڵی ، کە خوێن لە هەردووکیان جۆگەلەی بەستبوو، ئالاکە بگرێت .. بە هەر نرخێك بووە پێویستە ئالاکە نەکەوێتە زەویی .. پێویستە موسڵمانەکان چاویان لە ئالا بێت تا ورەیان نەڕووخێت و شپرزە نەبن .

بە هەردوو قۆڵی پەڕیوی ئالاکەی گرت .. بەرگریی‌کردنی نەما .. لە هەموو لایەکەوە شیر و تیری دوژمن ئاراستەی لاشەی پیرۆزی کران . ئالاکەی بەر نەدا هەتا گیانی پیرۆزی گەیشتە کاروانی شەهیدانی رزگاریی مرۆڤ ..

هەندێ لە مێژوونووسان نووسیویانە کە ئەسپسوارێکی رۆم شمشێرێك لە جەعفەر ئەدات و ئەی‌کات بە دوو کەرتەوە ، ئەمەش دوای ئەوەی کە هەموو گیانی کون کون بوو.. یەکێ لە دوو بەشەکەی بە رێزێکەوە کەوتە زەویی و ، کە سەرنجیان دا بەشەکەی تریشی سیی و ئەوەندە زامی پێوە بوو ، سەرەڕای ئەوەی کە رمێکیشی بەرکەوتبوو و لە لاشەی‌دا دیوان‌دەر بوو بوو .

کە جەعفەر لە ئەسپەکەی دابەزیی و کوشتی ئەم شیعرەشی وت :

يا حبذا الجنة واقترابُها　　طيبةٌ وباردٌ شرابُها

والرومُ رومٌ قد دنا عذابُها　　كافرةٌ بعيدةٌ أنسابُها

عليَّ إذ لاقيتها ضرابُها

لە ریوایەتەکەی بوخارییش‌دا کە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر گێڕاویەتەوە وەها هاتووە کە عەبدوڵڵا لەو غەزایەدا بەشداریی کردووە و ، کە ئەگەڕێن بۆ لاشەکەی جەعفەر لە نێو کوژراوان‌دا ئەی‌دۆزنەوە و ، ئەبینن لاشەی نەوەد و ئەوەندە زامی دەمی شمشێر و نووکی تیری پێوەیە .

هەروەها بوخاریی لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ریوایەتی کردووە کە دوای شەهیدبوون ئەچنە سەر جەعفەر ئەبینن هەرچیی زامی هەیە هەر هەموویان لە پێشەوە و لە کاتی هێرش‌دا لێی دراون و ، هیچیان لە دواوە بەری نەکەوتوون .

هەتا ئەهات جەنگ گەرمتر ئەبوو .. هێشتا هەر رۆژی شەشەم بوو دوای شەهیدبوونی جەعفەر ئەبوا عەبدوڵڵای کوڕی رەواحە ببێتە ئەمیری سوپا .. ئەویش خوا لێیان رازیی بێ هەڵمەتی دایە ئالاکە و هەڵی گرت و ، کەوتە جەنگەوە ..

هەرچەندە عەبدوڵلاّ یەکەم کەس بوو کە لە مەعان غیرەتی خستە بەر موسڵمانەکان تا جەنگ هەڵ بژێرن و ، خاوەنی حەماسەتێکی بێ‌وێنە بوو ، کەچیی کە ئالاکەی هەڵ گرت ، جۆرە لاوازی‌یەکی سروشتی مرۆڤ رووی تێ کرد .. بەلاّم خێرا هەڵمەتی دا و بە ئەسپەکەیەوە بەرەو پێشەوە تەکانی دا و ، کەوتە پێشی سوپاوە و مەردانە جەنگی کرد هەتا شەهید بوو ..

بۆ ئەم دوو دڵی‌یە عەبدوڵلاّ کەوتە لۆمەی دەروونی و ئەم شیعرەی وت :

| | |
|---|---|
| أقسمتُ یا نفس لتنزلنه | طائعةً أو فلتکرهنّه |
| إن أجلب الناس وشدّوا الرنه | مالي أراك تکرهین الجنّة |
| قد طالما قد کنت مطمئنه | هل أنت إلا نطفة في شنّه ؟ |

ئالاکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەستیەوە بوو ، لەسەر ئەسپەکەی دابەزی و، پاڵەوانانە جەنگی کرد ، هەتا ئەوەبوو لە هەموو لایەکەوە شیر و رمی ئاراستە کرا و، ئەویش بە سەری بەرزەوە و ، هەر لە رۆژی شەشەمدا گەیشتەوە بە هەردوو هاوەڵەکەی .

هێشتا موسڵمانەکان بە رێوە بوون و بەرەو موئتە ئەڕۆیشتن ، عەبدوڵلاّ بە شیعر ئاواتی بۆ شەهیدیی ئەخواست . ئەوەبوو دوو دڵیەکەش هەر بە شیعر لۆمەی دەروونی خۆی ئەکرد و ، شەهیدبوونی بە لاوە خۆشەویست ئەکرد و ، هەڵی ئەنا تا چاو لە هەردوو فەرماندە شەهیدەکەی پێش خۆی بکات .

کە چووە پێشەوە ئامۆزایەکی ئێسقانێکی پڕ لە گۆشتی بۆ هێنا و وتی : ئەمە بخەرە بەر دڵت ، خۆ تۆ لەم چەند رۆژەدا تووشی نارەحەتیی یەکجار زۆر بوویت . ئەویش گۆشتەکەی لێ وەرگرت و ، بە دەمی پارچەیەکی کەمی لێ کردەوە و ، ئەوەبوو دەنگی بگرە و بەردەی خەڵکەکە هات ، عەبدوڵلاّ بە خۆی وت : خۆ هێشتا تۆ لە دنیادایت . پارچە گۆشتەکەی فڕێ دا و ، دەستی دایە شمشێرەکەی و ، هەر خەریکی کوشتار بوو هەتا شەهید بوو .

لەو شەش رۆژەدا کە جەنگ بەردەوام بوو رۆمەکان مەرگیان ئەچەشت و ، لە دەستی سوپا بچکۆلەکەی ئیسلام رزگاریان نەئەبوو .. خەڵکێکی یەکجار زۆریان لێ کوژرا بوو .. یەکێ لەو کوژراوانە فەرماندەی گشتیی هێزە عەرەبە بە گاوربووەکان

بوو کە ناوی مالیکی کوڕی رافیلە بوو و ، فەرماندەی بەشی دەستە راستی سوپای موسڵمانان قوطبەی کوڕی قەتادە کوشتی ..[١٥١]

**شەشەم : خالید ئەبێتە فەرماندە**

کە هەر سێ فەرماندەکە شەهید بوون ، موسڵمانەکان یەکجار ماندوو و هیلاك بوون .. شەشەم رۆژی جەنگە ناهەموارەکە بوو .. تا فەرماندەکان شەهید نەبووبوون و، ئاڵاکەیان بە ئاسمانەوە ئەشۆکایەوە موسڵمانەکان ورەیان بەرز بوو .. بەلاّم کە ئەوان شەهیدبوون و ئاڵاکەیان کەوتە زەویی ورەیان رووخا و، تووشی شڵەژان بوون .. هەتا هەندێك تێك شکان و کەوتنە هەلاّتن .

هەڵوێستێکی یەکجار پڕمەترسیی بوو ..

سوپای ئیسلام بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو شپرزە بووبوو .. هەرسێ فەرماندەکەی شەهید بوون و ئاڵاش کەوتە زەویی ..

کەواتە ئەو سوپایە بە یەکجاریی تیا چوو ..

بەلاّم خوای خاوەنی سۆز و بەزەیی گەیشتە فریای موسڵمانان ..

ئەوەبوو یەکێ لە ئەسپ سوارە ئەنصارەکان ، کە ثابیتی کوڕی ئەقرەم بوو ، خێرا ئاڵاکەی لە قوطبەی کوڕی عامیری ئەنصاریی وەرگرت کە بە دەنگی بەرز هاواری ئەکرد : خزمینە ! پیاو بەرەو روو بکوژرێ چاکترە لەوەی کە لە دواوە ـ لە راکردندا ـ بکوژرێ . ثابیتیش کە ئاڵاکەی گرتە دەست بانگی لە ئەنصار ئەکرد و خەڵکێکی لە دەورکۆبوونەوە . . ئەوەبوو هاواری لێ کردن کە لەسەر فەرماندایەتیی پیاوێکیان رێك بکەون ، تا ئاڵاکەی تەسلیم بکرێ و لێ پرسراوی هەڵوێستەکە بێت . ناودارانی سوپا رەزامەندیان بۆ ئەمیریی ثابیتی کوڕی ئەقرەم نواند ؛ بەلاّم ثابیت دەری بڕیی کە شتی وەها ناکات .

هەڵوێستەکەش یەکجار سەخت بوو ، بۆیە وت و وێژ و راگۆڕینەوەی نەئەویست و، لەو بارودۆخەدا بیر لەوە ئەکرایەوە کە ئەم سوپا بچکۆلەیە تێك نەشکێ و کاری بدرێتە دەست کەسێك کە نەهێلێ ریزەکانی تێك بچن و هەرەس بهێنن ؛ چونکە بەرە بەرە خەریك بوو ورەی سەربازەکانی دائەبەزیی ..

---

[١٥١] غزوة مؤتة لباشميل : ٢٨٦ ـ ٣٠٤ . السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٤٢٧ ، الرحيق : ٤٠١ ـ ٤٠٢ ، شرح حياة الصحابة : ١ / ٧٧٦ ـ ٧٧٧ ، ٨١٣ ـ ٨١٨ .

لەم هەڵوێستەدا کەسێکی تری وەك خالیدی کوڕی وەلید نەبوو کە چاکتر بتوانێ شپرزەبوونی ئەو سوپایە چاك بکات ، کە تەنها سێ مانگ بوو موسڵمان بووبوو ..

ثابیت کە ئاڵاکەی بە دەستەوە بوو و چاوە و چاوی بۆ کەسێکی لێ هاتوو ئەکرد تا ئاڵاکەی بداتە دەست ، هاواری کردە خالید : ئەبوسولەیمان ! ئاڵاکەم لێ بگرە .. خالیدیش وتی : لێتی وەرناگرم تۆ خۆت بۆ ئەو کارە شیاوتری .. تۆ پیاوێکی بەتەمەنی ..

ثابیت وتی : بیگرە ، کابرا ! دە بەخوا تەنها بۆ تۆم هەڵ گرتووە . تۆ لە من زیاتر شارەزای جەنگی .. خێرا ناودارانی سوپا و سەرۆك هۆزەکان پشتگیریی وتەکەی ثابیتیان کرد و ، بە فەرماندەیەتیی خالیدی کوڕی وەلید رازیی بوون و ، خالیدیشیان لەسەر ئەوە هەڵ نا ، تا فریای سوپای شپرزە و بێخاوەن بکەوێ .

خالید لە ترسی سەختیی هەڵوێستەکە ناچار بوو بە دەم دادی موسڵمانەکانەوە بڕوا و، ئاڵاکە بەرز بکاتەوە و ببێتە فەرماندەی گشتیی سوپای موسڵمانان ..

کارێکی زۆر چاك بوو .. ئەو هەڵوێستە پێویستی بەو تەگبیرە هەبوو .. چونکە خالید وەك جەنگاوەرێکی ئازا و بەجەرگ بوو ، لە هەمان کاتدا لە چڵە پۆپەی سیاسەتی سەربازیی و شارەزاییەتیی جەنگدا بوو .. پیاوی ئەوەبوو کە هەڵمەت بەرێتە سەر دوژمن و ، پیاوی ئەوەش بوو کە سوپا بکشێنێتەوە .. لە راستییدا خالید دوای موسڵمانبوونی بووە فەرماندەیەکی ئەوتۆ کە لە پێشی پێشەوەی لیستی فەرماندە پاڵەوانەکانی جیهاندا ناوی تۆمار بکرێت .. دیارە یەکەم کاری پاڵەوانانەی لە ئیسلامدا بریتیی بوو لەم هەڵمەتەی کە توانیی چاکترین نەخشە بۆ سوپای ئیسلام بکێشێت ..

خالید یەکەم جار و پێش هەموو شتێك سوپای رێك و پێك کردەوە . پاشان بە ژیریی و سەلیقەی خۆی متمانەی بۆ دڵ و دەروونی سوپاکەی گێڕایەوە ، بە تایبەت کە سەربازەکانی هەواڵی فەرماندایەتیی خالیدیان بیست ، یەکجار دڵ خۆش بوون . پاشان هێرشێکی توندی کردە سەر سوپای رۆم کە ئەوەبوو ریزەکانی ئەو سوپایەی هێنانە لەرزە و ، پاشان بە ژیریی و سەلیقەیەکی کەم وێنەوە ئەو سوپا بچکۆلەی موسڵمانانی پاشەکشێ پێ کرد ، کە لە ترازووی شارەزایانی کاروباری سەربازییدا بە گەورەترین سەرکەوتن لە قەڵەم ئەدرێ .. بە مەرجێ سوپای دوژمن هەست بە لاوازیی و دۆڕاویی خۆی بکات ، ئەویش بە بۆنەی ئەو هەمووە کوژراو و زامدارەوە کە کەوتنە

ریزەکانیەوە .. بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ئەم لیٚهاتنەی خالید کە توانیی سوپاکەی رزگار بکات نازناوی ( شمشێری خوا ـ سیف الله ) ی لیٚ نا ..

لەو کاتەدا کە خالید سەرگەرمی کاری خۆی بوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ لەلایەن خوای پەروەردگارەوە ئاگاداری ئەو جەنگە ناهەموار، کرا .. خوای گەورە رەزامەندیی نواند تا پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینەوە سەیری جەنگی موئتە بکات و ، ئاگاداری شەهیدبوونی هەر سیٚ فەرماندەکە و ، ئالاٚ هەڵگرتنی خالید ببێت .. ئەمەش یەکێکە لە موعجیزەکانی ئازیز ﷺ .

بوخاریی لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ریوایەتی ئەوەی کردووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەر لەوەی هەواڵی بۆ بێت باسی شەهیدبوونی زەید و جەعفەر و کوڕی رەواحەی بۆ خەڵکەکە کردووە ، کە فەرمووی : (( أخذ الراية زيد فأصيب ، ثم أخذها جعفر فأصيب ، ثم أخذها إبن رواحة فأصيب ـ وعيناه تذرفان ـ حتى أخذ الراية سيف من سيوف الله حتى فتح الله عليهم )) .

لە ریوایەتەکەی بەیهەقییدا کە ناوی هەر سیٚ فەرماندەکە ئەبات کە شەهید بوون، لە خوای گەورە داوای لیٚ خۆش بوونیان بۆ ئەکات و ، دەربارەی خالیدیش ئەفەرموێت : (( أللهم إنه سيف من سيوفك أنت تنصره )) . ئیتر لەو کاتەوە خالید ناو نرا ( سيف الله ) .

واقیدییش ئەڵێت : موحەممەدی کوڕی صالح لە عاصیمی کوڕی عومەری کوڕی قەتادەوە و ، عەبدولجەبباری کوڕی عومارەی کوڕی عەبدوڵلاٚی کوڕی ئەبوبەکر بۆیان گێڕامەوە و وتیان :

کە خەڵکەکە لە موئتە بە یەك گەیشتن پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مینبەر دانیشت و نێوان خۆی و شامی بۆ دەرخرا و ، سەیری جەنگەکەی ئەکرد . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :

(( أخذ الراية زيد بن حارثة ، فجاءه الشيطان فحبب إليه الحياة وكره إليه الموت ، وحبب إليه الدنيا ، فقال : الآن حين استحكم الإيمان في قلوب المؤمنين تحبب إلي الدنيا )) . فەرمووی : زەید ئالاٚکەی هەڵ گرت و ، شەیتان هاتە لای و ژیانی بە لاوە خۆشەویست کرد و ، مردنی بە لاوە ناشیرین کرد و ، دنیای بە لاوە خۆشەویست کرد. ئەویش وتی : ئێستا دێیتە لام و دنیام بە لاوە خۆشەویست ئەکەی ، کاتێك کە ئیمان

لە دڵی ئیمان‌داران‌دا ریشکی داکوتاوە . بەرەو پێشەوە ڕۆی و ، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر کرد و فەرمووی :

(( إستغفروا له فقد دخل الجنة وهو يسعى . ثم أخذ الراية جعفر بن أبي طالب فجاءه الشيطان فمناه الحياة وكره إليه الموت و مناه الدنيا . فقال : الآن حين استحكم الإيمان في قلوب المؤمنين تمنيني الدنيا )) . فەرمووی : داوای لێ خۆش بوون بۆ زەید بکەن . ئەو بە هەڵمەتەوە چووە بەهەشت . پاشان جەعفەری کوڕی ئەبوطالیب ئالاکەی هەڵ گرت و ، شەیتان هاتە لای و ژیان و دنیای بە لاوە خۆشەویست کرد و مردنیشی ناشیرین کرد . ئەویش وتی : ئێستا دڵم بە دنیا خۆش ئەکەیت ، کاتێك کە ئیمان لە دڵی ئیمان‌داران‌دا ریشکی داکوتاوە . بەرەو پێشەوە ڕۆی هەتا شەهید بوو و، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر کرد و بۆیشی پاڕایەوە و ، پاشان فەرمووی :

(( إستغفروا لأخيكم فإنه شهيد دخل الجنة ، فهو يطير في الجنة بجناحين من ياقوت حيث يشاء من الجنة . ثم أخذ الراية بعده عبدالله بن رواحة فاستشهد ودخل الجنة معترضاً )) . فەرمووی : داوای لێ خۆش بوون بۆ براکەتان بکەن ، ئەو شەهیدە و چۆتە بەهەشت . ئەو بە دوو باڵی لە یاقووت دروست کراوەوە بۆ هەر شوێنێکی بەهەشت بیەوێ ئەفڕێت . پاشان دوای ئەو عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە ئالاکەی هەڵ گرت و شەهید بوو و بە ئیعتیراضەوە چووە بەهەشتەوە .

ئەنصار ئەمەیان بە لاوە گران بوو . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( أصابه الجراح )) . فەرمووی : لە چەندین لاوە زامدار بوو بوو . وترا : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئیعتیراضی چیی بوو ؟ فەرمووی : (( لما أصابته الجراح نكل فعاتب نفسه فشجع ، فاستشهد فدخل الجنة )) . فەرمووی : کاتێك کە زامدار بوو سارد بوویەوە ، ئەویش لۆمەی دەروونی خۆی کرد و ، غیرەتی بە بەردا هات و ، شەهید بوو و ، چووە بەهەشتەوە .

راویی ئەڵێت : بەمە خەفەتی خزمەکانی ڕەوی‌یەوە .

لە ریواتەکەی ئیبن ئیسحاق‌دا وەها هاتووە کە کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ دێتە سەر باسی عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە ، ماوەیەك بێ‌دەنگ ئەبێت ، بە رادەیەك کە ڕەنگی دەم و چاوی ئەنصار ئەگۆڕێ و ، وەهایان بە بیردا دێت کە عەبدوڵلا شتێکی خراپی ئەنجام دابێ . پاشان فەرمووی : (( ثم أخذها عبدالله بن رواحة فقاتل بها حتى قتل شهيداً )) . فەرمووی : پاشان عەبدوڵلا ئالاکەی هەڵ گرت و پێ‌یەوە خەریکی کوشتار

بوو هەتا شەهید کرا . پاشان فەرمووی : (( لقد رفعوا إلي في الجنة ، فيما يرى النائم، على سرر من ذهب ، فرأيت في سرير عبد الله بن رواحة إزوراراً عن سريري صاحبيه، فقلت : عَمَّ هذا ؟فقيل لي : مضيا وتردد ، ثم مضى )) . فەرمووی : بە شێوەی کەسێك کە خەو ببینێ لە بەهەشتدا ، بەسەر قەرەوێڵەی زێڕەوە پیشانم دران، ئەبینم قەرەوێڵەکەی عەبدوڵلاَ لە چاو هەردوو قەرەوێڵەی هاوەڵەکانیدا خواربوونەوەیەکی تێدایە . وتم : ئەمە بۆچ وەهایە ؟ پێمیان فەرموو : ئەوان هەردووکیان چوونە پێشەوە ، بەلاَم عەبدوڵلاَ دوو دڵییەکی کرد پاشان چووە پێشەوە.

لە ( إصابە ) ی ئیبن حەجەریشدا هاتووە کە ئیبن عەبباس خوا لێیان رازیی بێ وتوویە : لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوو و ئەسمائی کچی عومەیس ( ی هاوسەری جەعفەر ) لە نزیکیا دانیشتبوو ، فەرمووی : (( يا أسماء ! هذا جعفر بن أبي طالب قد مرّ مع جبريل وميكائيل فردّي عليه السلام )) . فەرمووی : ئەسماء! ئەوە جەعفەرە لەگەڵ جیبریل و میکائیل تێپەڕین ، تۆش وەلاَمی سەلامەکەی بدەرەوە . هەروەها فەرمووی :(( ... فعوضه الله من يديه جناحين يطير بهما حيث يشاء )) . فەرمووی : خوای گەورە لە بریی دوو دەستەکەی دوو باڵی پێ بەخشیوە و، بە ویستی خۆی بۆ هەر کوێ بیەوێ پێیانەوە ئەفڕێ ..

یەعلای کوڕی ئومەییەش بە هەواڵی جەنگی موئتەوە دێتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەمیش پێی ئەفەرموێ : (( إن شئت فأخبرني ، وإن شئت أُخبرك )). فەرمووی : ئەگەر پێت خۆشە تۆ هەواڵەکەم پێ بڵێ و ، گەر پێیشت خۆشە من هەواڵ بە تۆ ئەدەم ..

وتی : تۆ هەواڵم بدەرێ ، ئەی پێغەمبەری خوا ! [١٥٢]

ئەڵێت : پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی موسڵمانەکانی هەر هەموو بۆ گێڕانەوە و وەصفیشی کرد بۆیان . یەعلاش وتی : بەو خوایەی بە دینی حەق رەوانەی کردووی پیتێك لە باسەکەی ئەوانت بەجێ نەهێشتووە و ، کاری موسڵمانانیش هەر وایە کە

---

[١٥٢] یەعلای کوڕی ئومەییە هاوپەیمانی قورەیش بووە . بەشداریی حونەین و طائیف و تەبووکیشی کردووە. کاربەدەستی نەجران بووە لە سەردەمی عومەردا ، پاشان لەسەر کار لای ئەبات و ، دواتریش عوثمان ئەیکاتە کاربەدەستی صەنعای یەمەن . لە ساڵی شەهیدکردنی عوثماندا حەجی کردووە . ساڵی ٤٧ ی کۆچیی کۆچی دوایی کردووە .

باست کرد . ئەویش فەرمووی : (( إن الله رفع لي الأرض حتى رأيت معتركهم )) . فەرمووی : خوا زەویی ئەوەندە بەرز کردەوە بۆم هەتا شوێنی جەنگەکەیانم بینیی.

کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵەکەی بۆ موسڵمانەکان ئەگێڕایەوە تێی گەیاندن کە بە شەهیدبوونی هەر سێ فەرماندەکە سوپای موسڵمانان شپرزە بووە ، بەڵام کە خالید بۆتە ئەمیر و ئاڵاکەی هەڵ گرتووە ، جەنگ گەرم بۆتەوە و ، موسڵمانەکان بوونەتەوە بە خاوەنی ورە و ، پاڵەوانانە ئەجەنگن ..

ئەمە یەکەم جەنگ بوو کە خالید دوای موسڵمانبوونی بەشداریی تیێدا بکات و، یەکەم جاریش بوو ببێتە فەرماندەی گشتیی سوپایەکی موسڵمان .. ئەو کارەش کە کەوتە ئەستۆی خالید کارێکی یەکجار سەخت بوو .. چونکە موسڵمانەکان لە مەیدانی جەنگدا پژا بوون و یەکجار شڵەژا بوون .. تا ئەو کاتە هێشتا موسڵمانان وەها شپرزە نەبوو بوون ..

ئەبوعامیریش باسی تێکشکانی موسڵمانەکان ئەکات دوای شەهیدبوونی هەر سێ فەرماندەکە : پاشان عەبدوڵلای کوڕی رەواحە ئاڵاکەی هەڵ گرت و دەستی دایە کوشتار هەتا شەهید بوو .. پاشان موسڵمانەکان بە خراپترین شێوە کە من دیبێتم تێك شکان ، بە رادەیەك کە دوو موسڵمانم پێکەوە نەئەدین !! ئا لەم کاتەدا ئەرکێکی یەکجار قورس ئەکەوێتە ئەستۆی خالید :

پێویستە ئەم سوپا شپرزەیە کۆ بکاتەوە و ، یەکی پێ بگرێتەوە و ، ریزەکانی رێك بخاتەوە و ، لە تیاچوون رزگاری بکات .

پێویستە هێرشێکی وەها بکاتە سەر رۆم کە خۆیان بۆ هەڵاتن ئامادە بکەن ، تا کە سوپای ئیسلام کشایە دواوە بۆ خۆ دەربازکردن لە چنگی دوژمن و ، خۆ قوتار کردن لە تێکشکان ، ئەوان نەوێرن دوای موسڵمانەکان بکەون .

خالید ئەیزانیی سوپا بچکۆلەکەی ئیسلام یەکجار ماندووە و ، بۆ هەتا هەتایی ناتوانێ جەنگ بکات . ئەمەش کارێکی ئاسایییە ، چونکە تەنها ئەو سوپا ئیمانییە توانیویەتی خۆی بگرێت و شەش رۆژ جەنگی خوێناویی وەها بکات ، ئەگینا لە مێژوودا هیچ سوپایەك ئاوەها نەیتوانیوە بجەنگێ و ، هەموو شارەزایەکی جەنگیش بە لایەوە شتێکی زۆر ئاسایییە کە تاقی ئەو سوپایە ببڕێتەوە یان هەر هەمووی خۆی بە دەستەوە بدات ..

ئەوەی کە پێویست بوو موسڵمانەکان ئەنجامی بدەن کشانەوە بوو .. کشانەوە بە سەلامەت گەورەترین سەرکەوتن بوو . بەڵام موسڵمانەکان تێکەڵ بە شەپۆلی سوپای رۆم بوو بوون و ، بەو ئاسانی‌یە جیا نەئەبوونەوە ، ئیتر چۆن بکشێنەوە ؟

ئەبێ خالید چۆن توانیبێتی بکشێتەوە ؟

هەر کە خالید دەستی دایە ئاڵاکە بووە لێپرسراوی سەلامەتیی ئەو سوپا بچکۆلە.. ئەوەبوو دەستەی ئەرکانی جەنگی کۆ کردەوە و ، کەوتنە نەخشەکێشان .. نەخشەی کشانەوە ..

بەڵام چۆن بتوانێ سوپایەکی سەرگەردانی شپرزە بە سەلامەت بکشێنێتەوە ؟

یان کێ ئەڵێ هۆزە عەرەبە بتپەرستەکانی نێوان موئتە و مەدینە رێ بە سەربازانی ئیسلام ناگرن ، ئەگەر بە رێك و پێکیی و لە ژێر فەرمانی فەرماندەیەکی لێ هاتوودا نەکشێنەوە ؟

خالیدی فەرماندە ئاگاداری ئەم خاڵانە بوو .. کەواتە ئەبێ بە وردیی نەخشە بکێشێ . خۆ هەر کەسی تر بوایە لەو هەڵوێستەدا نەی‌ئەزانیی چیی بکات ، بەڵام خالید کۆڵدانی بۆ نیە .. هەر کەسی تر بوایە دەستی لە هەموو شتێك ئەشۆرد ، بەڵام خالید نازانێ دەست شۆردن چی‌یە ؟

خالید توانیی زۆر بە چاکیی سوپاکەی بکشێنێتەوە ، بەو مەرجەی سوپای رۆم نەتوانێ دوای بکەوێ !! چۆن ؟!

خالید توانیی دەستێکی چاك لە رۆمەکان بوەشێنێ و تووشی زەرەر و زیانێکی زۆریان بکات و ، پاشان بە سەلامەتیی بکشێتەوە .

بەڵێ لە تاریك و لێڵیی ئێوارەی شەشەمدا بوو شپرزەیی رووی کردە سەربازانی ئیسلام .. ئەو کاتەی کە خالید ئاڵاکەی وەرگرت .. بەڵام خالید نەی‌هێشت رۆمەکان کەڵك لەمە وەربگرن ، بەڵکو فەرماندایەتیی رۆمی وەها چەواشە کرد کە بە پێچەوانەوە بیر بکەنەوە..

خالید ئەوەی بردە مێشکی فەرماندایەتیی رۆمەوە کە موسڵمانەکان کۆمەکی‌یان بۆ هاتووە و ، لە مەدینەوە فەرمانی تازەیان بۆ هاتووە کە لەسەر جەنگی خۆیان بەردەوام بن .. دەی کەواتە موسڵمانەکان بە هیچ شێوەیەك بە تەمای کشانەوە نین و ، ورەشیان یەکجار بەرزە ..

جا سوپای ئیسلام بەو کەمی‌یە ئەو شەش رۆژە تالآوی مەرگی بە رۆم چەشتبێ، داخۆ ئەگەر کۆمەکیی مەدینەیان بگاتێ ؛ چ جەنگێکی خوێناویی لەگەڵ رۆم‌دا ئەکەن ؛ کە هەر لە ئێستەوە دەست و پەلی یەکە یەکەی سەربازەکانی شل بوون ؟

ئەی چەواشەکردنەکە چۆن ئەنجام درا ؟

هەر کە دنیا تاریك بوو و سوپای هەردوو لا دەستیان لە جەنگ و کوشتار هەڵ گرت و گەڕانەوە دوا ، خالید بە خێرایی کەتیبەکانی رێك و پێك کردن و ، لە شلەژان و شپرزەیی رزگاری کردن .. پاشان کۆمەڵێك سوارچاکی هەڵ بژاردن و، فەرمانی دا لە تاریکیی شەودا بگەڕێینەوە دوا و خۆیان بگەیەننە دواوەی سوپای ئیسلام ؛ بەڵام بەوپەڕی نهێنی‌یەوە .

خالید فەرمانی دا ئەو سوارچاکانە کە گەیشتنە شوێنی دیاریی‌کراو ببنە چەند دەستەیەك و ؛ هەر دەستەیەکیش فەرماندەی خۆی هەبێت . فەرمانیشی بەو فەرماندانە دا لەگەڵ بەرەبەیان‌دا ، هەر دەستە و لە شوێنی خۆیەوە بجووڵێن و بەرەو موئتە ، بکەونە رێ .. لەگەڵ ئەوەش‌دا بە تەهلیل و تەکبیر دەنگ بەرز بکەنەوە.

هەروەها فەرمانی پێ دان کە لە شوێنی وەهادا کە تۆزی زۆر بێت دەست بدەنە غار غارێن بە ئەسپەکان ، هەتا تۆز بەرز ببێتەوە؛ و ، لە دوورەوە سوپای رۆمان هەرا و دەنگە دەنگەکە ببیستێ و تەپوتۆزەکەش ببینێ و ، وەها بزانن کە سوپایەکی گەورە لە مەدینەوە هاتووە بۆ کۆمەکی‌یان .

لە هەمان کات‌دا خالید هەر بەو شەوە کارێکی گرنگی تری ئەنجام دا ، کە ئەویش بریتیی بوو لە شوێن‌گۆڕینی دەستە راست و دەستە چەپ و ناوجەرگەی سوپا.. دەستە راستی بردە شوێنی دەستە چەپ و چەپیشی هێنایە شوێنی راست و، سەربازی تری هێنایە جێی کەتیبەکانی ناوجەرگە . مەبەستی لەمەدا ئەوەبوو بە راستەقینە لە دڵی رۆمەکان‌دا جێی بکاتەوە کە ئەم سوپایەی موسڵمانەکان سوپاکەی دوێنێ نیە.. ئەوەتا سەربازەکان گۆڕاون .. دەی کەواتە موسڵمانەکان کۆمەکیی مەدینەیان فریا کەوتووە..

کە دنیا رۆشنی کرد رۆمەکان سەرنجیان دا سوپایەکی تازە لە بەرامبەریان‌دا وەستاوە .. لە رۆژی حەوتەم‌دا دیتیان وا ئەفسەر و سەربازی سوپای موسڵمانان ئەوانەی شەش رۆژی رابوردوو نین .. نە خۆیان و نە ئاڵآیان .. کە سەرنجی ئاسۆی لای

باشووریان دا تۆز و خۆڵێکی زۆریان بە ئاسمانەوە دیی و لە ناو تەپ و تۆزەکەش‌دا دەنگی ( لا إله إلا الله ) و ( ألله أكبر ) بەرز ئەبوویەوە ..

لەبەر چاوی سوپای رۆمان‌دا دنیا گۆڕا .. ترسێکی زۆریان لیٚ نیشت .. ئەوان شەش رۆژ گیرۆدەی دەستی سوپایەکی بچکۆلە بوون ، ئێستە لە کویٚ بەرگەی ئەو هەمووە کۆمەکی‌یە ئەگرن کە مەدینە ناردوویەتی ؟!

کە دەنگی ( تەهلیل ) و ( تەکبیر ) ی ناو تەپ و تۆزەکە بەرزبوویەوە ، سوپای موسڵمانانیش، کە بەرامبەر بە رۆمەکان وەستا بوو، دەستی دایە وتنی ( تەهلیل ) و ( تەکبیر ) ، بە دەنگی بەرز .. ئەمەش بە نەخشەیەکی جوانی فەرماندەی گشتیی..

رۆمەکان قەناعەتی تەواویان کرد کە سوپایەکی یەکجار گەورەی موسڵمانان گەیشتۆتە موئتە و لە رۆژی حەوتەم‌دا گەورەترین هێرش ئەکاتە سەریان و ، درێژە بە جەنگی خوێناویی ئەدات . ئەم قەناعەتەش ترسێکی زۆری بردە دڵ و دەروونی ئەفسەر و سەربازانی سوپای رۆمەوە .

فەرماندەی لیٚزانیش ، خالیدی کوڕی وەلید ، ئاگای لە حاڵەتی دەروونیی رۆم و عەرەبە هاوپەیمانەکانیان بوو .. ئەی‌زانیی چ ترس و لەرزێك چۆتە دڵیانەوە.. بۆیە فەرمانی دا بە کەتیبەکانی ئیسلام ، ئەم هەلە لە کیس نەدەن و ، خێرا هەڵمەت بەرنە سەر سوپای دۆڕاو و ورە رووخاوی رۆم .. بەڵام هەڵمەتێکی هەورە تریشقە ئاسا..

کەتیبەکانی ئیسلام لە هەموو لایەکەوە کەوتنە هێرش و ، سوپای رۆمیان داگرتەوە .. رۆمەکان نەیان‌ئەزانیی ئەمە ئەو سوپا ماندوو و هیلاکەیە کە دوێنیٚ دوای شەهیدبوونی هەرسیٚ فەرماندەکەی دەستی لە خۆی شۆردبوو .. بەڵکو وایان ئەزانیی سوپای تازەیە و ، ئەمە یەکەم هەڵمەتیەتی ..

ترس و لەرز دای‌گرتنەوە ..

ریزەکانیان شپرزە و پارچە پارچە بوون ..

موسڵمانەکان نیشتنە سەریان ..

شمشێریان خستە گەردنیانەوە ..

سەربازێکی یەکجار زۆریان لیٚ کوشتن ..

واقیدیی بە کوشتارێکی بیٚوێنەی لە قەڵەم داوە ..

ئیبن سەعیدیش بەوپەڕی سەرکەوتنی لە قەڵەم داوە ، بە رادەیەك کە رۆم تێك ئەشکێن.

لە کاتێکدا کە ئەم جەنگە رووی دابوو ، ئەبوعامیر - کە یەکێ لە هاوەڵان بوو و، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ کاری پێویست ناردبووی بۆ شام - لە شامەوە ئەگەڕێتەوە و، ئەو جەنگ و کوشتارە ئەبینێ ..

خالید بەبێ کۆڵدان خەریکی تێك شکاندنی رۆم بوو .. موسڵمانەکان جەنگێکی سەختیان ئەنجام ئەدا.. رۆمەکان خەریکی پاشەکشە بوون و ، لە هەمان کاتدا بەوپەڕی دڕییەوە ئەجەنگان .. هەتا ئەوەبوو لەو هەڵمەتەدا خالید نۆ شمشێری بە دەستەوە شکان .

ئیمام بوخاریی لە خالیدەوە ئەگێڕێتەوە کە وتوویە : رۆژی موئتە نۆ شمشێر لە دەستمدا شکان و ، تەنها شمشێرێکی یەمانیی لە دەستمدا مایەوە ..

دیارە خالید نایەوێ بەردەوام بچێت بە گژی رۆمدا ، بەڵکو ئەیویست رۆم بشلەژێن و ، ئەمیش بە ژیرانە سوپای ئیسلام بە سەری بەرزەوە پاشەکشە پێ بکات . بۆ ئەمە فەرمانی دا بە فەرماندەکانی سوپا تا بە هێمنیی و لەسەر خۆ شەو سوپا بکشێننەوە و ، خۆیشی سەروکاریی ئەکردن ، هەتا بە رێك و پێکیی کارەکە ئەنجام بدەن و تووشی زەرەر و زیان نەبن .

سوپای رۆمەکان هەر لەسەر ئەو رایە بوو کە ئەم هەڵمەتەی کە موسڵمانەکان لەم دواییەدا ئەنجامیان دا ، هەڵمەتی کۆمەکیی مەدینە بوو ، بۆیە شوێنکەوتنی موسڵمانەکانی یەکجار بە مەترسییدار ئەزانیی . بۆیە فەرمان دەرچوو کە بە هیچ شێوەیەك شوێن موسڵمانەکان نەکەون .

رۆمەکان لەلایەکەوە ئەترسان موسڵمانەکان داویان بۆ نابنەوە و پێیان خۆش بێ رایان بکێشنە ناو بیابانەوە، تا لەوێ پیلانیان بۆ دابنێن و، تووشی زیانیان بکەن.

لە لایەکی ترەوە پێیان خۆش بوو رزگاریان ببێ . چونکە وەها بیریان ئەکردەوە کە موسڵمانەکان بوونەتە خاوەنی سوپایەکی گەورە و ، تەنها سوپا بچکۆلەکەی جاران ناچێت بە گژیاندا ، هەرچەندە ئەویش زیانێکی گەورەی پێ گەیاندن ..

بۆیە رۆمەکان پێیان خۆش بوو موسڵمانەکان بکشێنەوە و ، لە دەستیان رزگار بن.. خوای گەورەش کۆمەکیی خالیدی کرد و بە ژیرانە سوپا بچکۆلەکەی ئیسلامی گەیاندەوە مەدینە و ، ئەوەندەش بە رێك و پێکیی گەڕانەوە هیچ هۆزێك نەیوێرا رێ

یان پێ بگرێ . هەتا هۆزە دوژمنەکان هەندێکیان پاڵیان دا بە ئیسلامەوە و موسڵمان بوون ، وەك هۆزی نەوەی سولەیم و ، ئەشجەع و ، غەطەفان و ، ذیبیان و ، فەززارە . ئەمەش بەو بۆنەوە کە سوپا بچکۆلەکەی ئیسلام توانیی سوپای مل‌هوڕی ڕۆم بەو بارودۆخە بگەیەنێ..

بەڵام بەر لەوەی موسڵمانەکان بگەنەوە مەدینە ، هەواڵێکی چەواشە گەیشتبووە مەدینە کە گوایا سوپای موسڵمانەکان لە جەنگی موئتە هەڵاتوون و تێك شکاون . شتێکی روون و ئاشکرایە کە هەڵاتن کردەوەیەکی نەویستراو و قیزەون بووە لە مێژووی موسڵمانان‌دا و، هەرگیز خواناسان بیریان لەوە نەکردۆتەوە لەبەر دوژمن‌دا هەڵ بێن . بۆیە کە دانیشتوانی مەدینە ئەو هەواڵەیان بیست زۆریان پێ ناخۆش بوو و ، رقیان لە سوپای موئتە هەڵ گرت .

هەر کە سوپای موئتە ، بە فەرماندایەتیی خالیدی کوڕی وەلید ، گەیشتەوە دەوروبەری مەدینە ، تووشی بە تووشی خۆ پیشان‌دانێکی گەورەوە بوو ، کە خەڵکەکە هەڕەشەیان لە سوپاکە ئەکرد و ، هاواریان ئەکرد : ئەی هەڵاتوان ! لە غەزای پێناوی خوادا هەڵاتوون .. ئیتر لە فەرماندە و سەربازیان نەئەپرسی‌یەوە ، خۆڵیان بە دەم و چاویان‌دا ئەکرد ..

بەڵێ ، کۆمەڵگای ئیسلامیی کۆمەڵگای غیرەتە .. سووکیی و ترسنۆکیی بەلایەوە شتێکی نامۆیە .. پێویستە بە هەموو شێوەیەك غیرەت بخرێتە کار بۆ رزگار کردنی مرۆڤ..

بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ ، لەبەر ئەوەی کە لە پاڵەوانێتیی سوپا بچکۆلەکەی موئتە شارەزا و ئاگادار بوو ، بەرگریی لە سەربازانی سوپاکەی ئەکرد ، چونکە ئەو لە ئەبوعامیری هاوەڵیەوە ، کە ئەوەبوو لە شامەوە گەڕابوویەوە و ، بەلای موئتەدا تێپەڕیی بوو ، هەواڵی راستەقینەی وەرگرتبوو ، بۆیە بۆ هێورکردنەوەی خۆ پیشان دەران ئەی فەرموو : (( لیسوا بفرّار ولکنهم کرّار إن شاء الله )) . ئەی فەرموو : هەڵ نەهاتوون ، بەڵام کشاونەتەوە تا جارێکی تر هەڵمەت بەرن ، إن شاء الله ، چونکە ئەمان دەستی چاکیان لە ڕۆم وەشاندبوو ، بە رادەیەك کە سوپای ڕۆم لە خوایان ئەویست لە چنگی ئەو سوپا بچکۆلە دەرباز بێ .. بە تایبەت جەنگی خالید کە ڕۆمەکان ئەترسان داویان بۆ بنێتەوە ..

بەڵام دانیشتوانی مەدینە بەو ئاسانی‌یە هێور نەئەبوونەوە و ، دەستیان لە لۆمە کردن و سوکایەتیی پێ کردن هەڵ نەئەگرت ، هەتا ژنان دەرگایان لە رووی

مێردەکانیاندا داخستبوو و نەیان ئەهێشت بچنە ژوورەوە و ، تانە و تەشەریان تێ ئەگرتن کە گوایا ترسنۆك بوون و بۆ ژیانی دنیا پشتیان لە شەهیدیی هەڵ کردووە .

هاوەڵە فەرماندە و ناودارەکانیش ، ئەوانەی بەشداریی موئتەیان کردبوو ، لە ترسی ئەوەی کە دانیشتوانی مەدینە بە سووك سەیریان بکەن ، ناچار بوون لە ماڵەکانیاندا خۆیان حەشار بدەن ، بە رادەیەك کە پێغەمبەری خوا ﷺ ناچار بوو یەك بە یەك بنێرێ بە دوایاندا و دڵخۆشی‌یان بکات کە ئەمان لە جەنگ رایان نەکردووە بەڵکو هەڵمەت بەرن لە رێی خوادا.

لە ئەبوبەکری کوڕی عەبدوررەحمانی کوڕی حاریثی کوڕی هیشامەوە ریوایەت کراوە کە وتوویە : سەلەمەی کوڕی هیشامی کوڕی موغیرە ، واتە ئامۆزای خالیدی کوڕی وەلید ، لەگەڵ سوپای موئتەدا بوو ، جا ژنەکەی چوو بووە لای ئوم‌سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەری خوا ﷺ و ، ئوم سەلەمە پرسیی بووی : ئەوە چی‌یە سەلەمەی کوڕی هیشام نابینم ؟ ئایا نەخۆش نیە ؟ ژنەکەشی ئەڵێت : نا ، بەخوا بەڵام ناتوانێ لە ماڵ دەرچێت . هەر کە بێتە دەرەوە خەڵکەکە هاوار ئەکەنە ئەو و هاوەڵانی و ئەڵێن : ئەی هەڵاتوان ! ئایا لە غەزای پێناوی خوادا هەڵاتوون؟

ئەویش ناچار لە ماڵەوە دانیشتووە . ئوم سەلەمە ئەم باسە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگێڕێتەوە و ، ئەویش ئەفەرموێ : (( بل هم الكرّار في سبيل الله فليخرج )) . ئەفەرموێ : بگرە ئەوان کشاونەتەوە تا هەڵمەت بەرن لە رێی خوادا ، با لە ماڵ دەرچێت . ئیتر دەرئەچێت ..

نارەزایی دەربڕین و خۆ پیشان‌دانی دانیشتوانی مەدینە چەند رۆژێکی خایاند .. ئەمە یەکەم خۆ پیشان‌دانێك بوو کە موسڵمانەکان لە ئیسلامدا ئەنجامیان دا .. بە ئەوپەڕی سەربەستی‌یەوە هێرشیان ئەکردە سەر پاڵەوانەکانی ئیسلام و ، ئەوانیش کە شمشێر بە دەستیانەوە بوو دەنگیان نەئەکرد .. پێغەمبەری خواش ﷺ لێ‌یان زویر نەئەبوو کە ئەو هەڵوێستە ناشیرینەیان بەرامبەر بە سوپا پاڵەوانەکەی ئەگرتە بەر ، بەڵکو لەسەرخۆ تێی ئەگەیاندن .. ئەبوایە خێرا وازیان بهێنایە ، کەچی چەند رۆژێك لە کۆڵی ئەو بەستەزمانە ماندوو و هیلاك و برسێتیی و تینوانە نەئەکەوتن . واتە ئەوپەڕی سەربەستیی رادەربڕینیان هەبوو . هەر چەند راکەشیان هەڵە بوو لە ئەنجامدا

تیٚگەیشتن کە سوپای موئتە سوپای پاڵەوانی تاقانەی سەرزەوی‌یە و ، توانیویەتی سوپایەکی وەها مل‌هوڕ ئابڕوو بەریٚت !![١٥٣]

**حەوتەم : پایەداریی هەر سیٚ ئەمیرەکە**

ئەو سیٚ ئەمیرەی کە پیٚغەمبەری خوا ﷺ بۆ فەرماندایەتیی سوپای موئتە هەڵی بژاردن ، لە هاوەڵە ناودار و پیاوچاکەکانی بوون .. دوانیان لە کۆچ‌کەرانی مەککە بوون و عەبدوڵلاش لە ئەنصار بوو و ، هەرسیٚکیان زوو بە زوو موسڵمان بوو بوون .

زەیدی کوڕی حاریثە نازناوی ( حب رسول الله ) ی وەرگرتبوو . هەر بە منداڵیی لە ماڵی پیٚغەمبەری خوادا ﷺ گەورە بوو بوو ، بۆیە پەروەردەیەکی چاکی وەرگرتبوو و، بەڵیٚ خزمەت گوزاریان بوو ، بەڵام هەر پیٚش هاتنی وەحی ئازاد کرابوو و، کاتیٚکیش کە وەحی هات لە بەندەکاندا یەکەم کەس بوو کە ئیمانی بە ئیسلام هیٚنا.

زەید جەنگاوەریٚکی زۆر لیٚ هاتوو بوو ، بۆیە فەرماندایەتیی چەند سریەیەکی پیٚ سپیٚررا بوو و ، بە سەرکەوتنەوە ئەنجامی دابوون .

عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحەش یەکیٚ لە سەردارانی هۆزی خەزرەج بوو و ، زوو بە زوو موسڵمان بوو بوو . ئەوەبوو بەشداریی پەیمانی عەقەبەی دووهەمی کرد و ، یەکیٚ بوو لەو دوانزە نەقیبەی کە دانیشتوانی مەدینە بۆ ئەمیریی خزمەکانیان هەڵیان بژاردن ، تا ئەو بەڵیٚنانەی کە ئەنصار داویانە بە پیٚغەمبەری خوا ﷺ ئەوان بە ناوی خزمەکانیانەوە جیٚ بەجیٚیان بکەن .. عەبدوڵلا یەکیٚ بووە لە کەڵە شاعیرە ناودارەکان و ، ئەویش مژدەی بەهەشتی ، وەك زەید و جەعفەر ، وەرگرتووە ..

جەعفەریش کە ئامۆزای پیٚغەمبەری خوا بوو و ، گەنجیٚکی ڕەوشت جوانی دامەزراو و ، خاوەنی ڕیٚز و سەخاوەت و دەروون پاکی‌یەکی بیٚویٚنە بوو ، یەکیٚ بوو لەوانەی کە لە مەککەدا زوو بە زوو موسڵمان بوو . کاتیٚکیش کە کۆچی بۆ حەبەشە کرد ئەمیری کۆچ‌کەران بوو و ، لەویٚ مەردانە بەرگریی لە ئیسلام و موسڵمانان ئەکرد و ، ژیرانەش ئیسلامی ڕوون ئەکردەوە ، تا ئەوەبوو کاربەدەستانی حەبەشە لە ستەم لیٚکراوی‌یان گەیشتن و ، کاتیٚ کە قوڕەیش داوای کرد تەسلیمیان بکەنەوە ، ئەوانیان پاراست و ، سەرەنجام نەجاشیی ئەصحەمە ئیمپراتۆری حەبەشە موسڵمان بوو ، دوای ئەوەی کە جەعفەر باسی زۆرانبازیی نیٚوان خۆیان و قوڕەیشی بە جوانیی بۆ شیی کردەوە . هەتا ئەوەبوو کاربەدەستانی دەوڵەت و قەشە و پیاوە دینی‌یەکان ناڕەزایی

[١٥٣] غزوة مؤتة لباشميل : ٣٠٤ ـ ٣٣٢ ، السيرة النبوية : ٢/ ٤٢٨ ـ ٤٣٠ ، الرحيق : ٤٠٣ ـ ٤٠٤ .

یان لە موسڵمان بوونی پادشا دەربڕیی و شۆڕشێکی چەکدارییشیان لە دژی بەرپا کرد، بەڵام خوای گەورە پشتی نەجاشیی گرت و ، ئەو ملەجەڕەیەی لە ناو برد و ، هەتا مابوو پادشایەکی موسڵمان بوو بەسەر گەلی حەبەشەی گاوردا و ، کە کۆچی دواییشی کرد ، پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینەوە نوێژی غایبی لەسەر کرد.

کاتێك کە قوڕەیش نوێنەرەکانی خۆی ناردنە لای نەجاشیی تا موسڵمانە کۆچ کەرەکان بگێڕێتەوە ، پادشا بڕیاری دا بانگیان بکات و ، بە جوانیی لە بەڵگەی هەر دوولا تێ بگات . جا کە موسڵمانەکان هاتن و جەعفەر بە ژیرانە وەڵامی پادشای دایەوە و ، داواکارییەکانی نوێنەرانی قوڕەیشی پووچەڵ کردنەوە ، پادشا ئەوەندە تووڕە بوو نێرراوەکانی قوڕەیشی دەرکردن ، بە مەرجێ ئەو کاتە تەمەنی جەعفەر لە سیی ساڵیی کەمتر بووە .

لەسەر ئەم ڕەوشتە جوانانە پێغەمبەری خوا ﷺ جەعفەری زۆر خۆش ئەویست ، چونکە هیچ کەس نەبووە ئەوەندەی جەعفەر لە لاشە و ئەندام و لە ڕەوشت جوانییدا لە پێغەمبەری خوا بچێت . هەتا ئەوەبوو جەعفەر لە ( عمرة القضاء ) دا لە خزمەتیا بوو و پێی فەرموو : (( أشبهت خَلقي و خُلُقي )).

جەعفەر ئەوەندە پایەدار بووە بەلای پێغەمبەری خواوە ﷺ ، تەنها لەبەر ئەو هەڵساوەتەوە ، کاتێك کە لە حەبەشەوە گەڕایەوە ، ئەوەبوو ناوچاوانی ماچ کرد و ، لە خۆشیانا بەسەر یەك قاچەوە بەڕێوە ئەچوو ..

هەندێ لە هاوەڵانیش وەهایان ئەبینی کە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ چاکترین کەس جەعفەرە .

ئیمام ئەحمەد بە ئیسنادێکی چاك لە ئەبوهورەیرەوە ریوایەتی کردووە کە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ کەسێك پێڵاوی لە پێ نەکردووە و ، سواری وڵاغ نەبووە و ، جل و بەرگی لەبەر نەکردووە لە جەعفەری کوڕی ئەبوطالیب چاکتر بێت .

پێغەمبەری خوا ﷺ خەفەتێکی زۆری بۆ جەعفەری ئامۆزای خوارد ، ئەوەبوو فرمێسکێکی زۆری بۆ هەڵ ڕشت و ، خۆی تەشریفی بۆ ماڵی جەعفەر برد تا دڵ خۆشیی منداڵەکانی بکات . کە هێشتا منداڵ بوون .

ئەسمائی کچی عومەیسی هاوسەری جەعفەر ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : ئەو ڕۆژەی کە جەعفەر و هاوەڵانی شەهید بووبوون پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ ماڵمان و منیش

چل مەن ( رەتـڵ ) پـێـخـۆرم ئامـادە کردبـوو و ، هـەویرم شـێلابوو و دەم و چـاوی منداڵەکانم شۆردبوو و ، رۆنم لەسەریان دابوو ..

که پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەوە فـەرمووی : ئـەسماء ! کوڕەکـانی جەعفـەر کوان ؟ منیش هێنانم ، ئەویش باوەشی پیایانا کرد و بۆنی کردن ، پاشان فرمێسك بە خوڕیی لـە چـاوی هاتنـە خـوارەوە و دەسـتی بـە گریـان کـرد . منـیش وتم . ئـەی پێغەمبەری خوا! لەوە ئەچێ دەربارەی جەعفەر و هاوەڵانی شتێکت پـێ گەیشـتبێ . فەرمووی : (( نعم ، أصيبوا هذا اليوم )) . له رێوایەتێکی تردا ئەڵێت : لـەوە ئەچـێ دەربارەی جەعفـەر شـتێکت پـێ گەیشـتبێ . فـەرمووی : (( نعـم ، قتـل اليـوم )) . فەرمووی : بەڵێ ئەمڕۆ شەهید بووە .

ئەڵێت : منیش دەستم بە هاوار کرد و ژنان لێم کۆبوونەوە و ، پێغەمبەری خوایش ﷺ ئەی فەرموو : (( يا أسماء ! لا تقولي هجراً ، ولا تضربي صدراً )) . فـەرمووی : ئەسماء! وتەی ناشیرین بە دەمتدا نەیەت و ، لە سنگیشت نەدەی .

ئەڵێت : پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا و چوو بۆ ماڵی فاطیمـەی کچـی و ، ئـەویش ئەی وت : (( وا عماه )) . پێغەمبەری خوایش ﷺ فەرمووی : (( على مثل جعفر فلتبك الباكية )) . فەرمووی : با شیوەنگەران لەسەر پیاوی وەك جەعفەر بگرین . پاشان فەرمووی : (( إصنعوا لآل جعفر طعاماً ، فقد شغلوا عن أنفسهم اليوم )) .

فەرمووی : خواردن بۆ خاوخێزانی جەعفەر دروست بکەن ، ئەمڕۆ پەشۆکاون . لـە رێوایەتێکی تریشدا فەرموویە : (( لا تغفلوا عن آل جعفر أن تصنعوا لهم طعـاماً ، فإنهم قد شغلوا بأمر صـاحبهم )) . فەرمووی : لە خاوخێزانی جەعفەر بێئاگا نەبن ، خواردنیان بۆ دروست بکەن ، چونکە ئەوان بە شەهیدبوونی جەعفەرەوە پەشۆکاون ..

لە عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەرەوە ئەگێڕنـەوە کـە وتوویـە : لـە بیرمـە کـاتێ کـە پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ماڵمان و شەهیدبوونی بـاوکمی بـە دایکـم گەیانـد . مـن سەیرم ئەکرد و ئەویش دەستی بە سەری من و براکـەمدا ئـەهێنا و ، هـەردوو چـاوی فرمێسکیان لێ ئەهاتە خوارەوە و بە دڵۆپە لە ریشەکەیدا ئەکەوتنە خوارەوە . پاشان فەرمووی : (( أللهم ! إن جعفر قد قدم إلى أحسن الثواب فأخلفه في ذريته بأحسـن مما خلفت أحداً من عبادك في ذريته )) . فـەرمووی : خوایـە ! جەعفـەر بـەرەو چـاکترین پاداشت براوە و ، لە هەموو کەسێ چاکتر وەچە و بەرەکەشی بکەرە جێگرێکـی چـاك

بۆی . پاشان فەرمووی : (( يا أسماء ! ألا أبشرك ؟ )) فەرمووی : ئەسماء ! ئایا مژدەت نەدەمێ ؟ وتی : بەڵێ ، دایك و باوكم بە قوربانت بن . فەرمووی: (( فإن الله عز وجل جعل لجعفر جناحين يطير بهما في الجنة )) . فەرمووی : خوای گەورە دوو باڵی بە جەعفەر بەخشیین هەتا لە بەهەشتدا پێیانەوەی بفڕێ.

ئەڵێت : دایكم و باوكم بە قوربانت بن ئەی پێغەمبەری خوا ، ئەمە بۆ خەڵك باس بكە.

عەبدوڵلا ئەڵێ : پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا و دەستمی گرت و دەستیشی بە سەرمدا ئەهێنا هەتا سەركەوتە سەر مینبەر و ، منیشی لەبەر دەمیدا پلەیەك نزم تر ، دانیشاند و ، خەم و خەفەتیشی پێوە دیار بوو و دەستی بە فەرمایشت كرد و فەرمووی : (( إن المرء كثير بأخيه وابن عمه ، ألا إن جعفراً قد استشهد وقد جعل الله له جناحين يطير بهما في الجنة )) . فەرمووی : پیاو بە بوونی برا و ئامۆزای زۆر و بەهێزە . بە راستیی جەعفەر شەهید بووە و خوایش دوو باڵی پێ بەخشیوە هەتا لە بەهەشتدا پێیانەوە بفڕێ .

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزی و چووەماڵەوە و ، منیشی بردە ماڵەوە و ، فەرمانی دا خواردن بۆ ماڵی ئێمە دروست بكرێ . ناردیشی بە دوای براكەمدا و لەلای خۆی نانمان خوارد . بەخوا خواردنێكی چاكی موبارەك بوو .. ئەوەبوو سەلمای خزمەت گوزاری جۆی هاڕیی بوو پاشان بێژابووی و برژاندبووی و ڕۆنی پێوە كردبوو و، بیبەریشی بەسەردا كردبوو . من و براكەم لەگەڵ خۆیدا نانمان خوارد و سێ ڕۆژ لە ماڵیاندا ماینەوە و ، بۆ هەر ماڵێكی هاوسەرەكانی بچوایە ئێمەش لەگەڵیا ئەچووین، پاشان گەڕاینەوە بۆ ماڵی خۆمان . ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هێنا و منیش لەگەڵ برایەكەمدا موعامەلەی مەڕێكیم ئەكرد ، فەرمووی : (( اللهم بارك في صفقته )) . عەبدوڵلا ئەڵێ : هەرچیيم فرۆشتبێ و هەرچیيم كڕیبێ خوا بەرەكەتی تێ خستووە.

ئیمام ئەحمەدیش لە عەبدوڵلای كوڕی جەعفەرەوە ریوایەتی كردووە كە پێغەمبەری خوا ﷺ دوای سێ ڕۆژ دێت بۆ ماڵی منداڵەكانی جەعفەر و ئەفەرموێ : (( لاتبكوا على أخي بعد اليوم ، أدعوا لي أبناء أخي )). فەرمووی: لەمڕۆ بە دواوە بۆ جەعفەری برام مەگرین .. كوڕەكانیم بۆ بانگ بكەن . كە ئێمەیان هێنا وەك بێچووە باڵندە وەها بووین فەرمووی : (( أدعوا لي الحلاق )) . فەرمووی : سەرتاشم

بۆ بانگ بکەن . ئەوەبوو سەرتاشیان هێنا و سەرمانی تاشیی . پاشان فەرمووی: (( أما محمد فشبيه عمنا أبي طالب ، وأما عبدالله فشبيه خَلْقي و خُلُقي )). فەرمووی: موحەممەدی کوڕی جەعفەر لە ئەبوطالیبی مامەمان ئەچێت ، بەلاّم عەبدوللاّی کوڕی جەعفەر چ لە جەستەدا و چ لە ڕەوشتدا لە خۆم ئەچێت..

پاشان دەستمی گرت و بەرزی کردەوە و فەرمووی : (( أللهم ! اخلف جعفراً في أهله، وبارك لعبدالله في صفقة يمينه )) سێ جارەی کردەوە. فەرمووی : خوایە ! خۆت لە جیاتی جەعفەر چاودێریی ماڵ و منداڵی بکە و ، فەڕ و بەرەکەتیان بەسەردا برژێنی و ، فەڕ و بەرەکەتیش بخەرە کار و کاسپیی عەبدوللاّوە..

کە دایکی منداڵەکان دێت و باسی هەتیویی و لاوازییان ئەکات ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( العيلة تخافين عليهم ، وأنا وليّهم في الدنيا والآخرة )) . فەرمووی: ئەترسی هەژار بکەون ، بە مەرجێ من لە دنیاش و لە قیامەتیشدا سەروکاریی کەریانم .

ئەسمائی کچی عومەیسی هاوسەری جەعفەر شیوەنێکی بە شیعرەوە بۆ جەعفەری هاوسەری کرد ، پاشان کە عیددەی بەسەر چوو شووی بە ئەبوبەکری صددیق کرد و ، موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری بینیی . دوای ئەویش شووی بە ئیمام عەلیی کرد و چەند کوڕێکی لێ بوو . خوا لە هەموویان ڕازیی بێت ..

بەم شێوەیە بۆ یەکەم جار سوپایەك لە دوورگەی عەرەبییدا پەڕی کێشا و لە بەردەم دەوڵەتی ڕۆمدا وەستا و ، لەبەردەم سوپایەکی گەورەیدا شمشێری هەڵ کێشا.. جا هەر چەندە موسڵمانەکان بۆ تۆڵەسەندنی شەهیدانیان ، کە بە ئاشتییانە بۆ ئەو ناوچانە نێررا بوون ، تا ئیسلام بگەیەنن ، سوپایان بەرەو باکوور برد و ، بە مەبەستی خۆیان نەگەیشتن .. بەلاّم لەوە زیاتریان دەست کەوت کە ئەوان بە تەمای بوون ، چونکە عەرەبەکانی دوورگەش و عیراق و شامیش سەرسامی غیرەت و لێ هاتنی موسڵمانەکان بووبوون .. چونکە هەرگیز بە بیریاندا نەئەهات لەناو جەرگەی دوورگەدا سوپایەکی وەها هەڵ بکەوێ کە شمشێر لە گەورەترین و بەهێزترین دەوڵەتی ئەو ڕۆژەی جیهان بەرز بکاتەوە .. جا کە ئەو سوپا بچکۆلە لە دەستی ڕۆم ڕزگاری بووبوو ، بە شتێکی سەیر و سەمەرەیان ئەزانیی . بەمە بووە هۆی ئەوەی کە هەموو لایەك حیسابی جیاواز بۆ دانە دانەی سەربازەکانی ئیسلام بکات .. ئەم هەواڵە دنیای پڕ کرد ، کە جەنگاوەری موسڵمان هاوتای نیە ..

هەر ئەو هەواڵە گەیشتە لای پادشای چین و کاتێك کە پادشای فارسەکان داوای یارمەتیی لێ کرد بۆ جەنگی موسڵمانان ، ئەمەش لە سەردەمی فارووقدا ؛ پادشای چین نەیوێرا سوپا بنێرێ بۆ ئێران و ، بە کیسرای راگەیاند کە ئەو سوپای وەهای لە دەستدا نیە بتوانێ بچێ بە گژی سوپایەكدا کە سەربازەکانی مردن و شەهیدییان بە لاوە خۆشتر بێ لە ژیان ..

هەر ئەم بۆچوونە وای لە هۆزە داخ لە دڵە دوژمنەکان کرد کە واز لە دژایەتیی ئیسلام بهێنن و ، بگەنە ئەو قەناعەتە کە سوپای ئیسلام لەلایەن خواوە کۆمەکیی ئەکرێت و ، گەورەکەشیان راست ئەکات پێغەمبەری خوایە و ، بە هیچ هێزێکی سەرزەویی چار ناکرێن بۆیە رایان هاتە سەر موسڵمان بوون وەك لە پێشەوە باس کراوە.[١٥٤]

**هەشتەم : کوژراوانی هەردوو سوپا**

بێگومان جەنگی موئتە جەنگێکی سەخت بوو .. بۆ ماوەی شەش رۆژ جەنگ بەردەوام بوو و ، لە کۆتایی رۆژی شەشەمدا هەر سێ فەرماندەکەی سوپای ئیسلام شەهید بوون . لەو جەنگەشدا مالیکی کوڕی رافیلە ، کە ئەعرابییەکی گاور بوو و، فەرماندەی صەد هەزار ئەعرابی کرێ گرتەی رۆم بوو ، کوژرا .. نۆ شمشێریش لە دەستی خالیدا شکان . بەڵێ سوپای موسڵمانان یەکجار بچکۆلە بوو لە چاو سوپای رۆمدا ، کەچیی مێژوونووسان ئەوەیان دەرخستووە کە سوپای رۆم گورزی کاریگەری بەرکەوتووە . لە هەمان کاتدا دوای شەهیدبوونی سێ فەرماندە موسڵمانەکە سوپای ئیسلام شپرزەییەکی بێوێنەی هاتە رێ ، تا ئەوەبوو خالید دەستی دایە ئاڵا و لەو هەڵوێستە سەختە موسڵمانانی رزگار کرد ..

ئەوەی لە پێشەوە باس کرا لە سەختیی جەنگی موئتە ، ئەیسەلمێنێ کە لە ماوەی ئەو حەوت رۆژەدا کوشتارێکی زۆر بووە ، کەچیی لە کتێبەکانی مێژوودا تەنها ناوی دوو کوژراوی رۆمەکان هاتووە کە یەکێکیان مالیکی کوڕی رافیلە بووە و ، ئەوی تریشیان سوارچاکێکی رۆمانیی بووە کە بە دەستی هاوەڵێکی یەمانیی کوژراوە ..

هەروەها ناوی چەند موسڵمانێکیش هاتووە ، کە لە دواوە ناویان ئەبەین ، ئەو ژمارەیە هیچ نیە لە چاو سەختیی ئەو جەنگەدا .. چونکە لە دوای شەش رۆژە

---

١٥٤ غزوة مؤتة لباشميل : ٣٣٣ ـ ٣٤٠ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٤٣٠ ـ ٤٣١ .

موسڵمانەکان تووشی شکستی یەکی بێوێنە هاتوون و ، لە رۆژی حەوتەمیش دا رۆمەکان زۆر خراپ شکاون و کوشتارێکی زۆریان لێ کراوە ، سەرەڕای دەست وەشاندنی موسڵمانەکان لێیان لە شەش رۆژی رابووردوودا .. کەواتە ئەوەی راستیی بێ ئەوەیە کە کوژراوانی موئتە صەدان کوژراو بوون ؛ لە زۆر زۆر و لە کەم کەم . بەڵام مێژوونووسان لەوە زیاتریان لەو کوژراوانە نەناسیون ، یان ناویان نەهاتووە ، بۆیە بە کورتە باسی زۆریی کوژراوانیان کردووە ؛ بێ ئەوەی کە ناویان بهێنن ؛ بە تایبەت کە سوپای رۆمەکان ئەوەندە زۆر بووە ناوی سەربازان بە هیچ کەس دیاریی ناکرێ ؛ بگرە ئەوەندە کوژراویان زۆر بوون بە ئاسانییش ژمارەیان دەرنەکەوتووە. سوپای موسڵمانانیش کە سێ هەزار پیاو ئەبوون وەك سوپای بەدر و ئوحود نەبوو کە یەك بە یەکی سەربازانی ناویان هاتبێ ..

شەهیدانی موسڵمانەکان بە پێی ریوایەتی واقیدیی هەشت پیاون کە چواریان موهاجیر و چواریشیان ئەنصارن . بەڵام بە پێی ریوایەتی ئیبن هیشام لە ئیبن ئیسحاقەوە دوانزە شەهیدن ، کە چواریان موهاجیر و هەشتیشیان ئەنصارن ؛ کە ئەمەش ناوەکانیانە :

( أ ) **شەهیدانی موهاجیرەکان** :

١ ـ جەعفەری کوڕی ئەبوطالیب .

٢ ـ زەیدی کوڕی حاریثە .

٣ ـ مەسعوودی کوڕی ئەسوەدی کوڕی حاریثەی عەدەویی .[١٥٥]

٤ ـ وەهبی کوڕی سەعدی کوڕی ئەبوسەرحی عامیریی .[١٥٦]

( ب ) **شەهیدەکانی ئەنصار** :

١ ـ عەبدوڵڵای کوڕی رەواحەی ئەنصاریی ، خەزرەجی یە .

٢ ـ عەببادی کوڕی قەیس ، خەزرەجی یە .[١٥٧]

---

١٥٥ مەسعوودی کوڕی ئەسوەدی عەدەویی ، قورەیشی یە و لەگەڵ موطیعی برایدا لەو حەفتا پیاوە بوون کە کۆچیان کرد و ، بەشداریی بەیعەتی رضوانیان کرد . مەسعوود فەرموودەشی ریوایەت کردووە .

١٥٦ وەهبی کوڕی سەعدی کوڕی ئەبوسەرحی فیهریی قورەیشی یە و برای فەرماندەی بە ناوبانگ عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبوسەرحە . ئیبن سەعد بە یەکێ لە بەشداربووانی بەدری لە قەڵەم داوە . پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ سوەیدی کوڕی عەمردا ئەوی کردۆتە برا و ، لە پەراوێزی ( غزوة مؤتة ) ی مامۆستا باشمیل ، لاپەڕە ( ٣٧١ ) ی چاپی دووهەمدا وەها هاتووە کە هەردووکیان لە موئتەدا شەهید بووبن . وەهب بەشداریی ئوحود و ، خەندەق و ، حودەیبیە و، خەیبەریشی کردووە . لە تەمەنی چل ساڵیی دا شەهید بووە .

١٥٧ ئیبن سەعد دەری بڕیوە کە عەبباد لەگەڵ سوبەیعی برایدا بەشداریی جەنگی بەدریان کردووە .

٣ ـ حاریثی کوڕی نوعمانی کوڕی ئەساف ، ئەوسی‌یە .

٤ ـ سوراقەی کوڕی عەمری کوڕی عەطیە ، خەزرەجی‌یە .[١٥٨]

٥ ـ ئەبوکولەیبی کوڕی عەمر ، ئەوسی‌یە . ئەبوکیلابیشی پێ وتراوە .

٦ ـ جابیری کوڕی عەمری کوڕی زەید ، ئەوسی‌یە و برای دایك و باوکیی ئەبوکولەیب بووە ..

٧ ـ عەمری کوڕی سەعدی کوڕی حەرثی کوڕی عەبباد ، ئەوسی‌یە .

٨ ـ عامیری کوڕی سەعد کە برای عەمری کوڕی سەعدە ، ئەوسی‌یە .

ئەمەش هەندێ لەو هۆیانەی کە ژمارەی کوژراوان لەوە زیاتر دەرنەکەتووە :

١ ـ سوپای موئتە بەشی هەرە زۆری لە هۆزەکانی بیابان پێك هاتبوو ، بە بەڵگەی ئەوە کە فەرماندەی دەستە راستی موسڵمانان پیاوێکی تەوەی عوذرە بوو ، کە نەوەی عوذرە هۆزێکی بیابان نشین بوو .. لە هەمان کاتدا ناوی فەرماندە موهاجیر و ئەنصارەکان ، ئەوانەی کە فەرماندایەتیی سوپای ئیسلامیان لە جەنگ و سریەکانی تردا کردبوو ، بە کەمیی هاتووە . کەواتە زۆربەی شەهیدانی سوپای موئتە لە هۆزەکانی بیابان بوون و ، نووسەرانی مێژووش بە ئاسانیی نەیان تەنوانیی سەرژمێری‌یان بکەن و ، بیان ناسن ..

٢ ـ لە جەنگەکانی تردا موسڵمانان دوای جەنگ دەستیان بەسەر مەیدانی جەنگدا ئەگرت ، هەتا لە جەنگی ئوحودیشدا ، کە شەهیدی زۆریان دابوو .. بۆیە بە ئاسانیی سەرژمێریی شەهیدانی خۆیان و کوژراوانی دوژمنیان ئەکرد . بەڵام لەبەر ئەوەی کە موسڵمانەکان لە پێشەوە مەیدانی جەنگی موئتەیان چۆڵ کرد ، ئەوا نەیانتوانیی لە کوژراوی هەردوو لا ئاگادار بن .

٣ ـ لە هەمان کاتدا مێژوونووسانی بیزەنطییش لەو مێژووەدا کە نووسیویانە و ماوەتەوە ، باسی جەنگی موئتەیان نەکردووە ، بگرە باسی جەنگی یەرمووکی ناوداریشیان نەکردووە . جا لەوە ئەچێ ئەو مێژووە بە تیاچوون و رووخانی دەسەڵاتی بیزەنطیی ئەویش فەوتابێت .

ئەو دوانزە شەهیدەش کە ناویان هاتووە لە ناو موهاجیر و ئەنصاردا بەناوبانگ بوون و شەهیدبوونیان بەر هەموو گوێیەك ئەکەوت و ، دوایی لە گێڕانەوەدا ناویان دەست مێژوونووسان کەوتووە .[١٥٩]

---

[١٥٨] بەشداریی بەدر و ، ئوحود و ، خەندەق و ، خەیبەر و ، حودەیبیەی کردوە .

**نۆهەم : سەرکەوتن یان تێک شکان ؟**

دوای ئەوەی کە شتێك لە جەنگی موئتە ئاگادار بووین ، با لە خۆمان بپرسین ئایا لە جەنگی موئتەدا موسڵمانەکان سەرکەوتن یان تێك شکان ؟

لە راستیی دا دوای شەهیدبوونی هەر سێ فەرماندە موسڵمانەکە ، ئەویش لە کۆتایی رۆژی شەشەمدا ، موسڵمانەکان شپرزە بوون و تێك شکان ، ئەگەرچیی ئەو شەش رۆژە ئەوپەڕی جەنگی سەروماڵی یان کرد ..

بەڵام کە خالید ئالآی گرتە دەست و بووە فەرماندە ، هەر ئەو ئێوارەیە توانیی سوپای تێك شکاو کۆ بکاتەوە و ، ریزەکانی رێك و پێك بکاتەوە و ، هەر ئەو شەوە جێ گۆڕکێ بە بەشەکانی سوپا بکات ، وەك لە پێشەوە بە درێژیی باس کرا و ، لە ئاسۆی داوی سوپاکەشیەوە تەپ و تۆز و دەنگە دەنگێکی دروست کرد تا رۆم وا بزانن کۆمەکی یان بۆ هاتووە و ئەو سوپایەی بەردەمیشیان ئەوەی دوێنێ نیە . بەمە ورەی رۆم لە رۆژی حەوتەمیندا ، دوای ئەوەی کە موسڵمانەکان دەستێکی چاکیان لێ وەشاند ، رووخا و هەڵاتن و ، خالیدیش بە ژیرانە سوپای پاشە کشێ پێ کرد و ، بەبێ وەی موسڵمانانی گەیاندەوە مەدینە .

ئەم هەڵوێستەی سوپای موئتە بە سەرکەوتن لە قەڵەم ئەدرێ و پێغەمبەری خواش ﷺ کارەکەی خالیدی بە فەتح لە قەڵەم داوە کە فەرموویە :

(( ثم أخذ الراية خالد بن الوليد ، نعم عبدالله وأخو العشيرة وسيف من سيوف الله سلّه الله على الكفار والمنافقين من غير إمرة حتى فتح الله عليه )) .

لە راستیی دا سوپای موئتە بۆ ئەوە نەنێررا بوو ناوچەیەك لە شام داگیر بکا ، بەڵکو مەبەست لە ناردنی تەمێ کردنی ئەو هۆزانە بوو کە دەست درێژی یان کردبووە سەر نێرراوی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ لای پادشای غەساسینە لە جەولان و کوشتبوویان و ، ئەو پانزە موسڵمانە بانگەوازکارەیان شەهید کردبوون . کەچیی کە سوپای ئیسلام گەیشتە ئەو ناوچەیە گورمیشی سوپا دووصەد هەزاری یەکەی رۆم بوون و ، سەرەنجام بڕیاریان دا کە لەو سوپا ملهوڕە سڵ نەکەنەوە و بچن بە گژیا تا ئەوەبو توانی یان ( سدوس ) ی برای شورەحبیلی کوڕی عەمر بکوژن ، کە ئەو بوو نێرراوە موسڵمانەکەی کوشتبوو و ، توانیشیان زیانێکی گەورە لە سوپای رۆم بدەن ..

[159] غزوة مؤتة لباشميل : ٣٦٣ ـ ٣٧٦ .

هەتا لە ریوایەتی صەحیح‌دا هاتووە کە خالید و سوپای ئیسلام کاتێك بەرەو مەدینە ئەگەڕێنەوە کە بە چاوی خۆیان شپرزەیی و شلەژاویی و تێك شکانی رۆم ئەبینن ..

کەواتە سوپای موئتە نەشکاوە و هەڵیش نەهاتووە ، بەڵکو دوای ئەنجامدانی ئەرکی سەر شانی گەڕاوەتەوە پایتەخت . خۆ ئەگەر رۆم لەسەر خۆبوونایە ، ئەوا شوێن سوپای ئیسلام ئەکەوتن و تەماعی داگیرکردنی مەدینە ئەیگرتن .

لە راستیی‌دا ئەم جەنگە سامی موسڵمانەکانی شکاند ، تا لە رۆژانی داهاتوودا هەڵمەت بەرنە سەر هەردوو دەوڵەتی ملهوڕی رۆم و فارس و ، وڵاتانیان یەك لە دوای یەك لێ بسێنن .

## بەشی سیی و حەوتەم

# غـەزای ( ذات السلاسـل )

( ذات السلاسل ) ئاوێکە لە پشتی ( وادي القرى ) وە و ، لـە مەدینـەوە دە ڕۆژ ڕێگا دوورە .

هۆزی قوضاعە سەرەتا لە ( شـحر ) ئەژیان ، پاشان چوونە نـەجران و ، پاشـتریش بەرەو باکووری خۆرئاوای دوورگە باریان کرد و لەو ناوەدا بلاوەیان کـرد . بـەرە بـەرە دەسەلاتیان بەسەر ناوچـەی نێـوان حیجـاز و عێـراق و شـامدا ، هـەتا کـەنارەکانی کەنـداوی عەقەبـە و ، چیاکانی کـەرەك لـە ئـوردون ، پەیـدا کـرد .. ئـەم هـۆزە مەسیحیەتی تیا بلاو بووبوویەوە و ، ڕۆمەکانیش کەلکیان لێ وەرئەگرت . ئەم هـۆزە هەندێ وەچەی لێ جوێ بووبوونەوە وەك بەلیی و بەهراء و بەلقین و عـوذرە کـە هـەر هەموویان دوژمنی سەرسەختی موسلمانەکان بوون و پشتگیریی ڕۆمەکانیان ئەکرد..

شایانی باسە کە لە جـەنگی موئتـەدا ئـەم هۆزانـە و وێنـەیان بـە صـەد هـەزار جەنگاوەرەوە لەگەل موسلمانەکاندا ئەجـەنگان و بووبوونـە کۆمـەکی ڕۆمـەکان و ، پیاوێکی هۆزی ( بلي ) فەرماندەیان بوو .

کاتێك کە سوپای موئتە کشایەوە هیچ هۆزێك نەیوێرا ڕێ بـەو سـوپایە بگـرێ ، بەلام هۆزی قوضاعە و وەچـەکانی ، بـە ئامۆژگـاریی و پشـتگیریـی ڕۆمـەکان بـە ماوەیەکی کەم دوای موئتە کەوتنە سوپا ئامادەکردن بۆ هێرشکردنە سەر مەدینە .

کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەوالی جم و جوولی ئەو هۆزانەی بەر گـوێ کـەوت خێـرا هەلمەتێکی سەربازیی ڕێك خست تا بە زووترین کات هێرش بکاتە سەر ئەو ناوچـانە و، گورزی کاریگەر لەو نیاز خراپانە بدات .

ئەم هەلمەتە لە مانگی جومادیی یەکەمی سالی هەشـتەمدا بـەرەو ئـەو ناوچـانە ڕۆیشتووە و ، جەنگی موئتەش لە مانگی جومادی یەکەمی سـالی هەشـتەمدا ڕووی داوە ، واتە ماوەی نێوانیان لە مانگێك زیاتر نەبوو . کەواتـە ئـەتوانین بلـێین : ئـەم ڕووداوە پاشماوەی جەنگی موئتەیە و ، ئەو هۆزانەش و ڕۆمانیش داخیـان لێ ئـەهات

سوپای موسڵمانەکانیان لە دەست دەرچوو بوو و ، لەوە ئەچێ ڕۆمەکان پەشیمانی ئەوە بووبن کە دوای ئەو سوپایە نەکەوتوون ، بۆیە ئەیانەوێ ئەو هۆزە عەرەبانە هەڵ بنێن و گەرمە گەرمە هێرش بەرنە سەر مەدینە ..

کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە نیازی خراپی ئەو هۆزانە ئاگادار بوو ، بڕیاری دا نەهێڵێ ئەوان بێنە سەر مەدینە ، بەڵکو ئەم سوپای موسڵمانان بنێرێتە سەر خاك و ئاویان و جەنگ لەوێ ڕوو بدات .

ئەم هەڵمەتە سەربازی‌یەی ئیسلام سەرەتا بریتیی بوو لە سێ‌صەد پیاو و ، پاشان دووصەد پیاوی تری بە شێوەی کۆمەك خرایە سەر .

ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرماندەی نەوموسڵمان عەمری کوڕی عاصی سەهمیی بانگ کرد و ، فەرمانداییەتیی سوپای هەڵمەت بەری پێ سپارد و ، فەرمانی پێ دا کە ئەم سوپایەی بگەیەنێتە ناوچەی ئەو ئەعرابی‌یانە و تەمێ‌یان بکات . بۆ ئەمەش ئاڵایەکی سپیی دایە دەست عەمر .

ئەوەش ریوایەت کراوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ عەمر بۆ ئەم کارە هەڵ ئەبژێرێ و ، پێیشی ئەفەرموێ : (( إني أريد أن أبعثك على جيش فيغنمك الله ويسلمك )) . فەرمووی : ئەمەوێ بە سەرکردایەتیی سوپایەك بت‌نێرم بۆ شوێنێك کە خوا دەست کەوتت دەست بخات و بە سەلامەتییش بگەڕێیتەوە .. عەمر ئەڵێت : منیش وتم : من لەبەر خۆش‌ویستنی ماڵ و سامان موسڵمان نەبووم . فەرمووی : (( نعم المال الصالح للرجل الصالح )). فەرمووی : ماڵ و سامانی چاك بۆ پیاوی چاك نیعمەتە ..

بەم شێوەیە عەمری کوڕی عاص بۆ یەکەم جار لە ژیانی‌دا فەرمانداییەتیی سوپای ئیسلامی گرتە دەست ، بە مەرجێ ئەم سوپایە گەورە پیاوانی موهاجیر و ئەنصاری وێنەی ئەبوبەکر و ، عامیری کوڕی ڕەبیعە و ، صوهەیب و ، سەعیدی کوڕی زەید و ، سەعدی کوڕی ئەبووەققاص و ، ئوسەیدی کوڕی حوضەیر و عەببادی کوڕی بیشر و ، سەلەمەی کوڕی سەللامە و ، سەعدی کوڕی عوبادەی لەگەڵ‌دا بوون. لە هەمان کات دا تەنها چوار مانگ بوو عەمر موسڵمان بوو بوو ..

عەمر کە توانایەکی چاکی لە هونەری فەرمانداییەتیی سەربازیی‌دا هەبوو شیاوی ئەوەبوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەو کارە هەڵی ببژێرێ . هەروەها ئەبوبەکر و عومەریش خوا لێ‌یان ڕازیی بێ ، لە سەردەمی خەلافەتی خۆیان‌دا فەرمانداییەتی‌یان بە عەمر ئەسپارد . ئەوەبوو لە سەردەمی خەلیفەی یەکەم‌دا عەمر فەرماندەی یەکێ

لەو چوار سوپایە بوو کە هێرشیان کردە سەر شام و فەتحیان کرد و ، لە سەردەمی خەلیفە عومەریش‌دا عەمر فەرماندەی ئەو سوپایەی ئیسلام بوو کە سەرتاسەری میصری لە دەستی ڕۆمەکان ڕزگار کرد ..

بەڵێ ، لە مانگی جومادیی دووهەمی ساڵی هەشتەمی کۆچیی‌دا ، عەمری فەرماندە بە خۆی و سوپا سێ‌صەد کەسەکەیەوە مەدینەی بەجێ هێشت و بەرەو باکوور، بەرەو سنووری شام کەوتە ڕێ .. شایانی باسە کە سوپای عەمر تەنها سیی ئەسپی لەگەڵ دابوو .

بۆ ماوەی دە ڕۆژ عەمر بە شەو خۆی و سوپاکەی ڕێگەیان ئەبڕیی و ، بە ڕۆژیش خۆیان حەشار ئەدا ، هەتا گەیشتنە دەوروبەری ناوچەی دوژمنان و لەسەر ئاوی ( السلاسل ) باریان خست .

عەمر بە ژیرانە چەند پیاوێکی بەسەلیقەی خستبوونە پێشی سوپاکەیەوە تا بە نەناسراویی خۆیان بگەیەننە ناو دوژمن و لە هەواڵی هێز و ورەیان ئاگاداری بکەن . ئەوانیش ئەو کارەیان بە چاکیی ئەنجام دا و ، خۆیان گەیاندە ناو هۆزی قوضاعە و هەواڵی تەواویان گەیاندە عەمر و ئەویش هەستی کرد کە ئەو سێ صەد پیاوەی کە لەگەڵ ئەودان چاری هێزی ئەو هۆزانە ناکەن . بۆیە وای بە چاك زانیی پەلە نەکات و بەو هێزە کەمەوە نەچێت بە گژی دوژمن دا ، هەتا نامە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بنووسێت و ، داوای کۆمەکیی لێ بکات . بۆ ئەمە فەرمانی بەسەر سوپاکەی‌دا دا تا لە ناوچەی دوژمن کەمێك بێنە دواوە و ، خۆیان حەشار بدەن هەتا دوژمن پێ یان نەزانێ تا کۆمەکی‌یان بۆ بێت . هەتا فەرمانی‌دا هیچ سەربازێك بە شەودا ئاگر نەکاتەوە . کاتیش زستان بوو و دنیا یەکجار سارد بوو ، بۆیە هەندێ لە هاوەڵان کە زانی‌یان عەمر نەرم نابێت گوێڕایەڵی‌یان کرد و لەو سەرمایەدا دانیان بە خۆیان‌دا ئەگرت .

عەمر پیاوێکی بە ناوی ڕافیعی کوڕی موکەیثی جوهەنیی هەڵبژارد و ناردیەوە بۆ مەدینە و ، خێرا پێغەمبەری خوا ﷺ دووصەد پیاوی لە موهاجیر و ئەنصار بۆ هەڵبژارد و ، بە پەلە ناردنی بۆ ناوچەی جەنگ . فەرماندەی ئەم سوپایەش ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح بوو .

ئەبوعوبەیدە بەرەو باکوور بە پەلە کەوتە ڕێ ، تا فریای سوپاکەی عەمر بکەوێ و پێکەوە هەڵمەت بەرنە سەر دوژمنان .

ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ ئامۆژگاریی ئەبوعوبەیدەی کرد کە لەگەڵ عەمردا ناکۆك نەبن و بە برایەتیی کارەکەیان ئەنجام بدەن .

کە ئەبوعوبەیدە گەیشت ویستی پێشی عەمر بکەوێ و ، ئیمامەت بۆ سوپا بکات، کەچیی عەمر رازیی نەبوو و ، بە ئەبوعوبەیدەی راگەیاند کە خۆی ئەمیرە و ئەویش بۆ کۆمەکیی ئەم هاتووە . ئەو موسڵمانە ناودارانەی کە لەگەڵ سوپاکەی ئەبوعوبەیدەدا بوون ، وەك ئەبوبەکر و عومەر و سەعدی کوڕی ئەبووەققاص بە عەمریان فەرموو: نەخێر ، تۆ ئەمیری هاوەڵانی خۆتی و ئەویش ئەمیری هاوەڵانی خۆیەتی . کەچیی عەمر رازیی نەبوو و وتی : ئێوە بۆ کۆمەکیی ئێمە هاتوون .

کە ئەبوعوبەیدە سەرنجی دا هەستی بە ناکۆکیی کرد ، ئەویش خوا لێی رازیی بێ پیاوێکی نەرم و نیان بوو ، وتی : ئەی عەمر ! با دڵت بێخەم بێ و ، بزانیت کە دوا ئامۆژگاریی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ من ئەمە بوو کە ئەیفەرموو : (( إذا قدمت على صاحبك فتطاوعا ولا تختلفا )) . فەرمووی : کە گەیشتیتە لای عەمر گوێڕایەڵیی بکەن و ناکۆك نەبن . جا بەخوا ئەگەر تۆ لە فەرمانی من دەرچیت ، من گوێ ڕایەڵیی بۆ تۆ ئەکەم . بەمە ئەبوعوبەیدە گوێ ڕایەڵیی کرد و ، عەمر پێش نوێژیی بۆ سوپای موسڵمانان ئەکرد .

کە سوپای موسڵمانان کۆمەکیی بۆ هات ، عەمر کەوتە نەخشەکێشان بۆ هێرش کردنە سەر دوژمن .

مێژوونووسان ئەوەیان باس کردووە کە هەر چەندە قوضاعە و دەوروبەری خاوەنی جەنگاوەری زۆر بوون و ، لەگەڵ ئەمەشدا لەلایەن رۆمەوە بە چەك و بە پارە کۆمەکیی کرابوون ، تەنها ماوەیەکی کەم خۆیان بۆ راگیر کرا ، ئیتر هەڵاتن و ناوچە و کەل و پەل و سامانیان بەجێ هێشت و ، هەر هەمووی کەوتە دەست موسڵمانەکان .. موسڵمانەکان خەریك بوون دوای هەڵاتوان بکەون ، بەڵام عەمر نەی هێشت ، لە ترسی ئەوەی کە نەوەکو دوژمنان دا و بۆ موسڵمانەکان بنێنەوە و بیانخەنە کەمینەوە و بەرودوایان لێ بگرن..

کە سوپای موسڵمانان کاری سەرشانی خۆی ئەنجام دا ، عەمر بڕیاری دا کە سوپا بەرەو مەدینە بگێڕێتەوە ، کە ئەوەبوو تەنها یەك پیاویان لێ زامدار بوو بوو، ئەویش زامێکی کەم بە هۆی تیرێکی دوژمنەوە ..

بەر لەوەی سوپا بگەڕێتەوە عەمر وای بە چاك زانیی پیاوێك لە پێشەوە بنێرێت و مژدە بە پێغەمبەری خوا ﷺ بدات. بۆ ئەمە عەوفی کوڕی مالیکی ئەشجەعیی[١٦٠] پێش خست تا هەواڵی سەرکەوتن بگەیەنێت . پێغەمبەری خواش ﷺ بە هەواڵی سەرکەوتن زۆر شادمان بوو . جا عەوف هەواڵی ناکۆکیی نێوان ئەبوعوبەیدە و عەمری بە درێژە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس کرد ، کە چۆن ئەبوعوبەیدەی قوتابیی دێرینی قورئان گوێ ڕایەڵیی بۆ عەمر کرد و ، فەرمانداریەتیی تەسلیمی ئەو کردووە ، ئەویش ستایشی ئەبوعوبەیدەی کرد و فەرمووی: (( یرحم الله أبا عبیدة بن الجراح )).[١٦١]

---

[١٦٠] عەوف ساڵی خەیبەر موسڵمان بووە و ڕۆژی فەتحی مەککەش هەڵ گری ئاڵای ئەشجەع بووە . پێغەمبەری خوا ﷺ عەوف و ئەبوددەرداتی کردنە برا . فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە و ، لە عەبدوڵلای کوڕی سەلامەوە گێڕاوەتەوە و ، بەشداریی جەنگەکانی شامی کردووە .

موجالید لە ( الشعبي ) یەوە ریوایەتی کردووە و وتوویە : کاتێك کە عومەر هات بۆ شام پیاوێکی ئەهلی کیتاب هەستایەوە و وتی: پیاوێکی موسڵمان ئەمەی پێ کردووم کە ئەیبینیی . کابرا سەری شکابوو و لێیشی درابوو . عومەر یەکجار تووڕە بوو و بە صوهەیبی ڕۆمیی فەرموو : بڕۆ بیدۆزەرەوە و بیهێنە بۆم . کە ڕۆیشت ئەبینێ ئەو پیاوە عەوفی کوڕی مالیکە . وتی : ئەمیری ئیمان داران یەکجار لێت تووڕەیە ، بڕۆ بۆ لای موعاذی کوڕی جەبەل و باسەکەی تێ بگەیەنە ، چونکە ئەترسم عومەر پەلەت لەگەڵ بکات . کە عومەر لە نوێژ بوویەوە فەرمووی : کابرات هێنا ؟ وتی : بەڵێ .. ئەوەبوو موعاذ هەستا و وتی : ئەی ئەمیری ئیمان داران! ئەو پیاوە عەوفی کوڕی مالیکە و گوێی بۆ بگرە و پەلەی لەگەڵ مەکە . عومەر فەرمووی: چیتە بەسەر ئەمەوە ؟ ( مەبەستی لە کابرای جوولەکەیە ) . عەوف وتی : چاوم لێ بوو ئەم جولەکەیە لە گوێدرێژێك ئەخوڕیی کە ئافرەتێکی موسڵمانی سوار بوو بوو. ئەقیزەی ئەدا هەتا بیخاتە خوارەوە ، کەچیی نەئەکەوتە خوارەوە . پاشان پاڵی پێوە ناو خستیە خوارەوە و خۆی بە سەری‌دا دا. فەرمووی : با ژنەکە بێت و تەصدیقی ئەم قسەیەت بکات . عەوفیش هات بە دوای ئافرەتەکەدا ، بەڵام باوك و مێردی ئافرەتەکە لەم هەڵوێستەی عەوف ناڕازیی بوون لە ترسی ئەوەی ئابڕوویان بچێت . کەچیی ئافرەتەکە وتی : بەخوا ئەچم لەگەڵیا ( واتە بۆ لای عومەر ) . ئەوانیش وتیان : دەی ئێمەش دێین لەگەڵت‌دا . ئەوانیش هاتن و هەواڵەکەی عەوفیان بە ڕاست دەرکرد . عومەر فەرمانی دا جوولەکەکە لە خاچ بدرێ و ، فەرمووی : ئێمە لەگەڵ ئێوەدا لەسەر ئەوە ڕێك نەکەوتین . سوەید ئەڵێت : ئەو جوولەکە یەکەم کەسێکە کە لە ئیسلام‌دا دیبێتم و لە خاچ بدرێ . عەوف لە ساڵی ٧٣ ی کۆچیی دا و لە سەردەمی خەلافەتی عەبدولمەلیك‌دا کۆچی دوایی کردووە ..

[١٦١] غزوة مؤتة لباشمیل : ٣٤١ ـ ٣٦٠ ، السیرة النبویة لأبي شهبة : ٢ / ٤٣٢ ـ ٤٣٣ ، شرح حیاة الصحابة : ٢ / ٩٧ ـ ٩٨ ، ١٠٦ ـ ١٠٨ .

## بەشی سیی و هەشتەم

# ڕووداوەکانی نێوان موئتە و فەتحی مەککە

### یەکەم : شۆڕشی موسڵمانە بێدەسەڵاتەکان لە عیص

عیص شوێنێکە لەلای ( ذوالمروة ) وە لەسەر دەریای سوور .

کە پێغەمبەری خوا ﷺ پەیمانی حودەیبیەی بەناوبانگی لە ساڵی شەشەمدا ، لەگەڵ قوڕەیش‌دا بەست ، کافرەکان بیانوویان ئەگرت ، بۆیە هەرچی‌یان ئەوت ئەو قبووڵی ئەکرد ، بەو هیوایەوە کە جەنگ نەبێت و خوێنی هیچ لایەك نەڕژێ . موسڵمانەکانیش بە مەرج و بیانووەکانی قوڕەیش بێ‌تاقەت ئەبوون ، بە تایبەتیی بەو بەندەی کە هەرکەسێ لەلایەن قوڕەیشەوە را بکات بۆ ناو موسڵمانەکان ، ئەوان گلی نەدەنەوە و بی‌دەنەوە دەست کافرەکان ..

جا گەنجێکی زۆر لە مەککەدا لەسەر موسڵمان بوون بەند کرا بوون و ، قوڕەیش هەوڵی ئەدا لە دین پەشیمانیان بکاتەوە .. ئەوانیش لە هەلێك ئەگەڕان تا خۆیان دەرباز بکەن . کەچیی ئەو بەندە لە پەیمانەکەدا نووسرا ..

هێشتا پەیمانەکە مۆر نەکرا بوو دیتیان وا گەنجێکی خواناسی خوێن گەرم ، کە ئەبوجەندەلی کوڕی سوهەیلی کوڕی عەمر بوو ، لە بەندی‌خانەکەی ، لە مەککە هەڵاتووە و ، وا خۆی گەیاندە لای موسڵمانەکان . جا هەرچەندە کارێکی دڵ تەزێن بوو بۆ موسڵمانان ، پێغەمبەری خوا ﷺ ناچار بوو ئەبوجەندەل تەسلیم بکاتەوە .

بەڵێ کە پەیمانی حودەیبیە مۆر کرا و پێغەمبەر و موسڵمانەکان گەڕانەوە مەدینە، ئەو گەنجە بەندکراوانەی مەککە کەوتنە بیری ئەوەی کە خۆیان دەرباز بکەن و خۆیان بگەیەننە مەدینە.

یەکەم گەنجێك کە خزمەکانی بەندیان کردبوو و خۆی دەرباز کرد و گەیشتە مەدینە، گەنجێك بوو بە ناوی (( ئەبوبەصیر )) [١٦٢] .

---

١٦٢ ئەبوبەصیر ناوی عوتبەی کوڕی ئوسەیدی کوڕی جاریەی کوڕی عەبدوڵڵای ثەقەفی‌یە ، کە هاوپەیمانی نەوەی زوهرە بووە و، یەکێ بووە لەو گەنجانەی کە زوو بە زوو موسڵمان بوو و ، خزمەکانی بەندیان کرد . ئەویش دانی بە خۆی دا گرت هەتا هەلی بۆ هەڵکەوت و ، یەکەم گەنج بوو کە دوای پەیمانی حودەیبیە لە دەستی قوڕەیش هەڵات .

که گەیشتە مەدینە چووە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و داوای لێ کرد کە مافی پەناهەندەیی بداتێ تا لە ناو کۆمەڵگای ئیسلامیی‌دا بمێنێتەوە ..

بەڵام لەبەر ئەوەی موسڵمانەکان بۆ شکاندنی پەیمانی حودیبیە دەست پێش نەخەن، پێغەمبەری خوا ﷺ نەی‌توانیی ئەبوبەصیر گل بداتەوە .. بەڵکو ناچار بوو بی‌گێڕێتە دواوە . ئەوەبوو دوای هەڵاتنی ئەبوبەصیر دوو سەرداری ئەوەی زوهرە ، کە ئەخنەسی کوڕی شورەیق و ئەزهەری کوڕی عەبدعەوف [١٦٣] بوون ، نامەیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ نووسیی و تیایا داوایان لێ کرد کە ئەبوبەصیریان بۆ بگێڕێتەوە ، چونکە لە حودەیبیە بڕیاری لەسەر دراوە . نامەکەیان دایە دەست پیاوێکی ئەوەی عامیری کوڕی لوئەی ، کە خونەیسی کوڕی جابیر بوو ، کە بە وشترێکی پارێنەیان بە کرێ گرت . خونەیس لەگەڵ خزمەت گوزارێکی‌دا کە ناوی کەوثەر بوو بەرەو مەدینە کەوتە رێ و دوو سەرداره زوهەری‌یەکەش وشترێکیان دایە خونەیس تا لە رێگادا سواری ببێ .

لە نامەکەدا داوایان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد کە ئەبوبەصیر بداتە دەست ئەو دوو پیاوە تا بی‌گێڕنەوە مەککە .

ئەو جووتە پیاوە سێ رۆژ دوای ئەبوبەصیر گەیشتنە مەدینە .. کە نامەکەیان دایە دەستی ئازیز ، بانگی کردە ئوبەی کوڕی کەعب تا نامەکەی بۆ بخوێنێتەوە . پاشان فەرمانی بەسەر ئەبوبەصیردا دا تا لەگەڵ ئەو جووتە پیاوەدا بگەڕێتەوە بۆ مەککە ، چونکە موسڵمانان ئەبێ پەیمان نەشکێنن .. کە ئەبوبەصیر ئەمەی بیست ئێشێکی زۆر بە دڵی گەیشت و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئایا ئەم گێڕیتەوە بۆ لای موشریکان و لە دین وەرم گێڕن ؟!

ئەویش فەرمووی : ((يا أبا بصير ! إنا قد أعطينا هؤلاء القوم ما قد علمت ، ولا يصلح لنا في ديننا الغدر . وإن الله جاعل لك ولمن معك من المستضعفين فرجاً ومخرجاً، فانطلق إلى قومك)) . فەرمووی : ئەبوبەصیر ! وەك ئەزانیت ئێمە پەیمانمان بەو خەڵکە داوە و ، لە دینی ئێمەش‌دا رێ بە ناپاکیی نادرێت . خوای گەورەش بۆ تۆ و ئەو موسڵمانە بێ‌دەسەڵاتانەی کە وەك تۆ وەهان دەروو ئەکاتەوە. بڕۆرەوە بۆ ناو خزمەکانت.

---

[١٦٣] ئەزهەری کوڕی عەبدعەوف مامەی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف بووە . لەوە ئەچێ لە دوای فەتحی مەککە موسڵمان بوو بێت .

گەنجی خواناس ، کە خاوەنی ئیمانێکی دامەزراو بوو ، بەبێ هیچ وت و وێژێك گوێڕایەڵیی فەرمانی کرد و ، هەردوو دەستی خستە بەردەم جووتە نێرراوەکەی قورەیش تا قۆڵ بەستی بکەن ، هەرچەندە ئەیزانیی بەرەو مەرگ هەنگاو ئەنێت . لەولاوە موسڵمانەکان بە لایانەوە زۆر گران بوو ئەو برا بەستەزمانەیان ببرێتەوە بۆ ژێر سزا و ئازاری مەککە .. بەڵام چیی بکەن فەرمانی پێغەمبەری خوایە و نابێت لێی دەرچن ؟

ئەبویەصیر بە باڵی بەستراوەوە کەوتە گەڵ پیاوەکانی مەککە و ، مەدینەی بەجێ هێشت .. لە رێگا هەر لە بیری ئەوەدا بوو چۆن خۆی دەرباز بکات ، دوای ئەوەی تاوانی پەیمان شکاندنی لە پێغەمبەری خوای ﷺ دوور خستەوە .

ئەبویەصیر بە لایەوە زۆر گران بوو جارێکی تر بچێتەوە ناو بەندیخانەکەی مەککە و کافران سزای سەختی پێ بچێژن ، بۆیە هەوڵی دا خۆی رزگار بکات .. رۆیشتن هەتا گەیشتنە شوێنێك بە ناوی ( ذوالحليفە ) کە ئەمرۆ ( أبيار علي ) پێ ئەوترێ و حەوت میل لە مەدینەوە دوورە . لەوێ هەردوو پاسەوانەکە دانیشتن تا کەمێ پشوو بدەن . ئەبویەصیر کەوتە گفتوگۆ لەگەڵ یەکێ لە پاسەوانەکاندا .. دوای ماوەیەك پرسیی : کاکی عامیریی ! ئایا شمشێرەکەت تیژە ؟

وتی: بەڵێ .. پاشان شمشێرەکەی شۆکاندەوە و بە فیزێکەوە وتی : رۆژێك هەتا ئێوارە بەم شمشێرەم لە ئەوس و خەزرەج ئەدەم .

ئەبویەصیر داوای مۆڵەتی کرد تا سەیرێکی بکات و وتی : سەیری بکەم ؟

پاسەوانەکە وتی : ئەگەر پێت خۆش بێت .

کابرا کۆتەکانی دەستی ئەبویەصیری کردەوە و ، شمشێرەکەی دایە دەست ئەبویەصیر، هەر دەستی پێی گەیشت ، کابرای عامیریی داگرتەوە و کوشتی .. پاشان هەڵمەتی بردە سەر پاسەوانی دووهەمیش ، کەچیی ئەو لە دەستی هەڵات و ، بە ترس و لەرزەوە خۆی کردەوە بە مەدینەدا و ، دادی بردە دانیشتوان کە فریای بکەون. خۆی کرد بە مزگەوتدا . کە پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی پێ کەوت وا بە پەلە ئەهات فەرمووی : (( إن هذا الرجل قد رأى فزعاً )) . فەرمووی : ئەم پیاوە ترسی بینیوە . پاشان فەرمووی: (( ويحك ! ما لك ؟ )) فەرمووی : کابرا ! چیتە ؟

وتی : پیاوەکەی لای ئێوە هاوەڵەکەمی کوشت و ، خەریك بوو منیش دەرباز نەبم. من هەر ئەکوژرێم ..

پاشان داوای کرد پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئەبوبەصیر بی‌پارێزێ چونکە وا بە دوایەوە. ئەویش لە ژیانی بێ‌خەمی کرد ..کابرای عامیریی کە لە قسەکانی بوویەوە، ئەبوبەصیریش دەرکەوت ، کە شمشێری کوژراوەکەی بە دەستەوە گرتبوو . وشترەکەی لە دەرگای مزگەوتدا چۆك پێ‌دادا و هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و هەوڵی ئەدا ئەو رازیی بکات هەتا رێی پێ بدا لە مەدینە بمێنێتەوە .

ئەوەبوو زۆری لێ نەکرد بگەڕێتەوە مەککە ، بەلاّم رێیشی نەدا لە مەدینە بمێنێتەوە ، چونکە ئەوە ئەبێتە مایەی هەڵ وەشاندنەوەی پەیمانەکە ، بۆیە مۆڵەتی دا شوێنێك بۆ خۆی پەیدا بکات .

پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئازایەتیی و غیرەتی ئەبوبەصیر سەرسام بوو بۆیە فەرمووی: (( ویل أمه مسعر حرب لو کان معه رجال )) . فەرمووی : ئەگەر پیاوی لەگەڵدا بن ، ئاگری جەنگ هەڵ ئەگیرسێنێ .. مەبەستی ئەوەیە بۆ فەرماندایەتیی زۆر لێ هاتووە.

کە ئەبوبەصیر زانیی لە مەدینەدا جێی نابێتەوە ، ئەوەی بە بیردا هات کە لە مەککەیش و مەدینەیش یاخیی ببێ و ، ببێتە شۆڕش گێڕێکی سەربەخۆ و ، نەگەڕێتەوە مەککە .

ئەوەبوو شمشێری پیاوە کوژراوەکەی هەڵ گرت و ، سواری وشترەکەی بوو کە لە کوژراوەکەی سەندبوو و ، بەرەو خۆرئاوا کەوتە رێ .. چونکە رۆخی دەریای سوور دار و درەختی زۆر بوو بۆ خۆ حەشاردان.

کە ئەو ناوچەیەی هەڵ بژارد مەبەستی ئەوە نەبوو خۆی تیا حەشار بدا و بەس ، بەڵکو مەبەستێکی لەوە بەرزتری بەرچاو گرتبوو . ئەی‌ویست بنکەیەك دروست بکا تا موسڵمانە چەوساوەکان لەوێ کۆ ببنەوە و دەست بدەنە رێ‌گرتن لە کاروانەکانی قورەیش.

سەرەتا خۆی بە تەنیا دەستی لە کاروانەکانیان ئەوەشاند ، تا ئەوەبوو دەنگ و باسی بلاّو بوویەوە و ، خەڵکی مەککە ئازایەتیی و لێ‌هاتنی ئەبوبەصیریان بەرگوێ کەوت . گەنجە موسڵمانەکانی مەککە بە پەلە خۆیان لە بەندیخانە دەرباز کرد و ، خۆیان گەیاندە لای ئەبوبەصیری پاڵەوانی چاونەترس ، بە تایبەت کە زانیان چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئازای لە قەڵەم داوە .

هەر گەنجێك کە لە بەندیخانەکانی مەککە ڕزگاری ئەبوو بە پەلـە بـەرەو (عـیص) ئەکەوتە ڕێ .. ئەوەبوو دوای چەند مانگێك حەفتا گەنجی موسـڵمانی مەککـە لـەوێ کۆ بوونەوە ، بە تایبەت ئەبوجەندەلی کوڕی سوهەیلی کوڕی عەمر ..[١٦٤]

سەرەڕای گەنجەکانی مەککە هەندێ لە پیـاوانی غیفـار و جوهەینـە و هـۆزی تـر پاڵیان دا بە جەنگاوەرانی ( عیص ) ەوە ، هەتا گەیشتنە سێ صەد پیـاو .. ئەمانـە هەر هەموویان بە جوانیی دەستیان بە ئیسلامەوە گرت بوو ، هەر چـەندە پەیوەنـدیی ئیداری‌یان بە مەدینەوە نەبوو .

ئەمانە بڕیاریان هاتە سەر ئەوە کە ئەبوبەصیر فەرماندەیان بێت و گوێڕایەڵیی بـۆ بکەن. ئەبویەصیریش ئەبوجەندەلی کردە جێگری خۆی و ، جەنگاوەرەکانیشی ڕێـك و پێك کردن و ، دەستیان دایـە جـەنگی پـارتی زانیـی دژی قـوڕەیش و ، بـە وردیـی چاودێریی هات و چۆی کاروانـەکانی قوڕەیشـیان ئـەکرد .. ئـیتر هـەر کەسـیان لـە دوژمنـانی ئیسـلام دەسـت بکەوتایـە ئـەیان‌کوشـت و ، فریـای هـەر کـاروانێکیش بکەوتنایە دەستیان بەسەری‌دا ئەگرت . بەمە بازرگانیی قـوڕەیش تووشـی زیـانێکی گەورە بوو و ، ئابووریی مەککـە هاتـە کزیـی و ، خـۆراکی تێـدا کـەم بوویـەوە و ، ئارمایی گرانیی هەڕەشەی لە دانیشتوانی مەککە ئەکرد ..

موسڵمانەکانی مەدینە بە هیچ شێوەیەك پەیوەندی‌یان بەم دەستە هەڵ گەڕاوەیەوە نەبوو و، ئەوانیش بۆ خۆیان کاری خۆیان سەربەخۆ ئەنجام ئەدا .

ئەبویەصیر و جەنگاوەرەکانی هەروا خەریکی کاری خۆیان بـوون و ، دەسـەڵاتێکی چاکیان پەیدا کردبوو و ، ئارامیان لە قـوڕەیش هـەڵ گرتبـوو ، بـەوەی کـە تووشـی زیانێکی گەورەیان کردبوو .

لە کاتی بەسـتنی پـەیمانی حودەیبیـیـەدا قـوڕەیش زۆر بیـانووی ئـەگرت و لەسـەر مەرجەکانی زۆر پێی دا ئەگرت ، بـە تایبـەت ئـەو مەرجـەی کـە پێویسـتی ئـەکرد موسڵمانەکان هەڵاتوان نەگرنە خۆ و بیان‌گێڕنەوە .. موسڵمانەکانیش ئەو مەرجـەیان

---

[١٦٤] ئەبوجەندەل نازناویەتی ، ناوی عەبدوڵلای کوڕی سوهەیلە . یەکێکە لەوانەی کە زوو بە زوو موسڵمان بووە، هەتا لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ بەشداریی جەنگی بەدری کردووە . سەرەتا لەگەڵ بت‌پەرستەکان‌دا هاتبوو بۆ بەدر ، کەچیی لەوێ هاتە پاڵ موسڵمانەکان و ، دوای ئەوە بەدیل گیرا و لەسەر ئیسلام سزایان ئەدا .. کە مەککە فەتح کرا ئەو داوای ئەمانی بۆ باوکی کرد . لە جەنگی یەمامەدا شەهید بوو و تەمەنیشی سیی و هەشت ساڵان بوو.

یەکجار بەلاوە گران بوو ، بۆیە دژی پەیمانەکە بوون . بەلاّم سەرەنجام بۆ قورەیش دەرکەوت کە ئەو مەرجە زیانێکی زۆری لێ دان و ، بووە مایەی وەستانی چالاکیی بازرگانی‌یان .

کە مەترسیی جەنگاوەرانی عیص پەرەی سەند پیاوماقوولانی مەککە لە ( دار الندوة ) کۆبوونەوەیەکیان کرد ، بەلاّم بەبێ ئەنجام کۆتایی‌یان پێ هێنا .. چونکە نەیان ئەتوانیی حوکومەتی مەدینە تاوان‌بار بکەن و ، نەشیان ئەتوانیی سوپا بەرێ بکەن و بچنە سەر ناوچەی عیص و ، ئەو جەنگاوەرانە لەناو ببەن .. سەرەنجام بیریان هاتە سەر ئەوە کە هۆی ئەم کارەساتە ناهەموارە ئەو مەرجەیە کە بە زۆر سەپاندوویانە بەسەر موسڵمانەکان‌دا کە هەر کەسێ لە مەککەوە را بکات بۆ مەدینە گل نەدرێتەوە .. کە کۆمەڵێ گەنج لە مەککە بەند ئەکرێن و سزا ئەدرێن بۆ ئەوەی واز لە ئیسلام بهێنن ، ناچار هەوڵی دەرباز بوون ئەدەن و هەڵ دێن بۆ مەدینە .. مەدینەش بە بۆنەی پابەندبوونیەوە بە پەیمانی حودەیبیە ناهێڵێ لەوێ بمێننەوە . لەبەردەم ئەم واقیعەدا ئەوانیش ناچار ئەبن دەست لە دوژمنی خۆیان بوەشێنن . کەواتە چارەی ئەم گرفتە ئەوەیە ئەو مەرجە لا ببرێت .. ئەندامانی ( دار الندوة ) بە یەك دەنگیی هاتنە سەر ئەوە داوا لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن و، بە ناوی سیلەی رەحمەوە لێی بپارێنەوە ، تا فەرمان بەسەر گەنجە موسڵمانە هەڵاتووەکانی مەککەدا بدات واز لەو دژایەتی‌یەیان بهێنن و ، بگەرێنەوە بۆ مەدینە و ، ئەوانیش بچنە ژێر سایەی پەیمانی حودەیبیەوە .. واتە رێ‌یان بدەن لە مەدینە نیشتەجێ ببن ، بەو مەرجەی دەست لە کاروانەکانیان نەوەشێنن.

بۆ ئەمە قورەیش لە ( دار الندوە ) بریاری ئەوەیان دا نامەیەك بنووسن و ، گەورە پیاوێکیان بە نامەکەوە بنێرنە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ . ئەوەبوو ئەبوسوفیان رەوانەی مەدینە کرا و ، کە نامەکەی دایە دەست پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەویش لەناوکرۆکی گەیشت ، بەبێ بیانوو گرتن ، بە سووك و ئاسانیی بە گوێی کردن و ، فەرمانی دا جەنگاوەرانی عیص بگەرێنەوە مەدینە ، هەر چەندە ئەوان زیانی گەورەیان لە قورەیش ئەدا و ، قورەیشیش لە دژی موسڵمانان هیچ درێغی یەکی نەکردووە . بەلاّم پێغەمبەری هیدایەت زیانی بۆ هیچ کەسێك نەئەویست .. خێرا نامەی بۆ ئەبوبەصیر و ئەبوجەندەل نووسیی تا بە خۆیان و جەنگاوەرانیانەوە بگەرێنەوە مەدینە.

لەو کاتەدا کە نامەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە دەستی ئەبوبەصیر ، ئەبوبەصیر تووشی نەخۆشی یەك بوو بوو و ، لە سەرەمەرگ دا بوو . نامەکەیان دایە دەستی و ، هەڵی پچڕی و ، دەستی بە خوێندنەوەی کرد و ، هێشتا نامەکە بە دەستیەوە بوو ، بەر لەوەی لە خوێندنەوەی ببێتەوە گیانی پیرۆزی دەرچوو ..

دوای ئەوە ئەبوجەندەلی جێ گر ، کە بە مردنی ئەبوبەصیر بووە فەرماندەی جەنگاوەرانی عیص ، نامەکەی وەرگرت و خوێندیەوە . پاشان بە هەموویانەوە پاڵەوانی فەرماندەیان لەوێ بە گڵ سپارد و ، ئەبوجەندەل فەرمانی دا جەنگاوەرانی عیص فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ جێ بە جێ بکەن و بگەڕێنەوە مەدینە و ، دەست لە دژایەتیی قورەیش هەڵ بگرن .

هەر هەموو فەرمانەکەیان جێ بەجێ کرد و ، حەفتا گەنجی قورەیشیی گەڕانەوە مەدینە و ، جەنگاوەرەکانی تریش گەڕانەوە ناو هۆزەکانیان . یەکێ لە گەنجە قورەیشی یەکان وەلیدی کوڕی وەلید بوو کە برای خالیدی کوڕی وەلید بوو .. وەلید کە گەیشتە ناوچە بەردەلانەکەی نزیکی مەدینە پێی هەڵ کەوت و پەنجەیەکی بڕڕایەوە و کە گەیشتە مەدینە بە هۆی ئەو زامەوە کۆچی دوایی کرد .

ئەبوجەندەل گەڕایەوە مەدینە و ، ڕۆژانی حودەیبیەی ئەهاتنەوە یاد کە چەندە سەخت بوون کاتێ کە ئەو درایە دەستی باوکی هەتا بیباتەوە بۆ مەککە و کۆت و زنجیر بخاتە دەست و پێی . ئەو ڕۆژەی هاتەوە یاد کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵێنی پێ دا کە خوا دەروو لەویش و لە موسڵمانە بێ دەسەڵاتە ستەملێکراوەکانی مەککە ئەکاتەوە . وا ئەمڕۆ ئەو بەڵێنەی بە چاوی خۆی دیی . بە چاوی خۆی بەرهەمی ئارام لەسەر سزا و ستەم و ، بەرهەمی خۆفرۆشتن بە خوای بینیی ..[165]

**دووهەم : گرتنی ئافرەتە کۆچ کەرەکان**

دوای پەیمانی حودەیبیە و پێش فەتحی مەککە خوای گەورە دەستووری ئاسمانی بۆ موسڵمانان نارد هەتا ئافرەتی موسڵمان لەگەڵ مێردی کافری دا جیا بکەنەوە و ، ئیتر لەوە و دواش ئافرەتی موسڵمان بە هیچ شێوەیەك لە پیاوی کافر مارە نەکرێت ..

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم دەستوورە ئاسمانی یە ئەوەیە کە ئوم کولثوومی کچی عوقبەی کوڕی ئەبومعیط لە مەککە موسڵمان بوو بوو و ، بەر لە کۆچ کردن بۆ مەدینەش لە مەککەدا بەیعەتی بە پێغەمبەری خوا ﷺ دابوو و ، یەکێ لە ئافرەتە

---

[165] فتح مكة لباشميل : ٢٥ ـ ٤٩ ، الطبعة الثانية ١٣٩٤ هـ ـ ١٩٧٤ م .

ئیمان‌دامەزراوەکانی مەککە بوو ، هەر چەندە باوکی دوژمنی سەرسەختی ئیسلام بوو.[١٦٦] ئەوەبوو لە دوای پەیمانی حودەیبیە خۆی گەیاندە پایتەختی ئیسلام ، هەر چەندە ئەترسا کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر مەرجەکەی حودەیبیە بی‌گێڕێتەوە بۆ مەککە.

ئەم ئافرەتە بەڕێزە ئەوپەڕی ئازایەتیی نواند کە گەشتێکی وەها دوور و سەختی لەبەر خاتری ئیمان خستە بەر خۆی .. تەنها ئیمانی دامەزراو ئەوەی لێ ئەوەشێتەوە، چونکە ماوەی نێوان مەککە و ، مەدینە زۆرە و ، ڕێگاکەشی چۆڵەوانیی و سەختە، کەچیی ئوم کولثووم مەردانە نییەتی بە خزمەت گەیشتنی ئازیز دێنێ .

جا کە ئەو نییەتە پاکەی هێنا و لەسەر ئەوە سوور بوو کە خۆی بگەیەنێتە لای ئیمان‌داران ، خوای گەورەش پیاوێکی مەردی پاک‌داوێنی کەم‌وێنەی بۆ ڕەخساند تا ببێتە پاسەوانی و بە سەلامەتی بی‌گەیەنێتە مەدینە ، بە مەرجێ لەوە و پێش یەکیان نەدیوە و نەناسیوە ، تەنها ئەوەندەی بۆ روون ئەبێتەوە کە ئەو پیاوە لە هۆزی خوزاعەیە کە ئەو هۆزە دۆستی موسڵمانەکانن و ، ئیتر ناویشی نازانێ ..

ئوم کولثووم یەکەم ئافرەتێکە کە دایك و باوکی هەردووکیان قورەیشیی بن و بە موسڵمانێتیی کۆچی لە پێناوی خوا دا کردبێت .. ئەم ئافرەتە لە دەشت لە نزیکی ( تنعیم ) شوێنێ وەهایان هەبووە کە لەگەڵ کەس‌وکاری‌دا چووە بۆ ئەوێ و، سێ و چوار ڕۆژ لەوێ ماوەتەوە و ، پاشان گەڕاوەتەوە بۆ مەککە . ڕۆژێك بڕیاری خۆی یەك لایی ئەکاتەوە کە ئەبێ کۆچ بکا بۆ مەدینە . لە ماڵەوە بە ناوی چوون بۆ دەشت دەرئەچێت و ، کە ئەوەی ڕەوانەی ئەکات ئەگەڕێتەوە دوا ، ئەکەوێتە ڕێ و خۆی ئەگەیەنێتە ڕێگای مەدینە . ئەبینێ پیاوێکی هۆزی خوزاعە وا لەوێ . لێی ئەپرسێ : بۆ کوێ ئەڕۆی ؟ ئافرەتەکە ئەڵێ : بۆ کاری خۆم ئەڕۆم و تۆ بۆچ پرسیار ئەکەیت ؟ تۆ کێیت ؟ ئەڵێت : پیاوێکی هۆزی خوزاعەم . کە ئەزانێ لە خوزاعەیە

---

[١٦٦] ئوم کولثوومی کچی عوقبەی کوڕی ئەبوموعیطی ئومەویی بووە . دایکی ناوی ئەروای کچی کورەیزی کوڕی زەمعە بووە . خوشکی دایکیی عوثمانی کوڕی عەففان بووە . ئافرەتێکی بەڕێزی ناوداری ئیمان دامەزراو بووە ، لەوانەی کە زوو بە زوو موسڵمان بووبوون . باوکی دژایەتیی پێغەمبەری خوای ئەکرد ، تا ئەوەبوو لە بەدردا بە دیل گیرا و لە نێوان بەدر و مەدینەدا ، بە فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ بە ناوی تاوانباری جەنگەوە لە ملی درا .

ئوم کولثووم کە هێشتا مێردی نەکردبوو ، بە تاقی تەنیا ، بە پێ کۆچی کرد بۆ مەدینە . لە بوخاریی و موسلیم و هەرسێ ( سنن ) ەکەدا فەرموودەی گێڕاوەتەوە . کە گەیشتە مەدینە زەیدی کوڕی حاریثە مارەی کرد ، کە شەهید بوو، زوبەیری کوڕی عەووام مارەی کرد ، پاشان لێی جیا بوویەوە و ، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف مارەی کرد و ئیبراهیم و حەمیدی لێ بوو ، کە ئەویش کۆچی دوایی کرد عەمری کوڕی عاص مارەی کرد .

دڵی متمانەی پێ ئەكات ، چونكە خوزاعە هاوپەیمانی موسڵمانەكان بوون . ئەڵێت : منیش ئافرەتێكی قورەیشییم و ئەمەوێ خۆم بگەیەنمە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و ، شارەزای ڕێگاش نیم . وتی : ئێمە بە شەو و بە ڕۆژ شارەزای ڕێگاین . من هاوەڵی تۆم هەتا بتگەیەنمە مەدینە .

خێرا وشترێكی بۆ دێنێ و ، ئەویش سواری ئەبێ . كابرا جڵەوی وشترەكە ئەگرێ، بێ ئەوەی تەنها وشەیەك قسەی لەگەڵ بكا . لە هەر شوێنێ لایان بدایە وشترەكەی بۆ پاڵ ئەخست و ، خۆی دوور ئەكەوتەوە تا دابەزێت . كاتی ڕۆیشتنیش وشترەكەی ئەهێنایە پێش و لێی دوور ئەكەوتەوە هەتا سواری ببێ . دوای ئەوە جڵەوی ئەگرت و ئاوڕی بۆ دواوە نەئەدایەوە ، هەتا كاتی لادان . هەروا ئەڕۆن هەتا ئەیگەیەنێتە مەدینە . پاشان ئوم كولثووم بەڕێزەوە باسی ئەو پیاوەی ئەكرد و، ستایشی خوزاعەیشی ئەكرد كە پیاوی وەهای تێدا هەڵ كەوتووە.

ئوم كولثووم بە نیقابەوە ئەچێتە ژوورەوە لای ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەری خوا ﷺ . كە نیقاب لا ئەبا و ئەیناسێ ، باوەشی پێدا ئەكات و ئەڵێت : بۆ لای خوا و بۆ لای پێغەمبەرەكەی كۆچت كردووە ؟ ئەڵێت : بەڵێ ، ئەترسم پێغەمبەری خوا ﷺ منیش وەك ئەبوجەندەلی كوڕی سوهەیل و ئەبوبەصیر بگێڕێتە دواوە . بەڵام ئەی ئوم سەلەمە حاڵی پیاوان وەك حاڵی ئافرەتان نیە . خزمەكانیشم بە دوامدا ئەگەڕێن ، چونكە ئەوە هەشت ڕۆژە لێیان جوێ بوومەتەوە ...

كە پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریف دێنێتە لای ئوم سەلەمە ، هەواڵی ئوم كولثوومی ئەداتێ ، ئەویش بە خێرهاتنی ئەكات . جا ئوم كولثووم ئەڵێت : ئەی پێغەمبەری خوا ! من بە دینەكەمەوە ڕام كردووە بۆ لات ، دە تۆش بم پارێزە و مەمگێڕەرەوە بۆ لای كافران و ئەوانیش لە دین وەرم گێڕن و سزام بدەن ، چونكە بەرگەی سزا ناگرم . من ئافرەتم و خۆیشت بە لاوازیی ئافرەتان ئاگاداری . ئاگاداریشم كە دوو پیاوت گێڕانەوە بۆ ناو موشریكان ( مەبەستی لە ئەبوجەندەل و ئەبوبەصیرە ) هەتا یەكێكیان خۆی داماڵیی .. منیش ئافرەتم .

لەولاوە كە ئوم كولثووم لە مەككە دیار نەما ، كەس و كاری كەوتنە هەواڵ پرسینی. سەرەنجام زانییان كۆچی بۆ مەدینە كردووە . بۆ ئەمە دوو برای بە ناوی وەلید و عومارە نێرران بە دوایا بۆ مەدینە و بە پێی پەیمانی حودەیبیە داوایان كرد بگێڕرێتەوە بۆ مەككە ..

پێغەمبەری خوا نەی ئەویست بەڵێن و گفتی موسڵمان بشکێت ، لەبەر ئەوە لەسەر گێڕانەوەی ئوم کولثووم سوور بوو ، بەڵام لەو کاتەدا قورئان هاتە خوارەوە و دەستووری بۆ موسڵمانان دیاریی کرد . پێغەمبەری خوا ﷺ ئاگادار کرا کە ئەگەر پێویست بێ پیاوانی هەڵهاتوو لە مەککەوە بگێڕنە دواوە ، ئەوا بە هیچ شێوەیەك ناگونجێ ئافرەتی موسڵمان بگێڕێتەوە ، بە تایبەت ئەو ئافرەتانەی کە مێردی موشریکیان هەیە ، چونکە فەرمانی قورئان بەوەیە کە هیچ ئافرەتێکی موسڵمان لە موشریك مارە نەکرێ و ، هیچ پیاوێکی موسڵمانیش ئافرەتی موشریك مارە نەکات .

جا ئەو ئایەتە پیرۆزەی کە دوا بە دوای کۆچ کردنی ئوم کولثووم هاتە خوارەوە ئەی فەرموو :

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٖ فَٱمۡتَحِنُوهُنَّۖ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِإِيمَٰنِهِنَّۖ فَإِنۡ عَلِمۡتُمُوهُنَّ مُؤۡمِنَٰتٖ فَلَا تَرۡجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلۡكُفَّارِۖ لَا هُنَّ حِلّٞ لَّهُمۡ وَلَا هُمۡ يَحِلُّونَ لَهُنَّۖ وَءَاتُوهُم مَّآ أَنفَقُواْۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّۚ وَلَا تُمۡسِكُواْ بِعِصَمِ ٱلۡكَوَافِرِ وَسۡـَٔلُواْ مَآ أَنفَقۡتُمۡ وَلۡيَسۡـَٔلُواْ مَآ أَنفَقُواْۚ ذَٰلِكُمۡ حُكۡمُ ٱللَّهِ يَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡۖ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴾ ( الممتحنة : ١٠ )

بەمە هەموو ژنێکی موسڵمان لە مێردە موشرێکەکەی و هەموو پیاوێکی موسڵمانیش لە هاوسەرە موشریکەکەی حەرام کران . بەڵام ئیسلام نەهاتووە ستەم لە هیچ کەس بکات .. لێرەدا کە ژنێکی موسڵمان لە مێردە موشریکەکەی حەرام ئەکات، ئەوە لەبەر ئەوەیە کە ئەو پیاوە موشریکە تازە هاوشانی ئافرەتێکی ئیماندار نیە، بەڵام ئەو پیاوە موشریکە مارەیی بەو هاوسەرەی داوە ، کەواتە تووشی زیان بووە، بۆیە قورئان فەرمانی دا بەسەر دەوڵەتی موسڵماندا دا تا مارەیی ئەو موشریکە ببژێرێ، ئەمەش بە هۆی پەیمانی حودەیبییەوە . قورئان ئەفەرموێ :

﴿ وَءَاتُوهُم مَّآ أَنفَقُواْۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ ﴾ ( الممتحنة : ١٠ ) .

بەمە ئەگەر ژن و مێردێك هەردووکیان موسڵمان نەبوونایە شەریعەت جیای ئەکردنەوە ، قورئان فەرمانی دا :

﴿ وَلَا تُمۡسِكُواْ بِعِصَمِ ٱلۡكَوَافِرِ ﴾ ( الممتحنة : ١٠ ) .

کە ئەم دەستوورە نوێیە هاتە خوارەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ دوو براکەی ئوم کولسوومی ئاگادار کردن کە هیچ ئافرەتێکی موسڵمان نانێررێتەوە بۆ ناو کافران و، زیانیش بۆ ئەو پیاوە موشریکە ئەبژێررێ کە لەبەر دین ژنەکەی لێ سەندراوەتەوە. ئەوانیش گەڕانەوە مەککە و ، دانیشتوانی مەککە لەو داوایە کۆڵیان دا ..[١٦٧]

**سێ هەم : سریەی خەبەط**[١٦٨]

یەکێ لەو هەڵمەتانەی کە لە دوای غەزای موئتە و لە پێش فەتحی مەککەدا سوپای ئیسلام ئەنجامی دا ، سریەیەك بوو کە ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح بەرەو ناوچەی جوهەینە لەسەر ڕۆخی دەریای سوور فەرماندایەتیی کرد .

ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ لە مانگی ڕەجەبی ساڵی هەشتەمدا بانگی کردە ئەبوعوبەیدە و ئاڵای فەرماندایەتیی سێ صەد پیاوی موهاجیر و ئەنصاری دایە دەست کە عومەری کوڕی خەططابیشیان لەگەڵدا بوو . فەرمانی بەسەردا دا تا بە سریەکەیەوە هێرش بکاتە سەر هۆزی جوهەینە کە تا ئەو کاتەش موسڵمان نەبووبوون و، ناوچەکەشیان لە مەدینەوە پێنج شەو دوور بوو.

پیاوانی ئەم سریەیە هەر هەموویان پیادە بوون و تەنها چەند وشترێکیان پێ بوو بۆ هەڵ گرتنی نان و خۆراکیان ..

لەوە ناچێ ئەم سریەیە تووشی جەنگ و هەرا بووبێ ، بەڵام گەیشتۆتە ناوچەی نیشتەجێی جوهەینە . جا مێژوونووسان ئەوەیان باس کردووە کە بەر لەوەی بگەنە ناوچەی جوهەینە تووشی برسێتی یەکی وەها بوون کە گەڵای خەبەطیان خواردووە . بەو برسێتی یە ئەوەندە لاواز ئەبن کە ئەگەر تووشی دوژمن ببوونایە توانایان نەبوو بچن بە گژیدا.

لەم غەزایەدا کە سریە موسڵمانەکە خەریك بوو لە برساندا تیا بچێ ، سەخاوەتی گەنجێکی ئەنصاریی دەرکەوت ، ئەو ئەنصارانەی کە قورئان بەوپەڕی ستایشەوە باسیان ئەکات و ئەفەرموێ :

﴿ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ﴾ (الحشر : ٩) .

---

[١٦٧] فتح مكة لباشميل : ٤٩ - ٥٧ .

[١٦٨] خەبەط ناوی گەڵای درەختێکە کە ئەوەرێنرێ و وشك ئەکرێتەوە و ئەهاڕرێ و تێکەڵ بە نارد ئەکرێت . لەبەر ئەوەی کە ئەم سوپایە ئەوەندە برسیی بوو سەربازەکان گەڵای خەبەطیان ئەخوارد ، ناونرا سریەی خەبەط .

ئەوەبوو گەنجێکی ئەنصاریی کە ناوی قەیسی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادە بوو لەگەڵ سریەکەدا بوو .. دیارە سەعدی کوڕی عوبادەی باوکی سەرداری خەزرەج بوو . قەیسیش بە ساخەوەت ناوبانگی دەرکردبوو .

قەیس گەنجێکی بێ‌ماڵ و سامان بوو .. کە دیتی وا سریە موسڵمانەکە بە دەست برسێتی‌یەوە گیریان خواردووە ، چوو بۆ لای ئەعرابی‌یەکی بنەماڵەیەکی دۆستی موسڵمانان لە جوهەینە و ، داوای لێ کرد کە چەند وشترێکی پێ بفرۆشێ تا سەریان ببڕێ بۆ سوپا موسڵمانەکە، بەو مەرجەی کە لە مەدینە خورمای بداتێ.

کابرای جوهەینیی بە قەیسی وت : بەخوا نات‌ناسم .. تۆ کێیت ؟

وتی : من قەیسی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادەی کوڕی دلەیمم .

ئەعرابی‌یەکە دەری بڕیی کە دۆستایەتی‌یەکی پتەوی لەگەڵ سەعدی سەرداری یەثریب هەیە . ئەوەبوو پێنج وشتری پێ فرۆشت هەر یەکە بە دوو بار خورمای وشك، لە خورمای ئالی دلەیم .. دوای ئەوە داوای شاهێدی کرد . قەیس چەند هاوەڵێکی ئەنصار و موهاجیری لەگەڵدا بوون و ، کردنیە شاهێد کە یەکێکیان عومەر بوو . عومەر فەرمووی : من شاهێدیی نادەم . ئەمە قەرزار ئەبێت و سامانیشی نیە ، بەڵکو سامان هی باوکیەتی . کابرای جوهەینیی وتی : بەخوا سەعد لەسەر کێشێك خورما دەست لە کوڕەکەی هەڵ ناگرێت .. دەم و چاوێکی گەشاوە و ، رەفتارێکی مەردانەش ئەبینم.

قەیس وشترەکانی هێنان و هەر رۆژە و یەکێکیانی سەر بڕیی ، کە رۆژی چوارەم هاتە بەرەوە ئەبوعوبەیدەی ئەمیر نەی‌هێشت وشتری چوارەم سەربڕێ و ، پێی وت: ئەتەوێ قەرزەکەت بدرێتەوە ، بێ‌ئەوەی سامانت هەبێ ؟ نابێت سەری ببڕیت .

قەیس وتی : ئەبوعوبەیدە ! تۆ وای ئەبینی کە باوکم ـ کە قەرزی خەڵکیی ئەداتەوە و، یارمەتیی لێ‌قەوماو ئەدات و ، لە گرانیی‌دا نان ئەدات ـ کێشێك خورمای کۆمەڵێك جیهادکەر لە پێناوی خوادا نەبژێرێ ؟ خەریك بوو ئەبوعوبەیدە نەرم ببێ و وازی لێ بهێنێ ، کەچیی عومەر فەرمووی : عەزیمەی لەگەڵدا بەکار بهێنە . ئەویش بڕیاری دا و نەی‌هێشت وشتری چوارەم سەربڕێ . بەمە دوو وشتری پێ مانەوە .. ئەوەبوو لە رێگا بە نۆبە سواری هەردووکیان ئەبوون هەتا گەیشتنەوە مەدینە.

دەنگ و باسی برسێتیی سوپای ئیسلام بە سەعد گەیشت ، وتی : ئەگەر من قەیس بناسم ئاژەڵیان بۆ سەر ئەبڕێت .. کە قەیس گەیشت و سەعدی باوکی تووشی بوو، لێی پرسیی : لە کاتی برسێتیی ئەو خەڵکەدا چیت کرد ؟ وتی : ئاژەڵم بۆ سەربڕین . وتی : چاکت کردووە ، سەر ببڕە ! وتی : پاشان چیی ؟ وتی : سەرم بڕیی. وتی : چاکت کرد ! وتی : پاشان چیی ؟ وتی : سەرم بڕیی . وتی : چاکت کردووە، سەر ببڕە ! وتی : پاشان چیی ؟ وتی : قەدەغە کرام . وتی : کێ قەدەغەی لێ کردی؟! وتی: ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕڕاحی ئەمیرم . وتی : بۆچ ؟ وتی : وای ئەگەیاند کە من سامانم نیە ، بەڵکو سامان هی باوکمە . منیش وتم : باوکم قەرزی دوورینە ئەبژێرێ و، یارمەتیی لێ قەوماو ئەدات و ، لە گرانیی‌دا نان ئەدات ، ئەوە لەگەڵ من‌دا ناکات؟!

سەعد وتی : چوار باخچەت پێشکەش بن . دەربارەی ئەوەش کیتابێکی بۆ نووسیم و هێنای بۆ ئەبوعوبەیدە و ئەویشی کردە شاهێد . هات بۆ لای عومەریش ، بۆ ئەویش شاهێدیی نەدا .. وتیان : کەمترین باخچەیان پەنجا بار خورمای تیا ئەبێت.

کابرای بیابان‌نشین هات و قەیسیش قەرزەکەی بۆ بژاردەوە و ، وشتری دایە بۆ سواربوون و جل و بەرگی پێشکەش کرد . کە ئەم دەنگ و باسە گەیشتە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (( إنه في بيت جود )) . فەرمووی : ئەو لە لانەی سەخاوەت‌دا گەورە بووە .

هەندێ لەو هاوەڵانەی کە لەگەڵ سریەکەی ئەبوعوبەیدەدا بوون گێڕاویانەتەوە کە کاتێ برسێتیی تەنگی پێ هەڵ چنیون خوای گەورە نەهەنگێکی بە وێنەی گردێک بۆ هێناونەتە وشکایی ، کە سوپا لێی خواردووە .

عوبادەی کوڕی صامیت ـ کە یەکێکە لەو دوانزە ئەنصاری‌یەی کە پەیمانی عەقەبەی یەکەمیان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بەستووە ـ ئەڵێت : بیست ڕۆژ لێمان خوارد هەتا قەڵەو و تەن‌دروست بووین .

ئەگێڕنەوە کە ئەم نەهەنگە بە ڕادەیەك گەورە بووە کە پێنج پیاو لە هاوەڵان چوونەتە ناو چاڵی چاوێکیەوە و جێ‌یان بۆتەوە .. پێنج پیاویش لە قورگی نەهەنگەکەدا وەستا بوون و بە خاکەناز چەوری‌یان ڕانەماڵیی .

هەروەها ئەگێڕنەوە کە ئەبوعوبەیدەی ئەمیر فەرمان ئەدات تا پەراسوویەکی ئەو نەهەنگە بە چەماوەیی بووەستێنرێت . کە پەراسووەکەیان وەستاند و وەك پردی لێ

هات بالاّ بەرزترینی ئەو سوپایە کە قەیسی کوڕی سەعدی کوڕی عویادە بوو، بەسواریی بەرزترین وشترەوە بە ژێر پەراسووەکەدا تێپەڕیی ، بۆ ئەوەی سەری دابنەوێنێ .
هەروەها ئەگێڕنەوە کە لە چاڵی چاوی ئەو نەهەنگەدا چەوری‌یان بە کەمۆڵە هەڵ گۆزیوە..
کاتێکیش کە ئەبوعوبەیدە بە سریەکەیەوە گەڕایەوە مەدینە ، هەواڵی ئەو نەهەنگەیان دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەویش ڕەزامەندیی لەسەر خواردنی دەربڕیی و داوای کرد ئایا هیچیان لە گۆشتی ئەو نەهەنگە لایە ؟ یەکێ لە پیاوانی سریەکە شتێکی لێ ئەنێرێ بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ و لێی ئەخوا .[١٦٩]
**چوارەم : سریەی ئەبوقەتادە بۆ خەضرە**
هۆزەکانی غەطەفان دوژمنی سەرەکیی موسڵمانان بوون ، بەلاّم پێویست بوو چاوترسێن بکرێن تا بیر لە هێرش بۆ سەر مەدینە نەکەنەوە . بۆ ئەمە لە مانگی شەعبانی ساڵی هەشتەمدا پێغەمبەری خوا ﷺ سریەیەکی چواردە کەسیی بە فەرماندایەتیی ئەبوقەتادەی ئەنصاریی ناردە سەر ناوچەی خەضرە تا چاوترسێنیان بکەن .. فەرمانی بەسەردا دان کە بە شەو بڕۆن و بە ڕۆژ خۆیان حەشار بدەن تا بگەنە ئەوێ و هێرشیان بکەنە سەر ، بەلاّم ژن و منداڵ نەکوژن .
ئەبوقەتادە وتاریان بۆ ئەدات و ئامۆژگاری‌یان ئەکات کە تەقوای خوا لە دڵیاندا بێت و ، پیاوانی سریەکەی دوو دوو لە یەك ئاگادار کردن کە هیچ پیاوێك هاوەڵەکەی بەجێ ناهێڵێ و خۆی بگەڕێتەوە . کە گەڕایەوە ئەبێ هەواڵی براکەی بزانێت .
هەروەها فەرمانی پێ دان کە هەرکەی ( الله أكبر ) ی وت ئەوانیش بی‌لێن و ، کە هێرشی کرد ئەوانیش هێرش بکەن ، بەلاّم زۆر نەچن بە دوای دوژمن‌دا .
کە ئەگەنە ناوچەکە ئەبوقەتادە شمشێرەکەی لە کێلان دەرئەهێنێ و ، موسڵمانەکانیش وەها ئەکەن و ، ( الله أكبر ) ئەڵێ و ئەوانیش بە دوایا ( الله أكبر ) ئەڵێن و هێرش ئەکەنە سەر ئاوەدانی‌یەکە و سەرەنجام ئەیان شکێنن و ، بە سەرکەوتوویی و دەست‌کەوتەوە ئەگەڕێنەوە مەدینە .. ئەم سریەیە دووصەد وشتر و هەزار سەر مەڕی دەست ئەکەوێت و ، بۆ ئەم غەزایە پانزە ڕۆژی پێ ئەچێ .
لە ساڵی چوارەمی کۆچیی‌دا غەطەفان شەش هەزار جەنگاوەری دڕندەی هێنایە سەر مەدینە و ، ئەی‌ویست ئەمامی ئیسلام بە ڕەگ و ریشەوە هەڵ بکێشێت .

---
[١٦٩] فتح مكة لباشميل : ٥٩ ـ ٦٤ .

کەچیی ئەوەتا لە ساڵی هەشتەمی کۆچییدا چواردە جەنگاوەری موسڵمان هەڵ ئەکوتنە سەر ناوچەیەکی هۆزی غەطەفان و کەس ناوێرێ بێتە ڕێیان و شمشێریان لێ بەرز بکاتەوە، بگرە بە ویستی خۆیان لێیان دیل ئەکەن و مەڕومالاتیشیان ئەدەنە بەر . ئەمەش ئەوەمان بۆ دەرئەخات کە موسڵمانەکان بوو بوونە هێزی چارنەکراوی ناوچەکە .[١٧٠]

[١٧٠] فتح مكة لباشميل : ٦٥ ـ ٦٨ .

## بەشی سیی و نۆهەم

# فەتحی مەککە

**یەکەم : هۆی فەتحی مەککە**

که موسڵمانەکان پەیمانی حودەیبیەیان بەست مەبەستیان ئەوەبوو ئەمن و ئاسایش باڵ بەسەر ناوچەی حیجاز هەر هەمووی‌دا بکێشێ و ، هەموو لایەك سەربەستیی تەواوی هەبێ بۆ هات و چۆ و تێکەڵاویی . ئەمەش هەلی بۆ کافران ئەڕەخساند تا لە نزیکەوە لە تایبەت‌مەندی‌یەکانی ئیسلام ئاگادار بن و ، بە جوانیی ئیسلام بناسن ، که ساڵەهای ساڵ بوو پاگاندەی ناحەزان خەڵکی چەواشە کردبوو و نەی‌ئەهێشت رەوشتی جوانی موسڵمانان بۆ دانیشتوانی دوورگە دەربکەوێ ، چونکە هەڵاتنی خۆری ئیسلام بۆ بەرژەوەندی‌یە ناشەرعی‌یەکانی ستەم کاران مایەی مەترسیی بوو ..

لە کاتی بەستنی پەیمانەکەدا موسڵمانەکانیش و قورەیشیش ئەوەیان بە بیردا هات کە دوو هۆزی بەهێزی تریش وان لە دەوروبەری حەرەم‌دا و خاوەنی سەنگی تایبەتیی خۆیانن . جا بۆ ئەوەی ئاشتیی دە ساڵەی پەیمانی حودەیبیە چاکتر بەرهەم بدات ، وا چاکە ئەو دوو هۆزەش بەشدار بکەن . ئەو دوو هۆزە هۆزی بەکر و هۆزی خوزاعە بوون، کە ساڵەهای ساڵ بوو جەنگی خوێناویی لە نێوانیان‌دا بنەبڕ نەبووبوو ..

ئەوەبوو ناردیان بە دوای سەرۆکانی هەردوو هۆزەکەدا تا ئاگادار بکرێن لەوەی کە موسڵمانەکان و قورەیش لەسەری رێك کەوتوون ، کە بریتی‌یە لە وەستاندنی جەنگ بۆ ماوەی ده ساڵ و ، ئەوانیش سەربەستیی تەواویان هەیە کە پاڵ بەهەر لایەکەوە ئەدەن، بەو مەرجەی ئەوانیش بەندەکانی پەیمانەکە بپارێزن .

لە ئەنجام‌دا خوزاعە ـ بە کافر و موسڵمانیەوە ـ چووە پەیمانی پێغەمبەری خوا ﷺ و، نەوەی بەکری کوڕی عەبدمەناتیش چوونە پەیمانی قورەیشەوە و ، ئەمەش لە پەیمانەکەدا نووسرا .. بەمە ئیتر خوزاعە و بەکر نەیان‌توانیی دەست لە یەکتر بووەشێنن.. خۆ ئەگەر بەکر دەست‌درێژیی بکردایە ئەوا قورەیش تاوانبار ئەبوو و ، گەر خوزاعەش دەست درێژیی بکردایە ئەوا موسڵمانەکان لێ پرسراو ئەبوون .

موسڵمانەکان کە پابەندی ڕەوشتە جوانەکان بوون بە چاکیی بەڵێنی خۆیان بەسەر ئەبرد ، وەك لە پێشەوە دیمان چۆن ئەبوجەندەل و ئەبوبەصیر تەسلیم کرانەوە، هەتا خەریك بوو ئوم کولشوومی کچی عوقبەش تەسلیم بکرێتەوە ، گەر قورئان دانەبەزیایە. بەڵام قورەیش و هاوپەیمانەکانی نەیانتوانی ، بگرە نەیانویست پارێزگاریی لە پەیمانەکە بکەن.. هەموو گفت و بەڵێنێکیان کێشا بە دیواردا و ئابرووی خۆیان برد .. سەرەنجام پێغەمبەری خواش ﷺ هەڵمەتی دا و کەعبەی پیرۆزی لەژێر چنگیان دەرهێنا ، تا قورەیش تەمیٚ بکا و ، بە سەر و بە ماڵ و بەوپەڕی دڵسۆزییەوە لەسەر خوزاعەی دۆست و ڕەفتار جوان بکاتەوە ..

خوزاعە بە نییەتی پاکەوە پارێزگاریی لە بەندەکانی پەیمانی حودەیبییە ئەکرد ، بۆیە ئەندامانی ئەم هۆزە ، چ کافر و چ موسڵمانیان ، بیٚخەم هات و چۆی ناوچەی نیشتەجیٚبوونی قورەیش و بەکریان ئەکرد و ، بە بۆنەی پەیمانەکەوە نیازیان نەبوو دەستی دوژمنایەتیی بۆ هیچ کەس درێژ بکەن و ، بە بیریشیاندا نەئەهات کە هیچ کەس دەستی دوژمنایەتیی بۆ ئەوان درێژ بکات .

بەڵام قورەیش و بەکر ئەمەیان بە هەل ئەزانی و ، بە تەما بوون لەم بارودۆخە کەڵك وەربگرن و ئەوەی لە کاتی جەنگ دا بۆیان نەئەهاتە دیی ، لە کاتی پەیمانەکەدا دەستی بخەن . چونکە هۆزی بەکر لە هیچ جەنگێك دا لە خوزاعەیان نەئەبردەوە ، بەڵکو خوزاعە زۆری لیٚ ئەکوشتن.

خوزاعە لە خۆی بیٚخەم بوو و، بەکریش خەریکی نەخشەکێشان بوو بۆ تۆڵەسەندن. بە تەما بوون هەل بە دەست بێنن و دەست لە خوزاعە بوەشێنن و کۆمەڵێکیان لیٚ بکوژن .ئەوەبوو سەرەنجام بە کۆمەکیی قورەیش ئەو نامەردییەیان ئەنجام دا..

ئەوەبوو سەرداری نەوەی بەکر و فەرماندەی جەنگاوەرانیان ، نوفەیلی کوڕی موعاویە لە هەلێك ئەگەڕا بۆی هەڵ بکەویٚ و دەست لە خوزاعە بوەشێنیٚ ، بەڵام بە شێوەیەك کە نەوەی بەکر تووشی زیان نەبن .[١٧١]

[١٧١] نەوفەلی کوڕی موعاویەی کوڕی عورروەی نەفاثیی ، پاشان بەکریی ، پاشان کەنانیی ،ساڵی فەتحی مەککە موسڵمان بووە و ، لە ساڵی نۆهەمدا لەگەڵ ئەبوبەکردا حەجی کردووە . پیاوێکی بە تەمەن بووە . پێش موسڵمانبوونی شەصت ساڵ ژیاوە و ، دوای موسڵمانبوونیشی شەصت ساڵ . لە جەنگی فوجاردا موعاویەی باوکی فەرماندەی هۆزەکەیان ( دوئل ) بووە . نەوفەل لە مەدینە نیشتەجیٚ ئەبێت و هەر لەوێش لە سەردەمی یەزیددا ئەمرێت . لە بوخاریی و موسلیم و تیرمیذییدا فەرموودەی ریوایەت کردووە .

ئەگێڕنەوە کە نەوفەل ئەچێ بۆ لای سەرۆکانی قورەیش و بە لای ئەوانەوە نیازەکەی ئەدرکێنێ کە ئەیەوێ لە ناخلۆف‌دا دەستێك لە خوزاعە بوەشێنێ . جا داوای یارمەتیی لە قورەیش ئەکات کە بە پیاو و بە چەك کۆمەکیی بکەن . ئەوانیش ئەمەیان بە دڵ بوو و ، بەڵێنی کۆمەکی‌یان پێ دا ..

ئەوەبوو خوزاعە هیچ ترسێکیان لە خۆیان نەبوو و ، لە ناوچەی وەتیردا لە گەرمەی خەودا بوون و ، چەکیشیان بەلاوە نەبوو ، لە تاریکیی شەودا بەکر هەڵمەتیان بردە سەریان و تا توانی‌یان لێ‌یان کوشتن . بەکر و قورەیش بەوەشەوە نەوەستان ، بەڵکو کەوتنە راونانی ئەوانەش کە لە کوشتن دەرباز بوو بوون ، هەتا هی وایان هەبوو گەیشتبووە پەنای حەرەم و ئەوسا ئەیان‌کوشت . ئیتر حیسابێکیان بۆ دوارۆژی خۆیان نەئەکرد .

لەناو قورەیش‌دا ئەم پیاوانە بەشداریی ئەو کارە چەوتەیان کرد و بە خۆیان و بە چەکیش ستەمیان لە خوزاعە کرد :

١ ـ صەفوانی کوڕی ئومەییە .

٢ ـ سوهەیلی کوڕی عەمر ، کە لە جێی قورەیش پەیمانەکەی مۆر کرد .

٣ ـ عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل .

٤ ـ موکەررەزی کوڕی حەفص .

٥ ـ حوەیطبی کوڕی عەبدولعوززا ، کە ئەم دوانەی دواوە هەردووکیان ئەندامی نوێنەرە قورەیشی‌یەکە بوون بۆ بەستنی پەیمانەکە و لە بریی قورەیش پەیمانەکەیان مۆر کرد .

مێژوونووسان ئەوەیان تەئکید کردووە کە جگە لە ئەبوسوفیان هەموو سەردارانی قورەیش رایان لەسەر بووە . بەڵام نەوەی مودلیج ، کە بەرەیەکی هۆزی بەکر بوون ، لەو ناپاکی‌یەدا بەشداری‌یان نەکرد و پەیمانیان نەشکاند .

باسەکەش بەم شێوەیە بوو ..

لە مانگی شەعبانی ساڵی هەشتەم‌دا ، بیست و دوو مانگ دوای پەیمانی حودەیبییە، هۆزی بەکر کەوتنە دواندنی سەرۆکەکانی قورەیش جگە لە ئەبوسوفیان، بە نیازی ئەوەی کە ئەگەر چوون بە گژی خوزاعەدا قورەیشیش بە پیاو و بە چەك و ئەسپ یارمەتی‌یان بدەن . قورەیش بەڵێنی کۆمەکی‌یان بە نهێنیی دا ، بۆ ئەوەی خوزاعە نەکەوێتە خۆ و خۆی ئامادەی جەنگ نەکات .

قورەیش شوێنێکیان دیاریی کرد کە ناوی ( وەتیر ) بوو . جا لە کاتی دیاریی کراودا سەردارەکانی خۆیان گۆڕیی و نیقابیان پۆشیی و ، بەندە و کۆیلەکانیان لەگەڵ خۆیان هێنا و هاتن بۆ ئەو شوێنە . لەولاوە نەوفەلی کوڕی موعاویەی دوئلییش سەرۆکایەتیی نەوەی بەکری کرد و ، شەو ، کە خوزاعە لە خۆیان بێخەم بوون ، دایان بەسەریان دا و ، هەتا خۆیان گەیاندە حەرەمی مەککیی هەر لێیان کوشتن .

خوزاعە بەبێ چەك و پەناشیان بردبووە پەنای کەعبە ، هێشتا نەوفەل وازی لێ نەئەهێنان و لەسەر ئەوە سوور بوو کە لەناو حەرەمیشدا هەر بیانکوژن ..

کە هەندێك رەفتاری نەوفەلیان بە دڵ نەبوو و ئامۆژگاریییان کرد کە لە خوا بترسێ و دەست بگرێتەوە ، چونکە لەناو حەرەمدا هەرگیز کوشتار نەکراوە ، نەوفەل کەوتە کوفر کردن و وتی : ئەمڕۆ من خوام نیە . ئەوەبوو نەوەی بەکری هەڵ نا تا تۆڵەی خۆیان بکەنەوە .

خوزاعە خۆیان گەیاندە ماڵی بودەیلی کوڕی وەرقای خوزاعیی لە مەککە و ، رافیع کە بەندەیەکی ئازادکراویان بوو . ئەمەش لەگەڵ بەرەبەیاندا . ئەوانەی کە خوزاعەیان راو ئەنا بەکریی و قورەیشیی بوون . کە قورەیشییەکان گەیشتنەوە مەککە خۆیان گەیاندەوە ماڵی خۆیان و ، وایان ئەزانیی کەس پێی نەزانیون و ، هەواڵی ئەم بەشداربوونەیان ناگاتە مەدینە . نەوەی بەکر لە مەککەدا و لەبەر دەرگای بودەیل و رافیعدا بیست پیاوی خوزاعەیان کوشتن ، بێئەوەی پیاوێکی قورەیشیی قەدەغەیان بکات . بەڵام چەند پیاوێکی قورەیشیی هەستیان بە مەترسیی ئەم کارەی بەکر کرد کە ئەبێتە مایەی هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی حودەیبییە . ئەوەبوو حاریثی کوڕی هیشام و عەبدوڵڵای کوڕی ئەبورەبیعە[١٧٢] هاتنە لای سوهەیلی کوڕی عەمر و عیکریمە و موکەررەز و حوەیطبی کوڕی عەبدولعوززا و لۆمەی بەشداریی کردنی ئەو

---

[١٧٢] عەبدوڵڵای کوڕی ئەبورەبیعەی کوڕی موغیرە ، ئامۆزای خالید بووە و یەکێ لە سەردارە قورەیشییەکان بووە . برای دایکیی ئەبوجەهلیش بووە . لەگەڵ عەمری کوڕی عاص دا قورەیش ئەیان نێرێ بۆ حەبەشە بەو هیوایەی موسڵمانەکانیان تەسلیم بکرێنەوە و ، بیانگێڕنەوە بۆ ژێر سزا و ئازارەکەی مەککە . ساڵی فەتحی مەککە موسڵمان بووە . کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە سوپاوە بەرەو حونەین ئەڕۆیشت دە و ئەوەندە هەزار دیرهەمی لە عەبدوڵڵا قەرز کرد و ، کە لە حونەین گەڕایەوە قەرزەکەی پێ دایەوە و دوعای بەرەکەتی ماڵ و منداڵی بۆ کرد . عومەر کردوویەتییە فەرماندەی سوپا . لە سەردەمی خەلافەتی عوثماندا کۆچی دوایی کردووە .. ئەوەبوو هەواڵی گەمارۆی عوثمانی بیست و ئەویش لە مەککە بوو . سوار بوو و هات بۆ مەدینە بۆ کۆمەکیی عوثمان ، کەچیی لە نزیك مەککە لەسەر وڵاغەکەی کەوت و کۆچی دوایی کرد ..

کاره نەشیاوەیان کردن . ئەمە کاری تێ کردن و چوون بۆ لای نەوفەل و ماوەیان نەدا چیی تر خوزاعەیی بکوژێت ..

قورەیش پەشیمانی کاره نەشیاوەکەیان بوونەوە .. ترسیان لێ نیشت کە ئەم دەست درێژی یە بەسەریان دا ناڕەوات ، چونکە نەوەی بەکر بە کۆمەکیی و پشتەسووریی ئەوان و لە ناوچەی ئەوان دا ئەم ناپاکی یەیان ئەنجام داوە . لە هەمووی ناخۆش تر هەندێ لەو قورەیشی یانەی کە بەشداریی ئەو دەست درێژی یەیان کردبوو ، لە بریی قورەیش پەیمانی حودەیبییەیان مۆر کردبوو .

کە حاریث و عەبدوڵلاّ چوونە لای ئەبوسوفیان تێیان گەیاند کە ئەمە هەڵ وەشاندنەوەی حودەیبییەیە و موسڵمانەکان دێنە سەریان . ئەبوسوفیانیش تێ گەیشت کە ئەم کاره تەڵەیە و بۆ ئەو و قورەیش نراوەتەوە . ئەویش دەری بڕیی کە ئاگای لێ نەبووە و ، لە دەستی موحەممەدیش رزگاریان نابێ .

قورەیش ناچار بوون کۆبوونەوەیەك ئەنجام بدەن . ئەوەبوو گەیشتنە ئەو رایە کە ئەمە پاشگەزبوونەوەیە لە بەڵێنەکانی حودەیبییە و ، پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز لەم دەست درێژی یە بێ دەنگ نابێت .

کاتێك کە قورەیش خەریکی کۆبوونەوەکانی بوو لە ( دار الندوة ) عەبدوڵلاّی کوڕی سەعدی کوڕی ئەبوسەرحیش لەوێ بوو . عەبدوڵلاّ کەوتە ئامۆژگاریی قورەیشی یەکان تا رێگەچارەیەك بۆ خۆیان هەڵ ببژێرن .

تێی گەیاندن کە پێغەمبەری خوا ﷺ هێرشیان ناکاتە سەر هەتا چەند رێیەکیان بۆ دانەنێت ..

داوایان لێ ئەکات کە خوێنی بیست و سێ کوژراوی خوزاعە بدەن ، یان لە پەیمان و دۆستایەتیی نەوەی بەکر خۆیان داماڵن ، یان خۆیان بۆ جەنگ ئامادە بکەن . پێی وتن: کامیان هەڵ ئەبژێرن ؟

سوهەیلی کوڕی عەمر خۆ داماڵین لە پەیمان و دۆستایەتیی نەوەی بەکری بەلاوە ئاسان بوو .. بەڵام شەیبەی کوڕی عوثمانی عەبدەریی ئەوەی بە دڵ نەبوو و ، دوای مشت ومڕ دەری بڕی کە خوێن دانی خوزاعە ئاسانە .. قورطەی کوڕی عەبد عەمریش وتی : نا بەخوا نە خوێن ئەدەین و ، نە لە پەیمانی نوفاثەی کوڕی غەوثیش ــ کە تیرەیەکی بەکر بوون ـ خۆمان دائەماڵین ، بەڵکو ئەچین بە گژی دا ، واتە بە گژی پێغەمبەری خوادا ﷺ .

ئەبوسوفیان وتی : ئەوە هیچ نیە و ، تاکە را بۆ ئێمە ئەوەیە کە دان بەم کارەدا نەنێین کە گوایا قورەیش پەیمانی شکاندبێ . خۆ ئەگەر خەڵکانێك بەبێ حەزی ئێمە و بەبێ راوێژ پێکردنمان ئەوەیان کردبێ ، ئێمە چیی بکەین ؟ وتیان : تەنها ئەمە رایە. مل بادان بۆ هەرچیی کە رووی داوە .

وتی : من فەرمانم بەو کارە نەداوە و راستیش ئەکەم و پێیشم ناخۆشە ئەوەتان کردووە و ، زانیویشمە کە رۆژێکی رەشی بە دواوەیە . قورەیش رەزامەندی‌یان دا ئەبوسوفیان ئەو کارە بکات . بۆ ئەمە رایان هاتە سەر ئەوە کە نێرراوێکی پایەدار بنێرنە مەدینە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ تا ماوەی پەیمانەکە درێژ بکاتەوە . جا ئەگەر ئەمەیان بۆ کرا ، ئەوا لە سزای سوپای مەدینە رزگار ئەبن . هەروەها پیاو ماقوولانی ( دار الندوة ) هاتنە سەر ئەو بڕیارە کە ئەبوسوفیانی فەرماندەی گشتیی سوپای قورەیش بچێت بۆ مەدینە .

ئیتر لە قورەیشیش و ئەبوسوفیانیش وەهابوو کە ئەو هەواڵە پێشی ئەبوسوفیان ناکەوێ و ناگاتە مەدینە . بۆیە ئەبوسوفیان بە پەلە کەوتە رێ و خۆی گەیاندە مەدینە.

بەڵام قورەیش و ئەبوسوفیان نەیان پێکا ، چونکە خوزاعە پێش کەوتبوو و ، خۆی گەیاندبووە مەدینە و ، بە وردیی باسەکەی بە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیاندبوو ، ئەوسا دوای چەند رۆژێك ئەبوسوفیان گەیشت .

هەر دوای دەست درێژی‌یەکە هۆزی خوزاعە نێرراوێکی تایبەتی‌یان نارد بۆ مەدینە، کە عەمری کوڕی سالمی خوزاعیی بوو ، تا ئەو ستەمەی نەوەی بەکر و کۆمەکانیان بگەیەنێتە پێغەمبەری خوا ﷺ .

بەڵێ ، لە کاتێك‌دا کە پیاوماقوولانی قورەیش ئەگەڕان درۆکانیان پینە بکەن، عەمری کوڕی سالم گەیشتبووە مەدینە و ، بە وردیی باسەکەی بۆ ئازیز گێڕابوویەوە..

عەمر لە مزگەوتی مەدینەدا هەستایە سەرپێ و باسەکەی بە شیعر هۆنی‌یەوە، کە قورەیش پەیمانی حودەیبیەیان شکاند و ، داوای کرد هێرشیان بکرێتە سەر و نەهێڵرێن، چونکە ئەوان لە کاتی ئاشتیی‌دا هەلیان بە دەست هێنا و ، لە وەتیردا و لە ناو مەککەدا ئەمان خەریکی نوێژ و قورئان خوێندن بوون دەست درێژی‌یان کردە سەریان..

که پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمەی بیست ، یەکجار تووڕە بوو و ، بە نێرراوەکەی خوزاعەی ڕاگەیاند کە تۆڵەی ئەو دەست درێژی‌یە ئەسێنێت لێیان کە فەرمووی: (( نُصرتَ یا عمرو بن سالم )) .

که پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوت هاتە دەرەوە ، تووڕەیی پێوە ئەبینرا ..

لە ئیبن عەبباسەوە [١٧٣] ڕیوایەت کراوە کە وتوویە : پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوت هەستا و لای عەباکەی بە دوای خۆی‌دا ڕائەکێشا و ئەی فەرموو : (( لا نُصرتُ إن لم أنصر بني کعب ـ یعني خزاعة ـ مما أنصر منه نفسي )) . ئەی‌فەرموو : خوا سەرم نەخات ئەگەر لە هەر شتێك‌دا کە هەوڵی سەرکەوتنی خۆم ئەدەم هەوڵی سەرکەوتنی نەوەی کەعب نەدەم واتە هۆزی خوزاعە .

جا هەروەك خوزاعە عەمری کوڕی سالم یان بە پەلە نارد بۆ مەدینە ، هەروەها بە دوای‌دا وەفدێکی گەورەشیان نارد کە بریتیی بوو لە چل پیاو بە سەرۆکایەتیی بودەیلی کوڕی وەرقاء .. ئەوانیش ڕووداوەکەیان بە وردیی گێڕایەوە و ، داوای کۆمەکی‌یان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد تا تۆڵەی بیست و سێ کوژراوی خۆیان بسێنن کە قوڕەیش و بەکر بە ناڕەوا کوشتنیان . ئەویش جەختی لەسەر ئەو کۆمەکی‌یە کردەوە .

---

[١٧٣] عەبدوڵلای کوڕی عەبباسی کوڕی عەبدولموطەللیب ، ئامۆزای پێغەمبەری خوا بووە . دایکی ناوی لوبابەی کچی حاریثی هیلالی‌یە . پێش کۆچ کردن بۆ مەدینە بە سێ ساڵ ، لەو کاتەدا کە موسڵمانەکان لە مەککەدا لەلایەن قوڕەیشەوە ئابڵوقەی ئابووریی‌یان خرابوویە سەر ، لە دایك بووە . یەکەم جەنگێك کە بەشداریی تێدا کرد جەنگی ئەفریقیە بوو لە توونس ، لە ژێر فەرماندایەتیی عەبدوڵلای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبوسەرحدا ، ئەمەش لە ساڵی بیست و حەوتەمی کۆچیی‌دا . پیاوێکی سپیی پێستی بالآبەرزی بە لاشە گەورەی دەم و چاو گەشاوە بووە ، کە ئەگەر دانیشتایە جێی دوو پیاوی ئەگرت . ڕیوایەت کراوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی بەسەردا هێناوە و ، فەرموویە: (( أللهم فقهه في الدین وعلمه التأویل )) . یەکێ بووە لەو هاوەڵانەی کە خاوەنی زانستێکی زۆر بوون . نازناوی (( حبر الأمة )) ی لێ نراوە . ئەڵێن لە جەنگی ئەفریقیەدا چاوی بە جەرجیری فەرماندەی ڕۆمان ئەکەوێت ، کە زۆر بە پیاوێکی لێ هاتوو ئەکەوێتە بەرچاوی و پێی ئەڵێ کە پێویستە تۆ زانای عەرەب بیت . عەطائیش وتوویە : کۆڕم نەدیوە وەك کۆڕی ئیبن عەبباس بەڕێز بێت : لە هەموو کۆڕێك فیقهی زیاتر و لە خواترسانی چاکتری تێدا بووە . طاووس‌یش وتوویە: حەفتا لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوام ﷺ دیوە ، هەرکەی لە کارێك‌دا جیاوازی‌یان بووبێت ، شوێن وتەی ئیبن عەبباس ئەکەوتن . ئیمام عەلیی کردوویەتیە والیی بەصرە و ، لە جەنگی صیففینیش‌دا فەرماندەی دەستە چەپی سوپاکەی بووە و، نازناوی ( ترجمان القرآن ) یشی لێ نراوە . لە طائیف و لە ساڵی شەصت و هەشتی کۆچیی‌دا و لە تەمەنی حەفتا و یەك ساڵیی‌دا کۆچیی دوایی کردووە . لە کاتی مردنی‌دا عەمری کوڕی دینار وتوویە : خواناسی ئەم ئوممەتە مرد .

عائیشەش وتوویە : گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ کاتێ هاتە ژوورەوە و ، داوای ئاوی کرد ، کە لە تووڕەییدا ئاوی بەسەر خۆیدا ئەکرد و ئەیفەرموو : (( لا نُصرتُ إن لم أنصر بني كعب )) .

نوێنەرانی خوزاعە بەرەو ناوچەی خۆیان گەڕانەوە ، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بەسەردا دان کە هەموویان پێکەوە نەگەڕێنەوە ، بەڵکو لە چەم و دۆڵەکاندا دابەش بن ، هەر چەندە هەندێکیان تووشی ئەبوسوفیان بوون کە بەرەو مەدینە ئەهات و، هەستی بە شتێ کرد..

بەڵێ ، قوڕەیش پەیمانەکەیان شکاند و ، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە مەککە ڕزگار بکرێ و خەڵکەکەی لە بتپەرستیی ڕزگار بن ، بگرە بووە هۆی ئەوەی هۆزەکانی دوورگەش باوەش بۆ ئیسلام بکەنەوە ، کە ساڵەهای ساڵ بوو چاوەڕوانی ئەنجامی زۆرانبازیی نێوان موسڵمانەکان و قوڕەیش بوون .

بەر لەوەی ئەبوسوفیان بگاتە مەدینە ، پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی دا کە ئەبوسوفیان دێت و هەوڵ ئەدا ماوەی پەیمانەکە درێژ بکرێتەوە .

کە نوێنەرانی خوزاعە لە کاتی گەڕانەوەیاندا بەسەر چەند ڕێگایەکدا دابەش بوون، کۆمەڵێکیان بە ڕاستە ڕێدا ئەڕۆیشتن تووشی ئەبوسوفیان بوون . ئەبوسوفیان ترسی ئەوەی لێ نیشت کە ئەمانە لە شکات گەڕابنەوە ، بۆیە لێی پرسین کە ماوەی چەندە سەردانی یەثریبیان کردووە . وتیان : هیچ هەواڵێکی نازانین .

پاشان پرسیاری لە سەرۆکی دەستەکە کرد ، کە بودەیلی کوڕی ئوم ئەصرەم بوو ، ئایا سەردانی پێغەمبەری کردووە ؟ ئەویش وتی : نەخێر . بەڵکو لە خۆشکردنی خوێنی کوژراوێك گەڕاوەتەوە . ئەبوسوفیانیش هەندێ ستایشی کرد و ، پێکەوە لەوێ خەوی قەیلوولەیان کرد ..

ئەبوسوفیان هێشتا هەر بەگومان بوو کە لە مەدینە گەڕابنەوە . بۆیە پرسیی کە ئایا خورمای یەثریبیان لا نیە دەرخواردی بدەن ، وتیان : نەخێر . کە ئەوان کەوتنە ڕێ ئەبوسوفیان چووە ئەو شوێنەی کە وشترەکانیان مۆڵیان تیا دابوو و ، پشقڵەکانی ورد کردن ئەبینێ کە ناوکە خورمایان تیایە و ، لە شوێنی پیاوەکانیشدا ناوکی خورمای عەجوەی بینیی . بەمە هیوای بە هەوڵەکەی کەم بوویەوە و ، بڕوای نەبوو بتوانێ سەرکەوتن بە دەست بهێنێ . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەرەو مەدینە ڕۆیشت و بڕیاری دا هەوڵی خۆی بدات .

كە گەیشتە مەدینە سەرنجی دا موسڵمانەكان یەكجار داخ لە دڵن بۆ قورەیش ، لەسەر ئەو ناپاكی‌یەی كە دژ بە خوزاعەی بێتاوان ئەنجامیان داوە ؛ بە رادەیەك كە تاقە كەسێك روویەكی خۆشی پێ نەدا ..

كە چووە ناو شارەوە ؛ یەكەم جار چووە لای ئوم حەبیبەی كچی كە یەكێ بوو لە هاوسەرانی پێغەمبەر و دایكانی موسڵمانان ؛ كە ماوەیەكی كەم بوو لە كۆچی حەبەشە گەڕابوویەوە . لەبەر ئەوەی كە كچی بوو چوو بۆ ژوورەكەی ئەو . كە چووە ژوورەوە ویستی لەسەر نوێنەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ دابنیشێت ؛ كەچیی رەملەی كچی خێرا نوێنەكەی پێچایەوە و نەی‌هێشت لەسەری دابنیشێ !

ئوم حەبیبە باوكی خۆش ئەوێ ئەگەرچیی هێشتا موسڵمان نەبووە ، خۆ ئەگەر موسڵمانیش ببێ ؛ ئەوسا وەك پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشی ناوێت ، چونكە ئەم مایەی هیدایەتە و ، هۆی سەرفرازیی قیامەتە . بەڵام باوكی لەسەر بت پەرستیی سوورە و، كە كچەكەی لەو دینە لای داوە ئیتر هیچ حیسابێكی بۆ ناكات .

ئەبوسوفیان پێی ناخۆش بوو كچەكەی نوێنەكەی پێچایەوە ، بۆیە بەوپەڕی ناڕەحەتی‌یەوە پرسیاری لێ كرد كە ئایا حەیفی نوێنەكەی لێ هاتووە ، یان حەیفی ئەمی لێ هاتووە؟

ئەویش بە زمانی پاراوی ئیمانەوە وەڵامی دایەوە كە ئەوە نوێنی پێغەمبەری خوایە ﷺ و ئەویش پیاوێكی موشریكی پیسە و پێی خۆش نیە لەسەر نوێنی ئەو دابنیشێ.

ئەبوسوفیان وتی : بە خوا كچەكەم ! دوای من خراپت بەسەر هاتووە .

وتی : خوا هیدایەتی داوم بۆ سەر ئیسلام . تۆش بابە گیان كە سەردار و گەورەی قورەیشی ئەگەر موسڵمان ببی لێت ئەسەنرێتەوە ؟ تۆ بەردێك ئەپەرستی نە ئەبیستێ و نە ئەبینێ !!

باوكی وتی : ئای كە سەیرە ! تۆش وەها ئەڵێیت ! ئایا ئەوەی كە باوك و باپیرم ئەیانپەرست وازی لێ بهێنم و شوێن دینی موحەممەد بكەوم ؟ پاشان چووە دەرەوە ..

ئێشێكی زۆر بە دڵی ئەبوسوفیان گەیشت .. زۆر ناڕەحەت هەنگاوی بۆ هەڵ ئەگیرا .. دوای ئەوە ناچار بوو هەوڵێكی بێكەڵك بدات ، تا بەشكوم پێغەمبەری خوا ﷺ وت و وێژی لەگەڵدا بكات بۆ بەردەوامبوونی كاریگەریی پەیمانی حودەیبیە.

چونکە ئەوە بکرێ ، وەك ئەوە وەهایە کە چاوپۆشیی لە قورەیش کرابێ و ، لەو تاوانە سەرفراز بووبێ.

ئەبوسوفیان ئەی‌ویست کارەکە لە موسڵمانان بشارێتەوە ؛ بۆیە وەهای دەرئەخست کە لە خۆیەوە هاتووە ، چونکە لە کاتی بەستنی پەیمانی حودەیبییەدا لەوێ ئامادە نەبوو بوو . جا ئەویش وەك سەردارێکی قورەیشیی هاتووە و پێی خۆشە جەخت لەسەر بەردەوامیی پەیمانەکە بکاتەوە .

ئەوەبوو چووە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی : ئەی موحەممەد ! لە کاتی بەستنی پەیمانی حودەیبییەدا من ئامادە نەبووم ؛ جا پەیمانەکە توندتر بکە و ماوەکەشی زیاتر بکە . بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ قسەکەی لێ سەند و فەرمووی:

(( لذلك جئت يا أباسفيان ؟ )) . فەرمووی : بۆ ئەوە هاتووی ؟ وتی : بەڵێ. فەرمووی : (( هل كان من حدث ؟ )) . فەرمووی : ئەی لە ناوتان‌دا هیچ رووی نەداوە؟ ئەبوسوفیان راستیی نەوت و ، بەوپەڕی پرکێشی‌یەوە وتی : پەنا بە خوا ؛ ئێمە لەسەر پەیمان و رێك‌کەوتنی خۆمانین و هیچ ئاڵ و گۆڕێکمان بەسەری‌دا نەهێناوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەرخۆ هەندێ وشەی دا بە گوێی ئەبوسوفیان‌دا کە بۆنی بەڵێنێکیان نەئەدا، بەڵام لەلای ئیبن هیشام وەها هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵامی نەداوەتەوە ..

ئەبوسوفیان بەمەش کۆڵی نەدا ، بەڵکو کەوتە هەوڵی ئەوەی کە هەندێ لە هاوەڵان بکاتە تکاکار ، بە تایبەت کۆچ کەران ، تا بەڵکو پەیمانەکە بەردەوام ببێ ..

یەکەم کەسێك کە ئەبوسوفیان خۆی گەیاندە لای ئەبوبەکری صددیق بوو ، بەڵام ئەبوبەکر ئەی‌زانیی قورەیش چ ناپاکی‌یەکیان ئەنجام داوە ، لەبەر ئەوە ئەبوسوفیانی جواب کرد..

دوای ئەو رووی لە عومەری کوڕی خەططاب نا ، تا بەڵکو ئەو تکای بۆ بکات و ماوەی پەیمانەکە درێژ بکرێتەوە . عومەریش بەوپەڕی تووڕەیی‌یەوە جوابی کرد ..

دوای عومەر رۆیشت بۆ لای عوثمان و دای بە گوێی‌دا کە هیچ کەس ئەوەندەی ئەو خزم و نزیکی نیە ، بە بۆنەی ئەوەوە کە عوثمانیش لە نەوەی ئومەییە بوو ؛ بەڵکو هەوڵی بۆ بدا و پەیمانەکە نوێ بکەنەوە ؛ چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ قسەی ئەو ناداتە دواوە . بەڵام عوثمان بە نەرمیی جوابی کرد ..

دوای عوثمان پەنای بردە لای ئیمام عەلیی و فاطیمەی کچی پێغەمبەری خواﷺ .. چووە لایان و حەسەنی کوڕیان ، کە ئەو کاتە منداڵێکی بچووك بوو ، لەبەر دەستیان‌دا بوو . لە پێشەوە رووی لە ئیمام کرد و بەویشی راگەیاند کە لە هەموو کەسێ زیاتر ئەم خزمیەتی ، بەڵکو هەوڵێکی بۆ بدات و بە دەستی خاڵیی نەگەڕێتەوە.. چەند جارێك ئەمەی دووبارە کردەوە و ، ئیمامیش هەموو جارێ ئەوەی بە گوێی‌دا ئەدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ گەر کارێکی بە دڵ نەبوو کەس بۆی نیە لەو بارەوە بی‌دوێنێ .. دواجار بە ناچاریی روویەکیشی لە فاطیمە کرد تا لای باوکی تکایەکی بۆ بکات . فاطیمەش عوزری بۆ هێنایەوە کە ئەو ئافرەتە ، بەلاّم ئەبوسوفیان دووبارە رووی لێ‌نایەوە و وتی: خوشکەکەت ـ واتە زینەب ـ پەنای ئەبولعاصی مێردی دا و پێغەمبەری خواش ﷺ رێی پێ‌دا . فاطیمە وتی : ئەوە بە دەستی پێغەمبەری خوایە . بۆ سێ‌هەم جار داوای لێ کرد کە بە یەکێ لە کوڕەکانی بڵێ تا پەنای بدەن ، واتە حەسەن و حوسەین . وتی : هەردووکیان منداڵن ناتوانن پەنا بدەن ..

کە ئەبوسوفیان دەستی لە یارمەتیی موهاجیرەکان شۆرد ، ناچار بوو روو بکاتە سەرۆکی خەزرەج سەعدی کوڕی عوبادە ، تا بەڵکو تکایەکی بۆ بکات ، چونکە لە سەردەمی نەفامیی‌دا ئەبوسوفیان و سەعد بەینیان خۆش بوو و ، هەر یەکە لە شاری خۆی‌دا پەنای ئەوی تری ئەدا .. داوای لێ کرد پەنای بدا و ماوەکە زیاد بکاتەوە . کەچیی سەعدیش جوابی کرد و تێی گەیاند کە هیچ موسڵمانێك بێ پرسیی پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ کارێك ئەنجام نادات .

دواجار چووە خزمەتی ئیمام عەلیی تا بەڵکو چارەی دەردی بکات ، کەچیی ئەوەش بێ‌سوود بوو .. ناچار هیچی بۆ نەمایەوە جگە لەوەی بە دەستی بەتاڵ بگەڕێتەوە مەککە و ، هەواڵ بە قورەیش بدات کە با چاوەڕوانی ئەو جەنگە بن کە ئەوان بوونە هۆی هەڵ گیرسانی ..

کە ئەبوسوفیان مەدینەی بەجێ هێشت پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی بە پەڵە هەورێك کرد و فەرمووی : (( إن هذه السحابة لتبضُّ بنصر بني كعب )) . فەرمووی : ئەم هەورە سەرکەوتنی خوزاعەی پێوە دیارە . پاشان فەرمووی : (( أللهم خذ على أبصارهم وأسماعهم فلا يرونا إلا بغتة ولا يسمعوا بنا إلا فجأة )) . فەرمووی : خوایە! چاو و گوێ‌یان ببەستە هەتا نەمان بینن و باسمان نەبیستن تا لە ناکاودا بگەینە لایان.

قورەیش خەمیان لێ هاتبوو کە سوپای ئیسلام مەککە داگیر بکات ؛ لەولاوە ئەبوسوفیان زۆری پێ چوو و نەگەڕایەوە مەککە ، بە رادەیەك کە سەردارانی مەککە لێی بەگومان کەوتن و ، تاوانی موسڵمانبوونیان ئەدایە پاڵی.

کە گەڕایەوە مەککە و چووە ماڵی خۆیانەوە ، هیندی هاوسەری هەواڵی دایە کە قورەیش گومانی موسڵمانبوونی پێ ئەبەن . کە ئەبوسوفیان باسەکەی بۆ گێڕایەوە، هیند تێ گەیشت کە هیچی بۆ قورەیش نەکردووە . لە هەمان کاتدا بە راستەوخۆ هەموو شتێکی دا بە گوێی سەردارانی قورەیشدا و تێی گەیاندن کە ئەو بەردەی نەفامێك ئەیخاتە گۆمێکەوە ؛ بە صەد حەکیم نایەتە دەرەوە..

جا هەروەك ئەبوسوفیان بۆ تازەکردنەوەی پەیمانەکە هیچی بۆ نەکرا ، لە هەمان کاتدا هیچ هەواڵێکی بۆ ساغ نەبوویەوە کە تایا موسڵمانەکان هێرش ئەکەنە سەر مەککە یان نا ..[١٧٤]

**دووەم : بڕیاری رزگار کردنی مەککە**

کە هەواڵی دەستدرێژیی قورەیش و بەکر بە لای پێغەمبەری خواوە ﷺ ساغ بوویەوە ؛ بڕیاری دا کە هێرش بکاتە سەر بت پەرستانی مەککە و تۆڵەی خوزاعەیان لێ بسێنێ . بۆ ئەمە بڕیاری دا زۆر بە نهێنیی ئەو هێرشە ئەنجام بدات ، تا سوپای ئیسلام لە ناکاودا بگاتە مەککە و ، بە کەم ترین زیان کەعبەی پیرۆز لە بتەکان پاك بکاتەوە و ، دەسەڵات لە قورەیشی ستەمکار بسێنێ .

ئەوەبوو کە فەرمانی دا موسڵمانانی مەدینە و هۆزەکانی دەوروبەر خۆیان ئامادەی جەنگ بکەن ، هیچ کەسیان نەیئەزانیی نیازی کوێی هەیە ، بۆیە هەندێ وەهایان ئەزانیی کە بەرەو رۆم هێرش ئەبات و ـ هەندێکیش وەهایان ئەزانیی کە روو لە هەوازین و ثەقیف ئەنێت و ، هەندێکیش وایان ئەزانیی ئەجدی ئەوێ .. جا هەر چەندە مەبەستی کۆکردنەوەی سوپا دیار نەبوو ، سوپای ئیسلام هەر هەمووی جەم بوو . ناردی بۆ بیابان و دەرودەشت و فەرمانی دا : هەرکەس ئیمانی بە خوا و بە رۆژی قیامەت هەیە با لە مانگی رەمەزاندا لە مەدینە ئامادە بێت ..

بەم بانگەوازە موسڵمانەکانی دەوروبەری مەدینە لە هۆزەکانی غیفار[١٧٥] و موزەینە[١٧٦] و ئەشجەع[١٧٧] و جوهەینە[١٧٨] و ئەسلەم خۆیان گەیاندە مەدینە .

---

[١٧٤] فتح مكة لباشميل : ٧١ ـ ١٠٩ .

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا عائیشە کەل و پەلی پێویستی بۆ بپێچێتەوە. لەو کاتەدا ئەبوبەکر هاتە ژوورەوە لای عائیشە و پرسیاری ئەوەی لێ کرد کە ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ نیازی غەزایەکی کردووە ؟ ئەویش وەڵامی دایەوە : نازانم . هەتا عائیشە نەی وێرا باسەکە لای ئەبوبەکری باوکیشی ئاشکرا بکات . کە پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی تەشریفی هاتە ژوورەوە ، ئەبوبەکری ئاگادار کرد و ، فەرمانی دا ئاشکرای نەکات .

جا بۆ ئاگادارکردنی هۆزەکان پێغەمبەری خوا ﷺ دوانزە لە هاوەڵە دڵسۆزەکانی هەڵ بژاردن و ڕەوانەی دەرودەشتی کردن تا هۆزەکان ئاگادار بکەن بۆ کۆکردنەوەی سوپا . ئەو نێرراوانەش ئەمانە بوون :

١ ـ ئەسمائی کوڕی حاریثە ، کە ئەسلەمی یە و یەکێ بووە لە هاوەڵانی ( صُفة ) . دڵسۆزی پێغەمبەری خوا بوو . لە تەمەنی هەشتا ساڵیی دا ، لە سەردەمی موعاویەدا کۆچی دوایی کردووە .. ناردی بۆ سەر هۆزی ئەسلەم .

٢ ـ هیندی کوڕی حاریثە کە برای ئەسما، بوو و هەردووکیان ئامادەی پەیمانی حودەیبیە بوون . بەغەویی ئەوەی باس کردووە کە هیند بە خۆی و حەوت برایەوە بەشداریی پەیمانی ( رضوان ) یان کردووە .. ئەمیشی نارد بۆ سەر هۆزی ئەسلەم.

---

[١٧٥] غیفار : هۆزێکی عەدنانی یە و ، ماوا و مەنزڵیان لە نێوان مەککە و مەدینەدا بووە و ، ئاوی بەدریش لە ناوچەی ئەواندا بووە .

[١٧٦] هۆزێکی موضەریە و ، ناوچەکەیان ئەکەوێتە نێوان مەدینە و وادیلقورا . هۆزی موزەینە هۆزێکی بەڕێز بوون و ، کە ئیسلام هات هیچ دژایەتی یەکیان نەکرد ، هەر چەندە لە مەدینەوە زۆر نزیك بوون ، بەڵکو بە ویستی خۆیان زوو بە زوو موسڵمان بوون .. ئەوەبوو کە ئیسلام هات بتێکیان هەبوو بە ناوی ( نوهم ) شکاندیان و موسڵمان بوون ، ئەمەش پێش فەتحی مەککە . موزەینە بە پیاوە لێ هاتووەکانیانەوە بەشداریی فەتحی مەککەیان کرد کە سوپایەکی هەزار کەسی یان ڕێك خستبوو . هەر ئەم سوپا هەزار کەسی یە بەشداریی جەنگی حونەینیشی کرد . پێغەمبەری خوا ﷺ زۆری خۆش ئەویستن و ستایشی ئەکردن . موسلیم لە ( ج ٧ ص ١٧٨ ) ی صەحیحەکەیدا ریوایەتی کردووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ستایشی ئەنصار و ، موزەینە و ، جوهەینە و ، غیفار و ، نەوەی عەبدوڵلای کردووە و ، بە کۆمەکی خۆی داناون لە قیامەت دا و خوا و پێغەمبەریشی بە کۆمەکی ئەوان داناوە کە فەرموویە :(( الأنصار ، و مزينة ، و جهينة ، و غفار ، ومن كان من بني عبدالله موالي دون الناس ، يوم القيامة ، والله ورسوله مولاهم )) . یەکێ لەو پیاوانەی کە جێی شانازین بۆ موزەینە و خزمەتی ئیسلامیان کردووە ، فەرماندەی سوارچاکی خواناسی خاوەن تەقوا نوعمانی کوڕی موقەررینە ، کە فەرماندەی جەنگی نەهاوەند بوو ، ئەو جەنگەی کە ناونرا ( فتح الفتوح ) و دوای سەرکەوتن فەرماندە خۆی شەهید کرا ..

[١٧٧] ئەشجەع : لقێکە لە هۆزەکانی غەطەفان لە نەجد و ، پێش هەموو هۆزە غەطەفانی یەکانی تر موسڵمان بوو . لە سەردەمی نەفامیی دا هاوپەیمانی خەزرەج بوون و ، لە جەنگی ( بوعاث ) ی مێژوویی دا کۆمەکی یان کردن دژی ئەوس.

[١٧٨] جوهەینەش هۆزێکی قەحطانیی گەورەیە . لە دەوروبەری دەریای سووردا ، لە ناوچەی ( ينبع ) نیشتەجێ بوو بوون.

٣ ـ رافیعی کوڕی موکەیثی جوهەنیی ، کە ناردی بۆ سەر جوهەینە .
٤ ـ جوندوبی کوڕی موکەیث کە برای رافیع بووە ، بۆ سەر جوهەینە .
٥ ـ ئیمائی کوڕی رەحضە ، زوو موسڵمان بووە و ، پێش کۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ مەدینە ، ئەو پێش نوێژیی بۆ خزمەکانی کردووە . ناردی بۆ سەر غیفار و ضیمرە و حوصەین .
٦ ـ ئەبوڕوهم ، کولثوومی کوڕی حوصەین بۆ سەر غیفار و ضیمرە و حوصەین .
٧ ـ مەعقەلی کوڕی سینان ، کە موسڵمانێکی دێرین بووە و ، لە ڕۆژی فەتحی مەککە و جەنگی حونەینیش‌دا هەڵگری ئاڵای هۆزەکەی بووە ، هۆزی ئەشجەع ، بۆ سەر هۆزی ئەشجەع .
٨ ـ نوعەیمی کوڕی مەسعوود بۆ سەر ئەشجەع .
٩ ـ بیلالی کوڕی حاریث ، کە موسڵمانێکی دێرین بووە و ، لە پێش فەتحی مەککەدا نیشتەجێی مەدینە بووە و ، ڕۆژی فەتحی مەککەش هەڵگری ئاڵای موزەینە بووە . نیشتەجێی بەصرە بووە و ، لە ساڵی شەصت و شەشی کۆچیی‌دا و لە تەمەنی هەشتا ساڵیی‌دا کۆچی دوایی کردووە ، بۆ سەر هۆزی موزەینە .
١٠ ـ عەبدوڵڵای کوڕی عەمری موزەنیی ، بۆ سەر موزەینە .
١١ ـ حەججاجی کوڕی عیلاطی سوللەمیی بۆ سەر نەوەی سولەیم ..
١٢ ـ عیرباضی کوڕی ساریە ، کە هاوەڵێکی ناودار بووە و ، فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ ریوایەت کردووە و ، یەکێ بووە لە ئەهلی صوففە و ، دوایی نیشتەجێی حیمص بووە لە شام و ، لە ساڵی حەفتا و پێنجی کۆچیی‌دا کۆچی دوایی کردووە ، بۆ سەر نەوەی سولەیم .

لە هەمان کات‌دا بیشری کوڕی سوفیان و بودەیلی کوڕی وەرقای ناردن بۆ ناو خوزاعە ، تا ئەوانیش خۆیان ئامادە بکەن .

کە پێغەمبەری خوا ﷺ رای هاتە سەر هێرش‌کردنە سەر مەککە ، کۆبوونەوەیەکی بە گەورە هاوەڵانی کرد ، بە تایبەت ئەبوبەکر و عومەر . ئەبوبەکر داوای نەرم و نیانیی کرد و عومەریش داوای کرد بە توندیی لە قوڕەیش بدرێت ، چونکە هەتا قوڕەیش نەرم نەبێت ، پاشماوەی دانیشتوانی دوورگە نەرم نابن و ، مل‌کەچیی بۆ ئیسلام نانوێنن .. سەرەنجام رای عومەر وەرگیرا و ، بڕیار درا هێرش بکرێتە سەر قوڕەیش ، لەسەر ئەوەی کە پەیمانی حودەیبییەی شکاندووە و کۆمەکیی بەکری

کردووه بۆ کوشتنی بیست و سێ پیاوی خوزاعه له ناو مەککه و له نزیك کەعبەدا .. بەڵام هەوڵ درا ئەم هەواڵه بڵاو نەبێتەوه تا قورەیش لێی ئاگادار نەبێ .

ئەوەبوو ده هەزار جەنگاوەر ئامادەی هێرش بردن کران ، بەڵام نەیانئەزانیی بەرەو کوێ ئەڕۆن ، هەتا گەیشتنه ( مر الظهران ) ، ئەوسا لەوێ زانییان بەرەو مەککه ئەڕۆن .

هەتا ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ له سەرەتای مانگی رەمەزانی ساڵی هەشتەمدا سریەیەکی بەرەو خۆرهەڵاتی مەدینه رەوانه کرد ، تا هەڵمەت بەرنه سەر شیوێکی ئەشجەع ، به نیازی ئەوەی خەڵکەکه وەها تێ بگەن که کۆکردنەوەی سوپا بۆ ئەو مەبەستەیه . ئەم سریه به ئاشکرا کەوته رێ و ، کاتێکیش گەڕایەوه سوپای ئیسلام بەرەو مەککه کەوتبووه رێ و ، ئەو سریەیه له ( سقیا ) به سوپا گەیشتەوه .

لەلایەن پێغەمبەری خواوه ﷺ فەرمان بۆ عومەری کوڕی خەططاب دەرچوو تا چاودێریی هەموو ئەو رێگایانه بکات ، که بەرەو مەککه ئەڕۆن و ، هەر کەسێك نەناسراو بێت و گومانی لێ بکرێ ، گلی بدەنەوه و نەهێڵن بەرەو مەککه بڕوا .. بەمە هیچ هەواڵێك به قورەیش نەگەیشت ، هەتا ئەوەبوو سوپای ئیسلام له نزیك شاری مەککه سەربازگەی دروست کرد و ، که پێیان زانیی ماوەی جم و جووڵیان نەما و ، هیچ سوپایەکیان بۆ رێك نەخرا و ، سەرەنجام خۆیان به دەستەوه دا ..

ئەم هەموو هەوڵه درا بۆ ئەوەی قورەیش هەواڵ نەزانێ ، کەچیی خەریك بوو هاوەڵێك له موهاجیرەکان ئەو نەخشەیه تێك بدا و ، قورەیش ئاگادار بکات .. ئەو هاوەڵەش حاطبی کوڕی ئەبوبەلتەعه بوو که موسڵمانێکی دێرین و ئەهلی بەدر بوو و له رۆژی ئوحودیشدا یەکێ بوو له سەربازه دامەزراوەکانی ئیسلام که دەوری پێغەمبەری خوایان چۆڵ نەکرد .

ئەم هاوەڵه ویستی به نهێنیی قورەیش له هەڵمەتی موسڵمانان بۆ سەریان ئاگادار بکات ، دیاره ئەم کارەش ناپاکییه لەگەڵ سوپای ئیسلامدا و ، ناپاکییشه لەگەڵ هەمواندا . چونکه ئاگاداربوونی قورەیش ئەبێته هۆیەك تا قورەیش سوپا جەم بکات و جەنگێکی سەخت و خوێناویی روو بدات و ، له هەردوولا خەڵکێکی زۆر بکوژرێت. بەڵام ئەوەنده هەبوو حاطب زوو موسڵمان بووبوو و ، ئەهلی بەدریش بوو ، ئەگینا لەوانەیه له ملی بدرایه .

حاطەب نامەی بۆ صەفوانی کوڕی ئومەییە و ، سوهەیلی کوڕی عەمر و ، عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل نووسیی و تیایا پێی راگەیاندن کە موسڵمانەکان سوپایان کۆ کردۆتەوە و لەوانەیە نیازی گرتنی مەککەیان هەبێ . بۆ گەیاندنی ئەم نامەیە ئافرەتێکی بە کرێ گرت و ناردی بۆ مەککە و بەڵێنی دینارێك زێڕی دایە گەر بتوانێ بی گەیەنێ بە قورەیش .[١٧٩]

حاطەب داوای لێ کرد نامەکە بە چاکیی بشارێتەوە و لە رێگای سەرەکییشەوە دەرنەچێت ، چونکە پاسەوانی لەسەرە . رۆیشت هەتا گەیشتە ( ذو الحليفة ) کە حەوت میل لە مەدینەوە دوور بوو .

ئەو ئافرەتە نامەکەی وەها داشاردبوو کە هیچ کەسێ نەتوانێ بی دۆزێتەوە . ئەوەبوو لە ژێر پەلکەکانی سەری دا دایشاردبوو .

بەڵام خوای گەورە خۆشەویستی خۆی لەم ناپاکی یە ئاگادار کرد .. وەحی بۆ هات و ئاگادار بوو .. ئەویش عەلیی کوڕی ئەبوطالیب و زوبەیری کوڕی عەووامی خوا لێیان رازیی بێ بانگ کردن و ، فەرمانی بەسەریاندا دا تا فریای ئەو ئافرەتە سیخوڕە بکەون و ، ئەو نامەیەی حاطەبی لێ وەربگرن و نەهێڵن لە دەستیان دەربچێت ..

بە پەلە گەیشتنە لای ئافرەتەکە و وەستاندیان و دایانبەزاند و ، بە وردیی خۆی و ولاغەکەیان پشکنی ، کەچیی نامەکەیان نەدۆزی یەوە . کە پرسیاریشیان لێ کرد هەر ملی با ئەدا .. هەردووکیان سویندیان بەخوا خوارد کە پێغەمبەری خوا ﷺ درۆ ناکات و ، گەر خۆی نامەکە دەر نەخات ، ناچار ئەبن خۆیان بی دۆزنەوە ئەگەر رووتیان کردۆتەوە . کە زانیی کۆڵ نادەن ورەی رووخا و نامەکەی ئاشکرا کرد . ئافرەتەکە داوای لێ کردن کە پشت هەڵ بکەن هەتا سەیری نەکەن . ئەوانیش روویان بەو لاوە کرد و لە نێوان پەلکەکانی دا نامەکەی دەرهێنا و ، هێنایانەوە خزمەتی

---

[١٧٩] ئەو ئافرەتە ناوی سارە بوو و کەنیزەکی ئازادکراوی نەوەی موطەللیبی کوڕی عەبدمەناف بوو . لە مەککەدا گۆرانییبێژ بوو . دوای ماوەیەك دێتە مەدینە و موسڵمان نەبێ و داوای خۆراك ئەکات کە گوایا بێ دەسەڵاتە . پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری ئەوەی لێ ئەکات کە ئاپا بە گۆرانیی وتنەکەی نەئەژیا ؟ ئەڵێت : لەو کاتەوە کە پیاوانی قورەیش لە بەدردا کوژراون وازیان لە گۆرانیی هێناوە . پێغەمبەری خوا ﷺ رەحمی لەگەڵدا بەکار هێنا و وشترێکی لە خۆراك بار کرد بۆی . کەچیی کە گەڕایەوە بۆ ناو قورەیش لە ئیسلام هەڵ گەڕایەوە ، بۆیە ئەویش یەکێ بوو لەوانەی کە رۆژی فەتحی مەککە پێغەمبەری خوا ﷺ خوێنی حەڵاڵ کردن .

پێغەمبەری خوا ﷺ و وازیان لە ئافرەتەکە هێنا . بەمە هەوڵی ئاگادارکردنی قورەیش پووچەڵ بوویەوە ، ئەگینا جەنگێکی خوێناویی رووی ئەدا و لە هەردوولا خەڵك ئەکوژرا .

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ حاطبی بانگ کرد و ، دەربارەی ئەو نامەیە پرسیاری لێ کرد .

لێی پرسیی کە ئایا ئەو نامەیە ئەناسێت ؟ ئەویش دانی پیا نا .

فەرمووی : (( ما حَمَلَكَ على هذا ؟ )) . فەرمووی چیی پاڵی پێوە نای ئەم کارە بکەی؟

وتی : بەخوا من ئیمانم بە خوا و بە پێغەمبەر هەیە و نەگۆڕاوم ، بەڵام من کەس‌وکار و عەشرەتم لە ناو قورەیش‌دا نەبوون و ، ماڵ و منداڵیشم لە ناویان‌دا بوون. ئەوانەش کە لەگەڵت‌دا کۆچیان کردووە خزم و کەس و کاریان لەوێ هەیە و ماڵ و سامانیان بۆ ئەپارێزن . من کەسم نەبوو ، ویستم لەلایان دەستم هەبێ و منداڵەکانی پێ بپارێزم . دوای موسڵمان‌بوونیشم ئەو کارەم بە کافرێتیی نەکردووە و، ئەشم زانیی کە خوای گەورە غەزەبی خۆی ئەنێرێتە سەریان و ، ئەو نامەیەی من هیچ دادێکیان نادات .

لە کاتی لێکۆڵینەوەدا عومەریش ئامادە بوو و ، یەکجار لە حاطەب تووڕە بوو بۆیە وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! لێم گەڕێ با لە گەردنی بدەم ، کابرا بە مونافیق دەرچوو .. بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ رێی پێ نەدا و چاوپۆشیی لێ کرد و فەرمووی: (( إنه قد صدقكم ولا تقولوا له إلا خيراً )) . فەرمووی : لەگەڵتان‌دا راستی کرد، ئێوەش بە چاکە باسی بکەن . پاشان رووی کردە عومەر و فەرمووی : (( وما يدريك يا عمر ! لعل الله قد اطلع إلى أصحاب بدرٍ ، فقال : اعملوا ما شئتم فقد غفرت لكم !! )). فەرمووی : عومەر ! تۆ چووزانی لەوانەیە لە رۆژی بەدردا خوای گەورە رووی لە ئەهلی بەدر کردبێ و فەرمووبێتی چیتان پێ خۆشە بیکەن ، من لێتان خۆش بووم .

ئەوەبوو قورئان ئامۆژگاریی حاطبی وەك ئیمان‌دارێك کرد و سەرەتای سوورەتی ( الممتحنة ) ی ناردە خوارەوە تا پشت‌گیریی دوژمنان نەکەن .

بە دەست خستنی نامەکەی حاطب پارێزگاریی لەو نەخشەیە کرا کە پێغەمبەری خوا ﷺ دایڕێژا بوو بۆ هەڵمەت بردنە سەر قورەیش ، بێ‌ئەوەی قورەیش ئاگادار بێ.

هەتا سوپا گەیشتە قودەید ، کە لە مەککەوە نزیکە ، لەوێ عویەینەی کوڕی حیصن ی فەزاریی ، کە موسڵمان بووبوو ، پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد کە نیازی کوێی هەیە ؟ ئەویش تەنها ئەوەندە وەڵامی دایەوە : (( حیث یشاء الله )) . فەرمووی: بۆ ئەو شوێنەی کە خوا بیەوێ .

کەعبی کوڕی مالیکی سوارچاك و شاعیری ئیسلام هەوڵی دا هەواڵ وەربگرێ ، کەچیی سەرنەکەوت .

مێژوونووسان لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە ژمارەی جەنگاوەرانی سوپای ئیسلام کە هێرش کرایە سەر مەککە لە دە هەزار جەنگاوەر کەمتر نەبوو .. هەتا هەندێکیان وتوویانە کە دوانزە هەزاریش بووە .

بەڵام لە مەدینە دە هەزار جەنگاوەری موسڵمان جەم نەبوو بوون ، چونکە هەندێ هۆز کە موسڵمان بوون مەنزڵیان لە نێوان مەدینە و مەککەدا بوو ، لە ڕێدا بە سوپای ئیسلام گەیشتن .

بەڵێ ، سوپای سەرەکیی مەدینە حەوت هەزار و چوارصەد جەنگاوەر بوو بەم شێوەیەی خوارەوە :

١ ـ ئەنصار ، چوار هەزار جەنگاوەر .

٢ ـ موهاجیرەکان ، حەوت صەد جەنگاوەر .

٣ ـ موزەینە ، هەزار جەنگاوەر .

٤ ـ ئەسلەم ، چوارصەد جەنگاوەر .

٥ ـ جوهەینە ، هەشت صەد جەنگاوەر .

٦ ـ نەوەی کەعبی کوڕی عەمر ، کە بنامەڵەیەکی خوزاعە بوون ، پێنج صەد جەنگاوەر . بەڵام واقیدیی ڕای وەهایە کە نەوەی کەعب لە ڕێدا بە سوپای ئیسلام گەیشتوون .

پاشماوەی سوپا لەو هۆزانە پێك هات کە یەك لە دوای یەك بە سوپای ئیسلام ئەگەیشتن . یەکێ لەو هۆزانە هۆزی سولەیم بوو کە سوپایەکی هەزار کەسییان پێك هێنابوو و ، لە قودەید بەموسڵمانەکان گەیشتن ، هەروەها هۆزی غیفار و ئەشجەع .

مێژوونووسان سەرژمێریی ئەسپ سوارانی سوپای ئیسلامیان بە دوو هەزار و هەشتا ئەسپ سوار کردووە ، بەم شێوەیە :

١ ـ نەوەی سولەیم ، هەزار ئەسپ سوار .

٢ ـ ئەنصار ، پێنج صەد ئەسپ سوار .

٣ ـ موهاجیرەکان ، سێ صەد ئەسپ سوار .

٤ ـ موزەینە ، صەد ئەسپ سوار .

٥ ـ جوهەینە ، پەنجا ئەسپ سوار .

٦ ـ هۆزی تر ، صەد ئەسپ سوار .

٧ ـ ئەسلەم ، سیی ئەسپ سوار .

لە هەمان کات‌دا وشترگەلێکی زۆریان پێ بوو بۆ بار هەڵ گرتن ، بەلاَم ژمارەیان دیاری نەکراوە .. هەروەها چەکی خۆ پارێزیی وەك قەڵغان ئاماژەی بۆ نەکراوە ، جگە لەوەی کە واقیدیی باسی کردووە کە هۆزی موزەینە صەد قەڵغانیان پێ بووە .

دوای رێكخستنی سوپا و دیاریی‌کردنی کاتی دەرچوون ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا ئیبن ئوم مەکتوومی نابینا ببێتە ئەمیری مەدینە ، تا لەم غەزایە ئەبێتەوە . بەلاَم طبەریی وتوویە ئەبوڕەهم ، کولثوومی کوڕی حوصەینی غیفاریی بە ئەمیری مەدینە داناوە .[١٨٠]

**سێهەم : بە ڕێ کەوتنی موسڵمانان بەرەو مەککە**

لە سەرەتای مانگی ڕەمەزان‌دا دەست بە کۆکردنەوەی سوپا کرا تا مەککەی پیرۆز فەتح بکرێ و ، لە بتەکان پاك بکرێتەوە و ، گەورەترین قەلاَی بت پەرستیی بڕمێنرێ و ، دوای ئەو ئیتر هیچ هێزێکی دوورگە نەی‌توانی لەگەڵ موسڵمانەکان‌دا بجەنگێ ، جگە لە هۆزی هەوازین کە لە دۆڵی حونەین‌دا و لەساڵی هەشتەم‌دا لەگەڵ سوپای ئیسلام‌دا جەنگا ..

ئەوەبوو سوپای سەرەکیی موسڵمانان لە دەی مانگی ڕەمەزانی ساڵی هەشتەم‌دا لە مەدینە دەرچوو و ، لە ڕێگاش‌دا هۆزەکان پێیان گەیشتن کە دواهۆز هۆزی سولەیم بوو، کە بە سوپایەکی هەزار کەسی‌یەوە و ، بە سەرکردایەتیی عەبباسی کوڕی میرداسی سوللەمیی[١٨١] لە قودەید هاتنە کۆمەکی‌یان .

---

[١٨٠] فتح مكة لباشميل : ١١٣ ـ ١٣٥ .

[١٨١] عەبباسی کوڕی میرداس ، سوارچاك و شاعیری هۆزەکەی بووە . کوڕی خەنسای شاعیری بەناوبانگە .. پێش فەتحی مەککە موسڵمان بووە و ، نازناوی سوارچاکی عوبەیدیان لێ ناوە ، کە عوبەید ناوی ئەسپەکەی بووە . پیاوێکی دەوارنشین بووە و حەزی لە ژیانی شار نەکردووە ، بۆیە هەر کە بەشداریی غەزایەکی لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ بکردایە، دوای لێ بوونەوەی بە پەلە ئەگەڕایەوە بیابان . بەلاَم زۆر ژیر و دانا بووە و ، بە یەکێ لە دانا دەگمەنەکانی عەرەب ئەژمێررێ و لە سەردەمی نەفامیی‌ش‌دا عەرەقی لەسەر خۆی حەرام کرد بوو . لە سەردەمی خەلیفە عومەردا کۆچی دوایی کردووە .

سوپای ئیسلام کە گەیشتە قودەید ، کە مەنزڵی خوزاعـەی دۆسـت و هاوپـەیمانی موسڵمانان بوو ، لەوێ سوپا ڕێك و پێك کرا و ، کەتیبە کەتیبە بـەش کـرا و ، ئـالاّ دابەش کران و ، فەرماندایەتیی کەتیبەکان بە فەرماندەکانیان سپێررا ..

هەر کە پێغەمبەری خوا ﷺ و سوپای ئیسلام لە مەدینە دەرچوون ماوەی دا هـەر موسڵمانێك پێی خۆشە بەڕۆژوو بێت با بەڕۆژوو بێت و ، هـەر کەسـیش پێـی خۆشـە بـەڕۆژوو نـەبێت بـا ڕۆژووەکـەی بشـکێنێ ، بـەلاّم خـۆی بـەڕۆژوو بـوو ، هەتـا گـەیشـتـنە ( مرالظهـران ) کە نزیکی مەککە بوو و ، فەرمانی بەسەر سوپادا دا تـا بـەڕۆژوو نـەبن، بـە شـێوەیەك کـە هـەر کـەس بـەڕۆژوو بێـت ، ئـەوە لـە خـوا و پێغەمبەرەکەی یاخیی بووە.

هەر لە مەدینەوە پێغەمبەری خوا ﷺ زوبەیری کوڕی عەووامی کـردە فەرمانـدەی دووصەد موسڵمانی ئەسپسوار تا بکەونە پێش سوپای ئیسـلام و ، ببنـە چاوسـاغی سوپا ، هەتا ئەگەنە مەککە ..

لە باسەکانی پێشەوە زۆر جار ئەهاتینە سـەر باسـی عویەینـەی کـوڕی حیصـنی سەرداری غەطەفان و ، دژایەتیی کردنی موسڵمانان ، بە تایبەت لە جەنگی ئـەحزاب و غەزای خەیبەردا .. چونکە غـەطـەفـان هـۆزێکی بـەهێزی دڕ بـوون و چـەند جـار هەوڵیان ئەدا هێرش بکەنە سەر مەدینە . عویەینە کە دیتی وا موسڵمانەکان بـەهێز بوون و ، زۆرێك لە غەطەفانیش موسڵمان بوون ، وای بە چـاك زانیـی کـە موسـڵمان ببێ. بەلاّم لە کاتی کۆکردنەوەی سوپادا پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لە هۆزی غەطەفان نەکرد سوپا کۆبکەنەوە ، جگە لە بنەماڵەیەکیان کە هۆزی ئەشجەع بوون ، ئەویش بە بۆنەی ئەوەوە کە پیاوی ناوداری وەك نوعەیمی کـوڕی مەسـعوود و مەعقـەلی کـوڕی سینان لە ئەشجەع بوون و ، ئەوانی ناردن بۆ کۆکردنەوەی سوپا ..

کە عویەینە هەواڵی هێرشی موسڵمانانی بیست ، خێرا بـەرەو مەدینـە هـات تـا بکەوێتە گەل سوپای ئیسلام ، بەلاّم دوو ڕۆژ دوای دەرچوونی سوپا گەیشـتە مەدینـە و، فریا نەکەوت . بە پەلە بە ڕێگای کورتدا ڕۆیشت هـەتا گەیشـتە ( عـرج ) بـەر لەوەی موسڵمانان بگەن . لەوێ لەگەڵ چەند پیاوێکی غەطەفاندا چاوەڕوانیی کرد تـا گەیشتن. لەوێ عوزری هێنایەوە کە ئاگادار نەبووە تا سوپا کۆبکاتەوە . جا هەرچەندە عویەینە ئەعرابییەکی وشك و زبر بوو ، لە هەمان کاتدا جەنگاوەرێکی هەڵبـژاردە

بوو ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ خۆیدا بردی و ، کردیشیە ئەندامێکی ئەرکانی جەنگی خۆی ، ئەمەش لەبەر قازانجی ئیسلام .

هەروەها لە ڕێگادا ئەقرەعی کوڕی حابیسی [١٨٢] سەرداری تەمیم بە موسڵمانەکان گەیشت ؛ چونکە تەمیمیش وەك غەطەفان داوای کۆکردنەوەی سوپایان لێ نەکرابوو ، چونکە تەمیم هەر هەموویان موسڵمان نەبووبوون . ئەوەبوو لە ساڵی نۆهەمدا نوێنەریان هاتە مەدینە و لەوێ موسڵمانبوونی خۆیان ئاشکرا کرد .. پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویشی کردە ئەندامی ئەرکانی جەنگ و ، کاتێکیش کە چووە ناو شاری مەککەوە لە ناوەڕاستی ئەو دوانەدا بوو .

سوپای ئیسلام لەسەر ڕەوتی خۆی بەردەوام بوو و ، نەیئەهێشت هیچ کەسێك بەرەو مەککە بڕوا تا هەواڵ بە قورەیش نەگات .

شایانی باسە کە ئەبوسوفیانی کوڕی حاریثی کوڕی عەبدولموطەللیب ؛ کە ئامۆزای پێغەمبەری خوا بوو و ؛ برای شیرییشی بوو چونکە حەلیمە شیری بەویش دابوو ، لە هەموو کەسێ زیاتر دژایەتیی ئیسلامی ئەکرد . ئەبوسوفیان شاعیرێکی بلیمەت بوو کە بۆ ماوەی بیست ساڵ هێرشی ئەکردە سەر پێغەمبەر و هاوەڵانی . بە منداڵیی هاوەڵی خۆشەویستی ئازیز بوو ، بەڵام کە وەحیی بۆ هات کەوتە دژایەتیی و ، ئەویش وەك ئەبولەهەبی مامی نەچووە شیوی ئەبوطالیب ، کاتێ کە قورەیش گەمارووی ئابووریی خستە سەر موسڵمانەکان ؛ بگرە لە هەموو هەڵوێستێکی خوار و خێچی قورەیشدا دژی موسڵمانەکان ئەو بەشدار بوو .

هەر ئەم ئامۆزایەی بوو کە بیانووی پێ ئەگرت و داوای شتی سەیری کرد تا خوا بۆ پێغەمبەری بکات ، وەك سەرکەوتنی بە ئاسماندا و خانوویەکی لە ( زخرف ) دروست کراوی هەبێ و ، ڕووبار لە دوورگەدا هەڵ بقوڵێنێ .. تا ئەوەبوو ئەم ئایەتە پیرۆزانە هاتنە خوارەوە :

---

[١٨٢] ئەقرەعی کوڕی عوقالی تەمیمیی ، هاوەڵە و ، لە سەردارانی عەرەبی سەردەمی نەفامیی بووە . لەگەڵ نوێنەرانی نەوەی ( دارم ) ی سەر بە هۆزی تەمیم هاتوونەتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و موسڵمان بوون . ئەقرەع بەشداریی حونەین و فەتحی مەککە و جەنگی طائیفی کردووە . لە مەدینە نیشتەجێ بووە . یەکێ بووە لە ( المؤلفة قلوبهم ) . لە سەردەمی خەلیفە ئەبوبەکردا کۆچی بۆ ( دومة الجندل ) کردووە و ، لە زۆربەی جەنگەکانی خالیدی کوڕی وەلیددا بەشداریی کردووە ، هەتا جەنگی یەمامەش . ئەمیش یەکێ بووە لە حەکیمە عەرەبەکانی سەردەمی نەفامیی کە عەرەقی لە خۆی حەرام کردبوو . لە ( جوزجان ) شەهید بووە .

﴿ وَقَالُوا لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفْجُرَ لَنَا مِنَ الْأَرْضِ يَنبُوعًا ۝ أَوْ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَعِنَبٍ فَتُفَجِّرَ الْأَنْهَارَ خِلَالَهَا تَفْجِيرًا ۝ أَوْ تُسْقِطَ السَّمَاءَ كَمَا زَعَمْتَ عَلَيْنَا كِسَفًا أَوْ تَأْتِيَ بِاللَّهِ وَالْمَلَائِكَةِ قَبِيلًا ۝ أَوْ يَكُونَ لَكَ بَيْتٌ مِّن زُخْرُفٍ أَوْ تَرْقَىٰ فِي السَّمَاءِ وَلَن نُّؤْمِنَ لِرُقِيِّكَ حَتَّىٰ تُنَزِّلَ عَلَيْنَا كِتَابًا نَّقْرَؤُهُ ۗ قُلْ سُبْحَانَ رَبِّي هَلْ كُنتُ إِلَّا بَشَرًا رَّسُولًا ﴾ ( الإسراء : ٩٠ ـ ٩٣ ) .

ئەبوسوفیانی کوڕی حاریشیش یەکێ بوو لەوانەی کە خوێنی حەلاڵ کرابوو . جا کە دیتی وا دینی ئامۆزاکەی لە پەرەسەندنایە و ، دەست بەسەرا گرتنی مەککە لەلایەن سوپای ئیسلامەوە درەنگ و زوویی کەوتووە ، بڕیاری دا مەککە بەجێ بهێڵێ و خۆی بگەیەنێتە لای پادشای رۆم .

بەڵێ ، بەر لەوەی سوپای ئیسلام روو لە مەککە بکات ئەو خۆی گەیاندە لای قەیسەری رۆم ، کە پرسیی : تۆ کێیت ؟ وتی : من ئەبوسوفیانی کوڕی حاریثی کوڕی عەبدولموطەللیبم . هیرەقل وتی : کەواتە تۆ ئامۆزای موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای ، ئەگەر بە راستت بێ ؟

ئەڵێت : بەڵێ .

ئا لەو کاتەدا خۆشەویستیی ئیسلام ئەچێتە دڵیەوە و ، بۆیشی دەرئەکەوێ کە ئەو لەسەر رێبازی چەوت بووە و ، شوێن کۆمەڵێکی مێشک بەستووی دواکەوتوو کەوتووە.

پاشان ئەگەڕێتەوە مەککە و ، بۆی دەرئەکەوێ کە پێغەمبەری خوا خوێنی ئەویشی حەلاڵ کردووە و ، لە هەر کوێ موسڵمانەکان دەستگیری بکەن ئەی کوژن. بەڵام ئەبوسوفیان بڕیاری دا بچێتە خزمەتی موحەممەدی ئامۆزای و داوای لێ بووردنی لێ بکات ، چونکە هەر لە وڵاتی رۆم بڕیاری داوە موسڵمان ببێ .

لە هەمان کاتدا عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوئومەییە [١٨٣] دۆستی ئەبوسوفیانی کوڕی حاریث بوو و ، ئەویش دژایەتیی زۆری ئەکرد . ئەوەبوو هەردووکیان لەسەر ئەو رێ

---

[١٨٣] عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوئومەییەی کوڕی موغیرە ، ئامۆزای خالیدی کوڕی وەلید و ، کوڕی عاتیکەی کچی عەبدولموطەللیبی پووری پێغەمبەر و ، برای ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەر ﷺ بووە . ئەویش دژایەتیی زۆری ئەکرد. ساڵی فەتحی مەککە موسڵمان بووە . بەشداریی فەتحی مەککە و حونەینی کردووە و ، موسڵمانێکی دامەزراو بووە . لە ساڵی هەشتەمی کۆچییدا و لە ئابلۆوقەی طائیف شەهید بووە .

کەوتن کە هەل بە دەست بهێنن و بچنە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ، بەڵکو چاوپۆشی یان لێ بکات . سەرەتا نەیویست بیانبینێ ، بەڵام ئوم سەلەمەی خێزانی بۆیان پاڕایەوە تا چاوپۆشی یان لێ بکات ، چونکە بۆ موسڵمانبوون هاتوون و ، با بەدبەخت نەبن . بەمە ئومسەلەمە هەوڵێکی زۆری دا کەچیی بێهوودە بوو . کە هەواڵیان زانیی وا چاوپۆشییان لێ ناکرێت ، ئەبوسوفیانی کوڕی حاریث کە کوڕەکەیشی لەگەڵیدا بوو وتی : بەخوا یا وەرم ئەگرێت ، یان دەستی کوڕەکەم ئەگرم و سەری خۆم هەڵ ئەگرم هەتا لە برسێتیی و تینوێتییدا تیا بچم . تۆیش ( مەبەستی لە پێغەمبەری خوایە ) لە هەموو کەسێك بە حیلمتر و بەڕێزتری سەرەڕای خزمایەتییمان . کە ئەم قسەیە گەیشتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ بەزەیی پیا هاتەوە .

هەروەها عەبدوڵلاش پاڕایەوە کە بۆ تەصدیقی دینەکەی هاتووە و ، ئوم سەلەمەی خوشکیشی تکایەکی زۆری بۆ کرد ، سەرەنجام دڵی ئازیز نەرم بوو و ، ئەوانیش هاتنە ژوورەوە و موسڵمان بوون . دوای ئەوە ئەبوسوفیان شیعرێکی زۆر نایابی وت.

لەلایەکی ترەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دەرکرد تا موسڵمانان دەست لە ئەبوسوفیانی کوڕی حەربی سەرکردەی باڵای قورەیش بپارێزن و ، نەیکوژن ، چونکە پیاوێکی ژیر و بەسەلیقە بوو و ، بە وێنەی سەرداره قورەیشی یەکانی تر دژایەتیی ئیسلامی نەئەکرد . بۆ نموونە پێی خۆش نەبوو جەنگی بەدر روو بدات و ، پێیشی ناخۆش بوو قورەیش ناپاکیی دەرهەق بە خوزاعە بکات . هەروەها پێش کۆچکردن نە بە دەست و نە بە زمان دژایەتیی پێغەمبەری خوای ﷺ نەئەکرد ..

لە پێشەوە باسی ئەوەمان کرد کە بەشی سەرەکیی سوپای مەدینە (٧٤٠٠ ) جەنگاوەر بوو و ، پاشماوەکەی لە ڕێگا پەیوەندیی بە موسڵمانانەوە کرد .

یەکەم هێزێك کە پەیوەندیی کرد ، هۆزی غیفار بوو ، چونکە لە مەدینەوە نزیك بوون . ئەوەبوو لە دوای شەصت میل ڕێگا سێ صەد جەنگاوەری غیفاریی بە سەرکردایەتیی ئەبوذەرری غیفاریی بە سوپای موسڵمانان گەیشتن .. ئەم جەنگاوەرانە ئەبوڕەهم ، کولثوومی کوڕی حوصەین و ئیمائی کوڕی ڕەحضە کۆیان کردبوونەوە.

هۆزی ئەشجەعیش ، کە یەکێ لە چوار باڵەکەی هۆزی غەطەفان بوون کاتێك هاتنە سەر مەدینە لە جەنگی ئەحزابدا ، دوای موسڵمانبوونی نوعەیمی کوڕی مەسعوود ، بەشێکیان لێ موسڵمان بوون . ئەوەبوو سێصەد جەنگاوەریان بە

سەرکردایەتیی مەعقەلی کوڕی سینان و نوعەیمی کوڕی مەسعوود بوونە کۆمەکی سوپای ئیسلام.

هەروەها بە سەرکردایەتیی ئەبوواقیدی لەیثیی [184] لە هەردوو هۆزی نەوەی سەعد و نەوەی ضەمرەی کوڕی بەکر دووصەد جەنگاوەری موسڵمانیان بوونە کۆمەکی سوپای ئیسلام . شایانی باسە کە نەفامانی ئەم دوو هۆزە بوون پەیمانی حودەیبییەیان شکاند.

هەروەها لە نەوەی لەیثی کوڕی سەعدی بەکرییش ، لە نزیك مەککەوە ، دووصەد و پەنجا جەنگاوەر ، بە سەرکردایەتیی صەعبی کوڕی جوثامە ، [185] هاتنە کۆمەکیی سوپای ئیسلام .

هەروەها لە نەوەی کەعبی کوڕی عەمر ، لە هۆزی خوزاعە بە سەرکردایەتیی بوسری کوڕی سوفیان پێنج صەد جەنگاوەر لە قودەید بە موسڵمانەکان گەیشتنەوە.

بەڵام بەهێزترین سوپا و کۆمەك کە بە موسڵمانەکان گەیشتەوە سوپای نەوەی سولەیم بوو ، بە سەرکردایەتیی سەردار و شاعیر و حەکیمیان عەبباسی کوڕی میرداس، کە هەزار جەنگاوەری ئەسپ سوار بوون و پیادەیەکیان لەگەڵ دا نەبوو . شایانی باسە کە کۆبوونەوەی ئەم سوپایە بە هۆی حەججاجی کوڕی عیلاط و عیرباضی کوڕی ساریە بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ ناردنی بۆ ناو نەوەی سولەیم .

نەوەی سولەیم هەر وەك هەموویان ئەسپ سوار بوون لە هەمان کات دا بە زرێ خۆیان داپۆشیی بوو و ، رمەکانیان بەرزکردبوونەوە . کاتێك کە نزیکی سوپای موسڵمانان بوونەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەرکانی جەنگ و فەرماندەکانی سوپای وەستاند تا چاویان لە رەوتی سوپای چەکداری بەهێزی نەوەی سولەیم بێت . ئەوانیش

---

[184] ناوی عەوفی کوڕی حاریثی کوڕی ئوسەیدی بەکری یە . زوو بە زوو موسڵمان بووە ، بەڵام لەبەر منداڵیی بەشداریی بەدری نەکردووە . لە رۆژی فەتح و حونەین دا هەڵ گری یەکێ لە ئاڵاکانی نەوەی لەیث بوو . بۆ غەزای تەبووکیش لە نەوەی لەیث سوپای بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ جەم کرد . بەشداریی جەنگی یەرمووکی کردووە . لە تەمەنی حەفتا و پێنج ساڵیی دا و لە ساڵی شەصت و هەشتی کۆچیی دا لە مەککە کۆچی دوایی کردووە و ، هەر لە مەککەدا لە قەبرستانی موهاجیران دا نێژراوە ..

[185] صەعبی کوڕی جوثامە هاوپەیمانی قورەیش بووە و ، فاخیتەی دایکی خوشکی ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب بووە . پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ عەوفی کوڕی مالیك دا کردنیە برا . صەعبیش یەکێ بووە لە موسڵمانە دێرینەکان. سوارچاکێکی لێهاتوو بووە . لە کاتی تێك شکانی موسڵمانان دا لە حونەین ئەو بە دامەزراویی ماوەتەوە و ، پێغەمبەری خوایش ﷺ ئەوە دەرئەبرێ کە صەعب دەوری کاریگەری هەبووە لە رۆژی حونەین دا بەشداریی فەتحی وڵاتی فارسی کردووە، بە تایبەت فەتحی شاری ( أصطخر ) لەسەر کەناری خۆرهەڵاتی کەنداو . فەرموودەی صەحیحیشی گێڕاوەتەوە . لە کۆتایی سەردەمی فاروق دا کۆچی دوایی کردووە .

هەر هەموویان بە سواریی ئەسپەکانیانەوە بە چەند ریزێك لەبەردەم پێغەمبەری خوادا وەستاون.

ئەم سوپا رێك و پێکە داوایان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد کە چیی پێ خۆشە فەرمانیان پێ بدات ، چونکە ئەوان خاڵوانی ئەون ، بەوەی کە دایکی هاشم عاتیکەی کچی موڕڕەی کوڕی هیلالە و لە نەوەی سولەیمە . ئەویش فەرمانی دا ببنە پێشەنگی سوپای ئیسلام .[186]

**چوارەم : دابەش‌کردنی سوپا و دیاریی‌کردنی فەرماندەکان**

پێغەمبەری خوا ﷺ وای بە چاك زانیی کە لە قودەید سوپاکەی بە شێوەی کەتیبە دابەش بکات و ، فەرماندەکان دیاریی بکات و ، هەر کەسە ئاڵای خۆی بداتە دەستی. ئەمەش دوای ئەوەی کە دە هەزار جەنگاوەر خۆیان ئامادە کرد ..

دابەش‌کردنی سوپا بە پێی هۆزەکان بوو و ، یەکێ لە پاڵەوانانی ئەو هۆزەش ئەکرایە فەرماندە . بەمە زۆر و کەمیی جەنگاوەری کەتیبەکان بە پێی زۆر و کەمیی جەنگاوەری هۆزەکان بوو .

گەورەترین بەشی سوپای ئیسلام ئەنصار بوون کە چوار هەزار جەنگاوەریان ئامادە کردبوو و ، لە دوو هۆزی ئەوس و خەزرەج[187] پێك هاتبوون . پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنصاری کردە دوانزە کەتیبە و ، دوانزە فەرماندەشی بۆ دیاریی کردن .

ئەمانەش کەتیبەکانی ئەوسن :

١ ـ نەوەی عەبدولئەشهەل ، بە فەرماندایەتیی ئەبونائیلە .[188]

٢ ـ نەوەی ظەفەر ، بە فەرماندایەتیی قەتادەی کوڕی نوعمان .

٣ ـ نەوەی حاریثە ، بە فەرماندایەتیی ئەبوبوردەی کوڕی نیار .[189]

---

[186] فتح مكة لباشميل : ١٣٥ ـ ١٥٦ .

[187] ئەوس و خەزرەج دوو برا بوون و باپیری ئەنصار بوون . هەردووکیان کوڕی حاریثەی کوڕی ثەعلەبەی کوڕی عەمر مزیقیای کوڕی ماء السماء بوون . ئەو دوو هۆزە خاوەنی ئازایەتیی و غیرەت بوون و ، بەناوبانگ‌ترین جەنگاوەری عەرەب بوون . دوای رووخانی بەندی مەئرەب ، لە سەرەتای صەدەی یەکەمی زایینیدا لە ناوچەی مەئرەبەوە کۆچیان بۆ ناوچەی یەثریب کرد و ، دەسەڵاتیان لە جوولەکە سەند ، ئەمەش پێش هاتنی ئیسلام بە چەند صەدەیەك . کە ئیسلام هات ئەوس و خەزرەج بوونە گەورەترین پاڵپشت بۆی و ، کۆمەکی پێغەمبەری خوا بوون لە هەموو جەنگەکانیدا . خوای گەورە لە قورئاندا بە ( أنصار ) ناوی هێناون.

[188] ئەبونائیلە ناوی سلکانی کوڕی سەلامەی کوڕی وەقش بووە . پاڵەوانێکی چاونەترس بووە . کەعبی کوڕی ئەشرەفی جوولەکە بە دەستی ئەو کوژرا . ئەبونائیلە بەشداریی ئوحود و بە دواوەی کردووە . شاعیرێکی بلیمەت و تیرهاوێژێکی لێهاتوو بووە .

٤ ـ نەوەی موعاویەی کوڕی مالیك ، بە فەرماندایەتیی جەبری کوڕی عەتیك.[١٩٠]

٥ ـ نەوەی خەطمە ، بە فەرماندایەتیی ئەبولوبابەی کوڕی عەبدولمونذیر .[١٩١]

٦ ـ نەوەی ئومەییەی کوڕی عەوف، بە فەرماندایەتیی ( مبیض ) یان ( نبیض ).

ئەمانەش کەتیبەکانی خەزرەجن :

١ ـ نەوەی ساعیدە ، بە فەرماندایەتیی ئەبوئوسەیدی ساعیدیی .[١٩٢]

٢ ـ نەوەی حاریث ، بە فەرماندایەتیی عەبدوڵڵای کوڕی زەید .[١٩٣]

٣ ـ نەوەی سەلیمە ، بە فەرماندایەتیی قوطبەی کوڕی عامیر .[١٩٤]

٤ ـ نەوەی مالیکی کوڕی نەججار ، بە فەرماندایەتیی عیمارەی کوڕی حەزم .[١٩٥]

٥ ـ نەوەی مازن ، بە فەرماندایەتیی سولەیطی کوڕی قەیس .[١٩٦]

٦ ـ نەوەی دینار ، بەڵام ناوی فەرماندەکەیان دیاریی نەکراوە .

بەڵام سوپای موهاجیرەکان کە حەوت صەد جەنگاوەر بوو و ، بەشی زۆریشیان قوڕەیشیی نەبوون ، بەڵکو لە هۆزە عەرەبە عەدنانیی و قەحطانیی‌یەکان بوون ، کرایە سێ کەتیبە و ، فەرماندایەتی‌یان بەم سێ موسڵمانە دێرینە قوڕەیشی‌یە سپێررا :

---

[١٨٩] ناوی ( هانيء ) ە و ، بەشداریی پەیمانی عەقەبە و جەنگی بەدر و بە دواوەی کردووە . خاڵۆی بەرائی کوڕی عازیبە . ساڵی چل و پێنجی کۆچیی کۆچی دوایی کردووە .

[١٩٠] جەبری کوڕی عەتیك بەشداریی بەدری کردووە و ، لە ساڵی حەفتا و یەکی کۆچیی‌دا کۆچی دوایی کردووە .

[١٩١] ئەبولوبابە ناوی ریفاعەیە و ، بەشداریی پەیمانی عەقەبەی کردووە و ، یەکێ بووە لە دوانزە نەقیبەکەی ئەنصار . بە بەدریی لە قەڵەم ئەدرێ ئەگەرچیی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ( الروحاء ) گێڕایەوە دوا بۆ مەدینە . لە جەنگی نەوەی قورەیظەدا چیرۆکی ناپاکیی لە دەست دەرچوونی ئەبولوبابەمان باس کردووە ، کە سەرەنجام خوای گەورە چاوپۆشیی لێ ئەکات . لە سەردەمی خەلافەتی ئیمام عەلیی‌دا کۆچی دوایی کردووە .

[١٩٢] ناوی مالیکی کوڕی رەبیعەیە و ، بەشداریی بەدر و ئوحود و لەوە و دوای کردووە . لە نزیکەی هەشتا ساڵیی‌دا لە ساڵی شەصتی کۆچیی‌دا کۆچی دوایی کردووە .

[١٩٣] عەبدوڵڵای کوڕی زەید ، ئامادەی پەیمانی عەقەبە بووە و بەشداریی بەدریشی کردووە . حاکم وتوویە : لە ئوحوددا شەهید بووە . لە ( حلیە ) دا هاتووە کە کچەکەی عەبدوڵڵای کوڕی زەید ئەچێتە خزمەتی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز و ، ئەڵێ : من کچی عەبدوڵڵای کوڕی زەیدم . باوکم بەشداریی بەدری کردووە و لە ئوحودیش‌دا شەهید بووە . ئەویش وتی : چیت پێ خۆشە داوام لێ بکە . ئەوەبوو دیاریی دایە .

[١٩٤] قوطبەی کوڕی عامیر ، یەکێکە لە موسڵمانە دێرینەکان و ، یەکێکە لەو شەش کەسەی کە پێشەنگی پیرۆز بوون و، یەکەم جار لە مینا و سێ ساڵ پێش کۆچ کردن لەسەر دەستی پێغەمبەری خوادا ﷺ موسڵمان بوون .

[١٩٥] بەشداریی پەیمانی عەقەبە و بەدر و هەموو رووداوەکانی لە خزمەتی پێغەمبەردا کردووە . لەگەڵ ( محرز ) ی کوڕی ( نضلة ) کرانە برا .. یەکێك بووە لە پاڵەوانەکانی جەنگی یەمامە و ، هەر لەوێش لە ژێر فەرماندایەتیی خالیدی کوڕی وەلیددا شەهید بووە .

[١٩٦] سولەیطی کوڕی قەیس یەکێکە لە موسڵمانە دێرینەکان ، لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ ئامادەی بەدر و هەموو رووداوەکانی تر بووە . بەشداریی جەنگی عیراقی کردووە و ، لە ژێر فەرماندایەتیی ئەبوعوبەیدی ثەقەفیی‌دا لە جەنگی جیسردا شەهید بووە .

١ ـ عەلیی کوڕی ئەبوطالیب .

٢ ـ زوبەیری کوڕی عەووام .

٣ ـ سەعدی کوڕی ئەبووەققاص ، کە هەرسێکیان لە دە کەسە مژدە پێدراوەکەی بەهەشتن.

سوپای هۆزی موزەینەش کە هەزار جەنگاوەر ئەبوو ، کرایە سێ کەتیبە و ئەم سێ پیاوە موزەنی‌یە کرانە فەرماندەیان :

١ ـ نوعمانی کوڕی موقەڕڕەن .[197]

٢ ـ بیلالی کوڕی حاریث .

٣ ـ عەبدوڵلای کوڕی عەمر .

سوپای هۆزی جوهەینەش کە بریتیی بوو لە هەشت صەد جەنگاوەر ، کرایە چوار کەتیبە و چوار فەرمانده‌ی لە ڕۆڵەکانی جوهەینەیان بۆ هەڵبژێرران کە ئەمانە بوون :

١ ـ سوەیدی کوڕی صەخر .[198]

٢ ـ رافیعی کوڕی موکەیث .

٣ ـ ئەبوزەرعە ، مەعبەدی کوڕی خالید .

٤ ـ عەبدوڵلای کوڕی بەدر .[199]

سوپای سولەیم یش کە بریتیی بوو لە هەزار سوارچاکی چەکداری لێهاتوو ، کرایە سێ کەتیبە و سێ فەرماندەیان لە هۆزی سولەیم بۆ هەڵ بژێرران کە ئەمانە بوون:

١ ـ عەبباسی کوڕی میرداس .

٢ ـ خوفافی کوڕی نەدبە .[200]

---

[197] نوعمان سوارچاکێکی چاونەترس بووە . زوو بە زوو موسڵمان بووە و ، پێش فەتحیش لەگەڵ چوارصەد پیاوی هۆزی موزەینەدا دێتە مەدینە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ . نوعمان و خزمەکانی هێز و کۆمەکیی بوون بۆ خەلیفە ئەبوبەکر بۆ تێك شکاندنی ئەو هێرشەی کە دوا بە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ پاشگەزبووەکان کردیانە سەر مەدینە . سێ برای تریشی بوون کە هەر هەموویان بە پاڵەوانی ئیسلام لە قەڵەم ئەدرێن . یەکێك بووە لە فەرماندە بەناوبانگەکانی ئیسلام بۆ فەتحی وڵاتی فارس . ئامادەی جەنگی قادسیە بووە و ، هەر ئەویش مژدەی سەرکەوتنی موسڵمانان لەو جەنگەدا دەگەیەنێتە خەلیفەی دووهەم . بە بۆنەی تەقوا و پیاوچاکیی و ئازایەتی‌یەوە خەلیفە عومەر زۆری خۆش ئەویست ، بۆیە کردیە فەرمانده‌ی جەنگی فارس و ، نەهاوەندی فەتح کرا و ناویش نرا ( فتح الفتوح )، چونکە ئیتر دوای ئەوە پشتی فارسەکان شکا و ، دوای سەرکەوتنیش خۆی بە پلەی شەهیدیی گەیشت.

[198] بەشداریی پەیمانی حودەیبیەی کردووە و پەیمانی ( رضوان ) یشی داوە .

[199] ناوی ( عبد العزی ) بووە ، پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی ناوە عەبدوڵلا . بەشداریی ئوحودی کردووە و، لە سەردەمی موعاویەدا کۆچی دوایی کردووە .

٣ ـ حەججاجی کوڕی عیلاط .

سوپای خوزاعەش کە بە بۆنەی ئەوەوە قوڕەیش و بەکر دەستیان بۆ درێژ کردن ، پەیمانی حودەیبییە هەڵوەشایەوە ، پێنج صەد جەنگاوەریان کۆکردبوویەوە و ، پێغەمبەری خوا ﷺ سێ کەتیبەی لێ دروست کردن و ، سێ سەرداری خوزاعەشی بۆ فەرماندەیان هەڵ بژاردن کە ئەمانە بوون :

١ ـ بوسری کوڕی سوفیان .

٢ ـ ئیبن شورەیح .

٣ ـ عەمری کوڕی سالم .

سوپای ئەسلەمیش کە بریتیی بوو لە چوارصەد جەنگاوەر دوو کەتیبەی لێ پێك هێنرا و ، هەر لە خۆیان دوو فەرماندەیان بۆ هەڵ بژێران :

١ ـ بورەیدەی کوڕی حەصیب .

٢ ـ ناجیەی کوڕی ئەعجەم ، یان جوندوب .

سوپای هۆزی غیفاریش کە بریتیی بوو لە سێ صەد جەنگاوەر کرایە یەك کەتیبە و ، ئەبوذەڕی غیفارییش کرایە فەرماندەی .

نەوەی ضەمرە و نەوەی سەعدیش کە بنەماڵەی هۆزی بەکرن ، بەشداریی تاوانی پەیمان شکاندنیان نەکردن ، بەڵکو سوپایەکی دووصەد کەسییان رێك خست و ، کەتیبەیەکیان لێ دروست کرا و فەرماندایەتی‌یەکەی بە ئەبوواقیدی لەیثیی سپێررا .

هەروەها نەوەی لەیثی کوڕی بەکریش کە ئەوانیش بەشداریی تاوانیان نەکردبوو سوپاکەیان بریتیی بوو لە دووصەد و پەنجا جەنگاوەر و ، پێغەمبەری خوا ﷺ کەتیبەیەکی لێ پێك هێنان و صەعبی کوڕی جوثامەشی کردە فەرماندەیان .

هۆزی ئەشجەعیش ، کە بەشێکە لە غەطەفان و یەکەم هۆزی نەجدە کە بەشداریی ئەم هەڵمەتە بکات ، ژمارەی جەنگاوەرانی سێ صەد پیاو بوون و ، دوو کەتیبەیان لێ پێك هێنرا و ، فەرماندەییشیان بە دوو پیاوی هۆزەکە سپێررا کە ئەمانە بوون :

١ ـ نوعەیمی کوڕی مەسعوود .

٢ ـ مەعقەلی کوڕی سینان .

---

[٢٠٠] ناوی خوفافی کوڕی عومەیری کوڕی حەربە . شاعیرێکی بەناوبانگی لێهاتوو بووە . بەشداریی حونەینی کردووە . لە کاتی فیتنەی پاشگەزبووەکاندا بە دامەزراویی لەسەر ئیمان ماوەتەوە . هەتا سەردەمی خەلیفە عومەر ژیاوە .

بەڵام نەوەی تەمیم [٢٠١] کە هۆزێکی نەجدیی مەزن بوو ، ئامادەی ئەم هەڵمەتە نەبوون جگە لە مەفرەزەیەکی بچووك کە تەنها دە جەنگاوەر بوون بە فەرمانداییەتیی سەرداری نەوەی تەمیم ئەقرەعی کوڕی حابیسی تەمیمیی . [٢٠٢]

**پێنجەم : بە ڕێکەوتنی سوپا لە قودەیدەوە**

هەر چەندە سوپای ئیسلام لە مەککە زۆر نزیك کەوتبووەوە ، کەچیی زۆربەی هاوەڵان نەیان ئەزانیی بەرەو کوێ ئەڕۆن . بەڵام رای خەڵکەکە هاتە سەر ئەوە کە نیازی هەڵمەت بردنە سەری دوو شوێنی هەیە : یان قورەیش یان هەوازین .

بەڵێ ، لە قودەید سوپا بە تەواویی رێك خرا و ، بەرەو شیوی عوسفان کەوتە رێ . پێشەنگی سوپا کە هەر هەمووی ئەسپ سوار بوون و زۆربەشیان لە نەوەی سولەیم بوون ، کە خاوەنی سوپایەکی هەزار کەسیی بوون و هەر هەمووشیان ئەسپ سوار بوون ، کەوتە پێش و ، فەرماندایەتیی گشتییشی بە سوارچاکی پاڵەوان و بەناوبانگی قورەیش ، خالیدی کوڕی وەلید سپێررا .

جا بۆ ئەوەی دوژمن بە نیازی نەزانێ ، سەرەتا پێغەمبەری خوا ﷺ سوپای ئیسلامی بەرەو ئەو ناوچانە بە ڕێ کرد کە هی هۆزی ثەقیف بوون ، پاشان رووی کردەوە مەککە و لە شیوی ( ظهران ) ەوە تێپەڕیی . بەڵام سەیر لەوەدایە کە چۆن قورەیش و هەوازین لە دژی موسڵمانەکان یەکیان نەگرت ؟

---

[٢٠١] نەوەی تەمیم هۆزێکی گەورە و بەناوبانگە و ، لە سەردەمی نەفامیی دا یەکجار بەهێز بوون و ، دارای کاریگەرییش بوون لە ئیسلامدا . ئەوەبوو نوعمانی پادشای حیرە بە کۆمەکیی هەندێ هۆزی تر هێرشی کردە سەریان ، کەچیی تێکیان شکاند . زۆربەی هۆزی تەمیم لە ساڵی نۆهەمی کۆچیی دا موسڵمان بوون ، دوای ئەوەی نوێنەرەکەیان کە لە حەفتا پیاو پێك هاتبوو و بە سەرکردایەتیی زەبەرقانی کوڕی بەدر و ، ئەقرەعی کوڕی حابیس و عەمری کوڕی ئەهتەم هاتنە مەدینە . بە پێی فەرموودە یەکەم دژی لێهاتوون بەرامبەر بە دەججال . سێ هەزار جەنگاوەری نەوەی تەمیم بەشداریی جەنگی قادسیەیان کرد و ، مەردانە دەوری خۆیان بینی . لە رۆژی قادسیەدا فەرماندەیان عاصیمی کوڕی عەمر بوو کە سەرەنجی دا ئەبینێ وا فیلی سوپای دوژمن تەنگیان بە موسڵمانان هەڵ چنیوە . سەعدی کوڕی ئەبووەقqاص دادی هێنایە بەردەمیان . عاصیم هاواری کردە کۆمەڵی تەمیم تا چارەیەك بۆ فیلەکانی دوژمن بدۆزنەوە . پاشان هاواری کردە تیرهاوێژان تا فیل سوارەکان دابگرنەوە . ئیتر ئەوەبوو فیلەکان سەریان لێ شێوا و ، مەترسییان لەسەر موسڵمانەکان نەما . یەکێ لە سوارچاکە نازا و ناودارەکانی ئەم هۆزە قەعقاعی کوڕی عەمر و ، یەکێ لە فەرماندەکانی فەتحی ئیسلامییش ئەحنەفی کوڕی قەیسی بەحیکمەت و نەرم و نیانی بەناوبانگ و ، یەکێ لە مرۆڤە هێمنە بەناوبانگەکانیشیان قەیسی کوڕی عاصیمی مینقەریی بوون . نەوەی تەمیم لە فەتحی خۆراسان دا دەستێکی باڵایان هەبوو .

[٢٠٢] فتح مكة لباشميل : ١٦٠ ـ ١٧٣ .

هۆی ئەمەش ئەوەیە کە هەرچەندە هەوازین خاوەنی هێز و سوپای دڕ بوون ، بەڵام قورەیش کۆڵی لەوە دابوو کە جەنگ لەگەڵ موسڵمانەکان بکات ، چونکە بەرگەی سوپای موسڵمانانی نەئەگرت .

هۆیەکی تریش ئەوەبوو کە قورەیش و هەوازین کۆنە دوژمن بوون و ، لە نێوان هەوازین و قورەیش و بەکردا پانزە ساڵ پێش هاتنی وەحی جەنگی فیجار رووی دابوو.

جا هەوازین بە تەمای جەنگ بوو لەگەڵ موسڵمانەکان‌دا ، بۆیە خەریکی خۆئامادەکردنیش بوو .

ئەوەبوو لە نێوان عەرج و طەلووب‌دا ، کە طەلووب تەنها سیی میلێك لە مەککەوە دوور بووە ، پێشەنگی سوپای ئیسلام توانیی سیخوڕێکی هەوازین دەست گیر بکات. ئەوەبوو هێنایانە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ دانی بە هەموو شتێك‌دا نا، بەو مەرجەی لە گیانی خۆی بێ‌خەم بێت .

کە پرسیاری لێ کرا دەری بڕیی کە هەوازین ، بە سەرکردایەتیی مالیکی کوڕی عەوفی نەصریی بە تەمایە لەگەڵ موسڵمانەکان‌دا بجەنگێ و ، پیاوی شارەزاشیان رەوانەی جورەش کردووە لە ولاتی توردون تا چەکی قورسی جەنگی ئەو سەردەمە ، بە وێنەی دەببابە و مەنجەنیق ، بکڕن .

پێغەمبەری خوا ﷺ وتەکانی ئەو پیاوەی بە راست وەرگرتن ، لەگەڵ ئەوەش‌دا فەرمانی دا خالید بی‌گرێتە لای خۆی و بەری نەدات .. کەچیی سیخوڕەکە بە ویستی خۆی موسڵمان بوو و ، لە جەنگی حونەین‌دا شەهیدیی دەست کەوت .

کە سوپای موسڵمانان گەیشتە ( مر الظهران ) کە تەنها دە کیلۆمەتر لە مەککەوە دوورە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا سوپا رۆژوو بشکێنێ و ، هەر کەس بەڕۆژوو بێت بە یاخیی ئەژمێررێ .[٢٠٣]

**شەشەم : قورەیش جەنگ ناکات**

ویستی خوای گەورە وەها بوو کە نەخشەکەی پێغەمبەری بەسۆز ﷺ سەر بگرێت و، قورەیش لە هەڵمەتی موسڵمانان بێ‌ئاگا بێت ، هەتا بۆی نەکرێ لە خۆی و لە هاوپەیمانانی سوپا کۆ بکاتەوە ، تا جەنگ روو نەدات و خوێن نەڕژێ و ، مەککە بەبێ جەنگ فەتح بکرێ ..

---

[٢٠٣] فتح مكة لباشميل : ١٧٣ ـ ١٨٤ .

قوڕەیش هەروا بێئاگا بوون هەتا سوپای ئیسلام گەیشتە ( أراك ) کە تەنها چوار میلی ئەمێنێ بۆ مەککەی پیرۆز .

سەردارانی قوڕەیش دوای گەڕانەوەی ئەبوسوفیان لە مەدینە هاتنە سەر ئەو رایە کە ئەگەر سوپای مەدینە هێرشی هێنا ، ئەوان بەرگریی نەکەن و ، ماوەیان دا ئەبوسوفیان وت و وێژ بکات و ، چاوپۆشیی بۆ دانیشتوانی مەککە بە دەست بهێنێ .

دوای ئەم بڕیارە قوڕەیش داوایان لە ئەبوسوفیانی سەرۆکیان کرد کە خۆی لە شار دەرچێ و ، هەواڵی موسڵمانەکان بزانێ . هەروەها بڕیاریان دا کە حەکیمی کوڕی حەزام یارمەتیی‌دەری ئەبوسوفیان بێت ، بۆ ئەنجامدانی کاری سەر شانی . بەڵام داوایان لە ئەبوسوفیان کرد کە ئەگەر زانیی سوپای موسڵمانان هێزێکی کەمە بڕیاری جەنگ بدات لە دژیان.

بەڵێ ، قوڕەیش هیچی نەزانی هەتا سوپای ئیسلام چەند کیلۆمەترێکی کەمی ما بچێتە ناو مەککەوە . هەر ئەوەندەیان زانیی وا دە هەزار جەنگاوەری رێك و پێك لەسەرخۆ تەقە لە دەرگای مەککە ئەدەن .

قوڕەیش سەرسام بوون ، بەڵام خوا چاکی بۆ ئەوان ویست ، چونکە ئەگەر زووتر هەواڵیان بزانیایە ئەوا سوپایان جەم ئەکرد و خوێنێکی زۆر لە هەردوولا ئەڕژا . لەوانەش بوو قوڕەیش لە ناچاریی‌دا پەیمانی لەگەڵ هەوازین‌دا ببەستایە و ، جەنگەکە یەکجار گەورە بوایە .

عەبباسی کوڕی عەبدولموطەللیبیش کە لە بەدر بە دیل گیرا و فیدیەی دا و گەڕایەوە مەککە ، هەر لەوێ بوو و لەسەر دینی خۆی مابوویەوە ، هەر چەندە دڵسۆزی موحەممەدی برازای بوو و ، لە ساڵی سێ‌هەم‌دا لە هێرشی قوڕەیش بۆ سەر مەدینە ئاگاداری کرد . لە هەمان کاتیش‌دا خەم خۆری قوڕەیشی‌یەکان بوو و ، هەموو توانایەکی خستە گەڕ تا لە بەلا و موصیبەت پارێزراو بن .

هەر لەو کاتەدا کە سوپای ئیسلام ئەی‌ویست بەرەو مەککە بکەوێتە رێ ، عەبباسیش ئەوە هات بە سەریا کە کۆچ بۆ مەدینە بکات . ئەوەبوو لە رێ‌دا تووشی موسڵمانان بوو و لەگەڵیان گەڕایەوە دوا ..

کە عەبباس لە ( مر الظهران ) سەرنجی زۆریی سوپای ئیسلامی دا خەمی قوڕەیش چووە دڵیەوە و ، ترسا ئەم سوپایە بە زۆر بچێتە مەککەوە و دانیشتوانی تیا بچن .. بۆیە بیری کردەوە کە چۆن کارێك بکات قوڕەیش تیا نەچێت . بۆیە وای بە

چاك زانیی قورەیش خۆیان بە دەستەوە بدەن و ، لە شار دەرچن و بێن بە پیری سوپای ئیسلامەوە و ، داوای ئەمان لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن .. واتە خۆیان بە شێوەیەك بە دەستەوە بدەن کە سوپای ئیسلام مەککە بە شارێکی دەرگا ئاوەڵا لە قەڵەم بدات کە هیچ دژایەتی یەکی تێدا بەرامبەر بە سوپای ئیسلام نەکرابێ .

عەبباس لەو بیرەدا بوو کە ئامۆژگاریی قورەیش بکات تا فریای خۆیان بکەون و کۆمەڵێ لە سەرۆکانیان بنێرنە خزمەتی پێغەمبەری خوا تا بەر لەوەی سوپا بچێتە شارەوە لەسەر شێوازێك رێك بکەون .

ئەم بۆچوونەی عەبباس شەو بە دڵی دا هات . وای بە چاك ئەزانی تا رۆژ نەبۆتەوە جێ بە جێی بکا . بۆیە بە تاریکەشەو خۆی گەیاندە ئەراك تا بەڵکو کەسانێکی لەوێ دەست بکەوێ کە بۆ دار چنینەوە یان بۆ ماست فرۆشتن هاتبن ، بۆ ئەوەی هەواڵ بەوان دا بنێرێ بۆ سەرۆکانی قورەیش کە تا زوو بە زوو بێن و فریای خۆیان بکەون .

خوای گەورە وەهای رێك خست کە ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب هەر ئەو شەوە لە مەککە دەرچوو تا بەڵکو هەواڵی سوپای ئیسلام بزانێ ؛ بێ ئەوەی بزانێ کە سوپای ئیسلام گەییوەتە نزیکی مەککە و تەنها چوار میلی ماوە بگاتە ناو شار .

خوای گەورە بۆ سەرفرازیی و بێ وەیی دانیشتوانی مەککە ، ئەوەی خستە دڵی ئەبوسوفیانەوە کە ئەو شەوە لە مەککە دەرچێ و بگاتە ئەو شوێنەی کە عەبباس ئەی ویست کەسێکی تیا ببینێ و جواب بۆ قورەیش بنێرێ .

لەوێ عەبباس چاوی بە ئەبوسوفیان کەوت و چاك تێی گەیاند کە پێویستە خۆی بگەیەنێتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و داوای چاوپۆشیی لە دانیشتوانی مەککەی لێ بکات.

ئەبوسوفیان بەبێ دوو دڵیی بە گوێی عەبباسی کرد و ، عەبباس لە پاشکۆی خۆیدا سواری ئێسترەکەی پێغەمبەری خوای کرد و گەیاندیە خزمەتی پێغەمبەر و چاوپۆشیی بۆ وەرگرت.

مێژوونووسان ئەوەیان باس کردووە کە کاتێ سوپای ئیسلام ئەگاتە ( مر الظهران ) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمان ئەدا هەر سەربازێك بۆ خۆی ئاگرێك بکاتەوە . بەمە دە هەزار ئاگر لەو بیابانەدا کرایەوە و دیمەنێکی یەکجار کاریگەری ئەنواند .

لەو کاتەدا ئەبوسوفیان و حەکیمی کوڕی حەزام لە شار دەرچووبوون تووشی بودەیلی کوڕی وەرقاء هاتن . بودەیل کە سەرۆکێکی هۆزی خوزاعەی هاوپەیمانی

موسڵمانان بوو ، ئەویش بۆ دەنگ و باس هاتبوو . پێکەوە رۆیشتن تا چاویان بە ئاگرەکان کەوت . سەرەتا وایان زانیی نەوەی کەعبن ، بەلاّم بودەیل وتی : ئەوان نین . دوایی وتیان : هەوازین هاتوون و زەویی و زاری قورەیشیان داگیر کردووە .

کاتێ ئەم وت و وێژەیان ئەکرد عەبباس گوێی لێ بوو . بانگ لە ئەبوسوفیان ئەکات و هەواڵی ئەداتێ کە سوپایەکی زۆری موسڵمانان هێرشی هێناوە و بە قورەیش چار ناکرێ .

ئەبوسوفیان داوای ئامۆژگاریی لە عەبباس کرد کە چیی بکات ، ئەویش لەگەڵ خۆیدا هەڵی گرت و گەیاندیە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ .

ئەبوسوفیان لەوە ئەترسا کە عەبباس نەتوانێ لە سەربازە موسڵمانەکان بیپارێزێ و، ئەترسا بی‌کوژن . بەلاّم عەبباس دڵی دایەوە کە با ترسی نەبێ و بێخەم بێ ئەی‌گەیەنێ . شایانی باسە کە حەکیم و بودەیل‌یشیان لەگەڵدا بوون و ، ئەو دوانە هەر کە گەیشتنە چادرەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەردووکیان موسڵمان بوون .

لەو شەوەدا پاسەوانیی سەربازگەی ئیسلام بە عومەری کوڕی خەططاب سپێررا بوو و بە خۆی و کۆمەڵێك سەربازەوە بە دەوری سەربازگەدا بۆ پاسەوانیی ئەخولانەوە.. عومەر لە هەموو کەسێ زیاتر داخ لە دڵی قورەیش بوو ، بۆیە ئەو شەوە عەبباسی ماندوو کرد ، چونکە عەبباس بەڵێنی پەنای بە ئەبوسوفیان دابوو و ، سواری ئێسترەکەی پێغەمبەری خوای ﷺ کردبوو . جا هەر موسڵمانێك ئەبوسوفیانی ئەدیی، ئەی زانیی وا لە پەنای عەبباس‌دا چاوپۆشی‌یان لێ ئەکرد و ، دەستیان بۆ نەئەبرد.. هەروا رۆیشتن هەتا گەیشتنە لای عومەری فەرماندەی پاسەوانانی سەربازگە . هەر کە ئەبوسوفیانی لەبەر رووناکیی ئاگرەکەدا بەرچاو کەوت هاواری کرد : ئەبوسوفیانی دوژمنی خوایە ؟ سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە بەبێ پەیمان و بەڵێن تۆی خستە دەستمان.

عومەر سەرنجی دا ئەبوسوفیان وا لە پەنای عەبباس‌دا و سواری ئێسترەکەی پێغەمبەریشە ، بۆیە بۆ کوشتنی پەلەی نەکرد ، بەڵکو هەوڵی دا بە پەلە بگاتە بنکەی سەرکردایەتیی و لەوێ مۆڵەتی کوشتنی سەرداری قورەیش وەربگرێ .

عەبباسیش کە بووبووە زامنی ئەبوسوفیان ئەترسا عومەر زوو بگات و مۆڵەتی کوشتن وەربگرێ ، بۆیە پەلەی بە ولاغەکە کرد تا پێش عومەر بگات و چاوپۆشیی بۆ ئەبوسوفیان وەربگرێت . سەرەنجام عەبباس زووتر گەیشت .

هەر دوا بە دوای گەیشتنی ئەوان عومەریش گەیشت .. کە ئەبوسوفیان عومەری دیی شڵەژا . چونکە هێشتا عەبباس چاوپۆشیی بۆ وەرنەگرت بوو عومەر هەوڵی ئەدا پێغەمبەری خوا ﷺ ماوەی بدا تا لە گەردنی ئەبوسوفیان بدات ، بەلام سەرەنجام عەبباس توانیی چاوپۆشیی وەربگرێ ، هەر چەندە عومەر داوای کوشتنی ئەکرد .

عەبباس وای ئەزانیی عومەر بۆیە حەز ئەکات ئەبوسوفیان بکوژێ چونکە خزمی ئەوە ، کەچیی عومەر دەری بڕیی کە ئەو بیر لە شتی وەها ناکاتەوە ، بەڵکو هەر لەبەر ئەوەیە کە گەورە و سەرۆکی کوفرە و دژی موسڵمانان وەستاوە .

عەبباس نەخشەیەکی وردی کێشا بوو .. پێی خۆش بوو ئەبوسوفیان نەکوژرێ ، بەو هیوایەی کە موسڵمان ببێ ، بەمەش مەککە لە جەنگ و خوێن ڕشتن بە دوور بێت . ئەوەبوو عەبباس توانیی قەناعەت بە پێغەمبەری خوا ﷺ بکات و چاوپۆشیی لە ئەبوسوفیان بکات ، لە هەمان کاتدا توانیی قەناعەت بە ئەبوسوفیان بکات موسڵمان ببێ ، بەر لەوەی بگەڕێتەوە مەککە .

عومەریش ئەبوسوفیانی بە سەرۆکی ئەو کوفرە ئەزانی کە هیچ ڕێگایەك نەمابوو بۆ سزادانی موسڵمانان و دژایەتیی دینی خوا نەیگرتبێتە بەر . جا ئەگەر ئەم بکوژرێ ئەوا هەموو سەردارانی قورەیش ورەیان ئەڕووخێ و ، بۆیان ئەسەلمێ کە تازە توانای هیچ بەرگری‌یەکیان نیە و ، ناچارن بەبێ جەنگ و هەرا خۆیان بە دەستەوە بدەن.

بەلام پێغەمبەری خوا ﷺ وای بە چاك زانیی لایەنی چاوپۆشیی و لێبووردن بگرێ، نەك کوشت و بڕ . چونکە بۆ بەرژەوەندیی ئیسلام پێویستە دڵەکان خۆش بکرێن . خەڵکێکی زۆر چاوەڕوان بوو بزانێ داخۆ چارەنووسیی چۆن بێ ، ئەگەر ئیسلام دەست بەسەر مەککەدا بگرێ ؟

جا چاوپۆشیی لە ئەبوسوفیان وەلامی هەموویانی ئەدایەوە، کە با هیچ کەس لە خۆی نەترسێ .. ئەوەتا سەرۆکی کوفر چاوپۆشیی لێ کراوە ، کەواتە با هەموان دڵیان لە متمانە پڕ بێ ، کە موحەممەدی ( الصادق الأمین ) تۆڵە لە هیچ کەس

ناسێنێ و ، خوای گەورە بە ( رحمة للعالمين ) ناردوویەتی . ئیتر چۆن ئەبێتە مایەی زیان و ناڕەحەتیی بۆ خزمەکانی ؟

ئەو هەڵگری پەیامی حەسانەوەی مرۆڤە .. هەر چەندە خزمەکانی لەگەڵیا خراپ بوون ، بەڵام پاداشتی ئەوەش لای خوایە و نافەوتێ .. موسڵمانان قازانجیان کردووە.. لە دنیادا سەرکەوتن و ، لە قیامەتدا ڕەزامەندیی خوا .

لەو شەوەدا هیچ وت و وێژێك دەربارەی چاوپۆشیی لە قوڕەیش ، یان دەربارەی موسڵمانبوونی ئەبوسوفیان ڕووی نەدا .. ئیتر عەبباس ئەبوسوفیانی لەگەڵ خۆیدا بردەوە بۆ شوێنی حەسانەوەی خۆی لە ناو سوپای ئیسلامدا و هەتا بەیانیی پاسەوانی بۆ دانرا نەوەکو را بکاتەوە بۆ مەککە .

ئەگێڕنەوە کە ئەبوسوفیان لە بەرەبەیانی ئەو شەوەدا کە لە چادرەکەی عەبباسدا ئەمێنێتەوە ، دەنگی بانگی بەیانیی لە هەموو لایەکەوە ئەبیستێ و ، ترسی لێ ئەنیشێ و ئەپرسێ : ئەوە چیی ئەکەن ؟ عەبباس وەڵامی ئەداتەوە کە نوێژ بەجێ ئەهێنن . ئەبوسوفیان ئەپرسێ : لە شەو و ڕۆژێکدا چەند جار نوێژ ئەکەن ؟ ئەڵێت : پێنج جار . ئەڵێت : بەخوا زۆرە .

پاشان ئەبوسوفیان چاوی لێ ئەبێ چۆن هاوەڵان ناهێڵن ئاوی دەستنوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەوێتە زەویی ، بۆیە بە عەبباس ئەڵێت کە تا ئێستە هیچ پادشایەکی بەو شێوە نەدیوە ، نە پادشای ئێران و نە پادشای ڕۆم . عەبباس ئەڵێت : ماڵ کاول ، ئیمان بهێنە . ئەبوسوفیان داوا لە عەبباس ئەکات کە بیباتە خزمەتی. ئەویش کە ئەیباتە ژوورەوە ، ئەبوسوفیان ئەڵێت : ئەی موحەممەد ! من داوای سەرکەوتنم لە خواکەم کرد و ، تۆیش داوای سەرکەوتنت لە خواکەت کرد . دەی بەخوا هەرچیی جارێك ڕوو بەڕووت بوومەتەوە هەر تۆ سەرکەوتوویت بەسەر مندا . جا ئەگەر خواکەی من لەسەر ڕێی ڕاست و خواکەی تۆ لەسەر ناڕەوا بوایە ئەوا من سەرنەکەوتم . پاشان ئەبوسوفیان شاهێدیی دا کە موحەممەد پێغەمبەری خوایە .

سەربازگەی موسڵمانان نەیئەهێشت هیچ هەواڵێك بە قوڕەیش بگات ، جگە لە یەك هەواڵ ، کە بە تایبەتیی ماوەی دا بگاتە مەککە ، ئەویش هەواڵی ئەوەی کە ئەبوسوفیان خۆی گەیاندۆتە بنکەی سەرکردایەتیی موسڵمانان و ، بە تایبەتیی چاوپۆشیی بۆ خۆی بە دەست هێناوە ، ئەویش بە تکای عەبباسی کوڕی عەبدولموطەللیب . وەك بڵێی ئەبوسوفیان خەمی قوڕەیشی نەخواردووە و هەموو

بەرژەوەندی‌یەکی ئەوانی پشت‌گوێ خستووە . ئەم بیرکردنەوەیە ترس و لەرزێکی خستبووە دڵی دانیشتوانی مەککەوە . ئەوان لەبەر خۆیانەوە ئەبوسوفیانیان نارد تا خەمێکیان بخوا ، کەچیی ئەو تەنها بیری لە خۆی کردۆتەوە . لەولاشەوە ئەیان زانیی مەککە توانای جەنگی نیە لەگەڵ موسڵمانەکان‌دا و ، ئەگەر هێرش بکەنە سەر مەککە بە یەکجاریی وێران ئەبێ .

لە کاتێک‌دا کە کافران بە رەش بینی‌یەوە سەیری دەوروبەریان ئەکرد ، پێغەمبەری ( رحمة للعالمين ) ﷺ بە جۆرێکی تر بیری ئەکردەوە .. ئاواتی ئەخواست خوێن لە لووتی تاکە کەسێك نەیەت .. هیچ کەس تووشی زیان نەبێت . ئەو لە دانیشتوانی مەککە خۆیان زیاتر حەزی لەوەبوو شاری مەککەی پیرۆز سەلامەت و بێ وەی بێت . بەڵام چاریش نیە مەگەر لە بت پەرستان پاك بکرێتەوە .. هەتا مل‌هوڕە موشریکەکان خاوەنی دەسەڵات بن لە مەککەدا ، سەرانسەری دوورگەی عەرەبیی حەسانەوە بە خۆیەوە نابینێ . تا موسڵمانەکان لە مەککەدا بوون و لاواز بوون ، ئەوان لە سزادانیان درێغی‌یان نەکرد و ، کە کۆچیشیان بۆ مەدینە کرد ، لەوێش دەست بەرداریان نەبوون و ، بەینا و بەین سوپایان جەم ئەکرد و شاڵاویان ئەبردە سەر مەدینە بە نیازی لە ریشەکێشانی ئیسلام و موسڵمانان .. لەگەڵ ئەوەش‌دا پێغەمبەری بە سۆز ﷺ بە چاوی بەزەیی‌یەوە سەیری ئەکردن و ، وەك رۆڵەیەکی مەردی بەوەفا ، بیری لە تۆڵەسەندن نەئەکردەوە ، بەڵکو ئاواتی ئەوەبوو سەروماڵی دانیشتوان پارێزراو بێت .

وەك لە پێشەوە باس کرا عەبباس زۆری پێ خۆش بوو ئەبوسوفیان موسڵمان ببێ ، چونکە ئەی‌زانیی بە موسڵمان‌بوونی ئەو ئیتر قورەیش بیر لە جەنگ ناکاتەوە ، بگرە بیر لە موسڵمان بوون ئەکاتەوە ، بەمە مەککە لە مەترسیی رزگاری ئەبێت .

کە عەبباس و ئەبوسوفیان چوونەوە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وت و وێژی زۆر رووی دا .. یەکەم باسێك کە هاتە کایەوە وت و وێژی نێوان پێغەمبەری نازدار و سەرداری قورەیش بوو . داوای لێ کرد واز لە شیرك و بت پەرستیی بهێنێ و دەست بە تەوحیدەوە بگرێ ، کە فەرمووی : (( ويحك يا أبا سفيان ! ألم يأن لك أن تعلم أن لا إله إلا الله ؟ )) .

ئەبوسوفیان وتی : دایك و باوكم بە قوربانت بن ، چەندە سیلەی رەحم ئـەپارێزی و چەندەش بە حیلمی و چەندەش بەڕێزی ! بەخوا وەهای بۆ ئەچم كە ئەگەر لەگەڵ خوادا خوایەكی تر بوایە شتێكی بۆ من جێ بەجێ ئەكرد .

فەرمووی : (( ویحك یا أبا سفیان ! ألم یأن لك أن تعلم أني رسول الله ؟ )) .

فەرمـووی : ماڵت كاول بێ ئەبوسوفیان ! ئایا كاتی ئەوەت نەهاتووە كە بزانـی مـن پێغەمبەری خوام ؟

ئەبوسوفیان وتی : دایك و باوكم بە قوربانت بن ، چەندە سیلەی رەحم ئـەپارێزی و چەندەش بە حیلمی و چەندەش بەڕێزی ! بەڵام ئەمەیان دڵم شتێكی تێدا ماوە.

عەبباس گوێی لەم وت و وێژە نەرم و نیانە بوو ، بۆیە ئەبوسوفیانی تێ گەیاند كە ئەو تازە چاوپۆشیی لێ كراوە و ، پێغەمبەریش ﷺ ئەو ناچاری موسڵمان بوون ناكات، بەڵام ئەوەندە هەیە موسڵمانبوونی ئەم ئەبێتە فەڕ و بەرەكـەت و بەخشـانی مەككـە ئەبێت . بەڵام ئەگەر ئەم موسڵمان نەبێت لەوانەیە جەنگێكی ناهەموار روو بـدات و، قوڕەیش تووشی زیانێكی زۆر ببێت .

عەبباس هەروا بەردەوام بوو هەتا ئەبوسوفیان دڵی نەرم بوو و ، هەر لـە خزمـەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ و لە بنكەی فەرماندایەتیی‌دا شایەتمانی حەقی هێنا .

بە موسڵمانبوونی ئەبوسوفیان ئاو بەسەر ئاگردا كرا و ، مەككە وازی لـە جـەنگ هێنا و سوپای ئیسلام بە سەلامەتیی چووە ناو شارەوە ، جگە لە چەند گـەنجێكی لـە خۆیایی بوو وەك عیكریمەی كوڕی ئەبوجەهل و صەفوانی كوڕی ئومەییـە كـە هەنـدێ بەرگری‌یان كرد و خالیدی كوڕی وەلیدیش كـە فەرمانـدەی لیـوای پێنجـەم بـوو لـە باشووری مەككەدا تێكی شكاندن ..

دوای موسڵمانبوونی ئەبوسوفیان عەبباس پێی خۆش بوو موسڵمانەكان و قوڕەیش لەسەر چەند خاڵێك رێك بكەون تا جەنگ و هەرا نەبێت ، كە ئەمانە بوون :

١ ـ دانیشتوانی مەككە پارێزگاریی لە خوێن و سەروماڵیان بكرێت .

٢ ـ كاتێك كە سوپای ئیسـلام ئەچـێتە مەككـەوە قـوڕەیش هـیچ بـەرگری‌یـەك نـەكەن.

٣ ـ هەر بەرگری‌یەك روو بدات سوپای ئیسلام بۆی هەیە بە چەك لێی بدات و لـە ناوی بەرێت.

٤ ـ بۆ سەلامەتیی سەروماڵی دانیشتوان ، خەڵکەکە هات و چۆ نەکات ، بەڵکو هەر کەسە بچێتە ماڵی خۆیەوە ، یان مزگەوت ، یان ماڵی ئەبوسوفیان . ئەمەش ڕێزێکی تایبەتیی بوو بۆ ئەبوسوفیان .

بۆ ئەمە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بۆ سوپای ئیسلام دەرکرد کە مەگەر بۆ بەرگریی لە خۆیان چەك بەکار بهێنن و ، پێویستە دەست بۆ هیچ ماڵ و سامانێکی ناو شار نەبەن . موسڵمانان بە جوانیی فەرمانەکەیان بە جێ هێنا و ، ئەبوسوفیانیش دانیشتوانی مەککەی لەو ڕێکەوتنە ئاگادار کرد ، کە نابێ چەك لە ڕووی سوپای ئیسلامدا بەرز بکەنەوە .

کە ئەبوسوفیان موسڵمان بوو حەکیمی کوڕی حەزامیش موسڵمان بوو .

بەر لەوەی کە ئەبوسوفیان بگەڕێتەوە بۆ مەککە ، پێغەمبەری خوا ﷺ وای بە چاك زانیی ئەبوسوفیان بە چاکیی سوپای ئیسلام ببینێ ، تا بە قوڕەیش بگەیەنێ کە چاری کەتیبەکانی ئیسلامیان پێ ناکرێ ..

بۆ ئەمە فەرمانی دا لە دەربەندی شیوەکەدا ئەبوسوفیان ماوەیەك بوەستێنرێ ، تا بە چاوی خۆی کەتیبەکانی ئیسلام ببینێ . کە ئەبوسوفیان هەستی بە گل دانەوەکە کرد ، وای زانیی ناپاکیی لەگەڵدا ئەکرێ و وتی : ئەی نەوەی هاشم ! غەدر ئەکەن ؟

عەبباس وتی : ئەهلی پێغەمبەرایەتیی غەدر ناکەن ، بەڵام پێویستییم پێت هەیە .

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا هەموو کەتیبەکانی ئیسلام لەوێوە تێپەڕ بکەن تا ئەبوسوفیان بیان بینێ .

یەکەم کەسێك کە تێپەڕی کرد خالیدی کوڕی وەلید بوو ، کە فەرماندەی گشتیی ئەسپ سواران بوو لە هۆزی سولەیم کە هەزار سوارچاکی پڕچەك بوون لەگەڵ سێ فەرماندەی نەوەی سولەیم : عەبباسی کوڕی میرداس و ، خوفافی کوڕی نودبە و ، حەجاجی کوڕی عیلاط .

کە تێپەڕیان کرد ئەبوسوفیان پرسیی : ئەمانە کێن ؟ عەبباس وتی : نەوەی سولەیمن . وتی : دەی من چیم داوە لە سولەیم ؟ کە عەبباس وتی : ئەوەش خالیدی کوڕی وەلیدی فەرماندەیانە ، وتی : منداڵەکە ؟ وتی : بەڵێ . جا کە گەیشتنە بەردەمیان ، خالید سێ جار ( أللە أكبر ) ی وت و تێپەڕیان کرد .

پاشان زوبەیری کوڕی عەووام لەگەڵ پێنج صەد جەنگاوەری موهاجیرین و هەندێ جەنگاوەری تری عەرەبدا بە ئاڵایەکی ڕەشەوە ، گەیشتنە لای ئەبوسوفیان و سێ

جار ( ألله أكبر ) ی وت . خۆ ئەبوسوفیان زوبەیری ئەناسیی ، بەڵام چونکە بە کڵاوی ئاسن و قەڵغان خۆی پێچابوویەوە نەی‌ناسیی . بۆیە پرسیی : ئەمە کێ‌یە ؟ وتی : زوبەیری کوڕی عەووام . پرسیی : خوشکەزات ؟ وتی : بەڵێ . چونکە زوبەیر کوڕی صەفیەی کچی عەبدولموطەللیب بوو .

پاشان نەوەی غیفار ، کە سێ‌صەد جەنگاوەر ئەبوون ئەبوذەڕی غیفاریی ئاڵاکەیانی هەڵ گرتبوو ، تێپەڕیان کرد و کە گەیشتنە بەرامبەریان سێ جار ( ألله أكبر ) یان وت . پرسیی : ئەمانە کێن ، ئەی باوکی فەضل؟ وتی : نەوەی غیفارن . وتی : دەی من چیم داوە لە نەوەی غیفار ؟

پاشان نەوەی ئەسلەم بە چوار صەد جەنگاوەرەوە تێپەڕیان کرد ، کە بورەیدەی کوڕی حەصیب و ناجیەی کوڕی جوندوب هەڵگری ئاڵاکەیان بوون و ، ئەوانیش سێ جار ( ألله أكبر ) یان وت و ، پرسیی : ئەمانە کێن ؟ عەبباس وتی : ئەسلەم . ئەبوسوفیان بە ناڕەحەتی‌یەوە وتی : دەی من چیم داوە لە ئەسلەم ؟ تاقە جارێك شت بە بەینمانا نەچووە . عەبباس وتی : ئەمانە کۆمەڵێك موسڵمانن و هاتوونەتە سەر ئیسلام.

پاشان نەوەی عەمری کوڕی کەعب لە خوزاعە بە پێنج صەد جەنگاوەرەوە تێپەڕیان کرد ، کە بوسری کوڕی سوفیانی خوزاعیی هەڵگری ئاڵاکەیان بوو . پرسی : ئەمانە کێن ؟ عەبباس وتی : نەوەی کەعبی کوڕی عەمر .

ئەبوسوفیان وتی : بەڵێ باشە ، ئەمانە هاوپەیمانی موحەممەد بوون .کە گەیشتنە بەردەمیان ئەوانیش سێ جار ( ألله أكبر ) یان وت ..

پاشان هۆزی موزەینە بە هەزار جەنگاوەرەوە ، بە فەرماندایەتیی نوعمانی کوڕی موقەررین و ، بیلالی کوڕی حاریث و ، عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ، هاتن و سێ جار ( ألله أكبر ) یان وت ، ئەبوسوفیان پرسیی : ئەمانە کێن ؟ عەبباس وتی : موزەینەن. دیسان بۆ ئەوانیش ناڕەزایی دەربڕیی .

پاشان جوهەینە بە هەشت صەد جەنگاوەرەوە و بە فەرماندایەتیی چوار سەرداریان: رافیعی کوڕی موکەیث و ، عەبدوڵڵای کوڕی بەدر و ، سوەیدی کوڕی صەخر و، ئەبوزەرعە ، تێپەڕیان کرد و دوای وتنی ( ألله أكبر ) ئەبوسوفیان ناسینی .

پاشان سێ بنەماڵەی کەنانە ، نەوەی ضەمرە و نەوەی لەیث و نەوەی سەعدی کوڕی بەکر ، کە نەوەی نوفاثەی خزمیان پەیمانی حودەیبیەیان شکاند و پیاویان لە

خوزاعە کوشت ، بە دووصەد جەنگاوەرەوە و ، بە فەرماندایەتی ئەبوواقیدی لەیثیی هاتن و ، کە گەیشتنە بەردەم ئەبوسوفیان سێ جار ( ألله أکبر ) یان وت . ئەویش پرسیی: ئەمانە کێن ؟ عەبباس وتی : نەوەی بەکرن .

کە ئەو غەدرەی قورەیشی هاتەوە یاد ، بە کۆمەکیی کردنی نەوەی بەکر و کوشتنی پیاوی خوزاعە بە ناڕەوا ، ئێشێك بە دڵی ئەبوسوفیان گەیشت و وتی: بەڵێ، ئەوانە بەخوا کۆمەڵێکی شوومن . بە بۆنەی ئەوانەوە موحەممەد هاتە سەرمان .. بەخوا من نە راوێژم پێ کراوە و نە ئاگاداریش بووم . کە پێیشم گەیشتووە پێم ناخۆش بووە . بەڵام تازە لە دەست دەرچوو .

عەبباس وتی : بەم هێرشەی موحەممەد ﷺ بۆ سەرتان ، خوا چاکی بۆ کردن کە هەمووتان موسڵمان بوون .

پاشان هۆزی ئەشجەع ، بە سێ صەد جەنگاوەرەوە ، بە فەرماندایەتیی مەعقەلی کوڕی سینان و نوعەیمی کوڕی مەسعوود تێ پەڕین و ئەبوسوفیان ناسینی و وتی: ئەمانە لە هەموو عەرەب زیاتر دوژمنی موحەممەد بوون .

عەبباس وتی : خوا ئیسلامی بردۆتە ناو کرۆکی دڵیانەوە و ، ئەمەش لە فەزڵ و بەخشایشی خوای گەورەیە .

ئەبوسوفیان بێ دەنگ بوو ، پاشان وتی : هێشتا موحەممەد تێ نەپەڕیوە؟ عەبباس وتی : هێشتا تێ نەپەڕیوە . ئەگەر ئەو کەتیبەیە ببینی کە موحەممەدی لەگەڵدایە ، ئاسن و ئەسپ و پیاو ئەبینیت ، کە هیچ بەرگەی ناگرێ . وتی : منیش وەهای بۆ ئەچم ئەی باوکی فەضل ، جا کێ بەرگەی ئەوانە ئەگرێ ؟

دوای تێپەڕبوونی هۆزە عەرەبەکان پێغەمبەری خوا ﷺ ، کە سواری وشترەکەی ( قصوی ) بوو بوو ، لەگەڵ موهاجیر و ئەنصاردا ، کە نزیکەی پێنج هەزار جەنگاوەر ئەبوون ، ئەشریفی هات . ئەو سوپایە زۆربەی موهاجیر و ئەنصار بوون و ، پێشی پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتبوون . کە کەتیبە صەوزەکەی دەرکەوت ، تۆز و گەردی سمی ئەسپەکان ئاسمانی گرتبوو ، هەر خەڵك تێ‌پەڕیی و ئەبوسوفیان چاوەڕوان بوو ، بۆیە ئەی‌وت : موحەممەد تێ نەپەڕیی ؟ عەبباسیش ئەی‌وت : نەخێر . تا کە دەرکەوت، عەبباس وتی : ئا ئەوە پێغەمبەری خوایە .

سواری وشترەکەی بوو بوو و دەستەی ئەرکانی جەنگ دەورەیان دابوو و ، سەرداری ئەنصار ئوسەیدی کوڕی حوضەیر و ئەبوبەکری یەکەم وەزیری ئەم دیـو و ئـەو دیویـان گرتبوو و فەرمایشتی بۆ ئەکردن ..

ئەم کەتیبە صەوزەیەی ، کە لەبەر ئەوەی ئاسنی زۆریان پێ بوو صەوزی ئەنواند ، هەر چوار هـەزار جـەنگاوەرە ئەنصارەکەی لـە خـۆ گرتبـوو ، لەگـەڵ هەنـدێ لـە موهاجیران و ، هەندێ سەردار و سەرۆکی هۆزە عەرەبـەکان . هـەموو بنەماڵەیـەکی ئەنصار ئاڵای خۆی پێ بوو و ، هەموو پڕ چەك و بە ئاسن داپۆشراو تەنها چاویان بـە دەرەوە بوون. ئەم کەتیبەیە عومەری کوڕی خەططابیشـی لەگـەڵدا بـوو و ، بـە زرێ خـۆی داپۆشـیی بـوو و دەنگیشـی بـەرز کردبوویـەوە ، بـە رادەیـەك کـە سـەرنجی ئەبوسوفیانی راکێشا و پرسیی : ئەمـە کـێـیـە ؟ عـەبباس وتـی : عومـەری کـوڕی خەططابە . وتی : بەخوا کـاری ئـەوەی عـەدیی لـە کـەمیی و زەلیلـیـیـەوە پـەرەی سەندووە . عەبباس وتی : ئەبوسوفیان ! خوا کەسانێك بە شتێ کە خۆی بیەوێ بـەرز ئەکاتەوە ، عومەریش یەکێکە لەوانەی کە ئیسلام بەرزی کردنەوە .

ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ ئاڵا تایبەتی‌یەکـەی خـۆی دابـووە دەسـت سـەرداری ئەنصار سەعدی کوڕی عوبادە . کە لەبەردەمی ئەبوسـوفیاندا تێپـەڕیی بـە دەنگـی بەرز قیڕاندی : ئـەی ئەبوسـوفیان ! ئـەمڕۆ رۆژی کوشـتارە .. ئـەمڕۆ رۆژی دەسـت وەشاندنە.. ئەمڕۆ خوا قورەیشی زەلیل کردووە .

ئەبوسوفیان ترسی لێ نیشت .. ئەمەی بە پێچەوانەی رێككەوتنەکـە ئـەزانیی .. کەواتە قورەیش لە سەروماڵی بێ‌خەم نابێ . بۆیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ تێپەڕی کرد ئەبوسوفیان بە نارەزایی‌یەوە بانگی لێ کرد : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئایا فەرمانت بە کوشتاری خزمەکانت داوە ؟ سەعد و ئەوانەی لەگەڵیا بوون کە بـە لامانـا تێپـەڕیان کرد وتیان : « یا أباسفیان ! الیوم یوم الملحمة ، الیوم تستحل الحرمة ، الیـوم أذل الله قریشاً » . من داوات لێ ئەکەم لەبەر خوا چاوت لە خزمەکانت بێت ، چونکە تـۆ لە هەموو کەسێك چـاكتـر و ، بـەڕەحمتـری ، لـە هـەموو کەسـیش زیـاتر مـافی خزمایەتیی ئەزانیی .

لەو کاتەدا گەورە موهاجیرەکـان وەك عەبـدورڕەحمانی کـوڕی عـەوف و عومـەری کوڕی خەططاب و عوثمانی کوڕی عەففان لـەوێ ئامـادە بـوون و ئـەوانیش دەنگیـان خستە پاڵ دەنگی ئەبوسوفیان و ، نارەزایی‌یان لە وتەکەی سەعد دەربڕیی .

پێغەمبەری خوا ﷺ دڵی هەموویانی دایەوە و فەرمووی : (( اليوم يوم المرحمة ، اليوم يعظم الله فيه الكعبة ، اليوم أعز الله فيه قريشاً )) . فەرمووی : ئەمڕۆ ڕۆژی سۆز و بەزەیی‌یە .. ئەمڕۆ خوا کەعبە بە گەورە و پیرۆز ئەگرێ .. ئەمڕۆ خوا قوڕەیش سەربەرز ئەکات . هەتا بۆ زیاتر متمانەکردنیان فەرمانی دا سەعد لە فەرماندایەتیی بکەوێت و قەیسی کوڕی ئالاکەی هەڵ بگرێت .

کە ئەبوسوفیان سوپای ئیسلامی بینیی بە عەبباسی وت : پاك و بێ‌گەردیی بۆ خوا، هیچ کەس بەرگەی ئەمانە ناگرێت . بەخوا ئەی باوکی فەضل ! ئەمڕۆ موڵك و دەسەلاتی برازاکەت پەرەی سەندووە . عەبباس وتی : ئەبوسوفیان ! ماڵت ئاوابێ موڵك و دەسەلات نیە ، بەڵکو پێغەمبەرایەتی‌یە . وتی : بەڵێ ، وەهایە .

بینینی سوپای ئیسلام لەلایەن ئەبوسوفیانەوە قازانجێکی زۆری هەبوو ، بۆ ئەوەی نە ئەبوسوفیان و نە قوڕەیش بیر لە جەنگ نەکەنەوە و ، بەبێ کوشتار و زەرەر و زیان شاری پیرۆز پاك بکرێتەوە و ، خەڵکەکەشی ڕێبازی تەوحید بگرنە بەر .

دوای ئەوە ئەبوسوفیان گەڕایەوە مەککە و ، لە دڵی‌دا ئەوە جێگیر بوو کە سوپای ئیسلام چار ناکرێ . بۆیە بە پێویستی ئەزانی کە قەناعەت بە گەورە و بچووکی قوڕەیش بکات و ئەوانیش بیر لە جەنگ نەکەنەوە . عەبباسیش ئەوەی دووپات کردەوە کە پێویستە فریای قوڕەیش بکەوێ و بەر لەوەی سوپای ئیسلام بچێتە شارەوە ئەوان قەناعەتیان بە جەنگ نەکردن کردبێ ، تا بەرگریی دروست نەبێت و دانیشتوان سەلامەت بن .

هەر کە ئەبوسوفیان گەیشتەوە شار ، لە هەموو قوژبنێکەوە خەڵکەکە هاتن و دەورەیان لێ دا .. دەستیان دایە پرسیار کە چیی کردووە بۆیان و ، ئەمانیش چیی بکەن چاکە .

ئەبوسوفیانیش بێ پێچ و پەنا هەموو شتێکی بە ڕوونیی بۆ باس کردن .. بۆی گێڕانەوە کە چۆن لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ ڕێك کەوتوون کە جەنگ نەکەن و ، کە یەکەم سەربازی موسڵمان هاتە مەککەوە یاسای نەبوونی هات و چۆ کاری پێ ئەکرێ . خەڵکەکە یان لە ماڵی خۆیاندا دەرگا لەسەر خۆیان داخەن ، یان بچنە ماڵی ئەبوسوفیانەوە ، یان بچنە مزگەوتی کەعبەوە ، تا لە هەموو سزایەك بە دووربن . چونکە هەرکەس ڕێگریی بکات ئەکوژرێت . خۆ هەر کەس لە فەرمان لا نەدات ئەوا

لە سەروماڵی بێخەم بێت . سەرەڕای ئـەم ئامۆژگـاری‌یانـە ئەبوسـوفیان داوای کـرد دانیشتوانی مەککە موسڵمان بن ، چونکە خۆی موسڵمان بووە .

که ئەبوسوفیان باسەکەی دا بە گوێی قورەیش‌دا ، هەندێ کەسـی تونـد و تیـژیان ناڕەزایی‌یان دەربڕیی ، بە تایبەت هینـدی کچـی عوتبـەی هاوسـەری ئەبوسـوفیان . هیند کە باسی خۆ بەدەستەوەدانی بیست هەڵمەتی دایە سەر ئەبوسـوفیان و ، سمێڵـی راکێشا و، داوای کرد دانیشتوانی مەککە بی‌کوژن .

بەڵام دەستەی ناڕەزایی کەم بـوون و هیچـیان پـێ نەئـەکرا ـ دەسـتەی خۆ بـە دەستەوەدان زۆربوون و ، ئەوەیان بە قازانجی مەککە ئەزانیی . ئەوانە هەسـتیان کـرد ئەبوسوفیان دڵسۆزە و راکەشی راستە ، بۆیە فەرمانەکانیان جێ بەجێ کرد .

خەڵکەکە دوای وەرگرتنـی ئامۆژگـاری‌یـەکانی ئەبوسـوفیان بڵاوەیـان لێ کـرد و بڕیاریان هاتە سەر ئەوە کە وا چاکە بەرگریی نەکەن . ئەوەبوو شەقام و کۆڵانـەکانیان چۆڵ کـرد و ، خۆیـان گەیانـدە کەعبـە و هەنـدێکیش چـوونە مـاڵی ئەبوسـوفیان و هەندێکیش چوونە ماڵی خۆیانەوە . بەڵام چەند کەسـێکی کـەم لـە رای فەرمانـدەی قورەیش دەرچوون ، وەك صەفوانی کوڕی ئومەییە و عیکریـەی کـوڕی ئەبوجـەهل و هەندێ بەرهەڵستی‌یان کرد ، کەچیی بەرگەیان نەگرت و دوای کەمێك خالید بەرگریی کەرانی تەفروتونا کردن . شایانی باسە ئەمانە دوایی بوونـە فەرمانـدەی لێهـاتووی سوپای ئیسلام و مەردانـە ئەچوونە مەیـدانی کافرانـەوە ، بـە تایبـەت صـەفوان و عیکریمە کە هەردووکیان لە جەنگی یەرمووك‌دا ، کـە لـە نێـوان سـوپای ئیسـلام و سوپای رۆم دا رووی دا ، شەهید بوون .. [٢٠٤]

**حەوتەم : چوونە ناو مەککەوە**

سوپای ئیسلام کەتیبە لە دوای کەتیبە بەرەو مەککە رۆیشت هـەتا گەیشـتە ( ذو طوی ) ، لەوێ پێغەمبەری خواﷺ سوپاکەی کرد بە پێنج بەشەوە : خۆی فەرماندەی بەشی یەکەم بوو کە بریتیی بوو لە دەستەی ئەرکانی جـەنگ لـە گـەورە موهـاجیر و ئەنصارەکان و ، سەردار و گـەورەی هـۆزە عەرەبـەکان . بـەڵام چوار بەشـەکەی تـر فەرمانیان بەسەردا درا کە دەسـت بەسـەر مەککـەدا بگـرن و ، لـە هـەر لایەکـەوە قورەیش دەست بدەنە چەك و دژی سوپای ئیسلام بووەستن بیان‌هاڕن .. فەرمانداییەتیی

---

[٢٠٤] فتح مكة لباشميل : ١٨٤ ـ ٢٤٣ .

ئەم چوار بەشە بە چوار لە گەورە هاوەڵان سپێررا کە سیانیان لە موهاجیران بوون و یەکێکیان لە ئەنصار ، کە ئەمانە بوون :

١ ـ زوبەیری کوڕی عەووام : فەرمانی بەسەردا درا دەست بەسەر باکووری مەککەدا بگرێ.

٢ ـ خالیدی کوڕی وەلید : فەرمانی بەسەردا درا دەست بەسەر باشووری مەککەدا بگرێ.

٣ ـ ئەبوعویەیدەی کوڕی جەڕڕاح : فەرمانی بەسەردا درا لە باکووری خۆرئاوای مەککەوە بچێتە ناو شارەوە .

٤ ـ قەیسی کوڕی سەعدی کوڕی عویادەی ئەنصاریی :[205] فەرمانی بەسەردا درا لە باشووری خۆرئاوای مەککەوە بچێتە ناو شارەوە .

بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی وا دەرئەکەوێ کە لەو لایەوە چووبێتە شارەوە کە ئەبوعویەیدە پیایا ڕۆیشت ، واتە لە باکووری خۆرئاواوە ، هەتا ئەگاتە ( حجون ) و لەوێوە بەرەو مزگەوت بەرەو خوار ئەبێتەوە .

شایانی باسە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دەرکردبوو کە هیچ موسڵمانێك ، هەتا ناچار نەبێت ، چەك بەکار نەهێنێت . ئەوەبوو هەموو بەشەکانی سوپا بەبێ جەنگ چوونە ناو شارەوە ، جگە لە بەشەکەی خالید کە هەندێ قوڕەیشیی ڕێیان پێ گرت و بە کۆمەکیی هەندێ لە هۆزی بەکر ، لەگەڵیان جەنگان .

کەتیبەکانی سوپای ئیسلام هەر هەموو خۆیان ئامادە کردبوو و چاوەڕوانی فەرمان بوون تا بچنە ناو شاری پیرۆزەوە ..

مەککەی پیرۆزیش بە دار و بەرد و چەم و شیو و چیاکانیەوە خۆی ئامادە کردبوو تا پێشوازیی لەو پیاوە گەورە خواناسە بکات ، کە هەشت ساڵ لەمەو بەر قوڕەیش بە ناڕەوا دەریان پەڕاند .. ئەو پیاوەی کە ئەی‌ویست ئەوان بۆ لای خوا بەرێ و ، لە

---

[205] قەیسی کوڕی سەعد ، باوکی سەرداری خەزرەج بوو ، قەیس یەکێ بووە لە هاوەڵە گەنجە ئازاکان . وەك باوکی نموونەی سەخاوەت و دڵگوشادیی بووە . بۆ نموونە پیاوێك سیی هەزاری بە لای قەیسەوە قەرز کرد ، کاتێ کە بۆی هێنایەوە لێی وەرنەگرتەوە . ئەوەندە بالا بەرز و کەڵەگەت بووە کە سواری ولاغ ببوایە پێی بە زەویی‌دا ئەخشان . لە ژێر فەرمانداپەتیی عەمری کوڕی عاص‌دا بەشداریی رزگارکردنی میصری کردووە . لە جەنگی هاوەڵان‌دا لایەنگیریی هەڵوێستی ئیمام عەلیی کردووە . کاتێکیش کە موعاویە بووە بە خەلیفەی موسڵمانان و قەیس سەری لێ دا ، موعاویە هەڵوێستەکانی لەگەڵ عەلیی‌دا هێنایەوە یادی ، کەچیی قەیس لێی تووڕە بوو و پشت گیریی لە عەلیی دەربڕیی . موعاویە دانی بە خۆی‌دا گرت و ڕێزیشی لێ نا . لە کۆتایی خەلافەتی موعاویە و لە مەدینەدا کۆچی دوایی کردووە ..

ئاگری دۆزەخ لایان بدات و ، بیان‌خاتە سەر ڕێبازی بەهەشت ، کەچیی ئەوان بە نەزانیی و نەفامیی لەگەڵیا جوولاْنەوە و ، کەوتنە سزا و ئازاردانی خۆی و خوشك و برا ئیمان‌دارەکانی ، بە رادەیەك کە ئەوەندە تەنگیان پێیان هەڵ چنی ناچار بوون مەککە بەجێ بهێڵن . پێغەمبەری خواش ﷺ بە قودرەتی خوا لە دەستیان رزگاری بوو، ئەگینا نەخشەی لە ناوبردنیان بۆ کێشا..

وا ئەمڕۆ بە پشت‌گیریی خوا ، بە سەری بەرزەوە ئەگەڕێتەوە مەککە و دە هەزار جەنگاوەری گیان‌فیدا شوێن دینەکەی کەوتوون و ، چاوەڕوانی فەرمانن .

قورەیش هەرچی‌یان لە دەست هات بۆ دژایەتیی دینی خوا درێغی‌یان نەکرد ، کاتێکیش کە زانی‌یان چاری سوپای مەدینەیان پێ ناکرێ ، ئەوەندەیان بۆ مایەوە کە چەك دابنێن .. لەبەر ئەوە نا کە حەزیان لە جەنگ نەبووە ، یان کۆڵیان لە دژایەتیی داوە ، بەڵکو لەبەر ئەوەی کە توانایان نەبوو لەگەڵ موسڵمانان‌دا بجەنگن ..

پێغەمبەری خوایش ﷺ بە دڵە پاکەکەیەوە چاوپۆشیی لێ کردن . بە مەرجێ هەموو دەسەلاتێکی هەبوو و ، ئەشی‌توانیی هەموو سزایەکیان بدات .. بەلاْم دڵی پێغەمبەران پڕە لە خۆشەویستیی و بەزەیی و چاوپۆشیی ، ئیتر جێی رق و قین و دژایەتیی و تۆڵەسەندنی تیا نابێتەوە ..

جا بۆ سەلامەتیی شاری مەککەی پیرۆز پێغەمبەری خوا ﷺ دوو فەرمانی دەر کردن :

**یەکەم** : کە سوپای ئیسلام ئەچێتە مەککەوە بە هیچ جۆرێك چەك بەکار ناهێنێ مەگەر سەربازان بەرگریی لە خۆیان بکەن .

**دووهەم** : هات و چۆ و چەك هەڵگرتن لەلایەن دانیشتوانی مەککەوە قەدەغەیە ، بەڵکو پێویستە هەر کەسە لە ماڵی خۆی‌دا دابنیشێ یان بچێتە مزگەوتەوە ، یان ماڵی ئەبوسوفیان .

ئەوەبوو دانیشتوان گوێڕایەڵیی فەرمانیان کرد ، هەتا چەکەکانیان لە دەرەوەی ماڵەکانیان دانا ، تا ئەوە نیشانەی خۆ بە دەستەوەدان بێت .

شەقامەکان چۆڵ بوون .. دنیا کش و مات بوو .. هەر هەموو گوێ قولاْخی دەنگ و باس بوون .. دڵە ترساوەکان بە پەلە لێیان ئەدا .. تاوان‌باران بیریان لە رابوردووی تاریك و هەڵوێستی چەوتی خۆیان ئەکردەوە .. پەشیمانی کاری نا مرۆڤانەیان بوون . ئەو هەمووە ستەمەیان بەرامبەر بەو هەژارانە بۆ ئەنجام دا ؟ خۆ موحەممەدی کوڕی

عەبدوڵلاَ رۆڵەیەکی میللەت فرۆش نەبوو .. خۆ زیانی بۆ هیچ کەس نەئەویست .. لە هەموو ژیانیدا درۆیەکی لێ نەبیسترا بوو .. هەروەها هاوەڵانیشی شوێن ئیمان کەوتبوون .. دژایەتی کەسیان بە دەستەوە نەبوو .. تاوانباران ئەم یادەوەریانە بە مێشکیاندا ئەهات ..

فەرمان بۆ هەر چوار بەشە هێرشکەرەکەی سوپای ئیسلام دەرچوو تا دەست بەسەر شاردا بگرن ..

هەموو بەشەکان بەبێ بەرهەڵست کردن چوونە شوێنی دیاریی کراو ، جگەلە بەشە سوپاکەی خالید کە تووشی جەنگ بوو ..

ئەوەبوو لە باشووری مەککەدا ، بە سەرکردایەتیی صەفەوانی کوڕی ئومەییە و عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل کۆمەڵێك قورەیشیی کۆ بوونەوە و بڕیاریان دا بچن بە گژی سوپای خالیدا .. هەروەها هەندێ لە پیاوانی هۆزی بەکر و هوذەیلیش هاتبوونە کۆمەکیی ئەو دەستە قورەیشی یە .. ئەمانە دەربەندێکیان داگیر کرد و تیایا جێگیر بوون .

کاتێك کە سوپای خالید لێیان نزیك کەوتەوە دیتی وا ڕێیان لێ گرتوون . کە پێشەنگی موسڵمانان گەیشتە لایان لە بەرزاییەکانەوە و ، لە پشتی بەردەکانەوە تیر بارانیان کردن .

خالید فەرمانی دا سوپا بوەستێ بەڵکو قەناعەت بە ڕێگران بکات و چەك دانێن و بچنە ماڵی خۆیانەوە . بانگی کردە سەرکردەکانیان با لە کەلی شەیتان دابەزن ئەگینا فەرمانی پێیە بیانهاڕێت . بەڵام ئەوان دەریان بڕیی کە لێ ناگەڕێن سوپای ئیسلام بە زۆر بچێتە مەککەوە . دیسان دەستیان بە تیرەوشاندن کردەوە .

دوای ئەو ئاگادارکردنە خالید ناچار بوو فەرمان بە سوپاکەی بدات تا هێرش بکات . بە چەند ساتێکی کەم ڕێگران تەفروتوونا کران و ، بیست و هەشت کوژراویشیان لە دوا بەجێ مان کە چواریان لە هوذەیل بوون ، بەڵام لە سوپای خالید، لەو جەنگەدا هیچ جەنگاوەرێك نەکوژرا ، جگە لە دوو جەنگاوەری کە ڕێیان لێ تێك چوو بوو و بە دەستی ئەعرابی بەکر شەهید کران و ، ناویان کەرزی کوڕی جابیر و حونەیشی کوڕی خالید بوو .

که پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە سەر بەرزاییەك بریسکەی شمشێری بەرچاو کەوت که پرسیاری کرد هەواڵیان دایە کە خالیدە و شەڕیان پێ گێڕاوە ، فەرمووی : (( قضى الله خيراً )) .[٢٠٦]

**هەشتەم : ئەوانەی کە فەرمانی کوشتنیان دەرچوو بوو**

کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بۆ سوپای ئیسلام دەرکرد کە کەس نەکوژرێ ، دە کەسی جیا کردنەوە و فەرمانی دا هەر کەس یەکێ لەو دە کەسەی دەست کەوت ، ئەگەرچیی خۆیشی بە پەردەکانی کەعبەدا هەڵ واسیی بێ ، بیکوژێ .. ئەوانە ئەوەندە تاوان بار بوون دەبوا بکوژرانایە ، کە ئەمانە بوون :

١ ـ عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل .
٢ ـ عەبدوڵلای کوڕی خەطەل .
٣ ـ مەقیسی کوڕی صەبابە .
٤ ـ عەبدوڵلای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبوسەرح .
٥ ـ هەبباری کوڕی ئەسوەد .
٦ ـ حوەیریثی کوڕی نوقەیذ .
٧ ـ هیندی کچی عوتبەی کوڕی رەبیعە .
٨ ـ سارەی کەنیزەکی نەوەی هاشم .
٩ ـ فەرتنا ، ئافرەتێکی گۆرانیبێژی عەبدوڵلای کوڕی خەطەل بوو .
١٠ ـ ئەرنەبە ، ئەویش ئافرەتێکی گۆرانیبێژێ عەبدوڵلای کوڕی خەطەل بوو .

جا سیان لەمانە لە کاتی گرتنی شاری مەککەدا کەوتنە بەردەستی سوپای ئیسلام و لەسەر ئەو تاوانانەی کە لە ئەستۆیان‌دا بوون کوژران ، کە ئەمانە بوون :

١ ـ عەبدوڵلای کوڕی خەطەل : سەرەتا موسڵمان ئەبێ و ، پاشان پیاوێکی موسڵمان ئەکوژێ و ، لە ئیسلامیش هەڵ ئەگەڕێتەوە و هەڵ دێت . جا لەسەر خوێنی کابرای کوژراو ئەبوا بکوژرایە و ، لە یاسای ئیسلامیش‌دا کەسێك لە ئیسلام پاشگەز ببێتەوە دەبێ بکوژرێ . سەرەڕای ئەمانەش ئەم پیاوە لە رۆژی فەتحی مەککەدا چەکی لە دژی موسڵمانان هەڵ گرت . ئەوەبوو ویستی لەگەڵ موسڵمانەکان‌دا بجەنگێ ،

---
[٢٠٦] فتح مكة لباشميل : ٢٤٤ ـ ٢٦١ .

بەلاّم کە سوارچاکانی سوپای ئیسلامی دین لە ترسانا لەرزی لێ هات و بە پەلە خۆی گەیاندە کەعبە و لەسەر ئەسپەکەی دابەزیی و چەکەکەی فڕێ دا و بە پەردەکانی کەعبەدا خۆی هەڵ واسیی . لەو کاتەدا دوو پاڵەوانی ئیسلامی فریا کەوتن و کوشتیان کە سەعیدی کوڕی حەریثی مەخزوومیی [٢٠٧] و ئەبوبەرزەی ئەسلەمیی بوون.[٢٠٨]

٢ ـ حوەیریثی کوڕی نوقەیذ یەکێ بوو لەوانەی کە ئازاری پێغەمبەری خوای ﷺ ئەدا و ، لە کاتی کۆچ کردنیش‌دا نەقیزەی ئەو وشترەی داوە کە فاطیمە و ئوم کولثوومی کچانی پێغەمبەری خوا ﷺ سواری بوون ، تا کەوتوونەتە خوارەوە . بەلاّم لەسەر کارێکی وەها پێغەمبەری خوا ﷺ خوێنی کەسێك حەلاڵ ناکات ، بۆیە ئەبێ تاوانی تری ئەنجام دابێ . ئەوەبوو لە رۆژی فەتح‌دا ویستی لە ماڵەوە خۆی بشارێتەوە، کە ئیمام عەلیی هەواڵی پرسیی ویستی را بکات ، لەو کاتەدا ئیمام پێی گەیشت و کوشتی..

٣ ـ مەقیسی کوڕی صەبابە : ئەم پیاوە برایەکی هەبوو موسڵمان بووبوو ، بەلاّم هاوەڵێکی ئەنصاریی نەی‌ناسیی بوو و بە هەڵە کوشتبووی .. مەقیس هاتە مەدینە و خۆی بە موسڵمان لە قەڵەم دا و ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا خوێنی براکەی پێی بدرێ . کە مەقیس خوێنەکەی وەرگرت ، هەلی بە دەست هێنا و ، موسڵمانە ئەنصاریی‌یەکەی کوشت و ، بە کافریی خۆی گەیاندەوە مەککە .

ئەوەبوو ئامۆزاکەی لە نێوان صەفا و مەڕوەدا حوکمی کوشتنەکەی جێ بەجێ کرد، لەسەر کوشتنی پیاوێك و هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام .

ئیتر ئەوانی تر کەوتنە بەر چاوپۆشیی و لە کوشتن رزگاریان بوو .. بە کۆمەکیی خوا لە دواوە بە درێژە باس ئەکرێن .[٢٠٩]

**نۆهەم : گەیشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ**

هەر چوار سوپاکەی ئیسلام گەیشتنە ناو شاری مەککە و ، پێغەمبەری خوایش ﷺ لەگەڵ دەستەی ئەرکانی جەنگ لە گەورە هاوەڵانی موهاجیر و ئەنصار بە

---

[٢٠٧] سەعید پێش فەتحی مەککە موسڵمان بووە و لە کووفە کۆچی دوایی کردووە . وتوویانە لە حەڕڕە لە سەردەمی یەزیددا کوژراوە .

[٢٠٨] ئەبوبەرزە ناوی نەضلەی کوڕی عوبەیدی کوڕی حەرثە. لە موسڵمانە دێرینەکانە . بەشداریی خەیبەر و بە دواوەی کردووە . بەشداریی فەتحی خۆراسانی کردووە و ، لەگەڵ ئیمام‌دا جەنگی خەواریجی کردووە و ، لە سەردەمی عەبدولمەلیکیش دا لەگەڵ خەواریج جەنگاوە . ساڵی شەصت و چواری کۆچیی لە تەمەنی حەفتا ساڵیی‌دا لە خۆراسان کۆچی دوایی کردووە .

[٢٠٩] فتح مكە لباشميل : ٢٦٥ ـ ٢٧٠ .

دوایـان‌دا کەوتە ڕێ و دوو هەزار جەنگاوەر دەورەیان دابـوو و ، دوو پیـاوی گـەورەی هۆزە عەرەبەکانیش ، کە ئەقرەعی کوڕی حابیس و عویەینەی کوڕی حیصـن بـوون ، ئەم‌دیو و ئەودیویان گرت بوو ، هەرچـەندە جگـە لـە دە جـەنگاوەری نـەوەی تـەمیم جەنگاوەری ئەوان بەشداریی سوپای فەتحیان نەکرد ..

پێغەمبەری خوا ﷺ لە بـاکووری خۆرئـاوای مـەککـەوە چـووە نـاو شـارەوە هـەتا گەیشتە ( حجون ) و ، لەوێ ئەبینێ وا فەرماندەی دووهەمی سوپا زوبـەیری کـوڕی عەووامی پوورزای گەیشتۆتە ئەوێ .. ئەوەبوو لـە کـاتی چـوونە نـاو شـاردا سـەری بەندایەتیی بۆ خوا دانەواند وا ئەم ڕۆژە ڕووناکەی لە خۆی و دینەکەی کردەوە و ، هەر بەسەر وشترەکەیەوە خەریکی خوێندنی سوورەتی ( الفتح ) بوو ، بەڵام نە خـۆی و نـە هیچ هاوەڵێکی ئیحرامیان نەبەستبوو ، تەنها ئەوەندە لە کـاتی داخـڵ‌بـوون‌دا خـۆی شۆرد .

لەو کاتەدا کە بەسەر پشتی وشترەکەیەوە بوو و ئەهاتە نـاو شـارەوە و ئوسـامەی کوڕی زەیدیش لە پاشکۆی‌دا سوار بوو بوو ئەی‌فەرموو : (( أللهم ! إن العيش عـيش الآخرة )) .

کاتێ کە ئەچووە ناو شارەوە و پاڵەوانەکانی ئیسـلام چـوار دەوریـان گـرت بـوو ، پیاوێکی تووش بوو و ویستی قسەی لەگەڵ‌دا بکات . بەڵام کابرا ترسێکی وەهـای لێ نیشت کە بە ئاشکرا هەڵ ئەلەرزیی . کە ئەمـەی دیـی بـۆ نوانـدنی ( تـواضـع ) و دڵ دانەوەی کابرا فەرمووی : (( هون عليك فإنما أنا إبن امرأة من قريش تأكل القديد )) . فەرمووی : کاکە ! وەرەوە سەر خۆت ، من کوڕی ئافرەتێکی قوڕەیشییم کـە گۆشـتی وشکەوە کراوی ئەخوارد ..

لەو کاتەدا کە سوپای ئیسلام چووە ناو مەککەوە دوو سەرداری قوڕەیشـیی ، کـە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوڕەبیعە و حاریثی کوڕی هیشام بوون ، لە خۆیـان ئەترسـان کـە بکوژرێن ، لەبەر ئەوە وایان بـە چـاك زانیـی پـەنا بەرنـە بـەر ئـوم هـانیء‌ی کچـی ئـەبـوطالیب ، کە مێردەکەی خزمیان بوو ، تا پەنایان بدات . ئـەویش پـەنای دان . لەو کاتەدا ئیمام عەلیی بە دوایان‌دا ئەگەڕا کە بیان‌کوژێ ، کە بیستی وان لە مـاڵی خوشکەکەی هات و ویستی بیان‌کوژێ، بـەڵام خوشـکەکەی نـەی‌هێشـت و ، وتـی : مەگەر لە پێشەوە من بکوژی ئەوسا دەست بۆ ئەوان بەری . ئیتر ئیمام ئەڕوا و ، ئوم هانیء یش دەرگا لەسەر دوو خزمەکەی دائەخا و ئەچـێت بـۆ چـادرەکەی پێغەمبـەری

خوا ﷺ لەوێ نابێ و چاوی بە فاطیمە ئەکەوێ و ئەبینێ ئەو لە عەلیی توندترە .. چاوەڕوان ئەبێ هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەڕێتەوە و ، باسەکەی بۆ ئەگێڕێتەوە ، ئەویش بەڵێنی ئەداتێ کە هەر کەسێ ئەو پەنای دابێ ، ئەمیش پەنای ئەدات . پاشان فەرمان ئەدات فاطیمەی کچی ئاوی بۆ ئامادە بکات بۆ خۆشۆرین و ، دوای ئەوە هەشت رەکعەت نوێژ بەجێ ئەهێنێ ، چونکە چێشتەنگاوی رۆژی فەتح ئەبێت .

دوو پەناهەندەکە دوو رۆژ لە ماڵی ئوم هانیء ئەمێننەوە پاشان بە ئازادیی ئەگەڕێنەوە ماڵی خۆیان . شایانی باسە کە ئەم دوانە لە ناو ئەوانەدا نەبوون کە خوێنیان حەلاڵ کرا بوو ، بەڵام لە رۆژی فەتحدا لەگەڵ سوپای ئیسلامدا جەنگا بوون و ئیمامیش راوی نابوون .

کە مەککە فەتح کرا پێغەمبەری خوا ﷺ شوێن نەبوو تێی بچێ چونکە عەقیلی کوڕی ئەبوطالیبی [٢١٠] ئامۆزای خانووەکەی ئەوانی فرۆشتبوو ، ناچار پێغەمبەری خوا ﷺ لە ( حجون ) لە ناو چادردا مایەوە .

بەڵێ ، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستەی ئەرکانی جەنگی دەورەیان دابوو و ، دە هەزار جەنگاوەری رێك و پێك ، کە رمەکانیان بەرەو ئاسمان ئاراستە کرا بوون ، بە دوایانەوە بەرەو کەعبەی پیرۆز ئەکشان .. دەنگی زوڵاڵی ( ألله أكبر ) کە لەو سوپا مەزنەوە بەرز ئەبوویەوە مەککەی هێنابووە لەرزە ، بە رادەیەك کە وەها بە بیری بت پەرستەکاندا ئەهات کە چیاکانی دەوروبەری مەککە لەم تەکبیر وتنەدا بەشداریی سوپای ئیسلام ئەکەن. هەتا هەندێ لە دانیشتوانی مەککە ، دوای تێك شکانی هەڵ گەڕاوەکان ، شەقامەکانی مەککەیان چۆڵ کرد و سەرکەوتنە سەر بەرزاییەکانی مەککە . لەسەر لووتکەی چیاکانەوە سەیری دیمەنی قەشەنگی ئەو سوپا دە هەزارییە رێك و پێکەیان ئەکرد کە دوورگەی عەرەبیی سوپای وەهای بە خۆیەوە نەدیی بوو ..

کە پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی بە کەعبە کەوت تەکبیری فەرموو و موسڵمانەکانیش لەگەڵیا بەردەوام بوون ، هەتا ئاماژەی بێدەنگبوونی بۆ کردن . بەمە خەوەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دیی و موسڵمانان بە سەرکەوتنی خوا شادمان بوون .

---

[٢١٠] عەقیلی کوڕی ئەبوطالیب برای جەعفەر و عەلیی بووە ، بەڵام وەك ئەوان زوو موسڵمان نەبووە ، بەڵکو رۆژی فەتح موسڵمان بووە . لە جەنگی بەدردا لەگەڵ سوپای قورەیشدا بووە و بە دیلییش کەوتۆتە دەست موسڵمانەکان . زیرەك و وریا بووە و هەمیشە وەڵامی حازر بووە . لە جەنگی صیففیندا دایە پاڵ موعاویە . موعاویە ئەمەی پێ خۆش بوو کە برای ئیمام عەلیی پاڵی پێوە داوە ، بۆیە وتی : تۆمان لەگەڵی عەقیل . ئەویش خێرا وەڵامی دایەوە و وتی: رۆژی بەدریش لەگەڵتان بووم ! لە سەرەتای خەلافەتی یەزیددا کۆچی دوایی کردووە .

کە گەیشتنە کەعبەی پیرۆز ، پێغەمبەری خوا ﷺ یەکەم جار طەوافی ماڵی خوای کرد .. ئەوەندە قەرەباڵغ بوو و ، ئەویش بەسەر پشتی وشترەکەیەوە بوو بە گۆچانێک ئاماژەی بۆ بەردە رەشەکە ئەکرد .. پاشان دوو رەکعەت نوێژی بەجێ هێنا و ، دوای ئەوە بەرەو زەمزەم چوو و داوای ئاوی زەمزەمی کرد بۆ خواردنەوە و دەست نوێژ گرتن. کاتێ دەستنوێژی ئەگرت موسڵمانەکان نەیانئەهێشت ئاوەکە بکەوێتە زەویی ئەیانگرتەوە . بت پەرستەکان بە سەرسوڕمانەوە ئەیان وت : هەرگیز پادشای وەهامان نەدیوە و نەبیستووە .

لە کاتی طەوافدا موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی ئەنصاریی ، سەرۆکی پاسەوانان جڵەوی وشترەکەی گرتبوو ..

لەو رۆژە مێژوویی‌یە مەزنەدا کە فەتحی مەککەی پیرۆزی تێدا کرا و ، لە کاتی طەوافی کەعبەی پیرۆزدا پیاوێکی نەوەی بەکری کوڕی کەنانە ، کە ناوی فوضالەی کوڕی عومەیر بوو هەوڵی دا دەست لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوەشێنی و بی‌کوژێ ، بەڵام خوای گەورە بە سۆز و بەزەیی بەلێشاوی خۆی ئازیزەکەی خۆی ئاگادار کرد ..

کاتێك کە فوضالە لێی نزیك کەوتەوە تا دەستی لێ بوەشێنێ ، ئەم پرسیاری لێ کرد و فەرمووی : (( أفضالة ؟ )) . فەرمووی : فوضالەی ؟ وتی : بەڵێ فوضالەم ، ئەی پێغەمبەری خوا .

فەرمووی : (( ماذا كنت تحدّث به نفسك ؟ )) فەرمووی : لە دڵی خۆتدا باسی چیت ئەکرد ؟

فوضالە وتی : هیچ ، ذیکری خوام ئەکرد .. پێغەمبەر ﷺ پی‌کەنی و پاشان فەرمووی : (( إستَغفِرِ الله )) . فەرمووی : داوای لێ خۆش بوون لە خوا بکە .. پاشان دەستی شەریفی خستە سەر سنگی و دڵی نیشتەوە .

فوضالە ئەیوت : دەستی لەسەر سنگم لا نەبرد ، هەتا وام لێ هات لە بەدیی هێنراوانی خوادا هیچ شتێك نەبوو لەو خۆشەویستتر بێ بە لامەوە ..

لە ریوایەتی ئیبن‌عەبباسدا خوا لێیان رازیی بێ هاتووە لە رۆژی فەتحدا پێغەمبەری خوا ﷺ بتەکانی دەوروبەری کەعبە ئەشکێنێ ، کە هەر هۆز و بنەماڵەیەك بۆ خۆی بتێکی لەوێ دانابوو و بە قوڕقوشم دابەسرا بوو و ، ژمارەشیان سێ صەد و شەصت بت ئەبوون . پێغەمبەری خوا ﷺ داردەستێکی بە دەستەوە بوو و، بەو دارە ئاماژەی کەوتنی بۆ یەکە بە یەکەی بتەکان ئەکرد و ، بێ‌ئەوەی

دارەکەیان بەر بکەوێ و ، هەرچەندەش بە قورقوشم دابەسرابوون ، یەکسەر ئەکەوتن..

لەو کاتەدا کە ئاماژەی بۆ ئەکردن ئایەتی پیرۆزی :

﴿وَقُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ ٱلْبَٰطِلُ ۚ إِنَّ ٱلْبَٰطِلَ كَانَ زَهُوقًا﴾( الإسراء : ٨١ ) یشی ئەخوێند..

بەلاّم لە ریوایەتەکەی بوخاریی‌دا وەها هاتووە کە بە داردەستەکە لێی ئەدان و ئەی‌فەرموو : (( جاء الحق وزهق الباطل ، جاء الحق وما يبدىء الباطل وما يعيد )) .

هەروەها فەرمانی دا ئەو وێنانە بسڕنەوە کە بتپەرستەکان لە ناو کەعبەدا کێشابوونیان ، ئەوسا تەشریفی بردە ناو کەعبەوە . ئەو وێنانە عومەری کوڕی خەططاب سڕینیەوە .

لە موسنەدی ئیمام ئەحمەددا لە ئیبن عەبباس‌ەوە هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە ڕۆژی فەتح‌دا چووە ناو بەیتەوە وێنەی ئیبراهیم و مەریەمی تێدا بینیی فەرمووی : (( أما هم فقد سمعوا أن الملائكة لا تدخل بيتاً فيه صورة ، هذا إبراهيم مصوراً فما باله يستقسم ؟ )) . فەرمووی : خۆ ئەوان بیستوویانە هەر ماڵێك وێنەی تێدا بێت مەلائیکەتی تێ ناچێت . ئەمەش وێنەی ئیبراهیمە ، چیەتی خەریکی ئەزلامە ؟

دوای ئەمانە بۆ یەکەم جار پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناو کەعبەدا دوو ڕەکعەت نوێژی بە جێ هێنا ، ئەمەش دوای ئەوەی کە دەرگاکەی لەسەر خۆی و ئوسامەی کوڕی زەید و بیلالی کوڕی ڕەباح داخست .

لە ڕۆژی فەتح‌دا و لە دەوری کەعبەدا موعجیزەیەکی تری پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دیی ..

لە باسەکانی پێشەوە ئاگادار بووین کە خالیدی کوڕی وەلید و عەمری کوڕی عاص و عوثمانی کوڕی طەلحە ، هەر سێکیان لە مەککەوە کەوتنە ڕێ و خۆیان گەیاندە مەدینە و موسڵمان بوون و ، پێغەمبەری خواش ﷺ بە جگەرگۆشەکانی مەککەی لە قەڵەم دان .. لە بیرمان نەچێ کە عوثمانی کوڕی طەلحە ، کە لە نەوەی عەبدوددار بوو، هەڵگری ئاڵای قوڕەیش بوو و ، لە جەنگی ئوحوددا زۆریان لێ کوژران و مەردانە بەرگری‌یان لە ئاڵای قوڕەیش ئەکرد .. بە ڕادەیەك کە بە کوژرانی ئەوان قوڕەیش تێك

شکا و هەڵاتن و موسڵمانانیش دوایان کەوتن ، تا ئەوەبوو لە ئەنجامدا موسڵمانەکان شکستیان خوارد ..

کاتێك کە موسڵمانەکان لە مەککەدا بوون و کۆچیان بۆ مەدینە نەکردبوو ، هەرچیی قورەیش دەرگای کەعبەیان بکردایەتەوە نەیانئەهێشت پێغەمبەری خوا ﷺ بچێتە ناویەوە .

عوثمانی کوڕی طەلحە ئەڵێت : لە سەردەمی نەفامییدا رۆژانی دووشەممە و پێنج شەممە دەرگای کەعبەمان ئەکردەوە . رۆژێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ هات و ویستی لەگەڵ خەڵکەکەدا بچێتە ژوورەوە ، منیش قسەی رەقم پێ وت ، کەچیی ئەو لەگەڵم دا بەحیلم بوو ، پاشان فەرمووی : (( یا عثمان ! لعلك ستری هذا المفتاح یوماً بیدي أضعه حیث شئت )) . فەرمووی : عوثمان ! لەوانەیە رۆژێك بێت ئەم کلیلە بە دەستی منەوە ببینی و منیش بە ویستی خۆم بە هەر کەسی بدەم . منیش وتم : کەواتە ئەو رۆژە قورەیش تیا چووە و زەلیل بووە . فەرمووی : (( بل عمّرت وعزّت یومئذ )). فەرمووی: بەڵکو ئەو رۆژە تەمەندرێژ و بەدەسەڵات ئەبێت . ئیتر چووە کەعبەوە و، فەرمایشتەکەی وەها کاری تێ کردم کە وام ئەزانی ئەوەی ئەو ئەیفەرموو دێتە دیی. کە رۆژی فەتح هاتە بەرەوە فەرمووی : (( یا عثمان ! إئتني بالمفتاح )) . فەرمووی: کلیلەکەم بۆ بهێنە . منیش بۆم هێنا و لێمی وەرگرت ، پاشان دایەوە پێم و، فەرمووی : (( خذوها خالدة تالدة ، لا ینزعها منکم إلا ظالم . یا عثمان ! إن الله استأمنکم علی بیته ، فکلوا مما یصل إلیکم من هذا البیت بالمعروف )) . فەرمووی: ئەو کلیلانە بە هەمیشەیی وەریگرن ، هەر کەس لێتان بسێنێ ستەم کارە . عوثمان! خوای گەورە ئێوەی بە ئەمین داناوە لەسەر ماڵەکەی .. ئەوەی بە بۆنەی ئەم ماڵەوە بە دەستتان ئەگات بە رێك و پێکیی بیخۆن .

ئەڵێت : کە پشتم هەڵ کرد بانگی لێ کردم و منیش گەڕامەوە خزمەتی و فەرمووی : (( ألم یکن الذي قلت لك ؟ )) . فەرمووی : ئایا ئەوەی پێم وتی نەهاتە دیی ؟ ئەڵێت : فەرمایشتەکەی مەککەی پێش کۆچ کردنیم هاتەوە یاد : (( لعلك ستری هذا المفتاح بیدي أضعه حیث شئت )) و ، وتم : بەڵێ شاهێدیی ئەدەم کە تۆ پێغەمبەری خوایت .

چیرۆکی دەستکەوتنی کلیلی کەعبە بەم جۆرە بوو :

ئەوەبوو عوثمانی کوڕی طەلحە پێش فەتح چوو بۆ مەدینە و موسڵمان بوو و ، کلیلی کەعبە لای دایکی ، کە ناوی کچی شەیبە بوو مایەوە و ، ئەویش هەتا رۆژی فەتح بە کافریی مایەوە . کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەتحی مەککەی کرد بیلالی نارد بۆ لای عوثمانی کوڕی طەلحە تا کلیلەکەی بۆ بهێنێ . ئەویش چوو بۆ لای دایکی و داوای کلیلەکەی لێ کرد . دایکی ئەوپەڕی ناڕەزایی دەربڕیی . ئەویش پاڕایەوە کە کلیلەکەی بداتێ تا یەکێکی تر نەهاتووە بە زۆر لێی بستێنێ . لە ناکاودا دەنگی ئەبوبەکر و عومەر خوا لێیان رازیی بێ هات ، ئیتر ئافرەتەکە وای بە چاك زانیی بێ دەنگ کلیلەکە تەسلیم بکات ، چونکە نەك هەر ئەو بەڵکو هەموو قوڕەیش لە عومەر ئەترسان.

دوای ئەوەی کە بارودۆخی شار هێمن بوویەوە ، هات و چۆ ئاسایی بوویەوە و ، خەڵکی مەککە لەو رۆژە مێژوویی‌یەدا لە هەموو لایەکەوە هاتن و روویان کردە مزگەوت تا بە چاو و گوێی خۆیان ببینن و ببیستن پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ قوڕەیشی تێکشکاودا هەڵس و کەوتی چۆنە و ، چ هەڵوێستێك بەرامبەریان وەرئەگرێت.

بەڵێ ئەمڕۆ موحەممەدی ڕۆڵەی بە ئەمەکی مەککە خاوەنی دە هەزار سوپای چەکداری خۆ فیداکەرە و ، وا هاتووە دەستی بەسەر مەککەدا گرتووە .. ئەمڕۆ مافی خۆیەتی تۆڵەی بیست ساڵی خۆی و هاوەڵانی لە قوڕەیش وەربگرێتەوە .

کە دانیشتوانی مەککە لە دەوری مزگەوت جەم بوون ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بەسەر بیلال‌دا دا سەر کەوێتە سەر بانی کەعبە و بانگ بدات ، تا بەوە دەری ببڕێ کە تەوحید دەسەڵاتی بەسەر مەککە دا ئەڕوات و ، دەسەڵاتی بت پەرستیی کۆتایی پێ هات .

قوڕەیشی‌یەکان کە بیلالیان بەسەر کەعبەوە دیی یەکجار پێی ناڕەحەت بوون و هەندێکیان راستەوخۆ ناڕەزایی‌یان دەربڕیی .

عەتتابی کوڕی ئوسەید ، کە هێشتا موسڵمان نەبوو بوو وتی : خوا رێزی لە ئوسەید ( واتە باوکی ) نا کە نەما تا گوێی لە بانگی ئەمە نەبێت .

یەکێ لە نەوەی سەعیدی کوڕی عاص‌یش وتی : خوا رێزی لە سەعید نا کە ئەوەبوو بەر لەوەی گوێی‌لە بانگی ئەم رەشە بێ لەسەر بانی کەعبە بردیەوە بۆ لای خۆی.

پیاوێکی قورەیشییش بە حاریثی کوڕی هیشامی وت : نابینی ئەو بەندەیە سەرکەوتۆتە سەر کوێ ؟ وتی : وازی لێ بهێنە ، ئەگەر خوا پێی ناخۆش بێ گۆڕانی بەسەردا ئەهێنێ .

دوای ئەوەی کە ئەبوسوفیان وتەی ئەو پیاوانەی بیست وتی : من هیچ ناڵێم ، چونکە ئەگەر قسە بکەم ئەو دەنکە چەوانە هەواڵی ئەدەنێ .

حاریثی کوڕی هیشامیش وتی : بەخوا ئەگەر من بزانم لەسەر راستی‌یە شوێنی ئەکەوم .

لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ناویان و فەرمووی : زانییم چیتان وت . پاشان بۆی باس کردن کە هەر یەکە چیی وتووە . ئەوەبوو حاریثی کوڕی هیشام و عەتتابی کوڕی ئوسەید وتیان : شاهێدیی ئەدەین کە پێغەمبەری خوایت . بەخوا هیچ کەسێ لەوانەی لەگەڵمان بوون بەمەیان نەزانیوە تا بڵێین ئەو هەواڵی پێ داوی .

ئەگێڕنەوە کە ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب ، دوای ئەوەی کە موسڵمانەکان بە تەواویی مەککەیان فەتح کرد ، شەیتان ئەوە دێنێ بە دڵی‌دا کە سەر لە نوێ سوپا کۆ بکاتەوە و بچێت بە گژی پێغەمبەردا ﷺ . ئەوەبوو خوای گەورە پێغەمبەرەکەی خۆی ئاگادار کرد و دای بەسەر سنگی ئەبوسوفیان‌دا و فەرمووی : (( إذن يخزيك الله )) . فەرمووی : کەواتە خوا سەرشۆڕت ئەکات . ئەویش وتی : ئەگەڕێمەوە بۆ لای خوا و داوای چاوپۆشیی ئەوەشی لێ ئەکەم کە بە دەمم‌دا هات .

لە ریوایەتەکەی واقیدیی‌دا وەها هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناو شانی ئەبوسوفیان ئەدا و ، کە ئەویش ئەی‌بینێ ئەڵێت : هەتا ئەم سەعاتە بە یەقینیی بۆم دەرنەکەوتبوو کە پێغەمبەریت .

ئەو رۆژەی کە موسڵمانەکان فەتحی مەککەیان کرد ، کە یەکەم شەویان بەسەردا هات هەتا رۆژ بوویەوە هەر خەریکی تەهلیل و ، تەکبیر و ، طەوافی کەعبە بوون .

ئەو شەوە ئەبوسوفیان بە هیندی هاوسەری وت : ئایا ئەمە لە خواوە ئەزانیت ؟ ئەویش وتی : بەڵێ ، ئەمە لە خواوەیە . کە ئەبوسوفیان رۆژی لێ بوویەوە و چووە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ، فەرمووی : (( قلت لهند أترى هذا من الله ؟ قالت : نعم هذا من الله )) . فەرمووی : تۆ بە هیندت وت : ئایا ئەمە لە خواوە ئەزانیت ؟ ئەویش وتی : بەڵێ ئەمە لە خواوەیە . ئەبوسوفیان وتی : شاهێدیی ئەدەم کە تۆ

بەندە و پێغەمبەری خوایت . بەو کەسەی کە سوێندی پێ ئەخورێ ئەم وتەیەی من جگە لە هیند تاقە کەسێکی تر نەی‌بیستووە .[٢١١]

**دەهەم : لێ بووردن و موسڵمان بوون**

خەڵکەکە لە دەوری کەعبە جەم بوو بوون و چاوەڕوان بوون .. پێغەمبەری خوایش ﷺ لە دەرگای کەعبەدا وەستا بوو و دەستی بە هەردوو باهووی دەرگاکە گرتبوو و ، کلیلەکانی کەعبەش لە دەستیا بوون ـ هێشتا نەی‌دابوون بە عوثمانی کوڕی طەلحە وەك لە پێشەوە باس کرا ـ و ، خالیدی کوڕی وەلیدی فەرمانەدەی هێزی ئەسپ سوارانیش خەڵکیی لێ دوور ئەخستەوە . هەموو خەڵکەکە سەیری ئازیزیان ئەکرد ، تا وتاریان بۆ بدا و ، چارەنووس بۆ دانیشتوانی مەککە دیاریی بکات .

وتارەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ چەند باسێکی گرنگی گرتبووە خۆ کە ئەو ڕۆژە کاتی گونجاو بوو بۆ ئەو باسانە . ئەمانەش هەندێ لە بابەتەکانی ئەو وتارە مێژوویی‌یە بوون:

**١ـ چاوپۆشیی لە دانیشتوانی مەککە** :

سەرەتا بەم شێوەیە سوپاسی خوای گەورەی کرد : (( الحمد الله الذي صدق وعده ونصر عبده ، وهزم الأحزاب وحده )) .

پاشان رووی کردە دانیشتوان ، کە خەریك بوو لە ترساندا دڵیان بێتە دەرێ و، پرسیاری لێ کردن : (( یا معشر قریش ، ویا أهل مكة ! ماذا ترون أني فاعل بکم؟ )) . فەرمووی : ئەی کۆمەڵی قورەیش و دانیشتوانی مەککە ! چاوەڕوانن من چیتان لێ بکەم ؟ لە ریوایەتێکی تردا :(( ماذا تقولون وماذا تظنون ؟ )) . فەرمووی: ئێوە چیی ئەڵێن و ، چیی بە دڵتاندا دێت ؟ وتیان : ظەننی چاك ئەبەین و چاکیش ئەڵێین . تۆ برایەکی بەرێز و کوڕی برایەکی بەڕێزمانی و وا توانا و دەسەلاتیش لە دەستتدایە .

لێرەدا بەڕێزیی و بە ئەمەکیی رۆڵەی دڵسۆزی مەککە دەرکەوت .. ساڵەهای ساڵ قورەیش سزای خۆی و هاوەڵانیان دا ، لەسەر ئەوەی کە بۆ سەر رێی سەربەرزیی دنیا و قیامەت بانگی ئەکردن ، کەچیی ئەوان وەك ناپاکێکی دوژمن بە کەس و کاری

---

[٢١١] فتح مكة لباشميل : ٢٧١ ـ ٢٩٨ .

خۆی لە قەڵەمیان دا .. سیحربازیی و شێتیی و کاهنییان دایە پاڵی ، هەر چەندە تەمەنێکی زۆری بە پاکیی و سەلامەتیی و دڵسۆزیی لە ناویاندا بەسەر بردبوو ..

لێرەدا سەلماندی چەند خەمخۆری مرۆڤەکانە .. ئەوەبوو چاوپۆشیی تەواوی بۆ هەموان دەربڕیی . ئەوەبوو فەرمووی : (( لا تثريب عليكم اليوم يغفر الله لكم وهو أرحم الراحمين . إذهبوا فأنتم الطلقاء )) . فەرمووی : ئەمڕۆ هیچتان لەسەر نیە، خوا لێتان خۆش ببێ کە هەر خۆی لە هەموو کەسێ بەڕەحمترە .. بڕۆن ئازاد بن..

**٢ـ حەرام کردنی ڕیبا :**

لە سەردەمی نەفامییدا ڕیبا گرنگترین یاسای بازرگانیی و ئابووریی بوو .. دیارە ڕیباش لەگەڵ ئامۆژگاریی و یاساکانی ئیسلامدا ناگونجێت ، چونکە ئیسلام ستەم و خوێنمژینی ناوێ و ، ڕیباش خراپترین ستەم و خوێنمژینە بۆ هەژاران و، دەوڵەمەندان پێی ملهوڕ ئەبن و ستەم لە هەژاران ئەکەن .

پێغەمبەری خوا ﷺ لە وتارەکەیدا ڕیبای بە یەکجاریی حەرام کرد کە فەرمووی: (( ألا إن ربا في الجاهلية أو دم أو مال أو مأثرة فهو تحت قدميّ هاتين ، إلا سدانة البيت وسقاية الحاج )) . بەمە جگە لە کلیلەوانیی کەعبە و ئاودانی حاجییان هەموو کردەوەیەکی نەفامیی خستنە ژێر پێی و قەدەغەی کردن .

**٣ـ دیاریی کردنی خوێنی کوژراوی بە هەڵە :**

یاسای خوێندانی کوژراوی بە هەڵە و ( شبه عمد ) یشی دەرکرد کە لە شەرعدا بە ( ديّة ) ناوبراوە ، کە فەرمووی : (( ألا وفي القتيل الخطأ ، مثل شبه العمد ، السوط والعصا ، فيهما الدية مغلظة ، مائة من الإبل منها أربعون في بطونها أولادها )) . فەرمووی : کوژراوی بە هەڵە و ( شبه عمد ) خوێنیان صەد وشترە کە ئەبێ چلیان سکیان پڕ بێت .

**٤ـ یەکسانیی مرۆڤەکان :**

پاشان یەکسانیی مرۆڤەکانی خستە روو و ، جیاوازیی ڕەگەزی حەرام کرد . واتە لە ئیسلامدا جیاوازیی ڕەنگ و ڕەگەز و زمان نیە و ، بەرز و نزمیی مرۆڤەکان تەنها بە ڕادەی تەقوایە و ، بە پێی ئەو خزمەتەیە کە هەر موسڵمانێك پێشکەش بە مرۆڤایەتیی ئەکات . ئەوەبوو فەرمووی : (( يا معشر قريش ! إن الله قد أذهب عنكم نخوة الجاهلية وتكبرها . الناس من آدم وآدم من تراب )) . فەرمووی : ئەی کۆمەڵی قوڕەیش ! خوای گەورە لە فیز و دەماری سەردەمی نەفامیی پاکی کردوونەتەوە . هەموو خەڵکیی لە ئادەمن و ، ئادەمیش لە گڵە .

پاشان ئایەتی پیرۆزی سوورەتی ( الحجرات ) ی بەسەریاندا خوێندەوە :

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَـٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴾ ( الحجرات : ١٣ ) .

**٥ ـ ڕێزی مەککە هەتا هەتایە** :

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ لە وتارە مێژووییەکەیدا باسی ڕێز و پایەی مەککەی پیرۆزی کرد کە هیچ بیانوویەك ڕێ نەدراوە خوێنی هیچ کەسی تێدا بڕێژرێ .

بوخاریی لە شورەیحی خوزاعییەوە ریوایەتی کردووە کە بە عەمری کوڕی سەعیدی وتووە ، کاتێك کە خەریك بوو سوپای بۆ مەککە ڕەوانە ئەکرد : ئەی عەمر ! ماوەم بدە فەرمووده‌یەکت بۆ بگێڕمەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە بۆ سبەینێی ڕۆژی فەتح فەرمووی و ، کاتێ کە فەرمووی هەردوو گوێم بیستیان و دڵم وەری گرت و هەردوو چاویشم بینییان . ئەوەبوو سوپاس و ستایشی خوای کرد و پاشان فەرمووی : (( إن مكة حرمها الله ولم يحرّمها الناس . لا يحل لامريء يؤمن بالله واليوم الآخر أن يسفك بها دماً ولا يعضد بها شجراً ، فإن أحد ترخص بقتال رسول الله فقولوا : إن الله أذن لرسوله ولم يأذن لكم ، وإنّما أذن لي فيها ساعة من نهار ، وقد عادت حرمتها اليوم كحرمتها بالأمس . فليبلغ الشاهد الغائب )) . فەرمووی : مەککە خوا ڕێزی لێ ناوە نەك خەڵکیی . هەر کەسێ ئیمانی بە خوا و ڕۆژی قیامەت هەیە بۆی حەڵاڵ نییە خوێن بڕێژێ و درەخت ببڕێتەوە . ئەگەر کەسێکیش بە بۆنەی جەنگی پێغەمبەری خواوە کارەکەی بە روخصەت لە قەڵەم دا ، ئەوا بڵێن : خوا ماوەی پێغەمبەرەکەی داوە ، بەڵام ماوەی ئێوەی نەداوە . منیش تەنها سەعاتێکی ڕۆژێك ماوەم دراوە ، ئیتر یاساغ بوونی وەك یاساغ بوونی دوێنێی لێ هاتۆتەوە .. جا با ئامادەتان ئامادە نەبووتان تەبلیغ بکات .

هەروەها لە وتارەکەیدا هەندێ ئامۆژگاریی تری موسڵمانانی کرد ، وەك ئەوەی موسڵمانان یەك ئوممەتن و لە هەموو شتێکدا یەکسانن و برای یەکن ..

هەندێ بڕیاری شەرعییشی پیشاندان وەك :

نابێ ئافرەت شوو بەسەر هەردوو پووریدا بکات .

هەرکەس دەعوایەکی هەبوو پێویستی بە شاهێد هەیە و ، ئەوەش کە ئینکاریی بکات سوێندی لەسەرە .

سێ ڕۆژ ڕێگا ئافرەت بۆی نیە بەبێ مەحرەم بچێ بۆ سەفەر .

دوای نوێژی بەیانیی و نوێژی عەصر نوێژی سوننەت نیە .
لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و ڕۆژانی جەژنی قوربان‌دا ڕۆژووگرتن قەدەغەیە .
پیاو نابێ بە یەك کراس ( إشتمال ) بکات ، واتە تەنها یەك کراسی لەبەردا بێت و، لایەکی بەرز بکاتەوە و بێ‌خاتە سەرشانی و عەورەتی دەربکەوێ .
نابێ لە حەرەم‌دا ڕاو بکرێ و درەختی تیا ببڕێ و ، شتی گوم بوویشی هەڵ نەگیرێ، مەگەر کەسێك بە دوای‌دا بگەڕێ .
بەڵام عەبباسی کوڕی عەبدولموطەللیب کە خاوەنی تاقیی‌کاریی بوو وتی : جگە لە ( إذخر ) ، ئەی پێغەمبەری خوا ، چونکە بێ ئەو ناکرێ ، بۆ قەبر و بۆ پاك و خاوێنیی ماڵ . ماوەیەك پێغەمبەری خوا ﷺ بێ‌دەنگ بوو و پاشان فەرمووی : (( إلا الإذخر ، فإنه حلال )) . ئیذخیر گیایەکی بۆن خۆشە .
بەم وتارە مێژوویە کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێشکەش بە دانیشتوانی مەککەی کرد سەلماندی کە بت‌پەرستیی هیچ هێز و دەسەڵاتێکی بەسەر مەککەدا نەما و ، دانیشتوانی مەککەش هەر هەموویان ـ جگە لە چەند کەسێکی کەمی دیاریی کراو ـ چاوپۆشی‌یان لێ کراوە .
بەم هەڵوێستە پێغەمبەری خوا ﷺ سەلماندی کە یەکەم فەرماندەی سەرکەوتووی جیهانە لە نەرم و نیانیی و چاوپۆشیی‌دا . بۆیە دانیشتوانی مەککە ـ هەر چەندە زۆرێکیان لە ترسان‌دا خۆیان حەشار دابوو ـ هەر هەموو هاتن و موسڵمان بوون .. هەتا لەو تاوان‌بارە هەڵاتووانە هی وەهایان موسڵمان بوو کە دوایی بووە پاڵەوانی ئیسلام، وەك عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبوسەرح ، کە لە دواوە باسی دێت، کە ئەفەریقیای ڕزگار کرد و ، سەخت‌ترین جەنگی دەریایی لەگەڵ کەشتی‌گەلی ڕۆمانیی‌دا کرد کە زۆربەی بەشەکانی‌کەشتی گەلی ڕۆمانیی لە دەریای سپیی ناوەڕاست دا نوقوم کرد ، کە نزیکەی هەزار کەشتیی ئەبوون .
هەروەها وەك عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل کە لە جەنگی یەرمووك‌دا بە شەهیدیی سەری نایەوە ، دوای ئەوەی کە بووە فەرماندەی کەتیبەی خۆبەخشە فیدائی‌یەکان کە بوونە هۆی وەستاندنی شاڵاوی هێرشی ڕۆمەکان بۆ سەر موسڵمانان ، کە ئەمەش لە گرنگ‌ترین هۆیەکانی سەرکەوتنی موسڵمانان بوو لە جەنگی یەرمووك‌دا ..

دوای چاوپۆشیی دانیشتوانی مەککە بەوپەڕی هێمنی‌یەوە گەڕانەوە ماڵەوە ، دوای ئەوەی کە لە سەروماڵ و منداڵیان بێ‌خەم بوون . بەمە ژیانی ناو شاری مەککە ئاسایی بوویەوە .

پێغەمبەری خوایش ﷺ دوای وتارەکەی کەعبەی پیرۆزی بەجێ هێشت و رووی کردە صەفا کە بیرەوەری‌یەکی زۆری ، چ تاڵ و چ شیرین لە دڵیا هەبوو .

لەسەر بەردەکەی صەفا بوو پێغەمبەری خوا ﷺ یەکەم بەیانی پەرستنی خوای بە تاك و تەنیا ، هەژدە ساڵ لەوەوبەر ، دا بە گوێی قوڕەیش‌دا ، کاتێك کە قورئان فەرمانی بەسەردا دا :

﴿فَٱصۡدَعۡ بِمَا تُؤۡمَرُ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾ (الحجر : ٩٤) .

هەر بەسەر بەردەکەی صەفاوە بوو کاتێك کە ئەبولەهەبی مامەی قسەی ناشیرینی پێ وت ، ئەویش لەسەر ئەوەی کە خەڵکەکەی کۆ کردەوە و پێی راگەیاندن کە ئەو رەوانەکراوی خوایە . ئەبولەهەبیش وتی : داوەشێی بۆ ئا ئەمەت کۆ کردینەوە ؟ ئەوەبوو خوای گەورەش دەربارەی دژایەتیی ئەبولەهەب و هاوسەرەکەی سوورەتی ( المسد ) ی ناردە خوارەوە .

کە سەرکەوتە سەر تاشە بەردەکەی صەفا هەردوو دەستی بەرز کردنەوە و خەریکی ذیکر و دوعا بوو و روویشی لە کەعبە کرد و لێیشیەوە دیار بوو .

لێرەدا ئەنصار ترسیان لێ نیشت کە پێغەمبەری خوا ﷺ واز لە مەدینە بهێنێ و لە مەککە نیشتەجێ ببێ ، هۆی ئەمەش بریتیی بوو لەوەی کە ئەنصار پێغەمبەری خوایان یەکجار خۆش ئەویست و پێ‌یان خۆش بوو هەر لە ناو خۆیاندا بێ . ئەوەبوو لە رێی وەحی‌یەوە پێغەمبەری خوا ﷺ لەوە ئاگادار کرا کە ئەنصار باسیان کردبوو . بۆ ئەمە دڵخۆشیی ئەنصاری دایەوە کە هەتا زیندوو بێت لێ‌یان جوێ نابێتەوە . ئەوانیش دەستیان بە گریان کرد و عوزریان هێنایەوە کە لەبەر خۆشویستنی خوا و پێغەمبەرەکەی وەهایان وتووە . پێغەمبەری خوایش تەصدیقی کردن کە فەرمووی :

(( إن الله ورسوله يصدقانكم ويعذرانكم )) .

دوای ئەوە دانیشتوانی مەککە بە ویست و رەزامەندیی خۆیان هاتنە صەفا خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و لەوپەڕی هێمنیی و رێك و پێکیی‌دا ئیمانیان هێنا .. سەرەتا پیاوەکان هاتن و بەیعەتیان دا و ، دوای ئەوانیش ئافرەتان بەیعەتیان دا ..

ئەوەبوو عومەری کوڕی خەططاب خوا لێی ڕازیی بێ لە پایینی صەفاوە ، لە نێوان پێغەمبەر و خەڵکەکەدا وەستا بوو و ، بەیعەتی لێ وەر ئەگرتن .

هەموو دانیشتوانی مەککە بەیعەتیان دا جگە لە چەند کەسێکی کەم ، کە لە ترسی گیانیان خۆیان حەشار دابوو ، یان دوور کەوتبوونەوە ، وەك عیکریمە و ، هەندێکیش لەسەر دینی کۆنیان مانەوە و پێغەمبەری خوا ﷺ ناچاری موسڵمانبوونی نەکردن ، وەك صەفوانی کوڕی ئومەییە کە دوای غەزای حونەین زۆر چاك موسڵمان بوو . ئەوەبوو بە موشریکیی کەوتە گەل سوپای ئیسلام بۆ جەنگی حونەین و پاشان لە جیعیڕرانە لە قەراغی مەککەدا موسڵمان بوو ، لە کاتێکدا هاوڕێی پێغەمبەری خوا بوو ﷺ و لە گەماڕووی شاری ( طائیف ) ، لە دوای حونەین ، بەرەو مەککە ئەگەڕایەوە[٢١٢] .

**پانزەهەم : بەیعەتی ئافرەتان**

دوای ئەوەی کە پیاوانی مەککە بەیعەتی موسڵمانبوونیان دا ، ئافرەتانیش هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و بەیعەتیان دا .. ئەوەبوو نوێنەریان هات و موسڵمان بوون ، کە ئەمانە ناودارەکانیان بوون : ئوم حەکیمی کچی حاریثی کوڕی هیشام ، هاوسەری عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل و ، هیندی کچی عوتبە ، هاوسەری ئەبوسوفیانی سەرداری قورەیش و ، بەغوومی کچی موعەذذەلی کەنانیی ، هاوسەری صەفوانی کوڕی ئومەییە و ، فاطیمەی کچی وەلیدی کوڕی موغیرە و ، هیندی کچی مونەببیهی کوڕی حەججاج ، دایکی عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص . بەیعەتی ئافرەتان لە ئەبطەح بوو ، بە ئامادەبوونی فاطیمەی زەهرا و هاوسەرەکەی پێغەمبەر و چەند ئافرەتێکی نەوەی عەبدولموطەللیب .

جا هیندی کچی عوتبەی کوڕی ڕەبیعەی کوڕی عەبدشەمس ، یەکێ بوو لەوانەی کە نەخشەی لەناوبردنی سەرداری شەهیدان حەمزەی کوڕی عەبدولموطەللیبیان کێشا و، هەر ئەویش بوو کە وەحشیی کوڕی حەربی هەڵ نا تا لە جەنگی ئوحوددا حەمزە شەهید بکات . لەبەر ئەوە هیند ئەترسا لەسەر ئەوە تۆڵەی لێ بسەنرێ ، بەڵام هیوای بە چاوپۆشیی زیاتر بوو . ئەوەبوو لەگەڵ ژنە قورەیشیی یەکاندا هات و ئەویش موسڵمان بوو . بەڵام خۆی وەها دەرنەخست کە پێغەمبەری خوا ﷺ بی ناسێ ، تا

[٢١٢] فتح مكة لباشيل : ٢٩٩ ـ ٣١٦ .

کـاتی خـۆی هـات ، ئەوسـا پەچـەکەی لابـرد و داوای سـۆز و بـەزەیی کـرد و پێغەمبەریش ﷺ داواکەی وەرگرت و بە تەنها وشەیەکیش گلەیی نەکرد .

بەیعەت وەرگرتن لە ئافرەتان وەك هی پیاوان نەبوو ، چونکە پێغەمبەری خـوا ﷺ تەوقەی لەگەڵ پیاوان ئەکرد، بەڵام تەوقە لەگەڵ ئافرەتان لە ئیسلامدا ڕێی پێ نادرێ.

لە هەندێ ریوایەت‌دا هاتووە کە هیندی کچی عوتبە لەگەڵ نوێنەری ئافرەتان‌دا بە نیقابـەوە دێتـە خزمـەتی پێغەمبـەر ﷺ و ئـەڵێت : مـن ئـافرەتێکی ئیمـان‌دارم و شاهێدیی ئەدەم کە جگە لە زاتی ( ألله ) هیچ خوایەکی تر نیـە و ، تـۆیش بەنـدە و پێغەمبەری خوایت . پاشان پەچەکەی لابرد و وتـی : مـن هینـدی کچـی عوتبـەم . پێغەمبەریش بەخێرهاتنی کرد . دوای بەیعەت پێدان وتی : ئەی پێغەمبەری خـوا ! ئەبوسوفیان پیاوێکی ڕەزیلە و ئەوەندە پارەمان ناداتێ کە بەشی خۆم و کوڕەکەم بکـات ، مەگەر ئەوەی کە ئـەو نـازانێ و لێـی وەرئـەگرم . ئایـا گونـاهم ئـەگات بـە پـارەی ئـەو خێزانەکەمان بـەخێو بکـەم؟ فـەرمووی : (( لا علیـك أن تطعمـيهم بـالمعروف .. خـذي مـا يكفيك وولدك بالمعروف )) .

ماوەی دا بەشی خۆیان وەربگرن .

هیندی کچی عوتبە هاوسەری سەرداری قوڕەیش و فەرماندەی سـوپاکانی بـوو .. جا پێغەمبەری خوا ﷺ عادەتی وەها بوو کە ئەو جۆرە کەسانە ڕێز لێ بگرێ تا دڵیان نەرم ببێ و ، باوەش بۆ ئیسلام بگرنەوە . بەڵێ ، هیند لە دوژمنـە سەرسـەختەکانی ئیسلام بوو و ، هۆی سەرەکیی شـەهیدبوونی حـەمزە ئـەو بـوو ، لەگـەڵ ئـەوەش‌دا پێغەمبەری خوا ﷺ رق و قینی بەکار نەهێنا و چاوپۆشیی لە هیند کرد .

هۆی دڵنەرم بوونی هیند بۆ موسڵمان‌بوون ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو خواپەرستی‌یەی کە ئـەو هەتا بەیانیی هاوەڵان لە دوای فەتح بە ڕێك و پێکیی ئەنجامیان ئەدا .. هینـد هاتـە سـەر ئەو بڕیارە کە خواپەرستیی ڕاستەقینە ئەمەیـە . بۆیـە دوای موسـڵمان بـوونی گەڕایـەوە ماڵەوە و بتەکەی ورد و خاش کرد .[٢١٣]

[٢١٣] هیند زۆر دوژمن بوو ، هەتا داوای کوشتنی ئەبوسوفیانی ئەکرد چونکە نەرمیی ئەنواند . لەو چەند شەوەی فەتح‌دا هەرچیی بۆ خەوتن سەری ئەنایەوە خەوی ئەبینی . ئەڵێت :
دوای فەتحی مەککە سێ شەو لەسەر یەك خەوم ئەبینی . لە خەومدا لە تاریکایی‌یەك‌دا بووم کە نە دەشت و نە شاخم نەئەبینی ، ئەبینم وا ئەو تاریکایی‌یە بە ڕۆشنایی‌یەك کە لە خۆر ئەچوو ئەڕەوێتەوە . ئەبینم وا پێغەمبەری خوا ﷺ بانگم ئەکات . پاشان شەوی دووهەم وام ئەبینی وا لە ڕێگایەك‌دام و بانگم لێ ئەکات ، هوبەلیش وا لەلای ڕاستمەوە و بانگم لێ ئەکات و ، ئیسافیش وا لەلای چەپمەوە و بانگم لێ ئەکات . لە ناکاو ئەبینم پێغەمبەری خوا ﷺ وا لەبەردەممدا و ئەفەرموێ : (( هلمي إلى الطريق )) ئەی فەرموو : خێراکە بۆ سەر ڕێگا . شەوی سێ‌هەمیش لە خەومدا

هیند له دوای موسڵمانبوونی دەری بڕیی که لەوەوپێش له هەموو کەس زیاتر رقی له پێغەمبەر بووه و حەزی کردووه خۆی و کەسوکاری سەرشۆڕ بن ؛ بەلاّم دوای موسڵمانبوون به خۆی و کەسوکاریەوه حەز ئەکا له هەموو کەس زیاتر سەربەرز بن . که گەڕایەوه ماڵەوه به کەنیزەکێکی‌دا دیاری‌یەکی نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ ، که بریتیی بوو له دوو چێیری برژاو . کەنیزەکەکه هێنانی و پێغەمبەریش ﷺ له نێوان هەردوو هاوسەرەکەی ئوم سەلەمه و مەیموونه و چەند ئافرەتێکی نەوەی عەبدولموطەللیب‌دا دانیشتبوو . کەنیزەکەکه وتی : خانمم عوزر دێنێتەوه و ئەڵێت : ئەمڕۆ مەڕەکانی بەرخی کەمیان دیوه . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( أللهم بارك لكم في غنمكم وأكثر والدتها )) . داوای فەڕ و بەرەکەتی بۆ ئاژەڵەکانیان کرد . ئەو کەنیزەکه شاهێدیی گیرابوونی ئەو دوعایه ئەدا که مەڕەکان و بەرخەکانیان یەکجار زۆر بوون .[214]

**دوانزەهەم : ئەوانەی خۆیان شاردەوه**

دوای ئەوەی که موسڵمانەکان دەستیان بەسەر مەککەدا گرت ، ژمارەیەك له سەردارانی قورەیش له خۆیان ئەترسان موسڵمانەکان تۆڵەیان لێ بکەنەوه ، لەسەر ئەو هەڵوێسته چەوتەی که لەوەو پێش نواندبوویان ـ جا ئەمانه هەندێکیان له مەککەدا خۆیان حەشار دا و ، هەندێکیشان هەلاتنه دەرەوەی مەککه .

ئەوانەی لەناو مەککەدا مانەوه ، چاوەڕوانی‌یان کرد هەتا بارودۆخەکه هێمن بوویەوه ؛ ئەوسا دەرکەوتن و چاوپۆشی‌یان لێ کرا و به چاکیی موسڵمان بوون ، که ئەمانه بوون :

١ ـ سوهەیلی کوڕی عەمر : یەکێ بووه له سەردارانی قورەیش ؛ که وتاردەرێکی لێهاتوو و سەرۆکێکی سیاسیی بووه . بۆ بەستنی پەیمانی حودەیبیه سەرۆکی نوێنەرانی قورەیش بووه و له بریی قورەیش ئەو رێککەوتنەی مۆر کردووه . ئەوەبوو له جەنگی بەدردا به دیلیی کەوته دەست موسڵمانان و ، پاشان به فیدیه ئازاد کرا .

---

ئەبینم لەسەر رۆخی دۆزەخ وەستاوم و ئەیانەوێ پاڵم پێوه بنێن و ، هوبەلیش ئەی‌وت : بچنه ناوی . که ئاوڕم دایەوه ئەبینم وا پێغەمبەری خوا ﷺ له دوامەوەیه و جلەکانمی گرتووه . ئیتر له رۆخی ئاگرەکه دوورکەوتمەوه تا ئاگرەکەم نەئەبینی . راچڵەکییم و وتم ئەمه چی‌یه ؟

[214] فتح مكة لباشميل : ٣١٦ ـ ٣٢٣ ، المنهج التربوي للسيرة النبوية : ٣ / ٨٥ .

سوهەیل یەکێ نەبوو لەوانەی کە خوێنیان حەلاڵ کرابوو ، بەلام ئەو لە خۆی ئەترسا لەسەر ئەو دژایەتی‌یانەی کە لە ماوەی بیست ساڵدا بەرامبەر بە موسڵمانەکان ئەنجامی دابوون . بەلام لە مەککە دەر نەچوو و ، دوای هێوربوونەوەی بارودۆخەکە ناردی بە دوای عەبدوڵلای کوڕی‌دا ، کە نازناوی ( ئەبوجەندەل ) ی لێ نرابوو و لە کاتی پەیمانی حودەیبییەدا لە بەندیخانەکەی مەککە هەلات بوو و ، باوکی بە زۆر دایە بەر و بردیەوە بۆ مەککە . ناردی بە دوای عەبدوڵلادا تا لای پێغەمبەری خوا ﷺ پەنای بۆ وەربگرێ . ئەویش مەردانە پەنای بۆ وەرگرت و سوهەیل زۆر دڵ خۆش بوو و ، وتی : بەخوا بە بچووکییش و بە گەورەییش هەر پیاو چاك بووە . کاتێك کە سوپای موسڵمانان بۆ حونەین کەوتە ڕێ ، سوهەیلیش کە هێشتا موسڵمان نەبوو بوو کەوتە گەل سوپای موسڵمان ، تا ئەوەبوو بە ویستی خۆی لە ( جعرانة ) موسڵمان بوو . لەگەڵ سوپای فەتحی ئیسلامیی‌دا بەرەو شام کەوتە ڕێ و ، لەوێ بە نەخۆشیی تاعوون پلەی شەهیدیی وەرگرت .

٢ ـ عەبدوڵلای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبوسەرح : یەکێ بووە لە سەرۆکەکانی قوڕەیش کە ناوی لە لیستی ئەوانەدا هاتبوو کە ئەبێ بکوژرێن ئەگەرچی خۆشیان بە پەردەکانی کەعبەدا هەڵواسن .

تاوانی عەبدوڵلا ئەوەبوو سەرەتا موسڵمان بوو بوو و کۆچیشی کردبوو و ، وەحیی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنووسیی . کەچیی شەیتان گومڕای کرد و لە ئیسلام پاشگەز بۆوە و گەڕایەوە مەککە . لەسەر ئەمە حوکمی کوشتنی بۆ دەرچوو .

کە مەککە فەتح کرا عەبدوڵلا ئەی‌زانیی ئەکوژرێ ، بۆیە پەنای بردە لای عوثمانی کوڕی عەففان کە برای شیریی بوون و لە ماڵی ئەوا خۆی پەنا دا هەتا فەرمانی چاوپۆشیی پێغەمبەری خوای دەست بکەوێ . عوثمان هەوڵی دا دڵی پێغەمبەری خوای ﷺ نەرم کرد و چاوپۆشیی بۆ عەبدوڵلای کوڕی سەعد وەرگرت .

عوثمان دەستی عەبدوڵلای گرت و بردیە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ! دایکی ئەمە ( واتە عەبدوڵلا ) منی هەڵ ئەگرت و ئەوی بە پێ بەڕێوە ئەبرد ، شیری بە من ئەدا و لەوی ئەگرتەوە ، منی ئەلاواند و دەستی لەو هەڵ ئەگرت . بی‌بەخشە بە من . پێغەمبەر ﷺ ڕووی وەرئەچەرخاند و ، هەموو جارێك کە ڕووی وەرئەچەرخاند عوثمان ئەچووەوە بەردەمی و هەمان قسانی دووبارە ئەکردنەوە . بۆیە ڕووی وەرئەچەرخاند تا یەکێ هەڵسێ و لە ملی بدا چونکە هێشتا

ئەمانی پێ نەدابوو . کە کەس ئەو کارەی نەکرد و عوثمانیش خۆی تەدا بە مل پێغەمبەردا و سەری ماچ ئەکرد و ئەشی وت : ئەی پێغەمبەری خوا ! دایك و باوکم بە قوربانت بن ، بەیعەتی لێ وەرئەگری ؟ فەرمووی : (( ما منعکم أن یقوم رجل منکم إلی هذا الکلب فیقتله ؟ )) . فەرمووی : چیی لەوە قەدەغەی کردن پیاوێکتان هەستێ و ئەم سەگە ( یان ئەم فاسقە ) بکوژێ ؟

عەببادی کوڕی بیشر وتی : نەئەکرا ، ئەی پێغەمبەری خوا ! ئاماژەت بۆم بکردایە ؟ بەو خوایەی کە تۆی بە حەق رەوانە کردووە لە هەموو لایەکەوە چاوم بە دوای چاوتا ئەگێڕا بەڵکو ئاماژە بکەیت و بدەم لە ملی . بەڵام هەرگیز پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی لەو جۆرەی نەکردووە . دوای ئەوە هەرگیز پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی لەو جۆرەی نەکردووە . دوای ئەوە بەیعەتی لێ وەرگرت ، بەڵام هەرچیی پێغەمبەری بدیایە لە شەرمان دا دوور ئەکەوتەوە . عوثمان بە پێغەمبەری فەرموو: دایك و باوکم بە قوربانت بن ، هەرچیی عەبدوڵلا ئەت‌بینێ لێت را ئەکات. پێغەمبەریش ﷺ زەردەخەنەی کرد و فەرمووی : (( أَوَلَم أُبایعهُ وأؤمنه ؟ )) فەرمووی: ئەی بەیعەتم لێ وەرنەگرتووە و ئەمانم پێ نەداوە ؟ فەرمووی : بەڵێ ، ئەی پێغەمبەری خوا ! بەڵام یادی گەورەیی تاوانەکەی دەرهەق بە ئیسلام ئەکاتەوە. فەرمووی : (( الإسلام یجبُّ ما کان قبله )) . فەرمووی : ئیسلام چاوپۆشیی لە رابوردوو ئەکات . عوثمان گەڕایەوە لای عەبدوڵلا و هەواڵەکەی دایە و ، ئەویش لەگەڵ موسڵمانان‌دا ئەهات و سەلامی لێ ئەکرد ..

عەبدوڵلا بەبێ خەوش تەوبەی کرد و ، بووە موسڵمانێکی بە خزمەت لە بواری جیهادی ئیسلامیی و فەرماندەیەکی ناوداریشی لێ دەرچوو .

عەبدوڵلا دەستە راستی عەمری کوڕی عاص بوو کە فەرماندەی فەتح کردنی میصر بوو . عەبدوڵلا فەرماندەی بەشی دەستە راستی ئەو سوپایە بوو کە شاری قیساریەی لە فەلەسطین فەتح کرد .. دوای ئەوەی کە عەمر فەتحی میصری کرد ، لەبەر لێ‌هاتوویی و نەخشە رێك و پێکیی عەبدوڵلای کوڕی سەعدی بەرەو ولاتی لیبیا ئەنارد تا هێرش بکاتە سەر رۆمان . ئەویش هەموو جارێك بە سەرکەوتنەوە ئەگەڕایەوە ، تا ئەوەبوو خەلیفە عومەر کردیە کاربەدەستی صەعیدی میصر ، ئەمەش لەو کاتەدا کە عەمری کوڕی عاص والیی بوو . ئەوەبوو سەرەنجام لە سەردەمی خەلیفە عوثمان‌دا بووە والیی سەرانسەری ولاتی میصر . ئەوەبوو خۆی بووە

فەرماندەی سوپا و فەتحی باکووری ئەفریقیای کرد هەتا گەیشتە شاری قەیرەوان لە توونس و ، هەندێ فەرماندەی لێ هاتووش وەك عوقبەی کوڕی نافیع دەستباریان تەدا ..

عەبدوڵلا خۆی فەرماندەی ئەو سوپایە بوو ، کە لە جەنگی ( عقوبە ) ی مێژوویی بەناوبانگدا پادشای ئەفریقیای رۆمانیی ( جەرجیر ) ی تێك شکاند . ئەم هەڵمەتە سەربازی‌یە کۆمەڵێك هاوەڵی ناوداری تێدا سەرباز بوون وەك عەبدوڵلای کوڕی عەبباس و عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص و حەسەن و حوسەین و عەبدوڵلای کوڕی جەعفەر خوا لە هەموویان رازیی بێ .

هەروەها عەبدوڵلا لە دیارترینی ئەو فەرماندانە بوو کە بەشداریی فەتحی دوورگەی قوبروصیان کرد و ، فەتحی ( دنقلە ) شی لە سوودان تەواو کرد و خەڵکێکی زۆریشی بە بۆنەی ئەوەوە موسڵمان بوون .

شایانی باسە گەورەترین و گرنگترین کارێك کە عەبدوڵلای کوڕی سەعد ئەنجامی دا بریتیی بوو لەو سەرکەوتنەی کە لە یەکەم و گەورەترین جەنگی دەریایی‌دا بە دەستی هێنا ، کە لە نێوان کەشتی‌گەلی ئیسلامیی و کەشتی‌گەلی رۆمانیی ، لە دەریای سپیی ناوەڕاست ، لە ئاوی توونس‌دا رووی دا ..

لە کاتێك‌دا کە عەبدوڵلای کوڕی سەعد والیی میصر و ، موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیانیش والیی شام بوون ، دەنگ‌وباس گەیشتە موسڵمانەکان کە رۆمان بە سەرکردایەتیی قوسطەنطینی کوڕی هیرەقل لە ئەستەنبوولەوە کەشتی‌گەلێکیان ئامادە کردووە کە نزیکەی هەزار کەشتی ئەبن . عوثمانی خەلیفە خوا لێی رازیی بێ لە مەدینەوە فەرمانی دا بە موعاویە و عەبدوڵلا تا بە پەلە خۆیان بگەیەننە کەشتی‌گەلەکەی رۆمان . موعاویە لەگەڵ دانیشتوانی شام سواری کەشتی‌گەلی خۆیان بوون و ، عەبدوڵلاش لە ئەسکەندەری‌یە سواری کەشتی‌گەلی خۆی بوو و لە ناوەڕاستی دەریای سپیی‌دا گەیشتن بە کەشتی‌گەلی رۆمان . سەرکردەی موسڵمانان عەبدوڵلا بوو . ئەو رۆژە جەنگێکی پیاوانەیان کرد و کەشتی‌گەلی رۆمانیان تێك شکاند و ، فەرماندەی رۆم بە زامداریی بە کەشتیی فەرماندەیی تایبەتیی خۆی گەیاندە دوورگەی ( صقلیە ) و لەوێ کوژرا .

عەبدوڵلا زۆر زاهیدانە تەمەنی بەسەر ئەبرد . لە دوای شەهیدبوونی عوثمان ، لە فیتنە کەناری گرت و ، لە شاری عەسقەلانی فەلەسطین ئیعتیکافی کرد و ، هەر

لەوێ مایەوە، تا ئەوەبوو لە نوێژی فەجردا لە سەجدەدا کۆچی دوایی کرد .. پێشتر لە خوا پاڕابوویەوە تا دواکاری نوێژی بەیانیی بێ ، خوای گەورەش دوعاکەی گیرا کرد .
٣ ـ عوتبە و موعتەبی کوڕانی ئەبولەهەب : ئەبولەهەب بە دوژمنایەتیی ئیسلام و موسڵمانان بە کافریی سەری نایەوە . لە رۆژی فەتحی مەککەش‌دا هەردوو کوڕەکەی وەك موشریکەکانی مەککە خۆیان شاردەوە . ئەو رۆژە پێغەمبەری خوا ﷺ لە عەبباسی مامەی هەواڵی ئەو دوو کوڕە ئامۆزایەی ئەپرسێ : (( أين إبنا أخيك ، عتبة و معتب إبني أبي لهب ، لا أراهما ؟ )) . عەبباسیش وەڵامی ئەداتەوە کە لەگەڵ قوڕەیشیەکان خۆیان کەنار داوە . فەرمووی : (( إئتني بهما )) . فەرمووی : بەیدایان بکە و بیانهێنە بۆ لام . عەبباس ئەیانهێنێ و پێغەمبەریش ﷺ بانگیان ئەکات بۆ سەر ئیسلام و ، ئەوانیش موسڵمان ئەبن و بەیعەت ئەدەن . پاشان پێغەمبەر ﷺ دەستیان ئەگرێ و بەرەو ( الملتزم ) ئەیان بات . سەعاتێك دوعا ئەکات و پاشان خۆشیی ئەکەوێتە سەر دەم و چاوی و ئەگەڕێتەوە .
عەبباس ئەڵێت : وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ! خوا شادمانت بکات ، خۆشیی بە دەم و چاوتەوە ئەبینم . فەرمووی : (( إني إستوهبت إبني عمي هذين من ربي فوهبهما لي )) . فەرمووی : داوام لە پەروەردگارم کرد کە ئەم دوو کوڕە ئامۆزامە پێم ببەخشێ ، ئەویش پێمی بەخشین .
لە رۆژی حونەین‌دا ئەم دوو کوڕە بە دامەزراویی لە خزمەتی پێغەمبەردا مانەوە و، وەك خەڵکی تر هەڵ نەهاتن . هەروەها ئەبوسوفیانی کوڕی حاریثی ئامۆزای پێغەمبەر ﷺ .
ئەوانەش کە لە رۆژی فەتح‌دا لە مەککە هەڵاتن ئەم سەرۆکانە بوون :
١ ـ صەفوانی کوڕی ئومەییەی جومەحیی : یەکێ بووە لە سەردارە دەوڵەمەندەکانی مەککە . ئەم سەرۆکە ناوی لە لیستی ئەوانەدا نەبوو کە خوێنیان حەڵاڵ کرا بوو . بەڵام چونکە خۆی زۆر بە تاوانبار ئەزانیی نەی‌وێرا لە مەککە بمێنێتەوە .
لە پێشەوە ، دوا بە دوای جەنگی بەدر ، باسی ئەو نەخشەیەمان کرد کە صەفوان بۆ لەناو بردنی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ عومەیری کوڕی وەهب‌دا کێشایان . چونکە ئومەییەی کوڕی خەلەفی باوکی صەفوان لە بەدردا کوژرا بوو و ، ئوبەیی کوڕی خەلەفی مامەشی لە ئوحوددا ، بە دەستی پێغەمبەر ﷺ کوژرا بوو . هەروەها

صەفوان دژایەتیی زۆری دەرهەق بە موسڵمانان کردبوو بۆیە لە خۆی و ئەترسا ، بۆیە بەرەو شاری جوددە لەسەر دەریای سوور هەڵات و ئەی‌ویست سواری دەریا ببێ و ، تەنها غولامێکیشی بە ناوی یەسار لەگەڵدا بوو .

صەفوان گەیشتە بەندەری شوعەیبە لە نزیك جوددە و ئەی‌ویست لەگەڵ غولامەکەی‌دا سواری کەشتیی بن ، لە ناکاو عومەیری کوڕی وەهبی دۆستی دێرینی گەیشتە لای . صەفوان لە عومەیر ترسا ، چونکە عومەیر موسڵمان ببوو و صەفوان وای زانیی بۆ کوشتنی هاتووە . بەڵام عومەیر بۆ ئەوە هاتبوو کە یارمەتیی صەفوان بدات و بی‌گێڕێتەوە بۆ مەککە و داوای چاوپۆشیی بۆ بکا لەلای پێغەمبەری خوا ، تا لەوە زیاتر صەفوان سەرگەردان نەبێت و لە نووری قورئان بێ‌بەش نەبێت.

عومەیر چوو بووە خزمەتی پێغەمبەر و داوای ئەمانی بۆ صەفوان کردبوو ، بۆیە بە پەلە خۆی گەیاندبووە شوعەیبە تا فریای صەفوان بکەوێ . عومەیر صەفوانی دڵ خۆش کرد و تێی گەیاند کە ئەتوانێ بگەڕێتەوە مەککە ، بەڵام صەفوان دڵی ئاوی نەخواردەوە و ، داوای لە عومەیر کرد نیشانەیەکی بۆ بهێنێ هەتا باوەڕ بکات.

عومەیر ناچار بوو بگەڕێتەوە مەککە و مێزەرەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بهێنێ تا صەفوان باوەڕ بکات . ئیتر صەفوان گەڕایەوە و ماوەشی درا بە ویستی خۆی بۆ موسڵمان بوون بیر بکاتەوە . ئەوەبوو چەند حەفتەیەك لەسەر دینی خۆی مایەوە، پاشان بە چاکیی موسڵمان بوو .

لەو کاتەدا کە هێشتا صەفوان موسڵمان نەبوو بوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەو هەوازین سوپای خستە رێ و ، صەفوانیش بە کافریی کەوتە گەلی و بە ئەمانەت چەکەکانی دایە دەست موسڵمانان کە صەد قەڵغان و ئامێرەکانیان بوون . صەفوان ئەو چەکانەی لەگەڵ خۆی هێنا و بەشداریی حونەین و طائیفی کرد ، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە و گەیشتە ( جعرانە ) و دەست کەوتەکانی جەنگ ، کە مەڕومالاتێکی زۆر بوو پێیان بوون و صەفوانیشی لەگەڵ دا بوو .. صەفوان سەیری شیوەکەی ئەکرد کە پڕ لە وشتر و مەڕ و شوان بوو .. هەر سەیری ئەکرد و پێغەمبەریش چاوی لێی بوو ، فەرمووی : (( أبا وهب ! يعجبك هذا الشعب ؟ )) . فەرمووی : صەفوان ! ئەو شیوەت بە دڵە ؟ وتی : بەڵێ . فەرمووی : (( هو لك وما فيه )) . فەرمووی : شیوەکە و هەرچیشی تێدایە بۆ تۆ . صەفوان بە سەرسوڕمانەوە

وتی : تەنها دەروونی پێغەمبەر بەو پلەیە سەخیی و کراوەیە . أشهد أن لا إله إلا الله، وأن محمداً عبده ورسوله . ئیتر لە جێی خۆیدا موسڵمان بوو .

٢ـ عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل : یەکێ بوو لەوانەی کە دوژمنایەتی‌یەکی بێ ئەندازەیان لەگەڵ ئیسلامدا ئەکرد .. باوکی دەوری سەرەکیی دژایەتیی هەبوو ، عیکریمەش دوای باوکی هەمان هەڵوێستی هەبوو . بەڵام عیکریمە دامەزراو و خاوەنی عەقڵ و ژیریی بوو . کەچیی لە رۆژی فەتحدا دەمارپەرستیی جاهلیەت بەسەریدا زاڵ بوو و ، رازیی نەبوو ئەبوسوفیان بەبێ جەنگ مەککە بە دەستەوە بدات . ئەوەبوو بووە فەرماندەی هەندێ لە قورەیشی‌یەکان و هاتنە بەردەم بەشە سوپاکەی خالید . ئەم کارەی عیکریمە صەفوانی کوڕی ئومەییە و سوهەیلی کوڕی عەمریش پشتگیری‌یان لێ کرد ، بەڵام زۆری نەخایاند و تێك شکان .

بەر لەوەی موسڵمانان بێنە ناو شاری مەککەوە ، خوێنی عیکریمەش حەلاڵ کرابوو و ، فەرمان بە کوشتنی درا بوو . کە سوپای ئیسلام گەیشتە قەراغی شار عیکریمە مەککەی بەجێ هێشت و بەرەو جوددە کەوتە رێ و ، نیازی هەبوو خۆی بگەیەنێتە یەمەن . لە جوددە بە نیازی سەفەر بۆ یەمەن سواری کەشتیی بوو .. خەریك بوو کەشتی‌یەکە دەربچێ هاوسەری بەوەفای ئوم حەکیم گەیشتە لای و داوای لێ کرد سەفەر نەکات ، چونکە ئەتوانێ بگەڕێتەوە مەککە .

ئوم حەکیم ئافرەتێکی ژیر بوو .. رۆژی فەتح لەگەڵ هیندی کچی عوتبە موسڵمان بوو و ، لە پێغەمبەری خوا ﷺ پاڕایەوە تا چاوپۆشیی لە عیکریمەی هاوسەری بکات، ئەویش چاوپۆشیی لێ کرد .

ئوم حەکیم خۆی کۆکردەوە و بەرەو جوددە کەوتە رێ ، تا چاوپۆشی‌یەکەی پێغەمبەر ﷺ بە مێردەکەی بگەیەنێ و لەگەڵیا بگەڕێتەوە بۆ مەککە .

ئوم حەکیم بەندەیەکی خزمەت گوزاری لەگەڵ خۆیدا هێنا بوو . لە رێگادا ویستی دەستدرێژیی بکاتە سەر ، ئوم حەکیمیش بە ژیرانە خلافاندی هەتا گەیاندیە ناو هۆزی نەوەی عەك و ، داوای لێ کردن قۆڵ بەسی بکەن . ئەوانیش گرتیان و لای خۆیان هێشتیانەوە و ئوم حەکیمیش خۆی گەیاندە بەندەری جوددە .

کاتێ عیکریمە سواری کەشتیی بوو ، خاوەنی کەشتی‌یەکە ( کە موسڵمان بوو ) پێی وت : نیەتی ئیخلاص بهێنە . وتی : چیی بڵێم ؟ وتی : بڵێ : ( لا إله إلا الله ). عیکریمە بە سەرسوڕمانەوە وتی : من لەمە هەڵاتووم .[٢١٥]

لەم کاتە ناسکەدا هاوسەرە پاکداوێنە بەوەفاکەی گەیشتە لای و هاواری لێ کرد : ئامۆزا ! لەلایەن کەسێکەوە هاتووم بۆ لات کە لە هەموان سیلەی رەحم زیاتر ئەپارێزێ و لە هەموان زیاتر چاکەی لێ ئەوەشێتەوە . خۆت لەناو مەدە . عیکریمە وەستا و داوای کرد بۆی روون بکاتەوە : دەنگ‌وباس چی‌یە ؟ وتی : داوای ئەمانم لە موحەممەدی پێغەمبەری خوا ﷺ کردووە بۆت . وتی : تۆ شتی وەهات کردووە ؟ وتی: بەڵێ . عیکریمە بڕوای بە هاوسەرەکەی کرد و لە کەشتی‌یەکە دابەزیی و لەگەڵیا گەڕایەوە .

لە ڕێگا هەواڵی غوڵامەکەی پێ دا و ، کە گەیشتنە لای ، عیکریمە دای لە ملی و تۆڵەی نامەردیی ئەو هەڵوێستەی لێ کردەوە .

کاتێك کە عیکریمە نزیکی مەککە کەوتەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ مژدەی بە هاوەڵەکانی دا کە عیکریمە بە موسڵمانیی دێتەوە لایان و ، قەدەغەی هاوەڵانیشی لە قسەوتن بە ئەبوجەهلی باوکی کرد .

کاتێك کە عیکریمە بەرەو ڕووی موسڵمانەکان هات پێغەمبەری خوا ﷺ زۆری پێ خۆش بوو و بەرەو ڕووی ڕۆیشت . پاشان پێغەمبەر ﷺ دانیشت و عیکریمەش لەبەر دەستی‌دا وەستا و ژنەکەشی بە پەچە دەم و چاوی داپۆشیی بوو . وتی : ئەی موحەممەد ! ئەمە هەواڵی داومەتێ کە ئەمانت پێ داوم . فەرمووی : (( صدقت ، فأنت آمن )) . وتی : تۆ بۆچیی بانگ ئەکەیت ؟ فەرمووی : (( أدعوك إلى أن تشهد أن لا إله إلا الله وأني رسول الله ، وأن تقيم الصلاة وتؤتي الزكاة... )) فەرمووی : بانگت ئەکەم بۆ شاهێدیی‌دان کە جگە لە زاتی ( ألله ) هیچ خوایەکی تر نیە و ، منیش پێغەمبەری خوام و ، نوێژ بەجێ بهێنی و زەکات بدەیت ... هەموو واجبەکانی تری بۆ هەڵ دا . عیکریمە وتی : بەخوا بۆسەر حەق و کاری چاك و جوان

---

[٢١٥] لە ریوایەتێك‌دا وەها هاتووە کە عیکریمە سواری دەریا ئەبێت و رەشەبایەکی توندیش هەڵ ئەکات . عیکریمە هاوار ئەکاتە لات و عوززا ، بەڵام ئەهلی کەشتی‌یەکە ئەڵێن ئیخلاص بنوێنن ، خواکانتان هیچ کەڵکێکیان نیە . عیکریمە وتی : بەخوا ئەگەر لە دەریادا تەنها ئیخلاص رزگارم بکا ، ئەوا لە وشکانیش‌دا هەر ئەو رزگارم ئەکات . خوایە ! پەیمان بێت ئەگەر لەمە رزگارت کردم بچمە خزمەتی موحەممەد و دەست بخەمە ناو دەستیەوە . وای ئەبینم لێ بووردە و چاوپۆشیی‌کەر و بەڕێز بێت . هات و موسڵمان بوو .

بانگ ئەکەیت . بەخوا پێش ئەوەش ئەم بانگەوازەت بلاّو بکەیتەوە لە ناومـاندا لـە هەمووومان راستگۆتر و کار چاکتر بوویت . پاشان عیکریمە وتی :

أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً عبده ورسوله .

بە موسڵمانبوونی عیکریمە پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر شادمان بوو ، چونکە عیکریمە یەکێ لە سەرداران و فەرمانـدە پاڵەوانـەکانی قـورەیش بـوو . ئـەوەبوو لـە جـەنگی پاشگەزبووەکان و جەنگەکانی شامدا عیکریمە دەوری پاڵەوانانی بینیی .

دوای شایەتمان عیکریمە پرسیی : چیی تر ؟ فەرمووی : (( تقول : أُشهِدُ اللهَ وأشهدُ من حَضَرَ أني مسلم مهاجر مجاهد )) . فەرمووی : بڵێی خوای گەورە و ئەوانـەش کـە لێرە ئامادەن بە شاهید ئەگرم کـە مـن موسـڵمانێکی کـۆچ کـردووی جیهـاد کـارم .

عیکریمە ئەوەشی وت .

پێغەمبـەری خـوا ﷺ فـەرمووی : (( لا تسـألني اليوم شـيئاً أعطيـه أحداً إلا أعطيتكه )) . فەرمووی : ئەمڕۆ هەر شتێکم داوا لێ بکەیت کە بتـوانم بـە کەسـێکی ببەخشم ئەوا پێتی ئەبەخشم .

عیکریمە وتی : داوات لێ ئەکەم لەسەر هـەر دوژمنایەتییەك کـە لـەگـەڵتدا کردبێتم ، یان هەر رۆیشتنێك ، یان هەر پێگەیشتنێك ، یان هەر قسەیەك کـە پێـتم وتبێت لە رووتدا یان لە پاش ملەدا چاوپۆشییم لێ بکەیت .

پێغەمـبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( أللهم اغفر له كل عداوة عادانيها ، وكل مسير سار فيه إلى موضع يريد بذلك المسير إطفاء نورك ، فاغفر له ما نال مني من عرض، في وجهي أو أنا غائب عنه )) . داوای چاوپۆشیی بۆ کرد .

عیکریمە وتی : رازیی بووم ، ئەی پێغەمبەری خوا !

پاشان وتی : بەخوا ، ئەی پێغەمـبەری خـوا ! هـەر خـەرجێکم بـۆ پـەرچدانـەوەی رێبازی خوا خەرج کردبێ ، دوو چەندانەی ئەوە لە رێی خوادا خـەرج ئەکـەم و ، هـەر جەنگێکیشم بۆ پەرچدانەوەی رێبازی خوا کردبێ ، دوو چەندانەی ئەوە لە رێی خـوادا جەنگ ئەکەمەوە .

ئەوەبوو لە غەزادا ئەوەندە هەوڵی ئەدا هەتا بە شەهیدیی سەری نایەوە .[٢١٦]

---

[٢١٦] عیکریمە ئەو بەڵێنانەی بە راستی بردنە سەر . ئەوەبوو لە جەنگی یەرمووکدا ئەیوت : لە هەموو هەڵوێستێك دا لەگەڵ پێغەمبەردا جەنگاوم و ، ئەمڕۆ لەبەردەم ئێوەدا هەڵێم ؟ پاشان جاڕی دا : کێ پەیمانی مردنم لەگەڵ ئەبەستێ ؟ حاریثی کوڕی هیشامی مامەی ( واتە برای ئەبوجەهل ) و ضیراری کوڕی ئەزوەر و چوارصەد پیاو سوارچاکی ناوداری

صەفوانی کوڕی ئومەییە و عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل کە موسڵمان بوون لەسەر نیکاحی یەکەم هاوسەرەکانیان لەلایان مانەوە .

ئەگێڕنەوە کە پێش موسڵمانبوونی عیکریمە ، پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەویدا خۆی لە بەهەشتدا ئەبینێ و چاوی بە هێشووە خورمایەك ئەکەوێ کە زۆر بە دڵی ئەبێ . ئەپرسێ : (( لمن هذا ؟ )) ئەفەرموێ : ئەمە هی کێیە ؟ ئەوترێ : هی ئەبوجەهلە. بە لایەوە زۆر گران ئەبێت و ئەفەرموێ: (( لا يدخلها إلا نفس مؤمنة )). ئەفەرموێ : تەنها ئیماندار ئەچێتە بەهەشتەوە .

کاتێك کە عیکریمە موسڵمان بوو زۆری پێ خۆش بوو و وەهای تەئویل کرد کە هێشووەکە هی عیکریمەیە .

عیکریمە پێش موسڵمان بوونی لەگەڵ پیاوێکی موسڵماندا ئەجەنگێ و ئەی کوژێ. پێغەمبەری خوا ﷺ پێ ئەکەنێ . پیاوێك لە ئەنصار ئەپرسێ : بە چیی پێکەنییت ، ئەی پێغەمبەری خوا ! ئێمە بە کوشتنی خزمەکەمان جەرگمان بڕراوە ؟

فەرمووی: (( أضحكني أنهما في درجة واحدة في الجنة )) . فەرمووی: بەوە پێکەنییم کە هەردووکیان : ئەو هاوەڵە شەهیدە و عیکریمە لە بەهەشتدا لە یەك پلەدا ئەبن!

مەبەستی ئەوەیە کە عیکریمەش موسڵمان ئەبێ و بە شەهیدیی سەر ئەنێتەوە .. هەروایش بوو عیکریمە لە جەنگی یەرمووکدا کەتیبەیەك خۆ بەخشی پێك هێنا و دەستیان بە هەڵمەتدان کرد هەتا بە شەهیدیی سەری نایەوە و سەرکەوتنیشیان بۆ ئیسلام بە دەست هێنا .

٣ ـ هەبباری کوڕی ئەسوەد : ئەمیش یەکێك بوو لەوانەی کە فەرمانی کوشتنی بۆ دەرچوو بوو .

---

موسڵمانان بەیعەتیان پێ دا .. لەبەردەم چادرەکەی خالیددا کوشتاریان کرد ، هەتا هەر هەموویان زامدار بوون و هەر هەموویان شەهید بوون جگە لە ضیراری کوڕی ئەزوەر .

زوهەریی ئەڵێت : ئەو ڕۆژە عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل لە هەموو کەس زیاتر تووشی ناڕەحەتیی بوو ، بە رادەیەك کە سنگی و دەم و چاوی زامدار بوون . پێی وترا : لە خوا بترسە و ، بەزەییت بە خۆتدا بێتەوە . وتی : من لە پێناوی لات و عوززادا کۆششم ئەکرد و خۆم بەخت ئەکرد ، ئێستە لە پێناوی خوا و پێغەمبەردا لە بەختکردنی دریغیی بکەم؟! نا بەخوا هەرگیز .

هەروا چووە پێشەوە تا شەهیدیی دەست کەوت رەحمەتی خوای لێ بێ .

هەروەها حاریثی مامەشی لەسەر نەخشەی عیکریمەی برازای ، کە بەیعەتی مەرگی پێ دابوو ، لەژێر بەیداخی خالیدی ئامۆزایدا بە شەهیدیی سەری نایەوە ..

هەببار لە سەردەمی نەفامیی‌دا پیاوێکی قسەزانی زمان پاراو بوو ، خەڵکیی دژی پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵ ئەنا و ، پیاوێکی خراپکار و رەوشت نزم بوو ، کە سۆز و بەزەیی بە هیچ شێوەیەك لە دڵی‌دا نەئەبوو .

کاتێك کە زەینەبی کچی پێغەمبەری خوا ویستی کۆچ بکا بۆ مەدینە بۆ لای باوکی و ، سکی پڕ بوو ، هەببار کەوتە دوای و لە قەراغی مەککەدا گەیشتە لای و دەستی کرد بە نەقیزەدانی وشترەکەی زەینەب هەتا خستیە خوارەوە و ، پاشان رمێکی کێشا بە پشتیا ، کە ئەوەبوو سکەکەی خست و ، هەروا خوێنی لێ ئەرژیشت و بەینا و بەین لێی هەڵ ئەدایەوە ، تا ئەو رۆژەی کە کۆچی دوایی کرد .

هەببار لێپرسراوی کوشتنی زەینەبیش و مناڵەکەشی بوو . بۆیە ئەمیش فەرمانی کوشتنی بۆ دەرچوو بوو . کە ئەویش ئەو فەرمانەی بیستبوو و ، موسڵمانەکانیش دەستیان بەسەر مەککەدا گرت ، هەببار مەککەی بەجێ هێشت و بەرەو بیابان هەڵات . ئەوەبوو دوای فەتحی مەککە موسڵمانەکان لە جەنگی حونەین‌دا سەرکەوتنیان بە دەست هێنا و گەڕانەوە مەدینە . دوای ئەوەی کە بارودۆخ هێور بوویەوە و خەڵکی مەککە هەر هەموو موسڵمان بوون ، هەببار بڕیاری دا بچێ بۆ مەدینە و خۆی تەسلیم بکات و داوای چاوپۆشیی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکات . ئەوەبوو گەیشتە مزگەوت و چووە خزمەتی پێغەمبەر و ناسیی . جا هەرچەندە فەرمانی کوشتنی بۆ دەرکرابوو ، بەڵام فەرمانی بە هاوەڵانی دا کە هیچ کەس دەستی بۆ نەبات ، چونکە زانیی بە پاکیی بۆ موسڵمان بوون هاتووە ..

هەببار هاتە پێشەوە وتی : (( السلام عليك ، يا رسول الله ! إني أشهد أن لا إله إلا الله ، وأنك رسول الله )) . پاشان وتی : لە دەستت رام کرد و ویستم خۆم بگەیەنمە ناو عەجەم . پاشان لێبووردن و فەزڵ و چاکیی و چاوپۆشییت لە کەسێك کە نەفامیی بەرامبەرت نواندبێ هاتەوە یادم . ئەی پێغەمبەری خوا ! ئێمە ئەهلی شیرك بووین بە هۆی تۆوە خوای مەزن هیدایەتی داین و ، لە تیاچوون رزگاری کردین . جا چاوپۆشیی بکە لە نەفامییم و لەوەش کە لە منەوە پێت گەیشت . من دان بە خراپکاریی و تاوان بارییم‌دا ئەنێم .

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : وا چاوپۆشییم لێ کردیت و ، خواش کە هیدایەتی دایت بۆ سەر ئیسلام چاکی بۆ کردیت و ، ئیسلامیش چاوپۆشیی لە کاری لەوەو بەر ئەکات .

زوبەیری کوڕی عەووام خوا لێی ڕازیی بێ وتوویە : هەرچیی پێغەمبەری خوام ﷺ دیبێ ناوی هەبباری بردبێ ڕقی لێ هەستاوە . هەرچیی دیبێتیشم سریەیەکی ڕەوانە کردبێ ئەی فەرموو : (( إن ظفرتم بهبّار فاقطعوا يديه ورجليه ثم اضربوا عنقه )) . ئەی فەرموو : ئەگەر هەببارتان دەست کەوت هەردوو دەست و هەردوو قاچی ببڕن و بدەن لە ملیشی . بەخوا من بە دوای‌دا ئەگەڕام و پرسیاریشم دەربارەی ئەکرد . خوا ئەزانێ ئەگەر بەر لەوەی کە هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ دەستم بکەوتایە ئەم کوشت .

هەببار زۆر زمان پاراو بوو ، کاتێ جنێوی وەهای پێ ئەدرا کە کاری ئەکردە سەر دڵی ، ئەو بە هیچ شێوەیەك تۆڵەی خۆی نەئەسەند و وەڵامی کەسی نەئەدایەوە . ئەوەبوو ئەو دان بە خۆدا گرتنەی گەیشتە پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەویش فەرمووی: (( هبّار ! سُبَّ من سبَّك )) جنێوی پێ بدرێ ئەوەی کە جنێوت پێ ئەدا .

٤ ـ هوبەیرەی کوڕی ئەبووەهب : ئەم پیاوە نە بە دوای‌دا ئەگەڕان و نە فەرمانی کوشتنیشی دەرچوو بوو .

ـ عەبدوڵلای کوڕی زەعبەریی : ئەمیش فەرمانی کوشتنی دەرنەچوو بوو . ئەم پیاوە شاعیرێکی لێ‌هاتوو بوو دژی پێغەمبەر ﷺ شیعری ئەوت . هوبەیرە و عەبدوڵلا هەردووکیان لە خۆیان ئەترسان بۆیە مەککەیان بەجێ هێشت و خۆیان گەیاندە لای هۆزی نەوەی حاریث لە نەجران و چوونە قەڵاکەیانەوە .

دوای ماوەیەك خوای گەورە خۆشەویستیی ئیسلامی خستە دڵی عەبدوڵلاوە و ، بڕیاری دا نەجران بەجێ بهێڵێ و بگەڕێتەوە بۆ مەدینە . لەوێ چووە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و داوای چاوپۆشیی لێ کرد . ئەویش لێی خۆش بوو و ، کوڕی زەعبەریی موسڵمان بوو .

کە پێغەمبەری خوا ﷺ سەیری کوڕی زەعبەریی کرد فەرمووی : (( هذا إبن الزعبري ومعه وجه فيه نور الإسلام )) . شاهێدیی بۆ دا کە دەم و چاوی نووری ئیسلامی تێدا دیارە .

کاتێ گەیشتە نزیکی پێغەمبەر وتی : سەلامت لێ بێ ئەی پێغەمبەری خوا ! شاهێدیيم بە تاك و تەنیایی خوا داوە و تۆش بەندە و پێغەمبەری خوایت . سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە هیدایەتی‌دام بۆ سەر ئیسلام . دوژمنایەتییم کردیت و ، خەڵکم هێنایە سەرت و ، بە سواریی ئەسپ و وشتر و بە پێ دوژمنایەتییم کردیت ، پاشان

رام کرد لە دەستت بۆ نەجران ، کە نەمئەویست هەرگیز نزیکی ئیسلام بکەومەوە ، پاشان خوای مەزن چاکەی بۆم ویست و ، خۆشەویستیی ئیسلامی خستە دڵمەوە و ، بیرم لەو گومڕایی‌یە کردەوە کە تیایا بووم ، لەگەڵ پەرستن و قوربانیی کردن بۆ بەردێك کە کەڵك بە هیچ ژیرێك نەگەیەنێ و ، نەش‌زانێ کێ ئەی‌پەرستێ و کێش نای پەرستێ.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( الحمد لله الذي هداك للإسلام ، إن الإسلام يجب ما كان قبله )) . فەرمووی : سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە هیدایەتی بۆ سەر ئیسلام دایت . ئیسلام چاوپۆشیی لە کاری لەوەو بەر ئەکات .

بەڵام هوبەیرەی کوڕی وەهب هەر لە نەجران مایەوە تا لەوێ بە موشریکیی سەری نایەوە و مرد . بەڵام ئوم هانیئ کچی ئەبوطالیب کە هاوسەری هوبەیرە بوو لە مەککە موسڵمان بوو .

٦ ـ حوەیطبی کوڕی عەبدولعوززا : ئەمیش فەرمانی کوشتنی بۆ دەرنەچوو بوو ، بەڵام یەکێ بوو لە سەردارانی قوڕەیش و ئەندامی نوێنەرانی قوڕەیش بوو لە ڕێکەوتن نامەی حودەیبیەدا ، کە یەکێ بوو لەو سێ کەسەی کە لە بریی قوڕەیش پەیمانەکەیان مۆر کرد . لە هەمان کات‌دا دوژمنایەتیی ئیسلامی زۆری ئەکرد ، بۆیە لە خۆی ئەترسا کە بکوژرێ.

ڕۆژی فەتح حوەیطەب ویستی بە نهێنیی لە مەککە دەرچێت ، بەڵام ئەبوذەرری غیفاریی ، کە دۆستی سەردەمی نەفامیی بوون ، چاوی پێ کەوت ، بانگی لێ کرد و هێمنی کردەوە و ، داوای لێ کرد بگەڕێتەوە مەککە و بەڵێنی پێ دا کە تووشی هیچ خراپەیەك نەبێت .

بانگی لێ کرد مەترسە ، ئەگەر ئەتەوێ ئەت‌بەمە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەشت دەوێ ئەت‌بەمەوە ماڵی خۆتان . وتی : جا ئەگەمەوە ماڵی خۆمان ؟ کەسێ تووشم ببێ بەر لەوەی بگەمەوە ماڵەوە ئەمکوژێ ، یان لە ماڵەوە دێنە سەرم و ئەم کوژن . وتی : من ئەت‌گەیەنمەوە ماڵەوە . ئەبوذەڕ لە دەرگاکەی حوەیطەب‌دا جاڕی دا کە هیچ کەس نەیەتە سەری و ئەمانی پێ دراوە . پاشان چووە خزمەتی پێغەمبەری خوا و هەواڵەکەی دایە . ئەویش فەرمووی : (( أَوَ ليس قد أمنا كل الناس إلا من أمرت بقتله ؟ )) . فەرمووی : ئەی ئێمە ، جگە لەوانەی فەرمانم بە

کوشتنیان داوە ، ئەمامان بە هەموو خەڵکیی نەداوە ؟ ئەوانەش تەنها سیانیان کوژران ئەوانی تر چاوپۆشیی‌یان لێ کرا و موسڵمانیش بوون .

شایانی باسە کە هەندێ لە پیاوانی مەککە پێش ژنەکانیان موسڵمان بوون و ، هەندێ ئافرەتیش پێش مێردەکانیان موسڵمان بوون و، پێغەمبەری خوا ﷺ نیکاحی تازەی بۆ نەکردن ، بەڵکو لەسەر نیکاحی پێشوویان هەر بە ژن و مێرد مانەوە .

٧ ـ وەحشیی کوڕی حەرب : ئەمیش یەکێ بوو لەوانەی کە فەرمانی کوشتنی بۆ دەرچوو بوو لەسەر شەهیدکردنی حەمزە ..

ئیبن عەبباس ئەگێڕێتەوە کە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کوشتنی وەحشیی لەگەڵ چەند کەسێك دەرکرد . موسڵمانەکانیش لە هەموو کەس زیاتر هەوڵی کوشتنی وەحشیی‌یان ئەدا .. ئەویش رای کرد بۆ طائیف و لەوێ مایەوە ، هەتا ئەوەبوو نوێنەرانی طائیف بۆ موسڵمانبوون هاتنە مەدینە ، ئەویش لەگەڵیان هات و هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی : أشهد أن لا إله إلا الله وأن محمداً عبده ورسوله.

فەرمووی : وەحشییت ؟ وتی : بەڵێ .

فەرمووی : (( إجلس ، حدثني كيف قتلت حمزة ؟ )) . فەرمووی : دانیشە بۆم باس بکە حەمزەت چۆن کوشت ؟

کە گێڕایەوە بۆی ، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دا نەی‌بینێ . ئیتر هەرچیی وەحشیی تووشی ببوایە خۆی لێ ئەشاردەوە .

ئەوەبوو جەنگی پاشگەزبووەکان هاتە بەرەوە و وەحشییش لەگەڵ سوپای ئیسلامدا بەرەو ناوچەی موسەیلەمەی درۆزن کەوتە رێ و لەوێ حەربەیەکی گرتە موسەیلەمە و، پیاوێکی ئەنصارییش بە شمشێر لێی دا ، بەمە بە هەردووکیانەوە موسەیلەمەیان کوشت.

کاتێك کە سوپای ئیسلام هاتە مەککەوە موسڵمانەکان بەشێکیان زۆر دەست کورت بوون ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ لەلای سێ دەوڵەمەندی قورەیشیی پارەی قەرز کرد و بەسەر هاوەڵاندا دابەشی کرد .

لە صەفوانی کوڕی ئومەییە پەنجا هەزار و ، لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبورەبیعە چل هەزار و ، لە حوەیطبی کوڕی عەبدولعوززا چل هەزاری قەرز کرد و ، پاشان لە

دەست کەوتەکانی هەوازین بۆی بژاردنەوە و سوپاسی کردن و دوعای خێری بۆ ماڵ و منداڵیان کرد.[٢١٧]

**سیانزەهەم : کوژرانی پیاوێکی هەذەلیی**

کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا هەموو موشریکێکی مەککە چاوپۆشیی لێ کراوە و ، هیچ کەسێ دەستی بۆ نەبات ، سوپای ئیسلام بە جوانیی گوێی بۆ فەرمانەکە راگرت ، جگە لە چەند سەربازێکی سوپای ئیسلام کە لە هۆزی خوزاعەی هاوپەیمانی موسڵمانان بوون . ئەوانە لە فەرمان دەرچوون و بۆ تۆڵەسەندن پیاوێکی موشریکی هۆزی هوذەیلیان لە مەککەدا کوشت ، دوای بلاّوکردنەوەی چاوپۆشیی .

ئەم کارە بە لای پێغەمبەری خواوە ﷺ زۆر گران بوو ، بۆیە سوپای کۆ کردەوە و ، وتارێکی بۆ دان و نارەزایی خۆیشی بۆ کوشتنی ئەو پیاوە موشریکە دەربڕیی و پاشان فەرمانی دا هۆزی خوزاعە خوێنی ئەو پیاوە کوژراوە دەر بکەن کە بریتیی بوو لە صەد وشتر ، ئەوانیش گوێڕایەڵی‌یان کرد ..[٢١٨]

---

[٢١٧] فتح مكة لباشميل : ٣٢٣ ـ ٣٥٥ ، المنهج التربوي للسيرة النبوية : ٣ / ٨١ ـ ١٠٢ .

[٢١٨] فتح مكة لباشميل : ٣٥٥ ـ ٣٥٨ .

## بەشی چلـەم

# ڕووداوەكانی نێوان فەتح و حونەین

كە موسڵمانەكان دەستیان بەسەر مەككەدا گرت ، ئەستێرەی بتپەرستیی هاتە ئاوابوون و ، تازە بیروباوەڕی پووچەڵ لەبەردەم بیروباوەڕی تەوحیددا خۆی ناگرێ .

ئەوەبوو پێشتر موسڵمانەكان دەوروبـەری مەدینـە و ناوچـەی خەیبـەریان لـە بت پەرستیی پاك كردەوە ، تەنها دوو هێز مابوون سەنگی سەربازی‌یان هـەبێت : یەكـەم هێزی قوڕەیش لە مەككـە و ، دووهـەم هـۆزی هـەوازین لـە بیابـان و دەرو دەشـتە فراوانەكەیاندا كە لە حیجازەوە هەتا دەوروبەری نەجد درێژ ئەبوویەوە .

ئەوەبوو بە فەتحی مەككە هێزی یەكەمیان لە ناو چوو ، بەڵكو موسڵمان بـوو و ، بووە كۆمەكی سـوپای ئیسـلام و ، تـەنها هێـزی هـەوازین مـابوو كـە بـە ڕاستیی موسڵمانەكان حیسابیان بۆ ئـەكرد و ، خـاوەنی توانـا و دەسـەڵات بـوون و : ئـەیان توانیی بیست هەزار جەنگاوەر جەم بكەن . هەروایش بـوو دوای فـەتحی مەككـە بـە ماوەیەكی كەم بەرەو مەككـە سـوپایان ڕێـك خسـت و ، ئـەوەبوو موسـڵمانەكانیش ئاگاداری بارودۆخەكە بوون و بە پەلە چوون بە پیری ئەو سوپا گـەورەوە و لـە شـیوی حونەین بە یەك گەیشتن .

جگە لە هەوازین لەم لاو لـەولا بـە دەوری مەككـەدا چـەند هێزێكـی بچـكۆلەی عەرەب مابوون : پێغەمبەری خوا ﷺ وای بە چاك زانیی ئەوانە لە بت پەرستیی بخات و بیان هێنێتە سەر ڕێبازی خواناسیی ، بەر لەوەی لەگەڵ هەوازیندا بجەنگێ .

بۆ ئەمە پێغەمبەری خوا ﷺ چەند بەشێكی سوپاكەی بۆ ئەو ناوچانە ڕەوانـە كـرد تا ئەو بتانە بشكێنن كە دانیشتوانی دوورگە ئەیانپەرستن . ئەو هەڵمەتانەش بریتیی بوون لە پێنج هەڵمەت :

**یەكەم : سریەی موشەللەل**

پێغەمبەری خوا ﷺ سەعدی كوڕی زەیدی ئەشهەلیی كردە فەرماندەی ئەم سریەیە بۆ تێكشكاندنی بتی مەنات ، كە كۆنترین بتێكـە عـەرەب پەرسـتبێتی . ئـەوەبوو

عەرەبەکان بە خوایەکی گەورەیان دائەنا و ئاژەڵیان بۆ سەر ئەبڕیی ، بە تایبەت ئەوس و خەزرەج کە لە هەموو کەس زیاتر ڕێزیان لە مەنات ئەنا و ، کە حەجیان ئەکرد ئەبوا بچوونایە بۆ ناوچەی قودەید لەسەر دەریای سوور و لەوێ لەبەردەم مەناتدا سەریان بتاشیایە و ماوەیەك لەوێ بمێننەوە .

لە ڕیوایەتێکی تردا وەها هاتووە کە مەنات بە دەستی عەلیی کوڕی ئەبوطالیب تێك شکێنرابێ .

**دووهەم : تێك شكاندنی عوززا**

لە بیست و پێنجەمین ڕۆژی مانگی ڕەمەزانی ساڵی هەشتەمدا بە فەرماندەیەتیی خالیدی کوڕی وەلید سریەیەکی سیی سەربازیی بە ڕێ خرا بۆ تێك شکاندنی عوززای گەورەترین بتی قوڕەیش . خالید تێکی شکاند و گەڕایەوە خزمەتی پێغەمبەر و هەواڵەکەی دایە .

پاشان خالید وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ڕێزی لێمان نا و لە تیاچوون ڕزگاری کردین . چاوم لە باوکم بووە بە دیارییەکەیەوە ، کە سەد سەر وشتر و مەڕ ئەبوو ، ئەهات بۆ لای عوززا و هەمووی بۆ سەر ئەبڕیی و سێ ڕۆژ لەوێ ئەمایەوە و پاشان بە دڵی خۆشەوە ئەگەڕایەوە دوا ..

**سێهەم : هەڵمەتی یەلەملەم**

لە کۆتایی مانگی ڕەمەزانی ساڵی هەشتەمدا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم دەوریەی بە ڕێ کرد کە بریتیی بوو لە دووصەد جەنگاوەر و هیشامی کوڕی عاصیشی کردە فەرماندەیان ، تا بەرەو ناوچەی یەلەملەم بڕۆن کە کەوتبووە باشووری خۆرهەڵاتی مەککە بۆ بەگژاچوونی بتپەرستانی ئەو ناوچەیە .

**چوارەم : هەڵمەتی عورەنە**

ئەم هەڵمەتە لە کۆتایی مانگی ڕەمەزانی ساڵی هەشتەمدا ئەنجام درا .. عورەنەش شیوێکە لە تەنیشت عەرەفاتدا .. هەر لەم شیوەدا بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری حەجی ماڵئاوایی پێشکەش بە موسڵمانان کرد . دانیشتوانی ئەم شیوە لە سەرەتای هاتنی ئیسلامدا بەرەیەکی هوذەیل بوون و ، یەکجار دوژمنایەتی ئیسلامیان ئەکرد . هەتا ئەوەبوو لە ساڵی چوارەمی کۆچییدا سوپایان کۆ کردەوە و نیازیان وەها بوو هێرش بکەنە سەر مەدینەی پایتەختی ئیسلام . کە ئەم هەواڵە گەیشتە پێغەمبەری خوا ﷺ ، خێرا هاوەڵێکی پاڵەوانی بۆ کوشتنی فەرماندەی

سوپـای دوژمنــان هەڵ بژارد ، کە عەبدوڵڵای کوڕی ئونەیسی جوهەنیی بوو . نـاردی بۆ کوشتنی خالیدی کوڕی سوفیانی هەذەلیی ، وەك لە شوێنی خۆیدا بە درێژە بـاس کراوە .

ئەو هێزەی کە لە کۆتایی ڕەمەزانی ساڵی هەشتەمدا بـەرەو عورەنـە ڕەوانـە کـرا بریتیی بوو لە سێصەد جەنگاوەر و خالیـدی کـوڕی سـەعیدی کـوڕی عـاص کرایـە فەرماندەیان بۆ کۆتایی هێنان بە بتپەرستیی لەو ناوچانەدا .

**پێنجەم : غەزای نەوەی جوذەیمە**

لە کۆتایی مانگی ڕەمەزانی ساڵی هەشتەمی کۆچـیدا هەڵمـەتێکی سـەربازیی کرایە سەر نەوەی جوذەیمە ، ئەمەش بە سەرکردایەتیی خالیدی کوڕی وەلید ، کـە بـە بۆنەی هەڵەیەکەوە کە لە دەستی دەرچوو ، گلەیی پێغەمبەری ﷺ هاتە سەر . ئەوەبوو کۆمەڵێك موسڵمانی کوشتن بە بۆنەی ئەوەوە کە نەیئەزانی موسڵمانن .

پێغەمبەری خوا ﷺ خالیدی کوڕی وەلیدی بەرەو ناوچـەی نـەوەی جـوذەیـە ، بـە فەرماندەی سێصەد و پەنجا پیاوی موهاجیر و ئەنصار و نەوەی سولەیم ، ڕەوانە کرد، تا بانگیان بۆ سەر ئیسلام بکات ، نەك جەنگ و کوشتار .

هەواڵ بە نەوەی جوذەیمە گەیشت کە خالید و سـوپای موسـڵمانان بـەرەو ناوچـەی ئەوان دێن . ئەوانیش لە خۆیان بێخەم بوون و وتیـان : ئێمـە موسـڵمانین ، نوێـژمان بەجێ هێناوە و تەصدیقی موحەممەدمان کردووە و ، مزگەوتـمان دروسـت کـردووە و بانگمان داوە .

کە خالید گەیشتە لایان داوای موسڵمانبوونی لێ کردن ، ئـەوانیش دەریـان بڕیـی کە موسڵمانن . فەرمانی دا چەکەکانیان دابنێن . پیاوێکیان هەسـتی بـە مەترسـیی کرد و لە نەوەی جوذەیمە داوای کرد چەکەکانیان دانەنێن ، بەڵام بە گوێیـان نـەکرد و چەکیان دانا و، خالیدیش داوای لێ کردن ببنە دیـل . دیسـان پیاوەکـە ئامۆژگـاریی کردن کە خالید نیازی خراپی پێیان هەیە . کەچیی خۆیـان بـە دەسـتەوە دا و قـۆڵ بەست کران و هەر یەك دوو پیاویان درایە دەست موسڵمانێك و هەروا شـەو بـە قـۆڵ بەستراویی مانەوە. کە ڕۆژ بوویـەوە خالیـد فـەرمانی دا دیلـەکان بکـوژن . نـەوەی سولەیم دیلەکانیان کوشت ، بەڵام موهاجیر و ئەنصار دیلەکانی دەستی خۆیان بـەر دا

..

دوای ئەوە دەمەقاڵێیەك لە نێوان خالید و یەکێ لە ئەنصارە ناودارەکان ، کە ئەبوئوسەیدی ساعیدیی بوو ، رووی دا ، ئەویش لەسەر ئەوەی کە خالید ئەو کارەی موهاجیر و ئەنصارەکانی پێ ناخۆش بوو . ئەبوئوسەید وتی : خالید ! لە خوا بترسە . بەخوا ئێمە هەرگیز کوشتاری موسڵمانمان نەکردووە . خالید وتی : جا تۆ چۆن ئەزانیت ئەمانە موسڵمانن؟ وتی : دان نانیان بە ئیسلامدا ئەبیستین و ، مزگەوتیش لە ناوچەکەیاندا هەن .

دوای گەڕانەوەی خالید لەلایەن گەورە هاوەڵانەوە ، وەك عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف و عومەری کوڕی خەططاب و عوثمانی کوڕی عەففانەوە لۆمە کرا و ، ئەویش بەرگریی لە خۆی ئەکرد و لە هەمان کاتدا داوای چاوپۆشیی لە خوای گەورە ئەکرد . عومەر بەزەیی پیا هاتەوە و داوای لێ کرد بچێتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ تا داوای چاوپۆشیی بۆ بکات .

کە هەواڵی ئەو کارەی خالید گەیشتە پێغەمبەری خوا ﷺ هەردوو دەستی ئەوەندە بەرز کردنەوە تا سپێتیی بن باڵی دەرکەوت و ئەی فەرموو : « أللهم إني أبرأ إليك مما صنع خالد » . خۆی لەو تاوانەی خالید داماڵیی ، چونکە فەرمانی وەهای بەسەردا نەدابوو . کە خالید هاتە خزمەتی لێی زویر بوو .

بەڵام کە دەرکەوت خالید بە هەڵە ئەو کارەی لە دەست دەرچووە ، پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری دا خوێنی ئەو کوژراوانە بدات . بۆ ئەمە ئیمام عەلیی بانگ کرد و پارە و سامانی دایە و ، فەرمانی بەسەردا دا بچێتە لای نەوەی جوذەیمە و خوێنی کوژراوەکانیان بدات .

کە ئیمام دەستی بە خوێندان کرد پارەکە کەم بوو ، خێرا پیاوێکی ناردەوە بۆ پارەی تر و ، هەرچیی مافێکیان هەبوو هەمووی پێ دان و ، پارەش لای ئیمام مایەوە و ، دایە دەست نەوەی جوذەیمە تا هەر مافێکی تر مابێ پێی جێ بەجێ بکەن. ئەم پارەیەش پێغەمبەری خوا ﷺ بە قەرز وەری گرتبوو ، چونکە لەو کاتەدا موسڵمانەکان فەتحی مەککەیان کرد بێپارە بوون .

خوێندانی ئەو کوژراوانە ئەیسەلمێنێ کە خالید نەیزانیوە موسڵمانن و کارەکە بە هەڵە رووی داوە ، ئەگینا ئەبوا خالید لەسەریان بکوژرایە .

ریوایەتی وایش هەیە کە ئەوانە بەرەنگاریی خالیدیان کردووە و ئامادەبوون جەنگ بکەن ، هەرچەندە خالید مۆڵەتی خۆ بە دەستەوەدانی پێ دابوون . لە هەمان کاتدا

سێ نوێژی عەصر و مەغریب و عیشا خالید چاوەڕوان ئەکات دەنگی بانگ نابیستێت، ئەوسا هێرش ئەکاتە سەریان و بە دیل ئەیان گرێ و ئەیان کوژێ ..

هەتا لە ریوایەتەکەی بوخاریی دا وەها هاتووە کە ئەوەی جوذەیمە نەیان زانیوە بڵێن موسڵمان بووین ، بەڵکو وتوویانە صبأنا ، صبأنا ، واتە لە دین وەرگەڕاوین . خالیدیش ناچار بووە بچێ بە گژیان دا.

لەسەر ئەمە لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ دەمەقاڵە لە نێوان خالید و هەندێ لە هاوەڵە دێرینەکان دا ، وەك عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف و عەمماری کوڕی یاسیر ، ڕووی دا . ئەوەبوو خالیدیش هەندێ قسەی دەرهەق بە عەبدوڕڕەحمان لە دەم دەرچوو بوو ، بۆیە پێغەمبەریش فەرمووی : (( يا خالد ! ذروا لي أصحابي متى يُنكَ أنفُ المرءِ يُنكَ ، لو كان أحد ذهباً تنفقه قيراطاً قيراطاً في سبيل الله لم تدرك غَدوة أو رَوحة من غدوات أو روحات عبدالرحمن بن عوف )) . داوای لە خالید کرد کە لە هاوەڵەکانی بگەڕێ . چونکە ئەگەر خالید کێوی ئوحودی هەبێ و هەمووی زێڕ بێ و قیراط قیراط لە پێناوی خوادا خەرجی بکات بە پاداشتی سەر لە بەیانی یەك ، یان سەر لە ئێوارەیەکی عەبدوڕڕەحمان دا ناگات . هەروەها دەربارەی عەمماریش فەرمووی: (( صه يا خالد ! لا تقع بأبي اليقضان ، فإنه من يُعادِهِ يُعاده الله ، ومن يبغضه يبغضه الله ، ومن يسفهه يسفهه الله )) . خالیدی ئاگادار کرد کە هەر کەس دژایەتیی عەممار بکات خوا دژایەتیی ئەو کەسە ئەکات و هەر کەس ڕقی لێ بێ ، یان بە نەزانی دابنێ خوا ڕق لەو کەسە هەڵ ئەگرێ و بە نەزانیشی دائەنێ .

خالید دێت و داوای چاوپۆشیی لە عەبدوڕڕەحمان ئەکات .

هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ خالیدی لە هێرش کردنە سەر هاوەڵانی قەدەغە ئەکرد، بە هەمان شێوە هەموو هاوەڵانی لەوە قەدەغە ئەکرد کە قسە بە خالید بڵێن چونکە خالید شمشێرێکە و خوا بۆ تێك شکانی کافرانی ناردووە ..

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ لە خالید ڕازیی بوو و ، ستایشی کرد . هەتا ئەوەبوو خالیدی کردە فەرماندەی پێشەنگی ئەو سوپایەی کە بەرەو حونەین کەوتە ڕێ ، هەروەها بۆ تەبووکیش.

خالید لە حەجی ماڵئاوایی دا لە خزمەتی پێغەمبەردا بوو . کە پێغەمبەر ﷺ سەری تاشیی ، قژی پێشەوەی سەری دا بە خالید ، ئەویش لە کڵاوەکەی خۆی دا هەڵی گرت و ، هەر کەسێ ئەهات بە ڕوویەوە خوای گەورە ئەی شکاند . کە جەنگی

یەرمووك هاتە بەرەوە خالید بەشداریی تیّدا کرد ، کلاّوەکەی لیّ کەوت و، خالیدیش بە دوایدا ئەگەڕا و هەواڵی ئەپرسیی . لیّیان پرسیی کە سەیرە بە لایانەوە لە گەرمەی جەنگدا ئەو بە دوای کلاّوی سەردا ئەگەڕیّ . وتی : قژەکانی پیّشەوەی سەری پیّغەمبەری تیّدا هەڵ گیراوە و ، لە جەنگدا تووشی هەرکەس هاتبم پیّیانەوە، هەلاّتووە .[219]

[219] غزوة حنین لباشیل : ١٣ ـ ٣٩ .

## بەشی چل و یەکەم

# جەنگی حونەین

**یەکەم : هێرشی سوپای هەوازین**

بەر لەوەی بێینە سەر باسی جەنگی حونەین ، وا چاکە کورتەیەك دەربارەی هەوازین بزانین .

مێژوونووسان لەسەر ئەوە یەك‌دەنگن کە هەوازین گەورەترین و بەهێزترین هۆزە لە دوورگەی عەرەبیی‌دا و ، هۆزێکی موضەریی عەدنانی‌یە . کە پشتیان ئەچێتەوە سەر هەوازینی کوڕی مەنصووری کوڕی عیکریمەی کوڕی خەصفەی کوڕی قەیسی کوڕی عەیلانی کوڕی موضەری کوڕی نزاری کوڕی مەعدی کوڕی عەدنان ..

ئەم هۆزە لقی زۆری لێ کەوتبوویەوە وەك ثەقیف و کەعب و و کیلاب و نەوەی هیلال و نەوەی عامیری کوڕی صەعصەعە و نەوەی جوشەمی عەشرەتی دورەیدی کوڕی صومە و نەوەی نەصری عەشرەتی مالیکی کوڕی عەوف ..

جا لەبەر زۆریی لقەکانی ئەم هۆزە ناوچەیەکی زۆری لە خاکی دوورگەی عەرەبیی داگیر کردبوو ، هەر لە شیوی حونەینەوە لە نزیك مەککەدا جێگیر بووبوون هەتا ناوچەی نەجد .

لە سەردەمی نەفامیی‌دا هەوازین هۆزێکی دڕی جەنگەران بوو و ، چەندین جەنگی خوێناویی لەگەڵ هۆزە دراوسێ‌کانی‌دا هەڵ گیرساندبوو . هەتا لە نێوان خۆیان‌دا لق و بەرەکان جەنگیان ئەکرد .

ئەوەبوو لە سەردەمی نەفامیی‌دا لە نێوان ثەقیف و بەرەکانی تری هەوازین‌دا جەنگێکی سەخت رووی دا کە پێی ئەوترێ جەنگی ( أنتان ) بە بۆنەی زۆریی ئەوانەوە کە کوژرا بوون و لە مەیدانی جەنگ‌دا بۆگەنیان کردبوو .

**جەنگەکانی فیجار**

گرنگ‌ترین جەنگی هەوازین لە سەردەمی نەفامیی‌دا بریتیی بوو لە جەنگەکانی فیجار ، کە هەوازین لەلایەکەوە و ، قورەیش و کەنانەش لە لایەکەی ترەوە .

ئەم جەنگانە چوار جەنگ بوون و هەموویشیان لە مانگەکانی حەرامدا روویان داوە، لەو کاتەدا کە عەرەبەکان لە بازاری عوکاظدا کۆ ئەبوونەوە . هەر بەو بۆنەشەوە ناویان نان جەنگەکانی فیجار چونکە لە مانگە حەرامەکاندا روویان داوە .

لە هەموویان سەختتر جەنگی فیجاری چوارەمە کە چەند ساڵێکی خایاند و خەڵکێکی زۆر لە ریش سپیی و سەرۆکی هەردوو لا کوژران .

**جەنگی فیجاری یەکەم** :

هۆی روودانی ئەم جەنگە ئەوە بووە کە پیاوێکی هۆزی غیفار کە ناوی بەدری کوڕی مەعشەر بووە ، ئامادەی بازاڕی عوکاظ ئەبێت . ئەم پیاوە فیز و دەمارێکی زۆری هەبووە و جەنگی بە خەڵك فرۆشتووە . کوڕێکی بۆ خۆی دروست کردبوو و هەردوو پێی تیا راکێشا بوو و ، ئەیوت : من دەسەڵاتدارترین پیاوی عەرەبم ، کێ خۆی بە پیاوتر ئەزانێ با بە شمشێر لێم بدات . ئەوەبوو پیاوێك لە نەوەی نەصر لە هەوازین بە ناوی ئەحمەری کوڕی مازین لەوێوە تێپەڕی و ، شمشێرێکی دا لە قاچی بەدر و پەڕاندی . بەڵام پیاوە ژیرەکان ئاگری ئەم فیتنەیان کوژاندەوە و نەیان هێشت جەنگ دروست ببێ ..

**جەنگی فیجاری دووهەم** :

هۆی ئەم جەنگەش ئەوەبوو چەند گەنجێکی قوڕەیش و کەنانە شەڕیان بە ئافرەتێکی هەوازین لە تیرەی عامیری کوڕی صەعصەعە فرۆشت و سوکایەتییان پێ کرد . لەسەر ئەمە هەوازین تووڕە بوون و جەنگ هەڵ گیرسا . بەڵام حەربی کوڕی ئومەییەی کوڕی عەبدشەمسی کوڕی عەبدمەناف کە سەرداری قوڕەیش بوو توانیی جەنگەکە بوەستێنێ و عوزری بۆ هەوازین هێنایەوە و ، خوێنی کوژراوانی هەوازینییان دا.

**جەنگی فیجاری سێهەم** :

هۆی ئەم جەنگەش ئەوەبوو پیاوێك لە نەوەی جوشەم قەرزی بەلای پیاوێکی هۆزی کەنانەوە بوو و هەر دەستیی پێ نەکرد ، کە بێتاقەت بوو لێی ، لە بازاڕی عوکاظدا بۆ سوکایەتیی بەو پیاوە قەرزارە ئەیقیڕاند و مەیموونێکیشی بە دەستەوە بوو . دوای ماوەیەك پیاوێکی کەنانیی شمشێرێکی دا لە مەیموونەکە و کوشتی و ، هەردوو لا جاڕی جەنگیان دا .. بەڵام پیاوە ژیرەکانیان نەیانهێشت جەنگ دروست ببێ . پاشان عەبدوڵڵای کوڕی جەدعانی پیاوی سەخی تەبیعەتی ناوداری قوڕەیش قەرزی کابرای هەوازینیی دایەوە و کێشەکە کۆتایی هات .

**جەنگی فیجاری چوارەم :**
ئەم جەنگە یەکجار ناهەموار بوو ، چونکە بریتیی بوو لە پێنج جەنگی خوێناویی کە خەڵکێکی زۆریان تێدا کوژرا و سەرەنجام کە هەستیان بە مەترسیی کرد جەنگیان وەستاند .

**جەنگی یەکەمی فیجاری چوارەم :**
هۆی ئەم جەنگانە ، کە سەرەتاکەیان بیست و شەش ساڵ پێش هاتنی وەحیی بوو، ئەوەبوو پیاوێکی عەرەق خۆری بیڕەوشتی نەوەی ضیمرە لە کەنانە بە ناوی بەڕڕاضی کوڕی قەیس ، بە بۆنەی بەدڕەوشتی‌یەوە خزمەکانی دەربەدەریان کرد ، ئەویش خۆی گەیاندە لای قوڕەیش و بووە هاوپەیمانی حەربی کوڕی ئومەییەی باوکی ئەبوسوفیان . لەوێش هەر خەریکی عەرەق خواردنەوە بوو ، بۆیە خەریك بوو حەربیش دەستی لێ هەڵ بگرێ . بەڕڕاض لە حەرب پاڕایەوە با پەیمانەکەی بێنێ ، ئەو مەککە بەجێ ئەهێڵێ . بەم شێوەیە خۆی گەیاندە لای مەلیك نوعمانی پادشای حیرە لە عێراق و لەوێ وەك هاوپەیمانێکی حەرب مایەوە .
شایانی باسە کە بازاڕی عوکاظ گرنگ ترین بازاڕی عەرەبەکان بوو لە خۆرهەلاتی نزیك‌دا ، کە لە یەکەم رۆژی مانگی ذولقەعیدەوە دەستی پێ ئەکرد و تا کاتی حەج خەڵکەکە خەریکی کڕین و فرۆشتن ئەبوو .
هەموو ساڵێکیش مەلیك نوعمان ئەم بازاڕەی بە هەل ئەزانیی و چەندین کاروانی رێك ئەخست و کەلوپەلی جۆراوجۆری ئەنارد بۆ عوکاظ تا کەلوپەلی دوورگەی عەرەبی‌یان پێ بکڕێت .
ئەو ساڵەش کە جەنگی فیجار تێیدا رووی دا مەلیك نوعمان کاروانی رێك خست و، بە دوای کەسێك‌دا ئەگەڕا کە لە ولاتی عەرەب‌دا پەنای بدات ، تا کەس لاقەی نەکات و بگەڕێتەوە حیرە ..
بەڕڕاضی سەرخۆش وتی : من پەنای ئەدەم . پادشا ئەی‌زانیی ئەو پیاوی ئەوە نیە، بۆیە وتی : ئەمەوێ کەسێك بۆ ئەهلی نەجد پەنای بدات . پیاوێك بە ناوی ( عروة الرحال ) ، کە لە هەوازین بوو ، وتی : من پەنای ئەدەم . بەڕڕاض کە لە کەنانە بوو، وتی : لە کەنانەش پەنای ئەدەی ؟ وتی : بەڵێ ، لە هەموو خەڵکیی پەنای ئەدەم . ئەی صەگێکی خوێڕیی پەنای ئەدا ؟ ( مەبەستی لە بەڕڕاض بوو ) .

عوروه له نەوەی عامیری کوڕی صەعصەعە بوو کە بە دەسەڵاتترین تیرەی هەوازین بوو . بۆیە پادشا رازیی بوو و ، ئەویش کاروانەکەی لە سنووری دوورگە تێ پەڕاند و بەڕڕاضی عەرەق خۆریش بە دوایەوە بوو و بۆ هەل ئەگەڕا دەستی لێ بوەشێنێ . کە نزیکی خەیبەر کەوتەوە عوروە لە سێبەری درەختێکدا خەوت و، بەڕڕاضیش هەڵمەتی دا و عوروەی لە مانگی حەرامدا کوشت و دەستی بەسەر کاروانەکەدا گرت و بەرەو مەککە دایە بەر .

خەڵکەکە لە بازاڕی عوکاظ دا لە خۆیان بێخەم بوون و ، خەریکی کڕین و فرۆشتن بوون . بازاڕی عوکاظیش لەسەر خاکی هەوازین بوو ، بۆیە پێویست بوو قوڕەیش و کەنانە بکەونە خۆ و لە دەستی هەوازین خۆیان دەرباز بکەن ، بەر لەوەی هەوازین هەواڵی کوژرانی عوروەی پیاوماقووڵیان بزانن .. ئەوەبوو بەڕڕاض پیاوێکی بە کرێ گرت تا هەواڵ بۆ حەربی کوڕی ئومەییەی هاوپەیمانی و ، عەبدوڵڵای کوڕی جەدعان و هیشام و وەلیدی جووتە کوڕی موغیرە بەرێت تا بە پەلە بە خۆیان و قوڕەیش و کەنانەوە لە بازاڕی عوکاظ بکشێنەوە ، چونکە ئەو عوروەی کوشتووە ، ئەوەکا هەوازین هەواڵ بزانن و لە بریی خزمەکەیان گەورەیەکی قوڕەیشیی بکوژنەوە.

هەمووساڵێکیش لەم کاتەدا هەموو هۆزەکان چەکەکانیان بە عەبدوڵڵای کوڕی جەدعانی قوڕەیشیی ئەسپارد ، تا بازاڕ تەواو ببێ .

عەبدوڵڵای کوڕی جەدعانیش پیاوێکی ژیری دانا و دەوڵەمەند بوو و لە ناو عەرەبەکاندا لە پیاوەتیی‌دا تاقانە بوو .. ئەوەبوو حەربی کوڕی ئومەییە هاتە لای عەبدوڵڵا و داوای لێ کرد ئەو چەکانە بۆ هەوازین نەگێڕێتەوە تا بە ئاسانیی قوڕەیش و کەنانە بەسەریا زاڵ بن ، ئەگەر جەنگ روو بدات . بەڵام عەبدوڵڵا تووڕە بوو و دەری بڕیی کە ئەو ئامادە نیە هەرگیز کاری نامەردانە ئەنجام بدات . پاشان عەبدوڵڵا فەرمانی دا جاڕ بدرێت تا هەموو کەس چەکی خۆی وەربگرێتەوە .

قوڕەیش و کەنانە کشانەوە و ، هەوازینیش لای ئێوارەوە هەواڵی کوژرانی عوروەیان بیست بۆیە ئەبوبەرائی سەرداری هەوازین لە عوکاظ وتی : حەرب و کوڕی جەدعان منیان خەڵەتاند . بە خۆی و ئەوانەی دەوروبەریەوە سواری ئەسپ بوون و کەوتنە دوای قوڕەیش . ئەوەبوو لە شیوی ( نخلە ) پێیان گەیشتن و دەستیان بە جەنگ و کرد و ، قوڕەیش بە دەم جەنگەوە ئەکشایەوە هەتا خۆی کرد بە حەرەمدا و شەو

بەسەردا هات و ، لەبەر خاتری حەرەمیش هەوازین دەستیان لە کوشتار کێشایەوە ؛ بەڵام بازاڕی عوکاظی ساڵێکی تریان بڕیار دا بۆ جەنگ‌کردن .

**جەنگی دووەمی فیجاری چوارەم :**

هەردوولا خۆیان ئامادە کرد بۆ جەنگی ساڵی داهاتوو .. هەرچەندە لە مانگی حەرامدا بوو قورەیش و کەنانە خۆیان کۆك کرد و ، هەوازینیش جگە لە کەعب و کیلاب هەموویان جەم بوون و جەنگێکی سەخت بەرپا بوو و ، سەرەتا قورەیش و کەنانە سەرکەوتنیان بە دەست هێنا ؛ بەڵام هەوازین دامەزراو بوون و کوشتارێکی زۆر لە قورەیش کرا و سەرەنجام تێك شکان و کشانەوە بۆ چیای ( رخما ) .

**جەنگی سێیەمی فیجاری چوارەم :**

دوای ساڵێکی تر لە بازاڕی عوکاظ دا و لە شوێنێك‌دا بە ناوی عەبلا هەردوولا بە یەك گەیشتن و ؛ جەنگێکی خوێناویی سەخت بەرپا بوو . ئەم جارەش هەر هەوازین سەرکەوت و قورەیش و کەنانە دوای تێك شکان کشانەوە .

**جەنگی چوارەمی فیجاری چوارەم :**

ئەو تێك شکانەی عەبلا کاری کردە سەر قورەیش ، بۆیە بە چاکیی خۆی ئامادەی جەنگی داهاتوو کرد . هەتا عەبدوڵڵای کوڕی جەدعان بە سامانی خۆی هەزار پیاوی کەنانەی بە سواریی هەزار وشتر و بە تفاقی تەواوەوە خستە ڕێ .. قورەیش ئەترسان وەك ساڵی پیشوو بدۆڕێن ؛ بۆیە بڕیاری جەنگی سەرومالی‌یان دابوو .. کە ساڵ گەڕایەوە جارێکی تر هەردوولا لە عوکاظ دا و لە مانگی حەرامدا بە یەك گەیشتن .. ئەو ڕۆژە قورەیش مەردانە دامەزراوی‌یان نواند ، هەتا سێ برا ، حەرب و ئەبوسوفیان و ئەبوسەفین ؛ کوڕانی ئومەییەی کوڕی عەبدشەمس خۆیان بەستەوە هەتا شوێنی خۆیان چۆڵ نەکەن هەتا ئەکوژرێن .

جەنگێکی سەروماڵیی ناهەموار بەرپا بوو و ، هەردوولا مەردانە دانیان بە خۆیاندا گرت . لە کەنانە ئەوەندە کوژران خەریك بوو هەڵێن ؛ بەڵام قورەیش بە دامەزراویی مانەوە و کەنانەش لە شەرمدا دانیان بە خۆدا گرت ..

جەنگ بڵێسەی سەندبوو .. قورەیش و کەنانە هەڵمەتێکی توندیان بردە سەر هەوازین ؛ بۆیە بەرە بەرە لقەکانی دەستیان بە کشانەو؛ و هەڵاتن کرد ، جگە لە نەوەی نەصر کە دانیان بە خۆیاندا گرت . هەتا سەبیعی کوڕی ئەبوڕەبیعەی فەرماندەیان خۆی بەستەوە تا هەوازین شەرم بیان‌گرێ و را نەکەن .. چەند جارێك

هاواری کردە هەوازین ، بەڵام بێهوودە بوو و ، تێك شكان لافاوی هێنا .. قورەیش و كەنانەش كەوتنە دوای هەوازین ، تا كوشتن و تا بە دیلگرتن ..

شایانی باسە کە سەرۆکی ثەقیف ، مەسعوودی ثەقەفیی ، باوکی عوروەی کوڕی مەسعوود ، سەبیعەی کچی عەبدشەمسی کوڕی عەبدمەنافی قورەیشیی هاوسەری بوو و ، لە عوکاظ دا چادرێکی هەڵ دا بوو .. مەسعوود بە هاوسەری ئەڵێ : هەر خزمێکی قورەیشییت چووە ناو چادرەکەو ، ئەمانی هەبێ . ئەویش چادرەکەی گەورە ئەکرد تا خەڵکیی زیاتر بگرێت . مەسعوود وتی : لە چادرەکە تێپەڕ نەکات ، چونکە زامنیی ژیانی ئەو کەسە ناکەم کە چادرەکە بە دەوریا نەهاتبێ .. ئافرەتەکە بەم قسەیە تووڕە بوو و ، بە گاڵتەیەکەوە وتی : بەخوا وا بزانم تۆ ئاوات ئەخوازیی کە فراوانترت بکردایە . جا کە هەوازین تێك شكان چەند پیاوێكی هەوازین خۆیان گەیاندە چادرەکەی سەبیعە و داوای پەنایان کرد . ئەویش بانگی کردە حەربی کوڕی ئومەییەی برازای واتە باوکی ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب ، ئەویش وتی : پوورێ ، هەر کەس دەست بە پەتی چادرەکەتەو ، بگرێ ، یان بە دەوری‌دا بسووڕێتەوە ئەوە ئەمانی هەبێ . سەبیعە جاڕی دا بۆ هەوازین و قەیس هەتا زۆرێك هاتن و کۆبوونەوە ، هەتا مێردەکەشی پەنای بۆ هێنا و لووتی نا بە سنگیەوە ، تا بی پارێزێ . وتی : وات دەرئەبڕیی کە ماڵەکەم لە خزمەکانم بە دیلکراویی پڕ ئەکەیت . دانیشە و ئەمانت هەبێ .

**جەنگی پێنجەمی فیجاری چوارەم :**

هەر لە عوکاظ و لە مانگی حەرامی ساڵی ئایندەدا جەنگی پێنجەمیش لە نێوان هەردوولادا هەڵ گیرسایەوە . ئەم جەنگەیان ناو نرا ڕۆژی حەریرە و ، جەنگێکی یەکجار سەخت بوو و کوشتارێکی زۆر لە هەردوولا ڕووی دا و ، قورەیش و کەنانە تێك شكان ، چونکە زۆرتریان لێ کوژرا . پیاوە ژیرەکانیان هەستیان بە مەترسیی کرد کە ئەم جەنگە هەردوولا ببڕێتەوە ، بۆیە بە شێوەیەکی کاتیی جەنگیان وەستاند، تا وت و وێژ بکەن . سەرەنجام لەسەر ئەوە ڕێك کەوتن کە کوژراوی هەردوو لا سەرژمێر بکرێن و ، چ لایەك کوژراوی زیاتر بوو ، خوێنی ئەو کوژراوە زیادانە بدرێ بە هۆزەکەیان . جا بۆ ئەوەی ئەم کارە سەر بگرێ ، هەر یەکە بارمتەی خۆی دانا .

ئەوەبوو حەربی کوڕی ئومەییە ئەبوسوفیانی کوڕی لە بری قورەیش دانا و ، حەرثی ثەقەفییش لە بری هەوازین نەضری کوڕی دانا و ، سوفیانی کوڕی عەوفیش لە بری

کەنانە حەرثی کوڕی دانا . سەرەنجام دەرکەوت زیادەکان بیست کوژراو بوون کە هەریەکەیان وای دەرئەبڕیی کە لە هۆزی بەرامبەرەکەدان .

بەم شێوەیە ئەم جەنگە ناهەموارە کۆتایی پێ هات .

لەم جەنگەدا ، لە ناو قورەیش‌دا هەندێ پیاوی ناودار کوژران وەك ئەبوسوفیانی کوڕی ئومەییەی کوڕی عەبدشەمس ، کە مامەی ئەبوسوفیان بوو و ، عەووامی کوڕی خوەیلیدی باوکی زوبەیر و برای خەدیجە و ، حەزامی کوڕی خوەیلیدی برای خەدیجە و باوکی حەکیمی کوڕی حەزام و ، ئوحەیحەی کوڕی ئەبوئوحەیحەی عەبشەمیی و، موعەممەری کوڕی حەبیب . هەروەها حەربی کوڕی ئومەییەی باوکی ئەبوسوفیان زامدار بوو .

لە هەوازینیش صومەی باوکی دورەید کە شاعیر و سوارچاکی بەناو بانگ بووە کوژراوە . پێغەمبەری خوا ﷺ تەمەنی بیست ساڵان کەمتر بووە بەشداریی جەنگی فیجاری کردووە ، ئەویش تیری ئەدا بە دەست مامەکانیەوە .

شایانی باسە کە قورەیش پایە و پلەی تایبەتیی هەبوو لەناو عەرەبەکان‌دا ، چونکە قورەیش پارێزگاری‌کەری حەرەم و نان‌دەر و ئاودەری حاجیان بوو .. لە هەمان کات‌دا قورەیش خاوەنی عەقڵ و ژیری‌یەکی یەکجار رێك و پێك بوو لە چاو هۆزە عەرەبەکانی تری دوورگەدا ، چونکە قورەیشیش خاوەنی ( دار الندوة ) بوون ، واتە پەرلەمانی مەککەیان پێك هێنا بوو بۆ تەگبیر و راوێژ و دەرکردنی هەر بڕیارێك کە مایەی قازانج بێت بۆ خۆیان و کۆمەڵیان ..

هەروەها قورەیش خاوەنی سەلیقەیەکی وەها بوون ، لە سەردەمی نەفامیی‌دا پیاوە ژیرەکانیان پەیمانی ( فضول ) یان بەست ، بۆ ئەوەی نەهێڵن لە مەککەدا هیچ کەس ستەمی لێ بکرێ ، بەڵکو مافی ماف‌خوراوان وەربگرنەوە .

لەم روانگەیەوە عەرەبەکان رێزی تایبەتی‌یان بۆ قورەیش دائەنا .. جا کە بە دەستی سوپای ئیسلام مەککە فەتح کرا و ، بت‌پەرستیی دەسەڵاتی بەسەر کەعبەدا نەما ، ئەو هۆزانەی کە موسڵمان نەبوو بوون ئەمەیان بە کارێکی یەکجار پڕمەترسیی لە قەڵەم دا .. وایان ئەزانیی تووشی تیاچوونی یەکجاریی هاتوون . بۆیە بە ترس و لەرزەوە بیریان لە چارەنووسی خۆیان ئەکردەوە و ، ئەیان زانیی پێویستە یەکێ لەم دوو کارە ئەنجام بدەن :

**یەکەم** : موسڵمان بوون .

**دووهەم** : جەنگی سەرومالّیی بۆ تێك شكاندنی هێزی تەوحید .

یەكەم هۆزێك كە ئەم ترسەی لێ نیشتبوو هۆزی هەوازین بوو ، كە لە چەند هۆزێكی عەدنانیی بەهێز پێك هاتبوو وەك نەوەی هیلال و ، ثەقیف و ، جوشەم و ، نەوەی سەعد و ، نەوەی مالیك و ، نەوەی كیلاب و ، نەوەی عامیر و ، نەوەی نەصر و ، نەوەی روباب .

ئەم هێزە گەورەیە كە دیتی وا مەككە كەوتە دەست موسلّمانان ، كەوتە خۆكۆكردنەوە بۆ جەنگی موسلّمانان ، چونكە ئەیان زانیی تازە جگە لە خۆیان هێزێكی تر لە دوورگەدا نەماوە كە بەرەنگاری موسلّمانەكان ببێتەوە . بۆیە خۆیان ئامادە كرد بچن بە گژ موسلّمانەكاندا ، چونكە بە زۆریی جەنگاوەر و سەختیی ناوچە شاخاوییەكەیاندا ئەیاننازیی . خۆ ئەگەر هەوازین پەلەیان نەكردایە تا سوپای موسلّمانەكان بچوایەتە سەریان چاكتر ئەیان توانیی بەرگریی لە خۆیان بكەن و ، موسلّمانەكان تووشی ناڕەحەتیی زۆر ئەبوون . چونكە سوپای ئیسلام لە چاو جەنگاوەرانی هەوازیندا سوپایەكی بچووك بوو و ، بەو ئاسانییە نەیئەتوانیی دەست بەسەر ئەو ناوچە سەختانەدا بگرێت ..

سوپای ئیسلام تەنها دوانزە هەزار جەنگاوەری هەبوو ، بەلاّم هەوازین ئەگەر لە ولاّتە سەختەكەی خۆیاندا خۆیان قایم بكردایە لە چل هەزار جەنگاوەر كەمتر نەئەبوون و ، جەنگاوەرانیان زۆر دڕ و ئازا و بەجەرگ بوون . هەروایش بوو هۆزی ثەقیف ، كە بەشێكی هەوازین بوو ، دوای جەنگی حونەین ، خۆیان لە قەلاّكانی طائیفدا مەحكەم كرد و سوپای ئیسلام نەی توانیی بەسەریاندا زالّ ببێ ، هەرچەندە بۆ ماوەی بیست رۆژ گەمارووی طائیفی دا . دوای گەمارۆودان سوپای ئیسلام گەڕایەوە مەدینە و ، سەرەنجام دانیشتوانی طائیف بە ویستی خۆیان لە سالّی نۆهەمدا موسلّمان بوون .

بەلاّم بەدبەختیی هەوازینی خاوەنی جەنگاوەری زۆر و ، ناوچەی سەخت و یەكجار شارەزا و بلیمەت لە جەنگدا لەوەدا بوو كە لەو كاتەدا كاروباریان كەوتە دەست گەنجێكی ئازا و بەجەرگ كە لە مردن سلّی نەئەكردەوە ، بەلاّم ئازایەتییەكەی گەیشتبووە رادەی سەركەشیی و لە خۆبایی بوون ، كە هەوازینی تووشی تێك شكانێكی وەها كرد كە هیچ هۆزێكی عەرەب شتی وەهای بەسەر نەهاتبوو .

ئەو گەنجە مالیکی کوڕی عەوفی نەصریی بوو کە توانیی فەرماندایەتیی لە هەموو عەشرەتەکانی هەوازین وەربگریٚ . مالیك نەیئەویست هەوازین کۆ بکاتەوە تا بەرگریی لە ناوچەکەیان بکەن ، ئەگەر موسڵمانەکان هێرشیان بکردایەتە سەریان ، بەڵکو ئەیویست بە هەزارەها جەنگاوەرەوە هێرش بکاتە سەر مەککە و ، بە هێزی چەك موسڵمانەکان لە مەککەدا دەربپەڕێنیٚ .. واتە ئەیویست پایتەختی بت پەرستیی لە دەست موسڵمانەکان وەربگرێتەوە . ئەوەبوو بیست هەزار جەنگاوەری بۆ ئەو هێرشە ئامادە کرد .. بەڵام چونکە منداڵ بوو و تەمەنی لە سیی ساڵ تێ نەپەڕیی بوو ، هیچ تاقیی کاریی‌ەکی لە جەنگ‌دا نەبوو .. بۆیە شێوازێکی زۆر سەیری بە کار هێنا ، کە لەوەو پێش هیچ کەس ئەو شێوازەی بەکار نەهێنا بوو لە دوورگەدا ..

مالیك کە توانیی بیست هەزار جەنگاوەر لە بنەماڵە جیاجیاکانی هەوازین کۆ بکاتەوە ، بڕیاری دا بەرەو مەککە بکەوێتە ڕیٚ . ئەو شێوازە سەیرەش کە بە کاری هێنا ئەوەبوو داوای لە هەموو سەرباز و فەرماندەیەکی سوپای هەوازین کرد کە ژن و منداڵ و مەڕومالاّت و ئاڵتوون و زیویان لەگەڵ خۆیان‌دا بهێنن بۆ مەیدانی جەنگ ..

مەبەستی مالیك لەم کارەدا ئەوەبوو هەموو جەنگاوەرێك جەنگی سەروماڵیی بکات و بیر لە هەلاّتن و کشانەوە نەکاتەوە . چونکە هەلاّتن لە بەردەم موسڵمانەکان‌دا بریتی‌یە لە بە جیٚ هێلاّنی ژن و منداڵ و سەروەت و سامانەکەی بۆ دوژمن . بەمە ناچار ئەبیٚ تا مردن بجەنگیٚ .. ئیتر نەیئەزانیی کە جەنگاوەر ورەی نەما و پشتی شکا هیچ بەربەستێك ناتوانیٚ لە هەلاّتن قەدەغەی بکات .. ئەم بڕیارەش بە بۆنەی منداڵیی و دنیانەدیدەیی‌یەوە بوو .

لەولاوە هەوازین پیاوێکیان لە ناودا بوو کە پیاوێکی بە تەمەنی جەنگاوەری خاوەن تاقیی کاریی بوو ، بە ناوی دورەیدی کوڕی صومە ، کە ئەوەبوو باوکی لە جەنگی فیجاردا کوژرا بوو ..

دورەید ئامۆژگاریی مالیکی گەنجی کرد کە ژن و منداڵ و مەڕومالاّت بگێڕێتەوە دواوە و بیانبەن بۆ سەر لووتکەی چیاکان ، تا بە هیچ شێوەیەك دەستی موسڵمانەکانیان پیٚ نەگات ..

بەڵیٚ مالیك سوپای کۆ کردبۆوە ، بەلاّم لەگەڵ ئەوەش‌دا دوو هۆزی ناوداری هەوازین ، کە بەش بە حاڵی خۆیان سەنگیان هەبوو ، بەو کارەی مالیك ڕازیی

نەبوون، کە هەوازین هەر هەمووی بە ژن و منداڵ و مەڕومالاَت و سامانەوە بچێتە مەیدانی جەنگی موسڵمانان ، چونکە ئەگەر تێك شکا ، ئیتر هەڵسانەوەی بۆ نابێت..

مالیك قسەی کەسی نەئەبیست . نە قسەی دورەیدی کوڕی صوممەی وەرگرت و ، نە گوێیشی دا بە بەشداریی نەکردنی جووتە هۆزی ناوداری کەعب و کیلاب . ئەوانیش ئامادە نەبوون لە جەنگی وەها دۆڕاودا بەشداریی بکەن . بەمە لە سوپای هەوازین دا یەکەم جیاوازیی و ناکۆکیی پەیدا بوو ، چونکە ئەو دوو هۆزە هێزی سەرەکیی هەوازین بوون ، وەك شارەزای سەربازیی و خاوەن تاقیی کاریی دورەیدی کوڕی صوممە شاهێدیی بۆ دان . ئەوەبوو کە گەیشتنە شیوی حونەین دورەید لەوە ئاگادار بوو کە مالیکی فەرماندە ژن و منال و مەڕومالاَتی لەگەڵ سوپادا هێناوە ، ئەویش رەخنەی لە مالیك گرت و وەك ئامۆژگاریی داوای لێ کرد ژن و منداڵ و سامانەکەیان بگەیەننە لووتکەی چیاکان . ئەوەبوو لێی پرسیی کە هۆزی کەعب و کیلاب چی یان کردووە ؟ وتیان : تاقە کەسێکیان ئامادە نەبووە .

دورەید وتی : ئەوەی بە کەڵك بێ ئامادە نیە ، ئەگەر ئەمڕۆ رۆژی بەرزیی و بلندیی بوایە کەعب و کیلاب تیایا دوا نەئەکەوتن . خۆزگە ئێوەش وەك کەعب و کیلابتان بکردایە .

هۆی ئامادەنەبوونی کیلابیش لەو جەنگەدا ئەگەڕێتەوە بۆ ژیریی و سەلیقەی کوڕی ئەبولبەراء کە ئامۆژگاریی کردن و وتی : بەخوا ئەگەر هەرچیی وا لە نێوان خۆرهەڵاَت و خۆرئاوادا دژایەتیی موحەممەد بکات ، بەسەر هەر هەموویان دا زاڵ ئەبێت.

هەرچەندە کەعب و کیلاب بڕیاری جەنگیان نەدا بەڵاَم سوپایەکی گەورە لە دەوری مالیك جەم بوو کە بیست هەزار جەنگاوەر بوو ، بەرامبەر بە دوانزە هەزار موسڵمان.

مێژوونووسان وەهای بۆ ئەچن کە هەوازین پێش ئەوەی مەککە بگیرێ و ، پێش ئەوەش سوپای موسڵمانان لە مەدینە بەرەو مەککە دەربچێ ، نیازی ئەوەیان هەبووە کە خۆیان جەم بکەن و هێرش بکەنە سەر موسڵمانەکان لە هەر کوێ بن . هەتا وایان دانابوو ئەگەر هات و لەو هێرشەیان دا شکان ، پاشەکشە بکەن بۆ شوێنێکی سەختی وەك طائیف . هەتا بۆ ئەوەی کارەکەیان زیاتر مسۆگەر بێت و بە یەکجاریی موسڵمانان تێك بشکێنن نێرراو ئەنێرن بۆ شاری جەرەش لە وڵاَتی ئوردون کە ئەو

ڕۆژە لە ژێر دەسەلاتی ڕۆمدا ئەبێت ، تا چەکی قورس لەوێ بکڕن وەك دەبابە و مەنجەنیق . سەرۆکی ئەم نێرراوانەش عوروەی کوڕی مەسعوود بوو .
ئەم نەخشەیە بە نهێنیی ئەنجام ئەدرا ، تا ئەوەبوو لەسەر زمانی سیخوڕێکی هەوازین ئاشکرا بوو ، کاتێك کە کەوتە دەست موسڵمانەکان ، لەو سەفەرەدا کە سوپا بۆ فەتحی مەککە کەوتبووە ڕێ ..
ئەم سیخوڕە کاری بۆ مالیکی کوڕی عەوفی سەرداری هەوازین ئەکرد و هەواڵی موسڵمانەکانی بۆ ئەنارد . کاتێك ئەم سیخوڕە برایە بەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی پرسیار لێ کردندا دەربارەی هێزی سەربازیی هەوازین وتی :
خەڵکیان کۆ کردۆتەوە و عەرەبیشیان لەگەڵ خۆیان هێناوە و ، جوابیشیان بۆ ثەقیف ناردووە و، ئەوانیش ڕەزامەندی‌یان نواندووە و ، ناردووشیانە بۆ جەرەش بۆ دروست کردنی دەبابە و مەنجەنیق و ، پێکەوە لەگەڵ هەوازین یەك ئەگرن .
فەرمووی : (( وکل هوازن قد أجاب ؟ )) فەرمووی : ئایا هەموو هەوازین ڕەزامەندی‌یان نواندووە ؟
سیخوڕەکە وتی : نەخێر ، لە نەوەی عامیر هۆزی کەعب و هۆزی کیلاب بەشداری‌یان نەکردووە .
پێغەمبەری خوا ﷺ بڕوای بە سیخوڕەکە کرد ، بەڵام بۆ بڵاونەبوونەوەی دەنگ و باس فەرمانی دا بەند بکرێ .
ئەمە ئەوەمان بۆ دەرئەخات کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاگادار بووە لە نیازی هەوازین ، بەڵام ئەو زانیاری‌یە کەم بوو و ، پێویست بوو لە دەم موسڵمانێکی دڵسۆز زانیاریی تەواو وەربگیرایە ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری دا پیاوێك لە هاوەڵان ڕەوانەی ناوچەی هۆزی هەوازین بکات ، تا بە وردیی هەواڵی بۆ بهێنێ . ئەو هاوەڵەش کە بۆ ئەم کارە گرنگە هەڵ بژێررا عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوحەدرەدی ئەسلەمیی بوو ، کە هاوەڵێکی ناودار و پاڵەوانێکی لێهاتووی خەیبەر بوو .
پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کرد و فەرمانی بەسەردا دا کە شێوەی خۆی وەها بگۆڕێ کە هیچ پیاوێکی هەوازین نەی‌ناسێتەوە . خۆی تێکەڵیان بکات و ڕادەی هێز و توانا و لێهاتنیان بە چاکیی بزانێ .
ئەم پاڵەوانە مەردانە کاری سەرشانی ئەنجام دا و خۆی گەیاندە لای هەوازین و ، لە فەرماندەکانیان نزیك کەوتەوە و ، ئەوەی پێویست بوو بزانێ ئەو دەستی خۆی

خست. دوای ئەوە بە ژیرانە لە ناو هەوازین خۆی دزی یەوە و گەڕایەوە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ . دیارە خۆ دزینەوەکەش کارێکی ئازایانە بوو ، چونکە هەزارەها جەنگاوەری ئەوە و بەرە جیاجیاکان لە دەوری مالیکی گەورە فەرمانـدەیان کۆ بووبوونەوە .

کە گەیشتەوە مەککە بە وردیی هەواڵەکانی بە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیاند .. پێش هەموو شتێك هەوازین خەریکە خۆی ئامادەی جەنگی موسڵمانان ئەکات و ، نزیکەی بیست هەزار جەنگاوەری جەم کردووە و ، ناشیەوێ لە ناوچەی هەوازین دا جەنگ روو بدات ، بەڵکو بە بۆنەی لە خۆباییبوونی فەرمانـدە گەنجەکەیەوە ئەیەوێ هێرش بکاتە سەر مەککە و ، سوپای هەوازین وا لە شیوی حونەین دا مۆڵی خواردووە.

کە هۆزەکان سوپایان جەم کرد و بە خۆیان و ژن و منداڵ و مەڕومالاَتەوە کەوتنە رێ ، دیمەنێکی یەکجار هەیبەتدار بوو .. چونکە بیست هەزار جەنگاوەر و ، سێ ئەوەندەی ئەو ژمارەیەش ژن و منداڵ و نزیکەی بیست و چوار هەزار وشتر و ، دەیان هەزار سەر مەڕ هەر هەمووی کەوتبووە رێ .. دەنگێکی سامناك لەو سوپا گەورەیە بەرز ئەبوویەوە ..

ئەوەبوو هەموو بەشەکانی سوپای هەوازین لە شیوی ( أوطاس ) ، کە یەکێ لە شیوەکانی حونەین بوو ، یەکی گرت و ، لەوێ باریان خست .

وەك لە پێشەوە ئاماژەمان بۆ کرد ، جەنگاوەرێکی ئازا و بەجەرگی خاوەن تاقیی کاریی بە ناوبانگی هۆزی هەوازین لەگەڵ سوپای هەوازین دا بوو ، کە ناوی دورەیدی کوڕی صومە بوو و تەمەنی گەیشتبووە صەد و شەصت ساڵ . ئەوەندە پیر بوو نەی ئەتوانیی بەرێوە بچێ ، چ جای جەنگ کردن ، بەلاَم هەموو ئەندامانی هەستی بە چاکیی کاریان ئەکرد ، جگە لە گوێی کە کەمێکی پێ ئەبیست .

جا لەبەر تەمەنزۆریی و تاقیی کاریی بوو بووە جێ پرسیی هەموو هەوازین چونکە لە ماوەی صەد و بیست ساڵدا ئەو بەشداریی هەموو جەنگەکانی کردبوو . لە هەمان کاتدا شاعیرێکی بلیمەت و لێهاتوو بوو .

بەم بۆنەوە قەومەکەی دورەید پێیان خۆش بوو بەشداریی ئەم هەڵمەتەیان لەگەڵدا بکات ، تا کەڵك لە نەخشە و ئامۆژگاری یەکانی وەربگرن .. هەتا داوای لێ ئەکەن

ببێتە سەرۆکیان ، بەلام ئەو خۆی ئـەوەی بـە دڵ نابێـت و ، بـە مـەرجی وەرگرتنـی ئامۆژگاری‌یەکانی و بە پێچەوانە نەجوولانەوەیان ئەکەوێتە گەلیان .

بەلام فەرماندەی گشتیی سوپای هـەوازین ، مـالیکی کـوڕی عـەوفی نەصریی ، کەلکی لە زانست و شارەزایی دورەید وەرنەگرت ، چونکە بە را و بیری خـۆیدا زۆری ئەنازیی و ، نەی‌ئەویست بە گوێی هیچ کەسێك بکات . لە راسـتیی‌دا گـەنجێك لـەو تەمەنەدا بیست هەزار جەنگاوەر گوێڕایەڵی بن ، تووشی لە خۆبایی بوون ئەبێت و ، نایەوێ هیچ ریش سپی‌یەك ئامۆژگاریی بکات . بۆیە خاوەن تەمەنەکانی پشت گوێ خستن ، بە تایبەتیی دورەیدی کوڕی صومە .. لەبەر ئەوەی کە دورەید گوێی گران بوو نەی‌ئەزانیی مالیك خەریکی چی‌یە و ، لە شیوی ( أوطـاس ) یـش زانیـی کـە ژن و منداڵ و مەڕومالات هەموویان لەگەڵ سوپادا هاتوون .. ئەویش بەو بۆنەوە کە چـەند رۆژێك لەو شیوە باریان خست ، دەنگی ئاژەڵ و هاواری ژن و منداڵ دنیـای هەراسـان کرد .

کە دورەید ئەو دەنگانەی بیست بە سەرسوڕمانەوە پرسیی : ئەوە چـی‌یـە دەنگـی وشتر و ، زەڕەی گوێ درێژ و ، باڕەی مەڕ و قوڕەی مانگا و گریانی منداڵ ئەبیستم ؟

وتیان : مالیك ژن و منداڵ و ماڵ و سامانی لەگەڵ سوپادا هێناوە ..

ئەوەبوو پێشتر کە پرسیی بووی ئەم شوێنە کوێ‌یە؟ وەلامیان دابوویەوە کـە شـیوی ئەوطاسە . ئەویش رەزامەندیی نواندبوو .

پاشان دورەید پرسیاری دەربارەی دوو هۆزی پالەوان و ئازا کرد و وتی :

ئەی کۆمەڵی هەوازین ! ئایا لە نەوەی کیلابی کوڕی رەبیعە کەستان لەگەڵدایـە ؟

وتیان : نەخێر .

پرسیی : ئەی لە نەوەی کەعبی کوڕی رەبیعە کەستان لەگەڵدایە ؟ وتیان : نەخێر.

وتی : ئەگەر ئەم کارە چاك بوایە ئێـوە پێشـی ئـەوان نەئەکـەوتن بـۆی و ، گـەر ناوداریی‌و شەرەفیش بوایە ئەوان دوا نەئەکەوتن .

هەروەها دەری بڕیوە کە ئەگەر رۆژی سـەربەرزیی بوایـە ئـەوان دوا نەئەکـەوتن و خۆزگەشی خواستووە کە ئەمانیش وەك کەعب و کیلابیان بکردایە .

پاشان پرسیاری کرد : ئەی کێ بەشداریی کردووە ؟

وتیان : عەمری کوڕی عامیر و عەوفی کوڕی عامیر .

وتی : ئەو جووتە لاوەی نەوەی عامیر کە نە کەڵکیان هەیە و ، نە زیان .

دورەید تێ گەیشت کە بارودۆخەکە یەکجار نەگونجاوە و ، هەوازین لەوپەڕی مەترسیی‌دایە .. داوای لێ کردن وەك کەعب و کیلاب واز لە جەنگ بهێنن و ، گوێ بە فەرمانی مالیکی کوڕی عەوف نەدەن و بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان . کەچیی هەوازین بە گوێی دورەیدیان نەکرد ..

کە هەوازین ئامۆژگاری‌یەکەی دورەیدیان دایە دواوە ، تا نەچن بە گژی موسڵمانەکان‌دا ، هەوڵی دا هەر چۆن بووە ئامۆژگاری‌یەکی تریان بکات ، تا زەرەر لە نیوەی‌دا بگەڕێتەوە . داوای لێ کردن با ژن و منداڵ و ماڵ و سامانەکەیان بگێڕنە دواوە ، نەکەوێتە دەست سوپای ئیسلام ، ئەگەر هات و سەرکەوتن بۆ ئیسلام بوو و ، مالیك جەنگاوەران سواری ئەسپ بکات تا سوپای هەوازین بە کەمترین زیان بتوانێ خۆی دەرباز بکات . بەڵام فەرماندەی سەرکەش و لە خۆیایی‌بووی هەوازین ئەم ئامۆژگاری‌یەشی نەبیست و ، هەر لەسەر رای خۆی سوور بوو .

دورەید مالیکی بانگ کرد و وت و وێژێکی زۆر لە نێوانیان‌دا رووی دا . بەڵام بێ‌هوودە بوو . مالیك تەنها رای خۆی پەسەند ئەکرد . سەرەنجام دورەید رووی کردە هەوازین و داوای لێ کردن بلاوەی لێ بکەن ، چونکە مالیك حەیایان ئەبات و ، دواییش خۆی هەڵ دێ و لە قەڵای ثەقیف‌دا خۆی حەشار ئەدات .

لەوە ئەچێ قسەکانی دورەید کاریان کردبێتە سەر فەرماندە و سەرۆکەکانی سوپای هەوازین و پێیان خۆش بووبێ ژن و منداڵ و مەڕومالاَت بگێڕنە دواوە و بیان‌گەیەننە سەر لووتکەی چیا بەرزەکان ، بۆیە کە مالیك هەستی بە دڵ نەرم‌بوونی فەرماندەکانی کرد ، کە گوایا قسەکانی دورەید راست بن ، مالیکی سەرکەش هیچی بۆ نەمایەوە جگە لە هەڕەشەی خۆکوشتنەوە ، ئەگەر هەوازین لە قسەی دەرچن و بکەونە دوای قسەکانی دورەیدی کوڕی صومە . ئەوەبوو لەبەردەم فەرماندە و ماقووڵانی هەوازین‌دا شمشێرەکەی دەرهێنا و هەڕەشەی لێ کردن کە یا ئەوەتا بە گوێی ئەکەن ، یان خۆی بەسەر شمشێرەکەی‌دا ئەدا هەتا لە پشتیەوە دەرچێت ..

فەرماندەکان لە نێوان خۆیان‌دا کەوتنە تەگبیر و راوێژ .. سەرەنجام هاتنە سەر ئەو رایە کە ئەگەر مالیك خۆی بکوژێتەوە ، ئەمان ئەبێ چاوەڕوانی دورەید بن فەرماندەیان بێت و ، ئەویش توانای جووڵەی نیە .. کەواتە سەرگەردان ئەبن .. کەواتە پێویستە بە گوێی مالیك بکەن .

بەمە ئامۆژگاری‌یەکەی دورەیدیان ئەمجارەش پشت گوێ خست .

شایانی باسە کە دورەیدی تەمەن صەد و شەصت سالە ، بەر لەوەی تەمەنی بگاتە بیست سالان ناوی پالەوانیی و سوارچاکیی و ئازایەتیی دەرچوو ، تا ئەوەبوو بووە سەرداری ئەوەی جوشم لە هەوازین .[٢٢٠]

**دووهەم : بە ڕێ کەوتنی سوپای ئیسلام**

سوپای هەوازین لەسەر رەوتی خۆی بەردەوام بوو ، تا ئەوەبوو مالیکی فەرماندەی گشتیی ئەوەی بۆ ساغ بۆوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە فەرماندایەتیی سوپای ئیسلام لە مەککەوە کەوتۆتە رێ . ئیتر مالیك بڕیاری دا لە شیوی حونەینی بەرفراوان دا چاوەڕوان بێت ، چونکە لەو شوێنەدا ئەسپ سواران ئەتوانن بە چاکیی هەڵسووڕێن .

پێغەمبەری خوایش ﷺ کە بیستی وا سوپای هەوازین بەرەو مەککە کەوتۆتە رێ ، بە پەلە سوپای ئیسلامی جەم کرد و ، بەرەو رووی کەوتە رێ ، بەر لەوەی هەوازین بگاتە مەککە ، چونکە وای بە چاك زانیی لە دەرەوەی مەککە دەست بدەنە یەخەی یەکتریی . چونکە دانیشتوانی مەککە هەندێکیان بە دەم موسڵمان بووبوون و ، گەر لە ناو مەککەدا جەنگ گەرم ببوایە ، لەوانە بوو ببنە کۆمەکی سوپای هەوازین و دژی موسڵمانەکان بوەستانایە . هەندێکی تریش ماوەیان درا بوو بیر بکەنەوە و ، هێشتا موسڵمان نەبووبوون . ئەوانەش خەڵکیان دژی موسڵمانەکان جەم ئەکرد ، ئەو کاتە سوپای ئیسلام ئەکەوتە نێوان دوو ئاگرەوە . بۆ ئەمە پێغەمبەری خوا ﷺ سوپا دە هەزاری یەکەی ئیسلام و دوو هەزار جەنگاوەری نەوموسڵمانی مەککەی بەرەو هەوازین لە شیوی حونەین خستنە رێ ، بەڵام سوپایەکی بچکۆلەشی لە مەککەدا ، بە سەرکردایەتیی عەتتابی کوڕی ئوسەید ، بۆ پارێزگاریی ئاسایشی شار بە جێ هێشت..

پێغەمبەری خوا ﷺ هەستی کرد کە سوپاکەی هەندێ کەرەسەی جەنگی ناتەواوە و ، جەنگی هەوازینیش جەنگی سەروماڵی یە و پێویستە سوپای ئیسلام کۆك بێت . بۆ ئەمە بیری لەوە کردەوە کە هەندێ چەك و کەرەسەی جەنگ بخوازێ .

صەفوانی کوڕی ئومەییە کە هێشتا موسڵمان نەبوو بوو و ، یەکێ بوو لە گەورە سەردارانی قوڕەیش و ، پیاوێکی دەوڵەمەند و ، بازرگانی کەرەسەی جەنگ بوو ، هەروەها نەوفەلی کوڕی حاریثی کوڕی عەبدولموطەللیب کە ئامۆزای پێغەمبەر بوو ئەویش بازرگانی چەك بوو ..

---

[٢٢٠] غزوة حنين لباشميل : ٤١ ـ ٩١ . الرحيق المختوم : ٤٢٧ ـ ٤٣١ .

پێغەمبەرﷺ لەم دوانە چەکی خواست . ئەوەبوو صەد قەڵغانی بە رم و بە شمشێرەوە لە صەفوان خواست و ، فەرمانیشی دا صەفوان چەکەکان بە وشتری خۆی بگەیەنێتە شیوی ئەوطاس . نەوفەلیش سێ هەزار رمی تەسلیمی موسڵمانەکان کرد و لە جەنگی حونەین‌دا دەوری کاریگەریان هەبوو و پێغەمبەری خوایش ﷺ لەسەر ئەوە ستایشی نەوفەلی کرد ..

کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ مەککەی فەتح کرد ، بۆی هەبوو دەست بەسەر سامان و چەکی قورەیشی‌یە ژێرکەوتووەکان‌دا بگرێ . بەڵام ئەوەبوو چاوپۆشیی لەوە کرد و نەی‌هێشت سوپای ئیسلام بە دوای چەك و جبەخانەدا بگەڕێن و ، جگە لەو چەکانەی کە هەڵ گەڕاوەکان لە کۆڵانەکانی مەککەدا فڕی‌یان دابوون ، دەستیان بۆ هیچ چەکێك نەبرد ..

لە هەمان کات‌دا سوپای ئیسلام زۆر دەست کورت بوو و ، پێویستیی بە ماڵ و سامان هەبوو ، بەڵام یەك بە یەکی سەربازانی بەوپەڕی دەست پاکی‌یەوە رەفتاریان ئەکرد . بەڵام کە سەرکردەی باڵا هەستی بە هەژاریی و دەست کورتیی هاوەڵانی کرد، داوای لە دەوڵەمەندەکانی مەککە کرد کە بە قەرز پارەی بدەنێ تا کۆمەکیی هاوەڵانی بکات . ئەوەبوو لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوڕەبیعە چل هەزار دیرهەمی وەرگرت و دوای سەرکەوتن بەسەر هەوازین‌دا بۆی گێڕایەوە و ، فەرمووی : (( إنما جزاء السلف الحمد )). فەرمووی : پاداشتی قەرز سوپاس‌کردنە . هەروەها فەرمووی: (( بارك الله في مالك وولدك )) . فەرمووی : خوا بەرەکەت بخەتە ماڵ و منداڵتەوە ..

هەروەها لە حوەیطبی کوڕی عەبدولعوززا چل هەزار و لە صەفوانی کوڕی ئومەییەش پەنجا هەزار دیرهەمی قەرز کرد و ، بەسەر موسڵمانە دەست‌کورتەکان‌دا دابەشی کرد ..

مێژوونووسان بەرواری دەرچوونی سوپای ئیسلامیان وەها باس کردووە کە فەتحی مەککە دە رۆژ پێش جەژنی رەمەزان بووە و ، دەرچوونی سوپای ئیسلامیش دوای پانزە رۆژ لە فەتح بووە ، کە لەو کاتەدا موسڵمانان نوێژیان کورت کردۆتەوە .. هەندێکیش وەهای ئەگەیەنن کە لە سیانزەی رەمەزان‌دا مەککە فەتح کراوە ، بەمە هەتا جەژن ، بۆ ماوەی حەڤدە رۆژ موسڵمانان نوێژیان کورت کردۆتەوە ..

کاتێ کە سوپا ویستی مەککە بەجێ بهێڵێ ، پێغەمبەری خوا ﷺ یەکێ لە گەنجە راستگۆکانی کردە ئەمیری شاری مەککە هەتا بگەڕێتەوە ، کە ئەویش عەتتابی

کوڕی ئوسەید بوو .[٢٢١] عەتتاب لە کاتی پاشگەزبوونەوەی عەرەبەکان دا ، لەگەڵ سوهەیلی کوڕی عەمردا دەوری کاریگەریان هەبوو تا دانیشتوانی مەککە لەسەر ئیسلام دامەزراو بن ..

وتمان ژمارەی سوپای موسڵمانان لە جەنگی حونەین دا دوانزە هەزار بوو ، کە دە هەزاری سوپای فەتح بوو و ، دوو هەزاریشی دانیشتوانی مەککە بوون کە دوای فەتح موسڵمان بوون ، هەندێکیش لە خەڵکی مەککەیان لەگەڵدا بوون کە هێشتا موسڵمان نەبوو بوون ، وەك صەفوانی کوڕی ئومەییە . هەندێکی تریش بۆ بەرژەوەندیی خۆیان هاتبوون : ئەگەر موسڵمانەکان سەربکەون تالاَن بکەن و ، گەر شکانیش دەست بەسەر دڵیاندا بهێنن .

دوای کۆکردنی سوپا ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا سوپا بەرەو حونەین بکەوێتە ڕێ ..

ئەمە یەکەم جار بوو موسڵمانەکان سوپای وەها گەورە پێکەوە بنێن ، بۆیە هەندێ تووشی لە خۆبایی بوون بوون .

لە خۆبایی بوونیش بریتی یە لە سووك سەیرکردنی دوژمن ..

سووك سەیرکردنی دوژمنیش لەکاتی جەنگدا ، واتە خۆ ئامادە نەکردن و پاڵ دانەوە و شل و شۆڵیی ..

سەرەنجامی ئەوەش تێك شکان و هەڵاتن ئەبێت ..

لە خۆبایی بوونی ئەندامانی سوپای ئیسلام لەبەردەم سوپای پڕ تفاق و پڕ چەك و ڕاهێنراوی هەوازین دا ، بووە هۆی تێك شکانی سوپای ئیسلام لە سەرەتای جەنگدا ، کە ئەگەر دامەزراویی سەرکردەی مەزن و دەستەیەك لە هاوەڵە کۆڵ نەدەرەکانی نەبووایە سوپای ئیسلام بە یەکجاریی تیا ئەچوو . ئەوەبوو کەمینەکانی هەوازین لە تاریکیی بەرەبەیاندا دایان بەسەر موسڵمانەکان دا و شپرزەیان کردن .. ئەمەش تا کە

[٢٢١] عەتتاب کوڕی ئوسەیدی کوڕی ئەبولعەیصی کوڕی ئومەییەی کوڕی عەبدشەمسی کوڕی عەبدمەناف بووە . ڕۆژی فەتحی مەککە بە چاکیی موسڵمان بوو و ، تەمەنیشی لە بیست و پێنج ساڵان تێپەڕی نەکردبوو . جێی متمانەی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو وا بەو گەنجی یە و ، بەو تازە موسڵمان بوونەی ئەمیریی پێ سپێررا ، چونکە مایەوە هەتا کۆچی دوایی ئەبوبەکری صددیق . عەتتاب پیاوێکی شارەزا و پیاوچاك و ڕەوشت بەرز بوو . لە ساڵی هەشتەمی کۆچیی دا حەجی بە موسڵمانەکان کرد . لەو کاتەدا کە ئەبوبەکری صددیق کۆچی دوایی کردووە عەتتابیش کۆچی دوایی کردووە ، خوا لە هەموویان ڕازیی بێ ..

موسڵمانەکان لە بەشی دووهەمی جەنگدا سەرئەکەون ، چاك بزانن لەلایەن خواوە پێشکەشیان کراوە و ، بە ئازایەتیی و زۆریی ژمارەی خۆیان نەبووە .

موسڵمانەکان سەرەتا شپرزە بوون و هەر کەسە بە لایەكدا رای ئەکرد ، هەتا هەندێ لە هەلاتوان گەیشتنە نزیك مەککە .. بەلام غیرەتی بەشە دامەزراوە کەمەکەی سوپای ئیسلام بووە هەوێنی سەرکەوتن ..

کاتێك کە سوپای دوانزە هەزاریی موسڵمانان لە مەککە دەرچوو ، یەکێ لە هاوەڵان بە شێوەی لە خۆبایی بوونەوە وتی : ئەگەر بچین بە گژی نەوەی شەیبانەدا باکمان نیە و ، لەبەر کەمییش ئەمڕۆ هیچ کەس بەسەرماندا زاڵ نابێت .

کاتێکیش کە سوپای ئیسلام بەرەو حونەین کەوتبووە رێ ، بەلای درەختێکی گەورەی صەوزدا تێ پەڕیی ، کە قورەیش و عەرەبەکانی تریش بە گەورەیان دائەنا و پێیان ئەوت : ( ذات أنواط ) . کە درەختەکەیان دیت ، هەندێ لەوانەی کە تازە موسڵمان بووبوون و لە عەقیدەی ئیسلامیی شارەزا نەبوو بوون داوایان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد کە درەختێکیان بۆ دیاریی بکات ، تا ئەوانیش وەك موشریکان رێزی لێ بگرن . پێغەمبەر ﷺ ئەو وتەیەی یەکجار لەلا ناخۆش بوو ، بۆیە فەرمووی : (( ألله أکبر ، قلتم والذي نفسي بيده كما قال قوم موسى لموسى : ﴿ ٱجْعَل لَّنَآ إِلَـٰهًا كَمَا لَهُمْ ءَالِهَةٌ ۚ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ ﴾ (الأعراف : ١٣٨ ) إنها السنن لتركبن سنن من كان قبلكم )). فەرمووی : بەو خوایەی گیانمی بە دەستە ئەوەتان وت کە قەومەکەی مووسا بە موسایان وت : وەك ئەوان خوایان هەیە تۆش خوایەك بۆ ئێمە دابنێ . فەرمووی : ئێوە قەومێکی نەفامن . ئەمە یاسا و دەستوورە و ، ئێوەش شوێن یاسای پێشینەکان ئەکەون ..

هەر لەو کاتەدا کە سوپای ئیسلام بەرەو حونەین ئەکشا ، لە یەکێ لە کاتەکانی حەسانەوەی سوپادا هەوڵ درا پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناو ببرێت ..

دیارە هەموو سەرکردەیەك هەوڵ ئەدا سەرکردەی سوپای دوژمن لەناو بەرێت ، بۆ ئەوەی دوژمنەکەی شپرزە و سەرگەردان ببێت و بە ئاسانیی لەناوی بەرێت ..

دوور نیە مالیکی سەرداری هەوازینیش بیری لە کوشتنی پێغەمبەری خوا نەکردبێتەوە و ، پیاوێکی لێهاتووی بۆ ئەم کارە تەرخان نەکردبێ .

مێژوونووسان ئەوەیان گێڕاوەتەوە کە پیاوێکی موشریک توانیویەتی بچێتە ناو سەربازخانەی موسڵمانانەوە و خۆی بگەیەنێتە ئەو شوێنەی کە پێغەمبەرﷺ بۆ حەسانەوە تیایا راکشا بوو .

ئەبوبوردەی کوڕی نەیار ، کە یەکێ بووە لە پیاوە نزیکەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگێڕێتەوە کە وتوویە : هێشتا نەگەیشتبووینە ئەوطاس ، بارمان خست و گەڕاین بۆ درەختێکی گەورە و پێغەمبەری خوا ﷺ لە ژێریا دابەزیی و شمشێر و کەوانەکەشی پیایا هەڵواسیی . ئەڵێت : من نزیکترین هاوەڵی بووم لێیەوە . بە دەنگی راچڵەکییم کە فەرمووی : (( یا أبا بردة ! )) وتم : لبیك . بە پەلە هاتم ئەبینم پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتووە و پیاوێکیش لەلای دانیشتووە . فەرمووی : (( إن هذا الرجل جاء وأنا نائم، فسلَّ سيفي ثم قام به على رأسي ففزعت به ، وهو يقول : يا محمد ! من يؤمنك مني اليوم ؟ قلت : الله )) . فەرمووی : لە کاتێکدا کە من خەوتبووم ئەم پیاوە هاتووە و ، شمشێرەکەمی لە کێلان دەرهێناوە و ، لەسەر سەرم وەستاوە و ، بەو داچڵەکام کە ئەی وت : ئەی موحەممەد ! ئەمڕۆ کێ لە دەستم رزگارت ئەکات ؟ منیش وتم : الله .

ئەبوبوردە ئەڵێت : هەڵمەتم دا بۆ شمشێرەکەم و لە کێلان دەرم کێشا . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( شِم سيفك )) . فەرمووی : شمشێرەکەت بکەرەوە بە کێلان دا .

ئەڵێت : وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ! لێم گەڕێ با لە ملی دوژمنی خوا بدەم ، ئەمە سیخوڕی موشریکانە . فەرمووی : (( أسكت يا أبا بردة )) . ئەڵێت : پێغەمبەری خوا ﷺ نە شتێکی پێ وت و نە سزای دا . ئەڵێت : منیش لە سەربازگەکەدا هاوارم ئەکرد تا خەڵکیی بیبینێ و یەکێ بەبێ فەرمانی پێغەمبەری خوا بی کوژێ . چونکە من خۆم پێغەمبەری خوا ﷺ لە کوشتنی قەدەغەی کردبووم . ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ ئەیفەرموو : (( إِلْهَ عن الرجل يا أبا بردة ! )) . فەرمووی: وازی لێ بهێنە . ئەڵێت : گەڕامەوە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و ، فەرمووی : (( يا أبا بردة ! إن الله مانعي وحافظي حتى يظهر دينه على الدين كله )). فەرمووی : خوا ئەم پارێزێ هەتا دینەکەی بەسەر هەموو دینەکان دا زاڵ ببێ ..

دەربارەی کاری سیخوڕییش ، مالیکی پادشای هەوازین هەوڵی دا لە دەنگ و باسی سوپای موسڵمانەکان بە وردیی ئاگادار بێت ، بۆیە دوای ئەوەی کە شیوی حونەینی کردە سەربازگە و ، دوای ئەوەش کە هەواڵی دەرچوونی سوپای

موسڵمانەکانی بەرەو حونەین زانیی ، سێ پیاوی هەڵ بژاردن و فەرمانی بەسەردا دان کە بچنە ناو سوپای ئیسلامەوە و ، بە وردیی هەموو هەواڵێکی بۆ وەربگرن .
ئەو سێ پیاوە ئازایانە خۆیان گەیاندە لای سوپای موسڵمانان و خۆیان تێکەڵ بە سوپا کرد و ، بێئەوەی موسڵمانان پێیان بزانن بە وردیی هەموو هەواڵێکیان زانیی و ، بە لایانەوە یەقین بوو هیچ هێزێك چاری هێزی ئیسلام ناکات ..
کە گەڕانەوە لای پادشا راپۆرتێکیان پێشکەشی کرد و ، ئەویش پێی تووڕە بوو ، چونکە بە دڵی نەبوو . سەرەڕای ئەوەش سێ پیاوەکە ئامۆژگاریی مالیکیان کرد تا خۆی لە قەرەی سوپای ئیسلام نەدات ، بەڵکو بە خۆی و سوپاکەیەوە بەرەو مەنزڵی هەوازین بگەڕێتەوە ، چونکە بە گژاچوونی ئەو سوپایە ئەوپەڕی مەترسیی تیایە بۆ تیاچوون و ئابڕووچوونی هەوازین .
سیخوڕەکان راپۆرتی خۆیان پێشکەش کرد و ئامۆژگاریی مالیکیشان کرد کە ئەوان لەو سوپایە زراویان چووە ، با پیاوی چاك بێت بگەڕێتەوە ..
بەڵام مالیك سێ پیاوەکەی بە ترسنۆك لە قەڵەم دان و ، گاڵتەی پێ کردن ، بۆیە پیاوێکی تری بۆ ئەم کارە دەست نیشان کرد و ناردی بۆ ناو موسڵمانەکان ، کەچیی ئەویش هەمان هەست و بۆچوونی هەبوو و ، ئامۆژگاریی مالیکی کرد کە هەوازین بەرەو وڵاتی خۆیان بگێڕێتەوە ، ئەگەرنا سوپای ئیسلام تێکیان ئەشکێنێ .
بەڵام مالیك لە خۆبایی بوونەکەی لە رادە بەدەر بوو ، بۆیە لەسەر جەنگ سوور بوو و بە خۆی و سوپاکەی‌دا زۆر ئەنازیی ، تا ئەوەبوو دەرمانی دەردی کرا !
بە هەمان شێوە موسڵمانەکانیش پیاویان ناردە ناو سوپای هەوازین تا دەنگ و باسیان بۆ وەربگرێ .. ئەو پیاوەش وەك لە پێشەوە باس کرا ، عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوحەدرەدی ئەسلەمیی بوو کە توانیی خۆی بگەیەنێتە لای مالیکی پادشا و لە چادری فەرماندایەتیی‌دا گوێی لێ بگرێ چۆن نەخشەی جەنگی بۆ هەوازین ئەکێشا و، سام و هەیبەتی موسڵمانەکانی لە دڵیان‌دا لا ئەبرد ، تا ورەی کەتیبەکانی خۆی بەرز بکاتەوە . بەڵێنی ئەوەشی پێ ئەدان کە بەسەر موسڵمانەکان‌دا زاڵ ئەبن ، چونکە ئەوان هەتا ئێستا لەگەڵ کەسانێك‌دا جەنگیان کردووە ، کە پیاوی جەنگ و رۆژی سەخت نەبوون .

عەبدوڵڵا گوێی لە مالیك بوو کە ئەیوت : هەرگیز پێش ئەم جارە موحەممەد جەنگی نەکردووە ، بەڵکو تووشی کۆمەڵە کەسانێکی نادیار بووە کە هیچیان دەربارەی جەنگ نەزانیوە و بەسەریاندا زاڵ بووە .

هەروەها گوێی لێ بوو نەخشەی جەنگی ئەکێشا و ئەیوت :

لەگەڵ بەرەبەیاندا ئاژەڵ و ژن و منداڵەکانتان لە دوای خۆتانەوە ریز بکەن ، پاشان ریزەکانتان رێك و پێك بکەن ، پاشان ئێوە هەڵمەت بەرن .

مالیك ئامۆژگاریی سەرکردەکانی کرد تا ئەوانیش سەربازەکان ئاگادر بکەن کە پێویستە رێگایەکی سووك و سوڵ بگرنە بەر تا بە ئاسانیی سەرکەون و ، بەوپەڕی ئازایەتیی و کۆڵ نەدانەوە بجەنگێن . ئەو رێگایەش بریتی یە لە شکاندنی کێلانی شمشێرەکانیان و فڕێدانیان و پێویستە هەوازینیش هەڵمەت بەرێ ، کە ئەیوت :

پاشان ئێوە هەڵمەت بەرن و کێلانی شمشێرەکانتان بشکێنن . ئەو کاتە بە بیست هەزار شمشێری کێلان شکاوەوە بە گژیدا ئەچن و ، بە وێنەی تاقە پیاوێك هەڵمەت بەرن . ئەوەش بزانن سەرکەوتن بۆ ئەو کەسەیە کە یەکەم جار هەڵمەت ئەبات .

کوڕی ئەبوحەدرەد ئەم هەواڵانەی هێنایەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ.

پیاوێکی تریش هەواڵی بۆ پێغەمبەری خوا هێنا و رای گەیاند کە هەوازین بە رەگ و ریشەوە ، بە ئاژەڵ و ژن و منداڵیانەوە لە شیوی حونەین دا جەم بوون . پێغەمبەری خوایش ﷺ زەردەخەنەیەکی کرد و فەرمووی : (( تلك غنيمة للمسلمين غداً إن شاء الله )) . فەرمووی : إن شاء الله ئەوە سبەینێ ئەبێتە دەست کەوتی موسڵمانەکان .

کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە سوپاکەیەوە لە شیوی حونەین نزیك کەوتەوە ، فەرمانی دا پاسەوان بۆ سوپای ئیسلام دیاریی بکات ، تا ئاگاداری هەموو جم و جووڵێکی دوژمن بن ، نەوەکا دوژمن لە ناخلۆفدا هێرش بکاتە سەر موسڵمانەکان .

بۆ ئەم کارە ئونەیسی کوڕی مورثیدی کوڕی ئەبومورثیدی غەنەویی[٢٢٢] هەڵ بژارد، کە بە راستیی سوارچاکێکی ئازا و بەجەرگ بوو و ، فەرمانی بەسەردا دا کە

---

[٢٢٢] ئونەیس هاوپەیمانی حەمزە بووە ، لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ بەشداریی فەتحی مەککە و غەزای حونەینی کردووە . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بەسەردا دا تا ئەو ئافرەتە رەجم بکا کە بە دان پیانانی خۆی بووە شایانی ئەو حەددە . لەگەڵ دەستەی شەهیدانی رەجیع دا باوکی بە پلەی شەهادەت گەیشتووە . ئونەیس لە ساڵی بیستەمی کۆچیی دا کۆچی دوایی کردووە .

مەڵبەندی پاسەوانی یەکەی با لە سوپای ئیسلامەوە دوور و لە سوپای کافرانەوە نزیك بێت ، تا بە چاکیی چاوی لە جم و جووڵی دوژمن بێت .

ئەوەبوو پرسیاری کرد : (( ألا فارس يحرسنا الليلة ؟ )) . فەرمووی : ئەوە سوار چاکێك نیە ئەمشەو ببێتە پاسەوانمان ؟ لەولاوە ئونەیس بە سواریی ئەسپەکەی هات و وتی : من ئەی پێغەمبەری خوا !

فەرمووی : (( إنطلق حتى تقف على جبل كذا وكذا ، فلا تنزلَنَّ إلا مصلياً أو قاضي حاجة ، ولا تغرنَّ من خلفك )) . فەرمووی : برۆ ، هەتا ئەگەیتە سەر چیای فلان و فیسار ، ئیتر بۆ نوێژ کردن یان بۆ دەست بە ئاو گەیاندن نەبێت نەیەیتە خوارەوە .

ئەڵێت : ئەو شەوە ماینەوە ، هەتا رۆژبوویەوە و ئامادەی نوێژ بووین . ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ناومان و فەرمووی : (( أأحسستم فارسكم الليلة ؟ )) . فەرمووی : ئەمشەو هەستتان بە سوارچاکەکەتان کرد ؟ وتمان نە بەخوا . قامەت بۆ نوێژ کرا و ، نوێژی بۆ کردین ، کە سەلامی دایەوە ، چاوم لێی بوو لە ناو درەختەکانەوە سەیری ئەکرد و ، فەرمووی : (( أبشروا ، قد جاء فارسكم )) . فەرمووی : مژدەتان لێ بێت سوارچاکەکەتان هاتەوە .

ئونەیس هاتە بەرەوە و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! چۆن فەرمانت پێ دابووم لەسەر چیاکە وەستام و جگە بۆ نوێژکردن و دەست بە ئاو گەیاندن لەسەر ئەسپەکەشم دانەبەزیوم هەتا بەیانیی ، هەستم بە هیچ کەس نەکردووە .

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا لەسەر ئەسپەکەی دابەزێت و شاهێدیی بۆ دا کە ئەگەر هیچی تریش نەکات ئەمەی بەسە کە فەرمووی : (( ما عَلَيهِ ألا يَعملَ بعدَ هذا عَمَلاً ! )) [٢٢٣] .

**سێهەم : رێک و پێک کردنی سوپای هەردوولا**

دوای ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ زانیاریی تەواوی دەربارەی هەوازین دەست کەوت ، سوپای ئیسلامی رێك و پێك کرد و ئامادەی جەنگی داهاتووی کرد .

لەسەر بنەمایەکی رێك و پێك سوپای ئیسلامی کردە سێ بەشەوە :

**بەشی یەکەم** : موهاجیرەکانی خەڵکی مەککە و هاوپەیمانەکانیان .

---

[٢٢٣] غزوة حنين لباشميل : ٩١ ـ ١١٨ ، الرحيق المختوم : ٤٢٧ ـ ٤٣١ .

**بەشی دووهەم** : ئەنصار .

**بەشی سێهەم** : هۆزە جۆر بە جۆرەکانی تر ، لەگەڵ موهاجیرە پێشینەکانی ئەو هۆزانە.

جا بەشی یەکەم کرانە سێ کەتیبە و ، فەرماندایەتی‌یان بە سێ لە گەورە پیاوە موهاجیرەکان سپێررا ، کە هەموویان قورەیشیی بوون .

بەلاّم بەشی دووهەم کە بریتیی بوو لە ئەنصار و برِبرِەی پشتی سوپای ئیسلام بوون، دابەشی کردن بۆ دوو هێزی سەرەکیی کە ئەوس و خەزرەج بوون و ، فەرماندایەتییشی دانە دەست دوو پیاوی سەرداری ئەوس و خەزرەج .

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ سەربازانی ئەوس و خەزرەجی دابەش کرد بۆ چەند بەشێك ، ئەویش بە پێی بنەماڵەکان و هەر دەستەیەك فەرماندەی خۆی و ئالاّی تایبەتیی بۆ تەرخان کرد ، بەلاّم ئەبێ ئەو فەرماندانە پەیوەندی‌یان بە یەکێ لە هەڵگرانی ئالاّ سەرەکی‌یەکانی ئەنصارەوە هەبێ ، یان سەعدی کورِی عویادەی سەرۆکی خەزرەج ، یان ئوسەیدی کورِی حوضەیری سەرۆکی ئەوس .

بەلاّم بەشەکانی تری سوپا ، جگە لە موهاجیر و ئەنصار ، پێغەمبەری خوا ﷺ بە پێی هۆزایەتیی دابەشی کردن و ئالاّی بەسەریاندا دابەش کرد .. هەندێ هۆز لەبەر زۆریی جەنگاوەرانی ئەکرایە چوار بەش و فەرماندە و ئالاّی بۆ دائەنرا .. هەندێکیش بە سێ و هەندێکیش بە دوو بەشەوە بەش ئەکرا و ، هەندێکیش هەر هۆزە و بەشێك.

جا هەڵگرانی ئالاّ گەورەکانی موهاجیر و ئەنصار سیان بوون کە ئەمانەن :

| | |
|---|---|
| ١ ـ عەلیی کورِی ئەبوطالیب | قورەیشیی و موهاجیری‌یە . |
| ٢ ـ سەعدی کورِی عویادە | خەزرەجیی و ئەنصاری‌یە . |
| ٣ ـ ئوسەیدی کورِی حوضەیر | ئەوسیی و ئەنصاری‌یە . |

ئەمەش ناوی هەڵگرانی ئالاّی کەتیبە و بەشەکان لە موهاجیر و ئەنصار :

| | |
|---|---|
| ١ ـ سەعدی کورِی ئەبووەققاص | قورەیشیی موهاجیری‌یە . |
| ٢ ـ عومەری کورِی خەططاب | قورەیشیی و ئەنصاری‌یە . |
| ٣ ـ ئەبونائیلە | ئەوسیی و ئەنصاری‌یە . |
| ٤ ـ ئەبوبوردەی کورِی نەیار | ئەوسیی و ئەنصاری‌یە |
| ٥ـ ئەبولوبابەی کورِی عەبدولمونذیر | ئەوسیی و ئەنصاری‌یە . |
| ٦ ـ قەتادەی کورِی نوعمان | ئەوسیی و ئەنصاری‌یە |

٧ـ جەبری کوڕی عەتیك — ئەوسیی و ئەنصاریی‌یە .
٨ ـ ئەبوئوسەیدی ساعیدیی — خەزرەجیی و ئەنصاریی‌یە .
٩ ـ عومارەی کوڕی حەزم — خەزرەجیی و ئەنصاریی‌یە .
١٠ ـ ئەبوسولەیط — خەزرەجیی و ئەنصاریی‌یە .
١١ ـ سولەیطی‌کوڕی قەیس — خەزرەجیی و ئەنصاریی‌یە .[٢٢٤]

ئەمەش ناوی هۆزە عەرەبەکان و بیابان نشینەکانی ترە ، کە بریتیی بوون لە هەژدە فەرماندە :

١ ـ بورەیدەی کوڕی حەصیب — لە هۆزی ئەسلەم
٢ ـ جوندوبی کوڕی ئەعجەم — لە هۆزی ئەسلەم
٣ ـ ئەبوذەرری غیفاریی — لە هۆزی غیفار
٤ ـ ئەبوواقیدی لەیثیی — لە نەوەی ضەمرە
٥ ـ بیشری کوڕی سوفیان — نەوەی کەعبی کوڕی عەمر
٦ ـ ئەبوشورەیح — نەوەی کەعبی کوڕی عەمر
٧ ـ بیلالی کوڕی حاریث — لە هۆزی موزەینە
٨ ـ نوعمانی کوڕی موقەڕڕەن — لە هۆزی موزەینە
٩ ـ عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عەوف — لە هۆزی موزەینە
١٠ ـ رافیعی کوڕی موکەیث — لە هۆزی جوهەینە
١١ ـ عەبدوڵڵای کوڕی یەزید — لە هۆزی جوهەینە
١٢ ـ مەعبەدی کوڕی خالید ، ئەبوزەرعە — لە هۆزی جوهەینە
١٣ ـ سوەیدی کوڕی صەخر — لە هۆزی جوهەینە
١٤ ـ نوعەیمی کوڕی مەسعوود — لە هۆزی ئەشجەع
١٥ ـ مەعقەلی کوڕی سینان — لە هۆزی ئەشجەع
١٦ ـ عەبباسی کوڕی میرداس — لە نەوەی سولەیم
١٧ ـ خەففافی کوڕی نودبە — لە نەوەی سەلەیم
١٨ ـ حەججاجی کوڕی عیلاط — لە نەوەی سولەیم

---

[٢٢٤] ئەو سوپایەی کە جەنگی حونەینی کرد سوپاکەی رۆژی فەتح بوو ، ئەوەندە هەیە فەرماندەکانی ئەوس و خەزرەج لە رۆژی فەتح‌دا هەر یەکە شەش فەرماندە بوون ، بەلاّم لە جەنگی حونەین‌دا فەرماندەکانی ئەوس پێنج و فەرماندەکانی خەزرەج چوار بوون و ، هەر هەمان فەرماندەش بوون .

واقیدیی وتوویە : ئالاّكانی ئەوس و خەزرەج لـە سـەردەمی نـەفامیی‌دا صـەوز و سوور بـوون . جـا كـە ئیسـلام هـات وەك خۆیـان هێشـتیانەوە و ، ئـالاّی گـەورەی موهاجیرەكانیش سپیی و ، بچووكەكانیش رەش بوون .

بەم شێوەیە پێغەمبەری خوا ﷺ سوپاكەی كردە بیست و نۆ بەش ( فصیل ) ەوە : موهاجیرەكان دوو بەش و ، ئەنصـار نـۆ بـەش و ، هـۆزە عەرەبـەكان و دانیشـتوانی بادیەش هەژدە بەش .

ئەسپ سوارانیش خرانەوە پێشی سـوپا و فەرمانـدەی پاڵـەوانیش خالیـدی كـوڕی وەلید كرایە فەرمانـدەی گشتیی هەزار ئەسپ سوار كە هەموویان لـە نـەوەی سـولەیم بوون و لە خۆشیان سێ فەرماندەیان بۆ دیاریی كران كە عەبباسی كوڕی مـیرداس و ، حەججاجی كوڕی عیلاط و ، خەففافی كوڕی نودبە بوون . هەروا ئەم ئەسپ سـوارانە لە پێشەوەی سوپادا بوون و خالیدیش فەرماندەی گشتی‌یان بوو هەتا جەنگی حونەین و طائیف تەواو بوو و ، موسڵمانەكانیش گەڕانەوە جیعیڕانە .

شایانی باسە كە پێش خستنی ئەسپ سواران شێوازێك بوو كە پێغەمبەری خوا ﷺ بە كاری ئەهێنا ، چونكە لەو رۆژەدا ئەسپ بەهێزترین چەك بوو كە سـوپا بـە كـاری بهێنایە و ، وەك چەكی دەبابەی ئەمڕۆ وەها بوو .[٢٢٥]

بەلاّم مالیكی كوڕی عەوفی سەرداری هەوازین ، هەرچەندە تەمەنی سیی سـالاّن بوو ، جەنگاوەرێكی چـاك بـوو لـە پلـەی یەكـەم‌دا و، شـارەزاییـەكی چـاكی لـە نەخشەكێشانی جەنگ‌دا هەبوو ، سەرەڕای ئـەوەش ئەوەنـدە ئـازا و بەجـەرگ بـوو ، گەیشتبووە پلەی هەڵ چوون و لە خۆبـایی بـوون .. لـە هـەمان كـات‌دا بـە چـاكیی دەسـەلاّتی بەسـەر هـەموو هۆزەكـانی هـەوازین‌دا هـەبوو و ، ئـەوانیش دانیـان بـە سەرداریی ئەودا ئەنا .

مالیك نەخشەیەكی وردی كێشا بەوەی سەربازانی بە شێوەی كەمین لە شـیوەكان‌دا حەشار دا ، كە ئەوەبوو لە بەرەبەیانی رۆژی جەنگ‌دا توانی‌یان شكست بە موسڵمانان بهێنن و ، لە سەرەتای جەنگ‌دا كەتیبەكانیان پەرتەوازە بكەن ، بە شێوەیەك كـە لـە شیوەكان‌دا هەڵ بێن ، كە خەریك بوو سوپای ئیسلام بە یەكجاریی تیا بچێ ، ئەگـەر دامەزراویی پێغەمبەر و كۆمەڵێكی كەمی دڵسـۆز لـە هـاوەڵان نەبوایـە . ئـەوەبوو دانیان بە خۆیان‌دا گرت و ، موسڵمانەكان گلێر بوونەوە و دوژمنیان تێك شكاند .

---

[٢٢٥] غزوة حنين لباشميل : ١١٨ ـ ١٢٥ .

مالیك ئەم شێوازەی خوارەوەی بەكار هێنا :

**١ ـ بەرزكردنەوەی ورەی سەربازەكانی :**

بۆ ئەمە وتارێكی بۆ هەوازین دا تا متمانە بە خۆیان بكەن ، چونكە ئەوان لە موسڵمانەكان زۆرترن و ، لەوانیش دامەزراوترن و ، موسڵمانەكانیش تا ئێستا تووشی پیاوی خۆیان نەبوون وا بە خۆیاندا ئەنازن .

**٢ ـ ئامادەكردنی ژن و منداڵ و ئاژەڵ و سامان :**

ئەمانەی لە مەیدانی جەنگدا ئامادە كردن تا هەموو سەربازێكی هەوازینیی جەنگی سەروماڵیی بكات و ، بەو ئاسانی‌یە مەیدانی جەنگ چۆڵ نەكات ..

بەڵام ئەوەبوو ، وەك لە پێشەوە باس كرا ، دورەیدی كوڕی صومە رەخنەی لەم كارەی مالیك گرت و ، بە شوانی لە قەڵەم دا نەك فەرماندەی سوپا . كەچیی مالیك بە سەركەشیی خۆی كۆڵی نەدا و وازی لەو نەخشەیەی نەهێنا .

**٣ ـ شكاندنی كێلانی شمشێرەكان :**

مالیك داوای لە سوپاكەی خۆی كرد كە هەر بیست هەزارەكەیان كێلانی شمشێرەكانیان بشكێنن . ئەمەش بە لای عەرەبەكانەوە واتە : جەنگ كردن و كۆڵ نەدان تا یا ئەوەتا سەرئەكەون ، یان هەموویان لەو پێناوەدا ئەمرن .

**٤ ـ كەمین دانان :**

مالیك چاك شارەزای پێچ و پلۆچی شیوی حونەین بوو ، بۆیە ئەو شوێنەی بۆ مەیدانی جەنگ هەڵ بژاردبوو ، تا لە یەكەم دەست وەشاندندا موسڵمانەكان دەستە پاچە بكەن .

لەو شەوەدا كە بۆ بەیانی‌یەكەی جەنگی حونەین رووی دا ، مالیك چەند مەفرەزەیەكی لە پیاوە ئازا و بەجەرگەكانی هەڵ بژارد و ، لە تاریكیی شەودا بردنی بۆ ئەو دۆڵ و تەنگەبەرانەی كە سوپای ئیسلام پیایانا تێ ئەپەڕێ و ، بە چەند بەشێك دای‌مەزراندن و بە شێوەی كەمین حەشاری دان و ، فەرمانی پێ دان لەگەڵ تاریكیی بەرەبەیاندا هێرش بكەنە سەر موسڵمانەكان ، تا بەو تاریكی‌یە سەریان لێ بشێوێ و تەفروتوونا ببن و خۆیان بۆ كۆ نەكرێتەوە .

**٥ ـ هەڵمەت بردن لە ئاخلۆفدا :**

ئەمەش نەخشەیەكی تری مالیك بوو تا جڵەوی مەیدان بە دەست هەوازینەوە بێت.

بۆ ئەمە فەرمانی پێ دان بە وێنەی تاقە پیاوێك هەڵمەت بەرن ..

ئەوەبوو هەوازین ئەم نەخشانەیان بە وردیی جێ بەجێ کردن و دەستێکی توندیان لە موسڵمانەکان وەشاند .

٦ ـ ترساندن و سەرلێ شێواندن :

شێوازێکی تر و نەخشەیەکی تری مالیك بریتیی بوو لە زۆر دەرخستنی سوپاکەی تا موسڵمانەکان سامیان لێ بنیشێ .. ئەوەبوو کە موسڵمانەکان سەرنجیان دا وایان ئەزانیی صەد هەزار سەرباز ئەبن . ئەویش بەوەی کە دەیان هەزار وشتری هێنا بوون و لە دوای سوپاوە ریزی کردبوون و ئافرەتی سواریان کردبوو و ، لە دوورەوە وا ئەزانرا ئەو هەمووە ئافرەتە پیاون بەسەریانەوە .[٢٢٦]

**چوارەم : سەرەتای جەنگ و تێک شکان**

دوای ئەوەی کە هەردوو لا خۆیان ئامادەی جەنگ کرد ، سەعاتی صفر هاتە بەرەوە ..

موسڵمانەکان لە بەرەبەیان‌دا و کەمێك پێش فەجر خۆیان ئامادە کرد و ویستیان دەربەندی حونەین ببڕن و خۆیان بگەیەننە ئەو دەشتە فراوانەی کە سوپای زۆر و زەبەندەی هەوازین تیای‌دا دامەزرا بوو .. لەو کاتەدا موسڵمانەکان گەیشتنە بەردەم ئەو مەفرەزانەی کە سەرداری هەوازین بە شێوەی کەمین دای‌مەزراندبوون و ، موسڵمانەکان هیچ ئاگایان لەوە نەبوو و ، بە تەما نەبوون سوپای هەوازین ئەوەندە هاتبێتە پێشەوە .

موسڵمانەکان بە تەما بوون تا رۆژ ئەبێتەوە ئەو شیوە ببڕن و ، خۆیان بگەیەننە بەردەم سوپای هەوازین و ، لەوێ جەنگ دەست پێ بکات . بەڵام کارێك کە خوا ئەی‌ویست بێتە دیی ، بە کەس تەفرە نەئەدرا .. چونکە موسڵمانەکان دوای دەرچوونیان لە مەککە کەوتنە شانازیی و خۆهەڵکێشان کە گوایا سوپایان گەورەیە و لەبەر کەمیی ناشکێن . ئیتر یارمەتیی و کۆمەکیی خوایان لە یاد چوو و ، دوعا و پاڕانەوە و داوای سەرکەوتن پشت‌گوێ خران .. پشت‌بەستن بە خوا لە یاد چوو .. بۆ ئەمە خوای گەورە دەرسێکی چاکی دادان و ، تێی گەیاندن کە سەرکەوتن تەنها بە دەستی خۆیەتی و ، پێویستە سوپای خواناس ئەوەی لە یاد نەچێ و ، زۆریی و بەهێزیی ئەوان ، بەبێ ویستی خوا ، سەرکەوتن دەست ناخات ..

---

[٢٢٦] غزوة حنين لباشميل : ١٢٥ ـ ١٣٠ .

مالیکیش ، هەرچەندە بە تەمەن گەنج بوو ، بەڵام کەڵکی لە ئامۆژگاریی دورەیدی کوڕی صومە وەرگرت و ، زۆر بە ژیرانە لەو دەربەندەدا کەمینەکانی دامەزراندن و ، فەرمانی دا لە کاتی تایبەتیی‌دا بە یەك دەست سوپای ئیسلام دابگرنەوە . جا هەرچەندە ئەو مەفرەزانە لە چاو سوپای ئیسلام‌دا کەم بوون ، بەڵام کارێك کە ئەوان لە تاریکیی‌دا و لە ناخلۆف‌دا ئەنجامیان دا ، زۆر کاری کردە سەر ورەی موسڵمانەکان و ، بە یەکجاریی شپرزەی کردن ، هەرچەندە سوپای ئیسلام زۆر ڕێك و پێك بوو و ، هەزار سوار چاك بە فەرماندایەتیی ناودارترین سوار چاکی عەرەب ، خالیدی کوڕی وەلید ، پێشی سوپا کەوتبوون .

وەنەبێ خالید توانای ڕاستکردنەوەی هەڵوێستی وەهای نەبووبێ ، بەڵام لەوە ئەچێ دەسەڵاتی بەسەر ئەو ئەسپ سوارانەدا نەمابێ کە زۆربەیان بیابان‌نشین بوون و، لەگەڵ جەنگی وەهادا ڕانەهاتبوون و ، کە لەلایەن کەمینەکانەوە هێرشیان کرایە سەر ناچاری هەڵاتن بوون و ، بەرەو مەککە ئەو دەشتەیان گرتە بەر . بە هەڵاتنی ئەوانیش هەموو سوپا ورەی لە دەست دا و ، هەموو جەنگاوەرێك مەبەستی ئەوەبوو خۆی دەرباز بکات ..

ئێمەش ئەتوانین هۆیەکانی سەرکەوتنی مەفرەزەکانی مالیك بەم جۆرە دەست نیشان بکەین :

یەکەم : فەرماندایەتیی سوپای ئیسلامیی هەستی نەئەکرد کە لەو شوێنەدا ئەو مەفرەزانە خۆیان حەشار داوە ، بۆ ئەوەی کارێك ڕوو بدات کە خوا نەخشەی کێشاوە.

دووهەم : ئەو مەفرەزانە لە تاریکیی‌دا بە تیر موسڵمانەکانیان داگرتنەوە و ، لە هەمان کات‌دا بە هەموو چەکێك هێرشیان کردە سەریان ، بە ڕادەیەك کە نەیان ئەزانیی لە کوێوە هێرشیان ئەکرێتە سەر . ئەمەش بووە هۆی سڵەمینەوەی ئەسپەکان و بێزاربوونیان و ترسانیان و ، ناچاربوونیان بۆ کشانەوە و بەمەش تێك‌شکانەکە هاتە کایەوە .

سێهەم : ئەو کەمینانە لە شوێنی سەخت و پێچ و پلۆچ‌دا بوون و ، ئەسپەکان توانای هەڵسوڕانیان نەبوو ، بۆیە بە کشانەوەیان تێك شکان بووە بەشی سوپای ئیسلام ..

شایانی باسە کە تێك شکانی ئەسپ سواران بووە هۆی هەڵاتنی هەموو بەشەکانی تری سوپا ، بەرەو مەککە ، بۆ ئەوەی دەست بدەنە چەك و بەرگریی لە خۆیان بکەن ، چونکە هێرشی کەمینەکانی هەوازین لە تاریکیی و ناخلۆفیی‌دا بوو .

ئەو تێك‌شکانە ئەوەندە مەترسیی‌دار بوو ، ئەگەر خوای گەورە دامەزراویی بە پێغەمبەری خوا ﷺ و صەد هاوەڵی پایەدار نەبەخشی‌یایە ، ئەوا سوپای هەوازین ئەی‌توانیی لە ماوەی دوو سەعات‌دا مەککە داگیر بکات ..

دوو هەزار سەربازی سوپای موسڵمانان بریتیی بوو لە دانیشتوانی مەککە کە زۆربەیان نا بە دڵ موسڵمان بوو بوون و، بۆ بەرگریی لە ئیسلامیش لە مەککە دەرنەچوو بوون ، بەڵکو بۆ وەرگرتنی بەشە دەست‌کەوت دەرچوو بوون . کاتێك کە ئەو جۆرە کەسانە تێك‌شکانی سوپای ئیسلامیان بینیی کەوتنە دەربڕینی ئەوەی کە لە ناو دەروونیان‌دا حەشار درا بوو ..

لەو کاتە ناسکەدا کە سوپای ئیسلام شپرزە بوو بوو ، شەیبەی کوڕی عوثمانی کوڕی ئەبوطەلحەی عەبدەریی ، هەڵگری کلیلی کەعبە ، کە یەکێ لە دانیشتوانی مەککە و لە ڕۆژی فەتح‌دا موسڵمان بوو بوو و ، باوکی لە جەنگی ئوحوددا هەڵگری ئاڵای قوڕەیش بوو و بە دەستی موسڵمانەکان ، لەگەڵ دەستەی هەڵ گرانی ئاڵادا هەر هەموویان ، کوژرا بوو ، ویستی لە تۆڵەی باوکی‌دا پێغەمبەری خوا ﷺ بکوژێت .

شەیبە دوای ئەوەی کە بە چاکیی ئیمانی هێنا ئەو ڕووداوەی ئەگێڕایەوە و ئەی وت: وتم : ئەمڕۆ تۆڵەی باوکم ئەسێنم .. ئەمڕۆ موحەممەد ئەکوژم . ئەڵێت : هەوڵم دا پێغەمبەری خوام ﷺ دەست بکەوێ هەتا بی‌کوژم . شتێك هات بە ڕووم‌دا و دڵمی داگیر کرد ، ئیتر توانای ئەو کارەم نەما و ، زانییم بە من ناکوژرێ .

ئیبن ئیسحاق باسی ئەو تێك شکانە ئەکات و ئەڵێت : عاصیمی کوڕی عەمری کوڕی قەتادە ، لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی جابیرەوە ، ئەویش لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵای باوکیەوە بۆی باس کردم کە ئەی‌وت :

کە ڕوومان لە شیوی حونەین نا ، بە شیوێك لە شیوە قووڵ و لێژەکانی توهامەدا هاتینە خوارێ ، کە تیایا خل ئەبووینەوە . ئەڵێت : لە تاریکیی بەرەبەیان‌دا ، کە ئەوەبوو دوژمن پێش ئێمە گەیشتبووە ئەو شیوە و ، لە پێچ و پەنا و تەنگەبەرایی یەکانی‌دا خۆیان حەشار دابوو . ئەوان خۆیان کۆ کردبوویەوە و ئامادە بوو بوون . دە بەخوا هەر ئەوەندەمان زانیی بە وێنەی تاقە پیاوێك کەتیبەکانیان تەپیان کوتایە

سەرمان .. خەڵکەکە بۆ دواوە هەڵاتن و کەس لە کەسی نەئەپرسی‌یەوە . پێغەمبەری خوایش ﷺ لای دایە لای راست و ، پاشان فەرمووی : (( أين الناس ؟ هلموا إليّ ، أنا رسول الله )) . فەرمووی : خەڵکەکە کوا ؟ وەرنەوە بۆ لام ، من پێغەمبەری خوام. ئەڵێت : هیچ نەبوو .. وشترەکان نیشتنە سەر یەك و ، خەڵکەکەش بۆی دەرچوون، بەڵام ئەوەبوو چەند کەسێك لە موهاجیر و ئەنصار و ئەهل و بەیتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە خزمەتی‌دا مانەوە .

بەلای ئیبن ئەثیرەوە وەها هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ سێ جار فەرموویە : (( أيها الناس ! هلموا إلي ، أنا رسول الله ، أنا محمد بن عبد الله )) .

وتمان : دانانی ئەو مەفرەزانەی هەوازین بە کەمین نەخشەی جەنگاوەری بەساڵاچووی هەوازین ، دورەیدی کوڕی صومەه بوو . ئەوەبوو بە مالیکی وت : کەمین دابنێ، جا ئەگەر موسڵمانەکان هاتنە سەرت ، ئەوا کەمینەکەت دوایان لێ ئەگرێ و تۆیش بە خۆت و ئەوانەوە کە لەگەڵت‌دان هێرشیان ئەکەیتە سەر . خۆ ئەگەر تۆ هەڵمەتت برد ئەوا تاقیان دەرناچێت .

ئێستە با بە ئەندێشە ئەو دیمەنەی موسڵمانان بێنینە بەر چاومان کاتێ کە تێك شکان .. هێشتا دنیا رۆشنی نەکردووە ، دوانزە هەزار جەنگاوەر بە خۆیان و چەك و تفاقیانەوە ، کە دوو هەزار و چوار صەد ئەسپ و چەند هەزار وشترێکیان پێ بوون ، لە مەیدانی جەنگ هەڵ دێن .. کەس لە کەس ناپرسێتەوە .. خەڵکەکە لە ئاژەڵەکان زیاتر و ئاژەڵەکانیش لە خەڵکەکە زیاتر سام و هەیبەتی هەڵوێستەکە ترسی بردبووە دڵیانەوە .. شپرزە بوون و شڵەژان و هاوار و قیژە و بگرە و بەردە دنیای هەراسان کردبوو .. خەڵکەکە و ولاغ و ئاژەڵەکان یەکتریان ئەشێلا .. هێزێکی گەورە یاسای لە دەست دابوو و ، وەك لافاوێکی یەکجار گەورە دەرودەشتی ئەماڵی .. تەنها پێغەمبەری خوا ﷺ و نزیکەی صەد کەسێك لە دامەزراوان دانیان بە خۆیان‌دا گرت..

پیاوێکی هەوازینیش بەسەر وشترێکی سوورەوە پێشی هەوازین کەوتبوو و ئالایەکی رەشی بە دەستەوە گرتبوو دوای ئەوەی کردبووی بە نووکی رمێکی درێژدا و موسڵمانانی راو ئەنا .. بە هەر موسڵمانێك ئەگەیشت بە رمەکەی لێی ئەدا .. هەوازین و ثەقیفیش دوای کەوتبوون و رمیان ئەوەشاند..

ئەو هەمووە موسڵمانە رایان ئەکرد و بیست هەزار جەنگاوەری هەوازینیش بە دوایانەوە بوون و راویان ئەنان .

لەم هەڵوێستە سەختەدا پێغەمبەری فەرماندە ﷺ هەوڵی ئەدا موسڵمانەکان هێور بکاتەوە و ، لە هەلاتن واز بهێنن و ، بگەڕێنەوە لای .. چەند ساڵە بانگەوازی ئیسلامیی پیاو پەروەردە ئەکات ، کەچیی لە ساتێکی یەکجار سەخت دا ئەو هەمووە رەنجە درا بە ئاودا .. داخۆ ئەو هەڵوێستە چەندە سەخت بووبێ !!

پێغەمبەری خوا ﷺ هاواری ئەکردە هاوەڵان کەچیی کەسێك ئاوڕی لێ نەئەدایەوە.. تۆ بڵێ لە سەختیی هەڵوێستەکەدا هیچ کەس هاواری ئازیزی نەئەبیست.. ئەو هەمووە خەڵکە تێکەڵ بوو بوون و کەس لە کەسی نەئەپرسی یەوە.. لەوانەشە ئەو هەلاتوانە وایان زانیبی بێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ کوژراوە ، یان ئەویش هەلاتووە .. چونکە ئەوەبوو کە عەبباس بانگی لێ کردن و هۆشیان بە خۆیان‌دا هاتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ زیندووە و لە شوێنی خۆی‌دا دامەزراوە و بە چەند کەسێکی کەمەوە خەریکی جەنگ و کوشتاری هەوازینە ، یەکتریان ئاگادار کرد و بە جارێ گەڕانەوە خزمەتی .

بەڵێ ، پێغەمبەری خوا ﷺ شمشێرەکەی لە کێلان دەرهێنا و ، کیلانەکەی فڕێ دا و، دەستی دایە حەربەکەشی تا بەرامبەر بە دوژمنان بوەستێ و ، هاوەڵە کەمەکانیش دەوریان لێ دابوو .. لەو رۆژەدا پێغەمبەری خوا ﷺ بەوپەڕی ئازایەتیی و دامەزراوی‌یەوە ، کە شایانی پلەی پێغەمبەرایەتیی بێ ، ئەجەنگا و ، روو بە رووی سوپای بێ شوماری هەوازین ئەبوویەوە . وەنەبێ ئەو تەنها لە رۆژی حونەین‌دا ئازایەتیی نواند بێ ، بەڵکو لە هەموو هەڵوێستێك‌دا ئازاترین پیاوی سوپای ئیسلام بوو ، بە شێوەیەك کە شیاو بێت ببێتە فەرمانده‌ی ئازاترین پاڵەوان ..

ئەوەبوو لە رۆژی ئوحودیش‌دا بە شێوەیەکی کاتیی موسڵمانەکان شکستیان خوارد ، ئەویش بە هۆی ئەو هەڵەیەوە کە لە دەستی تیرهاوێژەکان دەرچوو و خالید توانیی گردەکەیان لە دەست بستێنێ . لەو کاتەش‌دا پێغەمبەری خوا ﷺ بەوپەڕی ئازایەتیی و دامەزراوی‌یەوە لە جێی خۆی‌یەوە وەستا ، بە شێوەیەك کە توانیی موسڵمانەکان لە دەوری خۆی جەم بکاتەوە و ، سەر لەنوێ رێك و پێکیان بکاتەوە ، بە جۆرێ کە سام و هەیبەتیان بچێتەوە دۆخی جاران ئەگەرچیی زیانی زۆریان لێ کەوتبوو ..

هەروەها لە رۆژە سەختەکانی خەندەقیش‌دا ، کاتێك کە لە سەرمای زستان و ، رەشەبای سەخت و ، ساڵی گرانیی و برسێتیی‌دا سوپای دە هەزاریی ئەحزاب هاتبووە سەر موسڵمانان و ، باری سەربارانیش جوولەکەی قورەیظە پەیمانیان شکاند و ، لە

بریی ئەوەی کۆمەکیی موسڵمانەکان بکەن ، کەوتنە دژایەتیی و ، لە هەلێك ئەگەڕان پشتی موسڵمانەکان بدەن بە زەوییدا .. لەو ڕۆژانەدا کە ئەوپەڕی مەترسیی ڕووی لە موسڵمانان کردبوو و ، ئەوەندە ترس چووبووە دڵیانەوە خەریك بوو زراویان بڕوات ، پێغەمبەری خوا ﷺ نموونەی ئازایەتیی و دامەزراویی بوو ، بە ڕادەیەك کە موسڵمانەکانی هێور ئەکردنەوە و وورەی بەرز ئەکردنەوە .. هەتا خۆی لە مەترسیی دارترین شوێندا ، کە ئەگونجا ئەسپ سوارانی دوژمن بکەنە ئەوبەر ، ئەبووە پاسەوانی خەندەقەکە ، بە تایبەت لە شەوە تاریك و یەکجار ساردەکاندا و ، لەو کاتانەشدا کە ژمارەی موسڵمانەکان لە نۆصەد جەنگاوەرەوە هاتبووە سەر سێصەد جەنگاوەر ، ئەویش بە پاگاندەی مونافیقەکان .

بە ڕاستیی تاقییکردنەوەیەکی گەورە بوو ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە جەمسەرێك تا هاوەڵە هەڵاتووەکان بگێڕێتەوە لای خۆی .. خۆی دڵی پڕ بوو لە متمانە کە خوا سەری ئەخات .. هەر کەسیش متمانە بە خوا بکات ، ئەوا خوا پشتی بەر نادات . لە هەمان کاتدا سوپای ئیسلام ئەگەرچیی شکستی خواردووە ، بەڵام هێشتا سوپایەکی ڕێك و پێکە ، گەر بگەڕێتەوە مەیدان ، چونکە ژمارەیەکی ئەوتۆی لێ نەکوژراوە . تەنها ئەوەندە بوو هەوازین لە ناکاودا دایان بەسەر موسڵمانەکاندا و ئەمانیش خۆیان بۆ ئەوە ئامادە نەکردبوو .. ئەمان بەتەما بوون خۆیان بگەیەننە دەشتایی ئەوسا جەنگ بکەن .

کەواتە ئەم شکست خواردنە بە هۆی بێوورەیی و ترسنۆکییەوە نەبوو و لەبەر کەمیی ژمارەشیان نەبوو ، چونکە جەنگی بەدر بەم جۆرە پیاوانە ئەنجام درا کە ڕێژەی کافران لەو ڕۆژەدا لە چاو ڕێژەی حونەیندا زیاتر بوو .. ئەوەندە هەبوو کە دەست وەشاندنەکەی هەوازین ناخلۆفیی بوو و ، هەندێ هۆزیش تازە موسڵمان بوو بوون و فێری یاسا و نەخشەکێشان نەبووبوون و ، هەندێ لە دانیشتوانی مەککەش بە دەم موسڵمان بوو بوون و هێشتا ئیسلام نەچووبووە ناو کرۆکی دڵیانەوە و ، ئەمانەش ـ وەك مێژوونووسە ناودارەکان باسیان کردووە ـ یەکەم دەستە بوون کە هەڵاتن و وورەی خەڵکەکەیان دابەزاند ..

ئەمەش هەمووی بۆ چارەسەرکردنی ئەو نەخۆشییەی کە خەریك بوو تووشی دڵی موسڵمانەکان ببێ ، کە ئەویش بریتییە لە غروور و پشت بەستن بە زۆریی سوپا بۆ سەرکەوتن .

عەبباسی کوڕی عەبدولموطەللیبیش یەکێ بوو لەو صەد کەسە دامەزراوە .. بەڵێ تازە موسڵمان بوو بوو ، بەلاَم دیارە خاوەنی پەروەردە و غیرەتی راستەقینە بوو . کە پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی لە شکستی هاوەڵان بوو ، لای یەقین بوو کە موهاجیر و ئەنصار بزانن ئەو لە شوێنی خۆی دامەزراوە ئەگەڕێتەوە و خێرا ورەی سوپای ئیسلام هەر هەمووی بەرز ئەبێتەوە و ، لەو شکستە کاتییە رزگار ئەبن . بۆیە فەرمانی دا عەبباسی مامەی ـ کە لە دووریی چەند میلێکەوە دەنگی ئەبیسترا بانگ لە سوپای ئیسلام بکات تا بگەڕێتەوە .. داوای لێ کرد بانگ لە ئەنصار و ، موسڵمانە پەیمان دەرەکانی ژێر درەختی رضوان بکات ، تا بگەڕێنەوە بۆ مەیدانی شەرەف ، مەیدانی جیهاد . ئەویش خوا لێی رازیی بێ بانگی لێ کردن ..

هەر کە هاوەڵان دەنگی عەبباسیان بیست ، هۆشیان بە خۆدا هاتەوە .. ئەوان و هەلاَتن ؟! ئەوان و شکست خواردن و زاڵ بوونی دوژمن ؟! هەرگیز وەها نابێت .. ئەوان هەموو ژیانیان هەر غیرەت بووە .. هۆشیان بە خۆیاندا هاتەوە و هەر هەموو گەڕانەوە بۆ مەیدانی مەردایەتیی و ، دەورەیان لە ئازیز دایەوە .. بەمە بارودۆخ گۆڕا .

بە ڕاستی هاوەڵان شەرمەزاری ئەو هەڵوێستەیان بوو بوون ، کە هەلاَتبوون و پێغەمبەری خوایان ﷺ بە تەنیا لە مەیدانی جەنگدا و لەبەردەم دوژمندا بەجێ هێشتبوو .. کەی بەڵێنی ئەوان وەها بوو ؟! ئەوان کەی بە تەمای بێوەفایی لەو جۆرە بوون ؟! بۆیە هەر بە بیستنی جاڕدانەکەی عەبباس خێرا گەڕانەوە دوا .. هەتا هی وایان هەبوو بەسەر پشتی وشترەکەیەوە بوو و وشترەکە ئەیفڕاند و لە مەیدانی جەنگ دووری ئەخستەوە ، موسڵمانەکەش پێی خۆش بوو بگەڕێتەوە ، بەلاَم چاری وشترەکەی نەئەکرد و ، ملی نەئەدا بگەڕێتەوە ، ناچار جڵەوی وشتری بەر ئەدا و خۆی فڕێ ئەدایە زەویی و ، بە پێ ئەگەڕایەوە خزمەتی ئازیز و دەستی ئەدایە کوشتاری دوژمنان ..

هەتا هەروەك لە کاتی هەڵهاتنا یەکتریان ئەشێلا ، لە کاتی گەڕانەوەشدا ، ئەوەندە پەلەیان بوو ، دیسان یەکتریان ئەشێلا و ، ئەوەندەش بە پەلە لە دەوری پێغەمبەری خوا ﷺ جەمیان ئەخوارد بۆ کوشتاری دوژمنان خەریك بوو رمەکانیان بەری پێغەمبەری خوا بکەون .

که هاوەڵان گەڕانەوە مەیدانی جەنگ ، دەستیان دایە کوشتار ، بەڵام چۆن کوشتارێك ! ئەوەبوو جەنگێکی سەخت لە نێوانیاندا رووی دا و ، هەوازینی هێرش بەر دوای ماوەیەکی کەم بوونە بەرگریی‌کەر .. موسڵمانەکان بەوپەڕی داخ لە دڵی‌یەوە کوشتاری دوژمنیان ئەکرد .. زۆر بە چاکیی ئارامیان گرت ، تا ئەوەبوو خوای گەورە سەرکەوتنی پێشکەش کردن . هەوازینیش تووشی وەها شکستی‌یەك بوو کە بە درێژایی مێژوو هیچ عەرەبێك وەها شکستی نەخوارد بوو ..

شایانی باسە کە یەکێك لەوانەی لە دەوری پێغەمبەری خوا ﷺ بە دامەزراویی مابوونەوە ئەبوسوفیانی کوڕی حاریثی کوڕی عەبدولموطەللیب بوو ، کە دەستی بە جڵەوی ئێسترەکەی پێغەمبەری خواوە گرتبوو و ، ئەویش بە پەلە بەرەو موشریکەکان ئەڕۆیشت .. لە بیرمان نەچێ کە هەتا فەتحی مەککە ئەبوسوفیان دژایەتیی موحەممەدی ئامۆزای ئەکرد و ، بە چ حاڵێك پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵی ئاشت بوویەوە و رووی پێ دا ..

سەرەتا عەبباس بانگی لە ئەنصار ئەکرد ، پاشان بانگی ئەکردە خەزرەج کە بە راستیی جەنگاوەر و بەغیرەت بوون . کە جەم بوون و جەنگیش گەرم بوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ سەری بەرز ئەکردەوە تا چاوی لە گەرمەی جەنگ بێت و ئەشی فەرموو : (( الآن حمي الوطيس )) . واتە : ئێستە جەنگ گەرم بوو . ئەم رستەیە یەکەم جار بوو پێغەمبەری خوا ﷺ بە کاری بهێنێ . پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ مشتێك چەوی بۆ دوژمنان هاویشت و فەرمووی : (( إنهزموا ورب الكعبة )) . فەرمووی : بە پەروەردگاری کەعبە هەڵاتن ..

ئەنەس ئەڵێت : دە بەخوا چاوم لێ‌یان بوو کاریان بەرەو دواوە و بڕشتیان بەرەو کولیی ئەڕۆیشت هەتا خوا تێکی شکاندن . چاویشم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ ئێسترەکەی خۆی بە دوایاندا تاو دابوو .

ئەنەس باسی دامەزراویی پێغەمبەر و ئەو کۆمەڵە هەڵبژاردە ئەکات کە پێغەمبەری خوا ﷺ سەیری راست و چەپی خۆی ئەکرد و ئەی‌دیی وا موسڵمانەکان هەڵ دێن، ئەی فەرموو: (( يا أنصار الله وأنصار رسوله ، أنا عبدالله ورسوله صابر )).

پاشان بە حەربەکەیەوە ئەچووە بەردەم دوژمنان و هێرشی ئەکردە سەر سەربازگەی کافران ، تا ئەوەبوو خوا دوژمنی شکاند و موسڵمانە هەڵاتووەکانیش گەڕانەوە لای .

لە کاتی تەنیایی‌دا پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوڕی بۆ لای ئەبوسوفیانی کوڕی حاریثی ئامۆزای دایەوە کە بە زریّ خۆی داپۆشیی بوو و نەی‌ئەناسی و جڵەوی ئیسترەکەی بۆ گرتبوو و ، فەرمووی : (( من هذا ؟ )) . وتی : دایك و باوکم بە قوربانت بن ، براکەتم، ئەبوسوفیانی کوڕی حاریث .

فەرمووی : (( نعم أخي . ناولني حصىً من الأرض )) . فەرمووی : برای چاکی .. چەند چەوێکم بدەریّ .

ئەو چەوانە بەرەو دوژمن ئەهاوێژیّ و خوا تێکیان ئەشکێنیّ .

ئەوانەی کە ناویان هاتووە لەو دامەزراوانە : ئەبوبەکر و ، عومەر و ، عەبباس و ، عەلیی و ، فەضلی کوڕی عەبباس و ، [227] ئەبوسوفیانی کوڕی حاریث و ، رەبیعەی کوڕی حاریث و ، ئەیمەنی کوڕی عوبەیدی خەزرەجیی [228] و ، ئوسامەی کوڕی زەید و، حاریثەی کوڕی نوعمان [229] .

لە کاتی تێك شکان‌دا پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ئەوانەی کە لە مەیدان ماون و هەڵ نەهاتوون پرسیار لە حاریثەی کوڕی نوعمان ئەکات ، ئەویش کە سەیری ئەم لاو ئەو لای ئەکات دایان ئەنیّ کە صەد کەس بن . رۆژێکیان حاریثە بە لای پێغەمبەردا ﷺ تیّ ئەپەڕیّ کە لەگەڵ جیبریل‌دا ، لە نزیك دەرگای مزگەوت‌دا ، فەرمایشتی ئەکرد . جیبریل فەرمووی : ئەی موحەممەد ! ئەمە کیّیە ؟ ئەفەرمویّ : حاریثەی کوڕی نوعمانە . جیبریل ئەفەرمویّ : ئەمە یەکێکە لە صەد کەسە ئارام‌گرەکەی رۆژی حونەین . ئەگەر سەلامی بکردایە وەڵامم ئەدایەوە . پێغەمبەر ﷺ ئەم هەواڵەی بە حاریثە گەیاند و ئەویش وتی : وام زانیی دیحیەی کەلبی‌یە لەگەڵت‌دا وەستاوە ..

---

[227] فەضلی کوڕی عەبباس ئامۆزای پێغەمبەری خوایە . بەشداریی فەتحی مەککەی کردووە و ، لە جەنگی حونەینیش‌دا یەکێك بووە لە دامەزراوان . ئامادەی حەجی ماڵئاواییش بووە و لە پاشکۆی پێغەمبەری خوادا بووە . زۆر جوان و پیّ کەوتوو بووە . فەرموودەشی گێڕاوەتەوە و ، ئامادەی شۆردنی پێغەمبەری خوا بووە . ئاوی ئەکرد بە دەستی ئیمام عەلیی دا .. لە شام لە رۆژی ( مرج الصفر ) دا شەهید بووە . ئەڵێن : لە ئەجنادین . ئەش‌ڵێن : بە تاعوونی عەمواس لە ساڵی ( ١٨ ) ی کۆچیی‌دا کۆچی دوایی کردووە .

[228] ئەیمەنی کوڕی عوبەید کوڕی ئوم ئەیمەنی بەخێوکەری پێغەمبەرە و ، برای دایکیی ئوسامەی کوڕی زەیدە . موجاهید و عەطاء فەرموودەیان لێیەوە ریوایەت کردووە . ئیبن ئیسحاق وتوویە : ئەیمەن لە جەنگی حونەین‌دا شەهید بووە .

[229] حاریثەی کوڕی نوعمان بەشداریی بەدر و ئوحود و خەندەق و هەموو جەنگەکانی کردووە . یەکیّ بووە لەو هاوەڵە پایەدارانەی کە جێی متمانە بوون لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ. رۆژی حونەین دامەزراو بوو . ئەم بوو کە جیبریل سەلامی لیّ کرد .. حاریثە بە عوثمانی کوڕی عەففان ئەڵێت : ئەگەر بتەویّ لەسەرت جەنگ ئەکەین . تا سەردەمی خەلافەتی موعاویە ژیاوە و ، دوای ئەوەی کە چاوی لە دەست ئەدا کۆچی دوایی ئەکات .

لە موعەممەری کوڕی راشیدەوە ، لە زوهەری‌یەوە ، لە عورروەوە ، لە عائیشەوە گێڕراوەتەوە کە جیبریل فەرموویە : خوای گەورە بۆتە کەفیلی رزقی خۆیان و ماڵ و منداڵیان لە بەهەشتدا . ( واتە ئەوانەی کە لە حونەین‌دا ئارامیان گرت ) .
عەبباسیش ئەی‌وت : ئەبوسوفیانی کوڕی حاریث یەکێ بوو لەوانەی کە خوا کەفیلیی رزقی خۆیان و ماڵ و منداڵیانی کرد لە بەهەشتدا .
لە بەرائی کوڕی عازیبەوە ( کە ئەویش یەکێ بووە لە ئارامگرانی حونەین ) رێوایەت کراوە کە وتوویە : بەو خوایەی کە جگە لە خۆی خوایەکی تر نیە پێغەمبەری خوا ﷺ پشتی هەڵ نەکرد ، بەڵکو داوای سەرکەوتنی کرد ، پاشان لەسەر وڵاغەکەی دابەزیی و ئەی‌فەرموو :

أنا النبيُّ لا كذب أنا ابن عبدالمطلب

شایانی باسە کە شەصت و حەوت کەس لەو صەد کەسە دامەزراوە ئەنصار و ، سیی و سێشیان موهاجیر بوون .
لەو ساتە ناسکانەدا پێغەمبەری خوا ﷺ لە خوا ئەپاڕایەوە :
(( أللهم لك الحمد وإليك المشتكى وأنت المستعان )) .[٢٣٠]

**پێنجەم : بەرەو سەرکەوتن**

دوای ئەوەی کە موسڵمانە تێك شکاوەکان گەڕانەوە مەیدانی جەنگ ، جەنگێکی یەکجار سەخت رووی دا .. هەوازین بەوپەڕی درپی و ئازایەتی‌یەوە ئەجەنگیی .. بەڵام کە موسڵمانەکان کۆبوونەوە ، هەڵوێستی هەوازین لە هێرشەوە گۆڕا بۆ بەرگریی کردن . ئەوەبوو موسڵمانەکان هێرشێکی سەختیان کردە سەر هەوازین ، کە هەوازین و هاوپەیمانەکانی هەوڵیان ئەدا دان بە خۆیاندا بگرن ، کەچیی بێ‌هوودە بوو ..
موسڵمانەکان ئەوەندە تووڕە بوو بوون ، هیچ شتێك بەرگەی هەڵمەتی ئەوانی نەئەگرت .. بە رادەیەك کە هەوازینیان لەبەردەمیاندا راتەماڵیی .. ئەوەندە تووڕەبوون خەریك بوو دەست بۆ کوشتنی منداڵەکانی هەوازین درێژ بکەن ، بەڵام پێغەمبەری خوا قەدەغەی کردن ، چونکە شەریعەت بە هیچ شێوەیەك رێ بە شتی وەها نادات .

---

[٢٣٠] غزوة حنين لباشميل : ١٣٤ ـ ١٦٢ .

لە هەمان کاتدا هەوازینیش جەنگێکی سەروماڵیی ناهەمواری ئەکرد .. هەندێ لە پیاوە دڕەکانی زۆرێك لە جەنگاوەرە موسڵمانەکانیان ئەکوشت .

بۆ نموونە مێژوونووسان باسی پیاوێکی هەوازین ئەکەن کە بەسەر وشترێکەوە بە ڕاست و چەپدا موسڵمانی ئەکوشتن ، ئەوەندەش بەلاّ بوو تا ئیمامی عەلیی و ئەبودوجانە ناچار بوون لەسەر کوشتنی یەك بگرن و لە ناوی بەرن .

ئەو کابرایە بەسەر وشترێکی سوورەوە بووە و ئاڵایەکی ڕەشی بە دەستەوە بووە و کردوویەتی بەسەر نووکی ڕمێکی درێژەوە . بە هەر کەسێ گەیشتووە کووشتوویە . ئەبودوجانە لەبەردەمیا ئەوەستێ و وشترەکەی ئەخات . دوای ئەوە عەلیی و ئەبودوجانە بەردەمی کابرا ئەگرن ، ئیمام دەستی ڕاستی کابرا ئەبڕێ و ئەبودوجانەش ئەوی تریان . پاشان هەردووکیان بە شمشێر دای ئەگرنەوە هەتا شمشێرەکانیان خوار ئەبنەوە . یەکێکیان واز ئەهێنێ و ، ئەوی تریان بە یەکجاریی ئەی کوژێ و ، واز لە کەل و پەلەکەی دێنن و ئەڕۆن . لەولاوە پاڵەوانێکی تری هەوازین کە ئاڵایەکی سووری بە دەستەوە ئەبێت دێتە ڕێی هەردووکیان . یەکێکیان دەستی ئەسپەکەی ئەقرتێنێ و ئەکەوێ بە دەمدا ، پاشان هەردووکیان کابرا دائەگرنەوە هەتا یەکجاری ئەکەن و واز لە کەل و پەلەکەی دێنن . کەچیی ئەبوطەلحە لەولاوە پەیدا ئەبێ و کەل و پەلی هەردوو کوژراوەکە بۆ خۆی هەڵ ئەگرێ .

لەم جەنگە سەختەدا پادشای هەوازین ، مالیکی کوڕی عەوف و هۆزەکەشی نەوەی نەصر جەنگێکی ئازایانەیان کرد ، بەڵام زۆرێك لەوانیش کوژرا ، بە ڕادەیەك کە خەریك بوو بە یەکجاریی تیا بچن . مالیك سەرنجی دا جەنگ تازە بۆ ئەو بێ هوودەیە. چونکە سوپای هەوازین بۆتە گەلاّ وشکەی بەردەمی ڕەشەبای سەخت .. موسڵمانەکان وەهایان بەو سوپایەی ئەو کردووە با بە دەواری شڕی نەکات .. لەبەر ئەوە هەر جەنگاوەرێکی هەوازین بگری ، جگە لە خۆدەربازکردن بیری لە هیچ شتێکی تر نەئەکردەوە ..

ئەوەبوو یەکێ لە نەوەی نەصر کە موسڵمان بوو بوو و ، ناوی عەبدوڵلای کوڕی قەیسی نەصریی بوو ، کە چاوی لە کوژرانی پیاوانی هۆزەکەی بوو ، هاواری لێ هەڵسا و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! نەوەی ڕوباب تیاچوون . ئەویش فەرمووی: (( أللهم اجبر مصيبتهم )) . فەرمووی : خوایە ئەو موسیبەتەیان بۆ ببژێریتەوە.

ئەبوقەتادەش باسێکی ئەو جەنگەی حونەین ئەکات کە چاوی لێ بووە موسڵمانێك و کافرێك جەنگاون و ، موشریکێکی تر ویستوویە یارمەتیی هاوەڵەکەی خۆی بدات ئەبوقەتادەش هەڵمەت ئەبات بە شمشێر دەستی ئەو کابرایە ئەقرتێنێ . کابرا ئەوەندە لێ‌هاتوو ئەبێ بە دەستە ساغەکەی ملی ئەبوقەتادە ئەگرێ و ، بەری نادا خەریك ئەبێ بی‌خنکێنێ . بەڵام لەبەر خوێن‌ڕۆیشتنی دەستە بڕاوەکەی ناچار شل ئەبێ و بەری ئەدا و ئەکەوێ و ئەبوقەتادە بە یەکجاریی ئەی‌کوژێ و ، لەبەر گەرمیی جەنگ بۆی ناکرێ کەل و پەلەکەی کابرا بۆ خۆی بەرێ ، بەڵام دوایی هەر دەستی ئەکەوێتەوە ..

دەربارەی جەنگی حونەین مێژوو نووسان دەریان بڕیوە کە خوای گەورە بە موعجیزە پشت‌گیریی سوپای ئیسلامی کردووە ، بەوەی کە ترس و لەرزی بردۆتە ناو دڵی دوژمنانەوە .

هەندێ لەو هاوەڵانەی کە ئامادەی حونەین بوون باسی ئەوەیان کردووە کە بە چاوی خۆیان ، لە کاتی جەنگ و کوشتاردا و بەر لەوەی هەوازین تێك بشکێت ، دیویانە شتێك بە وێنەی قوماشێکی ڕەش لە ئاسمانەوە بەر بۆتەوە و کەوتۆتە نێوان هەردوو سوپا . یەکێکیان ئەی‌گێڕایەوە کە مێروولە ڕەشەی بە ئاسمانەوە بە پڕاویی دیوە و شیوەکەی پڕ کردووە ، ئەو هاوەڵە لای یەقین بووە کە ئەوە مەلائیکەت بوون و ، ئەوەندەی پێ ناچێ هەوازین ئەشکێت ..

یەکێکی تر ئەگێڕێتەوە کە سیخوڕانی مالیکی کوڕی عەوف بە ترس و لەرزێکی بێ‌ئەندازەوە ئەگەڕێنەوە لای . لێیان ئەپرسێ : تیاچن ، ئەوە چیتانە ؟ ئەڵێن : پیاوی سپییمان دین بەسەر ئەسپی بەڵەکەوە . بەخوا خۆمان پێ نەگیرا و ئاوەهامان بەسەر هات.

هەندێکیش ئەو مێروولانەیان بە ئاسمانەوە بە وێنەی پەڵە هەور بەر چاو کەوتوون . ترس و لەرزی ئەو ڕۆژەش لە دڵی کافراندا بە وێنەی چەند دەنکە چەوێك لە ناو تەشتێك‌دا چۆن دەنگیان دێت ، وەها ناو سکیان دەنگی لێوە هاتووە .

لە هەمان کات‌دا ئەو مشتە چەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەو سوپای هەوازین هاویشتی یەك بە یەکی سەربازانیان بەشی خۆیان چەو و خۆڵ کەوتە چاویانەوە .

لە پێشەوە باسی شەیبەی کوڕی عوثمانی عەبدەرییمان [٢٣١] کرد کە هێشتا بە چاکیی ئیمانی نەهێنا بوو و لە کاتی شکستی موسڵمانەکان‌دا ویستی پێغەمبەری خوا ﷺ بکوژێت ، ئەمەش یەکێکە لە موعجیزەکانی پێغەمبەری خوا و بووە هۆی ئیمان هێنانی شەیبە .

شەیبە ئەکەوێتە گەل سوپای ئیسلام و بەرەو حونەین بەڕێ ئەکەوێ ، بەو نیازەی کە ئەگەر هەردوو سوپا تێکەڵ بوون هەلێك بە دەست بهێنێ و ، دەستێك لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووەشێنێ و ، تۆڵەی هەموو کوژراوانی قورەیش بسێنێ . لە ریوایەتێکی تردا وەهای دەرئەبڕێ کە تۆڵەی باوکی و مامەی وەربگرێتەوە کە لە ئوحوددا بە دەستی حەمزە یان عەلیی کوژرا بوون . شەیبە ئەوەندە داخ لە دڵ بوو ئەی‌وت : ئەگەر عەرەب و عەجەم هەر هەمووی شوێنی ئیسلام بکەوێ و تاقە پیاوێك نەمێنێ من شوێن موحەممەد ناکەوم .

کە خەڵکەکە تێکەڵ بوون و ، پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ئێسترەکەی دابەزیی ، شەیبە شمشێرەکەی لە کێلان دەرهێنا و لێی نزیك کەوتەوە و شمشێری بەرز کردەوە و خەریك بوو دای‌بێنێتەوە و پێغەمبەری ئازیز ﷺ بکوژێت . کەچیی لەو کاتەدا بە وێنەی بروسکە پارچە ئاگرێکی بۆ دێ کە خەریك ئەبێ لە ناوی بەرێ و ، لە ترسان‌دا دەست بە چاویەوە ئەگرێ و ، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی لێ ئەکات : (( یا شیبة ! أدنُ مني )) . فەرمووی : شەیبە ! لێم نزیك بکەوەرەوە . شەیبە لێی نزیك ئەکەوێتەوە و ، ئەویش ئاوڕێکی بۆ ئەداتەوە و زەردەخەنەیەك ئەکات و دەست بەسەر سنگی شەیبەدا دێنێ و پاشان ئەفەرموێ : (( أللهم ! أعذه من الشيطان )) . فەرمووی: خوایە ! لە داوی شەیتان پەنای بدە .

---

[٢٣١] شەیبەی کوڕی عوثمانی کوڕی ئەبوطەلحە لە نەوەی عەبدوددارە . نەوەی عەبدوددار لە دوای قوصەی هەڵ گری ئالای قورەیش بوون . باوکی شەیبەش لە جەنگی ئوحوددا لەگەڵ خزمەکانی‌دا هەڵگر و پارێزەری ئالای قورەیش بوون.. لە سەرەتای جەنگی ئوحوددا هەموویان بە شمشێری موسڵمانان کەوتنە زەویی و ئالای قورەیش شۆڕ بوویەوە و ، کەس نەما بەرزی بکاتەوە و ، قورەیش دەستیان دایە هەلاتن . پێغەمبەری خوا ﷺ کلیلەکانی کەعبەی دایە دەست شەیبە و عوثمانی کوڕی طەلحەی ئامۆزای . تا ئەمڕۆش کلیلی کەعبە بە دەست نەوەی شەیبەوەن . شەیبە فەرموودەی ریوایەت ئەکرد و ، ساڵی سیی و نۆی کۆچیی حەجی بە موسڵمانان کردووە . ئەمەش لە کاتی ناکۆکیی نێوان ئیمام عەلیی و موعاویەدا خوا لێ‌یان رازیی بێ کە هەر یەکەیان ئەی‌ویست خۆی ئەمیری‌حەج بێت ، شەیبە لە بری هەردوو لا حەجەکەی بەجێ هێنا . شەیبە لە ساڵی پەنجا و نۆی کۆچیی‌دا کۆچی دوایی کردووە ..

شەیبە ئەڵێت : دە بەخوا هەر ئەو سەعاتە ئەوم لە گوێم و چاوم و خۆمم خۆشتر ئەویست و ، هەرچییش دەربارەی ئەو لە دڵمدا هەبوو خوا لای برد .. پاشان فەرمووی: لێم نزیك بەرەوە و جەنگ بکە . منیش لە بەردەمی‌دا شمشێرم ئەوەشاند خوا چاك ئەزانێ پێم خۆش بوو بە گیانی خۆم لە هەموو شتێك بی‌پارێزم . خۆ ئەگەر باوکم زیندوو بوایە و لەو ساتەدا تووشی ببوومایە شمشێرم لێی نەئەگێڕایەوە . ئیتر ئەوەبوو منیش لەگەڵ ئەوانەدا بووم کە دەورەیان دابوو هەتا موسڵمانەکان گەڕانەوە و بە یەك دەست هەڵمەتیان ئەدا .. ئێسترەکەیم بۆ نزیك کردەوە و بە پێوە لەسەری وەستا و دوای کافرەکان کەوت هەتا بە هەموو لایەك‌دا پڕژان . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا هەر کەس توانای کوشتاری هەیە با لێیان بکوژێ . موسڵمانەکان دوایان کەوتن و خەریك بوو منداڵ بکوژن پێغەمبەر ﷺ لەوە قەدەغەی کردن .

شایانی باسە کە لە جەنگی حونەین‌دا ئافرەتە موسڵمانەکان رۆڵی بەرچاویان هەبوو . ئەوەبوو لەگەڵ سوپای ئیسلام‌دا چوار ئافرەتی ئەنصار بەشداریی جەنگیان کرد و لە کاتی شکست‌خواردنی موسڵمانەکان‌دا ئەوان لە خزمەتی پێغەمبەردا بە دامەزراویی مانەوە ، بە تایبەت ئوم عومارە نوسەیبەی کچی کەعب کە لە ئوحودیش‌دا دەوری پاڵەوانانەی بینیی .

نوسەیبە ئەگێڕێتەوە کە لەگەڵ سێ ئافرەتی تردا ، لە کاتی شکستی موسڵمانەکان‌دا ، شمشێرێکی بە بڕشتی بە دەستەوە بووە . سێ ئافرەتەکەی تریش یەکێکیان ئوم سولەیمی هاوسەری ئەبوطەلحەی ئەنصاریی بووە کە لەو کاتەدا سکی بە عەبدوڵلای کوڕیەوە پڕبووە و ، خەنجەرێکی بە لاتەنیشتیەوە هەڵواسیوە . یەکێکی تریان ئوم سولەیط [٢٣٢] و ئەوی تریشیان ئوم حاریث [٢٣٣] بوون .

ئەگێڕنەوە کە ئوم عومارە شمشێرەکەی لە کێلان دەرئەهێنا و ، هاواری ئەکردە ئەنصار و ئەی وت : ئەمە چ عادەتێکە ؟ چیتانە وا هەڵ دێن ؟ لەو کاتەدا چاوی بە پیاوێکی هەوازین ئەکەوێ بەسەر وشترێکی بۆرەوە کە ئالایەکی بە دەستەوە ئەبێ و وشترەکەی خستبووە دوای موسڵمانەکان . نوسەیبە رێی پێ ئەگرێ و بە شمشێر پاژنەی وشترەکە دائەگرێتەوە و ، ئەی‌خات بە پشت‌دا و ، هەڵمەت ئەداتە سەر

---

[٢٣٢] ئوم سولەیط : لە ( أسد الغابة ) دا هاتووە کە ئافرەتێك بووە لەوانەی بەیعەتیان داوە و رۆژی ئوحودیش بەشداریی کردووە . عومەری کوڕی خەططاب فەرموویە : رۆژی ئوحود کوندە ئاوی بۆمان ئامادە ئەکرد ..

[٢٣٣] ئەم ئافرەتەش ئەنکی عومارەی کوڕی غوزیەیە . لە هۆزی ئەنصار و نەوەی خەزرەجە .

پیاوەکە و بە شمشێر دای‌ئەگرێتەوە و ، شمشێرێکی لیٚ ئەستێنیٚ و وشترەکەشی هەر پرخەی ئەهات ، لەولاوە پێغەمبەری خواش ﷺ شمشێرەکەی بە دەستەوە بوو و ، کێلانەکەی فرِیٚ دابوو و ، بانگی ئەکردە شکست خواردووان .. دوای ئەوە هەردوو کورِەکەی نوسەیبە ، حەبیب و عەبدوڵڵای کورِانی زەید ئەگەرِێنەوە و چەند دیلێکی قۆڵ بەستراویان لەگەڵدا ئەبن . خەڵکەکە دیلیان ئەهێنایەوە ..

ئوم سولەیمیش کە ئەی‌دیی موسڵمانەکان چۆن مەیدانیان چۆڵ ئەکرد و هەڵ ئەهاتن غیرەتی ئەجۆشا . ئوم سولەیم هاوسەری ئەبوطەلحە کە حامیلەش بوو و وشتەکەی ئەبوطەلحەی پیٚ بوو و ، پشتوێنێکی توند و تۆڵی بەستبوو و ، خەنجەرێکیشی هەڵ گرتبوو ، تا هەر کافرێك لیٚی نزیك ببێتەوە ورگی بدرِیٚ .

ئوم سولەیم داوای لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد کە هەرچیی لە جەنگ هەلاتوون و پشتی ئەویان بەرداوە ، چاوپۆشی‌یان لیٚ نەکات ، بەڵکو بە وێنەی ئەو موشریکانەی کە لەگەڵیا ئەجەنگن بیان‌کوژێت .. بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ چاوپۆشیی پیٚ خۆش بوو دەرهەق بەو شکست خواردووانە .

لە راستیی‌دا موسڵمانە هەلاتووەکان لە حونەین‌دا نەبوونە هۆی شکستی ئیسلام بە یەکجاریی ، چونکە دوای ئەو شلەژان و راکردنەیان خێرا هاتنەوە سەر خۆیان و ، بە پەلە خۆیان گەیاندەوە مەیدانی جەنگ و ، پشتی سوپای شەیتانیان بە زەویی‌دا دا . بۆیە خوای گەورەش چاوپۆشیی لیٚ کردن وەك لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە :

﴿ لَقَدْ نَصَرَكُمُ اللَّهُ فِي مَوَاطِنَ كَثِيرَةٍ ۙ وَيَوْمَ حُنَيْنٍ ۙ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْئًا وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ الْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ أَنزَلَ اللَّهُ سَكِينَتَهُ عَلَىٰ رَسُولِهِ وَعَلَى الْمُؤْمِنِينَ وَأَنزَلَ جُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا وَعَذَّبَ الَّذِينَ كَفَرُوا ۚ وَذَٰلِكَ جَزَاءُ الْكَافِرِينَ ﴿٢٦﴾ ثُمَّ يَتُوبُ اللَّهُ مِن بَعْدِ ذَٰلِكَ عَلَىٰ مَن يَشَاءُ ۗ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ ( التوبة : ٢٥ ـ ٢٧ ) .

ئەوەشمان لە بیر نەچیٚ کە زانایان لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە هەلاتن لە جەنگ لە رۆژی بەدردا بە یەکیٚ لە گوناهە کەبیرەکان ئەژمێررِیٚ ، هەروەها لە جەنگی گەورەی رۆمدا لە ئاخرزەمان‌دا و ، کاتی هاتنی دەججالیش هەلاتن لە مەیدانی جەنگ بە گوناهی کەبیرە ئەژمێررِێن ..

بەڵێ ، کە هاوەڵان گەڕانەوە مەیدانی جەنگ هەر یەکەیان بووە شێرێك کە هیچ شتێ لەبەر دەمیا خۆی پێ نەئەگیرا .. بە وێنەی پڵنگ هەڵمەتیان ئەدا و هیچ کەس خۆی پێ نەئەگیرا لەبەر دەمیانا شمشێر بەرز بکاتەوە .. یەکێ لەوانە ئەبوطەلحەی ئەنصاریی بوو کە بە تەنیا خۆی لە بتپەرستانی هەوازین بیست و پێنج کەسی لێ کوشتن و کەل و پەلەکانیشی دەست خستن .

موسڵمانانیش زۆرێکیان لێ شەهید بوو و لێیشیان زامدار بوون ، بە تایبەتیی فەرماندەی ئەسپ سواران خالیدی کوڕی وەلید کە خوێنێکی زۆر لە زامەکانی ڕۆیشت و ، ئەوەندە بێهێز کەوت ناچار بوو پاڵ بە شت و مەکەکەیەوە بدات . ئەوەبوو دوای تێك شکانی کافرەکان پێغەمبەری خوا ﷺ بەناو موسڵمانان دا هات و چۆی ئەکرد و ئەیفەرموو : (( مَن یدلني علی رحل خالد بن الولید ؟ )) . ئەیفەرموو: کێ شوێنی کەل و پەلەکەی خالیدم پیشان ئەدات ؟

موسڵمانەکان پیشانیان دا و ، ئەبینێ وا لە تاو بێهێزیی پاڵی بە کەل و پەلەکەیەوە داوە . خێرا تفی موبارەکی دا لە زامەکەی و چاك بوویەوە .

سەرەنجام ، دوای جەنگ و کوشتارێکی زۆر هەوازین تێك شکان و صەدان کوژراویان لێ بەجێ ما و ، شەش هەزار مرۆڤیان لێ بە دیل گیران و ، دەست کەوتێکی یەکجار زۆریشیان لە چەك و مەڕومالات کەوتە دەست موسڵمانان ، کە لە سەردەمی پێغەمبەردا موسڵمانەکان دەستکەوتی وەها زۆریان دەست نەکەوتبوو . ئەوەبوو بیست و چوار هەزار وشتر و ، زیاتر لە چل هەزار سەر مەڕ و ، دەیان هەزار ئۆقیە زیو کەوتە دەست موسڵمانەکان .

هەرچیی نەکوژرا بوون و بە دیلییش دەست موسڵمانەکان نەکەوتبوون بەرەو دوا هەڵاتن ، بە تایبەت فەرماندەی گشتیی مالیکی کوڕی عەوف ، لەو چەم و شیوانەدا شپرزە بوون و ، لە ترسی گیانی خۆیان هۆشیان بەلای ژن و منداڵ و مەڕومالاتەوە نەما و هەموویان کەوتنە دەست موسڵمانەکان . ئەمە لێقەومانێك بوو تا ئەو ڕۆژە هیچ عەرەبێك شتی وەهای بە چاوی خۆی نەدیی بوو . ئەوەبوو دورەیدی کوڕی صوممە پێش ڕوودانی جەنگ لە مالیك پاڕایەوە کە ئەو نەخشەیەی هەڵەیە و با ڕۆژی وەها بەسەر هەوازین‌دا نەهێنێ . داوای لێ کرد ژن و منداڵ و و مەڕومالات بگێڕێتەوە بۆ شوێنە سەختەکانی وڵاتەکەیان . کەچیی مالیك بە گوێی نەکرد و ، قەدەری خوا وەهای هێنایە پێش دورەیدی کوڕی صومەی تەمەن صەد و شەصت ساڵە لە جەنگی

حونەین‌دا کوژرا و بە موشریکیی سەری نایەوە ، بەڵام مالیک ما و دوایش بە چاکیی موسڵمان بوو و رۆڵی گرنگی هەبوو لە جیهادی ئیسلامیی‌دا .

هەندێ لەوانەی کە لە ناو سوپای هەوازین‌دا بوون ، دوای موسڵمانبوونیان باسیان ئەکرد کە کەمینیان بۆ موسڵمانان داناوە و ، بە یەك هەڵمەت تەپیان کوتاوەتە سەریان و راویان ناون ، هەتا ئەگەنە لای پیاوێك کە سواری ئێسترێکی بۆر ئەبێت و ، چەند پیاوێکی سپیی دەم و چاو گەشاوەی بە دەوردا ئەبن . ئەفەرموێت : (( شاهت الوجوه ، إرجعوا )) . ئەوانیش تێك ئەشکێن و موسڵمانەکان راویان ئەنێن . لە ترساندا لەرزیان لێ دێ و ، خۆیان ئەگەیننە ناوچە بەرزەکانی وڵاتەکەیان و ، لە ئەنجامدا خوای گەورە خۆشەویستیی ئیسلام ئەخاتە دڵیانەوە .[٢٣٤]

**شەشەم : راونان و پەرتەوازەکردن**

دوای ئەوەی موسڵمانەکان بەسەر هەوازین‌دا سەرکەوتن ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بۆ سوپای ئیسلام دەرکرد تا شوێن سوپای پەرەگەندەی هەوازین بکەون و نەهێڵن هێز پێکەوە بنێنەوە . بەمە سوپای ئیسلام بە فەرماندایەتیی پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە طائیف کە لەوێ هۆزی ثەقیف - کە یەکێ لە باڵە گرنگەکانی هەوازین بوو - خۆی مەحکەم کردبوو و ، سوپای ئیسلام ئابڵووقەی دا ..

لە کاتی راونانی هەوازین‌دا لەلایەن سوپای ئیسلامەوە ، پیاوی بە ساڵاچووی شارەزای جەنگ و هەرا دورەیدی کوڕی صوممە کوژرا ..[٢٣٥]

دورەید لەبەر پیریی و پەككەوتنی لەسەر وشترێك و لەناو کەژاوەدا هێنرابوویە شیوی حونەین ، بەو هیوایەی کەڵك لە تاقیی‌کاریی رۆژگاری وەربگیرێ .. کە جەنگ گەرم بوو و هەوازین شپرزە بوو ، دورەید لە ناو کەژاوەدا بەبێ کەس مایەوە و وشترەکەی کوێرانە بە دەر و دەشت‌دا ئەسووڕایەوە ، هەتا ئەوەبوو گەنجێکی هۆزی سولەیم گەیشتە لای و جڵەوی وشترەکەی گرت ، بەڵام دورەیدی نەئەناسیی . کە دورەید پرسیاری لە گەنجەکە کرد و زانیی لە چ هۆزێکە ، گەنجەکە بە شمشێر دورەید

---

[٢٣٤] غزوة حنين لباشميل : ١٦٢ - ١٨١ .

[٢٣٥] دورەید کوڕی صوممەیە لە نەوەی جەشم و دایکیشی ناوی رەیحانەی کچی مەعدیکەریبەیە ، واتە خوشکی عەمری کوڕی مەعدیکەریبەی زوبەیدیی . دورەید برایەکی هەبووە بە ناوی عەبدوڵلا و لە سەردمی نەفامیی‌دا هێرش ئەباتە سەر عەبس و فەزارە و ئەوانیش هێرش دێنن و عەبدوڵلای کوڕی صوممە ئەکوژرێ و دورەید ئەبێتە سەرۆکی هۆزەکەی و، ئەویش هەڵمەت ئەباتە سەر عەبس و ذبیبان و صەد پیاویان لێ ئەکوژێ کە یەکێکیان بکوژی عەبدوڵلای برای بووە.

دائەگرێتەوە کەچیی کاری تیٚ ناکات . دورەید شمشێرەکەی خۆی پیشانی گەنجەکە ئەدا و هەندیٚ ئامۆژگاریی ئەکات و ، ئەڵێت : ئەگەر چوویتەوە بۆ لای دایکت پێی بڵێ دورەیدی کوڕی صوممەم کوشت . کە گەنجەکە ، کە ناوی رەبیعەی کوڕی رەفیعی سولەمیی بوو ، باسەکەی بۆ دایکی گێڕایەوە ، دایکی هەواڵی دایە کە ئەو پیاوە لە رۆژێكدا سیٚ دایکی ئەوی ئازاد کردووە و باوکیشی دوای بە دیل‌گرتنی ئازادی کردووە.

جا هەروەك دورەید خۆی شاعیر بوو ، عەمرەی کچیشی شاعیرە بوو ، بۆیە لە گلەیی رەبیعە و پیاوەتیی لەبەر چاو نەبوونی نەوەی سولەیمدا پارچە شیعرێکی رازاندەوە.

بەڵام مالیکی کوڕی عەوفی فەرماندەی گشتیی سوپای هەوازین ، کە بۆی دەرکەوت وا سوپاکەی شکستی خوارد و ، جەنگی بۆ ناکریٚ ، بە خۆی و کۆمەڵێك سوارچاکەوە کە فەرماندە و دەستەی ئەرکانی جەنگی بوون کشانەوە و مەیدانیان چۆڵ کرد و ، بە فەرمانی پێغەمبەری خوایش زوبەیری کوڕی عەووام بە خۆی و سوارەکانیەوە مالیکیان راو ئەنا ..

مالیك دوای تێك‌شکانی لەگەڵ چەند هاوەڵێکی ئەسپ سواری‌دا ئەچنە سەر بەرزایی‌یەك و فەرمان ئەدات بوەستن هەتا ماڵ و منداڵ و لاوازەکان تێپەڕ بکەن ، واتە بیان‌پارێزن . دوای ئەوە چەند پرسیارێکی لە هاوڕیٚکانی کرد و ، ئەوانیش هەواڵیان پیٚ دا ، تا ئەوەبوو وتی : چیی ئەبینن ؟ ئەوانیش هەواڵی پیاوێکیان بە ناونیشانەوە دایە ، وتی : ئەوە زوبەیری کوڕی عەووامە ، کوڕی صەفیەیە ، سوێندم بەخوا لە شوێنی خۆتان داتان ئەگریٚ ..

هەروایش بوو زوبەیر هەڵمەتی بردە سەر مالیك و هاوەڵانی و خەریك بوو گەمارۆویان بدات .. کە مالیك ئەوەی زانیی لەسەر ئەسپەکەی دابەزیی و لە ناو دار و درەخت‌دا خۆی حەشار دا نەوەکو بە دیلیی بکەوێتە دەست زوبەیر . هەروا لە ناو درەختەکان‌دا خۆی حەشار ئەدا و رای ئەکرد تا خۆی گەیاندە کۆشکی ( لیية ) .

کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی زانیی فەرمانی نەدا کەسێك دوای بکەویٚ ، یان تەنگی پیٚ هەڵ بچنیٚ . چونکە بە هیوای ئەوەبوو خوا هیدایەتی بدات .

هەروایش بوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێنەری تایبەتیی خۆی نارد بۆ لای مالیك و ، پێی راگەیاند کە ئەگەر موسڵمان ببیٚ چاوپۆشیی لیٚ ئەکریٚ و هەموو کەس‌وکار و سامانەکەی بۆ ئەگێڕرێتەوە . ئەوەبوو مالیکیش بە چاکیی موسڵمان بوو .

لە کاتی ڕاونانی سەربازە پەرەگەندەکانی هەوازین دا ، هەندێکیان لە شیوی ئەوطاس کۆبوونەوە و ، کەوتنە هەوڵی ئەوە سوپایەك ڕێك بخەنەوە تا بتوانن لەبەردەم موسڵمانەکان دا خۆیان بگرن .

کاتێك کە سوپای ئیسلام گەیشتە طائیف ، پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی کۆبوونەوەی هەندێ لە سەربازانی هەوازینی بەرگوێ کەوت لە شیوی ئەوطاس . بۆ ئەمە سریەیەك سەربازی موسڵمانی بە فەرماندایەتیی ئەبوعامیری ئەشعەریی[٢٣٦] ، کە مامەی ئەبوموسای ئەشعەریی[٢٣٧] بوو ، ڕەوانە کرد تا ئەو سەربازانەی هەوازین تەفروتوونا بکەن .

ئەبوعامیر ئاڵای هەڵ گرت و بەرەو شیوی ئەوطاس کەوتە ڕێ . لەوێ تووشی کۆمەڵێك لە هەوازین هات کە لە چەند شوێنێکی مەحکەمی شیوەکەدا خۆیان قایم کردبوو و بە تەمای جەنگ بوون . ئەم کۆمەڵە دە برایان لەگەڵدا بوون کە نۆیان یەك لە دوای یەك ئەهاتنە مەیدان و لەگەڵ ئەبوعامیردا ئەکەوتنە زۆرانبازیی و سەرەنجام هەر نۆیان بە دەستی ئەبوعامیر کوژران . هەر کامیان ئەهاتە مەیدان داوای زۆران بازیی ئەکرد و ئەبوعامیر ئەهاتە پێشەوە و بانگی ئەکرد بۆ سەر ئیسلام و ئەیشی وت : خوایە شاهێد بە لەسەری ، هەتا هەر نۆی کوشتن . کە سەرەی برای دەهەمینیش هات ئەویش هەڵمەتی دایە ئەبوعامیر و ، ئەبوعامیریش بانگی کرد بۆ موسڵمان بوون و ئەیشی وت : خوایە شاهێد بە لەسەری . وتی : خوایە شاهێدییم

---

[٢٣٦] ئەبوعامیر ناوی عوبەیدی کوڕی سەلیمی کوڕی حەضار بووە . یەکێ بووە لە گەورە هاوەڵان و زوو بە زوو موسڵمان بووە و ، بەلای ئیبن قوتەیبەوە یەکێکە لەوانەی کە بۆ حەبەشە کۆچیان کردووە . ئەڵێن چاوی کوێر بووە و دوایش چاك بۆتەوە ..

[٢٣٧] ئەبوموسا ناوی عەبدوڵلای کوڕی قەیسی کوڕی سەلیم بووە . ئەمیش زوو بە زوو موسڵمان بووە . سەرەتا لەگەڵ براکانی و کۆمەڵێك ئەشعەرییدا هاتبوونە مەککە و لەگەڵ سەرداری قورەیش ، ئەبوئوحەیحە سەعیدی کوڕی عاصی کوڕی ئومەییەدا پەیمانیان بەستبوو . موسڵمان ئەبێت و کۆچیش بۆ حەبەشە ئەکات . هەندێك ئەڵێن : کۆچی بۆ حەبەشە نەکردووە ، بەڵکو کاتێك کە جەعفەر و هاوەڵەکانی لە حەبەشەوە بە سوارییی دوو کەشتییەکە گەڕانەوە ئەبوموسای ئەشعەریی تووشیان ئەبێ و لەگەڵیان دێتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ ، کە ئەو کاتە لە خەیبەر بوو . عومەر کردوویەتە والیی بەصرە و ، ئامادەی کۆچی دوایی ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕڕاحیش بووە لە شام . فەرماندەیەکی ناودار بووە لەناو ئەو فەرماندانەی کە بەشداریی فەتحی شام و عێراقیان کردووە . لەگەڵ عومەری کوڕی سەعدی کوڕی ئەبووەققاص دا فەتحی حەڕڕان و نەصیبینی لە عێراق کردووە . هەروەها فەتحی ئەهواز و ئەصفەهانی کردووە . ئەبوموسا بەشداریی جەنگی نێوان هاوەڵانی نەکردووە و ، یەکێ بووە لەو دوو حەکەمەی کە بۆ نەهێشتنی ناکۆکیی خوێناویی نێوان ئیمام عەلیی و موعاویە هەوڵی دا . ئەبوموسا لە مەککەدا و لە ساڵی ( ٤٢ ) ی کۆچییدا و لە تەمەنی شەصت و سێ ساڵییدا کۆچی دوایی کردووە . هەندێکیش وتوویانە لە کووفە کۆچی دوایی کردووە .

لەسەر نەدەی . ئەبوعامیر دەستی لیێ کێشایەوە و ، کابراش لە دەستی دەرچوو و ، پاشان بە چاکیی موسڵمان بوو و ، هەرچیی جارێك پێغەمبەری خوا ﷺ بیدیایە ئەی فەرموو : (( هذا شريد أبي عامر )) . ئەی فەرموو : ئەمە هەڵاتووی دەستی ئەبوعامیرە .

لە کاتی جەنگدا پیاوێك تیرێکی گرتە ئەبوعامیر و دای لە ئەژنۆی . خێرا ئەبوموسا خۆی گەیاندە لای مامەی و پرسیی : مامە گیان ! کێ تیری تێ گرتی ؟ ئەویش ئاماژەی کرد بۆ لای کابرا . ئەبوموسا دوای کابرا ئەکەوێ و ئەیکوژێ و ، ئەگەڕێتەوە لای مامەی و تیرەکە دەرئەهێنێتەوە ، کەچیی ئاوی تیا دەرپەڕیی .

ئەبوعامیر وتی : کوڕی برام ! بچۆرە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامی پێ بگەیەنە و پێی بڵێ : داوای لیێ خۆش بوونم بۆ بکە .

ئەبوعامیر ئەبوموسا ئەخاتە شوێنی خۆی و ، دوای کەمێك بە شەهیدیی سەر ئەنێتەوە . ئەبوموسا ئەگەڕێتەوە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەچێتە ژوورەوە لای کە بەسەر قەرەوێڵەیەکی بە لم داپۆشراوەوە بوو و قوماشێکی بەسەردا درا بوو و ، لمی قەرەوێڵەکە چەقیبووە پشت و لاتەنیشتی . ئەبوموسا هەواڵی موسڵمانەکان و هەواڵی ئەبوعامیری ئەداتێ و ، داواکردنی لیێ خۆش بوونەکەشی بۆ باس ئەکات . خێرا داوای ئاو ئەکات و دەستنوێژ ئەگرێت و پاشان هەردوو دەستی بۆ ئاسمان بەرز ئەکاتەوە و ، ئەفەرموێ : (( أللهم ! اغفر لعبيد أبي عامر )) ، سپیایی بن باڵیشی دەرئەکەوێ . پاشان ئەفەرموێ : (( أللهم ! اجعله يوم القيامة فوق كثير من خلقك )). ئەفەرموێ : خوایە ! لە ڕۆژی قیامەتدا لە ژووری زۆرێك لە بەدیهێنراوانتەوە دای بنێ .

ئەبوموسا ئەڵێت : دەی داوای لیێ خۆش بوون بۆ منیش بکە . فەرمووی : (( أللهم! اغفر لعبد الله بن قيس ذنبه وأدخله يوم القيامة مدخلاً كريماً )) .

ئەگێڕنەوە لە جەنگی حونەیندا پیاوێك لە ناو سوپای ئیسلامدا جەنگێکی پاڵەوانانە ئەکات ، هەتا برینداریێکی زۆر ئەبێت . کە ئەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس ئەکەن ، ئەفەرموێ : (( من أهل النار )) . موسڵمانەکان بە لایانەوە سەیر ئەبێ. کەچیی کە برینەکان ناڕەحەتی ئەکەن لە تیردانەکەیدا تیرێکی دەرهێنا و خۆی پێ کوشتەوە . بۆ ئەمە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بەسەر بیلالدا دا تا جاڕ بدات

و بڵێ : تەنها ئیمان‌دار ئەچێتە بەهەشتەوە و ، بە پیاوی فاجیریش خوا پشت گیریی لە دین ئەکات .[٢٣٨]

**حەوتەم : ئابڵووقەدانی طائیف**

ئابڵووقەدانی طائیف بە بەشێك لە جەنگی حونەین لە قەڵەم ئەدرێ ، چونکە بەشی سەرەکیی سوپای هەوازین هۆزی ثەقیف بوون کە دانیشتوانی طائیف بوون . ئەمانە بڕبڕەی پشتی سوپای هەوازین بوون و ، هێزی سەرەکیی بوون لە جەنگی حونەین‌دا ، بە بەڵگەی ئەوە دوای سەرکەوتنی موسڵمانەکان لە حونەین‌دا هێزێکی ئەوتۆ نەما کە بتوانێ لەبەردەم موسڵمانەکان‌دا خۆی بگرێ جگە لە هۆزی ثەقیف ، کە ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو هێزێکی موسڵمانانی بە سەرکردایەتیی خۆی ڕەوانەی ناوچەی طائیف کرد بۆ ڕاونانی ثەقیف . کە گەیشتنە طائیف ثەقیف لە قەڵاکان‌دا خۆیان مەحکەم کردبوو . ئەوەبوو موسڵمانەکان بۆ ماوەی حەڤدە ڕۆژ ئابڵووقەی ثەقیفیان دا و سەرەنجام وازیان لێ هێنان ، تا ئەوەبوو خوای گەورە هیدایەتی دان و ، خۆیان بە پێی خۆیان هاتنە مەدینە و موسڵمان‌بوونی خۆیانیان ئاشکرا کرد .. ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ کە هێزی هۆزە هەوازینیەکان ـ جگە لە ثەقیف ـ هەر هەمووی تواوەتەوە ، بە تایبەت دوای موسڵمان‌بوونی سەردار و فەرماندەی گەنجیان مالیکی کوڕی عەوف و ، بوونی بە فەرماندەیەکی موسڵمانی لێ هاتوو .

ثەقیف لقێکی هەوازینە .. هەوازینیش کوڕی مەنصووری کوڕی عیکریمەی کوڕی خەصەفەی کوڕی قەیسی کوڕی عەیلانی کوڕی موضەری کوڕی نزاری کوڕی مەعدی کوڕی عەدنانە . واتە لە موضەردا لەگەڵ قوڕەیش بە یەك ئەگەن .

هەوازینیش بۆتە سێ هۆزی سەرەکیی کە هەموویان لە بەکری کوڕی هەوازین کەوتوونەتەوە ، کە ئەمانەن :

یەکەم : نەوەی سەعدی کوڕی بەکر .

دووهەم : نەوەی موعاویەی کوڕی بەکر، کە مالیکی کوڕی عەوفی نەصریی لەوانە.

سێهەم : نەوەی مونەببیهی کوڕی بەکر ، کە ثەقیف‌یش بەشێکە لەم هۆزە .

---

[٢٣٨] غزوة حنين لباشميل : ١٨٦ ـ ١٩٧ .

ثەقیف‌یش قەسیی کوڕی مونەببیهی کوڕی بەکری کوڕی هەوازین بووە . لەم قەسی‌یەش چەند هۆزێك کەوتوونەتەوە کە لەمەو دوا ناو نران ثەقیف . ئەمانە لە ناوچەی طائیف و دەوروبەری‌دا ئەژیان . ثەقیف لە سەردەمی نەفامیی‌دا هێزێکی جەنگاوەری ناودار بووە و هەمیشەش سەرکەوتوو بووە .

کاتێك کە ئیسلام هات ثەقیف ملیان پێ نەدا و هەتا ساڵی نۆهەمی کۆچیی موسڵمان نەبوون ، بەڵام لە بریی ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ دوعایان لێ بکات دوعای بۆ کردن تا خوا هیدایەتیان بدات و رایان بکێشێت بۆ سەر دینەکەی . لە پێشەوە باسی ئەوەمان کرد کە هۆزی ثەقیف عوروەی کوڕی مەسعوودی سەرداری نارد بۆ جەرەش لە شام تا لەسەر چەکی قورس مەشق بکەن و ئەو چەکانە دروست بکەن و بیان هێنن بۆ وڵاتی خۆیان تا بەرگریی لە خۆیان بکەن . جا ئەو نوێنەرانەی ثەقیف نەگەڕابوونەوە فەتحی مەککە و جەنگی حونەین روویان دا .

بەر لەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە حونەینەوە بەرەو طائیف بڕوا بۆ ئابڵووقەدانی هۆزی ثەقیف ، فەرمانی بەسەر طوفەیلی کوڕی عەمری دەوسیی‌دا[٢٣٩] دا تا روو لە قەومەکەی بکات و بتەکەیان کە ناوی ( ذو الکفین ) ە و بتی عەمری کوڕی حەمەمە بووە بشکێنێ و ، داوای کۆمەکیی لە هۆزی دەوس بکات تا پشتیوانیی لە سوپای ئیسلام بکەن و ، بە خۆی و خزمەکانیەوە لە طائیف پێی بگەنەوە.

طوفەیل بەر لەوەی بۆ شکاندنی بتەکە بکەوێتە رێ ، وتی : ئەی پێغەمبەری خوا! ئامۆژگارییم بکە . ئەویش فەرمووی : (( أفش السلام وابذل الطعام ، واستحي من الله کما یستحي الرجل ذو الهیئة من أهله ، إذا أسأت فأحسن )) ﴿ إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ۚ ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴾ ( هود : ١١٤ ) . ئەفەرموێ : سەلام لە خەڵك بکە و ، نان و خۆراك ببەخشە و ، وەك چۆن پیاوێکی ماقووڵ شەرم لە کەس وکاری ئەکات تۆش شەرم لە خوا بکە و ، ئەگەر خراپەیەکیشت کرد چاکەی بە دوادا بکە ، چونکە کردەوە چاکەکان کردەوە خراپەکان ئەسڕنەوە ..

---

[٢٣٩] طوفەیلی کوڕی عەمری دەوسیی شاعیرێکی بەڕێزی گوێ ڕایەڵیی‌کراو بووە لە ناو خزمەکانی‌دا . لە سەرەتای هاتنی وەحیی‌یەوە موسڵمان بووە . دوای ئەوەی کە موسڵمان بوو گەڕایەوە ناو خزمەکانی و بانگی کردن بۆ موسڵمان بوون و ، ئەوانیش موسڵمان بوون . طوفەیل لە جەنگی یەمامەدا بە شەهیدیی سەری ناوەتەوە و ، عەمری کوڕیشی زامدار بوو ، بەڵام لە زامەکەی چاك بوویەوە و ، ئەوەبوو لە سەردەمی خەلیفە عومەردا لە جەنگی یەرمووكدا شەهیدبوو بوو .

طوفەیل بە پەلە خۆی گەیاندەوە ناو خزمەکانی و بتەکەی شکاند و ، ئاگریشی بەردایە ناو کرۆکی یەوە .

خزمەکانی طوفەیل بە گوێیان کرد و ، چوارصەد پیاویان کەوتنە گەلی و خۆیان گەیاندە طائیف .

کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەو طائیف کەوتە رێ ، خالیدی کوڕی وەلیدی کردە فەرماندەی پێشەنگی سوپاکەی و ، دەلیلی شارەزای خستە پێشی سوپاوە بۆ رێ پیشان دان .

شایانی باسە کە عوروەی کوڕی مەسعوودی سەرداری ثەقیف و غەیلانی کوڕی سەلەمە ئامادەی جەنگی حونەین و ئابلۆوقەی طائیف نەبوون ، چونکە هەردووکیان لەو کاتەدا چووبوونە جەرەش بۆ کڕینی چەکی قورس .

سەرەتا سوپای ئیسلام شوێنێکی بێ کەڵکی بۆ سەربازگە هەڵ بژاردبوو و نزیکی قەڵاکانی ثەقیف بوو . ثەقیفیش لە حەربە و تیرهاویشتن دا زۆر لێ هاتوو بوون . هەر ئەوەندە سوپای ئیسلام باریان خست ، لەلایەن دوژمنەوە تیرباران کران و ، خەڵکێکی زۆر لە موسڵمانان زامدار بوون ، ناچار پێغەمبەری خوا ﷺ شوێنەکەی گۆڕیی . ئەمەش بە پرس و رای جەنگاوەری خاوەن تاقیی کاریی ئەنصاریی بە ناو بانگ حوبابی کوڕی مونذیر ، هەروەك لە رۆژی بەدردا سەربازگەی گواستەوە و ، لە رۆژی خەیبەریش دا شوێنەکەی گۆڕیی تا لە تیری جوولەکەی خەیبەر بە دوور بن . ئەوەبوو سەربازگەی موسڵمانانیش لە دەوری قەڵای طائیف کشاندەوە ، دوا بۆ شوێنێکی مەحکەم.

ئیمام واقیدیی وتوویە : پێغەمبەری خوا ﷺ رۆیشت لە نزیك قەڵای طائیف دا باری خست و ، لەوێ سەربازگەی دروست کرد . هەر ئەو ساتە کە بە خۆی و هاوەڵانیەوە باری خست ، حوبابی کوڕی مونذیر هاتە خزمەتی و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئێمە لە قەڵاکە نزیك کەوتووینەتەوە ، جا ئەگەر فەرمانە ئەوا تەسلیم ئەبین ، گەر بە را و بۆچوونیشە ئەوا با لە قەڵاکەیان دوور کەوینەوە . ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ بێ دەنگ بوو .

بەڵام سەرەنجام پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کردە حوباب و داوای لێ کرد شوێنێکی چاك بۆ سەربازگەیان هەڵ بژێرێ ، تا موسڵمانەکان لە تیری دوژمن سەلامەت بن ، ئەمەش دوای ئەوەی ژمارەیەك جەنگاوەری ئیسلام زامدار بوون .

دوای گواستنەوەی سەربازگە یەکێ لە موسڵمانە دێرینەکان کە یەزیدی کوڕی زەمعەی کوڕی ئەسوەد [٢٤٠] بوو بە سواریی ئەسپەکەی چووە پێشی خەڵکەکەوە و، داوای ئەمانی کرد لە ثەقیف هەتا بچێتە لایان و وت و وێژ بکەن . ئەمانیان پێ دا و، چووە پێشەوە ، بەڵام ناپاکی‌یان لەگەڵدا کرد و ، بە تیر لێیان دا و شەهیدیان کرد. ئەمە یەکەم شەهیدی موسڵمانان بوو لە ئابڵووقەی طائیفدا . بەڵام خوای گەورە نەی‌هێشت خوێنی یەزید بە زایە بڕوا . ئەوەبوو بکوژی ئەم شەهیدە کە ناوی هوذەیلی کوڕی ئەبوصەلت بووە ، برای شاعیری بەناوبانگ ئومەییەی کوڕی ئەبوصەلت ، لە قەڵاکە بۆ ئەنجامدانی کاری خۆی بە نهێنیی هاتە دەرەوە و ، وای ئەزانیی هیچ کەسێك لە موسڵمانان ئاگادار نیە . ئەوەبوو یەعقووبی کوڕی زەمعە و برای یەزیدی شەهید خۆی داگرتبوو و ، لە دەرگای قەڵاکەدا خۆی حەشار دابوو . کە هاتە دەرەوە بە دیل گرتی و هێنایەوە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەوە بکوژی براکەمە . پێغەمبەریش ماوەی دا و لە بری براکەی‌دا کوشتیەوە .

موسڵمانەکان چەند هەوڵێکیان دا بەڵکو بتوانن بچنە ناو قەڵا و سەنگەرەکانی ثەقیفەوە ، کەچیی بێ‌هوودە بوو .

ئەوەبوو سەرەتا مەنجەنیقیان بە کار هێنا بەو هیوایەی کە ثەقیف بترسن و ناچاری خۆ بە دەستەوەدان بن ، کەچیی قەڵاکان لەبەر سەختی‌یان بەو مەنجەنیقانە کاریان تێ نەکرا .

هەروەها دەستەیەك لە موسڵمانان لە پشتی دەبابەوە لە قەڵاکان نزیك کەوتنەوە ، بەو هیوایەی بگەنە لای دیواری قەڵاکان و کونیان تێ بکەن ، تا سوپای ئیسلام هێرش بکات و بچێتە ژوورەوە .

لەلایەکی ترەوە موسڵمانان دڕك و چقڵی بچوکی ئاسنینیان لە دەوری قەڵاکاندا پژاند تا ثەقیف چ پیادە و چ ئەسپ سوار بە ئاسانیی توانای هات و چۆیان نەبێت . ئەمەش بەو نیازەوە دوژمن نەتوانێ هێرش بکاتە سەر ئەو دەستە موسڵمانە خۆبەخشەی کە خۆیان گەیاندبووە لای دیواری قەڵاکان .

---

[٢٤٠] یەزیدی کوڕی زەمعە قوڕەیشی‌یە و ، دایکی ناوی قەریبەی کچی ئەبوئومەییەی مەخزوومی‌یە ، واتە خوشکی ئوم سەلەمەی دایکی ئیمانداران . کۆچی بۆ حەبەشە کردووە . فەرموودەشی گێڕاوەتەوە . لە سەردەمی نەفامیی‌دا جێی راوێژ بووە و ، هەر کارێك ئەو ئاگاداری نەبوایە قوڕەیش ئەنجامی نەئەدا ..

بەلام ئەوەبوو هەوڵی ئەو دەستە موسڵمانە سەری نەگرت ، چونکە سەربازانی ناو قەلاکان هەستیان پێ کردن و ، بەو چەکانەی کە ئاگریان ئەهاویشت هێرشیان کردە سەر موسڵمانەکان و ، ئەو دەبابانەیان سووتاند کە خۆیان دابووە پەنایان . بەمە موسڵمانەکان دەرکەوتن و ثەقەفی یەکان تیربارانیان کردن و هەندێ کوژراو و هەندێ زامداریان تێ کەوت و ، ناچار بوون بکشێنە دواوە .

شایانی باسە کە سەلمانی فارسیی[٢٤١] بوو ئاماژەی بۆ بەکارهێنانی مەنجەنیق کرد و ، پێغەمبەری خوایش ﷺ فەرمانی بەسەر سەلمان دا خۆی مەنجەنیقێك دروست بکات و ، طوفەیلی کوڕی عەمری سەرداری دەوسیش مەنجەنیقێك و دوو دەبابەی هێنان .

لە کاتی ئابلوقەدان دا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا جاڕ بدرێت بۆ بەندەکانی ثەقیف کە ئەگەر هەر بەندەیەك دابەزێت و بگاتە سەربازگەی موسڵمانان ئازاد ئەکرێت . بەم جاڕدانە دە و ئەوەندە پیاو خۆیان گەیاندە ناو موسڵمانەکان و ، ئازاد کران و ، هەریەکەشیان درایە لای پیاوێکی موسڵمان تا بەخێوی بکات و هەڵیشی بگرێ . فەرمانیشی دا قورئانیان پێ بلێن و سوننەتەکانیان پیشان بدەن . دوای ئەوەی کە ثەقیف موسڵمان بوون داوای بەندەکانیان کرد ، بەلام پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی نەگێڕانەوە چونکە ئەوانە تازە ئازاد کرا بوون و ، دوایش پیاوی چاکی لێ هاتوویان لێ هەڵ کەوت و خزمەتێکی باشی دینیان کرد .

لەم کاتەدا کە موسڵمانەکان لە بیری ئەوەدا بوون چۆن قەلای طائیف بگرن ، یەکێ لەوانەی کە بە دەم موسڵمان بوو بوو و ئیمان نەچووبووە ناو دڵیەوە کەوتە ناپاکیی کردن . ئەوەش عویەینەی کوڕی حیصنی فەزاری یە کە سەرداری غەطەفان بوو . ئەم

---

[٢٤١] سەلمانی فارسیی ، پێیشی ئەوترێ ( سلمان الخير ) مەولای پێغەمبەری خوا ﷺ بووە . دەربارەی ڕەچەڵەکی پرسیار لە سەلمان کرا ، ئەویش وتی : من سەلمانی کوڕی ئیسلامم . لە بنەڕەت دا خەڵکی ولاتی فارسە ، ناوچەی رام هورمز . لە ولاتی خۆیان ئاگرپەرست بووە و پاشان خوای گەورە هیدایەتی ئەدات و بە دوای دینی تەوحیددا ولاتی فارس بە جێ ئەهێڵێ و ولاتە و ولات ئەکات ، هەتا ئەگاتە مەدینە و ، لەوێ موسڵمان ئەبێ . سەلمان یەکێ بووە لە گەورە هاوەڵان و ، یەکجار زاهید و دنیانەویست بووە . پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەهلی بەیتی داناوە کە فەرموویە : (( سلمان منا أهل بيت )) . هەر سەلمان بوو هەڵکەندنی خەندەقی دەوری مەدینەی لە کاتی هێرشی سوپای ئەحزاب دا بۆ سەر مەدینە ، خستە بەرچاوی موسڵمانان . کاتێك کە والیی بوو لەسەر مەدائینی پایتەختی کیسرا مووچەکەی پێنج هەزار بوو هەر هەمووی بەسەر هەژاران دا دابەش ئەکرد و خۆی بە ئیشی دەستی ئەژیاند . ئەوەبوو تەیکەی ئەچنی و پێی ئەژیا .. سەلمان لە ساڵی سیی و پێنجی کۆچیی دا و ، لە سەردەمی خەلیفە عوثمان دا کۆچی دوایی کردووە ، دوای بەسەربردنی تەمەنێکی زۆر ..

پیاوه وەك لە باسی فەتحی مەککەدا باس کراوه ، ئەکەوێتـە گـەل سـوپای ئیسـلام و بەشداریی فەتحی مەککە ئەکات و ، بە نیازی دەستکەوتنی تالانیی ئەکەوێتـە گـەل سوپای موسڵمانان بۆ ئابڵووقەی طائیف .

ئەم پیاوه یەکێ بوو لەو سەردارانەی کـە لـە دوا رۆژەکـانی تەمـەنی پێغەمبـەری خوادا و لە سەرەتای خەلافەتی ئەبوبەکردا خەڵکی لە ئیسلام هـەڵ ئەگێڕایـەوه . لـە کاتی جەنگی پاشگەزبووەکان‌دا عویەینە بووە جێگری طولەیحـەی کـوڕی خوەیلیـدی ئەسەدیی کە داوای پێغەمبەرایەتیی ئەکرد و ، دژی موسڵمانەکان وەستان و جـەنگی بوزاخەی بەناوبانگیان ئەنجام دا و سەرەنجام موسڵمانەکان سەرکەوتن .

عویەینەی سەرداری غەطەفان و ئەقرەعی کوڕی حابیسی سەرداری نەوەی تەمیم ، لە کاتی فەتحی مەککەدا ئەم دیو و ئەو دیوی پێغەمبەری خوایان ﷺ گرتبوو . جا بـۆ دڵ راکێشانی عویەینە پێغەمبەری خوا ﷺ لە دەستکەوتەکانی حونەین صەد وشـتری پێ دا ، کەچیی هێشتا هەر ناپاکیی لێ دەرئەکەوت .

کاتێـك کـە ئابڵووقـەی طـائیـف درێـژەی کێشـا و بـۆ عویەینـە دەرکـەوت کـە موسڵمانەکان توانای گرتنی طائیفیان نیە ، داوای ماوەی لە پێغەمبەری خوا کرد تـا بچێ وت و وێژ لەگەڵ ثەقیف‌دا بکات . ئەویش مۆڵەتی دا و ، چوو بۆ لایـان و داوای مۆڵەتی کرد بچێتە ناویان و ئەوانیش مۆڵەتیان دا ..

کە لەگەڵیانا کۆ بوونەوه ، لە جیاتیی ئـەوەی بانگیـان بکـا بـۆ سـەر ئیسـلام و ئامۆژگاریی ئەوەیان بکات خۆیان بە دەستەوه بدەن ، کەوتە هان‌دانیـان لەسـەر خـۆ تەسلیم نەکردن و ، بۆی باس کردن کە موسڵمانەکان توانای مانـەوەی زۆریـان نیـە . دەریشی بڕیی کە بەو دامەزراوی‌یەی ئەوان زۆر دڵ خۆشە .

پێی وتن : دایك و باوکم بە قوربانتان بێت ، بەخوا ئـەوەی بـە ئێـوەوه ئـەی‌بینم شادمانی کردووم . بەخوا لە عەرەب‌دا وێنەی ئێوه نیە . بـەخوا هـەرگیز موحەممـەد تووشی هاووێنەی ئێوه نەبووه . لە مانەوه بێزار بووه . لە قەڵاکەتان‌دا دامەزراو بن ، چونکە قەڵاکەتان مەحکەمـە و ، چـەکتان زۆرە و ، ئاوتـان نابڕێـت . پاشـان هاتـە دەرەوه و گەڕایەوه ناو سوپای موسڵمانان .

کە گەیشتەوه ناو سوپای ئیسلام هەوڵی دا بە درۆ هەڵ بەستن چەواشەیان بکـات ، کە گوایە چووه ئامۆژگاریی ثەقیف بکـات تـا خۆیـان بـە دەسـتەوه بـدەن ، چونکە پێغەمبەر تا قەڵاکانیان نەگرێت دەست بەرداریان نابێت .

بەلاّم پێغەمبەری خوا ﷺ ، دوای ئەوەی کە خوای گەورە لە کار و گوفتاری عویەینە ئاگاداری کرد ، دای بە ناوچاوی عویەینەدا کە درۆ ئەکات ..

لە عویەینەی پرسیی و فەرمووی : (( ما قلت لهم ؟ )) .

وتی : وتم : وەرنە سەر دینی ئیسلام ، بەخوا موحەممەد ئەم ولاّتەتان چۆڵ ناکات هەتا تەسلیم نەبن ، بۆ خۆتان ئەمان وەربگرن .. پێش ئێوە ئەو چووەتە سەر قەلاّی تر: قەینوقاع و ، نەضیر و ، قورەیظە و ، خەیبەر کە خاوەنی چەك و تفاق و سەنگەر بوون، کەچیی ئەوانە فریایان نەکەوتن .. پێغەمبەری خوا ﷺ بێدەنگ گوێی گرت بوو، تا کە لە درۆکانی بوویەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو : (( كذبت ، قلت لهم كذا و كذا )) . فەرمووی : درۆت کرد . فلاّن شت و فیسار شتت پێ وتن ، بەو شتانەی کە عویەینە وتبوونی . ئیتر عویەینە هیچی پێ نەوترا ئەوەنەبێ وتی : داوای لێ خۆش بوون لە خوا ئەکەم .

عومەری کوڕی خەططاب خوا لێی رازیی بێ غیرەتی جوولاّ و داوای لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد کە لێی بگەڕێ تا عویەینە بێنێتە پێشەوە و لە گەردنی بدات . بەلاّم پێغەمبەری خوا ﷺ بە گوێی عومەری نەکرد ، بەڵکو فەرمووی : (( لا يتحدث الناس أني أقتل أصحابي )) . فەرمووی : با خەڵکیی نەڵێت موحەممەد هاوەڵانی خۆی ئەکوژێت.

ئەبوبەکریش بەو نەرم و نیانیی‌یەی خۆیەوە رووی کردە عویەینە و لەسەر ئەو کردەوە سووکەی پێی فەرموو : عویەینە ! تیاچیت . تۆ هەر خەریکی ناڕەوایت . چەند بە دەستتەوە گیرمان خواردبوو کە لە جەنگی ئەوەی نەضیر و قورەیظە و خەیبەردا خەڵکت ئەهێنایە سەرمان و بە شمشێرەکەت لەگەڵماندا ئەجەنگایت ، پاشان وەك دەری ئەبڕیی موسڵمان بوویت و ئەچی دوژمنان لێ هەڵ ئەنێیت ؟

وتی : ئەبوبەکر ! داوای لێ خۆش بوون لە خوا ئەکەم و تەوبە ئەکەم و هەرگیز شتی وەها دووبارە ناکەمەوە .

عویەینەی بێمێشك دوای کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ جارێکی تر لە ئیسلام هەڵ گەڕایەوە و ، فەرماندایەتیی یەکەم سوپای لە ئیسلام هەڵ گەڕاوەی ئەکرد و دژی ئیسلام ئەجەنگا و ، هەوڵی ئەوەی ئەدا مەدینەی پایتەخت داگیر بکات، چونکە ئەی‌زانیی زۆربەی سوپای ئیسلام لەوێ نیە و بە سەرکردایەتیی ئوسامەی کوڕی زەید بەرەو شام رەوانە کراوە. بەلاّم خەلیفەی یەکەم بە کۆمەکیی هۆزی موزەینەی پاڵەوان توانیی ئەو هێرشە پەرچ بداتەوە و عویەینەی نامەرد سەر شۆڕ بکات .

کاتێکیش کە جەنگی بوزاخەی سەخت لە نێوان موسڵمانەکان بە سەرکردایەتیی خالیدی کوڕی وەلید و ، لە نێوان طولەیحەی کوڕی خوەیلیدی ئەسەدیی رووی دا ، عویەینە فەرمانددەی گشتیی سوپای غەطەفان و ، جێگری طولەیحەی فەرماندەی گشتیی سوپای پاشگەزبووان بوو .

لەو جەنگەدا عویەینە بە دیل گیرا و هێنرایەوە بۆ مەدینە و ، منداڵە وردەڵەی مەدینە دوای کەوتن و بۆ سووکایەتیی پێ کردن ئەیان وت : ئەمە لە ئیسلام پاشگەز بۆتەوە . ئەویش پێی ئەوتن : بەخوا ئیسلام بەر دڵم نەکەوتووە تا لێی دەرچم.

هەندێك ئەڵێن : عویەینە وەك سەرۆکێك لە سەرۆکە پاشگەزبووەکان لە سێدارە دراوە و ، هەندێکیش ئەڵێن : دوای ئەوەی کە خەلیفە ئەبوبەکری صددیق چاوپۆشیی لێ کرد بە باشیی موسڵمان بۆتەوە و ، تۆبەی کردووە . خوا خۆی چاك ئەزانێ.

لە کاتی ئابڵوقەی طائیفدا فەرماندەی گشتیی ئەسپ سواران ، خالیدی کوڕی وەلید هاتە پێشەوە بۆ نزیکی قەڵاکان و، بانگی کردە دانیشتوانی ناو قەڵاکان با پاڵەوانێکیان بێتە دەرەوە بۆ زۆرانبازیی . کەچیی کەسێکیان نەهاتە دەرەوە ، بەڵکو خۆیان حەشار دا و ، سەرەنجام عەبدیالەیلی سەرداری ثەقیف بانگی کردە خالید کە هیچ کەس ئامادەی زۆرانبازیی نیە ، بەڵکو لە قەڵاکەیاندا بۆ خۆیان دائەنیشن ، چونکە بەشی چەند ساڵێك خۆراکیان بەلاوە هەیە . جا ئەگەر موسڵمانەکان دان بە خۆیاندا ئەگرن تا ئەو زەخیرەیە تەواو ببێ ، ئەو کاتە ئەوانیش هەر هەموویان بە خۆیان و شمشێریانەوە دێنە دەرەوە تا کوژرانی دوا پیاویان ئەجەنگن .

کە هیچ رێگایەك دادی نەدا و طائیف خۆی نەدا بە دەستەوە و لە هەمان کاتدا کۆمەڵێك هاوەڵیش شەهید کران ، لە ناچارییدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا بە بڕینی دارمێوەکانی ثەقیف و لە ناوبردنی کشت وکاڵیان .

کاتێك کە سوفیانی کوڕی عەبدوڵڵای ثەقەفیی ئەوەی دیی هاواری کرد : ئەی موحەممەد ! بۆچیی باخ و باخاتەکان ئەبڕیت ؟ یان ئەیبەیت بۆ خۆت ئەگەر سەرکەوتی، یان لەبەر خاتری خوا و سیلەی رەحم دەستی لێ هەڵ ئەگری ، وەك خۆت ئەڵێیت . [٢٤٢] پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ : (( فإني أدعها لله والرحم )) .

---

[٢٤٢] دایکی ئامینە بەڕڕەی کچی عەبدولعوززای کوڕی قوصەی بووە . دایکی بەڕڕەش ئوم حەبیبی کچی ئەسعەد بووە ، دایکی ئەویش بەڕڕەی کچی عەوف بووە ، دایکی ئەویش قەللابەی کچی حاریث بووە ، دایکی قەلابەش هیندی کچی یەربووع بووە لە هۆزی ثەقیف.

ثەقیف باکیان لە ئابلۆوقە نەبوو ، چونکە زەخیرەیان زۆر بوو و ، کانیاوی چاکیشیان لەبەر دەستدا بوون ، بەلام موسلمانەکان لەو دەشتەدا لەبەردەم تیر و چەکی دوژمندا بوون . قەلاکانیش بە هیچ شتێ چار نەئەکران چونکە بەرز و سەخت بوون و خەلکەکەش چەکی زۆریان بەلاوە هەبوو . بەلای هەندێکەوە پانزە و بە لای هەندێکی ترەوە بیست رۆژ قەلای طائیف لە ژێر ئابلۆوقەدا بوو و ، لەو ماوەیەدا دوانزە هاوەلێش شەهید بوون بەرامبەر بە دوو کوژراوی ثەقیف .

دوای بەسەر چوونی ئەو ماوەیە پێغەمبەری خوا ﷺ راوێژی بە گەورە شارەزا و راوێژکارانی کرد دەربارەی گەڕانەوە دوای سوپای ئیسلام . وت و وێژەکە بەوە کۆتایی هات کە ئابلۆوقەدانی ثەقیف کەلکی نیە و ، وا چاکە سوپای ئیسلام لە ثەقیف بگەڕێ تا بەلکو خوا دلیان نەرم بکات و بە ویستی خۆیان ئیمان بهێنن .

هەندێ ریوایەتیش وەهای دەرئەخەن کە خوای گەورە ماوەی موسلمانانی نەداوە بە زۆری چەك بچنە ناو قەلاکانیانەوە ..

کە عومەر ئەمەی بەر گوێ کەوت داوای لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد تا ماوەی بدا جاڕ بدا تا سوپای ئیسلام بۆ گەڕانەوە خۆیان ئامادە بکەن .

هەروەها ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ خەوێك ئەبینێ و ، وەهای تەفسیر ئەکات کە بەم ئابلۆوقەدانەی کەلکی دەست گیر نابێ . کورتەی خەوەکەش بەم شێوە ئەبێت کە پێغەمبەر ﷺ بە ئەبوبەکر ئەفەرموێ : (( إني رأيتُ أني أهدِيتْ لي قعبة مملوءة زبداً ، فنقرها ديك فأهرق ما فيها )) . فەرمووی : لە خەومدا جامێك پڕ لە کەرەم پێشکەش کرا . کەچیی کەلەشێرێك کونی تێ کرد و هەرچیی تێدا بوو ڕژاندی. ئەبوبەکر فەرمووی : وا نازانم ئەوەی ئەمڕۆ ئەتەوێ ، لێیانەوە دەست گیرت ببێ ، ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەویش فەرمووی : (( وأنا لا أرى ذلك )) .

مێژوونووسان باسی ئەوەشیان کردووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ئابلۆوقەی طائیف راوێژی بە شارەزای خاوەن تاقییکاریی نەوفەلی کوڕی موعاویەی دیلیی کردووە ، کە پێی فەرمووە : (( ما تقول أو ما ترى في المقام عليهم ؟ )) . نەوفەلیش وتوویە : ئەی پێغەمبەری خوا ! رێوییەك لە کونێکدا بێت ئەگەر لەسەری بوەستی دەستی ئەخەیت و ، گەر وازیشی لێ بهێنی زیانێکت پێ ناگەیەنێ .

هەندێ لە موسڵمانان بە کشانەوە لە قەڵای طائیف نارازیی بوون ، بۆیە خۆیان گەیاندە لای ئەبوبەکر و عومەر بەڵکو دادی نارەزاییان بگەیەننە لای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی لە طائیف نەکشێتەوە هەتا تەسلیم بن .

ئەبوبەکر و عومەر خوا لێیان رازیی بێ هەوڵیان دا ئەو نارازی‌یانە قەناعەت پێ بکەن کەچیی لە رای خۆیان دانەبەزین . پێغەمبەری خوایش ﷺ توورە نەبوو و نارەزایی دەرنەبڕیی . بەڵکو فەرمانی دەرکرد تا هێرش بکرێتە سەر ثەقیف . ثەقیف بە تیر موسڵمانەکانیان داگرتنەوە و کۆمەڵێکیان لێ زامدار بوون و هیچ پێشکەوتنێکیشیان بە دەست نەهێنا . بەمە نارازی‌یەکان قەناعەتیان کرد کە وا چاکە سوپای ئیسلام بکشێتە دواوە .

مێژوونووسان گێڕاویانەتەوە کە کاتێ پێغەمبەر ﷺ ویستی سوپای ئیسلام بکشێنێتە دواوە و ئابلووقە لەسەر طائیف هەڵ بگرێ، بە هاوەڵانی فەرموو: « قولوا: لا إله إلا الله وحده ، صدق وعده ونصر عبده ، وهزم الأحزاب وحده » . فەرمووی: بڵێن : جگە لە زاتی « الله »هیچ خوایەکی تر نیە تاك و تەنیایە .. بەڵێنی خۆی بردە سەر و بەندەکەی سەرخست و ، خۆی بە تەنیا هەر هەموو کۆمەڵە نەفامەکانی تێك شکاند.

کە سواربوون و کەوتنە رێ ، فەرمووی : «آئبون إن شاء الله ، عابدون ، لربنا حامدون ».

ئیبن کەثیریش ریوایەتی کردووە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ کە ثەقیف بە جێ ئەهێڵێ دوعای هیدایەتیان بۆ ئەکات کە ئەفەرموێ : «أللهم اهدهم واكفنا مؤونتهم» .

لە ئابلووقەی طائیفدا لە هۆزی ثەقیف تەنها دوو پیاو کوژراون . بەڵام لە موسڵمانەکان دوانزە پیاو بە تیری ثەقیف شەهید بوون ، کە نۆیان لە موهاجیر و سیانیان لە ئەنصار بوون ، بەم شێوەیە :

| | |
|---|---|
| ١ ـ سەعیدی کوڕی سەعیدی کوڕی ئومەییە | ئومەویی |
| ٢ ـ حەبیبی کوڕی عەبدمەنافی کەنانیی | ئومەویی بە هاوپەیمانیی |
| ٣ ـ یەزیدی کوڕی زەمعەی کوڕی ئەسوەد | ئەسەدیی |
| ٤ ـ عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکری صدديق ، زامدار بوو و لە مەدینە کۆچی دوایی کرد . | تەیمیی |

| | |
|---|---|
| ٥ ـ عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوئومەییەی کوڕی موغیرە | مەخزوومیی |
| ٦ ـ عەبدوڵڵای کوڕی عامیری کوڕی رەبیعە | عەدەویی بە هاوپەیمانیی |
| ٧ ـ سائیبی کوڕی حاریثی کوڕی قەیس | سەهمیی |
| ٨ ـ عەبدوڵڵای کوڕی حاریث | سەهمیی |
| ٩ ـ جولەیحەی کوڕی عەبدوڵڵا | سەعدیی لەیثیی |
| ١٠ ـ ثابیتی کوڕی جەذەع | ئەنصاریی |
| ١١ ـ حاریثی کوڕی سەهل | ئەنصاریی |
| ١٢ ـ مونذیری کوڕی عەبدوڵڵا | ئەنصاریی |

لە گەڕانەوەی سوپای ئیسلامدا چەند رووداوێك روویان دا :

ئەبورەهمی غیفاریی ئەگێڕێتەوە کە لە طائیف ئەگەڕێنەوە لە تەنیشتی پێغەمبەری خوادا ﷺ بەسەر وشترێکیەوە ئەڕۆیشت و ، جووتێك نەعلی ئەستووریشی لە پێدا بوون . وشترەکەی ئەم زۆر بۆ وشترەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ دێنێ لاتەنیشتی نەعلەکەی ئەکەوێتە سەر قاچی پێغەمبەر و ئازاری پێ ئەگەیەنێ . پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ : (( أوجعتني ، أخر رجلك )) . فەرمووی : ئازارت پێم گەیاند ، قاچت بەرە بەولاوە . قامچییەکیشی دا لە قاچی .

ئەبورەهم سامی لێ ئەنیشێ و ئەترسێ دەربارەی ئەو رەفتارەی قورئان بێتە خوارەوە ، بۆیە کە ئەگەنە ( جیعیرانە ) بێ ئەوەی سەرەی ئەو بێت ئەچێت بۆ وشتر لەوەڕاندن ، نەوەکو پێغەمبەری خوا ﷺ بنێرێ بە دوایدا . کە ئەگەڕێتەوە ئەڵێن : پێغەمبەری خوا ﷺ داوای کردی . ئەویش بە ترسێکەوە ئەڕواتە خزمەتی . ئەفەرموێ : (( إنك أوجعتني برجلك فقرعتك بالسوط ، فخذ هذه الغنم عوضاً من ضربتي )) . فەرمووی : تۆ بە قاچت ئازارت پێم گەیاند و منیش بە قامچییەکە لێم دایت . جا ئەم مەڕانە لە جیاتی لێدانەکەم وەربگرە .

ئەبورەهم ئەڵێت : رەزامەندیی ئەو لە هەموو دنیا و هەرچیی وا تێدا بە لامەوە خۆشەویستتر بوو .

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوحەدرەدی ئەسلەمییش لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ئەبێت. کە لە طائیف ئەگەڕێنەوە وشترەکانیان ئەنووسێن بە یەکەوە . جا چونکە

وشترەکەی عەبدوڵلاّ بەهێزتر ئەبێت ، ئەی‌ویست دووری بخاتەوە بۆی دوور نەئەخرایەوە و ئازاری قاچی پێغەمبەری داو فەرمووی : (( أخ ، أوجعتني )) . فەرمووی : ئاخ ، ئازارت پێم گەیاند . بە گۆچانەکەی دەستی پاڵ بە قاچیەوە ئەنێت و بۆ ماوەی سەعاتێك هیچ فەرمایشتێك ناکات و ، عەبدوڵلاّش ترسی لێ ئەنیشێ کە هەڕەشەی لەسەر بێتە خوارەوە . ئەو رۆژە نۆرەی وشتر لەوەڕاندنی نابێت کەچیی بۆ خۆشاردنەوە ئەچێ بۆ لەوەڕاندنیان . کە نیوەڕۆ ئەگەڕێتەوە پێی ئەڵێن پێغەمبەری خوا ﷺ داوای ئەکردیت. ترسی لێ ئەنیشێ و بە ترس و لەرزێکەوە ئەڕواتە خزمەتی ئازیز ﷺ و ئەبینێ زەردەخەنە ئەکات بۆی . فەرمووی : (( أوجعتك بمحجني البارحة )) . فەرمووی : دوێنێ بە گۆچانەکەم ئازارم دایت . پاشان فەرمووی : (( خذ هذه القطعة من الغنم )) . فەرمووی : ئەم برە مەڕە ببە بۆ خۆت . منیش مەڕەکانم هێنان ئەبینم هەشتا سەر مەڕی نەپاچراوەن .

ئەبوزەرعەی جوهەنییش لە نزیکی پێغەمبەرەوە ئەبێت لە کاتی سواربوونی وشتردا و، قامچیی لە پشتی وشترەکە ئەدات و نازانێ بەر ئەبوزەرعە ئەکەون ، تا ئاوڕ ئەداتەوە و پرسیاری لێ ئەکات و ئەفەرموێ : (( أصابك السوط ؟ )) . ئەفەرموێ : قامچییت بەرکەوت ؟ ئەویش ئەڵێت : بەڵێ ، دایك و باوکم بە قوربانت بن .

کە ئەگاتە جیعررانە ئەبینێ وا کۆمەڵێك مەڕ کەنار دراون . پرسیاری ئەو مەڕانە ئەکات و کە هەواڵی ئەدەنێ ، بانگ ئەکات : (( أين أبو زرعة ؟ )). ئەویش ئەڵێت : تا ئەوەتام لێرە . فەرمووی : ((خذ هذه الغنم بالذي أصابك من السوط أمس)) . فەرمووی : ئەو مەڕانە بەرە لە جیاتی ئەو قامچی‌یانەی کە دوێنێ بەرت کەوتن .

ئەبوزەرعە سەیر ئەکا مەڕەکان صەد و بیست سەر مەڕن .

لە باسی کۆچ‌کردن‌دا باسی سوراقەمان کرد کە چۆن ویستی پێغەمبەری خوا ﷺ دەست‌گیر بکات بۆ وەرگرتنی خەلاّتەکەی قورەیش ، بەلاّم خوای گەورە ماوەی نەدا و تۆبە و پەشیمانیی نواند و ، داواشی کرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ شتێکی بۆ بنووسێ بۆ رۆژی پێویست . ئەویش فەرمانی دا ئەبوبەکر لەسەر دەفەی شانی وشترێك شتێکی بۆ بنووسێ . چەند ساڵ تێپەڕین و دوای ئابلّووقەی طائیف سوراقە نووسراوەکەی هێنا و نواندی.

سوراقە ئەڵێت : لەو کاتەدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە طائیفەوە بەرەو جیعررانە ئەگەڕایەوە ، بە خزمەتی گەیشتم . خۆم رێك و پێك کرد و ، خەڵکییش کۆمەڵ

کۆمەڵ لەبەر دەمیەوە ئەڕۆیشتن و ، منیش کەوتمە ناو کۆمەڵێك ئەسپ سواری ئەنصارەوە . بە رمەکانیان دەستیان بە لێدانم کرد و ، ئەیان وت : خۆت لادە ، خۆت لادە تۆ کێیت ؟ نەیان ئەناسییم . کە نزیك کەوتمەوە و زانییم پێغەمبەر ﷺ دەنگم ئەبیستێ ، ئەو نووسراوەم دەر هێنا کە ئەبوبەکر بۆمی نووسیی و ، خستمە نێوان هەردوو پەنجەمەوە و ، دەستم بەرز کردەوە و ، بانگم کرد : من سوراقەی کوڕی مالیکی کوڕی جەعشەمم و ، ئەمەش نووسراوەکەمە .

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( یوم وفاء ، أدنوه )) . فەرمووی : ئەمڕۆ ڕۆژی وەفایە ، نزیکی بخەنەوە . نزیکیان خستمەوە . کە سەیری قاچی پێغەمبەری خوام ئەکرد ، لە ناو تەقەڵی جلەکانیەوە ئەتوت ناوکرۆکی خورمایە ( لە سپێتیی دا ) . کە گەیشتمە لای سەلامم لێ کرد و ، هەرچیی زەکاتم هەبوو هێنام بۆی . ئیتر هیچم بە بیردا نەهات پرسیاری لێ بکەم ئەوە نەبێ وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ! من حەوزەکانم بۆ وشترەکانم پڕ لە ئاوکردوون و وشتری گومبوویش دێن و لەو ئاوە ئەخۆنەوە ، ئایا ئەگەر ئاویان بدەمێ خەیرم ئەگات ؟ فەرمووی : (( نعم في کل ذات کبد حَرَّی أجر )). فەرمووی : بەڵێ ، ئاودانی هەموو گیانلەبەرێك پاداشتی هەیە .

لە کاتی گەڕانەوەی پێغەمبەردا ﷺ پیاوێك لە هۆزی ئەسلەم هاتە ڕێی کە هەندێ مەڕی پێ بوون و ، پێغەمبەریش بەسەر وشترەکەیەوە بوو ، وتی :

ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەمە دیاری‌یە و پێشکەشی تۆم کردووە . فەرمووی: (( وممن أنت ؟ )) فەرمووی : لە چ هۆزێکیت ؟ وتی : لە هۆزی ئەسلەمم . فەرمووی: ((إني لا أقبل هدية من مشرك )) . فەرمووی : من دیاریی لە موشریك وەرناگرم .

وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! من ئیمان‌دارم بە خوا و پێغەمبەرەکەی و، زەکاتیشم هێناوە بۆ بورەیدەی کوڕی حەصیب . بورەیدەش دێت و ڕاستیی کابرا ئەسەلمێنێ . پاشان کاکی ئەسلەمیی پرسیار ئەکات و ئەڵێت : ئەی پێغەمبەری خوا! کاتی نوێژ دێت و منیش وام لە شوێنی چۆك‌دادانی وشترەکان‌دا ، ئایا نوێژ بکەم ؟ فەرمووی : (( لا )) . وتی : ئەی ئەگەر لە شوێنی پشوودانی مەڕەکان‌دا کاتی نوێژ هات ، ئایا نوێژی تێدا بکەم ؟ فەرمووی : (( نعم )) . وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! لەوانەیە ئاومان لێوە دوور بێت و پیاوەکە ژنەکەی لەگەڵیا بێت ، ئەتوانێ لێی نزیك بکەوێتەوە ؟ فەرمووی : (( نعم ، ويتيمم )) . وتی : ئەی پێغەمبەری خوا !

ئەگەر ئافرەتمان لەگەڵدا بوو و کەوتە حەیضەوە ؟ فەرمووی : (( تتيمم )) . کە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە جیعیرانە صەد سەر مەڕی دایە .

لە هەندێ ریوایەتدا وەها هاتووە کە هەواڵی هێرشی سوپای ئیسلام بۆ سەر هۆزی ثەقیف گەیشت بە صەخەری کوڕی عەیلەی ئەحمەسیی سەرداری ئەحمەس ، بۆ کۆمەکیی پێغەمبەری خوا ﷺ بە خۆی و قەومەکەیەوە سواری ئەسپ بوون و ، بەرەو طائیف کەوتنە رێ . کە گەیشتن سوپای ئیسلام ئابلووقەی هەڵ گرتبوو و بەرەو مەککە گەڕابوویەوە . صەخر پەیمانی دا هەتا ثەقیف مل بۆ حوکمی پێغەمبەری خوا ﷺ کەچ نەکەن ئابلووقە لەسەر طائیف لا نەبات . هەروایش بوو ، خۆیان بە دەستەوە دا . صەخر نامەی نووسیی بۆ پێغەمبەر و مژدەی دایە کە تەسلیم بوون و بە خۆی و خزمەکانیەوە ئەیانهێنن . پێغەمبەری خوا ﷺ دە دوعای بۆ ئەحمەس کرد کە فەرمووی : (( أللهم بارك لأحمس في خيلها ورجالها )) .

موغیرەی کوڕی شوعبەی ثەقەفیی وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! پوورم موسڵمان بووە کەچیی صەخر بە دیلی گرتووە . ئەویش صەخری بانگ کرد و فەرمانی دا ئەو ئافرەتە دیلە موسڵمانە بگێڕێتەوە بۆ موغیرە . صەخریش گوێڕایەڵیی فەرمانی کرد..

ئاوێکی نەوەی سولەیم هەبوو چۆڵیان کردبوو و لە دەست ئیسلام هەڵاتبوون ، پێغەمبەری خوا ﷺ پێشکەشی صەخری کرد تا بە خۆی و خزمەکانیەوە تیایا نیشتەجێ بن . کە خەڵکەکەی هاتنەوە و موسڵمان بوون ، هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئێمە موسڵمان بووین و چووینە لای صەخر تا ئاوەکەمان بۆ بگێڕێتەوە کەچیی ملی نەدا بۆمان . فەرمووی : (( يا صخر ! إن القوم إذا أسلموا أحرزوا أموالهم ودماءهم ، فادفع إليهم ماءهم )) . فەرمووی : ئەی صەخر ! کە خەڵك موسڵمان بوو ئیتر سامان و خوێنیان پارێزراو ئەبێت . ئاوەکەیان بۆ بگێڕەوە . صەخر وتی : بەڵێ ، ئەی پێغەمبەری خوا ! لە شەرمی ئەوەدا کە ئافرەتەکەش و ئاوەکەی لە صەخر سەندەوە پێغەمبەری خوا ﷺ رەنگی سوور بوویەوە .[٢٤٣]

---

[٢٤٣] غزوة حنين لباشميل : ١٩٨ ـ ٢٤٩ .

**هەشتەم : دەست کەوت و دیلەکان**

ئەوەبوو موسڵمانەکان لە جەنگی حونەین‌دا بیست و چوار هەزار وشتر و چل هەزار سەر مەڕ و زیوێکی یەکجار زۆریان دەست کەوت و شەش هەزار ژن و منداڵیش بە دیل گیران .

ئەو دەست کەوتانە و ئەو دیلانە باو و نەریتی ئەو رۆژەی سەرزەویی وەها بوو .. خۆ ئەگەر کافران سەر بکەوتنایە بەسەر موسڵمانان‌دا ئەو موعامەلە مرۆڤانەیان جێ بە جێ نەئەکرد . بۆیە ئیسلام ناچار بوو دوژمن دیل بکات و ماڵ و سامانی مەیدانی جەنگیش دەست بەسەردا بگرێ ..

شایانی باسە کە نەوەی سەعدی کوڕی بەکری کوڕی هەوازین ، هۆزی حەلیمەی دایەنی پێغەمبەری خوا ﷺ بوون . کەواتە ئەو دیلانە هەر هەموویان لە خاڵوانی شیریی ئەو بوون .

کە پێغەمبەر ﷺ لە حونەین سەرکەوت و بەرەو طائیف سوپای بەرێ خست ، فەرمانی دا دیلەکان و دەست‌کەوتەکان لە جیعررانەی نزیکی مەککە بپارێزن ، هەتا ئەگەڕێتەوە . ئەوەبوو پاراستنی دەستکەوتەکان و دیلەکانی بە بودەیلی کوڕی وەرقاء سپارد ، کە یەکێ لە سەردارە هاوپەیمانەکانی خوزاعە بوو . هەروەها سەروکاریی دیلەکانی ـ بە ژن و منداڵەوە ـ سپارد بە بوسری کوڕی سوفیانی خوزاعیی .

جا پاراستنی ئەمانە بوو بووە سپاردەیەکی گران لە ئەستۆی سوپای ئیسلام‌دا ، بۆیە ئەبوایە موسڵمانەکان خەمیان بخواردنایە . بۆ ئەمە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا شوێنی سەرگیراو بۆ خەڵکەکە دابین بکەن ، هەتا بە بەر خۆرەوە نەبن ، تا لە طائیف ئەگەڕێتەوە . هەروەها فەرمانی بەسەر بوسری کوڕی سوفیان‌دا دا ، کە کاروباری ژیاندنی ئەو خەڵکە بەو سپێررا بوو ، بچێت بۆ مەککە و ، بەشی ئەو دیلانە هەر هەموویان لە بوردەی هەجر ، کە شارێکی بەحرەینە ، بکرێت و هەر هەموویان پۆشتە بکاتەوە . ئەویش کارەکەی ئەنجام دا ..

تا پێغەمبەری خوا ﷺ لە طائیف گەڕایەوە نزیکەی مانگێك بەسەر ئەو دیلانەدا تێ پەڕیی . چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ بە هیوا بوو کەس‌وکاریان بێن و داوایان بکەنەوە بەر لەوەی بەسەر سەربازان‌دا دابەش بکرێن . کەچیی لە ماوەی ئەم مانگەدا کەسێك لە هەوازین نەهات داوای سۆز و بەزەیی بکات بۆ بەخشینی ئەو دیلانە .

دیارە دیل و دەستکەوتەکانی جەنگ ، بە پێی یاسای جەنگ لە ئیسلام‌دا مافی سوپای ئیسلامە ، دوای وەرگرتنی پێنج یەك ، بە پێی دەقی قورئان ، بۆ بەرژەوەندیی موسڵمانان .

لەلایەکی ترەوە عەرەبە دەشتەکی‌یەکان کە لەگەڵ سوپای ئیسلام‌دا بەشداریی خونەینیان کردبوو کەوتنە پەلەکردن بە پێغەمبەری خوا تا دەستکەوتەکان بەش بکات . وایان ئەزانیی دڵی نایەت یان ئەترسێ . بۆ ئەمە دەستی دایە کەمێك لە تووکی وشتر و تیی گەیاندن کە بەشی خۆی ئەوەندەی ئەو کەمە خوری‌یە بەو دەست کەوتانەوە نیە ، تەنها پێنج‌یەکی لێ وەرئەگرێ و ، ئەویش دیسان هەمووی بۆ بەرژەوەندیی گشتیی موسڵمانان خەرج ئەکرێتەوە .

جارچیی پێغەمبەری خوا ﷺ جاڕی دا کە با هیچ کەس هیچ شتێك لە دەستکەوتەکانی جەنگ لا نەخات .

ئەوەبوو عەقیلی کوڕی ئەبوطالیب ، بەر لەوەی جارچیی جاڕ بدات ، چووە لای ژنەکەی و شمشێرەکەشی خوێناویی بوو بوو . ژنەکەی وتی : ئەزانم جەنگت لەگەڵ موشریکان‌دا کردووە ، لە دەستکەوتەکانیان چیت دەست کەوتووە ؟ وتی : ئەم دەرزی‌یە بۆ جل دوورینت چاکە . دەرزی‌یەکەی دا بە ژنەکەی کە فاطیمەی کچی وەلیدی کوڕی عوتبەی کوڕی رەبیعە بوو . کە ئەوەبوو لە زۆران‌بازی‌یەکەی سەرەتای جەنگی بەدردا باوکی و باپیری ( واتە وەلید و عوتبە ) کوژرا بوون . کە عەقیل گوێی لە جاڕدانەکە بوو خێرا گەڕایەوە لای خێزانەکەی و پێی وت : بەخوا دەرزی‌یەکەت رۆیشت . دەرزی‌یەکەی لە ژنەکەی وەرگرتەوە و خستیەوە سەر کۆمای دەست کەوتەکان.

پیاوێکی تریش کە عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی مازنی‌یە ، کە کوڕی نوسەیبەی کچی کەعب بووە ، [٢٤٤] لە کاتی جەنگ‌دا تیروکەوانێکی موشریکانی دەست کەوتبوو و تیری پێ هاوشتبوو بۆیان . کە دەنگی جارچیی بەرگوێ کەوت خێرا تیروکەوانەکەی گێڕایەوە بۆ لای دەستکەوتەکان .

---

[٢٤٤] عەبدوڵڵای کوڕی زەید لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ بەشداریی جەنگی ئوحود و هەموو رووداوەکانی تری کردووە . عەبدوڵڵا لەگەڵ وەحشیی کوڕی حەرب‌دا پێکەوە موسەیلەمەی درۆزنیان کوشت . ئەوەبوو موسەیلەمە پێشتر حەبیبی کوڕی زەیدی ، کە برای عەبدوڵڵا بووە ، کوشت ، بەڵام پلە پلە گۆشتی لێ ئەبڕیی لەسەر ئەوەی شاهێدیی نەئەدا موسەیلەمەش پێغەمبەری خوا بێت . عەبدوڵڵا ریوایەتی فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە کردووە . لە سەردەمی یەزیدی کوڕی موعاویەدا ، ساڵی شەصت و سێ عەبدوڵڵا لە جەنگی (( حرة )) دا بە شەهیدیی سەری ناوەتەوە .

دوای جاڕدان بۆ گێڕانەوەی هەر دەستکەوتێك ، پیاوێك بە گلۆڵەیەك مووی ڕێسراوەوە هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەمە بۆ من . فەرمووی : (( أما ما كان لي ولبني عبدالمطلب فهو لك )) . فەرمووی : هەرچیی هی من و نەوەی عەبدولموطەللیبە بۆ تۆ . ئیتر کابرا گێڕایەوە بۆ سەر دەستکەوتەکان.

پیاوێکی تریش بە گوریسێکەوە هات و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! لە کاتی شکستی دوژمن‌دا ئەم گوریسەم دۆزی‌یەوە ، ئایا جلی وشترەکەمی پێ ببەستم ؟ فەرمووی : (( نصيبي منه لك ، وكيف تصنع بأنصبة المسلمين ؟ )) . فەرمووی : بەشەکەی من بۆ تۆ ، بەڵام ئەی چیی ئەکەی بە بەشی موسڵمانەکان ؟

دوای ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بەسەر یەکێ لە هاوەڵە ناودارەکان‌دا دا ، کە زەیدی کوڕی ثابیت بوو ، تا دەستکەوتەکانی جەنگ بژمێرێ و پاشان بەسەر سەربازان‌دا دابەشیان بکات . ئەوەبوو هەر پیاوێکی پیادە چوار وشتر ، یان چل سەر مەڕی بەر ئەکەوت . بەڵام ئەسپ سوارەکان هەر یەکەیان سێ بەشی وەرئەگرت . واتە یان دوانزە وشتر ، یان صەد و بیست سەر مەڕ . کە بەشێکی بۆ خۆی پێی ئەدرا و دوو بەشیشی بۆ ئەسپەکەی چونکە بە ڕاستیی ئەسپ و وڵاغی ئەو سەردەمە کاریگەریی گرنگی لەسەر جەنگ ئەبوو .

شەریعەتی ئیسلام دەربارەی دەستکەوتەکانی جەنگ بڕیاری داوە کە پێنج یەکی ئەو دەستکەوتانە جیا بکرێتەوە و لەبەر دەستی پێغەمبەری خوادا بێ ﷺ و خۆی بۆ بەرژەوەندیی گشتیی ئیسلام خەرجی بکات . کەواتە لە بیست و چوار هەزار وشتر چوار هەزار و هەشت‌صەد وشتر و ، لە چل هەزار سەر مەڕیش هەشت هەزار سەر مەڕ جیا ئەکرێنەوە ، سەرەڕای پێنج‌یەکی دەیان هەزار ئۆقیەی زیو . ئەمانە پێغەمبەری خوا ﷺ بە ویستی خۆی دابەشی ئەکردن . ئەوەبوو بەشێکی زۆری ئەم پێنج‌یەکەی بۆ دڵخۆش‌کردنی سەردارانی هۆزەکان بەکار هێنا کە ئەوانە تازە موسڵمان بوو بوون ، بۆ ئەوەی دڵیان لەسەری دابمەزرێ . ئەوانە زۆربەیان لە مانگێك کەمتر بوو لە مەککەدا موسڵمان بووبوون .

ئەمەش خشتەی دابەش‌کردنی دەستکەوتەکان بەسەر ( المؤلفة قلوبهم ) :

| ناو | ژمارەی وشتر | ئۆقیە زیو |
|---|---|---|
| ١ ـ ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب | ١٠٠ | ٤٠ |

| | | |
|---|---|---|
| ٢ ـ موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان | ١٠٠ | ٤٠ |
| ٣ ـ یەزیدی کوڕی ئەبوسوفیان | ١٠٠ | ٤٠ |
| ٤ ـ حەکیمی کوڕی حەزام | ١٠٠ | |
| ٥ ـ نەضری کوڕی حاریث | ١٠٠ | |
| ٦ ـ ئوسەیدی کوڕی حاریثە | ١٠٠ | |
| ٧ ـ عەلائی کوڕی حاریثە | ٥٠ | |
| ٨ ـ مەخرەمەی کوڕی نەوفەل | ٥٠ | |
| ٩ ـ حاریثی کوڕی هیشام | ١٠٠ | |
| ١٠ـ سەعدی کوڕی یەربووع [٢٤٥] | ٥٠ | |
| ١١ـ صەفوانی کوڕی ئومەییە | ١٠٠ | |
| ١٢ـ قەیسی کوڕی عەدیی | ١٠٠ | |
| ١٣ـ عوثمانی کوڕی وەهب | ٥٠ | |
| ١٤ـ سوهەیلی کوڕی عەمر | ١٠٠ | |
| ١٥ ـ حوەیطبی کوڕی عەبدولعوززا | ١٠٠ | |
| ١٦ ـ هیشامی کوڕی عەمر | ٥٠ | |
| ١٧ـ ئەقرەعی کوڕی حابیس | ١٠٠ | |
| ١٨ـ عویەینەی کوڕی حیصن | ١٠٠ | |
| ١٩ـ مالیکی کوڕی عەوف | ١٠٠ | |
| ٢٠ـ عەبباسی کوڕی میرداس | ١٠٠ | |
| ٢١ـ عەلقەمەی کوڕی عەلاثە [٢٤٦] | ١٠٠ | |

[٢٤٥] سەعیدی کوڕی یەربووع ساڵی فەتح موسڵمان بووە و ناوی ( صرم ) بووە پێغەمبەری خوا ﷺ گۆڕیویە بۆ سەعید. لە مەدینە نیشتەجێ بووە و لەوێ چاوی لە دەست داوە . بۆ دڵ خۆشیی لە دەستدانی چاوی خەلیفە عومەر خوا لێی رازیی بێ سەردانی ئەکات و پێی ئەفەرموێ : واز لە جومعە و جەماعەتی مزگەوتی پێغەمبەری خوا ﷺ نەهێنی . ئەویش ئەڵێت : کەسم نیە دەستم رابکێشێ . سەعید لە مەدینەدا و لە تەمەنی صەد و بیست ساڵیی دا کۆچی دوایی کردووە .

مێژوونووسان باسی ئەوەیان کردووە کە یەکەم کەسێك داوای دەست کەوت ئەکات ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب بووە . کە ئەچێتە ژوورەوە خزمەتی پێغەمبەری خواﷺ و زیو لەبەر دەستی دا ئەبێت ، ئەڵێت : ئەی پێغەمبەری خوا ! بوویتە دەوڵەمەندترین کەسی قورەیش . ئەویش زەردەخەنەیەك ئەکات . ئەبوسوفیان ئەڵێت : ئەی پێغەمبەری خوا ! لەو سامانە بەشم بدە . ئەفەرموێ : (( یا بلال ! زن لأبي سفيان أربعين أوقية واعطوه مائة من الإبل )) . ئەفەرموێ : بیلال ! چل ئۆقیە زیو بۆ ئەبوسوفیان بکێشە و صەد وشتریشی بدەنێ .

ئەبوسوفیان ئەڵێت : بەشی یەزیدی کوڕیشم بدە . فەرمووی : (( زنوا ليزيد أربعين أوقية ، وأعطوه مائة من الإبل )) . ئەبوسوفیان وتی : تۆ سەخییت ، دایك و باوکم بە قوربانت بن . جەنگم لەگەڵت دا کرد ، چاکترین جەنگاوەر بوویت . پاشان ئاشتییم لەگەڵ کردیت ، چاکترین ئاشتیخواز بوویت . خوا پاداشتت بە چاکە بداتەوە .

دەربارەی پیاوی پیاوانەش ئەم رووداوە پێشکەش ئەکەین :

حەکیمی کوڕی حەزام ئەڵێت : لە دوای حونەین داوای صەد وشترم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد و پێی دام . پاشان داوای صەدی ترم کرد ، دیسان پێی دام . پاشان داوای صەدی ترم کرد ، دیسان پێی دام . پاشان فەرمووی : (( يا حكيم بن حزام ! إن هذا المال خضرة حلوة ، فمن أخذه بسخاوة نفس بورك له فيه ، ومن أخذه بإشراف نفس لم يبارك له فيه ، وكان كالذي يأكل ولا يشبع ، واليد العليا خير من اليد السفلى ، وابدأ بمن تعول )) . فەرمووی : حەکیمی کوڕی حەزام ! سامان و ماڵ صەوز و شیرینە. جا هەر کەس بە سەخاوەت و دڵفراوانیی وەری بگرێ ، ئەوا خوا بەرەکەتی تێ ئەخا بۆی . بەڵام هەر کەس بە چاوچنۆکیی وەری بگرێ ، ئەوا خوا بەرەکەتی تێ ناخا بۆی و ، وەك ئەو کەسە وەهایە کە هەر ئەخوا و تێر نابێت . دەستی

---

[٢٤٦] عەلقەمەی کوڕی عەلاثە لە پیاوماقووڵانی رەبیعەی کوڕی عامیر بووە . ئەمیش یەکێك بووە لە ( المؤلفة قلوبهم). لەناو قەومەکەی‌دا سەردارێکی ژیر و زمان پاراو بووە . عەلقەمە دوای ئابلووقەی طائیف لە ئیسلام هەڵ گەڕایەوە و خۆی گەیاندە شام . کە پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد بە پەلە گەڕایەوە و لە خاکی نەوەی کیلابی کوڕی رەبیعە سەربازگەی دروست کرد . ئەوەبوو خەلیفەی یەکەم کەتیبەیەکی نارده سەری و ئەویش هەڵات . کەس وکاری گیران و هێنرانە مەدینە . ئەوانیش لە کردەوەی عەلقەمە خۆیان داماڵیی و خەلیفە ئەبوبەکر ئازادی کردن . عەلقەمەش تەوبەی کرد و بە چاکیی موسڵمان بوو و ، یەکێ لە هاوەڵە چاکەکان دەرچوو . خەلیفە عومەریش کردیە والیی ناوچەی حۆران لە شام و ، هەر لەوێ کۆچی دوایی کرد ...

بەخشینیش لە دەستی داواکردن چاکترە. بۆ بەخشینیش لەوەوە دەست پێ بکە کە بەخێوکردنی لە ئەستۆتایە.
دوای ئەم دەرسە جوانە حەکیمیش وتی : بەو خوایەی بە حەق رەوانەی کردووی، دوای تۆ هیچ شتێك لە کەس وەرناگرم . ئەوەبوو لە سەردەمی خەلافەتی عومەردا، عومەر بانگی ئەکردە حەکیم هەتا مووچەکەی وەربگرێت نەئەهات وەری بگرێت. عومەریش ئەیفەرموو : خەڵکینە ! ئێوە بە شاهێد ئەگرم لەسەر حەکیم کە من بانگی ئەکەم بۆ وەرگرتنی مووچەکەی کەچیی نایەت وەری بگرێت . ئەوەشیان باس کردووە کە حەکیم تەنها صەد وشتری یەکەمی وەرگرتووە .
لە کاتی دابەشکردنی دەستکەوتەکاندا هەندێ لە مونافیقان کەوتنە رەخنەگرتن لە دابەشکردنەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەویش خەفەتی زۆری بەوە ئەخوارد.
لە یەکێ لە ریوایەتە صەحیحەکاندا هاتووە کە کاتێ پێغەمبەر ﷺ دەست کەوتەکانی لە حونەین دابەش ئەکردن پیاوێك وتی : ئەم بەشکردنە بۆ خوا نەبوو. کە ئەم قسەیە گەیشتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ و لەبەر پێ ناخۆش بوون رەنگی دەم و چاوی هەڵ گەڕا ، پاشان فەرمووی : (( رحمة الله على موسى لقد أوذي بأكثر من هذا )) . فەرمووی : رەحمەتی خوا لە مووسا پێغەمبەر ، لەمە زیاتر ئازار درا.
لە ریوایەتی تری صەحیحیشدا کە هەندێکیان پاڵپشتی هەندێکی تریان ئەکەن هاتووە کە پیاوێك لە نەوەی تەمیم پێیان ئەوت ( ذوالخويصرة ) لەسەر سەری پێغەمبەر ﷺ راوەستێ و ئەویش بەشی خەڵکەکە ئەدات ، ئەڵێت : ئەی موحەممەد! چاوم لێ بوو ئەمڕۆ چیت کرد . فەرمووی : (( أجل ، كيف رأيت ؟ )) . فەرمووی: چیت بینیی ؟ وتی: ئەم دیی عەدالەت بەکار بهێنی . پێغەمبەر ﷺ تووڕە بوو و فەرمووی: (( ويحك ، إذا لم يكن العدل عندي فعند من يكون ؟ )) . فەرمووی : تیا چیت ، جا ئەگەر عەدالەت بە لای منەوە نەبێ ، ئەی بەلای کێوە ئەبێت ؟
عومەر فەرمووی : ئەوە نەیکوژین ؟
فەرمووی : (( دعوه ، فإنه سيكون له شيعة يتعمقون في الدين حتى يخرجوا منه كما يخرج السهم من الرمية ، ينظر في النسل فلا يوجد شيء ، ثم في القِدح فلا يوجد شيء سبق الفرث والدم )) .

بەم فەرمایشتەی هاوەڵان تێ ئەگەیەنێ کە ئەمە لە دوارۆژدا دەستە و تاقمەیەکی ئەبن کە بە رواڵەت زۆر دین‌دارن ؛ کەچیی وەك چۆن تیر لە کەوانەکەی دەرئەچێت ، ئەوانە لە دین دەرچوون .[٢٤٧]

هەروەها لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە ئەگێڕنەوە وتوویە : لە جیعررانە پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە حونەین ئەگەڕایەوە و ، کۆشی بیلالیش زیوی تێدا بوو و ، پێغەمبەری خوایش ﷺ لێی وەرئەگرت و ئەیدا بە خەڵك . پیاوەکە وتی : ئەی موحەممەد ! عەدالەت بەکار بێنە . فەرمووی : « ویلك ! ومن یعدل إذا لم أكن أعدل ؟ لقد خبتُ وخسرتُ إذا لم أكن أعدل » . فەرمووی : تیاچیت ! جا من عەدالەت بەجێ نەهێنم کێ عەدالەت بەجێ ئەهێنێ ؟ ئەگەر عەدالەت بەجێ نەهێنم رەنجەڕۆ و خەسارۆمەند ئەبم .

عومەری کوڕی خەططاب فەرمووی : لێم گەڕێ ، ئەی پێغەمبەری خوا ! با لە گەردنی ئەم مونافیقە بدەم . فەرمووی : « معاذ الله أن تتحدث الناس أني أقتل أصحابي . إن هذا وأصحابه يقرأون القرآن لا يتجاوز حناجرهم يمرقون من الدين كما يمرق السهم من الرمية » .

فەرمووی : پەنا بەخوا خەڵکیی باس بکەن و بڵێن من هاوەڵانم ئەکوژم . ئەمە و هاوەڵانی کە قورئان ئەخوێنن لە گەروویان تێپەڕ ناکات . چۆن تیر لە کەوانەکەی دەر ئەچێت ؛ ئەمانەش وەها لە دین دەر ئەچن ..

لە ریوایەتێکی تری صەحیحی بوخاریی و موسلیم‌دا هاتووە کە ئەبوسەعید لە ئەبوسەلەمەوە گێڕاویەتەوە ئەڵێت : لە کاتێك‌دا کە ( لە جیعررانە ) لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین دەست کەوتی بەش ئەکرد ، ( ذوالخويصرة ) ، کە پیاوێکی نەوەی تەمیم بوو ، هاتە خزمەتی و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! عەدالەت بەکار بێنە . فەرمووی : « ويلك ومن يعدل إذا لم أعدل لقد خبتُ و خسرتُ ، إذا لم أعدل فمن يعدل ؟ » .

عومەر فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ماوەم بدە با لە گەردنی بدەم .

فەرمووی : « دعه فإن له أصحاباً يحقر أحدكم صلاته مع صلاتهم ، وصيامه مع صيامهم ، يقرأون القرآن لا يجاوز تراقيهم ؛ يمرقون من الإسلام كما يمرق السهم من الرمية ، ينظر إلى نصله فلا يوجد فيه شيء ، ثم إلى رصافه فلا يوجد فيه شيء ؛

---

[٢٤٧] لە نامازەی پێنجەمی ( موعجیزاتی ئەحمەدیی ) دا ئەمە بە درێژە باس کراوە .

ثم ينظر إلى نصبه ( وهو قدحه ) فلا يوجد فيه شيء ، ثم ينظر إلى قذذه فلا يوجد فيه شيء ، قد سبق الفرث والدم ، آيتهم رجل أسود إحدى عضديه مثل ثدي المرأة أو مثل البظعة تدردر ، ويخرجون على خير فرقة من الناس » .

بەم فەرمایشتەش موسڵمان ئاگادار ئەکات کە ئەمە دانەیەکە لە کۆمەڵێکی مونافیقی بێدین کە بە رواڵەت خواپەرستیی زۆر ئەکەن ، بە رادەیەك کە موسڵمانان خواپەرستیی خۆیان بە هیچ نازانن . ئەوانە قورئان ئەخوێنن بەڵام لە گەروویان تێپەڕ ناکات . بە وێنەی دەرچوونی تیر لە کەوانەکەی ئەوانیش لە دین دەرئەچن . ناو و نیشانیشیان پیاوێکی رەشە کە قۆڵێکی وەك مەمکی ئافرەت گۆشتەکەی ئەجوولێت. ئەوانە دژی چاكترین دەستەی موسڵمان ئەوەستن .

ئەبوسەعید ئەڵێ : شاهێدیی ئەدەم کە ئەمەم لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستووە و ، شاهێدیش ئەدەم کە عەلیی کوڕی ئەبوطالیب چوو بە گژیان‌دا و منیشی لەگەڵ‌دا بووم و ، فەرمانی دا ئەو پیاوە بدۆزنەوە . ئەوەبوو دۆزییانەوە و هێنایان ، هەتا من سەیرم کرد و لەسەر وەسفەکەی پێغەمبەری خوا بوو ﷺ.

لە باسەکانی پێشەوەمان‌دا ئەوەمان دەرخستووە کە ئەنصار چ دەورێکی کاریگەریان هەبووە لەسەر خستنی ئیسلام‌دا ، تا ئەو رۆژەی کە ئیسلام لە جەنگی حونەین‌دا سەرکەوت ، ئەوان بەردەوام خزمەتیان کرد .. خوێنیان ئەبەخشیی .. بەڵێنیان دا پارێزگاریی لە پێغەمبەر و کۆچکەران بکەن بەو شێوەی کە پارێزگاریی لە ژن و منداڵیان ئەکەن .. هەر وایش بوو .. ئەنصار خۆیان کردە دوژمنی سەرپاك عەرەبی دوورگە و ، باکیان لە هەڕەشە و گوڕەشەی ئەو هەمووە هۆزە دڕندە زبرانەی دوورگە نەبوو .. قورئانی پیرۆزیش لە ئایەتەکانی‌دا سوپاسی ئەنصاری کرد و بە خاوەنی ئیمانی راستەقینەی لە قەڵەم دان . بۆ نموونە ئەفەرموێ :

﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنۢ بَعۡدُ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ مَعَكُمۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ مِنكُمۡۚ وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ ﴾ (الأنفال : ٧٤) .

ئەنصار بە راستیی کۆمەکی خوا و پێغەمبەر بوون و ، لە هەموو جەنگێك‌دا بڕبڕەی پشتی سوپای ئیسلام بوون .

ئەوەبوو لە جەنگی بەدردا کە موسڵمانەکان ژمارەیان ( ٣١٨ ) جەنگاوەر بوون ، نزیکەی (٢٣٠ ) جەنگاوەریان لە ئەنصار بوون .

لە ساڵی فەتحیش‌دا کە سوپای فەتح دە هەزار بوو ، تەنها ئەنصار خۆیان چوار هەزار جەنگاوەر بوون .

یەکەم کەسێکیش کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەنگی حونەین‌دا ، لە کاتی شکست هێنان‌دا ، هاواری لێ کردن ، ئەنصار بوون . ئەوەبوو بە پەلە گەڕانەوە مەیدان و ، خوایش سەرکەوتنی پێشکەش بە سوپای قورئان کرد ..

ئەنصار لە کاتی دابەش‌کردنی دەستکەوتەکانی حونەین‌دا دڵیان لە خۆیان دا ما.. چونکە ئەوانەی کە مانگێك زیاتر نەبوو موسڵمان بوون ، وەك ئەهلی مەککە ، هەر یەکە صەد وشتریان پێ درا .. ئەمانە بۆ دڵڕاکێشانیان ئەم بەشە زۆرەیان پێ دا..

لە کتێبە صەحیحەکانی فەرموودەدا باسی گلەیی ئەنصارە گەنجەکان لە پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە . کە ئەم گلەیی‌یە بە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت زۆری پێ ناڕەحەت بوو ، چونکە ئەو ئەنصاری زۆر خۆش ئەویستن . بۆیە سەردارەکانی کۆ کردنەوە ، تا بە جوانیی تێیان بگەیەنێ .

ئەوەبوو بە جوانیی بۆی روون کردنەوە و ، ئەوانیش رەزامەندیی تەواویان بۆ ئەو مەبەستە نواند .

مێژوونووسان بە درێژە باسی ئەو گلەیی‌کردنەیان نووسیوە و باسیان کردووە کە هەر یەکە لە ئەنصار تەنها چوار وشتری بەر کەوتووە ، کەچیی کەسانێکی وەك عویەینە و ئەبوسوفیان و ئەقرەع ، کە هیچ خزمەتێکی ئیسلامیان تا ئەو رۆژە نەکردبوو ، یەکی صەد وشتریان پێ درا بوو .

ئەوەبوو سەعدی کوڕی عویادەی سەرداری خەزرەج چووە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەم هۆزەی ئەنصار ، لەسەر دابەش‌کردنی ئەو دەستکەوتەی کە دەستت کەوت ، دڵیان بەرامبەرت شتی تێدا دروست بووە . دەستکەوتەکەت بەسەر خزمەکانت‌دا دابەش کردووە و ، بەشی زۆرت بە هۆزە عەرەبەکان داوە ، بەڵام هیچێکی ئەوتۆ بەم هۆزەی ئەنصار نەدراوە .

فەرمووی : « فأين أنت من ذلك يا سعد ؟ » . فەرمووی : ئەی سەعد ! ئەی رای خۆت چۆنە لەو بارەوە ؟

وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! منیش یەکێکم لە خزمەکانم .

فەرمووی : « فاجمع لي قومك في هذه الحظيرة » . فەرمانی دا ئەنصار کۆ بکاتەوە. کە کۆی کردنەوە ، هەندێ پیاوی موهاجیرەکان هاتنە ناو کۆڕەکەوە ، بەڵام هی تر

هاتن گێڕرانەوە . دوای ئەوە سەعد دێتە خزمەتی پێغەمبەر و ، هەواڵی کۆبوونەوەی ئەنصاری پێ دا .

پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی برد و ، سوپاس و ستایشی خوای کرد و ، پاشان فەرمووی : « يا معشر الأنصار ! ما مقالة بلغتني عنكم ، وجدة وجدتموها في أنفسكم ، ألم آتكم ضلالاً فهداكم الله بي ، وعالة فأغناكم الله بي ، وأعداءً فألف الله بين قلوبكم ؟ » پرسیاری لێ کردن کە ئەوە چیە بە دڵیانا هاتووە ؟ ئەی کاتێ کە ئەو کۆچی کردە ناویان ئەوان گومڕا نەبوون و بە هۆی ئەمەوە خوا هیدایەتی دان و ، هەژار نەبوون و دەوڵەمەندی کردن و ، دوژمن نەبوون و دڵی یەك خستن ؟

وتیان : خوا و پێغەمبەرەکەی خاوەنی زۆرترین منەت و فەزڵن .

پاشان فەرمووی : « ألا تجيبوني يا معشر الأنصار ؟ » . فەرمووی : ئەی کۆمەڵی ئەنصار ! ئەوە وەڵامم نادەنەوە ؟

وتیان : بە چیی وەڵامت بدەینەوە ، ئەی پێغەمبەری خوا ، کە منەت و فەزڵ بۆ خوا و پێغەمبەرەکەیەتی ؟

فەرمووی : « أما والله لو شئتم لقلتم فلصَدقتم ولصُدِّقتم : أتيتنا مكذَّباً فصدقناك ، ومخذولاً فنصرناك ، وطريداً فآويناك ، وعائلاً فآسيناك ، أوجدتم علي يا معشر الأنصار في أنفسكم في لعاعة من الدنيا تألفت بها قوماً ليسلموا ، ووكلتكم إلى إسلامكم ؟ ألا ترضون يا معشر الأنصار أن يذهب الناس بالشاء والبعير ، وترجعون برسول الله إلى رحالكم ؟ فوالذي نفس محمدٍ بيده لما تنقلبون به خير مما ينقلبون به ، ولولا الهجرة لكنت امرءاً من الأنصار . ولو سلك الناس شِعباً وواديا ، وسلكت الأنصار شعباً ووادياً لسلكت شعب الأنصار وواديها . الأنصار شعار والناس دثار . أللهم ارحم الأنصار وأبناء الأنصار وأبناء أبناء الأنصار » .

خستیە بەردەمیان کە ئەگەر بیانەوێ ئەتوانن بڵێن : تۆیش کە هاتیتە ناومان خەڵکیی بە درۆیان خستبوویتەوە ، بەڵام ئێمە تەصدیقمان کردیت .. خەڵکیی پشتیان بەردابوویت ، بەڵام ئێمە سەرمان خستیت .. دەرکراو بوویت ، بەڵام ئێمە جێمان کردیتەوە .. هەژار و دەست کورت بوویت ، بەڵام ئێمە دڵمان دایتەوە . دوای ئەوە بە سەرسوڕمانەوە پرسیاری لێ کردن کە ئایا بۆ شتێکی دنیایی هیچ و پووچ کە داویەتی بە کەسانێك کە تازە موسڵمان بوون و ، ویستوویە دڵیان خۆش بکات ، ئەوانیشی بە موسڵمانێتییەکەیان سپاردووە ، ئایا دڵیان شتی کردووە ؟ پرسیاری لێ

کردن کە ئایا ئەنصار رازیی نابن خەڵکیی بە مەر و وشترەوە بگەڕێنەوە و ، ئەنصاریش بە پێغەمبەری خواوە ﷺ؟ پاشان سوێندی بۆ خواردن کە ئەوان شتی چاکیان دەست کەوتووە و ، ئەگەر لەبەر کۆچ کردنیش نەبوایە خۆی بە پیاوێکی ئەنصاریی ئەژمارد و ، هەر رێیەکیش ئەنصار پیایا برۆن پێغەمبەری خوا ﷺ یش بەو رێیەدا ئەڕوا . ئەنصار بەرگی ژێرەوەن و خەڵك بەرگی سەرەوە . پاشان لە خوا پاڕایەوە کە سۆزی خۆی بەسەر ئەنصار و ، رۆڵەکانی ئەنصار و ، رۆڵەکانی رۆڵەکانی ئەنصاردا بڕێژێ .

ئەنصار بە بیستنی ئەم فەرمایشتانە دەستیان دایە گریان بە رادەیەك کە ریشیان بە فرمێسك خووسا و ، وتیان : رازیی بووین پێغەمبەری خوا ﷺ بەشی ئێمە بێت .

لە ریوایەتێکی تردا هاتووە کە فەرموویە : (( إنكم ستلقون بعدي أثرة فاصبروا حتى تلقوني على حوضي )) .[248] ئەفەرموێ : دوای من کەسانێك دێن بە شێوەی خۆ پەرستیی دین‌داریی ئەکەن ، ئێوە ئارام بگرن هەتا لەسەر حەوزی کەوثەر پێم ئەگەنەوە .

شایانی باسە کە ئەم جۆرە وتانە لە گەنجەکانیانەوە بیسترا بوو ، ئەگینا سەردارەکان و بە تەمەنەکانیان ناڕەزاییان دەر نەئەبڕیی . ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ کە لێی پرسین : (( ما حديث بلغني عنكم ؟ )) . فەقیهەکانی ئەنصار وەڵامیان دایەوە : پیاوە خاوەن راکانمان هیچیان نەوتووە ، بەڵام خەڵکێکمان کە گەنجن وتیان : خوا لە پێغەمبەرەکەی خۆش ببێ بەشی قوڕەیش ئەدات و دەستبەرداری ئێمە ئەبێت، کە هێشتا خوێنیان بە شمشێرەکانمانەوە دائەچۆڕێ . فەرمووی : (( فإني أعطي رجالاً حديثي عهد بالكفر أتألفهم )) [249] . فەرمووی : من سامانم بە کەسانێك داوە کە تازە لە کوفر دوور کەوتوونەتەوە ئەمەوێ دڵیان راگیر بکەم .

لە ریوایەتێکی تردا سەعدی کوڕی ئەبووەققاص ئەڵێت : ئەی پێغەمبەری خوا ! صەد وشترت دا بە عویەینەی کوڕی حیصن و ئەقرەعی کوڕی حابیس و ، جوعەیلی کوڕی سوراقەی کوڕی ضەمرییت[250] فەرامۆش کردووە . پێغەمبەری خوا ﷺ

---

[248] مسلم ، كتاب الزكاة ، باب إعطاء المؤلفة قلوبهم ( ٢ / ٧٣٨ ) رقم ( ١٠٦١ ) .

[249] مسلم ، كتاب الزكاة ، باب إعطاء المؤلفة قلوبهم ( ٢ / ٧٣٤ ) رقم ( ١٠٥٩ ) .

[250] جوعەیل هەژارێکی مەدینە بووە لە ئەهلی صوففە . یەکێ بوو لە موسڵمانە دێرینەکان . بەشداریی جەنگی ئوحودی کردووە و ، لە ئابلوقەی جولەکەی قورەیظەدا چاوی پێکراوە . بە شێوە جوان و پێ‌کەوتوو نەبووە ، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ پتەویی ئیمانی ستایشی کردووە .

فەرمووی: (( والذي نفسي بيده ، لجعيل بن سراقة خير من طلاع الأرض كلها مثل عيينة والأقرع ، ولكني تألفتهما ليسلما ، ووكلت جعيل بن سراقة إلى إسلامه )) . فەرمووی : بەو خوایەی کە گیانمی بە دەستە ، جوعەیل لە پڕ بە پڕی زەویی خەڵك چاكترە كە هەموویان وەك عویەینە و ئەقرەع وەها بن ، بەڵام من دڵی ئەوانم راگیر كردووە تا موسڵمان بن و ، جوعەیلیشم بە موسڵمانێتییەكەی سپاردووە .

بوخارییش لە عەمری كوڕی تەغلیبەوە ئەگێڕێتەوە كە وتوویە : پێغەمبەری خوا ﷺ دەستكەوتی بە هەندێكدا و هەندێكیش پێی نەدان ، ئەوانیش گلەییان لێ كرد و ، ئەویش فەرمووی : (( إني أعطي قوماً أخاف هلعهم وجزعهم ، وأكل قوماً إلى ما جعل الله في قلوبهم من الخير والغنى منهم عمرو بن تغلب )) . فەرمووی : هەندێك لە ترسی بێئارامیی و شپرزەبوونیان بەشیان ئەدەم و ، هەندێكیش ئەسپێرم بەو چاكە و تێرییەی كە خوا لە دڵیانا جێگیری كردووە ، كە یەكێ لەوانە عەمری كوڕی تەغلیبە .[251]

عەمریش ئەیوت : پێم خۆش نیە ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ بگۆڕمەوە بە رانە وشتری رەسەن .

ئەو هەڵە گەورەیەی كە مالیكی كوڕی عەوفی سەرداری هەوازین كردی ، وەك لە پێشەوە باسمان كرد ، كە ئەوەبوو ژن و منداڵ و ئاژەڵ و سامانی هەوازینی لەگەڵ سوپادا هێنایە مەیدانی جەنگ و ، كە هەوازین شكا شەش هەزار ژن و منداڵ بوونە دیلی جەنگ ، وەك لەو رۆژەدا باو بوو ، ئیتر ئەوانە ئەبوا وەك دەستكەوتی جەنگ بەسەر جەنگاوەراندا دابەش بكرانایە .

هۆزی سەعدی كوڕی بەكری كوڕی هەوازینیش كە یەكێ بوو لە سێ لقە سەرەكی یەكەی هەوازین و ، ئەوانە هۆزی حەلیمەی دایەنی پێغەمبەری خوا ﷺ بوون ، ئافرەتەكانیان كەوتنە دەست سوپای ئیسلام . یەكێ لەوانە شەیمای كچی حاریث[252] بوو ، كە كچی حەلیمە بوو و ، خوشكی شیریی پێغەمبەر بوو .

---

[251] عەمری كوڕی تەغلیب لە بەصرە نیشتەجێ بووە و ، حەسەنی بەصریی فەرموودەی لێ گێڕاوەتەوە . هەروەها ئەو فەرموودەشی گێڕاوەتەوە كە دەری ئەبڕێ لە نیشانەكانی ئاخرزەمان ئەوەیە كە بازرگان زۆر ئەبن و نووسینیش زۆر ئەبێت. عەمر بەشداریی رووداوەكانی ئوحود و بە دواوەی لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ كردووە .

[252] شەیما نازناوی خوشكی شیریی پێغەمبەری خوایە ﷺ ، ئەگینا ناوی راستەقینەی حوذافەی كچی حاریثی سەعدیەیە .

شەیما گەورەتر بووە و کاتێـك کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـەلای حەلیمـە شیری خواردووە ، شەیما لە بەخێوکردنی ئازیزدا یارمەتیی دایکی داوە ..

کە شەیما ئەکەوێتە دەست موسڵمانەکان پەلەی پێ ئەکەن بۆ بەڕێوەچوون و نـەیان ئەزانی کێیە . ئەویش پێی وتن کە بەخوا من خوشکی شیریی سـەرۆکەکەتانم . بـەلام ئەوان بڕوایان پێ نەکرد هەتا هێنایانە لای پێغەمبەری خوا ﷺ کـە گەیشت وتـی : ئەی پێغەمبەری خوا ! من خوشکی شیریی تۆم . فەرمووی : (( ما علامة ذلـك ؟ )) . فەرمووی : ناونیشانی ئەوە چیە ؟ وتی : لە کاتێك‌دا کە بە کۆڵمەوە بوویت گازێکـت لە پشتم گرت .

پێغەمبەری خوا ﷺ ناونیشانەکەی هاتەوە یاد و ، عەباکەی خۆی بۆ ڕاخسـت و ، لەسەری دای‌نیشاند و ، شەیمای کردە سەرپشـك و فـەرمووی : (( إن أحببـت فعنـدي محببة مكرمة ، وإن أحببـت أن أمتعـك وترجعـي إلى قومـك فعلت )) . فـەرمووی : ئەگەر پێت خۆشە بە خۆشیی و بەڕێزەوە لە لام بمێنەرەوە و ، گەر پێیشت خۆشە کـەل و پەلی پێویستت بدەمێ و بگەڕێیتەوە ناو خزمەکانت وا ئەکەم . وتی : پـێم خۆشـە کەل و پەلم بدەیتێ و بمگێڕیتەوە بۆ ناو خزمەکانم .

شەیما موسڵمان بوو و چیی پێویست بوو پێشکەشی کرا و ڕەوانە کرایەوە . ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ سێ بەنـدە و کـەنیزەکێك و کۆمـەڵێك مـەڕومالاتی پـێ دا .. پاشان بە سەری بەرزەوە گەڕایەوە ناو کەس‌وکاری .

دەربارەی ئازادکردنی دیلەکانی هەوازین ، ئەوەبوو پێغەمبەری خـوا ﷺ نزیکـەی مانگێك دابەش‌کردنی دیلەکانی دوا خست ، بەو هیوایەی کە هەوازین بێن و داوایـان بکەنەوە . کەچیی هەوازین دوا کەوتن و نەهاتن ، ئیتر ئەوەبوو بەشیان کردن .

دوای بەش‌کردن هـەوازین بـە شـێوەی نوێنـەر چـوارده پیاویـان هاتنـە خزمـەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە جیعرانە و ، موسڵمانیش بووبوون . وتیان : ئەی پێغەمبـەری خوا ! ئێمە بنەڕەت و عەشیرەتین و ، تووشی بەلایەکی وەها هاتووین کـە خـۆت لێـی ئاگاداری .. چاکەمان لەگەڵدا بکە ، خوا چاکەت لەگەڵدا بکات .

سەرۆکی ئەم نوێنەرانەی هەوازین ئەبوصورەد ، زوهەیری کوڕی صورەد[٢٥٣] بـوو ، بە وێنەی وتاردەریان هەستایە سەرپێ و وتی :

---

[٢٥٣] زوهەیری کوڕی صورەد لە نەوەی سەعدی کوڕی بەکرە ( واتە لە خاڵوانی پێغەمبەرە ﷺ ) . زوهەیر لە شام نیشتەجێ بووە .

ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەو ئافرەتانەی کە لە حەضیرەکاندا دیل کراون پوور و دایەنی تۆن کە بە خێویان کردوویت . خۆ ئەگەر ئێمە منداڵمان بۆ کوڕی ئەبوشەمەر یان نوعمانی کوڕی مونذیر بەخێو بکردایە ، پاشان بە دەستی ئەوان وەهامان لێ بقەومایە کە بە دەستی تۆ لێمان قەوما ، بە هیوای فەزڵ و سۆزیان ئەبووین ، خۆ تۆ پێغەمبەری خوایت و چاکترین کەسی لە کەفالەتدا . پاشان دەستی کرد بە شیعروتن:

أمنُن علينا رسول الله في كرم فإنك المرءُ نرجوه وننتظرُ

شایانی باسە کە لەگەڵ ئەو نوێنەرانەدا مامەی شیریی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتبوو و ئەویش ستایشێکی زۆری پێغەمبەری کرد و ، داوای لێ کرد چاکەیان لەگەڵ بکات.

کە پێغەمبەری خوا ﷺ وتەی پیاوانی هەوازینی بیست پێی فەرموون : (( نساؤكم وأبناؤكم أحب إليكم أم أموالكم ؟ )) . فەرمووی : ژن و منداڵەکانتان بەلاتانەوە خۆشەویستن یان سامانەکەتان ؟

وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ! لە نێوان کەس‌وکار و ماڵ و سامانەکەماندا سەرپشکمان ئەکەیت ؟ منداڵ و ژنەکانمان بەلاوە خۆشەویستترن .

فەرمووی : (( أما ما كان لي ولبني عبدالمطلب فهو لكم ، وإذا أنا صليت بالناس فقوموا فقولوا : إنا نستشفع برسول الله ﷺ إلى المسلمين ، وبالمسلمين إلى رسول الله ﷺ في أبنائنا ونسائنا ، فإني سأعطيكم عند ذلك وأسأل لكم )) . فەرمووی : هەرچیی هی من و نەوەی عەبدولموطەللیب بێت ، ئەوا پێشکەشتان بێت . کە نوێژم بۆ خەڵکەکەش کرد هەستن بڵێن : پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای موسڵمانەکانەوە و، موسڵمانەکانیش بەلای پێغەمبەری خواوە ﷺ ئەکەینە تکاکار بۆ منداڵەکانمان و ژنەکانمان . ئەو کاتە من پێتان ئەبەخشم و داواشتان بۆ ئەکەم . کە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆی بۆ خەڵکەکە بەجێ ئەهێنا ، هەستان و ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردن وتیان ، ئەویش فەرمووی : (( أما ما كان لي ولبني عبدالمطلب فهو لكم )) . موهاجیرەکانیش وتیان : هەرچیی هی ئێمەیە پێشکەشی پێغەمبەری خوا بێت ﷺ و ، ئەنصاریش وتیان : هەرچیی هی ئێمەشە پێشکەشی پێغەمبەری خوا بێت ﷺ. ئەقرەعی کوڕی حابیسیش وتی : بەڵام ئێمە و نەوەی تەمیم نەخێر . عویەینەش وتی : من و نەوەی فەزارەش نەخێر . عەبباسی کوڕی میرداسیش وتی : من و نەوەی سولەیمیش نەخێر . نەوەی سولەیم وتیان : بەڵکو

هەرچیی هی ئێمەشە پێشکەشی پێغەمبەری خوا بێت ﷺ . عەبباسی کوڕی میرداس بە نەوەی سولەیمی وت : پشتتان بەردام ؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( مَن أمسك منكم بحقه فله بكل إنسان ستة فرائض من أول فيء نصيبه ، فردوا إلى الناس نساءهم وأبناءهم )) . فەرمووی : هەر کەسێ بەشی خۆی ئەهێڵێتەوە ئەوا لە بریی هەموو مرۆڤێك شەش بەشی لە یەکەم دەست کەوتێك کە بێتە دەستمان ئەدەینێ . دەی ژن و منداڵەکان بۆ ئەو خەڵکە بگێڕنەوە .

بە موسڵمانبوونی هەوازین پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر دڵ خۆش بوو و ، هەواڵی مالیکی کوڕی عەوفی [٢٥٤] سەرداری هەوازینیشی پرسیی و ، هەواڵیان دایە کە لە طائیفە لەگەڵ هۆزی ثەقیفدا . ئەویش بەڵێنی پێ دان کە ئەگەر بێت و موسڵمان ببێ کەس‌وکاری بۆ ئەگەڕێتەوە و صەد وشتریشی پێشکەش ئەکرێ . ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا بوو کە کەس‌وکار و سامانی مالیك بە جیا هەڵ بگیرێ و دابەش نەکرێ . مالیك کە ئەو کار چاکی‌یە و ئەو بەڵێنە شیرینەی بیست بە موسڵمانیی هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و ، ئەویش رێزی چاکی لێ گرت و، کردیە ئەمیری خزمەکانی و هەندێ لە هۆزەکانی دەوروبەری . مالیك ئەوەندە دڵی گەرم بوو بە پارچە شیعرێك ستایشی پێغەمبەری خوای ﷺ کرد .

لەلایەکی ترەوە صەفوانی کوڕی ئومەییە یەکێ بوو لە سەردارانی مەککە و پیاوێکی ژیر بوو . صەفوان ئامادەی جەنگی حونەین بوو ، بەلاّم هێشتا موسڵمان نەبووبوو ، بەڵکو مۆڵەتی چوار مانگی هەبوو تا بە ویستی خۆی بڕیاری موسڵمان بوون بدات . صەفوان دۆستی سوپای ئیسلام بوو و چەکێکی زۆریشی بە قەرز دایە موسڵمانەکان . هێشتا لەسەر رێبازی شیرك بوو پێغەمبەری خوا ﷺ صەد وشتری لە بەشە پێنجیەکی دەستکەوتەکانی حونەینی دایە .

---

[٢٥٤] مالیکی کوڕی عەوف لە رادەبەدەر ئازا و بەجەرگ بووە . فەرماندەی بالاّی سوپای هەوازین بوو لە جەنگی حونەین دا و ، بە شێوەی پادشای هەوازینیش تاجی لەسەر کرابوو . ئەگێڕنەوە لە رۆژی حونەین دا مالیك خۆی ویستوویەتی هێرش بکاتە سەر پێغەمبەری خوا ﷺ و بی‌کوژێ ، بەلاّم ئەسپەکەی کە ناوی ( مجاج ) بووە بە گوێی نەکردووە و بەرەو پێش نەچووە و دوای هەوڵێکی زۆر لەگەڵیا پارچە شیعرێکی لەو بارەوە وتووە . مالیك موسڵمان نەبێت ، بەلاّم چاك موسڵمان بوونێك و پێغەمبەری خوایش ﷺ ئەی‌کاتە ئەمیری ئەوانەی کە لە هۆزی ( قیس عیلان ) موسڵمان بوون .

مالیك بەشداریی فەتحی دیمەشق و ، بەشداریی قادسیەی لەگەڵ سەعددا کردووە ، بەلاّم دیار نیە لە کوێ کۆچی دوایی کردووە .

ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ صەفوانی کوڕی ئومەییە بە ناو دەست کەوتەکانی جەنگ‌دا ئەگەڕان ، لەو کاتەدا بە شیوێك‌دا تێپەڕین کە پڕی بوو لە مەڕ و حوشتر و دەنگی باڕەیان بەرز بووبوویەوە . صەفوان بە سەرسوڕمانەوە سەیری شیوەکەی ئەکرد . پێغەمبەر ﷺ لێی پرسیی : (( أعجبك أبا وهب ؟ )) وتی : بەڵێ . فەرمووی : (( هو لك وما فيه )) . فەرمووی : شیوەکە و هەرچیی وا تیایا بۆ تۆ . صەفوان وتی : شاهێدیی ئەدەم کە جگە لە دەروونی پێغەمبەر هیچ دەروونێك ئەمەی پێ خۆش نیە و ، شاهێدییش ئەدەم کە تۆ پێغەمبەری خوایت . بەمە بە چاکیی موسڵمان بوو .

لە صەفوان خۆیەوە ئەگێڕنەوە کە وتوویە : پێغەمبەری خوا ﷺ هەر خەریك بوو لە دەست‌کەوتەکانی حونەین بەشی ئەدام و ، ئەویش لە هەموو شتێ زیاتر رقم لێی بوو ، هەتا بووە کارێك کە هیچ بەدیی‌هێنراوێکی خوا ئەوەندە بە لامەوە خۆشەویست نەبوو .[255]

**نۆهەم : گەڕانەوە بەرەو مەدینە**

دوای ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە دابەش‌کردنی دەست‌کەوتەکان بەسەر سوپای سەرکەوتوودا بۆوە ، کە ئەوەبوو بە پێی فەرمانی قورئان دابەش کران و ، ئەوموسڵمانەکانیش بۆ دڵڕاگیرکردنیان صەدان وشتریان لە پێنج یەك پێ درا و ، دوای ئەوەش کە لە جیعرانە ، کە لە مەککەوە نزیکە ، سیانزە شەو مایەوە ، واتە لە پێنجەمین رۆژی ذولقەعیدەوە هەتا هەژدەهەمین رۆژی ذولقەعیدەی ساڵی هەشتەم ، دوای ئەوە بڕیاری دا بە خۆی و هاوەڵانیەوە بگەڕێنەوە بۆ مەدینە .

بەڵام بەر لەوەی بەرەو مەدینە دەرچن ، چوونە مەککەی پیرۆزەوە و لەگەڵ هاوەڵان دا عومرەیان بەجێ هێنا ..

دوای ئەنجام‌دانی عومرە ، وای بە چاك زانیی کاروباری مەککەی پیرۆز رێك بخات. ئەوەبوو عەتتابی کوڕی ئوسەیدی کردە حاکمی شار و ، کۆمەڵێك لە هاوەڵانیشی لە مەککە بەجێ هێشتن تا کاری فێرکردن و شارەزاکردن لە قورئان و ئەحکامەکانی بگرنە ئەستۆ و دانیشتوانی مەککە ، کە تازە موسڵمان بوون ، لە دین شارەزا بکەن و قورئانیان پێ بڵێن.

---

[255] غزوة حنين لباشميل : ٢٤٩ ـ ٢٩٤ . السيرة النبوية للدكتور علي محمد محمد الصلابي : ٧٨٨ ـ ٨٠٠ .

جا هەرچەندە دانیشتوانی مەککە پێش کۆچ کردن لەگەڵ موسڵمانەکان دا خراپ ئەجوولانەوە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بەسەر عەتتاب دا دا کە بە نەرمیی لەگەڵیان بجووڵێتەوە . ئەوەبوو دوو شەو لە مەککەدا بوون و ، دوای ئەوە بەرەو مەدینە کەوتنە رێ . ئەمەش لە رۆژی پێنج شەممەی بیستەم رۆژی ذولقەعیدەدا بوو.

پێنج یەکی دەست کەوتەکانیش هەندێکی لێ مابوویەوە کە بە هەزاران سەر وشتر و مەڕ ئەبوون ، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانەی بەرەو مەدینە دایە بەر هەتا لە نێوان مەککە و مەدینەدا دڵی ئەو عەرەبانەیان پێ خۆش بکات و بەرەو ئیسلام رایان بکێشێت و ، ئەوەش کە موسڵمان بووە لەسەری دامەزراو بێت ..

شایانی باسە کە عەتتابی کوڕی ئوسەید تەمەنی بیست و سێ ساڵ بوو کە کرایە کاربەدەستی مەککە و لە رۆژی فەتحی مەککەش دا موسڵمان بوویوو . ئەمەش بە هۆی ئەوەوە کە خاوەنی ژیریی و سەلیقە بوو و ، بە چاکییش موسڵمان بوویوو و ، خزمەکانیشی بە چاکیی گوێڕایەڵی یان ئەکرد و بەلای قورەیشەوە خاوەنی رێزی تایبەتیی بوو .

عەتتاب بە درێژایی تەمەنی ئازیز کاربەدەستی مەککە بوو ، کە پێغەمبەری خوایش ﷺ کۆچی دوایی کرد ئەمیری گەنجی مەککە هەڵوێستێکی ژیرانەی هەبوو کە نەی هێشت دانیشتوانی مەککە لە ئیسلام پاشگەز ببنەوە .

عەتتاب لەسەر بەرگریی لە ئیسلام ئەوەندە سوور بوو بڕیاری دابوو هەرکەسێك لە نوێژی جەماعەت دوا بکەوێ لە گەردنی بدات ، چونکە ئەو کەسە مونافیقە . ئەوەبوو دانیشتوانی مەککە بەلای پێغەمبەری خواوە ﷺ شکاتیان لێ کرد و وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا! ئەعرابی یەکی وشکت کردۆتە کاربەدەستی دانیشتوانی مەککە. ئەویش بۆ ستایش کردنی ئەو گەنجە بەغیرەتە ئیمان دامەزراوە فەرمووی : (( إني رأيت فيما يرى النائم أنه ( أي عتاب بن أسيد ) أتى باب الجنة فأخذ بحلقة الباب فقعقعها حتى فتح له ودخل )) . فەرمووی : لە خەوم دا عەتتابم بینیی کە هاتە دەرگای بەهەشت و دەستی بە ئەڵقەی دەرگاکەوە گرت و لێی دا هەتا دەرگاکەی بۆ کرایەوە و چووە ژوورەوە.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ موعاذی کوڕی جەبەل و ئەبوموساى کردنە جێنشینی خۆی لەسەر دانیشتوانی مەککە تا خەڵکەکە فێری قورئان بکەن و لە ئەحکامی دین شارەزایان بکەن . [٢٥٦]

**دەهەم : شەهیدبوونی عورووەی کوڕی مەسعوود**

لە پێشەوە باسمان کرد کە هۆزی ثەقیف باڵێکی گرنگی لە سوپای هەوازین پێك هێنا بوو ، چونکە ثەقیف بریتیی بوو لە چەند عەشیرەتێك و هەر هەموویان لە جەنگی حونەین‌دا بەشداری‌یان کرد و جەنگێکی سەروماڵی‌یان دژی سوپای ئیسلام کرد . ئەوەبوو دوای تێكشکانی هەوازین سوپای ئیسلامیش بە سەرکردایەتیی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی ثەقیفی راو نا ، هەتا ئەوەبوو لە ناچاریی‌دا خۆیان گەیاندە قەڵاکانی طائیف و لەوێ خۆیان پەنا دا . سوپای ئیسلامیش بۆ ماوەیەك گەمارۆی دان و ، لەبەر ئەوەی کەڵکێکی نەبوو دوای ماوەیەك سوپای ئیسلام کشایەوە دوا و ، پێغەمبەری خوا بە هیوا بوو ثەقیف خۆیان بە دەستەوە بدەن و موسڵمان ببن ؛ هەتا داوایان لێ کرد کە لە دژی ثەقیف دوعا بکات ؛ کەچیی بە پێچەوانەوە دوعای هیدایەتی بۆ کردن .

لە کاتێك‌دا کە ثەقیف دژی ئیسلام ئەوەستان مالیکی کوڕی عەوفی سەرکردەی سوپای هەوازین ؛ دوای ئەوەی کە خوا هیدایەتی دا ، دەستی دایە هێرش‌کردنە سەر هۆزی ثەقیف ، بەڵام ئەویش نەی‌توانیی کار بکاتە سەر ورەی ئەو عەشیرەتە بەهێزانە. لە پێشەوە باسمان کرد کە پێش هەڵگیرسانی جەنگی حونەین بە دوو مانگ عورووەی کوڕی مەسعوودی ثەقەفیی لەگەڵ کۆمەڵێك لە پیاوانی هۆزەکەی بەرەو وڵاتی ئوردون کەوتنە رێ و ، خۆیان گەیاندە شاری جەرەش تا لەوێ چەکی قورس بکڕن و خۆشیان لەسەر بەکارهێنانی را بێنن .

بۆیە لە کاتی جەنگی حونەین‌دا عورووە ئامادە نەبوو ، ئەگینا ئەو ئەبووە سەرکردەی سوپای هەوازین لە جیاتی مالیکی کوڕی عەوف .

عورووە پیاوێکی ژیری دامەزراوی زۆر بەسەلیقە بوو ، بۆیە بەلای هۆزەکەیەوە زۆر بەڕێز بوو . ئەوەبوو لە گەشتەکەی‌دا سێ مانگی پێ چوو ؛ واتە دوای تەواوبوونی

[٢٥٦] غزوة حنين لباشميل : ٢٩٥ ـ ٣٠٠ .

جەنگی حونەین و دۆڕانی هەوازین لە جەنگێکی ناهەمواری نەخشە منالانەدا ، گەڕایەوە ..

ژیریی و سەلیقەی عورروە بوونە چاوساغی و بە جوانیی سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد . سەرنجی دا تازە بتپەرستیی لەگەڵ ئیسلامدا توانای جەنگ و هەرای نیە و ، تەنها هۆزەکەی ئەو لەسەر بتپەرستیی ماوەتەوە . خۆ ئەگەر هەوازین بەو هەموو هێزەوە دۆڕا بێ ، تازە هیچ هێزێك و هیچ سوپایەك بەرامبەر بە موسڵمانان چەکی بۆ بەرز نابێتەوە .

لێرەدا خوای گەورە ئیلهامی خستە دڵی عورروەی کوڕی مەسعوودەوە و هەستی کرد کە ئیسلام سەر ئەکەوێ و ، دوای ماوەیەکی کەمیش هەموو دوورگە خۆی بە دەستەوە ئەدات .

عورروە لە کۆتایی ساڵی هەشتەمی کۆچییدا بوو گەیشتەوە ناو کەس‌وکاری .. لەلایەکەوە خۆشەویستیی ئیسلام چوو بووە دڵیەوە و ، لەلایەکی تریشەوە سێ مانگ لەوەوبەر بەڵێنی بە هۆزەکەی دابوو کە بچێ چەکی قورسیان بۆ بکرێت . بۆیە وای بە چاك زانیی ، وەك پیاوێکی مەرد ، بەڵێنەکەی بۆ خزمەکانی بەسەر بەرێت ، ئەوەبوو ئەمانەتەکەی گەیاند و ، لەگەڵ خزمەکانیدا بێوەعدیی لێ دەرنەکەوت . لەولاشەوە خۆشەویستیی ئیسلام چوو بووە دڵیەوە ، بۆیە بەبێ دەنگ و بەبێ راوێژ طائیفی بەجێ هێشت و ، بەرەو مەدینە کەوتە رێ تا لەوێ لەسەر دەستی پێغەمبەری ئازیزدا ﷺ ئیمان بهێنێ ..

کە گەیشتە مەدینە لەلایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ پێشوازییەکی گەرمی لێ کرا ، چونکە لەوەو پێش چاوی پێ کەوتبوو ، کاتێك کە ناوبژیی‌کەری حودەیبیە بوو بۆ رێکخستنی موسڵمانەکان و قورەیش .

کاتێك کە عورروە ئیمانی هێنا و شاهێدیی حەقی دا ، بڕیاری دا بگەڕێتەوە طائیف بۆ ناو قەومەکەی و بانگیان بکات بۆ موسڵمانبوون . بۆ ئەمە داوای مۆڵەتی لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد ، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ ئاگاداری کرد کە ئەی‌کوژن.

عورروە سەردارێکی خۆشەویستی وتە بیستراو و فەرمان جێ بەجێ کراو بوو ، ئەویش بە بۆنەی پایەداریی و رەوشت جوانی‌یەوە و ، وەهای بە بیردا ئەهات کە ثەقیف هەر هەموو بە جارێك ئیمان بهێنن .

که عورروه داوای مۆڵەتی کرد بۆ گەڕانەوە پێغەمبەری خوا ﷺ سێ جار لێی دووبارە کردەوە که خزمەکانی ئەی‌کوژن . ئەویش وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! منیان لە گەورە کوڕەکانیان خۆشتر ئەوێت .. ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەگەر بم بینن خەوتووم هەڵم ناسێنن . ئەو کاتە ئەویش مۆڵەتی دا ..

دوای پێنج رۆژ عورروە گەیشتەوە طائیف . کە گەیشتە بەرەوە خێرا ثەقیف کەوتە گومان لە عورروە .. هەموو جارێك کە لە سەفەر ئەگەڕایەوە کارێکی ئەنجام ئەدا ، بەڵام ئەم جارەیان دیار نەبوو ، کە ئەویش بەندایەتیی دەربڕین بوو بۆ ( لات ) ی بتە گەورە . ئەمجارە عورروە خۆی لە قەرەی لات نەدا و راستەوخۆ بەرەو ماڵەوە رۆیشت . دوای ئەوە پیاوماقووڵانی قەومەکەی هاتنە سەردانی تا بزانن چیی رووی داوە .. بە سەلامی نەفامیی هاتنە لای . بەڵام عورروە ئاگاداری کردن کە ئەو موسڵمان بووە و هیوادارە هەموویان ئیمان بهێنن . تێی گەیاندن کە ئیسلام کارێك نیە مرۆڤی ژێر خۆی لێ لا بدا .. بەڵام ئەوان ئەمەیان لێ نەبیست و وتیان : بە لات ئەوە هات بە دڵماندا کە لە دین وەرگەڕاوی ، کە ئەوەبوو نزیکی خواکەمان نەکەوتیت و لەلای‌دا سەرت نەتاشی .

قەومەکەی ئازارێکی زۆریان دا و قسەیان پێ وت ، بەڵام ئەو لەگەڵیان ئارامی گرت . پاشان هەستان و کەوتنە تەگبیری لە ناوبردنی . کە رۆژ بوویەوە و کاتی نوێژی بەیانیی هات چووە سەربانی ژوورێك تا بانگ بدات ، پیاوێك بە ناوی وەهبی کوڕی جابیر یان ئەوسی کوڕی عەوف لە نەوەی مالیك تیرێکی تێ گرت و دای لە خوێنبەری قۆڵی و خوێنەکەی نەئەوەستایەوە . کەس‌وکاری دەستیان دایە چەك و کەس‌وکاری بکوژەکەیش دەستیان دایە چەك . کە عورروەی خواناس ئەوەی دیی وتی : لەسەر من دەست مەدەنە کوشتار ، من خوێنی خۆمم کردووە بە صەدەقە تا ئیصلاحی نێوانتان بکرێت . ئەمە رێزێك بوو خوا لێمی گرت . خوای گەورە شەهیدیی خەڵات کردم .. شاهێدیی ئەدەم کە موحەممەد پێغەمبەری خوایە . هەواڵی ئێوەی پێ دام کە ئێوە ئەم‌کوژن . پاشان بە خزمەکانی وت : لەلای ئەو شەهیدانەدا بم نێژن کە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بوون و شەهید بوون ، بەر لەوەی بگەڕێتەوە و وازتان لێ بهێنێ ؟ ئەوانیش بە گوێیان کرد .

کە هەواڵی شەهیدبوونی عورروە بە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت فەرمووی: (( مثل عروة مثل صاحب یاسین ، دعا قومه إلى الله عز وجل فقتلوه )) . فەرمووی :

عوورەش وەك ئیمان دارەکەی سوورەتی ( یاسین ) ی بەسەر هاتووە ، کە بانگی قەومەکەی ئەکرد بۆ لای خوا ، کەچیی ئەوان شەهیدیان کرد ..

کە عوروە شەهید کرا ، ئەبومەلیحی کوڕی عوروەی کوڕی مەسعوود و قاریبی کوڕی ئەسوەدی کوڕی مەسعوود کە برازای عوروە خۆی بوو هەردووکیان بە دانیشتوانی طائیفیان وت : بۆ هیچ کارێك لەگەڵتان یەك ناگرین ، دوای ئەوەی کە عوروەتان شەهید کرد .

پاشان هەردووکیان بە جووت خۆیان گەیاندە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و موسڵمان بوون . پێغەمبەری خوا ﷺ سەرپشکی کردن تا بچنە پاڵ هەر کەس کە فەرمووی : (( تولّيا من شئتما )) . وتیان : ئەچینە پاڵ خوا و پێغەمبەرەکەی . فەرمووی : (( وخالكما أبو سفيان إبن حرب ، حالفاه )) . فەرمووی : ببنە هاوپەیمانی ئەبوسوفیانی خاڵۆتان . ئەوانیش وایان کرد و ، بوونە میوانی موغیرەی کوڕی شوعبە، کە ئەویش برازای عوروەی کوڕی مەسعوود بوو و ، لە مەدینە مانەوە هەتا لە مانگی رەمەزانی ساڵی نۆهەمدا نوێنەرانی ثەقیف هاتن بۆ موسڵمان بوون .[٢٥٧]

**یانزەهەم : کوژراوانی هەردوولا لە حونەین دا**

بە سەرنج دانی سەرچاوە ئیسلامی یەکان دەرئەکەوێ کە تەنها ناوی چوار کەس هاتووە کە لە ریزی موسڵمانەکان دا لە حونەین دا شەهید کرا بن کە ئەمانەن :

١ ـ ئەیمەنی کوڕی عوبەید ، کە کوڕی ئوم ئەیمەنی بەخێوکەری پێغەمبەری خوا ﷺ بووە ، کە بەلای ئیبن ئیسحاقەوە قورەیشی یە .

٢ ـ سوراقەی کوڕی حاریث ، ئەنصاریی بووە .

٣ ـ رەقیمی کوڕی ثابیت ، بەلاَم بەلای ئیبن ئیسحاقەوە یەزیدی کوڕی زەمعەی کوڕی ئەسوەدی کوڕی عەبدولموطەللیبە .

---

[٢٥٧] غزوة حنين لباشميل : ٣٠٠ ـ ٣١٠ ، السيرة النبوية للصلابي : ٧٩٣ .

٤ ـ ئەبوعامیری ئەشعەریی مامەی ئەبومووسای ئەشعەریی .
لە باسی کوژراوانی هەوازینیش‌دا تەنها ناوی چوار کەس هاتووە کە ئەمانەن :
١ ـ لەجلاج .
٢ ـ پیاوێك بە ناوی وەهب .
٣ـ عوثمانی کوڕی عەبدوڵلا کە سەرداری ثەقیف بووە .
٤ ـ عەوفی کوڕی رەبیع کە نازناوەکەی ( ذي الخمار ) بووە .
بەلاَم سەرچاوەکان ئەوە ئەخەنە بەرچاو کە لە هەوازین خەڵکێکی زۆر کوژراوە .
بۆ نموونە نەوەی نەصر کە هۆزی مالیکی کوڕی عـەوفی فەرمانـدە بـوون باسـیان وەها هاتووە کە خەریکە ببڕێنەوە ، بە رادەیەك کە یەکێ لـە موسـڵمانەکان کـە لـەو تیرەیە ، هەرچەندە موشریك بوون ، بەزەیی پیایانا دێتەوە و ئەڵێت : ئەی پێغەمبەری خوا ! نەوەی رەباب تیاچوون . ئەویش دوعای خێری بۆ کردن . لەوانەیـە بـە صـەدان لەم هۆزە کوژرا بن . ئیتر با تیرەکانی تر بوەستن ، چونکە مەگەر سوپای ئیسـلام لـە موتتەدا ئەو جەنگە سەخت و خوێناوی‌یەی حونەینی ئەنجام دابێت .
هەروەها شەهیدانی ئیسلام لە جەنگێکی ئاوەها سەخت‌دا جێـی بـڕوا نیـە تـەنها چوار پیاویان لێ شەهید بووبن ، ، بە تایبەت کە لە سەرەتای جەنگەوە موسڵمانەکان لە تاریکیی بەرەبەیان‌دا ئەکەونە ناو کـەمینی هەوازینـەوە ، ئـەویش لـە شـوێنێکی تەنگەبەرەی سەخت‌دا و، لە کـاتێکی نـاخلۆف‌دا . دوایـیش کـە موسـڵمانەکان کـۆ ئەبنەوە و جەنگ گەرم ئەبێ ، هەوازین کە هۆزێکی یەکجار جەنگـەران و دڕ ئـەبن ، جەنگی سەروماڵیی ئەکەن و بە بیسـت هـەزار جـەنگاوەرەوە لـەو بیابانـەدا دەسـت ئەوەشێنن ، کەی جێی بڕوایە تەنها چوار موسڵمان شەهید بووبن ؟
هەر چۆن لێکی بدەینەوە لەو جەنگە ناهەموارەدا لە سـوپایەکی بیسـت هـەزاریی هـەوازین‌دا نزیکـەی هـەزار کـەس ئـەکوژرێن و ، صـەدانیش لـە سـوپا دوانـزە هەزاری‌یەکەی ئیسلام شەهید ئەبن .
ئەمەش هەندێك لەو هۆیانەی کە مێژوونووسان ژمارەی شـەهید و کوژراویـان بـە تەواویی نەنووسیوە :
١ ـ چ لەناو سوپای ئیسلام و چ لەناو سوپای هەوازین‌دا کەسانێك دانەنرابوون تـا سەرژمێری‌یەکی گشتیی بۆ کوژراو و زامدار و بەدیل گیراو بکەن .

٢ ـ لەو سەردەمەدا تۆماری ژمارەی سەربازان نەئەکرا ، تا لە کاتی پێویستدا بە پێی ئەوە سەرژمێریی سەربازان بکرێ و شەهیدان دیاریی بکرێن .

٣ ـ لە جەنگی حونەیندا خەڵکێکی زۆری بیابان نشین سەربازی سوپای ئیسلام بوون و ئەمانە بە ئاسانیی نەئەناسران و دوا بە دوای جەنگیش گەڕانەوە بۆ ناوچەی خۆیان بۆ ئەنجامدانی کاری رۆژانەیان .. ئیتر هەموو هۆزێك بۆ خۆی ئەی‌زانیی چەند پیاوی بە پلەی شەهیدیی گەیشتوون ، بەڵام بەو ئاسانی‌یە ناوی هەموو ئەوانە یان ژمارەیان لە مەدینەی پایتەختدا کۆ نەئەکرایەوە ، بە تایبەت کە مێژووی ئەوە لە سەدەی دووهەمدا تۆمار کراوە .[258]

**دوانزەهەم : دەرسەکانی حونەین**

**أ ـ هۆیەکانی تێك شکانی سوپای ئیسلام :**

**( ١ ) لە خۆبایی بوون :**

تا ئەو رۆژە موسڵمانەکان سوپای وەها زۆریان بۆ جەم نەکرابوو ، بۆیە هەندێ لە ئەندامانی ئەو سوپایە دەستیان دایە شانازیی و لە خۆ رازیی بوون و ، سەرەنجام پشت گوێ خستن و ساردبوونەوە .

**( ٢ ) کۆك بوونی سوپای دوژمن :**

بە پێچەوانەوە ، هەرچەندە سوپای دوژمن زیاتریش بوو ، بەڵام هێزی بازووی موسڵمانەکانیان بیستبوو ، بۆیە زۆر بە چاکیی خۆیان ئامادەی ئەو جەنگە سەرومالی‌یە ئەکرد ، هەتا ژن و منداڵ و ئاژەڵیان لە دوای سوپاوە ریز کردبوون و ، تەپ و تۆزێکی وەها بە حەوادا ئەچوو ، وا ئەزانرا سوپایەکی صەد هەزاری‌یە . ئەمەش کاریگەریی لەسەر گیانی مەعنەویی موسڵمانەکان هەبوو .

**( ٣ ) هەل بەدەست هێنان :**

فەرماندەی هەوازین هەلی بە دەست هێنا و ، لە پێش موسڵمانانەوە خۆی گەیاندە شیوی حونەین و ، شوێنی گونجاوی بۆ سوپاکەی هەڵ بژارد و ، موسڵمانەکانی ناچار کردن کە لە شوێنێکی سەختی تەنگەبەرەدا تێپەڕ بکەن و ، لەبەر ئەوەش کە بەشی پێشەوەی سوپا ئەسپ سوار بوون بەشێکی زۆری رێك و پێکی‌یان لە دەست دا و ،

---

[258] غزوة لباشميل : ٣٥١ ـ ٣٥٨ .

سەرەنجام کەمینەکانی هەوازین لەو شوێنە سەختانەدا دەستی خۆیان وەشاند و سوپای ئیسلامیش خۆی بۆ کارەساتی ئاوەها ئامادە نەکردبوو .

( ٤ ) وریایی فەرماندەی هەوازین :

لەبەر ئەوەی کە فەرماندەی هەوازین شارەزای ناوچەکە بوو ، لە تاریکیی شەو و لەو شوێنە سەختانەدا کەمینی دانا ، تا لە تاریکیی بەرەبەیاندا دەست لە موسڵمانەکان بوەشێنن .

( ٥ ) نهێنیی پاراستنی هەوازین :

سوپای هەوازین توانیی پارێزگاریی لە نهێنییەکان بکات ، تا سوپای ئیسلام هیچ هەواڵێك دەربارەی ئەو کەمینانە نەزانێت . جا مالیکی کوڕی عەوف خۆی ئەو شوێنانەی دیاریی کردن و لە تاریکیی شەودا کەمینەکانی دانان .

( ٦ ) زانیاریی وەرگرتنی دەورییەکانی دوژمن :

دەورییەکانی هەوازین توانییان وردترین زانیاریی دەربارەی سوپای ئیسلام وەرگرن و ، هەواڵی ژمارەی سەربازان و کاتی بەرێ کەوتنیان بزانن . بۆیە ئەیانزانیی لەگەڵ فەجردا ئەگەنە ئەو شوێنە کە کەمینەکانیان تیا دانابوو .

( ٧ ) بەشداریی کردنی قورەیشیی و کەنانەیی :

لەگەڵ سوپای موسڵمانەکاندا کۆمەڵێك لە قورەیش و کەنانە هاتبوون کە بە رواڵەت موسڵمان بووبوون ، بەڵام ئیمان نەچووبووە ناو کرۆکی دڵیانەوە . ئەمانە پێیان خۆش بوو موسڵمانەکان تێك بشکێن و سوپای هەوازین موسڵمانەکان لە مەککەدا دەر بپەڕێنێ . ئەمانە یەکەم سات دەستیان دایە هەڵاتن و ورەی خەڵکەکەی تریشیان رووخاند ..

ب ـ هۆیەکانی سەرکەوتنی موسڵمانەکان :

( ١ ) دامەزراویی پێغەمبەری خوا ﷺ :

ئەمە هۆی بنەڕەتیی بوو بۆ دەربازبوونی سوپای ئیسلام لەو داوەی کە تێی کەوتبوو .. لەو لێقەومانەی کە لە ناکاودا هاتە ڕێی . تا لەو ساتە ناسکەدا پاڵەوانێتیی پێغەمبەری رزگارکەر ﷺ دەرکەوت .. وەك خۆی دامەزراو بوو کاریشی کردە سەر ورەی تێك شکاوەکان و هاتنە لای و دەورەیان لێ دا .. بۆیە تێك شکانەکە یەکجار کاتیی بوو .. زۆری نەخایاند .. هەر ئەوەبوو کە ڕۆژ بوویەوە و موسڵمانەکان کەوتنە چارەسەری شپرزەیی خۆیان ، ئیتر لەو لێ قەومانە سەختە رزگاریان بوو .. بە

پەلە هاتنەوە مەیدان و چوونەوە پلەی ئازایەتیی و فیداکاریی خۆیان . نەك هەر ئەمجارە ، بەڵکو هەر هەمیشە دەرکەوتووە کە پایەداریی و چاونەترسیی ئازیز لە ئاستێك‌دا نیە کەسێك بتوانێ شوێن پێی هەڵ بگرێ .

( ٢ ) دامەزراویی صەد کەس لە دەوری :

بە دامەزراویی پێغەمبەری خوا ﷺ صەد لە موسڵمانە پلە یەکەکان بە چاکیی و پاکیی لە دەوری جەم بوون و ، بوونە بەردی بناغە بۆ جەم بوونەوەی سوپای ئیسلام ، تا بە غیرەتێکی بێ‌ئەندازەوە هەوازین بدەن بە زەویی‌دا ..

پێغەمبەر ﷺ بەو صەد ئیمان‌دارەوە هێرشیکی توندی کردە سەر چەند یەکەیەکی دوژمن و تووشی زیانێکی زۆریان کرد و هەندێکیان لێ بە دیل گرتن ، کە ئەوەبوو موسڵمانە هەڵاتووەکان کە گەڕانەوە ئەبینن وا دیلەکانی هەوازین لەبەردەم پێغەمبەری خوادان و دەست و پەلیان بە گوریس بەستراوە .

( ٣ ) ورەڕووخانی هەوازین :

بە هۆی دامەزراویی پێغەمبەرەوە و ، هێرش بردنی بەو سوپا صەد کەسیە بچکۆلەوە بۆ سەر هەوازین ، هەوازین وایان زانیی کە سوپای ئیسلام هەمووی تێك نەشکاوە ، ئەمەش کاری کردە سەر ورەیان و لە هێرش‌کردن دەست‌کۆتا بوون و ، بەو ورە رووخانەشیان دەستیان دایە بەرگریی و بەرگرییشیان پێ نەکرا .

( ٤ ) بانگ کردنەوەی عەبباس :

عەبباسی کوڕی عەبدولموطەللیبیش دەوری کاریگەری هەبوو بۆ گێڕانەوەی هەڵاتوان ، کە ئەمیش یەکێ بوو لە صەد پیاوە دامەزراوەکە و ، بە فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەنگە بەرزەکەیەوە بانگی کردە موسڵمانە هەڵاتووەکان . خوا لێی رازیی بێ ئەوەندە دەنگی بەرز بوو بۆ ماوەی چەند میلیك ئەڕۆی . بەمە گەڕانەوە و بە یەکجار بوونە گەردەلوولێکی توند کە هیچ شتێ بەرگەی نەئەگرت ، چ جای سوپای بیست هەزاریی هەوازین . ئەوەبوو بە وێنەی گەڵا وشکەی دەم رەشەبا یاری‌یان پێ ئەکردن .

( ٥ ) هاویشتنی مشتە چەوێك :

پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەو رووی کافران مشتە چەوێکی هاوێشت و پاشانیش فەرمووی : (( إنهزموا ورب الكعبة )). فەرمووی : بە پەروەردگاری کەعبە تێك شکان..

**( ٦ ) پاڕانەوە و هانابردن :**

پاڕانەوە و هانابردنی پێغەمبەری خوا ﷺ و لالآنەوەی لە دەرگانەی پەروەردگاردا، بۆ سەرخستنی سوپای ئیسلام .

**( ٧ ) هاتنە خوارەوەی مەلائیکەت :**

هاتنەخوارەوەی مەلائیکەت و بەشدارییکردنیان لە جەنگ دا ، وەك قورئان ئاماژەی بۆ ئەکات .

**ج ـ هۆیەکانی تێك شکانی هەوازین :**

بێگومان مالیکی کوڕی عەوفی سەرداری هەوازین سەرکردەیەکی پالەوانی زۆر ئازا بوو ، بە رادەیەك کە ئەو بیست هەزار جەنگاوەرەی هەوازین هەموو گوێڕایەڵیی چاکیان بۆ ئەکرد . بۆ نموونە هەر کە وتارە حەماسی یەکەی بۆ دان ، داواشی لێ کردن کە کێلانی شمشێرەکانیان بشکێنن ، ئەوانیش هەر هەموویان شکاندنیان . هەروەها مالیك ئەوپەڕی هەوڵی دا ، هەتا دوای تێك شکانی هۆزەکانی تری هەوازین، ئەوەبوو لەگەڵ هۆزەکەی خۆی دا ، نەوەی نەصر ، ئەوپەڕی دامەزراوی یان نواند و خەڵکێکی یەکجار زۆریان لێ کوژرا ، بە هیوای ئەوەی پشت لە جەنگ نەکەن . بەڵام بێهودە بوو ، سوپای هەوازین هەر هەمووی بەرگەی شالآوی سوپای رق هەستاوی موسڵمانانی نەئەگرت ، چ جای بەشێکی کەمی .

ئەمەش هەندێ لە هۆیەکانی تێك شکانی هەوازین :

**( ١ ) نەبوونی عەقیدە :**

موسڵمانەکان چونکە خاوەنی عەقیدە بوون شەهیدبوونیان بە لاوە خۆشەویست تر بوو لە سەرکەوتن ، لەبەر ئەوە بەوپەڕی غیرەتەوە ئەچوونە مەیدان . بەڵام هەوازین بە پێچەوانەوە ، جگە بۆ سەرکەوتن و تالآن و بڕۆ دەستیان شمشێری نەئەگرت و جەنگیان بۆ نەئەکرا ، بۆیە ویستیان بە ژن و منداڵ و ئاژەڵ ورە و پشتیوان بۆ سوپاکەیان دروست بکەن .

**( ٢ ) بیری تەسکی خێڵایەتیی :**

بیری تەسکی خێڵایەتیی و بەرگریی لە خێڵ هەموو ئامانجێکی سوپای کوفر بوو ، بۆیە سەربازەکانی نەیانئەتوانیی وەك موسڵمانەکان فیداکاریی بنوێنن . چونکە موسڵمان بۆ رەزامەندیی خوا و سەرخستنی بیروباوەڕی ئیسلام ئەجەنگێ .

**( ٣ ) بڕوا نەبوون بە قیامەت :**

**لەبەر ئەوەی کە سوپای هەوازین بڕوای بە قیامەت و زیندووبوونەوە نەبوو ئەوا بە بەهەشت گەیشتن لە دڵی سەربازەکانی‌دا نەبوو ، تا خۆیان بە کوشت بدەن ، بەڵکو هەموو ئاواتێکیان تالآن کردن بوو ، ئەویش ئەگەر بە ئاسانیی دەستی بکەوێ ، ئەگینا خۆیان نەئەخستە مەترسی‌یەوە.**

**( ٤ ) غروور و ئیستیبدادی فەرماندە :**

**مالیکی کوڕی عەوف هەر چەندە گەنجێکی ئازا بوو ، بەلآم دوو سیفەتی خراپی هەبوون کە بریتیی بوون لە غروور تا ئەوپەڕی پلە و ئیستیبداد کە تەنها بە گوێی خۆی ئەکرد . هەتا راکەی دورەیدی کوڕی صومەی دایە دواوە و ، ژن و منالٚ و ئاژەڵ و سامانی هەوازینی خستبووە گەل سوپا . ئەوەندەش لە خۆی بایی بوو بوو گاڵتەی بە هێزی بازووی موسڵمانەکان ئەهات .**

**( ٥ ) دووبەرەکیی هۆزی هەوازین :**

**بەڵێ هەوازین بیست هەزار جەنگاوەری جەم کردبوو ، بەلآم ئەوە هێزی راستەقینەی ئەو هۆزە دڕندەیە نەبوو .. ئەوەبوو هەر لە یەکەم ساتەوە دوو هۆزی زۆر لێ‌هاتووی هەوازین بڕیاریان دا نەچن بە گژی موسڵمانەکان‌دا ، کە ئەوانیش هۆزی کەعب [259] و کیلاب [260] بوون. هەتا کە دورەیدی کوڕی صومە بیستی وا ئەم دوو هۆزە بەشداریی جەنگ ناکەن دەری بڕیی کە ئەوەی پیاوی مەیدان بووە نەهاتووە و ، ئەگەر ئەو رۆژەش رۆژی هەوازین بوایە ئەو دووانە بەشداری‌یان ئەکرد .. هۆزێکی تریش بە ناوی نەوەی هیلال بەشی زۆریان دواکەوتن . کە دورەید لە حونەین‌دا دیی وا ئەو سێ هۆزە بەشداریی ناکەن و ، مالیکیش ژن و منداڵ و ئاژەڵ و سامانی هەوازینی هێناوەتە مەیدانی جەنگەوە ، هاواری کردە هەوازین تا بگەڕێنەوە و جەنگ نەکەن .**

---

[259] کەعب کوڕی رەبیعەی کوڕی عامیری کوڕی صەعصەعەی کوڕی موعاویەی کوڕی بەکری کوڕی هەوازینە . مەنزڵەکانیان لە نێوان توهامە و مەدینە و شام دان .. بە ئازایەتیی و شەرەف داریی بەناوبانگ بوون .

[260] کیلابیش لە گەورەترین بنەماڵەی هەوازین بوون . کیلابیش برای کەعبی کوڕی رەبیعە بوو . لە ناوچەی نەجد و مەدینە و فەدەك و عەوالیی‌دا ژیاون . لە شامیش‌دا بلآوەیان کردبوو . زۆر ئازا و جەنگاوەر بوون و سەرەنجام دەستیان بەسەر حەڵەب و دەوروبەری و زۆرێك لە شارەکانی شام دا رۆیشتووە .

( ٦ ) ترس و لەرز :

هۆیەکی تری تێکشکانی هەوازین بریتی‌یە لەو ترس و لەرزەی کە خوای گەورە خستیە دڵی سەربازانی هەوازینەوە ، بەوەی کە ئەسپ سواریان ئەبینی و دژیان ئەجەنگان و تەنها جەنگاوەرانی هەوازینیش ئەیان‌بینین .

د- هۆیەکانی نەگرتنی طائیف :

کە سوپای هەوازین تیك شکا و هەڵ هات ، سوپای موسڵمانان کەوتە دوای هەتا قەڵاکانی طائیف و لەوێ ثەقیف خۆیان مەحکەم کرد و ، دوای ئابڵوقەدانیش بۆ ماوەیەك موسڵمانەکان دەست‌بەرداری طائیف بوون و گەڕانەوە .

ئەمەش هەندێ لە هۆیەکانی سەرنەکەوتنی موسڵمانەکان :

( ١ ) قەڵای مەحکەم :

قەڵاکانی طائیف مەحکەم بوون و بەو ئاسانی‌یە بۆ سوپای دەرەکیی نەئەگیران . هەتا موسڵمانەکان بە چەکی قورسیش وەك مەنجەنیق و دەبابە هێرشیان کردە سەریان، بەڵام بەرگریی ثەقیف توند و بەهێز بوو ، بۆیە ئەوەش کاری تێ نەکردن .

( ٢ ) ئازایەتیی :

ثەقیف لە هەموو بەشەکانی تری هەوازین ئازاتر و جەنگەرانتر بوون و ، تەنها لەوان لە رۆژی حونەین‌دا صەد پیاو کوژران ، کە یەکێکیان عەبدوڵڵای کوڕی عوثمانی فەرماندەیان بوو . ئەوەبوو ئەوەندە خۆراك و پێویستی‌یان بردبووە ناو قەڵاکانیانەوە کە بەشی ساڵێکیان بکات و ، ئاویش لە ناوقەڵاکان‌دا زۆر بوو .

ثەقیف زۆر لێ هاتوو بوون بە تایبەت لە تیروەشاندن‌دا ، ئەوەبوو هەندێك لە موسڵمانەکانیان شەهید کردن . کاتێکیش کە موسڵمانەکان دەبابەیان بەکار هێنا ، ئەوانیش توانی‌یان بە گوللە قازیفەی ئاسنینی گەرم ئەو دەبابانە بسووتێنن .

( ٣ ) نارەحەتیی زۆر مانەوە :

زۆر مانەوەی موسڵمانەکان لە دەوری قەڵاکان‌دا کارێکی یەکجار گران بوو ، چونکە هەتا ثەقیف خۆراکیان لەلابوایە باکیان لە گەماروودان نەبوو ، کە ئەوەبوو زەخیرەی ساڵێکیان جەم کردبوو و ، موسڵمانەکانیش ماوەی ئاوەها زۆر نەیان ئەتوانیی بمێننەوە .

( ٤ ) **مەترسیی نەبوون لە هەوازین :**

**لەبەر ئەوەی هۆزەکانی دەوروبەری طائیف هەر هەموو موسڵمان بوو بوون ثەقیف تەنیا کەوتبوو و ، مەترسی‌یەکی ئەوتۆی لەسەر موسڵمانەکان نەبوو و ، هۆزەکانی دەوروبەریش بەش بە حاڵی خۆیان ثەقیفیان بێ‌تاقەت ئەکرد ، بە تایبەتیی دوای موسڵمانبوونی مالیکی کوڕی عەوفی پادشای هەوازین . ئەوەبوو یەك لە دوای یەك هێرشی ئەکردە سەر ثەقیف .**

( ٥ ) **فەرمانی ئاسمان :**

**چەسپاوە کە فەرمان لە ئاسمانەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە کە ئابڵوقە لەسەر طائیف هەڵ بگرێ ، چونکە خۆیان دێن بۆ موسڵمان بوون . هەر وایش بوو .**[٢٦١]

---

[٢٦١] غزوة حنين لباشميل : ٣٦١ ـ ٣٨٧ .

## بەشی چل و دووهەم

# ڕووداوەکانی نێوان حونەین و تەبووك

پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە مەدینەوە بەرەو مەککە کەوتە ڕێ تا فەتحی مەککە بکات و دواییش کە جەنگی حونەین و طائیف هاتنە بەرەوە ، هەتا گەیشتەوە مەدینە دوو مانگ و شانزە ڕۆژی پێ چوو ، کە ئەوەبوو لە ڕۆژی جومعەی بیست و حەوتەمی مانگی ذولقەعیدەی ساڵی هەشتەمدا گەیشتەوە مەدینە .[٢٦٢]

ئێستاش با هەندێ لە ڕووداوەکانی نێوان حونەین و تەبووك بخەینە بەر دەستی ئازیزان :

**یەکەم : موسڵمانبوونی کەعبی کوڕی زوهەیری کوڕی ئەبوسەلما**

کەعبی کوڕی زوهەیریش یەکێ بوو لەوانەی کە زۆرێك هەجووی پێغەمبەری کردبوو و ئەویش خوێنی ئەوی حەڵاڵ کردبوو . جا کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە طائیف گەڕایەوە کەعبی کوڕی زوهەیر ، کە خۆیشی و باوکیشی شاعیر بوون ، دنیای لێ هاتبووە یەك و نەیئەزانیی خۆی لە کوێ حەشار بدات . ئەوەبوو ( بوجەیر ) ی برای هەڵی نا تا بە تەوبەکاریی و موسڵمانبوونەوە بێتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ ، ئەگینا دوایی بە خۆی گیر ئەخوات . ئەوەبوو لە ستایشی پێغەمبەری خوادا قەسیدە بەناوبانگەکەی ( بانت سعاد ) ی ڕێك خست و ، هاتە مەدینە و ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی بەیانیی بۆوە ، کەعب هاتە خزمەتی و لەبەردەمیدا دانیشت و دەستی خستە ناو دەستی و ، پێغەمبەری خواش ﷺ نەیئەناسی . وتی : کەعبی کوڕی زوهەیر بە تەوبە و موسڵمانێتیی هاتە خزمەتت و داوای ئەمانت لێ ئەکات ، ئایا لێی وەرئەگریی ؟ پیاوێکی ئەنصاریی هەڵمەتی کوتایە سەری و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! لێم گەڕێ بۆ دوژمنی خوا تا لە ملی بدەم . فەرمووی : (( دعه عنك فقد جاء تائباً نازعاً )) . فەرمووی : وازی لێ بهێنە بە تەوبەکاریی و کوڵ

---

[٢٦٢] المنهج التربوي للسيرة النبوية للغضبان : ٣ / ١٩٣ .

دانەوە هاتووە . پاشان قەسیدەکەی وت . ئەڵێن کە ئەو قەسیدەیە بە پێغەمبەری خوادا ﷺ ئەڵێ ، عەباکەی سەرشانی خۆی ئەدا پێی ، کە ئەوەبوو پاشان کەوتە دەست خەلیفەکان .[٢٦٣]

بە موسڵمانبوونی کەعبی کوڕی زوهەیر دەوری شاعیرە نەیارەکانی ئیسلام تەواو بوو .

ئیبن هیشام وتوویە : وتراویشە کە کاتێك ئەو شیعرەی خوێندەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە : (( لولا ذكرت الأنصار بخير فإنهم لذلك أهل )) . ئەفەرموێ : خۆزگە ستایشی ئەنصاریشت بکردایە ، چونکە شایانی ئەوەن . ئەویش ئەڵێت :

مَن سرّه كرم الحياة فلا يزل ... في منقَب من صالحي الأنصار

ورثوا المكارم كابراً عن كابرٍ ... إن الخيار همو بنو الأخيار

هەتا ئەگاتە :

والبائعين نفوسهم لنبيهم ... للموت يوم تعانق و كرار[٢٦٤]

دووهەم : ڕێک و پێک کردنی کاروباری زەکات

کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە کۆتایی مانگی ذولقەعیدەی ساڵی هەشتەمدا گەیشتەوە مەدینە ، ئەوەندەی پێ نەچوو موحەڕڕەمی ساڵی نۆهەم هاتە بەرەوە و ، لەو مانگەدا پیاوانی کۆکەرەوەی زەکاتی ناردن بۆ لای هۆزەکان کە ئەمانە بوون :

( ١ ) بورەیدەی کوڕی حەصیب ... بۆ ئەسلەم و غیفار

( ٢ ) عەببادی کوڕی بیشر ... بۆ سولەیم و جوهەینە

( ٣ ) ڕافیعی کوڕی موکەیث ... بۆ جوهەینە

( ٤ ) عەمری کوڕی عاص ... بۆ فەزارە

( ٥ ) ضەححاکی کوڕی شەعبان ... بۆ نەوەی کیلاب

---

[٢٦٣] قەسطەلانیی لە ( المواهب ) دا : ٣ / ٧٠ وتوویە : لە ڕیوایەتی ئەبوبەکری کوڕی ئەنبارییدا هاتووە کە کاتێ ئەگاتە ئەم دێڕە :

إنَّ الرسولَ لنورٌ يُستضاءُ به ... مُهَنَّدٌ مِن سيوفِ اللهِ مسلولُ

پێغەمبەری خوا ﷺ بوردەیەکی لەبەردا بوو هەڵی دا بۆی و ، موعاویە دە هەزاری پێ دا ، بەڵام کەعب وتی : ئیثاری هیچ کەسێك ناکەم بۆ کراسی پێغەمبەری خوا ﷺ . کاتێك کە کەعب کۆچی دوایی کرد موعاویە بیست هەزار دیرهەمی بۆ وەرەسەکەی نارد و بوردەکەی لێ وەرکرتن . جا ئەم بوردەیە ئەوەیە کە لەلای سوڵتانەکانە .

[٢٦٤] السيرة النبوية للندوي : ٣٦٤ ـ ٣٦٥ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٤٨٦ ـ ٤٨٧ ، السيرة النبوية للصلابي : ٨٠٠ .

( ٦ ) بوسری کوڕی سوفیان — بۆ نەوەی کەعب
( ٧ ) ئیبن لوتبیەی ئەزدیی — بۆ نەوەی ذیبیان
( ٨ ) پیاوێکی نەوەی سەعدی کوڕی هوذەیم — بۆ نەوەی هوذەیم
( ٩ ) موهاجیری کوڕی ئەبوئومەییە — بۆ صەنعاء
(١٠ ) زیادی کوڕی لەبید — بۆ حەضرەمەوت
( ١١ ) زەبەرقانی کوڕی بەدر — بۆ نەوەی سەعد
( ١٢ ) قەیسی کوڕی عاصیم — بۆ نەوەی سەعد
( ١٣ ) عەلائی کوڕی حەضرەمیی — بۆ بەحرەین
( ١٤ ) عەلیی کوڕی ئەبوطالیب . — بۆ نەجران

پێغەمبەری خوا ﷺ حسابێکی وردی لەگەڵ ئەو پیاوە نێرراوانەدا ئەکرد تا بزانێ چی‌یان وەرگرتووە و چیشیان هێناوەتەوە . ئەوەبوو ئیبن لوتبیەی موحاسەبە کرد. ئەویش لەسەر ئەوەی کە ئەی وت : ئەمە بۆ ئێوە و ، ئەمەش پێشکەشی خۆم کراوە. بۆ ئەمە پێغەمبەری خوا ﷺ سەرکەوتە سەر مینبەر و دوای سوپاس و ستایشی خوا فەرمووی : (( ما بالُ عاملٍ أبعثُهُ فيقولُ : هذا لكم وهذا أهدي لي ؟ أفلا قعد في بيت أبيه أو بيت أمه حتى ينظر أيهدى إليه أم لا ؟ والذي نفس محمدٍ بيده لا ينال أحد منكم منها شيئاً إلا جاء به يوم القيامة يحمله على عنقه ، إن كان بعيراً له رغاء ، أو بقرة لها خوار ، أو شاة تيعر )) . لەم فەرموودەیەدا ناڕەزایی لەو کاربەدەستە وەرئەبڕێ کە لە پاڵ زەکاتەکەدا شتێك بۆ خۆی کۆ ئەکاتەوە . ئەو کەسە با لە ماڵی باوکی‌دا یان ماڵی دایکی‌دا دابنیشێ بزانێ خەڵکەکە هیچی پێشکەش ئەکەن ؟ سوێندیش ئەخوا کە ئەو زکاتە لادراوە ئەبێ لە ڕۆژی قیامەت‌دا بە کۆڵ هەڵی بگرێ و هەر ئاژەڵێك بێت یان ئەقۆڕێنێ یان ئەبارێنێ . پاشان هەردوو دەستی ئەوەندە بەرز ئەکاتەوە کە هاوەڵان بن دەستی ئەبینن و دووجار ئەفەرموێ : (( أللهم هل بلغت ؟ )).

هەروەها ئەی‌فەرموو : (( أيُّما عاملٍ استعملناه وفرضنا له رزقاً فما أصاب بعد رزقه فهو غلول )) . ئەفەرموێ : هەر کەسمان کردە کاربەدەست و مووچەمان بۆی بڕی‌یەوە ، ئیتر لەوە بەولاوە هەرچیی دەست بکەوێ بە غلوول ئەژمێررێ . ( غلوول بریتی‌یە لە لادانی ئەو دەستکەوتانەی جیهاد کە هێشتا دابەش نەکراون ! ) .[٢٦٥]

---

[٢٦٥] السيرة النبوية للصلابي : ٨٠٣ ، الرحيق المختوم : ٤٣٨ ـ ٤٣٩ . بە داخەوە لە ( الرحيق ) دا هەندێ ناوی پیاوە نێرراوەکان بۆ کۆکردنەوەی زەکات بە هەڵە هاتووە . بۆ نموونە لە ل ٤٣٨ دا ناوی عویەینە یەکەم کەس هاتووە کە

### سێهەم : کۆچی دوایی خاتوو زەینەب

لە کۆتایی ساڵی هەشتەمی کۆچیی‌دا خاتوو زەینەبی کچی پێغەمبەر و ، هاوسەری ئەبولعاصی کوڕی ڕەبیع کۆچی دوایی کرد .. زەینەب گەورەترین کچی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو کە دە ساڵ پێش هاتنی وەحی لە دایك بوو بوو . دوای ئەو ڕوقیە ، پاشان ئوم کولثووم ، پاشان فاطیمە لە دایك بوون . پێغەمبەری خوا ﷺ زۆری خۆش ئەویست . زوو موسڵمان بوو و ، شەش ساڵ پێش موسڵمانبوونی مێردەکەی کۆچی کرد بۆ مەدینە . کە کۆچی کرد بە دەستی موشریکانی مەککە لەسەر وڵاغەکەی کەوتە خوارەوە و منداڵی لە بار چوو و هەر بەو نەخۆشی‌یەوە دوایی کۆچی دوایی کرد .. کوڕێکی لە ئەبولعاص بوو و ناوی نا عەلیی و ، گەیشتە تەمەنی باڵغ بوون ئەوسا کۆچی دوایی کرد . هەروەها ئومامەشی بوو کە ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژدا ئەی‌خستە سەرشانی خۆی . کە گەورە بوو ئیمام عەلیی دوای کۆچی دوایی فاطیمە مارەی کرد .

کە زەینەب کۆچی دوایی کرد پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( إغسلنها وتراً: ثلاثاً ، أو خمساً ، واجعلن في الآخرة كافوراً )) . فەرمووی : چەند جارێکی تاك بێ شۆن: سێ یان پێنج و لەگەڵ دواجاردا کافووریش بەکار بهێنن .[٢٦٦]

### چوارەم : لەدایکبوونی ئیبراهیم

لە مانگی ذولحەججەی ساڵی هەشتەمدا خاتوو ماریەی قیبطیی ، کە کەنیزەکێك بوو و ، موقەوقەسی پادشای میصر بە دیاریی بۆ پێغەمبەری نارد ، ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەری خوای لێ بوو . کە ماریە کوڕی بوو ئازاد بوو و هاتە ئاستی هاوسەرەکانی پێغەمبەرەوە . جا لەبەر ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە مردنی کوڕەکانی و مردنی ڕوقیە لە کاتی سەرکەوتنی بەدردا و ، مردنی زەینەب لە ساڵی

---

نێرراوە بۆ کۆکردنەوەی زەکات لە نەوەی تەمیم ، کەچیی لە ل ٤٣٩ دا عویەینە بە سوپاوە چۆتە سەر نەوەی تەمیم و یانزە پیاو و بیست و یەك ئافرەت و سیی منداڵی لێ بە دیل گرتوون .

هەروەها لە لاپەڕەی ( ٤٣٩ ) دا عەدیی کوڕی حاتیم نێرراوە بۆ هۆزی طەی و نەوەی ئەسەد ، کەچیی دوای دوو مانگ عەلیی خوا لێی ڕازیی بێ هێرش ئەکاتە سەر ناوچەکە و ، عەدیی ڕا ئەکات بۆ شام و ، دوای ماوەیەك خوشکەکەی ئازاد ئەکرێت و ، خۆی ئەگەیەنێتە شام لای عەدیی و ، هەوڵی لەگەڵدا ئەدا بگەڕێتەوە مەدینە و موسڵمان ببێ .. لاپەڕە ( ٤٤٠ ـ ٤٤٢ ) .

[٢٦٦] السيرة النبوة لأبي شهبة : ٢ / ٤٩٠ ، السيرة النبوية للصلابي : ٨٠٧ . کافوور : ڕووەکێکی بۆن خۆشە و ، لاشەی مردووش توند و تۆڵ ئەکات و ، ناهێڵێ زوو بۆن بکات .

هەشتەم‌دا جەرگی سووتا بوو ، بە لە دایك‌بوونی ئیبراهیم زۆر دڵ خۆش بوو ، بۆیە هاتە ناو هاوەڵانی و مژدەی پێ دان و فەرمووی : (( ولد لي الليلة غلام فسميته بإسم أبي إبراهيم )) . ئەوەبوو هاوسەری ئەبوڕافیع مامانی ماریە بوو ، کە ئەبوڕافیع مژدەی لە دایك بوونی ئیبراهیمی بە پێغەمبەر دا بەندەیەکی پێشکەش کرد . ئەوەبوو لە ڕۆژی حەوتەم‌دا بەرانێکی کردە قوربانیی بۆی و ، ئەبوهیند سەری ئیبراهیمی تاشیی و ، سەنگی مووەکانیش زیوی کردە صەدەقە و دای بە هەژاران.. پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ دایە دەست ئافرەتێك بە ناوی ئوم سەیف تا بەخێوی بکات . بۆ ئەمە هەموو ڕۆژێك پێغەمبەر ئەچوو بۆ ماڵی ماریە تا ئیبراهیم بگرێتە باوەش و ماچی بکات . ژنە ئەنصارەکانیش کەوتنە پێش بڕکێی شیرپێدانی و، پێغەمبەریش ﷺ بەشە مەڕ و وشترێکی تەرخان کردبوو تا هەر ئێوارەیەك ئیبراهیم لە چ ماڵێك شیری پێ ئەدەن ئەو تاژەڵانە بچنە ئەو ماڵە و بۆ خۆیان بیان‌دۆشن.[٢٦٧]

**پێنجەم : سریەی عویەینەی کوڕی حیصن بۆ سەر نەوەی تەمیم**

لە مانگی موحەڕڕەمی ساڵی نۆهەم‌دا عویەینە لەگەڵ پەنجا سواردا . کە نە موهاجیر و نە ئەنصاریان لەگەڵدا نەبوون ، هێرشی کردە سەر نەوەی تەمیم ، چونکە هۆزەکانیان بۆ جزیەنەدان هەڵ نا بوون .

عویەینە بە شەودا ڕێی ئەبڕیی و بە ڕۆژدا خۆی حەشار ئەدا ، هەتا گەیشتە لایان و دای بەسەریاندا . نەوەی تەمیم هەندێکیان هەڵاتن و ، یانزە پیاو و ، بیست و یەك ئافرەت و سیی منداڵیان لێیان بە دیل گرتن و هێنانیانەوە بۆ مەدینە و لە ماڵی ڕەملەی کچی حاریث‌دا دایان‌نان .

ئەوەبوو نوێنەری تەمیم هاتن بە دوای دیلەکانیان‌دا و ، دوای موسڵمان‌بوونیان هەر هەموویان گێڕڕانەوە بۆیان .[٢٦٨]

**شەشەم : سریەی نەوەی موصطەلەق**

لە سەرەتای ساڵی نۆهەمی کۆچیی‌دا پێغەمبەری خوا ﷺ وەلیدی کوڕی عوقبەی کوڕی ئەبوموعیطی نارد بۆ لای نەوەی موصطەلەق بۆ کۆکردنەوەی زەکات . کە

---

[٢٦٧] السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٤٩٠ ـ ٤٩١ .

[٢٦٨] الرحيق المختوم : ٤٣٩ ـ ٤٤٠ ، الرسول القائد لمحمود شيت خطاب : ٣٧٢ ـ ٣٧٣ .

خەڵكەكە هەواڵی هاتنی وەلیدیان زانیی بۆ بەخێرهاتن و ڕێزلێنان بیست پیاویان بە چەكەوە و وشترەكانی زەكاتیشیان پێ بوون هاتن بە پیریەوە . كە وەلید پیاوە چەكدارەكانی بینیی لێیان ترسا و وای‌زانیی لە دژی ئەوەستن ، چونكە لە سەردەمی نەفامییدا دوژمنایەتی‌یان لە نێواندا بوو بوو . بۆیە بە پەلە گەڕایەوە مەدینە و هەواڵەكەی بە پێغەمبەری خوا گەیاند . ئەویش خالیدی كوڕی وەلیدی بە سریەیەكەوە نارد تا هەواڵی ڕاستەقینە بزانێ . خالد گەیشتە ناوچەی نەوەی موصطەلەق و شەو خۆی لە نزیكەوە داگرت ، ئەبینێ وا بانگ‌وێژ بۆ نوێژەكان بانگ ئەدات . خالید چووە ناویان و جگە لە گوێڕایەڵیی هیچی پێوە نەبینین . ئەوەبوو زەكاتی لێ وەرگرتن و گەڕایەوە بۆ مەدینە .

دەربارەی ئەم ڕووداوە خوای گەورە ئایەتی : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ أَن تُصِيبُواْ قَوۡمَۢا بِجَهَٰلَةٖ فَتُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَا فَعَلۡتُمۡ نَٰدِمِينَ ﴾ ( الحجرات : ٦ ) . هاتە خوارەوە تا بۆ موسڵمانان ئامۆژگاریی بێت و ، بنج و بناوانی هەموو هەواڵێك بشێلن ئەوسا باوەڕی پێ بكەن . هەر بەم ئایەتە موسڵمانان مەرجی عەدالەتیان بۆ ڕاوی‌یەكان دانا و بە جوانیی لە حاڵیان ئەكۆڵانەوە ، بەمە زانستی ( الجرح والتعديل ) لە ئیسلامدا پەیدا بوو و ، بە هۆیەوە موسڵمانان بوونە خاوەنی پاك‌ترین و ڕاست‌ترین مێژوو و بە درێژایی مێژوو هیچ گەل و نەتەوەیەك نەی‌توانیوە مێژووی وەها بێ‌گەرد بۆ خۆی و دوژمنەكانیشی تۆمار بكات .[269]

**حەوتەم : سریەی قوطبەی كوڕی عامیر بۆ سەر نەوەی خەثعەم**

لە مانگی صەفەری ساڵی نۆهەمدا پێغەمبەری خوا ﷺ قوطبەی كوڕی عامیری بەرەو هۆزێكی خەثعەم لە ناوچەی ( تبالە ) ڕەوانە كرد و ، فەرمانی دا هێرش بكاتە سەریان . قوطبە بە خۆی و بیست جەنگاوەری موسڵمانەوە بە سواری دە وشتر ، كە بە نۆرە سواریان ئەبوون ، بەرەو ناوچەكە ڕۆیشتن و هێرشیان كردە سەریان و جەنگێكی گەرم ڕووی دا و لە هەردوولا زۆرێك كوژران . سەرەنجام موسڵمانەكان سەركەوتن و قوطبە بە دیل و مەڕومالاتە دەستكەوتەكانەوە گەڕایەوە مەدینەی مونەووەرە .[270]

---

[269] الرسول القائد لخطاب : ٣٧٣ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٤٩١ ـ ٤٩٢ .

[270] الرحيق المختوم : ٤٤٠ ، الرسول القائد : ٣٧٣ ـ ٣٧٤ .

**هەشتەم : سریەی ضەححاکی کوڕی سوفیان بۆ سەر نەوەی کیلاب**

لە مانگی رەبیعی یەکەمی ساڵی نۆهەمدا پێغەمبەری خوا ﷺ بە سەرکردایەتیی ضەححاکی کوڕی سوفیان سوپایەکی بەرەو ( قرطاء ) بۆ سەر نەوەی کیلاب رەوانە کرد تا بانگیان بکات بۆ سەر ئیسلام . سوپای موسڵمانان داوای لە نەوەی کیلاب کرد کە موسڵمان بن ، بەڵام ئەوان ئەمەیان نەبیست و کەوتنە جەنگ و کوشتار . سەرەنجام بت پەرستەکان دۆڕان و پیاوێکیشیان لێ کوژرا ..

لە ریوایەتێکدا وا هاتووە کە ئوصەیدی کوڕی سەلەمە لەگەڵ سوپای ئیسلامدا ئەبێت و کە تووشی موشریکەکان ئەبن ئوصەید سەلەمەی باوکی ئەبینێ بەسەر ئەسپێکەوە ، باوکی بانگ ئەکات بۆ موسڵمان بوون و ئەمانیشی ئەداتێ ، کەچیی باوکی جنیو بە کوڕەکەی و دینەکەشی ئەدات . ئوصەید ئەدا لە هەردوو دەماری پاژنەی ئەسپەکەی باوکی و ئەسپەکە ئەخات بەسەر هەردوو دەماری پاژنەیدا و ، باوکی بەسەر رمەکەیەوە لەناو ئاودا خۆی ئەگرێتەوە ، تا لەولاوە موسڵمانێك دێت و ئەی کوژێت .[٢٧١]

**نۆهەم : سریەی عەلقەمەی کوڕی مەجزەر بۆ سەر کەنارەکانی جوددە**

لە مانگی رەبیعی دووهەمی ساڵی نۆهەمدا هەواڵ گەیشتە پێغەمبەری خوا ﷺ کە کۆمەڵە پیاوێکی خەڵکی حەبەشە لە نزیك کەنارەکانی جوددەوە کۆبوونەتەوە تا لە دژی دانیشتوانی مەککە جەردەیی بکەن . ئەوەبوو عەلقەمەی کوڕی مەجزەری لەگەڵ سێ صەد جەنگاوەردا نارد بۆیان . عەلقەمە گەیشتە دەریای سوور و سواری دەریا بوو هەتا گەیشتە دوورگەیەك . کە بیستیان وا سوپای موسڵمانەکان بەرەو ئەوان کەوتوونەتە رێ هەڵاتن .[٢٧٢]

**دەهەم : سریەی عەبدوڵڵای کوڕی حوزافە یان سریەی ئەنصار**

عەلیی کوڕی ئەبوطالیب ئەفەرموێ : پێغەمبەری خوا ﷺ سریەیەکی رەوانە کرد و پیاوێکی ئەنصاریشی کردە ئەمیریان و فەرمانی بەسەردا دان کە گوێڕایەڵیی بۆ بکەن. ئەوەبوو ئەمیر تووڕەبوو و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ نەدان

[٢٧١] الرحيق المختوم : ٤٤٠ ، الرسول القائد : ٣٧٤ .

[٢٧٢] الرسول القائد : ٣٧٥ ، الرحيق المختوم : ٤٤٠ .

كە گوێ ڕایەڵییم بۆ بكەن ؟ وتیان : بەڵێ . وتی دارم بۆ كۆ بكەنەوە . ئەوانیش كۆیان كردەوە . وتی : ئاگر بكەنەوە . ئەوانیش ئاگریان كردەوە . وتی : دەی بچنە ناویەوە . هەندێكیان ویستیان بە گوێی بكەن ، بەڵام هەندێكی تریان ئەوانیان گرت و وتیان : ئێمە لە ترسی ئاگر هەڵاتووین بۆ لای پێغەمبەر ﷺ . هەروا وەستان هەتا ئاگرەكە دامركایەوە و ، ئەویش تووڕەیی یەكەی نیشتەوە . كە ئەمە گەیشتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( لو دخلوها ما خرجوا منها إلى يوم القيامة ، الطاعة في المعروف )) . فەرمووی : گەر بچوونایەتە ناو ئاگرەكەوە تا ڕۆژی قیامەت تیایا ئەمانەوە .. گوێ ڕایەڵیی لە چاكەدایە .[٢٧٣]

**یانزەهەم : تێك شكانی فولس**

فولس یان فەلس بتێكی هۆزی طەی بووە . بۆ شكاندنی ئەم بتە پێغەمبەری خوا ﷺ لە مانگی ڕەبیعی دووهەمی ساڵی نۆهەمدا سریەی عەلیی كوڕی ئەبوطالیبی ڕەوانە كردووە ، كە صەد و پەنجا پیاوی لەگەڵدا بووە و ، صەدیان سواری وشتر و پەنجاشیان سواری ئەسپ بوون و ، ئاڵایەكی سپیی و بەیداخێكی ڕەشیان پێ بوو ، لەگەڵ بەرەبەیان دا هێرش ئەكەنە سەر ئەو ناوچەیەی كە خاوخێزانی حاتیمی طەی ، كە نموونەی سەخاوەت بووە ، لێیە و ، بتەكە تێك ئەشكێنن و بە دەستی پڕ لە دیل و وشتر و مەڕەوە ئەگەڕێنەوە ، كە یەكێ لە دیلەكان سەفانەی كچی حاتیمی طەی بوو، كە خوشكی عەدیی بوو و ، عەدیی خۆی هەڵات و خۆی گەیاندە شام .[٢٧٤]

**دوانزەهەم : موسڵمان بوونی عەدیی كوڕی حاتیم**

عەدیی ئەڵێت :

هیچ پیاوێكی عەرەب لە من زیاتر ڕقی لە پێغەمبەری خوا ﷺ نەبوو كاتێ كە ناویم بیست . من پیاوماقوولێك بووم و ، نەصرانیی بووم و ، چواریەكی دەستكەوتی هۆزەكەم بۆ خۆم وەرئەگرت . من بۆ خۆم دین‌دار بووم و ، پادشای قەومەكەشم بووم . كاتێك كە هەواڵی پێغەمبەری خوام ﷺ بیست ڕقم لێی بوو . خزمەت گوزارێكی عەرەبییم هەبوو ، كە وشتری بۆم بەخێو ئەكرد ، پێم وت :ماڵت كاول بێ . لە ناو

---

[٢٧٣] السيرة النبوية للصلابي : ٨٠٤ .

[٢٧٤] المنهج التربوي للغضبان : ١٩٨ ، الرسول القائد لخطاب : ٣٧٥ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٤٩٣ ، السيرة النبوية للصلابي : ٨٠٤ ، الرحيق المختوم : ٤٤٠ .

وشترەکانمدا کۆمەڵە وشترێکی تیژڕەو و قەڵەو جیا بکەرەوە و ، لە نزیکمدا بیان بەستەرەوە . جا ئەگەر بیستت سوپای موحەممەد رووی لەم ناوە کردووە ، ئەوا ئاگادارم بکە . ئەوەبوو نیوەڕۆیەکیان هاتە لام و وتی : ئەی عەدیی ! هەر کارێك نیازت بوو بیکەی ئەگەر سوارچاکانی موحەممەد دایان بەسەرتدا ، ئێستە بیکە ، چونکە من چەند ئاڵایەکم بینین و دەربارەیان پرسیارم کرد وتیان : ئەمە سوپای موحەممەدە . ئەڵێ : وتم : دەی وشترەکان بێنە پێشەوە . ئەویش هێنانیە پێشەوە. ئەوەبوو کەس‌وکار و ماڵ و منداڵم سوار کردن ، پاشان وتم : خۆم ئەگەیەنمە نەصارا هاودینەکانم لە شام . رێگەی جەوشەبەم گرتە بەر و لە شوێنی خۆمان کچێکی حاتیمم بەجێ هێشت .

بەڵێ سوپای ئیسلام هێرشی کردە سەر طەی و خەڵکێکی زۆر بە دیل گیرا ، بە تایبەت سەفانەی خوشکی عەدیی . ئەویش هێنرایەوە مەدینە و پێغەمبەری خوایش ﷺ هەواڵی عەدیی ئەزانێ کە بەرەو شام هەڵاتووە و ، خوشکەکەشی لەگەڵ ئافرەتە دیلەکاندا لە ژوورێکی نزیك دەرگای مزگەوتدا بەند ئەکرێن . کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ تێ پەڕیی سەفانە ـ کە ئافرەتێکی ژیری سەلیقەدار بوو ـ هەستا و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! باوکم کۆچی دوایی کرد و ، خاوەنەکەشم دیار نیە ، چاکەم لەگەڵدا بکە و ئازادم بکە ، خوا چاکت بۆ بکات .

فەرمووی : (( ومن وافدكِ ؟ )) . فەرمووی : خاوەنەکەت کێیە ؟

وتی : عەدیی کوڕی حاتیم .

فەرمووی : (( الفارُّ من الله ورسوله ؟! )) . فەرمووی : ئەوەی کە لە خوا و پێغەمبەرەکەی هەڵ هاتووە ؟!

ئیتر بە جێی ئەهێڵێ .

بۆ سبەینێ بە هەمان شێوە لە بەردەمیا ئەوەستێ و ، هەمان وت و وێژ روو ئەداتەوە و ، بە جێی ئەهێڵێ .

بۆ دووسبەی سەفانە دەست لە تکاکردن ئەشوا ، بەڵام پیاوێك لە دوای پێغەمبەرەوە ئاماژەی بۆ ئەکات هەتا قسە بکات ، ئیتر هەڵ ئەسێت و ئەڵێت : ئەی پێغەمبەری خوا ! باوکم کۆچی دوایی کرد و خاوەنەکەشم دیار نیە ، چاکەم لەگەڵ بکە و ئازادم بکە ، خوا چاکت بۆ بکات . فەرمووی : (( قد فعلت ، فلا تعجلي بخروج حتى تجدي من قومك من يكون لك ثقة ، حتى يُبلغك إلى بلادكِ ، ثم

آذنيني )) . فەرمووی : باشە ، بەڵام پەلە مەکە بۆ دەرچوون هەتا خزمێکی متمانەپێکراوت دەست بکەوێ و بتگەیەنێتە ولاتی خۆت ، ئەوسا ئاگادارم بکە .

سەفانە پرسیاری ئەو کەسە ئەکات کە ئاماژەی بۆ ئەکات ئەڵێن عەلیی کوڕی ئەبوطالیب بووە .

دوای ماوەیەك کەس‌وکار و ناسراوانی پەیدا ئەبن و پێغەمبەری خوا ﷺ ئاگادار ئەکات کە پیاوی متمانەپێکراوی دەست کەوتوون . پێغەمبەری خوا ﷺ پۆشتەی ئەکات و ولاغی بۆ سواربوون ئەداتێ و پارەی مەسرەفی ئەداتێ و لەگەڵ پیاوە ناسراوەکان‌دا دێت هەتا ئەگاتە شام .

لە کاتێك‌دا کە عەدیی لە ناوماڵ و منداڵی‌دا دانیشتبوو ، سەیر ئەکا وا ئافرەتێك لەناو کەژاوەیەك‌دا بەرەو ئەوان هات . ئەڵێت : کچەکەی حاتیمە . سەیر ئەکات ئەبینێ ئەوە . کە ئەگاتە بەرەوە دەست بە گلەیی و لۆمەی عەدیی ئەکات و ئەڵێت : هەی ڕەحم‌بڕی ستەم‌کار ! ژن و منداڵەکەی خۆتت دەرباز کرد و ، شەرەف و نامووسی باوکتت بەجێ هێشت !

وتی : خوشکە گیان ! من کردم و تۆ نەی‌کەی !

ماوەیەك لای ئەبێت ، ئەوسا لێی ئەپرسێ : ئەم پیاوەت چۆن دێتە بەرچاو ؟

ئەڵێت : بەخوا من وای بە چاك ئەزانم بە زووترین کات خۆت بگەیەنیتە لای . خۆ ئەگەر پێغەمبەر بێ ، ئەوا هەر کەس زووتر شوێنی بکەوێ فەزڵ و پایەی زیاتری دەست ئەکەوێ و ، گەر پادشایش بێ ، پیاوی وەك تۆ هەرگیز بەلایەوە بێ‌ناز نابێ .

ئەڵێت : بەخوا ئەم بۆچوونە ڕاستە .

عەدیی بەرەو مەدینە ئەکەوێتە ڕێ و خۆی ئەگەیەنێتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ، لە کاتێك‌دا کە لە مزگەوت‌دا ئەبێ . سەلامی لێ ئەکات و ، ئەویش ئەپرسێ کە ئەم پیاوە کێ‌یە ؟ ئەڵێت : عەدیی کوڕی حاتیمم . بۆ زیادە ڕێزلێ‌گرتن لە عەدیی ئەی‌باتەوە بۆ ماڵەوە . لە ڕێگا پیرەژنێکی لاواز ڕێ بە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگرێت و ماوەیەکی زۆر ئەی‌وەستێنێ و باسی پێویستیی خۆی ئەکات بۆی . عەدیی لە دڵی خۆی‌دا ئەڵێ : بەخوا ئەمە پادشا نیە . دوای ئەوە پێکەوە چوونەوە بۆ ماڵەوە. پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵەوە تەنها پشتی‌یەکیان بۆ دانیشتن هەبوو کە لە چەرم دروست کرا بوو و بە ریشاڵیش پڕ کرابوویەوە ، دای‌نا بۆ عەدیی تا لەسەری دابنیشێ و فەرمووی : (( إجلس على هذه )) . ئەڵێت : بەڵکو تۆ لەسەری دابنیشە .

فەرمووی : (( بل أنت )) . ئیتر عەدیی لەسەری دائەنیشێ و ، پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی لەسەر زەوی‌یەکە دائەنیشێ . دیسان عەدیی بە خۆی ئەڵێ : بەخوا ئەمە کاری پادشا نیە .

لە ریوایەتێكدا عەدیی ئەڵێ : شاهێدیی ئەدەم کە تۆ بەرزیی و دەسەڵات و خراپکاریی سەرزەوییت ناوێت .

کە هاوەڵان دی‌یان پشتی‌یەکەی بە عەدیی دا و خۆی لەسەر زەوی‌یەکە دانیشت وتیان :

ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەمەی بە تۆوە دیمان تا ئێستە بە کەسمانەوە نەدیوە .

فەرمووی: (( هذا كريم قوم ، فإذا أتاكم كريم قوم فأكرموه )) .

فەرمووی : عەدیی سەردار و پایەداری کۆمەڵێکە ، هەر کە گەورەی کۆمەڵێك هاتە لاتان رێزی لێ بگرن .

ئەوانەی وا تێ دەگەن ، یان وای ئەگەیەنن کە ئیسلام بە زۆری شمشێر بلاو بۆتەوە، یەکەم : زۆر هەڵەن و بە هیچ شێوەیەك ئاگایان لە مێژوو نیە ، بەمەش ئەوپەڕی نەشارەزایی و نەخوێندەواری‌یان لێ دەرئەکەوێ . دووهەم : زۆر ستەمکار و ناڕەوابێژن کە دینێکی پاك و بێ‌گەردی وەك ئیسلام لەکەدار ئەکەن ، بەو نیازەی خەڵکیی لێ دوور بخەنەوە .

ئەوانە نە لە مێژوو و نە لە ئیسلام نەگەیشتوون و هەرگیزیش بە ئاوات ناگەن ، بەو نیازەی کە نەهێڵن مرۆڤایەتیی بە دڵ و بە گیان بگەڕێتەوە بۆ سەر ئیسلام ، چونکە رۆژ بە رۆژ مرۆڤایەتیی هانا بۆ ئیمان دێنێ و ، ئاوڕ لە ئیسلامی بێ‌گەرد ئەداتەوە .

بەڵگەیەکی زۆر گەورە بە دەستمانەوە بۆ ئەمەش سەرانسەری مێژووی مرۆڤایەتی‌یە کە هەزارەها سوپای دوڕندە و بەهەڵمەت لە ناوچە جۆرا و جۆرەکانی دنیادا هێرشیان بردووە و ، ولاتانیان داگیر کردووە . جا چونکە مەبەستیان داگیرکردن و تالان و برۆ بووە و هەڵگری بیروباوەڕێکی پیرۆز نەبوون ، ئەوانە بە زووترین کات لەو ولاتە داگیرکراوە دەرکراون و دانیشتوانیش کەوتوونەتەوە شوێن بیروباوەڕی خۆیان.
نزیك‌ترین نموونەی ئەمەش لێمانەوە رووخانی سۆڤیێتە ، کە هێزێکی زۆر بەکاری چەك دار پارێزگاریی لە بیروباوەڕێکی بێ‌سەر و بن و دوور لە فیترەتی مرۆڤی ئەکرد، کەچیی هەر کەوت و هەر کەوت .

بەڵام ئیسلامی بێگەرد ، ئەمە پانزە صەدەیە بەشی زۆری گەلان شوێنی كەوتوون و، نەك هەر لێی هەڵ نەگەڕاونەتەوە و ، بە هیچ شێوەیەك دەستبەرداری ڕەوشت و ئەحكامە بەرزەكانی نەبوون ، بەڵكو بە ملیۆنەها ڕۆڵەی زیرەك و بلیمەتیان تەمەنیان تەرخان كردووە بۆ لێكۆڵینەوە و شارەزابوون و ڕاڤەكردن و گەیاندن و بڵاوكردنەوەی . هەروەها ملیۆنەها ڕۆڵەی پاڵەوان و بەجەرگیان خوێنی گەشیان لە پێناوی قورئانی پیرۆزدا بەخشیوە و بوونەتە قەڵغانی ئیسلامی بێگەرد ..

مێژوویەكی پانزە صەدەیی شاهێدە كە زۆربەی گەلە جۆربەجۆرەكانی سەرزەویی بە شانازی‌یەوە ئیسلامیان كردۆتە دین و بیروباوەڕیان و ، بێ ئەوەی چاودێرێك بەسەریانەوە بێت هەموو فەرمانێكیان بە پێی توانا و تێگەیشتنی خۆیان ئەنجام داوە.

هەروەها ئەمڕۆ و لەمەو دوایش ئیسلام بەردەوام مرۆڤی چاكویست لە نێو گەلە جۆربەجۆرەكانی سەر زەویی‌دا هەڵ ئەبژێرێ و هیدایەتیان ئەدات .. ئیتر ئەگەر گەنیوەكانی وڵاتی خۆمان لێی لادەن ئیسلامیان نەوێ ، ئەوە سوپاسی خوا ئەكەین كە ئەو پیسانە لە كۆڵی ئەبنەوە !!

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( إيه يا عديّ ابن حاتم ! ألم تكن ركوسياً ؟ )) . فەرمووی : ئایا تۆ لەسەر دینی ركووسیی[٢٧٥] نەبوویت ؟ ئەویش ئەڵێت: بەڵێ . ئەپرسێ : (( أولَم تكن تسير في قومك بالمرباع ؟ )) ئەفەرموێ : ئەی تۆ چواریەكی دەست كەوتەكانی قەومەكەتت نەئەبرد بۆ خۆت ؟ ئەویش ئەڵێت : بەڵێ. ئەفەرموێ : (( فإن ذلك لم يكن يحلُّ لك في دينك )) . ئەفەرموێ : ئەوە لە دینەكەتدا بۆت حەڵاڵ نەبوو . ئەڵێت : ئەرێ بەخوا . ئیتر بەمە بۆ عەدیی ساغ ئەبێتەوە كە پێغەمبەرە و ئەوەی كە خەڵك نای‌زانێ ئەو ئەی‌زانێ ..

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :

(( لعلك يا عدي ! إنما يمنعك من دخول في هذا الدين ما ترى من حاجتهم ، فوالله ليوشكن المال أن يفيض فيهم فلا يوجد من يأخذه . ولعلك إنما يمنعك من دخول فيه ما ترى من كثرة عدوهم وقلة عددهم ، فوالله ليوشكن أن تسمع بالمرأة تخرج من القادسية على بعيرها حتى تزور هذا البيت لا تخاف . ولعلك إنما يمنعك من دخول فيه

---

[٢٧٥] ركووسیی : دینێك بووە لە نێوان نەصارا و صابیینەدا .

أنك ترى أن الملك والسلطان في غيرهم ، وأيم الله ليوشكن أن تسمع بالقصور البيض من أرض بابل قد فتحت عليهم )) .

ئەفەرموێ : ئەی عەدیی ! لەوانەیە ئەو دەستکورتی‌یەی کە بە موسڵمانەکانە ئەی‌بینیی لە موسڵمان بوون قەدەغەت بکات ، دە بەخوا هاکا سامان لە ناویاندا ئەوەندە زۆر بوو کە کەس وەری نەگرێ .. لەوانەشە ئەو زۆری‌یەی دوژمنان و کەمی‌یەی موسڵمانان کە ئەی‌بینیی لە موسڵمانبوون قەدەغەت بکات ، دە بەخوا هاکا بەرگوێت بکەوێ کە ئافرەتێك لە قادسیەوە بە تەنیا سواری وشترەکەی ببێت و بێت زیارەتی ماڵی خوا بکات و لە هیچ نەترسێ .. لەوانەشە کە ئەبینیی وا موڵك و دەسەڵات لە دەستی غەیری موسڵمانەکان دایە ، لە موسڵمانبوون قەدەغەت بکات ، دە بەخوا هاکا بیستت کە کۆشکە سپی‌یەکانی بابل بە دەستی موسڵمانەکان فەتح کراون.

ئیتر عەدیی موسڵمان ئەبێت .

لە ریوایەتی ئیبن جەریردا وا هاتووە کە عەدیی ئەڵێ :

هاتمە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و خاچێکی زێڕین لە ملمدا بوو ، فەرمووی: (( یا عدي ! أطرح هذا الوثن من عنقك )) . فەرمووی : عەدیی ! ئەو بتە لە ملتدا فڕێ بدە . منیش فڕێم دا .. کە گەیشتمە لای لە سوورەتی ( براءة ) دا قورئانی ئەخوێند . ئەوەبوو ئایەتی : ﴿ اتخذوا أحبارهم و رهبانهم أرباباً من دون الله ﴾ ی ئەخوێند ، منیش وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئێمە قەشەکان ناپەرستین . فەرمووی: (( أليس يحرمون ما أحل الله فتحرمونه ويحلون ما حرم الله فتحلونه ؟ )) فەرمووی: ئەی شتێ کە خوا حەڵاڵی کردبێ ئەوان حەرامی ناکەن و ئێوەش حەرامی بکەن و، شتێکیش کە خوا حەرامی کردبێ ئەوان حەڵاڵی ناکەن و ئێوەش حەڵاڵی بکەن؟ ئەڵێ: وتم : بەڵێ . فەرمووی : (( فتلك عبادتهم )) . فەرمووی : دەی ئەوە پەرستنیانە.

لە ریوایەتێکی تردا بەڵێنی دەستخستنی گەنج و گەوهەر و زێڕ و زیوی کیسرای کوڕی هورمزی پێ دا لەلایەن موسڵمانەکانەوە . عەدییش بە سەرسوڕمانەوە ئەپرسێ: کیسرای کوڕی هورموز ؟ ئەفەرموێ : (( كسرى بن هرمز )) . سێ جار ، (( وليوشكن أن يبتغي من يقبل ماله منه صدقة فلا يجد )) . ئەفەرموێ : هاکا رۆژێ هات کابرا بگەڕێ بە دوای کەسێکا زەکاتەکەی لێ وەر بگرێ کەچیی دەستی نەکەوێ.

جا عەدیی دەری ئەبڕێ کە لەو سێ بەڵێنە ( بەڵێنی هاتنی ئافرەت لە حیرەوە یان قادسیەوە بە تەنیا بۆ حەج و ، دەستکەوتنی گەنج و گەوهەری کیسرا و ، زۆربوونی پارە کە هیچ کەس زەکات وەرنەگرێ ) دوانیان هاتوونەتە دیی : ئافرەت لە حیرەوە بە تەنیا ئەچێ بۆ حەج و ، خۆیشی لەگەڵ ئەو ئەسپ سوارانەدا بووە کە هێرشیان کردۆتە سەر مەدائینی پایتەختی ساسانیی . دوای ئەوە سوێند ئەخوا کە سێهەم بەڵێنیش دێتە دیی چونکە فەرمایشتی پێغەمبەری خوایە ﷺ .

ئەم بەڵێنانەی پێغەمبەری ئازیز ﷺ ئەوەی ئەگەیاند کە ئیسلام سەراپای سەرزەویی حوکم ئەکات .. دەسەڵات لە ڕۆم و لە فارسیش وەرئەگرێت .. شارستانیەتێکی ئیمانیی و ئەخلاقیی یەکجار پاك و پێشکەوتوو بەرپا ئەکات .. هەموو مرۆڤ ـ بە موسڵمان و ناموسڵمانەوە ـ لە سایەیدا ئەحەسێتەوە..

ئیمام ئەحمەد بە سەنەدی خۆی لە گەنجێکی هۆزی موحاریبەوە ئەگێڕێتەوە کە وتوویە : لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست کە ئەیفەرموو : (( إنه سيفتح لكم مشارق الأرض ومغاربها ، وإن عمالها في النار ، إلاّ من اتقى الله وأدى الأمانة )) . ( المسند : ٥ / ٢٦٦ ).

ئەفەرموێ : خۆرهەڵات و خۆرئاواتان بۆ فەتح ئەکرێ و ، کاربەدەستەکانی ئەو ناوچانە هەموویان لە ئاگردان جگە لە کەسێك تەقوای خوای لە دڵدا بێت و ، ئەو ئەمانەتەی خراوەتە ئەستۆی بە جوانیی جێ بە جێی بکا .

هەروەها ئیمام ئەحمەد لە تەمیمی داریەوە ئەگێڕێتەوە وتوویە : لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست کە ئەیفەرموو : (( ليبلغن هذا الأمر ما بلغ الليل والنهار ، ولا يترك الله بيت مدر ولا وبر إلا أدخله هذا الدين ، يعز عزيزاً ويذل ذليلاً ، عزاً يعز الله به الإسلام ، وذلاً يذل الله به الكفر )) . ( المسند : ٤ / ١٠٣ ) .

بەڵێن ئەدا کە ئەم دینی ئیسلامە ئەگاتە هەموو شوێنێکی گۆی زەویی .. هەموو خانەوادەیەك ئیسلامی ئەگاتێ ، هەندێك بە پاکیی شوێنی ئەکەون سەربەزیی و ڕێز و شەرەفیان دەست ئەکەوێ و ، هەندێکیش دەروونی بەدخوازیان لە خشتەیان ئەبات و بە پاکیی شوێنی ئیسلام ناکەون ئەوانەش زەلیلیی و سەرشۆڕیی بەشیانە .

سەعیدی کوڕی مەنصوور تەخریجی کردووە ، هەروەها بەیهەقیی لە ( سنن ) ەکەیدا لە جابیرەوە خوا لێی ڕازیی بێ ، دەربارەی فەرمایشتی ﴿ ليظهره على الدين كله ﴾ وتوویە : ئەوە ڕوو نادات ، واتە سەرکەوتنی ئیسلام بەسەر هەموو دینەکانی

تردا ، هەتا هیچ جوولەکە و گاورێك نەمێنێ جگە لە ئوممەتی ئیسلام ، بە رادەیەك کە مەڕ لە گورگ و ، مانگا لە شێر و ، مرۆڤ لە مار ناترسن ، هەروەها مشك دەفر ناقرتێنێ و ، جزیە نامێنێ و ، صەلیب ئەشکێنرێ و ، بەراز ئەکوژرێ ، ئەمەش کاتێك کە عیسای کوڕی مەریەم سەلامی لێ بێ دائەبەزێتە سەرزەویی . ( الدر المنثور للسيوطي : ٤ / ١٠/ ١٧٦ ) .

هەروەها لە ئەبوهورەیرەوە خوا لێی رازیی بێ ریوایەت کراوە کە دەربارەی فەرمایشتی ﴿ ليظهره على الدين كله ﴾ وتوویە : ئەوە دابەزینی عیسای کوڕی مەریەمە سەلامی لێ بێ . ( الدر المنثور للسيوطي ) .[276]

**سیانزەهەم : سریەی جەریر بۆ زیلخولدصە**

جەریری کوڕی عەبدوڵلا ئەڵێت : پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو : (( ألا تريحني من ذي الخلصة ؟ )) . ئەفەرموێ : ئەوە ئەو بتەم لە کۆڵ ناکەیتەوە . وتم : بەڵێ ، منیش بە صەد و پەنجا سوارچاکی ئەحمەسەوە ، کە خاوەنی ئەسپی رەسەن بوون ، کەوتمە رێ . بەڵام من بەسەر ئەسپەوە خۆمم پێ راگیر نەئەکرا . ئەوەم بۆ پێغەمبەر ﷺ باس کرد ، ئەویش بە دەستی پیرۆزی دای بەسەر سنگمدا ، بە رادەیەك کە هەستم بە کاریگەریی دەستی کرد لەسەر سنگم و فەرمووی : (( أللهم ثبته واجعله هادياً مهدياً )) ، ئیتر دوای ئەوە لەسەر ئەسپەکەم نەکەوتمە خوارەوە .

ئەڵێت : ذولخولصە ماڵێك بوو لە یەمەن کە بتێکی تێدا بوو و ناو نرابوو کەعبە . جەریر بە ئاگر ئەیسوتێنێ و تێکی ئەشکێنێ .

دوای سەرکەوتن جەریر پیاوێکی ئەحمەسیی بە نازناوی ئەبوئەرطەئە ئەنێرێتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ تا مژدەی بداتێ . کە دێتە بەرەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ پێنج جار داوای خێر و بەرەکەت بۆ ئەسپ و ئەسپسواری ئەحمەس ئەکات . ( البخاري ، المغازي : ٥ / ١٣٢ ، رقم : ٤٣٥٧ ) .[277]

---

[276] الرحيق المختوم : ٤٤١ ـ ٤٤٢ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٤٩٣ ، السيرة النبوية للصلابي : ٨٠٥ ـ ٨٠٦ ، المنهج التربوي : ٣ / ١٩٨ ـ ٢٠٧ .

[277] السيرة النبوية للصلابي : ٨٠٤ ـ ٨٠٥ .

## بەشی چل وسێهەم

# غـەزای تـەبـووك

**یەکەم : پێشەکیی**

تەبووك شوێنێکە لەسەر ڕێگای نێوان مەدینەی مونەووەرە و دیمەشق و ، کەوتۆتـە نێوان ( وادي القـرى ) و شام و ، کەوتۆتە باشووری خۆرهەلاتی ئەیلە کـە بەندەرێکـە لەسەر کەنداوی عەقەبە . تەبووك قەلایەك بووە کە کانیاو و دارخورمای تێدا بـووە . وتراویشە کە ( أصحاب الأيكـة ) ، کە شوعەیب پێغەمبـەریان سـەلامی لێ بـێ بـۆ نێرراوە لەو ناوچەیەدا بوون . ئێستا کەوتۆتە ولاتی سعوودەوە و ( ٧٦٠ ) کیلۆمەتر لە مەدینەوە دوورە .[٢٧٨]

غەزای تەبووك لە مانگی ڕەجـەبی سـالی نۆهـەمی کۆچـیی‌دا ڕووی داوە ، دوای گەڕانەوە لە ئابلووقەی شاری طائیف بە شەش مانگ .[٢٧٩]

ئەم غەزایە بە ناوی غەزای تەبووکـەوە ناوبـانگی دەرکـردووە و ، لـە صـەحیحی موسلیم‌دا ناوی هاتووە ، کە لە موعـاذەوە ڕیوایەت کراوە کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویە : (( ستأتون غداً إن شاء الله عين تبوك ، وإنكم لـن تأتوهـا حتـى يضـحى النهار ، فمن جاءها منكم فلا يمس من مائهـا شيئاً حتـى آتـي )) . فـەرمووی : إن شاء الله سبەینێ ئەگەنە سەر کانیاوی تەبووك و ، لـە کـاتی چێشـتەنگاودا ئەگەنـە سەری . جا هەر کەستان گەیشتە سەری با دەسـت لـە ئاوەکـەی نـەدات هـەتا خـۆم ئەگەمە ئەوێ . ( صحيح مسلم : ٤ / ١٧٨٤ ، رقم ٧٠٦ ) .

ئەم غەزایە غـەزای ( عوسرە ) شـی پـێ ئـەوترێ و ، ئـەم ناوەشـی لـە قورئـان‌دا هـاتووە: ﴿ لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلْمُهَـٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ

---

[٢٧٨] الرسول القائد : ٣٩٥ ، السيرة النبوية للندوي : ٣٦٧ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٤٩٥ .

[٢٧٩] السيرة النبوية للندوي : ٣٦٧ ، الرحيق المختوم : ٤٤٣ ، السيـرة النبوية للصلابي : ٨٠٨ ، السيـرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٤٩٥ .

ٱلْعُسْرَةِ مِنۢ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴾

( التوبة : ١١٧ ) .

لەلای بوخارییش هەردوو ناوەکە هاتوون . ( البخاري : ٥ / ١٥٠ ، رقم ٤٤١٥ ) .

ناوی ( عوسرە ) بە بۆنەی ئەو هەمووە نارەحەتی‌یانەوە ناونراوە کە هاتنە رێی سوپای ئیسلام . ئەوەبوو دنیا زۆر گەرم بوو و ، رێگاش گەلی دوور بوو و ، بە بۆنەی کەمیی زەخیرەشەوە سەفەر گران بوو و ، ولاغی سوارییش کەم بوون و ، بۆ ئەم سەفەرە درێژە و گەرما زۆرەش ئاو کەم بوو و ، ماڵ و سامانیش بۆ بەرێ کردنی سوپا و خەرج کردنی بۆی کەم بوو .

لە تەفسیری ( عبدالرزاق ) دا ، لە موعەممەری کوڕی عەقیلەوە هاتووە کە وتوویە: بە ولاغێکی کەمەوە و ، لە گەرمایەکی زۆردا کەوتنە رێ ، هەتا وشتریان سەر ئەبڕیی و ، ئەو ئاوەی کە لە ورگیا بوو ئەیان خواردەوە . ( فتح الباري : ٩ / ١٧٤ ) .

ئەوەتا عومەریش خوا لێی رازیی بێ باسی رادەی تینوویەتیی موسڵمانان ئەکات و ئەفەرموێ : لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ لە گەرمایەکی زۆردا بەرەو تەبوک کەوتینە رێ . لە مەنزڵێکدا دابەزین تووشی تینوویەتی‌یەکی یەکجار زۆر بووین ، بە رادەیەك وامان ئەزانی وا خەریکە ملمان لە لاشەمان جوێ ئەبێتەوە . هەتا هی وامان هەبوو ئەچوو بۆ دەست گەیاندن بە ئاو ، بەر لەوەی بگەڕێتەوە وەهای ئەزانی ملی لە لاشەی جوێ ئەبێتەوە . هەتا پیاوی وەهاش هەبوو کە وشترەکەی سەر ئەبڕیی و چیی لەناو ورگیا بوو ئەی‌گوشیی و ئاوەکەی ئەخواردەوە و تلپەکەشی ئەخستە سەر سکی خۆی . ( سەیری مجمع الزوائد : ٦ / ١٩٤ بکە ) .

ئەم غەزایە ناوێکی تریشی هەیە کە ( الفاضحة ) یە و زەرقانیی رەحمەتی خوای لێ بێ لە ( شرح المواهب اللدنية : ٣ / ٦٢ ) دا باسی کردووە : ئەمەش بە بۆنەی ئەوەوە بوو کە ئەم غەزایە حەقیقەتی موونافیقانی دەرخست و ، پەردەی لەسەر لادان و ، هەموو فڕوفێڵێکی دەرخستن و ، بۆ هەمووان ئاشکرا بوو کە چەندە رقیان لە موسڵمانانە و، چۆن هەردەم خەریکی پیلان و فرت و فێڵن .[٢٨٠]

دوای فەتحی مەککە و سەرکەوتن بەسەر هەوازین‌دا سەرانسەری دوورگەی عەرەبیی کەوتە ژێر دەسەڵاتی موسڵمانەکان و ، هەتا سنووری عێراق و شام هەر هەمووی

[٢٨٠] السيرة النبوية للدكتور علي محمد محمد الصلابي : ٨٠٨ ـ ٨٠٩ .

لەلایەن موسڵمانەکانەوە حوکمڕانیی ئەکرا و ، هیچ هێزێکی تیا نەما بەرهەڵستی موسڵمانەکان بکات .

دیارە خۆ ئیسلام دینی عەرەب نیە بە تەنیا ، بەڵکو دینی هەموو مرۆڤە و ، پێویستە ئامۆژگاری‌یە بەنرخەکانی بە هەموو مرۆڤ بگەیەنرێن . وا ئێستا هەموو دوورگە موسڵمان کراوە ، کەواتە پێویستە بە دەرەوەی دوورگەش بگەیەنرێ ، چونکە موسڵمانەکان بەو عەقیدە پاکەیانەوە شایانی ئەوەبوون ئەو کارە مەزنە ئەنجام بدەن و، مرۆڤایەتیی بە پێی توانا لە نەفامیی و زوڵم رزگار بکەن ..

لەولاوە مونافیقەکانی مەدینە هەر خەریکی چرپ و چاپ و ئاژاوەنانەوە بوون ، بەڵام لەبەر لاوازیی و کەمی‌یان دەورێکی ئەوتۆیان نەمابوو ، چونکە لاریی و چەوتی‌یان بۆ دانیشتوانی مەدینە دەرکەوتبوو و ، هەر جووڵەیەکیان بکردایە دیار بوون . پێغەمبەری خوایش ﷺ بە دڵە پرسۆزەکەی پێی خۆش بوو لەگەڵیان ئارام بگرێ ، تا بەڵکو واز بهێنن و لەو کارەیان تەوبە بکەن ، ئەگینا زۆر بە ئاسانیی ئەی توانیی مەدینەیان لێ پاك بکاتەوە .

دەربارەی موشریکانی دوورگەش هیچ دەورێکی سەربازی‌یان نەمابوو ، چونکە دوای فەتحی مەککە ، بە شێوەیەکی بەر بلاو ئیسلام لە ناو هۆزەکان‌دا بلاو بوویەوە و، بت‌پەرستیی بووە شتێکی قیزەون لەبەر چاوی دانیشتوانی دوورگە . بەمە هێزی موشریکان بۆ دژایەتیی ئیسلام هیچ دەورێکی نەما .

دەربارەی دەوڵەتی رۆمیش ، ئەم دەوڵەتە هەرچەندە بەشێکی زۆری جیهانی ئاوەدان کراوەی ئەو رۆژە لەژێر رکێفی‌دابوو و ، لەو کاتەدا بە یەکەم هێزی جیهانیی لە قەڵەم ئەدرا ، چونکە بەسەر فارس‌دا زاڵ بوو بوو ، لەگەڵ هەموو ئەمانەدا ئاژاوە و پشێویی سەری لێ هەڵ دابوو ، بە تایبەت لە وڵاتی شام‌دا . خەڵکەکە بە دەست کاربەدەستان ئەچەوسایەوە و ، بە یەکجاریی لێیان بێزار بوون ، بۆیە خەڵکێکی زۆر لەو هۆزانەی ژێر دەسەلاتی رۆم موسڵمان بوون .

ئەوەبوو ( فەرۆەی کوڕی عەمری جوذامیی ) کە فەرماندەی یەکێ لە فیرقە سەربازی‌یە رۆمی‌یەکانی جەنگی موئتە بوو ، موسڵمان بوو و ، لەسەر ئەم موسڵمان بوونەشی هیرەقل بە تاوانی ناپاکیی‌کردن لەگەڵ دەوڵەت‌دا تاوان‌باری کرد و ، خستیە بەندی‌خانەوە . هیرەقل ئامادە بوو فەرۆە بەر بدات ئەگەر بگەڕێتەوە سەر دینی

مەسیحیەت ، کەچیی فەڕوە کۆڵی نەدا و لەسەر ئیسلام دانی بە خۆیدا گرت و ، هیرەقلیش شەهیدی کرد .

بڵاوبوونەوەی ئیسلام لە نێو عەرەبە گاورەکاندا بوو بووە مایەی نیگەرانیی بۆ رۆمەکان ، بۆیە رۆمەکانیش لە بیری ئەوەدا بوون بەسەر دینی نوێدا زاڵ بن و لەناوی بەرن ، بەر لەوەی دەسەڵاتی تەواو پەیدا بکات . بۆ ئەمە رۆمەکان سوپایەکی زۆریان لەسەر سنوورەکانی باشووری شام جەم کرد ، بەو هیوایەی هێرش بکەنە سەر موسڵمانەکان . بۆ ئەمە نەبەطی‌یەکانیان بۆ وەرگرتنی دەنگ و باسی موسڵمانەکان بەکار هێنا ، چونکە ئەوان بۆ کاروباری بازرگانیی هاتوچۆی مەدینەیان ئەکرد .. رۆمەکان هەواڵیان وەرگرت کە موسڵمانەکان رۆژ بە رۆژ بەهێزتر ئەبن و، بەو بەهێز بوونەش مەترسی‌یان بۆ سەر رۆم زیاد ئەکات ، بە تایبەتیی بۆ سەر وڵاتی شام .[281]

**دووهەم : هۆیەکانی ئەم غەزایە**

١ ـ بەبێ هیچ هۆیەك بە دەستی شورەحبیلی کوڕی عەمری غەسسانیی حاریثی کوڕی عومەیری ئەزدیی شەهید کرا . شورەحبیل کاربەدەستی قەیصەر بوو بەسەر ناوچەی ( بولقاء ) ەوە و[282] حاریثیش سەفیری پێغەمبەری خوا بوو ﷺ بۆ لای سەرۆکی بوصرا کە بانگی بۆ موسڵمانبوون ئەکرد .. بۆ تۆڵەسەندنی ئەو شەهیدە سوپای موئتە بەڕێ کرا ، بەڵام ئەو سوپا بچووکە تووشی بە تووشی سوپایەکی گەورەی رۆمەوە بوو و ، نەی‌توانیی وەك پێویست کاری سەرشانی ئەنجام بدا ، هەرچەندە دەوری خۆی هەر هەبوو .

٢ ـ قەیصەر ئەی‌زانیی جەنگی موئتە کاریگەری‌یەکی چاکی بۆ موسڵمانان بووە ، بەوەی کە دڵی هۆزە عەرەبەکانی سنووری شام و دوورگەی بە لای موسڵمانەکاندا راکێشاوە . دیارە ئەمەش مەترسی‌یەکە و پێویستە چارەسەر بکرێ ، ئەگینا کاروباری هۆزەکانی سنوور باش نابێت و مەترسیی روو ئەکاتە رۆم . بۆ ئەمە ئەبێ نەخشەیەکی ورد بکێشرێ .

---

[281] الرسول القائد ، محمود شیت خطاب : ٣٩٥ ـ ٣٩٦ .

[282] بولقا ، ناوچەیەکە لە نێوان شام و وادیلقوڕادا سەر بە دیمەشق و ، پایتەختیشی عەممان بووە .

٣ ـ ئەوەبوو سالێك بەسەر موئتەدا تێ نەپەڕیی قەیصەر لە رۆمان و لە عەرەبی ئال غەسسان سوپایەکی گەورەی پێك هێنا ، تا جەنگێکی خوێناویی دژی موسڵمانەکان بەرپا بکات .

٤ ـ هەواڵ گەیشتە پێغەمبەری خوا ﷺ کە رۆم سوپایەکی گەورەیان لە شام جەم کردووە و ، قەیصەریش مووچەی ساڵێکی پێشەکیی بەسەریانا دابەش کردووە و ، لە عەرەبە هاوکارەکانی رۆمیش ، لە هۆزی لەخم و جوذام و عامیلە و غەسسان خەڵکێکی زۆری جەم کردووە و، پێشەنگی سوپاشیان گەیشتۆتە بولقاء . جا پێغەمبەری خوا ﷺ وای بە چاك زانیی هەڵمەت بەرێتە سەر دوژمن ، نەك ئەوان هێرش بکەنە سەر مەدینە .

٥ ـ ئیبن کەثیر وای بۆ ئەچێ کە ئەم غەزایە لەگەڵ قۆناغی جیهاددا گونجاوە ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری دا بچێت بە گژی سوپای رۆمدا ، کە ئەو رۆژە ئەوان نزیکترین کەس بوون تا بۆ موسڵمانبوون بانگیان بکات . قورئان ئەفەرموێ :

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ ٱلۡكُفَّارِ وَلۡيَجِدُواْ فِيكُمۡ غِلۡظَةٗۚ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴾ ( التوبة : ١٢٣ ) . قورئانی پیرۆز فەرمان بۆ ئیمانداران دەر ئەکات تا بچن بە گژی ئەو کافرانەدا کە لێیانەوە نزیکن و ، با هەست بە زبریی و توند و تۆڵیی موسڵمانان بکەن . با ئەوەش چاك بزانن کە خوای خاوەنی دەسەڵات وا لەگەڵ تەقواداراندا ..

٦ ـ وەك لەناو دوورگەدا ئیسلام بڵاو بوویەوە ، پێویست بوو لە دەرەوەی دوورگەش بڵاو بکرێتەوە . ئەمەش پێویستی بە هێزێك هەبوو کە دوژمنان سڵی لێ بکەنەوە و ، نەوێرن هەڵگرانی ئیسلام بکوژن و ببڕن .

٧ ـ بەهێزکردنی ورەی ئەو هۆزانەی کە دڵیان ئەچووە سەر ئیسلام و ، رۆمیش هەڕەشەی لێ ئەکردن ، تا نەترسن و ئاوڕ بەلای دینی تازەوە بدەنەوە .

٨ ـ ترساندنی ئەو هۆزانەی کە بووبوونە داردەستی فارس و رۆم ، تا کەمێك بە خۆیاندا بێنەوە و ، ئەوەش بزانن کە هێزی دینی تازە ئەبێتە گەورەترین هێز و ، نۆکەریی دوژمنان و داگیرکەرانیش پەشیمانیی لە دوایە .

٩ ـ سڕینەوەی شوێنەواری کشانەوەی سوپای موئتە نەوەکو هەندێك موسڵمانەکانیان بە شکاو لە قەڵەم دابێ .

١٠ ـ تاقیی کردنەوەی هێزی رۆم ، تۆ بڵێ ترس بردنە ناو دڵی جەنگاوەری رۆمیەوە تا دەستی چەك نەگرێ دژی موسڵمانان ، ئەمەش بۆ ئامادەکردنی سوپای ئیسلام بۆ فتووحاتی نزیکەوە بوو .[283]

لە راستیی‌دا دەنگ‌وباسی هێرشی رۆم بۆ سەر موسڵمانەکان گەیشتبووە مەدینە و، ترسێکی زۆری بردبووە دڵی موسڵمانەکانەوە . ئەم هەواڵانە لە رێی ئەو بازرگانە نەبەطی‌یانەوە ئەگەیشتن کە زەیتیان لە شامەوە بۆ مەدینە ئەهێنا . بڵاویان کردەوە کە هیرەقل سوپایەکی چل هەزاریی پێکەوە ناوە و ، فەرماندایەتییشی بە یەکێ لە گەورە پیاوانی رۆم سپاردووە و ، زۆرێك لە عەرەبە گاورەکانی لەخم و جوذام و غەیری ئەوانیشیان لەگەڵ خۆیان‌دا هێناوە . ئەمە مەترسی‌یەکی گەورەی لەلای موسڵمانەکان دروست کرد .

بۆ ئەمە هەر دەنگێکی نائاسایی لە مەدینەدا ببیسترایە ، موسڵمانەکان وایان ئەزانیی هێرشی رۆمانە . جا ئەمە لەم رووداوەوە کە عومەر ئەی‌گێڕێتەوە بە جوانیی دەرئەکەوێ . ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی نۆهەم‌دا بۆ ماوەی یەك مانگ لە هاوسەرەکانی دوور کەوتەوە . هاوەڵانیش لە سەرەتاوە لە باسەکە بە وردیی تێ نەگەیشتن و وایان زانیی تەلاقی داون . بەمە تووشی خەم و خەفەت بوون . عومەری کوڕی خەططاب خوا لێی رازیی بێ رووداوەکە ئەگێڕێتەوە و ئەفەرموێ : هاوەڵێکی ئەنصاریی هەبوو ئەگەر من ئامادە نەبوومایە هەواڵی بۆ ئەهێنام و ، گەر ئەویش ئامادە نەبووایە من هەواڵم بۆ ئەهێنا - چونکە هەردووکیان نیشتەجێی ( عوالي ) مەدینە بوون و - بە نۆبەش سەریان لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەدا - ئێمەش ترسی پادشایەك لە پادشاکانی غەسسانمان لە دڵ‌دا بوو و ، بۆیان باس کردبووین نیازی وایە بێتە سەرمان .. ترسێکی زۆری چوو بووە دڵمانەوە . سەیرم کرد هاوەڵە ئەنصاریی‌یەکەم تەقە لە دەرگا ئەدات و وتی : بی‌کەرەوە ، بی‌کەرەوە . وتم : کابرای غەسسانیی هاتووە ؟ وتی : لەوە خراپ تر . پێغەمبەری خوا ﷺ لە هاوسەرەکانی کەناری گرتووە ....[284]

---

[283] الرسول القائد : ٣٩٧ . الرحيق المختوم : ٤٤٣ ، السيرة النبوية للصلابي : ٨٠٩ ـ ٨١٠ . السيرة النبوية للندوي : ٣٦٨ ـ ٣٦٩ .

[284] السيرة النبوية للصلابي : ٨١٠ ، الرحيق المختوم : ٤٤٤ ، السيرة النبوية للندوي : ٣٦٧ ـ ٣٦٨ .

ئەوەی کە زیاتر تەنگی بە موسڵمانەکان هەڵ چنی بوو ، ئەوەبوو کە کاتی ئەم غەزایە لە گەرمای هاویندا بوو ، کاتێك کە سێبەر خۆش بوو بوو و باغە خورماکانی مەدینە بەروبوومیان پێ گەیی بوو . بۆیە موسڵمانەکان دڵیان بەو سێبەر و بەروبوومانە زۆر ئەکرایەوە و ، بەجێ هێشتنیان یەکجار گران بوو .. لە هەمان کات دا خەڵکەکە دەستکورت بوون و ولاغیشیان کەم پێ بوون .. ماوەی نێوان مەدینە و شامیش بیابانێکی دوور دووری وشك و برینگ بوو ، سەرەڕای سەختیی رێگا .. [٢٨٥]

**سێهەم : سامان بەخشین**

پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بە وردیی سەرنجی بارودۆخ و رووداوەکانی ئەدا .. ئەیزانیی پێویستە رۆم تەمێ بکرێن و نەوێرن لە دوورگە نزیك بکەونەوە ، یان دەست بۆ هەر ناوچەیەك بەرن کە لە ژێر رکێفی ئیسلامدایە . چونکە ئەگەر رۆم تەماع بکەنە مەدینە و هێرشی بۆ بکەن ورەی موسڵمانەکان ئەڕووخێ و ، مونافیقان سەر بەرز ئەکەنەوە و ، ئەبنە نۆکەری دوژمنان . ئەو کاتەش رەنج و تەقالای بیست و ئەوەندە ساڵی موسڵمانان لە کیس ئەچێ و رەنج بەخەسار ئەبن ..

بۆ ئەمە پێغەمبەری خوا ﷺ بە پێویستی ئەزانیی هەڵمەت ببرێتە سەر رۆم ، تا ئەوان هەڵمەت نەهێنن . ئەوەبوو لە دەوروبەری مەدینە و مەککە و لەناو هۆزە موسڵمانەکاندا جاڕ درا کە هێرش ئەکرێتە سەر رۆم .. خەڵکەکە هەڵ نران بۆ جیهاد و داوا لە موسڵمانان کرا سامان لەو پێناوەدا ببەخشن و ، بەڵێنی پاداشتی خوایی بە موسڵمانە بەخشندەکان درا ..

موسڵمانەکان دەستیان دایە بەخشین ..

عوثمانی کوڕی عەففان بووە سەرقافڵەی ئیماندارە بەخشندەکان . ئەوەتا عەبدورڕەحمانی کوڕی خوباب باسی بەخشینی عوثمان بۆ ئەکات کە ئەڵێ : لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ ئامادە بووم کە موسڵمانانی بۆ کۆمەکیی کردنی سوپای ( عوسرە : سەختیی ) هەڵ ئەنا . ئەوەبوو عوثمانی کوڕی عەففان هەستا و فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ! صەد وشتر بە هەموو تفاقێکیانەوە لەسەر من بێ لە پێناوی خوادا .. پاشان موسڵمانانی بۆ کۆمەکیی سوپا هەڵ نا و ، عوثمانی کوڕی عەففانیش هەستا و فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ! دوو صەد وشتر بە هەموو

---

[٢٨٥] الرحيق المختوم : ٤٤٥ ، السيرة النبوية للندوي : ٣٧٠ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٤٩٥ .

تفاقێکیانەوە لەسەر من بن لە پێناوی خوادا . پاشان موسڵمانانی بۆ کۆمەکیی سوپا هەڵ نا و ، عوثمانیش هەستا و فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ! سیٚ صەد وشتر بە هەموو تفاقێکیانەوە لەسەر من بن لە پێناوی خوادا .. چاوم لیٚ بوو پێغەمبەری خوا لەسەر مینبەر دابەزیی و ئەی فەرموو : (( ما علی عثمان ما عمل بعد هذه ، ما علی عثمان ما عمل بعد هذه )) . فەرمووی : دوای ئەمە عوثمان هەرچیی بکات هیچی لەسەر نابێت .

لە عەبدورڕەحمانی کوڕی سەمورەوە ئەگێڕنەوە وتوویە : عوثمانی کوڕی عەففان هەزار دینار ( واتە هەزار مسقاڵ زێڕ ) ی کردبووە ناو کراسەکەیەوە و هێنایە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ ، ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە پێغەمبەر ﷺ تفاقی بۆ سوپای سەخڵەتیی کۆ ئەکردەوە . ئەڵێت : پێغەمبەر ﷺ بە دەستی ( زێڕەکەی عوثمانی ) ئەم دیو و ئەو دیوی پیٚ ئەکرد و ئەی فەرموو : (( ما ضرَّ ابن عفان ما عمل بعد اليوم )) . چەندین جار دووبارەی ئەکردەوە . فەرمووی : لەمڕۆ بە دواوە عوثمان هەرچیی بکات زیانی پیٚ ناگات .. عوثمان هەروا خەریکی بەخشین بوو هەتا ژمارەی وشترەکانی گەیشتنە نۆصەد . صەد ئەسپ و ، هەزار دیناریشی بەخشیی .

عومەریش نیوەی سامانەکەی هێنا و کردی‌یە صەدەقە و ، وای ئەزانیی بەوە پێشی ئەبوبەکر ئەداتەوە . فاروق خۆی لەو بارەوە ئەفەرمویٚ : ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بەسەرماندا دا تا صەدەقە بکەین ، لەو کاتەدا منیش ماڵ و سامانێکم بەلاوە هەبوو . وتم : ئەگەر بۆم بکریٚ ڕۆژێك پێشی ئەبوبەکر بدەمەوە ، ئەمڕۆ پێشی ئەدەمەوە . نیوەی سامانەکەم هێنا و ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( ما أبقيت لأهلك ؟ )) . فەرمووی : چەندت بۆ ماڵ و منداڵەکەت هێشتۆتەوە ؟ وتم : ئەوەندەی ئەمە . ئەڵیٚ : ئەبوبەکریش خوا لیٚی ڕازیی بیٚ چەندە سامانی هەبوو هەر هەمووی هێنا . پێغەمبەری خوا ﷺ لیٚی پرسیی : (( ما أبقيت لأهلك ؟ )) . فەرمووی : خوا و پێغەمبەرم بۆیان هێشتۆتەوە . وتم : ئیتر هەرگیز پێش برکێت لەگەڵدا ناکەم .

ئەگێڕنەوە کە عەبدورڕەحمانی کوڕی عەوفیش دوو هەزار دیرهەمی بەخشیوە بۆ بەڕیٚکردنی سوپای سەخلەتیی ، کە ئەوە نیوەی سامانەکەی بووە ..

هەندێکی تر لە هاوەڵان بەوپەڕی دڵ گوشادی‌یەوە پارەیەکی زۆریان ئەکردە صەدەقە ، وەك عەبباسی کوڕی عەبدولموطەللیب و ، طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلا و ،

موحەمـــەدی کوڕی مەسلەمە و ، عاصیمی کوڕی عـەدیی خوا لە هەموویان رازیـی بێ.

بەڵێ بە پێچەوانەی زۆربەی غەزاکانەوە پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵمەتەکەی دیـاریی کرد تا موسڵمانەکان گەورەیی کارەکەیان بـزانن و ، جـوان خۆیـان بـۆ ئـەو سـەفەرە ناڕەحەتـە ئامـادە بکـەن و ، بـۆ کۆمـەکییش هـەموو توانەیـەکیان بخەنـە کـار. موسڵمانەکانیش کە ئەوەیان زانیی ، بە پەلە کەوتنە خۆئامادەکردن و خۆپێچانەوە و، هۆزەکان هەر هەموو روویان کردە مەدینەی پایتەخت .. ئەوەی موسڵمان بـوو خـۆی ئامادە کرد و ، تاقە کەسێك ـ جگە لە مونافیقان و سێ موسـڵمانی دامـەزراو ـ دوا نەکەوت . هەتا دەست‌کورت و موحتاجەکان ئەهاتنە خزمەتی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بەو هیوایەی وڵاغ و کەرەسەی جەنگیان بۆ دەست بخات .

بەم شێوەیە هاوەڵە دەوڵەمەندەکان سەلماندیان کـە سـامانەکەیان وا لـە خزمـەتی ئیسلامدا و ، بەوپەڕی دڵگوشادیی و سنگ فراوانی‌یەوە ئەی‌بەخشن .. ئەمەش کاری ئیمانە وا لە ئیمان‌داران ئەکات کە سەریش و ماڵیشیان لە پێناوی بەرزیی قورئـان‌دا بەخت بکەن.

هـــەروەك دەوڵەمەنـــدەکان هـــەموو توانەیـــەکیان ئەخســـتە کـــار بـــۆ بەخشـــین ، هەژارەکانیش پێیـان خـۆش بـوو لـە شـەرەفی بەخشـین‌دا بەشـدار بـن ، بۆیـە بـە شەرمێکەوە ئەوەی لە تواناياندا هەبوو ئەیان‌هێنا و ئەیان بەخشیی .

ئەوەبوو هاوەڵێك بە ناوی ئەبوعوقەیل نیو صاع خورمای هێنا و یـەکێکی تـریش زیاتری هێنا ، کەچیی مونافیقەکان کەوتنە تـوانج و تەشـەر لـە هـەردووکیان . بـە دەوڵەمەندەکەیان ئەوت کە بۆ ریایی ئەوەی بەخشیوە و بە هەژارەکەشیان ئـەوت کـە خوا هیچ موحتاجی بەخشینی ئەویش نیە . ئەوەبوو ئایەتی پیرۆز هاتە خوارەوە :

﴿ ٱلَّذِينَ يَلۡمِزُونَ ٱلۡمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهۡدَهُمۡ ﴾ ( التوبة : ٧٩ ) ، هەڕەشەی لەو مونافیقانە ئەکرد کە توانج ئەگرنە ئیمان‌دارەکان کاتێ کە سامانیان بۆ خزمەتی ئیسلام ئەبەخشن ، چ دەوڵەمەند و چ هەژار .. ئەیان‌وت : ئەوەی کە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف بەخشیی بۆ ریایی بوو . گاڵتەشیان بە بەخشینی هەژارەکان ئەکرد .

ئەوانەش کە هەژار بوون خەفەتێکی زۆریان ئەخوارد وا دەستیان کورتە و توانای بەشداریی‌کردنیان لە جیهاددا نیە .

یەکێ لەو هەژارانە کە ناوی عولەبەی کوڕی زەید بوو ، کە یەکێك بوو لەوانەی کە لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ گریان و داوای ولاغ و کەرەسەی جەنگیان ئەکرد تا بەشداریی جیهاد بکەن ، شەو هەڵ ئەستێ بۆ شەونوێژ و دەست بە گریان ئەکات و ، ئەڵێت : خوایە تۆ فەرمانت بە جیهاد کردووە و ، خەڵکیشت هەڵ ناوە بۆی ، کەچیی هیچم بەلاوە نیە تا لەگەڵ پێغەمبەرەکەتدا خۆمی پێ کۆك بکەم . جا هەر ستەمێکم لە لاشە و لە ناموس لێ کراوە وا من بەخشییم و کردمە صەدەقە بۆ هەموو موسڵمانێك . پێغەمبەری خواش ﷺ هەواڵی ئەداتی کە خوا لێی خۆش بووە.

با گوێ لە واثیلەی کوڕی ئەسقەع یش بگرین ، ئەویش چیرۆکی خۆی ئەگێڕێتەوە: کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ جاڕی دا بۆ غەزای تەبوك ، هاتمەوە بۆ لای کەس‌وکارم . منیش هاتم ـ ئەوەبوو سەرەتای هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتبوونە ڕێ ـ و لە مەدینەدا ئەگەڕام و ئەمەوت : ئەوە کێ پیاوێك سواری ولاغ ئەکات و بەشەکەی هەڵ گرێ بۆ خۆی ؟ پیاوێکی ریش سپیی ئەنصاریی وتی: بەشەکەی بۆ ئێمە ئەبێ ئەگەر بە نۆبە سواری ولاغی بکەین و خواردنیشی لەسەر ئێمە بێت ؟ وتم : بەڵێ ، لەسەر بەرەکەتی خوا بڕۆ . لەگەڵ چاك ترین هاوەڵدا کەوتمە ڕێ هەتا خوا دەستکەوتی بۆ ناردین .[٢٨٦]

ئەوەبوو چەند وشترێکم دەست کەوتن . منیش لێیان خوڕیم هەتا هاتمەوە لای هاوڕێکەم و هاتە دەرەوە و ، لەسەر کەل و پەلی یەکێ لە وشترەکانی دانیشت و پاشان وتی : بەرەو دواوە لێیان بخوڕە . پاشان وتی : بەرەو پێشەوە لێیان بخوڕە . جا وتی: وا ئەبینم وشترەکانت ڕەسەن بن . وتم : ئەمە ئەو دەستکەوتەیە کە بەڵێنم دایتێ. کاکی ئەنصاریی وتی : کوڕی برام ! وشترەکانت بەرەوە ، بەشێکی ترمان ویست لێت.

بەم شێوەیە واثیلە بە بەشە دنیایی‌یەکەی قازانجی قیامەت دەست خۆی ئەخات و، کاکی ئەنصارییش دەست لە حەسانەوەی خۆی هەڵ ئەگرێت و بە ناوی دەستکەوتەوە

---

[٢٨٦] چونکە واثیلە یەکێ بووە لە سەربازانی ئەو سریەیە کە بە فەرمانداییەتیی خالیدی کوڕی وەلید پێغەمبەری خوا ﷺ لە تەبوکەوە ناردی بۆ ( دومة الجندل ) .

واثیلە ئەکاتە هاوبەشی خۆی چ لە سواریی وڵاغدا و چ لە خۆراکدا ، بەو هیوایەی دەستکەوتی قیامەتیی دەست بکەوێت .

هەروەها ئەشعەری‌یەکانیش بە سەرکردایەتیی ئەبوموسای ئەشعەریی هاتن و ، داوایان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد کە وشتری سواری‌یان بۆ پەیدا بکات ، تا بتوانن دەرچن بۆ جیهاد . ئەویش هیچی بەلاوە نەبوو ، هەتا دوای ماوەیەك ئەوەبوو سێ وشتری بۆ پەیدا کردن .

لاوازەکان و دەسەوسانەکان ، ئەوانەی کە یان نەخۆش بوون ، یان دەستکورت بوون و توانای دەرچوونیان نەبوو و لە خەفەتدا دەستیان بە گریان کرد . قورئان هاتە خوارەوە کە ئەوانە هیچ تاوان و گلەیی‌یەکیان لەسەر نیە ، هەروەها ئەوانەش کە داوایان کرد کەرەسەی جیهادیان بۆ ئامادە بکرێ ، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ هیچی بەلاوە نەبوو ، ئەوانیش لە داخ و خەفەتدا دەستیان بە گریان کرد ، قورئان ئەفەرموێ:

﴿ لَّيْسَ عَلَى ٱلضُّعَفَآءِ وَلَا عَلَى ٱلْمَرْضَىٰ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُوا۟ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ مَا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ مِن سَبِيلٍ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩١﴾ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ تَوَلَّوا۟ وَّأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ حَزَنًا أَلَّا يَجِدُوا۟ مَا يُنفِقُونَ ﴾ (التوبة : ٩١ ـ ٩٢) .

دیمەنێکی یەکجار دڵ ڕفێنە ..

کەسێك توانای وڵاغ کڕینی نەبێ .. توانای کڕینی چەك و کەرەسەی جەنگی نەبێ.. بگرە دەسەڵاتی نەبێ سادەترین خۆراك بۆ ماڵ و منداڵەکەی دابین بکات.. کەسێك ئا لەم ژیانە پڕ لە مەینەتی‌یەدا بژیت ، هێشتا هۆشی بە لای خزمەتی دینەکەیەوە بێت .. بێت و بپاڕێتەوە و داوای کۆمەکیی بکا تا بتوانێ بچێ بۆ جیهاد.. بەو گەرما گڕپەگڕەی بیابانی دوورگەی عەرەبیی .. ئەو هەمووە ڕێگا دوورە.. بۆ بەگژاچوونی ملهوڕترین دەوڵەتی دنیا .. تەنها ئیمانی بێ‌وێنەی ئەو هاوەڵە بەڕێزانە ئەوەی لێ ئەوەشێتەوە .. مەگەر ئەوانەش مەردانە شوێن پێیان هەڵ ئەگرن ، ئەو خزمەتە ناوازەیە بە دین بکەن ..

ئەگێڕنەوە کە ئەوانەی گریان حەوت کەس بوون . ئەڵێن : یامینی کوڕی عەمر دوانی بەرێ کردن و ، عوثمانیش سیان و ، عەبباسیش دوانەکەی تری بەرێ کردن. ئەو

حەوت کەسەش کە لەبەر دەستکورتیی گریان ئەمانە بوون : سالیمی کوڕی عومەیر، سالیمی کوڕی هەرەمیی کوڕی عەمر ، عولەبەی کوڕی زەید ، ئەبولەیلای مازنیی، عەمری کوڕی غونمە ، سەلەمەی کوڕی صەخر و ، عیرباضی کوڕی ساریە . سەیری ( طبقات ابن سعد : ٢ / ١٦٥ ) بکە .

کۆمەڵێکی تریش هەبوون کە لە مەدینەدا مابوونەوە و، لەبەر نەخۆشیی یان زۆر پیریی یان شتی تر دوا کەوتبوون و نەیانئەتوانیی بەشداریی بکەن ، بەڵام دڵیان لەگەڵ سوپای ئیسلام‌دا بوو ، ئەوانەش خوای گەورە لە ئەجر و پاداشتا کردنیە هاوبەشی سەربازەکانی ئیسلام .. ئەوانە پێغەمبەری خوا ﷺ بەم شێوە ستایشی ئەکردن و ئەی فەرموو : (( إن بالمدينة أقواماً ما سرتم مسيراً ولا قطعتم وادياً إلا كانوا معكم )) . لە تەبووك بە موسڵمانەکانی فەرموو : لە مەدینەدا خەڵکانێك هەن کە هەرچیی ئێوە ڕێگا ئەبڕن و بە شیوەکان‌دا ئەڕۆن ئەوانە وان لەگەڵتان‌دا و ، وەك ئێوە ئەجر و پاداشتیان هەیە . پرسییان : ئەی پێغەمبەری خوا ! وان لە مەدینەش‌دا ؟ فەرمووی : (( وهم بالمدينة حبسهم العذر )) فەرمووی : بەڵێ ، وان لە مەدینە، بەڵام توانایان نەبووە بکەونە ڕێ ..[287]

### چوارەم : هەڵوێستی مونافیقان لە غەزای تەبووك‌دا

کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا سوپای موسڵمانان جەم ببێ و ، هەر کەسە بە پێی توانای خۆی ماڵ و سامان ببەخشێ بۆ ڕێكخستنی سوپا و بەڕێ کردنی ، مونافیقەکان دەستیان دایە ساردکردنەوەی موسڵمانان و ، ئەیان وت : لە گەرمادا مەچن بۆ جەنگ ، بۆ ئەمە قورئانی پیرۆز هاتە خوارەوە تا هەڵوێستی نامەردانەی مونافیقان تۆمار بکات ، کە ئەفەرمویَ : ﴿ فَرِحَ ٱلْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلَٰفَ رَسُولِ ٱللَّهِ وَكَرِهُوٓا۟ أَن يُجَٰهِدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَالُوا۟ لَا تَنفِرُوا۟ فِى ٱلْحَرِّ ۗ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا ۚ لَّوْ كَانُوا۟ يَفْقَهُونَ ﴿٨١﴾ فَلْيَضْحَكُوا۟ قَلِيلًا وَلْيَبْكُوا۟ كَثِيرًا جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴾ ( التوبة : ٨١ ـ ٨٢ ) .

[287] الرحيق المختوم : ٤٤٥ ـ ٤٤٦ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٤٩٥ ـ ٤٩٦ ، السيرة النبوية للصلابي : ٨١٠ ـ ٨١٣ ، الرسول القائد : ٣٩٩ .

لە وەڵامی ئەو قسەیاندا کە ئەیانوت : لە گرەی گەرمادا مەچن بۆ جەنگ ، قورئان ئەیدا بە گوێیاندا کە ئاگری دۆزەخ گەرمترە .

لە کاتی خۆ ئامادەکردندا بۆ غەزای تەبووك ، پێغەمبەری خوا ﷺ بە جەددی کوڕی قەیسی [288] فەرموو : (( یا جد ! هل لك العام في جلاد بني الأصفر؟ )) . فەرمووی : ئەی جەدد ! پێت خۆشە ئەمساڵ لەگەڵ رۆمدا بجەنگێیت ؟ وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئایا مۆڵەتی من ئەدەی تا تووشی فیتنە نەبم ؟ دە بەخوا خزمەکانم ئەزانن کە هیچ پیاوێك وەك من شەیدای ئافرەتان نەبووە . جا من ئەترسم ئەگەر ئافرەتانی رۆم ببینم ئارام نەگرم . پێغەمبەری خوا ﷺ پشتی لێ هەڵ کرد و ماوەی دا کە فەرمووی : (( قد أذنت لك )) .

ئەوەبوو دەربارەی ئەو مونافیقە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە :

﴿ وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ ٱئْذَن لِّي وَلَا تَفْتِنِّيٓ ۚ أَلَا فِي ٱلْفِتْنَةِ سَقَطُوا۟ ۗ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ ﴾ ( التوبة : ٤٩ ) .

هەندێ لە مونافیقانیش ئەچوونە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و بیانووی درۆیان ئەدۆزییەوە تا ماوەیان بدات و بەشداریی تەبووك نەکەن ، ئەویش ماوەی ئەدان . ئەوەبوو خوای گەورە گلەیی لێ کرد کە بۆچ ماوەی دان تا راستگۆ و درۆزنی لەلا ئاشکرا بوایە کە ئەفەرموێ :

﴿ عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ وَتَعْلَمَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴾ ( التوبة : ٤٣ ) .

هەر لەو کاتەدا هەواڵ بە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت کە کۆمەڵێك لە مونافیقان لە ماڵی سوەیلیمی یەهوودیی کۆ ئەبنەوە و هەوڵ ئەدەن خەڵك لە کەوتنە گەلی سوپای ئیسلام پەشیمان بکەنەوە . بۆ ئەمە خێرا پیاوی نارد تا خانووەکەی سوەیلیم بەسەریاندا بسووتێنێ .. ئەمەش وریایی موسڵمان ئەنوێنێ کە پێویستە لە هەموو جم و جووڵێکی ناو کۆمەڵگا ئاگادار بێ .. بە تایبەت جم و جووڵی ئەوانەی کە خەریکی بڵاوکردنەوەی ژەهری خراپکاریین .. پێویستە ئاگاداری نەخشەی ئەو دوژمنانە بێ کە دژی ئیسلام کار ئەکەن .

---

[288] دوای کوڕی ئوبەی دووهەم مونافیقی مەدینە بووە کە زۆر ترسنۆك و زۆریش رەزیل بووە .

قورئانی پیرۆز لە پێشی غەزاکە و لە کاتی‌دا و لە دوایشی‌دا باسی مونافیقەکانی کردووە . ئەوەبوو یەکێ لەوانەی کە دوا کەوتن لە غەزاکە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی سەرۆکی نیفاق بوو ، کە قورئان دەربارەی ئەو جۆرانە ئەی فەرموو :

﴿ لَوۡ كَانَ عَرَضًا قَرِيبًا وَسَفَرًا قَاصِدًا لَّٱتَّبَعُوكَ وَلَٰكِنۢ بَعُدَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلشُّقَّةُۚ وَسَيَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ لَوِ ٱسۡتَطَعۡنَا لَخَرَجۡنَا مَعَكُمۡ يُهۡلِكُونَ أَنفُسَهُمۡ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ﴾

( التوبة : ٤٢ ) .

ەری ئەخا کە ئەو مونافیقانە زانی‌یان سەفەرەکە دوور و ناڕەحەتە دوا کەوتن، خۆ ئەگەر بیان‌زانیایە سەفەرێکی ئاسانە و دەستکەوتی دنیایی ئاسانی تیا دەست ئەکەوێت ئەکەوتنە گەل سوپای ئیسلام . پاشانیش کە سوپای ئیسلام بە سەلامەتیی و سەری بەرزەوە گەڕایەوە مونافیقان هاتن و دەستیان بە سوێندخواردن کرد کە ئەگەر بیان‌توانیایە ئەکەوتنە رێ . بەمە خۆیان بە هیلاك ئەبرد ، ئەویش بە سوێندخواردن بە درۆ و ، خوای گەورەش ئەزانێ درۆ ئەکەن . قورئان ئەفەرموێ :

﴿ وَسَيَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ لَوِ ٱسۡتَطَعۡنَا لَخَرَجۡنَا مَعَكُمۡ يُهۡلِكُونَ أَنفُسَهُمۡ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ﴾ ( التوبة : ٤٢ ) .

شایانی باسە کە ئەم ئایەتە پێش گەڕانەوە لە تەبووك هاتۆتە خوارەوە و، مونافیقەکانیش دوای گەڕانەوە ئەو قسانەیان ئەکرد . ئەمەش موعجیزەیەکی پێغەمبەری خوایە ﷺ .

دەربارەی ئایەتی : ﴿ عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمۡ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَتَعۡلَمَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴾ ( التوبة : ٤٣ ) ، کە گلەیی لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەکرد بە بۆنەی ماوەدانی مونافیقان تا بەشداریی تەبووك نەکەن ، موجاهید ئەڵێت : ئەم ئایەتە دەربارەی کەسانێك هاتە خوارەوە کە ئەیان‌وت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ ماوە بخوازن . جا ئەگەر ماوەی دان ئەوا دانیشن و ، گەر ماوەشی نەدان هەر دانیشن.. ئەوانە دەستەیەك لە مونافیقان بوون ، وەك عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول و، جەددی کوڕی قەیس و ، ریفاعەی کوڕی تابووت ، کە سیی و نۆ کەس بوون و بیانووی درۆیان ئەهێنایەوە .

بەم شێوەیە غەزای تەبووك بووە هۆی جیابوونەوەی دەستەی ئیمان‌داران و دەستەی مونافیقان .. ئیتر ماوەی خۆشاردنەوە نەما .. چونکە بە ئاشکرا بڕیاری خۆ

دزینەوەیان دا و ، هەوڵێکی زۆریشیان دا تا موسڵمانان سارد بکەنەوە و بە زۆریی دوژمن و ، سەفەری دوور و ، گەرمای هاوین بیانترسێنن ..[289]

**پێنجەم : سوپای ئیسلام ئەکەوێتە رێ**

جارِ درا هەموو موسڵمانان خۆیان ئامادەی غەزای تەبووك بکەن و ، نابێ هیچ کەسێك دوا بکەوێ . ئەوەبوو لە سەرانسەری دوورگەوە موسڵمانان کۆبوونەوە و سوپایەکی سیی هەزاری یان جەم کرد .. ئەوەبوو رۆژی پێنج شەممە پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینەوە دەرچوو .. سیی هەزار جەنگاوەر کە دە هەزار وڵاغیان پێ بوو ، لە دیمەنێکی کاریگەری دڵ رِفێن دا بەرەو ( ثنية الوداع ) کەوتنە رێ .. لەوێ پێغەمبەری خوا ﷺ سەربازگەی دروست کرد و ، لە خواری ئەویشەوە کوڕی ئوبەی سەربازگەی دروست کرد .. کە سوپای ئیسلام لەوێوە کەوتە رێ موونافیقان و سەرۆکەکەیان دوا کەوتن و گەڕانەوە و دەستیان دایە قسەی ناماقووڵ و رەخنەگرتن لە کاری موسڵمانان . قورئانی پیرۆزیش هاتە خوارەوە و عیتابی ئەو تەفرەخوازانەی کرد و فەرمووی :

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَا لَكُمۡ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلۡتُمۡ إِلَى ٱلۡأَرۡضِۚ أَرَضِيتُم بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا مِنَ ٱلۡأٓخِرَةِۚ فَمَا مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ﴾ .. ( التوبة : ٣٨ ) .

گلەیی لەوانە کرد کە تەمەڵی یان کرد و ، ژیانی دنیایان خۆش ویست و قیامەتیان پشت گوێ خست ، بە مەرجێ دنیا لە چاو قیامەتدا رابواردنێکی کەمی تێدایە . بۆ ئەم غەزایە قورئان فەرمانی بەسەر گەنج و پیر و ، هەژار و دەوڵەمەندا دا تا بکەونە رێ .. تا بەرگریی لە دینی خوا بکەن ، کە ئەیفەرموو:

﴿ ٱنفِرُواْ خِفَافٗا وَثِقَالٗا وَجَٰهِدُواْ بِأَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴾ ( التوبة : ٤١ ) .

لە زۆربەی غەزاکاندا پێغەمبەری خوا ﷺ شوێنی هەڵمەتەکەی دیاریی نەئەکرد ، بەڵام لەم غەزایەدا دەری بڕیی کە روو لە رۆم ئەنێن ، کە کەوتۆتە سنوورەکانی باکووری دوورگەوە ، ئەویش لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە :

---

[289] السيرة النبوية للصلابي : ٨١٣ ـ ٨١٥ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٤٩٧ ـ ٤٩٨ .

١ـ دووریی ڕێگا ، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەیزانیی بڕینی ئەو ماوە زۆرە چەندە ناڕەحەتە بۆ سوپایەکی وەها گەورە ، لە بیابانێکی وشك و برینگدا ، کە ئاو و ڕووەکی یەکجار کەمن . بۆیە پێویست بوو موسڵمانان تفاقی چاك ئامادە بکەن .

٢ ـ سوپای ڕۆم گەورەترین و بەهێزترین سوپای سەرزەویی بوو ، کە بە ڕاستیی خاوەنی چەکی زۆر و ، شارەزایی جەنگی چاك و ، توانای دەست وەشاندنی بێوێنەی هەبوو .

٣ ـ کاتی گەرمای هاوین بوو ، ئەبوایە هەموو کەسێ ئاگاداری ئەوە بوایە کە ئەم بیابانە لەم وەرزە سەختەدا بە ئاسانیی بۆیان نابڕێت .

٤ ـ لەبەر ئەوەی کە لە دوورگەدا دوژمنی چەکدار نەما بوو ، بۆیە سوپایەکی وەها گەورە تەنها بۆ جەنگی ڕۆم و عەرەبە گاورەکان ئەبێت ..

کە موسڵمانەکان هەستیان بە گەورەیی کارەکە کرد بە هەموو هێزێکیانەوە کەوتنە خۆئامادەکردن .. دەستیان دایە بەخشین ، بە تایبەتیی دوای بیستنی فەرمایشتی ئازیز ﷺ کە ئەیفەرموو : (( مَن جَهَّزَ جَيشَ العُسرةِ فَلَهُ الجَنَّة )) . ( البخاري : ٤ / ٢٤٣ ) . ئەی فەرموو : هەر کەسێ لە بەڕێکردنی سوپای سەختیی دا بەشداریی بکات ئەچێتە بەهەشتەوە :

کاتێك کە سوپا کەوتە ڕێ پێغەمبەری خوا ﷺ موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی ئەنصاریی کردە ئەمیری مەدینە و ، ئیمام عەلییشی لەلای کەسوکاری خۆی بەجێ هێشت . ئەوەبوو مونافیقەکان کەوتنە چرپ و چاپ و وتیان : لەبەر بارگرانیی و خۆ لێ ڕزگارکردن بەجێی هێشتووە . کە ئیمام ئەوەی بیست زۆری پێ ناخۆش بوو ، بۆیە چەك و کەرەسەی جەنگی هەڵ گرت و ، هات هەتا گەیشتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە (جورف ) دابەزیی بوو . ئیمام فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ! مونافیقان وای ئەگەیەنن کە تۆ لەبەر بارگرانیی و خۆ لێ ڕزگارکردن منت بە جێ هێشتووە . فەرمووی : (( كَذَبُوا ، وَلَكِنّي خَلَّفتُكَ لِما تركتُ وَرائي ، فارجع فاخلُفني في أهلي وَأهلِكَ ، أفَلا تَرضى أن تكونَ مِنّي بِمَنزِلَةِ هارون مِن موسى ؟ إلاّ أنَّهُ لا نَبِيَّ بعدي )) . ( البخاري : ٤٤١٦ ) . فەرمووی : درۆیان کردووە . من تۆم بۆ پارێزگاریی ئەوانە بەجێ هێشتووە کە بەجێم هێشتوون . بگەڕێرەوە لە بریی من چاودێریی خاوخێزانی منیش و خۆیشت بکە . ئایا ڕازیی نابیت بۆ من لە جێی هاروون بیت بۆ

مووسا ؟ ئەوەندە هەیە دوای من پێغەمبەری تر نایەت . بەمە ئیمام گەڕایەوە بۆ مەدینە.

بەجێهێشتنی ئیمام خوا لێی رازیی بێ بۆ چاودێریی کەسوکاری بە بۆنەی خزمایەتیی و زاوایەتی‌یەوە بووە و ، بۆ کارێکی تایبەتیی ، کە ئەویش چاودێریی کەسوکاریەتی ، بەجێی هێشتووە ، بەلاّم بە جێگردانانی موحەممەدی کوڕی مەسلەمە هەر لەو غەزایەدا بە شێوەیەکی گشتیی بووە .

کاتێك کە موسڵمانەکان بە فەرماندایەتیی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ( ثنية الوداع ) کۆ بوونەوە ، ئەمیر و فەرماندەکان دیاریی کران و ئالاّی دایە دەست هەموویان. ئالاّی گەورەی دایە دەست ئەبوبەکری صددیق خوا لێی رازیی بێ و ، بەیداخی گەورەشی دایە دەست زوبەیری کوڕی عەووام خوا لێی رازیی بێ و ، بەیداخی ئەوسیشی دایە دەست ئوسەیدی کوڕی حوضەیر و ، بەیداخی خەزرەجیشی دایە دەست ئەبودوجانە ، یان حوبابی کوڕی مونذیر و ، فەرمانیشی دا هەر بنەماڵەیەکی ئەنصار ئالاّیەك هەڵ بگرن. پاسەوانیی سەربازگەی تەبووکیش لە یەکەم ڕۆژی گەیشتنەوە تا ڕۆژی گەڕانەوە بە عەببادی کوڕی بیشر سپێررا . ئەوەبوو عەبباد خوا لێی رازیی بێ بە خۆی و هاوەڵانیەوە بە دەوری سەربازگەکەدا ئەسووڕانەوە . دەلیلی ڕێگاش بۆ ئەم غەزایە عەلقەمەی کوڕی فەغوائی خوزاعیی بوو ، کە چاك شارەزای ڕێی تەبووك بوو..[290]

**شەشەم : لە ڕێگای مەدینە و تەبووکدا**

سوپای ئیسلام کەوتە ڕێ ، بەلاّم لەوپەڕی ناڕەحەتیی‌دا ، چونکە وشتر و ولاّغی سواری‌یان کەم بوون .. هەردوو یان سێ پیاو بە نۆرە سواری وشترێك ئەبوون .. خۆراکیشیان ئەوەندە کەم بوو هەر دوو پیاو و سێ پیاویان دەنکە خورمایەکیان لە نێوان خۆیان‌دا بەش ئەکرد . ئەوەندە برسێتیی زۆری بۆ هێنان ناچار بوون گەلاّی دار و درەخت بخۆن ، بە ڕادەیەك کە لێویان زامدار بوو بوون . ئەوەندە تەنگیان پێ هەڵ چنرا ، ناچار بوون هانا بەرنە خزمەتی پێغەمبەر و داوای مۆڵەتی لێ بکەن بۆ سەربڕینی وشترەکانیان تا کەڵك لە گۆشتەکەیان و ئاوی ناوسکیان وەربگرن .. ئەویش ماوەی دان . لەم کاتەدا حەزرەتی عومەری فاروق هات و ناڕەزایی دەربڕیی و فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەگەر ئەو کارە ئەنجام بدەین ولاّغی

---

[290] السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٤٩٧ ـ ٤٩٩ ، السيرة النبوية للصلابي : ٨١٦ ـ ٨١٨ ، الرحيق المختوم : ٤٤٧ .

سوارییمان کەم ئەبێتەوە ، بەڵام فەرمان بدە هەر کەسە خۆراك چیی لایە بی‌هێنێ و تۆش دوعای بەرەکەتیان بۆ بکە . پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (( نعم )) . داوای سفرەیەکی کرد و رای خست و داوای خۆراکی ماوەی لێ کردن هەتا شتێکی کەم کۆ بوویەوە ..

بەڵێ بەڕێزان ! لەلایەن سیی هەزار سەربازەوە شتێکی کەم کۆ ئەبێتەوە و ئەیخەنە سەر سفرەیەك . پاشان دوعای بەرەکەتی کرد و ، فەرمانی دا هەر دەفرێکیان لایە بی‌هێنن و پڕی بکەن .. ئەو هەمووە سوپایە ، چیی دەفریان پێ بوو هێنایان و پڕیان کرد و بردیان .. لێیان خوارد هەتا تێر بوون و ، لێیشی مایەوە . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( أشهد أن لا إله إلا الله وأني رسول الله ، لا يلقى الله بها عبد غير شاك فيحجب عن الجنة )).( رواه مسلم والبيهقي ، عن البداية والنهاية : ٥/ ١٠ ).

فەرمووی : شاهێدیی ئەدەم کە جگە لە زاتی ( الله ) هیچ خوایەکی تر نیە و منیش پێغەمبەری خوام ، هەر بەندەیەکیش بەم شایەتمانەوە بچێتەوە حزووری خوا و گومانی لێ نەبێ ئەچێتە بەهەشتەوە .

بەڵام هیرەقلی پادشای رۆم مووچەی ساڵێکی بەسەر سەربازانی سوپاکەی‌دا دابەش کرد و ، پووڵ و پارەیەکی زۆریشی بەسەر هۆزە عەرەبە دۆستەکانی‌دا بەخشی‌یەوە، تا لە جەنگی داهاتوودا کۆمەکیی رۆم بکەن .

هەروەها لەو رێگا دوورەدا موسڵمانان بە پێی پێویست ئاویان دەست نەئەکەوت و، تینوو بوون ، بە رادەیەك کە ناچار بوون وشترەکانیان ، بە بۆنەی ئاوی ناو سکیانەوە، سەر ببڕن . ئەبوبەکر خوا لێی رازیی بێ فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ! خوای گەورە لە دوعاکردن‌دا بۆ بەجێ هێنانی چاکە رای هێناوی ، دەی لە خوا بپاڕێرەوە بۆمان . ئەویش هەردوو دەستی بەرەو ئاسمان بەرز کردنەوە و، دای نەگرتن هەتا باران لە ئاسمانەوە باریی .. سەربازانی سوپای ئیسلام ، بەو زۆری‌یەوە ، ئاویان خواردەوە و، چیی دەفریان پێ بوو پڕیان کرد لە ئاو . پاشان کە لە سەربازگەکە چوونە دەرەوە ئەبینن ئەو بارانە تەنها لەسەر سەربازگەی موسڵمانان باریوە .

ئیبن ئیسحاق باسی ئەوەی کردووە کە ئەمە لە کاتێك‌دا بووە موسڵمانەکان گەیشتبوونە حیجر . لەو کاتەدا بە پیاوێکی موونافیقیان وت : ماڵت کاول بێ دوای ئەم موعجیزەیە هیچی تر ماوە ؟ ئەڵێت : هەورێك بوو و تێپەڕیی !!

کە سوپا کەوتە ڕێ لەسەر ئەوانە نەوەستا کە دوا کەوتبوون ، ئەوەبوو چەند موسڵمانێکی چاك لە سوپا بەجێ مابوون ، یان لە ڕێگا بەجێ ئەمان . جا هەر کە عەرزی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەکرا کەوا فلانەکەس دوا کەوت ، ئەی فەرموو: (( دعوه، إن يك فيه خير فسيلحقه الله تعالى بكم ، وإن يك غير ذلك فقد أراحكم الله منه )). ئەی فەرموو : وازی لێ بهێنن ، ئەگەر خێری تیا بێ خوا ئەی گەیەنێتەوە پێتان و ، گەر وایش نەبێ خوا لە کۆڵتانی کردۆتەوە . هەموو جارێ وای ئەفەرموو ، هەتا وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەبوذەڕ دوا کەوت و وشترەکەی بەڕێوە نایەت . فەرمووی : (( دعوه، فإن يك فيه خير فسيلحقه الله بكم ، وإن يك غير ذلك فقد أراحكم الله منه )). ئەبوزەڕ ماوەیەك دانی بە خۆیدا گرت .. بەرە بەرە سوپا ڕۆیشت و ئەویش هەر بەجێ ئەما هەتا سوپا لە چاو ون بوو . ئیتر ناچار بوو لەسەر وشترەکەی دابەزێ و کەل و پەلەکەی داگرێ و ، بیدا بە کۆڵیا و ، دەست بەرداری وشترەکەی ببێ و ، بە پێ بکەوێتە دوای پێغەمبەری ئازیزی ..

پێغەمبەر و سوپای ئیسلام لە یەکێ لە مەنزڵەکاندا بۆ حەسانەوە لایان دا و ، یەکێ لە موسڵمانەکان سەیری کرد و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەوە پیاوێکە و بە تەنیا ڕێ ئەبڕێ . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( كُن أبا ذر )) . فەرمووی : لە خوا ئەخوازم ئەبوذەڕ بێت . کە خەڵکەکە لێی ورد بوونەوە وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ! بەخوا ئەبوذەڕە . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( رَحِمَ اللهُ أبا ذَرٍّ، يَمشِي وَحدَهُ ، ويموت وحده ، ويبعث وَحدهُ )) . فەرمووی : خوا ڕەحم بە ئەبوذەڕ بکات ، بە تەنیا بەڕێوە ئەچێ و ، بە تەنیاش ئەمرێت و ، بە تەنیاش زیندوو ئەبێتەوە .

ئەوەبوو ڕۆژگار تێپەڕیی و ، سەردەمی خەلیفە عوثمان هاتە بەرەوە و ، هەندێ ڕووداو ڕوویان دا و ، ئەبوذەڕیش ڕەوانەی ڕەبذە کرا . کە کەوتە سەرەمەرگ وەسیەتی بۆ ژنەکەی و خزمەتگوزارەکەی کرد و وتی : ئەگەر مردم بم شۆن و کەفەنم بکەن ، پاشان هەڵم بگرن و لەسەر ڕێگاکە دامبنێن . کە یەکەم کاروان بە لاتاندا تێپەڕیی بڵێن : ئەمە ئەبوذەڕە .

کە مرد بەو شێوەیان کرد ، ئەوەبوو کاروانێك دەرکەوت و پێیان نەزانیی تا خەریك بوو وڵاغەکانیان بنێشنە سەر جەنازەکەی . ئەبینن وا عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودە لەگەڵ کۆمەڵێك خەڵکی کووفەدا. پرسیی: ئەمە چی یە ؟ وترا : جەنازەی ئەبوذەڕە. عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود دەستی بە گریان کرد و ، فەرمووی : پێغەمبەری خوا

ﷺ راستی فەرمووە : (( يرحم الله أباذر، يمشي وحده، ويموت وحده ، ويبعث وحده )).
ئیتر عەبدوڵڵا دابەزیی و خۆی سەروکاریی کرد هەتا ناشتی .

ئەمەش یەکێکە لە موعجیزەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ .

هەروەها هاوەڵێکی تریش بە ناوی ئەبوخەیثەمە ، دوای ئەوەی چەند ڕۆژێك بوو پێغەمبەر و سوپای ئیسلام بەرەو تەبووك کەوتبوونە ڕێ ، لە ڕۆژێکی گەرمدا گەڕایەوە بۆ ناو ماڵ و منداڵی . سەیری کرد وا هەردوو هاوسەرەکەی لەناو باخەکەدا هەر یەکە وا لە کەپری خۆیدا . هەریەکەیان کەپری خۆی ئاوڕشێن کردبوو و ، ئاوی تیا سارد کردبوو و ، خواردنی ئامادە کردبوو بۆی . کە چووە ژوورەوە ، لە دەرگای کەپرەکەدا وەستا و ، سەیرێکی هەردوو هاوسەرەکەی کرد چیيان بۆ کردووە و وتی : پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر خۆردا ، لەبەر ڕەشەبا و گەرمادا بێت و ، ئەبوخەیثەمەش لە سێبەری فێنك و ، خواردنی بۆ ئامادە کرابێ و ، ژنی جوان لەلای‌دا و ، لەلای ماڵ و سامانی‌دا نیشتەجێ بێت ، بە ڕاستیی ئەمە ویژدان نیە ! پاشان وتی : بەخوا نایەمە ژوورەوە ناو کەپری هیچ کامتان هەتا خۆم بە پێغەمبەری خوا ﷺ نەگەیەنم . توێشووم بۆ ئامادە بکەن . ئەوانیش بۆیان ئامادە کرد و ، پاشان وشترەکەی هێنایە پێشەوە و باری کرد . کەوتە دوای پێغەمبەری ﷺ هەتا ئەوەبوو لە تەبووك کە باری خستبوو گەیشتە لای . ئەوەبوو لە ڕێگا تووشی عومەیری کوڕی وەهب بوو و ، ئەویش ئەی‌ویست فریای پێغەمبەری خوا ﷺ بکەوێت . لە ڕێ بوونە هاوڕێ تا ئەوەبوو لە تەبووك نزیك بوونەوە ، ئەبوخەیثەمە بە عومەیری وت : من تاوانێکم هەیە ، خۆزگە تۆ دوا ئەکەوتی هەتا من لە پێشەوە بچوومایەتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ . ئەویش وەهای کرد .. کە ئەبوخەیثەمە نزیکی پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتەوە ئەویش لە تەبووك باری خستبوو ، خەڵکەکە وتیان : وا سوارێك بە ڕێگاوەیە و هات . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( كُن أباخيثمة )) . فەرمووی : لە خوا ئەخوازم ئەبوخەیثەمە بێت . وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ! بەخوا ئەبوخەیثەمەیە . کە گەیشت و ولاغەکەی چۆك پێ دا دا ، هاتە پێشەوە و سەلامی لە پێغەمبەری خوا کرد و ، ئەویش پێی فەرموو : (( أولى لك يا أباخيثمة )) . فەرمووی : ئەبوخەیثەمە ئەمەت چاکترە . پاشان هەواڵەکەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕایەوە و ، ئەویش چاکی پێ فەرموو و ، دوعای خێریشی بۆ کرد ..

لەم چیرۆکەدا غیرەت و ویژدانی موسڵمانێکمان بۆ دەرئەکەوێ ؛ کە ئەگەر سەرنجی بدەین ئەڵێین غیرەت و ئیمانی وا لە خوار غیرەت و ئیمانی ئەو سیی هەزارەوە کە سوپای ئیسلامیان لێ پێك هاتووە .. ئەمە موسڵمانێکی تەمەڵە وا چەند رۆژێك لە سوپای ئیسلام دوا ئەکەوێ .. بەڵێ ئەمە تەمەڵی ناو موسڵمانانە کە ئەم هەمووە غیرەتەی هەیە .. وەك موسڵمانێك کە خاوەنی ویژدان بێت هێنایە بەرچاوی ئەو گەرما و ناڕەحەتی‌یە چەندە تەنگی بە سوپای ئیسلام هەڵ چنی بێ ، بۆیە غیرەتی جوولاً و بە تاقی تەنیا کەوتە رێ ؛ تا ئەوەبوو لە رێگا تووشی عومەیر بوو .

هەروەها ئەم چیرۆکە بە یەکێ لە موعجیزەکان ئەژمێررێ .

لە رێگای تەبووك‌دا سوپای ئیسلام بە لای حیجردا تێپەڕیی کە شوێنەواری قەومی ئەموود بوو . موسڵمانەکان بە پەلە بەرەو حیجر رۆیشتن . کە ئەمە بە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت فەرمانی دا جاڕ بدەن : (( الصلاة جامعة )) .

راویی ئەڵێت : منیش هاتمە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەستی بە جڵەوی وشترەکەیەوە گرتبوو و ئەی فەرموو : (( ما تدخلون على قوم غضب الله عليهم ؟ )) . فەرمووی : بۆچ ئەچنە لای کۆمەڵێك کە خوا غەزەبی لێ گرتوون ؟ پیاوێکیان بانگی لێ کرد : بە لامانەوە سەیرن ، ئەی پێغەمبەری خوا ! فەرمووی : (( أفلا أنذركم بأعجب من ذلك ؟ رجل من أنفسكم ينبئكم بما كان قبلكم وما هو كائن بعدكم فاستقيموا وسددوا ، فإن الله عزوجل لا يعبأ بعذابكم شيئاً ، وسيأتي قوم لا يدفعون عن أنفسهم شيئاً )) . ( الفتح الرباني : ٢١ / ١٩٥ ) . فەرمووی : ئەی لەوە سەیرتر ئاگادارتان نەکەم ؟ پیاوێك لە خۆتان هاتووە لە هەواڵی لەوەو پێش و ، لەوەش دوای خۆتان روو ئەدات ئاگادارتان ئەکات ، دەی رێی راست بگرنە بەر و هەنگاوی چاك بنێن . خوای گەورەش بە سزادانی ئێوە هیچ باکێکی نیە . کۆمەڵێکیش دێن هیچ بەرگری یەك لە خۆیان ناکەن .

ئیبن عومەریش خوا لێیان رازیی بێ ئەڵێت : خەڵکەکە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ گەیشتنە خاکی قەومی ئەموود ، حیجر و ؛ چوون لە بیرەکەی ئاویان بۆ خواردنەوە دەرهێنا و ، هەویریان پێ شێلا . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بەسەریان دا دا هەر ئاوێکیان لە بیرەکە دەرهێناوە بیرێژن و ؛ هەویرەکەش دەرخواردی وشترەکان بدەن و ، فەرمانی بەسەریاندا تا لەو بیرە ئاو هەڵ گۆزن کە وشترەکەی صالح پێغەمبەر سەلامی لێ بێ هاتوچۆی بۆ ئەکرد ..

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( لا تدخلوا مساكن الذين ظلموا أنفسهم ، إلا أن تكونوا باكين حذراً أن يصيبكم مثل ما أصابهم )) . فەرمووی : سەردانی شوێنەواری ئەوانە مەکەن کە ستەمیان لە خۆیان کردووە ، مەگەر بە گریانەوە ، لە ترسی ئـەوەی نەوەکو ئەو موصیبەتەی کە تووشی ئەوان بوو تووشی ئێوەش ببێ . پاشان بـە پەلـە خوڕی یە وشترەکەی تا لەو ناوەدا خێرا تێ بپەڕێ و زوو ئەو ناوە چۆڵ بکـات . هـەتا پێغەمبەری خوا ﷺ ، لە کاتی تێپەڕبوونی دا بە لای ئەو شوێنە نەفرین لێکراوەدا ، بە کراسەکەی خۆی داپۆشیی .[291]

**حەوتەم : لە تەبووکدا**

کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ گەیشـتە تـەبووك هـیچ شوێنەوارێکی سوپای ڕۆم و جەنگاوەرانی هۆزە عەرەبەکان دیار نەبوو و ، هەرچەندە سوپای موسڵمانەکان بیسـت شـەو لـە تـەبووك مایـەوە فەرماندایـەتیی ڕۆمـان بـیری لـەوە نـەکردەوە لەگـەڵ موسڵمانەکان بجەنگێ ، هەتا هۆزە عەرەبە بـە گـاور بووەکـان ئـەوانیش لـە ئاسـتی خۆیانەوە بێدەنگ بوون و ، کاربەدەستانی شارەکانی دەوروبەری شامییش وایـان بـە چاك زانیی لەگەڵ موسڵمانەکاندا سوڵح بکەن و جزیە بدەن .

ئەوەبوو یوحەننای کوڕی ڕوئبەی پادشای ئەیلە[292] هاتە خزمەتی پێغەمبـەری خـوا ﷺ و صـوڵحی لەگـەڵدا بەسـت و جزیەشـی دا و، ئیسـترێکی سـپیی و چـەند بوردەیەکیشی بە دیاریی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ نارد . هەروەها دانیشتوانی جەربا و ئەذروح ئـەوانیش صـوڵحیان کـرد و جزیەشـیان دا و پێغەمبـەری خـوا ﷺ نامـەی صوڵحی بەم شێوەیە بۆ نووسین : (( بسم الله الرحمن الرحيم . من محمد النبـي رسـول الله لأهل جرباء وأذرح : إنهم آمنون بأمان الله وأمان محمد ، وإن علـيهم مائـة دينـار في كـل رجـب ، ومائـة أوقيـة طيبـة . وإن الله علـيهم كفيـل بالنصح والإحسـان إلى المسلمين ، ومن لجأ إليهم من المسلمين )) . هەروەها نامەی صوڵحیشی بەم شێوەیە بـۆ دانیشـتوانی ئەیلـە نووسیی : ((بسم الله الرحمن الـرحيم ، هـذهِ أَمَنَـةٌ مـن الله ومحمد النبـي رسول الله ليوحنا بن رُؤبة ، وأهل أَيلَة ، سفنهم وسياراتهم في البر البحـر ، لهم

[291] السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٤٩٩ ـ ٥٠٢ ، السيرة النبوية للصلابي : ٨١٨ ـ ٨٢٣ ، الرحيق المختوم : ٤٤٧ ـ ٤٤٨ ، الرسول القائد : ٣٩٩ ـ ٤٠١ .

[292] ئەیلە : شارێك بووە لە شوێنی ئێستای شاری عەقەبەدا کە بەندەری ئوردونە لەسەر دەریای سوور لە کەنداوی عەقەبە کە لە کۆتایی ناوچەی حیجاز و سەرەتای ناوچەی شامدایە .

ذمة الله ، وذمة محمد النبي ، ومن كان معه من أهل الشام ، وأهل البحر ، فمن أحدث منهم حدثاً ، فإنه لا يحول ماله دون نفسه ، وإنه طيب لمن أخذه من الناس ، وأنه لا يحل أن يمنعوا ماءً يردونه ، ولا طريقاً يريدونه من بر أو بحر )) .

بەم رێكەوتنانە ئەو ناوچانە لە خۆیان بێخەم بوون چونكە چوونە ژێر سایەی دەسەلاّتی موسلّمانانەوە و ، موسلّمانەكانیش لە سنوورەكانی شام بێخەم بوون . بەمەش بالّی رۆمەكان لە بنا برڕان و لە دەستدرێژیی دەست كۆتا بوون . ئیتر رۆمەكان دەسەلاّتیان بەسەر ناوچەی هۆزە عەرەبەكاندا نەما و ، لەو جزیەیەش كە جاران بەوپەڕی زەلیلیەوە ئەیان دا بە رۆم رزگار بوون ..

هەروەها لە تەبووكەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ ، خالیدی كوڕی وەلیدی ، بە سەركردایەتیی سریەیەك لە سوارچاكان كە ژمارەیان چوارصەد و بیست كەس ئەبوو ، ناردە سەر ناوچەی ( دومة الجندل ) . پێغەمبەری خوا ﷺ هەوالّی بە خالید دا كە پادشای ئەو ناوچەیە لە راوی گا كێوییدا ئەبینیّ كە فەرمووی : (( إنك ستجده يصيد البقر )) .

خالید هەلّمەتی دایە سەر ناوچەكە و توانیی پادشای ( دومة الجندل ) ئوكەیدەری كوڕی عەبدولمەلیكی كیندیی بە دیل بگرێت ، ئەمەش لە كاتێكدا كە پادشا لە راودا بوو . كە هێنایانە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر جزیە صولّحیان كرد . ئەمانەش دەستكەوتەكانی خالید بوون لەو هەلّمەتەدا : هەشت صەد كەس دیل و ، هەزار وشتر و ، چوارصەد قەلّغان و ، چوارصەد رم .

ئوكەیدەر بەرگێكی لەبەردا بوو كە لە ئاوریشم چنرا بوو و بە زێڕیش رازێنرابوویەوە. خالید لێی سەند و پێش گەڕانەوەی ناردیە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ . هاوەلاّن دەستیان لە قوماشەكە ئەدا و سەریان سوڕ ئەما . ئەویش پێی فەرموون : (( أتعجبون من هذا ؟ فوالذي نفسي بيده لمناديل سعد بن معاذ في الجنة أحسن من هذا )) . فەرمووی : سەرتان لەمە سوڕ ئەمێنیّ ؟ بەو خوایەی كە گیانمی بە دەستە دەستەسڕەكانی سەعدی كوڕی موعاذ لە بەهەشتدا لەمە چاكترە ..

بەمە هۆزە عەرەبەكان دەستیان لە پشتیوانیی رۆمەكان شۆرد و ، بۆیان سەلما تازە ئیتر نۆكەریی بۆ رۆمان سوودی نەماوە ، بەلّكو وا چاكە لەگەلّ هێزی موسلّماناندا رێك بكەون .

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود خوا لێی رازیی بێ ئەڵێت : لە نیوەشەودا لە خەو هەستام و ، لە تەبووکدا لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ بووم . لەلایەکی سەربازگەکەوە چاوم بە شۆڵەیەك ئاگر کەوت . شوێنی کەوتم تا سەیری بکەم ، ئەبینم وا پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوبەکر و عومەر خوا لێیان رازیی بێ لەوێن و، عەبدوڵڵای ذولبیجادەینی موزەینی مردووە و ، ئەوانیش قەبریان بۆ هەڵ کەندووە و، پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی دابەزیوەتە ناو قەبرەکەیەوە و ، ئەبوبەکر و عومەریش بۆی دائەهێڵن و ، ئەویش ئەفەرموێ : (( أدنیا إليّ أخاكُما )) . ئەیفەرموو : براکەتانم بۆ دابهێڵن . ئەوانیش بۆیان داهێلا . کاتێك کە خستیە ناو قەبرەکەیەوە فەرمووی: (( أللهمَّ ! إني أمسيتُ راضياً عنهُ ، فارضَ عنهُ )) . فەرمووی : خوایە ! من لێی رازییم و ، ئەخوازم تۆش لێی رازیی بی . عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ئەڵێت : خۆزگە من خاوەنی ئەو قەبرە بوومایە .

ئیبن هیشام ئەڵێت : بۆیە ناو نراوە بە ( ذوالبجادین ) ، ئەو دڵی ئەچووە سەر ئیسلام و خزمەکانیشی قەدەغەیان ئەکرد و ، تەنگیان پێ هەڵ ئەچنیی ، تا ئەوەبوو تەنها قوماشێکی ئەستووری خەتداریان لەبەریا هێشتەوە و هیچی تری لەبەردا نەبوو. ئەویش لە دەستیان هەڵاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و ، کاتێ کە لێی نزیك کەوتەوە ، قوماشەکەی کردە دوو کەرتەوە و ، یەکێکیانی کردە ئیزار و ئەوی تریشیانی وەك شەملە پێچا بە خۆیەوە . پاشان هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و پێی وترا ( ذوالبجادین ) .

بە راستیی لەم چیرۆکەدا ئەوپەڕی تەوازوع و رۆح سووکیی پێغەمبەری خوامان ﷺ بۆ دەرئەکەوێ ، کە ئەو لە تەمەنی شەصتساڵیی تێپەڕی کردووە و ، لە سەفەرێکی وەها دووردا و ، بێتفاق و خۆراك و ، بە فەرماندایەتیی سیی هەزار سوپا و ، لە نیوەشەودا خۆی ئامادەی ناشتنی هاوەڵێکی هەژاری ئەبێت ، بگرە خۆی دائەبەزێتە ناو قەبرەکەیەوە و تەسلیمی ئەکات و دوعای خێریشی بۆ ئەکات و بۆی ئەپاڕێتەوە تا خوا لێی رازیی بێ .[٢٩٣]

---

[٢٩٣] السيرة النبوية للندوي : ٣٧٢ ـ ٣٧٤ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٥٠٣ ـ ٥٠٤ ، السيرة النبوية للصلابي : ٨٢٢ ـ ٨٢٥ ، الرحيق المختوم : ٤٤٩ ـ ٤٥٠ ، الرسول القائد : ٤٠١ .

**هەشتەم : هەندێ موعجیزەی ئەم غەزایە**

لە غەزای تەبوكدا كۆمەڵە موعجیزەیەك بە پێغەمبەری خواوە ﷺ بینران كە ئەمانە هەندێكیانن :

**( ١ ) باران بارین :**

وەك لە پێشەوە باس كراوە ، كە پێغەمبەری خوا ﷺ لە حیجری ثەموود تێپەڕیی، خەڵكەكە دادی بێ‌ئاوی‌یان كرد . چوونە خزمەتی پێغەمبەری خوا و ﷺ، ئەویش لە پەروەردگاری پاڕایەوە تا باران بۆ سوپای ئیسلام ببارێنێ . ئەوەبوو خوای گەورە پەڵە هەورێكی نارد و باران بە پێی پێویستیی سوپاكە باریی و هەموو دەفرەكانیان پڕ كردن .

**( ٢ ) دۆزینەوەی وشترەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ:**

لە رێگای تەبووكدا وشترەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ گوم بوو و ، هاوەڵان كەوتنە گەڕان بەدوای‌دا . یەكێ لە هاوەڵانیش لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ بوو پێیان ئەوت : عومارەی كوڕی حەزم كە عەقەبیی و بەدریی بوو و ، مامەی نەوەی عەمری كوڕی حەزم بوو . یەكێ لە مونافیقانیش كە ناوی زەیدی كوڕی لەصیتی قەینوقاعیی بوو لەگەڵ عومارەدا بوو .

زەید كە مونافیق بوو و لەگەڵ كەل و پەلەكەی عومارەدا بوو لە نزیك پێغەمبەرەوە، ئەی وت : ئەی رای ناگەیەنێ كە پێغەمبەرە و ، هەواڵی ئاسمانتان ئەداتێ . كەچیی نازانێ وشترەكەی لە كوێ‌یە ؟

پێغەمبەری خوا ﷺ عومارە بەلایەوە بوو فەرمووی : « إن رجلاً قال : هذا محمد يزعم أنه يخبركم بأمر السماء ولا يدري أين ناقته ؟ وإني والله ما أعلم إلاّ ما علمني الله ، وقد دلّني الله عليها ، وهي في هذا الوادي ، في شعب كذا وكذا ، قد حبستها شجرة بزمامها ، فانطلقوا حتى تأتوني بها » . فەرمووی : پیاوێك وتوویە : موحەممەد وای رائەگەیەنێ كە هەواڵی ئاسمانتان بۆ دێنێ ، كەچیی نازانێ وشترەكەی لە كوێ‌یە ؟ بەخوا هەر شتێ خوا فێرم نەكا من نایزانم . وا خوای گەورەش پیشانی دام لە كوێ‌یە . وا لەم دۆڵەدا لە فلانە شیودا ، درەختێك بە بۆنەی رەشوەكەیەوە بەندی كردووە . بڕۆن بی‌هێننەوە بۆم .

هاوەڵان چوون و وشترەكەیان هێنایەوە و ، عومارەی كوڕی حەزمیش گەڕایەوە بۆ لای كەل و پەلەكەی و وتی : بەخوا شتێكی سەیر بوو كەمێ لەمەوبەر پێغەمبەری

خوا ﷺ باسی قسەی پیاوێکی بۆ کردین ، کە خوا هەواڵی فلان شت و فلان شتی پێ دابوو، بەو قسەیەی کە زەیدی کوڕی لەصیت کردبووی . پیاوێك کە لەلای کەل وپەلەکەی عومارەدا دانیشتبوو و ، ئامادەی کۆڕی پێغەمبەری خوا ﷺ نەبوو وتی : زەید ، بەخوا ، پێش ئەوەی تۆ بێیت ، ئەو قسەیەی کرد . عومارە هەڵمەتی دایە زەید و ، ئەی کوتایە گەردنی و ئەی‌وت : بەندانی خوا لێم گەڕێن ، لە ناو بار و کەل وپەلەکەمدا فێڵبازێك خۆی حەشار داوە و ، من پێم نەزانیوە . دەرچۆ ئەی دوژمنی خوا لەناو کەل‌وپەلەکەمدا و هاوەڵییم نەکەی . هەندێ ئەڵێن : زەید دوای ئەوە تەوبەی کردووە و ، هەندێکیش وەهای باس ئەکەن کە بەو حاڵەوە تیاچووبێ .

( ٣ ) هەڵ کردنی رەشەبا :

لە تەبووك پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی هەڵکردنی رەشەبایەکی توندی بە هاوەڵانی دا و ، فەرمانیشی بەسەردا دان هەتا وریای خۆیان و ولاغەکانیان بن ، لەو کاتەدا نەیەنە دەرەوە ، تا تووشی ناڕەحەتیی نەبن و ، ولاغەکانیشیان جوان ببەستنەوە . .

موسلیم لە صەحیحەکەی‌دا ریوایەتی کردووە کە ئەبوحومەید گێڕاویەتەوە و وتوویە: کەوتینە رێ هەتا گەیشتینە تەبووك ، لەوێ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( ستهب عليكم الليلة ريح شديدة ، فلا يقم فيها أحد منكم ، فمن كان له بعير فليشد عقاله )) . فەرمووی : ئەمشەو رەشەبایەکی سەختتان لێ هەڵ ئەکات ، لەو کاتەدا هیچ کەستان هەڵ نەسێتەوە و ، هەرکەسیش وشتری هەیە با توند بی‌بەسێتەوە. هەرواش بوو رەشەباکە هەڵی کرد و ، پیاوێك هەستابوویەوە و باکە هەڵی دابووە سەر چیای تەی .

(٤ ) زۆربوونی ئاوی کانی‌یەکەی تەبووك :

موعاذی کوڕی جەبەل خوا لێی رازیی بێ وتوویە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (( إنكم ستأتون غداً إن شاءالله عين تبوك ، وإنكم لن تأتوها حتى يضحى النهار ، فمن جاءها منكم فلا يمس من مائها شيئاً حتى آتي )) . فەرمووی : إن شاءالله سبەینێ لەکاتی چێشتەنگاودا ئەگەنە سەرکانی‌یەکەی تەبووك . هەرکەستان گەیشتە سەری با دەست لە ئاوەکەی نەدات هەتا خۆم دێم .

کە ئێمە گەیشتینە لای دوو پیاو پێشمان کەوتبوون و ، کانی‌یەکەش ئاوێکی یەکجار کەمی لێ ئەڕژێ . پێغەمبەری خوا ﷺ لە جووتە پیاوەکەی پرسیی : (( هل

مسستما من مائها شيئاً ؟ )) فەرمووی : دەستتان لە ئاوەکەی دا ؟ وتیان : بەڵێ . پێغەمبەری خوا ﷺ قسەی پێ وتن . پاشان بە لامشتیان کەم کەم ئاویان کۆ کردەوە، تا ئەوەبوو پێغەمبەری خوا دەست و دەم و چاوی خۆی لەو ئاوە شۆرد و پاشان کردیەوە ناو کانییەکە و ، ئیتر کانییەکە ئاوی ئەوەندە زۆر بوو هەموو خەڵکەکە ئاویان بۆ خۆیان برد .

پێغەمبەری خوا ﷺ بە موعاذی کوڕی جەبەلی فەرموو : (( يوشك يا معاذ ! إن آلت بك حياة أن ترى ما هاهنا قد ملئ جناناً )) . فەرمووی : ئەی موعاذ ! ئەگەر خوا تەمەنت پێ بدات ئەم ناوە پڕ لە باخ و باخات ببینی .

بەڵێ ناوچەی تەبووك لەوەوبەر ئەو شیوەی کە ئەو کانییەی تێدا بوو بە بۆنەی کەم ئاوییەوە وشك و رووتەڵە بوو ، تا ئەوەبوو خوای گەورە بە دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەکەتی خستە ئاوەکەیەوە و ، زۆری لەبەر ئەڕۆیشت ، نەك تەنها ئەوەندە کە سوپاکە تێر ئاو ببێ ، بەڵکو بە بەردەوامی ئاوەکەی زۆر بوو و باخ و باخاتێکی زۆر لەبەر دەمیا پێ گەیشت ، کە هەتا ئەمڕۆش تەبووك خاوەنی باخ و باخاتێکی رەنگینە و بەروبووم ئەدەن .

( ٥ ) زۆربوونی خواردن :

لە پێشەوە باسی ئەم موعجزەیەشمان کرد کە چۆن سوپا خواردنی کەم بوو بوویەوە، بە رادەیەك کاتێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانیدا چیی خۆراکیان لایە لەسەر سفرەیەك کۆی بکەنەوە ، پیاوی وا ئەبوو مشتێ گەنمە شامیی و ، یەکێکی تر مشتێ خورما و ، یەکێکی تریش پارچە نانێکیان ئەهێنا ، هەتا شتێکی کەم لەسەر سفرەکە کۆ بوویەوە و ، پاشان دوعای بەرەکەتی بۆ کرد و فەرمانی دا دەفرەکانیان بهێنن و پڕیان بکەن ..[٢٩٤]

**نۆهەم : داوی موونافیقان**

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر خوا لێیان رازیی بێ ئەڵێت : لە غەزای تەبووکدا رۆژێکیان پیاوێك لە کۆڕێکدا وتی : کەسمان نەدیوە وەك ئەم قورئان خوێنانەمان ، لە هەموو کەس چڵێس‌تر و ، زمان درۆزن‌تر و ، لە نەبەردا ترسنۆك‌تر . پیاوێك لە

[٢٩٤] السيرة النبوية للصلابي : ٨٢٥ ـ ٨٢٧ ، الرحيق المختوم : ٤٤٨ ، محمد رسول الله ، لعرجون : ٤ / ٤١٧ .

کوڕەکـەدا وتی : درۆت کرد ، تۆ مونافیقی و ، هەواڵیش بـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئەدەم . ئەو قسەیە گەیشتەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و قورئان هاتە خوارەوە .

عەبدوڵلاّ ئەڵێ : چاوم لەو پیاوە بوو بە گوریسی ژێر سکی وشترەکەی پێغەمبـەری خـواوە ﷺ خـۆی هەڵواسـیی بـوو و بـەردیش ئازاریـان ئـەدا و ، ئـەی‌وت : ئـەی پێغەمبەری خوا ! گاڵتەوگەپمان ئەکرد . پێغەمبەریش ﷺ ئـەی فـەرموو : (( أبـالله وآياته ورسوله كنتم تستهزئون ؟ )) . ئـەی‌فـەرموو : ئایـا گاڵتـەتان بـە خـوا و بـە ئایەتەکانی و پێغەمبەرەکەی ئەکرد ؟

لە ریوایەتەکەی قەتادەدا ئەڵێت : لە کاتێك‌دا کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ غـەزای تەبووك ئەڕۆیشت و چەند کەسێکی مونافیقیشی لە پێشـەوە ئەڕۆیشـتن وتیـان : ئـەم پیاوە بە هیوایە کۆشك و قەڵاکانی شامی بۆ فەتح بکرێن ؟ ئەی هوو ، ئـەی هـوو !! ئەوەبوو خوای گەورە پێغەمبەرەکەی لەوە ئاگـادار کـرد و ، ئـەویـش فـەرمـووی : (( إحبِسوا عليٍ هؤلاء الركب )) . فەرمانی دا ئەوانـە بوەسـتێنن . گەیشـتە لایـان و فەرمووی : (( قُلتُم كذا قلتم كذا )) . فەرمووی : وەها و وەهاتان وت . وتیـان : ئـەی پێغەمبەری خوا ! گاڵتەوگەپمان ئەکرد. ئەوەی کە ئەی‌بیستن دەربارەیان هاتە خوارەوە. خوای بالادەسـت ئایـەتی : ﴿ يَحۡذَرُ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ أَن تُنَزَّلَ عَلَيۡهِمۡ سُورَةٞ تُنَبِّئُهُم بِمَا فِي قُلُوبِهِمۡۚ قُلِ ٱسۡتَهۡزِءُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ مُخۡرِجٞ مَّا تَحۡذَرُونَ ﴿٦٤﴾ وَلَئِن سَأَلۡتَهُمۡ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلۡعَبُۚ قُلۡ أَبِٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمۡ تَسۡتَهۡزِءُونَ ﴾ ( التوبة : ٦٤ : ٦٥ ) ی نارده خوارەوە . ئەفەرموێ : ئەی موحەممەد ! بە گلـەیی و نـاڕەزایی یـەوە بەوانـە بڵێ: ئایا جگە لە فەرز و ئەحکام و ئایەتەکانی خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی کە بـۆ هیدایەتی ئێوە هاتووە ، تا لە تاریکایی دەرتـان بهێنـێ بـۆ نـاو روونـاکیی ، هیـچ شتێکی ترتان نەدۆزی‌یەوە ، تا لە گاڵتە و یاری‌یەکانتان‌دا ـ وەك ئەڵێن ـ گاڵتەی پێ بکەن؟

پاشان خوای پاك و بێ‌گەرد بۆی روون کردنەوە کە ئەو گاڵتەکردنەیان بـەرەو کـوفر بردوونـــــی : ﴿ لَا تَعۡتَذِرُواْ قَدۡ كَفَرۡتُم بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡۚ إِن نَّعۡفُ عَن طَآئِفَةٖ مِّنكُمۡ نُعَذِّبۡ طَآئِفَةَۢ بِأَنَّهُمۡ كَانُواْ مُجۡرِمِينَ ﴾ ( التوبة : ٦٦ ) . ئەفەرموێ : ئەم پۆزشتە مەهێننـەوە بۆ لابردنی ئەو تاوانە . جا پۆزشـت هێنانـەوەتان دان نانـە بـە تاوانەکـەتان‌دا . وەك ئەڵێن : پۆزشت لە تاوان خراپترە .

هەروەها دەربارەی ئەو مونافیقانە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە : ﴿ يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُواْ وَلَقَدْ قَالُواْ كَلِمَةَ ٱلْكُفْرِ وَكَفَرُواْ بَعْدَ إِسْلَٰمِهِمْ وَهَمُّواْ بِمَا لَمْ يَنَالُواْۚ وَمَا نَقَمُوٓاْ إِلَّآ أَنْ أَغْنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن فَضْلِهِۦۚ فَإِن يَتُوبُواْ يَكُ خَيْرًا لَّهُمْۖ وَإِن يَتَوَلَّوْاْ يُعَذِّبْهُمُ ٱللَّهُ عَذَابًا أَلِيمًا فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْأَخِرَةِۚ وَمَا لَهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴾ ( التوبة : ٧٤ ).

ئیبن کەثیر وتوویە : ضەححاك وتوویە : کۆمەڵێك لە مونافیقان ئەیانەوێ دەست لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوەشێنن ، ئەمەش لە شەودا و لە کاتی ڕۆیشتندا . ئەوانە دە و ئەوەندە کەس بوون و ئەم ئایەتەی سەرەوە دەربارەیان هاتە خوارەوە .

واحیدییش لە ضەححاکەوە ئەگێڕێتەوە : مونافیقان لەگەڵ پێغەمبەری خوا دا ﷺ بەرەو تەبووك کەوتنە ڕێ .. کە هەندێکیان تاك ئەکەوتنەوە جنێویان بە پێغەمبەر و هاوەڵانی ئەدا و تانەیان لە دین ئەدا . ئەوەبوو حوذەیفە ئەو قسانەیانی گەیاندە پێغەمبەری خوا ﷺ . ئەویش پێی فەرموون : (( يا أهل النفاق ! ما هذا الذي بلغني عنكم ؟ )) فەرمووی : ئەی ئەهلی نیفاق ! ئەمە چیە کە لێتانەوە پێم گەیشتووە ؟ دەستیان بە سوێند خواردن کرد کە هیچی لەوەیان نەوتووە . کەچیی قورئان بۆ بە درۆخستنەوەیان هاتە خوارەوە .[٢٩٥]

**دەهەم : گەڕانەوە بەرەو مەدینە**

سوپای ئیسلام ، سوپاس بۆ خوا ، بە سەلامەتیی و بە سەرکەوتنەوە بەرەو مەدینەی پایتەخت گەڕایەوە .

لە کاتی گەڕانەوەدا کۆمەڵێك مونافیق ویستیان پێغەمبەری خوا ﷺ لە شوێنێکی بەرزدا هەڵی بدێرن :

بەیهەقیی لە حوذیفەی کوڕی یەمانەوە ڕیوایەتی کردووە کە وتوویە : من دەستم بە لغاوی وشترەکەی پێغەمبەری خواوە گرتبوو و ، عەمماریش لە وشترەکەی ئەخوڕیی، هەتا کە گەیشتینە کۆسپەکە ، ئەبینین وا لەوێ دوانزە پیاو ڕێیان پێ گرتووە. ئەڵێ: منیش پێغەمبەری خوام ﷺ ئاگادار کرد و قیڕاندی بەسەریاندا و ، ئەوانیش هەڵاتن. فەرمووی : (( هل عرفتم القوم ؟ )) . فەرمووی : ئەو خەڵکەتان ناسین؟ وتمان: نەخێر، ئەی پێغەمبەری خوا ! دەم و لووتیان هەڵ بەستبوو . فەرمووی : (( هؤلاء

---

[٢٩٥] السيرة النبوية للصلابي : ٨٢٨ ـ ٨٢٩ .

المنافقون يوم القيامة ، وهل تدرون ما أرادوا ؟)) فەرمووی : ئەوانە مونافیقانی ڕۆژی قیامەتن . ئەی ئەزانن چی‌یان ئەویست ؟ وتمان : نەخێر . فەرمووی : ((أرادوا أن يزحموا رسول الله في العقبة فيلقوه منها !!)) . فەرمووی : ویستیان تەنگ بە پێغەمبەری خوا هەڵ بچنن و لە کۆسپەکەوە بی‌خەنە خوارەوە . وتمان : ئەی نانێری بۆ لای کەس‌وکاریان تا هەریەکەیان سەری خزمەکەیان بنێرن بۆت ؟

فەرمووی : ((لا ، أكره أن يتحدث العرب أن محمداً قاتل بقومه حتى إذا أظهره الله بهم أقبل عليهم يقتلهم)) .

فەرمووی : نەخێر ، پێم ناخۆشە عەرەب باسی ئەوە بکەن کە موحەممەد بە قەومەکەی جەنگی کرد هەتا کە خوا سەری خست ، دەستی داوەتە کوشتنی پیاوانی قەومەکەی . دوای ئەوە دوعای لە مونافیقەکان کرد ..

ئیمام ئەحمەدیش ریوایەتێکی وەهای گێڕاوەتەوە و ، ئەمەشی بۆ زیاد کردووە کە عەممار ئەی‌دا بە ناو چاوانی وشترەکانیان‌دا و لە پێغەمبەری خوا ﷺ دووری ئەخستنەوە ، هەتا وتی : بەسە ، بەسە . ئەمانە ئەوانە بوون کە ئەم ئایەتەیان لەسەر هاتە خوارەوە : ﴿ وَهَمُّواْ بِمَا لَمْ يَنَالُواْ ﴾ (التوبة : ٧٤) ، واتە کوشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ .[٢٩٦]

**یانزەهەم : دواکەوتووەکان**

لە ڕاستیی‌دا غەزای تەبوك ، بە بۆنەی بارودۆخە تایبەتی‌یەکەیەوە ، تاقیی کردنەوەیەکی گەورە بوو لەلایەن خواوە ، کە بە ڕاستیی ئیمانداران مەردانە تیایا سەرکەوتن و ، چەپەڵە ترسنۆکە خۆهەڵواسەکانیش بە چاکیی دەرکەوتن .. ئەمە یاسای خوایە و هەموو کۆمەڵێکی ئیمانداری تاقیی کردۆتەوە ، وەك قورئان ئەفەرموێ :

﴿ مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ عَلَىٰ مَآ أَنتُمۡ عَلَيۡهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلۡخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ ﴾ (آل عمران : ١٧٩).

ئەوەی بە پاکیی دەستی بە قورئانەوە گرتبوو قۆڵی لیّ هەڵ ماڵیی و، دواکەوتنیش بووە نیشانەی نیفاق .

[٢٩٦] السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٥٠٥ ـ ٥٠٦ ، الرحيق المختوم : ٤٥٠ .

بەڵێ لە مانگی ڕەجەبدا سوپای ئیسلام بەرەو تەبووك ڕۆیشت و ، لە مانگی ڕەمەزاندا گەیشتەوە مەدینە ، کە پەنجا ڕۆژی پێ چوو و ، بیست ڕۆژی لە تەبووك مایەوە . کە پێغەمبەری خوا ﷺ و سوپای ئیسلام گەیشتنە مەدینە ژن و منداڵانی مەدینە هاتنە ( ثنیة الوداع ) بۆ پێشوازیی و سروود وتن ، بۆ بەخێرهاتنەوەی پاڵەوانەکانی ئیسلام .

کە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتەوە ناو شار ، یەکەم جار سەری لە مزگەوت دا و دوو ڕکعەت نوێژی بەجێ هێنا و ، پاشان دانیشت بۆ جێبەجێکردنی پێویستیی خەڵك ..

ئەوەبوو دواکەوتووەکان هاتنە خزمەتی بۆ هێنانەوەی پۆزشت . شایانی باسە کە ئەو دواکەوتووانە چوار جۆر بوون :

١ ـ ئەوانەی عوزری شەرعی‌یان هەبوو و خوای گەورەش ئەو عوزرەی لێ وەرگرتبوون :

قورئان ئەفەرموێ : ﴿ لَّيْسَ عَلَى ٱلضُّعَفَآءِ وَلَا عَلَى ٱلْمَرْضَىٰ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُوا۟ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ مَا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ مِن سَبِيلٍ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩١﴾ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ تَوَلَّوا۟ وَّأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ حَزَنًا أَلَّا يَجِدُوا۟ مَا يُنفِقُونَ ﴾ ( التوبة : ٩١ ـ ٩٢ ) .

ئەوانەی کە چاوپۆشی‌یان لێ ئەکرا بەشداریی نەکەن ئەمانەن :

أ ـ لاوازەکان : ئەوانەن کە نەخۆشی هەمیشەیین ، یان یەکجار پیر بوون ، یان منداڵن ، یان شێتن .

ب ـ نەخۆشەکان : ئەوانەی ناتوانن جەنگ بکەن .

ج ـ دەست کورتەکان : کە مەسرەف و چەك و تفاقیان نەبوو .

٢ ـ ئەوانەی کە عوزری شەرعی‌یان نەبوو و چاوپۆشییشیان لێ کرا :

أ ـ فەرمایشتی خوای گەورە : ﴿ وَءَاخَرُونَ ٱعْتَرَفُوا۟ بِذُنُوبِهِمْ خَلَطُوا۟ عَمَلًا صَٰلِحًا وَءَاخَرَ سَيِّئًا عَسَى ٱللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ ( التوبة : ١٠٢ ) .

ئەمانە کە دوا کەوتن هیچ بیانوویەکی شەرعی‌یان نەبوو ، کە دوایش کەوتن پەشیمان بوون و ، لە خزمەتی پێغەمبەریشدا ﷺ درۆیان نەکرد بۆ خۆ قوتارکردن ، بەڵکو تەوبەیان کرد و دانیان بە تاوانباریی خۆیاندا نا و ، بە هیوابوون خوا

چاوپۆشی‌یان لیٚ بکات . مەبەست لە ( العمل الصالح ) موسڵمانبوونی لەوەوبەریانە لە عیبادەت و جیهاد و ، مەبەستیش لە ( العمل السيء ) دواکەوتنیایە لەم غەزایە.

ئەمانە دانیان بە تاوانباریی خۆیاندا نا و ، لە دڵیشەوە پەشیمانی ئەو دواکەوتنەیان بوون ، خوای گەورەش چاوپۆشیی لیٚ کردن .

ب ـ فەرمایشتی خوای گەورە : ﴿ وَءَاخَرُونَ مُرْجَوْنَ لِأَمْرِ ٱللَّهِ إِمَّا يُعَذِّبُهُمْ وَإِمَّا يَتُوبُ عَلَيْهِمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾ ( التوبة : ١٠٦ ) . وەك لە صەحیحی بوخاریی و موسلیمدا هاتووە مەبەست لەو سیانەیە کە دوا کەوتن : هیلالی کوڕی ئومەییە و ، کەعبی کوڕی مالیك و ، مەڕارەی کوڕی رەبیع .. ئەمانە دواکەوتن و نیازیان هەبوو بە دوای سوپادا بڕۆن ، بەلاّم بۆیان رێك نەکەوت . ئیتر دواکەوتنەکەیان لەبەر نیفاق نەبوو، چونکە پاك و دڵسۆز بوون . ئەوەبوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە و ، ئەوانیش چوونە خزمەتی وتیان : هیچ پۆزشتێکمان نیە جگە لە تاوانباریی . ئیتر وەکو ئەبولوبابە و کۆمەڵەکەی خۆیان نەبەست بە کۆڵەکەکانی مزگەوتەوە . ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا موسڵمانان لێیان دوور بکەونەوە و قسەیان لەگەڵ نەکەن ، هەتا خوا دەربارەیان ئایەت بنێرێتە خوارەوە .

ج ـ فەرمایشتی خوای گەورە : ﴿ وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّوٓاْ أَن لَّا مَلْجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُوٓاْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴾ ( التوبة : ١١٨ ) .

ئەوەبوو دوای پەنجا شەو خوای گەورە تەوبەی لەو سیانە پاکە وەرگرت و ئەم ئایەتە پیرۆزەی نارده خوارەوە . بە کۆمەکیی خوا دواتر چیرۆکەکەیان ئەخەینە پێش چاوان .

٣ ـ ئەعرابی مونافیقی دەوروبەری مەدینە :

ئەمانە لەبەر نیفاق دوا کەوتبوون و دەربارەشیان ئەم ئایەتە پیرۆزە هاتە خوارەوە:
﴿ وَجَآءَ ٱلْمُعَذِّرُونَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ لِيُؤْذَنَ لَهُمْ وَقَعَدَ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ۚ سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ ( التوبة : ٩٠ ) .

٤ ـ مونافیقانی مەدینە :

قورئان دەربارەیان ئەفەرموێ :

﴿ فَرِحَ ٱلْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلَٰفَ رَسُولِ ٱللَّهِ وَكَرِهُوٓاْ أَن يُجَٰهِدُواْ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَالُواْ لَا تَنفِرُواْ فِي ٱلْحَرِّ ۗ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا ۚ لَّوْ كَانُواْ يَفْقَهُونَ ﴿٨١﴾ فَلْيَضْحَكُواْ قَلِيلًا وَلْيَبْكُواْ كَثِيرًا جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴿٨٢﴾ فَإِن رَّجَعَكَ ٱللَّهُ إِلَىٰ طَآئِفَةٍ مِّنْهُمْ فَٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِلْخُرُوجِ فَقُل لَّن تَخْرُجُواْ مَعِيَ أَبَدًا وَلَن تُقَٰتِلُواْ مَعِيَ عَدُوًّا ۖ إِنَّكُمْ رَضِيتُم بِٱلْقُعُودِ أَوَّلَ مَرَّةٍ فَٱقْعُدُواْ مَعَ ٱلْخَٰلِفِينَ ﴾ ( التوبة : ٨١ ـ ٨٣ ) .

ئەو مونافیقانە وەك خۆیان ترسنۆك و تەمەڵ بوون و غیرەتیان نەبوو ئەو ڕێگا دوور و درێژە بۆ ئەو غەزا گەورەیە ببڕن و خەمیان بوو سوپای ڕۆم هەڵیان لووشێ ، خەڵکی تریشیان سارد ئەکردەوە ، چونکە ئەو بیابانە چۆڵە یەکجار گەرم و بێ‌سێبەر و بێ ئاوە. خوای گەورە فەرمانی بەسەر پێغەمبەرەکەی‌دا دا کە بۆ جارێکی تر نەهێڵێ ئەو مونافیقانە بەشداریی غەزای موسڵمانان بکەن .

ئەبولوبابە و هاوەڵانیشی کۆمەڵێك موسڵمان بوون کە لەبەر تەمەڵیی ، نەك شك و نیفاق ، دواکەوتن . ئەمانە حەوت یان دە کەس بوون . ئەمانە بەر لەوەی سوپای ئیسلام بگاتەوە مەدینە خۆیان بە کۆڵەکەکانی مزگەوتی پێغەمبەرەوە بەستەوە ، بۆ دەربڕینی پەشیمانی‌یان .

کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە لایان‌دا تێپەڕیی فەرمووی : (( من هؤلاء ؟ )) . وتیان: ئەبولوبابە و هاوەڵانیین ، لە غەزا دواکەوتوون و ، پەیمانیان بە خوا داوە کە خۆیان نەکەنەوە هەتا تۆ بیان‌کەیتەوە و لێیشیان ڕازیی بی .

فەرمووی : (( وأنا أقسم بالله لا أطلقهم ولا أعذرهم حتى يكون الله عز وجل هو الذي يطلقهم ، رغبوا عني ، وتخلفوا عن الغزو مع المسلمين )) . فەرمووی : منیش سوێند بە خوا ئەخۆم کە نە بەریان ئەدەم و نە پۆزشتیشیان بۆ دێنمەوە ، هەتا خوای بە دەسەڵات خۆی بەریان بدات . ئەوانە دەست‌بەرداری من بوون و لە غەزاکردنیش لەگەڵ موسڵمانان‌دا دوا کەوتوون.

کە ئەوانیش ئەم فەرمایشتەیان بیست وتیان : ئێمەش خۆمان بەر نادەین هەتا خوا خۆی بەرمان بدات . ئەوەبوو خوای پاك بێ‌گەرد ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە :

﴿ وَءَاخَرُونَ ٱعْتَرَفُواْ بِذُنُوبِهِمْ خَلَطُواْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَءَاخَرَ سَيِّئًا عَسَى ٱللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ ( التوبة : ١٠٢ ) . ئیتر پێغەمبەری خوا ﷺ ئازادی کردن و ،

ئەوانیش چیی سامانیان هەبوو هێنایان و ، وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەمە سامانەکەمانە لە بریی ئێمە بی‌کە بە صەدەقە و ، داوای لێ خۆشبوونمان بۆ بکە . هاوەڵان هەر وایان ئەکرد ، خوا لێیان رازیی بێ ، ئەگەر خوا بۆ گوناهێکیان تەوبەی لێ وەربگرتبانایە ، بۆ دەربڕینی سوپاس ماڵ و سامانیان ئەبەخشیی . فەرمووی: (( ما أمرتُ أن آخذ من أموالكم شيئاً )) . فەرمووی : فەرمانم پێ نەدراوە هیچێ لە سامانتان وەربگرم . ئەوەبوو ئایەتی : ﴿ خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ ۖ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٠٣﴾ أَلَمْ يَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ وَيَأْخُذُ ٱلصَّدَقَٰتِ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٤﴾ وَقُلِ ٱعْمَلُوا۟ فَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُۥ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۖ وَسَتُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ ( التوبة : ١٠٣ ـ ١٠٥ ) هاتە خوارەوە و ، پێغەمبەی خواش ﷺ سێ‌یەکی ماڵ و سامانەکەیانی وەرگرت و ئەوی تری بۆ گێڕانەوە .

ئێستاش دێینە سەر باسی ئەو سێ هاوەڵەی کە لە ئاسمانەوە خوا چاوپۆشیی لێ کردن ، کە کەعبی کوڕی مالیك و ، هیلالی کوڕی ئومەییە و ، مەڕارەی کوڕی ڕەبیع بوون:

کەعب خوا لێی رازیی بێ خۆی ڕووداوەکە ئەگێڕێتەوە و ئەڵێ : جگە لە غەزای تەبووك لە هیچ غەزایەك لە پێغەمبەری خوا ﷺ دوا نەکەوتم ، هەرچەندە لە غەزای بەدریش دوا کەوتم ، بەڵام بۆ دواکەوتن لەو هیچ کەس گلەیی لێ نەکرا ، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ وەها دەرچوو کاروانەکەی قورەیشی ئەویست ، تا ئەوەبوو خوا بەبێ ماوەدانان بۆ یەکتر لەگەڵ دوژمندا یەکی پێ گرتن . من بەشداریی شەوی عەقەبەشم کردووە لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ ، کاتێك کە بۆ موسڵمانبوون پەیمانمان دا .. من شەوی عەقەبە ناگۆڕمەوە بە بەدر ، هەرچەندە خەڵك بەدری زیاتر ناو ئەبرد . کاتێك کە لەو غەزایە دوا کەوتم هیچ کاتێك ئەوەندە بەهێز و دەست ڕۆیشتوو نەبووم . بەخوا پێش ئەو غەزایە هەرگیز دوو وشترم نەبوون ، تا ئەوەبوو لە کاتی ئەو غەزایەدا هەم بوون . پێغەمبەری خوایش ﷺ نیازی هەر غەزایەکی بکردایە دەنگ و باسەکەی ئەگۆڕیی بۆ شوێنێکی تر ، تا ئەم غەزایە هاتە بەرەوە. پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی گەرمایەکی زۆردا ئەم غەزایەی کرد و ، سەفەرێکی دوور و درێژی ، لە بیابانێکی چۆڵ و ، لەگەڵ دوژمنێکی زۆردا ، دایە بەر . بۆیە

کارەکەی بۆ موسڵمانان ڕۆشن کردەوە تا بۆ غەزاکەیان خۆیان ئامادە بکەن . هەواڵی دانیێ نیازی کوێی هەیە و، موسڵمانەکانیش لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ ئەوەندە زۆر بوون لە دیوانێکدا جێیان نەئەبوویەوە .

کەعب ئەڵێت : هەر پیاوێك بیویستایە دوا بکەوێ وای ئەزانیی بۆی ئەشاررێتەوە ئەگەر وەحی خوا دەربارەی نەیەتە خوارەوە .

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو غەزایەی لە کاتێکدا ئەنجام دا کە بەروبووم و سێبەرەکان خۆش بووبوون .. پێغەمبەری خوا ﷺ و موسڵمانەکانیش لەگەڵیا کەل و پەلیان ئامادە کرد . منیش ئەڕۆیشتم لەگەڵیانا کەل و پەل ئامادە بکەم ، کەچیی ئەگەڕامەوە و هیچم ئەنجام نەئەدا .. بە خۆمم ئەوت : من توانام بەسەریا ئەشکێ. هەروا ئەپەشۆکام هەتا خەڵکەکە خۆیان پێچایەوە تا ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ موسڵمانانی لەگەڵدا ئامادەبوون و منیش هیچ کەلوپەلێکم نەپێچاوەتەوە . وتم: ڕۆژێ یان دوو ڕۆژ دوای دەرچوونی ئەو خۆم ئەپێچمەوە و ، پاشان پێیان ئەگەمەوە. دوای دەرچوونی ئەوان هاتم کەلوپەل ئامادە بکەم ، کەچیی گەڕامەوە و هیچم نەکرد. پاشان بۆ سبەینێ ڕۆیشتم ، دیسان گەڕامەوە و هیچم نەکرد . هەروا پەشۆکام هەتا ڕۆیشتن و سوپا دوور کەوتەوە . ویستم بار بکەم و فریایان بکەوم ، خۆزگە وەهام بکردایە ، ئەوەشم بۆ ڕێك نەکەوت . هەرچیی ئەچوومە ناو خەڵك ـ دوای دەرچوونی پێغەمبەری خوا ﷺ ـ و بە ناویانا ئەسووڕامەوە ، خەفەت بار ئەبووم ، چونکە یا پیاوێکی نوقمی ناو نیفاقم ئەبینیی ، یان پیاوێك لەو لاوازانەی کە خوا پۆزشتی لێ وەرگرتبوون . پێغەمبەری خواش ﷺ ناوی نەهێنابووم هەتا گەیشتبووە تەبووك . لە تەبووك لەناو خەڵکەکەدا دائەنیشێ و ئەفەرموێ : (( ما فعل كعب ؟ )) . فەرمووی: کەعب چیی کرد ؟ پیاوێکی نەوەی سەلیمە ئەڵێت : ئەی پێغەمبەری خوا ! هەردوو بوردەکەی و سەیرکردنی ئەم دیو و ئەو دیوی خۆی دوای خستووە . موعاذی کوڕی جەبەل ئەڵێت : خراپت وت . بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا ! چاکە نەبێ هیچمان پێیەوە نەدیوە . پێغەمبەری خوایش ﷺ بێدەنگ ئەبێت ....

کەعبی کوڕی مالیك ئەڵێت : کە پێم گەیشت وا پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕاوەتەوە، خەفەت سەری تێ کردم و ، کەوتمە بیرکردنەوە بۆ دۆزینەوەی درۆ و ، ئەم وت: سبەینێ بە چیی لە ڕەنجانی خۆم دەرباز بکەم ؟ بۆ ئەمە پەنام بردە بەر هەموو خزمێکی خاوەن ڕام . کە پێیان وتم : گەڕانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ نزیك بۆتەوە،

هەرچیی ناڕەوا بوو لە دڵمدا نەما و ، زانییم هەرگیز بە هیچ شتێك لە دەستی دەرباز نابم ، بۆیە خۆم یەكلایی راستپێوتنی كردەوە .

پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە بەرەو .. هەرچیی لە سەفەر بگەیشتایە ، یەكەم جار سەری لە مزگەوت ئەدا و دوو رەكعەت نوێژی تیا بەجێ ئەهێنا و ، پاشان بۆ كاروباری خەڵك دائەنیشت . كە ئەوەی ئەنجام دا ، دواكەوتووەكان هاتن و ، دەستیان كرد بە پۆزشت هێنانەوە بۆی و ، سوێندیان بۆ ئەخوارد ، كە هەشتا و ئەوەندە پیاو بوون . پێغەمبەری خوایش ﷺ دیوی دەرەوەی لێ وەرگرتن و ، بەیعەتی لێ وەرگرتن و، داوای چاوپۆشیی بۆ كردن و ، دیوی ناوەوەشیانی بە خوا سپارد . منیش هاتم، كە سەلامم كرد، زەردەخەنەیەكی تێكەڵ بە تووڕەیی كرد ، پاشان فەرمووی : (( تعال )). منیش هاتم هەتا لەبەر دەستی دا دانیشتم . پێمی فەرموو : (( ما خلّفك ؟ ألم تكن قد ابتعت ظهرك ؟ )) . فەرمووی : چیی دوای خستی ؟ ئەی وشتری سوارییت نەكڕیی؟ وتم : بەڵێ . بەخوا ئەگەر لای كەسێكی تری ئەهلی دونیا لە غەیری تۆ دابنیشم ، ئەم توانیی بە پۆزشتێك لە رەنجانی خۆم دەرباز بكەم ، چونكە بەشی خۆم زمان پاراوییم پێ بەخشراوە . بەڵام بەخوا ئەزانم ئەگەر ئەمڕۆ قسەیەكی درۆت بۆ بكەم هەتا لێم رازیی ببی ، ئەوا بە زووترین كات خوای گەورە دڵت لە من ئەڕەنجێنێ. خۆ ئەگەر راستییشت پێ بڵێم ئەوا لێم زویر ئەبیت . من هیوادارم خوا بە چاك كۆتایی پێ بێنێ بۆم .. نا بەخوا هیچ پۆزشتێكم نەبوو . بەخوا هیچ كاتێك وەك ئەو كاتەی كە لێت دوا كەوتم بەهێز و دەستڕۆیشتوو نەبووم .

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( أما هذا فقد صدق ، فقم حتى يقضي الله فيك )) . فەرمووی: بەڵام ئەمە راستی كرد .. هەستە هەتا خوا دەربارەی تۆ بڕیاری خۆی دەر بكات. منیش هەستام . كۆمەڵێ پیاوی نەوەی سەلیمە هەڵ چوون و كەوتنە شوێنم، پێمیان وت : بەخوا نەمان دیوە بەر لەمە تۆ هیچ گوناهێك ئەنجام بدەی .. نەشت توانیی بەو شتانەی كە دواكەوتوان پۆزشتیان هێنایەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ تۆیش پۆزشتی بۆ بهێنیتەوە . خۆ داواكردنی لێ خۆش بوون لە لایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ بۆ گوناهەكەت بەس بوو. كەعب ئەڵێ : بەخوا ، هەروا خەریك بوون بە توندیی لۆمەیان ئەكردم هەتا ویستم بگەڕێمەوە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وخۆم بخەمە درۆوە..

پاشـان پێیانم وت : ئایا هیچ کەسێك لەگەڵ من‌دا تووشی ئەمـە بـووە ؟ وتیـان : بەڵێ ، دوو پیاو ، وەك ئەوەی تۆیان وت و ، ئـەوەش بـە تـۆ وتـرا بـەوانیش وتـرا . ئەڵێت : وتم : ئەو دوانە کێن ؟ وتیان : مەڕارەی کوڕی رەبیعی عەمریی و ، هـیلالی کوڕی ئومەییەی واقیفیی . دوو پیاوی صاڵحیان بۆ هەڵ دام کـە بەشـداریی بـەدریان کردبوو و ، پێشەنگ بوون .

کە ئەو دوانەیان بۆ هەڵ دام رۆیشتم بە رێی خۆمەوە .

پێغەمبـەری خـواش ﷺ موسـڵمانەکانی قەدەغـە کـرد کـە ـ لـە نـاو هـەموو دواکەوتووانا ـ هیچ کەس لەگەڵ ئەو سیانەمان‌دا قسە نەکات .. خەڵکیی لێمان دوور کەوتنەوە و ، لەگەڵمان گۆڕان بە رادەیەك کە زەوییم لەلا نامۆ بوو و ، ئـەو زەوی‌یـە نەما کە جاران ئەم‌ناسیی . بەم شێوەیە پەنجا شەو ماینەوە . هەردوو هاوڕێ‌کـەم لـە ماڵەوە لێی دانیشتن و ، هەر ئەگریان . بەڵام من لە هەموویان گەنج‌تر و لێ‌هـاتووتر بووم ، لە ماڵ دەرئەچووم و ، لەگەڵ موسڵمانەکان‌دا بەشداریی نوێـژم ئـەکرد و ، لـە بازاڕەکان‌دا ئەسووڕامەوە و ، تاقە کەسێکیش قسـەی لەگـەڵم نەئـەکرد و ، ئەهاتمـە خزمەتی پێغەمبـەری خـواش ﷺ و ، کـە دوای نوێـژ لەگـەڵ موسـڵمانان‌دا کـۆڕی ئەبەست سەلامم لێ ئـەکرد و ، لـە دڵـی خـۆم‌دا ئـەم وت : ئایـا بـۆ وەڵام‌دانـەوەی سەلامەکەم لێوی جووڵاند یان نەء ؟ پاشان لە نزیکیەوە نوێژم بەجێ ئەهێنا و ، چاوم بۆ ئەخست . جا کە بە نوێژەکەمەوە خەریك ئەبووم سەیری ئـەکردم و ، کـاتێ ئـاوڕم ئەدایەوە بۆ لای رووی لێم وەرئەگێڕا ، هەتا ئەو دابڕانەی خەڵك درێژەی لـێم کێشـا ، رۆیشتم هەتا لە دیواری باخچەکەی ئەبوقەتادە ، کـە ئـامۆزام بـوو و ، خۆشەویسـت ترین کەس بوو لە لام چوومە ئەو دیو. سـەلامم لێ کـرد ، دە بـەخوا سـەلامەکەمی وەڵام نەدایەوە . وتم : ئەبوقەتادە ! بۆ خوا لێت ئەپرسم : ئایا تـۆ بزانـی مـن خـوا و پێغەمبەرکەیم خۆش ئەوێن ؟ بێ‌دەنگ بوو . جارێکی تر لێی پاڕامەوە هەر بێ‌دەنگ بوو . دیسان لێی پاڕامەوە ، لە وەڵام‌دا وتی : خوا و پێغەمبەرەکەی چـاك ئـەزانن . هەردوو چاوم لە فرمێسك پڕ بوون و ، پشتم هەڵ کرد و لە باخچـەکە چـوومە دەرەوە لە کاتێك‌دا کە لە بازاڕی مەدینەدا بـەرێوە ئەچـووم ، ئـەبینم پیـاوێکی نەبـەطیـی خەڵکی شام ، لەوانەی کە خۆراکی بۆ فرۆشـتن هێنـابووە مەدینـەوە ، ئـەڵێت : کـێ کەعبی کوڕی مالیکم پیشان ئەدات ؟ خەڵکەکە ئاماژەیان بۆم ئەکرد و ، ئەویش لێم هاتە پێشەوە و ، نامەیەکی پادشای غەسسانی دا پێم ، ئەبینم تیایا نووسراوە : أمـا

بعد، پێم گەیشتووە کە گەورەکەت لەگەڵتدا ساردە ، خوایش تۆی لە شوێنێکدا دانەناوە کە تیایا سووك بیت یان مافت بفەوتێ. وەرە بۆ لامان ئێمە دڵت ئەدەینەوە.
کاتێك کە خوێندمەوە وتم : ئەمەش بەلایەکی ترە . نامەکەم خستە ناو تەنوورەوە و تیایا سووتاندم ، تا ئەوەبوو لە پەنجا شەوەکە چلیان بەسەر چوون ، ئەبینم وا نێرراوی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لام و وتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانت بەسەردا ئەدات کە لە هاوسەرەکەت دوور بکەویتەوە . وتم : تەلاقی بدەم ، یان چیی بکەم ؟ وتی: نەخێر ، بەڵکو لێی کەنار بگرە و نزیکی نەکەویتەوە . هەمان فەرمانی بۆ لای دوو هاوڕێکەی تریشم ناردبوو .

ئەڵێت : بە هاوسەرەکەمم وت : بچۆرەوە لای کەس وکارت و لای ئەوان بە هەتا خوای گەورە بڕیار لەسەر ئەم کارە بدات .

ئەڵێت : هاوسەرەکەی هیلالی کوڕی ئومەییە دێتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەڵێت : ئەی پێغەمبەری خوا ! هیلالی کوڕی ئومەییە پیرێکی بە ساڵدا چووە و خزمەتکاریشی نیە ، ئایا پێت ناخۆشە خزمەتی بکەم ؟ فەرمووی : (( لا ، ولكن لا يقربنكِ )) . فەرمووی : پێم ناخۆش نیە ، بەڵام لێت نزیك نەکەوێتەوە . ئەڵێت : ئەو بەخوا ! بۆ هیچ شتێ جووڵەی لێ نایەت . بەخوا لەو ڕۆژەوە ئەم کارەی بەسەردا هاتووە هەتا ئەمڕۆش هەر ئەگریێ .

یەکێ لە کەس وکارەکانم وتی : خۆزگە تۆش داوای مۆڵەتت لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکردایە بۆ مانەوەی هاوسەرت ، هەروەك هیلالی کوڕی ئومەییە داوای کرد تا خزمەتی بکات.

ئەڵێت : وتم : داوای مۆڵەتی لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ناکەم ، چونکە ئەگەر داوای مۆڵەت بکەم نازانم پێغەمبەری خوا ﷺ چیم پێ ئەڵێت و ، منیش پیاوێکی گەنجم.

ئەڵێت : دوای ئەوە دە شەو مامەوە ، هەتا ئەوەبوو ، لەو کاتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ قسەکردن لەگەڵمانی قەدەغە کردبوو ، پەنجا شەومان پڕ کردەوە . کاتێك کە نوێژی فەجرم بەجێ هێنا ، فەجری شەوی پەنجاهەمین و ، منیش لەسەر بانی یەکێ لە ماڵەکانمان بووم ، کاتێك کە بەو شێوە کە خوای گەورە حاڵمانی باس کردبوو دانیشتبووم ، کە دڵم یەکجار لە تەنگانەدا بوو و ، ئەو زەوییەش بەو پان و پۆڕییە لێم هاتبووە یەك ، دەنگی کەسێکم بیست کە سەر کەوتبووە سەر چیای ( سەلع ) و

بە هەموو دەنگێکی هاواری ئەکرد : ئەی کەعبی کوڕی مالیك مژدە بێت . ئەڵێت : خێرا چووم بە سەجدەدا و ، زانییم سەرفرازیی هات . ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ دوای بەجێ هێنانی نوێژی فەجر لە تەوبەوەرگرتنی خوا لێمان موسڵمانانی ئاگادار کردبوو . خەڵکەکە بۆ مژدە پێ دانمان هاتبوون و ، چەند مژدەدەرێکیش چوو بوون بۆ لای جووتە هاوەڵەکەم . پیاوێکیش بە ئەسپ بە غاردان هات مژدەم بداتێ . پیاوێکیش لە ئەسلەم بە پەلە سەرکەوتە سەر چیاکە و ، دەنگی ئەو لە ئەسپەکە خێراتر بوو . جا کاتێ ئەو پیاوەی دەنگەکەیم بیست و مژدەی پێم دا ، گەیشتە لام ، هەردوو کراسەکەی بەرمم بۆی داکەند و لە بریی مژدەدانەکەی پێشکەشم کرد . دە بەخوا ! ئەو رۆژە لەو دوو کراسە بەولاوە هیچی ترم نەبوو ، بۆیە دوو کراسم خواستن و لەبەرم کردن و ، بەرەو پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتمە رێ و ، خەڵکییش پۆل پۆل تووشم ئەبوون و ، پیرۆزبایی تەوبەیان لێم ئەکرد و ئەیان وت : یا خوا تەوبەی خوات لێ پیرۆز بێت.

کەعب ئەڵێت : رۆیشتم هەتا گەیشتمە مزگەوت ، ئەبینم وا پێغەمبەری خوا دانیشتووە و خەڵکیش لە دەوری‌دان . طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلا هەستا و بەرەو رووم بە هەروەلە هات و تەوقەی لەگەڵ کردم و پیرۆزبایی لێ کردم . دە بەخوا جگە لەو هیچ پیاوێکی موهاجیریی هەڵنەسایەوە لام و ، ئەو کارەی طەلحەیشم لە یاد ناچێت.

کەعب ئەڵێت : کە سەلامم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد ، پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە خۆشیی‌دا دەم و چاوی ئەبریسکایەوە فەرمووی : (( أبشر بخير يوم مرّ عليك منذ ولدتك أمك )) . فەرمووی : مژدە بێت لێت بە چاك‌ترین رۆژێك کە لەو رۆژەوە لە دایك بوویت بەسەرتا هاتووە . وتم : ئایا لەلایەن خۆتەوەیە ، ئەی پێغەمبەری خوا، یان لەلایەن خواوەیە ؟ فەرمووی : (( لا بل من عند الله )) . فەرمووی : نەخێر، لەلایەن خواوەیە . جا گەر پێغەمبەری خوا ﷺ شادمان بوایە دەم و چاوی بە وێنەی پارچەیەك لە مانگ ئەدرەوشایەوە . ئێمەش ئەوەیمان ئەزانیی .

ئەڵێت : کاتێك لەبەر دەستیا دانیشتم وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ! بۆ گیرابوونی تەوبەکەم وا چاکە هەرچیی سامانم هەیە بی‌کەمە صەدەقە بۆ خوا و بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( أمسك عليك بعض مالك ، فهو خير لك )) . فەرمووی : دەست بە هەندێ لە سامانەکەتەوە بگرە ، چونکە ئەوەت بۆ

چاکە. وتم : ئەو بەشەی خەیبەرم بۆ خۆم ئەهێڵمەوە . وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ! خوای گەورە بە راستگۆیی رزگاری کردم . وەها تەوبەشم کردووە کە هەتا ماوم بە راستیی نەبێ قسە نەکەم . دە بەخوا ! پێ نازانم تاکە کەسێك لە موسڵمانان ، لەو کاتەوە کە ئەوەم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس کردووە هەتا ئەم رۆژەم ، بە هۆی راست وتنەوە ، نیعمەتی بەسەردا رژاندبێ چاکتر لەو نیعمەتەی کە بەسەر من دا رژاندی. لەو رۆژەوە کە بە پێغەمبەری خوام ﷺ وتووە هەتا ئەم رۆژەم بە ئەنقەست درۆیەکم نەکردووە و، هیواداریشم لەو تەمەنەی کە ماوە خوا بمپارێزێ. ئەڵێت: خوای گەورە ئەم ئایەتانەی ناردنە خوارەوە : ﴿ لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلْمُهَـٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ مِنۢ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٧﴾ وَعَلَى ٱلثَّلَـٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُوا۟ حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّوٓا۟ أَن لَّا مَلْجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١١٨﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَكُونُوا۟ مَعَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴾( التوبة : ١١٧ ـ ١١٩ ) .

کەعب ئەڵێت : بەخوا ، خوای گەورە دوای ئەوەی کە هیدایەتی داوم بۆ سەر ئیسلام نیعمەتێکی تری پێ نەبەخشیوم ، کە بە لامەوە گەورەتر بێ لە راست کردنم لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ ، کە درۆم لەگەڵیا نەکرد و منیش وەك ئەوانە تیابچم کە درۆیان لەگەڵیا کرد . خوای گەورە کاتێك کە وەحی ناردە خوارەوە خراپ ترین شتێکی بەوانە وت کە خوایان بە درۆ ئەخستەوە . خوا فەرمووی : ﴿ سَيَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمْ إِذَا ٱنقَلَبْتُمْ إِلَيْهِمْ لِتُعْرِضُوا۟ عَنْهُمْ ۖ فَأَعْرِضُوا۟ عَنْهُمْ ۖ إِنَّهُمْ رِجْسٌ ۖ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٩٥﴾ يَحْلِفُونَ لَكُمْ لِتَرْضَوْا۟ عَنْهُمْ ۖ فَإِن تَرْضَوْا۟ عَنْهُمْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَرْضَىٰ عَنِ ٱلْقَوْمِ ٱلْفَـٰسِقِينَ ﴾ ( التوبة : ٩٥ ـ ٩٦ ) .

جا خۆشەویستان ئەتوانین چەند پەند و ئامۆژگارییەك لەم چیرۆکە وەربگرین :

١ـ مونافیقەکان باکیان لە درۆکردن نەبوو ، بۆیە هەر یەکە درۆیەکی بۆ خۆ پەراندنەوە رێك خست ، کەچیی کەعب و هیلال و مەرارە بە بۆنەی ئیمان دارییانەوە نەیانتوانیی درۆ بکەن ، ئەگەرچیی تووشی نارەحەتیی بوون . هەتا لە کاتی ئەو پەنجا شەوەدا، وەك لە قسەکانی کەعبدا دەرئەکەوێ ، لەو راست وتنەیان پەشیمان نەبوون،

بەڵکو هەردەم هیوادار بوون ئەو راستوتنەیان ببێتە مایەی سەربەرزیی دنیا و قیامەتیان . ئەوەبوو قورئانی پیرۆزیش بۆ ئەو کارە مەردانەیە هەڵی نان کە ئەی فەرموو:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَكُونُوا۟ مَعَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴾ ( التوبة : ١١٩ ) .

٢ ـ دابڕان و تێکەڵیی نەکردن لەو کۆمەڵە راستەدا دەورێکی کاریگەریی هەبوو ، تا هیچ کەس نەوێرێ فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەر ﷺ پشت گوێ بخات . خۆ ئەگەر ئەم کۆمەڵەی ئێمەش وەها موحاسەبەیەکی لەسەر بوایە هەر کەسە بۆ خۆی ئالآی نۆکەریی شەیتانی بەرز نەئەکردەوە . کەواتە تا رادەی دینداریی لە کۆمەڵگادا بە هێز بێت ئەو دابڕان و موحاسەبەیەش بە هێزتر ئەبێت و ، ئەندامەکان کەمتر ئەتوانن بێشەرمیی بکەن .

بەڵام ئەم دەنگ لێ وەرگرتنە جیاوازە لە دەنگ وەرگرتن لەسەر کاری دنیایی .. ئەمە دەنگ لێ وەرگرتنی دینیەیە و کارێکی شەرعیەیە . کەواتە هەرکەس زیانی بۆ دین هەبوو ، یان کارێکی ئەنجام ئەدا خزمەتی دینی نەئەکرد ، ئەگونجێ دەنگی لێ وەربگیرێ . ئەمە جیایە لەو دەنگ لێ وەرگرتنەی کە لەسەر دنیا بێت کە ئەو تا سێ رۆژ مەکرووهە و لەوەولایش حەرامە .

٣ ـ کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا هیچ موسڵمانێك لەگەڵ ئەو سیانەدا قسە نەکات ، بە یەکجار هەموو موسڵمانان فەرمانەکەیان بەجێ هێنا .. هەتا ئامۆزایەکی کەعب لەناو باخەکەی خۆیدا ناوێرێ وەڵامی سەلامیشی بداتەوە ! هەتا کە فەرمانیشی دا هەرسێکیان لە ژنەکانیان دوور بکەونەوە ئەوانیش گوێ ڕایەڵیی تەواویان کرد .. لەمەوە بۆمان دەرئەکەوێ کە تەنها دینێکی پاکی وەکو ئیسلام ئەتوانێ کۆمەڵگای وەها دروست بکات !!

٤ ـ لەولاوە دوژمنی دەرەوە ئەم بارودۆخەی ناو کۆمەڵگای ئیسلامیی بە هەل ئەزانێ ، تا بە هەر شێوەیەك بووە پیاوێکی وەك کەعب بکڕێت و ، کۆمەڵی موسڵمانی پێ پەرتەوازە بکات ؛ بۆیە نامەی بۆ ئەنێرێ تا بچێتە لای و دڵی شکاوی بهێنێتەوە . بەڵام کەعب مەردانە لەم تاقیی کردنەوەیەشدا سەرئەکەوێ ؛ چونکە بە راستیی ئەیەوێ بژیی و ، هەر کەسیش راستگۆ بێ دڵەکەی وا لە نێوان پەنجەکانی رەحماندا و ، بۆ لای راستیی و پاکیی وەرئەچەرخێنێ ..

کەعب ناکا کاغەزی پادشای غەسسانیی صەلیبیی بدڕێنێ و پارچە پارچەی بکات، بەڵکو ئەیخاتە ناو تەنوورەوە تا هەرچیی تیایە ببێ بە دووکەڵ و نەمێنێ . بەمە ئەوەندەی تر ئیمانی بەهێز بوو و ، بووە خاوەنی ئەخلاق و متمانەیەکی بەرز.

■ ـ ئیمانداران و پێغەمبەرەکەیان بە چاوپۆشیی خوای گەورە لەو سێ ئیمان دامەزراوە زۆر دڵ خۆش بوون ، بە رادەیەك کە بە کۆمەڵ پیرۆزباییان لە کەعب و هاوەڵانی ئەکرد.

هیلالی کوڕی ئومەییەش کە سەعیدی کوڕی زەید مژدەکەی بۆ ئەبات ، لە گەڕەکی نەوەی واقیف ، خێرا هیلال سەجدەی شوکر ئەبات . سەعید ئەڵێت : وام ئەزانیی سەربەرز ناکاتەوە هەتا گیانی دەرئەچێ . دیارە سەجدەکەی زۆر درێژ کردۆتەوە .

٦ ـ کەعب ئەو چاوپۆشی‌یەی پەروەردگاری ئەوەندە بە لاوە بەنرخ بوو لە خۆشیان دا چەند پەرستشێکی ئەنجام دا :

أ ـ کە کەعب مژدەکەی لە دوورەوە بیست خێرا سەجدەی شوکری بۆ خوا برد . نەك هەر ئەو ، بەڵکو هاوەڵان هەر هەموو بۆ هەر نیعمەتێکی خوایی ، یان لابردنی هەر بەلایەك سەجدەیان ئەبرد ، ئەمەشیان لە ئازیزەوە وەرگرتبوو .

ب ـ کەعب خێرا هەردوو کراسەکەی بەری داکەندن و بەخشینی بەو موسڵمانەی کە مژدەکەی پێ دا .. ئەمەش سوپاسی خوای تیایە .

ج ـ لە سوپاسی ئەو چاوپۆشی‌یەدا کەعب سێ‌یەکی سامانەکەی بەخشیی و کردیە صەدەقە ، ئەویش بە فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ ، ئەگینا ئەی‌ویست هەموو سامانەکەی بکاتە صەدەقە .[٢٩٧]

**دوانزەهەم : مزگەوتی ضیرار**

لە کاتی گەڕانەوەی پێغەمبەری خوادا لە تەبووك ئەم ئایەتانە هاتنە خوارەوە بۆی:

﴿ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مَسۡجِدٗا ضِرَارٗا وَكُفۡرٗا وَتَفۡرِيقَۢا بَيۡنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَإِرۡصَادٗا لِّمَنۡ حَارَبَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ مِن قَبۡلُۚ وَلَيَحۡلِفُنَّ إِنۡ أَرَدۡنَآ إِلَّا ٱلۡحُسۡنَىٰۖ وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ﴿١٠٧﴾ لَا تَقُمۡ فِيهِ أَبَدٗاۚ لَّمَسۡجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقۡوَىٰ مِنۡ أَوَّلِ يَوۡمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِۚ فِيهِ رِجَالٞ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُطَّهِّرِينَ ﴾( التوبة : ١٠٧ ـ ١٠٨ ).

---

[٢٩٧] الرحيق المختوم : ٤٥٠ ـ ٤٥١ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٥١٠ ـ ٥١٨ ، السيرة النبوية للصلابي : ٨٣٨ ـ ٨٤٦ ، السيرة النبوية للندوي : ٣٧٤ ـ٣٧٧ .

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە پیرۆزانە ئەمەیە : پێش ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچ بکات بۆ مەدینە ، لە مەدینەدا و لە هۆزی خەزرەج پیاوێك هەبووە کە پێیان وتووە ئەبوعامیری راهیب . ئەمە لە سەردەمی نەفامییدا ئەبێتە گاور و زانستی ئەهلی کیتاب ئەخوێنێ و ، لە نەفامییدا خەریکی خواپەرستیی ئەبێت . بەمە لە ناو خەزرەجدا پایەیەکی گەورەی ئەبێت . کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی بۆ مەدینە کرد و ، موسڵمانەکان لە دەوری کۆبوونەوە و ، ئیسلام بووە خاوەنی فەرمایشت و ، خوای گەورەش لە بەدردا موسڵمانانی سەرخستن ، ئەبوعامیری لەعنەتیی خۆی ئاشکرا کرد کە چەندە رقی لە ئیسلام و موسڵمانانە . بۆیە خۆی پێ نەگیرا و بەرەو کافرەکانی مەککە هەڵ هات ، تا لەوێ ئەوان بۆ جەنگی ئیسلام هەڵ بنێ . ئەوەبوو قورەیش و ئەو هۆزە عەرەبانەی کە لە گەڵیان جۆر بوون سوپایان جەم کرد و هاتنە سەر مەدینە و ، لە نزیك ئوحوددا ئەو جەنگە خوێناوییە رووی دا و، خوای گەورە بە شکستێکی کاتیی موسڵمانانی تاقیی کردەوە و ، سەرەنجام سەرکەوتنیش هەر بۆ تەقواداران بوو . ئەبوعامیری فاسیق لە نێوان هەردوو سوپاکەدا چەند چاڵێکی هەڵ کەندبوون و ، لەو رۆژەدا پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتە ناو یەکێکیان و زامدار بوو و ، دانی تەختی لای راستی خوارەوەی شکا و ، سەریشی زامدار بوو . لە یەکەم زۆرانبازییدا ئەبوعامیری فاسیق هاتە بەرەوە و ، کەوتە دواندنی ئەنصارە خزمەکانی و ، ویستی بە لای خۆیدا رایان بکێشێ و دڵیان نەرم بکات . کاتێ کە زانییان مەبەستی چییە وتیان : خوا نەتکاتە چاوساغ ، ئەی فاسیق ، ئەی دوژمنی خوا . دەستیان کرد بە قسە پێ وتن و جنێو پێ دانی . ئەویش گەڕایەوە دوا و وتی : بەخوا دوای خۆم خزمەکانم تووشی خراپە هاتوون . پێش ئەوەی را بکات بۆ مەککە پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کرد بۆ موسڵمان بوون و قورئانی بۆ خوێند ، بەڵام ئەو ملی بە موسڵمانبوون نەدا و یاخیی بوو . پێغەمبەری خواش ﷺ دوعای لێ کرد کە بە دووریی و دەرکراویی بمرێ . ئەوەبوو ئەو دوعایەی لێ گیرا بوو.

ئەبوعامر دوای ئوحود کە هەستی کرد وا کاری ئیسلام لە بەرز بوونەوەدایە ، خۆی گەیاندە لای هیرەقلی پادشای رۆم و ، داوای کۆمەکیی لێ کرد دژی پێغەمبەری خوا ﷺ . ئەویش بەڵێنی پێدا و دڵی خۆش کرد و لەوێ مایەوە . ئەبوعامیر نامەی بۆ هەندێ لە خزمە موونافیقەکانی مەدینە ئەنووسی و ، بەڵێنی پێ ئەدان و ، بەوە دڵی خۆش ئەکردن کە سوپایەك دێنێتە سەر مەدینە و ئەچێت بە گژی پێغەمبەری

خوادا ﷺ و لە مەدینە دەری ئەپەڕێنێ . جا داوای لەو خزمانەی کرد کە لە مەدینەدا بنکەیەك دروست بکەن تا کە هاتەوە بیکاتە بنکەی کاری . ئەوانیش بەمە دڵخۆش بوون و ، دەستیان دایە بیناکردنی مزگەوتێك لە نزیك مزگەوتی ( قوباء ) ەوە و ، بەر لەوەی کە سوپای ئیسلام بۆ تەبووك دەربچێ ، ئەو مزگەوتەیان تەواو کرد. ئەوەبوو هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا و داوایان لێ کرد بێت بۆ لایان و ، لە مزگەوتەکەیان‌دا نوێژ بەجێ بهێنێ تا ببێتە بەڵگەی ڕەزامەندیی و دان پیانانی . باسیان بۆ کرد کە ئەم مزگەوتەیان بۆ لاوازان و نەخۆشان دروست کردووە تا لە شەوی تەڕ و تووشیی‌دا نوێژی تێدا بکەن . بەڵام خوای گەورە لەوە پاراستی کە نوێژی تیا بکات و ، فەرمووی : (( إنا علی سفر ولکن إذا رجعنا إن شاء الله )) . فەرمووی : ئێستە ئێمە لە سەر سەفەرین ، ئەگەر إن شاء الله گەڕاینەوە .

کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە تەبووکەوە گەڕایەوە و ، تەنها ڕۆژێك یان هەندێ لە ڕۆژێکی مابوو بگاتەوە مەدینە ، جیبریل هەواڵی مزگەوتی ضیراری بۆ هێنا کە ئەوانەی بنیاتیان ناوە چ مەبەستێکی گڵاویان هەیە ، کە ئەیانەوێ کوفر بڵاو بکەنەوە و ، دووبەرەکیی بخەنە نێوان موسڵمانانەوە بەوەی کە هەندێکیان لە مزگەوتی قوباء دابڕ بکەن . ئەو مزگەوتەی کە یەکەم ڕۆژ لەسەر تەقوا و خواناسیی بنیات نراوە. بۆ ئەمە پێغەمبەری خوا ﷺ بەر لەوەی بگاتەوە مەدینە پیاوی پێش خۆی خستن تا بیڕووخێنن و بیسووتێنن .

ئەمە هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکانی پێشەوە بوو وەك ئیبن کەثیر باسی کردووە.

بەڵام مانای ئایەتە پیرۆزەکان ئەمەیە کە خوای گەورە هەواڵی داوە کە هۆیەکانی بیناکردنی ئەو مزگەوتە چوار شتن :

١ـ زیان‌گەیاندن بە غەیری خۆیان .

٢ـ کوفرکردن بە خوا و ، خۆ هەڵکێشان بەسەر موسڵمانان‌دا ، چونکە ویستیان مونافیقان بەهێز بکەن .

٣ ـ بەش بەش کردنی ئیمان‌داران ، چونکە ویستیان هەندێ لە موسڵمانان ئامادەی مزگەوتی ( قوباء ) نەبن .

٤ ـ خۆ ئامادەکردن و بوونە چاوساغ بۆ دوژمنانی خوا و پێغەمبەرەکەی .

جا خوای گەورە فەرمانی بەسەر پێغەمبەرەکەی‌دا دا تا نوێژی تیا نەکات ، بەڵکو بیڕووخێنێ.

ئەو ناپاکانە سوێندیشیان ئەخوارد کە مەبەستمان چاکە بووە ، بەڵام قورئان بە درۆزنیان لە قەڵەم ئەدات .

خوای گەورە بە فەرمانی قورئان پێغەمبەری ئاگادار کرد تا نەچێتە ئەو مزگەوتەوە و نوێژیشی تیا نەکات . ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بەسەر عەمماری کوڕی یاسیر و مالیکی کوڕی دوخشوم‌دا دا لەگەڵ چەند هاوەڵێکی تردا بچن مزگەوتی ضیرار بڕووخێنن و بی‌سووتێنن . پاشان خوای گەورە فەرمانی کرد تا ئازیزەکەی نوێژ لە یەکێ لەو دوو مزگەوتەدا بەجێ بهێنێ : مزگەوتی قوباء یان مزگەوتەکەی خۆی ، چونکە لەسەر تەقوا بنیات نراون .

دوای ئەوە وەسفی ئەو پیاوانە ئەکات کە وان لە مزگەوتی تەقوادا ، ئەوانە کۆمەڵە پیاوێکی پاك وخاوێنن .

ئیبن ماجە ریوایەتی کردووە کە کاتێ ئایەتی : ﴿ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْ ﴾ ( التوبة : ١٠٨ ) هاتە خوارەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( يا معشر الأنصار! إن الله قد أثنى عليكم في الطهور ، فما طهوركم ؟ )). فەرمووی : ئەی کۆمەڵی ئەنصار خوا ستایشی ئێوەی لەسەر پاك و خاوێنیی کردووە ، پاك و خاوێنییتان کامەیە؟

وتیان : بۆ نوێژ دەستنوێژ ئەگرین و ، بۆ لەش گرانیی خۆمان ئەشۆین و ، تارەتیش بە ئاو ئەگرین . فەرمووی : (( فهو ذاك فَعَلَيكُموهُ )) . فەرمووی : ئەوەیە ، دەست بەرداری مەبن .

لەو کاتەوە هەتا ئێستا و لەمەودوایش دوژمنانی ئیسلام خەریکی نەخشە و پیلانن و بە چەندین شێواز مزگەوتی ضیرار لە دژی موسڵمانان دروست ئەکەن .. ئەمەش تا موسڵمانە سادەکانی پێ بخەڵەتێنن و شك و گومان تێکەڵ بە عەقیدەی موسڵمانان بکەن .

ئەو دوژمنانە خۆیان ماندوو ئەکەن .. سەریان دا لە بەرد گەر بیانەوێ دینی خوا لەکەدار بکەن ، یان زیانی پێ بگەیەنن ، ئەوانە هیچیان پێ ناکرێ ، بەڵکو تەنها سەرشۆڕیی دنیا و قیامەتیان بۆ ئەمێنێتەوە .[٢٩٨]

**سیانزەهەم : کاریگەریی غەزای تەبووك**

لەبەر ئەوەی کە غەزای تەبووك لە کاتی گەرمای هاوین‌دا ئەنجام درا ، کە ئەوەبوو سێبەر خۆش بوو بوو و ، باخ و باخات وەختی پێگەیشتنی بەر و بەرهەمیان بوو،

---

[٢٩٨] السيرة النبوية للصلابي : ٨٣٣ ـ ٨٣٨ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٥٠٧ ـ ٥٠٨ .

وەك راهێنانێکی سەختی لێ هات ، کە بە راستیی بووە هۆی زیادبوونی غیرەتی ئەو موسڵمانە بەرێزانە کە بە برسێتیی و تینوێتیی ، ئەو هەمووە رێگەیانە بڕیی ؛ بەرەو دوژمنێکی مل‌هوڕی بەدەسەلأت و خاوەن سوپایەکی تاقانە لە جیهان‌دا ، بێ ئەوەی تاقە موسڵمانێك نارەزایی ؛ یان ماندوێتیی دەربڕێ ..

ئەم راهێنانە سەختە سەلماندی کە قورئان چۆن پیاوێکی پێ گەیاندوون .

لە ئەنجام‌دا کە موسڵمانەکان بە سەری بەرزەوە گەڕانەوە چەند ؛ دەستکەوتێکی مەعنەویی پێشکەش بە سوپای ئیسلام کران :

( ١ ) سام و هەیبەتی رۆم لەبەر چاوی عەرەبەکان‌دا، چ موسڵمان و چ کافر، شکا. ئەوە نەما ناوی رۆم ببرێ و خەڵك لە شوێنی خۆی‌دا بلەرزێ .. بەڵکو سوپای عەقیدە گەورەترین سوپا تێك ئەشکێنێ .

( ٢ ) دەرکەوت کە سوپای ئیسلام بۆتە تاقە سوپای بە دەسەلأت لە دوورگەدا و، هۆزەکانی سنووری شامیش بوونەتە دۆستی موسڵمانان و ؛ هەندێکیشیان بە راستیی جزیە بە موسڵمانان ئەدەن . کەواتە ئیتر دەوڵەتی رۆم ئەو سام و هەیبەتەی نەما و، هۆزە عەرەبەکان پێیان خۆشە سوپای ئیسلام رازیی بکەن . هەتا ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ کەمێك پێش کۆچی دوایی خۆی ئوسامەی کوڕی زەیدی کردە فەرماندەی سوپایەك تا رۆم تەمێ بکا و ، لە هەمان کات‌دا تا ئامادە بێ بۆ فەتحی شام و وڵاتەکانی تریش .

( ٣ ) دوای کۆمەڵە سەرکەوتنەکەی خەیبەر و مەککە و حونەین و ؛ تەبووك سەرانسەری دوورگە بۆ موسڵمان بوون نەرم بوو . بۆ ئەمە هۆزە عەرەبەکان هەموویان نوێنەریان ناردە مەدینە تا موسڵمان بوونی هۆزەکانیان بگەیەنن . ئەوەبوو ساڵی نۆیەم بەو بۆنەوە ناونرا ساڵی نوێنەران ، وەك لە دواوە باسی ئەکەین .[299]

**چواردەهەم : سەرنجێك بۆ غەزاکان**

ژمارەی ئەو غەزایانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە فەرماندایەتیی خۆی ئەنجام دران بیست و حەوت یان بیست و هەشت غەزا بوون و[300] سریەکانیش شەصت سریە بوون کە لە هەموویان‌دا جەنگ و کوشتار رووی نەداوە ..[301]

---

[299] السيرة النبوية للصلابي : ٨٤٨ ـ ٨٥٠ .

[300] بە پێی لێکۆڵینەوەی ئیبنولقەییم لە زادولمەعاددا ژمارەی غەزاکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بیست و حەوت غەزا بوون، بەلأم بە رای لیوا روکن مەحموود شیت خەططاب و بە لێکۆڵینەوەی ئەو بیست و هەشت غەزا ئەبن . سەیری

ئەگەر بە وردیی سەرنجی ئەو هەمووە غەزایانە بدەین کە چەندە بە ڕێك و پێکیی ئەنجام دراون بۆمان دەرئەکەوێ کە سەر زەویی تاقە فەرماندە و سەرکردەیەکی بە خۆوە نەدیوە کە لە پێغەمبەری خوا ﷺ لە پێشتر بێ ، لە نەخشەی جەنگ و ئارام گرتن و ئازایەتیی و غیرەت و کۆڵ نەداندا .. هەر وەك سەرداری هەموو پێغەمبەرانە، ئەوا سەرداری هەموو سەرکردە و فەرماندەکانی سەرانسەری مێژووی مرۆڤیشە..

بۆ هەموو غەزایەك نەخشەی چاك و ڕێکی ئەکێشا ، تیتر لە هەموو غەزاکاندا سەرکەوتن بەشی بوو ، جگە لە تێك شکانێکی کاتیی بۆ چەند سەعاتێك ، بە هۆی هەڵەی سەربازەکانیەوە ، لە ئوحود و حونەیندا . ئەوەبوو سەرەنجام هەر ئەو سەرکەوتوو بوو .. لە جەنگی ئوحوددا هەر ئەو ڕۆژە سەلماندی کە مەیدانی جەنگ وا بە دەستی موسڵمانەکانەوە و ، ئەوان لەسەر خۆ شەهیدەکانیان لەوێ ناشت و ، بۆ سبەینێش ، دوای شەهیدبوونی دەیەکی سوپا و زامداربوونی صەد و پەنجای تر تا ( حمراء الأسد ) قوڕەیشی ڕاو نا .. لە جەنگی حونەینیشدا دوای کەمێك هاوەڵانی بانگ کردەوە و بە صەد جەنگاوەری دامەزراوەوە جەنگی سەرکەوتنیان دەست پێ کرد و، بیست هەزار جەنگاوەری هەوازین شوێن نەبوو خۆیان تیا بشارنەوە.

چەندە پاڵەوانێتیی پێغەمبەری خوا ﷺ لە غەزاکاندا ئەسەلما ، لە غەزای ئوحود و حونەیندا چاکتر ئەسەلما ، بۆ ئەو ئارام و دان بە خۆداگرتن و ورە بەرنەدانەی دوای تێك شکان لە هەردوو غەزاکەدا هەتا سوپای ئیسلامی جەم ئەکردەوە و ، وەك شاخی دامەزراو لەبەردەم دوژمندا دای ئەمەزراندەوە ..

کەواتە سەرکەوتنی ئەو دوو غەزایە گرنگ تر بووە لە سەرکەوتنی غەزاکانی تر ..

کەواتە پێغەمبەری خوا ﷺ شکستی بە خۆی و نەخشەکانیەوە نەدیوە .. بگرە پاڵەوانانە شکست و هەڵەی هاوەڵەکانیشی چارەسەر ئەکرد ..

بەم غەزایانە پێغەمبەری خوا ﷺ توانیی شارستانیەتێك دابمەزرێنێ .. ئوممەتێك بە هەموو ڕەوشتێکی بەرزەوە بەرپا بکات .. وڵاتێك پڕ بکا لە ئاسایش و هێمنیی

---

( السیرة النبویة ) دانانی مامۆستا نەدەویی لـ٤٩٢ـ و ، ( الرسول القائد ) دانانی لیوا ڕوکن مەحموود شیت خەططاب بکە .

[٣٠١] ئەمەش بە پێی لێکۆڵینەوە وردەکەی دانەری ژیان‌نامەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە ناوی ( رحمة للعالمین ) ، قاضیی موحەممەد سولەیمان مەنصوورفووریی .

که هەرگیز شتی وەهای بە خۆیەوە نەدیی بێ .. دوژمنایەتیی و تۆڵەسەندن و رقەبەرایەتیی بنبڕ بکات .. ئەمەش دوای پایەدان بە دڵسۆزان و رەوشت بەرزان تا خزمەت بکەن و ، ناسینی مونافیق و دەستبڕان و دوورخستنەوەیان.

بەم غەزایانە ، کە لە قوتابخانەی قورئانەوە فەرمانیان بۆ دەرئەچوو ، پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ کۆمەڵێك فەرماندەی بلیمەت و خواناس و دەستودەم پاکیی پێ گەیاند، تا دوای خۆی ئیسلام پێشکەش بە ولاتان و گەلانی دەرەوەی دوورگەی عەرەبیی بکەن و ، رۆم و فارس بە جارێکا بەگیر بێنن و ، سوپای هەردوو گەورە دەوڵەتی جیهان بە چۆکدا بهێنن و ، لە ستەم و جەور و خوێن مژینی هەژاران دەست کۆتایان بکەن .

بەم غەزایانە ، پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ مەبەستی جەنگ و کوشتاری گۆڕیی .. جاران جەنگ لە نێوان هۆزەکان و دەوڵەتەکاندا بۆ ستەم و داگیرکاریی و خوێن ڕشتن و تالان و برۆ و دیلگرتن و بە کۆیلەکردن بوو . بەلام غەزاکان مرۆڤیان فێر کرد تا لە پێناوی رزگاریی مرۆڤ دا بجەنگێ .. جەنگ بۆ تێك شکاندنی زاڵمان و ، رووخاندنی قەلای ستەم بێت ، تا مرۆڤەکان پەروەردگاری خۆیان بدۆزنەوە و ، بێترس و بیم بیپەرستن و ، بەمەش لە مەینەتییەکانی دنیا و قیامەت سەرفراز بن . لێرەدا مل هوڕان دەستکۆتا کران .. لاوازەکان بوونە خاوەنی رێز و خاوەنی ژیان .. با هەموان بەندەی خوا بن .. هاوەڵێك بۆ مەبەستێکی پاك و بەرز ، بۆ ماچکردنی شانی موبارەکی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەڵێت : ئەی پێغەمبەری خوا ! قامچییت لێ داوم . پێغەمبەری خواش ﷺ ئامادەیی خۆی بۆ تۆڵەسەندن دەرئەبڕێ .. فەرمان ئەدا با ئەو هاوەڵە بەرێزە قامچییەك لە ئازیزی بداتەوە .. ئەویش بیانوو ئەگرێ کە گوایە ئەو بە شانی رووتەوە قامچییەکەی بەرکەوتووە ، ئازیزیش شانی بۆ رووت ئەکات و ، ئەویش هەڵمەت ئەدات ماچی ئەکات ..

مێژووی مرۆڤایەتیی مێژوویەکی رەشی تاریکی چڵکنە ، جگە لە مێژووی پێغەمبەران و شوێنکەوتوانیان .. تەنها ئەوان رووناکیی و گەشاوەییان بۆ مێژوو تۆمار کردووە .. بە تایبەت پێغەمبەری نازدارمان ﷺ و هاوڕێ مەرد و قارەمانەکانی .. چونکە دەستڕۆیشتووانی مێژوو ئەگەر بە پاکیی هەڵگری دینی خوا نەبووبن ، ئەوا هەموو رەنج و تەقالایەکیان بۆ ئەم چوار رۆژە تەمەنەی دنیا بووە، بۆ سەرۆکایەتیی و پارە کۆکردنەوە و رابواردن . ئیتر سۆز و بەزەیی و دڵسۆزیی

و خەمخۆریی بۆ مرۆڤەکان و بۆ گەلەکان بە هیچ شێوەیەك نەبوون ، هەرچەندە لەم چەرخانەی دواوەدا لاف و گەزافی زۆر لێ درا بۆ مافی مرۆڤ و، مافی گەلان و، مافی چەوساوان .. چونکە هەرکەس بە پاکیی دەست بە دینی خواوە نەگرێ هیچ پەرەوەردەیەکی لا نیە و ، تەنها بیری وا بەلای خۆیەوە و ، تەنها خەریکی خۆپەرستیی ئەبێت .

ئیسلام یاسای جوانی نەخشە کێشا تا فەرماندە و سەربازەکانی ئیسلام ، لە کاتی جەنگدا پەیڕەوی‌یان بکەن . ئەو یاسایانە ئەوەندە جوانن تێکڕای مرۆڤایەتیی شانازی‌یان پێوە ئەکات .

سولەیمانی کوڕی بورەیدە لە باوکیەوە ئەگێڕێتەوە کە وتوویە : ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ کەسێکی بکردایە بە ئەمیری سوپایەك ، یان سریەیەك ئامۆژگاریی ئەکرد کە لە دڵی خۆی‌دا تەقوای خوای بەدەسەڵاتی لە یاد نەچێت و ، ئامۆژگارییشی ئەکرد تا لەگەڵ موسڵمانەکان‌دا چاك بێت ، پاشان ئەی‌فەرموو : (( أُغزوا باسم الله ، في سبيل الله ، قاتلوا من كفر بالله ، أُغزوا ، فلا تغلوا ولا تغدروا ، ولا تمثلوا ، ولا تقتلوا وليداً )) . ئەی‌فەرموو : بە ناوی خواوە و ، لە پێناوی خوادا ، غەزا بکەن .. هەر کەسێ ئیمانی بە خوا نیە کوشتاری بکەن .. غەزا بکەن .. لە دەستکەوتی جەنگ پێش بەش‌کردنی هیچ لا نەدەن .. غەدر نەکەن .. کوژراوی دوژمن لووت و گوێ نەکەن .. منداڵ نەکوژن ..

ئەم ئامۆژگاری‌یە نایابانە بەوپەڕی پیرۆزی‌یەوە سەیر ئەکران .. بۆیە چ فەرماندە و چ سەرباز بە جوانیی گوێڕایەڵی‌یان بۆ ئەکردن .. هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی ئەدا بەسەر موسڵمانانا تا ئیسلام بخەنە بەر چاوان و خەڵکیی بۆ لای رابکێشن نەك دووری بخەنەوە کە ئەی‌فەرموو : (( يَسِّروا ولا تُعَسِّروا ، وسَكِّنوا ولا تُنَفِّروا )) . ( رواه مسلم ) . ئەگەر تەشریفی بۆ ناو کۆمەڵێك ببردایە ، شەو لە ناخلۆفیی دا نەئەچووە سەریان هەتا رۆژ ئەبوویەوە .. زۆر بە توندیی دوورەپەرێزیی لە سووتاندن بە ئاگری ئەکرد .. کوشتنی کچۆڵەی قەدەغە کردبوو .. لێدان و کوشتنی ئافرەتی قەدەغە کردبوو .. هەموو زەرەر و زیانێکی قەدەغەکردبوو ، وەك درەخت‌بڕین و لەناوبردنی دەغڵ و دان و کشت وکاڵ .

لە کاتی فەتحی مەککەدا هەڵمەت‌بردنە سەر زامدار و ، شوێن‌کەوتنی هەڵاتوو و ، کوشتنی دیلی قەدەغە کرد .. کە فەرمووی : (( لا تجهزن على جريح ،

ولا تتبعن مدبراً ، ولا تقتلن أسيراً )) . هەتا کوشتنی نێرراو و نوێنەری قەدەغە کرد.. کوشتنی هاوپەیمانی وەها لە قەڵەم دا کە ئەو کەسە بۆنی بەهەشت نەکات، هەر چەندە بۆنی بەهەشت لە دووریی چل ساڵ رێگاوە ئەبیسترێ کە فەرمووی : (( من قتل معاهَداً لم يرح رائحة الجنة ، وإن ريحها لتوجد من مسيرة أربعين عاماً ... )) .

ئەوەشمان لە یاد نەچێ کە غەزا و سریەکانی سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ کەمترین کوشتاریان تیا کراوە کە لە هەردوولا لە ( ١٠١٨ ) کەس زیاتر نەکوژراوە ، کە دیارە بە قوربانییەکی دانێکی ئاوەها کەم دەوڵەتی عەدالەت لە سەرزەویی دا بەرپا بکرێ کە ئەبێتە مایەی پاراستنی ملیۆنەها خوێن و ، پاراستنی شەرەف و سەروەت و سامانی ملیۆنەها مرۆڤ و ، بلاوکردنەوەی ئەمن و ئاسایش لە ناوچەیەکی یەکجار زۆردا ، بە رادەیەك کە ئافرەتێك لە حیرەوە سواری وشتر ببێ و بە تاقی تەنیا بگاتە کەعبە و تەوافی ماڵی خوا بکات و جگە لە خوا لە کەس نەترسێ ، یان ئافرەتێك لە قادسیەوە سواری وشترەکەی ببێت هەتا زیارەتی ماڵی خوا بکات ، بەبێ ترس . بە مەرجێ لەوە و پێش کاروانی حکومەتە گەورەکانیش ، ئەگەر کەسانێکی تایبەتیی پاسەوانی یان نەکردایە ، جەردە رێیان پێ ئەگرت و تالانیان ئەکرد ..

ئەوەشمان لە یاد نەچێ کە بلاوبوونەوەی ئیسلام ماوەیەکی یەکجار کەمی پێ چووە. ئەوەبوو لە ماوەی دە ساڵدا تەنها ٢٧٤ میل دووجا ناوچەی گرتەوە ، کە لەم ماوەیەدا موسڵمانان بۆ هەر یەك مانگ تاکە پیاوێکیان لە دەست داوە و ، زیانی دوژمنیش ئەوپەڕەکەی صەد و پەنجا کەسی لە دەست داوە . کە دە ساڵەکەش تەواو بوو زیاتر لە یەك ملیۆن میل دووجا مڵکەچی حوکمی ئیسلام بوو . خۆ ئەگەر قوربانیانی غەزاکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بەراورد بکەین لەگەڵ قوربانیانی دوو جەنگە نەگریسە بێ ئەنجام و بێ کەڵکە جیهانی یەکەدا ، واتە جەنگی جیهانیی یەکەم لە ١٩١٤ ـ ١٩١٨ ز و ، جەنگی دووهەم لە ١٩٣٩ ـ ١٩٤٥ ز ، ئەوا هەست بە جیاوازی یەکی زۆر ئەکەین . لە ( دائرة المعارف البريطانية ) ل ١٠١٣ ی چاپی ١٩٧٤ دا وەها نووسراوە کە ژمارەی کوژراوانی جەنگی جەنگی جیهانیی دووهەم لە نێوان سیی و پێنج ملیۆن و شەصت ملیۆن بووە . بە مەرجێ ئەوەندەی خوێنی تاقە کەسێك مرۆڤایەتیی کەڵکی لەو دوو جەنگە ناهەموارە وەرنەگرتووە .

هەروەها ژمارەی قوربانیانی ( محاكم التفتيش ) لە ئەوروپا لە صەدەكانی ناوەڕاستدا ، كە كەنیسە دژی زانیاریی و زانایان ئەنجامی ئەدا ، گەیشتە دوانزە ملیۆن كەس .[٣٠٢]

**پانزەهەم : كۆچی دوایی نەجاشیی**

لە مانگی رەجەبی ساڵی نۆهەمدا ئەصحەمەی كوڕی ئەبجەری نەجاشیی ، پادشای حەبەشە كۆچی دوایی كرد .. ئەم پادشایە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ موسڵمان بوو ، بەڵام كۆچی نەكرد بۆ لای ، لەو ماوەیەدا كە موسڵمانان كۆچیان كردبوو بۆ حەبەشە نەجاشیی رێزی چاكی لێ گرتن . كاتێك كە نەجاشیی كۆچی دوایی كرد هەر لەو رۆژەدا پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی بە موسڵمانەكان دا و ، لەگەڵیانا رۆیشت بۆ موصەللا لە دەرەوەی مەدینە و لەوێ بە كۆمەڵ نوێژیان لەسەر كرد و چوار ( ألله أكبر ) یان لەسەر وت . ئەمەش بەڵگەی بەشەرعیی‌بوونی بەجێ هێنانی نوێژی جەنازەیە بۆ كەسێك كە لە دوورەوە مردبێ .[٣٠٣]

**شانزەهەم : كۆچی دوایی ئوم كولثووم**

كچی پێغەمبەری خوا بووە و لە مانگی شەعبانی ساڵی نۆهەمدا بووە . ئەوەبوو عوثمان لە ساڵی سێهەمی كۆچییدا مارەی كرد . ئەویش دوای كۆچی دوایی روقیەی كچی پێغەمبەری خوا . ئوم كولثووم مناڵی بۆ عوثمان نەدیوە . لە شۆردنیا ئوم عەطیە و صەفیەی كچی عەبدولموطەللیب و ئەسمائی كچی عومەیس بەشدار بوون و ، پێغەمبەر و موسڵمانان نوێژیان لەسەر كرد .. كاتێ كە بردیان بۆ ناشتن ، پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر قەبرەكەی وەستا و هەردوو چاویشی فرمێسكیان لێ ئەباریی. فەرمانی دا طەلحە و عەلیی و فەضل و ئوسامە چوونە ناو قەبرەكەیەوە . بە مردنی ئەم كچەی ، پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها فاطیمەی كچی مابوو .

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندە لە عوثمان رازیی بوو فەرمووی : (( لو كانت عندي ثالثة لزوجتكها )) . فەرمووی : كچی سێهەمیشم ببوایە لێتم مارە ئەكرد ..[٣٠٤]

---

[٣٠٢] السيرة النبوية للندوي : ٣٧٧ ـ ٣٧٩ ، الرحيق المختوم : ٤٥٥ ـ ٤٥٧ .

[٣٠٣] السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٥٣٢ ، الرحيق المختوم : ٤٥٣ .

[٣٠٤] السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٥٣٢ ، الرحيق المختوم : ٤٥٣ .

## بەشی چل و چوارەم

# ڕووداوەکانی نێوان تەبووك و حەجی ماڵئاوایی

**یەکەم : موسڵمان بوونی ثەقیف**

هۆزی ثەقیف هەڵەیەکی یەکجار گەورەیان کرد کاتێك کە سەرداری ژیر و بە سەلیقەی خۆیان عوروەی کوڕی مەسعوودیان کوشت .. هەروەها هەڵەیەکی گەورەشیان کرد بەو شێوەیە دژی ئیسلام وەستان .. ئەوەبوو لە هەموو دووردگەدا ئەوان دوور خرابوونەوە و ، تەنیایی و بێکەسییان پێوە دیار بوو .. سەرەنجام پیاوێکی ژیریان ، کە ناوی عەمری کوڕی ئومەییە بوو ، هەستی کرد کە ئەگەر ثەقیفیش موسڵمانبوونی خۆی نەگەیەنێ تووشی مەترسیی ئەبێت و لەوانەشە تیا بچێ . چونکە هۆزەکان هەموویان موسڵمان بوبوون و ، ئەگونجا بچن بە گژی هەوازین‌دا ، بە تایبەت سەرداری موسڵمانبوویان مالیکی کوڕی عەوف کە پەیتا پەیتا هێرشی ئەکردە سەریان .

عەمری کوڕی ئومەییە لەگەڵ عەبدیالەیلی[٣٠٥] سەرداری دووهەمی ثەقیف شتێك لە نێوانیاندا ڕووی دا بوو و ، دەنگیان لە یەك وەرگرتبوو . بەڵام عەمر ئەوەی خستە پشت گوێ و هەوڵی دا لەگەڵ عەبدیالەیل ڕێك بکەون . عەمر یەکجار ژیر و خەمخۆر بوو .. ئەشیزانیی هۆزەکەی لە تیاچوون‌دایە .. بۆیە بەرەو ماڵی عەبدیالەیل کەوتە ڕێ . کە گەیشتە ماڵەکەی پیاوی نارده لای عەبدیالەیل کە با بێتە دەرەوە.

---

[٣٠٥] عەبدیالەیل کوڕی عەمری کوڕی عومەیری ثەقەفی‌یە . سەرداری نەوەی مالیك بووە و، سەرۆکی ئەو نوێنەرانەش بوو کە ڕۆیشتن بۆ مەدینە بۆ ئەوەی موسڵمانبوونی ثەقیف ڕابگەیەنن . لە پێشەوە ثەقیف ئەیانەوێ عەبدیالەیل بنێرن بۆ مەدینە . بەڵام عەبدیالەیل ناڕەزایی دەربڕیی و ترسا ئەویش وەك عورووە بکوژن . ئەوەبوو پێنج کەسیان لەگەڵیا نارد کە ئەمانە بوون : عوثمانی کوڕی ئەبولعاص و ، ئەوسی کوڕی عەوف و ، نومەیری کوڕی خەرشە و، حەکەمی کوڕی عەمر و ، شورەحبیلی کوڕی غەیلانی کوڕی سەلەمە . هەر هەموویان بە چاکیی موسڵمان بوون و، گەڕانەوە ناو [illegible] و ، ئەوانیش هەر هەموویان موسڵمان بوون .

کە نێرراوەکە هەواڵی هاتنی عەمری بە عەبدیالەیل گەیاند سەری سووڕما ئەما بۆیە پرسیی : ماڵت ئاوا بێ ! عەمر ناردووتی بۆ لام ؟ وتی : بەڵێ ئەوەتا لە ماڵەکەتدا وەستاوە.

عەبدیالەیلیش پێی خۆش بوو لەگەڵ عەمردا ئاشت ببنەوە ، بەڵام پێی ناخۆش بوو دەستپێشخەریی بکات و بچێت بۆ لای عەمر . عەبدیالەیل بە بیریدا نەئەهات کە عەمر شتی وەها بکات و بێت بۆ ماڵی ئەو .. دیارە شتێکی گرنگ رووی داوە .

عەبدیالەیل چووە دەرەوە بۆ لای عەمر و بەخێرهاتنێکی گەرمی لێ کرد . عەمریش هەڵوێستی ناسکی ثەقیفی بۆ باس کرد ، کەوا ئیسلام دەورەی داون و ، کاتی ئەوە نیە ناکۆکیی نێوان خۆیان بخوێننەوە . هەموو هۆزەکان موسڵمان بوون و ، ئەمانیش توانایان نیە بچن بە گژی هەموویاندا . عەمر ئەوەشی باس کرد کە هەوازین لە ناوچەیەکی زۆردا بلاوەیان لێ کردووە ، بەڵام ثەقیف لە قەلای طائیفدا خۆی قایم کردووە . جا چۆن ئەبێ واز لەو هەمووە خەڵکە بهێنرێ موسڵمانەکان دەستیان لێ بووەشێنن ؟ یان ئەوە کەی ژیانە ئەمانیش ناتوانن بستێك لە قەلاکەیان دوور بکەونەوە ؟

عەبدیالەیلیش رای گەیاند کە هەمان رای بووە ، بەلام ئەو هەنگاوەی عەمر ناویەتی ئەمنەیتوانیوە بینێ .

بۆ ئەمە گەورە پیاوان و ناودارانی ثەقیفیان بۆ کۆنگرەیەکی گشتیی بانگ کردن و، هەر هەموو هاتنە سەر ئەوە کە خۆیان لەو تەنیاییيە رزگار بکەن . بەمە بڕیاری موسڵمانبوونیان دا ..

دوای ئەوەش بڕیاریان دا کە نێرراوێکی تایبەتیی بنێرنە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە تا دەربارەی موسڵمانبوونی ثەقیف وتووێژی لەگەڵدا بکات . ئەوەبوو عەبدیالەیلیان هەڵ بژارد ، کە ئەو رۆژە لە پلە و پایە و تەمەنی عوروەی کوڕی مەسعووددا بوو ..

شایانی باسە کە پێش کۆچکردن بۆ مەدینە پێغەمبەری خوا ﷺ لە تاو سزا و ئازاری قوڕەیش سەردانێکی طائیفی کرد ، بەو هیوایەی کە خەڵکەکەی باوەش بۆ ئیسلام بکەنەوە . ئەمەش دوای کۆچی دوایی ئەبوطالیب و خەدیجە بوو . کەچیی عەبدیالەیل و براکەی وەك رێزیان لێ نەگرت ، منالی مەردومیان لێ هان دا تا بەردبارانی بکەن و ، سزا و ئازارێکی زۆری پێ بچێژن .

عەبدیالەیل داوای لە ثەقیف کرد کە چاوپۆشیی لەو بکەن و ئەو ئەرکەی پێ نەسپێرن ، ئەمەش وەنەبێ لە ترسی ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆڵەی لێ بکاتەوە ، چونکە ئەویش و هەموو عەرەب و عەجەمیش ئەیانزانیی کە ئەو زاتە موبارەکە تۆڵەی خۆی لە هیچ کەسێك ناسەنێتەوە و ، بەرامبەر بە هەر خراپەیەك چاکە ئەنجام ئەدات . بەلاَم لە ترسی ثەقیف نەیئەوێرا ئەو ئەرکە بەجێ بێنێ . ئەترسا ئەویش وەك عوروە شەهید بکەن .

بەلاَم ثەقیف کۆڵیان نەدا و ، لەسەر داوای خۆیان سوور بوون کە ئەبێ ئەو ئەرکە بگرێتە ئەستۆ . ئەویش ناچار بوو بە گوێیان بکات بەو مەرجەی کە لە هەر بنەماڵەیەك پیاوێکی لەگەڵدا بنێرن .

هەموو بنەماڵەکانی ثەقیف ڕەزامەندییان بۆ ئەم داوایەی عەبدیالەیل نواند . ئەوەبوو بڕیاریان دا کە هەردوو هۆزە سەرەکی‌یەکەی ثەقیف ، کە ئەحلاف و نەوەی مالیك بوون ، هەر یەکە سێ پیاو بۆ ئەم کارە هەڵ ببژێرن .. سێ پیاو لە ئەحلاف و سیان لە نەوەی مالیك ، بە مەرجێ عەبدیالەیل ، کە لە نەوەی مالیك بوو ، سەرۆکی نوێنەرەکان بێت .

مەبەستی عەبدیالەیل لە بەشدارکردنی عەشیرەتەکان لە پرۆژەی وت و وێژکردنیان لەگەڵ موسڵمانەکاندا بۆ ئەوە بوو کە هەر یەکە لەو پیاوانە قەدەغەی هەر بەرهەڵستی‌یەك بکات کە بنەماڵەکەی دژی عەبدیالەیل ئەنجامی بدا ، دوای ئەوەی کە لە مەدینە ئەگەڕێنەوە و ، لەسەر موسڵمان بوون بە ناوی ئەوانەوە بەیعەت بە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەدات .

ثەقیف بڕیاریان دا عەبدیالەیل بکەنە سەرۆکی نوێنەرەکانیان . ئەوەبوو لەگەڵ عەبدیالەیلدا حەکەمی کوڕی عەمر و شورەحبیلی کوڕی غەیلانیان [٣٠٦] ناردن ، کە ئەمانە لە ئەحلاف بوون و دەستەی عوروە بوون . هەروەها لە نەوەی مالیکیش عوثمانی کوڕی ئەبولعاص و ، [٣٠٧] ئەوسی کوڕی عەوف و ، [٣٠٨] نومەیری کوڕی

---

[٣٠٦] شورەحبیلی کوڕی غەیلان ، بە چاکیی موسڵمان بووە و ، لە طائیف نیشتەجێ بووە . فەرموودەشی ریوات کردووە . باوکیشی بە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتووە و پلەی هاوەڵێتیی هەیە . ساڵی شەصت کۆچی دوایی کردووە .

[٣٠٧] عوثمانی کوڕی ئەبولعاص لەلایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ کراوە بە کاربەدەستی طائیف و هەروا لەوێ ماوەتەوە تا دوو ساڵ لە خەلافەتی عومەر . پاشان عومەر ئەی‌کاتە کاربەدەستی عومان و بەحرەین . لەوێوە لە ساڵی بیست و یەكدا ئەچێ بۆ تووج و فەتحی ئەکات و شەهرەکی پادشای ئەکوژێت . عوثمان بەشداریی جیهادی زۆر کردووە . ئەوەبوو

خەرشەیان هەڵ بژاردن . ئەڵێن ئەو نوێنەرانە لە دە کەس زیاتر بوون ، کە یەکێکیان سوفیانی کوڕی عەبدوڵلایە .[٣٠٩]

عەبدیالەیل بە سەرۆکایەتیی نوێنەرەکان بەرەو باکووری خۆرئاوا ، بەرەو مەدینە کەوتنە ڕێ ، تا بڕیاری گەورە پیاوانی ثەقیف بە پێغەمبەری خوا ﷺ بگەیەنن ، کە بریتی‌یە لە پشت هەڵ کردن لە بت پەرستیی و ڕوونان لە ئیسلامی بێ‌گەرد.

ئەمەش یەکێك بووە لە نیشانەکانی پێغەمبەرایەتیی ئازیز ، چونکە کاتێك کە پێغەمبەری ئیسلام ﷺ ئابڵووقەی لەسەر طائیف هەڵ گرت و گەڕایەوە ، دوعای هیدایەتی بۆ کردن و لە خوا پاڕایەوە بەرەو ئیسلام بیانهێنێ .

ئەم ڕۆژە لە کوێ کە عەبدیالەیل هاتووە بۆ موسڵمان بوون و ، ئەو ڕۆژەش لە کوێ کە بە گاڵتە و سووکایەتی‌یەوە ئەی‌وت : بەرگی کەعبەی داماڵیبێ و فڕێی دابێ ئەگەر خوا ئەوی بە پێغەمبەر ناردبێ . هەروەها مەسعوودی کوڕی عەمری برایشی ئەی‌وت : ئیتر خوا کەسێکی تری نەدۆزی‌یەوە بی‌کاتە پێغەمبەر جگە لە تۆ ؟ حەبیبی کوڕی عەمری برایشی ئەی‌وت : بەخوا هەرگیز قسەت لەگەڵ ناکەم ، چونکە ئەگەر وەك خۆت ئەڵێی لەلایەن خواوە ڕەوانە کرابی ، ئەوا لەوە زیاتری کە من وەڵامی قسەت بدەمەوە و ، ئەگەر درۆش بۆ خوا هەڵ ببەستی ئەوا پێویست ناکات قسەت لەگەڵدا بکەم .

---

بە هاویندا جیهادی ئەکرد و بە زستانیشدا ئەهاتەوە تووج . دوای کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ عوثمان لە طائیف دا دەورێکی پیاوانەی بینیوە . ئەوەبوو سەرانسەری دوورگە جگە لە مەککە و مەدینە و طائیف لە ئیسلام هەڵ گەڕایەوە ، بەلام بە هۆی ژیریی و سەلیقەی عوثمانەوە ، کە بە جوانیی گوێ‌ڕایەڵیی بۆ ئەکرا ، لە طائیف دا هەڵ گەڕانەوە ڕووی نەدا . یەکێ بووە لەو هاوەڵە ناودارانەی کە زانایانی فەرموودە فەرموودەیان لێیانەوە گێڕاوەتەوە ، ئیمام حەسەنی بەصریی یەکێ بووە لەوانەی کە فەرموودەیان لێیەوە ڕیوایەت کردووە . عوثمان نیشتەجێی بەصرە بوو .

[٣٠٨] لە ( أسد الغابة ) دا وا هاتووە کە ناوی ئەوسی کوڕی حوذەیفە بێت . ئەمیش فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ ڕیوایەت کردووە .

[٣٠٩] سوفیانی کوڕی عەبدوڵلا یەکێ بووە لەو هاوەڵانەی کە خەلیفە عومەر خوا لێی ڕازیی بێ پشتی پێ بەستوون . دوای ئەوەی کە عوثمانی کوڕی ئەبولعاص ی لە طائیفەوە نەقڵی عومان و بەحرەین کرد ، سوفیانی کردە کاربەدەستی طائیف . خەڵکێکی زۆر فەرموودەیان لە دەم وەرگرتووە ، بە تایبەت ئەو فەرموودە پەروەردەیی‌یە مەزنە بەناوبانگەی کە عوروەی کوڕی زوبەیر لێی ڕیوایەت ئەکات ، کە یەکێکە لە ( الأربعين النواوية ) کە تیایا سوفیان ئەڵێت : وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ! دەربارەی ئیسلام فەرمایشتێکم پێ بڵێ کە دوای خۆت پرسیار لە کەسێکی تر نەکەم . فەرمووی: (( قل آمنتُ بالله عزوجل ثم استقم )) . فەرمووی : بڵێ : ئیمانم بە خوای بالادەست هێنا و ، پاشان ڕاست ڕێگا بگرە بەر ..

عەبدیالەیل و هاوەڵانی لە مانگی رەمەزانی ساڵی نۆهەمی کۆچیی‌دا و ، دوای گەڕانەوەی سوپای ئیسلام لە غەزای تەبووك ، گەیشتنە ( وادي القناة ) لە قەراغی مەدینە ، ئەوسا یەکێ لە هاوەڵان پێی زانین و ناسینی کە ئەمانە بۆ موسڵمان بوون هاتوون ، ئەویش موغیرەی کوڕی شوعبە بوو . موغیرە ویستی بە پەلە خۆی بگەیەنێتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و مژدەی پێ بدا ، چونکە چ پێغەمبەر و چ هاوەڵان بە هاتنی پیاوانی ثەقیف زۆر دڵ خۆش ئەبن .

بەر لەوەی موغیرە بگاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ، تووشی ئەبوبەکر بوو و ، ئەبوبەکر داوای لە موغیرە کرد پێش نەکەوێ تا خۆی ئەو هەواڵە پڕ خۆشی‌یە بگەیەنێ . موغیرە ئەبوبەکری پێش خست و خۆی لە دەرگا وەستا ، پاشان چووە ژوورەوە .

موغیرە بە پەلە گەڕایەوە بۆ لای نوێنەرەکان ، تا یارمەتی‌یان بدات و ، هەندێ ئاداب و خووڕەوشتی جوانیان پیشان بدا و ، فێریان بکات چۆن سەلام لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن ، چونکە کۆمەڵە ئەعرابی‌یەکی وشکی هیچ نەزان بوون و ، لە دوڕندەوە نزیك بوون .

پیاوە ثەقەفی‌یەکان یەکجار دواکەوتوو و نەزانکار بوون .. لە لایەکەوە هەموو هۆزەکانی دوورگە ساڵەهای ساڵە لە ئیسلام گەیشتوون و شوێنی کەوتوون ، کەچیی هێشتا ئەمان لەسەر بت‌پەرستیی ماونەتەوە . لە لایەکی ترەوە کە هاتوون موسڵمان بن ، ئەیانەوێ بە مەرجی تایبەتیی خۆیان موسڵمان بن .. هەروەك ئەوان سەرکەوتبن و سوپای ئیسلام ناچار بکەن بەگوێ‌یان بکات .. لە لایەکی ترەوە مەرجەکانیان دژی بناغەی ئیسلام بوون و هەرگیز شتی وەها نەئەگونجا . بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ بە ژیرانە لەگەڵیان رۆی هەتا لە نەزانکاری‌یەکانیان کۆڵیان دا و ، ئیمانیان هێنا ..

هەرچەندە موغیرە هەندێ شتی فێر کردن کە یەکێ لەوانە سەلامکردنی موسڵمانانە بوو ، کەچیی کە گەیشتنە بەرەوە بە سەلامی سەردەمی نەفامیی ( عم صباحاً ) سەلامیان کرد .

بەڵام لە هەمووی سەیرتر ئەوەبوو کە لە قوناغی یەکەمدا پیاوە ثەقەفی‌یەکان نەهاتنە مەدینەوە و بە خزمەتی پێغەمبەری خوا بگەن و ، وەك نوێنەرانی هۆزەکانی تر موسڵمانبوونی خۆیان و عەشیرەتەکانیان رابگەیەنن ، بەڵکو هەر لە ( وادي القناة ) لە دەرەوەی مەدینە مانەوە و ، یەکێ لە هاوەڵان ، کە ئەویش خالیدی کوڕی

سەعیدی کوڕی عاص بوو [٣١٠] ، لە نێوانیاندا هات و چۆی ئەکرد و هەر مەرج و وتەیەکیان هەبوو ئەی گەیاندە پێغەمبەری خوا و وەڵامی ئەمیشی ئەبردەوە بۆیان .

پیاوە ثەقەفی یەکان میوانی پێغەمبەری خوا بوون و ، بە فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینەوە خواردنیان بۆ ئەبرا بۆ ئەوێ کەچیی ئەو نەگبەتانە ئەوەندە وشك و زبر بوون دڵیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ بە گومان بوو و هەتا خالیدی کوڕی سەعید لە نانەکەی نەخواردایە ئەوان نەیان ئەوێرا لێی بخۆن .

ثەقیف بۆ موسڵمانبوونیان پێنج مەرجیان دانا بوو ، کە ئەوپەڕی دواکەوتوویی ئەگەیاند کە ئەمانە بوون :

١ ـ ماوەی زیناکردنیان بدرێت .

٢ ـ ماوەی سووخواردنیان بدرێت .

٣ ـ ماوەی عەرەق خواردەنەوەیان بدرێت .

٤ـ نوێژیان لەسەر لا ببرێت .

٥ ـ شکاندنی ( لات ) کە بتە گەورەیان بوو سێ ساڵ دوا بخرێت .

بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ هەر هەموو مەرجەکانی دانە دواوە چونکە هەر هەموویان دژی بنچینەکانی ئیسلام بوون .

دوای ماوەیەك هاتنە بەقیع و بوونە میوانی موغیرەی کوڕی شوعبەی ثەقەفیی و ، پاشان هاتنە مزگەوت و چادریان بۆ هەڵ درا و گوێیان لە قورئان خوێندنی شەونوێژی هاوەڵان ئەبوو .

پیاوەکانی ثەقیف هەموو رۆژێك کە ئەهاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ عوثمانی کوڕی ئەبولعاصیان لەلای کەل و پەلەکەیان بەجێ ئەهێشت چونکە لە

---

[٣١٠] خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاصی کوڕی ئومەییەی کوڕی عەبدشەمسی کوڕی عەبدمەناف بووە . دایکی لە هۆزی ثەقیفە . خالید یەکێ بووە لەوانەی کە لە سەرەتای هاتنی وەحی یەوە موسڵمان بووە . دوای ئەبوبەکری صدیق موسڵمان بووە . ئوم خالیدی کچی خالیدی کوڕی سەعید ئەڵێت : باوکم پێنجەم کەس بووە لە موسڵمانێتیی دا . لێی ئەپرسن : کێ پێشی کەوتووە ؟ ئەڵێت : عەلیی کوڕی ئەبوطالیب و ئەبوبەکر و زەیدی کوڕی حاریثە و سەعدی کوڕی ئەبووەققاص خوا لێیان رازیی بێ . خالید هەردوو کۆچەکەی کردوون . یەکێ بووە لە کاربەدەستانی پێغەمبەر و کاتێ کە پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کرد خالید کاربەدەستی یەمەن بوو . خالیدی کوڕی سەعید یەکەم فەرماندەیەك بوو لە سەردەمی ئەبوبەکردا سوپا بگەیەنێتە شام بۆ جیهادکردن . ئەوەبوو رۆمەکان لە نزیك دیمەشق دا تەنگیان بە خۆی و سوپاکەی هەڵ چنیی و گەڕایەوە دوا .. هەندێ ئەڵێن : لە جەنگی ئەجنادین دا و لە سەردەمی خەلافەتی عومەردا شەهید بووە و هی وایش هەیە ئەڵێ لە جەنگی ( مرج الصفر ) لە نزیك دیمەشق دا شەهید بووە ، لە کاتێك دا کە فەرماندەی جەنگی یەکەم ئەبێت لە دژی رۆمەکان .

هەموویان بچووکتر بوو . جا کە ئەوان ئەگەڕانەوە و نیوەڕۆ خەویان ئەکرد عوثمان کە گەنجێکی ژیر و وریا بوو ئەچووە خزمەتی پێغەمبەری خوا و دەربارەی دین پرسیاری لێ ئەکرد و ، داواشی ئەکرد قورئانی بۆ بخوێنێ . عوثمان بە نهێنیی ، بێ ئەوەی هاوەڵانی بزانن موسڵمان بوو . چەند جارێك بە خزمەتی ئازیز گەیشت و شارەزای دین بوو و ، چەند سوورەتێکیش قورئانی لای پێغەمبەری خوا ﷺ خوێند و ، ئەگەر رۆژێکیش پێغەمبەری خوا ﷺ بخەوتایە ئەچوو بۆ لای ئەبوبەکر یان بۆ لای ئوبەی کوڕی کەعب . پێش ئەوەی هاوەڵانی موسڵمان بن ئەو بەیعەتی بە پێغەمبەری خوا دا و، پێغەمبەریش ﷺ دڵی پێی خۆش بوو و یەکجار خۆشی ئەویست .

دوای وت و وێژێکی زۆر کە چەندین رۆژی خایاند ثەقەفی‌یەکان هیچ مەرجێکیان لێ وەرنەگیرا و ، سەرەنجام هاتنە سەر رای سوفیانی کوڕی عەبدوڵلای هاوەڵیان . ئەوەبوو زینا و ریبا و عەرەق خواردنەوەیان داوا کرد و ، ماوەیان پێ نەدرا ، ئیتر عەبدیالەیل ناڕەزایی دەربڕیی ، چونکە رای وابوو کە ثەقیف ناتوانن عەرەق و زینا و ریبا لەسەر خۆیان حەرام بکەن . بەڵام سوفیانی کوڕی عەبدوڵلا ئەوەی دایە دەست خوا تا هیدایەتی خەڵکەکە بدات ، ئەو هەمووە عەرەبەی دوورگەش کە موسڵمان بوون ، وەکو ئەوان وابوون و ئەو شتانەیان واز لێ هێناوە .. بەم شێوەیە ثەقیف بەبێ هیچ مەرجێك موسڵمان بوون و ، بە موسڵمان بوونی ئەوان لە دوورگەدا هیچ هێزێك نەما رووبەڕووی موسڵمانەکان بوەستێ . دوای ئەوە لە هەموو لایەکی دوورگەوە خەڵکیی رووی کردە مەدینە بۆ موسڵمان بوون .

دوای ئەوەی کە پیاوە ثەقەفی‌یەکان موسڵمان بوون وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ! پیاوێك بکە بە ئەمیرمان هەتا ببێتە پێشەوامان . جا لەبەر ئەوەی کە شارەزابوون لە دین و لێهاتنی کار لە ئیسلامدا پێوانەن بۆ کاربەدەستیی ، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ هەر لەو کۆمەڵە پیاوە ئەمیری بۆ هەڵ بژاردن ، کە ئەویش عوثمانی کوڕی ئەبولعاص بوو ، هەر چەندە تەمەن کەمترینی نوێنەرەکان بوو . ئەوەندە هەبوو کە عوثمان پێش هەموویان موسڵمان بوو بوو و ، لە هەمووشیان زیاتر ئامادەیی تێدا بوو بۆ فێربوونی و قورئان و شارەزابوون لە دین . کردیە ئەمیری هەموو طائیف و ، دوای ئەوە کۆمەڵێك ئامۆژگاریی گرنگی ئەکات . عوثمان ئەڵێت : دوا ئامۆژگاریی پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئامۆژگارییمی کرد ئەوەبوو کە بانگ وێژێك دیاریی بکە کە

لەسەر بانگدانەکەی کریێ وەرنەگریێ و ، ئەگەر ئیمامەتیشت بۆ کۆمەڵێك کرد ئەندازەی لاوازترینیان وەربگرە و ، گەر بۆ خۆت نوێژت کرد با بە ویستی خۆت بێت .

ئەبوبەکریش خوا لێی ڕازیی بێ ستایشی عوثمانی کوڕی ئەبولعاصی کرد و فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ! من ئەم گەنجەم لەناویانا بەرچاو کەوتووە کە لە هەموویان سوورترە بۆ شارەزابوون لە ئیسلام و فێربوونی قورئان .

لە ڕیوایەتێکی تردا عوثمانی کوڕی ئەبولعاص ئەڵێت : کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ کردمیە کاربەدەستی ثەقیف ، دوا ئامۆژگاریی کە کردمی ئەمە بوو کە فەرمووی: ((یا عثمان ! تجاوز في الصلاة ، واقدر الناس بأضعفهم ، فإن فیهم الکبیر والصغیر والضعیف وذا الحاجة )) . فەرمووی : عوثمان ! درێژە بە نوێژ مەدە . بە پێی لاوازترینی ئەو خەڵکە بجوولێرەوە ، چونکە هەیانە پیر و منداڵ و لاواز و خاوەن کاروبارە .

دوای ئەوە نووسراوێك لە نێوان هەردوولادا نووسرا و ، ئیتر ثەقەفی‌یەکان گەڕانەوە ناو هۆزەکانیان . ئەوانیش بە ئاسانیی ئیسلامیان وەرنەگرت . بەڵام نوێنەرەکان بە نەرمیی و بە ژیریی لە گەڵیان هاتن هەتا هەر هەموویان ئیسلامیان وەرگرت .[٣١١]

**دووهەم : شکاندنی ( لات )**

دوای ئەوەی کە ثەقیف موسڵمان بوون ، کاتی شکاندنی بتە گەورەکەی طائیف هات کە ناوی ( لات ) بوو . لە قورئانی پیرۆزدا ناوی ئەم بتە هاتووە . خوای گەورە ئەفەرمویێ :

﴿ أَفَرَءَيْتُمُ ٱللَّٰتَ وَٱلْعُزَّىٰ ﴿١٩﴾ وَمَنَوٰةَ ٱلثَّالِثَةَ ٱلْأُخْرَىٰٓ ﴿٢٠﴾ أَلَكُمُ ٱلذَّكَرُ وَلَهُ ٱلْأُنثَىٰ ﴿٢١﴾ تِلْكَ إِذًا قِسْمَةٌ ضِيزَىٰٓ ﴿٢٢﴾ إِنْ هِىَ إِلَّآ أَسْمَآءٌ سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَٰنٍ ۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَمَا تَهْوَى ٱلْأَنفُسُ ۖ وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّن رَّبِّهِمُ ٱلْهُدَىٰٓ ﴾ ( النجم : ١٩ ـ ٢٣ ).

( لات ) ناوی پیاوێکی صالح بووە ، کە لە دێرین زەماندا لەسەر ڕێی حاجی‌یان ئەوەستا و خۆراکی بە موحتاجان ئەدا و ، سەویقی بۆ ئەشێلان . جا بە عەرەبیی ئەڵێت : ( یلتُّ لهم السویق ) ، بەمە بکەری ئەو کارە پێیان ئەوت ( لات ) . لەو کاتەدا کە لات خێر و چاکەی ئەکرد ، خەڵکەکەش لەسەر دینی پاکی ئیبراهیم بوون،

---

[٣١١] غزوة حنين لباشميل : ٣١٠ ـ ٣٣٢ ، الرحيق المختوم : ٤٦٢ ـ ٤٦٣ ، السيرة النبوية للصلابي : ٨٥٠ ـ ٨٥٣، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٥٢٨ ـ٥٣٠ ، السيرة النبوية للندوي : ٣٨٧ ـ ٣٨٩ .

کاتێك کە کۆچی دوایی کرد قەومەکەی لەسەر قەبرەکەی نیشانەیەکیان دانا و هەموو جارێك بۆ ڕێز و پیرۆزیی سەریان لێ ئەدا . بەرە بەرە جەهالەت پەرەی سەند و ( لات ) ی پیاوچاك کرایە بت و ئەپەرسترا و ، ئەهاتنە سەری دوعایان ئەکرد و تەوافیان ئەکرد و ئاژەڵیان سەر ئەبڕیی و نەزریان بۆ ئەکرد ، بەڵام بەو شێوەی کە ئەمە پیاوچاکە و لای خوا نزیکیان ئەخاتەوە .

ئەم بتە لە هەموو بتەکانی تری دوورگەی عەرەبیی لە دڵی عەرەبەکاندا پایەدارتر بوو . بۆیە کە پیاوە ثەقەفی یەکان لە مەدینە موسڵمان بوون ، هەستیان ئەکرد کە کارێکی یەکجار گرانە قەناعەت بە هۆزی ثەقیف بکرێ پشت لە لات بکەن ، یان ڕێگە بدەن کەسێك بە خراپە دەستی بۆ بەرێت . خۆ دیارە بۆ سەلماندنی ئەوەی کە موسڵمان بوونەکەیان راستە پێویستە لات بشکێنن .

لەبەر ئەم ترسە عەبدیالەیل و هاوەڵانی داوایان لە پێغەمبەر ﷺ کرد تا ماوەی سێ ساڵ لە لات بگەڕێن و نەی‌شکێنن ، تا خەڵکەکە دەست بەرداری بن و ، دڵیان وابەستەی ئیسلام ببێت . بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ کۆڵی نەدا و ، لەسەر شکاندنی سوور بوو ، چونکە هەتا مایە ڕێز و تەقدیسی لە دڵی عەرەبە بت پەرستەکاندا ریشەکەن نەئەبوو . بەڵکو بڕیاری دا ئەبێ شکاندنی لات یەکەم کارێك بێت ئەو پیاوانە ئەنجامی بدەن ، دوای موسڵمان بوون و گەڕانەوەیان .

ثەقەفی یەکان ناچار بوون دەست لە لات بشۆن و بە شکاندنی رازیی بن ، بەڵام لە پێغەمبەری خوا ﷺ پاڕانەوە کە چاوپۆشیی لەوە بکات کە ئەمان خۆیان بی‌شکێنن ، چونکە ئەترسن جەماوەری ثەقیف لێیان راپەڕێ . جا لەبەر ئەوەی کە ئەمە زیانێکی نەبوو ڕەزامەندیی لەسەر نواند .

ثەقەفی یەکان گەڕانەوە و ، پێغەمبەری خوایش ﷺ شکاندنی لات ی خستە ئەستۆی ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب و موغیرەی کوڕی شوعبە . ئەوەبوو بۆ ئەنجام‌دانی ئەو کارە هەردووکیان روویان لە طائیف نا .

بەر لەوەی ئەبوسوفیان و موغیرە بگەنە طائیف ، عەبدیالەیل و هاوەڵانی گەیشتن. کە نزیکی شار کەوتنەوە ، عەبدیالەیل وتی : من لە هەموو کەس زیاتر ثەقیف ئەناسم ، باسەکەیان بەلاوە مەدرکێنن ، بەڵکو بە جەنگ و کوشتار بیان‌ترسێنن و ، هەواڵی ئەوەیان بدەنێ کە موحەممەد چەند شتێکی لێمان داوا کرد کە بە لای ئێمەوە

ئەو شتانە گرانبوون و ئێمە ملمان پێی نەدا .. داواشمان لێ ئەکات کە زینا و عەرەق حەرام بکەین و ، واز لە سووخواردن بێنین و ، لاتیش تێك بشکێنین .

کە نوێنەرەکان نزیك کەوتنەوە ثەقیف هاتن بە پیریانەوە . کە نوێنەرەکان ئەوەیان دیی لەسەر خۆ ئەڕۆیشتن و ، خۆیان وا دەرخست کە خەمبارن و ، بە هەواڵی چاکەوە نەگەڕاونەتەوە . کە ثەقیف ئەوەیان دیی ئەوانیش خەمبار بوون و هەستیان کرد کە هەواڵی خۆشیان لا نیە .

نوێنەران گەیشتنە لای لات ، دیارە کە ئەوان موسڵمان بوون نابێ تەقدیسی بکەن، ئاوڕێکیان بەلایەوە نەدا و ، ثەقیفیش کەوتنە گومانەوە و وتیان : ئەڵێی هیچ پەیوەندی‌یەکیان پێیەوە نەبووە و نەشیان دیوە . پاشان هەر یەکە گەڕایەوە ناو کەس و کاری خۆی .

پاشان کۆمەڵێکیان هاتنە لای نوێنەرەکان بزانن چی‌یان پێ‌یە . ئەوانیش مۆڵەتیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ وەرگرتبوو کە ئەگەر شتێك بڵێن .

وتیان : لەلایەن پیاوێکی ڕەق و تووڕەوە هاتووینەتەوە لاتان .. چۆنی بوێ وەها کاری خۆی ئەنجام ئەدا .. بە شمشێر زاڵ بووە و ، عەرەبی زەلیل کردووە و، خەڵکیی ملی بۆ کەچ کردووە ، هەتا ڕۆمەکانیش لە قەلاکانیان‌دا سامی ئەویان لێ نیشتووە . خەڵکەکەش یا ئەوەتا حەزی لە دینەکەیەتی ، یان لە شمشێر ئەترسێ . چەند کارێکی گرانی خستە بەر دەمان کە ئێمە بە لامانەوە قورس بوون و بۆمان بەجێ هێشت . زینا و عەرەق و ریبای لێ حەرام کردین و لاتیش بشکێنین .

ثەقیف وتیان : هەرگیز ئەوە ناکەین .

نوێنەرەکان ثەقیفیان هەڵ نا تا خۆیان کۆك بکەن و خۆیان ئامادەی جەنگ بکەن.. دەبابە و مەنجەنیق ئامادە بکەن و خواردنی ساڵێك یان دوو ساڵ بەرنە ناو قەلاکانتانەوە و ، خەندەقیش بە دەوری قەلاکەتان‌دا هەڵ بکەنن .

ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ لەسەر ئەوەبوون کە جەنگ بکەن ، پاشان خوای گەورە ترسی خستە دڵیانەوە کە چاری سوپای ئیسلام ناکەن ، بۆیە داوایان لە نوێنەرەکان کرد بگەڕێنەوە و لەگەڵی ڕێك بکەون .

کە نوێنەرەکان دی‌یان وا ثەقیف رازیی بوون و ، ترسی پێغەمبەر چۆتە دڵیانەوە و، دڵیان چۆتە سەر ئیسلام ، وتیان : ئێمە لەگەڵیا ڕێك کەوتین و ، چیمان پێ خۆش بووە پێی داوین و ، چیمان ویستووە بە مەرج بۆی داناوین و ، سەرنجمان دا لە هەموو

کەسێ بە تەقواتر و ، چاکتر و ، خزم دۆست تر و ، بەوەفاتر و ، راستگۆتر و ، بەرەحمترە. بۆ شکاندنی لات‌یش وازیی لێمان هێنا و ، ئێمە ملمان بە شکاندنی نەدا.. خۆی پیاو ئەنێرێ بۆ شکاندنی .
پیرە پیاوێك کە خۆشەویستیی لات لە دڵیا مابوو وتی : بەخوا ئەوە مایەی راستیی نێوان ئێمە و ئەوە . ئەگەر توانیی تێکی بشکێنێ ئەوە ئەو لەسەر حەقە و ئێمە لەسەر بەتاڵین . خۆ ئەگەر لات خۆی بە دەستەوە نەدا ئەوا دەروونم شتێ لەمەی تێدا ماوە .
عوثمانی کوڕی ئەبولعاص وتی : دەروونت ناڕەوای بە لاوە جوان کردوویت و لە خۆت بایی بوویت ، لات چی‌یە ؟ لات نازانێ کێ ئەی‌پەرستێ و کێش نای‌پەرستێ ، هەروەك عوززا نەی‌ئەزانی کێ ئەی‌پەرستێ و کێش نای‌پەرستێ . خالیدی کوڕی وەلید هاتە سەری و تێکی شکاند . هەروەها ئیساف و نائیلە [312] و هوبەل [313] و مەنات تاقە پیاوێك هەمووی شکاندن . سواعیش تاقە پیاوێك چوو بۆی و شکاندی . ئایا هیچ کامیان توانیی خۆی بە دەستەوە نەدا ؟ پیاوە پیرەکە وتی : لات لە هیچێ لەوانەی کە باست کردن ناچێت . عوثمان وتی : ئەی‌بینیی .
لە پێشەوە باسمان کرد کە ئەبوسوفیان و موغیرەی کوڕی شوعبە شکاندنی لاتیان پێ سپێررا . ئەوەبوو گەیشتنە ئەوێ . موغیرە داوای لە ئەبوسوفیان کرد تا بچێتە پێشەوە و بی‌شکێنێ ، بەڵام ئەبوسوفیان وای بە چاك زانیی موغیرە پێش بکەوێ چونکە خەڵکی طائیفە و ، خزمەکانی بە چەکەوە ئەی‌پارێزن .
موغیرە لەگەڵ دە دوانزە پیاوی خزمی‌دا لە ( لات ) چوونە پێشەوە تا بتەکە و ئەو خانووبەرەیەی بە دەوری‌دا کرابوون بیانڕووخێنن . خەڵکێکی زۆر دەورەیان لە بتەکە دابوو ، بەڵام کە موغیرە دەستی دایە شکاندنی بتەکە لە دژی نەوەستان . خزمەکانی

[312] لە کتێبی ( الأصنام ) دا کەلبیی ئەوەی باس کردووە کە لەناو عەرەبەکان‌دا دووکەس بوون بە ناوی ئیساف و نائیلە و، بە بۆنەی خراپکاری‌یەوە بوو بوون بە دوو بەرد ، بۆ ئەوەی ببنە پەند و ئامۆژگاریی بۆ خەڵك . بەڵام کە رۆژگار تێپەڕیی و بتەکان پەرستران ئەوانیش لە دڵی خەڵك‌دا پیرۆز بوون و پەرستران و لێك نزیك خرانەوە و حەیوانیان لەبەردەم‌دا سەر ئەبڕیی .
[313] هەروەها هوبەل گەورەترین بتی قورەیش بووە ، کە لە عەقیقی سوور لە شێوەی مرۆڤدا دروست کرابوو و ، دەستی راستی شکابوو و ، لە ئاڵتوون دەستیان بۆ دروست کردبوو . لە رۆژی ئوحوددا ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب کە فەرماندەی سوپای قورەیش بوو بە دەنگی بەرز ئەی‌وت : أعلُ هبل . پێغەمبەری خوایش ﷺ فەرمووی : ( الله أعلى وأجل ) .

موغیرە ئەترسان لات دەستی لێ بووەشێنێ ، بۆیە لێی پاڕانەوە لە شکاندنی بگەڕێ ، بەڵام موغیرە گاڵتەی بەو شتانە ئەهات .
لەبەردەم ئەو هەمووە خەڵکەدا دەستی دایە پیکێك و سەرکەوتە سەر بتە گەورەکە هەتا گەیشتە تەوقە سەری . خەڵکەکە چاوەڕوان بوون لات دەست بوەشێنێ و موغیرە هەڵ دا .. کەچیی هیچ رووی نەدا .. سەریان لە موغیرە سوڕ ئەما کە ئەی‌دا بە تەوقە سەری بتەکەدا ..
مێژوونووسان ئەگێڕنەوە کە موغیرە ویستی بە دانیشتوانی طائیف پێ بکەنێ . موغیرە خۆی خست و وەك لە هۆشی خۆی بچێ خۆی بێ‌ئاگا کرد .. کە خەڵکەکە ئەوەیان بینیی ، بەوپەڕی خۆش‌حاڵی‌یەوە هاواریان ئەکرد : نەخێر ، واتان ئەگەیاند کە لات بەرگریی ناکات ، بەڵێ ، بەخوا بەرگریی ئەکات . موغیرە ماوەیەك وەستا ، پاشان خۆی رێك کرد و بە جوانیی دانیشت و وتی : ئەی کۆمەڵی ثەقیف ! عەرەب ئەیانوت : لە ناو هۆزەکانی عەرەبدا هیچ هۆزێك لە ثەقیف ژیرتر نیە ، بەڵام لەناو هۆزەکانی عەرەبدا هیچ هۆزێك لە ئێوە ئەحمەق‌تر نیە . ماڵتان کاول . لات و عوززا چین ؟ بەردێکن وەك ئەو بەردە نازانێ کێ ئەی‌پەرستێ و کێش نای‌پەرستێ. ماڵتان کاول . ئایا لات ئەبیستێ یان ئەبینێ یا سوودی هەیە یان زیانی هەیە؟ پاشان تێکی شکاند و چیی خشڵ و ئاڵتوون و زیوو بۆن‌خۆشیی لە بناغەکەی‌دا بوو دەریان هێنا.[٣١٤]

سێهەم : مردنی سەرۆکی نیفاق
چەند شەوێك لە مانگی شەووالی ساڵی نۆهەمی کۆچیی مابوون عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوولی سەرۆکی موونافیقانی مەدینە نەخۆش کەوت و لە مانگی ذولقەعیدەی هەمان ساڵدا مرد ..
ئوسامەی کوڕی زەید ئەڵێت : لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ چووین بۆ سەردانی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی بە بۆنەی نەخۆشی‌یەکەیەوە . پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو : ((قد كنت أنهاك عن حب يهود )) . فەرمووی : لە خۆش‌ویستنی جوولەکە

[٣١٤] غزوة حنين لباشميل : ٣٣٢ ـ ٣٤٧ ، السيرة النبوية للصلابي : ٨٥٣ ـ ٨٥٤ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٥٣٠ ـ ٥٣١ ، الرحيق : ٤٦٣ .

دووره‌په‌رێزییم ئه‌کردیت . عه‌بدوڵلاش وتی : خۆ ئه‌سعه‌دی کوڕی زوراره‌ش خۆشی نه‌ئه‌ویستن ، مردیش .

که عه‌بدوڵلای کوڕی ئوبه‌ی مرد ، کوڕه‌که‌ی که ناوی عه‌بدوڵلا بوو و ، هاوه‌ڵێکی زۆر ئیمان دامه‌زراو بوو ، هاته خزمه‌تی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ و داوای کراسه‌که‌ی ئه‌وی کرد تا بی‌داتێ و بی‌کاته که‌فه‌نی باوکی .. ئه‌ویش پێی دا . پاشان داوای لێ کرد که نوێژی له‌سه‌ر بکات . پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ هه‌ستا هه‌تا نوێژی له‌سه‌ر بکات ، که‌چیی عومه‌ر هه‌ستا و ، ده‌ستی دایه کراسه‌که‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ و فه‌رمووی: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ! نوێژی له‌سه‌ر ئه‌که‌یت و ، په‌روه‌ردگاریشت له نوێژ له‌سه‌رکردنی قه‌ده‌غه‌ی کردوویت ؟ پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رمووی: (( إنما خيَّرني فقال: ﴿ ٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لَا تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَـٰسِقِينَ ﴾ ( التوبة : ٨٠ ) ، وسأزيده على السبعين )) . فه‌رمووی : من سه‌رپشك كراوم ، چونكه خوا فه‌رموویه : داوای چاوپۆشی‌یان بۆ بكه یان بۆیان مه‌كه ، ئه‌گه‌ر حه‌فتا جار داوای لێ خۆش بوونیان بۆ بكه‌یت خوا لێیان خۆش نابێت چونكه ئه‌وان ئیمانیان به خوا و به پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی نه‌هێناوه و، خوای گه‌وره‌ش هیدایه‌تی فاسقان نادات . جا من له حه‌فتا جار زیاتریش داوای بۆ ئه‌كه‌م . عومه‌ر فه‌رمووی : ئه‌و مونافیقه . ئه‌ڵێت : پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ نوێژی له‌سه‌ر كرد ، ئه‌وه‌بوو خوا عزوجل ئایه‌تی : ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ﴾ ( التوبة : ٨٤ ) ی نارده خواره‌وه .

پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ له‌به‌ر ئه‌وه پێی خۆش بوو نوێژی له‌سه‌ر بكات ، چونكه به رواڵه‌ت موسڵمان بوو و ، له‌لایه‌كی تریشه‌وه بۆ رێزگرتن له عه‌بدوڵلای كوڕی ، كه نموونه‌ی ئیمان‌داری راسته‌قینه بوو و ، ئه‌وه‌بوو له دوای غه‌زای نه‌وه‌ی موصطه‌له‌ق ئاماده‌یی خۆی ده‌ربڕیی بۆ كوشتنی باوكی ئه‌گه‌ر پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رمان بدا .. هه‌روه‌ها بۆ دڵدانه‌وه‌ی خزمه‌كانی ، چونكه خه‌ڵكێكی زۆر له مونافیقان پشت‌گیریی كوڕی ئوبه‌ی‌یان ئه‌كرد . به‌و شێوازه هیوا ئه‌كرا واز له نیفاق بهێنن و ، به دڵسۆزیی به‌ندایه‌تیی بۆ خوا بكه‌ن .

بۆ كراسه‌كه‌ش كه پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ دای به كوڕه‌كه‌ی عه‌بدوڵلا ، كه ئه‌و داوای كرد بۆ سه‌خاوه‌تی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ نه‌ئه‌شیا نه‌ی‌داتێ ، چونكه هه‌ر شتێكی داوا

لێ کرابێ ، هەرگیز دەستی نەناوە بە رووی هیچ کەسەوە . هەروەها عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵا پیاوەتی‌یەکی شەخسییشی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ کردبوو ، کە ئەوەبوو کاتێ عەبباسی مامەی پێغەمبەر لە بەدردا بە دیل گیرا بوو و هێنرابوویەوە مەدینە ئەو کراسەکەی خۆی پێشکەش کردبوو ، لەبەرخاتری ئەوە کە مامەی پێغەمبەری خوایە ، چونکە رەوشتی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئال و بەیتی وەها بووە کە چاکەیان بە چاکەی زیاتر پاداشت بدەنەوە .

بە مردنی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول مونافیقان لاواز بوون و ، دەستیان لەوە شۆرد کە دژایەتیی ئیسلام بکەن ، بە رادەیەك کە لە ساڵی دەهەمدا هیچ ناوێکیان نەما و تەنها ئەوانە مابوونەوە کە پێغەمبەر ﷺ بە نهێنیی ناویانی لای حوذەیفەی کوڕی یەمان درکاند بوو . ئەوەبوو لەوەو دوا عومەری کوڕی خەططاب خوا لێی رازیی بێ کە کەسێك لە مەدینەدا ئەمرد ، ئەگەر نەی ناسیبایە سەیری ئەکرد بزانێ حوذەیفە لەگەڵ جەنازەی مردووەکەدا هاتووە یان نا ، ئەگەر نەهاتایە ئەویش نوێژی لەسەر نەئەکرد .

ئەوەبوو سوورەتی ( التوبة ) ش لە نیوەی زیاتری باسی چەوتیی و فێڵ و تەڵەکەی مونافیقانی ئەکرد ، کە چۆن لە پێش تەبووك‌دا و ، لە کاتی غەزاکە و ، لە دوایشی‌دا مونافیقان ناپاکی‌یان لێ ئەوەشایەوە ، تا موسڵمانان ئاگایان لە پیلانەکانیان بێت .[٣١٥]

چوارەم : سەرپشك كردنی دایكانی ئیمان‌داران

پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵگری دینێك بوو کە لە ساڵی نۆهەمی کۆچیی‌دا سیی هەزار جەنگاوەری بەغیرەت لە دەوری جەم بوون و ، بڕیاریان دا لەو کاتە گەرمەدا و، بەو بیابانە دوور و درێژ و وشك و برینگەدا هەڵمەت بەرنە سەر ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی رۆم و سوپای رۆمیش تەمێ بکەن .

ئا ئەم سوپایە هەر سەربازێکی بە تەنیا سوپایەکە ..

لە هەمان کات‌دا ئەم کۆمەڵگا کە ئەم سەربازانەی هەڵ خستوون ئەوەندە گوێڕایەڵی فەرمانی خوا و پێغەمبەرە بۆ ماوەی پەنجا رۆژ تاقە کەسێکیان وشەیەکی لەگەڵ ئەو سێ کەسەدا نەوت کە فەرمان درابوو کەس قسەیان لەگەڵ نەکات ..

[٣١٥] السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٥٣٢ ـ ٥٣٤ ، السيرة النبوية للصلابي : ٨٥٤ ـ ٨٥٥ ، الرحيق المختوم: ٤٥٣.

له هه‌مان کات‌دا ساڵی پار ، بگره چه‌ند مانگێك له‌وه و به‌ر ، له جه‌نگی هه‌وازین و طائیف‌دا ده‌ست‌که‌وتێکی زۆر ده‌ست موسڵمانه‌کان که‌وت ، که‌چیی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ هێشتا هه‌ر هه‌ژاره و ، هاوسه‌ره‌کانی ژیان و گوزه‌رانیان تاڵخه، چونکه پێغه‌مبه‌ری خوایه و ، نابێ ده‌ست بداته کۆکردنه‌وه‌ی سه‌روه‌ت و سامان .

ژیان و گوزه‌رانیان ئه‌وه‌نده تاڵخ بوو ، که ئه‌و هاوسه‌ره ئیمان‌داره به‌ڕێزانه‌ی به‌رگه‌یان نه‌ئه‌گرت .. خۆ ئه‌وانیش به شێوه‌ی ئیمانیی و قیامه‌تیی بیریان له ژیان ئه‌کرده‌وه ، به‌ڵام به‌رگه‌یان نه‌ئه‌گرت ، چونکه جاری وا ئه‌بوو به مانگ و دوو مانگ ئاگر له ماڵی پێغه‌مبه‌ری خوادا ﷺ نه‌ئه‌کرایه‌وه بۆ چێشت لێ نان ..

بوخاریی و موسلیم له عورو‌ه‌وه ، له عائیشه‌وه خوا لێی رازیی بێ ریوایه‌تیان کردووه که ئه‌ی‌وت : به‌خوا ئه‌ی کوڕی خوشکم ( چونکه عوروه کوڕی زوبه‌یر و ئه‌سماء بووه و ، ئه‌سمائیش خوشکی عائیشه بووه ) چاومان به مانگی یه‌ك شه‌وه ، پاشان مانگێکی تر ، پاشان مانگێکی تر ئه‌که‌وت ، سێ جار مانگ نوێ ئه‌بوویه‌وه له دوو مانگ‌دا ، له ماڵه‌کانی پێغه‌مبه‌ری خوادا ﷺ ئاگر نه‌ئه‌کرایه‌وه . وتم : پورێ! ئه‌ی به چیی ئه‌ژیان ؟ وتی : هه‌ردوو ره‌شه‌که : خورما و ئاو ، به‌ڵام پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ چه‌ند دراوسێ‌یه‌کی ئه‌نصاری هه‌بوون ، که ئاژه‌ڵ‌دار بوون . ئه‌وه‌بوو له شیری ئه‌و ئاژه‌ڵانه‌یان بۆ پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ئه‌نارد و ، ئه‌ویش ده‌رخواردی ئیمه‌ی ئه‌دا..

( كذا في الترغيب : ٥/ ١٥٥ ) . وأخرجه أيضاً ابن جرير نحوه . وأخرجه أحمد ( في المسند : ٢ / ٤٠٥ ) بإسناد حسن ، والبزار عن أبي هريرة رضي الله عنه بمعناه كما في المجمع : ١٠ / ٣١٥ ) .

له ریوایه‌ته‌که‌ی ( إبن جرير ) دا عائیشه وتوویه : له‌و رۆژه‌وه که پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ته‌شریفی هێناوه‌ته مه‌دینه هه‌تا کۆچی دوایی کردووه ، سێ رۆژ له‌سه‌ر یه‌ك له نانی گه‌نم تێر نه‌بووه .

هه‌تا له ریوایه‌تێکی تردا وه‌ها هاتووه پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ هه‌تا کۆچی دوایی کردووه له خورما و ئاویش تێر نه‌بووه .

له ریوایه‌ته‌که‌ی به‌یهه‌قیی‌ش‌دا عائیشه وتوویه : سێ رۆژ له‌سه‌ر یه‌ك پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ تێر نه‌بووه ، خۆ ئه‌گه‌ر بمان‌ویستایه تێر ئه‌بووین ، به‌ڵام ئه‌و فه‌زڵی که‌سانی تری به‌سه‌ر خۆی‌دا ئه‌دا ..

به‌ڵێ ، له‌ناو کۆمه‌ڵگای مه‌دینه‌دا ده‌وڵه‌مه‌ندی زۆر هه‌بوون که خاوه‌نی مه‌ڕومالات و باخ‌وباخات بوون ، به‌ڵام پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ نه‌ی‌ئه‌ویست له‌سه‌ر هیچ

کەس ئەرك بێت . خۆ ئەگەر جارێکیش قاپێك شیریان بۆ نارد بێ ، یان دەرخواردی خاوخێزانی ، یان دەرخواردی هاوەڵانی ئەدا .

ئیمام ئەحمەد لە ( المسند : ٢ / ١٥ ) دا لە موجاهیدەوە تەخریجی کردووە کە ئەبوهورەیرە خوا لێی ڕازیی بێ ئەیوت : بەخوا ! لە برساندا خەریك بووم جگەرم ئەنووساند بە زەوی‌یەوە ، هەرچەندە لە برساندا بەردێکم بە توندیی بەستبوو بە سکمەوە . ڕۆژێکیان لەسەر ئەو ڕێگایە کە موسڵمانان هات وچۆی لێوە ئەکەن دانیشتم . ئەوەبوو ئەبوبەکر خوا لێی ڕازیی بێ تێپەڕیی و ، منیش دەربارەی ئایەتێکی قورئان پرسیارم لێ کرد . هەر بۆ ئەوە پرسیارم لێ کرد تا داوام لێ بکات دوای کەوم و بمباتە ماڵەوە ، کەچیی وای نەکرد . عومەریش خوا لێی ڕازیی بێ تێپەڕیی و ، دەربارەی ئایەتێکی قورئان پرسیارم لەویش کرد . هەر بۆ ئەوەش پرسیارم لێ کرد تا داوام لێ بکات دوای کەوم و بمباتە ماڵەوە ، کەچیی وای نەکرد . ئەبولقاسم ﷺ تێپەڕی کرد و زانیی ڕەنگی دەم و چاوم گۆڕاوە و ، لە دڵیشەوە برسییمە و داوای خواردن ئەکەم ، بۆیە فەرمووی : (( أبا هريرة ! )) وتم : لَبَّيك يا رسول اللهِ ! فەرمووی : (( إلْحَقْ )) . منیش داوای مۆڵەتم کرد و مۆڵەتیان دام . ئەبینم هەندێ شیر وا لە قاپێكدا . فەرمووی : (( مِن أينَ لكُم هذا اللَّبَنُ ؟ )) . فەرمووی : ئەم شیرەتان لە کوێ بوو ؟ وتیان : فلانەکەس ، یان خانەوادەی فلان بە دیاریی بۆمانی ناردووە . فەرمووی : (( أبا هِرّ ! )) . وتم : لَبَّيك يا رسولَ اللهِ ! فەرمووی : (( إنطلق إلى أهلِ الصُّفَّةِ [٣١٦] فادعُهُم لي )) . فەرمووی : بڕۆ بۆ لای ئەهلی صوففە و بانگیان بکە بۆم .

ئەڵێت : ئەهلی صوففە میوانی ئیسلام بوون نە کەس‌وکار و نە سامانیان نەبوو . ئەگەر دیاری‌یەك بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بهاتبایە شتێکی لێ ئەخوارد و هەندێکیشی بۆ ئەوان ئەنارد . خۆ ئەگەر صەدەقەی بۆ بهاتبایە ئەی‌نارد بۆ ئەوان خۆی هیچی لێ نەئەخوارد .

---

[٣١٦] صوففە : شوێنێك بوو لە دواوەی مزگەوتی پێغەمبەردا بۆ ئەو غەریبانە ئامادە کرابوو کە نە مەنزڵ و نە کەس وکاریان نەبوو . ئیبن حەجەر ئەڵێت : صوففە لە دواوەی مزگەوت‌دا بوو بۆ ئەو هاوەڵە هەژارانە ئامادە کرا بوو کە بێ کەس وکار بوون ، کە جاری وەها ئەبوو زۆر ئەبوون هەتا ئەگەیشتنە دوو صەد ، بگرە چوار صەد کەس و جاری وەهاش ئەبوو کەمیان ئەکرد بە بۆنەی ئەوەوە کە ئەنێرران بۆ جیهاد و بۆ قورئان فێرکردن ، ، خوا لە هەموویان ڕازیی بێ . ئەمە وتەی ئەبونوعەیم بوو .

ئەڵێت : ئەوە خەمباری کردم ، چونکە من ئەم ویست لەو شیرە قومێکی وەهام بەرکەوێ کە ببێتە هێز بۆ ئەو رۆژە و شەوەکەم . وتم : من نێرراوم ، جا ئەگەر خەڵکەکە هات ئەبێ من دەرخواردیان بدەم . هەروەها وتم : کەواتە لەو شیرە هیچی بەشی من نامێنێ ، خۆ بۆ گوێڕایەڵیی فەرمانی خوا و فەرمانی پێغەمبەرەکەشی چارێکم نەبوو . رۆیشتم بانگم کردن .. ئەوانیش هاتن و داوای هاتنە ژوورەوەیان کرد و ، ماوەیان درا و لە ماڵەکەدا دانیشتن ، پاشان فەرمووی : (( أبا هر ! خُذ فأعطِهم )) . فەرمووی : قاپە شیرەکە هەڵ گرە و بیاندەرێ . منیش قاپەکەم هەڵ گرت و خەریك بووم ئەمدانێ . ئەوەبوو پیاوێکیان قاپەکەی لە دەستم ئەگرت و ئەوەندەی شیر ئەخواردەوە هەتا تێر ئەبوو ، پاشان قاپەکەی ئەدایە دواوە ، هەتا هاتمە سەر دوا کەسیان و ، دامە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ، ئەویش قاپەکەی بە دەستی گرت و ئەبینێ وا هەندێکی ماوە . پاشان سەری بەرز کردەوە و سەیرێکی کردم و زەردەخەنەیەکی کرد [٣١٧] و فەرمووی : (( أبا هر! )) . وتم : لبيك يا رسول الله! فەرمووی : (( بقيتُ وأنت )) . فەرمووی : من و تۆ ماوین . وتم : راستت فەرموو، ئەی پێغەمبەری خوا ! فەرمووی : (( فاقعُدْ فاشرَبْ )) . فەرمووی : دانیشە بخۆرەوە. ئەڵێت : منیش دانیشتم و خواردمەوە . پاشان پێمی فەرموو : (( إشرَبْ )) ، منیش خواردمەوە . هەروا بەردەوام ئەیفەرموو : (( إشرَبْ )) . منیش ئەم خواردەوە ، هەتا وتم : نەء ، بەو خوایەی کە بە حەق رەوانەی کردووی ! ئیتر جێی بۆ شك نابەم. فەرمووی : (( ناولني القَدَحَ )) . فەرمووی : قاپەکەم بدەرێ . قاپەکەم دایەوە خزمەتی و پاشماوەکەی خواردەوە . وأخرجه البخاري : ٢ / ٩٥٥ ، والترمذي : ٢ / ٧١ ، وقال : صحيح ، كذا في البداية : ٦ / ١٠١ ، وأخرجه الحاكم وقال : صحيحٌ على شرطهما .

هاوسەرەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ خوا لێیان رازیی بێ لەو حاڵ و گوزەرانەدا بوون.

خوای گەورە ئەفەرمووێ : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٢٨﴾ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلْـَٔاخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا ﴾ . ( الأحزاب : ٢٨ ـ ٢٩ ) .

---

[٣١٧] هەروەك بە سەرنجدانی ئەبوهورەیرە ئەوەی لە دڵیایە لێی ئاگادار بێ ، کە خەمیەتی بەشی نەمێنێ . بۆیە ئەو زەردەخەنەیەی بۆ کرد کە ئەوەش ئاماژەیە خەمت نەبێ ، کەس بەشی تۆ ناخوا !!

فەرمووده صەحیحەکان ئەو بەڵگەیە بە دەستەوە ئەدەن کە ئەم دوو ئایەتە پیرۆزە دوای کەنارگرتنی پێغەمبەری خوا بووە لە هاوسەرەکانی ، دوای ئەوەی کە سوێندی خوارد بۆ ماوەی مانگێك تێکەڵی‌یان ناکات .. ئەم دوو ئایەتە لە ساڵی نۆهەمی کۆچیی‌دا هاتوونەتە خوارەوە و ، هۆی هاتنە خوارەوەشیان ئەوەبوو کە هاوسەرەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ داوای ژیان و گوزەرانی چاکتریان ئەکرد ، کە مەسرەفیان بۆ زیاد بکرێت.

موسلیم لە جابیرەوە خوا لێی رازیی بێ تەخریجی کردووە کە وتوویە : ئەبوبەکر هات بچێتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبینێ خەڵکەکە لە دەرگای ماڵەکەی‌دا وەستاون و هیچ کەسیان ماوە نەدراون بچنە ژوورەوە . ئەڵێت : ماوەی ئەبوبەکر درا و چووە ژوورەوە . پاشان عومەر هات و ماوەی خواست و ماوەی درا و ، ئەبینێ وا پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتووە و هاوسەرەکانیشی وان بە دەوری‌دا و ، ئەویش خەمبار و بێ‌دەنگە . ئەڵێ : عومەر فەرمووی : شتێك ئەڵێم هەتا پێغەمبەر ﷺ پێ بکەنێ . فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەگەر کچی خاریجە ( مەبەستی لە جەمیلەی کچی ثابیتی هاوسەریەتی کە خاریجە یەکێ لە باپیرانیەتی ) داوای نەفەقەم لێ بکات هەڵ ئەستم بۆی و ملی با ئەدەم . پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەنیی و فەرمووی : (( هن حولي كما ترى يسألنني النفقة )) . فەرمووی: ئەمانەی بە دەورم‌دا ئەیان بینیی داوای نەفەقەم لێ ئەکەن . ئەبوبەکر هەستا بۆ عائیشە (ی کچی) تا ملی با بدا و ، عومەریش هەستا بۆ حەفصە ( ی کچی ) تا ملی با بدات . هەردووکیان ئەیان فەرموو: ئایا شتێ لە پێغەمبەری خوا ﷺ داوا ئەکەن کە لە دەستی‌دا نیە؟ ئەوانیش ئەیان‌وت : بەخوا ! هەرگیز شتێ لە پێغەمبەری خوا داوا ناکەین کە لە دەستی‌دا نەبێ .. پاشان ئەوەبوو مانگێك یان بیست و نۆ رۆژ کەناری گرت لێیان . پاشان ئەو ئایەتە دابەزی‌یە سەری .

ئەو دوو ئایەتەش فەرمانیان بەسەر پێغەمبەردا ئەدا هەتا تەبلیغی هاوسەرانی بکات کە ئەگەر ئەوان ژیان و رابواردنی دنیایان ئەوێ ، واتە لەگەڵ دەست کورتیی و ژیانی کەفافی پێغەمبەری زاهید و دونیا نەویست‌دا گوزەران ناکەن .. واتە وەك ئەو نازدارە لە خەفەت و مەراقی قیامەت‌دا ناژین .. واتە ناتانەوێ هاوبەشی ئەو کارە پیرۆزەی سەرشانی ئازیز بن بۆ رزگارکردنی مرۆڤایەتیی لە جەوری دنیا و سزای سەختی قیامەت .. وەرن با بە شێوەیەکی جوان کە شایانی مرۆڤی بەرێز بێت

دەستتان لێ هەڵ بگرم و تەلاقتان بدەم . خۆ ئەگەر خوا و پێغەمبەرەکەی و ڕۆژی قیامەتیشتان مەبەستە ، ئەوا خوای گەورە پاداشتێکی گەورەی بۆ ئەوانەتان ئامادە کردووە کە گەیشتوونەتە پلەی ئیحسان ..

ئەوپەڕی سەربەرزی‌یە بۆ مرۆڤ ئەوە ژیان و گوزەرانی پێغەمبەرەکەی بێت و ، ئەوپەڕی سەربەرزیشە ئەوە ژیان و گوزەرانی هاوسەرەکانی بێت .. تا هیچ هەژارێك دڵی لە خۆی دانەمێنێ ، ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ لەو هەژارتر ژیان بەسەر ئەبات.. هەروەها با هیچ خێزانێکی دەستکورت ، کە خەریکی خزمەتی دینی خوایە، دڵی لە خۆی دانەمێنێ ، ئەوەتا خێزان و خانەوادەی خۆشەویستی خوا لەوان هەژارترن. ئەوەتا لە مانگ زیاتر جگە لە ئاو و خورما هیچ خۆراکێك شك نابەن .

نەك هەر خواردن بەڵکو لە هەموو شتێك‌دا هەر هەژار بوون :

ژوورەکانیان بچکۆلە و نزم .. بێ چرا و ڕووناکیی .. ژێرەخەری پێغەمبەری خوا ﷺ بریتیی بوو لە حەسیری ئەستوور کە کاتێ بەسەریەوە ئەخەوت حەسیرەکە چاڵی ئەکردە لاتەنیشتی و ، پشتیی لە چەرم دروست کراو و لە ریشاڵ پڕکراویشی بۆ پاڵ دانەوە و شان دادان بەکار ئەهێنا ..

کە دایکانی ئیمان‌دارانیش داوای ژیان و گوزەرانیان ئەکرد ، هەر لە قورئانەوە ئەوەیان وەرئەگرت ، چونکە قورئان خۆی ماوەی ئیمان‌داری داوە تا ژیان و گوزەرانی خاوێن و دوور لە ئیسراف بەسەر بەرێت :

﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ﴾ ( الأعراف : ٣١ ) .

﴿ قُلۡ مَنۡ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِيٓ أَخۡرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزۡقِۚ قُلۡ هِيَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا خَالِصَةٗ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴾ ( الأعراف : ٣٢ ) .

هەروەها قورئان داوای ژیانی مام‌ناوەندیی ئەکات :

﴿ وَلَا تَجۡعَلۡ يَدَكَ مَغۡلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ وَلَا تَبۡسُطۡهَا كُلَّ ٱلۡبَسۡطِ فَتَقۡعُدَ مَلُومٗا مَّحۡسُورًا﴾ ( الإسراء : ٢٩ ) .

بەڵام ئەوەندە هەیە کە لەبەر ئەوەی کاری تەبلیغی پێغەمبەر و هاوسەرانی مەزن تر بوو ، ئەبوا خۆیان بە ویستی خۆیان زیاتر لە موسڵمانان دەست لە دنیا بکێشنەوە.. ئەبێ ئەوان لەبەردەم کۆمەڵی موسڵمان و ، لەبەردەم مرۆڤایەتیی‌دا

نموونەی زوهد و وەرەع بن . بۆیە قورئانی پیرۆز دایكانی كردنە سەرپشك بۆ هەڵ بژاردن .. یان هەڵ بژاردنی دنیا .. یان هەڵ بژاردنی خوا و پێغەمبەر و قیامەت .

كە ئایەتەكانی سەرپشك‌كردن هاتن بەبێ دوودڵیی و لێك‌دانەوە دایكانی ئیمان داران، هەر هەموویان ، خوا و پێغەمبەر و قیامەتیان هەڵبژارد .. ئەوان خوا لێیان رازیی بێ نموونەی راستەقینەی ئیمان‌دار بوون .. بۆیە هەموویان بە یەك دەنگ وتیان: خوا و پێغەمبەرەكەی و قیامەتمان ئەوێت ..

لە عائیشەوە خوا لێی رازیی بێ ئەگێڕنەوە وتوویە : كاتێك كە خوا فەرمانی بەسەر پێغەمبەری خوادا ﷺ دا بۆ سەرپشك‌كردنی هاوسەرەكانی ، بە من دەستی پێ كرد كە فەرمووی: (( إني ذاكر لك أمراً فلا عليك أن تعجلي حتى تستأمري أبويك )). فەرمووی : كارێكت بۆ باس ئەكەم پەلە مەكە هەتا پرس بە دایك و باوكت بكەیت. ئەڵێت: چونكە ئەی‌زانیی دایك و باوكم فەرمانی ئەوەم بەسەردا نادەن كە لێی جیا ببمەوە. ئەڵێت : پاشان فەرمووی : (( إن الله جل ثناؤه قال : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٢٨﴾ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا ﴾ )) ( الأحزاب : ٢٨ ـ ٢٩ ) . ئەڵێت : وتم : جا لە چییدا داوای بڕیار لە دایك و باوكم بكەم ؟ من خوا و پێغەمبەرەكەی و قیامەتم ئەوێن . ئەڵێت : پاشان هاوسەرەكانی تری پێغەمبەری خواش ﷺ وەك منیان كرد .

ئەم سەرپشك‌كردنە ئیمان‌داریی و دامەزراویی دایكانی ئیمان‌دارانی سەلماند و ، بە راستیی تاقی‌كردنەوەیەكی بێ‌گەرد بوو بۆ دەركەوتنی ئیخلاص و راستگۆیی‌یان لەگەڵ خوادا .. بە مەرجێ كە سەرپشكیان ئەكات : ئەگەر ژیان و خۆش‌گوزەرانیی دنیاتان ئەوێت ، ئایەتەكە بەڵێنی ئەوەی تیایە كە ئەگەر دەست لە پێغەمبەری خوا هەڵ بگرن، هەموو ناز و نیعمەتێكی دنیایان پێشكەش ئەكرێ : بەڵام ئەوان خوا لێیان رازیی بێ لە بەرامبەر رەزامەندیی خوا و پێغەمبەرەكەیدا هەموو ناز و نیعمەتێكی دنیایان پشت گوێ خست . جا مادەم ئەوان خوا و پێغەمبەر و قیامەتیان هەڵ بژارد ، كەواتە ئەوان هەر ئەوەندە نیە كە هاوسەری پێغەمبەری خوا بن ، بەڵكو بەو هەڵبژاردنە گەیشتنە پلەی ئیحسان . ئەوەبوو بەڵێنی پاداشتێكی زۆر گەورەیان پێ درا ، كە هەموو خێر و چاكەی دنیا و قیامەت بگرێتەوە .

جا له دوای پێغەمبەری پێشەوا ﷺ خەلیفه راشیدەکانیش خوا لێیان رازیی بێ ئەم سەرپشك کردنەیان کردە نیشانەیەکی ئیسلام و پرۆگرامێکی پێغەمبەرایەتیی تا فەرمانبەدەستانی موسڵمانان و دەوروبەریان بەسەر خۆیاندا جێ بەجێی بکەن . فەرمانده و سەرۆکی موسڵمان و دەست و پێوەند و کەس وکاریان پادشا و میرزاده نین تا دەست بدەنە خواردن و رابواردن و ، پۆشینی جل و بەرگی گران بەها ، بەڵکو خزمەتکار و شوانی کۆمەڵگای موسڵمانن و ، پێویستە ئاستی ژیانیان لە ئاستی هەژار و دەستکورتەکاندا بێت .. پێویستە نموونەی زوهد بن لەبەر چاوی دۆست و دوژمندا .. ئەوەش ماوە بڵێین : هەتا موسڵمانی کاربەدەست خۆی بۆ قیامەت یەك لایی نەکاتەوە ، ناتوانێ عەدالەت بەکار بهێنێ .. هەر حوکمێکیش عەدالەتی تیا نەبوو ، ئەوە هیچ پەیوەندییەکی بە ئیسلامەوە نیە .. چونکە کاربەدەستی دنیاویست هەمیشە کەسانێکی دنیاویستی وەك خۆی ئاوات بۆ شوێنەکەی ئەخوازن و، هەوڵ ئەدەن لێی بسەنن ، ئەو کەسەش بە هەموو هێزێکیەوە ئەدات لەوانە ، ئیتر حەق بەلای هەر کامیانەوە هەبێت ، هیچ کام لە پاشقولدان درێغیی ناکەن ..بەمە بەرژەوەندیبازیی و ستەم و بوختان و کوشتوبڕ پەیدا ئەبێ ، وەك ئەمڕۆی سەرزەویی .. تۆ بڵێ وەك هەموو حوکمڕانێك و نەیارانی جگە لەو حوکمەی کە خوا و پێغەمبەر لێی رازیی بن ..

ئەمەش پێی ئەڵێن سیاسەت، کە خراپترین دەردە تووشی مرۆڤ بووە بە درێژایی مێژوو.

ئا بەم شێوەیە دەرئەکەوێ کاربەدەستە خواناسەکان بە هیچ شێوەیەك دنیایان نەویستووە . هەر کەسیش هەڵپەی دنیا بکات ئەوە کاربەستێکە لە دادگای خواییدا تاوانبارە و پێویستە دادگایی بکرێ . کەواتە سەرۆکایەتیی و فەرمانداییەتیی ئوممەتی ئیسلام ئەرکێکی ئەوەندە گرانە پێویستە خواناس هەموو خۆشیی و بەرژەوەندییەکی ئەم ژیانەی بخاتە ئەو لاوە .. ئەبێ بە سنگێکی فراوانەوە دەست لەم دنیایە بشۆن ، تا بتوانن بە سەخاوەتی تەواوەوە خزمەت بە مرۆڤ بکەن . چونکە هەر کەس لەم دنیایە تێر نەبووبێ خزمەتی هەژارانی پێ ناکرێ ..[318]

**پێنجەم : حەجی ئەبوبەکر خوا لێی رازیی بێ**

موسڵمانەکان لە هەموو بوارێکدا خەریکی پەروەردەی خۆیان بوون .. بە کۆمەکیی و پشتیوانیی خوای گەورە خەریکی بنیاتنانی دەوڵەتی ئیمان بوون ..

---

[318] السيرة النبوية للصلابي : ٨٥٦ ـ ٨٥٩ ، شرح حياة الصحابة للباره بنكوي : ١ / ٤٩٧ ـ ٥١١ .

هەموو لایەنەکان ڕێك و پێك کرابوون ، بەڵام لەو تەمەنە زۆرەی بانگەوازدا هێشتا فەرزی حەج زۆر جێ بەجێ نەکرابوو ، چونکە پێش حودەیبیە بە هیچ شێوەیەك ڕێگا بە موسڵمانان نەئەدرا حەجی ماڵی خوا بکەن . لەبەر ئەوەی کە قورەیش دژایەتیی موسڵمانەکانی ئەکرد . ساڵی حودەیبیە واتە ساڵی شەشەمی کۆچیی موسڵمانەکان گەڕانەوە و عەمرەیان بۆ ئەنجام نەدرا .. ساڵی حەوتەمیش عەمرەیان ئەنجام دا . لە ساڵی هەشتەمدا موسڵمانەکان دوای فەتحی مەککە بۆ یەکەم جار حەجیان بەجێ هێنا کە ئەوەبوو عەتتابی کوڕی ئوسەیدی کاربەدەستی مەککە ئەمیری حەج بوو و ، هێشتا حەجی موسڵمانان تێکەڵ بە حەجی موشریکان ئەنجام ئەدرا .

بۆ ساڵی نۆهەم و دوای گەڕانەوە لە غەزای تەبووك پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی خۆی ئەمیری حەج بێت ، بەڵام ئەوەبوو فەرمووی : (( إنه يحضر البيت عراة مشركون يطوفون بالبيت ، فلا أحب أن أحج حتى لا يكون ذلك )) . فەرمووی : موشریکی رووت بەبێ جل و بەرگ دێنە تەوافی کەعبە و ، هەتا حەج وا بێت پێم خۆش نیە حەج بکەم . بەم بۆنەوە لە ساڵی نۆهەمدا خۆی حەجی نەکرد ، بەڵکو ئەبوبەکری صددیقی خوا لێی رازیی بێ هەڵ بژارد و کردیە ئەمیری حەجی ئەو ساڵە .

ئەبوبەکر لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە هاوەڵان بەرەو مەککە کەوتنە ڕێ و ، لەگەڵ خۆیاندا ئاژەڵەکانی ( هدي ) یان دایە بەر . کاتێك کە ئەبوبەکر و کاروانی حاجییان لە مەدینە دەرچوون سوورەتی ( براءة ) واتە ( التوبة ) هاتە خوارەوە . بۆ ئەمە پێغەمبەر ﷺ عەلیی خوا لێی رازیی بێ بانگ کرد و ، فەرمانی بەسەردا دا تا بە ئەبوبەکر بگاتەوە . عەلیی سواری ئەو وشترەی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو کە ناوی ( العضباء ) بوو و ، لە ( ذوالحليفة ) ی نزیکی مەدینە بە ئەبوبەکر گەیشتەوە. کە ئەبوبەکر چاوی پێ کەوت فەرمووی : بە ئەمیریی هاتووی یان بە مەئمووریی ؟ ئەویش فەرمووی : بە مەئمووریی . هەردووکیان پێکەوە ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە مەککە ، لەوێ ئەبوبەکر فەرمانی دا خەڵکەکە بە شێوەی سەردەمی نەفامیی هەر کەسە لە شوێن و مەنزڵی خۆیدا بخات .. حەجی ساڵی نۆهەم لە مانگی ذیلحەجەدا بوو . ئەوەبوو ئەبوبەکر خوا لێی رازیی بێ پێش ( تروية ) و ، لە ڕۆژی عەرەفەدا و ، لە ڕۆژی ( نحر ) دا و ، لە ڕۆژی ( نفر ) ی یەکەمدا وتاری بۆ موسڵمانان دا . هەموو جارێ کاروبارەکانی حەجی ، لە وەستانی عەرەفە و ، ( إفاضة ) و، قوربانیی کردن و، ( نفر ) و ، ڕەجمی شەیتان و .... هتد پیشان ئەدان

و ، عەلييش خوا لێى رازيى بێ لە هەموو هەڵوێستێكدا بە دوايەوە ئەبوو ، سەرەتاى سوورەتى ( براءة ) ى بۆ خەڵكەكە ئەخوێندەوە ، پاشان ئەم چوار خاڵەى بە گوێى موسڵمانانیدا ئەدا :

- تەنها ئيمان دار ئەچێتە بەهەشتەوە .
- نابێ هيچ كەس بە رووتيى تەوافى ماڵى خوا بكات .
- هەركەس پەيمانى لەگەڵ پێغەمبەرى خوادا ﷺ بەستبێ ، ئەوا ئەو پەيمانە هەتا كۆتايى ماوەكەيان هەر بەردەوام ئەبێ .
- دواى ئەم ساڵە ئيتر هيچ موشريكێك نابێت حەج بكات .

ئەبوبەكريش بۆ ئاسانكاريى فەرمانى بەسەر ئەبوهورەيرە و كۆمەڵێك لە هاوەڵانیدا دا تا يارمەتيى عەليى بدەن ئەو جاڕەى لەگەڵدا بە موسڵمانان بگەيەنن ..

لە راستيىدا هاتنە خوارەوەى سەرەتاى سوورەتى ( براءة ) جيابوونەوەى يەكجاريى بوو لە نێوان ئيسلام و بت پەرستييدا .. بەمە موشريكان لە ئەنجامدانى حەج قەدەغە كران و ، بانگى جەنگ و كوشتاريان بەرزبوويەوە . ئەوەندە هەيە ئەوانەى پەيمانيان بۆ ماوەى ديارييكراو لەگەڵدا بەستراوە تا تەواوبوونى ماوەكەيان مۆڵەتيان پێ ئەدرێ و ، ئەوانەش كە پەيمانى بێماوەيان هەيە تا بەسەرچوونى مانگەكانى حەرام مۆڵەتيان پێ ئەدرێ . واتە چوار مانگ دواى ئەم راگەياندنە . واتە هەتا دەى مانگى رەبيعى دووهەم ، ئيتر دواى ئەوە ئەكەونە حاڵەتى جەنگەوە . قورئان ئەفەرموێ :

﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ثُمَّ لَمْ يَنقُصُوكُمْ شَيْـًٔا وَلَمْ يُظَٰهِرُوا۟ عَلَيْكُمْ أَحَدًا فَأَتِمُّوٓا۟ إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَىٰ مُدَّتِهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ۝ فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلْأَشْهُرُ ٱلْحُرُمُ فَٱقْتُلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَٱحْصُرُوهُمْ وَٱقْعُدُوا۟ لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ ۚ فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّوا۟ سَبِيلَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ ( التوبة : ٤ ـ ٥ ).

ئەو كارەى عەليى خوا لێى رازيى بێ بريتيى بوو لە هەڵوەشاندنەوەى ئەو پەيمانانەى كە لە نێوان موسڵمانەكان و موشريكەكاندا بەسترا بوون . ديارە ئاشكراكردنى هەڵوەشاندنەوەى پەيمانيش پێويستە سەردارى هۆز يان خزمێكى نزيكى ئەنجامى بدا بۆيە پێغەمبەرى خوا ﷺ عەليى بە دواى ئەبوبەكردا رەوانە كرد ، تا وەكو خزمێكى نزيكى لە بريى خۆى ئەو هەڵ وەشاندنەوەيە ئاشكرا بكات . كەچيى

( رافیضة ) بە نەزانیی کارەکەیان لێك دایەوە و ، رایان ئەگەیاند کە عەلیی شایانی خەلافەتە بۆیە بە دوای ئەبوبەکردا رەوانەی کرد . بەلاّم گێلانە ئەوەیان لە یاد چووە کە لە ( ذوالحليفة ) ئەبوبەکر پرسیاری لە عەلیی کرد : بە ئەمیریی هاتووی یان بە مەئموورییی ؟ ئەویش فەرمووی : بە مەئموورییی ..

ئەم حەجەی ئەبوبەکر پێشەکی‌یەك بوو بۆ حەجی گەورە ، کە حەجی ماڵئاوایی بوو و پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی ئەنجامی دا . لە حەجەکەی ئەبوبەکردا ئەوە ئاشکرا کرا کە سەردەمی بت و بتپەرستیی بەسەر چوو و ، قۆناغێکی نوێ لە مێژووی مرۆڤ دەست پێ ئەکات . ئەو کەسەش پێی خۆشە خوا رازیی بکات ، با بچێتە سایەی شەریعەتی خواوە .. بەمە هۆزەکان کەوتنە خۆ و ، بۆیان دەرکەوت تازە جارێکی تر ئەو بیروباوەڕەی ئەوان خەڵکی شوێنی ناکەون و ، وا چاکە هۆزەکان فریای خۆیان بکەون و موسڵمان بن .[٣١٩]

**شەشەم : ساڵی نوێنەران**

غەزای فەتح فەتحێکی وەها گەورە بوو کە ریشەی بت پەرستیی هەڵ کێشا و فڕێی دا .. فەتحێکی وەها گەورە بوو پەردەی لەسەر چاوی دانیشتوانی دوورگەی عەرەبیی هەڵ ماڵیی و ، گومان و دوودڵی بەلاوە نەهێشتن ، بۆیە هەر هۆزێك بۆ خۆی نوێنەری بەرەو مەدینەی پایتەختیی دەوڵەتی ئیمان و عەدالەت ئەخستە رێ ، تا لە خزمەتی پێغەمبەری رزگارکەردا ﷺ موسڵمانبوونی هۆزەکەی رابگەیەنێ ..

عەمری کوڕی سەلەمە ئەڵێت : ئێمە لەسەر ئاوێك بووین کە رێی خەڵکیی لەسەر بوو . ئەوەبوو رێبواران بە لامانا تێ ئەپەڕین و ئێمەش پرسیارمان لێ ئەکردن : دەنگوباسی خەڵك چی‌یە ؟ ئەو پیاوە چی‌یە ؟ ئەوانیش ئەیان وت : وا رائەگەیەنێ کە خوا رەوانەی کردووە و، وەحی بۆ ناردووە . خوا ئەوەی بە وەحی ناردۆتە خوارەوە . منیش ئەم قسانەم لەبەر ئەکردن .. عەرەبەکانیش چاوەڕوانی فەتحی مەککە بوون بۆ موسڵمان بوونیان و ، ئەیانوت : وازی لێ بهێنن بۆ خزمەکانی . ئەگەر بەسەریاندا زاڵ بوو ئەوە پێغەمبەرێکی راستگۆیە . جا کە فەتحی مەککە کرا هەر قەومێك بۆ خۆی بۆ موسڵمان بوون دەستپێشخەریی ئەکرد و ، باوکیشم بۆ موسڵمانبوونی

[٣١٩] السيرة النبوية للندوي : ٣٧٩ ـ ٣٨٠ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٥٣٦ ـ ٥٤٠ ، السيرة النبوية للصلابي: ٨٥٩ ـ٨٦١ ، الرحيق المختوم : ٤٥٤ .

قەومەکەی دەست پێشخەریی کرد .. کاتێك کە گەڕایەوە وتی : بەخوا لەلایەن پێغەمبەری راستەقینەوە گەڕاومەتەوە لاتان ...

بەڵێ ، بە فەتحی مەککە و غەزای حونەین و تەبووك و موسڵمانبوونی ثەقیف بۆ عەرەبەکان روون بوویەوە کە ئیسلام بۆتە هێزێکی جیهانیی وەها گەورە کە لەلایەن فارس و رۆمەوە حیسابی بۆ ئەکرێ ، بۆیە لە ساڵی نۆهەم و دەهەمدا هەر هەموو هۆزەکان خۆیان بە دەستەوە دا و موسڵمان بوون . ئەوەبوو سوپای ئیسلام لە فەتحی مەککەدا دە هەزار جەنگاوەر بوو و ، دوو ساڵ لەوەوبەریش بۆ بەستنی پەیمانی حودەیبیە و فەتحی خەیبەر موسڵمانەکان سوپایەکی هەزار و چوارصەد کەسییان هەبوو . بەڵام لە غەزای تەبووك‌دا کە هێشتا ساڵێك بەسەر فەتحی مەککەدا تێ پەڕی نەکردبوو ، سوپای ئیسلام گەیشتە سیی هەزار و ، لەساڵی دەهەمیش‌دا کە حەجی ماڵئاوایی تێدا ئەنجام درا شوێنکەوتوانی ئیسلام ، بگرە حاجییان صەد هەزار یان صەد و چل و چوار هەزار کەس ئەبوون ، کە هەر هەموویان لە دەوری پێغەمبەری خوادا ﷺ خەریکی تەلبیە و تەکبیر و تەسبیح و تەحمید بوون .

مێژوونووسان لەسەر ئەوە یەك‌دەنگن کە هاتنی نوێنەرانی هۆزەکان بۆ مەدینە لە ساڵی نۆهەمدا بووە و ئەو ساڵەشیان ناو ناوە ساڵی نوێنەران . بەڵام هەندێ لە نوێنەران زووتر و هەندێکیشیان درەنگ‌تر هاتوون و موسڵمان بوون .

لە راستییدا چیرۆکی هاتنی ئەو نوێنەرانە و چۆنیەتی هەڵسوکەوتی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵیان‌دا ئەوپەڕی گرنگیی هەیە ، چونکە ئەو هەواڵانە پرۆگرامێکی پێغەمبەرانەی پڕپێزیان ، دەربارەی هەڵسوکەوتی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەو نوێنەرانەدا ، بۆمان بەجێ هێشتووە ، کە ئەتوانین پەند و ئامۆژگارییەکی زۆری لێ وەربگرین بۆ ناسینی دڵ و دەروونی مرۆڤەکان .

بەم شێوەیە هاتنی نوێنەران بۆ مەدینە تایبەتمەندییەکی ساڵی نۆهەم بوو ، کە دەوڵەتی نەونەمامی ئیسلامیش بە چاکیی باوەشی بۆ گرتنەوە و ، شوێنی حەوانەوەشی بۆ ئامادە کردن و ، یانەیەکیش هەبوو بۆ میوانان تەرخان کرابوو ، سەرەڕای مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ کە شوێنێکی فراوان بوو ، لەگەڵ ئەوەش‌دا کە هەندێ لە هاوەڵان بە ویستی خۆیان یان بە داواکاریی پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێ میوانیان ئەبردە ماڵەوە .

شایانی باسە كە پێغەمبەری خوا ﷺ بایەخی چاكی بە فێركردن و پەروەردەكردنیان ئەدا و ، نوێنەرەكانیش ئامادە بوون بە جوانیی لە ئیسلام و شەریعەت و ئەحكامەكانی بگەن و شارەزای داب و یاساكانی بن و ، هەندێكیشیان دەربارەی ئەو شتانەی كە لە ژیانی رۆژانەیاندا هەبوون پرسیاریان ئەكرد ، تا بزانن و بتوانن حەلاڵ و حەرامیان جیا بكەنەوە .. پێغەمبەری خوایش ﷺ لەسەر فێركردنیان سوور بوو و ، ئەوەش كە زیاتر لەسەر شارەزابوونی قورئان سوور بوو لە خۆی نزیك ئەخستەوە و ، بە هاوەڵەكانیشی ئەفەرموو : (( فَقِّهُوا إخوانكم )) . ئەی‌فەرموو : براكانتان لە دین شارەزا بكەن .

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی پیاوە ناودارەكانیان پرسیاری ئەكرد و ، كە ئەشیانویست بگەڕێنەوە بۆ ناوچەكەی خۆیان ئامۆژگاریی ئەكردن تا دەست بە رێبازی حەقەوە بگرن و ، بە ئارام و لەسەرخۆ بن . لە هەمان كاتدا دیاریی و خەڵاتی پێشكەش ئەكردن . كە ئەوانیش ئەگەڕانەوە ناو خزمەكانیان ، بە دڵێكی كراوەی شادمانەوە ئەگەڕانەوە و ئەبوونە هیدایەتدەر و ، بانگكەری دڵسۆزی خزمەكانیان ، چونكە بە چاوی خۆیان نیشانەی پێغەمبەرایەتیی شاهی مەدینەیان دیی بوو و ، بە وردیی دەنگ‌وباسی پایتەختی ئیمانیان ئەگێڕایەوە .. باسی ئەو مرۆڤە وشك و زبرانەیان ئەگێڕایەوە كە چۆن بە نووری قورئان بوونەتە مەلائیكەت و نوور لە دەم و چاویان بەرز ئەبێتەوە و ، برایەتی‌یەكی بێ‌وێنەی مێژوویان دەستگیر بووە .

ئەمەش ناوی هەندێ لەو هۆزانەی كە نوێنەریان ناردە مەدینە بۆ موسڵمان بوون :

( ١ ) **نوێنەری عەبدولقەیس** : ئەم هۆزە دووجار نوێنەریان هاتۆتە مەدینە :

یەكەمیان لە ساڵی پێنجەمی كۆچییدا یان لە پێشتر بووە . پیاوێكیان بە ناوی مونقیذی كوڕی حەییان بۆ بازرگانیی دێتە مەدینە ، ئەمەش دوای كۆچ كردن ، لەوێ هەواڵی ئیسلام ئەبیستێ و موسڵمان ئەبێ و ، نامەیەك لەلایەن پێغەمبەرەوە ئەبات بۆ قەومەكەی و ، ئەوانیش موسڵمان ئەبن و ، لە مانگێكی حەرامدا لە شێوەی نوێنەردا سیانزە یان چواردە پیاویان دێنە مەدینە و ، دەربارەی ئیمان و ، دەربارەی شتە خوراوەكان پرسیار ئەكەن . ئەوەبوو گەورە و ماقووڵیان ئەشەجی عەصریی بوو كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( إن فيك خصلتين يُحبُّهما الله : الحِلمُ والأناة )) . ئەفەرموێ : دوو رەوشتی جوانت هەیە كە خوا خۆشی ئەوێن : ژیریی و لەسەرخۆیی .

که نوێنەری ئەم هۆزە هاتنە مەدینە ، پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیی : (( من الوافد، أو من القوم ؟ )) . وتیان : رەبیعە . فەرمووی : (( مرحباً بالقوم ، أو بالوفد غير خزايا ولا ندامى )) . فەرمووی : بەخێر بێن قەومێك کە نە سەرشۆڕ ئەبن و نە پەشیمان ئەبن ، بە بۆنەی ئەوەوە کە زوو موسڵمان بوون .

ئەڵێت : وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئێمە لە ناوچەیەکی دوورەوە هاتووینە خزمەتت و ، کافرانی موضەر ئەکەونە نێوانی ئێمە و ئێوەوە ، بۆیە لە یەکێك لە مانگە حەرامەکان‌دا نەبێت ناتوانین بێینە خزمەتت . جا ئامۆژگاری‌یەکی رێك و پێکمان بکە کە پێی بچینە بەهەشت ، تا ئێمەش هەواڵ بەوانە بدەین کە چاوەڕوانمان ئەکەن . پێغەمبەری خواش ﷺ ئامۆژگاریی کردن ، بە تایبەت ئیمان هێنان . ئەوەبوو فەرمووی : (( هل تدرون ما الإيمان بالله ؟ )) فەرمووی : ئەزانن ئیمان بە خوا هێنان کامەیە ؟ وتیان : خوا و پێغەمبەرەکەی چاك ئەزانن . فەرمووی : (( شهادة أن لا إله إلا الله ، وأن محمداً رسول الله ، وإقام الصلاة ، وإيتاء الزكاة وصوم رمضان ، وأن تؤدوا خُمساً من المغنم )) . فەرمووی : ئیمان هێنان بە خوا بریتی‌یە لە شەهادەتی ( لا إله إلا الله ومحمد رسول الله ) و ، بەجێ‌هێنانی نوێژ و ، زەکات‌دان و، بە رۆژووبوونی رەمەزان و ، پێنج‌یەکی دەست‌کەوتیش بدەن ..

لە ریوایەتێکی تردا هاتووە کە ئەشەججی کوڕی عەبدولقەیس لە لای کاروانەکە دوا ئەکەوێ هەتا چۆك بە وشترەکان دائەدا و ، کەل و پەلی هاوەڵەکانی کۆ ئەکاتەوە و، پاشان دێت هەتا دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگرێ و ماچی ئەکات. پێغەمبەریش ﷺ پێی ئەفەرموێ : (( إن فيك خصلتين يحبهما الله ورسوله )) . ئەویش ئەڵێت : ئایا ئەمە پێزێکە بەو شێوە داڕێژراوم یان رەوشتێکە لە خۆم‌دا ؟ فەرمووی: (( بل جَبْل )) . فەرمووی : بەو شێوە داڕێژراوی . وتی : سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە وەهای دارشتووم خوا و پێغەمبەرەکەی پێیان خۆشە ..

بە بۆنەی زوو موسڵمان‌بوونی ئەم هۆزەوە بوخاریی لە ئیبن عەباس‌ەوە ریوایەتی کردووە کە : یەکەم مزگەوتێك دوای مزگەوتی پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی جومعەی تیا بەدیی هێنرا بێ مزگەوتی عەبدولقەیس بووە لە گوندی ( جواثی ) لە بەحرەین.

بۆ دووهەم جار لە ساڵی نوێنەران‌دا نوێنەرانی عەبدولقەیس کە چل پیاو ئەبوون هاتنە مەدینە کە جاروودی کوڕی عەمریان لەگەڵ دا بوو . جاروود پیاوێکی نەصرانیی بوو ، کە گەیشتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ئیسلامی بۆ باس کرد و

هەوڵیشی دا بە لایەوە خۆشەویستی بکات . وتی : من بەسەر دینێکەوە بووم و، دینەکەی خۆم بۆ دینەکەی تۆ واز لێ دێنم ، ئایا ئەبیتە زامنی دینەکەم؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( نعم أنا ضامن أن قد هداك الله إلى ما هو خير منه )) . فەرمووی : بەڵێ ئەبم بە زامنی ئەوەت کە خوا بۆ سەر دینێکی لەوە چاکتر هیدایەتی داوی . بەمە بە خۆی و هاوەڵانیەوە موسڵمان بوون .

جاروود گەڕایەوە بۆ ناو قەومەکەی .. ئەوەبوو بە شێوەیەکی جوان و بەوپەڕی دامەزراوییەوە موسڵمان بوو بوو ، کە خەڵکی دوورگە لە ئیسلام پاشگەز بوونەوە، هەندێ لە قەومەکەی جاروودیش پاشگەز بوونەوە، ئا لەو کاتەدا دەستی دایە وتاردان. سەرەتا شایەتمانی هێنا و دەستی دایە بانگکردن بۆ سەر ئیسلام کە وتی: خەڵکینە ! من شاهێدیی ئەدەم کە جگە لە زاتی ( الله ) هیچ خوایەکی تر نیە و موحەممەدیش بەندە و پێغەمبەری خوایە و ، هەر کەسیش ئەم شاهێدییە نەدا من بە کافری لە قەڵەم ئەدەم . بە راستیی ئەمە شانازییە بۆ دامەزراویی جاروود.

بەڵگەی ئەوەش کە لە جارێك زیاتر نوێنەری عەبدولقەیس هاتۆتە مەدینە ئەوەیە کە بوخاریی ریوایەتی کردووە ( فتح الباري : ٨ / ٦١ ) کە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون : (( مالي أرى ألوانكم تغيرت ؟ )) فەرمووی : ئەوە چییە وا رەنگتان گۆڕاوە ؟ دیارە جاری تریش چاوی پێ کەوتوون .

( ٢ ) **نوێنەری نەوەی حەنیفە** : لە ساڵی نۆهەمی کۆچییدا هاتنە مەدینە ، کە حەڤدە پیاو بوون و یەکێکیان موسەیلەمەی درۆزن بوو . ئەم کۆمەڵە پیاوە چوونە ماڵێکی ئەنصاریی و پاشان هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و موسڵمان بوون . بە سەرنجدانی ریوایەتەکان دەرئەکەوێ کە موسەیلەمە لووتبەرزیی نواندووە و ، طەماعی دەسەڵات و گەورەیی لە دڵدا بووە .

بەر لە هاتنی ئەو نوێنەرانەی نەوەی حەنیفە پێغەمبەری خوا ﷺ خەو ئەبینێ کە هەموو گەنجینەکانی دنیای بۆ ئەهێنن و ، دوو بازوبەندی زێڕینیش ئەکەنە هەردوو دەستیەوە . ئەویش بەلایەوە گران ئەبێت و ، خەم و خەفەتی بە دڵدا ئەبەن . خێرا وەحی بۆ دێت کە فوویان پیا بکە . ئەویش فوویان پیا ئەکات و ئەڕۆن . جا پێغەمبەری خوا ﷺ وەها تەئویلی ئەو خەوەی ئەکات کە دوای خۆی دوو درۆزن هەڵ ئەکەون .

ئەوەبوو موسەیلەمەش لە ناو قەومەکەی‌دا هەندێ قسەی ئەکرد و ، ئەی‌وت : ئەگەر موحەممەد دوای خۆی کارەکەی بە من بسپێرێ ئەوا دوای ئەکەوم .

کە ئەم وتانە لە موسەیلەمە دەرچوون ، پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هێنا و پارچە دارێکی بە دەستەوە بوو و ، ثابیتی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماسی وتاربێژیشی لەگەڵدا بوو ، هەتا گەیشتە لای موسەیلەمە و هاوەڵانی . دەستی بە فەرمایشت کرد لەگەڵیانا . موسەیلەمە وتی : ئەگەر بتەوێ کارەکە واز لێ دێنین بۆت و ، پاشان تۆیش دوای خۆت بیدە بە ئێمە .

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( لو سألتني هذه القطعة ما أعطيتكها ، ولن تعدو أمر الله فيك ، ولئن أدبرت ليعقرنك الله ، والله إني لأراك الذي أريت فيه ما رأيت ، وهذا ثابت يجيبك عني )) . فەرمووی : ئەگەر ئەم پارچەیەشم داوا لێ بکەیت نات دەمێ . کاری خوایش نادرێتە دەستت و ، گەر پشتیش هەڵ بکەیت خوا چوار پەلت ئەبڕێتەوە . بەخوا وای ئەبینم تۆ ئەو کەسە بیت کە لە خەومدا دەربارەی شتم پیشان درا . ئەوەش ثابیتە لە بریی من وەڵامت ئەداتەوە . ئیتر تەشریفی رۆیشت ..

ئیبن عەبباس ئەڵێت : دەربارەی فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ : ( والله إني لأراك الذي أريت فيه ما رأيت ) پرسیارم کرد ، ئەبوهورەیرە هەواڵی پێ دام کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە : (( بينا أنا نائم رأيت في يدي سوارين من ذهب ، فأهمني شأنهما ، فأوحي إليّ في المنام أن انفخهما ، فنفختهما فذهبا ، فأوّلتهما كذابين يخرجان )) . ( رواه البخاري ) . فەرمووی : لە کاتێکدا کە خەوتبووم لە خەومدا بینیم دوو بازووبەندی زێڕ وان لە دەستمدا . بە هۆیانەوە تووشی خەفەت بووم . هەر لە خەوەکەدا وەحیم بۆ هات کە فوویان لێ بکە . منیش کە فووم پیا کردن رۆیشتن . بەوە تەئویلم کرد کە دوو درۆزن پەیدا ئەبن .

دوو درۆزنەکەش : یەکێکیان ئەسوەدی عەنەسی‌یە کە لە ناوچەی صەنعاءدا بانگی پێغەمبەرایەتیی بەرز ئەکردەوە . ئەوەبوو شەو و رۆژێک پێش کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ کوژرا و ، لە بەیانیی ناشتنی پێغەمبەردا هەواڵی کوشتنی گەیشتە مەدینە ، هەرچەندە پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی کوشتنی‌دا هەواڵی دا ..

دووهەمیشیان : موسەیلەمەی درۆزن بوو کە لە ناو هۆزی نەوەی حەنیفەدا خۆی بە پێغەمبەر لە قەڵەم ئەدا ، تا ئەوەبوو لە سەردەمی خەلافەتی صددیق‌دا کوژرا .

کاری موسەیلەمە هەروا دەرچوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی چوو بوو . موسەیلەمە کە گەڕایەوە بۆ یەمامە دەستی بە بیرکردنەوە کرد ، سەرەنجام هاتە سەر ئەو‌ە کە لە کاری پێغەمبەرایەتیی‌دا کراوە بە هاوبەشی پێغەمبەری خوا . بۆ ئەمە بانگی پێغەمبەرایەتیی هەڵ دا و ، بۆ ئەوەش کە بە خەڵك بگەیەنێ کە وەحی بۆ هاتووە هەندێ سەجەعی هەڵ بەست . بۆ دڵخۆشیی خەڵکیش عەرەق و زینای بۆ قەومەکەی حەلاڵ کرد .. بەمە قەومەکەی سەرگەردان بوون و کەوتنە دوای و ، سەرەنجام نامەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ نووسیی کە ئەمیش کراوەتە هاوبەشی کار و، نیوەی زەویی بۆ ئەمە و نیوەش بۆ قورەیش . پێغەمبەر ﷺ وەڵامی نامەکەی بۆ نووسی‌یەوە کە ئەم ئایەتەی تێدا بوو : ﴿ إِنَّ ٱلْأَرْضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴾ ( الأعراف : ١٢٨ ) .( زاد المعاد ).

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازیی بێ ئەڵێت : ئیبن نەوواحە و ئیبن أثال هاتن، کە هەردووکیان نێرراوی موسەیلەمە بوون بۆ لای پێغەمبەر . پێی فەرموون : (( أتشهدانِ أني رسول الله ؟ )) فەرمووی : هەردووکتان شاهێدیی ئەدەن کە من پێغەمبەری خوام ؟

وتیان : شاهێدیی ئەدەین کە موسەیلەمە پێغەمبەری خوایە .

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((آمنت بالله ورسوله ، لو كنت قاتلاً رسولاً لقتلتكما )) . ( رواه الإمام أحمد ) . فەرمووی : ئیمانم بە خوا و پێغەمبەرەکەی هێنا . ئەگەر نێرراوم بکوشتبا هەردووکتانم ئەکوشتن .

شایانی باسە کە لەساڵی دەهەم‌دا موسەیلەمە ئەم کارەی ئەنجام دا و لە جەنگی یەمامەدا و لە ساڵی دوانزەهەم‌دا بە دەستی وەحشیی کوڕی حەرب کوژرا .

**( ٣ ) ضەمامی کوڕی ئەعلەبە ، نوێنەری نەوەی سەعدی کوڕی بەکر :**

ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازیی بێ ئەڵێت : لە کاتێك‌دا کە لە مزگەوت‌دا لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ دانیشتبووین ، پیاوێك بە سواریی وشترێك هات و لە مزگەوت چۆکی پێ دادا و پاشان بەستیەوە، پاشان پێمانی وت : کامتان موحەممەدە؟ - پێغەمبەریش لە نێوانمان‌دا شانی دادا بوو - وتمان : ئەو پیاوە سپی‌یەیە کە شانی داداوە . پیاوەکە لێی چووە پێشەوە و ، پێی وت : کوڕی عەبدولموطەللیب ؟ پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو : (( قد أجبتك )) .

كابرا وتی : من پرسياری زۆرت لیٚ ئەكەم ، ليٚم زوير نـەبيت . فـەرمووی : (( سَل ما بدا لك )) . فەرمووی : چيت پیٚ خۆشە بپرسە .
وتی : بە پەروەردگاری خۆت و پەروەردگاری ئەوانەی پيٚشی تۆيش ليٚـت ئەپرسـم : ئايا خوا تۆی بۆ لای خەڵكيی هەر هەمـووی رەوانـە كـردووە ؟ فـەرمووی: (( أللـهم نعم )) .
وتی : سويٚندت ئەدەم بە خوا ، ئايا خوا فەرمانی بەسەردا داوی تا ئيٚمە لە شەو و رۆژيٚكدا پيٚنج نويٚژەكە بەجیٚ بهيٚنين ؟ فەرمووی : (( أللهم نعم )) .
وتی : سويٚندت ئەدەم بە خوا ، ئايا خوا فەرمانی بەسەردا داوی تا ئـەم مانگـەی ساڵ بەڕۆژوو بين ؟ فەرمووی : (( أللهم نعم )) .
وتی : سويٚندت ئەدەم بە خوا ، ئايا خوا فەرمانی بەسەردا داوی تا ئەم زەكاتە لـە دەوڵەمەندەكانمان وەر بگری و بەسەر هەژارەكانماندا دابەشی بكەيت ؟ پيٚغەمبەر ﷺ فەرمووی : (( أللهم نعم )) .
كابرا وتی : وا ئيمانم هيٚنا بەوەی هيٚناوتە و ، منـيش نيٚـرراوی قەومەكـەمم و ، ضەمامی كوڕی ثعلبەم و ، لە نەوەی سەعدی كوڕی بەكرم .
بەڵام لە ريوايەتەكەی ئيبن عەبباس‌دا بەم شيٚوە هاتووە : .... كە لیٚ بوويەوە وتی: من شاهيٚديی ئەدەم كە جگە لە زاتی ( ألله ) هيچ خوايەكی تر نيە و ، موحەممەديش ﷺ پيٚغەمبەری خوايە . جا من ئەم فەرزانە بەجیٚ ئەهيٚنم و ، لەو شتانەش بـە دوور ئەگرم كە دوورەپەريٚزييت لیٚ كردووم ، ئيتر نە زيادیان بۆ ئەكەم و نە كەم .
ئەڵيٚت : پاشان گەڕايەوە دوا بۆ لای وشترەكەی . كە پشتی هەڵ كـرد پيٚغەمبـەری خوا ﷺ فەرمووی : (( إن يصدق ذو العقيصـتين يـدخل الجنـة )) . فـەرمووی : ئەگـەر خاوەنی جووتە پەلكەكە راست بكات ئەچيٚتە بەهەشـتەوە . ( چـونكە ضـەمـام قـژی سەری كردبووە دوو بەشەوە ) .
ئەڵيٚت : هاتە لای وشترەكەی و ، رەشووەكەی كردەوە و ، بـەرەو هۆزەكەی كەوتـە ریٚ . كە گەيشت ليٚی كۆبوونەوە . يەكەم قسەی ئەمە بـوو: لات و عـوززا چـارەڕەش بن. وتيان : بیٚدەنگ بە ضەمام ، لە گوليی و گەڕيی بترسـە . لـە شيٚتيی بترسـە . وتی: بیٚبەلاٚ بن بەخوا ئەو دووانە نە زيانيان هەيە و نە كەڵك . خـوای گـەورە ( عـز وجل ) پيٚغەمبەريٚكی رەوانە كردووە و ، كتيٚبيٚكی بـۆ نـاردووە تـا بـە هۆيـەوە لـەم حاڵەتەی وان تيـايا رزگارتان بكات . من شاهيٚديی ئەدەم جگە لە زاتی ( ألله ) هيچ

خوایەکی تر نیە ، تاك و تەنیا و بێ شەریکە و ، موحەممەدیش بەندە و پێغەمبەری ئەوە . من لای ئەوەوە هەرچیی ئەو فەرمانی بەسەرتاندا داوە و دوورەپەرێزیی لێتان کردووە بۆم هێناون . ئەڵێت : بەخوا ئەو ڕۆژە ئێوارە بەسەردا نەهاتبوو هەرچیی پیاو و ئافرەتی ئەو هۆزە بوون هەر هەموویان موسڵمان بوون . ئەڵێت : ئیبن عەبباس خوا لێیان ڕازیی بێ ئەیوت : نەمان بیستووە نوێنەری هیچ قەومێك لە ضەمامی کوڕی ثەعلەبە چاکتر بووبێ .

( ٤ ) نوێنەرانی نەجران :

نەجران ولاتێکی فراوان بووە کە حەوت قۆناغ لە مەککەوە ڕوو بە یەمەن دوور بووە و ، بریتیی بووە لە حەفتا و سێ گوند و سواری خێرا بە ڕۆژە ڕێیەك بڕیویەتی و، صەد هەزار جەنگاوەریان بووە و لەسەر دینی مەسیحییەت بوون .

ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ نامەی بۆ نەجران نووسیی کە تیایا ئەی فەرموو : (( أما بعد ، فإني أدعوكم إلى عبادة الله من عبادة العباد ، وأدعوكم إلى ولاية الله من ولاية العباد ، فإن أبيتم فالجزية ، فإن أبيتم آذنتكم بحرب ، والسلام )) . بانگی ئەکردن بۆ خواپەرستیی ، ئەگەر نا ئەبێ جزیە بدەن ، ئەگەرنا سوپای ئیسلام لەگەڵیان ئەجەنگێ ..

لەوە ئەچێ ئەم نامە ناردنە لە ساڵی نۆهەمدا بوو بێت ، دوای هاتنە خوارەوەی ئایەتی : ﴿ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلۡحَقِّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حَتَّىٰ يُعۡطُواْ ٱلۡجِزۡيَةَ عَن يَدٖ وَهُمۡ صَٰغِرُونَ ﴾ ( التوبة : ٢٩ ) .

کاتێك نامەکەی پێغەمبەری خوا گەیشتە دەستی ( أسقف ) خەڵکەکەی کۆ کردەوە و نامەکەی بۆ خوێندنەوە و ، داواشی لێ کردن ڕای خۆیان دەرببڕن . هەر هەموویان هاتنە سەر ئەوە کە نوێنەر بنێرنە مەدینە . ئەوەبوو چواردە پیاوماقووڵیان نێرران ، ئەشڵێن شەصت پیاویان ناردووە ، کە کاروباریان لە دەستی سێ پیاوی گەورەیاندا بوو: یەکەم : عاقیب : کە ئەمیریی و هەڵسووڕاندنی کاروباری دەوڵەت لە دەستی ئەودا بوو و ، ناویشی عەبدولمەسیح بوو . دووهەم : سەیید : کاروباری ڕۆشنبیریی و سیاسیی لە دەستی ئەودا بوو و ، ناویشی ئەیهەم یان شورەحبیل بوو .

سێهەم : ئوسقوف : سەرۆکایەتیی دین و فەرماندایەتیی رۆحیی لە دەستی ئەودا بوون و ناویشی ئەبوحاریثەی کوڕی عەلقەمە بوو .

ئەمانە گەیشتنە مەدینە و چوونە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوتدا کە جل و بەرگی حیبرەکانیان لەبەردا بوو کە ئاوریشمیان پێوە چنرا بوو و ، ئەموستیلەی زێڕیش لە دەستیاندا بوو . هەر لە ناو مزگەوتدا روو بە خۆرهەڵات دەستیان بە نوێژ کرد . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا لێیان بگەڕێن . پاشان هاتنە خزمەتی و ، ئەویش رووی لێ وەرگێڕان و فەرمایشتی لەگەڵدا نەکردن .

عوثمان پێی فەرموون : لەبەر ئەم جل و بەرگەتان بوو . ئەو رۆژە رۆیشتن و ، بۆ سبەینێ بە جلوبەرگی راهیبەکانەوە هاتنە خزمەتی و سەلامیان لێ کرد ، ئەویش وەڵامی دانەوە و بانگی کردن بۆ موسڵمانبوون . کەچیی ملیان نەدا و وتیان : ئێمە لە پێش ئێوەوە موسڵمان بووین .

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (( یمنعکم من الإسلام ثلاث : عبادتکم الصلیب ، وأکلکم لحم الخنزیر ، وزعمکم أن لله ولداً )) . فەرمووی : سێ شتتان هەیە کە یان ئەبێ وازیان لێ بهێنن یان ناتوانن موسڵمان بن : پەرستنی خاچ و ، خواردنی گۆشتی بەراز و ، بڕیاردان لەسەر ئەوە کە خوا کوڕی هەیە .

گفتوگۆ درێژەی کێشا و ، پێغەمبەری خوایش ﷺ قورئانی بۆ ئەخوێندن و ئەی کردە بەڵگە بۆ سەلماندنی فەرمایشتەکانی . یەکێ لە وتە نەشیاوەکانیان ئەوەبوو کە بە پێغەمبەری خوایان ئەوت : چیتە جنێو بە پێغەمبەرەکەمان ئەدەیت و ئەڵێیت بەندەی خوایە ؟ ئەویش ئەیفەرموو : (( أجل إنه عبد الله ورسوله ، وکلمته ألقاها إلی مریم العذراء البتول )) . ئەوانیش تووڕە بوون و ئەیانوت : هەرگیز دیوتە مرۆڤێك بەبێ باوك لە دایك ببێ ؟ ئەگەر راست ئەکەی دەی نموونەیەکمان پیشان بدە.
خێرا خوای گەورە لە وەڵامی ئەو نەزانانەدا قورئانی نارده خوارەوە :

﴿ إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ۝٥٩ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴾ ( آل عمران : ٥٩ ـ ٦٠ ) .

ئایەتەکە بۆ سەلماندنی لە دایکبوونی عیسا پێغەمبەر سەلامی لێ بێ بەبێ باوك، ئادەم پێغەمبەری سەلامی لێ بێ بە نموونە هێناوەتەوە ، کە خوا لە گڵ دروستی

ئەكات و پاشان بە فەرمایشتی ( كُن ) دێتە بوون . بەم شێوەیە بە نموونەیەكی سەیرتر ئەو كارە سەیرە سەلمێنرا .

كە پێغەمبەری خوا ﷺ سەرنجی دا وا وت‌وویژ لەگەڵ ئەو نوێنەرانەدا كەڵكی نیە، بانگی كردن بۆ موباهەلە ، ئەویش بە پێی ئایەتی پیرۆزی : ﴿ فَمَنْ حَآجَّكَ فِيهِ مِنْۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ فَقُلْ تَعَالَوْاْ نَدْعُ أَبْنَآءَنَا وَأَبْنَآءَكُمْ وَنِسَآءَنَا وَنِسَآءَكُمْ وَأَنفُسَنَا وَأَنفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَـٰذِبِينَ ﴾ ( آل عمران : ٦١ ) .

موباهەلە بریتی‌یە لە دوعاكردن لەو لایەنەی كە راست ناكا و لەسەر رێی چەوتە تا بكەوێتە بەر غەزەبی خوا .. ئەم كارە كارێكی شەرعی‌یە و ، هەر كاتێ لە رێی وت‌وویژ و گفت‌وگۆوە موسڵمانان لەگەڵ بەرامبەرەكەیان‌دا نەگەیشتنە ئەنجام، ئەتوانن پەنا بەرنە ئەم كارە تا خوا غەزەب لەلایەنی چەوت بگرێ و ، دوای دەركردن لە رەحمەت لە ناویان بەرێت .

پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵ دەرچوو و ، عەلیی و حەسەن و حوسەین و فاطیمەشی لەگەڵ‌دا بوون فەرمووی : (( وإذا أنا دعوت فـأمّنوا )) . فەرمووی : ئەگەر من دوعام كرد ئێوەش ئامین بڵێن . نەجرانی‌یەكانیش لە نێوان خۆیان‌دا تەگبیریان كرد و ، چونكە ئەیان‌زانیی بە راستیی پێغەمبەری خوایە ، ترسیان لێ نیشت كە تیا بچن ، لەبەر ئەوەی هەر قەومێك لەگەڵ هەر پێغەمبەرێك موباهەلەیان كردبێ خوا لە ناوی بردوون . ئەوەبوو دانیان بەوەدا نا كە پێغەمبەر هەر حوكمێكیان بۆ دەر بكات . ئەویش لەسەر دوو هەزار دەستە جل لەگەڵیان رێك كەوت كە هەزاری لە مانگی رەجەب‌دا و هەزاریشیان لە مانگی صەفەردا تەسلیم بكەن و لەگەڵ هەر دەستە جلێكیش‌دا ئۆقیەیەك زێڕ و ، خستنیە پەنای خوا و پەنای پێغەمبەرەكەیەوە و بۆ دین‌دارییشیان سەربەستیی تەواوی پێ دان .

كاتێك كە ویستیان بگەڕێنەوە بۆ وڵاتەكەیان پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ئەو رێك‌كەوتنەیان نامەی بۆ نووسین و، ئەوانیش داوایان كرد پیاوێكی ئەمینیان لەگەڵ‌دا بنێرێ تا ئەو سامانەی لەسەری رێكەوتوون تەسلیمی بكەن . ئەویش پێی فەرموون: (( لأبعثن معكم رجلاً أميناً حق أمين )) . فەرمووی : پیاوێكی ئەمینتان لەگەڵ‌دا ئەنێرم كە بە راستیی ئەمین بێت .. هاوەڵان سەریان بەرز كردەوە بەڵكو ئەو صیفەتە جوانەیان بەركەوێ ، ئەویش فەرمووی : (( قُم يا أَبا عُبيدَة بـن الجراح )) . فەرمووی:

هەستە ئەی ئەبوعوبەیدە . کە هەستا فەرمووی : (( هذا أمين هذه الأمة )).
فەرمووی: ئەمە ئەمینی ئەم ئوممەتەیە . ( البخاري ) .

ئەهلی نەجران لەسەر دینی خۆیان زۆر نەمانەوە ، بەڵکو بەرە بەرە ئیسلامیان لەناودا بڵاو بوویەوە . هەر کە گەیشتنەوە نەجران سەیید و عاقیب موسڵمان بوون .. ئیتر ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ عەلیی نارد بۆ نەجران بۆ وەرگرتنی زەکاتیان ، لەبەر ئەوەی کە موسڵمان بووبوون .

( ٥ ) نوێنەری طەی :

لە پێشەوە باسی فەتحی ناوچەی طەی کرا ، کە ئەوەبوو عەدیی کوڕی حاتیمی طەی بە خۆی و کەس وکاریەوە هەڵات و خۆی گەیاندە شام و سەفانەی خوشکی بەجێ هێشت و کەوتە دەست سوپای ئیسلام و دوای ماوەیەك کەس وکاری متمانە پێکراوی هەڵ کەوتن و ، دوای رێزلێگرتن و پێبەخشینی کەلوپەلی پێویست پێغەمبەری خوا ﷺ سەفانەی رەوانەی شام کرد بۆ لای عەدیی .

سەفانە کە گەیشتە شام ئاماژەی بۆ عەدیی برای کرد کە خۆی بگەیەنێتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و موسڵمان ببێ . ئەویش مەردانە خۆی گەیاندە مەدینە و ، هاتە مزگەوتی پێغەمبەری خوا ﷺ و موسڵمان بوو .

هەروەها نوێنەرێکی تری هۆزی طەی بە سەرکردایەتیی ( زيد الخيل ) هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ . کە گەیشتن قسەیان لەگەڵدا کرد و ، ئەویش ئیسلامی بۆ باس کردن و ، ئەوانیش بە چاکیی موسڵمان بوون . ئەو پیاوانەی لەگەڵ زەیددا هاتبوون لەلایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ هەر یەکە پێنج ئۆقیە زیویان خەڵات کرا و ، زەیدیش دوانزە ئۆقیە و یەك نەش .

لە ستایشی زەیددا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (( ما ذكر لي رجل من العرب بفضل ثم جاءني إلا رأيته دون ما يقال فيه إلا زيد الخيل ، فإنه لم يبلغ الذي فيه )) .
فەرمووی: باسی چاکیی هەر پیاوێکی عەرەبم بۆ کرابێ کە پاشان هاتۆتە لام ئەبینم لە خوار ئەوەوەیە کە پێوەی وتراوە ، جگە لە ( زيد الخيل ) ، ئەوەی دەربارەی ئەو وتراوە ناگاتە ئەوەی کە لەسەریەتی . پاشان ناوی نا ( زيد الخير ) و ، گوندی ( فەید ) و ، چەند پارچە زەوی یەکی بۆ بڕی یەوە و ، لەو بارەوە نامەیەکی بۆ نووسیی و، پاشان لەگەڵ قەومەکەی دا گەڕایەوە و ، لە رێگادا کۆچی دوایی کرد ..

**( ٦ ) نوێنەری نەوەی عامیر :**

هەروەها نوێنەری نەوەی عامیریش ، کە عامیری کوڕی طوفەیل و ئەربەدی کوڕی قەیسیان لەگەڵدا بوو ، هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ . کە گەیشتن عامر وتی: ئەی موحەممەد چییم بۆ بڕیار ئەدەی ئەگەر موسڵمان ببم ؟ فەرمووی : (( لَكَ ما للمسلمين وعليك ما عليهم )) . فەرمووی : موسڵمانەکان چ مافێکیان هەیە تۆیش هەتە و ، چ ئەرکێکیشیان لەسەر شان بێ لەسەر شانی تۆیشە . عامیر وتی : ئەگەر موسڵمان ببم دوای خۆت کارەکە بە من ئەسپێری ؟ فەرمووی : (( ليس ذلك لك ولا لقومك ، ولكن لك أعِنَّة الخيل )) . فەرمووی : ئەو کارە نە بۆ تۆ و نە بۆ قەومەکەت نابێت . بەڵکو بەشی تۆ ڕەشمەی ئەسپەکانە . وتی : ئێستا ڕەشمەی ئەسپەکانی نەجدم لە دەستدایە . ناوچەی دەوارنشینان دابنێ بۆ من و ، شارەکانیش بۆ تۆ . فەرمووی: (( لا )) . وتی : دەی بەخوا ئەم ناوە لە ئەسپ و لە پیاو لە دژت پڕ ئەکەم. پێغەمبەری خوا ﷺ لە خوا پاڕایەوە تا لە دەستی ڕزگاری بکات ، کە فەرمووی : (( أللهم اكفني عامر بن الطفيل )) .[٣٢٠]

ئەوەبوو عامیر و ئەربەد لەسەر کوشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێك کەوتبوون، بەڵام خوا پاراستی لێیان .[٣٢١] کاتێك کە بەرەو وڵاتی خۆیان گەڕانەوە عامیر بووە میوانی ئافرەتێك لە نەوەی سەلوول و ، لەوێ تووشی نەخۆشی‌یەك بوو کە بریتیی بوو لە گرێیەك لە ملی‌دا . عامیر داخی لێ ئەهات بە وێنەی وشتر ئەو نەخۆشی‌یەی تووش ببێ و لە ماڵی ئافرەتێکی سەلوولییش‌دا بمرێ ، بۆیە پەڕی‌یە سەر پشتی ئەسپەکەی و، ڕمەکەی هەڵ گرت و ، هەر وا بە ئەسپەکەی غاری ئەکرد هەتا بە مردوویی لەسەری کەوتە خوارەوە .

بەڵام ئەربەد گەیشتەوە ناوچەی خۆیان و ، لەوێ لێیان پرسیی : دەنگ و باسی چییت پێیە ، ئەی ئەربەد ؟ وتی : هیچ شتێك ، بەخوا بۆ پەرستنی شتێك بانگی

---

[٣٢٠] شایانی باسە کە عامیری کوڕی طوفەیل ئەو دوژمنە ناپاکە بوو کە حەفتا لە قورئان خوێنە موسڵمانەکانی لە ( بئر معونة ) شەهید کردن ، کە ئەوەبوو ئەوان بۆ فێرکردنی دانیشتوانی نەجد چووبوون و ، هیچ نیازێکی جەنگیان نەبوو و ، عامیری کوڕی مالیك بوو بوو بە زامنی پاراستنیان .

[٣٢١] کە ئەم نوێنەرانە گەیشتنە مەدینە عامیر و ئەربەد تەگبیری کوشتنی پێغەمبەری خوایان ﷺ کرد . ئەوەبوو عامیر بۆ پەشۆکاندن کەوتە قسە لەگەڵ پێغەمبەردا و ، ئەربەدیش بە دەوریدا سووڕایەوە ، تا لە دواوە بە شمشێر لێی بدا . بستێك شمشێرەکەی ڕاکێشا و ، لەوە زیاتر نەی‌توانیی ، چونکە خوای گەورە دەستی وشك کرد و ، پێغەمبەرەکەی پاراست و ، پێغەمبەریش دوعای لێ کردن .

کردین ، ئاواتەخوازم ئێستە لە لامدا بوایە تا ئەوەندە تیری تێ بگرم هەتا بی‌کوژم. دوای یەك دوو رۆژ بە وشترێکیەوە لە ماڵ دەرچوو هەتا بی‌فرۆشێ ، خوای گەورە هەورە بریسکەیەکی بۆ نارد و بە خۆی و وشترەکەیەوە سووتاندنی ..

خوای گەورەش دەربارەی عامیر و ئەربەد ئەم ئایەتانەی ناردنە خوارەوە : ﴿ ٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَىٰ وَمَا تَغِيضُ ٱلْأَرْحَامُ وَمَا تَزْدَادُ ۖ وَكُلُّ شَىْءٍ عِندَهُۥ بِمِقْدَارٍ ﴿٨﴾ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ٱلْكَبِيرُ ٱلْمُتَعَالِ ﴿٩﴾ سَوَآءٌ مِّنكُم مَّنْ أَسَرَّ ٱلْقَوْلَ وَمَن جَهَرَ بِهِۦ وَمَنْ هُوَ مُسْتَخْفٍۭ بِٱلَّيْلِ وَسَارِبٌۢ بِٱلنَّهَارِ ﴿١٠﴾ لَهُۥ مُعَقِّبَٰتٌ مِّنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦ يَحْفَظُونَهُۥ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ ۗ وَإِذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِقَوْمٍ سُوٓءًا فَلَا مَرَدَّ لَهُۥ ۚ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَالٍ ﴿١١﴾ هُوَ ٱلَّذِى يُرِيكُمُ ٱلْبَرْقَ خَوْفًا وَطَمَعًا وَيُنشِئُ ٱلسَّحَابَ ٱلثِّقَالَ ﴿١٢﴾ وَيُسَبِّحُ ٱلرَّعْدُ بِحَمْدِهِۦ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ مِنْ خِيفَتِهِۦ وَيُرْسِلُ ٱلصَّوَٰعِقَ فَيُصِيبُ بِهَا مَن يَشَآءُ وَهُمْ يُجَٰدِلُونَ فِى ٱللَّهِ وَهُوَ شَدِيدُ ٱلْمِحَالِ ﴾ ( الرعد : ٨ـ١٣ ) .

**( ٧ ) نوێنەری پادشاکانی حیمیەر :**

لە مانگی رەمەزانی ساڵی نۆهەمدا و دوای گەڕانەوەی سوپای ئیسلام لە غەزای تەبوك ، مالیکی کوڕی مەرارەی رەهاویی ، کە نوێنەری پادشاکانی حیمیەر بوو بە نامەیانەوە گەیشتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و هەواڵی موسڵمانبوونی ئەوانی پێ دا .. ئەویش فەرمانی دا بیلال بیباتە ماڵەوە و رێزی لێ بگرێ . پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم نامەیەی بۆ حاریثی کوڕی عەبدکەلال و ، نوعەیمی کوڕی عەبدکەلال و، نوعمانی قەیل ذو روعەین و ، هەمدان و ، مەعافیر نووسیی : (( بسم الله الرحمن الرحيم . من محمد رسول الله النبي إلى الحارث بن عبد كلال ... أما بعد ذلكم : فإني أحمد إليكم الله الذي لا إله إلا الله ، فإنه قد وقع بنا رسولكم منقلبنا من أرض الروم ، فلقينا بالمدينة ، فبلّغ ما أرسلتم به ، و خبَّرنا ما قبلكم ، وأنبأنا بإسلامكم وقتلكم المشركين ، وأن الله قد هداكم بهداه إن أصلحتم وأطعتم الله ورسوله وأقمتم الصلاة ، وآتيتم الزكاة ، وأعطيتم من المغانم خمس الله وسهم النبي ﷺ وصفيه )) .

دوای سوپاسی خوای گەورە ئاگاداری کردن کە نوێنەرەکەیان بە نامەکەیانەوە هاتۆتە مەدینە و هەواڵی ئەوانی پێ داوە کە موسڵمان بوون . جا ئەگەر خۆیان چاك بکەن و ، گوێڕایەڵیی خوا و پێغەمبەرەکەی بکەن و ، نوێژ بە جێ بهێنن و ، زەکات بدەن و ، پێنج یەکی دەست کەوت بدەن ئەوا هیدایەتیان لەلایەن خواوە وەرگرتووە ..

ئەوەبوو چەند هاوەڵێکی بە ئەمیریی موعاذی کوڕی جەبەل نارده لایان تا لە دین شارەزایان بکەن .

( ٨ ) نوێنەری وڵاتی یەمەن :

هەروەها لە ساڵی نۆهەمدا نوێنەری وڵاتی یەمەن هاتنە مەدینە ئەبینن وا نوێنەری تەمیمیش وان لەوێ . هەر لەوێ دەرکەوت کە دانیشتوانی یەمەن چەندە ڕێك و پێك و دڵ نەرمن . ئەوەتا دەربارەی ئەم نوێنەرە ڕێك و پێکە بوخاریی لە پێغەمبەرەوە ﷺ ریوایەتی کردووە کە فەرموویە : (( أتاكم أهل اليمن ، هم أرق أفئدة ، وألين قلوباً ، الإيمان يمانٍ ، والحكمة يمانية والفخر والخيلاء في أصحاب الإبل ، والسكينة والوقار في أهل الغنم )) . فەرمووی : وا دانیشتوانی یەمەن هاتنە لاتان کە دڵناسك و دڵنەرمن .. ئیمان و حیکمەتیش یەمانیین . فەخر و شانازیی لای خاوەن وشترەکان و ، هێمنیی و ویقاریش لای خاوەن مەڕەکانە .

( ٩ ) نوێنەری ئەشعەرییەکان :

ئەوەی کە بە صەحیحیی چەسپاوە ئەوەیە کە نوێنەری ئەشعەرییەکان لە ساڵی حەوتەمدا و ، دوای غەزای خەیبەر هاتوونەتە مەدینە . کاتێ کە بەڕێوە بوون بۆ مەدینە بە شێوەی سروود ئەیانوت : (( غداً نلقى الأحبة : محمداً وحزبه )) . ئەیان وت : سبەینێ بە خۆشەویستانمان ، موحەممەد و کۆمەڵەکەی ، شاد ئەبین .

( ١٠ ) نوێنەری هەمدان :

دوای گەڕانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە تەبووك هاتن و نامەی بۆ نووسین و ئەوەی داوایان کردبوو بۆی جێ بەجێ کردن و ، مالیکی کوڕی نەمەطی کردە ئەمیریان و کردیە سەرۆکی موسڵمانەکانیان و ، خالیدی کوڕی وەلیدیشی خوا لێی رازیی بێ نارد بۆ وڵاتی یەمەن ، هەتا خەڵکەکەی تر بۆ سەر ئیسلام بانگ بکات . خالید لەگەڵ چەند موسڵمانێكدا ئەڕۆن و شەش مانگ لەوێ ئەمێننەوە و ، بانگیان ئەکەن بۆ موسڵمان بوون ، کەچیی نایەن بە دەمیانەوە . پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ عەلیی کوڕی ئەبوطالیب خوا لێی رازیی بێ بە دوایانا ئەنێرێ و ، نامەی پێغەمبەری خوا

ﷺ بۆ دانیشتوانی یەمەن ئەخوێنێتەوە و ، هەمدان هەر هەموویان موسڵمان ئەبن .
بۆ ئەمە ئیمام عەلییش خوا لێی رازیی بێ نامە ئەنێرێ بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ و هەواڵی موسڵمانبوونی هەمدانی ئەداتێ . کە پێغەمبەری خوا ﷺ نامەکە ئەخوێنێتەوە سەجدەی شوکر ئەبات و ، پاشان سەر بەرز ئەکاتەوە و ئەفەرموێ :

(( السلام علی همدان ، السلام عَلی همدان )) .

( ١١ ) وائیلی کوڕی حیجر :

وائیلی کوڕی حیجری کوڕی رەبیعە کە یەکێ لە پادشاکانی یەمەن بوو ، هاتە مەدینە . پێشتر پێغەمبەری خوا ﷺ مژدەی بە هاوەڵانی دابوو و فەرموبووی: (( یأتیکم بقیة أبناء الملوك )) . فەرموویە : ئەو شازادانەی کە ماون ئەوانیش دێن. کاتێ هاتە خزمەتی بەخێرهاتنی گەرمی لێ کرد و ، لە خۆی نزیك کردەوە و، عەباکەی خۆی بۆی راخست تا لەسەری دابنیشێ و فەرمووشی : (( أللهمَّ بارك في وائل وولده ، وولد ولده )) . لە خوا بۆی پاڕایەوە کە بەرەکەت بەسەر خۆی و رۆڵە و رۆڵەی رۆڵەیدا بڕژێنێ . پاشان کاربەدەستیی ئەقیالی لە حەزرەمەوت بە وائیل سپارد.

( ١٢ ) نوێنەری ئەزد :

هەر لە وڵاتی یەمەنەوە نوێنەرانی ئەزدیش هاتنە مەدینەی پایتەختی ئیسلام و ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی بە جل و بەرگ و رێك و پێکیيان کەوت دڵی خۆش بوو و ، پرسیاری لێ کردن : (( ما أنتم ؟ )) . ئێوە چیین ؟ وتیان : ئیمانداریـن . جا دەربارەی حەقیقەتی ئیمانەکەیان پرسیاری لێ کردن ، ئەوانیش پانزە سیفەتیان بۆ هەڵ دا : پێنج سیفەتیان نێرراوەکانت فەرمانیان بەسەرماندا داوە تا ئیمانیان پێ بهێنین و ، پێنجیشیان خۆت فەرمانت داوە ئەنجامیان بدەین و ، پێنجیشیان هەر لە سەردەمی نەفامییدا رەوشتی خۆمانمان پێیان رازاندۆتەوە و ، هەر واین لەسەریان مەگەر تۆ شتێکت بە دڵ نەبێ .

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :

(( ما الخمس التي أمَرَتْکُم بها رسلي أن تؤمنوا بها ؟ )) فەرمووی : ئەو پێنج شتە چین کە نێرراوەکانم فەرمانیان بەسەرتاندا داوە تا ئیمانیان پێ بهێنن ؟

وتیان : فەرمانیان بەسەرماندا دا کە ئیمان بە خوا و ، بە مەلائیکەتەکانی و کتێبەکانی و ، پێغەمبەرەکانی و ، زیندووبوونەوە دوای مردن بهێنین .

فەرمووی : (( وما الخمس التي أمَرْتُكم أن تعملوا بها ؟ )) . فەرمووی : ئەی ئەو پێنج شتە چین کە من فەرمانم بەسەرتان‌دا داوە ؟ وتیان : فەرمانت بەسەرمان‌دا داوە کە بلێین : لاإله إلا الله و ، نوێژ بەجێ بهێنین و ، زەکات بدەین و ، ڕەمەزان بە ڕۆژوو ببین و ، هەر کەسمان توانای هەبوو حەجی ماڵی خوا بکەین .

فەرمووی : ((وما الخمسُ التي تخلقتم بها في الجاهلية ؟ )) . فەرمووی : ئەی ئەو پێنج ڕەوشتەی سەردەمی نەفامییتان کامانەن ؟ وتیان : شوکرانەکردن لە کاتی خۆش گوزەرانیی‌دا و ، ئارام‌گرتن لە کاتی بەلاّ و موصیبەت‌دا و ، ڕازیی‌بوون بە تاڵیی قەزای خوا و ، ڕاستگۆیی و دامەزراویی لە بەرامبەر دوژمن‌دا و ، شایی و کامیی نەکردن بە دوژمنان .

پێغەمبەری خوا ﷺ پێیانی فەرموو : ((حکماء علماء ، کادوا من فقههم أن یکونوا أنبیاء )) . فەرمووی : ئەمانە حەکیم و زانان .. خەریکە بەم شارەزایی‌یەیان ببنە پێغەمبەر ! ( البدایة والنهایة : ٥ / ٩٤ ) .

( ١٣ ) **ئەشعەثی کوڕی قەیس :**

ئەمیش یەکێ بووە لە پادشایانی کیندە و ، لەگەڵ هەشتا سوارچاکی پیاوماقووڵی کیندەدا دێنە مەدینە و ، قژیان هەتا سەرشانیان بەردابوویەوە و ، چاویان بە کل ڕەشتبوو و، جبەی ئەحباریان لەبەر کردبوو و ، بە ئاوریشم کەناریان داپۆشیی بوو. کە چوونە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوت‌دا پێی فەرموون: (( ألم تسلموا ؟ )) فەرمووی : ئەی ئێوە موسڵمان نەبوون ؟ وتیان : بەڵێ . فەرمووی : ((فما بالُ هذا الحریر في أعناقکم )) . فەرمووی : ئەی ئەم ئاوریشمە چیە بە گەردنتانەوە ؟ ئەوانیش خێرا ئاوریشمەکەیان لێ کردەوە و ، فڕێ‌یان دا و موسڵمان بوون .

پاشان ئەشعەثیش ، وەك پیاوانی تری کیندە ، لە کاتی کۆچی دوایی پێغەمبەردا لە ئیسلام هەڵ گەڕایەوە و ، دوایی بە دیل گیرا و هێنرایە خزمەتی ئەبوبەکر خوا لێی ڕازیی بێ . ئەوەبوو لە کاری خۆی پەشیمان بوویەوە و ، گەڕایەوە سەر ئیسلام و ، ئەبوبەکریش ئوم فەروەی خوشکی لێ مارە کرد . ئیتر ئەشعەث لەسەر ئیسلام دامەزرا و ، لە فتووحاتی ئیسلامیی‌دا بەشداریی کرد و ، موسڵمانانیش بە یەك دەنگیی بە هاوەڵیان لە قەڵەم داوە .

( ١٤ ) **نوێنەری دەوس :**

ئەم هۆزە لە سەرەتای ساڵی حەوتەم‌دا نوێنەریان ناردۆتە مەدینە ، کاتێك کە سوپای ئیسلام بۆ غەزای خەیبەر دەرچوو بوو . لە پێشەوە لە باسی سەردەمی

مەککەدا باسی موسڵمانبوونی طوفەیلی کوڕی عەمری دەوسیی کرد ، کە هێشتا پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککەدا بوو . هەر ئەو کاتە طوفەیل ئەگەڕێتەوە ناو هۆزەکەی و ، بانگیان ئەکات بۆ موسڵمانبوون ، کەچیی ئەوان ئەیخاوێنن ، هەتا دەستیان لێ ئەشوات . بۆ ئەمە ئەگەڕێتەوە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و ، داوای لێ ئەکات تا دوعا لە دەوس بکات ، ئەویش ئەفەرموێ : (( أللهم اهدِ دَوساً )) . دوعای هیدایەتیان بۆ ئەکات و ئەوانیش موسڵمان ئەبن . دوای ئەوە طوفەیل لەگەڵ حەفتا تا هەشتا ماڵی هۆزی دەوس‌دا ، لە ساڵی حەوتەم‌دا هاتنە مەدینە و ، لەو کاتەش‌دا پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەیبەر بوو و ، طوفەیل خۆی گەیاندە لای .

( ١٥ ) **نێرراوی فەڕوەی کوڕی عەمری جوذامیی :**

وەك لە بەشەکانی پێشەوە ئاماژەی بۆ کراوە ، فەرماندەیەکی عەرەبیی بووە لە ناو سوپای ڕۆمان‌دا و کاربەدەستی ڕۆمەکان بووە بەسەر عەرەبەکانی ناوچەکەیەوە ، کە لە ناوچەی مەعان و زەوی‌یەکانی شام‌دا بووە . دوای ئەوەی لە غەزای موئتەدا پاڵەوانیی و ڕاستگۆیی موسڵمانەکانی بۆ دەرئەکەوێ ، موسڵمان ئەبێت . کە موسڵمان بوو نێرراوێکی خۆی ناردنە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ تا هەواڵی موسڵمانبوونی پێ بدات و ، ئێسترێکی سپییشی پێشکەش کرد و بۆی نارد . کە ڕۆمەکان هەواڵی موسڵمانبوونی فەڕوەیان بیست ، گرتیان و بەندیان کرد ، پاشان کردیانە سەرپشك یان لە ئیسلام هەڵ بگەڕێتەوە ، یان ئەی‌کوژن . ئەویش خوا لێی خۆش بێ مردنی هەڵ بژارد و لە ئیسلام پاشگەز نەبوویەوە . ئەوەبوو شەهیدیان کرد.

( ١٦ ) **نوێنەری صەداء :**

ئەم نوێنەرانە ، دوای گەڕانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە جیعرانە لە ساڵی هەشتەم دا هاتن . ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ سوپایەکی چوارصەد سەربازیی ئامادە کرد و، فەرمانی دا بەرەو ئەو ناوچەیەی یەمەن بڕۆن کە هۆزی صەدائی لێیە . ئەو سەربازانە لە مەدینە دەرچوون و ، ( صدر قناة ) یان کردە سەربازگە . لەو کاتەدا زیادی کوڕی حاریثی صەدائیی ئەم هەواڵەی بیست ، بە پەلە خۆی گەیاندە خزمەتی ئازیز و وتی : من بە نوێنەرایەتیی هۆزەکەم هاتوومەتە لات .. ئەو سوپا بگێڕەرەوە و ، هۆزەکەم لەسەر من . پێغەمبەری خواش ﷺ سوپاکەی گێڕایەوە و ، زیادیش گەڕایەوە ناو خزمەکانی و هێنانیە سەر ئەوە کە ئامادە بن بچنە مەدینە . ئەوەبوو پانزە پیاوی لەگەڵ خۆی‌دا هێنا و ، بەیعەتیان بۆ موسڵمانبوون دا و ، پاشان

گەڕانەوە بۆ ناو خزمەکانیان و ، بانگیان کردن بۆ موسڵمانبوون . بەمە ئیسلامیان لە ناودا بڵاو بوویەوە و ، بۆ حەجی ماڵ ئاوایی صەد پیاویان ئامادەی حەج بوون لە خزمەتی ئازیزدا ﷺ .

( ١٧ ) نوێنەری عوذرە :

ئەم نوێنەرانە لە مانگی صەفەری ساڵی نۆهەمدا هاتوونەتە مەدینە ، کە دوانزە پیاو بوون و حەمزەی کوڕی نوعمانیان لەگەڵدا بوو . کە پرسیاریان لێ کرا ، ئەو کەسەی کە بە ناوی نوێنەرەکانەوە وەڵامی ئەدایەوە وتی : ئێمە نەوەی عوذرەین و ، برای دایکیی قوصەین .. ئێمە بووین پشتگیریی قوصەیمان کرد و ، لە مەککەدا خوزاعە و نەوەی بەکرمان دەرپەڕاند .. ئێمە خزمایەتیی و رەحممان لەگەڵتانا هەیە. پێغەمبەریش ﷺ بەخێرهاتنی لێ کردن و ، مژدەی فەتح‌کردنی شامی پێ دان و، فەرمانی بەسەردا دان کە پرسیار لە ئافرەتە کاهینەکە نەکەن و ، ئەو ئاژەڵانەش سەر نەبڕن کە لەوەوپێش بۆ بتەکانیان سەر ئەبڕین . نەوەی عوذرە موسڵمان بوون و چەند رۆژێك لەوێ مانەوە و ، پاشان گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان .

( ١٨ ) نوێنەری بولەی :

ئەمانیش لە مانگی رەبیعی یەکەمی ساڵی نۆهەمدا هاتنە مەدینە و موسڵمان بوون و سێ رۆژ لە مەدینە مانەوە . ئەوەبوو ئەبوضبیبی سەرۆکیان دەربارەی میوان داریی پرسیاری کرد : کە ئایا پاداشتی هەیە ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( نعم ، وكل معروف صنعته إلى غني أو فقير فهو صدقة )) . فەرمووی : بەڵێ ، هەموو چاکەیەك کە لەگەڵ دەوڵەمەنددا یا هەژاردا بیکەیت ئەوە بە صەدەقە ئەژمێررێ . دەربارەی ماوەی میوانداریش پرسیاری کرد، فەرمووی: (( ثلاثة أيام )). دەربارەی مەڕی گوم بوویش پرسیاری کرد ، لە وەڵام فەرمووی : (( هي لك أو لأخيك أو للذئب )) . فەرمووی : مەڕی گوم بوو یان بۆ تۆیە ، یان بۆ براکەتە ، یان بۆ گورگە . واتە ئەگەر دۆزیتەوە، گلی بدەرەوە ئەگینا ئەفەوتێ . دەربارەی وشتری گوم بوویش پرسیی ، وەڵامی دایەوە : (( مالَكَ وله ؟ دعه حتى يجده صاحبه )) . فەرمووی : چیت داوە لێی ؟ لێی گەڕێ تا خاوەنەکەی ئەی دۆزێتەوە ، واتە ئەو نافەوتێ .

( ١٩ ) نوێنەری نەوەی فەزارە :

ئەمانیش دوای گەڕانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە تەبووك و لە ساڵی نۆهەمدا ، دە و ئەوەندە پیاویان هاتن و ، دانیان بە راستیی ئیسلامدا نا و ، دادی وشك و

برنگیی ولاتەکەیان و بێخێر و بێرییان کرد . ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ سەرکەوتە سەر مینبەر و ، هەردوو دەستی بەرز کردنەوە و ، داوای بارانبارینی کرد کە فەرمووی : (( أللهم اسق بلادك وبهائمك ، وانشر رحمتك ، أحيي بلدك الميت ، أللهم اسقنا غيثاً ، مغيثاً ، مريحاً ، مريعاً ، طَبَقاً ، واسعاً ، عاجلاً ، غير آجل ، نافعاً غير ضارّ ، أللهم سقيا رحمةٍ ، لا سقيا عذاب ، ولا هدم ، ولا غَرَقٍ ، ولا محقٍ ، أللهم اسقنا الغيث ، وانصرنا على الأعداء )) . ( زاد المعاد : ٣ / ٤٨ ) .

**( ٢٠ ) نوێنەری توجیب :**

ئەمانیش کە بریتیی بوون لە سیانزە پیاو هاتنە مەدینە و ، پێغەمبەری خوا ﷺ بە هاتنیان زۆر دڵخۆش بوو و ڕێزی لێ گرتن .. زۆر حەزیان لە شارەزایی قورئان و سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا بوو ، بۆیە لەو بارەوە پرسیاریان کرد و ، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی نووسین و ، فەرمانیشی دا بیلال بە چاکیی میوانداریان بکات . ئەم نوێنەرانە پێش هاتنیان لە ناوچەی خۆیاندا زەکاتیان کۆ کردبوویەوە و ، ئەوەی کە لە هەژارەکانی خۆیان زیاد بوو هێنابوویان بۆ مەدینە .. ئەم نوێنەرانە چەند ڕۆژێکی کەم مانەوە ، لێیان پرسیین : پەلەتان چییە ؟ وتیان : ئەگەڕێینەوە بۆ لای ئەو کەسوکارەمان کە بە جێمان هێشتوون و ، هەواڵیان ئەدەینێ کە پێغەمبەری خوامان ﷺ دیوە و ، قسەمان لەگەڵیا کردووە و ، وەڵامی داوینەتەوە . پێغەمبەری خواش خەڵاتی پێ دان و ، کە ویستیان بگەڕێنەوە منداڵێکیان نارده خزمەتی ، کە بەلای کەل و پەلەکەیانەوە بەجێیان هێشتبوو . منداڵەکە هات و وتی : بەخوا لە وڵاتی خۆمەوە بۆ ئەوە هاتووم کە لە خوای گەورە داوا بکەی لێم خۆش ببێ و ڕەحمم پێ بکات و ، دەوڵەمەندییش بخاتە دڵمەوە . ئەویش دوعای بۆ کرد و ، لە هەموو کەس قەناعەتی زیاتر بوو و ، لە کاتی پاشگەزبوونەوەی عەرەبەکاندا ئەو لەسەر ئیسلام دامەزراو بوو و ، ئامۆژگاریی قەومەکەی کرد و ئەوانیش بە دامەزراویی مانەوە . ئەم نوێنەرانە جارێکی تر لە ساڵی دەهەمدا و ، لە حەجی ماڵئاواییدا ، لە مینا بە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتنەوە .

**( ٢١ ) نوێنەری دار :**

هەروەها دوای غەزای تەبووك نوێنەری دارییەکانیش هات ، کە بریتیی بوو لە دە پیاو کە تەمیمی داریی و نوعەیمی برای لەگەڵیانا بوون . ئەمانە نەصارا بوون و موسڵمان بوون . لە مەدینە مانەوە هەتا کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ ، کە

ئەوە بوو پارچە زەوی‌یەکی لە شام پێشکەش بە تەمیم کردبوو . کە ئەبوبەکری صدديق خوا لێی رازیی بێ بووە خەلیفە پێی دا ..

( ٢٢ ) نوێنەری تەغليب :

بريتيی بوون لە شانزە پیاو هەندێکیان موسڵمان بوون و هەندێکیشیان گاور بوون و صەلیبی زێڕیان لە ملدا بوو . پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ گاورەکانیاندا ڕێك کەوت بەو مەرجەی منداڵەکانیان لە ناوی ( مەعموديە ) هەڵ نەکێشن و ، خەڵاتی موسڵمانەکانیشی کرد ..

( ٢٣ ) نوێنەری نەوەی زوبەید :

ئەوانیش هاتن و ، سوارچاکی بەناو بانگی عەرەبیشیان لەگەڵ دابوو کە ناوی عەمری کوڕی مەعدیکەریبە بوو .

هەروەها نوێنەری هۆزی موزەینە کە چوارصەد پیاو ئەبوون هاتنە مەدینە و ، نوێنەرانی ئەسەد و بەهرا و ( ذي مرة ) و ( خولان ) و ( غسان ) و ( محارب ) و ( غامد ) و ( نخع ) یش هاتن و موسڵمانبوونیان دەربڕیی .

ئەو نوێنەرانە ئەهاتن و فێری ئیسلام ئەبوون و ، شارەزای دین ئەبوون و ، بە چاوی خۆیان ڕەوشتی پاك و خاوێنی پێغەمبەری خوا ﷺ و هەڵس‌وکەوتی هاوەڵە بەڕێزەکانیان ئەدیی .. لە حەوشەی مزگەوتدا چادریان بۆ هەڵ ئەدرا ، ئیتر قورئانیان ئەبیست و ، چاویان لە موسڵمانان بوو نوێژیان بەجێ ئەهێنا و ، بەوپەڕی ئاسایی‌یەوە هەر پرسیارێك بە دڵیاندا بهاتایە لە پێغەمبەری خوایان ﷺ ئەپرسیی و ، ئەویش بەوپەڕی بەلاغەت و حیکمەتەوە وەڵامی ئەدانەوە و ، بە ئایەتەکانی قورئانیش نموونەی بۆ ئەهێنانەوە و ، ئەوانیش ئیمانیان ئەهێنا و ، دڵیان لە متمانە پڕ ئەبوو..[٣٢٢]

## حەوتەم : نێرراوی شارەزاکردن و ڕێکخستنی سامان

( ١ ) ناردنی سريەی خالیدی کوڕی وەلید :

هۆزە ناودارەکانی وڵاتی یەمەن هەر هەموویان هاتنە مەدینە و موسڵمانبوونیان ڕاگەیاند ، جگە لە هۆزی حاریثی کوڕی کەعب کە خۆیان گرتە کەنار و نەهاتن بە

---

[٣٢٢] الرحيق المختوم : ٤٥٨ ـ ٤٦٧ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٥٤١ ـ ٥٥٤ ، السيرة النبوية للندوي : ٣٨٣ ـ ٣٨٧ ، السيرة النبوية للصلابي : ٨٦١ ـ ٨٦٦ .

دەم ئیسلامەوە . بۆ ئەمە پێغەمبەری خوا ﷺ لە مانگی رەبیعی دووهەم یان جومادیی یەکەمدا خالیدی کوڕی وەلیدی نارد بۆ ناوچەکەیان لە نەجران و ، فەرمانی بەسەردا دا بانگیان بکات بۆ موسڵمانبوون . جا ئەگەر موسڵمان بوون ئەوا باشە و گەر بە دەمیەوە نەهاتن لەگەڵیان بجەنگێ ..

خالید گەیشتە ناوچەکەیان و بانگی کردن و ئەوانیش موسڵمان بوون .. ئەوەبوو خالید ماوەیەك لە ناویاندا مایەوە ئەحکامی ئیسلام و زانستی قورئان و سوننەتی پێغەمبەری خوای ﷺ فێر ئەکردن . پاشان نامەیەکی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ نارد و هەواڵی موسڵمانبوونی ئەو هۆزەی پێ راگەیاند . ئەویش نامەی بۆ نووسین و تیایا ئامۆژگاریی ئەو نەوموسڵمانانەی کرد و ، فەرمانیشی دا خالید بگەڕێتەوە و هەندێکیشیان بە نوێنەریی لەگەڵ خۆیدا بهێنێ ..

خالیدیش فەرمانەکەی بەجێ هێنا و لەگەڵ نوێنەرەکانیاندا هاتەوە مەدینە ، کە یەکێ لە پیاوە ناودارەکانیان قەیسی کوڕی حوصەین بوو . کە گەیشتن پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمایشتی لەگەڵیانا کرد و لێی پرسین : (( بِمَ کنتم تغلِبونَ من قاتلکم في الجاهلية ؟ )) . پرسیی : لە سەردەمی نەفامییدا بە چیی بەسەر ئەو دوژمنەدا سەرئەکەوتن کە لەگەڵتان ئەجەنگیی ؟ وتیان : ئێمە یەکمان ئەگرت و پەرتەوازە نەئەبووین و ، بۆ ستەمکردن لە هیچ کەسیش دەستپێشخەرییمان نەئەکرد. فەرمووی: (( صدقتم )) . پاشان قەیسی کوڕی حوصەینی کردە ئەمیریان و ، لە شەووال یان لە سەرتای ذولقەعیدەدا گەڕانەوە بۆ ناوچەکەی خۆیان .

کە نوێنەرەکان مەدینەیان بەجێ هێشت پێغەمبەری خوا ﷺ عەمری کوڕی حەزمی بە دوایانا نارد هەتا لە دین شارەزایان بکات و سوننەتەکانیان فێر بکات و ، زەکاتیشیان لێ وەربگرێ و ، نامەیەکیشی بۆ نووسیی تا بزانێ چۆن هەڵس و کەوتیان لەگەڵ بکات و ، چۆن خەریکی پەروەردە و فێرکردن و ئامۆژگارییان بێت . هەروەها وەرگرتنی پێنجیەکی دەستکەوتەکان و ، وەرگرتنی زەکاتی کشتوکاڵ و زەکاتی ئاژەڵی بۆ نووسیی .

( ٢ ) ناردنی سریەی عەلیی کوڕی ئەبوطالیب :

هەروەها لە مانگی رەمەزانی ساڵی دەهەمدا پێغەمبەری خوا ﷺ عەلیی کوڕی ئەبوطالیبی بە کۆمەڵێك موسڵمانەوە نارد بۆ سەر نەوەی مەذحەج ، کە ئەویش هۆزێکی یەمەنییە و ، بە دەستی مویارەکی مێزەری لە سەری بەست و پێی فەرموو:

(( سر حتى تنزل بساحتهم ، فادعهم إلى قول : لا إله إلا الله ، فإن قالوا : نعم ، فمرهم بالصلاة ، ولا تبغ غير ذلك ، ولئن يهدي الله بك رجلاً واحداً خير لك مما طلعت عليه الشمس ، ولا تقاتلهم حتى يقاتلوك )) . فەرمووی : بڕۆ هەتا ئەگەیتە ناوچەکەیان ، ئەوسا بانگیان بکە بۆ وتنی ( لا إله إلا الله ) . ئەگەر ئەوەیان وت فەرمانیان بەسەردا بکە بە نوێژکردن و ، لەوە زیاتریان داوا لێ مەکە . ئەگەر خوا لەسەر دەستی تۆیش‌دا تاقە پیاوێك هیدایەت بدا لە هەموو ئەوە چاکترە کە خۆری لێ هەلاتووە . هەتا ئەوان لەگەڵت‌دا نەجەنگێن تۆ جەنگ نەکەی .

لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە جەنگ روو نەدات و دڵەکان فەتح بکرێن .

کە گەیشتە ناوچەکەیان تووشی خەڵکێکی جەم بوویان بوو و ، بانگی کردن بۆ سەر ئیسلام . ئەوان ملیان بەوە نەدا و کەوتنە تیرهاویشتن بۆ موسڵمانەکان . عەلییش خوا لێی رازیی بێ سوپاکەی ریز کرد و ، فەرمانی جەنگی بۆ دەرکردن . دەستیان دایە جەنگ و دوژمنیان تێك شکاند و ، کەمێك لێیان گەڕا و دوایان نەکەوت ، پاشان دوایان کەوت و بانگی کردن بۆ سەر ئیسلام ، ئەوانیش بە دەمیەوە هاتن و سەرۆکەکانیان بەیعەتیان پێ دا و وتیان : ئێمە سەرداری قەومەکەمانین ، مافی خوامان لێ وەربگرە . ئەویش بەو جۆرەی کرد ..

هەروەها لە رەمەزانی ساڵی دەهەمی کۆچیی‌دا جەریری کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلیی لەگەڵ صەد و پەنجا پیاوی هۆزەکەی‌دا هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ . ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ پێش ئەوەی دەربکەون فەرمووی : (( يطلع عليكم من هذا الفج من خير ذي يمن ، على وجهه مسحة مَلَك )) . فەرمووی : ئێستە لەم رێگایەوە پیاوێکی چاکی یەمەنیی لێتان دەرئەکەوێ ، کە شوێنی دەست لێ‌دانی مەلائیکەت بەسەر دەم و چاویەوەیە . دوای ئەوە جەریر بە سواریی وشترەکەی و قەومەکەشی لەگەڵ‌دا بوو سەریان دەرهێنا و موسڵمان بوون و بەیعەتیشیان دا ..

ریوایەتیش کراوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ قوماشێك ئەدا بەسەر جەریردا و ، پاشان ئاوڕ بۆ لای هاوەڵانی ئەداتەوە و ئەفەرموێ: (( إذا أتاكم كريم قوم فأكرموه )). ئەگەر پیاوی بەڕێزی هەر کۆمەڵێك هاتە ناوتان رێزی لێ بگرن .

لە هەردوو صەحیحی بوخاریی و موسلیم‌یش‌دا لە جەریرەوە هاتووە کە وتوویە : لەسەر بەجێ هێنانی نوێژ و ، زەکات‌دان و ، ئامۆژگاریی‌کردنی هەموو موسڵمانێك بەیعەتم بە پێغەمبەری خوا ﷺ داوە .

هەروەها قەیسی کوڕی عەزرەی ئەحمەسیی بە خۆی و دووصەد و پەنجا پیاوی هۆزی ئەحمەسەوە ـ کە لەگەڵ بەجیلەدا دوو هۆزی باوك برا بوون ـ هاتنە مەدینە و ، پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیی : (( مَن أنتم ؟ )) . وتیان : ئێمە ( أحمس الله ) ین . ئەویش فەرمووی : (( وأنتم اليوم لله )) . فەرمووی : ئەمڕۆش ئێوە هەر ئەحمەسی خوان . بە بیلالیشی فەرموو : (( أعط ركب بجيلة وابدأ بالأحمسيين )) . فەرمووی : دیاریی بە سوارچاکانی بەجیلە بدە ، بەڵام لە پێشەوە لە ئەحمەسییەکانەوە دەست پێ بکە . ئەویش وای کرد .

کاتێك کە جەریر موسڵمان بوو پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو : (( ألا تريحني من ذي الخَلَصة ؟ )) . فەرمووی : ئەوە لە دەست ذولخەصە رزگارم ناکەی ؟

ذولخەلەصە : ماڵێك بووە لە یەمەن کە هۆزی خوثعەم بۆ بەرابەرکێی کەعبە دروستیان کردبوو و ، بتی تێدا بوون ئەپەرستران .

جەریر بە خۆی و دووصەد و پەنجا پیاوی ئەحمەسییەوە کە خاوەنی ئەسپ بوون کەوتنە رێ . بەڵام جەریر بە لای پێغەمبەرەوە ﷺ دادی ئەوەی کرد کە بەسەر ولاغەوە خۆی پێ ناگیرێ . پێغەمبەری خواش ﷺ دای بەسەر سنگیدا و دوعای بۆ کرد و فەرمووی : (( أللهم ثبته واجعله هادياً مهدياً )) . دوعای بۆ کرد کە خوا دامەزراوی بکات و بیکاتە پیاوێکی هیدایەتدەر و هیدایەتدراو . ئیتر دوای ئەوە جەریر لەسەر ئەسپ نەکەوتە خوارەوە .. پاشان بە خۆی و ئەسپ سوارەکانیەوە خۆیان گەیاندە لای ئەو ماڵە و رووخاندیان و سووتاندیان و ، مژدەشی بۆ پێغەمبەری خوا نارد و ، ئەویش پێنج جار پیرۆزبایی لە ئەسپ و ئەسپ سوارانی ئەحمەس کرد .

**٣ ـ ناردنی موعاذی کوڕی جەبەل بۆ یەمەن :**

پێغەمبەری خوا ﷺ موعاذی جەبەلی ئەنصاریی خەزرەجیی ، زانای بەناوبانگ لە حەلاڵ و حەرامدا ، بە قازیی و فەقیە و ئەمیر و زەکات کۆکەرەوە نارد بۆ ولاتی یەمەن و ، کردییە کاربەدەستی ناوچەی باکووری یەمەن . پێغەمبەری خوا ﷺ نامەیەکی بۆ دانیشتوانی یەمەن نووسیی و تیایا ئەی فەرموو : (( إني بعثت لكم خير أهلي )) . فەرمووی : چاکترین کەس وکاری خۆمم ناردووە بۆ لاتان .

کاتێك کە موعاذ کەوتە رێ ، بۆ خواحافیزیی و ئامۆژگاریی پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتە گەلی ، موعاذ بە سواریی و پێغەمبەریش بە پیادە لەگەڵ وشترەکەی موعاذدا ئەڕۆی . ئامۆژگارییەکی زۆری کرد کە ئەمە یەکێکیانە : (( إتقِ اللهَ حيثما كنت ،

وأتبع السيئة الحسنة تمحها ، وخالق الناس بخلق حسن )) . ( رواه أحمد والترمذي ) .
ئەفەرمویٚ : لە هەموو بارودۆخێك‌دا شەرمی خوا بکە و ، بە دوای هەر خراپەیەك‌دا چاکەیەك ئەنجام بدە ، ئەی‌سڕێتەوە .. بە ڕەوشتی جوانیش لەگەڵ خەڵکیی هەڵس وکەوت بکە .

کاتێکیش پێی خستە ئاوزەنگیی وڵاغەکەیەوە پێی فەرموو : (( حَسِّن خُلُقك للناس )) . ( رواه مالك في الموطأ ) .

هەروەها پێی فەرموو : (( إنك ستأتي قوماً أهل كتاب ، فأذا جئتهم فادعُهم إلى أن يشهدوا أن لا إله إلا الله ، وأن محمداً رسول الله ، فإن هم أطاعوا لك بذلك فأخبرهم أن الله فرض عليهم صدقة تؤخذ من أغنيائهم فترد على فقرائهم ، فإن هم أطاعوا لك بذلك فإياك وكرائم أموالهم ، واتق دعوة المظلوم فإنه ليس بينها وبين الله حجاب )) . ( رواه البخاري ومسلم وغيرهما ) .

پێی‌فەرموو : ئەچیتە ناو کۆمەڵێکەوە کە ئەهلی کیتابن . کە چوویتە ناویان بانگیان بکە تا شاهێدیی لەسەر تاك و تەنیایی خوا و پێغەمبەرایەتیی موحەممەد بدەن. جا ئەگەر بۆ ئەوە گوێڕایەڵت بوون ، ئەوا ئاگاداریان بکە کە لە هەموو شەو و ڕۆژێك‌دا خوا پێنج نوێژی لەسەر فەرز کردوون . ئەگەر بۆ ئەوەش گوێڕایەڵت بوون ، ئەوا ئاگاداریان بکە کە خوا زەکاتی لەسەر فەرز کردوون کە لە دەوڵەمەندەکانیان وەرئەگیرێت و ئەدرێتەوە بە هەژارەکانیان . ئەگەر بۆ ئەوەش گوێڕایەڵت بوون ، ئەوا نەکەی دەست بۆ پارە و سامانیان بەریت و ، لە دوعای ستەم لێ‌کراویش بترسە . چونکە لە نێوان ئەو دوعایە و خوای گەورەدا پەردەیەك نیە .

بە کورتە نەخشەی داد و یەکسانیی و مافی مرۆڤ و حوکمڕانیی بە دەست پاکیی بۆ موعاذ کێشا ، تا ببێتە حوکمڕانێکی ڕەببانیی و کاروباری کۆمەڵگای خواناس هەڵ بسووڕێنێ .

یەکەم جار ئیمان‌هێنان ، پاشان خواپەرستیی ، دوای ئەوە خۆپاراستن لە حەرام بە تایبەت پارە کۆکردنەوە و پێکەوەنانی سامانی حەرام بە گزیی و بەرتیل و لادان ، تا دەست و دەم و پاکیی هەڵگرانی ئیسلام دەربکەوێ و بەو بۆنەوە مەردومەکان دڵیان نەرم ببێ و ڕوو لە ئیسلام بکەن .

دوای ئامۆژگاریی پێویست پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی زانستی موعاذ تاقیی بکاتەوە ، کە چۆن حوکم دەرئەکات بۆ ئەو کێشانەی کە دێنە بەردەمی . بۆ ئەمە

لێی پرسیی : (( كيف تصنع إن عرض لك قضاء ؟ )) . فەرمووی : ئەگەر داوەرییەك هاتە بەردەمت چیی ئەكەیت ؟ وتی : بە پێی قورئانی پیرۆز حوكم دەر ئەكەم . فەرمووی : (( فإن لم يكن في كتاب الله ؟ )) . فەرمووی : ئەی ئەگەر لە قورئاندا نەبوو ؟ وتی : بە سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ . فەرمووی : (( فإن لم يكن في سنة رسول الله ؟ )) . فەرمووی : ئەی ئەگەر لە سوننەتی پێغەمبەری خوادا نەبوو ؟ وتی : ئیجتیهاد ئەكەم و درێغیی ناكەم . پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی لەسەر سنگی دا و پاشان فەرمووی : (( الحمد الله الذي وفق رسولَ رسولِ الله لما يُرضي رسول الله )) . ( رواه أحمد وأبوداود والترمذي وابن ماجه ) . فەرمووی : سوپاس بۆ ئەو خوایەی كە تەوفیقی نێرراوی پێغەمبەری خوای داوە بۆ ئەنجامدانی ئەو كارەی كە پێغەمبەری خوا رازیی ئەكات.

دوای هەموو ئەمانە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( يا معاذ ! إنك عسى أن لا تلقاني بعد عامي هذا ، ولعلك أن تمر بمسجدي هذا وقبري )) . فەرمووی : ئەی معاذ! لەوانەیە لەم ساڵ بە دواوە پێم نەگەیتەوە و ، لەوانەشە بەلای ئەم مزگەوتەم و قەبرەكەمدا تێپەڕ بكەی . موعاذ لە خەفەتی جیابوونەوەی لە پێغەمبەر دەستی بە گریان كرد . هەرواش دەرچوو . موعاذ لە یەمەن مایەوە و نەهاتەوە مەدینە هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ كۆچی دوایی كرد .

**٤ ـ ناردنی ئەبومووسای ئەشعەریی بۆ یەمەن :**

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبومووسای ئەشعەریی یەمەنیی نارد بۆ یەمەن و، كردییە كاربەدەستی بەشی خوارووی یەمەن ، بە شێوەی قازیی و فەقیه و ئەمیر و زەكات كۆكەرەوە و ، لەگەڵ موعاذدا ئامۆژگاریی كردن و فەرمووی : (( يَسِّرا ولا تُعَسِّرا ، وبشرا ولا تنفرا ، وتطاوعا ولا تختلفا )) . ( رواه البخاري ) . فەرمووی: كارئاسانیی بكەن نەك قورس كردن ، مژدە بدەن نەك خەڵك بتارێنن ، لە نێوان خۆتاندا گوێڕایەڵی یەكتر بن و ناكۆك مەبن .

هەردووكیان بەرەو یەمەن كەوتنە رێ و ، هەریەكەیان خۆی گەیاندە ناوچەی حوكمڕانی یەكەی و ، هەردووكیان سەردانیان لە یەك ئەكرد و ، لەبەر خوا یەكیان خۆش ئەویست .

ئەبومووسا ئەوەندە دەست پاك و خواناس و رێك و پێك بوو ، هەر سێ خەلیفە عومەر و عوثمان و عەلیی خوا لێیان رازیی بێ بڕوایان بە پاكیی ئەو هەبوو و، كاریان پێ سپارد .

**٥ ـ ناردنی عەلیی کوڕی ئەبوطالیب :**

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ عەلیی نارد بۆ یەمەن تا پێنج یەکی ئەو دەست کەوتانە وەربگرێ کە خالیدی کوڕی وەلید دەستی کەوتبوون ، لە ئەنجامی ئەوەدا کە خەریکی غەزا بوو لە یەمەندا و ، تا بچێتە شوێنەکەی .

لە صەحیحی بوخارییدا هاتووە کە عەلیی لە پێنج یەك پارچە زێڕێك ، کە هێشتا پاڵفتە نەکرابوو ، ئەنێرێتەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ، ئەویش بە شێوەی دیاریی بەشی ئەکات بەسەر چوار کەسدا : عویەینەی کوڕی حیصن و ، ئەقرەعی کوڕی حابیس و ، ( زید الخیل ) و ، عەلقەمەی کوڕی عولاثەی عامیریی . هەروەها بە کۆکەرەوەی زەکاتیش ئەی نێرێ وەك بەیهەقیی ریوایەتی کردووە ( البداية والنهاية : ٥ / ١٠٥ ).

هەروەها کاری ( قضاء ) یشی پێ سپێرراوە :

ئەحمەد و ئەبوداود و تیرمیذیی لە عەلییەوە خوا لێی رازیی بێ ریوایەتیان کردووە کە فەرموویە : پێغەمبەر ﷺ رەوانەی کردم بۆ یەمەن . منیش وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەمنێریتە ناو قەومێکەوە کە لە من بە تەمەنترن و ، منیش کەم تەمەنم و ( قضاء ) نازانم ؟ دەستی خستە سەر سنگم و فەرمووی : (( أللهم ! ثَبّتْ لِسانَهُ ، وَاهدِ قلبَهُ )) . فەرمووی : خوایە ! زمانی دامەزراو بکە و ، دڵیشی هیدایەت بدە . هەروەها فەرمووی : (( يا علي ! إذا جلس إليك الخصمان فلا تقض بينهما حتى تسمع من الآخر، فإنك إن فعلت ذلك تبين لك )) . فەرمووی : کە دوو ناکۆکەکە لەبەر دەستتدا دانیشتن هیچ بڕیارێکیان بۆ دەرنەکەیت هەتا چاك گوێ لە هەردووکیان بگریت . جا ئەگەر وەهات کرد مەسەلەکەت بۆ روون ئەبێتەوە . عەلیی ئەی فەرموو: ئیتر لەوەو دوا هیچ ( قضاء ) یکم لێ تێك نەچوو . ( فتح الباري : ٨ / ٥٣ ) .

کاتێك کە ئیمام ئەگەڕێتەوە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ، لە مەککە و لە کاتی حەجی ماڵ ئاواییدا پێی ئەگاتەوە .[٣٢٣]

[٣٢٣] السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٥٥٥ ـ ٥٦١ ، السيرة النبوية للصلابي : ٨٦٦ ـ ٨٦٨ .

# بەشی چل و پێنجەم

# حەجیماڵئاوایی

**یەکەم : ناوەکانی ئەم حەجە**

حەج پایەیەکە لە پێنج پایەکەی ئیسلام و ، لە ساڵی دەهەمی کۆچییدا فەرز کراوە ؛ ئەمەش بە پێی بۆچوونی ( إبن القیم ) و لەو بارەوە بەڵگەی بەهێزی هێناونەتەوە و ، ئەوەش بۆ رەوشتی پێغەمبەری خوا شیاوترە ؛ چونکە ئەگەر زووتر فەرز بوایە ، دوای نەئەخست . قورئانی پیرۆز ئەفەرموێ : ﴿ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً ﴾ ( آل عمران : ٩٧ ) . ئەم ئایەتە لە کۆتایی ساڵی نۆهەم ، واتە ساڵی نوێنەراندا هاتۆتە خوارەوە ..

ئەوەبوو لە هەموو لایەکی دوورگەوە نوێنەران روویان کردە مەدینە و ، سەراپای دوورگە ئیمانی هێنا و ، کەوتە شوێن دینی تەوحید . هەروەها پایە و ئەحکامەکانی شەریعەتی ئیسلام لەلایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ بە جوانیی روون کرابوونەوە و ، تەنها پایەی حەج مابوو بە شێوەی وتن و کردەوە روون بکرێتەوە . دیارە لە سەردەمی ئیبراهیم خەلیلەوە سەلامی لێ بێ عەرەبەکان حەجی ماڵی خوایان ئەکرد ، جا لەو ماوە دوور و درێژەدا چەندین کاری نەشیاو تێکەڵ بە حەج بوو بوون و ، پێویست بوو پێغەمبەری نازدار لە ژیانی خۆیدا حەجیان لێ پاك بکاتەوە . ئەوەتا دەری ئەبڕێ کە ئەم حەجە میراتی ئیبراهیمی باوکە گەورەیانە کە ئەفەرموێ : (( کونوا علی مشاعرکم، فإنکم علی إرث من إرث أبیکم إبراهیم )) . ( رواه النسائي وأبوداود والترمذي وابن ماجه ).

هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا ئامۆژگاریی موسڵمانان ئەکات کە کاروباری حەج بە جوانیی وەربگرن ؛ چونکە لەوانەیە ئەمە دوا حەجی خۆی بێت ؛ کە ئەفەرموێ: (( لتأخذوا مناسککم ؛ فإني لا أدري لعلي لا أحج بعد حجتي هذه )) . رواه مسلم.

هەر بەم فەرموودە موسڵمانانی ئاگادار کردن کە کاتی لێك جوێبوونەوە نزیکە و هاکا سەفەری قیامەتی هاتە بەرەوە .

بەم بۆنەوە ئەم حەجەی ناو نراوە حەجی ماڵئاوایی ( حجة الوداع ) ، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ بەم فەرمایشتەی ماڵئاوایی لێیان کرد .
هەروەها ناویش نراوە ( حجة الإسلام ) چونکە ئەمە یەکەم حەج بوو کە لە دوای کۆچکردن بۆ مەدینە پێغەمبەری ئیسلام ﷺ ئەنجامی بدات .. بەلاّم پێش کۆچ کردن چەندین جار ، پێش هاتنی وەحی و دوای هاتنیشی ، حەجی کردووە .
هەروەها ناویش نراوە ( حجة البلاغ ) چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ بە جوانیی هەموو کارەکانی حەجی شەرعیی پیشان موسڵمانەکان دا و ، حوکمە شەرعیی‌یە گرنگەکان و ، مافی مرۆڤەکان و ، بە تایبەتیی مافی ئافرەتانی هێنانەوە یادی موسڵمانان ، وەك لە دواوە باسی دێت و ، موسڵمانانی کردنە شاهێد ..

## دووهەم : جاڕدان و بەڕێ کەوتن

کە مانگی ذولقەعیدەی ساڵی دەهەم هاتە بەرەوە پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ دەستی بە خۆپێچانەوە کرد بۆ حەج و ، خەڵکیشی لەو نیازەی ئاگادار کرد و، فەرمانی دا ئەوانیش خۆیان ئامادە بکەن . ئەوەبوو موسڵمانان زۆر بە چاکیی بە دەم ئەم بانگەیەوە هاتن و ، خۆیان ئامادە کرد .. ئەوەبوو لە هەموو لایەکەوە ، لە گوند و شارەکانەوە .. لە دەشت و شاخەوە .. لە چەم و دۆڵ و بیابانەکانەوە .. موسڵمانان بە پیادە و بە سواریی ، هاتن بە دەم فەرمانەوە ..
موسڵمانان بەوپەڕی تاسەوە حەزیان لە حەجی ماڵی خوا بوو ، کە دەمێك بوو لێیان قەدەغە کرا بوو .. زۆریان پێ خۆش بوو لە خزمەتی ئازیزدا ئەو خواپەرستی‌یە گرنگە ئەنجام بدەن ، تا بە هاوەڵێتیی ئازیز شەرەفمەند بن و ، جوان جوان سەیری ناوچاوانی بکەن و ، گوێ لە فەرمایشتەکانی بگرن . بۆ ئەمە بە دەوری مەدینەدا ئەوەندە چادریان هەڵ دا کە جێی صەد هەزار کەس زیاتریان تیا ببێتەوە ..
کە خەڵکی مەدینە و دەوروبەری لە مەدینە کۆ بوونەوە ، لە رۆژی شەممەی بیست و پێنجەم رۆژی مانگی ذولقەعیدە ، پێغەمبەری خوا ﷺ ، دوای ئەوەی کە نوێژی نیوەڕۆی بە چوار رەکعەت لە مەدینەدا بە جێ هێنا ، لەگەڵ ئەو دەیان هەزار خەڵکەدا کەوتە رێ و، ئەبودوجانە، یان سیباعی کوڕی عەرفەطەی لە مەدینە لە جێی خۆی دانا.

ڕۆیشتن هەتا گەیشتە ( ذوالحليفة ) ی[٣٢٤] نزیکی مەدینە و ، لەوێ بە دوو ڕەکعەت نوێژی عەصری بەجێ هێنا و ، ئەو شەوە لەوێ مایەوە . کە ڕۆژ بوویەوە بۆ بەستنی ئیحرام خۆی شۆرد و ، خۆی بۆن خۆش کرد و ڕۆنی سەری لە سەری دا تا نەدڕێ و پاك و خاوێن بێ و ، دوو ڕەکعەت نوێژیشی بەجێ هێنا .

پێغەمبەری خوا ﷺ صەد وشتری بۆ ( هدي ) لەگەڵ خۆی‌دا هێنا تا لە حەج‌دا سەریان ببڕێت . پاشان سواری وشترەکەی ( القصواء ) بوو و ، بە نیازی حەجەوە دەستی بە ( إهلال ) کرد و ئەی‌فەرموو : (( لبيك اللهم لبيك ، لبيك لا شريك لك لبيك ، إن الحمد والنعمة لك والملك ، لا شريك لك )) . لە ڕێگادا عومرەشی خستە حەجەکەی و فەرمووی : (( لبيك بعمرة وحجة )) . بەڵام موسڵمانەکان هی وایان هەبوو ئیحرامی بۆ حەج بەستبوو و ، هی واشیان هەبوو بۆ عومرە و ، هی واشیان هەبوو بۆ هەردووکیان پێکەوە ، وەك لای بوخاریی و موسلیم هاتووە .

ئیتر ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ بە خۆی و زیاتر لە صەد هەزار هاوەڵەوە بە ( تلبية ) و ( تكبير ) و ( تهليل )ەوە کەوتنە ڕێ . هەرچیی سەر ئەکەوتنە سەر بەرزایی‌یەك و دائەبەزینە نشێوی‌یەك دەنگیان بە ذیکری خوا بەرز ئەکردەوە و ، دەنگی تەوحید و تەهلیل ئەو ناوەی پڕ کردبوو . ئەمە یەکەم جار بوو ئەو بیابانە سوپای خواناسی یەکگرتووی وەها مەزن بە خۆیەوە ببینێ .

مەلائیکەتەکانی ئاسمانیش سەیری دیمەنی دڵڕفێنیان ئەکرد .. سەیری کۆمەڵی خواناسیان ئەکرد کە بەرەو حزووری پەروەردگار ئەڕۆیشتن .. ئەم کۆمەڵە نایابە یەکەم کۆمەڵی تەوحیدکار بوو کە بە پاکترین شێوە بە دەم بانگەوازەکەی ئیبراهیم خەلیلەوە سەلامی لێ بێ هاتبوو ..

کە گەیشتنە ( سَرِف ) ، کە شوێنێکی نزیکە لە مەککەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بەسەر ئەوانەدا دا کە بۆ حەج ئیحرامیان پۆشیی بوو و ، ( هدي ) یان لەگەڵ خۆیاندا نەهێنا بوو ، با ئەوانە حەجەکەیان بکەن بە عومرە .

کە گەیشتنە ( ذي طوی ) ی نزیکی مەککە شەو لەوێ پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ هاوەڵان مانەوە و ، نوێژی بەیانیی لەگەڵیان کرد ، پاشان غوسلی چوونە ناو مەککەی ئەنجام دا ...

---

[٣٢٤] ذولحولەیفە : شەش میل لە مەدینەوە دوورە و شوێنی ئیحرام بەستنی دانیشتوانی مەدینەیە . ئێستە پێی ئەوترێ : بیرەکانی عەلیی .

**سێهەم : چوونە ناو مەککەوە**

دوای هەشت شەو کۆمەڵی خواناس بە پێشەوایەتیی پێغەمبەری ئازیز ﷺ گەیشتنە مەککە و ، ئەو هەمووە خەڵکە بە هێرشێکی ئیمانیی بێوێنەوە ؛ بە ڕۆژی ڕووناک ، لە ڕۆژی یەك شەممەی چوارەم ڕۆژی مانگی ذولحەججەی ساڵی دەهەمی کۆچیی چوونە ناو شاری مەککەوە .

کە کەعبەی پیرۆز لە پێغەمبەری خۆشەویستەوە ﷺ دەرکەوت فەرمووی : (( أللهم أنت السلام ، ومنك السلام ، فَحَيِّنا - ربنا - بالسلام . أللهم زد هذا البيت تشريفاً وتعظيماً ، وتكريماً ومهابة وبراً ، وزد من حَجَّهُ أو اعتمره تكريماً وتشريفاً ، وتعظيماً وبراً )) .

دوای ناوبردنی خوای گەورە بە ( السلام ) داوا لە خوا ئەکات ، کە سەلام و ئاشتیی و بێوەیی هەر لەلایەن خۆیەوەیە ؛ ئیمانداران لە سەلامەتیی و بێوەییدا بژیەنێت . پاشان لە خوا ئەپاڕێتەوە تا ڕێز و گەورەیی و شەرافەت و هەیبەت و چاکەی زیاتر بە ماڵەکەی خۆی ببەخشێ و ، هەرکەسیش بۆ حەج یان عومرە سەر لە ماڵەکەی ئەدات ڕێز و شەرافەت و گەورەیی و چاکەی زیاتری بەسەردا بڕێژێ .

کە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە لای کەعبەی پیرۆز ؛ هەر بە سواریی وشترەکەی طەوافی کرد و ، بە گۆچانێکیش کە بە دەستیەوە بوو ئیستیلامی بەردە ڕەشەکەی ئەکرد ، ئەمەش بۆ ئەوەی خەڵکەکە چاویان لێی بێت و ، چاوی لێ بکەن و پرسیاری لێ بکەن و ، بۆ ئەوەش کە خەڵکەکە لە دەوری بڵاوە نەکەن . ئەوەبوو لە هەموو لایەکەوە دەورەیان لێ دابوو و ، لەگەڵ ئەودا طەوافیان ئەکرد .

کە موسڵمانەکان خەریکی طەواف بوون پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بەسەریاندا دا کە ( اضطباع ) بکەن و لە سێ خولانەوەی یەکەمدا ( رمل ) بکەن و لە چوار خولانەوەکەی تردا بە ڕەوتی ئاسایی بەڕێوە بچن .[325]

کە لە طەواف بوویەوە تەشریفی هێنایە مەقامی ئیبراهیم و ،[326] ئەم ئایەتە پیرۆزەی ئەخوێند : ﴿ وَإِذْ جَعَلْنَا ٱلْبَيْتَ مَثَابَةً لِّلنَّاسِ وَأَمْنًا وَٱتَّخِذُوا۟ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ

---

[325] ( إضطباع ) واتە : موسڵمان نیوەی ئیزارەکەی بخاتە ژێر دەستی ڕاستی و سەرەکەی تری بداتەوە بەسەر شانی چەپیدا .

( رمل ) یش واتە ( هرولة ) کە لە بەڕێوەچوونی ئاسایی گورجترە و لە ڕاکردنیش هێواشترە ، بە هەنگاوی ورد و نزیك و بە شۆکاندنەوەی شان .. کە ئەم بەڕێوەچوونە هێز و گەنجیی موسڵمان دەرئەخات ، تا هەموو کەسێ بزانێ ئیسلام مایەی سەربەرزیی و هێز و ورەی بەرزە و ، شوێنکەوتووانی هەرگیز زەلیل نابن ..

مُصَلًّى وَعَهِدْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَـٰعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِىَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلْعَـٰكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ﴾ ( البقرة : ١٢٥ ) .

له دوایشیەوە دوو رەکعەت نوێژی بەجێ هێنا و ، جارێکی تر ئیستیلامی بەردە رەشەکەی کردەوە .

پاشان لە دەرگای نەوەی مەخزوومەوە بەرەو صەفا دەرچوو و ، خەریکی خوێندنی ئەم ئایەتە پیرۆزەش بوو :

﴿ إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ۖ فَمَنْ حَجَّ ٱلْبَيْتَ أَوِ ٱعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا ۚ وَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَإِنَّ ٱللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ ﴾ ( البقرة : ١٥٨ ) .

جا فەرمووی : (( أبدأ بما بدأ الله بـه )) . فەرمووی : بەو شێوە دەستی پێ ئەکەم کە خوا دەستی پێ کردووە ، واتە لە پێشەوە سەر ئەکەومە سەر صەفا : پاشان مەڕوە . ئەوەبوو سەرکەوتە سەر صەفا هەتا کەعبەی لێوە دەرکەوت و رووبەڕووی کەعبە وەستا و فەرمووی :

(( لا إله إلا الله وحده لا شريك له ، له الملك وله الحمد ، وهو على كل شيء قدير، لا إله إلا الله وحده ، أنجز وعده ، ونصر عبده ، وهزم الأحزاب وحده )) .

پاشان لەسەر صەفا دابەزیی و سەرکەوتە سەر مەڕوە . پاشان گەڕایەوە بۆ سەر صەفا ، بەم شێوەیە هەتا حەوت ئەمسەر و ئەوسەری کرد .

کە لە سەعی نێوان صەفا و مەڕوە بۆوە فەرمانی بەسەر ئەو هاوەڵانەدا دا کە ( هدي ) یان پێ نیە حەجەکەیان بکەن بە عومرە و ، ئیحرام بشکێنن . هەندێ لە هاوەڵان خاوە خاویان ئەکرد چونکە پێیان ناخۆش بوو ئیقتیدا بەو نەکەن . ئەویش دڵی دانەوە و ، هۆی ئەوەشی بۆ روون کردنەوە کە خۆی ئیحرامی نەشکاندووە و فەرمووی : (( لو استقبلتُ من أمرى ما استدبرتُ لما سقتُ الهديَ ولجعلتها عمرة )) . واتە تازە من ( هدي ) م لەگەڵ خۆم هێناوە . ئیتر خەڵکەکە هەموویان ئیحرامیان شکاند و سەریان کورت کردەوە و ، بە ئیحرامەوە تەنها پێغەمبەر و ئەوانە مانەوە کە ( هدي ) یان لەگەڵ خۆیاندا هێنا بوو .

---

[٣٢٦] مەقامی ئیبراهیم : بریتییە لەو بەردەی کە سەردارمان ئیبراهیمی خەلیل سەلامی لێ بێ ، لە کاتی بیناکردنی کەعبەدا ، لەسەری وەستا . ئەو بەردە ئێستەش ماوە و ، وا لە بەرامبەر دەرگای کەعبەدا ..

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ و خەڵکەکە پێکەوە ڕۆیشتن تا گەیشتنە ( الأبطح )، کە شوێنێکی فراوانە لە خۆرهەلاتی مەککە . لەوێ مایەوە هەتا ڕۆژی چوارشەممە و، پێش‌نوێژیی بۆ هاوەڵان ئەکرد و ، ئەو چەند ڕۆژە نەگەڕایەوە کەعبە .

پێشتر باسمان کرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ عەلیی کوڕی ئەبوطالیبی نارد بۆ یەمەن و لە کاتی حەجی ماڵئاوایی‌دا لە مەککە بە پێغەمبەری خوا گەیشتەوە. ئەوەبوو لەو ڕۆژانەدا و لەو شوێنەدا بە خزمەتی ئازیز گەیشتەوە .

کە عەلیی گەیشت ئەبینێ وا فاطیمەی هاوسەری لەگەڵ هاوسەرەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئیحرامیان شکاندووە و ، فاطیمە جل و بەرگی ڕەنگ کراوی لەبەردایە. پرسیی : کێ ئەم فەرمانەی بەسەردا داوی ؟ وتی : باوکم . عەلیی پرسیاری لە پێغەمبەری خوا کرد و ئەویش فەرمووی : (( صدقت ، صدقت )) . فەرمووی : ڕاستی کردووە.

عەلییش ( هدي ) لەگەڵ خۆی هێنا بوو بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بەسەردا دا کە ئیحرام نەشکێنێ . بەلام کە ئەبومووسای ئەشعەریی گەیشت ، لەبەر ئەوەی کە ( هدي ) لەگەڵ خۆی نەهێنا بوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بەسەردا دا کە حەجەکەی بگۆڕێ بۆ عومرە و ئیحرام بشکێنێ . ( البخاري ومسليم ) .

هەروەها لە ڕۆژی پێنج شەممەدا کە هەشتەم ڕۆژی مانگی حەج بوو و ، پێی ئەوترێ ڕۆژی ( تروية ) ، پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ هاوەلانی‌دا بەرەو مینا کەوتە ڕێ ، ئەمەش دوای ئەوەی کە ئەو هاوەلانەی لە ئەبطەح ئیحرامیان شکاندبوو بە نیەتی حەج ئیحرامیان بەست و ، ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە مینا . لەوێ پێغەمبەر ﷺ نوێژی نیوەڕۆ و عەصر و مەغریب و عیشا و فەجری بۆ بەجێ هێنان .

**چوارەم : بۆ عەرەفات**

دوای خۆرهەلاتن پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەو عەرەفات کە[illegible] و ، فەرمانی دا لە ( نَمِرة ) [327] چادرێکی گەورەی بۆ هەڵ بدەن . کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەو عەرەفات ڕۆیشت ، قوڕەیش بە تەما بوون لە ( المشعر الحرام ) [328] بوەستێ ، وەك

---

[327] نەمیرە : شوێنێکە لە تەنیشت عەرەفات‌دا ، بەلام لەسەر ئەو نیە .

[328] چیایەکە لە موزدەلیفە کە قوڕەیش بەسەریەوە ئەوەستان و ، لەگەڵ عەر[illegible] لەسەر عەرەفات نەئەوەستان . بەلام پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر عەرەفات وەستا .

قوڕەیش لە سەردەمی نەفامییدا ئەوەستان ، بەلاّم وای نەکرد ، بەڵکو تێپەڕی کرد و هەتا عەرەفات رۆیشت ، ئەویش بە پێی فەرمانی خوای گەورە : ﴿ ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ ﴾ ( البقرة : ١٩٩ ) ، ئەبینێ وا چادرەکەی بۆ هەڵ دراوە . لەوێ دابەزیی هەتا خۆر لار بوویەوە ، ئەوسا سواری وشترەکەی ( القصواء ) بوو هەتا گەیشتە ناو شیوی ( عەرەنە ) و ، لەوێ وتارە بەناوبانگەکەی پێشکەش بە موسڵمانان کرد ..

دوای ئەوەی کە سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کرد ، فەرمووی :

« أَيُّهَا النَّاس ! إِسْمَعُوا قَوْلِي ، فَإِنِّي لا أَدْرِي لَعَلِّي لا أَلْقَاكُمْ بَعْدَ عَامِي هَذا بِهَذا الْمَوْقِف أَبَداً . أَيُّهَا النَّاس ! إِنَّ دِمَاءَكُم وَأَمْوَالَكُم عَلَيْكُم حَرَامٌ إِلَى أَنْ تَلْقَوا رَبَّكُم كَحُرْمَةِ يَوْمِكُم هَذا ، فِي شَهْرِكُم هَذا ، فِي بَلَدِكُم هَذا ، أَلا هَلْ بَلَّغْتُ ؟ أَللَّهُمَّ فَاشْهَدْ . فَمَنْ كَانَتْ عِنْدَهُ أَمَانَةٌ ، فَلْيُؤَدِّهَا إِلى مَنِ ائْتَمَنَهُ عَلَيْهَا .

أَلا إِنَّ كُلَّ شَيْءٍ مِنْ أَمْرِ الجَاهِلِيَّةِ تَحْتَ قَدَمَيَّ مَوْضُوعٌ ، وَرِبَا الجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعٌ ، وَإِنَّ أَوَّلَ رِبا أَبْدَأُ بِهِ رِبَا عَمِّي الْعَبَّاس بْنِ عَبد الْمُطَّلِب .

وَإِنَّ دِمَاءَ الجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعَةٌ ، وَأَوَّلُ دَمٍ أَبْدَأُ بِهِ دَم ابْنِ رَبِيعَةَ بْنِ الحَارِثِ بْنِ عَبدِ الْمُطَّلِب.

وَإِنَّ مَآثِرَ الجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعَةٌ غَيْرَ السَّدَانَةِ وَالسِّقَايَةِ .

وَالعَمْدُ قَوَدٌ ، وَشِبْهُ العَمدِ مَا قُتِلَ بِالعَصَا وَالحَجَرِ ، وَفِيهِ مِائَةُ بَعِيرٍ ، فَمَنْ زَادَ فَهُوَ مِنْ أَهْلِ الجَاهِلِيَّةِ .

أَيُّهَا النَّاس ! إِنَّ الشَّيْطَانَ قَدْ يَئِسَ أَنْ يُعْبَدَ فِي أَرضِكُم هَذِهِ ، وَلَكِنَّهُ قَدْ رَضِيَ أَن يُطَاعَ فِيمَا سِوَى ذَلِكَ مِمَّا تَحْقِرُونَ مِنْ أَعْمَالِكُمْ .

أَيُّهَا النَّاس ! إِنَّ النَّسِيءَ زِيَادَةٌ فِي الْكُفْرِ ، يُضَلُّ بِهِ الَّذِينَ كَفَرُوا ، يُحِلُّونَهُ عَامًا وَيُحَرِّمُونَهُ عَامًا ، لِيُوَاطِئُوا عِدَّةَ مَا حَرَّمَ اللهُ . وَإِنَّ الزَّمَانَ قَد اسْتَدَارَ كَهَيْئَتِهِ يَومَ خَلَقَ اللهُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ ، وَإِنَّ عِدَّةَ الشُّهُورِ عِنْدَ اللهِ اثْنَا عَشَرَ شَهْرًا فِي كِتَابِ اللهِ يَومَ خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرضَ مِنْهَا أَرْبَعَةٌ حُرُم ، ثَلاثَةٌ مُتَوَالِيَاتٌ وَوَاحِدٌ فَرْدٌ : ذُو القَعدَةِ وَذُو الحِجَّةِ وَالْمُحَرَّمُ ، وَرَجَبُ الَّذِي بَيْنَ جُمَادِي وَ شَعْبَانَ ، أَلا هَلْ بَلَّغْتُ ؟ أَللَّهُمَّ فَاشْهَدْ .

أيها الناس ! إِنَّ لَكُم عَلَى نِسَائِكُم حَقًّا ، وَلَهُنَّ عَلَيكُم حَقًّا ، لَكُم عَلَيهِنَّ أَن لا يُوَطِّئْنَ فُرُشَكُم غَيرَكُمْ ، وَلا يُدْخِلْنَ أَحَدًا تَكرَهُونَهُ بُيُوتَكُمْ إِلا بِإِذْنِكُمْ ، فَإِنْ فَعَلْنَ فَإِنَّ

اللهَ أذنَ لَكُم أنْ تَعظُوهُنَّ ، وَتَهجُرُوهُنَّ في الْمَضَاجِعِ ، وَتَضْرِبُوهُنَّ ضَرْبًا غَيْـرَ مُبَـرِّحٍ ، فَإِنِ انْتَهَيْنَ وَأَطَعْنَكُمْ فَعَلَيْكُمْ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ .

وَاسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا ، فَإِنَّهُنَّ عَوانٍ عِندَكُمْ لا يَمْلِكْنَ لأَنْفُسِهِم شَيْئًا ، وَإِنَّكُم إِنَّمَا أَخَذْتُمُوهُنَّ بِأَمَانَةِ اللهِ ، واسْتَحْلَلْتُم فُرُوجَهُنَّ بِكَلِمَةِ اللهِ ، فَـاتَّقُوا اللهَ في النِّسَـاءِ ، وَاسْتَوْصُوا بِهِنَّ خَيرًا . ألا هَل بَلَّغتُ ؟ أَللهُمَّ اشْهَدْ .

أيها الناس ! إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ ، وَلا يَحِـلُّ لامْـرِيءٍ مَـالُ أَخِيـهِ إِلاَّ عَـن طِيـبِ نَـفـسٍ مِنهُ . ألا هَـل بَلَّغتُ ؟ أَللهمَّ اشْهَدْ ، فَلا تَرْجِعُنَّ بَعدِي كُفَّـارًا يَضـرِبُ بَعضُكُم رِقَابَ بَعضٍ، فَإِنِّي قَدْ تَرَكْتُ فِيكُم مَا إِنِ اعْتَصَمْتُم بِهِ فَلا تَضِلُّوا أَبَدًا: كِتَابَ اللهِ وَسُنَّةَ نَبِيِّهِ.

أيها الناس ! إِنَّ رَبَّكُم وَاحِدٌ ، وَإِنَّ أَبَاكُم وَاحِدٌ . كُلُّكُم لآدَمَ ، وَآدَمُ مِـن تُـرَابٍ . إِنَّ أَكرَمَكُم عِندَ اللهِ أَتقَاكُم . لَيسَ لِعَرَبِيٍّ فَضلٌ عَلَى عَجَمِيٍّ إِلاَّ بِالتَّقوَى . ألا هَل بَلَّغتُ؟ أَللهُمَّ اشْهَدْ .

أيها النـاس ! إِنَّ اللهَ قَـد قَسَّـمَ لِكُـلِّ وَارِثٍ نَصِيبَهُ مِـنَ الْمِيرَاثِ ، وَإِنَّـهُ لا وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ، وَلا تَجُوزُ وَصِيَّةٌ في أَكثَرَ مِنَ الثُّلُثِ .

وَالوَلَدُ لِلفِرَاشِ ، وَلِلعَاهِرِ الحَجَرُ ، وَمَنِ ادَّعَى إِلى غَيرِ أَبِيهِ ، أَو تَـوَلَّى غَـيرَ مَوَالِيـهِ فَعَلَيهِ لَعنَةُ اللهِ والملائكةِ وَالنَّاسِ أَجمَعِينَ ، لا يَقبَـلُ اللهُ مِنـهُ صَـرفًا ولا عَـدْلاً . وَأَنـتُم تَسأَلُونَ عَنِّي فَما أَنتُم قَائِلُونَ ؟ قَالُوا : نَشهَدُ أَنَّكَ قَد بَلَّغـتَ وَأَدَّيـتَ وَنَصَحـتَ . فقَـالَ بِأَصبُعِهِ السَّبَّابَةِ يَرفَعُها إِلى السَّمَاءِ وَيُقَلِّبُها عَلَى النَّاسِ : أَللَّهُمَّ اشْهَدْ ، أَللهم اشهد ، أَللهم اشهد ، والسلامُ عليكُم ورحمةُ اللهِ وبركاتُهُ )) .[٣٢٩]

پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ لـەو شـوێنە پـیرۆز و کاتـە پـیرۆزەدا و لەبـەردەم کۆمـەڵێکی وەها زۆردا ، کە هێشتا لەوەوبەر ئەوەندە خەڵك بـۆ ئیسـلام جـەم نـەبوو بوو، وتاری ماڵئاوایی پێشکەش بە موسڵمانان کرد .. ئـەم وتـارە خاڵـە گرنگـەکانی ئیسلامی تیا بوو و ، پێی خۆش بوو بە کورتە هەموویان وە بیری کۆمـەڵی ئیمـان‌دار بهێنێتەوە ، بەر لەوەی لێیان جوێ ببێتەوە ، وەك ئەوە هەواڵی وەرگرتبێ کە جارێکی تر لەبەردەم کۆمەڵی وەها گەورەدا وتاری بۆ نادرێ .

ئەتوانین بە کورتە ئەم چەند خاڵە لە وتارەکەی ئازیزدا ﷺ دەربهێنین :

---

[٣٢٩] السيرة النبوية لإبن هشام : ٢ / ٣٠٦ ، صحيح مسلم بشرح النووي : ٨ / ١٨٢ ـ ١٤٨ ، البداية والنهاية : ٥ / ١٧٠ ـ ١٧١ .

١ ـ پێش هەموو شتێك هەواڵی دانێ ـ بەڵام ناڕاستەوخۆ ـ كە جارێكی تر لەم شوێنەدا لەگەڵیان كۆ نابێتەوە . كەواتە كۆچی دوایی ئازیز نزیك بۆتەوە .

٢ـ دەری بڕیی كە مرۆڤەكان خاوەنی مافن تا كەس دەست بۆ ماڵ و سامانیان نەبات و ، كەسیش خوێنیان نەڕێژێ . ئەمە دیارییكردنی مافی مرۆڤ بوو ؛ بەڵام بە راستەقینە ..

٣ ـ فەرمانی دا هەر كەسێك سپاردەیەكی لایە با بە چاكیی بیداتەوە دەست خاوەنەكەی .

٤ ـ بڕیاری دا هەموو كارێكی سەردەمی نەفامیی ئەخاتە ژێر پێیەوە و بەتاڵە .. ریبای سەردەمی نەفامییش بەتاڵە و ، یەكەم ریبایەكیش كە بەتاڵی ئەكاتەوە ریبای عەبباسی مامەیەتی .

٥ ـ خوێنی سەردەمی نەفامییش بەتاڵە و ، یەكەم خوێنێكیش بەتاڵی بكاتەوە خوێنی كوڕەكەی رەبیعەی كوڕی حاریثی عەبدولموطەللیبە .[٣٣٠]

٦ ـ هەموو شوێنەوار و كار و كردەوەی سەردەمی نەفامیی بەتاڵە جگە لە سەدانە و سیقایە .[٣٣١]

٧ ـ كوشتنی ( عمد ) قیصاصی هەیە . ( شبه عمد ) یش ئەوەیە كە بە دار و بەرد كوژرا بێت و ، صەد وشتری لە بریی ئەدرێ . هەركەس لەوە زیاتر وەربگرێ ئەوا ئەو كەسە لە نەفامییدا ئەژیی .

٨ ـ شەیتان دەستی لەوە شۆردووە جارێكی تر لە دوورگەدا بپەرسترێ بەڵام بەوەش رازییە كە بەو كردەوانەی كە ئێوە بە هیچیان نازانن گوێڕایەڵیی بۆ ئەو بكرێ .

٩ ـ لە سەردەمی نەفامییدا عەرەبەكان چوار مانگیان بە مانگە حەرامەكان لە قەڵەم ئەدا و تیایا شەڕ و شۆڕیان نەئەكرد . بەڵام جاری وا ئەبوو ئەو سێ مانگەیان بەلاوە زۆر بوو كە یەك لە دوای یەك ئەهاتن و ، پەلەی جەنگیان بوو ؛ بۆیە حەرامیی موحەڕڕەمیان دوا ئەخست بۆ مانگی صەفەر و ، لە موحەڕڕەمدا جەنگیان بەرپا ئەكرد . بەمە لە ساڵێكدا كە چوار مانگی حەرامیان هەبوون ئەیان گۆڕین . جا

[٣٣٠] رەبیعەی كوڕی حاریث ئامۆزای پێغەمبەری خوایە ﷺ و كوڕێكی دراوە بە دایەن بە نەوەی سەعد و هۆزی هوذەیل كوشتوویانە . ئەڵێن ئەو منداڵەی رەبیعە ناوی ئیاس بووە .

[٣٣١] سەدانە : بریتییە لە خزمەتی كەعبە و ، سیقایەش : بریتییە لە ئاوەدانی حاجییان .

قورئان ڕەخنە لەم کارەیان ئەگرێ چونکە لە حەلاڵ و حەرامدا شوێن هەوا و ئارەزووی خۆیان ئەکەوتن ..

١٠ ـ بەلای خواوە ، هەر لەو ڕۆژەوە کە ئاسمانەکان و زەویی بەدیی هێناون ، ژمارەی مانگەکان دوانزە مانگن ، کە چواریان حەرامن : سیانیان بەسەر یەکەوە کە ذولقەعیدە و ذولحەججە و موحەڕڕەمن و ، یەکێکیشان بە جیا کە ڕەجەبە ، کە وا لە نێوان جومادیی و شەعباندا ..

١١ ـ پیاوان و ئافرەتان هەر یەکەیان مافی بەسەر ئەوی تریانەوە هەیە . مافی پیاوان ئەوەیە ئافرەتان شەرەف و حەیای خۆیان و مێردیان بپارێزن و ، بەبێ ڕەزامەندیی مێردەکانیان هیچ کەسێ نەیەتە ماڵیانەوە . خۆ ئەگەر وا بکەن ئەوا خوا مۆڵەتی پیاوانی داوە لە هەنگاوی یەکەمدا ئامۆژگارییان بکەن ، پاشان جێی خەوتنیان لەگەڵدا جوێ بکەنەوە ، پاشان بە لێدانێکی وەها کە تووشی ناڕەحەتییان نەکات لێیان بدەن . جا ئەگەر کۆڵیان دا و گوێڕایەڵی مێردەکانیان بوون ، ئەوانیش ڕزق و پۆشاکیان بە چاکیی بۆ ئەنجام بدەن .

١٢ ـ پێویستە پیاوان چاودێری ئافرەتان بن ، چونکە لەبەر لاوازییان وەك دیل وەهان و ، ئەمانەتی خوان بەلای پیاوانەوە و ، بە نیکاحی شەرعیی بۆیان حەلاڵ بوون. جا با پیاوان دەربارەی ئافرەتان لە خوا بترسن و ، ئامۆژگاریی چاکەیان بکەن .

١٣ ـ ئیمانداران هەر هەموو برای یەکن و ، بە ڕەزامەندیی نەبێ ماڵ و سامانی هیچ موسڵمانێ بۆ براکەی حەلاڵ نیە .

١٤ ـ ئامۆژگاریی موسڵمانان ئەکات تا دوای خۆی لە ئیسلام هەڵ نەگەڕێنەوە و، یەکتریی بکوژن ، چونکە شتێکی چاکی بۆ بەجێ هێشتوون کە ئەگەر پشتی پێ ببەستن هەرگیز گومڕا نابن : قورئانی پیرۆز و سوننەتی پاك و بێگەرد .

١٥ـ موسڵمانانی تێ گەیاند کە پەروەردگاریان یەکە و ، باپیرە گەورەشیان یەکە. هەمووان لە ئادەمن و ئادەمیش لە گڵ دروست کراوە . ئەوەی لە هەمووان تەقوای زیاتر بێ ، لای خوا بەڕێزترینیش دەرئەچێ . نە عەرەب و نە عەجەم هیچیان لە یەکتر زیاتر نین ، مەگەر بە تەقوا.

١٦ ـ خەڵکەکەی تێ گەیاند کە شەریعەت یاسایەکی جوانی بۆ میرات داناوە . نابێ واریث وەسیەت بکات . وەسیەتی بەخشینی سامان پێش مردن نابێ لە سێیەك تێپەڕ بکات .

١٧ ـ منداڵ هی سەر جێگایە و ، زیناکەر پێویستە رەجم بکرێ . هەرکەسیش خۆی بە کوڕی کەسێکیتر لە قەڵەم دا لە غەیری باوکی ، یان کوڕی خەڵکی بە کوڕی خۆی لە قەڵەم دا ، ئەوا لەعنەتی خوا و مەلائیکەت و هەر هەموو خەڵکیی لێ بێ و، خوا نە تەوبە و نە فیدیەی لێ وەرناگرێ ..

دوای ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لە موسڵمانان کرد کە ئەوان چیی ئەڵێن؟

وتیان : شاهێدیی ئەدەین کە فەرمانی خوات بە چاکیی گەیاند و ، ئامۆژگاریی ئوممەتی ئیسلامت کرد .

ئەویش پەنجەی شایەتمانی بەرز کردەوە و سێ جار فەرمووی : خوایە ! بە شاهێد بە. پاشان فەرمووی : (( والسلام علیکم و رحمة الله وبرکاته )) .

لە کاتی وتاردانەکەدا جەریری کوڕی عەبدوڵلای بەجەلیی خەڵکەکەی بێدەنگ ئەکرد و ، رەبیعەی کوڕی ئومەییەی کوڕی خەلەفیش فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوای ﷺ بە دەنگی بەرز دووبارە ئەکردنەوە [٣٣٢] .

کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە وتارە گشتگرە گرنگەکەی بوویەوە ، بیلال بانگی دا و، پاشان قامەتی کرد و ، پێغەمبەر ﷺ نوێژی عەصری پێ بەجێ هێنان واتە بە جەمعی تەقدیم هەردووکیانی پێکەوە بەجێ هێنان و، لە نێوانیاندا هیچ نوێژێکی بەجێ نەهێنا.

---

[٣٣٢] با هەموومان سەیری دەسەلاتی خوا بکەین ! ئەو رەبیعەیەی کە ئێستە وا لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ و فەرمایشتە گەوهەری‌یەکانی بە دەنگی بەرزی خۆی بە موسڵمانان ئەگەیەنێ ، کوڕی ئومەییەی کوڕی خەلەفە ، کە لە کاتی باس‌کردنی مێژووی بانگەوازی سەردەمی مەککەدا شتێك لە هەڵوێستی لار و چەوتی ئومەییەمان خستە بەرچاو، کە چۆن مل‌هوڕێك بوو بۆ دژایەتیی بانگی پیرۆز و ، سزادانی پێغەمبەری ئازیز و، هاوەڵە کەمەکانی سەرەتای بانگەواز، بە تایبەت ئەو هاوەڵانەی کە لاواز و بێ‌کەس و دەس بوون .

بەڵێ ، زۆرێك هەن دژایەتیی ئیسلام ئەکەن .. دژی خزمەتی مزگەوتن .. رۆڵەی خەڵکیی لە عەقیدەی ئیسلام لا ئەدەن .. بە هەڕەشە و گوڕەشە ئەیانەوێ خەڵك بترسێنن و لە رێبازی خوا دووریان بخەنەوە .. بە مەرجێ موسڵمانان بە درێژایی مێژوو حەزیان لە دژایەتیی کەس نەکردووە و ، ویستوویانە بە چاکەکردن ـ ئەگەرچیی لەگەڵ دوژمنانیشدا بێ ـ خوا لە خۆیان رازیی بکەن .. ویستوویانە گرۆی مرۆڤایەتیی بەرەو حەسانەوە بەرن .. ئەوانە با چاك بزانن کە ئەم میللەتەمان میللەتێکی موسڵمانە و ، ئەم خاکەش خاکی ئیسلامە و ، هیچ نەمامێکی بێ ریشکی وەك زەقنەبووتی تیا سەوز نابێت و، خزمەتکردن و دەستپاکیی و چاکەخوازیی تەنها لە بەرنامەی ئیسلامدا هەن .. جا با ئەوانە چاك بزانن رەنجیان بە وێنەی رەنجەکەی ئومەییەی کوڕی خەلەف بە زایە ئەچێ و ، رۆڵەکانیشیان ـ بە کوڕ و کچەوە ـ ئەبنە شاگردی پێغەمبەری خوا ﷺ و پەیامی رزگاریی مرۆڤ پەخشانی سەرزەویی ئەکەن و ، مرۆڤەکان لە رێبازی دۆزەخ لا پێ ئەدەن و ، ئەیان‌خەنە سەر رێبازی بەهەشت .. بەڵێ رەنجیان بە فیڕۆ ئەڕوا ئەگەر لە دژایەتیی خوا و پێغەمبەر دەست هەڵ نەگرن .

پاشان سواری وشترەکەی بوو هەتا گەیشتە لای ئەو کۆمەڵە بەردەی کە وان لە پایینی کێوی ( الرحمة ) وە ، لەلایانا وەستا و رووی لە قیبلە کرد ، هەتا خۆرئاوا بوو و، فەرمووی : (( وقفت ههنا وعرفات كلها موقف )) . فەرمووی : لێرەدا وەستاوم ، بەڵام هەموو عەرەفات شوێنی وەستانە ..

لەو رۆژە پیرۆزەی عەرەفەدا ، کە جومعەش بوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ دوعایەکی زۆری بۆ ئوممەتەکەی کرد .. ئەو رۆژە رۆژێکی وەها مەزنە کە فرمێسکی تێدا هەڵ ئەرێژرێت و ، پاڕانەوەی تیا گیرا ئەبێت .. لەو رۆژەدا خوای گەورە شانازیی بەسەر مەلائیکەتەکاندا ئەکات بە بۆنەی ئەو خواپەرستی‌یە مەزنەوە کە بەندەکانی ئەنجامی ئەدەن .. خوای گەورە ئەفەرموێ :

(( يا ملائكتي ! هؤلاء عبادي جاؤوني شُعْثًا غُبرًا ، يرجون رحمتي ويخافون عذابي ولم يروني ، فكيف لو رأوني . فلو كانت ذنوبهم كعدد الرمل لغفرتها لهم . أفيضوا عبادي مغفوراً لكم ولمن شفعتم فيه ))[٣٣٣] .

ئەفەرموێ: مەلائیکەتەکانم ! ئەوانە بەندەکانی منن کە بە دژراویی و تۆزاوی‌یەوە هاتوون بۆ لام و هیوادارن بەر سۆزی من بکەون و ، لە سزاشم ئەترسن ، بێ ئەوەی منیان دیبێ . داخۆ ئەگەر بیان‌دیمایە چۆن ئەبوو ؟ ئەگەر گوناهەکانیان ئەوەندەی ژمارەی دەنکە لمەکان بن لێیان خۆش ئەبم .. بەندەکانم ( إفاضة ) بکەن ، وا لە خۆتانیش و لەو کەسەش کە تکای بۆ ئەکەن خۆش بووم .

هەروەها ریوایەت کراوە کە : پێغەمبەری خوا ﷺ کە دوعای لێ خۆش بوونی زۆری بۆ ئوممەتەکەی کرد ، خوای گەورە وەحی بۆ نارد کە لە هەموو شتێکیان خۆش ئەبم ، جگە لە ستەم‌کردنی هەندێکیان لە هەندێکی تریان ..[٣٣٤]

لەم رۆژە گرنگەدا ئایەتی پیرۆزی : ﴿ ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَـٰمَ دِينًا ﴾ ( المائدة : ٣ ) هاتە خوارەوە . کە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە هەندێ لە هاوەڵان دەستیان بە گریان کرد ، کە یەکێکیان عومەری کوڕی خەططاب بوو خوا لێی رازیی بێ ، هەروەك وەها تێ بگەن کە هاتنی ئەم ئایەتە ،

---

[٣٣٣] رواه عبدالرزاق في مصنفه ، وأصله في صحيح مسلم كتاب الحج من باب فضل يوم عرفة ، وروى نحوه الإمام أحمد في مسنده .

[٣٣٤] رواه البيهقي .

نزیکیی کۆچ‌کردنی پێغەمبەری خوا ﷺ را ئەگەیەنێ . هەتا کە لە عومەریان پرسیی: بۆچیی ئەگرییێت ؟ فەرمووی : دوای تەواوکردن ناتەواویی دێت .

هەندێ وەهای ئەگەیەنن کە ئەمە دوا ئایەتی قورئانە کە هاتبێتە خوارەوە . ئەمە هەڵەیەکە هیچ زانایەك دانی پیا نەناوە . بەڵکو دوا ئایەتی قورئان کە هاتبێتە خوارەوە ئەم ئایەتەیە لە سوورەتی ( البقرة : ٢٨١ ) کە ئەفەرموێ : ﴿ وَاتَّقُوا يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللَّهِ ثُمَّ تُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴾ .

**پێنجەم : بۆ موزدەلیفە و مینا**

پاشان دوای خۆرئاوابوون پێغەمبەری خوا ﷺ سواری وشترەکەی بوو و ، ئەوەندە لغاوەکەی توند کردەوە کە خەریك بوو سەری وشترەکە بەر پێشەوەی کورتانەکە بکەوێ و، ئوسامەی کوڕی زەیدیشی لە پاشکۆیدا سوار کرد تا خەڵکەکە ئاگادار بکا پەلە نەکەن و لەسەرخۆ بن ، هەتا گەیشتنە موزدەلیفە . لەوێ بە جەمعی تەئخیر و بە یەك بانگ و دوو قامەت نوێژی مەغریب و عیشای بەجێ هێنا و لە نێوانیاندا نوێژی سوننەتی بەجێ نەهێنا .. دوای ئەوە راکشا هەتا رۆژ بوویەوە و ، نوێژی فەجری بەجێ هێنا . پاشان سواری وشترەکەی بوو هەتا گەیشتە ( المشعر الحرام ) . لەوێ رووی لە قیبلە کرد و زۆرێك دوعای کرد و لە خوا پاڕایەوە و خەریکی تەهلیل و تەکبیر بوو و ، هەروا بە پێوە وەستا تا بە تەواویی دنیا رۆشن بوویەوە .

ریوایەت کراوە کە پێغەمبەر لە موزدەلیفە دەستی بە پاڕانەوە کردووە بۆ ئوممەتەکەی و، دوعایەکی زۆری کردووە ، خوای گەورەش وەحی بۆ ناردووە : من لێیان خۆش بووم جگە لەو زوڵمەی کە لە یەکتری‌یان کردووە . فەرمووی : (( یا رب ! إنك قادر علی أن تثیب المظلوم خیراً من مظلمته ، وتغفر لهذا الظالم )) . فەرمووی : پەروەردگارم ! تۆ توانای ئەوەت هەیە کە بە چاکە پاداشتی ئەم مەزڵوومە لەسەر ستەم لێ‌کردنەکەی بدەیتەوە و ، لەم ستەمکارەش خۆش ببی . ئەو ئێوارەیە خوای گەورە وەڵامی نەدایەوە .

بۆ سبەینێ لە موزدەلیفە دوعاکەی دووبارە کردەوە و ، خوای گەورەش وەحی بۆ نارد کە چاوپۆشیی هەموو شتێکی لێ کردوون . لەولاوە شەیتانیش دوعای تیاچوونی بۆ خۆی ئەکرد و ، خۆڵیشی بەسەر خۆیدا ئەکرد ..[٣٣٥]

[٣٣٥] رواه أبوداود الطیالیسي ، وروی نحوه البیهقي وابن ماجه .

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەو مینا کەوتە رێ کە هێشتا خۆر نەکەوتبوو ، فەضلی کوڕی عەبباسی ئامۆزایشی لە پاشکۆی خۆیدا هەڵ گرتبوو . کە گەیشتە شیوی موحەسسیر پەلەی بە ولاغەکەی کرد تا خێرا تێ بپەڕێ . دوای ئەوە رووی لە ( جمرة العقبة ) کرد و حەوت چەوی بچکۆلەی تێ گرت و ، لەگەڵ هەر یەکەیشیان دا ( ألله أكبر ) ی ئەفەرموو . کە لە رەجمی شەیتان بوویەوە رووی لە شوێنی ئاژەڵ سەربڕین کرد و ، بە دەستی پیرۆزی شەصت و سێ وشتری سەر بڕیی و ئەشی فەرموو: (( نحرتُ ههنا ومنى كلها منحر )) . فەرمووی : لێرەدا من ئاژەڵم سەر بڕیی و مینا هەر هەمووی شوێنی ئاژەڵ سەر بڕینە . ئەوەبوو سەردارمان عەلیی سیی و حەوت وشترەکەی تری سەر بڕیی و صەدی پێ تەواو کردن . دوای ئەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دا لە هەر وشترێك پارچە گۆشتێك کۆ بکەنەوە و هەموو پارچەکان لە مەنجەڵێك دا بکوڵێنن ، ئیتر خۆی لە گۆشتەکەی خوارد و لە ئاوەکەشی خواردەوە ..

پاشان سەری تاشیی و هاوەڵانیش دەورەیان دابوو ، نەیان هێشت تاڵە موویەکی بکەوێتە زەویی . بەمە پێغەمبەر ﷺ بەر لەوەی طەوافی کەعبە بکات ئیحرامی شکاند و جل و بەرگی خۆی لەبەر کرد و ، بۆن خۆشییشی لە خۆی دا و ، موسڵمانەکانیش هەر هەموو بۆ ئەنجامدانی هەموو بەشێکی حەج چاویان لەو ئەکرد . پاشان فەرمانی دا سەردارمان عەلیی گۆشت و پێستەی وشترە سەربڕاوەکان بە شێوەی صەدەقە دابەش بکات . ئەویش فەرمانەکەی ئەنجام دا .

**شەشەم : بۆ کەعبەی پیرۆز**

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ سواری وشترەکەی بوو و بەرەو کەعبە کەوتە رێ تا طەوافی ( إفاضة ) بەجێ بهێنێ ، کە بە یەکدەنگیی یەکێکە لە پایە ( روکن ) کانی حەج .. طەوافی کرد و نوێژی نیوەڕۆی لە مەککە بەجێ هێنا ، بەڵام سەعی نێوان صەفا و مەروەی ئەنجام نەدا .. پاشان تەشریفی هێنایە لای نەوەی عەبدولموطەللیب کە خەریکی ئاودانی خەڵك بوون لە ئاوی بیری زەمزەم و ، فەرمووی : (( إنزعوا بني عبدالمطلب ، فلولا أن يغلبكم الناس على سقايتكم لنزعت معكم )) . فەرمووی : ئەی نەوەی عەبدولموطەللیب ! خەریکی ئاودەرهێنان بن . ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە خەڵك دەست بەسەر ئاودانەکەتاندا بگرێت منیش لەگەڵتاندا ئاوم دەر ئەهێنا .. ئەوانیش دۆلکەیەکیان دایە دەستی و ئەوەندە ئاوی لێ خواردەوە ، هەتا چوارشانە

وەستا . پاشان تەشریفی بردە لای ئەو ( سقایە )[٣٣٦] یە کە عەبباس سەرپەرشتیی ئەکرد و ، فەرمووی : (( إسقوني )) . عەبباس وتی : ئەی فەضل ! بچۆ بۆ لای دایکت و لای ئەو شەربەتێك بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بهێنە ، چونکە ئەمە خەڵکیی دەستی تیێ ئەخەن .

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( لا حاجة لي فيه ، إسقوني مما يشرب الناس )) . فەرمووی : پێویستییم بەوە نیە ، لەوەدا کە خەڵکیی تیا ئەخۆنەوە بمدەنێ.

هەتا لە شتێکی ئاوەها بچکۆلەشدا نەیویست خۆی لە ئوممەتەکەی جیا بکاتەوە. ئەمە ئەوپەڕی داد و یەکسانییە .. خۆزگە پادشا و شازادەکان و ، فەرماندە و سەرۆکەکانیش وەها بوونایە .

**حەوتەم : گەڕانەوە بۆ مینا**

پێغەمبەری خوا ﷺ دوای نیوەڕۆ گەڕایەوە بۆ مینا و لەوێ لە شوێنی مزگەوتەکەی ئەمڕۆدا دابەزیی و ، موهاجیرەکانی لە لای راستیەوە و، ئەنصاری لای چەپیەوە دابەزاند و ، خەڵکەکەشی لە دوای ئەوانەوە بە دەوریاندا دابەزاند.

هەر لە رۆژی ئاژەڵ سەربڕیندا ، واتە لە یەکەم رۆژی جەژنی قورباندا، پێغەمبەری خوا ﷺ بەسەر وشترەکەیەوە وتارێکی تری دا ، کە تیایا هەندێ لەو مافانەی مرۆڤی دوو پات کردنەوە کە لە وتاری رۆژی عەرەفەدا باسی کردبوون و، ئامۆژگاریی ئەوەشی کردن کە چاودێریی برایەتیی و یەکێتیی نێوانیان بکەن .

بوخاریی لە صەحیحەکەیدا ، لە ( ئەبوبەکرە ) وە ریوایەتی کردووە کە وتوویە: لە رۆژی جەژنی قورباندا پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری بۆ داین کە فەرمووی:

(( أتدرون أي يوم هذا ؟ )) فەرمووی : ئایا ئەزانن ئەمە چ رۆژێکە ؟ وتمان : خوا و پێغەمبەرەکەی چاك ئەزانن . ئەوەبوو بێدەنگ بوو هەتا وامان زانیی ناوێکی تری لێ ئەنێ . فەرمووی : (( أليس ذوالحجة ؟ )) . فەرمووی : مانگی حاجییان نیە؟ وتمان: بەڵێ . فەرمووی : (( أي بلدٍ هذا ؟ )) فەرمووی : ئەی ئەمە چ ولاَتێکە؟ وتمان: خوا و پێغەمبەرەکەی چاك ئەزانن . ئەوەبوو بێدەنگ بوو هەتا وامان زانیی ناوێکی

---

[٣٣٦] لە سەردەمی نەفامییدا کاری ( سقایە ) کە بریتیی بوو لە ئاودانی حاجییان بە دەستی نەوەی عەبدولموطەللیبەوە بوو ، لەو کاتەدا لە دەستی عەبباسدا بوو ، کە ئاوی زەمزەمیان تێکەڵ بە مێوژ و خورما ئەکرد و بە شێوەی شەربەت پێشکەشی حاجییانیان ئەکرد . عەبباسیش رەزێکی گەورەی لە طائیف هەبوو ، سالانە ئەو مێوژەی بۆ ئاودانی حاجییان تەرخان ئەکرد .

تری لیٚ ئەنیٚ . فەرمووی : (( أليست بالبلدة الحرام ؟ )) . فـەرمووی : ( بلد الحرام ) نیە ؟ وتمان: بەڵیٚ . فەرمووی : ((فإن دماءكم ، وأمـوالكم ـ وفي رواية أعراضـكم ـ عليكم حرام كحرمة يـومكم هـذا ، في شـهركم هـذا ، في بلـدكم هـذا إلى يـوم تـلقون ربكم، ألا هل بَلَّغتُ ؟ )) . فەرمووی : خوێنتان و ، سامانتان ـ لە ریوایـەتێکی تـردا شەرەفیشتان ـ وەك حەرامیی ئەمڕۆتان ، لەم مانگەتاندا ، لەم ولاٚتـەتاندا ، بۆتـان حەرامن هەتا بـە پـەروەردگارتان ئەگەنـەوە . ئایـا تـەبلیغم کـرد ؟ وتمـان : بـەڵیٚ.

فەرمووی:

(( أللهمَّ اشهد ، فَلْيُبَلِّغُ الشَّاهِدُ الغَائِبَ ، فَرُبَّ مُبَلَّغٍ أوعى من سامعٍ ، فلا ترجعوا بعدي كفاراً يضرب بعضكم رقاب بعض )) . [٣٣٧] فەرمووی : خوایە ! بە شاهێد بـە .. با ئەوەی ئامادەیە تەبلیغی ئەوە بکات کە ئامادە نیە . لەوانەیە تەبلیغ کراوێك لـەو کەسە چاکتر تیٚ بگات کە گـوێیی لیٚ بـووە . دوای مـن هـەڵ مەگەڕێنـەوە بـۆ سـەر کافرێتیی، بەوەی هەندێکتان لە گەردنی هەندێکتان بدەن .

ئەم وتارە عەلیی سەردارمان خوا لێی رازیی بیٚ بە دەنگـی بـەرز بـە خەڵکەکـەی ئەگەیاند.

پاشان هەندیٚ لە هاوەڵاٚن پرسیاری هەندیٚ کاروباری حەجیان کرد بۆ پـێش و پـاش خستن ، ئەویش ئەیفەرموو : (( لا حَرَجَ ، لا حرج )) .

پێغەمبەری خوا ﷺ رۆژی جەژن و ، هەر سیٚ رۆژەکەی ( أيام التشريق ) [٣٣٨] لە مینا مایەوە ، هەموو رۆژێك کە خۆر خوار ئەبوویەوە رەجمی شـەیتانی ئـەکرد، [٣٣٩] کـە هەر رەجمێکی بە حەوت دەنکە چەو ئەنجام ئەدا و ، لەگـەڵ هــەر دەنـکێـکیـشدا ( الله أكبر ) ی ئەفەرموو و ، دوای رەجمی یەکەم و دووهەم روو بە قیبلە ماوەیەکی زۆر ئەوەستا و ، هەردوو دەستی بەرز ئەکردنەوە و ، دوعای ئەکرد . بـەلاٚم کـە رەجـمی سـێهـەمی ئەنجام دا نەوەستا و رۆیشت .

لەو ماوەیەدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە مینا مایەوە نوێـژی بـۆ هـاوەڵاٚنی ئـەکرد و، نوێژە چواری‌یەکانی کورت ئەکردنەوە و ، تەنها روخصەتی عەبباسی مامـەی و یارمـەتیی دەرانی دا ، تا بە بۆنەی ئاودانی حاجی‌یانەوە لە مەککە شەو بمێننەوە .

---

[٣٣٧] صحيح البخاري ـ كتاب الحج ـ باب خطبة أيام منى .

[٣٣٨] أيام التشريق : سیٚ رۆژن کە لە دوای جەژنی قوربان دێن ، واتە بریتیین لە دووهەم و سیٚهەم و چوارەم رۆژی جەژنی قوربان

[٣٣٩] رەجمی شەیتان لە سیٚ رۆژەی ( أيام التشريق ) دا ئەکرێن ، کە سیٚ رەجمن : یەکەمیان لە نزیك مزگەوتی خەیف و، دووهەمیان رەجمی ناوەڕاست و سیٚهەمیشیان رەجمی عەقەبە .

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ هەر لە مینا و لە رۆژی سێهەمی جەژنی قوربان‌دا، واتە لە دووهەم رۆژی ( أيام التشريق ) دا ، کە پێی ئەوترێ رۆژی (النفر الأول )، وتارێکی تری بۆ موسڵمانان دا ..

هەردوو حافیظ بەززار و بەیهەقیی بە سەنەدی خۆیان لە ئیبن عومەرەوە ریوایەتیان کردووە کە وتوویە : ئەم سوورەتە : ﴿ إذا جاء نصر الله والفتح ﴾ لە رۆژی ناوەڕاستی، واتە دووهەم رۆژی ( أيام التشريق ) هاتە خوارەوە ، ئیتر پێغەمبەری خوا زانیی ئەوە ماڵئاواییە ، بۆیە فەرمانی دا وشترەکەی ( القصواء ) گورج بکرێتەوە. پاشان وتارەکەی ئەو رۆژەی پێشکەش کرد کە جەخت کردنەوە بوو بۆ هەندێ لەو بابەتانەی کە لە دوو وتارەکەی عەرەفە و رۆژی جەژن‌دا هاتبوون [٣٤٠].

لە راستیی‌دا دووبارەبوونەوەی وتارەکان لە حەجی ماڵئاوایی‌دا کارێکی پێویست بوو ، چونکە ئەمە یەکەم حەج بوو کە پێغەمبەری خوا دوای کۆچ کردن ئەنجامی بدات، لە کاتێك‌دا کە خوا دەسەڵاتی بە موسڵمانان بەخشیی بوو و ، بت‌پەرستیی تێك شکابوو ، دەبوا وریا و ئاگادار بکرانایە تا ئاگایان لە خۆیان بێت ، پارێزگاریی لە راستی‌یەکانی ئیسلام بکەن و ، ئەو دەوڵەتە نەونەمامەشیان ، کە بە خوێنی گەشیان پێکیان هێنا بوو ، بپارێزن .

ریوایەتێکیش هەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە رۆژی حەوتەمی مانگی حەج‌دا وتاری دابێ ، بەڵام وا دیارە دەربارەی هەنگاوەکانی حەج‌کردن بووبێت .

رۆژی حەوتەمی مانگ ناوی رۆژی ( الزينة ) بوو ، چونکە ئەو وشترانەی کە بۆ ( هدي ) ئەهێنران ئەڕازێنرانەوە و، رۆژی هەشتەمیش پێی ئەوترێ رۆژی ( تروية ) چونکە لەو رۆژەدا وشترەکانیان ئاو ئەدان و ، چەندێ ئاویان بۆ کاتی وەستانی عەرەفە و لەوە و دواش پێویست بوایە هەڵیان ئەگرت ، چونکە ئەو کاتە لەو شوێنانەدا ئاو دەست نەئەکەوت . رۆژی نۆهەمیش پێی ئەوترێ رۆژی ( عرفة ) بە بۆنەی ئەوەوە کە لەو رۆژەدا حاجی‌یان لە عەرەفات ئەوەستن . رۆژی دەهەمیش رۆژی ( النحر ) واتە سەربڕین و ، رۆژی جەژنی قوربان و ، رۆژی حەجی گەورە . رۆژی یانزەهەمیینیش رۆژی ( القر ) چونکە میوان‌داری‌یان تێدا ئەکرد و ، پێیشی ئەوترێ رۆژی ( الرؤوس ) چونکە سەری ئاژەڵەکانی قوربانی‌یان تیا ئەخوارد و ، یەکەم رۆژی ( أيام التشريق ) یشە ، دووهەم رۆژی ( أيام التشريق ) یش پێی ئەوترێ رۆژی ( النَّفْر الأول ) چونکە

---

[٣٤٠] البداية والنهاية : ٥ / ٢٠١ ـ ٢٠٢ .

کەسێ پەلەی بێت جائیزە لەم ڕۆژەدا بەرەو مەککە بگەڕێتەوە . سێهەم ڕۆژیش پێی ئەوترێ ڕۆژی ( النفر الثاني ) . ئەوەتا قورئان ئەفەرموێ : ﴿ وَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ فِيٓ أَيَّامٖ مَّعۡدُودَٰتٖۚ فَمَن تَعَجَّلَ فِي يَوۡمَيۡنِ فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِ وَمَن تَأَخَّرَ فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِۚ ﴾ ( البقرة : ٢٠٣ ) .

**هەشتەم : بۆ ئەبطەح لە مەککە**

لە سێهەم ڕۆژی ( أيام التشريق ) دا ، واتە لە چوارەم ڕۆژی جەژنی قوربان‌دا ، کە ڕۆژی سێشەممە بوو پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ موسڵمانەکان‌دا کەوتنە ڕێ و هاتن لە ئەبطەح دابەزین . لەوێ نوێژی نیوەڕۆ و عەصر و ، مەغریب و عیشای بە موسڵمانان کرد ، پاشان لە سەحەردا طەوافی ( زیارە ) ی ئەنجام دا و ، نوێژی بەیانیی لە کەعبە بە موسڵمانەکان کرد ، دوای ئەوە فەرمانی دا موسڵمانان بەرەو مەدینە بکەونە ڕێ . کە کەوتنە ڕێ موسڵمانان دەستیان بە تەکبیر و تەهلیل کرد و ، ئەیان وت : (( آيبون ، تائبون ، عابدون ، ساجدون ، لربنا حامدون ، صدق الله وعده، ونصر عبده ، وهزم الأحزاب وحده )) .

لە ڕێی گەڕانەوەدا و ، لە ڕۆژی هەژدەهەم‌دا پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە ( غدير خُم ) لە نزیك جوحفەدا وتارێکی بۆ موسڵمانان دا ، کە تیایا هاتبوو :

(( أَمَّا بَعدُ ، ألا أَيُّهَا النَّاسُ ! فَإِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ يُوشِكَ أَنْ يَأْتِيَ رَسُولُ رَبِّي فَأُجِيب وَأَنا تَارِكٌ فِيكُم ثَقَلَينِ ، أَوَّلُهُمَا كِتَابَ اللهِ فِيهِ الْهُدى وَالنُّورُ ، فَخُذُوا بِكِتَابِ اللهِ ، وَاسْتَمْسِكُوا بِهِ )) . فەرمووی : خەڵکینە ! منیش مرۆڤم و هاکا نێرراوی پەروەردگارم هات واتە مەرگ یەخەی پێ گرتم . جا من دوو شتتان لەناودا بەجێ ئەهێڵم : یەکەمیان قورئانی پیرۆزە کە هیدایەت و نووری تێدایە .. دەست بە قورئانی پیرۆزەوە بگرن ... بەم شێوە موسڵمانەکانی هەڵ نا تا لە خزمەتی قورئان‌دا بن . پاشان فەرمووی : (( وَأَهلُ بَيتِي ، أُذَكِّرُكُمُ اللهَ في أَهلِ بَيتِي ، أُذَكِّرُكُمُ اللهَ في أَهلِ بَيتِي ، أذكركم الله في أهل بيتي )) . دووهەم : ئەهل و بەیتی خۆی . سێ جار داوا لە موسڵمانان ئەکات کە چاودێریی ئەهل و بەیتی بکەن .

لە ریوایەتێکی تردا پێغەمبەری خوا ﷺ ئامۆژگاریی موسڵمانان ئەکات و لەبەر چاویان‌دا بەرگریی لە سەردارمان عەلیی ئەکات ، وەك بڵێی لە سەردەمی ئەودا فیتنە و پشێویی بەرپا ئەبێ ، با موسڵمانەکان ئاگادار بن کە عەلیی سەردارمان لەسەر حەقە و نەیارانی ستەمی لێ ئەکەن ، بۆیە دەستی گرت و فەرمووی : (( من كنت

ولیه ، فهذا ولیه . أللهم وال من والاه ، وعاد من عاداه )) . لـه ریوایـەتێکی تـردا ئـەفـەرمـوێ : (( من کنت مولاه فعلي مولاه )) .

شایانی باسه که عەلیی سەردارمان له یەمەن گەڕابوویەوه و فریای حەج کەوتبوو. جا هەندێ له سەربازان گلەیی‌یان لێی هەبوو لەسەر ئـەوەی کـه جێگرەکـەی هەنـدێ شتی بەسەریاندا دابەش کردبـوو و عـەلییش لێـی وەرگرتبوونـەوه . لـه راسـتیی دا کارەکەی عەلیی سەردارمان راست بوو چونکه ئەوه له سامانی زەکات و پێـنج یـەك بوو . بۆ ئەمه پێغەمبەری خوا ﷺ بەرگریی لێ کرد که ئەو لەسەر حەقه .

که پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتەوه ( ذو الحليفه ) که چەند میلێکـی ئـەمێنێ بـۆ مەدینه ، شەو تیایا مایەوه . که چاویشی به مەدینه کەوت سێ جار ( ألله أكبر ) ی فەرموو و ، پاشان فەرمووی : (( لا إله إلا الله وحده ، لاشريك له ، له الملك وله الحمد، وهو على كل شيءٍ قـدير . آيبـون ، تـائبون ، عابـدون ، سـاجدون ، لربنـا حامـدون، صدق الله وعده ، نصر عبده ، وهزم الأحزاب وحـده )) . ئیتر ئەوەبوو به رۆژی رووناك گەیشتەوه ناو شار .[٣٤١]

---

[٣٤١] السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٥٦٧ ـ ٥٨١ ، السيرة النبوية للصلابي : ٨٦٩ ـ ٨٨٠ ، السيرة النبوية للندوي: ٣٩٣ ـ ٤٠٠ ، الرحيق المختوم : ٤٧٢ ـ ٤٧٧ .

## بەشی چل و شەشەم

# هەنــدێ ڕووداوی ســاڵــی دەهــەم

لە ساڵی دەهەمی کۆچیی‌دا چەند ڕووداوێکی تر ڕوویان دا کە ئەمە هەندێکیانن :

**یەکەم : کۆچی دوایی ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر**

لە مانگی ڕەبیعی یەکەم ، یان لە ڕەمەزان ، یان لە ذولحەججەی ساڵی دەهەم‌دا ، ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر ﷺ ، کە لە ماریەی قیبطیی بوو بوو ، لە تەمەنی شانزە مانگیی‌دا ، یان زیاتردا کۆچی دوایی کرد ..[٣٤٢]

دیارە پێغەمبەریش بە هەست و سۆزی مرۆڤەوە بە لەدایک‌بوونی ئیبراهیم زۆر شادمان بوو ، کەواتە سەیریش نیە ئەگەر بە مردنیشی یەکجار خەمبار ببێ .

کە تەشریفی بردە ژوورەوە لای ئیبراهیم و گیان‌کەنشتی ئەکرد ، هەردوو چاوی پڕ بوون لە فرمێسک . عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف کە چاوی لە فرمێسک ڕێژانی ئازیز بوو سەری سوڕ ما و پرسیی : تۆیش ئەی پێغەمبەری خوا ؟

فەرمووی : (( یا ابن عوف ! إنها رحمة )) . فەرمووی : کوڕی عەوف ئەوە ڕەحم و سۆزە. هەروەها فەرمووی : (( إن العين تدمع ، والقلب يحزن ، ولا نقول إلا ما يرضي ربنا، وإنا لفراقك يا إبراهيم لمحزونون )) . ( رواه البخاري ) .

فەرمووی : چاو فرمێسک هەڵ ئەڕێژێ و ، دڵیش خەمبار ئەبێ ، بەڵام ئێمە تەنها ئەوە ئەڵێین کە پەروەردگارمان ڕازیی بکات .. بە ڕاستیی ئیبراهیم ئێمە بۆ جیا بوونەوەت خەمبارین .

---

[٣٤٢] خوا لێ خۆش بوو ( محمود صالح الفلكي ) لە لـ ١٨ ـ ١٩ ی کتێبەکەی‌دا ( التقويم العربي قبل الإسلام ) ئەڵێت : بە وردیی حیسابم کرد بۆم دەرکەوت کە بە ڕاستیی لە مەدینەدا و ، لە سەعات هەشت و نیوی دوای نیوەڕۆدا، بە تەوقیتی غروبیی ، واتە سێ سەعات و نیو ڕۆژی مابوو ، لە ڕۆژی ٢٧ / ١ / ٦٣٢ ز ، بەرامبەر بە ٢٩ / شەووالی / ١٠ ك ، خۆر بە تەواویی گیراوە . ( السيرة النبوية للندوي ) ٤٢١ .

کەواتە بەم پێیە بێ کۆچی دوایی ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی بیست و نۆهەمی مانگی شەووالی ساڵی دەهەمی کۆچیی‌دا بووە ..

هەروەها فەرمووی :(( لولا أنه أمر حق ، ووعد صدق ، وإن آخرنا سيلحق أولنا لحزنا عليك حزناً أشد من هذا )) .

فەرمووی ، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە مردن کارێکی حەق و ، بەڵێنێکی راستە و، پاشیینەمان بە پێشیینەمان ئەگاتەوە، لەمەش زیاتر بۆت خەمبار ئەبووین . پاشان شۆردیان و کەفەنیان کرد و ، پێغەمبەر و هاوەڵانی نوێژیان لەسەر کرد و ، لە بەقیعی قەبرستانی مەدینە و ، لە تەنیشت هاوەڵی موسڵمانی پێشیینەدا عوثمانی کوڕی مەظعوون‌دا ناشتیان ..

خوای گەورە وەهای رێك خست لەو رۆژەدا کە ئیبراهیم کۆچی دوایی کرد خۆریش گیرا . خەڵکەکە وتیان : بە بۆنەی مەرگی ئیبراهیمەوە خۆر گیرا ..

بەڵام پێغەمبەری نازدار ﷺ خێرا بۆچوونی موسڵمانەکانی راست کردەوە کە فەرمووی : (( إن الشمس والقمر لا ينكسفان لموت أحد ولا لحياته ، ولكنهما آيتان من آيات الله . فإذا رأيتموها فقوموا وصلوا وادعوا الله )) . ( رواه البخاري ) .

فەرمووی : خۆر و مانگ نە بۆ مردن و نە بۆ ژیانی هیچ کەس ناگیرێن ، بەڵکو دوو نیشانەی خوان . جا ئەگەر دیتان گیران هەستن نوێژ بکەن و بپاڕێنەوە ..

دیارە پێغەمبەری خوایە و نایەوێ دڵپاکیی و نیازپاکیی جەماوەر رام بکات و ، خەڵکەکە بە چاوێکی تایبەتی‌یەوە سەیری خۆی و کوڕەکەی بکەن .. چونکە ئەو پێی خۆش بووە موسڵمانان بە چاوی ساغەوە ئیمان وەربگرن .

ئەوەی ئاگاداری ئەم هەڵوێستە بێ بەوپەڕی ئیعجابەوە سەیری ئازیز ئەکات .. هەتا خۆرهەڵاتناسەکان ، ئەوانەیان کە لەسەر ژیانی ئازیزمانیان نووسیوە ئەوپەڕی ستایشی ئەم هەڵوێستەیان کردووە و ، بە چاوی رێزەوە سەیری پێغەمبەری ئیسلامیان کردووە.

**دووهەم : سەرهەڵدانی موسەیلەمەی درۆزن**

لە پێشەوە باسی ئەوەمان کرد کە موسەیلەمەی درۆزن لەگەڵ نوێنەری نەوەی حەنیفەدا هاتنە مەدینە و ، لەوێ دڵی چووە سەر دەسەڵاتی پێغەمبەری خوا ﷺ و ، حەزی لەوەبوو ئەویش وەها گوێڕایەڵیی بۆ بکرایە . بۆ ئەمە پێشنیاری ئەوەی کرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەم کارەی‌دا بیکاتە هاوبەش یان دوای خۆی بەوی بسپێرێ . بەڵام ئەو بە گوێی نەکرد . ئەوەبوو لە کۆتایی ساڵی دەهەمی کۆچیی‌دا ئەم نامەیەی

بۆ پێغەمبەر نارد : (( مِن مسيلمة رسول الله إلى محمد رسول الله . سلام عليك . أما بعد : فإني قد أشركت في الأمر معك ، فإن لنا نصف الأرض ، ولقريش نصفها ولكن قريشًا قوم يعتدون )) . لە نامەکەیدا ئەوەی دەرخست کە ئەویش بۆتە پێغەمبەر و سەرزەویی نیوەی بۆ ئەو و نیوەکەی تریشی بۆ قورەیش .

بە دوو پیاودا نامەکەی نارد . پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوو نێرراوەکەی پرسیی: (( وأنتما تقولون بمثل ما يقول ؟ )) فەرمووی : ئێوەش وەك ئەو ئەڵێن ؟ وتیان : بەڵێ. فەرمووی : (( أما والله لولا أن الرسل لا تقتل لضربت أعناقكما )) . فەرمووی: بەخوا لەبەر ئەوە نەبێ کە نێرراوان نابێ بکوژرێن ، لە گەردنی هەردووکتانم ئەدا.

پاشان بۆی نووسیی : (( بسم الله الرحمن الرحيم . من محمد رسول الله إلى مسيلمة الكذاب . سلام على من اتبع الهدى . أما بعد : فإن الأرض لله يورثها من يشاء من عباده والعاقبة للمتقين )) .

بە ناوی خواوە وەڵامی دایەوە و ، بۆ هەتا هەتایی ناوی درۆزنیی بەسەردا بڕیی و، تێیشی گەیاند کە زەویی موڵکی خوایە و ، بە ویستی خۆیەتی تەسلیمی هەر کەسی بکات . ئەوەندە هەیە سەرەنجام هەر خواناسان ئەیبەنەوە ..

موسەیلەمەی درۆزن بەوە عاری نەنا ، بەڵکو دەستی دایە قسەی هەڵەق و مەلەق و ناویشی نا قورئان کە گوایا بۆی هاتووە . بەمە نەوەی حەنیفەی لە خشتە برد و کەوتنە شوێنی ، تا ئەوەبوو لە هەڵمەتی پاك سازیی دوورگەدا هاوەڵان توانی‌یان لە سەردەمی خەلیفەی یەکەمدا خوا لێی ڕازیی بێ موسەیلەمە بکوژن و لەشکری هەزار بە هەزاریشی تەفروتوونا بکەن .

### سێهەم : سەرهەڵدانی ئەسوەدی عەنسیی

ئەم پیاوە دەستبڕەش لە صەنعاء سەری هەڵ دا و ، ئەویش داوای پێغەمبەرایەتیی ئەکرد . بۆ ئەوەی خەڵك بخەڵەتێنێ پەنای بۆ سیحر و دەستبڕین برد. لەو کاتەدا ئەمیری یەمەن باذان بوو ، کە ئەوەبوو دوای موسڵمانبوونی بە فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە شوێنی خۆی بە ئەمیریی مابوویەوە .

کە باذان کۆچی دوایی کرد ئەسوەد هاوسەرەکەی باذانی مارە کرد و ، موهاجیری کوڕی ئەبوئومەییەی مەخزوومییشی لە صەنعاء دەرکرد ، کە لەلایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ بۆ کۆکردنەوەی زەکات دانرابوو . ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ نامەی بۆ

میرزەبانەی هاوسەری باذان و کاربەدەستەکانی نووسیی تا بە هەموویانەوە دەورەی لیّ بدەن و بی‌کوژن . میرزەبانە دەوری گرنگی بینیی لە کوشتنی ئەسوەددا ، بەوەی کە عەرەقێکی زۆری دایە هەتا سەرخۆش بوو و ، بە نەخشەی خۆیان فەیرووزی دەیلەمیی هات و سەری لە لاشەی جیا کردەوە . هەواڵی کوشتنی ئەسوەد لە بەرەبەیانی ناشتنی پێغەمبەردا ﷺ گەیشت کە یەکەم رۆژی خەلافەتی ئەبوبەکری صدیق بوو خوا لێی رازیی بێ .[٣٤٣]

[٣٤٣] السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٥٨٢ ـ ٥٨٤ .

## بەشی چل و حەوتەم

# سەرکەوتنی ئیسلام و ڕۆڵی گرنگی

لەو ڕۆژەوە کە وەحی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هات و ، ئەویش کەوتە هەوڵ و کۆشش و ، ڕەنج و تەقالای سەرەمرِ بۆ بانگ‌کردنی مەردومەکان بۆ سەر ڕێبازی خواناسیی و ، ڕزگارکردنیان لە شیرك و بت‌پەرستیی .. کەوتە هەوڵ و تێکۆشان و ، ملهوڕەکانی دەوربەریشی کەوتنە دژایەتیی‌کردنی و ، ترساندن و چەوساندنەوە و پەشیمان‌کردنەوەی ئەومرۆڤە فیطرەپاکانەی کە ئەیانویست ڕێبازی تەوحید بگرنە بەر..

زۆرانبازیی دروست بوو .. دینی تازە ڕاستیی‌یەکانی بلاّو ئەکاتەوە و شیرك و گومڕاییش بەرگریی لە بەندوباوی نەفامیی ئەکەن و ، مرۆڤەکان بە گاڵە و هاش و لووش چەواشە ئەکەن ..

مرۆڤە بەغیرەتەکان لە بانگی نوێ هاتنە پێشەوە .. ئەگەرچیی ژیان و گوزەرانیان ئەکەوێتە مەترسیی ، بێ‌باك هاتنە مەیدان و بە پەنجەی شایەتمان تەوحیدیان گەیاند.. بە خوێندنی ئایەتە پیرۆزەکان قوڕەیشیان لە حەق ئاگادار کرد ..

لێدانیان خوارد .. سزایان چەشت .. ئازاری سەرەمرِیان ئەدان .. بەلاّم کۆڵدان بە لای شێرەکانەوە نەبوو .. حەق بۆ ئەوە هاتووە شوێنی بکەوی .. بێ‌باك لە هەموو ئەنجامێك ..

بەڵێ ، دینی ئاخرزەمان بۆ پێغەمبەری ئاخرزەمان هات ، تا ئوممەتی ئاخرزەمانی پێ پەروەردە بکات .. ئەو ئوممەتەی کە نە لەوەو پێش و نە لەوەو پاشیش هەڵ نەکەوتووەو هەڵیش ناکەوێ . ئەو ئوممەتەی کە خوای گەورەی لێ ڕازیی بێ و ، پێغەمبەریش ﷺ ببێتە سەرداری هەموو پێغەمبەران سەلامیان لێ بێ .

که یەکەم جار جیبریل هاتە خوارەوە و قورئانی بۆ هێنا ؛ گەڕایەوە لای کەس وکاری و فەرمانی دا دای بپۆشن .. ئەوەبوو لە ئاسمانەوە فەرمانی بۆ هات : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُزَّمِّلُ ۝١ قُمِ ٱلَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ و ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ۝١ قُمْ فَأَنذِرْ ﴾ .

فەرمانی بۆ هات هەستێتە سەر پێ و دانەنیشێ .. ئەویش لە ماوەی زیاتر لە بیست ساڵدا مەردانە هەستایە سەرپێ و ؛ بەبێ وچان ، بەوپەڕی غیرەتەوە هەوڵی دا تا ئەو سپاردە بە نرخ و بەهایە بە دەستی خاوەنی شیاوی بگەیەنێ ..

بەڵێ مرۆڤایەتیی لەناو لیتەی نەفامییدا نوقم بووبوو و ، عەقیدەی شیرك مێشکی بەنج کردبوو و ، رەوشتە ناهەموارەکانیش لە گۆیان خستبوو و ، زاڵم و ستەمکارانیش هەژار و بێدەسەلاتیان چەوساندبۆوە ؛ لەگەڵ ئەوەشدا ئازیز کۆڵی نەدا هەتا کۆمەڵێکی پاڵەوانی خۆنەویستی فیداکاری پێ گەیاند و ، بوونە بەردی بناغە تا دیواری بەرز و بڵندی ئیسلامیان لەسەر بوەستێنرێ و ، مرۆڤایەتیی لە سایەیدا بحەسێتەوە .

ئەوەبوو سەرەتا قوڕەیش هاتە مەیدانی زۆرانبازییەوە تا دینی خوا لەناو بەرێت. پاشان هەموو عەرەبی دوورگە و ، جوولەکەی مەدینە و خەیبەر و ، مونافیقانی مەدینە کەوتنە دژایەتیی . کە ئەوانیش کۆڵیان پێ درا ، دوو دەوڵەتی گەورەی جیهانیی ، رۆم و فارس ؛ کەوتنە دژایەتیی و بە گژدا هاتنی دینی تەوحید . ئیتر با فرۆفێڵی شەیتان و نەفسیی ئەمارە لەولاوە بوەستێ ، سەرەڕای ژیان و گوزەرانی تاڵ بە هۆی دەستکورتیی موسڵمانانەوە ، بە بۆنەی ئەوەوە کە سەربەست نەبوون تا بتوانن بازرگانیی ئەنجام بدەن و ، زیاد لەوەش کە بە سەرەمڕیی و بەبێ ماندووبوون خەریکی خواپەرستیی و شەونوێژ و قورئانخوێندن بوون ..

بەم شێوەیە ئازیز و هاوەڵانی زیاتر لە بیست ساڵ بەبێ ئارامگرتن خەریکی بانگەواز بوون تا سەرکەوتنیان بە دەست هێنا و ، بتەکان شکێنران و ، ئاسمانی ئەو بیابانە فراوانە بە دەنگی ( ألله أكبر ) ئەزرنگایەوە .. بە دەنگی قورئان خوێنان ئەڕازایەوە .

لە سایەی ئیسلامدا هۆزەکان یەکیان گرت .. مرۆڤەکان لە بەندایەتیی بەندان رزگاریان بوو و ، بوونە بەندەی راستەقینەی خوای پەروەردگار .. گەورە و بچووك نەما .. ئاغا و نۆکەر نەما .. ستەمکار و ستەملێکراو نەما .. هەموو بوونە

بەندەی خوا و برای دینیی .. هەر هەموو بوونە قوتابیی قورئان و پەیڕەویی‌کەری سوننەتی بێ‌گەرد .. هەر هەموو لە ئادەم و ئادەمیش لە گڵ . ئیتر مرۆڤایەتییش لە وەهم و خەرافیات رزگاری بوو و ، رەوشتە نزمەکان باویان نەما .. دەست‌بڕین و چاوبەست کردن پێچرایەوە .. سیفەتە بەرزەکان سەریان هەڵ دا و کۆمەڵگایان پێ رازایەوە .. سەرەنجام مرۆڤایەتیی لە سایەی ئیسلام‌دا حەسایەوە .. بە حەیا و حورمەت ، بە دڵی پاك و سنگی خاوێنەوە موسڵمانان دەستیان دایە رزگارکردنی گەلانی سەرزەویی ئاوەدان کراوە ، بە هیوای پادشتی خوا و ، سەرفرازیی قیامەت .. پێغەمبەری ئازیزیش ﷺ بە دڵی خۆش و سەری بەرزەوە ئەرکی خۆی کۆتایی پێ هێنا و ، بە چاو و دڵی رۆشنەوە گەڕایەوە بارەگای خوا .. موسڵمانەکانیش هەتا ئەمڕۆ و هەتا ئاخرزەمان خەریکی گەیاندنی فەرمانی قورئان و سوننەتی ئازیزن بە نیەتی رزگارکردنی مرۆڤ لە ئاگری دۆزەخ ، هیوای رازیی کردنی خوای پەروەردگار .

## بەشی چل و هەشتەم

# خانەوادەی پێغەمبەری خوا ﷺ

سەرەتا با هاوسەرەکانی باس بکەین ، پاشان منداڵەکانی :

**أ ـ هاوسەرەکانی :**

( ١ ) خەدیجەی کچی خوەیلید ، خوا لێی رازیی بێ : لە سەرەتای بانگەوازدا خێزانی پێغەمبەر ﷺ بریتیی بوو لە خۆی و خەدیجە کە خۆی تەمەنی بیست و پێنج ساڵ بوو و، خەدیجەش چل ساڵان .. ئەمە یەکەم هاوسەریەتی و ، تا ئەمیش لە ژیان دا بوو ژنی تری نەهێنا . چەند کوڕێك و کچێکی لێ بوو . خەدیجە سێ ساڵ پێش کۆچ‌کردن کۆچی دوایی کرد . هەمیشە ناوی خەدیجەی ئەبرد و ، جاری وا ئەبوو مەڕێکی سەرئەبڕیی و پارچە پارچەی ئەکرد و ، پاشان ئەی‌نارد بۆ دەستەخوشکانی خەدیجە .

( ٢ ) سەودەی کچی زەمعە ، خوا لێی رازیی بێ : لە مانگی شەووالی ساڵی دەهەمی هاتنی وەحی‌دا ، چەند رۆژێك دوای کۆچی دوایی خەدیجە ، مارەی کردووە . سەودە لەوەوپێش هاوسەری ئامۆزایەکی خۆی بوو بوو و کۆچی دوایی کردبوو .

( ٣ ) عائیشەی کچی ئەبوبەکری صددیق ، خوا لێیان رازیی بێ : ساڵێك دوای مارە کردنی سەودە ، لە مانگی شەووالی ساڵی یانزەهەمی هاتنی وەحی‌دا مارەی کردووە ، کە دوو ساڵ و پێنج مانگ پێش کۆچ کردن بۆ مەدینە بووە . حەوت مانگ دوای کۆچ‌کردن لە شەووالی یەکەم ساڵ‌دا گواستوویەتیەوە . لە هاوسەرانی ئازیزدا تەنها عائیشە کچ بووە و مارەی کردووە . بە لای پێغەمبەری خواوە زۆر خۆشەویست بووە . یەکەم ئافرەتی ئوممەتی ئیسلامە لە شارەزای دین‌دا . بۆیە گەورە هاوەڵان لە زۆر مەسەلەدا پرسیان بەو ئەکرد و داوای فەتوایان لێ ئەکرد .

( ٤ ) حەفصەی کچی عومەری کوڕی خەططاب ، خوا لە هەردووکیان رازیی بێ: لە نێوان جەنگی بەدر و ئوحوددا خونەیسی کوڕی حوذافەی سەهمیی کۆچی دوایی

کرد و ، حەفصەش بێوەژن کەوت و ، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی سێهەمدا ، بۆ دڵدانەوەی عومەر مارەی کرد ..

( ٥ ) زەینەبی کچی خوزەیمە ، خوا لێی رازیی بێ : خاوەنی دڵێکی بەسۆز بوو بەرامبەر بە هەژار و دەستکورتان ، بۆیە نازناوی ( أم المساكين ) ی وەرگرتبوو - سەرەتا هاوسەری عەبدوڵڵای کوڕی جەحش بوو ، ئەوەبوو لە ئوحوددا شەهید بوو و ، بۆ دڵدانەوەی ، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی چوارەمی کۆچییدا ، مارەی کردەوە ، کەچیی بە فەرمانی خوا دوای دوو یان سێ مانگ کۆچی دوایی کرد ..

( ٦ ) ئوم سەلەمە ، هیندی کچی ئەبوئومەییە حوذەیفەی کوڕی موغیرەی مەخزوومیی ، خوا لێی رازیی بێ : ئامۆزای خالیدی کوڕی وەلید بووە . سەرەتا هاوسەری ئەبوسەلەمە ئەبێت . ئەوەبوو لە مانگی جومادی دووهەمی ساڵی چوارەمدا ئەبوسەلەمە کۆچی دوایی کرد و ، پێغەمبەری خوا ﷺ لە مانگی شەووالی هەمان ساڵدا مارەی کردەوە . ئوم سەلەمە دواهاوسەری پێغەمبەر بووە کە کۆچی دوایی بکات.

( ٧ ) زەینەبی کچی جەحش ، خوا لێی رازیی بێ : دایکی زەینەب ئومەیمەی کچی عەبدولموطەللیبە و پوورزای پێغەمبەری خوا بووە . سەرەتا هاوسەری زەیدی کوڕی حاریثەی خزمەتگوزاری پێغەمبەری خوا بوو ، کە بە کوڕی پێغەمبەر ناو ئەبرا . ئەوەبوو زەید تەڵاقی دا و خوای گەورەش پێغەمبەری خوای ﷺ ئاگادار کرد کەوا زەینەبی لە ئاسمان بۆ مارە بڕاوە ، ئەمەش تا ئەو یاسایە بەتاڵ بێتەوە کە لەناو عەرەبەکاندا باو بوو کە هاوسەری کەسێکی بە کوڕکراو بۆ باوکەکەی ناشێت . قورئان ئەفەرموێ : ﴿ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَٰكَهَا ﴾ ( الأحزاب : ٣٧ ) . لە مانگی ذولقەعیدەی ساڵی پێنجەمی کۆچییدا مارەی کردەوە .

( ٨ ) جوەیریەی کچی حاریث ، خوا لێی رازیی بێ : باوکی سەرداری نەوەی موصطەلەق بوو و ، جوەیریە لە جەنگی نەوەی موصطەلەقدا بە دیلیی لەگەڵ خەڵکێکی زۆری هۆزەکەیدا کەوتە دەست موسڵمانەکان و ، کەوتە بەشی ثابیتی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماس . بە موکاتەبە خۆی ئازاد کرد و پێغەمبەری خوایش ﷺ پارەی موکاتەبەکەی دا و، لە مانگی شەعبانی ساڵی شەشەمی کۆچییدا مارەی کرد.

( ٩ ) ئوم حەبیبە ، رەملەی کچی ئەبوسوفیان ، خوا لێیان رازیی بێ : هاوسەری عوبەیدوڵڵای کوڕی جەحش بوو و ، پێکەوە لە دەست ئازاری قورەیش کۆچیان کرد بۆ حەبەشە و ، لەوێ مێردەکەی لە ئیسلام هەڵ گەڕایەوە و ، بووە گاور و ، پاشان

مرد.. بەڵام رەملە لەسەر دینەکەی بە دامەزراویی مایەوە . کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ عەمری کوڕی ئومەییەی ضەمریی ، لە مانگی موحەڕڕەمی ساڵی حەوتەم دا، بە نامەوە نارده لای نەجاشیی پادشای حەبەشە ، خوازبێنیی رەملەی لێ کرد و داوای لێ کرد مارەی بڕێ بۆی . ئەوەبوو لەگەڵ شورەحبیلی کوڕی حوسنەدا ناردیەوە.

( ١٠ ) صەفیەی کچی حویەیی کوڕی ئەخطەب ، خوا لە صەفیە رازیی بێ :

باوکی سەرداری نەوەی نەضیر بوو . صەفیە بە رەچەڵەك ئەگاتەوە بە هاروون پێغەمبەری برای مووسا پێغەمبەری کوڕی عیمران سەلامی خوایان لێ بێ . صەفیە یەکێ بوو لە دیلەکانی خەیبەر و ، پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر دڵدانەوەی صەفیە کە کچی پادشای جوولەکە بووە هەڵی بژارد بۆ خۆی و ئازادی کرد و دوای فەتحی خەیبەر لە ساڵی حەوتەمدا مارەی کرد ..

( ١١ ) مەیموونەی کچی حاریث ، خوا لێی رازیی بێ : خوشکی ئوم فەضل لوبابەی کچی حاریث بووە . لە مانگی ذولقەعیدەی ساڵی حەوتەمدا لە ( عمرة القضاء ) دا ، دوای ئیحرام شکاندن ، مارەی کردووە .

ئەم یانزە هاوسەرە دوانیان لە ژیانی ئازیزدا کۆچیان کردووە کە خەدیجە و زەینەبی دایکی هەژاران بوون و ، ئەو نۆ هاوسەرەکەی مابوون کە ئازیز کۆچی دوایی کرد .

هەروەها دوو کەنیزەکیشی لە دوا بەجێ مان :

یەکەمیان: ماریەی کچی شەمعوونی قیبطیی میصریی کە موقەوقەسی پادشای میصر بە دیاریی بۆ پێغەمبەری خوای نارد .

دووهەمیان : رەیحانەی کچی زەید لە نەوەی نەضیریان قورەیظە موسڵمان بوو و ئازادی کرد و پاشان مارەی‌کرد ..

شایانی باسە ئەم هاوسەرانەی پێغەمبەری خوا ﷺ خوا لێیان رازیی بێ بە حوکمی قورئان دایکی هەموو ئیمان‌دارێکن کە لە ژێر ئاڵای پێغەمبەردا وەستابێ ، بۆیە بە هەموو موسڵمانێك مەحرەمن و ناگونجێ دوای پێغەمبەر هیچ کەسێك مارەیان بکات. قورئان ئەفەرموێ : ﴿ وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا رَسُولَ اللَّهِ وَلَا أَن تَنكِحُوا أَزْوَاجَهُ مِن بَعْدِهِ أَبَدًا ۚ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ عِندَ اللَّهِ عَظِيمًا ﴾ ( الأحزاب : ٥٣ ) .

شایانی باسە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر بەرژەوەندیی بانگەواز و ئوممەتەکەی ئەم ژنانەی مارە کردوون و ، بە ئامانج و مەبەستێکی قیامەتی‌یەوە هەر یەکەیانی

مارە کردووە . چونکە ئەمانە ئافرەتی جوان و شەنگ و شۆخ و هەڵبژاردەی ناو موسڵمانان نەبوون .. هەر هەموویان بێوەژن بوون جگە لە عائیشە .

سەرەتای تەمەنی هەتا گەیشتە بیست و پێنج ساڵیی لەوپەڕی پاکیی و رەوشت جوانیی‌دا ژیاوە . پاشان ئافرەتێکی بێوەژنی چل ساڵەی مارە کردووە کە لەوەو پێش دوو شووی کردوون و منداڵیشی هەبووە و ، تەمەنیشیان پانزە ساڵی جیاواز بووە .

هەتا خەدیجە لە ژیان‌دا ئەبێت ژنی تر ناهێنێ . کە تەمەنی لە پەنجا ساڵیی تێ ئەپەڕێ سەودە مارە ئەکات ، کە بێوەژن ئەبێت و مێردەکەی بە موسڵمانیی و کۆچ کردوویی لە حەبەشە کۆچی دوایی ئەکات .

لەناو عەرەبەکان‌دا ژن و ژنخوازیی رۆڵێکی گرنگی هەبوو تا هۆزەکان ببنە دۆستی یەك . جا پێغەمبەری خواش ﷺ ئەو بەرژەوەندی‌یەی بەرچاو ئەگرت و هەوڵی ئەدا بە هۆی ژن و ژنخوازی‌یەوە هۆزەکان بکاتە دۆستی ئیسلام .

ئەوەبوو پێی خۆش بوو بە مارەکردنی عائیشە و حەفصە خزمایەتیی لەگەڵ ئەبوبەکر و عومەردا پتەوتر بکات و ، بە مارەبڕینی فاطیمە لە عەلیی و ، روقیە و ئوم کەلثومیش ، یەك لە دوای یەك ، لە عوثمان پەیوەندیی نێوانیان زیاتر پتەو بکات .

کاتێك کە ئوم سەلەمەی مارە کرد کە ئامۆزای خالیدی کوڕی وەلید بوو ، ئیتر خالید لەو دژایەتی‌یە کۆڵی دا کە لە ئوحوددا بەرامبەر بە موسڵمانەکان کردی ، بگرە دڵی نەرم بوو و موسڵمان بوو .

هەروەها کە رەملەی کچی ئەبوسوفیانی مارە کرد ، ئیتر ئەبوسوفیان وازی لەو دژایەتی‌یە هێنا و لەگەڵ موسڵمانان‌دا جەنگی خوێناویی بەرپا نەکرد ..

کە صەفیەی کچی حویەییشی مارە کرد لەلایەن جولەکەی نەضیرەوە ئەو دژایەتی‌یە نەکرا .

کە جوەیریەشی مارە کرد نەوەی موصطەلەق هیچ دژایەتی‌یەکیان نەکرد ، بەڵکو جوەیریە بووە بەرەکەت بۆ خزمەکانی ، کە ئەوەبوو موسڵمانەکان بە بۆنەی ئەوەوە هەموو دیلەکانی نەوەی موصطەلەقیان ئازاد کردن و وتیان : خەزوورانی پێغەمبەری خوان ﷺ و ، ئەوانیش موسڵمان بوون .

ئەوەشمان لە یاد نەچێ کە ژیان و گوزەرانی لەگەڵ ئەم هاوسەرانەی‌دا لەوپەڕی نارەحەتیی‌دا بووە ، لەبەر دەستکورتیی پێغەمبەر و ئاتاجیی هاوسەرانی .

گوزەرانیان ئەوەندە سەخت بوو هیچ کەڵە پیاو و گەورە زاهیدێك لە مێژووی کۆن و نوێدا بەرگەی نەئەگرت ، بە رادەیەك کە ئەو دایکە بەرێزانە ناچار بوون مان بگرن و داوای نەفەقە لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن ، تا ئەوەبوو قورئانی پیرۆز هاتە خوارەوە و دایکانی ئەکردە سەر پشك کە ئەگەر دنیایان ئەوێ با تەلاقیان بدات و ، گەر خوا و پێغەمبەریشیان ئەوێ و چاوەڕوانی پاداشتی قیامەتن با ئەم چەند رۆژەی دنیا دان بە خۆیاندا بگرن ، چونکە خوای پاك و بێگەرد پاداشتی گەورەی بۆ ئەو ئافرەتانە داناوە کە بە گوێڕایەڵیی و ملکەچیی فەرمانی قورئان ئەگەنە پلەی ئیحسان :

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٢٨﴾ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا ﴾ ( الأحزاب : ٢٨ : ٢٩ ) .

ئەوانیش خوا لێیان رازیی بێ خۆیان بە تەواویی بۆ قیامەت یەك لایی کردبوویەوە.. زرق و برقی دنیایان داوا نەئەکرد .. بگرە نان و نەفەقەیەکی یەکجار کەمیان ئەویست .. کە فەرمانی قورئانیان بیست ، بەوپەڕی غیرەتەوە وازیان لەو داوایەشیان هێنا و ، ئامادەی هەموو ناڕەحەتی‌یەك بوون لە پێناوی رازیی کردنی خوا و پێغەمبەردا ..

بۆ نموونە : ئەو وەڵامەی کە عائیشە خوا لێی رازیی بێ دایەوە . کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئایەتەکەی بۆ خوێندەوە حەزی نەئەکرد عائیشە زوو وەڵام بداتەوە ، نەوەکو تووشی هەڵە ببێ ، بۆیە پێی فەرموو : (( لا عليك ألا تستعجلي حتى تستأمري أبويك )) . فەرمووی : وا چاکە پەلە نەکەیت هەتا پرس بە دایك و باوکت بکەیت ..

عائیشە وتی : بۆ ئەمە پرس بە دایك و باوکم بکەم ؟ من خوا و پێغەمبەرەکەی و قیامەتم ئەوێ . ( رواه البخاري وابن أبي حاتم وأحمد ) .

لەلایەکی ترەوە ئەم فرە ژنی‌یە کاری نەکردە سەر ورە و وزەی پێغەمبەری خوا ﷺ و لە کاری بانگەواز و خزمەتکردن دەست کۆتای نەکرد .. بەڵکو وەك خۆی دامەزراو بوو، ئەوانیش بوونە کۆمەك و یارمەتیی‌دەری بۆ گەیاندنی پەیامەکەی و ، شارەزاکردنی موسڵمانان لە دینەکەیان . هەروەها لە جەنگەکاندا لەگەڵیا ئەبوون بۆ دەرمانکردنی زامداران و نەخۆشان و ، راوێژکردن و ، ورە بەرزکردنەوەی لە کاتی

تەنگانەدا .. دایکانی ئیمانداران نزیکەی سێیەکی دینیان بۆ موسڵمانان گێڕاوەتەوە تا ئەوانیش لەبەری بکەن و بە جیهانی ئیسلامیدا بڵاوی بکەنەوە ، بە تایبەت ئەوەی کە پەیوەندیی بە ژیانی خێزانەوە هەبێت . بۆیە هەموو هاوسەرەکانی لە یەك تەمەندا نەبوون ، بەڵکو ئەو خۆی ئەوانی پەروەردە ئەکرد ، تا ئەوانیش وەڵامی گەنج و پیر و شاریی و دەشتەکیی و بیاباننشین بدەنەوە و ، ئافرەتان بە جوانیی لە ئەحکامی دینەکەیان شارەزا بکەن . بەمە هاوسەرەکانی ـ بە تایبەت عائیشە ـ ئەو کارە گرنگەیان ئەنجام ئەدا ..

ئەوەتا ئیمام ( الذهبي ) ، کە لە ساڵی ( ٧٤٨ ) ك کۆچی دوایی کردووە ، لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا ( تذکرة الحفاظ ) دەربارەی فیقه و زانستی عائیشەی دایکی ئیمانداران ئەڵێت :

(( ئەو گەورەترینی فەقیهانی هاوەڵان بوو ، کە فەقیهەکانی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەڕانەوە لای ئەو .

لە قەبیصەی کوڕی ذوئەیبەوە ئەگێڕنەوە کە وتوویە : عائیشە زاناترین کەس بوو، کە گەورە هاوەڵان پرسیاریان لێ ئەکرد .

ئەبوموساش وتوویە : ئێمەی هاوەڵانی موحەممەد ﷺ هەرکەی فەرموودەیەکمان لێ بگیرایە و پرسیارمان لە عائیشە بکردایە ، وەڵامان لای ئەو دەست ئەکەوت .

حەسسانیش وتوویە : نەم دیوە هیچ کەسێك لە عائیشە خوا لێی رازیی بێ بە قورئان و ، بە فەریضە و ، بە حەلاڵ و حەرام و ، بە شیعر و ، بە دەنگوباسی عەرەب و، بە رەچەڵەك زاناتر بێ )) .[٣٤٤]

ئیتر با رەوشتبەرزیی و ، هیممەت و ، سەخاوەت و ، دڵدانەوە و ، لێبووردن و، نەجابەت هەر هەمووی لەولاوە بوەستێ .

هیشام لە باوکیەوە گێڕاویەتەوە کە : موعاویە صەد هەزار بۆ عائیشە ئەنێرێ . دە بەخوا مانگ بەسەر نەچوو هەتا هەر هەمووی بەخشییەوە . کەنیزەکێکی ئازادکراوی پێی وت : خۆزگە لەو پارەیە بایی دیرهەمێکیش گۆشتت بۆ خۆمان

---

[٣٤٤] أخرجه البخاري برقم : ٦٢٨٥ ، ٦٢٨٦ ، ومسلم برقم : ٢٤٥٠ من حديث عائشة رضي الله عنها .

بکرپایه ، عائیشه وتی : خۆزگه بیرمت بخستایه‌ته‌وه .[٣٤٥] له‌و کاته‌دا عائیشه به‌رۆژوو ئه‌بێت .[٣٤٦]

یه‌کێك له هاوسه‌ره‌کانی ، که زه‌ینه‌بی کچی جه‌حش بوو ، حیکمه‌تێکی تایبه‌تیی له ماره‌کردنی‌دا هه‌بوو .. ئه‌ویش بۆ له‌ناوبردنی یاسایه‌کی نه‌فامیی که ریشکی داکوتا بوو .. یاسای به کوڕکردن ، چونکه عه‌ره‌به‌کان که‌سێکی به‌کوڕکراویان وه‌ك کوڕی راسته‌قینه سه‌یر ئه‌کرد و ، هه‌موو مافێکی کوڕی راسته‌قینه‌یان بۆ دائه‌نا .. له‌ولاوه ئه‌و یاسایه له‌گه‌ڵ بنچینه و بناغه‌کانی ئیسلام‌دا ده‌رباره‌ی نیکاح و ته‌ڵاق و میراث نه‌ئه‌گونجا و ، مایه‌ی ناره‌حه‌ت‌کردنی خه‌ڵکیی بوو ..

بۆیه خوای گه‌وره فه‌رمانی دا به پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ که زه‌ینه‌بی پوورزای ماره بکات . له‌سه‌ری پێویست کرد ، هه‌رچه‌نده پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ له پاگانده‌ی مونافیق و موشریك و جووله‌کان ئه‌ترسا که شتی پڕوپووچ بخه‌نه دوای . هه‌تا پێی خۆش نه‌بوو زه‌ید ته‌ڵاقی بدا . به‌ڵام خوای گه‌وره عیتابی له ئازیز گرت که ئه‌م فه‌رمانه‌ی به عه‌زیمه وه‌رنه‌گرت و ، ترسی چرپ و چاپی له دڵ‌دا هه‌بوو . کارێك خوا ئه‌یه‌وێ بکرێ، چۆن ئه‌بێ پێغه‌مبه‌ره‌که‌ی ته‌فره‌ی بدا ؟!

ئه‌مه‌ش هه‌موو تا یاسای به‌کوڕکردن به‌تاڵ بێته‌وه و ، ژنی ئه‌و به‌کوڕکراوه‌ش به بووك و به مه‌حره‌م له قه‌ڵه‌م نه‌درێ و ، یاسای نه‌فامیی ریشه‌که‌ن بکرێ .

پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ به‌وپه‌ڕی ره‌وشت به‌رزیی و ، نه‌رم و نیانیی و ، مه‌ردایه‌تی‌یه‌وه له‌گه‌ڵ هاوسه‌ره‌کانی‌دا ئه‌ژیا .. دڵی هه‌موویانی راگیر ئه‌کرد .. ئه‌وانیش ئه‌یان‌زانیی که مێرده‌که‌یان ته‌نها مافی مێردایه‌تیی به‌سه‌ریانه‌وه نیه ، به‌ڵکو مافی پێغه‌مبه‌رایه‌تییشی هه‌یه ، که پێویسته له قوڵایی دڵیان‌دا له هه‌موو که‌سێك زیاتر ، هه‌تا له خۆشیان ، خۆشتریان بوێت .

ئه‌مه هه‌مووی له لایه‌که‌وه ، له‌لایه‌کی تریشه‌وه با ئاوڕێك له ژیان و گوزه‌رانی خێزانه‌کانی ئه‌ورووپا بده‌ین تا بزانین چۆن هه‌موو رێز و ئیحتیرامێکیان له کیس داوه !! چۆن ئافره‌ت ناچار بووه سه‌گ و تانجیی به هاوسه‌ر بگرێ !! چۆن ئافره‌ت ناچار بووه هه‌موو کارێکی سووك ئه‌نجام بدات تا نانه‌سکیی له‌ناو ئه‌و کۆمه‌ڵه بێ‌ویژدانه‌دا بژیت !! چۆن که‌س‌وکاری له‌ته نانێکی پێ ره‌وا نابینن !!

---

[٣٤٥] أخرجه البخاري برقم : ٥٢٣٠ ، ومسلم : ٢٤٤٩ من حديث المسور بن مخرمة .

[٣٤٦] أخرجه البخاري برقم : ١٣٠٣ ، ومسلم برقم : ٢٣١٥ ، وأبوداود برقم : ٣١٢٦ من حديث أنس بن مالك .

هەر کەسێ دڵی بە یاسای ئیسلامی پڕ ڕێز و شەرەف نەکرێتەوە ئەبێ دڵی بە چیی بکرێتەوە ؟

ئەگەر ئافرەت خاوەنی حەیا و حورمەت نەبێ کەی خاوەنی مافە ؟

ئەوروپا گەورەترین تەڵەی بۆ ئافرەتی چارەڕەش ناوەتەوە ، تا بە سووك و ئاسان خۆی دابنێ و ، بۆ نانێك خۆی بدۆڕێنێ ..

بەڵام ئیسلام یاسای ڕێز و حورمەتی بۆ ئافرەت داناوە و ، غیرەتی وەهاشی بە پیاوان داوە کە لەسەر پاراستنی ڕێز و شەرەفی کەس‌وکاریان خوێنیان ببەخشن ..

کە ماوەشی داوە کۆمەڵگا بە یاسای فرەژنیی گرفتی کۆمەڵگا چارەسەر بکات ، ئەو، ئەوپەڕی خەمخۆری‌یە . کاتێك کە ئافرەتێکیش لە ئەوروپا لەگەڵ تاجی‌یەك‌دا ژیان ئەداتە سەر ، ئەوە ئەوپەڕی سەرگەردانیی خۆی و کۆمەڵگەی دەرئەخات .. وڵاتێکە یاسای ڕەوشتی تیا نیە .. ئەوپەڕی سەرگەردانی‌یە .. کەس خەمی هیچ کەسێکی نیە ..

ب ـ منداڵ و وەچە و بەرەکانی :

قاسم یەکەم منداڵی پێغەمبەری خوا بوو کە دایکی خەدیجە بوو و ، هەر بە منداڵیی مرد . دوای ئەوە چوار کچیان بوو : زەینەب و ، روقیە و ، ئوم کەلثووم و ، فاطیمە . هەروەها ( عبدالله ) شیان بوو کە ( طیب ) و ( طاهر ) یش نازناوی بوون، وەك ئیبن قەییم دەری بڕیوە . ئەم منداڵانە هەر هەموویان لە خەدیجە بوون و ، هەر بە منداڵیی ( عبدالله ) ش کۆچی دوایی کرد ..

فاطیمە خۆشەویست‌ترینی کچەکان بوو بەلای پێغەمبەری خواوە و ، هەواڵی ئەوەشی پێ دا کە سەرداری ئافرەتانی ئەهلی بەهەشتە و ، [٣٤٧] فەرمووشیە : (( فاطمة بضعة مني ، يُريبُني ما أرابَها ، ويؤذيني ما آذاها )) . ئەفەرموێ : فاطیمە بەشێکە لە من ، هەر شتێ ئەو بخاتە گومانەوە منیش ئەخاتە گومانەوە و ، هەر شتێکیش ئازاری ئەو بدات ئازاری منیش ئەدات . بەڵێنیشی پێ داو، کە لە کەس وکاری‌دا یەکەم کەس ئەو پێی ئەگاتەوە . هەروایش بوو دوای شەش مانگ لە کۆچی دوایی ئازیز فاطیمەش کۆچی دوایی کرد .

لە ماریەی قیبتییش ئیبراهیمی بوو ، کە دوای ئەوەی بوو بووە پڕی جۆلانەکەی ئەویش کۆچی دوایی کرد ..

---

[٣٤٧] جامع الترمذي : ٢ / ٢٢١ ، ( الطبعة الهندية ) .

زەینەبی کچیشی ، کە شووی بە ( أبـو العـاص ) ی کـوڕی رەبیـع کردبـوو ، کـە خوشکەزای خەدیجە بوو ، کوڕێکی بوو بە ناوی عەلیی و کچێکیش بە ناوی ئومامە.

روقـیەش شـووی بـە عوثـمانی کوڕی عـەفـفان کـرد و کـوڕێکی لێ بـوو بـە ناوی ( عبدالله ) . لـە کـاتی جـەنگی بـەدردا کۆچی دوایـی کـرد و ، دوای ئـەو عوثـمان ( أم کلثوم )یشی مارە کرد و ئەویش پێش پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد..

فاطیمـەش شووی بە ئیمام عەلیی کرد و ( حسن ) و حسین ) ی لێ بوو . ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەیان فەرمووی : ( هما ریحانتاي من الدنیا ) . فـەرمووی : هەردووکیان جووتە رەیحانەی دنیای منن .

هەروەها دەربارەیان فەرموویە : ( الحسن والـحسیـن سیدا شـباب أهل الـجنة ). ( البخاري ) فەرموویە : حەسەن و حوسەین سەرداری لاوانی بەهەشتن .

هەروەها فاطیمـە لە عەلیی دوو کچیشی هەبوون بە ناوی زەینەب و ئومکولشووم . زەینەب شووی بە عەبدوڵڵا کوڕی جەعفەری کوڕی ئەبوطالیبی ئـامۆزای کـرد ، کـە یەکێ لە پیاوە سەخیـیە بەناوبانگەکانی عەرەب بووە و ، دوو کـوڕی لێـی بـوون بـە ناوی ( علي ) و ( عون ) .

ئومکولشوومی کچی عەلییش شووی بـە عومـەری کـوڕی خـەططـاب کـرد ، کـە کوڕێکی لێ بوو بە ناوی زەید و مرد .. ( سیرة إبن کثیر ) .

هەموو منداڵەکانی پێغەمبەری خـوا ﷺ جگـە لـە فـاطیمـە پـێش خـۆی کۆچـی دوایی‌یان کردووە .[٣٤٨]

---

[٣٤٨] السیرة النبویة للندوي : ٤١٥ ـ ٤٢٢ ، الرحیق المختوم : ٤٨٧ ـ ٤٩٣ .

## بەشی چل و نۆهەم

# رەوشتە بەرزەکانی ئازیزمان

شتێکی بەڵگەنەویستە کە لە مێژووی دوور و درێژی مرۆڤایەتیی‌دا ـ بە تایبەتیی لە ریزی ئەوانەدا کە خوا هەڵی بژاردوون ، لە پێغەمبەران و ئەولیایان ـ هەزارەها ، بگرە ملیۆنەها مرۆڤی بەڕێز هەڵ کەوتوون ، کە خاوەنی رەوشت و دین بوون و ، بوونەتە مایەی هیدایەت‌دان و چاك‌کردنی کەسانی تر و ، ژیانیان بۆ خزمەت‌کردنی مرۆڤایەتیی تەواو کردووە . ئەمانە کەسانێکی بەوەفا و ئەمین‌دار و دەست‌پاك بوون و، بە هیچ شێوەیەك ستەم و ناپاکی‌یان لێ نەئەوەشایەوە ، بەڵکو پێشەنگی مرۆڤەکان ئەبوون بۆ ئەنجام‌دانی هەموو چاکەیەك و ، بە هەموو توانایەکیانەوە بەرگری‌یان لە بێ‌نەوا و هەژار و بێ‌دەسەلاتان کردووە و ، بەوپەڕی غیرەتەوە بەرگری‌یان لە مافی چەوساوان کردووە و ، مان و مردنیان لە پێناوی حەق‌دا بەلاوە یەکسان بووە .

بەڵێ مێژووی مرۆڤایەتیی هەمیشە بەم بەڕێزانە رازاوەتەوە و ، سەری مرۆڤیان بەرز کردۆتەوە ، بە رادەیەك کە مەلائیکەتەکانی ئاسمان بەڕێز و ستایشەوە سەیریان بکەن.

بەلام کە سەرنج ئەدەین ئەبینین جگە لە پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ هیچ پیاوێکی تر ئەم هەموو سیفەتانەی تێدا کۆ نەبوونەتەوە .. تەنها سەردارمان خاوەنی هەموو رەوشتە بەرزەکانە و ، لە هەموو رەفتارێکی نەگونجاویش پاك پاك بۆتەوە .. واتە ئەم بۆتە گەورەترین خۆری ئاسمانی مرۆڤایەتیی و ، هیچ خۆر و ئەستێرەیەکی تر وەك ئەم نابریسکێتەوە .

رەوشتە بەرزەکانی ئازیزمان ﷺ مامۆستا ( محمد بن محمد أبوشهبة ) بە وردیی باسی کردوون کە ئەڵێت :

(( وإنما هي صفات وزنت بميزان عادل لا يعول ، وأخلاق حسبت بحسبان دقيق لا يضل .. هداية في حكمة ، وعلم في فقه ، ورحمة في غير ضعف ، وعدل في غير عنف ،

وحزم في حلم ، وصرامة في رحمة ، وغضب لله في غير جور ولا بطش ، وكرم في غير إسراف ، ودقة في غير فسولة ، ورأفة في غير تفريط ، وعقل كبير في سعة قلب ، وجد في غير هزل ، ومزح في غير باطل ، وفصاحة في بلاغة ، وكلم جوامع في حكم نوابغ ، ورجولة في مروءة ، وفحولة في عفة )) .

ئەم رەوشتە جوانانە تەنها بە زمانی عەرەبیی بەو تام و چێژەوە هەڵ ئەدرێن .. چونکە هەر رەوشتێك مەترسیی ئەوەی لیٚ ئەکرێ دژەکەی بەسەریا زاڵ ببێ ، بۆیە لەم پێناسەیەدا ئەوە بەرچاو گیراوە و ، ئازیزیش بە تاقی تەنیا خاوەنی ئەم سیفەت و رەوشتە کاملانەیە . بەمە دەر ئەکەوێ گەورەترین پێغەمبەری مرۆڤایەتی‌یە .

کە شان بە شانی جوانیی و کامڵیی ، پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ خاوەنی ئەم هەمووە سیفەتە جوانانە بوو ، دڵەکان شەیدای بوو بوون و ، پیاو ، مەرد و قارەمانەکان خۆیان کردە قەڵغانی سەری و ، تا رادەیەکی بێ سنوور خۆشیان ئەویست ، بەوەی کە حەزیان ئەکرد لە گەردنی خۆیان بدرێت ، بەڵام درکێك نەچەقێت بە لاشەی ئەودا .. ئامادە بوون لە هەردوو دیوەوە ئەو داپۆشن ، ئەویش بە چەمینەوە بەسەریدا ، تا لە تیری هەردوو لا سەلامەت بێ .. کوڕی جگەرگۆشە و برای ئازیز و مێردی خۆشەویست قەی ناکا بە شەهیدیی سەر بنێنەوە ، بەو مەرجەی ئەو سەلامەت بێ ..

جا هاوەڵان زۆرێك وەسفی ئەو زاتە موبارەکەیان کردووە ، بەڵام چۆن وەسفێك . ئێمەش پێمان خۆشە هەندێك لەو وەسفانە بە دارشتنە شیرینەکەی خۆیان بخەینە بەردەستی ئازیزان :

هیندی کوڕی ئەبوهالە ، کە کوڕی خەدیجە و خاڵۆی حەسەن و حوسەین بوو و ، پیاوێکی وەصفکەر بوو ، وەصفی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەکات و ئەڵێت :

(( كان رسول الله ﷺ متواصلَ الأحزان ، دائم الفكرة ، ليست له راحة ، طويل السكت ، لا يتكلم في غير حاجةٍ ، يفتتح الكلام ويختتمهُ بأشداقِهِ ، ويتكلم بجوامع الكلم ، كلامه فصلٌ ، لا فضول ولا تقصير .

ليسَ بالجافِي ، ولا المُهين ، يُعَظِّمُ النعمةَ وإن دقَّت ، لا يذُمُّ مِنها شيئًا ، غير أنه لم يكن يذمُّ ذواقا ولا يمدحُه .

ولا تُغضبه الدنيا ، ولا ما كان لها ، فإذا تُعُدّيَ الحقُّ ، لم يقم لغضبهِ شيءٌ ، حتى ينتصر له ، لا يغضب لنفسه ولا ينتصر لها .

إذا أشارَ أشار بِكَفِّهِ كلّها ، وإذا تعجَّبَ قَلَبها ، وإذا تحدث ضرب براحته اليُمْنى بطنَ إبهامه اليسرى ، وإذا غضب أعرض وأشاحَ ، وإذا فرِح غَضَّ طرفَهُ .
جُلُّ ضحكِه التبسُّمُ ، يفترُّ عن مِثلِ حَبِّ الغَمامِ )) .[٣٤٩]

عەلیی کوڕی ئەبوطالیبیش ، کە لە هەموو کەسێك زیاتر لەگەڵیا ژیاوە و ، چاکتریش توانای وەصف‌کردنی هەیە ، ئەفەرموێ :

(( لم يكن بالطويل المغَّط ، ولا القصير المتردّد ، وكان ربعة من القوم ، ولم يكن بالجعد القَطَط ، ولا بالسَّبْط ، وكان جعدًا رجلاً ، ولم يكن بالمُطَهَّم ولا بالمكلثم ، وكان في الوجه تدوير ، وكان أبيضَ مشربًا ، أدعج العينين ، أهدب الأشفار ، جليل المُشاش والكند ، دقيق المسربة ، أجرد ، شثن الكفين والقدمين ، إذا مشى تقلّع كأنما يمشي في صبب ، وإذا التفت التفت معًا ، بين كتفيه خاتم النبوة ، وهو خاتم النبيين ، أجود الناس كفاً ، وأجرأ الناس صدراً ، وأصدق الناس لهجة ، أوفى الناس ذمة ، وأليـنهم عريكة ، وأكرمهم عشرة ، من رآه بديهة هابه ، ومن خالطه معرفة أحبه ، يقول ناعته: لم أر قبله ولا بعده مثله ﷺ )) .[٣٥٠]

---

[٣٤٩] ئەڵێت : پێغەمبەری خوا ﷺ یەك لە دوای یەك خەمی بۆ ئەهاتن ، هەمیشە بیری ئەکردەوە ، حەسانەوەی بۆ نەبوو، زۆر بێ دەنگ بوو ، بە پێی پێویست قسەی ئەکرد ، هەموو دەم و لێوی بۆ قسەکردن بە کار ئەهێنا .. قسەی نەستەقی بە کار ئەهێنا .. فەرمایشتی دیار و روون بوو ، نە زیاد و نە کەمی نەبوو .
وشك و رەق نەبوو ، کەسی بە سووك سەیر نەئەکرد ، نیعمەتی خوا چەندە بچووك بوایە بە گەورەی سەیر ئەکرد ، زەمی هیچ نیعمەتێکی نەئەکرد ، زەم و ستایشی هیچ خواردن و خواردنەوەیەکی نەئەکرد ..
نە دنیا و نە ئەوەش لەگەڵ دنیادا پەیوەندیی دار بوو نەیان ئەتوانیی تووڕەی بکەن . بەڵام ئەگەر دەست درێژیی بکرایەتە سەر حەق ، هیچ شتێك لەبەردەم تووڕەیی یەکەی دا خۆی نەئەگرت هەتا تۆڵەی بسەندایە .. بۆ خۆی تووڕە نەئەبوو و تۆڵەشی نەئەسەند .
بە لەپی دەستی هەمووی ئاماژەی ئەکرد و ، بۆ سەرسوڕمانیش هەڵی نەئەگێڕایەوە ، کاتێ فەرمایشتی بکردایە بە ناو لەپی دەستی راستی ئەی دا لە ناوەوەی پەنجە گەورەی دەستی چەپی ، گەر تووڕە ببوایە بە توندیی رووی وەرئەگێڕا ، گەر دڵیشی خۆش بوایە چاوی دائەخست ..
بەشی زۆری پێکەنینی زەردەخەنە بوو ، کە بە پێکەنینێکی جوانیش پێ ئەکەنیی وەك دەنکە تەرزە دانی دەرئەکەوتن ..

[٣٥٠] ئەفەرموێ : نە درێژێکی ناقۆلا بوو ، نە کورتە بالایەکی گرگن بوو ، بەڵکو گردە پیاوێکی چوارشانەی ناو خەڵك بوو .. قژی نە لوول و ئالۆسکاو بوو و ، نە خاویش بوو ، بەڵکو کرژ بوو .. پیاوێك بوو نە باریکەلە و نە گیپن.. دەم و چاوی خڕ بوو . سپیکەلە و چاورەش بوو .. برژانگی پێلووی چاوەکانی درێژ بوون .. ئێسقانەکانی لەشی وەکو پارچەی جومگە و شان و ئەژنۆ دەرچوو بوون .. مووی سەر سنگی ورد بوو .. تووکن نەبوو .. پەنجەکانی دەست و قاچی قەڵەو و خڕین بوون .. کە ئەڕۆیشت وات ئەزانی ئاوی ناو رێژگەیەکی لێژە .. کە ئاوڕی ئەدایەوە هەموو جەستەی وەرئەگەڕاند .. مۆری پێغەمبەرایەتیی لەناو هەردوو شانیدا هەبوو .. ئەو کۆتا پێغەمبەرە .. لە هەموو کەسێ دەست بەخشندەتر و ، لە هەموو کەسێ دڵ ئازاتر و ، لە هەموو کەسێ زمان راستگۆتر و ، لە هەموو کەسێ بۆ پەیمان دان بەوەفاتر و ، لە هەموویان نەرم و نیان‌تر و ، لە هەموویان بۆ هاوڕێیەتیی بەرێزتر بوو .. هەر کەسێ بۆ یەکەم جار

کاتێکیش کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککەوە بۆ مەدینە کۆچی ئەکرد ، بە لای چادرەکەی ئوم مەعبەددا تێپەڕی و لای دایە لایان . دوای ڕۆیشتنی ، ئوم مەعبەد بەم شێوەیە بۆ مێردەکەی وەصفی ئەکرد :

(( ظاهر الوضاءة ، أبلج الوجه ، حسن الخلق ، لم تعبه ثجلة ، ولم تزر به صعلة ، وسيم قسيم ، في عينه دَعَج ، وفي أشفاره وَطَف ، وفي صوته صَحَل ، وفي عنقه سَطَع ، أحورُ ، أكحلُ ، أزجّ ، أقرنُ ، شديد سوادِ الشعر ، إذا صمت علاه الوقار ، وإذا تكلم علاه البهاء ، أجمل الناس وأبهاهم من بعيد ، وأحسنه وأحلاه من قريب ، حلو المنطق ، فضل ، لا نذر ، ولا هذر ، كأن منطقه خرزات نظمن يتحدرن ، رَبعة ، لا تقحمه عين من قصر ، ولا تشنؤه من طول ، غصن بين غصنين ، فهو أنضر الثلاثة منظراً ، وأحسنهم قدراً ، له رفقاء يحفون به ، إذا قال استمعوا لقوله ، وإذا أمر تبادروا إلى أمره ، محفود ، محشود ، لا عابس ولا مفند ))[٣٥١] .

کە ئافرەتێکی بیابان‌نشین ئەو هەمووە سیفەتە بەرزانە بۆ ئازیزمان ئەهۆنێتەوە ، دەری ئەخات ڕێك و پێك‌ترین پیاوی سەرزەوی‌یە .

( أبو الطفيل ) یش ئەڵێت : ڕەنگی سپیی و ، دەم و چاوی مەکین و ، لاشەی مام ناوەندیی بوو ، نە کەتە و ، نە لاواز و ، نە درێژ و ، نە کورتە باڵا بوو .

هەروەها هیندی کوڕی ئەبوهالە دەربارەی ئەو بەرگی جوانی‌یەی کە پێغەمبەرەکەی پێ ڕازاندۆتەوە و ، خۆشەویستیی بردۆتە دڵانەوە تا سام و هەیبەتێکی بێ‌وێنەی هەبێ و ، وەصفی ئەکات و ئەڵێت :

---

بیدیایە سامی لێ ئەنیشت و ، هەر کەسێ تێکەڵیی بکردایە خۆشی ئەویست . وەصف کەرەکەی ئەڵێت : نە لە پێشیەوە و نە لە دوایەوە کەسم وەك ئەو پێغەمبەرە ﷺ نەدیوە .

[٣٥١] ئەڵێت : پیاوێکی دەم و چاو کراوە و ، ڕووخۆش و ، بە ڕەوشت بوو .. ورگن نەبوو و ، مل باریکیش نەبوو . بەڵکو جوان خاس و ، چاوڕەش و ، مووی برۆ درێژ و ، دەنگ گڕ و ، گەردن بەرز بوو .. سپێنەی چاوی زۆر و ، برژانگی چاوی درێژ و ، برۆی باریك و درێژ و ، بە یەك گەیشتوو و ، قژی سەری یەکجار ڕەش بوون . کە بێ دەنگ ئەبوو سام و هەیبەتی لێ ئەباریی و ، کە فەرمایشتیشی ئەکرد ئەبریسکایەوە .. لە دوورەوە جوانترین و گەشاوەترین کەس بوو و ، لە نزیکیشەوە جوان‌خاس‌ترین و شیرینترین کەس بوو .. فەرمایشتی شیرین و، ڕێزدار بوو .. نەکەم گۆ و، نەزۆر بلێ .. فەرمایشتەکانیشی وەك دەنکە تەسبیحی هۆنراوە لە دەمی ئەبارین .. چوارشانەیەکی باڵا مام‌ناوەندیی بوو .. ئەوەندە کورتەباڵا نەبوو کە بە بچووك بەرچاو بکەوێ و ، ئەوەندەش بەرزەباڵا نەبوو کە بە درێژ بەرچاو بکەوێ .. لقەدارێك بوو لە نێوان دوو لقەداردا ، کە گەشاوەترین و ، شکۆدارترینی هەرسێکیان بوو .. چەند هاوەڵێکی لەگەڵدا بوون کە چوار دەوریان گرتبوو .. گەر فەرمایشتی بکردایە گوێیان بۆ ئەگرت و ، گەر فەرمانیشی بەسەردا بدانایە خێرا جێ بەجێیان ئەکرد .. لەلایەن هاوەڵانیەوە گەورە و بەگوێ‌کراو و دەور قەرەباڵغ بوو .. نە گرژ و مۆن و ، نە بەرامبەر شکێن بوو ..

(( كان فخماً ، مفخماً ، يتلألأ وجهه تلألؤ القمر ليلة البدر )) .[٣٥٢]

خۆی لە خۆی‌دا گەورە بوو و ، لەبەر چاوی خەڵکییش‌دا هەر گەورە بوو .. دەم و چاوی وەك مانگی چواردە ئەدرەوشایەوە ..

بەرائی کوڕی عازیب‌یش خوا لێی ڕازیی بێ وەصفی ئەکات و ئەڵێت : پێغەمبەری خوا ﷺ چوارشانە بوو . جارێکیان بە دەستە جلێکی سوورەوە چاوم پێی کەوت ، هەرگیز هیچ شتێکم نەدیبوو لەو جوانتر بێ .[٣٥٣]

ئەبوهورەیرەش خوا لێی ڕازیی بێ وەسفی ئەکات و ئەڵێت : پیاوێکی چوارشانە بوو ، کە لە درێژی‌یەوە نزیكتر بوو . زۆر سپیی بوو ، مووی ریشی ڕەش بوو .. دەم و لێوی جوان بوو .. برژانگی چاوی درێژ بوون .. ناوشانی پان بوو .... نە لەوەو پێش و نە لەوەو دوایش لە وێنەی ئەوم نەدیوە ..[٣٥٤]

ئەنەسیش خوا لێی ڕازیی بێ ئەڵێت : دەستم لە هیچ جۆرە ئاوریشمێك نەداوە لە ناو لەپی پێغەمبەری خوا ﷺ نەرمتر بێت و ، هەرگیز هیچ بۆنێکیشم بۆن نەکردووە کە لە بۆنی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشتر بێت .[٣٥٥]

هەروەها ئەڵێت : لەپی دەستی گەورە بوو . هەروەها ئەڵێت : ڕەنگی سپیی و مەیلە و سوور بوو ، نە سپیی تەواو بوو نە ئەسمەر. کە وەفاتی کرد لە سەر و ریشی‌دا بیست تاڵە مووی سپیی نەبووبوون ..[٣٥٦]

هەروەها جابیری کوڕی سەمورەش خوا لێی ڕازیی بێ وتوویە : شەوی جەژنی قوربان چاوم پێی کەوت . جارێ سەیری پێغەمبەری خوام ﷺ ئەکرد و ، جارێکیش سەیری مانگ .. دەستە جلێکی سووری لەبەردا بوو ، هەرچیی سەیرم ئەکرد ئەوم بەلاوە جوانتر بوو لە مانگ .[٣٥٧]

کەعبی کوڕی مالیکیش خوا لێی ڕازیی بێ وتوویە : گەر شادمان بوایە دەم و چاوی نووری لێ ئەباریی ، بە ڕادەیەك کە وەك پارچەیەکی مانگ وەها بوو ..[٣٥٨]

---

[٣٥٢] أخرجه الترمذي في الشمائل برقم : ٧ ، وابن سعد : ١ / ٣١٦ ، والبيهقي في الدلائل : ١ / ٢٨٦ ، والحديث إسناده ضعيف .

[٣٥٣] أخرجه البخاري برقم : ٣٥٥١ ، ومسلم : ٢٣٣٧ ، وأبوداود : ٤٠٧٢ ، والترمذي في الشمائل : ٣ .

[٣٥٤] الأدب المفرد للبخاري ، باب إذا التفت التفت جميعاً .

[٣٥٥] أخرجه البخاري في كتاب المناقب ، باب ( صفة النبي ﷺ ) برقم : ٣٥٦١ ، ومسلم في كتاب الفضائل برقم :٢٣٣٠.

[٣٥٦] صحيح البخاري : ١/ ٥٠٢ .

[٣٥٧] رواه الترمذي في الشمائل : ٢ ، والدارمي ... مشكاة المصابيح : ٢ / ٥١٨ .

[٣٥٨] صحيح البخاري : ١ / ٥٠٢ .

روبەییعی کچی موعەوویذیش خوا لێی رازیی بێ وتوویە : گەر چاوت پێی بکەوتایە دەت‌وت خۆرە و هەڵاتووە .[٣٥٩]

جارێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ لای عائیشە بوو و ، عەرەقی کرد ، بەو عەرەقەی دەم و چاوی ئەبریسکایەوە، ئەویش دێڕە شیعرێکی ئەبوکەبیری هوذەلیی بۆ هێنایەوە:

وإذا نظرتَ إلى أسِرَّةِ وجهِهِ

بَرَقَتْ كَبَرقِ العارِضِ المُتَهَلِّلِ[٣٦٠]

ئەبوبەکریش خوا لێی رازیی بێ هەرچیی چاوی پێ بکەوتایە ئەی‌فەرموو :

أمينٌ مصطفىً بالخيرِ يدعو

كضوءِ البدرِ زايلَه الظلامُ[٣٦١]

ئەبوجوحەیفەش وتوویە : دەستی پێغەمبەرم ﷺ گرت و ، نامە سەر دەم و چاوم ، ئەبینم دەستی لە بەفر ساردترە و ، بۆنیشی لە بۆنی میسك خۆش‌تر بوو .[٣٦٢]

جابیری کوڕی سەمورەش ـ کە منداڵ بووە ـ ئەڵێت : دەستی هێنا بە دەم و چاومدا ئەبینم دەستی ساردی‌یەك یان بۆن‌خۆشی‌یەکی هەبوو هەر وەك ئێستە لە جەوەنەی عەترفرۆش‌دا دەری هێنابێ .[٣٦٣]

ئەنەسیش وتوویە : عەرەقی وەك دەنکە مرواریی وەهابوو . ئوم سولەیمیش وتوویە: عەرەقی پێغەمبەری خوا ﷺ لە بۆن‌خۆش‌ترینی بۆن‌خۆشی‌یەکان بوو .[٣٦٤]

پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ئەوەدا کە خوای گەورە لە گوناهی بەرودوای خۆش بوو بوو و ، خۆشەویست‌ترین بەندەی بوو ، لە هەموو کەسێك زیاتر خواپەرستیی ئەکرد.

موغیرەی کوڕی شوعبە ئەڵێت : پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە بە پێوە وەستابوو بۆ شەونوێژیی هەتا هەردوو پێی تلۆقەیان کردبوو .. پێی وترا : خۆ خوای گەورە لە گوناهی بەرو دوات خۆش بووە . ئەویش فەرمووی : (( أفلا أكون عبداً شكوراً ؟ )) . فەرمووی : ئەی نابێ من بەندەیەکی سوپاس‌گوزار بم ؟[٣٦٥]

---

[٣٥٩] رواه الدارمي ... مشكاة المصابيح : ٢ / ٥١٧ .

[٣٦٠] رحمة للعالمين : ٢/ ١٧٢ .

[٣٦١] خلاصة السير : ٢٠ .

[٣٦٢] صحيح البخاري : ٢/ ٥٠٢ .

[٣٦٣] صحيح مسلم : ٢ / ٢٥٦ .

[٣٦٤] صحيح مسلم : ٢ / ٢٥٦ .

[٣٦٥] أخرجه البخاري برقم ( ١١٣٠ ) ومسلم برقم ( ٢٨١٩ ) ، والنسائي برقم ( ٣ / ٢٢١٩ ) والترمذي برقم ( ٢٥٠ ) وابن ماجه برقم ( ١٤١٩ ) والبيهقي برقم ( ٣/ ١٦ ) .

عائیشەش خوا لێی رازیی بێ وتوویە : پێغەمبەر ﷺ بە ئایەتێکی قورئان شەوێکی بە شەونوێژیی بەسەر برد .. [٣٦٦]

ئەبوذەرریش خوا لێی رازیی بێ وتوویە : پێغەمبەری خوا ﷺ شەوێکی بە شەونوێژیی بە ئایەتی ﴿ إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾. ( المائدة : ١١٨ ) هەتا بەیانیی بەسەر برد . [٣٦٧]

هەروەها عائیشە دەربارەی رۆژووی وتوویە : ئەوەندە بە رۆژوو ئەبوو هەتا ئەمان وت : وازی لێ ناهێنێ و، ئەوەندەش وازی لێ ئەهێنا ئەمان وت : بەرۆژوو نابێت. [٣٦٨]

ئەنەسیش خوا لێی رازیی بێ وتوویە : لە هەر کاتێکی شەودا بتویستایە بیبینی نوێژ ئەکات ئەتدیی و ، بتویستایە بیبینی خەوتبایە ئەتدیی . [٣٦٩]

عەبدوڵڵای کوڕی ( شخّیر ) یش خوا لێی رازیی بێ وتوویە : هاتمە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ خەریکی نوێژ بوو و ، ناوسکیشی لەبەر گریان بە وێنەی مەنجەڵ گیزەی لێوە ئەهات . [٣٧٠]

دەربارەی خۆشویستنی پووڵ و پارە و سامانی دنیاش ئەوەندە پاك بوو ، نەك خۆی ، بەڵکو هاوەڵە پاکەکانی و ، قوتابیانی هاوەڵاکانی و شوێنکەوتووە دڵسۆزەکانی لە عەرەب و عەجەم ئەوەندە دەست و دەم پاك بوون هەموو مرۆڤایەتیی، بە دۆست و دوژمنەوە ، ستایشیان ئەکەن .. لاپەڕەکانی مێژوویەکی هەزار ساڵەیی پڕن لە هەواڵی پاکیی و دنیانەویستیی هەڵگرانی دینەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەمەش هەمووی بە چاوکردن لە گەورە پێشەوا و ، شوێنکەوتنی سوننەتە پیرۆزەکەی ، تا بە راستیی و پاکیی خزمەتی مرۆڤەکان بکرێت .. دەی داخۆ پێغەمبەری پێشەوا ﷺ خۆی چۆن بوویێ ؟!

بۆ ئەمە ئەیفەرموو : (( ما لي وللدنيا ، ما مثلي ومثلُ الدنيا إلا كراكب سار في يوم صائف فاستظلَّ تحت شجرةٍ ساعةً ثم راح وتركها )) [٣٧١] . ئەی فەرموو : من چیمم داوە لە دنیا .. وێنەی من و دنیا وەك رێبوارێك وایە کە لە رۆژێکی هاوین دا

---

[٣٦٦] أخرجه الترمذي ( ٤٤٨) ، والنسائي : ٥ / ١٧٧ ، والحديث إسناده صحيح .
[٣٦٧] أخرجه إبن ماجه برقم ( ١٣٥٠ ) ، والحاكم : ١ / ٢٤١ ، والحديث صحيح .
[٣٦٨] أخرجه مسلم برقم ( ١١٥٦ ) ، والنسائي : ٤/ ١٩٩ ، والترمذي في الشمائل ( ٢٨٣ ) .
[٣٦٩] أخرجه البخاري في صحيحه ( ١١٤١ ) ، والترمذي ( ٧٦٩ ) ، وأحمد : ٣ / ١٠٤ ، ١١٤ .
[٣٧٠] أخرجه الترمذي في الشمائل ، وأبوداود ، والنسائي في الكبرى ، وأحمد بإسناد صحيح .
[٣٧١] رواه أبوداود الطيالسي ، وأخرجه الترمذي ، وإبن ماجه ، والحديث صحيح لغيره .

بکەوێتە رێ و ، بۆ ماوەی سەعاتێك لا بداتە ژێر سێبەری درەختێك ، پاشان بڕوا و بەجێی بهێڵێ ..

نەك هەر خۆی پشت لە دنیا بکات ، بەڵکو ئەیویست ماڵ و منداڵیشی وەها پشت لە دنیا بکەن . ئەبوهورەیرە خوا لێی رازیی بێ ئەڵێت : بەو خوایەی کە گیانی ئەبوهورەیرەی بە دەستە پێغەمبەری خوا و ماڵ و منداڵی هەتا دنیای بەجێ هێشت سێ رۆژ لەسەر یەك لە نانی گەنم تێر نەبوون .[٣٧٢]

کە ویستی حەجی ماڵئاوایی ئەنجام بدات ، لەو کاتەدا کە هەتا چاو کار بکات هاوەڵان لە خزمەتیا بوون و ، سەرانسەری دوورگەی عەرەبییش لە ژێر دەستیدا بوو ، بە سواریی کۆپانێکی شڕی وشترێك کە قەدیفەیەکی بەسەرەوە بوو چوار دیرهەم نەئەژیا حەجی کرد و، فەرموویشی : (( أللهم اجعله حجاً لا رياءَ فيه ولا سمعة )) .[٣٧٣]

فەرمووی : خوایە بە حەجێکی بگێڕی کە نە ریایی و نە سومعەی تێدا نەبێ ..

خۆشنەویستنی پارە بەم فەرموودەیەش دەر ئەخات کە بە ئەبوذەر خوا لێی رازیی بێ ئەفەرموێ : (( ما يسرُّني أن عندي مثلَ أُحدٍ هذا ذهباً ، تمضي عليَّ ثلاثةُ أيام ، وعندي منه دينار ، إلا شيءٌ أرصده لدَينٍ ، إلا أن أقولَ به في عباد الله هكذا وهكذا وهكذا )) ، عن يمينه وعن شماله وعن خلفه .[٣٧٤] بەم فەرموودەیە دەری ئەبڕێ کە ئەگەر ئەوندەی کێوی ئوحود زێڕی هەبێ پێی خۆش نیە دوای سێ رۆژ دینارێکی لەلا مابێ ، مەگەر ئەوەندە کە چیی قەرزارە بیداتەوە . تەنها ئەوەی پێ خۆشە بەندەکانی خوا کۆ بکاتەوە و خەریکی بەخشینەوەی ئەو ئاڵتوون و زێڕە بێ هەتا تەواو ئەبێ .

ئەمە ئاواتی ئەوانەیە کە بڕوایان بە قیامەت هەیە ، بەڵام ئەوانەی کە بڕوایان پێی نیە ، ئاواتەخوازن ئەوەندەی کێوی ئوحود زێڕ لا بدەن ، بەو هیوایەی لە مردن رزگاریان بێت ، بەڵام خۆیان ماندوو ئەکەن ..

دیارە پێغەمبەری خوا ﷺ دەستکورت نەبووە ، بەڵکو سامانێکی زۆری ئەهاتە دەست و ، بە بۆنەی سەخاوەتییەوە لە دەستی دا نەئەما و ئەیبەخشیی . چونکە دەستکەوتی جەنگ لە ناو هەموو پێغەمبەراندا تەنها بۆ ئەم حەڵاڵ بووە و ، لە ژیانی خۆیدا هەموو دوورگە و سنوورەکانی عێراق و شام کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی

---

[٣٧٢] أخرجه مسلم والترمذي وأحمد وابن ماجه .

[٣٧٣] أخرجه إبن ماجه ، وابن أبي شيبة في المصنف من حديث أنس ، والحديث صحيح لغيره .

[٣٧٤] متفق عليه واللفظ للبخاري ( ٦٤٤٥ ) ومسلم ( ٩٩١ ) ، وابن ماجه ( ٤١٣٢ ) .

ئیسلامەوە و ، پێنج یەك و جزیە و زەکاتی ئەم ناوچانەی ئەهاتە دەست و ، کۆمەڵێك مەلیك و شازادەش دیاریی و خەلاتێکی زۆریان بۆ ئەنارد ، کەچیی هیچی لەمەی بۆ خۆی گل نەئەدایەوە و ، هەر لەسەر شێوازی جارانی ئەژیا لە کەمخواردن و کەم خواردنەوە ، هەتا تەمەنی بە سادەیی بەسەر برد و ، نەخشەیەکی جوانی بۆ شوێنکەوتوانی کێشا تا سەرزەویی بە سوننەتی بێگەرد ئاوەدان بکەنەوە ..

ئەو هەمووە خواپەرستیی‌یە و ، کاروباری زۆری دینی خوا کە پێغەمبەری خوایان ﷺ سەرقاڵ کردبوو ، نەئەبوونە هۆی ئەوە کە ئازیز ئاوڕ بەلای مرۆڤەکانەوە نەداتەوە ..

هەموو کەسێك مافی خۆی پێ ئەدا .. خۆشەویستیی و نەرم و نیانیی بەرامبەر بە هەموو کەسێك دەرئەبڕێ .. دڵی دڵشکستانی ئەدایەوە ..

عەبدوڵلای کوڕی حاریث خوا لێی رازیی بێ وتوویە : کەسم نەدیوە وەك پێغەمبەر ﷺ زەردەخەنەی زۆر بکات .[375]

عائیشەش خوا لێی رازیی بێ ئەڵێت : زەیدی کوڕی حاریثە ( کە بەندەی ئازاد کراوی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو ) گەیشتە مەدینە و ، پێغەمبەری خوایش ﷺ لە ماڵەوە بوو .. هات بۆ لای و تەقەی لە دەرگا دا . پێغەمبەریش ﷺ هەستا بە رووتیی چوو بە دەمیەوە و ، کراسەکەی بە دوای خۆی‌دا را ئەکێشا .. ( واتە بە شێوەی لە ماڵ دەرچوون جل و بەرگی لەبەردا نەبوو .. ) ، باوەشی پیا کرد و ماچی کرد ..[376]

هەروەها بەرامبەر بە منداڵان شەفەقەتێکی زۆری هەبوو :

لە ئەنەسەوە خوا لێی رازیی بێ ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە لای کۆمەڵێك منداڵدا تێ ئەپەڕێت یاریی ئەکەن ، ئەویش سەلامیان لێ ئەکات .[377]

نوێژی بە ڕووناکیی چاوەکانی لە قەڵەم ئەدا ، کەچیی کە لە نوێژدا بوایە و دەنگی گریانی منداڵێکی ببیستایە ، نوێژەکەی بە خێرایی تەواو ئەکرد ، نەوەکو دایکی منداڵەکە ، کە لە نوێژی جەماعەت‌دایە ، بە گریانی منداڵەکە دڵی ناڕەحەت ببێ ..

---

[375] من كلام أنس بن مالك رضي الله عنه ، رواه أبونُعيم في الحلية .

[376] أخرجه الترمذي في أبواب الإستئذان برقم ( ٢٧٣٢ ) والحديث ضعيف .

[377] أخرجه البخاري برقم : ( ٢٦٤٧ ) ، ومسلم : ( ٢١٦٨ ) ، والترمذي : ( ٢٦٩٦ ) .

ریوایەت کراوە کە فەرموویە : (( إني لأقوم في الصلاة أريد أن أطوِّلَ فيها ، فأسمع بكاء الصبي فأتجوز في صلاتي كراهية أن أشقَّ على أُمِّهِ )) .[٣٧٨]

خاوەنی دڵێکی یەکجار پاك بووە و بە هیچ شێوەیەك رقی لە هیچ کەسێك نەبووە..

لێیەوە ریوایەت کراوە کە فەرموویە : (( لا يُبَلِّغُني أَحَدٌ منكم عَن أصحابِي شَيئًا، فإني أحب أن أخرجَ إليكم ، وأنا سليم الصدر )) .[٣٧٩] پێی خۆش بووە هیچ کەس دەربارەی هاوەڵان هیچی بۆ باس نەکات ، تا بە سینەی سافەوە بێتە دەرەوە ناویان.

بۆ هەموو موسڵمانان باوکێکی بەسۆز و بەشەفەقەت بوو .. خۆی بە بەخێوکەری هەموو موسڵمانان ئەزانی و ، خۆی بە خەمخۆر و لێپرسراویان لە قەڵەم ئەدا .. هەر موسڵمانێك بمردایە ئەگەر قەرزار بوایە بۆی ئەبژاردەوە ، بەڵام گەر میراتی لە دوا بەجێ بمایە بۆ وەرەسەی مردووەکە ئەبوو . ئەوەبوو ئەی فەرموو : (( مَن تَركَ مالاً فلورثته ومن ترك كَلاًّ فإلينا )) .[٣٨٠]

لە ریوایەتێکی تردا فەرموویە : (( ما من مؤمن إلا وأنا أولى به في الدنيا والآخرة، إقرؤوا إن شئتم : ﴿ ٱلنَّبِيُّ أَوۡلَىٰ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ مِنۡ أَنفُسِهِمۡ ﴾ ( الأحزاب : ٦ ) ، فأيما مؤمن مات وترك مالاً فليرثه عصبته من كانوا ، ومن ترك ديناً أو ضياعاً ، فليأتي فأنا مولاه )) .[٣٨١]

دەری ئەبڕێ کە بە پێی ئەو ئایەتە ئەو لە خۆمانیش بۆ خۆمان دڵسۆزترە .

پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر فیترەتێکی پاك و خاوێن بە دیی هێنرا بوو ، بۆیە هەر کارێك ئاسان بوایە ئەوەی ئەنجام ئەدا بە مەرجێ گوناه و تاوان نەبوایە . عائیشەی دایکمان خوا لێی رازیبێ ئەڵێت : (( ما خُيِّرَ رسولُ الله ﷺ في أمرين قط إلا اختار أيسرهما ، مالم يكن إثماً ، فإن كان إثماً ، كان أبعد الناس )) .[٣٨٢]

فەرمانیشی داوە کە دین بە قورس پیشان نەدرێ و ، هەرکەسێ دین بە توندیی بگرێ بەرگە ناگرێ و ، پێویستە موسڵمانان ئاسانکار و مژدەدەر بن و بەیانیان و

---

[٣٧٨] أخرجه البخاري برقم : ( ٧٠٧ ) ، وأبوداود برقم : ( ٧٨٩ ) ، وابن ماجه برقم : ( ٩٨٩ ـ ٩٩١ ) .

[٣٧٩] أخرجه أبوداود برقم : ( ٤٨٦٠ ) ، والترمذي برقم : ( ٣٨٩٦ ) ، وهو ضعيف .

[٣٨٠] أخرجه البخاري في صحيحه برقم : ( ٢٢٩٧ ) ، وأبوداود برقم : ( ٢٨٩٩ ) ، وابن ماجه برقم : ( ٢٤١٦ ) .

[٣٨١] سبق تخريجه في الحديث السابق .

[٣٨٢] أخرجه البخاري برقم : ( ٣٥٦٠ ) ، ومسلم برقم : ( ٢٣٢٧ ) و أبوداود برقم : ( ٤٧٨٥ ) .

ئێواران خواپەرستیی بکەن لەگەڵ بەشێك لە دوا سەعاتی شەو : (( إن الدين يُسرٌ، ولن يشاد الدين أحد إلا غلبه ، فسددوا ، وقاربوا ، وأبشروا ، واستعينوا بالغدوة والروحة وشيء من الدلجة )) .[٣٨٣]

لە پاڵ زوهددا پێی خۆش بووە شوێنەواری ناز و نیعمەت بە بەندەی خواوە دیاربێ، بۆ ئەمە فەرموویە : (( إن الله يحب أن يرى أثر نعمته على عبده )) .[٣٨٤]

لەگەڵ ماڵ و منداڵیشیدا ئەوپەڕی نەرم و نیانیی ئەنواند : جلی خۆی ئەشۆرد و مەڕی ئەدۆشیی و ، خزمەتی خۆی ئەکرد .. لە ماڵەوە هەموو ئیش‌وکارێکی ئەنجام ئەدا و ، هەردەم ڕووخۆش و دەم بە پێکەنین بوو .

عائیشە خوا لێی ڕازیی بێ ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە: (( خيركم خيركم لأهلِه ، وأنا خيركم لأهلي )) .[٣٨٥] ئەفەرموێ : چاك ترینتان ئەو کەسەیە کە بۆ کەس‌وکاری چاك‌تر بێت و ڕێزی ماڵ و منداڵی بگرێ . منیش لە هەمووتان بۆ ماڵ و منداڵم چاك‌ترم .

ڕەوشت جوانییشی لە هەموو بارێکەوە بوو .. هەتا دەربارەی خواردن :

ئەبوهورەیرە خوا لێی ڕازیی بێ ئەگێڕێتەوە کە هەرگیز پێغەمبەری خوا ﷺ عەیبی لە هیچ خواردنێك نەگرتووە ، ئەگەر دڵی پێوەی بوایە ئەی خوارد و ، گەر نەشی‌ویستایە ئەی‌دایە دواوە .[٣٨٦]

ڕەوشتێکی تری یەکجار بەرزی ئازیزمان ﷺ بریتیی بوو لەوەی کە لە ترس و لەرز و زەرەر و زیاندا خزمەکانی خۆی پێش ئەخستن و ، لە خۆشیی و دەست‌کەوتدا دوای ئەخستن .

ئەوەبوو لە سەرەتای جەنگی بەدردا عوتبە و شەیبەی کوڕانی ڕەبیعە و وەلیدی کوڕی عوتبە لە ڕیزی سوپای قوڕەیش هاتنە دەرەوە و ، هاتنە بەردەم سوپای موسڵمانان داوای زۆران‌بازی‌یان کرد .. ویستیان قوڕەیشیی بێنە مەیدانیان . پێغەمبەری خواش ﷺ سێ خزمی نزیکی خۆی نارده بەردەمیان کە حەمزە و عەلیی و عوبەیدە بوون .

---

[٣٨٣] أخرجه البخاري برقم : ( ٣٩ ) ، والنسائي برقم : ( ٥٠٣٤ ) .

[٣٨٤] أخرجه الترمذي برقم : ( ٢٨١٩ ) ، والحديث حسن .

[٣٨٥] أخرجه الترمذي برقم : ( ٣٨٩٥ ) ، وأبوداود برقم : ( ٤٨٩٩ ) والحديث صحيح .

[٣٨٦] متفق عليه : رواه البخاري برقم : ( ٣٥٦٣ ) ، ومسلم برقم : ( ٢٠٦٤ ) ، والترمذي برقم : ( ٢٠٣١ ) ، وأبوداود برقم : ( ٣٧٦٢ ) .

کاتێکیش که ویستی حەرامبوونی ریبا و بە هەدەرچوونی خوێنی نەفامیی بە موسڵمانان بگەیەنێ ؛ بە ریبای عەبباسی مامەی و ، خوێنی رەبیعەی کوڕی حاریثی کوڕی عەبدولموطەللیبی ئامۆزای دەستی پێ کرد و ، لە وتارەکەی حەجیماڵئاواییدا رای گەیاندن ..

لە کاتی خۆشیی و دەستکەوتیشدا دوای ئەخستن ، بە پێچەوانەی هەموو دەسەلاتدارێکی دنیایییەوە .

لە باسەکانی پێشەوەدا باسی ئەوەمان کردووە کە چۆن خزمەتکاری نەداوە بە عەلیی و فاطیمە و بڕیاری داوە بیانفرۆشت و پارەکەیان بکاتە خەرج و مەسرەف بۆ ئەهلی صوففە کە لە برساندا ئەتلانەوە .

لەگەڵ ئەو هەمووە کاروبارانەدا هەست ناسکیی دەربارەی هەموو شتێکی لە یاد نەئەچوو .. هەتا کۆتایی تەمەنی یادی شەهیدانی ئوحودی ئەکرد و ، دوعای خێری بۆ ئەکردن .. هەتا ناوچەکە و کێوی ئوحودی زۆر خۆش ئەویستن و ئەی فەرموو : (( أحد جبلٌ يحبُّنا ونحبُّه )) .[٣٨٧]

دەربارەی حیلم و هێمنییشی ریوایەتی زۆر هەن : بۆ نموونە ئەوەبوو سەرۆکی نیفاق عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی تا ما بوو دژایەتیی زۆری پێغەمبەری خوای ﷺ ئەکرد .. کەچیی کە مرد و هێنایان بۆ قەبرستان و خستیانە ناو قەبرەکەیەوە ؛ فەرمانی دا دەری بهێننەوە . ئەوەبوو خستیە سەر هەردوو ئەژنۆی و ، فووی پیا کرد و کراسەکەی خۆی کردە بەری .[٣٨٨]

ئەمە کورتەیەکی سیفەتە جوانەکانی بوو و زۆرێکیش لە دوو توێی ژیانە پیرۆزەکەیدا باس کراون .[٣٨٩]

---

[٣٨٧] أخرجه البخاري برقم : ( ٣٣٦٧ ) ، ومسلم برقم : ( ١٣٤٥ ) ، والترمذي برقم : ( ١٠٩٥ ) ، والنسائي برقم : ( ٥٤٧ ) .

[٣٨٨] أخرجه البخاري في الصحيح برقم : ( ١٣٥٠ ) ، ومسلم برقم : ( ٢٧٧٣ ) ، والنسائي برقم : ( ١٩٠ ) .

[٣٨٩] السيرة النبوية للندوي : ٤٢٣ ـ ٤٥٦ ؛ الرحيق المختوم : ٤٩٤ ـ ٥٠٣ .

## بەشی پەنجاهەم

# نەخۆش کەوتن و کۆچی دوایی

**یەکەم : نزیکیی کۆچی دوایی**

لە دوا مانگی ساڵی دەهەمی کۆچیی‌دا پێغەمبەری خوا ﷺ حەجی ماڵئاوایی لەگەڵ گەورەترین ژمارەی موسڵمانانی ئەو رۆژەدا ئەنجام دا و ، سەرەتای ساڵی یانزەهەمینی لە مەدینە ، بەوپەڕی رێزەوە ، بە دڵێکی کراوەوە ، بە سنگێکی فراوانەوە ، دەست پێ کرد ، چونکە پەیامەکەی خوای تەبلیغ کردبوو و ، ئەو سپاردە گرانەی سەرشانی گەیاندبوو و ، خوای گەورەش دوژمنانی بۆ تێك شکاندبوو ، تا مرۆڤەکان بە سەربەستیی خوای خۆیان بپەرستن ..

بەڵێ سەرکەوتنی ئیسلام و ، پێ‌گەیاندنی کۆمەڵگای موسڵمان بە فەرمان و ئەحکامی قورئان ئەوپەڕی ئاوات بوو بۆ پێشەوای ئازیزمان ..

پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ ، کە یەکەم مرۆڤە لە بەرچاو ڕۆشنییدا ، هەستی ئەکرد کە کاتی کۆچ‌کردنی نزیك بۆتەوە .. هەستی ئەکرد وا ئەرکی سەرشانی لە تەواوبوون دایە و ، هەندێ ئایەتیش ئاماژە بۆ کۆچی دوایی ئەو ئەکەن .

قورئان دەری ئەبڕیی کە ئەویش مرۆڤە وەك برا پێغەمبەرەکانی تری و ، ئەویش هەمان مەرگ ئەچێژێ کە ئەوان چەشتیان . لە هەندێ ئایەتیش‌دا لەوە ئەگەیشت کە تەمەنی لە کۆتایی نزیك بۆتەوە :

أ ـ ئەو ئایەتانەی کە کۆچی دوایی ئازیزمان دەر ئەخەن :

١ـ خوای گەورە ئەفەرموێ : ﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴾ ( آل عمران : ١٤٤ ) . خوای گەورە ئەوەمان پیشان ئەدات کە هەتا پێغەمبەرانی خوا سەلامیان لێ بێ لەم دنیایەدا نامێننەوە . کە پێغەمبەریش کۆچی

دوایی بکات یان شەهید ببێ پێویستە شوێنکەوتوانی بە جوانیی دەست بە دینەکەیەوە بگرن ..

٢ـ هەروەها ئەفەرموێ : ﴿ إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴾ ( الزمر : ٣٠ ) .

خەڵکەکە هەندێکیان بڕوایان نەئەکرد پێغەمبەری خوا ﷺ مردبێت ، کەچی ئەبوبەکری صدیق خوا لێی رازیی بێ ئەم ئایەتەی بە بەڵگە لەسەر مردنی ئەهێنایەوە..

٣ ـ هەروەها ئەفەرموێ:﴿ وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ ٱلْخُلْدَ ۖ أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ ٱلْخَٰلِدُونَ ﴾ ( الأنبياء : ٣٤ ) . دەری ئەبڕێ کە ئەمیش وەك پێغەمبەرە پێشووەکان ئەمرێت و ، دوژمنەکانیشی هەر ئەمرن . پاشان دەری ئەبڕێ کە مردن کارێکی حەتمی یە کە ئەفەرموێ : ﴿ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ﴾ ( الأنبياء : ٣٥ ) .

٤ ـ دەربارەی سوورەتی ( النصر ) عومەر پرسیاری لە ئیبن عەبباس کرد کە چۆنی لێ تێ ئەگات ؟ ئەویش وەڵامی دایەوە کە : ئەوە ئەجەلی پێغەمبەری خوایە ﷺ و قورئان پیشانی دا .. عومەریش فەرمووی : منیش هەر ئەوەی لێ تێ ئەگەم .

ب ـ فەرمایشتەکان :

١ ـ عائیشە خوا لێی رازیی بێ ئەڵێت : هاوسەرەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ لەلای کۆ بوونەوە و ، هەر هەموویان لەوێ ئامادە بوون . فاطیمەش هات و ڕەوتیشی لە ڕەوتی باوکی ئەچوو ، فەرمووی : (( مرحباً يا بنيتي )) .لە لای ڕاستی یان چەپی دایشاند . پاشان شتێکی بە نهێنیی دا بە گوێیدا و ئەویش دەستی بە گریان کرد، پاشان هەر بە نهێنیی شتێکی تری دا بە گوێیدا و ئەویش دەستی بە پێکەنین کرد.. منیش پێیم وت : پێغەمبەری خوا نهێنییەکانی لای تۆ درکاند و تۆیش ئەگریت؟ کە هەستا پێیم وت : هەواڵم بدەرێ چ نهێنییەکی لەلات درکاند ؟ وتی : نهێنیی پێغەمبەری خوا ﷺ نادرکێنم . کە کۆچی دوایی کرد پێم وت : داوات لێ ئەکەم لەبەر ئەو مافەی کە بەسەرتەوە هەمە هەواڵم بدەرێ . فاطیمە وتی : ئێستا بەسەر چاو . وتی : یەکەم جار بە نهێنیی دای بە گوێمدا و فەرمووی : (( إن جبريل كان يعارضني في القرآن كل سنةٍ مرةً ، وقد عارضني في هذا العام مرتين ، ولا أرى ذلك الأجل إلا قد اقترب ، فاتقي الله واصبري ، فإني نعم السلف أنا لك )) . فەرمووی : جاران جیبریل هەموو ساڵێك جارێك پیاچوونەوەی قورئانی پێ ئەکردم ، بەڵام ئەمساڵ

دوو جار و ، وەهای ئەبینم کە ئەجەلم نزیك بۆتەوە ، جا تۆش شەرمی خوات لەلابێ و ئارامیش بگرە، چونکە من چاكترین کەسێکم بۆت کە بۆ قیامەت پێشت ئەکەوم . ئیتر بەو شێوەی کە دیت دەستم بە گریان کرد . جا کە خەمباریی منی دیی چپانی بە گوێمدا و فەرمووی : « يا فاطمة ! أما ترضين أن تكوني سيدة نساء المؤمنين ، أو سيدة نساء هذه الأمة ؟ » .[٣٩٠] فەرمووی : فاطیمە ! ئایا رازیی نابی واتە خەفەتی دلّت لا ناچێ تۆ خانمی ئافرەتە ئیمانداره‌کان ، یان خانمی ئافرەتانی ئەم ئوممەتە بیت؟

٢ـ جابیر خوا لێی رازیی بێ ئەلّێت : رۆژی جەژنی قوربان چاوم لە پێغەمبەر بوو ﷺ کە بەسەر وشترەکەیەوە رەجمی شەیتانی ئەکرد و ئەیفەرموو : «لتأخذوا مناسككم فإني لا أدري لعلي لا أحج بعد حجتي هذه » .[٣٩١] فەرمووی: کاروبارەکانی حەجم لێ وەربگرن ، چونکە من نازانم لەوانەیە دوای ئەم حەجەم حەجی تر ئەنجام نەدەم .

٣ ـ ئەبوسەعیدی خودریی خوا لێی رازیی بێ ئەلّێت : پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری بۆ خەلّکەکە دا و فەرمووی : « إن الله خير عبداً بين الدنيا وبين ما عنده فاختار ذلك العبد ما عند الله » . فەرمووی : خوای گەورە بەندەیەکی لە نێوان دنیا و ئەوەی لەلای خۆی لە قیامەتدا ئامادەی کردووە سەرپشك کرد ، ئەویش ئەوەی لای خوای هەلّ بژارد.

ئەبوبەکر دەست بە گریان ئەکات و ئەوانیش سەریان سوڕ ئەمێنێ کە بۆ هەوالّ دانی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ سەرپشك‌کردنی بەندەیەك ئەگریا . ئەوەبوو ئەبوبەکر لە باسەکە تێ گەیشت کە بەندە سەرپشك‌کراوەکە پێغەمبەری خوا بوو .[٣٩٢]

٤ ـ عەبباسی کوڕی عەبدولموطەللیب خوا لێی رازیی بێ ئەلّێت : لە خەومدا بینیم زەویی بە گوریسی ئەستوور بەرەو ئاسمان را ئەکێشرا ، کە گێڕامەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : « ذاك وفاة إبن أخيك » .[٣٩٣] فەرمووی : ئەوە کۆچی دوایی برازاکەتە، واتە خۆی .

---

[٣٩٠] البخاري ، كتاب الإستئذان رقم : ( ٦٢٨٥ ، ٦٢٨٦ ) .
[٣٩١] مسلم ، كتاب الحج رقم : ( ١٢٩٧ ) .
[٣٩٢] البخاري ، كتاب فضائل الصحابة رقم : ( ٣٦٥٤ ) .
[٣٩٣] البزار : ١ / ٣٩٧ ، كشف الأستار ( ٨٤٤ ) ، مجمع الزوائد : ٩ / ٢٤ ، رجاله ثقات .

٥ ـ له بهشهكانی پێشهوهش‌دا ئهوهمان باس كرد كه له بهڕێكردنی موعـاذدا بـۆ یهمهن پێغهمبهری خوا ﷺ ههواڵی پێ دا كه لهوانهیه تا ئهو ئهگهڕێتهوه ئهم كۆچی دوایی كردبێ . كه موعـاذ دهستی به گریان كرد ، فهرمووی : ((لا تبك یا معاذ! فإن البكـاء مـن الشـیطان)) . فـهرمووی : موعـاذ ! مـهگریی ، چـونكه گریـان لـه شهیتانهوهیه .

**دووههم : ناردنی سوپای ئوسامه**

دهوڵهتی ڕۆم یهكجار له خۆی بایی بوو بوو ، چونكه لهو چهند ساڵهدا بـوو پشـتی دهوڵهتی فارسی به زهویی‌دا دابوو ، بۆیه خۆی به پاڵهوانی مهیدان ئهزانیی و ، خێـرا خێرا له سنووری خۆی ئهچووه دهرێ . ههر كهسێ بیری له موسڵمانبوون بكردایهتهوه خێرا له ملـی ئـهدا ، وهك فـهرۆه . ههوڵیشـی ئـهدا هـۆزه عهرهبـهكان بترسـێنێ و دهسهڵاتی خۆی فهرز بكات بهسهریانا نهوهكو بیر له موسڵمانبوون بكهنهوه .

بهرامبهر بهم ههڵوێستهی ڕۆم پێغهمبهری ئازیزیش ﷺ ههڵوێسـتی وهرگـرت و ، سوپایهكی پێكهوه نا و ، فهرماندایهتیی ئـهو سـوپایهی بـه ئوسـامهی كـوڕی زهیـد سپارد. تا ڕۆم سنووری خۆیان بزانن و لهوه زیاتر دهسـتدرێـژیی نهكهنـه سـهر هـیچ كهس و هۆزێك و ، با خۆشیان ئامـادهی نهبـهردی لهمـهولا بكـهن ، چـونكه گـهلان سهربهسـتی‌یـان ئـهوێت و چاوهڕوانی ڕزگاركـهرن . لـه هـهمان كـات‌دا تـا هـۆزه عهرهبهكانی سهر سنووریش نهترسن و هێزی ڕزگـاریی خـوازی ئیسـلام بهڕێوهیـه تـا بهرگری‌یان لێ بكات و، ئهو زوڵم و ستهمهی ڕۆم له نهمان‌دایه .

پێغهمبهری خوا ﷺ سێ ههزار پیاوی له هاوهڵه چاكهكانی ههڵ بژاردن كه گـهوره موهاجیر و ئهنصاری وهك ئهبوبهكر و عومـهر و ئهبوعوبهیـده و سـهعد و سـهعید و سهلهمهی كوڕی ئهسلهمیان لهگهڵ‌دا بوون و ، فهرمانی بهسهردا دان بـهره و بولقـا و فهلهستین بكهنه ڕێ ، ئهمهش له مـانگی صهفهری ساڵی یانزهههمینی كۆچیی‌دا بوو.

پێغهمبهری خوا ﷺ بانگی كرده ئوسامهی كوڕی زهید و پێی فهرموو : ((سِرْ إلى موضع مقتل أبيك ، فأوطئهم الخيل ، فقد وليتك هذا الجيش ، وأغر صباحاً عليهم ، وأسرع السير تسبق الخبر ، فإن ظفرك الله بهم فأقلَّ اللبث فيهم )) . فـهرمووی : بچـۆ بۆ شوێنی شههیدكرانی باوكت و ، به ئهسـپ بنیشـهره سـهریان . مـن تـۆم كردۆتـه

ئەمیری ئەم سوپایە .. سەرلەبەیانیی هەڵمەت بدەرە سەریان . بە پەلە بڕۆ تا خێر بێتە رێت . گەر خوا سەرکەوتنی پێشکەش کردی لەو ناوەدا کەم بمێنەرەوە .

سەرەتا موسڵمانەکان خاوەخاویان ئەکرد و خۆیان نەئەپێچایەوە ، بە بیانووی ئەوەی کە ئوسامە ـ کە تەمەنی هەژدە ساڵان بوو ـ منداڵە و ، ئەو هەمووە هاوەڵە پایەدار و بە تەمەنەی لە ژێر دەستایە .

کە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستی وا تانە لە ئەمیریی ئوسامە دراوە ، قبووڵی نەکرد، بەڵکو فەرمووی : (( إن تطعنوا في إمرته فقد كنتم تطعنون في إمرة أبيه من قبل، وأيم الله إن كان لخليقاً للإمرة ، وإنه كان لمن أحب الناس إليَّ وإن إبنه هذا لمن أحب الناس إليّ من بعده )) .[٣٩٤] فەرمووی : ئەگەر تانە لە ئەمیریی ئوسامە بدەن ، ئەوە لە پێشەوە تانەتان لە ئەمیریی زەیدی باوکی داوە . سوێند بە خوا زەید هەر بۆ ئەمیریی بە دیی هێنراوە و ، یەکێکە لە خۆشەویستترین کەسم و ، کوڕەکەشی دوای ئەو یەکێکە لە خۆشەویستترین کەسم .

موسڵمانەکان کە لەم بڕیارە گەیشتن خێرا خۆیان ئامادە کرد و ، سوپا لە شار دەرچوو و ، جورف ، کە فرسەخێك لە شارەوە دوور بوو ، کرایە سەربازگە .

ئا لەو کاتەدا دوا نەخۆشیی پێغەمبەری خوا ﷺ سەری هەڵ دا .. بۆیە کە سوپا هەواڵی نەخۆشیی ئازیزیان زانیی پێیان خۆش نەبوو مەدینە بەجێ بهێڵن تا دەنگ و باسی چاك بوونەوە بزانن . ئیتر ویستی خوا وەها بوو ئازیز کۆچی دوایی بکات و ، سوپای ئوسامە لە خەلافەتی صدديق‌دا بکەوێتە رێ .[٣٩٥]

**سێهەم : سەردانی بەقیع و شەهیدانی ئوحود**

لە بەندەی ئازادکراوی پێغەمبەری خوا ﷺ ، ئەبوموەیهەبەوە ئەگێڕنەوە کە وتوویە : لە نیوە شەودا پێغەمبەری خوا ﷺ بەخەبەری هێنام و فەرمووی : (( يا أبامويهبة ! إني قد أمرتُ أن أستغفر لأهل البقيع فانطلق معي )) . بە بەندەکەی فەرموو کە فەرمانی بەسەردا کراوە بچێتە بەقیع و داوای لێ خۆش بوون بۆ مردووەکانی بکات و پێی خۆشە ئەویشی لەگەڵدا بڕوا ..

---

[٣٩٤] البخاري ، كتاب فضائل الصحابة : ٤ / ٢١٣ .

[٣٩٥] صحيح البخاري : ٢ / ٦١٢ ، وابن هشام : ٢ / ٦٠٦ ، ٦٥٠ .

ئەڵێت : لەگەڵیا ڕۆیشتم ، کاتێ گەیشتە ناویان فەرمووی : (( السلام عليكم ، يا أهل المقابر ، ليهنأ لكم ما أصبحتم فيه مما أصبح الناس فيه ، أقبلت الفتن كقطع الليل المظلم ، يتبع آخرها أولها ، الآخرة شر من الأولى )) . سەلامی لە ئەهلی قەبرستانەکە کرد و ، پیرۆزبایی ئەوەی لێ کردن کە ئەوان پێش کەوتن ، چونکە فیتنە و ئاژاوەکان وەك پارچەی شەوی تاریك وا هاتن بە دوای یەك دا و ، ئەوەی دواوە لە پێشووەکە خراپترە .

ئەڵێت : پاشان ڕووی لە من کرد و فەرمووی : (( يا أبا مويهبة ! إني قد أوتيت مفاتيح خزائن الدنيا والخلد فيها ، ثم الجنة ، فخُيِّرتُ بين ذلك وبين لقاء ربي والجنة )). فەرمووی : ئەی ئەبومەویهەبە ! سەرپشك كراوم لە نێوان ئەوەدا کە کلیلی گەنجینەکانی دنیام بە نەمریی پێ بدرێ ، پاشان بچمە بەهەشت و ، لە نێوان ئەوەدا کە بە خزمەت پەروەردگارم بگەمەوە و بچمە بەهەشت .

ئەڵێت : وتم : دایك و باوکم بە قوربانت بن دەی کلیلی گەنجینەکانی دنیا بە نەمریی وەربگرە و پاشان بەهەشت . فەرمووی : (( لا والله يا أبا مويهبة ! لقد اخترت لقاء ربي والجنة )) . فەرمووی : نا بەخوا ئەبومەویهەبە ! بە خزمەت گەیشتنی پەروەردگارم و چوونە بەهەشتم هەڵ بژاردووە . پاشان داوای لێخۆشبوونی بۆ مردوانی بەقیع کرد و گەڕایەوە . ئیتر ئەوەبوو ئەو نەخۆشی‌یە لە پێغەمبەری خوا ﷺ سەری هەڵ دا کە پێی گەڕایەوە خزمەتی خوا .[٣٩٦]

هەروەها عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنیی خوا لێی ڕازیی بێ ئەگێڕێتەوە و ئەڵێ: ڕۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ لە شار دەرچوو و ، بە وێنەی نوێژی مردوو نوێژی لەسەر شەهیدانی ئوحود کرد ، پاشان گەڕایەوە سەر مینبەر و فەرمووی : (( إني فرط لكم وأنا شهيد عليكم ، وإني والله لأنظر إلى حوضي الآن ، وإني أعطيت مفاتيح خزائن الأرض، أو مفاتيح الأرض ، وإني والله ما أخاف عليكم أن تشركوا بعدي ولكن أخاف عليكم أن تنافسوا فيها )) .[٣٩٧] فەرمووی : من پێشتان ئەکەوم و لەسەرتان شاهێد ئەبم . بەخوا من ئێستە سەیری حەوزەکەم ئەکەم و ، کلیلی گەنجینەکانی زەویی یان کلیلەکانی زەوییشم پێ بەخشراون . بەخوا من لەوە ناترسم دوای من شەریك بۆ خوا بڕیار بدەنەوە، بەڵام لەوە ئەترسم لەسەر دنیا بەرابەرکێ بکەن .

---

[٣٩٦] الحاكم في المستدرك : ٣ / ٥٥ ، ٥٦ ، صحيح على شرط مسلم وأقره الذهبي .

[٣٩٧] البخاري ، كتاب الجنائز ، باب الصلاة على الشهيد رقم : ( ١٣٤٤ ) .

**چوارەم : سەختیی نەخۆشییەکەی و مانەوەی لە ماڵی عائیشە**

لە کاتی نەخۆشییەکەشیدا پێغەمبەری خوا ئەگەڕا بەسەر خێزانەکانیدا و هەر ڕۆژێك لە ماڵی یەکێکیان ئەمایەوە ، ئەمەش تا بە یەك چاو تەماشایان بکات . بەڵام کە نەخۆشییەکەی سەخت بوو و ، ئەو ڕۆژە لە ماڵی خاتوو مەیموونە بوو ، داوای مۆڵەتی لە هاوسەرەکانی کرد کە لە ماڵی عائیشە بمێنێتەوە و لەوێ هەوڵی چارەسەریی بۆ بدرێ ، ئەوانیش ڕەزامەندییان نواند . ئەوەبوو لە ماڵی خاتوو مەیموونەوە هاتە دەرەوە و عەبباسی مامەی و عەلیی ئامۆزای چووبوونە ژێر باڵی و هەردوو پێی لە زەویی ئەخشان و گەیاندنە ماڵی خاتوو عائیشە . کە گەیشتە ئەوێ ئازاری زیاتر بوو و فەرمووی : (( أهريقوا علي من سبع قِرَبٍ لم تحلّ أوكيتهنّ ، لعلي أعهد للناس )) . فەرمووی : ئاوی حەوت کوندەم بەسەردا بکەن کە دەم بەستەکانیان نەکرابنەوە ، بەڵکو کەسێ دابنێم بۆ ئەو خەڵکە . لە تەشتێکی حەفصەدا دائەنیشێنرێت و لە ئاوی کوندەکانی بەسەردا ئەکەن ، هەتا بە دەستی ئاماژەی بۆ هاوسەرانی کرد کە باشە و کاری خۆتان ئەنجام دا . لەش سووکییەکی بە خۆیەوە هەست کرد و هاتە دەرەوە بۆ ناو خەڵکەکە .[٣٩٨]

خاتوو عائیشە خوا لێی ڕازیی بێ وتوویە : هیچ پیاوێکم نەدیوە ئەوەندەی پێغەمبەری خوا ﷺ نەخۆشیی توند گرتبێ .

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودیش خوا لێی ڕازیی بێ وتوویە : لە کاتی نەخۆشییەکەیدا هاتمە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ کە تایەکی زۆر توندی تووش بوو بوو، وتم : تایەکی زۆر توندت هەیە . وتم : یانێ بەوە دوو پاداشتت بۆ ئەنووسرێ؟ فەرمووی : (( أجل ما من مسلم يصيبه أذى إلا حات الله عنه خطاياه كما تحات ورق الشجر )) .[٣٩٩] فەرمووی : بەڵێ هەر موسڵمانێك تووشی ئازارێك بوو ئەوا وەك چۆن گەڵای دار ئەوەرێ وەها گوناهەکانی ئەوەرن .

**پێنجەم : چەند وەسیەتێکی ڕۆژانی کۆتایی**

لە ڕۆژەکانی دوایی تەمەنی ئازیزماندا چەند وەسیەتێکی بۆ موسڵمانان کرد کە ئەمانە هەندێکیان :

---

[٣٩٨] البخاري ، كتاب الوضوء رقم ( ١٩٨ ) .

[٣٩٩] البخاري ، كتاب المرض رقم : ( ٥٦٤٧ ) .

**( ١ ) چاودێریی ئەنصار :**

عەبباس خوا لێی رازیی بێ بەلای کۆمەڵێك ئەنصاردا تێپەڕیی سەیری کرد خەریکن ئەگرین ، ئەمەش لە کاتێكدا کە نەخۆشی‌یەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ لێی توند کردبوو . لێی پرسین : بۆچ ئەگرین ؟ وتیان : کۆڕ و دانیشتنەکانمان لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتەوە یاد . عەبباس چووە ژوورەوە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و هەواڵەکەی پێ دا . ئەوەبوو بە قوماشێکی رەش ، یان بە پەراوێزی بوردە سەری بەسترا بوو . هەستا و هاتە دەرەوە و سەرکەوتە سەر مینبەر و ، ئیتر دوای ئەو رۆژە سەر نەکەوتەوە سەری . سوپاس و ستایشی خوای کرد و پاشان فەرمووی : (( أوصيكم بالأنصار فإنهم كرشي وعيبتي ، وقد قضوا الذي عليهم وبقي الذي لهم، فأقبلوا من محسنهم ، وتجاوزوا عن مسيئهم )) .[٤٠٠] فەرمووی : ئامۆژگارییتان ئەکەم چاوتان لە ئەنصار بێت ، چونکە ئەوان جێی نهێنیی و ئەمانەتی منن . ئەوەی لەسەر شانیان بوو ئەنجامیان داوە و ، ئەوەی کە مافیان بێت ماوە . بۆیە کردەوەی چاکەکاریان وەربگرن و چاو لە خراپکاریشیان بپۆشن .

بە راستیی ئەنصار بەدڵ پێغەمبەری ئازیزیان خۆش‌ئەویست و مەردانەش سەروماڵیان کردە قوربانی دینەکەی ..

**( ٢ ) دەرکردنی موشریکان لە دوورگە و ، ماوەدانی نوێنەران :**

نەخۆشی‌یەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندە توند بوو لەسەری لە رۆژێکدا چەند جارێك بێ‌هۆش ئەکەوت لەگەڵ ئەوەشدا وەهای پێ خۆش بوو بە بێ‌خەمیی لە دوارۆژی ئوممەتەکەی دنیا بەجێ بهێڵێ ، چونکە لە گومڕابوونیان ئەترسا لە دوای خۆی. بۆ ئەمە پێی خۆش بوو نووسراوێك بنووسێ بۆیان هەتا بە درێژە ئامۆژگارییان بکات و ناکۆکی‌یان تێ نەکەوێت . ئەوانەی لەوێ ئامادە بوون ، بوونە دوو بەشەوە : هەندێکیان ـ کە عومەر یەکێکیان بوو ـ وتیان : نەخۆشی‌یەکەی زۆری بۆ هێناوە و ، ئێوە قورئانتان بە دەستەوەیە و بەستانە . ئەوانی تر حەزیان ئەکرد شتێکیان بۆ بنووسێت . کە ناکۆکی‌یەکەیان درێژەی کێشا ، فەرمووی : (( قوموا عني )) . فەرمووی : لەلام هەستن .

بەمە وازی لە نووسینی نووسراوەکە هێنا ، بەڵام سێ ئامۆژگاریی کردن . ئامۆژگاریی کردن کە هەرچیی موشریکە لە دوورگەی عەرەبیی بی‌کەنە دەرەوە و ،

---

[٤٠٠] البخاري ، كتاب مناقب الأنصار رقم : ( ٣٧٩٩ ) .

بەو شێوەش کە خۆی ماوەی نوێنەرانی ئەدا ، ئەوانیش ماوەیان بدەن و ، سێهەم ئامۆژگاریی راویی لە یادی کردووە .[٤٠١]

( ٣ ) دوورەپەرێزیی لە پەرستنی قەبرەکەی :

یەکێ لەو فەرمایشتانەی کە لە کۆتایی تەمەنی‌دا فەرمووی : ئەو ئامۆژگاری‌یە بوو کە نەکەن موسڵمانەکان دوای خۆی قەبرەکەی بپەرستن و وەك یەهوود و نەصارا سەرگەردان بن کە فەرمووی : (( قاتل الله اليهود والنصارى اتخذوا قبور أنبيائهم مساجد )) .[٤٠٢] فەرمووی : خوا یەهوود و نەصارا بکوژێ قەبری پێغەمبەرەکانیان ئەکردە مزگەوت و ئەیان‌پەرستن .

( ٤ ) ظەننی چاك بردن بە خوا :

جابیر خوا لێی رازیی بێ ئەڵێت : گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ سێ رۆژ پێش ئەوەی کۆچی دوایی بکا ئەی‌فەرموو : (( أحسنوا الظن بالله عز وجل )) .[٤٠٣] فەرمان بەسەر موسڵمانان‌دا ئەدا کە هەمیشە ظەننی چاك بە خوای بەدەسەڵات ببەن .

( ٥ ) وەسیەتی نوێژ و کۆیلەکان :

ئەنەس خوا لێی رازیی بێ ئەی‌وت : وەسیەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی سەرەمەرگ‌دا بەم شێوەیە بوو : (( الصلاة ، وما ملكت أيمانكم )) . ئەی‌فەرموو : پارێزگاریی لە نوێژەکانتان بکەن و ، چاوی بەزەییشتان لە کۆیلەکانتان بێت . هەتا سنگی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمەی بەغەر غەرە دەرئەبڕیی و ، زمانیشی بە حاڵە حاڵە پێی ئەجوولا .[٤٠٤]

( ٦ ) مژدەکانی پێغەمبەرایەتیی :

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لێیان رازیی بێ وتوویە : پێغەمبەری خوا ﷺ پەردەی لادا و ، لەو نەخۆشی‌یەی‌دا بوو کە پێی کۆچی دوایی کرد و سەریشی بەستبوو، سێ جار فەرمووی : (( أللهم بلغت )) ، پاشان فەرمووی : (( إنه لم يبق من مبشرات النبوة إلا الرؤيا ، يراها العبد الصالح أو ترى له ، ألا وإني قد نُهيتُ عن

---

[٤٠١] البخاري ، كتاب الجهاد والسير رقم : ( ٣٠٣٥ ) .
[٤٠٢] البخاري ، كتاب الصلاة رقم : ( ٤٣٥ ) .
[٤٠٣] مسلم ، كتاب الوصية رقم : ( ١٦٣٧ ) .
[٤٠٤] رواه الإمام أحمد في المسند .

القراءة في الركوع والسجودِ ، فإذا ركعتم فعظموا الله ، وإذا سجدتم فاجتهدوا في الدعاء ، فإنه قَمِنٌ أن يستجاب لكم )) .[٤٠٥]

فەرمووی : لە مژدەکانی پێغەمبەرایەتیی تەنها خەوی بەندە صاڵحەکان ماوە کە ئەیبینێ ، یان پیشانی ئەدرێت . من قورئان خوێندنی رکووع و سجوودم لێ قەدەغە کراوە ، ئێوەش کە رکووعتان برد گەورەیی خوا دەربڕن و ، کە سەجدەشتان برد دوعای زۆر بکەن ، چونکە شایانی ئەوەیە لێتان گیرا بکرێ .

**شەشەم : پێش نوێژیی ئەبوبەکر**

ئەخۆشی‌یەکەی پێغەمبەر ﷺ توندتر بوو و ، نوێژیش هاتە بەرەوە و ، بیلالیش بانگی دا . پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (( مروا أبابكر فليصل )) . فەرمووی : فەرمان بە ئەبوبەکر بدەن تا پێش‌نوێژیی بۆ موسڵمانان بکات .

وتیان : ئەبوبەکر پیاوێکی دڵنەرمە ، گەر بچێتە ئەو شوێنەی تۆ دەست بە گریان ئەکات و توانای قورئان خوێندنی نابێت . ئەو فەرمایشتەی دووبارە کردەوە و ، ئەوانیش دووبارەیان کردەوە ، لە سێهەم جاردا فەرمووی : ئێوە هەر لەو ژنانەن کە پیلانیان دژی یووسف گێڕا . واتە : ئێوەش شتێك ئەڵێن و مەبەستیشتان شتێکی ترە .. فەرمان بدەن تا ئەبوبەکر پێش‌نوێژیی بۆ موسڵمانان بکات .

ئەبوبەکر هات و ، پێغەمبەریش ﷺ سووك و سۆڵییەکی بە خۆیەوە دیی ، بۆیە خۆی دا بوو بەسەر دوو پیاودا و هاتە مزگەوتەوە .

راویی ئەڵێ : هەروەك ئێستە لەبەرچاومدا بێت هەردوو پێی بە زەوی‌یەکەدا ئەخشان .. کە ئەبوبەکر ئەوی بینیی ویستی بکشێتە دواوە ، ئەویش ئاماژەی بۆ کرد کە نوێژی خۆت بکە . ئەوەبوو ئەبوبەکر خوا لێی رازیی بێ کەمێ هاتە دواوە و ، پێغەمبەر ﷺ لە ئەنیشتی‌دا دانیشت و ئەبوبەکریش تەکبیری بە گوێی خەڵکەکەدا ئەدا ..[٤٠٦]

**حەوتەم : دواسانەکانی ژیانی ئازیزمان**

ئەبوبەکر خوا لێی رازیی بێ هەروا پێش‌نوێژیی بۆ موسڵمانان ئەکرد ، هەتا رۆژی دووشەممە هاتە بەرەوە . واتە ئەو رۆژەی کە ئازیزمان کۆچی دوایی کرد . هاوەڵان بۆ

---

[٤٠٥] مسلم : ١ / ٣٤٨ ، كتاب الصلاة رقم ( ٢٠٧ ) .

[٤٠٦] البخاري ، كتاب الأذان ، رقم ( ٧١٢ ) .

نوێژی فەجر ریزیان بەستبوو .. ئەیانویست نوێژ بەجێ بهێنن . لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ پەردەی حوجرەکەی خۆی لادا و ، سەیرێکی موسڵمانەکانی کرد کە بەو دیمەنە جوانەیانەوە لەبەردەم پەروەردگاردا وەستاون و ، پەیمانی خۆیان ئەبەنە سەر . سەرنجی دا وا سوپاس بۆ خوا بەرهەمی بانگەواز و جیهادەکەی بە شوێنی خۆی گەیشتووە و ، وا ئوممەتێك بە پەروەردەی قورئان پێ گەییوە و ، بە جوانیی و رێكوپێكیی نوێژ بۆ پەروەردگار بەجێ ئەهێنێ . تازە برپارە و داویانە تا خوای گەورە رازیی بکەن و ، دینە پاکەکەی بە گرۆی ئادەمیی بگەیەنن ..

چاوەکانی ئازیز بەم دیمەنە گەش گەش بوونەوە .. ئەمانە کۆمەڵە پیاوێکن بانگەوازەکەی بە هەموو قوژبنێکی جیهان ئەگەیەنن ..

چاوەکانی بەو سەرکەوتنە خوایی‌یە گەش بوونەوە کە سەرکەوتنی وەها بە هیچ پێغەمبەرێك نەدراوە .. دڵی لەوە بێخەم بوو کە ئەم کۆمەڵە موسڵمانە بە ژن و پیاوەوە پارێزگاریی لە هەموو شەعیرەیەکی ئەم ئیسلامە ئەکەن و ، ئەگەر پێغەمبەر ئازیزەکەشیان کۆچی دوایی بکات لەسەر خزمەتی خۆیان بەردەوام ئەبن و تا ئاخر زەمان دەستا و دەست بە هەموو کەسێکی ئەگەیەنن .

ئەوەندە خۆشیی و شادمانیی بە دڵی گەیشت دەم و چاوی وەك مانگی چواردە ئەگەشایەوە ..

هاوەڵانیش چاویان لە ئازیز بوو ، کە سەیری ئەکردن و ، دەم و چاوی وەك پەڕەی قورئان گەشابوویەوە و زەردەخەنەی ئەکرد .. هاوەڵان خەریك بوو لە خۆشیانا باڵ بگرنەوە ، وایان ئەزانیی بەشداریی نوێژ ئەکات . کەچیی ئاماژەی ئەوەی بۆ کردن کە نوێژی خۆیان بەجێ بهێنن و خۆی چووە ژوورەوە و ، پەردەکەی دادایەوە . دوای نوێژ هەندێ لە هاوەڵان چوون بەلای کاروباریانەوە و ، ئەبوبەکریش چووە ژوورەوە لای عائیشەی کچی و فەرمووی : وا ئەبینم کە پێغەمبەری خوا ﷺ نەخۆشی‌یەکەی بەری دابێ . ئەمڕۆش رۆژی کچی خاریجەیە . ـ مەبەستی لە یەکێ لە ژنەکانیەتی ، کە لە سونح [٤٠٧] دائەنیشت ـ ئیتر سواری ئەسپەکەی بوو و رۆیشتەوە بۆ ماڵەوە .

شایانی باسە کە لە رۆژی یەك شەممەدا پێغەمبەری خوا ﷺ بەندەکانی خۆی ئازاد کردن و ، حەوت دیناریشی بەلاوە بوو ، واتە حەوت مسقاڵ زێڕ و ، کردی‌یە صەدەقە و، چەك و تفاقەکەی جەنگیشی پێشکەش بە موسڵمانان کرد .

---

[٤٠٧] سونح : شوێنێك بوو لە دەرەوەی مەدینە کە ماڵێکی ئەبوبەکر لەوێ بوو ..

ئیتر کاتی نوێژێکی تر نەهات پێغەمبەری خوا ﷺ لە ژیان‌دا بێت .

نەخۆشی‌یەکە یەکجار ناڕەحەت بوو .. ئازیزمان کەوتە سەرەمەرگ .. ئوسامەی کوڕی زەید چووە ژوورەوە لای ئەبینێ توانای گفت و گۆی نەماوە ، هەر ئەوەندە دەستی بەرز ئەکردنەوە بۆ ئاسمان و پاشان ئەی‌خستنە سەر ئوسامە . ئەویش تێ گەیشت کە دوعای بۆ ئەکات .

خاتوعائیشە پێغەمبەری پاڵ دا بە خۆیەوە و سەری نایە سەر سنگی خۆی . هەتا ئەی‌وت : یەکێ لە نیعمەتەکانی خوا لەسەرم ئەوەبوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵی مندا و لە رۆژی خۆم‌دا و لەسەر سنگم گیانی دەرچوو و ، لە کاتی سەرەمەرگیا تفی هەردووکمان تێکەڵ بوون .

لەو کاتەدا عەبدوررەحمانی کوڕی ئەبوبەکر هاتە ژوورەوە و سیواکێکی بە دەستەوە بوو ، پێغەمبەری خواش سەیری ئەکرد . عائیشە وتی : وەری بگرم بۆت ؟ بە سەری ئاماژەی کرد بەڵێ . عائیشە لە براکەی وەرگرت و نەرمی کرد و دایە دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەویش بە جوانترین شێوە سیواکی پێ کرد . لەگەڵ ئەوەش‌دا هەر خەریك بوو و ، ئەی‌فەرموو : (( في الرفيق الأعلى )) . دەستیشی ئەخستە ناو دەفرێکەوە کە ئاوی تێدا بوو و ، دەم و چاوی پێ تەڕ ئەکرد و ، ئەی فەرموو : (( لا إله إلا الله ... إن للموت سكرات )) . ئەی فەرموو : بە راستی مەرگ ئێش و ئازاری زۆرە.. پاشان دەستی بە بەرزیی وەستاند و ئەی‌فەرموو : (( في الرفيق الأعلى ))، هەتا گیانی دەرچوو و دەستیشی شل بوو و خوار بوویەوە . لە لەفزێکی تردا ئەی‌فەرموو: (( أللهم أعني على سكرات الموت )) .[٤٠٨] ئەی فەرموو : خوایە ! لە کاتی گیان‌کێشان‌دا یارمەتیم بدەی ..

لە ریوایەتێکی تردا هاتووە کە عائیشە لە پێغەمبەری ﷺ بیستووە و گوێی بۆ گرتووە ، بەر لەوەی گیانی دەرچێ فەرموویە : (( أللهم اغفر لي ، وارحمني وألحقني بالرفيق الأعلى )) .[٤٠٩] داوای لێ‌خۆش‌بوون و رەحم و بەزەیی ئەکات و داواش ئەکات بە ( الرفيق الأعلى ) ی بگەیەنێ .

کاتێك کە پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ لە گیانەڵادا بوو و ، بە دەست گیان‌کێشانی سەختەوە گیری خواردبوو ، فاطیمە ئاگای لێ بوو ، بۆیە وتی : ((واكرب أباه)) .

---

[٤٠٨] الترمذي ، كتاب الجنائز ، رقم ( ٩٧٨ ) .

[٤٠٩] البخاري ، كتاب المغازي ، رقم (٤٤٤٠ ) .

فەرمووی : (( ليس على أبيكِ كرب بعد اليوم )) . فەرمووی : لەمڕۆ بە دواوە باوکت هیچ نارەحەتی‌یەکی لەسەر نامێنێ ..

کاتێکیش کە گیانی پیرۆزی لە لاشەی جیا بوویەوە فاطیمە وتی : (( يا أبتاه .. أجاب رباً دعاه.. يا أبتاه.. من جنة الفردوس مأواه .. يا أبتاه.. إلى جبريل ننعاه )).

ئەی‌وت : باوکە گیان .. بە دەم فەرمانی خواوە چووە کە بانگی کرد بۆ لای خۆی.. باوکە گیان .. ماوا و مەنزڵی لە بەهەشتی فیردەوسە .. باوکە گیان .. پرسە و سەرەخۆشیی لە جیبریل ئەکەین ..

کاتێکیش کە هاوەڵان لە ناشتنی ئازیزمان گەڕانەوە فاطیمە وتی : ئەی ئەنەس ! ئایا چۆن توانییتان خۆڵ بکەن بەسەر پێغەمبەری خوادا ﷺ ؟

گەڕانەوەی ئازیزمان ﷺ بۆ حزووری پەروەردگار لە کاتی چێشتەنگاودا بوو ، لە ڕۆژی دووشەممەی دوانزەهەمی ( ربيع الأول ) ی ساڵی یانزەی کۆچیی‌دا .. کە ئەوەبوو تەمەنی پیرۆزی شەصت و سێ ساڵ و چوار ڕۆژ بوو .[٤١٠]

**هەشتەم : گەورەترین موصیبەت**

بەڵێ ، پێغەمبەری خوا ﷺ کە حوکمی سەرانسەری دوورگەی ئەکرد و ، پادشا و دەسەڵاتدارانی دنیا لێی ئەترسان و ، هاوەڵانی کە هەزاران ئەبوون خۆیان و ماڵ و منداڵیان ئەکردە قوربانی ، ئەم دنیایەی بەجێ هێشت ، بەڵام دوای خۆی نە دینارێك و نە دیرهەمێکی بەجێ نەهێشت .. نە بەندەیەك و نە کەنیزەکێك ، نە هیچ شتێکی ئەم دنیایەی لە دوا بەجێ نەما جگە لە ئێسترە سپیی‌یەکەی و چەکەکەی و پارچە زەوی‌یەك کە کردنیە صەدەقە . کاتێك کە کۆچی دوایی کرد قەڵغانەکەی لەلای پیاوێکی جوولەکە بە ڕەهن ( بارمتە ) دانا بوو لە بریی سیی مەن جۆ .

بە ڕاستیی لێ‌قەومانێکی گەورە بوو .. موسڵمانەکان کۆستێکی گەورەیان کەوت.. یەکەم ڕۆژی ڕەش بوو کە بەسەر موسڵمانان‌دا بێت و ، مەینەتێکی ناهەمواریش بوو بۆ مرۆڤایەتیی ..

ئەنەس خوا لێی ڕازیی بێ ئەڵێت : ئەو ڕۆژەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هێنایە مەدینە هەموو شتێکی ڕووناك بوویەوە . بەڵام ئەو ڕۆژەی کە کۆچی دوایی کرد هەموو شتێکی تاریك بوو .

---

[٤١٠] ئەمە لە ( الرحيق المختوم ) دا هاتووە ، بەڵام لای ( علي محمد محمد الصلابي ) دوای زەوال بووە .. لەلای ( أبوشهبة ) ش ڕاست‌تر ئەوەیە لە ڕۆژی یەکەمی ( ربيع الأول ) دا کۆچی دوایی کردووە ..

ئوم ئەیمەنیش کە شیری پێ دا بوو ئەگریا و شیوەنی ئەکرد ، کە پێیان ئەوت : بۆچ ئەگریت بۆ پێغەمبەر ؟ ئەیوت : خۆ من زانیومە پێغەمبەری خوا ﷺ رۆژێك دێت بمرێ ، بەڵام من بۆ ئەو وەحی‌یە ئەگریم کە لێمان سەندرایەوە .

ئیبن رەجەب وتوویە : کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد موسڵمانەکان شڵەژان . هی وایان هەبوو سەرسام بووبوو و قسەی تێکەڵ و پێکەڵی ئەکرد و ، هی وایان هەبوو دانیشتبوو و نەی‌ئەتوانیی هەستێتە سەر پێ و ، هی وایان هەبوو زمانی لاڵ بوو بوو و نەی‌ئەتوانیی قسە بکات و ، هی واشیان هەبوو بە یەکجاریی ئینکاریی مردنی ئەوی ئەکرد .[٤١١]

بە کۆچی دوایی ئازیزمان ﷺ موسڵمانەکان تووشی گەورەترین موصیبەت بوون . بۆیە هەموو بە جارێ سەرسام بوو بوون . هەتا عومەری سەردارمان خوا لێی رازیی بێ وەها شپرزە بوو بوو ، هۆشی بە خۆیەوە نەمابوو .. ئەوەندەی بە لاوە گران بوو هەڕەشەی لەو کەسانە ئەکرد کە ئەیان‌وت کۆچی دوایی کردووە و ، ئەی‌فەرموو : نەمردووە ، بەڵکو بە وێنەی مووسای کوڕی عیمران ، کە چل شەو لەلای قەومەکەی دیار نەما و دواییش گەڕایەوە ، ئەمیش چووە بۆ لای پەروەردگاری . بەخوا وەك مووسا گەڕایەوە پێغەمبەری خواش ئەگەڕێتەوە ، ئەو کاتەش دەست و پێی کۆمەڵە پیاوێك ئەبڕێت کە وایان ئەگەیاند ئەو مردووە .

کە ئەبوبەکر هەواڵەکەی بیست لە سونحەوە بە سواری ئەسپێك هات ، خۆی گەیاندە مزگەوت ، بێ‌ئەوەی هیچ کەسێك بدوێنێ ، راستەوخۆ چوو بۆ ژوورەکەی عائیشە و ، رووی لە پێغەمبەری خوا ﷺ نا کە بە پارچە قوماشێك داپۆشرا بوو .. دەم و چاوی لادا و ، خۆی بەسەریدا چەماندەوە و ، ماچی کرد و ، دەستی بە گریان کرد . پاشان فەرمووی : دایك و باوکم بە قوربانت بن ، بەخوا هەرگیز خوا دوو جار نات مرێنێ . ئەو مەرگەی کە لەسەرت پێویست بوو ئەوا چەشتت .[٤١٢]

ئەبوبەکر چووە دەرەوە ئەبینێ وا عومەر وتار ئەدات . هەستی کرد عومەر هۆشی بە خۆیەوە نەماوە و ، بڕیارەکانی لە جێی خۆیاندا نین . بۆیە فەرمانی بەسەردا دا کە دابنیشێ ، کەچیی عومەر وەها گەرم بوو بوو و ، وەهاش هەڵ چوو بوو فەرمانەکەی

---

[٤١١] لطائف المعارف : ١١٤ .

[٤١٢] البخاري ، كتاب المغازي ، رقم ( ٤٤٥٢ ) .

ئەبوبەکری نەئەبیست . ئەبوبەکر ناچار بوو دەست بە وتاردان بکات . دوای سوپاس و ستایشی خوای گەورە فەرمووی :

أما بعد : هەرکەس موحەممەدی ئەپەرست ، ئەوا موحەممەد مرد و ، هەرکەسیش خوای ئەپەرست ، ئەوا خوا زیندووە و نامرێ . پاشان ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوێندەوە:

﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِين مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴾ ( آل عمران : ١٤٤ ).

ئایەتەکە باسی دامەزراویی ئیمانداران ئەکات لەسەر دین ، بەلاّم ئاماژەشی تێدایە کە پێغەمبەری خوا ﷺ مرۆڤە و ئەویش ئەمرێ ..

عومەر ئەفەرموێ : دە بەخوا کە گوێم لێ بوو ئەبوبەکر ئایەتەکەی خوێندەوە ئەژنۆم وشك بوون و ، خۆمم بە پێوە بۆ نەئەگیرا .. کە گوێم لە خوێندەوەی بوو کەوتمە سەر زەویی : ئیتر زانیم پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کردووە .[٤١٣]

ئیمام ( قرطبي ) لە تەفسیرەکەی‌دا ئاماژە بۆ ئازایەتیی و چاونەترسیی صدديق ئەکات ، چونکە ئەم دوانە ئەبنە مایەی دامەزراویی دڵ تا بەرگەی بەلاّ و موصیبەت بگرێ . دیارە موصیبەتیش نیە لە کۆچی دوایی ئازیزمان گەورەتر بێت . ئا لێرەدا ئازایەتیی و زانستی یەکەم قوتابیی ئیسلام دەرئەکەوێ . چونکە خەڵکەکە وایان دەرئەبڕیی کە پێغەمبەری خوا ﷺ نەمردووە ، عوثمانیش زمانی لە گۆ کەوت و ، عەلییش خۆی شاردەوە . بەلاّم حەزرەتی صدديق بەم ئایەتە ترازووەکەی راست کردەوە.

بەڵێ صدديقی ئەکبەر هەمیشە لە هەموان تێگەیشتووتر بووە .. لەبەر هێزی ئیمانی هیچ ئیماندارێك نەی‌توانیوە پێشی بداتەوە !!

ئیبن عەبباسیش ئەڵێت : دە بەخوا هەروەك ئەو خەڵکە ئاگادار نەبووبن کە خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردۆتە خوارەوە هەتا ئەبوبەکر خوێندیەوە .. خەڵکەکە هەر هەموو لێیان وەرگرت و ، هەر کەسم ئەدیی گوێم لێ بوو ئایەتەکەی ئەخوێند ..

**نۆهەم : هەڵبژاردنی ئەبوبەکر**

لەناو ئەم هەموو خەفەتەدا : خەفەتی کۆچی ئازیزمان ، لەسەر کاری خەلافەت خەریك بوو موسڵمانان تێك بچن .. هەر یەکە بە بۆچوونێك کە بە حەقی ئەزانیی

[٤١٣] البخاري : كتاب المغازي ، رقم ( ٤٤٥٤ ) .

ئەجوولایەوە .. لە کەپری نەوەی ساعیدە ئەنصار کۆبوونەوە و ، عـەلیی و طـەلحـە و زوبەیریش لە ماڵی فاطیمە کۆ بوونەوە . موهاجیرەکان لە دەوری ئەبوبەکر کۆ بوونەوە و ، ئوسەیدی کوڕی حوضـەیریش گەورە پیاوی ئەوس ، لە نەوەی عەبدولئەشهەل دوای سەعدی کوڕی موعاذ ، هاتە پاڵ ئەبوبەکر ..

عومەر بە ئەبوبەکری فەرموو : هەسـتە بـا بچـین بـۆ لای بـرا ئەنصـارەکانمان .. ئەوانیش هاتن بۆ کـەپری نـەوەی سـاعیدە .. دیتیـان وا سـەعدی کـوڕی عوبـادەی سەرۆکی خەزرەج لەوێ کەوتووە و نەخۆشە .

سەرەتا وتاردەرێکی ئەنصار وتاری دا کـە ئـەوەی ئەگەیانـد نایانـەوێ کاروبـاری دەوڵەت لـە دەستی خۆیان دەربچێت . خەریك بوو عومـەر وتـار بـدات و وەڵامیـان بداتەوە ، بەڵام ئەبوبەکر نەیهێشت ، چونکە هەڵوێستەکە نەرمتری ئەویست . پاشان ئەبوبەکر خۆی وتاری دا . عومەر ئەوەی دەربڕیی کە هەر بابـەتێك ئـەو پێـی خـۆش بووە باسی بکات ئەبوبەکر بە جوانتر باسی کردووە .

ئەمەش فەرمایشتەکەی ئەبوبەکر خوا لێی رازیی بێ :

(( یـا أیهـا النـاس ! نـحن المهـاجرین أول النـاس إسـلامًا ، وأکـرمهم أحسـابًا، وأوسطهم دارًا ، وأحسنهم وجوهًا ، وأکثرهم ولادة في العـرب ، وأمسـهم رحمـا برسـول الله . أسلمنا قبلکم، وقُدِّمنا في القرآن علیکم، فقال تبارك و تعالی : ﴿ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٍ ﴾ فـنحن المهـاجرون وأنـتم الأنصار إخواننا في الدین ، وشرکاؤنا في الفيء ، وأنصارنا علی العدو ، أما مـا ذکـر فیکم من خیر فأنتم له أهل ، فأما العرب فلـن تعرف هـذا الأمـر إلا لهـذا الحـي مـن قریش ، فمنا الأمراء ومنکم الوزراء )) .

دای بە گوێیان‌دا کە موهاجیرەکان لە پێشی ئەنصارەوەن : بە زوو موسڵمان بوون.. بە حەسەب و نەسەب .. بە نزیکیی لە پێغەمبەری خواوە و ، لـە قورئـانیش‌دا نـاوی موهاجیرەکان لە پێشەوە هاتووە . بـەڵێ ئـەوان پشـتیوانی دینـی خـوا بـوون و دژی دوژمنان وەستان و ، خێر و چاکەی زۆریان تێدایە ، بەڵام عەرەب ئەم کارە بـە کـاری هۆزی قورەیشی ئەزانن و بۆ ئەوانیش مـل کەچـیی ئەکـەن . کەواتـە بـا ئـەمیر لـە قورەیش بێت و وەزیریش لە ئەنصار ..

هەندێ ویستیان کارەکە تێك بدەن ، بەڵام عومەر کە دەنگێکی بەرزی هەبوو، هەستا و داوای لە ئەبوبەکر کرد کە دەستی بهێنێ تا بەیعەتی پێ بدا . ئەویش دەستی کردەوە و عومەر بەیعەتی پێ دا .. پاشان عومەر دای بە گوێی ئەنصاردا کە هەموویان ئەزانن پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی داوە بە ئەبوبەکر نوێژ بۆ موسڵمانەکان بکات ، جا کێ دڵی بەوە ئاو ئەخواتەوە کە پێشی ئەبوبەکر بکەوێ ؟

بەم فەرمایشتە رێکانە دڵی خەڵکەکە خۆش بوو .. سەرەتا موهاجیرەکان هەستان و بەیعەتیان بە ئەبوبەکر دا و ، دوای ئەوانیش ئەنصار هەستان و بەیعەتیان دا . بەمە خوای گەورە ئەو کۆمەڵە پاکەی لە پەرتەوازەیی پاراست و ، لەبەر ئەوەش کە شیاو بوون ، رایان هاتە سەر هەڵبژاردنی چاکترینیان کە ئەبوبەکری صدیق بوو خوا لێیان رازیی بێ .

ئەمە لە رۆژی دووشەممەدا رووی دا ..

لە رۆژی دووهەمدا ئەبوبەکر و عومەر و هاوەڵان هاتنە مزگەوت تا بە شێوەیەکی گشتیی موسڵمانان بەیعەت بە ئەبوبەکر بدەن . ئەوەبوو سەرکەوتە سەر مینبەر و، عومەریش لەبەر دەستیا وتاری ئەدا .. دوای سوپاس و ستایشی خوای گەورە فەرمووی : (( أيها الناس ! كنت قلت لكم بالأمس مقالة ما كانت ولا وجدتها في كتاب الله ، ولا كانت عهدًا عهدها إليّ رسول الله ، ولكني كنت أرجو أن يعيش رسول الله ﷺ حتى يدبرنا ـ يكون آخرنا ـ فإن يك محمدٌ قد مات فإن الله جعل بين أظهركم نورًا تهتدون به ، فاعتصموا به تهتدوا ، وإن أبابكر صاحب رسول الله ﷺ ثاني اثنين إذ هما في الغار ، فإنه أولى المسلمين بأموركم ، فقوموا إليه فبايعوه )) .

پێی راگەیاندن کە دوێنێ باسێکی کردووە لە قورئاندا نەیدیوە و فەرمانی پێغەمبەری خوایش نەبووە و ، پێیشی خۆش بووە پێغەمبەری خوا ﷺ تا دوای هەموان بمایە . بەڵام کە ئێستە ئەو کۆچی دوایی کردبێ ، وا قورئانی پیرۆز لەلایەن خواوە خەڵاتیان کراوە و ، ئەگەر شوێنی بکەون رێی راست ئەدۆزنەوە . ئەبوبەکریش هاوەڵی پێغەمبەری خوایە کە لە ئەشکەوتەکەدا بە جووتە پێکەوە بوون ، لەبەر ئەوە بۆ هەڵسووڕاندنی کاروباری موسڵمانان لە هەموو کەسێك لە پێشترە . داواشی لێ کردن هەر هەموو هەستن و بەیعەتی پێ بدەن .

موسڵمانەکان هەر هەموو هەستان و بەیعەتی گشتی‌یان پێ دا ..[٤١٤]

---

[٤١٤] صحيح البخاري ، كتاب الأحكام ، باب الإستخلاف .

دوای بەیعەتی گشتیی ئەبوبەکر خوا لێی رازیی بێ سەرنجی دا زوبەیری بەرچاو نەکەوت . ناردی بە دوایدا و هات ، پێی فەرموو : (( إبن عمة رسول الله وحواريّه أردت أن تشق عصا المسلمين ؟! )) . وتی : هیچ سەرزەنشتێکی ناوێ ، ئەی خەلیفەی پێغەمبەری خوا . هەستا و بەیعەتی پێ دا ..

پاشان سەیری کرد عەلییشی بەرچاو نەکەوت . ناردی بە دوای ئەویشدا و هات. پێی فەرموو : (( إبن عم رسول الله وختنه على ابنته أردت أن تشق عصا المسلمين؟! )). ئەویش فەرمووی : هیچ سەرزەنشتێکی ناوێ ، ئەی خەلیفەی پێغەمبەری خوا. هەستا و بەیعەتی پێ دا ..

ئەمە راستیی بەیعەتی ئیمام عەلیی یە بۆ ئەبوبەکری صدیق خوا لێیان رازیی بێ، لە دووهەم رۆژدا بەیعەتی داوە . ئەوەش کە ئەوترێ دوای شەش مانگ بەیعەتی پێ داوە ، ئەوە بۆ نوێکردنەوەی بەیعەتەکە بووە .[٤١٥]

دوای تەواوبوونی بەیعەت خەلیفە وتارێکی بۆ موسڵمانان دا و ، تیایا دەری خست کە چەندە ئاگاداری دینی خوایە و چەندیش توانای هەڵسووڕاندنی کاروباری موسڵمانانی هەیە . ئەوەبوو دوای دەربڕینی سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە فەرمووی :

(( أيها الناس ! فإني قد وُلِّيتُ عليكم ولست بخيركم ، فإن أحسنت فأعينوني ، وإن أسأت فقوموني . الصدق أمانة ، والكذب خيانة ، والضعيف فيكم قوي عندي حتى أريح عليه حقه إن شاء الله ، والقوي فيكم ضعيف عندي حتى آخذ الحق منه إن شاء الله . لا يدع قوم الجهاد في سبيل الله إلا ضربهم الله بالذل . ولا تشيع الفاحشة في قوم إلا عمهم البلاء . أطيعوني ما أطعت الله ورسوله ، فإن عصيت الله ورسوله فلا طاعة لي عليكم ، قوموا إلى صلاتكم يرحمكم الله )) .

ئاگاداری کردن کە هەتا چاکە ئەکات کۆمەکیی بکەن و ، گەر خراپەشی کرد و لە شەرع لای دا راستی بکەنەوە . راستگۆیی ئەمانەتە و ، درۆزنییش ناپاکی یە . خەلیفە بە توندیی دای بە گوێی هەمواندا کە هەر کەسێ لاواز و کەمدەسەڵات بێ بەلای خەلیفەوە بەهێزە هەتا هەموو مافێکی بۆ وەر بگرێتەوە و ، هەرکەسیش بەهێز بوو بەلایەوە لاوازە هەتا هەموو مافێکی خەڵکی لێ بسەنێتەوە ، ئەمەش بە پشتیوانیی خوا .. هەڕەشەی کرد کە هەر کۆمەڵێك واز لە جیهادی پێناوی خوا

[٤١٥] البداية والنهاية : ٥ / ٢٥ .

بهێنن خوا زەلیلیان ئەکات و ، هەر کۆمەڵێکیش داوێن پیسیی و بەدڕەوشتی‌یان تێدا بڵاو ببێتەوە خوا بەلاّیان بەسەردا ئەبارێنێ . دیسان دووبارەی کردەوە کە ئەوەندە گوێڕایەڵیی فەرمانەکانی بکەن کە ئەویش گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر بێت .

ئەمانە خاڵی گرنگن بۆ دامەزراندنی حکومەتێکی کەڵك بەخش ، بۆیە ئەبوبەکری داد و یەکسانیی جەختی لەسەر ئەکردنەوە ..

**دەهەم : شۆردن و کەفەن و نوێژ**

دوای ئەوەی کە بەیعەت بە ئەبوبەکر درا ، موسڵمانەکان گرفتیان نەما ، بەوەی کە بوونە خاوەنی ئەمیر ، تا بزانن چۆن کار بکەن و بە گوێی کێ بکەن و ، بە تەمای کێ بن . ئیتر ئەوەبوو لە ڕۆژی سێشەممەدا ئاوڕیان بە لای پێغەمبەرەوە دا هەتا بی‌نێژن ، دیارە بە فەرمان‌وەرگرتن لە خەلیفە ئەبوبەکر .

ئەوەبوو لە کەس‌وکاری ئازیز عەبباس و عەلیی و فەضل و قوثەم بۆ شۆردنی ئامادە بوو بوون . هەروەها ئوسامەی کوڕی زەید و صالحی بەندەی ئازادکراوی پێغەمبەر ئامادە بوون و ، دوای مۆڵەت‌وەرگرتنیش ئەوسی کوڕی خەولیی ئەنصاریی ئامادە بوو .

عائیشە ئەڵێت : کە ویستیان پێغەمبەر ﷺ بشۆن ، وتیان : نازانین ئایا بە وێنەی مردوانمان جلەکانی دابکەنین ، یان جلەکانی لەبەردا بن و بی‌شۆین . کە رایان یەکی نەگرت خوا خەوی پیاخستن بە رادەیەك کە هەر هەموویان زنجی نووسا بە سنگیەوە و، لە لایەکی ماڵەکەوە یەکێ قسەی لەگەڵ ئەکردن و ، نەشیان ئەزانیی کێیە و ئەی‌وت: پێغەمبەری خوا ﷺ هەر بە جلەکانیەوە بشۆن . بەمە بڕیاریان دا کراسەکەی لەبەردا بێت و ئاوی بەسەردا بکەن و دەست بەسەر کراسەکەدا بهێنن .

عائیشە خوا لێی رازیی بێ ، دوایی کە باسەکە ئەگێڕێتەوە پەشیمانیی خۆی دەر ئەبڕێ کە ئەگەر ئەوەی ئێستە ئەی‌زانێ ، ئەو کاتە بیزانیایە نەی‌ئەهێشت پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ کەسێك بیشوا جگە لە هاوسەرانی .[٤١٦]

---

[٤١٦] المستدرك للحاكم : ٣ / ٥٩ ، ٦٠ ، وقال صحيح الإسناد على شرط مسلم ولم يخرجاه ، ووافقه الذهبي ، وصححه إبن حبان .

بۆ شۆردنیشی عەلیی پێغەمبەری پاڵ دابوو بە سنگی خۆیەوە و کراسەکەشی لەبەردا بوو و خەریك بوو ئەیشۆرد و عەبباس و هەردوو کوڕەکەشی یارمەتی‌یان ئەدا و ، ئوسامە و صالحیش ئاویان بە دەستیان‌دا ئەکرد . شۆردنەکەشی بە ئاو و سیدر بوو، کە رووەکێکی بۆن خۆش بووە و لە جیاتی صابوون بەکاریان هێناوە . ئەمەش لە رۆژی سێ‌شەممەدا بووە .

ئەوەندە لاشەی پیرۆزی رێك و پێك بوو عەلیی ئەی‌فەرموو : دایك و باوکم بە قوربانت بن بە مردوویی و بە زیندوویی چەند پاك و خاوێنی !

دوای ئەوەی‌کە لە شۆردنی بوونەوە بەسێ کراسی سپیی سەحوولیی یەمەنیی لە لۆکە چنراو کەفەنیان بۆ کرد .

دوای ئەوە خستیانە سەر چارپاکەی لە ژوورەکەی‌دا . تا موسڵمانان نوێژی لەسەر بکەن .

ئیبن عەبباس خوا لێیان رازیی بێ ئەڵێت : کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد ، پیاوان کرانە ژوورەوە و ، دەستە دەستە بەبێ ئیمام نوێژیان لەسەر کرد . کە ئەوان لێ بوونەوە ، ژنانیش کرانە ژوورەوە و نوێژیان لەسەر کرد و پاشان منداڵانیش کرانە ژوورەوە و نوێژیان لەسەر کرد و ، پاشان بەندەکانیش کرانە ژوورەوە و نوێژیان لەسەر کرد ، بێ ئەوەی هیچ کەس ئیمامەتیان بۆ بکات .[٤١٧]

ئیبن کەثیریش دەری بڕیوە کە نوێژکردن لەسەری بە تەنیا و بەبێ ئیمام کارێکە موسڵمانان لەسەری یەك دەنگن و جیاوازی‌یان نیە ..[٤١٨]

لە ( الرحيق المختوم ) دا هاتووە کە دەکەس دەکەس چوونەتە ژوورەوە و سەرەتا کەس‌وکاری و ، پاشان موهاجیران و ، پاشان ئەنصار و ، دوای پیاوان ژنانیش نوێژیان لەسەر کردووە و ، پاشانیش منداڵان .

**یانزەهەم : ناشتنی**

کە نوێژی لەسەر کرا ویستیان بی‌نێژن . بۆ ناشتنی هەر یەکە شوێنێکی پێ باش بوو . هەندێ پێ‌یان باش بوو لە ناو مزگەوت‌دا و ، هەندێکیش بەقیعیان پێ باش بوو و ، هەندێکیش لە ماڵەکەی‌دا . بەڵام ئەبوبەکر خوا لێی رازیی بێ ئەو ناکۆکی‌یەشی نەهێشت.

---

٤١٧ دلائل النبوة : ٧ / ٢٥٠ ، وسنن إبن ماجه ، رقم : ١٦٢٨ ، والحديث فيه ضعف .

٤١٨ البداية والنهاية : ٥ / ٢٣٢ .

عائیشە و ئیبن عەبباس خوا لێیان رازیی بێ وتوویانە : كاتێ كە پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی كرد و شۆردرا ، دەربارەی شوێنی ناشتنی ناكۆكیی كەوتە نێو موسڵمانان. ئەبوبەكر فەرمووی : ئەوەی كە لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە هێشتا لەبیرم نەچۆتەوە كە ئەی‌فەرموو : (( ما قبض الله نبيًا إلا في الموضع الذي يجب أن يدفن فيه )). فەرموویە : خوای گەورە گیانی هەموو پێغەمبەرێكی لەو شوێنەدا كێشاوە كە پێویستە تیایا بنێژرێ . كەواتە پێغەمبەری خوا لە شوێنی نوێنەكانی‌دا بنێژن .[419]

جا هەرچەندە لەسەر صەحیحیی ئەم فەرموودەیە جیاوازیی هەیە ، بەڵام موسڵمانەكان دەربارەی ناشتنی پێغەمبەر ﷺ لەو شوێنەدا كە تیایا وەفاتی كردووە یەك‌دەنگن .[420]

ئیبن كەثیریش دەری بڕیوە كە بە تەواتور ریوایەت كراوە پێغەمبەر ﷺ لە حوجرەكەی عائیشەدا نێژراوە و ، پاشان ئەبوبەكر و عومەریش خوا لێیان رازیی بێ لەوێ نێژراون ..

شایانی باسە كە ئەبوعوبەیدەی جەرڕاح قەبری بۆ دانیشتوانی مەككە هەڵ ئەكەند، بەڵام لە شێوەی ( شق ) دا واتە چاڵكردنی ناوەڕاستی قەبرەكە و ، ئەبوطەلحەی ئەنصارییش قەبری بە شێوەی ( لحد ) بۆ دانیشتوانی مەدینە هەڵ ئەكەند، كە بریتی‌یە لە چاڵكردنی لاتەنیشتی قەبرەكە . جا عەبباس دوو پیاوی نارد بە دوایان‌دا . یەكێ لە پیاوەكان ئەبوعوبەیدەی نەدیتەوە ، بەڵام ئەوی تر ئەبوطەلحەی دۆزی‌یەوە و هێنای بە شێوەی ( لحد ) قەبری وەك دانیشتوانی مەدینە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵ كەند . ئەوەبوو عەبباس و عەلیی و قوثەم و فەضل و شەقران و ئەوس دابەزینە ناو قەبرەكەوە . شەقران كە بەندەی ئازادكراوی پێغەمبەری خوا بوو قەدیفەیەكی لەبەردا بوو دای‌كەند و لەناو قەبرەكەدا رای خست بۆ پێغەمبەر ﷺ و وتی : بەخوا دوای تۆ كەس لەبەری ناكات .

هاوەڵان بە خەم و خەفەتێكی زۆرەوە گڵیان‌دا بەسەر ئازیزیان‌دا .. پاشان ئاوڕشێنیان كرد ، ئەمەش لە شەوی چوارشەممەدا بوو .. كە ئەبوبەكریش كۆچی دوایی كرد لە تەنیشتیا ناشتیان و ، جێی قەبرێكی تریش مابوویەوە و عائیشە هەڵی

---

[419] صحيح السيرة النبوية : ٧٢٧ .
[420] مرض النبي ووفاته : ١٦٠ .

گرتبوو بۆ خۆی . کە عومەر زامدار کرا وەسیەتی کرد ئەگەر مرد بچنە لای خاتو عائیشە و مۆڵەتی لێ وەربگرن تا لەلای هەردوو هاوەڵەکەی‌دا بی‌نێژن . ئەوەبوو ئەویش مۆڵەتی دا و فەزڵی عومەری دا بەسەر خۆی‌دا . بەمە خەوەکەی خاتو عائیشەش هاتە دیی کە لە خەوی‌دا دیی بووی سێ مانگ کەوتوونەتە ژوورەکەیەوە . بەڵێ ، ئەو سێ مانگە ئەو سێ مرۆڤە بەڕێزە بوون کە ئاڵای ئازادیی مرۆڤیان هەڵ کرد . سەرزەوی‌یان پڕ لە داد و یەکسانیی کرد .. سەرزەوی‌یان بە نووری ئیمان و ئیسلام رووناك کردەوە .. بناغەی شارستانیەتی راستەقینەی مرۆڤیان دانا ..

سەرەتا ئەم سێ قەبرە لە دەرەوەی مزگەوت‌دا بوون ، هەتا سەردەمی وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك هاتە بەرەوە و ، عومەری کوڕی عەبدولعەزیزیش والیی مەدینە بوو . وەلید فەرمانی دا بە عومەر تا مزگەوتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو لایەکەوە گەورە بکات . بۆ ئەمە ناچار بوون حوجرەکانی هاوسەرانی پێغەمبەر بخەنە سەر مزگەوت ، کە یەکێ لەو حوجرانەش حوجرەکەی عائیشە بوو . بەمە هەر سێ قەبرەکە کەوتنە ناو مزگەوتەوە . بەڵام بۆ ئەوەی عەوام بەرەو رووی قەبرەکان نوێژ نەکەن ، کاربەدەستان دیوارێکی بەرزیان لە رووی قەبرەکان‌دا بنیات نا هەتا لە خەڵکەکەوە دەرنەکەون ، پاشان لە هەردوو گۆشەی باکووری حوجرەکەوە دوو دیواریان بنیات نا و ، خواریشیان کردنەوە هەتا ئەوەبوو لە شێوەی سەری سێ گۆشەدا لە باکوورەوە بە یەك گەیشتن ، ئەمەشیان بە پێی ئەو ئاگادارکردنەوەیەی پێغەمبەری خوا ئەنجام دا کە لە دوا نەخۆشیی‌دا فەرمووی و ، چەند جاریش دووبارەی کردەوە : (( لعن الله اليهود والنصارى ، اتخذوا قبور أنبيائهم مساجد )) .

**دوانزەهەم : بەڕێکردنی سوپای ئوسامە**

یەکەم کارێك کە خەلیفە ئەبوبەکر خوا لێی رازیی بێ دوای ناشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنجامی دا بریتیی بوو لە بەڕێکردنی سوپای ئوسامە ، کە ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ جەختی لەسەر ناردنی ئەکردەوە . جا هەر چەندە هەندێ لە هاوەڵان وایان بە چاك ئەزانیی کە لەم کاتە ناسکەدا ئەم سوپایە بەڕێ نەکرێ ، بەڵکو بۆ پاسەوانیی مەدینە بهێڵرێتەوە و ، هەندێکیش ئاماژەیان بۆ ئەوە ئەکرد کە فەرماندەیەکی تری بە تەمەن لە جێی ئوسامە بکرێتە ئەمیری سوپا و ، ئوسامەش خۆی پێی خۆش بوو لەلای خەلیفە بە خۆی و سوپاکەیەوە بمێنێتەوە ، خەلیفە گوێی

بە هیچ نەدا و ، بڕیاری دەرچوونی سوپای دا .. ئەوەبوو سوپا لە جورف بەڕێ كرا و ئوسامەش ئەمیری بوو . خەلیفە خۆی كەوتە گەل سوپا تا ڕەوانەیان بكات .. خەلیفە بە پێ ئەڕۆیشت و ئوسامەش لە تەنیشتیا سوار بوو بوو .. ئوسامە شەرمی ئەم هەڵوێستەی ئەكرد ، بۆیە وتی : ئەی خەلیفەی پێغەمبەری خوا ! یا تۆش سواری وڵاغ ئەبیت ، یا منیش دائەبەزم . فەرمووی : نە تۆ دائەبەزیی و نە منیش سوار ئەبم. با منیش سەعاتێك لە پێناوی خوادا قاچم تۆزاویی بن !!

خەلیفە خواحافیزیی لە ئوسامە و سوپاكەی كرد و ، كە ویستی بگەڕێتەوە پێی فەرموو : ئەگەر بە چاكی ئەزانی بە هێشتنەوەی عومەر لەلام یارمەتییم بدە . ئوسامەش مۆڵەتی عومەری دا ..

ئەوانەش كە بە ئەمیریی ئوسامە ناڕەحەت بوون ، كە ئەو كردەوانەی خەلیفەیان دیی ، بێدەنگ بوون و دڵیشیان ڕازیی بوو .

ئەوەبوو ئوسامە ڕۆیشت هەتا گەیشتە بولقا و سنووری شام .. هەڵمەتی بردە سەر دوژمنان و تۆڵەی باوكی و شەهیدانی ئیسلامی لێ كردنەوە .. پاشان بە سەركەوتوویی و بە سەری بەرزەوە ، دوای ڕازیی كردنی خوا و ، پێغەمبەرەكەی و خەلیفەكەی ، گەڕایەوە مەدینە .[٤٢١]

سوپاس بۆ خوای مەزن لە ١٧ / شەعبانی ساڵی ١٤٢٦ كۆچیی بەرامبەر بە ٢١ / ٩ / ٢٠٠٥ زایینیی لە نووسینی ئەم ژیانە پیرۆزەی ئازیزمان ﷺ بوومەوە ..

حبيب محمد سعيد

سلێمانیی ـ مامەیارە

---

[٤٢١] السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٥٨٥ ـ٦٠٠ ، السيرة النبوية لعلي محمد محمد الصلابي : ٨٨٠ ـ ٨٩٢ ، الرحيق المختوم : ٤٧٨ ـ ٤٨٦ ، السيرة النبوية للندوي : ٤٠١ ـ ٤١٤ .

# ناوەرۆك

# بەرهەمەکانی نووسەر

أ - زنجیرەی هاوەڵانی پێغەمبەر :

١. عومەیری کوڕی سەعد
٢. نوسەیبەی کچی کەعب
٣. عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف
٤. عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود
٥. ئەبو ئەییووبی ئەنصاریی
٦. خوبەیب و سەعید
٧. زەیدی کوڕی سەهل
٨. عەبدوڵڵای کوڕی حوذافە
٩. خەببابی کوڕی ئەرەت
١٠. بەڕائی کوڕی مالیك
١١. ئەبوسەعیدی خودری
١٢. عومەیری کوڕی وەهب
١٣. ـ ١٧ دەستەیەك لە شەهیدان
١٨. زەیدی کوڕی حاریثە
١٩. ڕەبیعەی کوڕی کەعب
٢٠. سەعیدی کوڕی زەید
٢١. سوراقەی کوڕی مالیك
٢٢. ڕەملەی کچی ئەبوسوفیان
٢٣. طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا
٢٤. عەبدوڵڵای کوڕی سەلام
٢٥. سەلەمەی کوڕی قەیس
٢٦. عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل
٢٧. عەدیی کوڕی حاتیمی تەی
٢٨. ثابیتی کوڕی قەیسی ئەنصاریی

٤. فرمێسکی شادیی (٣)

٥. چاوپۆشیی

و ـ زنجیرەی ذیکری خواناسان :

١. بەرگی یەکەم

٢. بەرگی دووەم

٣. بەرگی سێیەم

٤. بەرگی چوارەم

ز ـ زنجیرەی تیشکێ لە قورئانەوە:

١. ڕۆژان ڕۆژیان لە دوایە

٢. کۆمەڵی پایەدار

ح ـ چەند چەپکێ بیرەوەریی سەبارەت بە مامۆستا سەعیدی نوورسیی :

١. چەپکی یەکەم / بیرەوەریی پیاوان

٢. چەپکی دووەم / بیرەوەریی ئافرەتان

ط ـ زنجیرەی ناوازەیی بیری مامۆستا نوورسیی :

١. هاوبەشیی لە کاری قیامەتییدا

٢. پەیامەکانی نوور و یەکبوونی موسڵمانان

٣. حیکمەتی ژن نەهێنانی

٤. کارمەندانی پاکژیی

٥. هۆی ڕواڵەتیی و هۆی ڕاستەقینە

٦. هەشت خاڵ

ي ـ زنجیرەی ژیاننامەی خەلیفە راشیدەکان :

١. ئەبوبەکری صددیق

٢. عومەری کوڕی خەططاب

٣. عوثمانی کوڕی عەففان

٤. عەلیی کوڕی ئەبوطالیب

٥. عومەری کوڕی عەبدولعەزیز

کورتە ژیاننامەی هەر چوار خەلیفە راشیدەکە

ك ـ وەرگێڕانی پەیامەکانی نوور :

١. رابەری خزمە ت
٢. موعجیزاتی ئەحمەدیی
٣. پەیامی بیماران
٤. پەیامی پیران
٥. پەیامی ئیخلاص و برایەتیی
٦. پەیامی وتە بچووکەکان
٧. مافی دایك و باوك
٨. لەگەڵ پێشەوای ئارامگراندا
٩. پلیکانەی سوننەت و دەرمانی دەردی بیدعەت
١٠. پەیامی بەهەشت

ل ـ وەرگێڕانی بەرهەمەکانی مامۆستا محمد فتح الله گولەن :

١. مجموعة الأدعية المأثورة / ذیکری بەیانیان و ئێوارانی چاپ کراوە
٢. ئیرشاد و تەبلیغ

م ـ بەرهەمە عەرەبیەکانی نووسەر :

١. کیف وجدت رسائل النور ؟
٢. من مزایا رسائل النور
٣. لماذا ترك بدیع الزمان میدان السیاسة ؟
٤. الدعاء والتضرع

ن ـ لەگەڵ ئەم کتێبانەی خوارەوە :

١. ژیانی ئیمام شافیعی ( مەزنترین فەقیهی ئیسلام )
٢. چمکێك لە ژیانی مامۆستا سەعیدی نوورسیی
٣. دەستی پەروەردگار / نامیلکەی یەکەم
٤. دەستی پەروەردگار / نامیلکەی دووەم
٥. دەستی پەروەردگار / نامیلکەی سێیەم
٦. دەستی پەروەردگار / نامیلکەی چوارەم
٧. دەستی پەروەردگار / کۆکراوە

٨. ڕێبازی خواناسان
٩. کورتە پێناسەیەکی پەیامەکانی نوور
١٠. شارەزایی خوێندنی قورئانی پیرۆز
١١. وانەی شەهیدیی
١٢. یادی پەروەردگار
١٣. هەڵبژادەی چیرۆکی زیرەکان
١٤. نامەیەك بۆ ئازیزان
١٥. نامەیەك بۆ خوشکێکی حیجاب لەبەر
١٦. گەشتێك بەرەو پەیامەکانی نوور

# سەرچاوەکان


| کتێب | دانەر |
| --- | --- |
| ١ ـ الاصابة | العسقلاني |
| ٢ ـ البداية والنهاية | إبن كثير |
| ٣ ـ حلية الأولياء | الأصفهاني |
| ٤ ـ حياة الصحابة | الكاندهلوي |
| ٥ ـ الرحيق المختوم | المباركفوري |
| ٦ ـ الرسول القائد | محمود شيت خطاب |
| ٧ ـ السيرة النبوية | إبن هشام |
| ٨ ـ السيرة النبوية | الصلابي |
| ٩ ـ السيرة النبوية | محمد أبوشهبة |
| ١٠ ـ السيرة النبوية | الندوي |
| ١١ ـ شرح حياة الصحابة | الباره بنكوي |
| ١٢ ـ صحيح البخاري | البخاري |
| ١٣ ـ صحيح مسلم | مسلم |
| ١٤ ـ صفة الصفوة | إبن الجوزي |
| ١٥ ـ صلح الحديبية | باشميل |
| ١٦ ـ غزوة أحد | باشميل |
| ١٧ ـ غزوة الأحزاب | باشميل |
| ١٨ ـ غزوة بدر الكبرى | باشميل |
| ١٩ ـ غزوة بني قريظة | باشميل |

| الكتاب | المؤلف |
| --- | --- |
| ٢٠ ـ غزوة الحنين | باشميل |
| ٢١ ـ غزوة خيبر | باشميل |
| ٢٢ ـ غزوة مؤتة | باشميل |
| ٢٣ ـ فتح مكة | باشميل |
| ٣٤ ـ القلوب الضارعة | الگموشخانوي |
| ٢٥ ـ مختصر صحيح البخاري | الزبيدي |
| ٢٦ ـ مكائد يهودية | الميداني |
| ٢٧ ـ المكتوبات | سعيد النورسي |
| ٢٨ ـ المنهج التربوي للسيرة النبوية | الغضبان |
| ٢٩ ـ هذا الحبيب | أبو بكر الجزائري |

ئازیزمان ! ئەی پێغەمبەری خوا !

بەوپەڕی غیرەت و مەردایەتی‌یەوە دەستت دایە ئەو کارە پیرۆزەی کە پەروەردگار پێتی سپارد .. بەوپەڕی ئیخلاص و جوامێری‌یەوە پاك ترین کۆمەڵی ئادەمییت پەروەردە کرد .. لە بەرزترین پلەدا رەوشت و هەڵس و کەوتت پیشانی مرۆڤایەتیی دا .. بۆ ئەنجام‌دانی فەرمانی پەروەردگار هەموو ناڕەحەتیی و چەرمەسەری‌یەکت چەشت .. بە خۆت و هاوەڵە قارەمانەکانتەوە هەموو سزا و ئازارێك هاتە رێتان ، بۆ پاك کردنەوەی دڵ و دەروونی کۆمەڵێکی رەببانیی ، تا ئەوانیش ببنە هەوێن و بە خۆرهەلات و خۆرئاوادا ئیسلامی بێ‌گەرد بگەیەنن و ، ئادەمی‌یەکان لە سەرگەردانیی و کۆیلەیی رزگار بکەن و ، سەربەرزیی دنیا و قیامەت بە مرۆڤەکان پێشکەش بکەن .

مژدەت لێ بێ ، ئازیزمان ! تەوژمی هەڵمەتی رزگاریی‌خوازی خۆت و هاوەڵانت هێشتا نەوەستاوەتەوە و ، هەتا ئێستاش بەردەوام شار و دێهاتی سەرزەویی بە نووری ئیمان رووناك ئەبنەوە و ، شوێن‌کەوتوانت بە دەست و دەم و دڵی خاوێنەوە هیدایەتی ئادەمی‌یەکان ئەدەن .




لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی سۆز

سلێمانیی ـ شەقامی صابوونکەران

ژمارە سپاردنی ( ٣٣٤ )ی ساڵی ( ٢٠٠٦ )ی وەزارەتی رۆشنبیریی دراوەتێ.